تصوير ابو عبد الرحمن الكردي

رضي الله عنهم

# حياة الصحابة

## بە کوردی

کاندهلوی

تەحقیقی فەرموودەکان

شیخ ناصر الدین الالباني

وەرگێرانی: نیهاد جەلال

بەرگی یەکەم

# ژیانی هاوەڵان

(رضي الله عنهم)

نووسینی:

زانای پایەبەرز محمد یوسف الكاندهلوی

وەرگێڕانی:

نهاد جلال حبیب الله

هاودەم بە تەحقیقی فەرموودەکان لەسەر بنەمای بڕیاری فەرموودەناس

محمد ناصرالدين الألباني

بەرگی یەکەم

١٤٣٢کۆچی ٢٠١١زاینی

بسم الله الرحمن الرحیم

## پێناسی کتێب

ناوی کتێب: ژیانی هاوەڵان(رضي الله عنهم).

نووسەر:محمد یوسف الکاندهلوی

وەرگێڕانی: نهاد جلال حبیب الله.

ساڵو نۆرەی چاپ: یەکەم/٢٠١١-١٤٣٢

شوێنی چاپ: چاپخانەی ڕێ نوێ

ژمارەی سپاردن: ١٢٧٥ - ٢٠١١

تیراژ: ٢٠٠٠





# ئەم وەرگێڕانە پێشکەشە

- بــە هــەر موسـڵمانێك كـە لەگـەڵ خوێندنەوەیـدا لـە نـزای خێـر بێبەشـم
ناكات.

- بە دایكو باوكی ئازیزو خۆشەویستم خوا بەهەشت بكاتە شوێنیان.

- بــە هــەموو مامۆسـتایانی ئـازیزم لـە یەكـەم فێربـوونی پیتێكمـەوە تـا
ئێستا.

- بە هاوسەری باوەڕدارم بێخاڵ خان كە لە نێوەندی ئەم وەرگێڕانەدا خو
خەڵاتی كردم.

- بە مرۆڤایەتی بە گشتیو هەر شەیدایەكی راستی بە تایبەتی.

- بەوانەی تامەزرۆی دیداریانمو لێیان دوورم.

# ئەم وەرگێڕانە پێشکەشە

- بـە هـەر موسـڵمانێك کـە لەگـەڵ خوێندنەوەیـدا لـە نـزای خێـر بێبەشـم ناکات.

- بە دایكو باوکی ئازیزو خۆشەویستم خوا بەهەشت بکاتە شوێنیان.

- بـە هـەموو مامۆسـتایانی ئـازیزم لـە یەکـەم فێربـوونی پیتێکمـەوە تـا ئێستا.

- بە هاوسەری باوەڕدارم بێخاڵ خان کە لە نێوەندی ئەم وەرگێڕانەدا خوا خەڵاتی کردم.

- بە مرۆڤایەتی بە گشتیو هەر شەیدایەکی راستی بە تایبەتی.

- بەوانەی تامەزرۆی دیداریانمو لێیان دوورم.



# پێشەکی وەرگێڕ

سوپاس و ستایشی بێپایان بۆ خوای گەورە، خوایە سوپاس بۆ تۆ تا ڕازی دەبیت، سوپاس بۆ تۆ کاتێ ڕازی دەبیت، سوپاس بۆ تۆ پاش ڕازیبونت، پەروەردگارا هەموو سوپاس و ستایشێك بە جارێك شیاوی تۆیە، خوایە سوپاس بۆ تۆ بەو جۆرەی شیاوی گەورەیی خۆتە، ئەی بێهاوتا، ئەی بەخشندە، ئەی بێنیاز، ئەی لێبوردە.

صەلات و سەلامی خوای گەورە لە پێغەمبەری ئازیزمان موحەممەدی نێردراوی خوا، نووری چاو و ڕووناکی ژیان و چرای تاریکی و هاوڕێی ڕێ و ئازیزترین و خۆشەویستترین کەس، کەسێك کە لە خۆمان لەپێشترە بۆمان، پێش بینینمان خۆشەویستی و دڵسۆزی بۆ نواندین، بە مردنیشی کۆسی گەورەمان کەوت، بە دایك و باوکەوە بەقوربانی بین.

صەلات و سەلامی خوا لە ئالوبەیتی پێغەمبەری ئازیزمان، ئەوانەی خوای گەورە دەیەوێت پاکیان ڕاگرێت، ئەوانەی بە دڵ و گیانمان لە صەلەواتی هەموو نوێژێکدا ناویان دەبەین، ئەوانەی ڕەنگ و بۆی پێغەمبەریان گرتبوو.

صەلات و سەلامی خوا لەسەر هاوەڵانی خۆشەویست، ئەوانەی بوون بە پردێك بۆ پەڕینەوەی ئێمە بەرەو ئاسوودەیی و ڕێی دڵنیایی، ئەو کەسانەی لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەیدا ڕاستیانکرد، خوا لێیان ڕازی و ئەوانیش لە خوا ڕازی بوون، کەسانێ تاریکی ژیانیان بە چرای ئیسلام ڕووناك کردەوە، بشکێ دەستێ و لاڵ بێ زمانێ و کوێر بێت چاوێ و کەڕ بێت گوێیەك و لەئیش بکەوێت دڵێ کە بە نیازی خراپ لە ژیانیان دەنەوێت.

مێژووی مرۆڤایەتی تێکئالاوی لاری و ڕاستی و حەق و ناحەق و بوارە جیاجیاکانی ژیان بووە، مرۆڤ لەو کاتەوەی چاوی بڕیە ئەودیو سنووری خوا پێی لە قوڕاوی لاساریدا چەقی، بۆیە هەردەم لادانی نوێ و زیاتر دەهاتە کایە، بەرامبەر

بەمەش خوای گەورە پێغەمبەرانی بە پەیامی حەق ناردووە، هەریەکەو بەشێکی بەرپرسیارێتیەکەی بەرکەوتووە، هەرکام لەوانەش چواردەوریان دژایەتییان کردون و دۆست و پاڵپشتیشیان هەبووە، هەیانبووە کەسێ یان دوان شوێنکەوتەی هەبووە، هەشیانبووە ژمارەیەکی زۆر شوێنکەوتەی هەبووە.

پشکی گەورەی بەرپرسیارێتیەکە کەوتە بەر پێغەمبەری ئازیزی ئێمە، نەخوێندەوارێك بە تەنها پەیامی هەتاهەتایی خوایی بە هەموو مرۆڤایەتی بگەیەنێت، بەڕاستی ئەم ئەرکە هێندەی دی قورستر دەبێت ئەگەر چواردەوری لاساری بنوێنن، ئەمەش هاتە ڕێی پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام ویستی خواو پاشان هەوڵی پێغەمبەر(ﷺ) بوو بە هۆکار تا لاسارترین کەسانی چواردەوری پێغەمبەر(ﷺ)بن بە کەسانێ کە پێشەنگ بن بۆ مرۆڤایەتی، بەوە لە بری دوژمنانی خوا نازناوی بەرزی هاوەڵانی پێغەمبەری خوایان وەرگرت، خاڵی بەرچاویشیان لەو کاتەوە دەستیپێکرد کە بە تەواوەتی ملیانکەچکرد بۆ فەرمانی خوا و وەك ئەمڕۆی ئێمە چەنەچەنێیان لەسەر شتەکان نەدەکرد، ئەوان بەهایەکی بەرزتر لە گیانیان بەدیکرد ولە یەکەم هەنگاویانەوە بەرامبەر بەو بەهایە گیانیان دانا تا خوای گەورە کەی بیەوێت گیانیانْ بکڕێت، ئەوان بۆ دنیای کاتی نەدەسووتان، بەڵکو بە دنیا دەسووتان بۆ ڕۆژی دوایی، لە بری پشت بەستن بە دروستکراوان پشتیان دەبەست بە دروستکەر(الله)، برسێتی و تینوێتییان دەچەشت تا لە ڕۆژی دواییدا برسێتی و تینوێتی نەبینن، ئەگەر شتێکیان بویستایە-لای دروستکراو هەبوایە یان نا- خێرا ڕوویاندەکردە بارەگای پەروەردگارو باکیان بە کەس نەبوو.

ئیدی هێندە دروست شوێنپێی پێغەمبەریان(ﷺ) گرتەبەر کە خوای گەورە لە قورئانەکەیدا لە چەندین شوێندا شایەتی بۆ داون و وەسفیان دەکات، شایەتی دا کە

لـەوان رازی و ئـەوانیش لـە خـوا رازیـن، پێغەمبـەری ئـازیزیش(صلى الله عليه وسلم) بـە چـەندین فەرمووده وەسفیان دەکات و دژایەتی دوژمنانیشیان دەکات.

بە کورتی ئەوە دەڵێین پێشەنگی کردن بە کەسانێکەوە کە خواو پێغەمبەرەکەی لێیـان ڕازیـن ژیرانـەترین کـارە، بۆیـە پێویستە چاك شـارەزای ژیانیـان بین و لەگـەڵ سات بە سـاتی ژیانیانـدا بژین تـا چراکەی دەستیان لەدەست بگرین و ئێمەش بە ڕێگەی ئەوانـدا بچین، بـە تایبـەت ئـەمڕۆ کـە تیغـی دوژمنـانی کینـە لەدڵانی دژ بە هـاوەڵان تیـژ بوەتـەوە دەبێـت مەردانـە خۆمـان بدەینـە بەر ئـەو تیغـە تـا ڕێ نـەدەین مامۆستاکانی حـەق و ڕاسـتی بـە دەسـتی دڕنـدە خـراپ ویستەکان بریندار بکرێن، دوژمنـانێ کـە کەڵبـەی سـەگ و فێڵـی ڕێوییـان هەیـە تـا دەم بکوتنـە هـاوەڵانی کۆتـا پێغەمبەری خوا.

گـەلی کـوردیش کـە بـە درێـژایی مێـژوو ڕێـی ئـەو هاوەڵانـەیان لەبەر چاوبووەو ڕێیـان نەداوە دوژمنـانی هـاوەڵان دزە بکەنـە ناویـان لـەو نێوەنـدەدا پێشـەنگیان پێشکەش کرد, موجاهیدو سەرکردەی وەك سەلاحەدینی ئەییووبی و زانا و موجاهیدو نوێگەری وەك ئیبن تەیمیـەو سەرپەرشتیاری فـەتحی قوستەنتینیە (شێخی گۆرانی مامۆستای موحەممـەد فاتح)و....هتد, بەڵام بە داخەوە نوسین و وەرگێڕان لەسەر هاوەڵان لەناو کورددا دەگمەنەو دەکرێت هەوڵێکی بەرچاو کە ببینرێت هەوڵەکەی مامۆستا حبیب محمد سعید بێت (خوا تەمەندرێـژی بکـات بـۆ خزمـەتی ئیسلام) چـەند هـەوڵێکی دیکـەی ئـازیزانێکی دیکـەش هەبووە بەڵام بە گشتی هەوڵەکان بەشی پێویست نەبون.

خـوای گـەورە توانـا و نیـازی بـە بەندەیـەکی خـۆی بەخشـی تـا هەسـتێت بـە وەرگێڕانی کتێبێك لەسەر هاوەڵان کە تا ئاستێکی باش ڕاستی هاوەڵانی خستوەتە بەرچاو، ئەویش ئەم کتێبەی بەردەستتانە(حياة الصحابة) کە زانای پایەبەرز محمد یوسـف الکانـدهلوی نووسیویەتی، نووسـینێکی دانسقەیەو بـە پەنجـەی دەست ئاماژەی بۆ دەکرێت.

# ئەو هەنگاوانەی لەم وەرگێڕانەدا گیراونەتەبەر:

لەم نووسینەدا هەوڵمانداوە چەند خاڵێك بگرینەبەر:

١- پاراستنی تەواوی سپاردەی زانستی.

٢- پاراوکردنەوەی وەرگێڕانەکە تا خوێنەر ماندوو نەکات، ئەمەش بەوپەڕی ڕەچاوکردنی خاڵی یەکەم.

٣- ئەو تەخریجاتەی کە نووسەر لە نێو دەقەکەدا هێناویەتی بردوومانەتە پەراوێزەوە تا بیری خوێنەر ماندوو نەکات.

٤- هەستاوین بە دیاریکردنی (صحیح و حسن و ضعیف)ی فەرموودەکان بە تایبەت بە پشت بەستن بە بڕیاردانی زانای فەرمووودەناس ئیمامی ئەلبانی(ڕەحمەتی خوای لێ بێت).ئەمەش بە سوود وەرگرتن لە بەرهەمەکانی ئیمامی ئەلبانی و وەرگێڕانە فارسیەکە کە کتێبخانەی عەقیدەی ئەهلی سوننە بڵاوی کردوەتەوە.

٥- هەوڵمانداوە ئایەت و فەرموودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بە دەقە عەرەبیەکەش بهێنین نەوەك لە وەرگێڕانەکەدا بە تەواوەتی نەمانپێکابێت.

٦- هێنانی کورتەیەك لە ژیانی نووسەر ڕەحمەتی خوای لێ بێت.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هیچ کارێ بێ کەموکورتی نیە، ئەگەر هەڵەو کەموکورتی تێدا بەدیکرا داوا لە خوێنەری بەڕێز دەکەین ئاگادارمان بکاتەوە تا پشت بە خوا هەوڵی چاککردنی بدەین و هەموومان پێکەوە خزمەتێ بەو بوارە بکەین، داواشم لە خوێنەرانی بەڕێزە ئەگەر بە نزایەکیش بێت لەبیرمان نەکەن.

﴿وما أريد إلا الإصلاح ما استطعت وما توفيقي إلا بالله عليه توكلت و إليه أنيب﴾

نهاد جلال حبيب الله

١٤٣١/٤/٢٩کۆچی/ سلێمانی

nihadhawramany@maktoob.com

# کورتەیەك لە ژیانی نووسەر

موحەممەد یووسف کاندهلەوی کوڕی موحەممەد ئیلیاسی گەورە زانای ئیسلامی لە باکووری هیندستان لە بنەماڵەیەکی ئایین پەروەرو زانستخواز لەدایکبووە کە هەر لەگەڵ شیرپێدانیدا زانستیان پێداوە.

لە تەمەنی ١٠ ساڵیدا هەموو قورئانی پیرۆزی لەبەرکردووە، لەگەڵ وەرگرتنی زانستە سەرەتاییەکان بە دوایدا زانستی فەرمودەی لای چەند مامۆستایەك وەرگرت، لە ساڵی ١٣٥٤کۆچیدا بڕوانامەی زانستی وەرگرت.

موحەممەد یووسف زۆر شەیدای خوێندنەوە بووو کاتێکی زۆری بۆ تەرخان دەکرد، دواتر بەیعەتی دا بە باوکی کە دامەزرێنەری کۆمەڵی(التبليغ) بوو، باوکی لە ٢١ڕەجەبی ساڵی ١٣٦٢دا موحەممەد یووسفی کوڕی کرد بە جێگری خۆیو دواتر خۆی کۆچی دوایی کرد، ئەوکات موحەممەد یووسف ئەرکەکەی باوکی گرتە ئەستۆو کەوتە بانگەوازکردن بۆ ئیسلامو کاتێکی زۆری بۆ ئەو بوارە تەرخانکرد.

ئەم کەسایەتیە لە هیندستانو پاکستانەوە دەستیپێکردو دواتر بانگەوازەکەی بەرەو ناوچەکانی دیکە نارد وەك میسرو سوودانو عێراقو جەماوەرێکی زۆری لەخۆگرت، گرنگیەکی زۆریشی دا بە جیهانی رۆژئاواو بە دەیان دەستەی بانگەوازکاری بەرەو ئەورووپا نارد.

موحەممەد یووسف پەیوەندی زۆری لەگەڵ حاجیاندا دەبەست تا گوێگرو گەیەنەری بانگەوازەکەی بن، خۆی سێ جار حەجو دووجار عەمرەی بەجێگەیاندووەو لە ڕێگەیدا درێژەی داوە بە بانگەواز بۆ گەڕانەوە بۆ لای خوا.

ئەم کەسایەتیە ساڵێ دوای کۆتا حەجی پاش گەڕانێکی بەرچاو نەخۆشکەوتو بەهۆی نەخۆشیەکەیەوە مرد، هەواڵی مەرگی دەنگۆیەکی گەورەی لێکەوتەوە، دوای خۆیشی کوڕێکی بەجێهێشت بە ناوی موحەممەد هاروون کە ئەویش زانایەکی لێدەرچوو.

# دەروازە

## ﴿ئایەتە قورئانیەکان لەبارەی گوێڕایەڵی پەروەردگارو پێغەمبەرەکەی موحومەد (صلى الله عليه وسلم)﴾



# دەروازە

## ﴿ئایەتە قورئانیەکان لەبارەی گوێڕایەڵی پەروەردگارو پێغەمبەرەکەی موحەمەد (ﷺ)﴾

**خوای گەورە دەفەرموێت:**

ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣﴾ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٤﴾ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴿٥﴾ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿٦﴾ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧﴾ [1]

**واتە ((بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان. سوپاس و ستایش هەر شایشتەی خوایەو بۆ خوایە. بەخشندەو دلۆڤانە، کانگای ڕەحمەت و میهرەبانیە. خاوەن و سەرداری ڕۆژی پاداشت و سزایە. خوایە، تەنها هەر تۆ دەپەرستین و هەر لە تۆش داوای یارمەتی و پشتیوانی دەکەین. خوایە بەردەوام ڕێنومابیمان بفەرموو بۆ ئەم ڕێبازی ڕاست و دروستی ئیسلامە. کە بەرنامەو ڕێبازی ئەوانەیە لە نازو نیعمەتی خۆت بەهرەوەرت کردوون، نەمانخەیتە سەر ڕێبازی ئەوانەی خەشم و قینیان لێگیراوە، نەمانخەیتە سەر ڕێبازی ئەوانەش کە سەرگەردان و گومڕان)).**

إِنَّ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ ۗ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٥١﴾ [2]

**واتە((بەڕاستی هەر خوا پەروەردگاری منیش و ئێوەشە، کەواتە تەنها ئەو بپەرستن و ملکەچی ئەو بن، ئەمەیە ڕێبازی ڕاست و دروست)).**

قُلْ إِنَّنِى هَدَىٰنِى رَبِّىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ دِينًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ۚ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٦١﴾ قُلْ إِنَّ صَلَاتِى وَنُسُكِى وَمَحْيَاىَ وَمَمَاتِى لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُۥ ۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٦٣﴾ [1]

---

[1] – الفاتحة: ١ – ٧

[2] – آل عمران: ٥١

واتە ((ئەی محمد(ﷺ)) بڵێ: بەڕاستی من پەروەردگارم هیدایەتو ڕێنمونی کردووم بۆ ڕێگەو ڕێبازی ڕاستو دروست، ئاینێك کە ڕاگری ژیانیخەڵکە ئەویش ئایینی ئیبراهیمە کە دوورە لە هەموو لادانو ناڕێکیەوەو ئەو هەرگیز لە ڕیزی موشریكو هاوەڵگەراندا نەبوو.

(ئەی محمد(ﷺ)، ئەی ئیماندار) بڵێ: بەڕاستی نوێژو حەجو دروشمەکانیو (سەرجەم چاکەو بەندایەتیم) هەروەها ژیانو مردنم تایبەتە بە خوای پەروەردگاری جیهانیانەوە. ئەو زاتە هیچ هاوەڵو هاوبەشو شەریکێکی نیەو من بەوە فەرمانم پێدراوەو من یەکەم کەسی موسوڵمانم)).

قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۖ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِىِّ ٱلْأُمِّىِّ ٱلَّذِى يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥٨﴾ [٢]

واتە ((ئەی محمد(ﷺ) بڵێ: ئەی خەڵکینە بەڕاستی من پێغەمبەرو فرستادەی خوام بۆ ئێوە بە گشتی، ئەو خوایەی کە هەر بۆ ئەوە خاوەنداریێتی ئاسمانەکانو زەوی، هیچ خوایەك نیە جگە لەو زاتە، دەژێنێتو دەمرێنێت، جا کەوابوو باوەڕی پتەو بهێنن بەو خوایەو بە پێغەمبەرەکەی،، گە هەواڵدەرێکی نەخوێندەوارە، (تا هیچ کەس نەڵێت پیاوێکی خوێندەوار بووەو خۆی قورئانی داناوە) ئەو پێغەمبەرەی کە خۆی باوەڕدەهێنن بە خواو بە فەرموودەکانی، دە ئێوەش شوێنی بکەون، بۆ ئەوەی ئێوە ڕێنمونی وەرگرن)).

وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ جَآءُوكَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ ٱللَّهَ وَٱسْتَغْفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُوا۟ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا ﴿٦٤﴾ [١]

---

[١] - الأنعام: ١٦١ - ١٦٣

[٢] - الأعراف: ١٥٨

((هیچ فرستادەیەکمان نەناردوە مەگەر تەنها بۆ ئەوەی گوێڕایەڵی بکرێت بە فەرمانی خوا، خۆ ئەگەر ئەو خەڵکە بەڕاستی کاتێك ستەمیان لە خۆیان کرد (بە لادان لە شەریعەت) بهاتنایە بۆ لای تۆ و داوای لێخۆشبوونی لە خوای گەورە بکردایە، پێغەمبەریش داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکردنایە، ئەوە بێگومان ئەو کاتە دەیانزانی کە خوا تەوبەو پەشیمانی وەرگرەو میهرەبانو دلۆڤانە (ئەگەر بە ڕاستیان بوایە))).

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَوَلَّوْاْ عَنْهُ وَأَنتُمْ تَسْمَعُونَ ﴿٢٠﴾[2]

((ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەرەکەی بنو لە بەرنامەی ئەوزاتە پشت هەڵمەکەن، لەکاتێکدا ئێوە تێتدەگەنو دەبیستن)).

وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٣٢﴾[3]

((گوێڕایەڵو فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەرەکەی بن بۆ ئەوەی ڕەحمتان پێ بکرێت)).

وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفْشَلُواْ وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْۖ وَٱصْبِرُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٤٦﴾[4]

((گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەشی بن لە هەموو کردارو گوفتارێکداو ئاشوبو ئاژاوە مەگێڕنو مەچن بەگژیەکدا، خۆ ئەگەر بچن بەگژیەکداو یەکتر بشکێنن، ئەوە شکستو لاوازی ڕووتان تێدەکاتو هەیبەتو شکۆداریو دەسەڵاتتان لەبەین دەچێتو دەبێت خۆگرو نەفەس درێژ بن (هەم لە مەیدانی جەنگدا، هەم لەناو یەکتردا) چونکە بەڕاستی خوا یارو یاوەری خۆگرو ئارامگرانە)).

---

[1] – النساء: ٦٤

[2] الأنفال: ٢٠

[3] – آل عمران: ١٣٢

[4] – الأنفال: ٤٦

أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوٓاْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِۦ وَيُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا ﴿٦٠﴾ [1]

**((ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، فەرمانبەردارو گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرو فەرمانڕەواکان بکەن کە لەخودی خۆتانن (لە بیرو باوەڕ پابەندیدا)، خۆ ئەگەر لە شتێکدا بوو بە کێشەتان دەربارەی حوکمی خوایی، ئەوە ئەو کێشەیە بگێڕنەوە بۆلای خواو پێغەمبەرەکەی (ﷺ) (کە قورئان و سوننەت دەگەیەنێت)، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خواو بە ڕۆژی قیامەت هەیە، (ڕەفتارکردن) بەوشێوەیە چاکترین و جوانترین سەرچاوەیە بۆ چارەسەری کێشەکانتان)).**

إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥١﴾ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَخْشَ ٱللَّهَ وَيَتَّقْهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٥٢﴾ ۞ وَأَقْسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِنْ أَمَرْتَهُمْ لَيَخْرُجُنَّ ۖ قُل لَّا تُقْسِمُواْ ۖ طَاعَةٌ مَّعْرُوفَةٌ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٥٣﴾ قُلْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيْكُم مَّا حُمِّلْتُمْ ۖ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُواْ ۚ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٥٤﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِى ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ۚ يَعْبُدُونَنِى لَا يُشْرِكُونَ بِى شَيْـًٔا ۚ وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٥٥﴾ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٥٦﴾ [2]

**واتە ((بەڵام گوفتاری ئیمانداران کاتێك بانگ دەکرێن بۆلای خواو پێغەمبەرەکەی تا فەرمانڕەوایی بکات لە نێوانیاندا تەنها ئەوەیە کە دەڵێن: بیستمان و گوێڕایەڵین بۆ هەموو فەرمانێکی شەرعی، هەر ئەوانەشن سەرفرازو**

---

[1] – **النساء: ٥٩**

[2] – **النور: ٥١ – ٥٦**

سەرکەوتوو. جا ئەوەی فەرمانبەرداریی خواو پێغەمبەرەکەی بکاتو لە خوا بترسێتو لەسەرپێچی و نافەرمانی خۆی بپارێزێت، ئائەوانە سەرفرازو بە ئاوات گەیشتوون. دووڕووەکان سوێندی گەورە بەخوا دەخۆن ئەگەر فەرمانیان پێ بدەیت کە دەرچن بۆ خەباتو جیهاد، دەردەچنو ئامادەن، پێیان بڵێ: سوێند مەخۆن ملکەچی ئێوە زانراو و دیارە؟! (هەموو کات کردارو گوفتارتان جیایە)، بەڕاستی خوا ئاگایە بەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن. پێیان بڵێ: فەرمانبەرداری خواو فەرمانبەرداری پێغەمبەر بن، خۆ ئەگەر پشتیان هەڵکرد، ئەوە ئەو تەنها گەیاندنی پەیامی خوای لەسەر شانە، ئێوەش سەرپێچیو یاخیبوونەکەتان لەسەرتان دەکەوێت، خۆ ئەگەر فەرمانبەرداری بنو گوێڕایەڵو ملکەچ بن بەڕاستی ئەوە هیدایەت وەردەگرن، دڵنیاش بن کە ئەرکی سەرشانی پێغەمبەر تەنها گەیاندنێکی ڕوونو ئاشکرایەو هیچی تر نیە. خوا بەڵێنی دەڵنیابەخشو تەواوی داوە بەوانەی باوەڕیان هێناوە لە ئێوەو کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە بە ڕاستی لە ئایندەیەکی نزیکدا جێنشینو پایەداریان دەکات لە وڵاتدا هەوەك چون ئیمانداری پێش ئەمانی جێنشین کردووەو ئەو دینو ئایینەیان بۆ دەچەسپێنێت خودا خۆی پێی ڕازییە، هەروەها ترسو بیمیان بۆ دەگۆڕێت بە ئارامیو هێمنی، ئەوکاتە ئیتر بە تەواوی هەر من دەپەرستنو هەرگیز هیچ جۆرە هاوەڵێكو شەریکێکم بۆ بریار نادەن، ئەوسا ئەوەی دوای ئەو پایەداریە بێ باوەڕ بێت، ئائەو جۆرە کەسانە هەر تاوانبارو لەسنوور دەرچوون. ئەی ئیمانداران: نوێژەکانتان لە کاتی خۆیدا بە چاکی ئەنجام بدەنو زەکاتی ماڵەکانتان بدەنو فەرمانبەرداری پێغەمبەریش بکەن بەڵکو ڕەحمتان پێ بکرێت).

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ۖ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَقَلْبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٤﴾ [1]

**((ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە،بەدەم بانگەوازی خواو پێغەمبەرەوە بچن کاتێك بانگتان دەکات بۆ بەرنامەو ڕێبازێك کە دەتانژێنێتەوەو ژیان بەخشە، چاك بزانن بەڕاستی خوا (زۆر بە ئاسانی) دەتوانێت دەسەڵاتی بکەوێتە نێوان ئادەمیزادو (ئاواتەکانی) دڵیەوە (بە گۆڕینیان)، (بیرتان نەچێت) بەڕاستی هەر بۆلای ئەویش کۆدەکرێنەوە)).**

مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ ٱللَّهَ ۖ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ﴿٨٠﴾ [2]

**((ئەوەی فەرمانبەرداری پێغەمبەر (ﷺ) بکات، ئەوە بەڕاستی فەرمانبەرداری خوای کردووە، ئەوەش پشتی هەڵکردووە (ئەوە خۆی زەرەرمەند دەبێت) خۆ ئێمە تۆمان نە ناردوە تا ببیتە چاودێر بەسەر ئەوانەوە)).**

وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَـٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّـٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُوْلَـٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾ ذَٰلِكَ ٱلْفَضْلُ مِنَ ٱللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ عَلِيمًا ﴿٧٠﴾ [3]

**((ئەوەی فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەر بکات، جا ئەوانە لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەبن (لە بەهەشتی بەریندا) کە خوا نازو نعمەتی ڕژاندووە بەسەریاندا لەپێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان، ئای کە ئەوانە هاوەڵ و هاوەڕێ و هاودەمێکی چاك و بێ وێنەن!)).**

[1] – الأنفال: ٢٤
[2] – النساء: ٨٠
[3] – النساء: ٦٩ – ٧٠

تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ ۚ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٣﴾ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ يُدْخِلْهُ نَارًا خَٰلِدًا فِيهَا وَلَهُۥ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٤﴾ [1]

((ئەوانەی باسکران (دەربارەی هەتیوان و چۆنیەتی دابەشکردنی میراتی) ئەو سنورانەن خوا دیاری کردوون، جا ئەو کەسەی فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەرەکەی بکات (لەم بوارەداو لە هەموو بوارەکانی تردا)، ئەوە خوا دەیخاتە ناو باخەکانی بەهەشتەوە: کە چەندەها ڕووبار بە ژێر درەختەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی نەبڕاوە تیایدا، بێگومان هەر ئەوەشە سەرفرازی گەورەو دەستکەوتی بێ سنوور. بەڵام ئەوەی یاخی بێت لە خواو پێغەمبەرەکەی و دەرچێت لە سنوورەکانی، ئەوە خوا دەیخاتە ناو ئاگرێکەوە کە بۆ هەمیشە تیایدا دەمێنێتەوەو سزایەکی سەرشۆڕکەرو ڕیسواکەری بۆ هەیە)).

يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ ۖ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُوا۟ ذَاتَ بَيْنِكُمْ ۖ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١﴾ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا ۚ لَّهُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٤﴾ [2]

((ئەی محمد (ﷺ): پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی دەستکەوتەکان، تۆ بڵێ: هەموو دەستکەوتەکان هی خواو پێغەمبەرن (هەر ئەوان بۆیان هەیە بڕیاری چۆنیەتی دابەش کردنی بدەن)، کەواتە لەخوا بترسن و چاکسازی نێوانی خۆتان

[1] - النساء: ١٣ – ١٤

[2] - الأنفال: ١ – ٤

بکەن (مەیەڵن لەسەر تەماعی دونیا نێوانتان بشێوێت) و فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەرەکەی بن، ئەگەر ئێوە ئیماندارن. بێگومان ئیماندارانی راستەقینە تەنها ئەوانەن: (یەکەم) کە کاتێك ناوی خوا برا، ئەوە دڵەکانیان دەترسێت و دەهەژێت، (دووهەم) کاتێك ئایەت و فەرمانەکانی ئێمەیان بەسەردا بخوێنرێتەوە، ئەوە ئیمان و باوەڕیان زیاد دەکات، (سێ هەمەم) (لە هەموو کارو بارێکیشیاندا) هەر پشت بە پەروەردگاری خۆیان دەبەستن. (چوارەم) ئەوانەن کە نوێژەکانیان بە چاکی ئەنجام دەدەن، (پێنجەم) هەندێك لەو ڕزق و ڕۆزیەی پێماندراون، دەبەخشن و سەرفی دەکەن. ئا ئەوانە هەر خۆیان ئیماندارانی ڕاستەقینەن، چەندەها پلەو پایەی بەرزیان بۆ هەیە لای پەروەردگاریان و لێخۆشبوون و ڕزق و ڕۆزی هەمیشەیی لەگەڵ ڕێزدا)).

وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾ [1]

((ئیمانداران لە پیاوان و لە هەندێکیان خۆشەویست و پشتگیرو هاوکاری یەکترن (کە ئەمەش سیفاتیانە) فەرمان بە چاکە دەدەن و قەدەغە لە خراپە دەکەن و نوێژەکانیان بە چاکی ئەنجام دەدەن و زەکاتی ماڵیشیان دەبەخشن و گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن، ئا ئەوانە لە ئایندەدا خوا ڕەحمیان پێ دەکات و سۆزی دەبێت بۆیان، بەڕاستی خوا باڵادەست و دانایە)).

قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾ [2]

((ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بە ئیمانداران بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێت دە شوێنی من بکەون و لە فەرمانی من دەرمەچن، ئەوکاتە خواش ئێوەی خۆش دەوێت و لە گوناهو هەڵەکانیشتان خۆش دەبێت، ئەو خوایە لێخۆشبو و میهرەبانە)).

---

[1] – التوبة: ٧١

[2] – آل عمران: ٣١

لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْآخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ [1]

**((سوێند بە خوا بە ڕاستی لە پێغەمبەری خوادا چاکترین نمونەی تەواو و ڕێکوپێك هەیە تا چاوی لیٚ بکەن و شوێنی بکەون، بە تایبەت بۆ ئەو کەسانەی ڕەزامەندی خوایان مەبەستە، سەرفرازیی قیامەت ئاواتیانە، هەمیشەو بەردەوام یادی خوا بە زۆری ئەنجام دەدەن و زمانیان پاراوە بە یادی خوا)).**

مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ كَىْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ۚ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٧﴾ [2]

**((جا ئەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی بەخشیون وەری بگرن، هەر فەرمانێکی پێدان بە گوێی بکەن، قەدەغەی هەر شتێکی لیٚ کردن مەیکەن، لە خوا بترسن، چونکە بەڕاستی خوا بە توندی تۆڵە دەسێنێت)).**



## ((فەرموودە سەبارەت بە گوێڕایەڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و شوێنکەوتنی خۆی و جێنشینەکانی ڕەزای خوایان لیٚ بێت))

**بوخاری لە ئەبو هورەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (من اعطاعني فقد اطاع الله و من عصاني فقد عصى الله، ومن اطاع اميري فقد اطاعني، ومن عصى اميري فقد عصتني)). واتە ((هەرکەس گوێڕایەڵی من بێت**

[1] – الأحزاب: ٢١

[2] – الحشر: ٧

ئەوە گوێڕایەڵی خوا بووە، هەرکەسیش لەمن لابدات ئەوا لە فەرمانی خوا لایداوە، هەرکەس گوێڕایەڵی ئەمیرم بێت ئەوا گوێڕایەڵی من بووە، هەرکەسیش لێی یاخی بێت ئەوە لە من یاخی بووەو لایداوە)).

هەروەها بوخاری لە ئەبو هورەیرەوە (رضي الله عنه) بە مەرفوعی هێناویەتی ((کل امتي یدخلون الجنة الا من ابی، من اطاعني دخل الجنة، ومن عصاني فقد ابی))[1] واتە((هەموو ئومەتەکەم دەچنە بەهەشتەوە تەنها کەسێك نەبێت کە یاخی دەبێت، هەرکەس گوێڕایەڵم بێت دەچێتە بەهەشتەوە، هەرکەسیش لە من لابدات یاخی بووە)).

هەروەها بوخاری لە جابرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی کە دەڵێت ((فریشتەیەك هات بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەو کات پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خەوتبوو، وتیان: ئەم هاوڕێ‌و گەورەتان نمونەیەکی هەیە بزانن دەیزانن، هەندێکیان وتیان: خەوتووە، هەندێ وتیان چاوی خەوتووەو دڵی بێدارە، ئەوانیش وتیان وەك ئەو کەسە وایە ماڵێك دروست دەکات‌و تیایدا (مەئدەب) نانی ئاهەنگی بووکێنی دانابێت‌و کەسێك بنێرێت تا خەڵك بانگ بکات، هەرکەس بچێت بەدەم بانگەوازکەرەکەوە دەچێتە ماڵەکەوەو لە خواردنەکە دەخوات، هەرکەسیش نەچێت بەدەمیەوە ناچێتە ماڵەکەوەو لێی ناخواتوتیان: بۆی بگێڕنەوە لێی تێدەگات، هەندێکیان وتیان خەوتووە، هەنێکیان وتیان چاوی خەوتووەو دڵی بێدارە، ئەوانیش وتیان ماڵەکە بەهەشتەو موحەممەد بانگەوازکەرەکەیەو هەرکەس گوێڕایەڵی موحەممەد بێت گوێڕایەڵی خوا بووە، هەرکەس لە موحەممەد یاخی بێت لەخوا یاخی بووەو لایداوە، موحەممەد نێوانی خەڵکی جیا کردوەتەوە)).[2]

---

[1] لە (الجامع)ج٢ من٢٣٣ دا واهاتووە.

[2] – دارەمی لە ڕەبیعەی جەرشیەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی‌و لە (المشکاة)ص٢١دا واهاتووە.

هەردوو زانای فەرموودەناس بوخاری و موسلیم لە ئەبو موساوە (رضي الله عنه) دەڵێت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی ((انما مثلي و مثل ما بعثني الله به كمثل رجل اتى قوما فقال يا قوم! مني رايت الجيش بعيني، واني انا النذير العريان، فالنجاء، فالنجاء، فاطاعه طائفة من قومه فادلجوا، فانطلقوا على مهلهم فنجوا، و كذبت طائفة منهم فاصبحوا مكانهم فصبحهم الجيش فاهلكهم و اجتاحهم، فذالك مثل من اعطاني فاتبع ما جئت به، ومثل من عصاني و كذب ما جئت به من الحق))

واتە((نمونەی من و ئەوەی خوای گەورە پێی ناردووم، وەك پیاوێك وایە بێتە لای ئەو خەڵكەو پێیان بڵێت: گەلەكەم من بە چاوانی خۆم سوپام بینی،من بێداركەرەوەی بەرگ لابەرم، فریاكەون، فریاكەون، دەستەیەكی گەلەكەی بەگوێی دەكەن و لە درەنگانێكی شەودا خۆیان ڕزگار دەكەن و لە سەرخۆ دەچن و ڕزگاریان دەبێت، دەستەیەكیشیان بە درۆی دەزانن و لە شوێنی خۆیاندا دەمێننەوە، كە بەیانی دێت سوپا دێت بەسەریانداو لێیان دەدات و لە ناویان دەبات، دەی ئەوە نمونەی ئەو كەسەیە كە گوێڕایەڵی من دەبێت و شوێن ئەو پەیامە دەكەوێت كە پێی هاتووم، لەگەڵ نموونەی ئەو كەسەی لێم یاخی بووەو لایداوەو ئەو شتەی بەهەق پێی هاتووم بە درۆی دەزانێت)).

ترمزی لە عەبدوڵڵای كوڕی عەمرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی ((لياتين على امتي كما اتي على بني اسراءيل حذو النعل بالنعل حتى ان كان منهم من اتى امه علانية لكان في امتي من يصنع ذالك، وان بني اسرائيل تفرقت على اثنين و سبعين ملة، وتفترق امتي على ثلاث وسبعون ملة، كلهم في النار الا ملة واحدة، (هم) ما انا عليه و اصحابي)) واتە((ڕۆژێك دێت چی بەسەر بەنی ئیسرائیلدا دێت بەسەر ئومەتەكەی منیشدا دێت و هەنگاو بە هەنگاو دەكەونە شوێن بەنی ئیسرائیل تا ئەوەی ئەگەر یەكێك لەوان -بەنی ئیسرائیل- بە ئاشكرا لەگەڵ دایكیدا سەرجێ بكات لەناو ئومەتەكەی منیشدا كەسی وا دەبێت ئەوە دەكات، بەنی ئیسرائیل بوون بە حەفتاو دوو بەشەوە، ئومەتی منیش بۆ حەفتاو سێ بەش دابەش دەبن،

هەموویان دەچنە ناو دۆزەخ جگە لەیەك دەستەیان، وتیان، ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوانە كێن؟ فەرمووی: ئەوانەن لەسەر ئەو ڕێبازەن كە من و هاوەڵانم لەسەری دەڕۆین)).

ترمزی و ئەبو داودیش لە عیربازی كوڕی ساریەوە (رضي الله عنه) دەگێڕنەوە – دەقەكەش هی ئەبو داودە– كە وتی : پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژێك نوێژی بۆ دەكردین، پاشان ڕووی وەرگێڕا بەلاماندا و ئامۆژگاریەكی بەهێز و ڕەوانبێژی وای كردین كە چاوەكان فرمێسكیان بۆ ڕشت و دڵەكان پێی ڕاچڵەكین، یەكێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەڵێیت ئامۆژگاری ماڵئاوییە چیمان پێ دەڵێیت؟ ئەویش فەرمووی ((اوصيكم بتقوى الله والسمع والطاعة وان عبدا حبشيا فانه من يعيش منكم بعدي فسيرى اختلافا كثيرا، فعليكم بسنتي وسنة الخلاء الراشدين المهديي، تمسكوا بها و عضوا عليها بالنواجذ، و اياكم و محدثات الامور فان كل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة)) واتە((وەسیەتتان بۆ دەكەم لە خوا بترسن و گوێڕایەڵ بن با بۆ كۆیلەیەكی حەبەشیش بێت، چونكە هەركامتان دوای من بژین ناكۆكیەكی زۆر دەبین، بۆیە دەست بگرن بە سوننەتی من و خەلیفە ڕاشیدینە ڕێنمونیكەرەكانەوە، دەستی پێوە بگرن و لەسەری دان بەخۆدا بگرن، زۆر خۆتان بەدوور بگرن لە داهێنراوەكان، چونكە هەموو داهێنراوێك بیدعەیە و هەموو بیدعەیەكیش گومڕاییە)).[1]

ڕەزین لە عومەرەوە (رضي الله عنه) بە مەرفوعی هێناویەتی ((سالت ربي عن اختلاف اصحابي من بعدي فاوحى الي يا محمد! ان اصحابك عندي بمنزلة النجوم من السماء بعضها اقوى من بعض و لكل نور، فمن اخذ بشيئ مما م عليه من اختلافهم فهو عندي هدى... اصحابي كالنجوم بايهم اقتديتم اهتديتم))[2] واتە((پرسیارم لە پەروەردگارم كرد لەسەر ناكۆكی هاوەڵانم دوای خۆم، ئەویش سروشی بۆ دابەزاندم ئەی موحەمەد، هاوەڵانی تۆ لای

[1] – صحيح

[2] – لە (جمع الفوائد) ج٢ص١٢٠١دا هاتووە.

من وەك ئەستێرەكانی ئاسمان وان، هەندێكیان لە هەندێكی دیكەیان بەهێزترە، هەرچەندە هەموویان ڕووناكیان هەیە، هەركامیان لە ناكۆكیەكەیدا شتێك لەوە بگرنە دەست كە لەسەری بوون لای من لەسەر ڕێنموونین، پێغەمبەر (ﷺ) دواتر فەرمووی، هاوەڵانم وەك ئەستێرەكان وان هەركامێكیان بكەنە پێشەنگ ڕێنموونی وەردەگرن)).

ترمزی لە حوزەیفەوە (رضي الله عنه) بە مەرفوعی هێناویەتی كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ((اني لا ادري قدر بقائي فيكم فاقتدوا باللذين من بعدي – اشار الى ابوبكر و عمر (رضي الله عنه) واهتدوا بهدي عمار و ما حدثكم عن ابن مسعود فصدقوه)) واتە((من نازانم قەدەر وابێت چەندە لە ناوتاندا بمێنمەوە، بۆیە پێشەنگی بكەن بەو دوانەی دوای خۆمەوە – ئاماژەی كرد بۆ ئەبوبەكرو عومەر (رضي الله عنه) ڕێی عەممار بگرنە بەرو ئیبن مەسعود هەرچی پێ وتن بڕوای پێ بكەن‌و بەڕاستی بزانن)).[1]

هەروەها ترمزی لە بیلالی كوڕی حارسی موزەنییەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ((من احيا سنة من سنتي قد اميتت بعدي فان له من الاجر مثل اجور من عمل بها غير ان ينقص من من اجورهم شيئا، ومن ابتدع بدعة ضلالة لا يرضاها الله ورسوله كان عليه من الاثم مثل اثام من عمل بها لا ينقص ذالك من اوزارهم شيئا)). واتە((هەركەس سوننەتێكم زیندوو بكاتەوە كە دوای خۆم مرێنرابێت ئەوا وەك ئەو كەسەی كاری پێ دەكات پاداشتی بۆ هەیە بەبێ ئەوەی لە پاداشتیان هیچ كەم بكات، هەركەسیش بیدعەیەكی سەرشێوێنەرو گومڕاكەر دابهێنێت كە خواو پێغەمبەرەكەی پێی ڕازی نەبن وەك ئەو كەسەی كاری پێدەكات تاوانی بۆ دەنووسرێت بەبێ ئەوەی هیچ لە تاوانیان كەم بكات)). ئیبن ماجەش بە هەمان

[1] – صحيح

شێوە لە کەسیری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە هێناویەتی.[1]

هەروەها ترمزی لە عەمری کوڕی عەوفەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی کە دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی ((ان الدين ليارز الى الحجاز كما تارز الحية الى جحرها، و ليعقلن الدين من الحجاز معقل الاروية من راس الجبل، فان الدين بدا غريبا وسيعود غريبا كام بدا، فطوبى للغرباء وهم الذين يصلحون ما افسد الناس من بعدي من سنتي)) واتە ((چۆن مار دەچێتەوە ناو کونەکەی ئیسلامیش وا دەچێتەوە ناو حیجاز، ئیسلام لە حیجازدا دایدەکوتێت، وەك چۆن وشتر لە لوتکەی شاخدا دایدەکوتێت، چونکە ئەم ئایینە بە نامۆیی دەستی پێ کردووە رضي الله عنه دەگەڕێتەوە بۆ نامۆیی وەك چۆن وا دەستی پێ کرد، سەربەرزیو بەهەشت بۆ نامۆکان، ئەوانە – نامۆکان– ئەوانەن کە چی لە سوننەتی من دوای خۆم خەڵك شێواندوویەتی چاکی دەکەنەوە)).[2]

هەروەها ترمزی لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی وتم: ((يا بني! ان قدرت ان تصبح وتتمسى وليس في قلبك غش لاحد فافعل...يا بني! و ذالك من سنتي ومن احب سنتي فقد احبني، ومن احبني مان معني في الجنة)) واتە((کوڕی شیرینم، ئەگەر توانیت بەیانیو ئێوارە بکەیتەوە بەبێ ئەوەی دڵت لەکەس کرمۆ نەبێت بیکە... کوڕی شیرینم ئەوە لە سوننەتی منەو هەرکەسیش سوننەتی منی خۆش بوێت منی خۆش دەوێت، هەرکەسیش منی خۆش بوێت لە بەهەشتدا لەگەڵمدایە)).[3]

---

[1] – ضعيف

[2] – ضعيف

[3] – ضعيف

بەیهەقی لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) بە مەرفوعی هێناویەتی ((من تمسك بسنتي عند فساد امتي فله اجر ماتة شهيد)) واتە((هەرکەس لەکاتی خراپ بوونی باری ئوممەتەکەمدا دەستبگرێت بە سوننەتی منەوە ئەوا پاداشتی سەد شەهیدی هەیە)). تەبەرانیش لە ئەبو هورەیرەوە (رضي الله عنه) ئەمەی هێناوە، بەڵام ئەو دەڵێت ((فله اجر شهيد)) ((پاداشتی شەهیدێکی هەیە)). لە (الترغيب ج١ ص٤٤) دا واهاتووە.[١]

تەبەرانی و ئەبو نەعیم لە کتێبی (الحلية) لە ئەبو هورەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویانە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت ((المتمسك بسنتي عند فساد امتي له اجر شهيد)) واتە((ئەو کەسەی لە کاتی خراپ بوونی باری ئوممەتمدا دەست دەگرێت بە سوننەتمەوە پاداشتی شەهیدێکی هەیە)).[٢]

حەکیمیش لە ئەبو هورەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی ((المتمسك بسنتي عند اختلاف امتي كالقابض على الجمر)) واتە((ئەو کەسەی لە کاتی ناکۆکی ئوممەتەکەمدا دەست دەگرێت بە سوننەتی منەوە وەك ئەو کەسە وایە پشتکۆی گرتبێت بە دەستیەوە)).[٣][٤]

موسلیم لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) بە مەرفوعی هێناویەتی ((من رغب عن سنتي فليس مني)) واتە((هەرکەس گوێ بە سوننەتم نەدات لە من نی یە)). ئیبن عەساکیریش لە ئیبن عومەرەوە وای هێناوە و لە سەرەتاکەیەوە ئەمەی بۆ زیاد کردووە ((من اخذ بسنتي فهو مني)) واتە((هەرکەس دەست بگرێت بە سوننەتمەوە ئەوە لە منە)).

---

[١] – ضعيف

[٢] – ضعيف

[٣] – لە (كنز العمال ج١ ص٤٧)دا هاتووە.

[٤] – حسن

دارقوتنی لە عائیشەوە (رضي الله عنها) بە مەرفوعی هێناویەتی ((من تمسك بالسنة دخل الجنة)) واتە((هەرکەس دەست بگرێت بە سوننەتەوە- سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)- دەچێتە بەهەشتەوە)).[1]

سجزی لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) بە مەرفوعی هێناویەتی ((من احيا سنتي فقد احبني، ومن احبني كان معي في الجنة)) واتە((هەرکەس سوننەتی من زیندوو ڕاگرێت ئەوە منی خۆش دەوێت، هەرکەسیش منی خۆش بوێت لە بەهەشتدا لە گەڵمدایە)).[2]

## ئایەتە قورئانیەکان لە بارەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانیەوە (رضي الله عنهم)

**خوای گەورە دەفەرموێت**

مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٤٠﴾ [1]

---

[1] - ضعيف

[2] - ضعيف

واته((محمد باوکی هیچ کەس لە پیاوانتان نیە، بەڵکو پێغەمبەری خوایەو دواهەمینی پێغەمبەرانە، هەمیشەو بەردەوامیش خوا بە هەموو شتێك زانایە)).

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴿٤٥﴾ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذۡنِهِۦ وَسِرَاجٗا مُّنِيرٗا ﴿٤٦﴾[2]

واته((ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئێمە بەڕاستی تۆمان ڕەوانە کردووە کە شایەت یت (بەسەر ئوممەتی ئیسلامەوە کە پەیامی خوات پێ ڕاگەیاندوون)و مژدە دەبەخشیت (بە ئیمانداران بەوەی ڕەزامەندی خواو بەهەشتی بەرین چاوەڕێیانە) ترسێنەریت (بێ باوەڕان دەترسێنیت لە خەشمو قینی خواو دۆزەخ). هەروەها بە مۆڵەتو پشتیوانی خوا بانگەواز دەکەیت بۆ بەرنامەو ڕێبازی ئەو زاتە، هەروەها چرایەکی ڕووناککەرەوەی بۆ سەرجەم سەرگەردانان)).

إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴿٨﴾ لِّتُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلًا ﴿٩﴾[3]

واته((ئێمە تۆمان ڕەوانە کردووە ئەی محمد (ﷺ) کە شایەتو مژدەدەرو بەئاگاهێنەر بیت بۆ گرۆی ئادەمیزاد. بۆ ئەوەی ئێوە باوەڕ بهێنن بە خواو پێغەمبەرەکەی و پشتیوانی لە پێغەمبەر بکەنو ڕێزی شایستەی خۆی لێ بگرنو تەسبیحاتو ستایشی خوا بکەن لە بەرەبەیانو عەسراندا)).

إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗاۖ وَلَا تُسۡـَٔلُ عَنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡجَحِيمِ ﴿١١٩﴾[4]

---

[1] – الأحزاب: ٤٠
[2] – الأحزاب: ٤٥– ٤٦
[3] – الفتح: ٨ – ٩
[4] – البقرة: ١١٩

واتە((بەڕاستی ئەی محمد (ﷺ) ئێمە تۆمان هاوڕێ لەگەڵ هەق و ڕاستەقینەکاندا ڕەوانە کردووە تا مژدەدەر بیت بە ئیمانداران و ترسێنەر بیت بۆ بێ باوەڕان، بێگومان تۆ هەرگیز بەرپرسیار نیت لە نیشتەجێکانی دۆزەخ)).

إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ۚ وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾ [1]

واتە((بێگومان ئێمە تۆمان ڕەوانەکردووە بە حەق و ڕاستیەکی تەواوەوە، مژدەدەر و ترسێنەری (بێ بڕواکانیت) هیچ گەل و نەتەوەیەکیش نەبووە کە فرستادەو بێدارکەرەوەیەکی بۆ ڕەوانە نەکرابێت).

وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾ [2]

واتە((ئێمە تەنها بۆ هەموو خەڵکی نەبێت، تۆمان ڕەوانە نەکردووە، لە کاتێکدا مژدەدەر و ترسێنەریت بۆیان، بەڵام زۆربەی خەڵکی بەم ڕاستی یە نازانن)).

وَبِٱلْحَقِّ أَنزَلْنَٰهُ وَبِٱلْحَقِّ نَزَلَ ۗ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿١٠٥﴾ [3]

واتە((ئێمە قورئانمان لەسەر بنچینەی هەق و ڕاستی دابەزاندووە، بۆ چەسپاندنی هەق و ڕاستیش دابەزیوە، ئێمە تۆمان ڕەوانە نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە مژدەبەخش بیت (بە ئیمانداران) و ترسێنەر بیت (بۆ خوانەناسان))).

وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾ [4]

واتە((ئەی محمد ﷺ) ئێمە تۆمان ڕەوانە نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە ببیتە ڕەحمەت و بەرەکەت بۆ هەموو جیهانەکان (جیهانی ئادەمیزاد و گیاندار و ڕووەك و پەری و هتد...)).

هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُشْرِكُونَ [1]

---

[1] – فاطر: ٢٤
[2] – سبأ: ٢٨
[3] – الإسراء: ١٠٥
[4] – الأنبياء: ١٠٧

واته((هەر ئەو زاته پێغەمبەرەکەی هاورێ لەگەڵ هیدایەت و ڕێنموونی و ئایینی ڕاست و دروستدا ڕەوانە کردووه تا سەری بخات بەسەر هەموو بەرنامەو ئایینەکانی تردا، هەرچەندە موشریك و هاوەڵ دانەران پێی سەغڵەت و دڵتەنگ دەبن)).

وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِي كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا عَلَيْهِم مِّنْ أَنفُسِهِمْ ۖ وَجِئْنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ ۚ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴿٨٩﴾ [2]

واته((ڕۆژێك دێت لە هەموو ئوممەتێکدا شایەتێك دەنێرین لە خۆیان بۆ سەریان، تۆشمان هێناوە (ئەی محمد ﷺ) کە شایەت بیت لەسەر ئەو خەڵکە، قورئانیشمان بۆ تۆ دابەزاندووه، ڕوونکەرەوەی هەموو شتێکە، هیدایەت بەخش و ڕەحمەتە و مژدەبەخشیشە بۆ موسوڵمانان)).

وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا ۗ وَمَا جَعَلْنَا الْقِبْلَةَ الَّتِي كُنتَ عَلَيْهَا إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ الرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ ۚ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى الَّذِينَ هَدَى اللَّهُ ۗ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَانَكُمْ ۚ إِنَّ اللَّهَ بِالنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤٣﴾ [3]

واته((بەو شێوەیەش ئێوەمان بە گەلێکی میانڕەو گێڕاوە (لە هەموو ڕوویەکەوە، لە ڕووی عیبادەت و خواپەرستییەوە، لە ڕووی دونیا و قیامەتەوە، لەڕووی داخوازیەکانی ڕۆح و نەفسەوە...هتد) تا ببنە شایەت بەسەر خەڵکیەوە (تا بزانن ئەم ئایین و بەرنامەیە هەمووی مایەی خێرو سەربەرزیە بۆ تاك و کۆمەڵ لە هەموو

---

[1] – التوبه: ٣٣
[2] – النحل: ٨٩
[3] – البقرة: ١٤٣

سەردەمێکداو لە هەموو بوارەکانی ژیاندا) و بۆ ئەوەی پێپێغەمبەریش (لە هەموو ئەو بوارانەدا مامۆستاو ڕابەری ئێوە بێت لە ڕۆژی قیامەتدا) شایەتی بدات (بۆ دڵسۆزانی ئوممەتی لەسەر ئەوەی بە ئەرکی سەرشانی خۆیان هەستاون) و ئەو قیبلەو ڕووگەیەش ڕووت تێکردبوو (کە بیت المقدس بوو) گۆڕانکاریشمان بەسەردا هێنا تەنها بۆ ئەوە بوو بزانین و دەربکەوێت، کێ شوێنکەوتەی پێغەمبەر دەبێت و کێش پاشەو پاش هەڵدەگەڕێتەوە، هەرچەندە (گۆڕینی قیبلە) بوو بەهۆی ناڕەحیەتیەکی گەورە، مەگەر لەسەر ئەوانەی خوا دڵیانی دامەزراندبوو و ڕێنموونی کردبوون، بێگومان خوا ئیمان و باوەڕداری و (نوێژتان) بزایە ناکات، چونکە بەڕاستی خوا بۆ خەڵکی، زۆر بە سۆزو بە بەزەیی یە)).

أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَـٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَـٰبِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ قَدْ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكُمْ ذِكْرًا ﴿١٠﴾ رَّسُولًا يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ مُبَيِّنَـٰتٍ لِّيُخْرِجَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ مِنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعْمَلْ صَـٰلِحًا يُدْخِلْهُ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ قَدْ أَحْسَنَ ٱللَّهُ لَهُۥ رِزْقًا.[1]

واتە((دڵنیاین خوا قورئانی بۆ ئێوە دابەزاندووە، هەروەها پێغەمبەرێك کە ئایەتە ڕوونەکانی خواتان بەسەردا دەخوێنێتەوە، تا [illegible] کە [illegible] هێناوەو کردەوە چاکەکانیان ئەنجام داوە لە تاریکیەکان دەریان [illegible] و ڕزگاریان بکات و بیانخاتە ناو نوورو ڕووناکیەوە، جا ئەوەی باوەڕبهێنێت [illegible] خواو کردەوەی چاك ئەنجام بدات، ئەوە دەیخاتە باخەکانی بەهەشتەوە کە چەندەها ڕووبار بەژێر درەخت و بە بەردەم کۆشکەکانیدا دەڕوات و لەوێ ژیانی هەمیشەیی و هەتا هەتایی

[1] - الطلاق: ١٠ ـ ١١

دەبەنە سەر، بێگومان خوا ڕزق و ڕۆزی چاك و پاك و فرەو فراوانی بۆ ئامادە کردوون)).

لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولاً مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ (١٦٤) [1]

واتە((سوێند بێت بێگومان خوا منەتی ناوەتە سەر ئیمانداران کاتێك پێغەمبەرێکی بۆ ڕەوانە کردوون لە خۆیان ئایەتەکانی ئەویان بەسەردا دەخوێنێتەوە، دڵ و دەرونیان پاك و پوخت دەکاتەوە، هەروەها فێری قورئان و دانایيان دەکات، بەڕاستی پێشتر لە گومڕاییەکی ئاشکرادا ڕۆچوو بوون)).

كَمَآ أَرْسَلْنَا فِيكُمْ رَسُولاً مِّنكُمْ يَتْلُواْ عَلَيْكُمْ ءَايَـٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمْ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمْ تَكُونُواْ تَعْلَمُونَ (١٥١) فَٱذْكُرُونِىٓ أَذْكُرْكُمْ وَٱشْكُرُواْ لِى وَلَا تَكْفُرُونِ (١٥٢) [2]

واتە((هەروەکو (بۆ تەواوکردنی نازو نیعمەتم) لە نێوتاندا پێغەمبەرێکم لەخۆتان بۆ ڕەوانە کردوون کە ئایەتەکانی منتان بەسەردا دەخوێنێتەوە، دڵ و دەرون و ڕواڵەت و ئاشکراتان خاوێن دەکاتەوە، فێری قورئان و حیکمەت و داناییتان دەکات، ئەو شتانەتان فێر دەکات کە هەرگیز خۆتان نەتاندەزانی. (دەی کەواتە) ئەی ئیمانداران ئەگەر یادی من بکەن، منیش یادی ئێوە دەکەم و سوپاسگوزاری من بن و سوپاس ناپەرێزو سپڵەیی بەرامبەرم مەکەن)).

لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ [3]

---

[1] ـ آل عمران: ١٦٤

[2] ـ البقرة: ١٥١ ـ ١٥٢

[3] ـ التوبة: ١٢٨

**واتە((سوێند بەخوا بێگومان پێغەمبەرێکتان بۆ ڕەوانە کراوە کە هەر یەکێکە لە خۆتان، زۆر سەختە بەلایەوە تووش بونتان بە بەڵاو ناخۆشی، زۆر بە تەنگیشتانەوەیەو پەرۆشە لە سەرتان، زۆر دڵسۆزی ئیماندارانەو میهرەبان و دلۆڤانە بۆیان)).**

فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾ [١]

**واتە((ئەی موحەمەد) بەهۆی ڕەحمەتی خواوەیە تۆ نەرم و هێمن بویت لەگەڵیاندا، خۆ ئەگەر تورەو قسە ڕەق و بێ بەزەیی بویتایە، ئەوە هەموو لە دەورت بڵاوەیان دەکرد، کەواتە چاوپۆشیان لێبکە و لێیان ببورەو داوای لێخۆش بوونیان بۆ بکە، لەکارو پێشهاتدا پرس و ڕایان پێ بکە، ئەگەر بڕیارتدا (کارێك ئەنجام بدەیت) پشت بەخوا ببەستە، چونکە بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆشدەوێت کە پشتی پێدەبەستن)).**

إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ثَانِىَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِى ٱلْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَـٰحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلسُّفْلَىٰ ۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِىَ ٱلْعُلْيَا ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٠﴾ [٢]

**واتە((ئەگەر ئێوە پشتگیری پێغەمبەر ﷺ نەکەن و یارمەتی نەدەن، ئەوە بەڕاستی خوا پشتگیری کردو سەری خست، کاتێك ئەوانەی بێ باوەڕ بوون دەریان کرد لە شاری مەککەو یەکێك بوو لەو دوو کەسە کاتێك هەردووکیان لەناو**

[١] - آل عمران: ١٥٩

[٢] - التوبة: ٤٠

ئەشکەوتەکەدا بوون (کاتێك بێ باوەڕەکان گەیشتبوونە دەورووبەری ئەشکەوتەکە ئەبوبەکری هاوەڵی خەمی لێهات) پێغەمبەریش ﷺ دڵی دایەوەو پێی وت: خەفەت مەخۆ، دڵنیابە خوامان لەگەڵە، ئەوسا ئیتر خوا ئاسوودەی و ئارامی خۆی دابەزاندە سەری و پشتگیریو بە هێزی کرد بە سەربازانێك کە ئێوە نەتاندەبینین و بەرنامەو ئاینی بێ باوەڕانی دانەواندو ڕیسواتری کرد، بەرنامەو ئایینی خوایش هەمیشە بەرزو بڵندترە، خوایش هەمیشە باڵادەست و دانایە)).

مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ۖ تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا ۖ سِيمَاهُمْ فِى وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ ۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ ۚ وَمَثَلُهُمْ فِى ٱلْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسْتَغْلَظَ فَٱسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعْجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلْكُفَّارَ ۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًۢا ﴿٢٩﴾ [١]

واتە((محمد ﷺ ڕەوانەکراوی خوایە، ئەوانەش کە لە خزمەتیدان و شوێنی کەوتوون توندو تیژن بەرامبەر بێباوەڕان و بە بەزەیی و میهرەبانن لە نێوان خۆیاندا، دەیانبینیت سەرگەرمی نوێژو خواپەرستین، کڕنوش و سوجدە دەبەن، هەردەم ئاواتیان بەدەستهێنانی ڕەزامەندیو پایە بەرزی یە لەلای خوا، نیشانەی چاکیو پاکی لە ناوچەوانیاندا دیارەو دەدرەوشێتەوە لە ئەنجامی سوژدەبردن و خوا پەرستیاندا، جا ئەو بەڕێزانە ئەوە نمونەو پێناسەیانە لە تەوراتدا، نموونەو پێناسەشیان لە ئینجیلدا وەك ڕووەکێك وایە کە لە سەرەتاوە چەکەرە بکات، جا چەکەرەکەی بەهێز کردبێت، پاشان ئەستوور ببێت و ڕابوەستێت لەسەر قەدەکەی، ئەوەندە زوو پێبگات کشتیارەکان سەرسام بکات و پێیان سەیر بێت: چۆن پێگەیی؟ چۆن ئاوا خۆی گرت؟ ! ئەم پێناسەیە بۆ ئەوەیە خوا کافران داخ لەدڵ

---

[١] – الفتح: ٢٩

بکات، جا خوای بەدەسەڵات بەڵێنی بەوانە داوە کە باوەڕیان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە لەوان: کە لێخۆشبوون و پاداشتی گەورەو بێ سنووریان پێببەخشێت)).

﴿ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلْأُمِّيَّ ٱلَّذِى يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَٱلْأَغْلَٰلَ ٱلَّتِى كَانَتْ عَلَيْهِمْ ۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُوا۟ ٱلنُّورَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٥٧﴾﴾[1]

واتە((ئەوانەی کە شوێنی ئەم پێغەمبەرە(محمد ﷺ) هەواڵدەرە نەخوێندەوارە دەکەون ئەوەی کە (گاورو جوو، ناونیشانیان) دەستیان دەکەوێت نووسراوە لای ئەوان لە تەورات و ئینجیلدا، فەرمانیان پێ دەدات بە چاکەو قەدەغەی گوناهو خراپەیان لێدەکات و هەرچیەك پاکو چاکە بۆیان حەڵاڵ دەکات و هەرچی پیس و ناپوختە لێیان حەرام دەکات و ئەرکە قورس و سەنگینەکان لەسەر شانیان لادەبات، ئەو کۆت و زنجیرانەش کەلەریان بوو لای دەبات (وەك خۆ کوشتن لەکاتی تەوبەدا...هتد)، جا ئەوانەی باوەڕیان پێهێناوەو پشتیوانیان لێکردووەو پشتگیریان کردووەو شوێنی ئەو نوورە کەوتوون، (کە قورئانە) و هاوڕێ لە گەڵیدا ڕەوانە کراوە، هەر ئەوانە سەرفرازو ڕزگارن)).

خوای گەورە لەبارەی هاوەڵانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەفەرموێت:

---

[1] ـ الأعراف: ١٥٧

لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلْمُهَـٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلْعُسْرَةِ مِنۢ بَعْدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٍ مِّنْهُمْ ثُمَّ تَابَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّهُۥ بِهِمْ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٧﴾ [1]

**واتە((سوێند بە خوا بەڕاستی خوا تەوبەی قبوڵ کرد لە پێغەمبەرو کۆچبەران و پشتیوانان، ئەوانەی کە شوێنی پێغەمبەر کەوتن لە کاتی سەغڵەتی و تەنگانەدا (لە غەزای تەبووکدا)، دوای ئەوەی کە خەریك بوو دڵی دەستەیەکیان لە خشتە بچێت و (بێزاری دەربڕێت)، لەوەودوا تەوبەو پەشیمانی ئەوانیشی قبوڵ کرد، چونکە بەڕاستی ئەو پەروەردگارە بە سۆزو میهرەبانە لەگەڵیاندا).**

لَّقَدْ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَـٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾ وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا [2]

**واتە((سوێند بە خوا بەڕاستی خوا ڕازیی بووە لەو باوەڕدارانەی کاتێك پەیمانیان لەگەڵدا بەستیت لە ژێر درەختەکەدا خوا خۆیشی ئاگادار بوو بەوەی لە دڵەکانیاندا هەیە (لە نیاز پاکی و دڵسۆزی) هەر بۆیە ئارامی و هێمنی و ئاسوودەیی دابەزاندە سەریان و پاداشتی بە مژدەی سەرکەوتنێکی نزیك دانەوە. هەروەها بەڵێنی چەندین دەستکەوتی زۆری پێداون، کە لە ئاییندەدا دەستیان دەکەوێت و وەری دەگرن، خوا هەمیشەو بەردەوام باڵادەستە بەسەر خوا نەناساندا و دانایەو دەزانێت چ کاتێك ئیمانداران سەر دەخات).**

وَٱلسَّـٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَـٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَـٰنٍ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِي تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾ [1]

[1] – التوبة: ١١٧

[2] – الفتح: ١٨ ــ ١٩

واتە((خوای میهرەبان لەوانەی کە پێشکەوتن و یەکەم کەس بوون لە ئیسلام بوون و خزمەت کردنی ئیسلامدا لە کاروانی کۆچەران و پشتیوانان و ئەوانەی کە بە ڕێکوپێکی شوێنیان کەوتوون، ڕازی بووە و ئەوانیش لەو ڕازی بوون، باخەکانی بەهەشتی بۆ ئامادەکردوون کە چەندەها ڕووبار بە بەردەم کۆشکەکانی و بەژێر درەختەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ نەمریدا بۆ هەمیشەیی تیایدا دەمێننەوە، ئەو سەرەنجامە سەرکەوتنێکی زۆر گەورەیە)).

وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَـٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾ [2]

واتە((ئەوانەی کە پێشتر ماڵ و شوێنی خۆیان ئامادە کرد بۆ پێشوازیی لە کۆچەران و دڵ و دەروونی خۆیان ڕازاندەوە بە ئیمان، ئەوانەشیان خۆش دەوێت کە کۆچیان کردووە بۆ لایان و لە دڵ و دەروونیاندا جێی هیچ جۆرە حەسوودی و بەخیلییەك نابێتەوە (لەسەر ئەوەی کە بەشی کۆچبەران دراوە بەشی ئەوان نەدراوە)، حەز بە بەخشینی دەستکەوتەکان بەوان دەکەن، فەزڵی ئەوان دەدەن بەسەر خۆیاندا هەرچەندە هەژارو نەداریشن، جا ئەوەی خۆی لە نەفسی ڕەزیلی بپارێزێت و زاڵ بێت بەسەریدا، ئائەوانە هەر سەرفرازن)).

ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَـٰبًا مُّتَشَـٰبِهًا مَّثَانِىَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٢٣﴾ [3]

---

[1] – التوبة: ١٠٠

[2] – الحشر: ٩

[3] – الزمر: ٢٣

واتــە((خــوا جــوانترین و پیرۆزتــرین فەرمایــشتی ناردۆتــە خــوارەوە کــە ئــەم قورئانەیـە، (لـە جـوانی داڕشـتندا) بابەتـەکانی لەیـەك دەچـن، هەنـدێك باسیـشی بـە شێوازی جیاواز تیادا دووبارە بۆتـەوە، جا کارکردی ئـەم قورئانـە ئەوەیـە: تـەزوو دەهێنێـت بـە گیـان و پێـستی ئـەو کەسـانەدا کـە ترسـی پـەروەردگاریان لـە دڵ و دەروونیدا هەیە، پاشان گیان و پێست و دڵیان نەرم و ئامادەو چالاك دەبێت بۆ یادی خواو خواپەرستی ئا ئەوە هیدایەت و ڕێنموونیی خوایە کە هەرکەس شایستە بێت هیدایەت و ڕێنموونیی دەکات بۆ ئەو پلەو پایە بەرزانە ئەوەش کە ڕێبازی خوا ون بکات کەس نیە ڕێنموونیی بکات)).

إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِـَٔايَـٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِهَا خَرُّواْ سُجَّدًا وَسَبَّحُواْ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ۩ ﴿١٥﴾ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَـٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ [1]

واتە((بەڕاستی تەنها ئەوانە بڕوا بە ئایەتـەکانی ئێمە دەهێنن، کاتێك یادەوەری دەکـرێن پێـی، خێـرا سـوژدە دەبـەن تەسـبیحات و سوپاسـگوزاری پـەروەردگاریان دەکەن، لە کاتێکدا ئەوانە بە هیچ شێوەیەك فیزیان نیەو خۆیان بە گەورە نازانن. (ئەو ئیماندارە بەختەوەرانە) نیوانیان خۆش نیە لەگەڵ ڕاکشان لە جێگەو ڕێگەی گەرم و نەرما (واتە بە نوێژو خواپەرستی بەشێکی شەو دەبەنەسەر)، هەمیشە نزاو پاڕانـەوەیان ڕوو بـە پەروەردگاریانـە لـە خەشم و قین و دۆزەخـی دەترسـن، ئـاواتی ڕەزامەنـدی و بەهەشـتیان هەیـەو لـەو ڕزق و ڕۆزی و داونـایی و زانیاریـەی پێمـان بەخشیون دەبەخشن. جا هیچ کـەس لەو بەختەوەرانە نازانێت چی بۆ هەڵگیراوەو شاراوەتەوە لە نازو نیعمەتی جۆراو جۆر لای پـەروەردگاری، کە چاوان پێـی گەش

[1] - السجدة: ١٥ ـ ١٧

**دەبنەوەو بە دیتنی شاد دەبن، لە پاداشتی کارو کردەوەی چاك‌و پاکیاندا کە ئەنجامیان دەدا)).**

فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٣٦﴾ وَٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُوا۟ هُمْ يَغْفِرُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلْبَغْيُ هُمْ يَنتَصِرُونَ ﴿٣٩﴾ [1]

مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾ لِّيَجْزِيَ ٱللَّهُ ٱلصَّٰدِقِينَ بِصِدْقِهِمْ وَيُعَذِّبَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ إِن شَآءَ أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٤﴾ [2]

أَمَّنْ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحْذَرُ ٱلْءَاخِرَةَ وَيَرْجُوا۟ رَحْمَةَ رَبِّهِۦ ۗ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٩﴾ [3]

**واتە((ئایا ئەوانەی کە لە ئایەتەکەی پێشوودا وەسفیان هاتووە چاکترن) یـن ئەو ئیماندارەی کە لە دووتوێی شەوگاردا هەڵدەستێت بۆ خواپەرستی، سوژدە دەبات‌و بە پێوە دەوەستێت، لە لێپرسینەوەی قیامەت دەترسێت‌و ئومێدو هیوای بە میهرەبانی پەروەردگاری هەیە، ئەی پێغەمبەر بڵێ: ئایا ئەو کەسانەی کە دەزانن‌و شارەزان، وەك ئەوانەن کە هیچ نازانن‌و شارەزاییان نییە؟، بە ڕاستی تەنها خاوەن بیرو هۆشەکان لەم جۆرە یادەوەریانە سوود وەردەگرن‌و تێدەگەن)).**

[1] - الشورى: ٣٦ - ٣٩
[2] - الأحزاب: ٢٣ - ٢٤
[3] - الزمر: ٩

# باسی پێغەمبەر (ﷺ)و هاوەڵان (رضي الله عنهم) لە کتێبەکانی پێش قورئاندا

ئەحمەد لە عەنائی کوڕی یەسارەوە هێناویەتی دەڵێت: گەیشتم بە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (رضي الله عنه) پێم وت: لەسەر سیفەتی پێغەمبەر (ﷺ) لە تەوراتدا شتێکم پێ بڵێ، ئەویش وتی: بەڵێ سوێند بە خوا لە تەوراتدا بەهەمان سیفەتی لە قورئاندا وەسف کراوە (یا ایها النبي انا ارسلناك شاهدا ومبشرا ونذیرا وحرزا للامیین، انت عبدي ورسولي سمیتك التوکل، لا فظ ولا غلیظ، ولا صخاب في الاسواق ولا یدفع السیئة بالسیئة، ولکن یعفو و یغفر، ولن یقبضه الله حتی یقیموا الملة العوجائ بان یقولوا لا اله الا الله یفتح به اعینا عمیا و اذانا صما و قلوبا غلفا) واتە(ئەی پێغەمبەر ئێمە تۆمان وەك شاهیدو مژدەدەرو ترسێنەرو پارێزەرو سەرخەری نەخوێندەواران ناردووە، تۆ بەندەو پێغەمبەری منیتو ناوم ناویت موتەوەکیل، ڕەقو تووڕەو گرمێنەر نیت لە بازارەکاندا، بەرامبەر بە خراپە وەڵامی خراپەی نابێت، بەڵکو لێبوردنو لێخۆشبوونی هەیە، خوای گەورە نایباتەوە تا گەلی لارو وێر وارێك دەبنەوە دەڵێن لا الە الا الله چەند چاوێکی کوێر پێی دەکرێنەوە، کۆمەڵێ گوێی کەڕو دڵی داپۆشراویش پێی دەکرێنەوە).[1]

بوخاریش بەهەمان شێوە لە عەبدوڵڵاوە هێناویەتی، بەیهەقیش لە ئیبن سەلامەوە بەهەمان شێوە هێناویەتی، لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا تا بەهۆی ئەوەوە گەلی لارو وێر ڕێك دەبنەوە، ئیبن ئیسحاقیش لە کەعبی ئەحبارەوە بەهەمان واتا هێناویەتی، بەیهەقیش لە عائیشەوە (رضي الله عنها) بە کورتی هێناویەتی، وەهبی کوڕی مونەبهیش دەڵێت: خوای گەورە لە زەبووردا سروشی بۆ داود دابەزاندووە: (ئەی داود: لە دوای تۆ پێغەمبەرێك دێت ناوی ئەحمەدو موحەمەدە، ڕاستگۆو گەورەیە، هەرگیز لێی تووڕە نابمو ئەویش هەرگیز لە من بێزار نابێت، پێش ئەوەی لێم یاخی بێتو لابدات لە تاوانی پێشو پاشی

---

[1] - صحیح

خۆش بووم، ئوممەتەکەشی ڕەحمیان پێ دەکرێت و لە سوننەتەکاندا چیم بە پێغەمبەران داوە بەوانیشی دەدەم، ئەو فەرزانەی لەسەر پێغەمبەران دامناوە لەسەر ئەوانیش دامناوە تا لە ڕۆژی دواییدا هاتن بۆلام ڕووناکییان وەك ڕووناکی پێغەمبەران وابێت – ئەی داود- من فەزڵی موحەمەد و ئوممەتەکەیم داوە بەسەر هەموو ئوممەتەکاندا.[1]

ئەبو نەعیم لە (الحلیة ج٥ص ٣٨٦ )دا لە سەعیدی کوڕی ئەبو هیلالەوە هێناویەتی کە عەبدوڵلای کوڕی عەمر بە کەعبی وتووە: لە بارەی سیفەتی موحەمەد (ﷺ) و ئوممەتەکەیەوە هەواڵم پێ بدە، ئەویش وتی: لە کتێبی خوای گەورەدا وام لەسەر خوێندوونەتەوە (ئەحمەد و ئوممەتەکەی زۆر سوپاس گوزارن و لەسەر هەموو چاکە و خراپەیەك سوپاسی خوای گەورە دەکەن و لەسەر هەموو شەرەفێك خوای گەورە بە گەورە ڕادەگرن، لە هەموو شوێنێکدا زکری خوا دەکەن (سبحان الله) لە ئاسماندا دەنگ و بانگەوازیان دەنگێکی نەرمی هەیە کە لە نوێژیاندا دەیڵێن وەك دەنگی هەنگ لەسەر بەرد، وەك ڕیزی فریشتەکان ڕیز دەبەستن بۆ نوێژ، لە شەڕیشدا وەك ڕیزی نوێژیان ڕیز دەبەستن، ئەگەر لە پێناو خوادا غەزاو شەڕیان کرد فریشتەکان لە بەرو دواوە بە ڕمی توندو تیژەوە لەگەڵیان دەبن، ئەگەر لەپێناو خوادا ئامادەی ڕیز بن خوای گەورە بەریان بۆ دەگرێت وەك چۆن سیسارك (باڵندەیەکی گەورەیە) بەردەگرن بەسەر هێلانەکەیاندا، هەگیز لە کشان دواناکەون). هەروەها بە سەنەدێکی دیکە لە کەعبەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی و ئەمەشی تێدایە (ئوممەتەکەی زۆر سوپاس گوزارن و لە هەموو بارێکدا سوپاسی دەکەن و لە هەموو شەرەفێك زیاتر گەورەی ڕادەگرن، چاودێری خۆر دەکەن و پێنج نوێژەکەیان بەجێدەگەیەنن لە کاتی خۆیاندا تەنانەت ئەگەر لەسەر زبڵدانێکیش بن خۆیان دادەپۆشن و چواردەوریان پاك دەکەنەوە). هەروەها بە سەنەدێکی دیکە لە کەعبەوە بەدوورو درێژی هاتووە.[2]

## فەرمووده لەسەر سیفەتی پێغەمبەر (ﷺ):

---

[1] – لەالبدایة والنهایة)شدا ج٢ص٣٢٦دا هاتووە.

[2] – ضعیف

یەعقوبی کوڕی سوفیانی سەورییە فەرموودەناس لە حەسەنی کوڕی عەلیەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی کە دەڵێت: پرسیارم کرد لە هیندی کوڕی ئەبو هالەی خاڵم کە بە چاکی وەسفی پێغەمبەر (ﷺ)ی دەکردو منیش تامەزرۆ بووم شتێکم بۆ وەسف بکات تا منیش وەك ئەو بم، ئەویش وتی: ((پێغەمبەر (ﷺ) زۆر شکۆدار بوو، وەك درەوشانەوەی مانگی چواردەشەو دەدرەوشایەوە، کەمێك لە مامناوەندی باڵای بەرزتر بوو، لە کەتەو قەبەیش باڵای کەمتر بوو، شانو شکۆی زۆر بوو، ڕەنگی درەوشاوە بوو، قژی جۆرە شکانەوەیەکی هەبوو کاتێك دەدرا بەلادا جیا دەبوویەوە ئەگەرنا وانەبوو، قژی لە نەرمایی گوێی لایدەدا، قژی پڕبوو، ڕەنگی درەوشاوە بوو، تەوێڵو ناوچەوانی پانو کراوە بوو، بڕۆو برژانگی کەوانەیی و چڕبوونو لە یەك نزیك نەبوو، لووتی کەمە بەرزیەكو نیمچە درێژ بوو، ڕووناکیەك بە سەریەوە بوو، هەرکەس لێی ورد نەبوایەتەوە وای دەزانی بەرزە، ڕیشی چڕو پڕبوو، چاوی زۆر ڕەش بوو، ڕوومەتی تەخت بوو، دەمی سیمانو بەکار بوو، دەموودانی جوانو پاراو بوون، دانەکانی شاش بووە، ملی وەك ئەوەی لە زیو داتاشرابێت، مامناوەند بوو، جەستەیەکی یەکانگیر، سنگو سکی ڕێکی یەك بوو، سنگی فراوانو پان بوو، نێوانی شانەکانی زۆر بوو، سەرە ئێسقانەکانی گەورە بوون، سەری جومگەی ئێسقانەکانی گەورە بوو، زۆر نوورانی بوو، هێڵێکی مووی نەرم ناوكو سەرسنگی پێکەوە دەبەستەوە، سكو هەردوو مەمکی بێ موو بوون، قۆڵو شانی و سەرەوەی سنگی مووی زۆر بوو، قۆڵی درێژ بوو، ناولەپی پان و قژی خاوبوو، دەستو قاچی گۆشتن و پەنجەکانی شمشاڵی بوون، بازنەی چێر پێیشی زۆر بەرز بوو، پێکانی قلیشو شکانیان نەبوو، کە دەڕۆیشت پێکانی چاك هەڵدەگرت (نەوەك بە نازەوە بەرزیان بکاتەوە) لێهاتوانە هەنگاوی دەنا و لەسەرخۆ دەڕۆیشت، لە ڕۆشتنیدا خێرا دەڕۆیشت وەك ئەوەی لە بەرزاییەکەوە بەرەو خوار پێی دابنێت، کە لای دەکردەوە بە هەموو جەستەیەوە لای دەکردەوە، سەیرکردنی بۆ زەوی لە سەیرکردنی بۆ

ئاسمان زیاتر بوو، زۆربەی سەیرکردنی تێبینی بوو، لەگەڵ هاوەڵانیدا دەچوو، هەرکەسی پێ بگەیشتایە ئەم پێشتر سەلامی دەکرد)).

منیش وتم دەی وەسفی مەنتیقیم بۆ بکە، وتی (پێغەمبەر ﷺ هەمیشە خەمی هەبوو، بەردەوام بیری دەکردەوە حەسانەوەی نەبوو، پێویست نەبوایە قسەی نەدەکرد، زۆر بێدەنگ دەبوو، بەلا لێوەکانی دەستی دەکرد بە قسەو کۆتایی پێ دەهێنا، قسەکانی کۆدەکردەوەو پوخت دەدواو زیادەو کەمیان نەبوو، نەرمونیان بوو، ڕەق و وشك و سوکایەتی پێکەر نەبوو، بەخششی بە گەورە دادەنا باکەم و ورد بوایە، هیچ کات تانەو تەشەری لێ نەدەدا، نەدەکەوتە پیاهەڵدان، دونیا و ئەوەی لەسەر دونیا بوو تووڕەی نەدەکرد، لەبەردەم هەقدا تووڕە نەدەبوو تا ئەوەی هەق سەربخات، ئەگەر هەق بهاتایەتە ڕێی کەسی نەدەناسی، بۆ تووڕەیی خۆی هیچی نەهێشتبوویەوە مەگەر بۆ سەرخستنی هەق، بۆ خۆی تووڕە نەدەبوو، ئەگەر ئاماژەی بکردایە بە هەموو دەستی ئاماژەی دەکرد، ئەگەریش سەرسام بوایە هەڵیدەگێڕایەوە، ئەگەر قسەی بکردایە دەستەکانی دەگەیاندە یەك و بەبەری دەستی ڕاستی دەیدا بەناو پەنجەمۆری چەپیدا، ئەگەر تووڕە بوایە بە تەواوەتی وازی دەهێنا، ئەگەریش خۆی بوایە دەم و دانی پێوە دەدا، ئەوپەڕی پێکەنینی زەردەخەنە بوو، کە پێدەکەنی گەوهەرلە دەمی دەباری، حەسەن دەڵێت ماوەیەك دەمشاردەوە لە حەسەنی کوڕی عەلی، دواتر بۆم باسکرد، کەچی سەیر دەکەم پێشم کەوتووەو چوو بوو ئەوەی من لێم پرسی پێشتر لێی پرسیبوو، دەبینم پرسیاری کردبوو لە باوکی سەبارەت بە هاتنە ژوورەوەو دەرچوون و دانیشتن و شێوەو دیمەنی و هیچی نەهێشتبوویەوە (هیچی بیر نەچوو بوو).

حەسەن دەڵێت پرسیارم کرد لە باوکم لەسەر چوونە ژوورەوەی پێغەمبەر ﷺ ئەویش وتی: (چوونە ژوورەوەی خۆی بە مۆڵەت بوو، کاتێك دەچوویەوەماڵەوە چوونە ژوورەوەی دەکرد بە سێ بەشەوە، بەشێکی بۆ خوا، بەشێکی بۆ ماڵ و خێزانی، بەشێکی بۆ خۆی، پاشان بەشەکەی خۆی لە نێوان خۆی و خەڵکدا

دابەشـکردبوو ئـەوەی بـۆ خـەڵکی گـشتیو تایبـەت دەگێڕایـەوەو بـێ دڵـی نەدەکردن،شتێکی ناو ژیانی لە بەشی ئوممەتدا ئەوە بوو لەگەڵ خەڵکی خاوەن فەزڵدا ڕێزی زۆری دەنواندو بەپێی گەورەییو فەزڵیان لە ئاییندا دابەشی دەکردن، هەیانبوو پێویستیەکی هەبوو، هەیانبوو دوو پێویستی هەبوو، هەیانبوو چەند پێویستیو کاری هەبوو، ئەویش لەگەڵیان سەرقاڵ دەبوو و سەرقاڵی دەکردن بەشتێکەوە کە خۆیانو ئوممەتیش وەك پرسیارلێکردنیانو هەواڵپێدانیان کە دەبێت چی بکەنو چۆن بن، دەشیفەرموو با ئەوەتان ئامادەیە ئەمە بڵێت بەوەتان کە ئامادە نیە، کارو پێویستی کەسێکم پێ بگەیەنن کە خۆی نەتوانێت بیگەیەنێت، چەنکە هەرکەس پێویستیو قسەی کەسێك بگەیەنێتە دەسەڵاتدارێك کە ئەو کەسە خۆی نەتوانێت بیگەیەنێت خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا پێکانی چەسپاو و سەقامگیر دەکات تەنها ئەوی لا باس دەکرێتو ڕێگە نادرێت کەسانی دی جگە لەو بچن بۆ لایو بەحەزی خۆیان نەبێت جیانابنەوە، کە دەریش دەچن بە لێزانیو پێگەیشتووییەوە دەچن.

حەسەن دەڵێت: پرسیارم لێکرد لەسەر دەرچوونی ئایا چۆن بوو چی دەکرد؟ وتی: (پێغەمبەر ﷺ زمانی لەسەر شتێك بەكار دەهێنا کە جێی بایەخو گرنگیو دڵ ڕاکێشانیان بێتو نەیان ڕەنجێنێت، ڕێزی کەسی بە ڕێزی هەردەستەو هۆزێك (یان خێڵ یان نەتەوە) دەگرتو بە بەرپرسی ئەوانی دەزانی، خەڵکی هۆشیار دەکردەوەو بێداری پێدەدان بەبێ ئەوەی ڕووی گەشو زەردەخەنەیان لە ڕوودا هەڵبگرێتو ئاکاری خۆی بگۆڕێت، بەناو هاوەڵانیدا دەگەڕاو پرسیاری لەسەر باری خەڵك دەکرد،لەگەڵ چاکەکاردا چاك بوو و پاڵپشتی دەکرد، خراپیشی بەخراپ دەزانیو، بەکەمو سوکی دەزانی، میانەڕەو و دوور لە ناکۆکی بوو، لە ترسی ئەوەی خەڵك بێئاگابن لابدەن بە شوێنێکی دیکەدا بێئاگا نەدەبوو، لەهەر بارێکدا ئامادەباشیو شتێکی هەبووکە بۆی گونجاو و شیاو بوو، بەرامبەر بە هەق کەمتەرخەمیو لادانی نەبوو، ئەوانەی لەگەڵی بوون چاکترینی خەڵك بوون،

گەورەترینیان لای ئەوە بوو کە پشکی ئامۆژگاری زیاتر بوو، پایەدارترین کەسیان ئەوە بوو کە زیاتر بەدەمەوە بوون و هاریکاری هەبوو).

دەڵێت: پرسیارم لێکرد لەسەر دانیشتنی ئایا چۆن بوو؟ وتی: (پێغەمبەر ﷺ دابنیشتایە یان هەستایە بەردەوام زیکری دەکرد، لەسەرە ڕێکاندا دانەدەنیشت و دوورەپەرێزی دەکرد لەوێدا دابنیشن، ئەگەر بچوایەتە ناو خەڵکیەوە لە کوێدا کۆڕی دانیشتنەکە تەواو دەبوو لەوێ دادەنیشت و فەرمانیشی دەکرد وابن، پشکی بەهەر یەك لە کەسانی دانیشتووی دەوری دەدا، ئەوانەی لەگەڵی دادەنیشتن کەسیان واهەستی نەدەکرد کەسیتر هەبێت لەو لای پێغەمبەر ﷺ بەڕێزتر بێت، هەرکەس لەگەڵی دابنیشتایە یان لە پێویستیەکدا لە ڕووی بوەستایە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵیدا خۆڕاگری بەکاردەهێنا تاکەسی بەرامبەر دەچوو و وازی دەهێنا، هەرکەس لەسەر پێویستیەك پرسیارێکی لێ بکردایە یان داوایەکی هەبوایە ئەو پێویستیەی پێ دەدا یان وەڵام و قسەیەکی سادەی پێشکەش دەکرد، کراوەیی و ئاکاری هەموانی گرتبوویەوە و ببوو بەباوکێك بۆیان و ئەوانیش لای پێغەمبەر ﷺ لەحەقدا بەیەکسانی سەیر دەکران و هەمان مافیان هەبوو، کۆڕی ئەو کۆڕی نەرم و نیانی و شەرم و خۆڕاگری و دڵنیایی بوو، تیایدا دەنگ بەرزنەدەبوویەوە، سنوورشکێنی نەدەکرا، نەرموونیان بوون، ڕێزی گەورەیان دەگرت و سۆزیان بۆ بچووك هەبوو، پێویستی کەسی خاوەن پێویستیان دابین دەکرد و کەسی نامۆ و بێگانەیان دەپاراست).

دەڵێت پرسیارم لێکرد لەسەر ئەوانەی لەگەڵی دادەنیشتن، وتی: (پێغەمبەر ﷺ هەمیشە لێو بەخەندە بوو، ئاکاری نەرم و ساکار بوو، نەرموونیان و دوور لە ڕەقی و توندی و پیاهەڵشاخین و هاوارکردن و جنێودان و ڕەخنەگرتن و ڕابواردن بوو، لەسەر شتێك کە حەزی لێ نەبوایە خۆی بێئاگا دەکرد و کەسی خوازیاری ئەوەی بێ هیوا نەدەکرد لەوشتە، خۆی لە شت بەدوور دەگرت، نەچوونە ژێربار، زێدەڕۆیی، شتی بێ مانا(یان بڵێین ئەوەی لای گرنگ نەبوو)، بۆ خەڵکیش سێ شت هەبوو کە خۆی لێی بەدوور

دەگرت، قسەی (بە خراپە) لەسەر کەس نەدەکردو تانەی لێ نەدەدا، حەزی نەدەکرد عەیب و کەم و کورییەکانی دەرکەون، تەنها لەسەر شتێك قسەی دەکرد کە هیوای پاداشت و چاکەی هەبوایە، کاتێك قسەی دەکرد هاوەڵانی بێدەنگ دەبوون و وەك ئەوەی باڵندە بەسەر سەریانەوەە نیشتبێتەوە، کە بێدەنگ دەبوو ئەوان قسەیان دەکردو ناکۆکی و ڕکەبەرییان لەلای ئەودا نەدەنواند، لە چیدا ئەوان پێبکەنیبان ئەویش پێدەکەنی، بەچی سەرسام بوونایە ئەویش سەرسامی دەنواند، ڕەقی قسەو پرسیارکردنی لە کەسی بێگانە قبوڵ دەکردو لەسەری خۆ ڕاگربوو تا ئەوەی هاوەڵان سەریان سوڕدەما لەو مەنتیقە، دەیفەرموو ئەگەر کەسێکتان بینی پێویستیەکی هەبوو یارمەتی بدەن و ڕێنموونی بکەن، دەستخۆشی لە دەستگرۆ قبووڵ نەدەکرد، قسەی کەسی نەدەبڕی تا مۆڵەتی لێوەردەگرت و بە کۆتایی پێهێنان یان هەڵستان قسەکەی پێ دەوەستاند).[1]

دەڵێت پرسیارم لێکرد لەسەر بێدەنگبوونی، وتی:(بێدەنگبوونی لەسەر چوار بنەما بوو، نەرموونیانی، هۆشیاری و بێداری، ڕێزگرتن و لەبەرچاوگرتن، بیرکردنەوە، سەبارەت بە سێیەمیان ڕوانین و گوێگرتنی بوو لە نێوان خەڵکدا بە یەکسانی، سەبارەت بە بیرکردنەوەشی لەسەر ئەوەی ماوەو چووە بوو، پێغەمبەر ﷺ نەرمونیانی و خۆڕاگریشی پێکەوە هەبوو، هیچ توورەو هەڵەشەی نەدەکرد، لەسەر چوار شت هۆشیارو بێدار بوو، ئەنجامدانی چاکەو ئەنجامدانی کارێك بۆیان کە دونیاو دواڕۆژیشیان بۆ کۆبکاتەوە).[2][3]

---

[1] - ضعيف.

[2] - ضعيف.

[3] - ترمذي ئەم فەرموودەی بەدوورو درێژی لە (الشمائل) دا لە حەسەنی کوڕی عەلیەوە (ڕەزای خوا لە هەردووکیان) هێناوە، دەڵێت پرسیارم کرد لە خاڵم، ئینجا دەیهێنێت، تیایدا فەرموودەکەی هێناوە کە لە حەسەنی برایەوە لە عەلی کوڕی ئەبو تالیبی باوکیەوە هێناویەتی، بەیهەقیش لە (الدلائل)دا لە حاکمەوە بە سەنەدەکەی لە حەسەنەوە هێناویەتی کە دەڵێت پرسیارم کرد لە هیندی کوڕی ئەبو هالەی خاڵم، ئینجا فەرموودەکە دێنێت، هەروەك زانای فەرموودەناس ئیبن کەسیر لە (البداية والنهاية ج٦ ص٣٣)دا هێناویەتی. منیش دەڵێم: حاکم لە (المستدرك في الصحيحين) دا (ج٣ص٦٤) سەنەدی ئەم فەرموودەی

## ((ئەثە رەكان لەسەر سیفەتی هاوەڵانی بەڕێز (ﷺ)))

ئیبن جەریرو ئیبن ئەبی حاتەم لە سوددیەوە سەبارەت بە فرمایشتی خوای گەورە (كنتم خير امة اخرجت للناس) هێناویانە كە دەڵێت: عومەڕی كوڕی خەتاب (ﷺ) وتی: ئەگەر خوا بیویستایە دەیوت (انتم) ئەوكات هەموومان دەبووین، بەڵام فەرمووی (كنتم) ئەمە تایبەتە بە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) و ئەوانەی وەك ئەوان دەكەن و چاكترین ئوممەتن بۆ مرۆڤایەتی، لای ئیبن جەریرو قەتادە (ﷺ) هاتووە: بۆی باس كردووین عومەری كوڕی خەتاب (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێند (كنتم خير امة اخرجت للناس) پاشان وتی: خەڵكینە، كامتان حەز دەكات یەكێك بێت لەو ئایەتە با ئەو مەرجانە بەجێ بگەیەنێت كە خوای گەورە تیایدا دایناون.[1]

ئەبو نەعیم لە (الحلية ج١ ص٣٧٥) لە ئیبن مەسعودەوە (ﷺ) هێناویەتی كە دەڵێت: خوا سەیری دڵی بەندەكەی كردو كۆمەڵێك هاوەڵی بۆ هەڵبژاردو بەو پەیامەوە ناردی و بە زانستی خۆی هەڵیبژارد، پاشان سەیری دڵی خەڵكی كردو كۆمەڵێك هاوەڵی بۆ هەڵبژاردو كردنی بە پشتیوانی ئایینەكەی و وەزیرانی

---

هێناوەو دواتر فەرمووده‌كەی بە دوورو درێژی هێناوە، ڕەویانی و تەبەرانی و ئیبن عەساكیریش هێناویانە، هەروەك لە (كنز العمال ج٤ ص٣٢)دا هاتووە، بەغەویش هێناویەتی، هەروەك لە (الاصابة ج٢ ص٦١١)دا هاتووە، ئەوەی كنز العمال لە كۆتاییەكەیدا هاتووە دەڵێت (لە چوار شتدا هۆشیاری و بێداری وەردەگرت: چاكەكاری تا پێشەنگی پێوە بكرێت، وەلانانی خراپە تا خەڵكی دوورەپەرێزی لە خراپە بكەن. ڕاو ئیجتیهاد لەوەی بۆ بەرژەوەندی ئوممەتەكەی بەباشی دەزانی، ئەنجامدانی كارێك كە دونیاو دواڕۆژیش بۆ موسوڵمانان كۆ بكاتەوە) لە (الجمع ج٨ ص٢٧٥)دا لە تەبەرانیەوە بەهەمان شێوە هاتووە.

[1] – لە (كنز العمال ج١ ص٢٣٨)دا هاتووە.

پێغەمبەرەکەی (ﷺ)، جا ئەوەی باوەڕداران بەباشی دەزانن باشەو ئەوەش ئەوان بە خراپ و ناشیرینی دەزانن خراپ و ناشیرینە.[1]

ئەبو نەعیمیش لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: هەرکەس سوننەت دەگرێتەبەر با سوننەتی ئەوانە بگرێتەبەر کە مردوون، ئەوانە هاوەڵانی موحەمەدن (ﷺ) چاکترینی ئەم ئوممەتە بوون،چاکترین دڵ و قوڵترین و چڕو پڕترین زانست و کەمترین ئەرکیان هەبوو، خوای گەورە بۆ هاوەڵێتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) و گواستنەوەی ئایینەکەی هەڵیبژاردن، بۆیە خۆتان بچوێنن بە ئاکارو ڕێو شوێنیانەوە، چونکە ئەوانە هاوەڵانی موحەمەد (ﷺ) بوون و لەسەر ڕێی ڕاست بوون سوێند بە پەروەردگاری کەعبە.[2]

هەروەها ئیبن مەسعود(رضي الله عنه)هێناویەتی دەڵێت: ئێوە لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) زیاتر بە ڕۆژوون و نوێژدەکەن و ئیجتیهاد دەگرنەبەر، ئەوانیش چاکترینی ئوممەت بوون، وتیان بۆچی ئەی ئەبو عەبدولڕەحمان، وتی: چونکە دونیا نەویستتر بوون و زیاتر حەزیان بە ڕۆژی دوایی هەبوو،[3]، هەروەها لە ئەبوو وائیلەوە هێناویەتی دەڵێت: عەبدوڵڵا گوێی لە کەسێك بوو دەیوت: کوان ئەوانەی دونیا نەویست و دواڕۆژ ویستن؟ عەبدوڵڵا وتی: ئەوانە هاوەڵان بوون، پێنج سەد موسوڵمانیان مەرجیان کرد تا نەکوژرێن نەگەڕێنەوە، سەری خۆیان بەرەو ڕووی دوژمن چوون، هەموویان کوژران تەنها ئەوە نەبێت هەواڵی هێنایەوە.[4]

---

[1]-ئیبن و عەبدولبیر لە (الاستیعاب ج١ ص٦)دا لە ئیبن مەسعودەوە (رضي الله عنه) بەو واتایە هێناویەتی، بەڵام ئەمەی تێدا نی یە: ئەوەی باوەڕداران.....تاکۆتایی، تەیالیسیش (ص٣٣) هەمان شێوەی فەرموودەکەی ئەبوونەعیمی هێناوە.

[2] – لە الحلية ج١ ص٣٠٥دا هاتووە.

[3] – لە الحلية ج١ ص١٣٦دا واهاتووە.

[4] – لە (حلية الاولياء ج١ ص١٢٥)دا هاتووە.

هەروەها ئیبنو عومەر (ﷺ) هێناویەتی کە گوێی لە کەسێك بوو دەیوت: کوان دونیا نەویستان و دواڕۆژ ویستان؟ ئەویش گۆڕەکەی پێغەمبەر (ﷺ) و ئەبوبەکرو عومەر (ﷺ)ی نیشاندا وتی پرسیار لەسەر ئەمانە دەکەیت؟.[1] ئیبن ئەبی دونیا لە ئەبو ئەراکەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ عەلیدا (ﷺ) نوێژی بەیانیم کرد، کاتێك لای کردەوە بەلای ڕاستیدا وەك جۆرە ماندووبوونێك ڕاوەستا، تا ئەوەی خۆر هێندەی ڕمێك لەسەر دیواری مزگەوتەوە بوو، دووڕکات نوێژی کرد، پاشان دەستی هەڵگێڕایەوەو وتی: سوێند بەخوا هاوەڵانی موحەمەدم (ﷺ) بینیون، ئەمڕۆ هیچ نابینم لەوان بچێت، ئەوان بەیانیان دەکردەوە بە زەرد هەڵگەڕاوی، پشێوی و شێواوی، تەپوتۆزاوی، نێوچاوانیان ماندوو ئەبوو، بە سوجدەو نوێژ کردنەوە لە بەردەم خوادا بوون، قورئانیان دەخوێند، هەڵدەسان و دادەنیشتن تا بەیانی دەهات یادی خوایان دەکردو وەك چۆن درەخت لە ڕۆژی ڕەشەبادا دەبزوێت ئاوا دەجوڵان، چاوەکانیان فرمێسکیان دەکرد تا کراسەکانیان تەڕ دەبوون، سوێند بەخوا دەڵێیت ئەم خەڵکە بێئاگا کەوتوون، پاشان هەستاو نەبینرا دوای ئەوە پێ بکەنێت تا ئیبن مولجەمی دوژمنی فاسقی خوای گەورە کوشتی.[2].

ئەبو نەعیم لە ئەبو صالحەوە هێناویەتی دەڵێت: ضراری کوڕی ضەمرەی کەنانی چوو بۆ لای موعاویە پێی وت: وەسفی عەلیم بۆ بکە ئەویش وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ڕێم بدە نەیڵێم، وتی: نا ڕێت نادەم ئەویش وتی دەی چار نیە، سوێند بەخوا دوور بین و بەهێز بوو، بە یەکلایی قسەی دەکردو بە دادپەروەری حوکمی دەدا، لە هەموو لاوە زانستی لێ دەڕژاو زۆر لە دونیاو خۆشیەکانی دونیا دەترسا، بەشەو و تاریکی شەو ئارامی دەگرت، سوێند بەخوا پڕ پەندو بەئەزموون بوو

[1] - لە (الحلیة ج١ ص ٣٠٧)دا هاتووە.

[2]- لە (البدایة والنهایة ج٨ ص٦)دا هاتووە، ئەبو نەعیمیش لە (الحلیة ص٧٦)و دەینەوەری و عەسکەری و ئیبن عەساکیرو لە (کنز العمال ج٨ ص ٢١٩)یشدا وا هاتووە.

بیرکردنەوەی دوورو درێژ بوو، دەستی هەڵدەگێڕایەوەو خۆی دەدواند، بەکراسی کورت و خواردنی سادەو ناگران سەرسام بوو، سوێند بەخوا کە دەچووین بۆلای وەك هەریەکێکی ئێمە لێمان نزیك دەبوویەوەو ئەگەر پرسیارمان لێکردبایە وەڵامی دەداینەوە، لەگەڵ نزیك بوونەوەی لێمان و نزیکی خۆیشی لێمان لەبەر سام و بیمی نەماندەدواند، کە زەردەخەنە دەکەوتە سەر لێوی وەك لوئلوئی درەوشاوە بوو، ئاییندارانی بەرز ڕادەگرت، هەژارانی خۆش دەویست، کەسی بەهێز هیوای نەبوو ئەم بە ستەم ئیشی بۆ بکات، کەسی لاواز لە دادپەروەری بێ هیوا نەدەبوو، خوا بە شاهید دەگرم لە هەندێ هەڵوێست و باریدا بینیومە- شەو تاریکی خۆی دادابوویەوەو ئەستێرەکان ئۆغریان کردبوو- لە میحرابەکەیدا ڕیشی خۆی دەگرت و وەك کەسی پێوەدراو نووزەی دەهات، وەك کەسی خەمبار دەگریا، وەك ئەوەی ئێستا گوێم لێی بێت کە دەیوت: پەروەردگارا! پەروەردگارا! لەبەردەمیدا هەڵدەکروزا، دوایی بە دونیای دەوت: ئەرێ دەتەوێت من سەرکەش کەیت؟ بۆ من لێنەویت؟ ئەی هاوار، بڕۆ بۆ کەسی تر، من سێ تەڵاقەم داویت و تەمەنت کەم و کورت و سووکەو مەترسیت سادەیە، ئاه، ئاه لە کەمی کوڵ و توێشوو و دووری سەفەرو ترسناکی ڕێ، ئەوکات فرمێسکەکانی موعاویە دابارین بەسەر ڕیشیداو خۆی پێ نەگیراو بە سەرقۆڵەکەی دەیسڕین، هەموو کەوتنە گریان، ئەو کات موعاویە وتی: ئەی ضرار ئەبو حەسەن وابوو، وەضع و حاڵت چۆنە بۆی؟ وتی: وەك کەسێك یارەکەی لەماڵەکەیدا سەر ببڕێت فرمێسکی وشك نابێتەوەو خەفەتی دانامرکێتەوە، پاشان هەستاو چوو[1][2].

---

[1] – ضعيف.

[2]– هەروەها ئیبن عەبدولبیر لە (الاستیعاب ج٣ ص٤٤)لە حرمازیەوە – پیاوێکی خەڵکی هەمەدان – لە ضراری صەدائیەوە بەهەمان واتا هێناویەتی.

ئەبو نەعیمیش لە قەتادەوە هێناویەتی دەڵێت: پرسیار لە ئیبن عومەر (رضي الله عنهما) کرا ئایا هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێدەکەنین؟ وتی: بەڵێ، ئیمانی ناو دڵیشیان لە شاخەکان گەورەتر بوو،[1]

حاکم لە (المستدرك ج٣ ص٢٦٤)دا لە ئەبو سەعیدی مەقبەریەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك ئەبو عوبەیدە (رضي الله عنه) بریندار کرا، وتی موعاز بەرنوێژی بۆ ئەو خەڵکە بکە، موعازیش بەرنوێژی بۆ کردن، پاشان ئەبو عوبەیدەی جەراح مردو موعاز هەستا و لەناو خەڵکەکەدا وتی: خەڵکینە بگەڕێنەوە بولای خوای گەورەو تەوبە لەسەر تاوانەکانتان بکەن، تەوبەیەکی یەکجارەکی، چونکە هەربەندەیەك بە تەوبەکردن لە تاوانیەوە بگاتەوە بە خوا ئەوا مافی بەسەر خواوە هەیە لێی خۆش بێت، پاشان وتی: ئێوە ئەی خەڵکینە کەسێکتان لەدەستدا (مەبەستی ئەبو عوبەیدە بوو) بانگەشە نیە ئەگەر بڵێم سوێند بەخوا هیچ بەندەیەکی خوام نەبینیوە تەمەنی کەم‌و سنگی پڕ خێرو جۆش سەندووی دونیا نەویست و خۆشەویستی بۆ دوا ڕۆژو ئامۆژگاری بۆ هەموان هەبێت وەك ئەو، سۆزتان بۆی هەبێت‌و دوای بچن بۆ دەرەوە تا نوێژی لەسەر بکەن. سوێند بە خوا دوای ئەو کەسی وەك ئەو کارو بارتان ناگرێتە دەست، خەڵکی کۆبوونەوەو ئەبو عوبەیدە(رضي الله عنه) برایە دەرەوەو موعازیش (رضي الله عنه) چوو نوێژی لەسەر کرد تا بردیانە لای گۆڕەکەی، موعازی کوڕی جەبەل‌و عەمری کوڕی عاص‌و زەحاکی کوڕی قەیس چوونە ناو گۆڕەکەی، کاتێك لەناو گۆڕەکەیدا دایاننا‌و هاتنە دەرێ‌و خۆڵیان بەسەردا کرد موعازی کوڕی جەبەل وتی: ئەبو عوبەیدە هەمیشە چاکەت دەڵێم‌و هیچی ناهەق‌و باتڵ ناڵێم/ دەترسم

[1] - لە (الحلیە ج١ ص٣١١)دا هاتووە، هەنادیش لە سەعیدی کوڕی عومەری قورەیشیەوە هێناویەتی عومەر (رضي الله عنه) دەستەیەکی خەڵکی یەمەنی دی کە کوڵەکەیان پێستە بوو، وتی: کێ حەز دەکات بڕوانێتە کەسانێك کە لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەچن با سەیری ئەوانە بکات، لە کنز العمال ج٧ ص١٦٣ دا بەو جۆرە هاتووە.

ڕق و تووڕەیی خوام تووش بێت، سوێند بە خوا تۆم دی وەك كەسی زیكر كەری خوا كە زۆر زیكر بكات و لەسەر بەسەر زەویدا بچێت و ئەگەر نەفامان دواندیان بڵێت سەلام و بەخشندەبێت و زێدەڕۆیی نەكات و پیسكە نەبێت و لەو نێوەندەدا ڕاست بێت، سوێند بە خوا تۆ یەكێك بوویت لەوانەی نەرم و نیان و خاكی بوویت و سۆزت بۆ هەتیو و هەژاران هەبوو و ڕقت لە ناپاكان و خۆبەزلزانان بوو.

تەبەرانی لە ربعیەوە لە خەراشەوە هێناویەتی دەڵێت: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس (رضي الله عنه) مۆڵەتی لە موعاویە (رضي الله عنه) وەرگرت، كەسانی ناو قورەیش لای بوون و سەعیدی كوڕی عاصیش لەلای ڕاستیەوە دانیشتبوون كاتێك موعاویە بینی وا دێت وتی سەعید سوێند بەخوا كۆمەڵێك پرسیار بەرەو ڕووی ئیبن عەبباس (رضي الله عنه) دەكەمەوە كە بەدەست وەڵامیانەوە گیر بخوات، سەعیدیش پێی وت: كەسی وەك ئیبن عەبباس بەدەست پرسیاری تۆوە گیر ناخوات، كاتێك دانیشت موعاویە پێ وت: سەبارەت بە ئەبوو بەكر چی دەڵێیت؟ وتی: ڕەحمەتی خوا لە ئەبوبەكر، سوێند بەخوا قورئان خوێن بوو دوورە ئارەزوو ویستی بوو، لە داوێن پیسی دوورو بێ داڵغە بوون، لە خراپە دوورەپەرێزی دەكرد، ئایینەكەی خۆی دەناسی، لەخوا دەترسا، شەونوێژی دەكرد، بە ڕۆژ ڕۆژووی دەگرت، پارێزراو بوو لە دەست دنیای، بۆ دادپەروەری لەگەڵ خەڵكدا لێنەویو بوو، فەرمانی بە چاكە دەكرد پێشڕەوی ئەو بوارە بوو، لە هەموو بارێكدا سوپاسگوزار بوو، سوێند بەخوا شەو و ڕۆژ زیكری خوای دەكرد، بۆ بەرژەوەندی خۆی گوێی نەدەدا، لە دونیا نەویستی و لەخواترسی و پاكی و وریایی و لێهاتووییدا لە هاوەڵانی زیاتر بوو، هەركەس نەفرینی لێدەكات خوا لەڕۆژی دواییدا سزای بدات، موعویە وتی: ئەی چی دەڵێیت سەبارەت بە عومەری كوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) وتی: ڕەحمەتی خوا لە ئەبو حەفص، سوێند بەخوا پشت و هاوپەیمانی ئیسلام و پەناگەی هەتیوان و پێگەی ئیمان و فریادڕەسی لاوازان و قەڵای پاك و چاكان بوون قەڵا و قەڵغان بوو بۆ خەڵك، بۆ توندی هاریكار بوو، بە خۆڕاگری و چاوەڕوانی پاداشتەوە مافی خوای بەجێ گەیاند تا

خوای گەورە ئیسلامی سەرخستو شارو وڵاتانی فتح کرد، لە بەرزیو نزمی شوێنو ناوچەو گردو کوچەو کوڵانەکاندا یادی خوای دەکرد، نەرمو نیانو لەسەر خۆ بوو، لەکاتی توندیو حەسانەوەشدا سوپاسی خوای دەکرد، لە هەموو کاتو ساتێکدا یادی خوای دەکرد،

خوای گەورە سزای هەرکەس بدات کە نەفرینی بۆ دەنێرێت، سزاکەی تا ڕۆژی دوایی ڕۆژی خەفەتباری بهێڵێتەوە، موعاویە (رضي الله عنه) وتی: ئەی چی دەڵێیت سەبارەت بە عوسمانی کوڕی عەففان؟ وتی: ڕەحمەتی خوا لە ئەبو عەمر، سوێند بەخوا بەڕێزترین نەوەو لەهەموان چاکەکارترو لەسەر غەزا خوڕاگرتربوو, بەیانیانی بەبێداری دەکردەوە لە زیکری خوادا فرمێسکی زۆری دەڕشت، لەسەر گرنگی کاری شەو و ڕۆژ زۆر بیری دەکردەوە، هەرچی کارێکی بەرزو بەڕێزبوو ئەنجامی دەدا، بۆ هەر دەربازبوونێك هەوڵی دەدا لەدەست هەر تاوانێك ڕای دەکرد، خاوەنی سوپاو بیرو مێردی دووکچی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو، خوا تا ڕۆژی دوایی پەشیمانی بکاتە بەشی ئەو کەسەی کە قسەی پێ دەڵێت، موعاویە وتی: ئەی چی دەڵێیت سەبارەت بە عەلی کوڕی ئەبو تالیب (رضي الله عنه)؟ وتی: ڕەحمەتی خوا لە ئەبو حەسەن، سوێند بەخوا هێمای ڕێنوونی بوو، پەناگەی لەخوا ترسیو پێگەی عەقڵو لانکەی چاکەو ڕوونـاکی ناو تاریکی بوو، بانگەوازی بۆ بەڵگەی باڵا دەکرد (پەیامی خوا) شارەزایی لەسەر کتێبەکانی پێشوو هەبوو، تەئویلو یادخستنەوەی بەجێ دەگەیاند، چاکترینی ئەوانە بوو کە بڕوایان هێناوەو لە خوا دەترسن.لە ستەمو ئازاردانی خەڵك بەدوور بوو، لە نزمیو ڕێی سووكو لار بەدوور بوو، گەورەی ئەوانە بوو کە بەرگو پۆشاك دەپۆشن, لەناو ئەوانەی حەج دەکەنو هەوڵ دەدەن گەورەترین فەزڵی هەبوو، لە دادپەروەریو یەکسانیدا لێبووردنی زیاتر بوو، لەناو خەڵکی دونیادا لە دوای پێغەمبەرانو پێغەمبەر موحەمەد (صلى الله عليه وسلم)و خاوەنی دوو

قیبلـه لـه هـەموان وتابێـژتر بـوو، ئـیتر مەگـەر هـیچ یەکتاپەرستێکی پـیٚ دەگەشت؟ چاکترین ئـافرەتی بەهاوسـەر گـرت، بـاوکی (سـبگین) (حەسـەن و حوسـەین) بـوو، چاوانی من کەسی وەك ئەویان نەبینیوەو تا قیامەتیش کەسی وا نابینن، هەرکەس نەفرینی لێدەکات نەفرینی خواو بەندەکانی لیٚ بێت تا ڕۆژی دوایی، موعاویە وتی: ئەی سەبارەت بە تەلحەو زوبێر (رضي الله عنه) چی دەڵێیت؟ وتی: ڕەحمەتی خوایان لیٚ بێت، سوێند بەخوا پاك و داوێن پاك و چاکەکارو موسوڵمان و شەهیدو زانا بوون هەڵەیەکیان کرد بەڵکو خوای گورە بەهۆی سەرخستنی جاران و هاودەمی جاران و کارە جوانەکانیانەوە لێیان خۆش بێت، موعاویە وتی: ئەی لەبارەی عەباسەوە چی دەڵێیت؟ وتی: ڕەحمەتی خوا لە ئەبولفەزڵ، سوێند بەخوا کەسی (مامەو برا) باوکم پێغەمبەری خوا بوو، بیلبیلەی چاوی هەڵبـژێردراوی خوا بوو، پەناگەی خەڵك و گـەورەی هـەموان بـوو، لەبەرچـاو ڕوونـی کـارو بـاردا بـەرزو بڵنـدو لـە بینـینی سـەرەنجامەکاندا وردتـر، پـڕ زانـست بـوو لـەکاتی باسـی گەورەییـدا پێـوەر نایخوێنێتەوە، لەباسی شکۆی خێڵەکەیدا ڕەگەزو نەسەب نامێنێت، بۆچی وانەبێت لـە کاتێکـدا گـەورەو شـکۆدارترینی نـاو قـورەیش عەبدولموتـەلیب وریـا و سەرپەرشتیاری بووە، ئینجا فەرموودەکەی هێنا[1]،[2]

[1] - ضعیف

[2] - هەیسەمی (ج٩ ص١٦٠) دەڵێت: تەبەرانی گێڕاویەتەوەو لە سەنەدەکەیدا کەسانی واهەن کە من نایانناسم.

# بەشی یەکەم

# (بانگەواز بۆ خوا)

چۆن بانگەوازکردن بۆ خوای گەورەو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)و هاوەڵان (رضي الله عنه) لایان لە هەموو شتێک خۆشەویست تر بوو؟ چۆن سووربوون لەسەر ئەوەی ڕێنموونی خەڵک بکەن و بیانهێننە ناو ئاینی خواو لەناو ڕەحمەتی خوادا نغرۆ ببن بۆ گەیاندنی هەق بە خەڵک هەوڵدانیان چۆن بوو؟

# (حەزو تامەزرۆیی بۆ بانگەوازو شەیدابوون پێیەوە)

تەبەرانی لە ئیبن عەبباسەوە سەبارەت بە فەرمایشتی خوا (فمنهم شقی و سعید)و ئایەتی لەو جۆرە لە قورئاندا هێناویەتی کە دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) سوور بوو لەسەر ئەوەی کە هەموو خەڵك باوەڕ بهێنن و بەیعەتی ڕێنموونی پێ بدەن، خوای گەورەیش هەواڵی پێدا کە هیچ کەس باوەڕ ناهێنێت مەگەر کەسێك لای خوا لە سەرەتادا (تۆماری قەدەر) بەختەوەری بۆ بووبێت، یان کەس گومڕایی بۆ نابێت مەگەر پێشتر لای خوا شەقاوەیی بۆ نووسرابێت، پاشان خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەفەرموێت (لعلك باغع نفسك على الا يكونوا مؤمنين. ان نشا ننزل عليهم من السماء اية فظلت اعناقهم لها خاضعين)[1][2].

ئیبن جەریر لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك ئەبو تالیب نەخۆش کەوت دەستەیەك لە خەڵکی قورەیش چوون بۆلای، ئەبو جەهلیش لەناویاندا بوو، وتیان: برازاکەت جنێو بە خواوەندەکانمان دەدات و وادەکات و وادەڵێت، بەڵکو بنێریت بەشوێنیداو ڕێی لێ بگریت، ئەویش ناردی بە شوێنیدا، پێغەمبەریش (ﷺ) هات و چوویە ژوورەوە، نێوانی ئەوان و ئەبوتالیب هێندەی شوێنی دانیشتنی کەسێك بوو، بۆیە لەو شوێنەدا دانیشت، ترسا ئەگەر لای ئەبوتالیبدا دابنیشێت، سۆزی و نەرمی بۆ بنوێنێت، بۆیە لەو شوێنەدا دانیشت، پێغەمبەریش (ﷺ) شوێنێکی بەدی نەکرد تا لە نزیك مامیدا دابنیشێت، بۆیە لەلای دەرگاکەوە دانیشت، ئەبو تالیب پێی وت: برازای شیرینم! چی یە وا هۆزەکەت سکاڵایان هەیە لە سەرت؟ دەڵێن جنێو بە خواوەنەکانیان دەدەیت و ئەمەو ئەوە دەڵێن، ئەوانیش

---

[1] – ضعيف

[2] – هەیسەمی (ج٧ ص٨٥) دەڵێت کەسانی سەنەدەکە جێی متمانەن، تەنها عەلی کوڕی ئەبوتەلحە لە ئیبن عەبباسی نەبیستووە.

زیاتریان وت، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (یا عم! اني اریدهم علی کلمة واحدة یقولونها تدین لهم العرب و تؤدی الیهم العجم الجزیة) واتە((ئەی مامە گیان من یەك قسەم لەوان دەوێت بیڵێن، تا هەموو عەرەب بێتە ژێر باریان و عەجەمیش سەرانەیان بدەنێ))، ئەوانیش بەو قسەیە ڕاچڵەکین و وتیان یەك قسە، ئەوە دەقسەش بۆ تۆ، ئەو قسەیە چی یە بیڵێ؟ ئەبوتالیب وتی: برازای شیرینم ئەم یەك قسەیە چی یە؟ فەرمووی (لا اله الا الله) ئەوانیش بەترس و ڕاچڵەکینەوە جلەکانیان گرتبوو و هەستانە سەرپێ و وتیان (هەموو خواوەندەکان بکەینە یەك، بەڕاستی قسەیەکی سەرسووڕهێنەرە) ئایەتی خوا لەو بارەیەوە دابەزی (اجعل الالهة اله واحدا....بل لما یذوقوا عذاب)[1].[2]

ئیبن ئیسحاقیش لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی – هەروەك لە البدایە والنهایە ج٣ ص١٢٣ دا هاتووە –: کاتێك چوون بۆلای ئەبوتالیب و دواندیان – ئەوانەش خانەدانەکانی قورەیش، عوتبەی کوڕی ڕەبیعە و شەیبەی کوڕی ڕەبیعە و ئەبو جەهلی کوڕی هیشام و ئومەیەی کوڕی خەلەف و ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب بوون لەگەڵ کۆمەڵێك لە پیاو ماقووڵانی تریاندا – وتیان: ئەبوتالیب! تۆ لە ئێمەیت و تۆ دەزانیت، بینیت چی بوو، ئێمە ترسمان لێنیشتووە بۆی، دەزانیت چی لە نێوان ئێمە و برازاکەتدا هەیە، دەی وازی لێ بێنە و لە جیاتی ئەو کەسێکی دی لە ئێمە وەربگرە تا هەردوولامان لە دەستێك ڕزگارمان بێت و ئەو واز لە ئایینمان بێنێت و ئێمەش واز لەئایینی بهێنین، ئەبو تالیبیش ناردی بەشوێنیدا و ئەویش هات، ئەبوتالیب وتی: کوڕی شیرینم، ئەمانە پیاوماقوڵانی هۆزەکەتن

---

[1] – ضعیف.

[2] – ئیمامی ئەحمەد و نەسائی و ئیبن ئەبی حاتەم و ئیبن جەریریش هەموویان لە تەفسیرەکانیاندا ئەمەیان گێڕاوەتەوە، ترمزیش هێناویەتی و دەڵێت پلەی فەرموودەکە حەسەنە،[2] لە تەفسیری ئیبن کەسیریشدا ج٤ ص٢٨ وا هاتووە، بەیهەقیش (ج٩ ص١٨٨) هێناویەتی، حاکمیش لە المستدرك ج٢ ص٤٣٢ بەو واتایە هێناویەتی و دەڵێت: سەنەدەوکەی صحیحە و ئیمامی بوخاری و موسلیم نەیان هێناوە، زەهەبیش دەڵێت، صحیحە.

کۆبوونەتەوە تا چیت دەوێت پێت ببەخشن و شتێکت لێ وەربگرن، ئەو کات پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (كلمة واحدة تعطونها تملكون بها العرب وتدين لكم بها العجم) (یەك قسەم بدەنە دەست، عەرەبی پێ دەخەنە ژێرباری خۆتان و عەجەمیش ملکەچ و قەرزارتان دەبێت) ئەبو جەهل وتی: دەی ها ئەوە دە قسەش بۆ تۆ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (تقولون لا اله الا الله ويخلعون ما تعبدون من دونه) واتە(بڵێن لا اله الا الله و واز بهێنن لە پەرستنی جگە لە خوا) ئەوانیش دایان بە دەستی خۆیاندا (وەك جۆرە چەپڵە لێدانێك)، دوایی وتیان موحەمەد دەتەوێت هەموو خواوەندەکان بکەیت بەیەك، ئەمە شتێکی سەرسووڕهێنەرە، پاشان لە نێوان خۆیاندا وتیان سوێند بەخوا ئەم پیاوە ئەو شتەتان پێ نادات کە ئێوە دەتانەوێت، بۆیە واز بێنن و لەسەر ئاینی باو باپیرانتان بچن تا خوا بڕیاری نێوان ئێوە و ئەو دەدات، ئینجا بلاوەیان لێکرد، ئەبوتالیب وتی: برازای شیرینم! سوێند بەخوا نەمبینی داوای شتێکی لە سنوور بەدەریان لێ بکەیت، پێغەمبەر (ﷺ) هیوای پەیداکرد تا موسوڵمان بێت، بۆیە پێی دەوت (اي عم! فانت فقلها استحل لك بها الشفاعة يوم القيامة) واتە(دەی مامە گیان تۆ چی، دەی تۆ بیڵێ تا لە ڕۆژی دواییدا شەفاعەتت بۆ بکەم) کاتێك ئەویش سوور بوونی پێغەمبەر (ﷺ) ی بینی وتی" برازا گیان! سوێند بەخوا ئەگەر لە بەرترسی لێدانی تۆو کوڕانی باوکت نەبوایە لە دوای خۆم، لەبەر ئەوە نەبوایە قورەیش وابزانن لە ترسی مەرگ ئەمەم وتووە دەموت، ئەوەشم دەوت تەنها لەبەر ئەوەی تۆی پێ دڵخۆش بکەم). ئینجا فەرموودەکەی تەواوکرد. لەسەنەدەکەیدا گێڕەرەوەیەکی جێی گومان هەیە کە بڕیاری یەکلایی لەسەر نیە.[1]

بوخاریش لە ئیبنولموسەیبەوە لە باوکیەوە هێناویەتی کە کاتێك ئەبوتالیب سەرەمەرگی هات، پێغەمبەر (ﷺ) چوو بۆلای ئەوکات ئەبوجەهل لە لای بوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (اي عم قل لا اله الا الله كلمة احاج لك عندالله) واتە(مامە گیان بڵێ لا اله الا الله قسەیەکە تا لە لای خوا بیکەم بە بەڵگە بۆت)، ئەبوجەهل و

[1] - ضعيف.

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئومەیەش وتیان: ئەبوتالیب ئەریّ واز دێنیت لە ئایین و ڕێبازی عەبدولموتەلیب؟ بەردەوام ئەمەیان دەوت و دەیاندواند تائەوەی کۆتا قسەی وتی ئەوە بوو: من لەسەر میللەتی عەبدولموتەلیبم، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (لاستغفرن لك ما لم انه عنك) واتە(سوێند بەخوا داوای لیّ خۆشبوونت بۆ دەکەم مەگەر ڕێگریم لیّ بکرێت) ئەوکات ئەم ئایەتە دابەزی (ماكان للنبي والذين امنوا انيستغفروا للمشركين ولو كانوا اولي قربى من بعد ما تبين لهم انهم اصحاب الجحيم) ئەم ئایەتەش دابەزی (انك لاتهدي من احببت). موسلیمیش هێناویەتی.

هەروەها لە گێڕانەوەیەکی تردا بەهەمان شێوە هێناویەتی و تیایدا دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) بەردەوام لێی دووبارە دەکردەوە و ئەوانیش بەردەوام ئەو قسەیەیان لیّ دووپات دەکردەوە تا کۆتا قسە کەوتی ئەوە بوو: من لەسەر میللەتی عەبدولموتەلیبم، ئامادە نەبوو بڵێت (لا اله الا الله) پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (اما لاستغفرن لك مالم انه عنك) خوای گەورەش ئەو دوو ئایەتەی دابەزاند (دوای ئەوە).

ئیمامی ئەحمەد و موسلیم و نەسائی و ترمزیش بەو جۆرە لە ئەبوهورەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویانە کە دەڵێت: کاتێك ئەبوتالیب سەرەمەرگی هات پێغەمبەر (ﷺ) هاتەلای و پێی فەرموو (یا عماه! قل لا اله الا الله اشهد لك يوم القيامة) واتە(مامە گیان! بڵیّ لا اله الا الله تا لە ڕۆژی دواییدا شایەتیت بۆ بدەم، ئەویش وتی: ئەگەر قورەیش سەرکۆنەیان نەکردمایە تا بڵێن: تەنها ترسی مەرگ وای لێکرد چاوەکانتم پیّ سەقامگیر دەکرد(وام دەکرد بحەسێیتەوە) و دەمووت، ئەوەشم نەدەوت مەگەر تەنها لەبەر چاوانی تۆ، ئەو کات خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند (انك لا تهدي من احببت ولكن الله يهدي من يشاء وهو اعلم بالمهتدين).[1]

تەبەرانی و بوخاریش لە (التاريخ)دا لە عقیلی کوڕی ئەبوتالیبەوە (ﷺ) هێناویانە کە دەڵێت: قورەیش هاتن بۆلای ئەبوتالیب، ئینجا وەك چۆن فەرموودەکە

[1] – لە البداية والنهاية ج٣ ص١٢٤ یشدا هاتووە.

هاتبوو لە بابی (تحمل الشدائد) دا هێناویەتی، ئەبوتالیبیش پێی وت: برازا گیان: سوێند بەخوا وادەزانم بە گوێم دەکەیت، وا هۆزەکەت هاتوون و دەڵێن تۆ دەچیتە کەعبەیان و لە کۆڕیاندا شتی وایان بە گوێدا دەدەیت کە ئازاریان دەدات، بەڵکو وازیان لێبهێنیت، ئەویش ڕووی بەرەو ئاسمان بەرزکردەوەو وتی (والله ما ان باقدر ان ادع ما بعت به من ان يشعل احدكم من هذة الشمس شعلة من نار) واتە (سوێند بەخوا چەندە هەرکام لە ئێوە دەتوانێت لەو خۆرە پارچە ئاگرێك داگیرسێنێت (واتەدەستی بگاتە لای خۆر) منیش هێندە دەتوانم واز لەمە بێنم کەپێی نێردراوم).
لای بەیهەقی واهاتووە ئەبوتالیب پێی وت برازا گیان وا هۆزەکەت هاتوون بۆلام و ئەمەو ئەوە دەڵێن، بۆیە چاوێکت لە من و خۆیشت بێت و تووشی شتێکم مەکە من و تۆیش دەرەقەتی نەیەین، وازبێنە لێیان و ڕقیان لە چییە مەیلێ،پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) وای گومان برد مامی دەستی لێ بەردەدات و دەیدات بەدەستەوەو لاوازی دەنوێنێت لەوەی لەگەڵی بڕوات، بۆیە فەرمووی (یا عم! لو وضعت الشمس في يميني والقمر في يساري ماتركت هذا الامر حتى يظهره الله او اهلك في طلبه) واتە (مامە گیان! سوێند بەخوا ئەگەر خۆر بخەیتە دەستی ڕاستم و مانگ بخەیتە دەستی چەپم واز لەم کارە ناهێنم تا خوا سەری دەخات یان لە پێناویدا لەناو دەچم) پاشان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دڵی پڕ بوو و قوڕگی پرمەی گریانی گرت و گریا، ئینجا فەرموودەکەی باسکرد، وەك دواتر باسی دەکەین.[1]

عەبدی کوڕی حەمید لە موسنەدەکەیدا لە ئیبن ئەبی شەیبەوە بە سەنەدەکەی خۆی لە جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە (رضي الله عنه) هێناویەتی کە دەڵێت: ڕۆژێکیان قورەیش کۆبوونەوەو وتیان: بزانن کامتان زۆر شارەزای جادوو و فاڵچیەتی و شیعرە با بچێتە لای ئەو کەسەی وا نێوانی تێکداوین و دووبەرەکی بۆ دروست کردووین و عەیبی ناوەتە سەر ئایینەکەمان، با قسەی لەگەڵ بکات و بزانێت چۆن وەڵامی

[1] – حسن.

دەداتەوە، ئەوانیش وتیان مەگەر تەنها عوتبەی کوڕی ڕەبیعە، ئەوانیش وتیان دەی ئەبو وەلید بڕۆ، عوتبەش هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ)و وتی: موحەمەد تۆ باشتری یان عەبدوڵلا؟ پێغەمبەریش (ﷺ) بێدەنگ بوو، ئەویش وتی: ئەگەر دەڵێیت ئەوانە لە تۆ باشتربوون ئەوا بزانە ئەوان ئەو خواوەندانەیان دەپەرست کە تۆ ڕەخنەیان لێ دەگریت، ئەگەریش دەڵێیت تۆ لەوان باشتریت بیڵێ با قسەکەت ببیستین، سوێند بەخوا هەرگیز هەرچی و پەرچیمان نەدیوە وەك تۆ شووم بێت بۆ هۆزەکەی، یەکدەنگیت نەهێشتووین و ئایینت عەیبدار کردووین و لەناو عەرەبدا ناوت زڕاندووین تا ئەوەی وابلاّ بووەتەوە لەناویاندا دەڵێن قورەیش جادووگەری تیایەو فاڵچی تیایە، سوێند بەخوا هێندەماوە شمشێر لە ڕووی یەکتردا هەڵبگرین تا یەکتر لەناو ببەین، هۆ کابرا! ئەگەر پێویستیەکت هەیە واهێندەمان بۆ کۆکردوویتەوە کە ببیتە دەوڵەمەندترین کەسی قورەیش، ئەگەریش عەشق وێڵی کردووی چ ئافرەتێکی قورەیشت بەدڵە دە دانەیان لێ بەهاوسەر بگرە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (فرغت؟) (لێبوویتەوە؟) وتی بەڵێ، پێغەمبەریش (ﷺ) دەستیپێکردو فەرمووی (بسم الله الرحمن الرحيم، حم تنزيل الكتاب من الرحمن الرحيم، كتاب فصلت اياته قرانا عربيا لقوم يعلمون) تا گەیشتە (فان اعرضوا فقل انذرتكم صاعقة مثل صاعقة عاد و ثمود) عوتبە وتی: بەسە! جگە لەمە هیچت لا نیە فەرمووی نا، ئەویش گەڕایەوە بۆلای قورەیش، وتیان چیت کرد؟ وتی: هەرچیەك پێم وابوو ئێوە پێی دەڵێن پێم وت، وتیان ئەی وەڵامی دایتەوە؟ وتی بەڵێ، دوایی وتی سوێند بەوەی کردی بە کوڕ هیچی لێ تێنەگەیشتم جگە لەوەی هەڕەشەی هەورە بروسکەیەکی وەك هەورە بروسکەی عادو سەمودی لێکردن، وتیان: قوڕت بەسەر کابرا بە عەرەبی دواندیتی کەچی نازانیت چی وت؟ وتی نا، سوێند بەخوا جگە لە باسی هەورەبروسکە هیچی لێ تێنەگەیشتم.[1]

[1] – حسن.

بەیهەقی و حاکمیش هێناویانەو ئەوەشیان بۆ هێناوە، ئەگەر سەرۆکایەتیت دەوێت ئاڵای خۆمان دەدەینە دەستت، تاماوی سەرۆك بە،هەروەها کاتێك فەرمووی (فان اعرضو فقل انذرتکم صاعقة مثل صاعقة عاد وثمود) عوتبە داوای لێکرد ڕاوەستێتو نەچوویەوە بۆلای ماڵەوە(بۆلای هاوڕێکانی ئەوانەی ناردبوویان تا لەگەڵ پێغەمبەر گفتوگۆ بکات) و خۆی لێ بەدوور گرتن، ئەبو جەهل وتی: ئەی کۆمەڵی قورەیش وادیارە عوتبە داویەتە پاڵ موحەمەدو سەرسام بووە بەخواردنی، ئەمە لەبەر ئەوەیە پێویستیەکی لا پەیدا بووە، وەرن بابچین بۆلای، هاتن بۆلای عوتبەو وتیان دەتبینین کاریگەر بویت بە موحەممەد، عوتبە پێی وتن لەبەر چی هاتوون، ئەبوجەهل وتی ئەگەر پێویستیت هەیە با هێندە لە ماڵوسامانی خۆمانت بۆ کۆبکەینەوە کە پێویستیت بە خواردنی موحەمەد نەبێت، بۆیە عوتبە تووڕە بوو و سوێندی خوارد تاماوە موحەمەد نەدوێنێت، وتی: دەزانن من یەکێکم لەوانەی لە قورەشدا پارەم زۆرە، بەڵام من هاتم بۆلای – ئینجا چیرۆکەکەی بۆ گێڕانەوە– ئەویش وەڵامی خوایی دامەوەو جادو و شیعر و فاڵگیری نەبوو، ئەمەی خوێندەوە (بسم الله الرحمن الرحيم، حم تنزيل من الرحمن الرحيم) تا گەیشتە (فان اعرضوا فقل انذرتكم صاعقة مثل صاعقة عاد وثمود) منیش پەنام بردەلای تا بوەستێت، ئێوە دەزانن موحەمەد هەرچی بوتایە درۆی نەدەکرد، منیش ترسام سزا داباریێتە سەرتان.[1]

ئەبونەعیم لە (دلائل النبوة ص٦٧)دا لە ئیبن عومەرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی کە قورەیش کۆبوونەوە بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەویش لە مزگەوتدا دانیشتبوو، عوتبەی کوڕی ڕەبیعەش پێی وتن، واز بێنن تا بچم بۆلای و بیدوێنم، بەڵکو من لە ئێوە

[1]– لە البداية ج٣ ص٦٢ دا وا هاتووە، ئەبو یەعلایش لە جابرەوە (رضي الله عنه) وەك ئەم فەرموودەی عەبدی کوڕی حەمیدی هێناوە، ئەبو نەعیمیش الە (الدلائل ص٧٥)دا هەمان شتی هێناوە، هەیسەمی (ج٦ ص٢٠) دەڵێت: لەسەنەدەکەدا ئەجلەص کندی هەیە مە ئیبن مەوعین و چەندێکی دی متمانەیان پێ داوە، نەسائی و چەندێکی دیکەش بەلاوازی دەزانن، ئەگەرنا کەسانی دیکەی سەنەدەکە جێی متمانەن.

نەرمتر بم لەگەڵی، عوتبە چوو تا لەلای دانیشت و وتی: برازاکەم! من وا سەیرت دەکەم گوڵی نێو کۆڕو گەورەی شوێنی، بەرامبەر بە هۆزەکەت شتێکت کردووە کە هیچ کەس بەرامبەر هۆزەکەی خۆی شتی واناکات، ئەگەر بەم قسانەت پارەت دەوێت ئەوا هۆزەکەت هێندەت بۆ کۆدەکەنەوە تا ببیتە دەوڵەمەندترینیان، ئەگەر ناوبانگ و گەورەییت دەوێت ئەوا هێندە بەرزت دەکەینەوە تاکەس نەگاتە ئاستت و بەبێ تۆ هیچ نەکەین، ئەگەر ئەمەش دەردێکە و لێت نابێتەوە ئەوا هەموو خەزێنەکانمان دەخەینە بەردەستت تا بنێرین بەدوای پزیشکداو بۆ چارەسەرت، ئەگەریش دەسەڵاتت دەوێت دەتکەینە دەسەڵاتدار، ئەوکات پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (افرغت یا ابا ولید؟) (ئەبو وەلید لێبوویتەوە؟) وتی بەڵێ، پێغەمبەریش (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە (حم...سورەتی سجدە) تا گەیشتە سەر سەجدە، ئەوکات پێغەمبەر (ﷺ) سوجدەی برد، عوتبەش دەستی خستبوویە پشتیەوە تا لە خوێندنەوەکەی تەواو بوو، ئینجا عوتبە هەستاو نەیزانی چی بڵێت بەهۆزەکەی، کاتێك بینیان هاتەوە وتیان: بە ڕوویەکەوە بەرەو ڕووتان دێتەوە جیاواز لەو ڕووەی پێی چوو،عوتبەش لەلایان دانیشت و وتی: ئەی کۆمەڵی قورەیش: چۆنتان پێ وتم بەو جۆرە دواندم تا لێبوومەوە ئەوکات بەجۆرێك دواندمی سوێند بەخوا دوو گوێم تا ئێستا شتی وایان نەبیستووە و نەمدەزانی چی پێ بڵێم، کۆمەڵی قورەیش ئەمڕۆ گوێم لێ بگرن و سبەینێ لێم یاخی بن و بەگوێم مەکەن، ئەو پیاوە وازی لێ بهێنن و کەناری لێ بگرن، چونکە سوێند بەخوا واز لەو کارەی ناهێنێت، وازی لێ بێنن با بەرەو ڕووی هەموو عەرەب بێتەوە، چونکە ئەگەر بەسەریاندا سەرکەوێت گەورەیی و شکۆمەندی ئەو بۆ ئێوەشە، ئەگەریش بەسەریدا سەرکەون ئەوا بێ ئەوەی خۆتان ماندووکەن کەسی تر لە دەستی دەربازتان دەکات، وتیان ئەبو وەلید چاوبەس کراویت.[1]

---

[1] - ضعیف.

بوخاری لە مسوەری کوڕی مەخرەمەو مەڕوانەوە هێناویەتی کە دەڵێن: پێغەمبەر (ﷺ) لە سەردەمی حودەیبییەدا چوویە دەرەوە، بە دوورو درێژی فەرموودەکەی هێناوە، هەروەك لەم بەشەدا ئەو فەرموودەیە دێنین، تیایدا دەڵێن: لەوکاتەدا بەدیلی کوڕی وەرقای خوزاعی بە دەستەیەکی خوزاعیەکانەوە هات، ئەمانە جێی ئامۆژگاری و نهێنی پێغەمبەر (ﷺ) بوون لە خەڵکی تیهامە بوون، وتی: من کەعبی کوڕی لوئەی و عامری کوڕی لوئەیم بەجێهێشتووە کە لەسەر ئاوی بەردەوامی حودەیبییە دابەزیون و وشتریان پێیە (عوذ المطافیل)،[2] ئەوان هاتوون تا لەگەڵت بجەنگن و ڕێ نەدەن بچیتە بەیتەوە (کەعبە) پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی ((انا لم نجئ لقتال احد ولكنا جئنا معتمرين و ان قريشا نهكتهم الحرب و اضرت بهم فان ساؤء ماددتهم مدة ويغلوا بيني وبين الناس، فان اظهر فان شاؤءا ان يدخلو فيها دخل فيه الناس فعلوا الا فقد جموا، وان هم ابو فوالذي نفسي بيده لاقاتلنهم على امري حتى تنفرد سالفتي و لينقذن امر الله) واتە(ئێمە بۆ شەڕکردن لەگەڵ کەسدا نەهاتووین، بەڵکو هاتووین تا عەمرە بکەین، قورەیش شەڕ سەری کون کردوون و زیانی پێ گەیاندوون، ئەگەر دەیانەوێت با ماوەیەکیان لەگەڵ دابنێم تا وازم لێبهێنن لەگەڵ ئەو خەڵکە کاری خۆم بکەم، ئەگەر سەرکەوتم ئەگەر پێیان باش بوو بێنە ناو ئەو ئایینەی خەڵك هاتوونەتە ناویەوە باشە ئەگەر نا پاڵی لێ بدەنەوە، ئەگەر ڕازی نابن ئەوا سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە لەسەر ئەم کارەم

---

[1]- ئیبن ئیسحاق بەدوورو درێژی باسی کردووە، لە البداية والنهاية ج٣ ص٦٣ دا هاتووە، بەیهەقیش بە کورتی لە فەرموودەی ئیبن عەمەردا هێناویەتی، ئیبن کەسیر لە البدایه والنهایه ج٣ ص٦٤ دا دەڵێت: ئەمە فەرموودەیەکی تەواو (غريب) ە لەم ڕووەوە هاتووە.

[2] دوو جۆ ر وشترن بەپێی تەمەن نەوەك بەپێ جۆری شێوەیی.

لەگـەڵیان بەشـەڕ دێـم ئەگـەر خـۆم بەتـەنهاش بمێنمـەوە دەبێـت فـەرمانی خـوا بەجێبگەیەنم).[1]

بوخـاری لـە سـەهلی کـوڕی سـەهلەوە (رضي الله عنه) هێناویـەتی کـە پێغەمبـەر (ﷺ) لـە ڕۆژی خەیبەردا فەرمووی (لاعطين هذه الراية غدا رجلا يفتح الله على يديه يحب الله ورسوله ويحبه الله ورسوله) واتە(سبەینێ ئەم ئاڵایە دەدەمە دەست کەسێك خوای گەورە لەسەر دەستی ئەو فەتحی دەکات، ئەو کەسە خواو پێغەمبەری خوای خۆش دەوێت، خواو پێغەمبەری خوایش ئەویان خۆش دەوێت) خەڵکیش ئەو شەوەیان وابردەسەر تا بزانن ئاڵاکە دەداتە دەست کێ، کە بەیانی بوویەوە خەڵکی دەچوون بـە دەوری پێغەمبـەردا (ﷺ) هـەرکامیان هیـوادار بـوو ئاڵاکـە بداتـە دەسـت ئـەو، پێغەمبــەر (ﷺ) فــەرمووی عــەلی کــوڕی ئــەبوتالیب لــە کوێیــە؟ وتیــان: ئــەوەتا پێغەمبــەری خــوا بەدەســت چــاویەوە هاواریــەتی، پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) نــاردی بەشوێنیداو عەلی هاتو پێغەمبەر (ﷺ) تفی دا لە چاوەکانیو نزای بۆکرد، عەلی چاك بوویـەوە وەك ئەوەی هیچی نەبووبێت ئینجا(پێغەمبـەر (ﷺ)) ئاڵاکـەی دایـە دەست(عەلی)، عەلی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لەگەڵیان بەشەڕ دێم تا وەك ئێمە بن، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (انفذ على رسالتك حتى تنزل بساحتهم، ثم ادهم الى

---

[1] – تەبەرانی بەمەرفەعی لە مەسوەرو مەڕوانەوە هێناویەتی کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ياويح قريش، لقد اكلتهم الحرب، فماذا عليهم لو خلو بيني وبين سائر العرب، فان اصابوني كان الذي ارادوا، وان الله اظهرني عليهم دخلوا في الاسلام واخرين، وان لم يقبلوا قاتلوا وبهم قوة، فما تظن قريش! فوالله لا زال اجاهدهم على الذي بعثني الله به حتى يظهره الله او تنفرد هذة السالفة) لە کەنزولعومال ج٢ ص٢٨٧ یشدا واهاتووە. هەروەها ئیبن ئیسحاقیش لە ڕێگەی زوهریەوە هێناویەتی، لە فەرموودەکەدا واهاتووە، (فما تظن قريش؟ فوالله لا ازال اجاهد على هذا الذي بعثني الله به حتى يظهره الله او تنفرد هذه السالفة) لە البداية والنهاية ج٤ ص١٦٥ دا واهاتووە.

الاسلام و اخبرهم بما یجب علیهم من الله تعالی فیه، فوالله لان یهدي الله بك رجلا واحدا خیر لك من ان یکون لك حمر النعم).[1] واتە(کاری خۆت بەجێ بگەیەنە تا دەگەیتە مەیدانیان، دواتر بانگیان بکە بۆ ئیسلام و پێیان بڵێ بە موسوڵمان بوونیان چ مافێکی خودایان لەسەر شان دەبێت، چونکە سوێند بەخوا ئەگەر خوای گەورە بتکاتە هۆکاری موسوڵمان بوونی یەك کەس لە وشتری تەواو گرانبەها بۆت باشترە).

ئیبن سەعید (ج٤ ص١٣٧) لە میقدادی کوڕی عەمرەوە هێناویەتی دەڵێت: من حەکەمی کوڕی کەیسانم بەدیلگرت، ئەمیرەکەمان ویستی لە ملی بدات، منیش پێم وت: وازی لێ بێنە بابیبەین بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) ئینجا بردمانە خزمەتی، پێغەمبەر (ﷺ) بانگی کرد بۆ ئیسلام و بارەکە ماوەیەکی خایاند، عومەر وتی لەسەر چی قسەدەکەیت لەگەڵیدا ئەی پێغەمبەری خوا؟ سوێند بەخوا تاماوە موسوڵمان نابێت، وازبێنە بدەم لە ملی و بەرەو دۆزەخی بنێرم، پێغەمبەریش (ﷺ) ڕێی نەدا بە عومەر تا حەکەم موسوڵمان بوو، عومەر دەڵێت: کە بینیم موسوڵمان بوو هەموو ڕاربدوو و دواتری بۆ هێنامەوە، منیش وتم: چۆن شتێکم خستە بەردەم پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەو لەمن شارەزاتر بوو پێی؟ دوایی ئەموت: مەبەستم لەوە ئامۆژگاری بووە بۆ خواو پێغەمبەرەکەی، عومەر دەڵێت: سوێند بەخوا زۆر بە چاکی موسوڵمان بوو و لە پێناوی خوادا جیهادی کرد تا لە شەڕی بیئر مەعەنەدا شەهید بوو پێغەمبەریش (ﷺ) لێی ڕازی بوو و چوویە بەهەشت.

هەروەها لە ئیبن سەعدەوە (ج٤ ص١٣٨) لە زوهەیرەوە دەڵێت: حەکەم وتی: ئیسلام چیە؟ وتی: ئەوەیە بە تەنها خوا بپەرستیت و هاوەڵی بۆ دانەنێیت، شایەتی بدەیت موحەمەد بەندەو پێغەمبەری خوایە، ئەویش وتی واموسڵمان بووم، پێغەمبەریش (ﷺ) لایکردەوە بەلای هاوەڵانیداو فەرمووی (لو اطعتم فیه انفا

[1] – موسلیمیش ج٢ ص٢٧٩ بەو جۆرە هێناویەتی

فقتلتـه دخـل النـار) واتـه (ئەگـەر لـەو بارەیـەوە بـە گـوێم بکردنایـە دەمکوشـت و دەچوویە ئاگری دۆزەخەوە).

تەبەرانی لە ئیبن عەباسـەوە (رضي الله عنه) هێناویـەتی دەڵێت: پێغەمبـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) نـاردی بـە دوای وەحـشی کـوڕی حـەربی بکـوژی حـەمزەدا (رضي الله عنه)و بـانگی کـرد بـۆ ئیسلام، ئەویش (وەحش) هەواڵی بۆ نارد: ئەی موحەمـەد چۆن بانگم دەکەیت بۆ ئیسلام و بانگەشەی ئەوەش دەکەیت هەرکەس کەسێك بکوژێت یان هـاوەڵ دابنێت یـان زینـا بکـات تاوانبـارەو تـاوانی ڕۆژی دوایـی چـەندبارە دەبێـت و بـە ڕیـسوایی هەمیشەیی تیایدا(دۆزەخ) دەمێنێتـەوە، دەی مـن ئەوانەم کـردووە! هـیچ دەرفـەتێکم بۆ هەیە؟ خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند (الا من تاب وامن وعمل عملا صالحا فاولائك يبـدل الله سيئاتهم حـسنات وكـان الله غفـورا رحيمـا) وەحـشی وتـی: ئـەی موحەمەد ئەمە مەرجێکی سەختە (الا من تاب وامن وعمل عمـلا صـالحا) کـێ دەڵێت دەتوانم شتی وا بکەم، ئەوکات خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند (ان الله لا يغفر ان يشرك به و يغفر مادون ذالك لمـن يـشاء) وەحـشی وتـی: ئـەی موحەمـەد دوای ئـەوە پێم وایە دەتوانم، بەڵام نازانم ئایا خوا لێم خۆش دەبێت یان نا؟ئایا شتی تر هەیە؟ خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند (يا عبادي الذين اسرفوا على انفسهم لالا تقنطوا مـن رحمـة الله ان الله يغفـر الـذنوب جميعـا انـه هـو الغفـور الـرحيم) وەحـشی وتـی: ئەمەیان بەڵێ، ئینجا موسوڵمان بوو، خەڵکی وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەی بۆ وەحشی هەیە بۆ ئێمەش دەبێت، فەرمووی ئەمە بۆ هەموو موسوڵمانانە[1].[2]

بوخـاری (ج٢ ص٧١٠)دا لـە ئـیبن عەبباسـەوە (رضي الله عنه) هێناویـەتی دەڵێـت: خەڵکێکی بێباوەڕ کوشتارو زینایەکی زۆریان ئەنجام دابوو، هاتنە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وتیان ئەوەی دەیڵێیت و بانگەوازی بۆ دەکەیت چاکە، بەڵکو پێمان بڵێیت ئایا لێخۆشبوون بۆ کارەکانمان هەیە؟ ئەم ئایەتە دابەزی (والـذين لا يـدعون مع الله الها

---

[1] – ضعيف.

[2] – هەیسەمی (ج٧ ص١٠٠) دەڵێت: لەسەنەدەکەیدا ئەببەنی کوڕی سوفیان هەیە کە زەهەبی بە لاوازی دادەنێت.

اخر ولا يقتلون النفس التي حرم الله الا بالحق ولا يزنون) هەروەها (قل يا عبادي الذين اسرفوا على انفسهم لالا تقنطوا من رحمة الله).[1]

تەبەرانی و ئەبو نەعیم لە حلیة الاولیاء ﷺ حاکم لە ئەبو سەعلەبەی خەشەنیەوە هێناویانە کە دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) بە کۆمەڵێ جەنگاوەرەوە پێش کەوت و هاتە مزگەوت و تیایدا دوورکات نوێژی کرد – حەزی دەکرد لە سەفەردا کە گەڕایەوە بچێتە مزگەوت و تیایدا دوورکات نوێژ بکات و سەری فاتیمە بدات و دوایی چێتە لای ژنەکانی، جارێکیان لە سەفەرەکەیەوە هاتەوە و هات بۆ لای فاتیمەی کچی و پێش ماڵی ژنەکانی چوویە ئەوێ، فاتیمە لەبەر دەرگای ماڵەوە پێشوازی لێ کردو نێوچاوانی پێغەمبەری (ﷺ) ماچ کرد، لە دەقێکدا دەم و چاوەکانی ماچ کردو گریا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ما يبكيك؟) چی وایکرد بگریت؟ فاتیمە وتی: پێغەمبەر (ﷺ) دەتبینم ڕەنگت گۆڕاوە و کراسەکەت کۆن و شڕۆڵ بووە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (يا فاطمة لا تبكي فان الله بعث اباك على امر لا يبقى على الارض بيت مدر ولا وبر ولا شعر الا ادخله الله عزا او ذلا حتى يبلغ حيث يبلغ الليل) واتە(فاتیمە مەگری چونکە خوا باوکتی بەشتێکەوە ناردووە لەسەر زەویدا هیچ گوندو شارو شوێنێك نامێنێت مەگەر ئەوەی خوای گەورە بە عیزەت بێت یان بەزەلیل کردنیان ئەم پەیامە دەگەیەنێتە ئەوێ تا ئەوەی شەو بگاتە هەر شوێنێك ئیسلامیش دەچێتە ئەوێ)[2].[3]

---

[1] – موسلیمیش ج١ص٧٦و ئەبوداود ج٢ ص٣٣٨و نەسائی هێناویانە، هەروەك لە العینی ج٩ ص١٢١ دا هاتتوە، بەیهەقیش (ج٩ ص٩٨) دا هێناویەتی.

[2] – صحیح.

[3] – لە كنز العمال ج١ ص٧٧ دا هاتووە، هەیسەمی ج٨ ص٨٦٢ دەڵێت: تەبەرانی گێڕاویەتەوە و تیایدا یەزیدی کوڕی سنانی ئەبوو وەقرە هەیە کە لەگەڵ لاوازیەکی زۆردا فەرمووده لێك نزیك = =دەکاتەوە، حاکم ج٣ ص١٥٥ دەڵێت: ئەم فەرموودە سەنەدەکەی صحیحە و بوخاری و موسلیم

ئەحمەدو تەبەرانی لە تەمیمی داریەوە (ﷺ) هێناویانە دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو کە دەیفەرموو (لیبلغن هذا الامر ما بلغ اللیل والنهار، ولا یترك الله بیت مدر ولا وبر الا ادخله الله هذا الدین بعز عزیز او بذل ذلیل، عزا یعز الله به الاسلام واهله، وذلیل یذل الله به الکفر) واتە (ئەم پەیامە دەگاتە هەر شوێنێك کە شەو و ڕۆژی پێدەگاتو خوای گەورە هیچ گوندو شارێك ناهێڵێت مەگەر ئەم ئایینە بە عیزەتی عیزەتمەندو زەلیلی کەسی زەلیل دەگەیەنێت، عیزەتێك خوای گەورە ئیسلامو موسوڵمانانی پێ عیزەتمەند دەکاتو زەلیلیەك خوای گەورە کوفری پێ زەلیل دەکات).

تەمیمی دەڵێت: ئەوەم لە ئالوبەیتەوە زانی، ئەوەیان موسوڵمان بوو شانو شکۆی پەیداکرد، ئەوەشیان بێباوەڕ بوو زەلیلو بچوك بوو و سەرانەی بەسەردا سەپا.[1]

تەبەرانی لە میقدادەوە بەهەمان شێوە هێناویەتی، عەبدولڕەزاق لە ئەنەسەوە (ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: ئەبو موسا (ﷺ) بە فەتحی توستەرەوە ناردمی بۆلای عومەر (ﷺ)، عومەر پرسیاری لێ کردم– شەش کەسی بەکری کوڕی وائیل لە ئیسلام هەڵگەڕابوونەوەو چووبونە لای بێباوەڕان– وتی: ئەوانە چییان کرد؟ وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران لە ئیسلام هەڵگەڕاونەتەوەو چوونەتە لای بێباوەڕان تەنها

---

نەیانهێناوە، زەهەبی لەسەری دەچێتو دەڵێت: یەزیدی کوڕی سنان ڕاهاویەو ئەحمەدو چەندێکی دی بە لاوازی دەزاننو عوقبەی ماموستای نەناسراوە؟ عوقبە لە (اللسان)دا دەڵێت: بوخاری دەڵێت: قسە لەسەر صحیحی هەیە، ئیبن حیبانیش لەناو کەسانی جێمتمانەدا ناوی دێنێت.

[1] – لە الجمع ج٦ ص١٤ و ج٨ ص٨٦٢ دا واهاتووە، (هەیسەمی ج٦ ص١٤) دەڵێت: پیاوانی سەنەدی ئەحمەدپیاوانی صەحیحن.

چارەیان کوشتنە، عومەر وتی: ئەگەر بە ئاشتی بیانگرم لەوە پێم خۆشترە کەچی سەوزایی سپێتی هەیەو خۆری لە ڕوو هەستاوە، (لە هەموو دونیاو سامانی دونیا) وتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران: ئەگەر بیانگریت چییان پێ دەکەیت؟ پێی وتم: ئەو دەرگایەیان بۆ دەخەمە ڕوو کە لێوەی دەرچوون تا بێنەوە ناوی، ئەگەر کردیان باشە، ئەگەرنا بەرەو بەندینخانەیان دەنێرم.[1]

مالیك‌و شافیعی‌و عەبدولڕەزاق‌و ئەبوعوبەید لە (الغريب)و بەیهەقی (٢٠٧) لە عەبدولڕەحمانی قاریئەوە دەگێڕنەوە دەڵێت: پیاوێك لەلایەن ئەبوموساوە (رضي الله عنه) هات بۆلای عومەری کوڕی خەتاب (رضي الله عنه) پرسیاری لێکرد ئەویش وەڵامی دایەوە، پاشان وتی: هیچ هەواڵێکی نامۆتان پێیە (واتە هەواڵی تازەی ئەوێتان نیە؟) وتی: با، پیاوێك دوای موسوڵمان بوونی بێباوەڕبووە، وتی: چیتان لێکرد؟ وتی: لە خۆمان نزیك کردەوەو دامان لە ملی، عومەر وتی: سێ جار بەندتان کردو ڕۆژانە نانتان پێداو داواتان لێکرد تەوبە بکات؟ بەڵکو تەوبە بکات‌و بگەڕێتەوە، خوایە من ئامادە نەبووم‌و فەرمانم نەکردووە، کاتێکیش بیستم ڕازی نەبووم.

موسەدەو ئیبن عەبدولحەکەم لە عەمری کوڕی شەبیب لە باوکیەوە لە باپیریەوە هێناویانە کە دەڵێت: عەمری کوڕی عاص (رضي الله عنه) نامەی نووسی بۆ عومەر (رضي الله عنه)و پرسیاری لێکرد لەبارەی کەسێکەوە کە موسوڵمان بووەو دواتر بێباوەڕ بووە، دواتر موسوڵمان بووەو دواتر بێباوەڕبووە، تا ئەوەی چەند جارێك ئەمەی کردووە، ئایا موسوڵمان بوونی لێ قبوڵ دەکرێت؟ عومەریش بۆی نووسی تاخوا لێیان قبووڵ دەکات

---

[1] – لە کنز العمال ج١ ص٧٩ دا وا هاتووەو بەیهەقیش ج٨ ص٢٠٨ بەو واتایە هێناویەتی.

موسوڵمان بوونی لێ قبوڵ بکە، پێشنیاری ئیسلامی بۆ بکە، ئەگەر ڕازی بوووازی لێ بهێنە، ئەگەرنا بدە لە ملی.[1]

بەیهەقی و ئیبن مونزیرو حاکم لە ئەبو عیمرانی جونی یەوە هێناویانە دەڵێت: عومەر (رضي الله عنه) دای بەلای ڕاهیبێکداو وەستا، هاوار کرا لە ڕاهیبو وترا ئەوە ئەمیری باوەڕدارانە، ئەویش هات کەسێك بوو لەوپەڕی ئیجتیهادو دونیا نەویستیدا بوو، عومەر کە بینی گریا، وتیان: ئەمە نەسرانیە، عومەر وتی: دەزانم بەڵام سۆزم بۆی جوڵا، فەرمایشتی خوام بیر کەوتەوە (عاملة ناصبة. تصلى نارا حامية) دڵم بۆ ئەو کارو هەوڵەی جوڵا کە دادی نادات و دەچێتە دۆزەخ.[2]



[1] – لە الکنز ج١ ص٧٩ دا واهاتووە.

[2] – لە کنز العمال ج١ ص١٧٥دا واهاتووە.

# بانگه‌وازی تاك و كه‌سان
# (پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) بانگه‌وازی ئه‌بوبه‌كر (رضي الله عنه) ده‌كات)

زانای فه‌رمووده‌ناس ئه‌بولحه‌سه‌نی ته‌رابلوسی له‌ عائیشه‌وه‌ (رضي الله عنها) ده‌ڵێت: ئه‌بوبه‌كر (رضي الله عنه) چوو تا بچێت بۆلای پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) – له‌ سه‌رده‌می جاهیلیشدا دۆستی یه‌ك بوون– له‌ ڕێدا پێی گه‌یشت و وتی: ئه‌ی ئه‌بولقاسم له‌كۆڕی هۆزه‌كه‌تدا نه‌ماویت و تۆمه‌تبارت ده‌كه‌ن كه‌ ڕه‌خنه‌ و كه‌موكورتی له‌سه‌ر باپیرو داپیریان ده‌ڵێیت، پێغه‌مبه‌ریش (ﷺ) فه‌رمووی (انی رسول الله ادعوك الى الله) (من پێغه‌مبه‌ری خوام و بانگت ده‌كه‌م بۆلای خوا) هه‌ركه‌ له‌ فه‌رمایشته‌كه‌ی بوویه‌وه‌ ئه‌بوبه‌كر موسوڵمان بوو، پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) له‌ لای چوو، له‌ نێوان هه‌ردوو ئه‌خشه‌بدا [1] كه‌س نه‌بوو هێنده‌ی مۆسوڵمان بوونی ئه‌بوبه‌كر دڵخۆشی بكات، ئه‌بوبه‌كریش چوو بۆلای عوسمانی كوڕی عه‌ففان و ته‌ڵعه‌ی كوڕی عوبه‌یدوڵلاو زوبه‌یری كوڕی عه‌وام و سه‌عدی كوڕی ئه‌بی وه‌قاص و ئه‌وانیش موسوڵمان بوون، پاشان به‌یانی چوو بۆلای عوسمانی كوڕی مظعون و ئه‌بوعوبه‌یده‌ی جه‌ڕاح و عه‌بدولڕه‌حمانی كوڕی عه‌وف و ئه‌بوسه‌له‌مه‌ی كوڕی عه‌بدولئه‌سه‌د و ئه‌رقه‌می كوڕی ئه‌رقه‌م، ئه‌وانیش هه‌موویان موسوڵمان بوون ڕه‌زای خوا له‌ هه‌موویان بێت.[2]

ئیبن ئیسحاق ده‌ڵێت ئه‌بوبه‌كر (رضي الله عنه) گه‌یشت به‌ پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) و وتی: موحه‌مه‌د ئه‌رێ قوره‌یش ڕاست ده‌كه‌ن وازت له‌ خواوه‌نده‌كانمان هێناوه‌و گاڵته‌ به‌ ئه‌قڵمان ده‌كه‌یت و باو باپیرانمان به‌ بێباوه‌ڕ ده‌زانی؟ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رمووی (بلی، اني رسول الله ونبيه بعثني لابلغ رسالته، وادعوك الى الله بالحق، فوالله انه للحق، ادعوك يا ابابكر الى الله وحده لاشريك له ولا تعبد غيره والموالاة على طاعته) واته‌(به‌ڵێ، من پێغه‌مبه‌ری خوام ناردوومی تا په‌یامه‌كه‌ی بگه‌یه‌نم، به‌ هه‌ق و ڕاستی بانگت ده‌كه‌م بۆلای خوا، چونكه

[1] – دووشاخی ده‌وری مه‌ككه‌ن، هه‌رشاخێكی ڕه‌ق و توندو سه‌خت پێی ده‌وترێت ئه‌خشه‌ب.
[2] – له‌ البداية والنهاية ج٣ ص٢٩ دا هاتووه‌.

سوێند بەخوا زۆر ڕاستە، ئەبوبەکر بانگت دەکەم بۆلای خوایەك کە تاك و تەنیایەو هاوەڵی نیەو جگە لەو مەپەرستەو لەسەر گوێڕایەڵی ئەو بڕۆ)، ئینجا قورئانی بەسەردا خوێند، ئەویش نکوڵی نەکردو دانیشی پیانەنا، دواتر موسوڵمان بوو و بڕوای بە بتەکان نەماو هاوەڵ دانانی لە بیریدا لابردو دانی نا بە حەقبوونی ئیسلامدا ئەبوبەکر بە باوەڕداری و دانپیانانەوە گەڕایەوە، ئیبن ئیسحاق دەڵێت: موحەمەدی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی حوصەینی تەمیمی بۆی گێڕامەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ما دعوت احد الى الاسلام الا كانت عندي كبوة وتردد و نظر الا ابابكر، ماعكم عنه حين ذكرته ولا تردد فيه) واتە (هەر کەسێکم بانگ کردبێت بۆ ئیسلام سەرەتا داکەوتن و ڕاڕایی و بیرکردنەوەیەکی بۆ هەبووە، جگە لە ئەبوبەکر کاتێك پێم وت بەبێ وەستان و دوودڵی وەریگرت)، ئەمە ئیبن ئیسحاق هێناویەتی (نکوڵی نەکردو دانیشی پیانەنا) وانیە، چەنکە ئیبن ئیسحاق و کەسانی دیکەش باسیان کردووە کە پێش پێغەمبەرایەتی ئەبوبەکر هاوڕێی پێغەمبەر (ﷺ) بووە و دەیزانی ڕاستگۆ و سپاردەکارو ناو و ناوبانگ پاك و بەڕێزەو درۆ بەدەم خەڵکەوە ناکا تا ئێستا درۆ بەدەم خواوە بکات! بۆیە هەرکە بیستی خوا کردوویەتی بە پێغەمبەر یەکسەر بڕوای پێ کردو ڕاڕاو دوودڵ نەبوو، لە صەحیحی بوخاریشدا لە ئەبو دەردائەوە (رضي الله عنه) فەرموودەیەك لەسەر ناکۆکی نێوان ئەبوبەکرو عومەر هاتووە، تیایدا هاتووە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ان الله بعثني اليكم فقلتم كذبت وقال ابوبكر صدق، و واساني بنفيه و ماله، فهل انتم تاركو لي صاحبي؟ مرتين) واتە (خوا منی نارد بۆتان، ئێوەش وتتان درۆ دەکەیت، ئەبوبەکر وتی: ڕاست دەکەیت، بە ماڵ و گیانی لە گەڵمدا بوو، دەی واز لە هاوڕێکەم دێنن؟ دووجار وتیەوە) دوای ئەوە ئازار نەدرا. ئەمەش وەك دەق ئەوە دەڵێت یەکەم کەس بووە موسوڵمان بووە[1][2].

---

[1] – ضعيف.

[2] – له (البداية والنهاية ج٣ ص٢٦-٢٧)دا هاتووه.

# (بانگکردنی عومەری کوڕی خەتاب (ﷺ) بۆ ناو ئیسلام)

تەبەرانی لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (اللهم اعز الاسلام بعمر بن الخطاب او بابي جهل بن هشام) واتە(خوایە گیان ئیسلام عیزەتمەند بکە بە موسوڵمان بوونی عومەری کوڕی خەتاب یان ئەبو جەهلی کوڕی هیشام) خوای گەورەش نزاکەی پێغەمبەر (ﷺ)ی کردە بەشی عومەری کوڕی خەتاب، بەوە ئیسلام لەسەر دەستی بناغەی داناو بتەکان وێران بوون، هەیسەمی (ج٩ ص٦١) دەڵێت پیاوەکانی سەنەدەکەی صەحیحن جگە لە موجالیدی کوڕی سەعید، ئەویش جێمتمانەیە، تەبەرانی لە فەرموودەکەی سەوبانەوە فەرمودەکە دێنێت، وەك لە باسی خۆڕاگری هاوەڵان لەسەر سەختیەکان لەسەر سەعیدی کوڕی زەیدو فاتیمەی ژنی کە خوشکی عومەر بوو هێناویەتی،لە فەرموودەکەدا هاتووە، پێغەمبەر (ﷺ) هەردوو بن باڵی گرتو شەکاندیەوەو فەرمووی (مالذي تريد مالذي جئت؟) (چیت دەوێت بۆ چی هاتوویت؟) عومەر پێی وت: ئەوەی بانگەوازی بۆ دەکەیت بۆم بخەڕوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (تشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له، وان محمد عبده و رسوله) (شایەتی بدەیت هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواو هاوەڵی نیەو تەنهایە، موحەمەدیش بەندەو نێردراویەتی) عومەریش هەرلەوێدا موسوڵمان بوو.

ئەبو نەعیم لە (الحلية ج١ ص٤١)دا لە ئەسلەمەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەر (ﷺ) پێی وتین، حەز دەکەم باسی سەرەتای موسوڵمان بوونی خۆمتان بۆ بکەم؟ وتمان بەڵێ، وتی من سەرسەختترین دوژمنی پێغەمبەر (ﷺ) بووم، هاتم بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) لەماڵێك لەلای صەفا، لەبەر دەمیدا دانیشتمو ئەویش کراسەکەمی گرت، دوایی فەرمووی (اسلم يا ابن خطاب! اللهم اهده) (ئیبن خەتاب موسوڵمان ببە! خوایە ڕێنمونی بکەیت) منیش وتم: شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواو تۆیش نێردراوی ئەویت، موسوڵمانانیش (الله اكبر)یێکیان وت کە لە ڕێگاکانی مەککەوە دەبیسترا، ئینجا فەرموودەکە دێنێت، بەزاریش بە دەربڕینێکی دیکە هێناویەتی و دواتر دەیخەینە بەرچاو.

# (پێغەمبەر (ﷺ) بانگەوازی عوسمانی کوڕی عەففان (رضي الله عنه) دەکات)

مەدائینی لە عەمری کوڕی عوسمانەوە هێناویەتی دەڵێت، عوسمان (رضي الله عنه) وتی: چووم بۆلای پوورم ئەردای کچی عەبدولموتەلیب و سەردانم کرد، پێغەمبەریش (ﷺ) هاتە ژوورەوە، منیش سەیرم دەکرد، –ئەو ڕۆژە شتێك لە باری پێغەمبەر (ﷺ) دەرکەوت– سەیری منی کردو فەرمووی (مالك يا عثمان؟) (چی بووە ئەی عوسمان؟) وتم: سەرسامی خۆت و پلەو پایەتم لە ناوماندا کە چیت لە بارەوە دەوترێت، عوسمان وتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (لا اله الا الله) خوا دەزانێت خەریك بوو شەقم دەبرد (مەبەستی ڕاچڵەکینیەتی)، پاشان فەرمووی (وفي السماء رزقكم وما توعدون. فورب السماء والارض انه لحق مثل ما انكم تنطقون) پاشان هەستاو چوو، منیش چووم بە شوێنیدا تا پێی گەیشتم و موسوڵمان بووم، لە (الاستيعاب ج٤ ص٢٥٥)دا واهاتووە.

# (پێغەمبەر (ﷺ) بانگەوازی عەلی کوڕی ئەبو تالیب (رضي الله عنه) دەکات)

ئیبن ئیسحاق لە عەلی کوڕی ئەبوتالیبەوە (رضي الله عنه) دەڵێت چوو بۆ ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) سەیر دەکات هەردووکیان (پێغەمبەر ﷺ و خەدیجە رضي الله عنها) نوێژ دەکەن، عەلی وتی موحەمەد ئەوە چیە؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (دين الله الذي اصطفى لنفسه وبعث به رسله، فادعوك الى الله وحده لا شريك له والى عبادته وان تكفر باللات والعزى) واتە(ئەمە ئەو ئایینەی خوایە کە بۆ خۆی هەڵی بژاردووەو پێغەمبەرانی پێ ناردوون بانگت دەکەم بۆ لای خوای تەنهای بێ هاوەڵ و پەرستنی ئەو خوایەو بڕوانەبوونت بە لات و عوززا)، عەلی وتی: من پێشتر شتی وام نەبیستووە، بۆیە هیچ شتێك ناکەم تا لەگەڵ ئەبوتالیب قسە نەکەم، پێغەمبەر (ﷺ)

پێی فەرموو با ئەو نهێنیە ئاشکرا نەکات پێش ئەوەی کاتی خۆی بێت، پێی فەرموو (يا علي اذا لم تسلم فاكتم) واتە(عەلی ئەگەر موسوڵمان نابیت بیشارەوەو ئاشکرای مەکە) عەلی ئەو شەوە مایەوە، پاشان خوای گەورە ئیسلامی خستە دڵی عەلی و سبەینێ چوو بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و وتی: موحەممەد پێشنیاری چیت بۆ کردم؟ پێغەمبەریش (ﷺ) پێی فەرموو (تشهد ان لا اله الا الله وحده لا سريك له وتكفر باللات والعزى وتبرا من الانداد) واتە(شایەتی بدەیت هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خوای تاكو تەنیای بێ هاوتاو بڕوات بەلاتو عوززا نەبێتو نکوولی بکەیت لە بوونی هاوەڵو هاوبەش دانان بۆ خوا). عەلیش ئەوەی کردو موسوڵمانان بوو و بەترسی ئەبوو تالیبەوە بردیە سەرو موسوڵمان بوونی خۆی شاردەوەو نیشانی نەدا[1].[2]

ئەحمەدو جگە لەویش لە حەببەی کوڕی عورەینەوە هێناویانە دەڵێت: عەلیم بینی لەسەر مینبەر پێدەکەنی، نەمبینیبوو هیچ کات هێندەی ئەوکاتە پێبکەنێت تا ئەوەی دانەکانی دەرکەوتن، دوایی وتی: بیری قسەکەی ئەبوتالیبم کەوتەوە، ئەبوتالیب هاتو منو پێغەمبەریش (ﷺ) لە پشت خورمایەکەوە نوێژمان دەکرد، وتی:برازا گیان چی دەکەن؟ پێغەمبەریش (ﷺ) بانگی کرد بۆ ئیسلام، ئەویش وتی: ئەوەی دەیکەن قەیناکات، بەڵام هەرگیز مەمدەن بە قن دڕینا،ئەویش لەتاو سەرسامی بە قسەکەی باوکی پێ کەنی، پاشان وتی خوایە هیچ بەندەیەکی ناو ئەم ئوممەتە ناناسم پێش من پەرستشی بۆ تۆ کردبێت، جگە لە پێغەمبەرەکەت –سێ جار وتیەوە– پێش ئەوەی خەڵکی نوێژ بکەن من نوێژم دەکرد.[3]

---

[1] – ضعيف

[2] – لە البدايە ج٣ ص٢٤ داهاتووە.

[3] – هەیسەمی (ج٩ ص١٠٢) دەڵێت ئەحمەدو ئەبو یەعلاش بە کورتی و بەزارو تەبەرانی لە (الاوسط) دا هێناویانەو سەنەدەکەشی حەسەنە.

# (پێغەمبەر (ﷺ) عەمری کوڕی عەبەسە (رضي الله عنه) بۆ ئیسلام بانگ دەکات)

ئەحمەد (ج٤ ص١١٢) لە شەدادی کوڕی عەبدوڵڵاوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبو ئوسامە وتی: ئەی عەمری کوڕی عەبەسە بە چ شتێك بانگەشەی ئەوە دەکەیت تۆ پیاوێکی ئیسلامیت؟ ئەویش وتی: من لە نەزانیدا خەڵکم بە گومڕاو بتەکانم بە هیچ دەزانی، پاشان گوێم لە کەسێك بوو هەواڵی لەسەر مەککە دەوت و هەندێ شتی دەوت، منیش سواری وڵاخەکەم بووم تا هاتمە مەککە، لەوێ بەنهێنی پێغەمبەر (ﷺ)م بە نهێنی دی، چونکە هۆزەکەی چاویان لەسەر بوو، منیش چوومە ژوورەوە، پێم وت: تۆ چیت؟ فەرمووی (انا نبي الله) (من پێغەمبەری خوام) وتم: پێغەمبەری خوا چیە؟ فەرمووی (رسول الله) (نێردراوی خوا) وتم: خوا تۆی ناردووە؟ فەرمووی بەڵێ، وتم: تۆی بە چ شتێك ناردووە(پەیامەکەت چیە؟) فەرمووی (بان یوحد الله ولایشرك به شیئا و کسر الاوثان و صلة الرحم) واتە(بەوەی خوا بە تاك و تەنها دابنرێت و هیچ هاوەڵێکی بۆ دانەنرێت و بتەکان بشکێنرێن و پەیوەندی خزمایەتی هەبێت)، منیش وتم: لەم کارەتدا کێت لەگەڵدایە؟ فەرمووی (حر وعبد) (ئازاد و کۆیلە) ئەبوبەکری کوڕی ئەبو قوحافە و بیلالی مەولای ئەبوبەکری لەگەڵدا بوو، منیش وتم: دەی منیش شوێنت دەکەوم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی تۆ ئەمڕۆ ئەوەت پێ ناکرێت بگەڕێرەوە بۆلای کەس و کارت ئەگەر بیستت پەیاکەم کەوتە ڕوو پەیوەستم ببە، منیش گەڕامەوە و موسوڵمان بووم، پێغەمبەریش (ﷺ) کە کۆچی کرد بۆ مەدینە هەواڵم وەرگرت تا کاروانێکی یەسریب هات، وتم ئەو کەسە مەککیە کێیە کە هاتووە بۆلاتان؟ وتیان: کەسانی خۆی ویستیان بیکوژن، نەیانتوانی و نێوانیان تێکەوت و خێرا بەجێمان هێشت، عەمری کوڕی عەبەسە دەڵێت: سواری وڵاخەکەم بووم تا چوومە مەدینە و چووم بۆلای و وتم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا دەمناسیت؟ فەرمووی (نعم الست انت الذي اتیتني بمکة؟) (بەڵێ مەگەر تۆ

ئەوە نە بوویت لە مەککە هاتیت بۆلام؟) وتم: بەڵێ، ئینجا وتم ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەی خوا فێری کردوویت و من نایزانم فێرم بکە، ئنجا فەرموودەکە دێنێت[1،2].

هەروەها ئەحمەد (ج٤ ص١١١) لە ئەبو ئومامەوە لە عەمری کوڕی عەبەسەوە هێناویەتی و فەرموودەکەی هێنا، تیایدا هاتووە (وتم بەچی تۆی ناردووە؟ فەرموی (بان توصل الارحام و تحقن الدماء وتامن السبل و تكسر الوثان و يعبد الله وحده لا شريك به شيئ) واتە(پەیوەندی خزمایەتی بەجێ بگەیەنیت و ڕێ بە خوێن ڕشتن نەدەیت و ڕێگەمان دڵنیا بکەیت و بتەکان بشکێنیت و خوای تاك و تەنها بپەرستیت و هیچ هاوەڵێکی بۆ دانەنێیت) وتم: ئەوەی پێی ناردویت شتێکی زۆر باشە، من شاهیدی دەدەم و باوەڕت پێ دێنم (عەمدوێ)، لەگەڵتدا بمێنمەوە یان چیت پێ باشە پێغەمبەر (ﷺ)؟ فەرمووی پێ دەچێت ڕق و بێزاری خەڵك لەسەر ئەوەی پێی هاتووم بەدی بکەیت، بۆیە لەناو کەس و کاری خۆتدا بمێنەوە، ئەگەر بیستتان دەرچووم بێن بۆلام[3،4].



[1] - صحيح

[2] - (ئیبن سەعد ج٤ ص١٥٨) لە عەمری کوڕی عەبەسەوە بە دوورو درێژی هێناویەتی.

[3] - صحيح

[4] -موسلیم و تەبەرانی و ئەبو نەعیم هێناویانە، لە (الاصابە ج٣ ص٦)یشدا هاتووە ئیبن عەبدولبیر لە الاستیعاب (ج٢ ص٥٠٠)دا لە ڕێگەی ئەبو ئوسامەوە بە دوورو درێژی هێناویەتی، ئەبو نەعیمیش لە دلائل النبوه ص٨٦ دا هێناویەتی.

# (پێغەمبەر (ﷺ) بانگەوازی خالیدی کوڕی سەعیدی عاص(ﷺ) دەکات)

بەیهەقی لە جعفەری کوڕی موحەمەدی کوڕی خالیدی کوڕی زوبەیر لە باوکیەوە- یان لە موحەمەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عوسمانەوە- هێناویەتی: دەڵێت: موسوڵمان بوونی خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص کۆنە، ئەو یەکەم کەسی ناو براکانی بوو کە موسڵمان بوو، سەرەتای موسڵمان بوونی ئەوە بوو لە خەویدا بینی لە کەناری ئاگردا وەستێنراوە - باسی فراوانی ئاگرەکە دەکات کە هێندەی خوا خۆی دەزانێت فراوان بووە- لە خەوەکەدا وا دەبینێت کەسێك هات بوڵای و فڕێی دەدایە ناو ئاگرەکەو پێغەمبەریشی (ﷺ) بینی دەیگرت تا نەکەوێتە ناویەوە، لە خەوەکەیدا ترسا ئینجا کەهەستا لەخەو سوێند بەخوا ئەم خەوە ڕاستە، ئەبوبەکری کوڕی ئەبو قەحافەی بینی و باسی ئەوەی بۆ کرد، ئەبوبەکریش وتی خێری تیابووە ئەوە پێغەمبەری خوایە (ﷺ) دەی شوێنی بکەوە چونکە ئەگەر شوێنی بکەویت لەگەڵیدا دەچیتە ناو ئیسلام، ئیسلامیش ڕێ نادات بچیتە ناو دۆزەخ لە کاتێکدا باوکت کەوتۆتە ناو دۆزەخەوە ئەویش گەشت بە پێغەمبەر (ﷺ) لەوکاتەدا پێغەمبەر (ﷺ) لە ئەجیاد بوو وتی ئەی پێغەمبەری خوا! ئەی موحەمەد! بانگەواز بۆچی دەکەیت؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ادعوك الى الله وحده لا شريك له وان محمدا عبده ورسوله وتخلع ما انت عليه من عبادة حجر لايسمع ولا يبصر ولا ينفع ولا يدري من عبده ممن لا يعبده) واتە(بانگت دەکەم بوڵای خوای تاك و تەنهای بێ هاوەڵ و ئەوەی موحەمەد پێغەمبەرو بەندەیەتیی واز لە پەرستنی ئەو بتانە بهێنیت کە لە بەرد دروست کراون و نابیستن و نابینن و سودیان نیە و نازانن کێ دەیانپەرستێت و کێ نایانپەرستێت) خالید وتی: شایەتی دەدەم هیچ خوایەك نیە جگە لە الله، تۆش پێغەمبەری خوایت: پێغەمبەر (ﷺ) بە موسوڵمان بوونی دڵخۆش بوو، خالید دوور کەوتبوویەوەو باوکی بە موسڵمان

بوونی زانی بوو، بۆیە ناردی بە شوێنیداو هێنایان، بەوپەڕی توندیو گوڕەشەوە دواندیو بە داردەستێك کەلە دەستیدا بوو لێیداو شکاندیەوە بەسەریدا، وتی سوێند بە خوا نانت لیٚ دەگرمەوە، خالید وتی ئەگەر لێم دەگریتەوە خوا هێندە ڕۆزیم دەدات پێی بژیم، چوو بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەویش ڕێزی لیٚ گرتو پێکەوە بوون.[1]

حاکمیش لە (المستدرك ج٣ ص٢٤٨) لە ڕێگەی واقدی لە جەعفەری کوڕی موحەمەدی کوڕی خالیدی کوڕی زوبەیر لە موحەمەدی کوڕی عەبدەڵلای کوڕی عەمری کوڕی عوسمانەوە هێناەیەتیو تیایدا هاتووە: باوکی کورەکانی تری(ئەوانەی موسڵمان نەببوون) نارد بەشوێنیدا لەگەڵ ڕافعی مەولایدا، ڕافع دۆزیەوەو هێنایان بۆلای ئەبو ئوحەیحەی باوکیان، ئەویش پیایدا هەڵشاخاو بە پیسی دواندیو بەدارێکی دەستی لێیدا تا شکاندیەوە بەسەریدا، پاشان وتی شوێن موحەمەد دەکەویتو دەشی بینیت پێچەوانەی هۆزەکەی خۆیەتیو خواوەندەکانیان بەکەم دەزانێتو ڕابردووی باوباپیرانی بە سووك سەیر دەکات؟ خالید وتی سوێند بەخوا ڕاست دەکاتو شوێنی دەکەوم، ئەبو ئوحەیحەی باوکی تووڕەبوو جنێوی پێداو دوایی وتی: بڕۆ کۆیلە، بۆ کویٚ دەچی بڕۆ، سوێند بەخوا نانت لیٚ قەدەغە دەکەم خالید وتی ئەگەر لێم بگریتەوە ئەوا خوای گەورە هێندە ڕۆزیم دەدات پێی بژیم، ئەویش دەری کردو بە کوڕەکانی وت: کەستان قسەی لەگەڵ نەکات مەگەر بەو جۆرەی من دواندم، خالیدیش چوو بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەویش ڕێزی گرتو پێکەوە بوون،[2] لە (الاستیعاب ج١ ص٤٠١) یشدا لەڕێگەی واقدیەوە بەو جۆرە هێناویەتیو ئەمەش دێنێت: لە باوکی دوورکەوتەوەو لە

---

[1] - لە البداية والنهاية ج٣ ص٣٢ دا واهاتووە

[2] - ئیبن سەعد ج٤ ص٩٤ لە واقدی لە جەعفەری کوڕی موحەمەدی کوڕی عەبدوڵلاوە بەو جۆرە بەدووررو درێژی هێناویەتی،

دەوروبەری مەککە بوو تا هاوەڵانی پێغەمبەر (عليه السلام) چوون بۆ خاکی حەبەشە لە کۆچی دووەمیاندا، خالیدیش یەکەم کەس بوو کۆچی کردبۆ حەبەشە،حاکم (ج٣ ص٣٤٩) لە خالیدی کوڕی سەعیدەوە هێناویەتی کە سەعیدی کوڕی عاصی کوڕی ئومەیە نەخۆش کەوتو وتی ئەگەر خوا لەم نەخۆشیە چاکم بکاتەوە ئەوا خواوەندی کوڕی ئەبو کەبشە لەناو مەککەدا هەرگیز ناپەرستێت خالیدی کوڕی سەعید ئەوکات وتی خوایە ڕاست ئەبێتەوە بۆیە بەو نەخۆشیەوە مرد[1].[2]



## (پێغەمبەر (عليه السلام) بانگەوازی زەماد (رضي الله عنه) دەکات)

موسلیم و بەیهەقی لە ئیبن عەباسەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: چماد – پیاوێکی ئەزدی شەنوئە بوو– هات بۆ مەککە گوێی لە هەندێ گەمژەی خەڵکی مەککە بوو دەیانوت: موحەمەد شێتە، ئەویش وتی: ئەو پیاوە لە کوێیە؟ بەڵکو خوا لەسەر دەستی من شیفای بدات، چووم بۆلای موحەمەد وتم من نوشتە دەکەم بۆ چاک بوونەوەی شێتی، خوای گەورە کێی بوێت لەسەر دەستی من شیفای دەدات، دەی وەرە، موحەمەد فەرمووی (ان الحمد لله نحمده ونستعينه، من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له، اشهد ان لا اله لا الله وحده لا شريك له) واتە(سوپاسی خوا دەکەین و پشتی پێ دەبەستین، هەرکەس خوا ڕێنموونی بکات گومڕایی بۆ نیە،هەرکەسیش گومڕابێت ڕێنموونی بۆ نیە، شایەتی دەدەم هیچ پەرەستراوێك نیە جگە لە خوای تەنهای بێ هاوەڵ) سێ جار ئەمەی فەرموو، ئەویش وتی: سوێند

---

[1] – ضعيف

[2] – ئیبن سەعدیش ج٤ ص٩٥ بەو جۆرە هێناویەتی.

بەخوا گوێم لە قسەی فاڵچی و جادووگەرو شاعیران بووە، بەڵام شتی وام نەبیستووە، دەستت بێنە با بەیعەتی موسڵمان بوونت پێ بدەم، پێغەمبەریش (ﷺ) بەیعەتی پێ داو پێی وت فەرموو: بەیعەتی هۆزەکەشتم پێ بدە (بانگیان بکەیت بۆ ئیسلام) ئەویش بەیعەتی پێدا، دوایی پێغەمبەر (ﷺ) سوپایەکی نارد دایان بەپاڵ هۆزی زەمادا، بەرپرسی سوپاکە بە سریەکەی وت: هیچتان لەو هوزە بردووە یەکێکیان وتی: من پاککەرەوەیەکم لێ بردن (مەسینە) ئەویش وتی بیگێڕەوە بۆیان چونکە ئەوانە کەسانی زەمادن، لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا: زەماد پێی وت: قسەکانت دووبارە بکەرەوە بۆم، چونکە گەیشتوونەتە نێوەندی دەریا (واتە لەوپەڕی بەهێزیدان).[1]

نەسائی و بەغەوی و موسەددەدیش لە موسنەدەکەیداو ئیبن حەجەر لە الاصابە ج٢ ص٢١٠ دا هێناویانە، ئەبونەعیمیش لە دلائل النبوة ص٧٧ لە ڕێگەی واقدیەوە هێناویەتی دەڵێت: موحەمەدی کوڕی سولەیت لە باوکیەوە لە عەبدولڕەحمانی عەدویەوە بۆی گێڕامەوە وتی: چووم بۆ مەککە تا عەمرە بکەم، لە کۆڕێکدا دانیشتم ئەبوجەهل و عوقبەی کوڕی ڕەبیعەو ئومەیەی کوڕی خەلەف تێدا بوون، ئەبوجەهل وتی: ئەم پیاوە(مەبەستی پێغەمبەر (ﷺ) ە نێوانی تێکداوین و بە سووك سەیری هیواکانمان دەکات و ئەوەمان مردووە بە گومڕای دەزانێت و گاڵتە بە خواوەندەکانمان دەکات ئومەییە وتی: بێگومان شێتە، زەماد وتی: منیش ئەم قسەیەم لای خۆم لێکدایەوەو وتم من کەسێکم توشبوانی شێتی چاك دەکەمەوە، لە کۆڕەکە هەستام چووم بە دوای پێغەمبەر (ﷺ) بەڵام ئەو ڕۆژە نەمبینی، بەیانی هات و چووم بۆلای دەبینم لە پشت مەقامەوە نوێژ دەکات، منیش دانیشتم تا لێبوویەوە، پاشان لای دانیشتم و وتم: کوڕی عەبدولموتەلیب! ئەویش ڕووی تێکردم و فەرمووی (ماتشاء) چیت دەوێت؟؟ وتم: من چارەسەری توشبووانی شێتی

[1] – لە البدایە و النهایە ج٣ ص ٣٦ دا واهاتووە.

دەکەم، ئەگەر حەز دەکەیت چارەسەرت دەکەم، شتەکەت لەسەر سەخت نەبێت، من چارەسەری کەسی وام کردووە کە لە تۆ زیاتر تووش بووە و چارەسەری وەرگرتووە،من گوێم لە هۆزەکەت بوو چەند خەسڵەتێکی خراپی تۆیان دەوت کە رێزت تێك داون و ئەوەیان مردووە بە گومڕای دەزانی و گاڵتە بە خواوەندەکانیان دەکەیت، تەنها کەسێك ئەمە دەکات کە جۆرە شێتیەك لێی دابێت، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (الحمد لله احمده و استعينه، و اؤمن به و اتوكل عليه، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلله فلا هادي له، و اشهد ان لا اله الا الله وحده لا شريك له و اشهد ان محمد عبده و رسوله) زەماد دەڵێت: قسەیەکم بیست هیچ کات شتی وام لەوە جوانتر نەبیستبوو، دوام کرد دووبارەی بکاتەوە بۆم، ئەویش دووبارەی کردەوە، وتم: بانگەواز بۆچی دەکەیت؟ فەرمووی (الى ان تؤمن بالله وحده لا شريك له و تخلع الاوثان من رقبتك و تشهد اني رسول الله) واتە(بۆ بڕواهێنانت بە خوای تاکی بێهاوتا و لابردنی پەرستشی بتەکان لەسەر گەردنت و شایەتی بدەیت من پێغەمبەری خوام)، وتم: ئەگەر ئەمە بکەم چیم بۆ دەبێت؟ فەرمووی (لك الجنة) (بەهەشتت بۆ دەبێت) منیش وتم: شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواو پەرستشی بتەکان لەسەر گەردنم ناهێڵم و نکووڵیان لێ دەکەم و شایەتی دەدەم تۆ بەندەو پێغەمبەری خوایت، ئینجا لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەستام تا چەند سوورەتێکی قورئان فێر بووم، پاشان گەڕامەوە بۆ ناو هۆزەکەم، عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولڕەحمانی عەدوی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) عەلی کوڕی ئەبوتالیبی (رضي الله عنه) بەسریەیەکەوە ناردو لە شوێنێك بیست وشتریان گرت و بەڕێیان خستن، عەلی کوڕی ئەبوتالیب بیستی ئەوانە لە هۆزی زەمادن(رضي الله عنه) بۆیە وتی: بیانگێڕنەوە بۆیان، ئەوانیش بیست وشترەکەیان بۆ گێڕانەوە.



# (پێغەمبەر (ﷺ) بانگەوازی حوصەینی باوکی عیمران (رضي الله عنه) دەکات)

ئیبن خوزەیمە لە عیمرانی کوڕی خالیدی کوڕی تەلیقی کوڕی عیمرانی کوڕی حوصەینەوە هێناویەتی دەڵێت: باوکم لە باوکیەوە لە باپیریەوە بۆی گێڕامەوە کە قورەیش هاتن بۆلای حوصەین -چونکە بە گەورە سەیریان دەکرد- پێیان وت: لەگەڵ ئەو پیاوە قسەمان بۆبکە چونکە قسە بە خواوەندەکانمان دەڵێت، لەگەڵی هاتن تا نزیکی ماڵ پێغەمبەر (ﷺ) بوونەوە، ئەویش وتی: ڕێ بە شێخ بدەن با بێت - عیمران و هاوەڵەکانیشی لەوێ بوون- حوصەین وتی: ئەمە چیە لەسەر تۆ دەیبیستین جنێو بە خواوەندەکانمان دەدەیتو بە خراپە باسیان دەکەیت، خۆ باوکت چاكو ڕێك بوو؟ پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (يا حصين ان ابي و اباك في النار، يا حصين! كم تعبد من اله؟) واتە(ئەی حوصەین باوکی منو باوکی تۆیش لە دۆزەخدان، حوصەین تۆ چەند خوا دەپەرستیت؟)، حوصەینی وتی: حەوت خوا لە زەویو یەك لە ئاسماندا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (فاذا اصابك الضر من تدعو؟) (کە ناڕەحەتیەکت تووش بوو لەکامیان دەپاڕێیتەوە؟)، وتی:(ئەوەی لە ئاسمانە)، فەرمووی (فاذا هلك المال من تدعو؟) (ئەگەر ماڵو سامانت نەما لە کێ دەپاڕێیتەوە؟)، وتی: ئەوەی لە ئاسمانە، فەرمووی (فيستجيب لك وحده و تشركه معهم ارضيته في الشكر ام تخاف ان يغلب عليك؟)، وتی: نا هیچکام لەو دوانە نا، زانیم من وەك ئەو قسە ناکەم، فەرمووی (يا حصين اسلم تسلم) (حوصەین موسوڵمان ببە پارێزراو دەبیت) بە منی وت: من هۆزو خێڵم هەیە چییان پێ بڵێم؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (قل: اللهم استهيك لارشد امري و زدني علما ينفعني) (بڵێ: خوایە داوای ڕێنموونیت لێ دەکەم تا ڕێم دروست بێت، خوایە زانستم زیاد بکە تا سوودم پێ بگەیەنێت)) حوصەین ئەمەی وتو هەڵنەسا تا موسڵمان بوو، عیمران هەستاو سەرو دەستو پێکانی ماچ کرد، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی

بینی گریا و فه‌رمووی (بكيت من صنيع عمران، دخل حصين وهو كافر فلم يقم اليه عمران ولم يلتفت ناحيته، فلما اسلم قضى حقه فدخلني من ذالك الرقة) واته(هه‌لویستی عیمران گریاندمی، حوصه‌ین به‌بێباوه‌ری هاته ژووره‌وه‌و عیمران له‌رووی هه‌لنه‌ساو لای به‌لادا نه‌کرده‌وه، به‌لام که موسلمان بوو ماف به جێگه‌یاند، ئیتر ئه‌وه وایلێکردم بگریم). حوصه‌ین کاتێك ویستی بچێته ده‌ره‌وه پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) به هاوه‌لهکانی فه‌رموو (قوموا فشيعوه الى منزله) (هه‌ستن به‌ره‌و مالی خۆی به‌رێی که‌ن) کاتێك له ده‌رگاکه چوویه ده‌ره‌وه قوره‌یش بینییان وتیان هه‌لخه‌له‌تا، ئینجا جیابوونه‌وه.[1][2]



[1] – ضعيف.

[2] – له الاصابة ج١ ص٣٣٧ دا واهاتووه.

# (پێغەمبەر (ﷺ) بانگەوازی پیاوێك دەكات كە ناوی نەهاتووە)

ئەحمەد لە ئەبو تەمیمەی هەجیمیەوە لە پیاوێكی ناو هۆزەكەیەوە دەگێڕێتەوە كە هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ), یان وتی پێغەمبەرم (ﷺ) بینی و پیاوێك هات بۆلای وتی: تۆ پێغەمبەری خوایت؟ یان وتی تۆ موحەمەدیت؟ فەرمووی بەڵێ، وتی بانگەواز بۆچی دەكەیت؟ فەرمووی (ادعوالله عز و جل وحده من اذا كان بك ضر فدعوته كشفه عنك، و من اذا اصابك عام فدعوته انبت لك، ومن اذا كنت في ارض قفز فاضللت فدعوته رد عليك) واتە(بانگەواز بۆ خوایەكی تاكو تەنها دەكەم كە ئەگەر زیانێكت تووش بوو لێی دەپاڕێیتەوە (رضي الله عنه) زیانەكەت لەسەر لا دەبات، ئەگەر برسی و قاتی و قڕیت تووش بوولێی دەپاڕێیتەوەو دێت بە هاناتەوە، ئەگەر لە زەویەكی چۆڵ و وێڵدا ڕێت لێ تێكچوو لێی دەپاڕێیتەوە دەتگەڕێنێتەوە) پیاوەكەش موسڵمان بوو و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئامۆژگاریەكم بكە، فەرمووی (لا تسبن شيئا- او قال احدا) (جنێو بە هیچ مەڵێ- یان فەرمووی جنێو بە كەس مەڵێ)، وتی لەو كاتەوەی پێغەمبەر (ﷺ) وەسیەتی بۆ كردم قسەم بە وشترو مەڕێكیش نەوتووە.[1]



[1]- هەیسەمی (ج٨ ص٧٢) دەڵێت: لە سەنەدەكەیدا حەكەمی كوڕی فوزەیل هەیە كە ئەبو داودو جگە لەویش متمانەی پێ دەدەن، بەڵام ئەبوزەرعەو جگە لەویش بە لاوازی دەزانن، كەسەكانی دیكەی سەنەدەكە صەحیحن.

# (پێغەمبەر (ﷺ) بانگەوازی موعاویەی کوڕی حیدە (رضي الله عنه) دەکات)

ئیبن عەبدولبیر لە الاستیعابدا بە صەحیحی لە موعاویەی کوڕی حیدەی قوشەیریەوە هێناویەتی دەڵێت: هاتمە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا نەهاتووم بۆ لات تا هێندەی ژمارەی مێرووەکان سوێندم خواردووە- ناو لەپی ئەم دەستی دەدا بەسەر ئەو دەستی دیکەیدا – تا نەیەمە لای خۆت و ئایینەکەت، هاتووم بۆ شتێك هیچی لێ نازانم مەگەر تەنها خوا فێرم بکات، لەبەر خوا لێت دەپاڕێمەوە پەروەردگارمان لە ڕێی تۆوە چی بۆ ناردووین؟ فەرمووی (بدین الاسلام) (ئاییینی ئیسلام) وتی ئاییینی ئیسلام چییە؟ فەرمووی (ان تقول اسلمت وجهي و تغليت و تقيم الصلاة و تؤتي الزكاة وكل مسلم على كل مسلم محرم اخوان نصيران، لا يقبل الله ممن اشرك بعدما اسلم عملا حتى يفارق المشركين، ما لي امسك بحجزكم عن النار! الا و ان ربي داعي و انه سائلي هل بلغت عبادي؟ فاقول رب قد بلغت الا فليبلغ شاهدكم غائبكم، الا انكم تدعون مفدمة افواهكم بالفدام، ثم ان اول شيئ ينبئ عن احدكم لفخذه وكفه) واتە(بڵێیت وا خۆم دا بەدەست خواوەو لەبەردەمیدا موسوڵمان بووم وازم لە پەرستنی جگە لە خوا هێنا و نوێژ بکەیت و زەکات بدەیت و، هەموو شتێکی موسوڵمان لە موسوڵمان حەرامە، برای سەرخەری یەکن، خوای گەورە هیچ لەکەسێك وەرناگرێت کە لە دوای موسڵمان بوون کارێك بکات تا لە بێباوەڕان جیا نەبێتەوە، من ناتوانم لە دۆزەخ بتانگێڕمەوە (تەنها ئەوەی ئاگارتان دەکەمەوە) خوای گەورە بانگم دەکات و پرسیارم لێ دەکات پەیامەکەت بە بەندەکانم گەیاند؟ منیش دەڵێم: پەروەردگارا! گەیاندم، دەی ئەوەتان ئامادەیە با بیگەیەنێت بەوەی ئامادەنیە، پاشان دواتر بەدەم

داخراوی بانگ دەکرێن، یەکەم شت هەواڵتان لەسەر دەدات دەستو ڕانتانە). وتم: ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەمە ئایینەکەمانە؟ فەرمووی: ئەوە ئایینەکەتەو لە هەرکوێدا چاکە بکەیت (ئەمە بە چاکی بکەیت) بەستە، دوایی هەموو فەرموودەکەی هێناوە[1][2].

ئیبن حەجەر لە الاصابە ج١ ص٣٥٠ دا دەڵێت: بەڵام دەکرێت ئەمەی دواتر بێت، دووریش نیە دوان یەك پرسیار بێنن، بەتایبەت لەگەڵ جیاوازی هێنانەکەیدا، ئیبن ئەبی عاصم هێناویەتیو فەرموودەکەی لە عەبدولوەهابی کوڕی نەجدەوە کە حوگی مامۆستای ئیبن ئەبی خەیسەمەی تێدایە هێناویەتی.



[1] - ضعیف

[2] -ئەم فەرموودە صحیحەو سەنەدەکەی چەسپاو و ناسراوەو فەرموودەی موعاویەی کوڕی حیدەیە نەوەك حەکیمی کوڕی ئەبو موعاویە، پێشتر حەکیم فەرموودەیەکی هێناوە کە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خوای گەورەمان بەچی تۆی ناردووە؟ فەرمووی (تعبد الله ولا تشرك به شيئا و تقيم الصلاة و تؤتي الزكاة وكل مسلم على مسلم محرم، هذا دينك و اينما تكن يكفيك) ئیبن خەیسەمە بەوجۆرە هێناویەتی، لەسەر ئەم سەنەدە قسە هەیەو سەنەدەکە لاوازە. لە الستيعاب ج١ ص٣٢٢ دا بەو جۆرە هاتووە.

# (پێغەمبەر (ﷺ) عەدی کوڕی حاتەم (رضي الله عنه) بەرەو ئیسلام بانگ دەکات).

ئەحمەد لە ئیبن حاتەمەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك بیستم پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەرچوو زۆر ڕقم لەوە بوو، چووم تا گەیشتمە دەوروبەری ڕۆم، لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا تا چوومە لای قەیسەر، ئەو شوێنەم زیاتر ڕق لێ بوو لە دەرچوونی پێغەمبەر (ﷺ)، وتم:سوێند بەخوا ئەگەر بچم بۆلای ئەو پیاوە ئەگەر درۆزن بێت زیانم پێ ناگەیەنێت، ئەگەریش ڕاستگۆ بێت دەزانم، چووم تا هاتمە لای، کاتێك هاتم خەڵکی دیتیان ئیبن حاتەمە، چووم بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (یا عدي بن حاتم! افلم تسلم) (عەدی کوڕی حاتەم موسوڵمان بە پارێزراویت، سێ جار ئەمەی فەرموو، وتی من لەسەر ئاییینێکم، فەرمووی (انا اعلم بدینك منك) (من لە تۆ زیاتر شارەزای ئاییینەکەتم) وتم: تۆ لە من زیاتر شارەزای ئاییینەکەمی؟ فەرمووی (اما اني اعلم الذي یمنعك من الاسلام، تقول انما اتبعه ضعفة الناس ومن لا قوت لهم وقدر منهم العرب، اتعرف الحیرة؟) واتە(من دەزانم چی ناهێڵێت موسوڵمان بیت، دەڵێیت کەسانی لاوازو بێ هێزو ئەوانەی عەرەب دەریکردوون، تۆ شارەزای حیرە هەیت)[1]؟ وتم: نەمبینیوە بەڵام شتم لەسەر بیستووە، فەرمووی (فوالذي نفسي بیده لیتمن الله هذا الامر حتى تخرج الظعیلة من الحیرة حتى تطوف بالبیت في غیر جوار احد، ولیفتحن الله کنوز کسری بن هرمز) واتە(دەی سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە خوای گەورە ئەم کارە دەباتە سەر تا ئافرەت بەتەنها لە حیرەوە دێتو تەواف کەعبە دەکاتو کەس چاودێرو پاسەوانی نیە، خوای گەورەش سامانی خەزێنەی کیسرای کوڕی هورمز فەتح دەکات) وتم سامانو خەزێنەی هورمز؟ فەرمووی بەڵێ: کیسرای کوڕی هورمز (ولیبذلن المال حتى لا یقباه احد) واتە(پارەکە خەرج دەکرێو دابەش دەکرێت تا

---

[1] شارێکی دێرینە لە پاڵ کوفەدا.

ئەوەی کەس ئامادەنیە وەریبگرێت). عەدی دەڵێت ئەو ئافرەتە دێت و بەبێ پاسەوان تەواف کەعبە دەکات و خۆیشم لەناو فەتح کردنی سامانی کیسرادا بووم، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە سێبەمیش دێتە دی، چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی[1][2].

هەروەها ئەحمەد لە عەدیەوە هێناویەتی وتی: ئەسپەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هات و من لە عەقرەب بووم، پوورم و چەندێکی دیکەیان بردن بۆ کوێ؟، کاتێك هێنایانە لای وتی: وەسفی بۆ بکەن، پوورم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا وەفدەکە هاتن و کوڕم لانەما و منیش پیرە ژنێکی پەککەوتەم و خزمەتگوزارم نیە، یارمەتیەکم بدە خوا یارمەتیت بدات. فەرمووی کێ وەفد بوو؟ وتی: عەدی کوڕی حاتەم، فەرمووی (الذي فر من الله ورسوله) واتە(ئەوەی لە خواو پێغەمبەرەکەی ڕایکرد؟) وتی: دەی ئەم منەتەم پێببەخشە، کاتێك گەڕایەوە و لای دابەزی – وادەزانین دەڵێت: پوورم هات بۆلام و وتی: کارێکت کردووە باوکت نەیکردووە، وتی بەحەز بێت یان بەترس بێت دەچیت بۆلای، فلان کەس هات بۆلای ئەوەی دەستکەوت و فلانکەس وای بەرکەوت–، منیش هاتم بۆلای ژنێك و منداڵی لەلا بوو – یان یەك منداڵ– باسی نزیکی ئەوانی لە خۆیەوە کرد، ئینجا زانیم ئەمە وەك پاشای کیسراو قەیسەر نیە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (یا عدي بن حاتم ما افرك؟ افرك ان يقال لا اله الا الله فهل من اله الا الله؟ ما افرك؟ افرك ان يقال الله اكبر فهل شيئ هو اكبر من الله عز وجل) واتە(عەدی چی وایکرد ڕابکەیت؟ ئەوەی بوترێت هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خوا، مەگەر جگە لە خوا هیچ پەرستراوێك هەیە؟ ئەوە وایکرد ڕابکەیت نەوەك بوترێت خوا گەورەترینە، مەگەر لە خوای گەورە گەورەتر

[1] – حسن.

[2] – لە البدایە والنهایە ج٥ ص٦٦ دا هاتووە، بەغەویش لە موعجەمەکەیدا بەو واتایە هێناویەتی، لە الاصابە ج٢ ص٤٦٨ یشدا هاتووە.

هەیە؟) منیش موسڵمان بووم، سەیرمکرد ڕووی گەش و موژدەبەخش بوو فەرمووی (ان المغضوب علیهم الیهود وان الضالین النصاری) (ئەوانەی غەزەبیان لێ گیراوە جوولەکەن، گومڕاکانیش مەسیحیەکانن) پاشان پرسیاریان لێکرد، ئەویش سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کرد پاشان فەرمووی (اما بعد فلکم ایها الناس ان ترضخوا من الفضل ارتضختم امرؤ بصاع، ببعض صاع، یقبضه ببعض قبضة، شوعبە دەڵێت: زیاتر وا گومان دەبەم فەرمووی (بتمرة بشق تمرة، وان احدکم لاقی الله فقائل ما أقول: ألم أجعلك سمیعا بصیرا؟ ألم أجعل لك مالا وولدا؟ فماذا قدمت؟ فینظر من بین یدیه ومن خلفه وعن یمینه وعن شماله فلا یجد شیئا فما یتقی النار الا بوجهه، فاتقوالنار ولو بشق تمرة، فان لم تجدوه فبکلمة لینة، انی لا أخشی علیکم الفاقة، لینصرکم الله ولیعطینکم -أو لیفتحن علیکم- حتی تسیر الظعیلة بین الحرة ویثرب ان أکثر ما یخاف السرق علی ضعینتها).[1]



[1]- ترمزی گێڕاویەتیەوە و دەڵێت: فەرمودەکە حەسەنی غەریبە، تەنها لە فەرموودەکەی سەماکەوە بینیومانەو بەیهەقیش هەندێکی کۆتاییەکەی هێناوە، بوخاریش بەکورتی هێناویەتی، لە البدایة والنهایة ج٥ ص٦٥ یشدا هاتووە.

# (پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) بانگه‌وازى زيلجه‌وشه‌نى زه‌بابى (رضي الله عنه) ده‌كات)

ته‌به‌رانى له‌ زيلجه‌وشه‌نى ضةبابييه‌وه‌ ده‌گێڕته‌وه‌ ده‌ڵێت: پاش ئه‌وه‌ى پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) له‌ شه‌ڕى به‌در بوويه‌وه‌ كوڕى قه‌رحائم برد بۆلاى پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم)و وتم موحه‌مه‌د وائل بن قرحائم بۆ هێناويت تا بيگريت. فه‌رمووى (لا حاجة لي فيها، و ان اردت اقضيك بك المختار من دروع بدر فعلت) واته‌(هيچ پێويستيه‌كم پێى نيه‌، ئه‌گه‌ريش پێت خۆشه‌ له‌ جياتى قه‌ڵغانه‌كانى به‌در ده‌تده‌مێ) منيش وتم: ئه‌مڕۆ هيچ بايه‌خه‌كى بۆم نيه‌ تا بيگۆڕمه‌وه‌، پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) فه‌رمووى (لا حاجة لي فيه) (منيش هيچ پێويستيه‌كم پێى نيه‌) پاشان فه‌رمووى (يا ذا الجوشن! الا تسلم فتكون من اول هذا الامر؟) واته‌(موسوڵمان نابيت تا ببيته‌ يه‌كه‌مى ئه‌م كاره‌؟) وتم: ده‌بينم هۆزه‌كه‌ت گيرۆده‌ت ده‌كه‌ن، فه‌رمووى (كيف بلغك عن مصارعهم ببدر؟) واته‌(له‌سه‌ر له‌ناوچوونيان له‌ به‌در چۆنت بيستووه‌؟) وتم: بيستوومه‌و هه‌واڵم پێ گه‌يشتووه‌، فه‌رمووى (فانا نهدى لك) وتم: يا به‌سه‌ر كه‌عبه‌دا زاڵ بيت‌و له‌وێ دابنيشيت، فه‌رمووى (لعلك ان عشت ترى ذالك) واته‌(به‌ڵكو بژيت ئه‌وه‌ ببينيت) پاشان فه‌رمووى (يا فلان خذ حقيبة الرجل فزودوه من العجوة) واته‌(فڵان كه‌س كوڵه‌كه‌ى ئه‌و كابرا بێنن‌و خورماى زياترى بۆ دابنێن) كاتێك لام كرده‌وه‌ تا بچم فه‌رمووى (اما انه من خير فرسان بني عامر) واته‌(ئه‌مه‌ يه‌كێكه‌ له‌ چاكترين سوارچاكانى به‌نى عامير) ده‌ڵێت: سوێند به‌ خوا له‌گه‌ڵ كه‌سو كاره‌كه‌مدا بووم كه‌ سوارێك هات، وتم: خه‌ڵكى چى ده‌كه‌ن؟ وتى: موحه‌مه‌د ده‌ستيگرت به‌سه‌ر كه‌عبه‌داو له‌وێ سه‌قامگير بووه‌، وتم: دايكم ڕۆڵه‌ ڕۆم بۆ بكات ئه‌گه‌ر ئه‌و ڕۆژه‌ موسڵمان بوومايه‌و دوايى داواى حيره‌م لێكردبايه‌ پێى ده‌دام، له‌ گێڕانه‌وه‌يه‌كى ديكه‌دا پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) پێى فه‌رموو (ما يمنعك من ذالك) (چى واده‌كات موسڵمان نه‌بيت؟) وتم: ده‌بينم هۆزه‌كه‌ت به‌ درۆيان زانيويت‌و ده‌ريان كردوويت‌و له‌گه‌ڵتان به‌

شەڕدێن، بزانم چیت بەسەر دێت؟ ئەگەر بەسەریاندا سەرکەوتیت باوەڕت پێ دێنم و شوێنت دەکەوم، ئەگەریش بەسەرتدا زاڵ بوون شوێنت ناکەوم.[1][2]

## پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەشیری کوڕی خەصاصیە (رضي الله عنه) بۆ ئیسلام بانگ دەکات

ئیبن عەساکیر لە بەشیری کوڕی خەصاصیەوە هێناویەتی دەڵێت: چووم بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەویش بانگی کردم بۆ ئیسلام و دواتر پێی فەرمووم (ما اسمك؟) (ناوت چیە؟) وتم: نەزیر، فەرمووی (بل انت بشير) بەڵکوو تۆ موژدەدەری (بشیر) ئەو سیفەتەی پێدام، ئەگەر خەڵاتێکی بۆ بهاتایە بەشداری دەکردن تیایدا، ئەگەر صەدەقەیەکی بۆ بهاتایە دابەشی دەکرد بەسەر ئێمەدا، شەوێکیان چوویە دەرەوە، منیش کەوتمە شوێنی، چوو بۆ بەقیع، فەرمووی (السلام عليكم دار قوم مؤمنين و انا بكم لاحقون وانا لله وانا اليه راجعون، لقد ابحصتم خيرا بجيلا و سبقتم شرا طويلا) واتە(سەلامتان لێ بێت خەڵکی باوەڕدار، ئێمەش پەیوەستتان دەبین، هەموومان لای خواوە هاتووین و بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە، بەڕاستی خێرێکی زۆر فراوانتان دەستکەوت و پێشەوەتان خراپەیەکی دوورو درێژ بوو). پاشان لایکردەوە بەلامداو فەرمووی ئەوە کێیە؟ وتم: بەشیرم، فەرمووی (اما ترضى ان احذ الله سمعك و قلبك و بصرك الى الاسلام من بين ربيعة الفرس الذين يقولون ان لةلاهم لا ئتفكت الارض باهلها؟) واتە(ئایا ڕازی نیت خوا گوێ و دڵ و چاوت بەرەو ئیسلام ببات لەناو ڕەبیعەی فارسدا کە دەڵێن ئەگەر ئەوان نەبوونایە زەوی هەموو خەڵکی سەراو ژوور دەکرد؟) وتم: بائەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (ماجاء بك؟) (بۆچی هاتوویت) وتم: ترسام شتێکت بەسەر بێت، تەبەرانی و بەیهەقی

---

[1] – صحيح.

[2] – هەیسەمی ج٦ ص١٦٢) دەڵێت: عەبدوڵلای کوڕی ئەحمەدو باوکی گێڕاویانەتەوە و دەقەکەی تەواو نەکردووە، تەبەرانیش هێناویەتی و پیاوانی سەنەدی هەردووکیان صەحیحن، ئەبوداودیش هەندێکی گێڕاوەتەوە.

واهێناویانە (یا بشیر الا تحمد الله الذي اخذ بناصیتك الی الاسلام من بین ربیعة قوم یرون ان لولاهم لائتفکت الارض بمن علیها) واتە(بەشیر ئایا سوپاسی خوا ناکەیت کە لەناو ڕەبیعەدا ئیسلامی کردە بەشت، ئەو ڕەبیعەی وادەبینین ئەگەر ئەوان نەبوونایە زەوی هەرچی کەسی سەر دونیا هەیە هەمووی سەراو ژوور دەکرد)[1,2].



## (پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بانگەوازی کەسێك دەکات کە ناوی نەهاتووە)

ئەبویەعلا لە حەربی کوڕی سورەیجەوە هێناویەتی دەڵێت: پیاوێکی خەڵکی بەلعەدویە پێی وتم باپیرم بۆی گێڕامەوە وتی: چووم بۆ مەدینەو لە دوڵدا دابەزیم، دوو پیاو هەبوون و خەنجەرێك لە نێوانیاندا بوو کڕیارەکە بە فرۆشیارەکەی دەوت: ڕێکوپێك پێم بفرۆشە، منیش لە دڵی خۆمدا وتم: ئەمە ئەو هاشمیەیە کە خەڵکی گومڕا کردووە، ئائەمە ئەوە؟ سەیرم کرد پیاوێکی لەش جوانی تەوێڵ گەورەی لووت و برۆ ڕێکە، لەسەر سنگیەوە تا ناوکی وەك دەزووی ڕەش وایە مووی ڕەشە، جلێکی جوانی لەبەردایە، لێمان نزیك بوویەوەو وتی: (السلام علیکم) ئێمەش وەڵاممان دایەوە، هێندەی نەبرد کڕیارەکە بانگی کردو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا پێی بڵێ بە ڕێکوپێکی پێم بفرۆشێت، ئەویش دەستی هێناو فەرمووەی (اموالکم تملکون اني ارجو ان القی الله عز وجل یوم القیامة لا یطلبني احد منکم بشيئ ظلمته في مال ولا في دم وعرض الا بحقه، رحم الله امرا سهل البیع سهل الشراء، سهل الاخذ، سهل العطاء، سهل القضاء، سهل التقاضی) واتە(ماڵ و سامانێك هەتانە

---

[1] – صحیح.

[2] – لە المنتخب ج٥ ص١٤٦ دا واهاتووە.

موڵکتانە، من هیوادارم لە ڕۆژی دواییدا کە دەگەمەوە بە خوای گەورە کەستان داوای شتێکم لێ نەکات کە ستەمم لێ کردبێت لە ماڵو خوێنو ئابڕوویدا تەنها مافی خۆی نەبێت، ڕەحمەتی خوا لە کەسێك فروشتنو کڕینو وەرگرتنو بەخشینو دادوەریو داخوازی سادەو سووك بێت)، پاشان چوو، وتم: سوێند بە خوا دەچم بۆلای چونکە قسەی چاکە، کەوتمە شوێنی وتم موحەمەد، ئەویش لای کردەوە بەلامداو فەرمووی چیت دەوێت؟ وتم: تۆیت کە خەڵکت گومڕاو گێرۆدە کردووەو لەسەر ڕێی باو باپیرانیان لاتداون؟ فەرمووی ئەوە خوایە، وتم: بانگەوازی چی دەکەیت؟ فەرمووی (ادعو عباد الله الى الله) (بەندەکانی خوا بۆلای خوا بانگ دەکەم) وتم: چی دەڵێیت، فەرمووی (اشهد ان لا اله الا الله واني محمد رسول الله وتؤمن بما انزله علي وتكفر باللات والزى و تقيم الصلاة وتؤتي الزكاة) وتم زەکات چیە؟ فەرمووی (يرد غنينا على فقيرنا) واتە(دەوڵەمەندمان بەشی هەژارمان بدات) وتم: بە ڕاستی بانگەواز بۆ شتێکی چاك دەکەیت، جاران لەسەر زەویدا کەس نەبوو هێندەی من ڕقی لێی بێت واخێرا لە ماڵو منداڵو باوکمو هەموو کەس لام خۆشەویستتر بوو وتم: زانیم، فەرمووی زانیت؟ وتم بەڵێ فەرمووی (تشهد ان لا اله الا الله واني محمد رسول الله وتؤمن بما انزل علي) وتم بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، من ئاوێکم هەیە کە خەڵکێکی زۆری بۆدێت بانگیان دەکەم بۆ ئەوەی تۆ بانگت کردم بۆی بەڵکو شوێنت بکەون، فەرمووی (نعم فادعهم) (بەڵێ بانگیان بکە) بەوەش خەڵکەکە بە ژنو پیاویانەوە موسوڵمان بوون پێغەمبەریش (ﷺ) دەستی هێنا بەسەر سەریدا[1،2].

---

[1] – ضعيف

[2]– هەیسەمی ج٩ ص١٨ دەڵێت: تیایدا گێڕەرەوەیەك هەیە کەناوی نەهاتووە، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە جێمتمانەن.

ئەحمەد لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هێناویەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چوو بۆ ماڵی یەکێك لە پیاوانی نەجارو سەردانی کرد، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرموو (یاخال، قل لا الە الا الله) واتە(خاڵە گیان، بڵێ لا الە الا الله) وتی: من خاڵم یان مام؟ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی نا، بەڵکو خاڵۆی، فەرمووی بڵێ (لا الە الا الله) وتی: ئەوە چاکەی هەیە بۆم؟ فەرمووی (بەڵێ)[1].[2]

بوخاریو ئەبوداود لە ئەنەسەوە (رضی الله عنه) هێناویانە گەنجێکی جوولەکە کە خزمەتی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) دەکرد نە خۆش کەوت، ئەویش هاتو سەردانی کردو لای سەریەوە دانیشتو پێی فەرموو (موسڵمان ببە) ئەویش سەیری باوکی کرد لەلای بوو وتی: بە گوێی ئەبولقاسم بکە، ئەویش موسڵمان بوو، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) چووە دەرەوەو دەیفەرموو (الحمد الله الذي انقذه من النار) واتە(سوپاس بۆ خوا کە لە دۆزەخ ڕزگاری کرد).[3]

ئەحمەدو ئەبویەعلا لە ئەنەسەوە هێناویانە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە پیاوێکی فەرموو (موسڵمان ببە پارێزراو دەبیت) وتی: دەبینیت حەزناکەم فەرمووی (ان کنت کارها)[4].[5]



[1] – صحيح.

[2] – هەیسەمی (ج٥ ص٣٠٥) دەڵێت: ئەحمەد گێڕاویەتیەوەو پیاوانی سەنەدەکە صەحیحن.

[3] – لە جمع الفوائد ج١ ص١٢٤ دا واهاتووە.

[4] – صحيح.

[5] – هەیسەمی (ج٥ ص ٣٠٥) هێناویەتیو دەڵێت پیاوانی هەردووکیان (سەنەدەکانیان) صەحیحن

## (پێغەمبەر (ﷺ) بانگەوازی ئەبوو قوحافە (رضي الله عنه) دەکات)

تەبەرانی لە ئەسمائی کچی ئەبوبەکرەوە هێناویەتی دەڵێت: لە ڕۆژی فەتحدا پێغەمبەر (ﷺ) بە ئەبوقوحافەی فەرموو موسڵمان ببە پارێزراو دەبیت، هەیسەمی ج٥ ص٣٠٥ دەڵێت پیاوانی سەنەدەکەی صەحیحن.

ئیبن سەعدیش (ج٥ ص٤٥١) لە ئەسمائەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) هاتە مەککەو دڵنیابوو لە مزگەوتدا دانیشت ئەبوبەکر ئەبوقوحافەی بردە خزمەتی، پێغەمبەر (ﷺ) کە بینی فەرمووی (یا ابابکر الا ترکت الشیخ حتی اکون انا الذي امشی الیه) واتە(ئەبووبەکر بۆ وازت لەو پیرە نەهێنا تا من بچم بۆلای) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەبێت ئەو بێت بۆلای تۆ نەك تۆ بچیت بۆلای، پێغەمبەر (ﷺ) لەبەردەم خۆیدا داینیشاندو دەستی لەسەر دڵی داناو فەرمووی (یا ابا قحافة اسلم) ئەبو قووحافە موسڵمان ببە پارێزراو دەبیت، ئەویش موسڵمان بوو و شایەتمانی حەقی هێنا، کە ئەبوقوماحە چوو بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) سەرو ڕیشی تەواو سپی ببوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (غیروا هذا الشیب و جنبوه السواد) واتە(ئەو ڕەنگی پیریەی بگۆڕن و ورياش بن بۆی ڕەش نەکەن).[1]



[1] – صحیح.

# (پێغەمبەر (ﷺ) ئەو بێباوەڕانە بۆ ئیسلام بانگ دەکات کە موسڵمان نەبون)

بەیهەقی لە موغەیرەی کوڕی شوعبەوە هێناویەتی دەڵێت: یەکەم ڕۆژ تیایدا پێغەمبەر (ﷺ) ناسرا من و ئەبو جەهلی کوڕی هیشام بە هەندێ کۆڵانی مەککەدا دەچووین، پێغەمبەر (ﷺ) گەیشت پێمان و بە ئەبوجەهلی وت (یا ابا الحکم هلم الی الله و الی رسوله ادعوك الی الله) واتە(ئەبولحەکەم ئادەی وەرە بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی، بانگت دەکەم بۆلای خوا) ئەبوجەهل وتی: موحەمەد ئەرێ تۆ واز ناهێنیت لە قسەوتن بە خواکانمان؟ دەشتەوێت شایەتی لەسەر خۆشت بدەین؟ ئێمە شایەتی دەدەین تۆ قسەی خۆت گەیاند، سوێند بە خوا ئەگەر بمزانیایە ئەوەی دەیڵێیت ڕاستە شوێنت دەکەوتم، پێغەمبەر (ﷺ) چوو و ئەبوجەهلیش لایکردەوە بەلای منداو وتی: سوێند بە خوا دەزانم ئەوەی دەیڵێت ڕاستە، بەڵام شتێك ڕێم لێ دەگرێت، نەوەی قوصەی دەڵێن، پەردەداری هی ئێمەیە، وتمان وایە، وتیان، ئاودان هی ئێمەیە، وتمان وایە، وتیان نەدوە لە ئێمەیە، سوێند بەخوا ئەمەیان ناکەم[1]. [2]لە کنزالعمال ج٧ ص١٢٩ دا هاتووە، لەفەرموودەکەدا واهاتووە (یا ابا الحکم هلم الی الله و الی رسوله والی کتابه ادعوك الی الله).[3]

ئیسحاقی کوڕی ڕاهەویە لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی وەلیدی کوڕی موغەیرە هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)، ئەویش قورئانی بەسەردا خوێند، لەوە دەچوو دڵی نەرم بووبێت، ئەبوجەهل ئەوەی بیست و هات بۆ لای و وتی: مامە گیان ئەوا هۆزەکەت دەیانەوێت پارەت بۆ کۆبکەنەوە، وتی: بۆچی؟ وتی: تا پێت بدەن چونکە تۆ هاتوویت تا پێشنیاری ئەوە بکەیت بۆ موحەمەد کە قبوڵی کردووە،

---

[1] – حسن.

[2] – لە البدایە ج٣ ص٦٢ دا واهاتووە، ئیبن ئەبی شەیبەش بەهەمان شێوە هێناویەتی،

[3] – حسن.

وتی: قورەیش دەزانن من پارەم لە هەموویان زیاترە، وتی: دەی قسەیەکی پێ بڵێ تا بە خەڵکەکە بگات تۆ ڕقت لێیەتی، وتی: چی بڵێم؟ وتی: سوێند بە خوا کەستان هێندەی من لە شیعرو قەسیدەو شیعری جنۆکە نازانێت، سوێند بە خوا ئەوەی موحەمەد دەیڵێت لەوانە ناچێت، سوێند بە خوا ئەوەی دەیڵێت شیرینەو ڕەونەق و جوانی هەیە، سەرەوەی بە بەرهەمو خوارەوەی چڕو پڕە، بەرز دەبێتەوەو هیچ بەسەریدا بەرز نابێتەوە، چی هەیە لە خوار خۆیەوە تێك دەشکێنێت، وتی: خەڵکەکە بە هیچ شتێك ڕازی نابن تا قسەی پێ نەڵێیت، ئەویش وتی: لێم ڕاوەستە تا بیری لێبکەمەوە، کە بیری کردەوە وتی: ئەمە جادوویەکەو کار لە کەسانی دیکە دەکات، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند (ذرني ومن خلقت وحيدا. وجعلت له مالا ممدودا. وبنين شهودا) بەوجۆرە ئایەتەکان هاتن، بەیهەقی لە حاکمەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی کوڕی ئەیووبیش لە عیکرەمەوە بە مورسەلی هێناویەتی و تیایدا هاتووە ئەم ئایەتەی بەسەردا خوێندەوە (ان الله يامركم بالعدل و الاحسان وايتاء ذي القربى وينهى عن الفحشاء والمنكر ولبغي يعظكم لعلكم تذكرون)[1].[2]



[1] – صحيح.

[2] – لە البدايه والنهايه ج٣ ص٦٠ دا واهاتووە. ئیبن جەریریش لە عەکرەمەوە هێناویەتی، لە تەفسیری ئیبن کەسیر (ج٤ ص٤٤٣)یشدا هاتووە.

## (پێغەمبەر (ﷺ) بانگەوازی ئەبوسوفیانو هیندی دەکات)

ئیبن عەساکیر لە موعاویەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئەبوسوفیان لەگەڵ هینددا چوو بۆ دەوارێکی خۆی، منیش لەسەر گوێدرێژێکی خۆم لەگەڵ غولامێکدا بە دوایانەوە بووین کە گوێمان لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو، ئەبوسوفیان وتی: موعاویە دابەزە با موحەمەد سواربێت، منیش دابەزیمو پێغەمبەر (ﷺ) سوار بوو لەسەر خۆ لە پێشمانەوە چوو، پاشان لایکردەوە بە ڕوومانداو فەرمووی (یا ابلسفیان بن حرب، وهند بنت عتبة والله لتموتن ثم لتبعثن ثم لیدخلن المحسن الجنة والمسیئ النار، وانا اقول لکم بحق و انکم لاول من انذرتکم) (ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب، هیندی کچی عوتبە، سوێند بەخوا دەمرنو دواتر زیندوو دەکرێنەوەو چاکەکار دەچێتە بەهەشتو خراپەکار دەچێتە دۆزەخ، من ئەمەتان بەهەق پێ دەڵێمو ئەمە یەکەم کەس هۆشیاریتان پێ بدرێت) پاشان پێغەمبەر (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە (حم تنزیل من الرحمن الرحیم) تا گەیشتە (قالتا اتینا طائعین) ئەبوسوفیان پێی وت: موحەمەد لێبوویتەوە؟ فەرمووی بەڵێ،ئینجا لەسەر گوێدرێژەکە دابەزیو من سواربوومو هیندیش سەیری ئەبو سوفیانی کردوو وتی کوڕەکەمت بۆ ئەو جادووگەرە دابەزاند؟ ئەبو سفیان وتی: نا سوێند بە خوا ئەمە جادووگەرو درۆزن نیە،[1]

ئیبن سەعد ج٣ ص٥٥ لە یەزیدی کوڕی ڕۆمانەوە هێناویەتی دەڵێت: عوسمانی کوڕی عەففان و تەلعەی کوڕی عەبدوڵلا و زوبەیری کوڕی عەوام (رضي الله عنهم)، چوون بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و ئەویش پێشنیاری ئیسلامی بۆ کردنو قورئانی بەسەردا خوێندنو هەواڵی ماف و بەڵێنی ئیسلامی پێدان...ڕێزو گەورەیی لای خوایە، ئەوانیش بڕوایان هێنا، عوسمان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تازە لە شامەوە

---

[1] – لە الکنز ج٧ ص٩٤ دا هاتووە، تەبەرانیش هەروا هێناویەتی، هەیسەمی (ج٦ ص٢٠) دەڵێت حەمیدی کوڕی مونەهەب ناناسم، ئەگەر چی کەسانی دیکەی سەنەدەکە جێ متمانەن.

هاتمەوە كە لە نێوان مەعانو زەرقادا بووین وەك ئەوەی خەوتبین بانگی كردین هەو خەوتوان هەستن وا ئەحمەد لە مەككە دەركەوت، ئێمەش هاتینو ئەوەمان بیست، موسوڵمان بوونی عوسمان زووتر بوو پێش ئەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بچێتە ماڵی ئەرقەم.

ئیبن سەعد ج٣ ص٣٤٧ لە ئەبو عوبەیدەی كوڕی موحەمەدی كوڕی عەممارەوە دەڵێت: عەمماری كوڕی یاسر (رضي الله عنه) وتی: لەبەر دەرگای ماڵی ئەرقەم صوهەیبی كوڕی سنانم (رضي الله عنه) بینیو پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لە ژوورەوە بوو، پێم وت: چیت دەوێت؟ ئەویش وتی: تۆ چیت دەوێت؟ وتم: ویستم بچمە لای موحەمەدو گوێ لە قسەی بگرم، ئەویش وتی منیش بۆ ئەوە هاتووم، هەردووكمان چووینو پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) پێشنیاری ئیسلامی بۆ كردین، ئێمەش موسڵمان بووین، دواتر ئەو ڕۆژە بەوجۆرە ماینەوە تاشەو داهات بە نهێنی چووینەوە، موسڵمان بوونی عەممارو صوهەیب پاش سیو ئەوەندە كەس بوو.

ئیبن سەعد ج٣ ص٦٠٨ لە خوبەیبی كوڕی عەبدولڕەحمانەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەسعەدی كوڕی زرارەو زەكوانی كوڕی عەبدقەیس چوون بۆ مەككە, بە دوای عوتبەی كوڕی ڕەبیعەدا دەگەڕان تا داخی خۆیانی پێ بڕێژن، هەواڵی پێغەمبەریان بیستو هاتن بۆ لای، ئەویش پێشنیاری ئیسلامی بۆ كردنو قورئانی بەسەردا خوێندن، ئەوانیش موسڵمان بوونو نزیكی عوتبەی كوڕی ڕەبیعە نەبوونەوەو گەڕانەوە بۆ مەدینە، ئەمانە یەكەم كەس بوون كە لە مەدینە موسوڵمان بوون.



# (پێغەمبەر (ﷺ) پێشنیاری موسڵمان بوون بۆ کۆمەڵێك دەكات)

ئیبن جەریر لە ئیبن عەباسەوە هێناویەتی عوتبەو شەیبەی کوڕانی ڕەبیعەو ئەبوسوفیانی کوڕی حەربو یەکێك لە پیاوانی بەنی عەبدودارو ئەبولبوختەرەی برای بەنی ئەسەدو ئەسوەدی کوڕی عەبدولموتەلیبی کوڕی ئەسەدو زەمعەی کوڕی ئەیوەدو وەلیدی کوڕی موغەیرەو ئەبوجەهلی کوڕی هیشامو عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوئومەییەو ئومەیەی کوڕی خەلەفو عامی کوڕی وائیلو نەبیهومونەبەهی دوو کوڕی حەججاج پاش ئاوابوونی خۆر لە لای کەعبە کۆبوونەوە، ئەوانیش هەواڵیان نارد بۆ پێغەمبەر (ﷺ) کە پیاوماقوڵانی هۆزەکەت کۆبوونەتەوە تا بتدوێنن، پێغەمبەریش (ﷺ) خێراهات بۆلایان، وایزانی سەرەتای هەنگاویانە بەرەو ئیسلام ئەویش سووربوو لەسەر خۆشەویستی ژیربوونو پێگەیشتنیانو حەزی نەدەکرد بەرەو لەناوچوونو سەختی بچن، هات تا لەلایان دانیشت، وتیان موحەمەد ئێمە پۆزشت بۆ دێنینەوە، خوا دەزانێت نەماندیوە لەناو عەرەبدا کەس ئەوە لەناو هۆزەکەیدا بکات کە تۆ کردووتە، جنێو بە باوباپیرانو گاڵتە بە ئایینو بە گەمژە زانینمان و قسەوتن بە خواوەندەکانمانو تێکدانی یەکدەنگیمانت گرتووەتە بەر، ئیتر هیچ ناشیرینیەك نەماوە لە نێوانماندا بیگریتەبەر، ئەگەر ئەم قسەیەت هێناوەو مەبەستت کۆکردنەوەی پارەیە لێمان باهێنەدەت بۆ کۆبکەینەوە ببێتە دەوڵەمەندترینمان، ئەگەر داوای شەرەفمەندی دەکەی وا دەتکەینە گەورەی خۆمان، ئەگەر پاشایەتیت دەوێت دەتکەینە پاشای خۆمان، ئەگەریش ئەمە دەردێکەو تووشت بووەو جنۆکەیە (ریئی) ئەوا پارەمان بە خەرج دەدەین تا پزیشك بێنینو چاك بیتەوە، ئەگەر نا هیچ بیانوویەکمان بۆت نیەو لەوە زیاترمان پێ ناکرێت، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (مابي ماتقولون ما جائتكم بما جئتكم به اطلب اموالكم ولا الشرف فيكم، ولا الملك عليكم، ولكن الله بعثني اليكم رسولا، وانزا علي

کتابا، وامرني ان اکون لکم بشيرا ونذيرا، فبلغتکم رسالات ربي و نصحت لکم، فان تقبلوا مني ماجئتکم به حظکم في الدنيا والاخرة، وان تردوه علي اصبر لامر الله حتى يحکم الله بيني وبينکم) واته(ئەوە چیم لە بارەوە دەڵێن، ئەوەی پێتان دەڵێم بۆ ئەوە نیە پارەو شەرەفمەندیو پاشایەتی ناو ئێوەم بوێت، بەڵکو خوای گەورە ناردوومی بۆ ئێوەو کتێبێکی دابەزاندووە بۆم، فەرمانی پێکردم مژدەدەرو ترسێنەرتان بم، وا پەیامی خوام پێ گەیاندنو ئامۆژگاریم کردن، ئەگەر ئەوەی بۆم هێناون وەریگرن پشکی چاکی دونیاو دواڕۆژتان دێتە ڕێ، ئەگەریش بەرپەرچی بدەنەوە لەسەر فەرمانی خوا تا من خۆڕاگریم لەسەرە خوا حوکمی نێوان منو ئێوەش دەدات) ئەوانیش وتیان: موحەمەد ئەگەر بەوە ڕازی نیت کە پێمان وتیت بزانە کەس نیە هێندەی ئێمە وڵاتی بەرتەسکو سامانی کەمو ژیانی سەخت بێت، داوا لە پەروەردگارت بکە کە ئەو پەیامەی پێ ناردوویت با ئەو شاخەی باری سەرشانی سەخت کردووین لێمان دووربخاتەوەو شارمان بۆ فراوان بکاتو تیایدا ڕووبارو کانیاوی وەك ئەوانەی شامو عێراق بتەقێنێتو چی باوباپیرانمان مردوون زیندوویان بکاتەوەو لەوانەی بۆمان زیندوودەکاتەوە قوصەی کوڕی کیلاب بێت چونکە پیرێکی ڕاستگۆ بوو، تا پرسیاریان لێ بکەین لەسەر قسەکەی تۆ بزانین ڕاستە یان باتڵە؟ ئەگەر ئەوەت کرد ئەوانیش بەڕاستیان زانیت ئێمەش بڕوات پێ دەکەینو دان دەنێین بە پلەو پایەتدا لای خواو دەڵێین خوا تۆی ناردوەوە وەك خۆت دەڵێیت: پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموون (ما بهذا بعثت، انما جئتکم من عند الله بما بعثني به، فقد بلغتکم ما ارسلت به اليکم، فان تقبلوه فهو حظکم في الدنيا والاخرة وان تردوه علي اصبر لامر الله حتى يحکم الله بيني وبينکم) واتە(من بۆ ئەوە نەنێردراوم، بەڵکو لای خواوە ئوەم بۆ هێناون کە پێی نێردراوم، ئەوەی پێی نێردراوم بۆتان پێم گەیاندوون، ئەگەر قبوڵی بکەن بەختی چاکی دونیاو دواڕۆژتانە، ئەگەریش وەرینەگرن خۆڕاگری لەسەرە فەرمانی خوا تا خوا حوکمی نێوان منو ئیوە دەدات). وتیان: ئەگەر ئەوە ناکەیت دەی شتێك بۆ خۆت بکەو

داوابکە فریشتەیەکت بۆ بنێرێت تا پشتگیری قسەکانت بکات و لەسەر تۆ بێدارمان بکاتەوەو داوای لێبکە باخ و بێستان و کان و کانزاو کۆشکی زێڕو زیوت بۆ بنێری و بێباکت بکات لەوەی ئێمە پێمان وایە تۆ بۆ ئەوە هەوڵ دەدەیت، چونکە تۆ وەك ئێمە دەچیتە بازاڕو هەوڵی بژێوی دەدەیت، ئەوانە داوابکە تا ئێمە پلەو پایەت لای خوا بزانین ئەگەر ڕاست دەکەیت پێغەمبەریت، ئەویش پێی فەرموون (ما ان بفاعل، ما انا بالذي يسال ربه هذا، وما بعثت اليكم بهذا، ولكن الله بعثني بشيرا ونذيرا، فان تقبلو ماجئتكم به فهو حظكم في الدنيا والاخرة وان تردوه علي اصبر لامر الله حتى يحكم الله بيني و بينكم) وتیان دەی ئەگەر ڕاست دەکەیت وەك خۆت دەڵێیت پەروەردگارت دەتوانێت ئاسمان داباریێنێت بە سەرماندا، بڕوات پێ ناکەین تا ئەوە نەکەیت، پێغەمبەریش (عليه السلام) پێی فەرموون (ذالك الى الله ان شاء فعل بكم ذالك) واتە(ئەوە بۆ خوا خۆیەتی ئەگەر ویستی واتان پێ دەکات)، وتیان موحەمەد مەگەر پەروەردگارت نازانێت ئێمە لەگەڵ تۆدا دادەنیشین و ئەم پرسیارانەت لێ دەکەین و ئەم داواکاریانەمان لێت هەیە؟ دەی با بێت بۆلات و فێرت بکات چۆن بمانگێڕیتەوەو پێت بڵێت ئەگەر ئەوەی پێی هاتوویت لێمان وەرنەگرتیت چی دەکات، ئێمە بیستوومانە ئەم قسانە لە لایەن کەسێکەوە پێت دەوترێت لە یەمامە کەناوی ڕەحمانە، سوێند بە خوا ئێمە هەرگیز بڕوا بە ڕەحمان ناهێنین، بمانبوورە موحەمەد بە خوا وابکەیت وازت لێناهێنین تا لەناوت دەبەین یان لەناومان دەبەیت، یەکێکیان وتی: ئێمە فریشتەکان دەپەرستین کە کچانی خوان، یەکێکیان وتی: هیچ کات بڕوات پێ ناکەین تا خوا فریشتەت بۆ نەنێرێت لەبەر چاوماندا، کاتێك ئەمەیان وت پێغەمبەر (عليه السلام) هەستا، عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوئومەییەی کوڕی موغەیرەی کوڕی عومەری کوڕی مەخزوم کە پوورزای بوو – کوڕی عاتیکەی کچی عەبدولموتەلیب– لەگەڵیدا هەستاو وتی: موحەمەد: وا هۆزەکەت ئەوەیان بۆ خستیتەڕوو تۆیش ڕازی نەبوویت، پاشان داوایان لێکردیت شتیان بۆ دابەزێنیت تا پلەو پایەت لای خوا بزانن نەتکرد، پاشان داوایان کرد سزایەك بێت تا

بیانترسێنێت، سوێند بە خوا هیچ کات بڕوات پێ ناکەم تا لە ئاسمانەوە پەیژە دابەزێت و پلیکان بە پلیکان بەبەر چاومەوە سەرکەویت و بڕۆیت و بە وەرەقەیەکی بڵاوکراوەو بەهاودومی چوار فریشتەوە کە شایەت بدەن ئەوەی تۆ دەیڵێیت ڕاستە دابەزیوەتە خوارەوە، کورە بەخوا ئەگەر ئەوەش بکەیت بڕواناکەم باوەڕت پێ بێنم، پاشان لای پێغەمبەر (عليه السلام) چوو و پێغەمبەریش (عليه السلام) بەدڵگرانی و پەژارەوە گەڕایەوە بۆماڵەوە، کاتێك هیوای ئەوکاتی نەما کە سەرەتا بانگیان کرد، چونکە وای زانی باوەڕدێنن، کەچی سەیری کرد زۆر دووری لێ دەگەن، زیادی کوڕی عەبدوڵلای بە کائی لە ئیبن ئیسحاقەوە لە هەندێ لە زانایانەوە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەو عیکرەمەوە لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) بەوجۆرە گێڕاویەتیەوە[1][2].

ئەبونەعیم لە مەحمودی کوڕی لوبەیدی برای بەنی عەبدولئەشهەلەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك ئەبوحەیسەم ئەنەسی کوڕی ڕافیع هات بۆ مەککە- دەستەیەکی ناو بەنی عەبدولئەشهەلیشی لەگەڵدا بوو، لەوانە ئیاسی کوڕی موعاز (رضي الله عنه) کە هاتبوون تا لەگەڵ قورەیش لەسەر خەزرەج هاویەپمانی ببەستن- پێغەمبەر (عليه السلام) بیستی هاتوون چوو بۆلایان و لەلایان دانیشت و فەرمووی (هل لكم الي خير مما جئتم له؟) واتە(چاکەو خێرێکتان دەوێت باشتربێت لەوەی بۆی هاتوون؟) وتیات کامەیە؟ فەرمووی (انا رسول الله بعثني الله الى العباد ادعوهم الى الله ان يعبدو الله ولايشركوا به شيئا و نزل علي كتاب) واتە(من پێغەمبەری خوام، خوا ناردوومی بۆ بەندەکان تا بانگیان بکەم بۆلای خوا تا خوا بپەرستن و هیچ هاوەڵێکی بۆ دانەنێن، کتێبێکی بۆ دابەزاندووم) پاشان باسی ئیسلامی بۆ کردن و قورئانی بەسەریاندا خوێند، ئیساسی کوڕی موعاز - تازە پێدەگەیشت - وتی سوێند بە خوا هۆزەکەم ئەمە لەوە چاکترە کە بۆی هاتوون، ئەبولحەسەمیش چنگێ

[1] - ضعيف

[2] - لە تەفسیری ئیبن کەسیر (ج٣ ص٦٢)و البداية والنهاية (ج٣ ص٥٠) یشدا واهاتووە.

چەوو زیخی هەڵگرت و دای بە نێوچاوانی ئیاسی کوڕی موعازداو وتی: وازمان لێ بێنە سوێند بە تەمەنم بۆ شتی تر هاتووین ئیاسیش بێدەنگ بوو، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) هەستا و ئەوانیش چوونەوە بۆ مەدینە، شەڕی (بعاث) لە نێوان ئەوس و خەزرەجدا ڕوویدا، هێندەی نەبرد ئیاسی کوڕی موعاز لەناوچوو، موحەمەدی کوڕی لەبید دەڵێت: یەکێك لەوانەی لە سەرەمەرگیدا لای بوو پێی وتم گوێیان لێی بوو بەردەوام (لا الـه الا الله والـه اکبر وسبحان الله)ی دەوت تا مرد، بۆیە گومانیان نەبوو بە موسوڵمانی مرد، ئەوکەسە کاتێك لە کۆڕەدا گوێی لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گرت هەستی بە ئیسلام کرد[1].[2]



[1] -صحیح.

[2] - لە (کنز العمال ج٧ ص١١)دا واهاتووە، ئەحمەدو تەبەرانیش هێناویانە، کەسەکانی سەنەدەکە جێ متمانەن، هەیسەمیش (ج٦ ص٣٦) دەڵێت ئیبن ئیسحاقیش لە المغزی دا داویەتیەوە پاڵ مەحمودی کوڕی وەلید، کۆمەڵێك لە ئیبن ئیسحاقەوە هێناویانە، ئەمەش وەك لە الاصابة (ج١ ص٩١) دا واهاتووە لە فەرموودە صەحیحەکانیەتی.

# (پێغەمبەر (ﷺ) لە کۆڕەکاندا بانگەواز دەکات)

ئیبن سەعد لە ئیبن عەبباسەوە (ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند (وانذر عشيرتك الاقربين) پێغەمبەر (ﷺ) چوویە دەرەوە تا چوویە سەر مەروەو دواتر فەرمووی (يا ال فهر) بەوە خەڵکی قورەیش هاتن بۆلای، ئەبولەهەبی کوڕی عەبدولموتەلیب وتی وا هەموویان لات کۆبوونەتەوە بڵێ بزانین چی دەڵێیت، فەرمووی (يا ال غالب) بەنو موحاریب و نورحاسی دووکوڕی فیهر گەڕانەوە، فەرمووی(يا ال لؤى بن غالب) بەنوتەمیمی ئەدرەمی کوڕی غالب گەڕانەوە، فەرمووی (يا ال كعب بن مرة) بەنومەخزومی کوڕی یەقفەو موڕەو بەنوتەمیمی کوڕی موڕە گەڕانەوە، فەرمووی (يا ال قصى) بەنو زوهرەی کوڕی کیلاب گەڕانەوە، فەرمووی (يا ال عبد مناف) بەنو عەبدوداری کوڕی قوصەی و بەنو ئەسەدی کوڕی عەبدولعززای کوڕی قوصەی و بەنوعەبدی کوڕی قوصەی گەڕانەوە، ئەبولەهەب وتی: وابەنو عەبدمەنافیش هاتن دەی بیڵێ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ان الله امرني ان انذر عشيرتي الاقربين و انتم الاقربون من قريش، و اني لا املك لكم من الله حظا ولا من الاخرة نصيبا الا ان تقولوا لا اله الا الله، فاشهد بها لكم عند ربكم وتدين لكم العرب وتذل لكم العجم) واتە(خوای گەورە فەرمانی پێکردووم تا نزیکەکانم بێداربکەمەوەو لە ئاگری دۆزەخ بیانترسێنم، ئێوەش نزیکانی قورەیشن، من لای خوا هیچ پشك و لە دواڕۆژیشدا هیچ بەش و پشکێکم نیە بۆتان مەگەر بڵێن لا اله الا الله تا لای پەروەردگارتان شایەتیتان بۆ بدەم و عەرەب ملکەچتان بێت و عەجەمیش بکەوێتە ژێر دەستتان) ئەبولەهەب وتی: دەستت بشکێ بۆ ئەمە بانگت کردین، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند (تبت يدا ابى لهب) دەڵێت: ئەبولەهەب دۆڕاندت و زیانمەند بوویت.[1]

[1] – لە کنزالعمال (ج١ ص٢٧٧) دا واهاتووە.

ئەحمەدیش لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی کاتێك خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند (وانذر عشيرتك الاقربين) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هاتە سەر سەفاو سەرکەوتو هاواری کرد (يا صباحاه)[1]، خەڵکیش لە دەوری کۆبوونەوە، هەبوو خۆی دەهاتو هەبوو نێردراوی خۆی دەنارد، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (يا بني عبدالمطلب يا بني فهر يا بني كعب ارايتم لو ان خيلا بسفح هذا الجبل تريد ان تغير عليكم صدقتموني؟) واتە(بەنی عەبدولموتەلیب، بەنی فیهر، بەنی کەعب دەڵێن چی ئەگەر بڵێم کاروانێ لەلاپاڵی ئەو شاخەوە دەیەوێت شاڵاوتان بێنێتە سەر بڕوام پێ دەکەن؟) وتیان: بەڵێ، وتی (فاني نذير لكم بين يدي عذاب شديد) (من بێدارکەرەوەی ئێوەم تا لە سزای سەخت بتانترسێنم)ئەبو لەهەب وتی: هەموو ڕۆژ دەستت بشکێت بۆ ئەمە بانگت کردین؟ خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند (تبت يدا ابي لهب وتب)[2][3].

---

[1] – ئەمە وشەی هاوار کردنە، زیاتر بۆ هاواری فریاگوزاری کاتی شاڵاوبردنە، بەڵام لێرەدا بۆ کۆکردنەوەی ئەو خەڵکە بەکارهاتووە.

[2] – صحيح.

[3] –بوخاریو موسلیم وەك ئەمە هێناویانە لە البدية والنهاية ج٣ ص٣٨ یشدا هاتووە.

## (پێغەمبەر(ﷺ) لە وەرزی حەج و لە سەردانی هۆزەکانی عەرەبدا بانگەواز دەکات)

ئەبونەعیم لە (دلائل النبوة ص١٠١)دا لە عەبدوڵڵای کوڕی کەعبی کوڕی مالیکەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) سێ ساڵی پێغەمبەرایەتی بە شاراوەیی و نهێنی بردەسەر، پاشان لە ساڵی چوارەمدا ئاشکرای کردو دەساڵ بانگەوازی کردو لە وەرزی حەجدا دەکەوتە شوێن حاجیان لە نشینگەیانی عەکاظو میجەننەو زیلمەجازو بانگی دەکردن و داوای دەکرد پشتی بگرن تا پەیامی خوای گەورە بگەیەنێت و بەهەشت بەشیان بێت، داوای لە یەك بەیەکی هۆزەکان دەکرد کەسی نەدی سەری بخات تا گەیشتە بەنی عامری کوڕی صەعصەعە، هێندەی لەوان ئازاری بینی لای هیچ کامیان نەیبینی بە جۆرێ کاتێك بەجێی هێشتن لە پشتەوە بەردیان تێدەگرت, تا ئەوەی چوو بۆلای بەنی موحاریبی کوڕی خەصفەو سەیری کرد پیرێکی سەدوبست ساڵەیان تێدایە، پێغەمبەر (ﷺ) دواندیو بانگی کرد بۆ ئیسلامو داوای کرد پشتگیری بکات تا پەیامی خوا بگەیەنێت، ئەویش وتی: کابرا! هۆزەکەت چاکتر دەتناسن دەی بڕۆ لە ئێمە بێباك بە، ئەبولەهەب وەستابوو گوێی لە قسەکانی موحاریبی دەگرت، پاشان ئەبولەهەب لەسەر موحاریبی وەستاو وتی: ئەگەر خەڵکی وەرزی حەج هەموویان وەك تۆبن ئەم ئایینەی ئەم درۆزنە مناڵکارە نامێنێ، موحاریبی وتی: سوێند بە خوا تۆ باشتر برازاو کەسی خۆت دەناسیت، پاشان وتی: ئەبوعوتبە پێ دەچێت فێی لەگەڵدا بێت، من کەسێکم لەگەڵدایە بەرەو چارەسەری دەبات، ئەبولەهەبیش هیچی نەکردو نەچوو، بەڵام ئەگەر بیبینیایە پێغەمبەر (ﷺ) لای کۆمەڵێکی عەرەبەکان دەوەستێت هاواری دەکرد ئەوە درۆزنە[1][2]. موحەمەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی

---

[1] – ضعیف.

[2] – لەسەنەدەکەیدا واقیدی هەیە. ئەبونەعیم لە الدلائل ص١٠٣ دا لە ڕێگەی واقیدیەوە هێناویەتی،

کەسیری کوڕی صەلت لە ئیبن رومان و عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکرو کەسانی دیکەوە (رضی الله عنه) هێناویەتی وتوویانە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هات بۆلای کیفدە لە عکاظ هیچ کام لە شوێنەکانی عەرەب هێندەی ئەوان نەرم و نیان نەبوون، کاتێک نەرمی و ڕووخۆشی ئەوانی بینی دەیدواندن و فەرمووی (ادعوكم الى الله وحده لا شريك له وان تمنعوني مما تصنعون منه انفسكم، فان اظهر فانتم بالخير) واتە(بانگتان دەکەم بۆلای خوای تاکی بێ هاوتا، هەروەها خۆتان لە چی دەپارێزن منیش وا بپارێزن، ئەگەر سەرکەوتم ئێوە سەربەست و دەستڕەون).

هەموو وتیان: قسەیەکی زۆر جوانە، بەڵام ئێمە خواوەندەکانی باوباپیرانمان دەپەرەستین، بچوکەکەیان وتی: هۆزەکەم گوێ بگرن، بچن بەدەم ئەم کابراوە پێش ئەوەی کەس پێشتان کەوێت، چونکە سوێند بە خوا ئەهلی کیتاب دەڵێن پێغەمبەری ئێمە لە حەرەمەوە دێت و کاتی هاتووە، لە ناویاندا کەسێک وتی: دەست بەمنەوە بگرن، خێڵەکەی دەریان کردووەو ئێوە پەنای دەدەن شەڕی عەرەب تووشی خۆتان دەکەن، هەرگیز شتی وانیە، نا، نابێت پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) بە دڵگرانی بەجێی هێشتن، ئەوانیش چوونەوە بۆلای هۆزەکەیان و پێیان وتن، یەکێک لە جوولەکەکان وتی: سوێند بەخوا هەڵەتان کرد، ئەگەر دەستپێشخەریتان بکردایە بۆلای دەبوونە گەورەی عەرەب، سیفەتی ئەو کەسە لە کتێبی ئێمەدا هاتووە، ئەوانەی بینبوویان وەسفیان کرد هەمووی ئەو وەسفانە بوون کە ئەو دەیوتن، پاشان وتی: دەبینن لە مەککە دەردەکەوێت و شوێنی کۆچی یەسریب دەبێت، هەمووان کۆبوونەوە تا بۆ وەرزی دواتر بیبیننەوە، بەڵام گەورەکەیان نەیهێشت ئەو ساڵە حەج بکەن، بۆیە هیچ کامیان پێی نەگەیشتنەوە، جوولەکەکەش مرد، لە بیسترا بوو سەرەمەرگیدا بڕوایشی بە موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) هەبوو و باوەڕی پێ هێنابوو.[1]

---

[1] - ضعيف

ئەبونەعیم لە دلائل النبوة ص١٠٠ دا لە عەبدولڕەحمانی عامری لە گەورەکانی هۆزەکەیەوە هێناویەتی وتیان: ئێمە لە بازاڕی عەکاز بووین کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هات بۆلامان و فەرمووی (من القوم؟) واتە(لە چ هۆزێکن؟) وتمان: لە بەنی عامری کوڕی صەعصەعین، فەرمووی (من اي بني عامر؟) واتە(لە کام بەنی عامر؟) وتمان: لە بەنوکەعەبی کوڕی ڕەبیعە، وتی (کیف المنعة فیکم؟) واتە(پاراستن لاتان چۆنە؟) وتمان: لەسەر باری جارانمان، ئەویش پێی فەرمووین (اني رسول الله، فان اتیتم تمنعوني حتى ابلغ رسالة ربي ولم اکره احدا منکم على شیئ) واتە(من پێغەمبەری خوام ئەگەر بێم بۆلاتان تا بمپارێزن تا پەیامی پەروەردگارم دەگەیەنم و کەستان هیچ بێزار نەکەم چی دەڵێن؟) وتیان: تۆ لە کامانەی قورەیشیت؟ فەرمووی لە بەنی عەبدولموتەلیب، وتیان: ئەی عەبدولمەناف بۆچی پەنات نادەن؟ فەرمووی (ئەوان یەکەم کەسانێك بوون بەدرۆیان زانیم و دەریانکردم، وتیان، بەڵام ئێمە دەرت ناکەین و بڕواشت پێ ناهێنین، پشتگیریت دەکەین تا پەیامی پەروەردگارت دەگەیەنیت، ئەویش لەگەڵیان چوو و ئەوانیش ئیشی بازاڕیان هەبوو، کە بەحرەی کوڕی قەیسی قوشەیری هات بۆلایان و وتی: ئەوە کێیە لاتان؟ ڕقی لێی بوو، وتیان: موحەمەدی کوڕی عەبدوڵلای قورەیشی، وتی ئێوە لە کوێ و ئەو لە کوێ؟ وتیان: بانگەشەی ئەوە دەکات پێغەمبەری خوایە، داوامان لێدەکات بیپارێزین تا پەیامی پەروەردگاری بگەیەنێت، وتی: ئەی چیتان خستۆتە بەردەست؟ وتیان: وتمان بە بەخێرهاتن و کرلوەیی دەرفەتەوە وەرە بۆ وڵاتمان چۆن خۆمان دەپارێزین، بەجرە وتی: بڕواناکەم هیچ کەسی ئەم بازاڕە وەك ئێوە بە زیادمەندی بگەڕێتەوە، سەرەتای ڕکەبەری و ڕەخنەگیری عەرەبتان دەست پێکرد، هۆزەکەی خۆی باشتر دەیناسن ئەگەر خێریان لێ بەدی بکردایە ئەوا خەڵکی پێی دڵخۆش دەبوون. پەنای کەسێك دەدەن و لەگەڵی دەوەستن کە هۆزەکەی دەیان کرد و بە درۆیان زانیوە و ئێوەش پەنای دەدەن و سەری دەخەن، بە ڕاستی خراپتان کرد، پاشان سەیری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)ی کردوو وتی: هەستە و پەیوەستی هۆزەکەت بە، سوێند بەخوا

ئەگەر لای هۆزەکەم نەبوویتایە ئەمدا لە ملت، پێغەمبەریش (ﷺ) هەستا و سواری وشترەکەی بوو بەجرەی پیس دای لە لاتەنیشتی وشترەکەو ئەویش پشێو کەوت و پێغەمبەری (ﷺ) خستە خوارەوە، لە ناو بەنی عامردا لەو ڕۆژەدا ضوباعەی کچی عامری کوڕی قورگ هەبوو – یەکێك بوو لە و ڕۆژانەی لە مەککە لەلای پێغەمبەر (ﷺ) موسوڵمان ببوون– بە سەردان هاتبوو بۆلای ئامۆزاکانی، وتی: ئەی ئال عامر ئاوا دەکەن لە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك لەناوتاندایە کەستان ناتوانێت بیپارێزێت؟ سێ کەس لە ئامۆزاکانی هەستان بۆ بەجرەو سیانیشیان چوونە یارمەتی بەجرە، هەرکامیان یەکێك لەوانی گرت و دای بەسەر زەویداو دوایی لەسەر سنگی دانیشت، دوایی بە بۆکز دایان لە دەم و چاویان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (اللهم بارك على هؤلاء والعن هؤلاء) واتە(خوایە بەرەکەت داباڕێنە بەسەر ئەو سیانەداو نەفرین داباڕێنە بەسەر ئەوانی دیکەشدا) ئەو سیانەی پێغەمبەریان (ﷺ) سەرخست موسڵمان بوون و شەهیدبوون ئەوانیش بەر نەفرین کەوتن و قوڕ بەسەر بوون ناوی ئەو سێ کەسەی پاڵپشتی بەجرە بوون فراس و حەزمی دووکوڕی عەبدوڵلاو موعاویەی کوڕی عوبادە بوون، ئەو سیانەش پێغەمبەریان(ﷺ) سەرخست، غیتریف و غەتفانی دووکوڕی سەهل و عوروەی کوڕی عەبدوڵلا بوون[1].[2]

ئیبن ئیسحاق لە زوهریەوە هێناویەتی پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆلای بەنی عامیری کوڕی صعصەعە و بانگی کردن بۆلای خواو پێشنیاری ئەوەی بۆ کردن بیپارێزن، یەکێکیان – کەپێی دەوترێت بوحەیرەی کوڕی فراس– پێی وت سوێند بەخوا من ئەگەر ئەم گەنجەی قورەیشم هەبێت سەری عەرەبی پێ دەخۆم (هەموویان دەخەمە

---

[1] – ضعیف.

[2]– زانای فەرمودەناس سەعیدی کوڕی یەحیای کوڕی ئومەوی لە (المغازی) لە باوکیەوە هێناویەتی، لە البداية والنهاية (ج٣ ص١٤١)یشدا هاتووە.

ژێر دەستی)، پاشان پێی وت: باشە ئەگەر لەسەر کارەکەت لە پشتت بووین پاشان خوای گەورە سەری خستیت بەسەر نەیارانتدا، ئایا دوای تۆ کارو بارو دەستەڵات بۆ ئێمە دەبێت؟ فەرمووی (الامر لله یضعه حیث یشاء) (ئەم کارە هی خوایەو دەیداتە دەست هەرکەس خۆی بیەوێت) ئەویش پێی وت: خۆمان بدەینە بەر ڕمی عەرەب بۆ تۆ، کە خوا سەری خستیت دەسەڵات بۆ کەسی تر بێت، هیچ پێویستمان بەو کارەت نیە، بۆیە ڕازی نەبوون، کە خەڵکی گەڕانەوە بەنی عامر گەڕانەوە بۆلای گەورەیەکی بە تەمەنیان کە لەبەر پیری نەیتوانیبوو لەگەڵیان بچێت،کاتێك گەڕانەوە بۆلای بۆیان باسکرد چی بووە، کاتێك ئەو ساڵە هاتن بۆلای پرسیاری لیٚ کردن چی بووە، وتیان یەکێك لە بەنی عەبدولموتەلیب لە قورەیشیەکان هات و بانگەشەی پێغەمبەری دەکردو بانگی دەکردین بۆ ئەوەی پاڵپشتی بین و لەگەڵی بین و بیهێنین بۆ وڵاتی خۆمان، پیاوە پیرەکەش دەستی خستەسەر دەستی و وتی: قوڕبەسەرتان؟ سوێند بەوەی گیانی فڵانی بە دەستە ئەمە تەنها قسەی کەسێکی ئیسماعیلیەو حەقە، ئەی ڕای ئێوە چۆن وابوو؟ (بۆ ڕازی نەبوون؟)[1][2]

ئیبن ئیسحاقیش لە زوهریەوە هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هات بۆلای کیندەو گەورەیەکیان هەبوو پێی دەوترا مەلیحن پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بانگی کردن بۆلای خواو پێشنیاری بۆ کردن تا بیپارێزن، بەڵام ئەوان ڕازی نەبوون.

لە موحەمەدی کوڕی عەبدولڕەحمانی حوصەینەوە دەڵێت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هات بۆلای کوڕو کۆمەڵی بەنو کەلب هات بۆلای بەشێکیان کە پێیان دەوترا بەنوعەبدوڵلا، بانگی کردن بۆ ئیسلام و پێشنیاری پاراستنی خۆی بۆ کردن تا

---

[1] – ضعیف.

[2] – لە البدایة ج٣ ص١٣٩ دا واهاتووە ن ئەبونەعیم (ص١٠٠) لە ئیبن ئیسحاق لە زوهریەوە هێناویەتی (لەوێوە کە دەڵێت کاتیٚ خەڵك چوونەوە بەنی عامر گەڕانەوە بۆلای گەورەیەکیان) تاکۆتایی دێنێت.

ئەوەی فەرمووی (یا بني عبد الله ! ان الله قد احسن اسم ابیکم) واتە(بەنو عەبدوڵلاّ خوای گەورە ناوێکی جوانی داوە بە باوکتان) کەچی ڕازی نەبوون.

لە عەبدوڵلای کوڕی کەعبی کوڕی مالیکەوە (رضي الله عنه) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هاتە کوڕ و کۆمەڵی بەنو حەنیفە و بانگی کردن بۆ لای خوا و پێشنیاری بۆ کردن تا بیپارێزن، هیچ کەس لە عەرەبەکان هێندەی ئەوان ناشیرین وەڵامیان نەدایەوە[1][2].

ئەبو نەعیم لە عەباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموون لای تۆو براکەشت پاراستن و پەنایەك بۆ خۆم بەدی کەم، دەی سبەینێ لەگەڵم دێیت بۆ بازاڕ تا بچینە لای هۆزەکان کە کۆبوونەوەی عەرەبەکانە. منیش وتم: ئەمە کیندەن و ئەمەش شوێنیانە، چاکترین کەسانی یەمەنن کە هاتوون بۆ حەجی بەیت، ئەمەش بەکری کوڕی وائیل و ئەمانەش بەنی عامری کوڕی صەعصەعەن. خۆت یەکێکیان هەڵبژێرە؟ پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لە کیندەوە دەستی پێکرد، فەرمووی (من أيّ کینده) واتە(لە کامانی کیندەن؟) وتیان: لە بەنی عەمری کوڕی موعاویەین، فەرمووی (فهل لکم إلى خیر) واتە(خێر و چاکەیەکتان دەوێت ڕووتان تێ بکات؟) وتیان: چیە؟ فەرمووی(تشهدون ان لا اله الا الله و تقیمون الصلاة و تؤمنون بماجاء من عند الله).

عەبدوڵلای کوڕی ئەجلەح دەڵێت: باوکم لە شێخەکانی هۆزەکەیە و بۆی گێڕامەوە کە کیندە وتیان بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم): ئەگەر سەرکەوتیت دوای خۆت دەسەڵات دەدەیت بە ئێمە؟ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (إن الملك لله یجعله حیث یشاء) واتە(دەسەڵات هی خوایە و بە کێی بوێت دەیداتێ) ئەوانیش وتیان: هیچ پێویستیەکمان بەوە نیە بۆت هێناوین، کەلبی دەڵێت: دێیت وامان لێ دەکەیت بە ڕووی خواکانماندا بوەستین و ڕکابەری عەرەب بکەین، بڕۆوە ناو هۆزەکەی خۆت،

---

[1] – ضعیف.

[2] – لە البدایە ج٣ ص ١٣٩ دا واهاتووە.

ئێمە کە هیچ پێویستیەکمان پێت نیە، ئەویش لە لایان چوو و هاتە لای بەکری کوڕی وائیل و فەرمووی (ممن القوم؟) وتیان لە بەکری کوڕی وائیلن، فەرمووی(من اي بكر وائيل؟) واتە (لە کامیان) وتیان (لە بەنی قەیسی کوڕی ثە علەبە، فەرمووی(كيف العدد؟) واتە (ژمارەتان چەندە؟) وتیان زۆر زۆرین، فەرمووی (كيف المنعة؟) واتە (پەنادان و پاراستن لای ئێوە چۆنە؟) وتیان: پەنای کەس نادەین، دراوسێی فارسین و نەپەنایان دەدەین و نە لە دژیان دەبین، فەرمووی (فتجعلون الله عليكم ان هو ابقاكم حتى تنزلو منازلهم و تستنكحوا نسائهم و تستعبدوا ابنائهم ان تسبحوالله ثلاثا وثلاثين و تحمدوه ثلاثا وثلاثين و تكبروه اربعا وثلاثين) وتیان: تۆ کێیت؟ فەرمووی من پێغەمبەری خوام، پاشان چوو، کاتێك ڕووی لێ وەرچەرخاندن تا بچێت کەلبی وتی: ئەبولەهەبی مامی بە دواوە بوو بە خەڵکی دەوت: قسەکەی وەرمەگرن، پاشان ئەبولەهەب تێپەڕی و خەڵکەکە وتیان: ئەم پیاوە دەناسی؟ئەبولەهەب وتی، بەڵێ ئەوە لە وەچەی ئێمەیە پرسیار لە چی دەکەن لە بارەیەوە؟ ئەوانیش پێیان وت کە بۆچی بانگی کردوون و وتیان دەڵێت: پێغەمبەری خوام،ئەبولەهەب وتی: نا قسەی لێ مەگرن ئەو شێتەو بەدەست ناساغی سەریەوە وڕێنە دەکات،بەنی قەیس وتیان: کاتێك فتوحاتی فارسمان بینی ئەومان بینی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرمووین.[1]

ئیبن ئیسحاق لە ڕەبیعی کوڕی عەبادەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: من گەنجێك بووم لەگەڵ باوکم لە مینا بووین، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) یش دەچوو بۆلای هۆزەکانی عەرەب و دەیفەرموو (يا بني فلان اني رسول الله اليكم امركم ان تعبدوا الله ولا تشركوا به شيئا و ان تخلعوا ما تعبدون من دونه من هذه الانداد، وان تؤمنوا بي، وتصدقوا بي، وتمنعوني حين اين عن الله ما بعثني به) واتە (ئەی بەنی فلان من پێغەمبەری خوام، ناردوومی بۆ ئێوە تا فەرمانتان پێ بکەم خوا بپەرستن و هاوەڵی

[1] - ضعيف.

بۆ دانەنێن و واز لە پەرەستشی جگە لە خوا بهێنن و هاوەڵی بۆ دانەنێن و باوەڕم پێ بهێنن و پاڵپشتم بن تا ئەوەی خوا پێی ناردووم بیخەمە ڕوو)، پیاوێکی چاو خێلی پاك و خاوێن كە دوو پرچی هەبوو كڵاوێكی عەدەنی لەسەر نابوو بە دوایەوە بوو. كە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە قسەكەی دەبوویەو ئەو پیاوە دەیوت: بەنی فڵان ئەمە بانگتان دەكات بۆ ئەوەی واز لە لات و عوززا بهێنن و دەست بەرداری هاوپەیمانە جنۆكەكانتان بن لە بەنی مالیكی كوڕی ئەقیەش و چەند نەزانی و گومڕاییەكی وای بۆ ڕیز دەكردن و دەیوت بە گوێی مەكەن و گوێی لێ مەگرن، منیش وتم بابەگیان ئەم كابرا كێیە وا شوێنی كەوتووە و بەرپەرچی قسەكانی دەداتەوە؟ وتی ئەوەی عەبدولعززای كوڕی عەبدولموتەلیبە(ئەبو لەهەب)ی مامیەتی.[1,2]

تەبەرانی لە مودریكەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ باوكم حەجم كرد، كاتێك لە مینادا دابەزین لەناو كۆمەڵێكدا بووین، بە باوكم وت ئەمانە كێن؟ وتی ئەوە صابیئە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموو (يا ايها الناس قولوا لا اله الا الله تفلحوا) واتە (خەڵكینە بڵێن لااله الا الله سەردەكەون)[3].[4]

بوخاری لە (التاريخ) و ئەبوزەرعەو بەغەوی و ئیبن ئەبی عاصم و تەبەرانی لە حارسی كوڕی غمیدیەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: لە مینا لە گەڵ باوكم بووین بە باوكم وت ئەمانە كێن؟ وتی ئەوانە لە دەوری صابیئە كۆبوونەتەوە، منیش چوومە

---

[1] – ضعیف.

[2] – لە البدايه والنحايەج٣ ص١٣٨ دا واهاتووە. هەروەها لە عەبدوڵڵای كوڕی ئەحمەدو تەبەرانی لە ڕەبیعەوە بەو واتایە هێناویانە، هەیسەمی (ج٦ ص٣٦) دەڵێت لە سەنەدەكەدا حوسەینی كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی عەبەیدوڵڵا هەیە كە لاوازە و ئیبن موعینیش لە گێڕانەوەكەیدا بە جێمتمانەی داناوە، منیش دەڵێم: لە گێڕانەوەكەی ئیبن ئیسحاقدا كەسێك هەیە كە ناوی نەهاتووە.

[3] – صحیح.

[4] – هەیسەمی ج٦ ص٢١ دەڵێت: پیاوەكانی سەنەدەكەی جێمتمانەن.

پێشەوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خەڵکی بانگ دەکرد بۆ یەکتاپەرستی و ئەوانیش بەرپەرچیان دەدایەوە.[1][2]

واقیدی لە حەسانی کوڕی سابیتەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: حەجم کرد دەبینم پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خەڵك بانگ دەکات بۆ ئیسلام و هاوەڵەکانیشیزادەدران، منیش لای عومەرەوە وەستام کەسزای کەنیزەکی بەنی عەمری کوڕی موئمەلی دەدا، پاشان چوو بۆلای زەنیرو وایشی بەو کرد.[3][4]

ئەبونەعیم (ص٩٦) لە ئیبن عەبباس لە عەلی کوڕی ئەبوتالیبەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك خوای گەورە فەرمانی کرد بە پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) تا پێشنیاری پاراستنی بخاتە بەردەم هۆزە عەرەبەکان من و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەبوبەکر (رضي الله عنه) چووین بۆ مینا تا چووینە کۆڕێك لە کۆڕەکانی عەرەب، ئەبوبەکر پێشکەوت و سەلامی کرد – هەموو کات ئەبوبەکر پێش دەکەوت چونکە لە ڕەچەڵەك ناسیدا زیرەك بوو– وتی لە چ هۆزێکن؟ وتیان: لە ڕەبیعە، وتی: کامیان؟ ئینجا فەرموودەکەی بە دوورو درێژی هێناوە و تیایدا دەڵێت: پاشان گەشتینە کۆڕێك کە سوکنایی و هێوری بەسەردا زاڵبوو و گەورەکانیان ڕێزو شان و شکۆیان هەبوو،ئەبوبەکر پێش کەوت و سەلامی کرد، پێی وتن لە چ هۆزێکن؟ وتیان ئێمە بەنوشەیبانی کوڕی سەعلەبەین، ئەویش لایکرد بەلای پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) و پێی وت: بە دایك و باوکمەوە بەقوربانت بم دوای ئەمانە لەناویاندا عیزەتمەند نیە، لە نێوانیاندا مەفروقی کوڕی هانیئی کوڕی قوبەسە و موسەننای کوڕی حارسە و نوعمانی کوڕی شورەیك بوون، مەفروق لە هەموویان زیاتر لە ئەبوبەکر نزیکتر بوو، مەفروق بە

---

[1] – صحیح.

[2] – لە الاصابة (ج١ ص٢٧٥) دا واهاتووە.

[3] – ضعیف.

[4] – لە الاصابە (ج٤ ص ٣١٢) دا واهاتووە.

قسەزانی و زمانپاراوی بەسەریاندا زاڵ بوو،دووپرچی هەبوون درێژ ببونەوە بەسەر سنگیدا، ئەبوبەکر پێی وت: ژمارەتان چەندە؟ پێی وت: زیاتر لە هەزار کەسین و کەمینەیەکیش هەرگیز بەسەر هەزاردا زاڵ نابن، ئەبوبەکر وتی پاراستن و پەنادان لای ئێوە چۆنە؟ وتی هەوڵمان لەسەرەو هەر هۆزێکیش گەورەیەکی هەیە، ئەبوبەکر وتی: ئەی شەڕی نێوان ئێوەو دوژمنەکانتان چۆنە؟ مەفروق وتی: کاتێك شەڕ دەکەین لەوپەڕی توندڕەویدابن، کاتێکیش تووڕەدەبین لەوپەڕی توندی بەریەککەوتنداین، ئێمە ئەسپەکانمان لە منداڵەکان لا گرنگترە، چەکمان لە وشتری شیردار لا گرنگترە، سەرکەوتنیش لای خوایە، جارێك سەرمان دەخات و جارێکیش بەسەرماندا سەردەکەون، وادیارە تۆ لە قورەیشیت؟ ئەبوبەکر وتی ئەگەر بیستووتانە پێغەمبەر (ﷺ) لەناو قورەیشدا دەرکەوتووە ئا ئەوەتا، مەفروق وتی: پێمان گەیشتووە شتی وا دەڵێت، پاشان لایکردەوە بەلای پێغەمبەردا (ﷺ) و وتی: بانگەواز بۆچی دەکەیت برای قورەیش (کەسێکی ناو قورەیش)؟ پێغەمبەریش (ﷺ) دانیشت و ئەبوبەکریش بە کراسەکەی سێبەری بۆ دەکرد، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (ادعوكم الى شهادة ان لا الـه الا الله انـي رسـول الله وان تـؤووني وتنصروني حتى اؤدي عن الله تعالى ما امرني به، فان قريشا قد تظاهرت علي امر الله، وكذبت رسوله واستغنت بالباطل عن الحق، والله هو الغني الحميد) واتە (بانگتان دەکەم بۆ ئەوەی شایەتی بدەن هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خوا و منیش پێغەمبەری خوام، پەنام بدەن و بمپارێزن و سەرم بخەن تا ئەوەی خوا فەرمانی پێ کردووم بەجێی بگەیەنم، چونکە قورەیش بەرامبەر فەرمانی خوا وەستان و پێغەمبەرەکەیان بە درۆزانی و بە باتڵ خۆیان لە حەق بێباك کرد، خوای گەورەش دەوڵەمەندو جێ سوپاسە)، وتیان بانگەواز بۆ چیتر دەکەیت؟ پێغەمبەریش (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە (قل تعالو اتل ما حرم ربكم عليكم الاتشركوا به شيئا وبالوالدين احسانا) تا گەیشتە (فتفرق بكم عن سبيله ذلكم وصاكم به لعلكم تتقون) مەفروق وتی: بانگەواز بۆ چیتر دەکەیت؟ سوێند بەخوا ئەمە قسەی خەڵکی سەر

زەوی نیـە، ئەگـەر قـسەی سـەر زەوی بوایـە دەمـانزانی، پێغەمبـەریش (صلی الله علیه وسلم) ئـەم ئایەتەی خوێنـدەوە (ان الله یامرکم بالعدل و الاحسان) تاگەیشتە (لعلکم تذکرون) مەفروق وتی: ئەی قورەیشی سوێند بە خوا بانگەواز بۆ ڕەوشتی باڵا و کاری چاك دەکەیت، هۆزێك بە درۆت دەزانن و لە دژت هەڵدەستن قوڕیان بەسەرە، وەك ئەوەی حەز بکات هـانیئی کوڕی قوبەیصە بەشداری قسەکەی بکات، بۆیە وتی: ئەمەش هـانیئی کوڕی قوبەیصەی گەورەو بەرپرسی ئاینمانە، هـانیئ پێـی وت: قسەکانم بیـست و بە ڕاستیان دەزانم، مـن پـێم وایـە ئەگـەر واز لـە ئاییـنمـان بهێـنین و لەسـەر کۆڕێـك لەگـەڵت دانیـشتووین بـەبێ ئـەملاولا و بیرکردنـەوەو ڕوانینـە سـەرەنجامی ئـەوەی بانگمـان دەکـەیت, سـەرەنجامی گـومڕایی و سـادەعەقڵی و کـەمبینی تیایـە، پەلەکردن شکستی لەگەڵە، ئێمە خەڵکێکمان بەجێهێشتووە حەزناکەین بەبێ ئـەوان بڕیاریـان لەسـەر بدەین، بـەڵام تـۆ بگـەڕێرەوەو ئێمـەش دەگەڕێینـەوەو چاوەڕێکەو ئێمـەش چـاوەڕێ دەکـەین، وەك ئـەوەی حـەزبکات موسـەننای کـوڕی حارسـەش بەشـداری لـە قسەکەیدا بکـات وتـی ئەمـە موسـەننای گـەورەو بەرپرسـی شـەڕمانە، موسـەنناش وتـی: قـسەکەم بیـست و پـێم بـاش بـوو و سەرسـامی وتـەکانت بـووم، وەڵامی منیش وەك ئەوەی هانیئی کوڕی قوبەیصەیە، ئێمە لە نێوان دوو دڕزداین، لـە نێـوان یەمامـەو سـەماوەداین، پێغەمبـەریش (صلی الله علیه وسلم) پێـی فـەرموو (و مـا هـذا الصیران؟) واتە (ئەو دڕزانە چین؟) پێی وت: یەکێکیان بەرزایی و وشکانی خاکی عـەرەب و ئـەوی دیکـەش خـاکی فـارس و ڕووبارەکـانی کیـسرا، لەگـەڵ کیـسرا بەڵێنێکمان هەیە کە لێی وەرگرتووین تا هیچ نەکەین و پەنا بۆ هیچ شتێکی تازە نەبەین، کـێ دەڵـێ ئەوەی تـۆ بانگـەوازی بـۆ دەکـەیت جێـی ڕق و نـاڕەزایی پاشاکان نـەبێت، سـەبارەت بـە وڵـاتی عـەرەبیش تـاوانی خاوەنەکـەی جێـی لێخۆشـبوونەو پۆزشـی قبـوڵ دەکرێـت، بـەڵام لای فـارس تـاوان لێخۆشـبوونی نیـەو پـۆزش وەرناگیرێت، ئەگـەر دەتـەوێت لـەلای عەرەبەوە سەرت بخـەین ڕازیـن، پێغەمبـەریش (صلی الله علیه وسلم) فـەرمووی (مـا اسـاتم الـرد اذ افـصحتم بالـصدق انه لایقوم بـدین الله الا مـن

حاطه من جميع جوانبه) واتـه (وەڵـامێکی خراپتـان نەدایـەوە کە بەڕاسـتی قسـەتان کرد، ئاییـنی خـوا لەهـەمووﻻوە چـواردەور نـەدرێت ناگیرێتەبـەر) پاشـان پێغەمبـەر (ﷺ) هەستاو دەستی ئەبوبەکری (رضي الله عنه) گرت و چوون بۆ کۆڕی ئەوس و خەزرەج، هەرکەهەسـتان یەکسەر بەیعەتیانـدا بـە پێغەمبـەر(ﷺ)، عـەلی (رضي الله عنه) وتـی: زۆر ڕاستگۆو خۆڕاگربوون (ڕەزای خوا لە هەموویان)،[1] لـە البدايـه والنهايـه ج٣ ص١٤٢ دا دەڵێـت: ئەبونـەعیم و حاکم و بەیهـەقی گێڕاویانەتـەوەو دەقەکە هـی ئەبونەعیمـە، ئینجا فەرموودەکە دێنێت و تیایدا پاش (انه لا يقوم بدين الله الا من حاطه من جميع جوانبه) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ارايتم! ان لم تلبثوا الا يسيرا متى يمنعكم الله بلادهم و اموالهم و بفرشكم بناتهم اتسبحون الله و تقدسونه) واتـە(ئەی چی ئەبێت ئەگەر کەمێك خۆتـان ڕابگرن تـاخوای گـەورە وڵـات و ماڵیـان بداتـە ئێوەو کچانیان بداتـە ئێـوە ئایـا ستایـشی خـوا دەکـەن و بـە پیرۆزی ڕادەگـرن؟) نوعمـان پێـی وت: خوایە گیان! ئەریٚ وەڵڵاٚ، پێغەمبەریش (ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێنـدەوە (انـا ارسلناك شاهدا ومبشرا ونذيرا وداعيا الى الله باذنه وسراجا منيرا) پاشـان هەسـتاو دەستی ئەبوبـەکری گـرت، عـەلیش دەڵێـت: پاشـان پێغەمبـەر (ﷺ) لایکـردەوە بەلامانـداو فەرمووی (ياعلي، اية اخلاق للعرب كانت في الجاهلية – ما اشرفها– بها يتحاجزون في الحياة الدنيا) واتـە(ئـەی عـەلی عـەرەب لـە نەزانیـدا چ ئاکارێکیـان هەیـە – چەند شەرەفمەندانەیە– ئەو ئاکارە دەکەنە بەربەست لە ژیانی دونیادا) پاشان چووین بۆ کـۆڕی ئـەوس و خـەزرەج، کـە هەسـتاین چـووین بەیعەتیانـدا بـە پێغەمبـەر (ﷺ)، ئەوانـە ڕاسـتگۆو خۆڕاگربوون، پێغەمبـەر (ﷺ) دڵخـۆش بـوو کـە ئەبوبـەکر (رضي الله عنه) ڕەچەڵەکی دەناسین، هێندەی نەخایاند تـا پێغەمبـەر (ﷺ) چـوو بـۆلای هاوەڵـانی و پێـی فـەرموون (احمدوا الله كثيرا فقد ظفرت اليوم ابناء ربيعة باهل فارس، قتلوا ملوكهم واستباحوا عسكرهم وبي نصروا) واتـە(زۆر سوپاسـی خـوا بکـەن، ئەمڕۆ

---

[1] – لە دلائل النبوه ی ئەبونەعیمدا واهاتووە.

کوڕانی ڕەبیعە بەسەر خەڵکی فارسدا سەرکەوتن، پاشاکانیان کوشتن و سەربازگەیان ڕەوا کردو بە منەوە بەرەو سەرکەوتن چوون)[1].

ئەمە لە ڕێگەیەکی دیکەوە هاتووەو تیایدا دەڵێت: کاتێك لەگەڵ فارسدا بە یەك گەیشتین و لە (قراقر) (شوێنێکی نزیك فورات) بە شەڕهاتن دروشمیان ناوی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوو، بەوە بەسەر فاسدا سەرکەوتن و دواتریش (فارس) هاتنە ناو ئیسلام، < ئیبن حەجەر لە فەتحولباری ج٧ ص ١٥٦ دا دەڵێت: حاکم و ئەبونەعیم و بەیهقی لە الدائل دا بەسەنەدێکی حەسەن لە ئیبن عەباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی کە عەلی کوڕی ئەبوتالیب پێی وتم – ئینجا بەشێکی ئەم فەرموودەیە دێنێت–.>

ئەبونەعیم لە الدلائل ص١٠٥ لە ڕێگەی واقیدی لە ئیسحاقی کوڕی حەباب لە یەحیای کوڕی یەعلاوە هێناویەتی دەڵێت ڕۆژێکیان عەلی کوڕی ئەبی تالیب (رضي الله عنه) باسی پشتیوانان و فەزڵ و گەورەیی و پێشینەیانی دەکرد وتی: هەرکەس پشتیوانانی خۆش نەوێت و مافیان لەبەرچاو نەگرێت باوەڕدار نیە، سوێند بە خوا بە شمشێرەکانیان چاودێری ئیسلامیان کردو زمان و دەوڵەمەندی خۆیان بەکار هێنا، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە وەرزەکاندا دەچوو و بانگەوازی هۆزەکانی دەکرد، کەس نەدەچوو بە دەمیەوەو لێی قبوڵ نەکرد، هۆزەکان لە مجنەو عوکازو مینا بوون، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەچوو بۆلای هۆزەکان و ساڵ دوای ساڵ دەچوویەوە بۆلایان تا ئەوەی هۆزی وا هەبوو دەیوت: ئیتر لێمان بێ هیوا نەبوویت؟ چونکە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) زۆر لێی دووبارە دەکردنەوە تا خوای گەورە خێری بۆ ئەم پشتیوانانە ویست، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێشنیاری ئیسلامی بۆ کردن، ئەوانیش خێرا هاتن بە دەمیەوەو پەنایان داو سەریان خست – خوای گەورە پاداشتی خێریان بداتەوە–

---

[1] – حسن.

[2] – ئیبن کەسیر لە البداية والنهاية (ج٣ ص١٤٥) دا دەڵێت: فەرموودەیەکی غەریبە، نووسیومانە لەبەر ئەوەی بەڵگەی پێغەمبەرایەتی و ئاکاری بەرزو ڕەوانبێژی عەرەبی تێدایە.

چووین بۆلایان و لەگەڵیان دانیشتین و لە کۆڕوماڵیان دابەزین و هەرکامیان ویستی زیاتر خزمەتمان بکات تا ئەوەی بەشداریان کردین، پاشان وای لێهات زیاتر لە خۆیان لە ماڵ و سامانیاندا مافیان دەدا بە کۆچەران تا بەوە خۆیان پاك ڕاگرن، پاشان بۆ پێغەمبەرەکەیان گیانی خۆیان دانا.[1]

ئەبونەعیم لە الدلائل (ص١٠٥)دا لە ئوم سەعدی کچی سەعدی کوڕی ڕەبیعەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هێندەی لە مەککە مایەوە بانگەوازی هۆزەکانی دەکرد بۆ لای خوای گەورە، ئازار دەدراو قسەی پێ دەوترا تا خوای گەورە ڕێزی کردە بەشی ئەو دەستەی پشتیوانان، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە عەقەبە دەستەیەکی ئەوانی بینی کە سەری خۆیان دەتاشی، وتم دایە گیان ئەوانە کێ بوون؟ وتی: شەش یان حەوت کەس بوون، سیانیان لە بەنی نەجار بوون، ئەسعەدی کوڕی زورارەو دووکوڕەکەی عەفراو، ناوی ئەوانی دیکەی پێ نەوتم، وتی: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دانیشت و بانگی کردن بۆ لای خوای گەورەو قورئانی بەسەردا خوێندن و ئەوانیش چوون بەدەم بانگەوازی خواو پێغەمبەرەکەیەوەو قبوڵیان کرد، ئەمە عەقەبەی یەکەم بوو، دوایی عەقەبەی دووەمیش هات، وتم: دایکی سەعد: پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) چەندە لە مەککە مایەوە، ئەویش وتی: مەگەر وتەکەی ئەبوصرمەی قەیسی کوڕی ئەنەست نەبیستووە؟ وتم: نازانم چی وتووە، ئەویش ئەم شیعرەی خوێندەوە

ثوى في قريش بضعة عشرة حجة    يذكر لو لاقى صديقا مواتيا

ئینجا دێرە شیعرەکانی دیکەی هێنا کە دواتر لە باسی سەرکوتن لە فەرموودەکەی ئیبن عەبباسدا (رضي الله عنه) دەیهێنین.[2]

---

[1] – ضعیف.
[2] – ضعیف.

ئەبونەعیم لە الدلائل (ص١٠٥) دا لە عەقیلی کوڕی ئەبوتالیبەوە (رضي الله عنه) و زوهری (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك بێباوەڕان فشاریان لەسەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) توند کردەوە بە عەبباسی مامی (رضي الله عنه) فەرموو (یا عم ان الله عز وجل ناصر دینه بقوم یهون علیهم رغم قریش عزا في ذات الله تعالى، فامض بي الى عكاظ فارني منازل احياء العرب حتى ادعوهم الى الله عز وجل وان يمنعوني و يؤووني حتى ابلغ عن الله عز وجل ما ارسلني به) واتە(مامە گیان خوای گەورە ئایینی خۆی بە کۆمەڵێك سەردەخات کە لەتاو عیززەتی لای خوا قورەیشیان لا کەم و بچووکە، دەی بمبە بۆ عوکاز و شوێنی دانیشتنی عەرەبەکانم پێ بڵێ تا بانگیان بکەم بۆلای خواو پەنام بدەن و بمپارێزن تا ئەوەی خوا پێی ناردووم بیگەیەنم) عەبباسیش وتی: برازاکەم بڕۆ بۆ عوکاز منیش لەگەڵت دێم تا شوێنەکانیانت پێ نیشان بدەم، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) سەرەتا لە سەقیفەوە دەستی پێ کرد، پاشان لەو ساڵەدا چوو بۆلای هۆزەکانی دی، بۆ ساڵی دواتر- کاتێك خوا فەرمانی کرد بە ئاشکرا بانگەواز بکات- شەش کەسی خەزرەجی و ئەوسی بینی: ئەسعەدی کوڕی زەرارە، ئەبولهەیسەمی کوڕی تیهان، عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە، سەعدی کوڕی ڕەبیع، نوعمانی کوڕی حارسە، عوبادەی کوڕی صامت، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە شەو لە عەقەبە لە ڕۆژانی مینادا ئەوانی بینی، لایان دانیشت و بانگی کردن بۆلای خواو پەرستشی خواو پشتگیری ئەو ئایینەی کە ناردوویەتی بۆ پێغەمبەرانی، ئەوانیش داوایان کرد ئەو سروشەی بۆی دابەزیوە بۆیان بخاتە ڕوو، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) سوورەتی ئیبراهیمی خوێندەوە (واذ قال ابراهيم رب اجعل هذا البلد امنا....) تاکۆتایی سوورەتەکەی خوێند، ئەوانیش دڵیان نەرم بوو و هاتن بە دەمیەوە، عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب تێپەڕی کاتێك یەکتریان دەدواند، دەنگی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) ناسیەوە و وتی: برازاکەم ئەوانەی لاتن کێن؟ فەرمووی (يا عم سكان يثرب الوس والخزرج قد دعوتهم الى ما دعوت اليه من قبلهم الاحياء فاجابوني و صدقوني، و ذكروا انهم يخرجونني الى بلادهم) واتە(مامە گیان دانیشتوانی یەسریبن، ئەوس و

خەزرەج، بانگم کردن بۆ ئەوەی پێشتر ئەوانی ترم بۆ بانگ کردن، ئەمان هاتن بەدەم بانگەوازەکەمەوەو بڕوایان پێ هێنام و دەڵێن دەمبەنەوە بۆ وڵاتی خۆیان).
عەبباشیش دابەزیو سوارەکەی بەستەوەو دوایی پێی وتن: کۆمەڵی ئەوس و خەزرەج ئەمە برازامە، خۆشەویسترین کەسمە، ئەگەر بڕواتان پێ هێناو ویستان لەگەڵ خۆتان بیبەن من دەمەوێت بەڵێنێکتان لێ وەربگرم تا دڵم ئارام بێت و پشتی بەر نەدەن و نەیخەن، چونکە جوولەکە دراوسێتانن، جوولەکەش دوژمنی موحەمەدن ودڵنیا نیم لە فێڵی جوولەکە دژ بە موحەمەد(ﷺ)، ئەسعەدی کوڕی زەرار قسەکەی عەبباسی بڕی کاتێك سەعدو هاوەڵەکانی تۆمەتبار دەکات - وتی: ئەی پێغەمبەری خوا مۆڵەتمان بدە با بەبێ دڵ ئێشاندنی تۆو دوور لە وتنی هەرچیەك تۆ پێی ناخۆشە وەڵامی بدەینەوەو دان بنێین بە ڕاستی بەدەمەوە هاتنمان بۆت و بڕوابوونمان پێت، ئەویش فەرمووی (اجیبوه غیر متهمین) واتە(وەڵامی بدەنەوە بەبێ ئەوەی تۆمەتباری بکەن) ئەسعەدی کوڕی زەراریش ڕوویکردە پێغەمبەر (ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا هەربانگەوازێك ڕێگەیەکی هەیە، یان نەرم یان ڕەق و توند، ئەمڕۆ تۆ بانگەوازت کردووە بۆ بانگەوازێکی وا بانگت کردین واز لە ئایینمان بهێنین و ببینە شوێنکەوتەی ئایینەکەت، ئەمەش کارێکی سەختە، ئێمەیش هاتین بەدەم داواکەتەوە، داوات لێ کردین دراوسێیەتی و خزمایەتی دوورو نزیکمان لەگەڵ خەڵکدا بپچڕێنین، داواکاریەکی سەخت بوو، ئێمەش قبوڵمان کرد، ئێمەو کۆمەڵەکەمانت لە پێگەی عیزەت و پارێزگاریدا کە کەس چاوی تێ نابڕێت بانگ کرد تا کەسێکی تر کە لە خۆمان نیە بکەینە سەرکردەمان،کەسێك کە هۆزەکەی تەنهایان خستووەو مامەکانی داویانە بەدەستەوە، ئەمەش کارێکی سەختەو ئێمەش ڕازی بووین، هەموو ئەمانە لای خەڵك سەختن تەنها لای کەسانێك نەبن کە خوا ژیری و پێگەیشتنی پێ بەخشین و بۆ خێری سەرەنجامی بگەڕێن، ئێمەش بە زمان و دڵمان هاتین بەدەم ئەمانەوەو بڕوابوونی خۆمان نیشاندا بەوەی هێناوتەو لە دڵەوە بە ڕاستمان زانی، بەیعەتی

ئەمەت پێ دەدەین، بەیعەت بە پەروەردگاری خۆمان و تۆیش دەدەین، دەستی خوامان لە پشتەو خوێنمان خوێنی تۆیە، دەستمان دەستی تۆیە، خۆمان و منداڵ و ژنمان لە چی دەپارێزین بۆ تۆش وا دەکەین، ئەگەر وەفامان بۆ ئەمە هەبوو وەفامان بۆ خوا بووە، ئەگەریش ناپاك بووین لە ڕووی خوادا ناپاکیمان نواندووە، ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە لە ڕاستگۆیی ئێمەو خواش پشت و پەنایە، پاشان ڕوویکردە عەبباس و وتی: تۆ ئەی ئەوکەسەی ئەم قسەمان لەسەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێ دەڵێیت و خوا دەزانێت مەبەستت لێی چیە؟ وتت ئەمە برازاو خۆشەویسترین کەستە، ئێمە دوورو نزیکی و پەیوەنیمان پچڕاندو شایەتیمان دا پێغەمبەری خوایەو خوا ناردوویەتی و درۆناکات و ئەوەی ئەو هێناویەتی لە قسەی مرۆڤ ناچێت، ئەوەی دەیڵێیت لە بارەی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) لێمان دڵنیا نیت تا بەڵێنمان لێ وەرنەگریت، ئەمە شتێکە مادەم بۆ پێغەمبەری خوایە بۆ هەرکەس بێت قبووڵمانە، چیت دەوێ ئێمە ڕازین، پاشان لایکردەوە بەلای پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چیت پێ باشە بڕیاری لەسەر بدەو چۆنت پێ باشە لەبەردەم پەروەردگارتدا بەمەرجی دانێ -بۆمان- پاشان بەدوورو درێژی باسی بەیعەتدانیان دەکات، پشت بەخوا دواتر فەرموودەکانی بەیعەتدان لە بەشەکانی تردا دێنین.

# (پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە بازاڕدا بانگەواز دەکات)

ئەحمەد لە ڕەبیعەی کوڕی عباد لە بەنی دیلەوە – بێباوەڕبوو دوایی موسڵمان بوو– هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەرم (صلى الله عليه وسلم) بینی، لە بازاڕی زیلمەجازدا، ئەوکات من گومڕابووم، فەرمووی (یا ایها الناس قولوا لا اله الا الله الا تفلحوا) واتە(خەڵکینە بڵێن لا اله الا الله سەردەکەون و دەیبەنەوە) خەڵکیش لە دەوروبەری کۆببوونەوە، لە پشتیەوە پیاوێکی دەموچاو گەشی چاوخێل کە دوو پرچی هەبوو دەیوت: ئەمە صابیئەو درۆزنە، پێغەمبەر بۆ کوێ بچوایە ئەویش دەکەوتە شوێنی، منیش پرسیارم کرد ئەوە کێیە؟ وتیان: ئەوە ئەبولەهەبی مامیەتی[1،2].هەیسەمی ج٦ ص٢٢ دەڵێت، لە گێڕانەوەیەکیشدا هاتووە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە دەستی ڕایدەکردو ئەویش شوێنی دەکەوت، لە گێڕانەوەیەکیشدا هاتووە: خەڵکیش لە دەوری گرمۆڵەیان کردبوو، نەمبینی کەس هیچ بڵێت، ئەویش بێدەنگ نەدەبوو (تەواو) پێشتر باسمانکرد کە بانگەوازی هۆزەکانی دەکرد ئەم فەرموودەمان هێنا.

تەبەرانی لە تاریقی کوڕی عەبدوڵڵاوە هێناویەتی دەڵێت: من لە بازاڕی زیملەجاز بووم کە پیاوێکی گەنج کڵاوێکی خەت خەتینی سووری لەسەر بوو دەیوت(یا ایها الناس قولوا لا اله الا الله تفلحوا) واتە(ئەی خەڵکینە بڵێن لا اله الا الله دەیبەنەوەو سەکەوتوو دەبن) کەسێکیش لە دوایەوە دەچوو دەماری سەر پاژنەو لاقەکانی خوێن ڕەنگ بوون، دەیوت خەڵکینە ئەمە درۆزنە بە گوێی مەکەن،

---

[1] – صحیح.

[2] بەیهەقی بەهەمان شێوە هێناویەتی،لە البدایە ج٣ ص٤١ دا واهاتووە، هەیسەمی ج٦ ص٢٢ دەڵێت: ئەحمەدو کوڕەکەی و تەبەرانی لە (معجم الكبير) وەك خۆی و لە (معجم الوسيط) بە کورتی و بەچەند سەنەدێك هێناویانە، یەکێك لە سەنەدەکانی عەبدوڵڵای کوڕی ئەحمەد کەسانی جێ متمانەن، ئیبن حەجەر لە فەتحولباری ص١٥٦ دا دەیباتەوە لای بەیهەقی و ئەحمەدو دەڵێت ئیبن حەببان بە صەحیحی داناوە.

منیش وتم ئەمە کێیە؟ وتیان ئەو گەنجەی بەنوهاشمە کە دەڵێت پێغەمبەری خوام، ئەوەش عەبدولعوززای مامیەتی، ئینجا فەرموودەکە دێنێت[1][2].

ئەحمەد لە پیاوێکی بەنی مالیکی کوڕی کینانەوە هێناویەتی دەڵێت: لە بازاڕی زیلمەجاز پێغەمبەرم بینی دەیفەرموو (یا ایها الناس قولوا لا الە الا اللە تفلحوا) ئەبوجەهلیش خۆڵی بەسەردا فڕێ دەداو دەیوت: ئەمە لە خشتەتان نەبات واز لە ئایینەکەتان بێنن، ئەمە دەیەوێت واز لە خواوەندەکانتان بێنن، واز لە لات و عوززا بهێنن، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لای بەلادا نەدەکردەوە، منیش دەڵێم: وەسفی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)ی بۆ کردوین و دەڵێت: لەنێو دووخوتی سووردا بوو، گۆشتی زۆرو چوارشانە بوو، ڕووی جوان و ڕەشی موو و سپیەتی لەشی زۆرو، قژی پڕبوون[3][4].

---

[1] صحيح.

[2] هەیسەمی (ج٦ ص٢٣) دەڵێت: لەسەنەدەکەدا ئەبووحەبابی کەلبی هەیە کە دەست شوێنەرە، ئیبن حەببانیش متمانەی پێ دەدات و کەسانی دیکەی سەنەدەکەش صەحیحن.

[3] – صحيح.

[4] – هەیسەمی ج٦ ص٢١ دەڵێت: ئەحمەد گێڕاویەتیەوەو پیاوانی سەنەدەکەشی صەحیحن، بەیهەقیش بەو واتایە هێناویەتی بەڵام وەسفەکەی نەهێناوە، لە (البداية والنهاية ج٣ ص١٣٩) یشدا دەڵێت: لە دەقەکەدا ئەبوجەهل وای دەوت، دەکرێت واش نەبێت، یان هەرجارەو یەکێکیان بووبێت، یەك لە دوای یەك بەکاری هێنابن بۆ ئازاردانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

## (پێغەمبەر (ﷺ) بانگەوازی نزیکەکانی خۆی دەکات)

ئەحمەد لە عائیشەوە (رضي الله عنها) دەڵێت: کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی (وانذر عشيرتك الاقربين) پێغەمبەر (ﷺ) هەستاو فەرمووی (يا فاطمة ابنة محمد، يا صفية ابنة عبد المطلب، يا بني عبدالمطلب،لا املك لكم من الله شيئا سلوني من مالي ما شئتم) واتە(ئەی فاتیمەی کچی موحەمەد، ئەی صەفیەی کچی عەبدولموتەلیب، کوڕانی عەبدولموتەلیب، لە ماڵو سامانم چیتان دەوێت داوا بکەن، بەڵام لای خوا هیچم پێ ناکرێت بۆتان).[1]

هەروەها ئەحمەد لە عەلیەوە (رضي الله عنه)هێناویەتی دەڵێت: کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی (و انذر عشيرتك الاقربين) پێغەمبەر (ﷺ) لە ئالوبەیتی خۆی سی کەسی کۆکردەوەو نانو ئاویان خوارد، پاشان پێی فەرموون (من يضمن عني ديني ومواعيدي ويكون معي في الجنة ويكون خليفتي في اهلي؟) واتە(کامتان ئایینو مەوعیدم لێ وەردەگرێت لە بەهەشتدا لەگەڵمدا دەبێتو لە ناو ئالوبەیتیشمدا جێگیرەوەم دەبێت؟) یەکێکیان وتی ئەی پێغەمبەری خوا تۆ وەك دەریا وایت کێ ئەوە دەکات؟ پاشان ئەوی تر ئەوەی وت: سێ جار ئەمەی وت، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەی خستەڕوو بۆ بنەماڵەکەی خۆی، عەلی (رضي الله عنه) وتی: من.

هەروەها ئەحمەد لە عەلیەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) بەنی عەبدولموتەلیبی کۆکردەوە ئەوانیش دەستەیەك بوونو هەرکامیان جەزعەیەکی[2] دەخواردو فەرقێکیش[3] ئاوی دەخواردەوە، ئەویش نانێکی باشی بۆ ئامادە کردن، نانیان خوارد تا تێربوون، هێندە لە نانەکە مایەوە وەك ئەوەی

---

[1] – تەنها موسلیم هێناویەتی.

[2] – جەزعە لە بنەڕەتدا بۆ ئاژەڵ بەکار دێت، وەك وشتر لە تەمەنی پێنج ساڵیدا یان گا لە تەمەنی سێ ساڵیدا، واتە هێندەیان دەخوارد.

[3] فەرقە: نزیکەی شانزە ڕەتڵ یان دوانزە مشت دەکات.

دەستیان لێ نەدابێت، پاشان بانگی کرد جامی خواردنەوە بێنن، هێندەیان خواردەوە تا ماندووبوون و خواردنەوەکە وەك ئەوەی دەستی لێ نەدرابێت مایەوە، ئینجا فەرمووی (یا بني عبد المطلب اني بعثت اليكم خاصة والى الناس عامة، فقد رايتم من هذة الاية ما رايتم، فايكم يبايعني على ان يكون اخي وصاحبي؟) واتە(بەنی عەبدولموتەلیب من نێردراوم بۆ ئێوە بە تایبەت و خەڵکی بە گشتی، بینیتان ئەو ئایەتە چی تێدا هاتووە، جاکامتان بەیعەتم پێ دەدات براو هاوەڵم بێت؟) هیچ کامیان هەڵنەسان، منیش لە هەموویان بچوکتر بووم هەستام، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی دانیشە، لە سێیەم جاردا دەستی خستە ناو دەستم[1][2].

بەزار لە عەلیەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی (و انذر عشيرتك القربين) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (يا علی اصنع زجل شاه بصاع من طعام و اجمع لی بنی هاشم) ئەو ڕۆژە ئەوانەی ئامادەبوون چل یان سی و نۆ پیاو بوون، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بانگی خواردنی کردو خستیە بردەستیان، هێندەیان خوارد تا تێر بوون، هەیانبوو جەزعێکی دەخوارد، پاشان جام هێنراو تێریان خواردەوە (رضي الله عنه) (شیریان خواردەوە) هەندێکیان وتیان جادووی وامان نەدیوە، دەڵێن ئەبولەهەب ئەوەی وتەوە، پاشان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (یاعلی! اصنع رجلا شاه بصاع من گعام و اعدد قعبا من لبن) منیش ئەو خواردن و خواردنەوەم ئامادەکردو وەك ڕۆژی یەکەم هێندەیان خواردو هەمان قسەی ئەو ڕۆژەی کردەوە، پاشان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەمان شتی فەرموو و منیش ئەنجامممدا، ئینجا فەرمووی عەلی بەمی هاشم کۆبکەرەوە، منیش کۆمکردنەوەو نان و ئاویان خوارد، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕووی تێ کردن و فەرمووی (ایکم يقضي عني ديني) واتە(کامتان ئایینەکەمم

---

[1] –صحیح.

[2] – لە تەفسیری ئیبن کەسیر ج٣ ص٣٥٠ دا واهاتووە.

لێ وەردەگرێت و بەجێی دەگەیەنێت؟) هەموومان بێدەنگ بوون، پێغەمبەر (ﷺ) دووبارەی کردەوە، منیش وتم من ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەویش فەرمووی (عەلی تۆ، عەلی تۆ)[1][2].

ئیبن ئەبی حاتەم بەو واتایە هێناویەتی، تیایدا هاتووە، فەرمووی (ایکم یقضي عني دیني ویکون خلیفتي في اهلي؟) واتە(کامتان ئایینەکەم لێ وەردەگرێ و لە بنەماڵەکەمدا دەبێتە جێگیرەوەم؟) هەموو بێدەنگ بوون و عەبباسیش (رضي الله عنه) بێدەنگ بوو لە ترسی ئەوەی نەوەك بە هۆیەوە سامانەکەی لە دەست بدات منیش لەبەر تەمەنی عەبباس بێدەنگ بووم، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) وتیەوە و عەبباس بێدەنگ بوو، کە ئەمەم بینی وتم: من ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو ڕۆژە من شێوە و حاڵم لە هەموویان خراپتر بوو، چاوەکانم کزبوون، سکم گەورەبوو (ورگن)، لاقەکانم باریك و ڕەقوڵ بوون[3][4].

---

[1] - ضعیف.

[2]- هەیسەمی(ج ٨ ص٣٢) دەڵێت بەزار گێڕاویەتەوە و ئەم دەقەش هی ئەوە، ئەحمەدیش بەکورتی هێناویەتی، تەبەرانی بە کورتی لە (الاوسط)دا هێناویەتی، پیاوانی سەنەدی ئەحمەد و یەکێك لە کەسەکانی سەنەدەکەی بەزار صەحیحن جگە لە شریك هەرچەندە بەزار متمانەی پێداوە.

[3] - ضعیف

[4]- لە تەفسیری ئیبن کەسیر ج٣ ص٣٥١ واهاتووە، هەروەها بەیهەقی لە (الدلائل) و ئیبن جەریر سادەتر لەودەقە بە زیادەیەکەوە بە سەنەدی لاواز هێناویەتی، لە تەفسیری ئیبن کەسیر ج٣ ص٣٥٠ والبدایە والنهایە ج٣ ص٣٩ یشدا هاتووە. لە باسی بانگەوازی پێغەمبەر (ﷺ) لە کۆڕەکاندا بەدەربڕینێکی تر لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناومانە.

# (پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە سەفەردا بانگەواز دەکات)

ئەحمەد ج٤ ص٧٤ لە ئیبن سەعدەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی – سەعد ئەو کەسە بوو کە ڕێی نیشانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)دا لە رکوبە کە دووڕیانێکی ناسراوی نێوان مەککەو مەدینەیە– دەڵێت: باوکم پێی وتم پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ ئەبوبەکردا (رضي الله عنه) هات بۆلایان، ئەبوبەکر کچێکی شیرەخۆرەی لای ئێمە بوو، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەیویست ڕێگەی مەدینە کورت بکاتەوە، سەعد پێی وت: ئەمە لەم دووڕیانەوەیەو دوو دزی سەر بە ئەسلەمی لەسەرن کە پێیان دەوترێت (موهانان) ئەگەر دەتەوێت دەیانهێنین، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی بمانبە بۆلایان، سەعد دەڵێت: چوون تا گەیشتین، یەکێکیان بەوی تری دەوت ئەوە یەمانیە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)بانگی کردن‌و پێشنیاری موسڵمان بوونی بۆ کردن، ئەوانیش موسڵمان بوون، پاشان پرسیاری ناویانی لێکردن، وتیان پێمان دەڵێن (موهانان) فەرمووی (بل انتم مکرمان) بەوە ناوی گۆڕین‌و فەرمانی کرد لەگەڵی بچن بۆ مەدینە، ئینجا فەرموودەکە دێنێت.[1]

حاکم ئەبو عەبدوڵلای نەیسابووری لە ئیبن عومەرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)لە سەفەرێکدا پێکەوە بووین کە دەشتەکیەك هات،[2]کاتێك لێی نزیك بوویەوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو (بۆ کوێ دەچیت؟) وتی بۆ لای ماڵ‌و منداڵم، فەرمووی (خێرێکت دەوێت بێتە ڕێت؟) وتی کامەیە؟ فەرمووی (شایەتی بدە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواو موحەمەدیش بەندەو نێردراویەتی) ئەویش وتی ئەی هیچ شایەتێکت بۆ ئەوە هەیە؟ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (ئەو درەختە) درەختەکە لەناو دۆڵەکەوە بوو، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بانگی کردو ئەویش بەخشەخش هاتە بەردەمی‌و سێ جار شایەتی بۆدا، من شاهید بووم

[1]- هەیسەمی (ج٦ ص٥٨) دەڵێت: عبدوڵلای کوڕی ئەحمەدو ئیبن سەعد هێناویانە، ناوی عەبدوڵلایەو نایناسم، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە جێی متمانەن.

[2] - ضعیف.

کەوتی، پاشان گەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی، دەشتەکیەکەش گەڕایەوە بۆلای هۆزەکەی و وتی بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم): ئەگەر شوێنم بکەون دەیانهێنم بۆلات، ئەگەر نا خۆم دەگەڕێمەوە بۆلات و لەگەڵت دەبم[1 2].

ئیبن سەعد (ج٤ ص٢٤٢) لە عاصمی ئەسلەمیەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە مەککەوە کۆچی کرد بۆ مەدینە گەیشتە (غەمیم) بورەیدەی کوڕی حەصیب هات بۆلای، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بانگی کرد بۆ ئیسلام، ئەویش لەگەڵ هاوەڵەکانیدا موسوڵمان بوو- نزیکی هەشتا ماڵ دەبوون- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نوێژی عیشای کردو ئەوانیش لە پشتیەوە نوێژیان کرد.

## پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەپێ ڕێ دەبڕێت لە پێناو بانگەوازدا

تەبەرانی لە عەبدوڵلای کوڕی جەعفەرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك ئەبوتالیب مرد پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەپێ چوو بۆ تائیف و بانگی دەکردن بۆ ئیسلام، ئەوانیش نەچوون بە دەم بانگەوازەکەیەوە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) گەڕایەوە و لە ژێر سێبەرێکدا دووڕکات نوێژی کردو دواتر فەرمووی (اللهم اني اشكو اليك ضعغ قوتي وهواني على الناس يا ارحم الراحمين انت ارحم الراحمين، الى من تكلني؟ الى عدو يتهجمني ام قريب ملكته امري، ان لم تكن غضبان علي فلا ابالي غير ان عافيتك اوسع لي، اعوذ بوجهك الذي اشرقت له الظلمات وصلح عليه امر الدنيا والاخرة ان ينزل بي غضبك او يحل بي سخطك، لك العتبي حتى ترضى ولا قوة الا بالله)[3 1].

---

[1] - صحیح.

[2] - سەنەدەکەی دروستەو هیچ کام ڕیوایەتیان نەکردووەو ئیمامی ئەحمەدیش نەیهێناوە، لە البدايه والنهايه ج٦ ص١٢٥ دا هاتووە، هەیسەمی (ج٨ ص٢٩٢)دا دەڵێت: تەبەرانی گێڕاویەتیەوەو پیاوەکانی سەنەدەکەی دروستن، ئەبویەعلاش لەگەڵ بەزاردا هێناویانە

[3] - ضعيف.

# (بانگەواز بۆ خوا لە کاتی شەڕدا)

عەبدورەزاق لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ هەر کۆمەڵێکدا بەشەڕ بهاتایە سەرەتا بانگەوازی دەکرد بۆ ئیسلام[2][3].

ئیبن موندەو ئیبن عەساکیر لە عەبدولڕەحمانی کوڕی عائیدەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەگەر دەستەیەکی بناردایە دەیفەرموو (تالفوا الناس و لا تغيروا عليهم حتى تدعوهم، فما على الارض من اهل بيت مدر و لا وبر الا تاتوني بهم مسلمين احب الي من ان تاتوني بنسائهم و اولادهم و تقتلوا رجالهم) واتە(دڵی خەڵك ڕاگرن و شاڵاو مەبەنە سەریان تا بانگیان دەکەن بۆ ئیسلام، چی خەڵکی گوندو شاری سەرزەوی هەیە بە موسوڵمانی بیانهێننە لام زۆر لام خۆشترە لەوەی ژن و منداڵەکانیان بهێنن و پیاوەکانیان بکوژن)[4][5].

---

[1]- هەیسەمی (ج٦ ص٣٥) دەڵێت: ئیبن ئیسحاقی تیایە کە گومان لەسەر متمانەی هەیە، کەسانی دیکەی سەنەدەکەی جێی متمانەن، دواتر لە ڕێگەی زوهریەوە (رضي الله عنه) و کەسانی دیکەشەوە بە دوورو درێژی فەرموودە دێنن لەسەر سەختی ئازارەکان لە پێناو بانگەوازی ڕێی خوادا.

[2] – صحيح.

[3]- حاکمیش لە (المستدرك) دا واهێناویەتی و دەڵێت: سەنەدەکەی صەحیحەو بوخاری و موسلیم نەیانهێناوە، ئەحمەدیش لە موسنەدەکەیداو تەبەرانیش لە موعجەمەکەیدا هێناویانە، لە (نصيب الراية ج٢ ص٢٩٨) یشدا هاتووە، هەیسەمی (ج٥ ص٣٠٤) دەڵێت: ئەحمەدو ئەبویەعلاو تەبەرانی بە چەند سەنەدێك هێناویانن، سەنەدی یەکێکیان صەحیحە، هەروەها ئیبن ماجە هێناویەتی، لە كنز العمال ج٢ ص٢٩٨دا هاتووە، بەیهەقیش لە سونەنەکەیدا ج٩ ص١٠٧ هێناویەتی

[4] – ضعيف.

[5]- لە الكنز ج٢ ص٢٩٤دا هاتووە، ئیبن شاهین و بەغەویش هێناویانە، لە الاصابە ج٣ ص ١٥٢دا هاتووە، ترمزی (ج١ ص١٩٥) هێناویەتی.

ئەبوداود (ص ٣٥٨) (دەقەكەش هی ئەوە)و موسلیم ج٢ ص٨٢و ئیبن ماجە، ص (٢١٠)و بەیهەقی ج٩ ص ١٨٤ لە بورەیدەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەگەر ئەمیری بە سریەیەكەوە یان بە سوپایەكەوە بناردایە وەسیەتی بۆ دەكرد تا لە خوا بترسێت بەرامبەر كەسانی دەورو بەریو ئەو موسوڵمانانەی لەگەڵیدان، دەیفەرموو (ئەگەر بەرامبەر بە بێباوەڕان وەستایت بانگیان بكە بۆ یەكێك لەو سێ خەسڵەتە، لە كامیاندا وەڵامیان دایتەوە لێیان قبوڵ بكەو وازیان لێ بهێنە، بانگیان بكە بۆ ئیسلام، ئەگەر هاتن بە دەمتەوەو ڕازی بوون لێیان قبوڵ بكەو وازیان لێ بهێنە، پاشان داوایان لێ بكە لە ماڵی خۆیانەوە بەرەو ماڵی كۆچەران بڕۆن‌و پێیان بڵێ ئەگەر ئەوە بكەن چی ئەرك‌و مافی كۆچەران هەیە بۆ ئەوانیش دەبێت، ئەگەر ئامادە نەبوون شوێنی خۆیان ویست پێیان بڵێ وەك دەشتەكیە موسوڵمانەكان ئەو حوكمەی خوایان بەسەردا دەچەسپێت كە بەسەر باوەڕداراندا هەیەو لە فەیئو دەستكەودا پشكیان نیە مەگەر لەگەڵ موسوڵماناندا جیهاد بكەن، ئەگەر ڕازی نەبوون بانگیان بكە بۆ دانی سەرانە، ئەگەر ڕازی بوون لێیان قبوڵ بكەو وازیان لێ بهێنە، ئەگەرنا پشت بە خوا ببەستەو لەگەڵیان بەشەڕ بێ، ئەگەر گەمارۆی خەڵكی قەڵایەكت داو ویستیان لەسەر حوكمی خوا لەگەڵیان هەڵبكەیت وامەكە چونكە ئێوە نازانن حوكمی خوا لەسەریان چیە، بەڵام لەسەر حوكمی خۆتان لەگەڵیان پێك بێن، پاشان دواتر چۆنتان ویست دادوەرییان تێدا بگرنەبەر)[1].

تەبەرانی لە (الاوسط) لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) عەلی كوڕی ئەبوتالیبی (رضي الله عنه) نارد بۆ كۆمەڵێك تا لەگەڵیان بەشەڕ بێت، پاشان كەسێكی نارد بۆلایو فەرمووی (لا تدعه من خلفه و قل له: لا تقاتلهم حتى تدعوهم) واتە(لە دوایەوە بە دەست بەرداری مەبەو پێی بڵێ لەگەڵیان شەڕ مەكە تا بانگیان بكەیت بۆ ئیسلام) هەیسەمی ج٥ ص٣٠٥ دەڵێت: كەسانی

[1] ترمزی دەڵێت فەرموودەكەی بورەیدە حەسەنی صەحیحە، ئەحمەدو شافعیو دارمیو تەحاویو ئیبن حیبان جارودو ئیبن ئەبی شەیبەو چەندێكی دی هێناویانە، لە كنز العمال ج٢ ص ٢٩٧ یشدا هاتووە.

سەنەدەکە صەحیحن جگە لە عوسمانی کوڕی یەحیای قرسانی، هەرچەندە ئەو متمانەی پیێ دەدات ئیبن ڕەهاویە لە عەلی (رضي الله عنه) هێناویەتی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناردیو دواتر بە کەسێکی فەرموو: (الحق ولا تدعه من خلفه فقل ان النبى (صلى الله عليه وسلم) يامرك ان تنتظره وقل له لا تقاتل قوما حتى تدعوهم) واتە(بڕۆ بە دوایدا وازی لێ مەهێنە تا پێی دەگەیت، بڵێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمانت پێ دەکات چاوەڕوانی بکوەیتو پێ بڵێ لەگەڵ هیچ کۆمەڵێکدا شەڕ نەکەیت تا بانگیان دەکەیت بۆ ئیسلام). لە کنز العمال ج٢ ص٢٩٧ دا هاتووە، عەبدولڕەزاق لە عەلییەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی کاتێك کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناردی پێی فەرموو (بەشەڕ مەیە لەگەڵ هیچ کۆمەڵێکدا تا بانگیان دەکەیت بۆ ئیسلام)، لە نصب الرایة ج٢ ص٣٧٨ دا وا هاتووە،[1] پێشتر لە فەرموودەی سەهلی کوڕی سەعد (رضي الله عنه) کە بوخاریو چەندێکی دی هێنابوویان هاتبوو کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ڕۆژی خەیبەردا بە عەلی (رضي الله عنه) فەرموو (هەنگاوی خۆت بنێ تا دەچیتە مەیدانیان، پاشان بانگیان بکە بۆ ئیسلامو پێیان بڵێ چ مافێکی خوایان دەکەوێتە ئەستۆ، سوێند بەخوا ئەگەر خوای گەورە لەسەر دەستت کەسێك ڕێنموونی بکات بۆ ئیسلام بۆت چاکترە لەوەی کۆمەڵێ وشتری گرانبەهات هەبن).[2]

ئیبن سەعدو ئەحمەدو ئەبو داودو ترمزی (ج٢ ص١٥٤) و تەبەرانیو حاکم لە فەروەی کوڕی موسەیکی قەتیعیەوە (رضي الله عنه) – ترمزی بە حەسەنی داناوە– هێناویانە دەڵێت چومە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ ئەو کەسانەی ڕوویان کردوتە ئیسلام, ئەوانە نە جەنگم کە ڕوویان وەرگێڕاوە لە ئیسلام؟ ئنجا فەرمووی: با، پاشان بۆم دەرکەوت وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوانە خەڵکی سەبەئن ئەوان عیزەتمەندترو بەهێزترن پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمان پێ

---

[1] – حسن.

[2] – صحيح.

کردم مۆڵەتی دام تا لەگەڵ سەبەو بەشەڕبێم، کاتێك لەلای چووم خوای گەورە ئەو ئایەتانەی لەسەر سەبەو دابەزاند، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ما فعل ابقطيعي؟) (قەتیعی چی کرد؟) پاشان ناردی بەشوێنمداو سەیری کرد کەوتوومەتە ڕێ گێڕامیەوە، کە هاتمەوە لای پێغەمبەر (ﷺ) سەیر دەکەم دانیشتووەو لە چواردەوریدا هاوەڵانی دانشتوون، فەرمووی (ئەو گەلە بانگ بکە بۆ ئیسلام هەرکەسیان هات بە دەمتەوە لێی وەربگرە، هەرکام نەهاتن پەلەمەکە تامن ئاگادار دەکەیتەوە) یەکێك وتی: ئەی پێغەمبەری سەبەء زەوی بووە یان ئافرەت؟ ئینجا فەرمووی (زەوی و ئافرەت نەبووە، بەڵکو پیاوێك بوو دە کوڕی لە عەرەب بوو شەشیان لای یەمەنیان گرت، چواریشیان لای شامیان گرت ئەوانەی لای شامیان گرت لە خەم و جوزان و غەسان و عاملە بوون، ئەوانەی یەمەن ئەزت و کیندەو حیمیەرو ئەشعەریەکان و ئەنمارو مەزحیج بوون، وتی ئەی پێغەمبەری خوا ئەنمارەکان کێ بوون؟ فەرمووی (ئەوانە بوون کە خەلتعەم و بەجیلە لەوانن)[1،2].

ئەحمەدو عەبدی کوڕی حەمید لە فەروەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: هاتم بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا بەوانەی بەرەو ئیسلام هاتوون لەگەڵ ئەوانە بەشەڕ بێم کە ڕوویان وەرگێڕاوە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بەڵێ، بەوانەی بەرەو ئیسلام هاتوون لەگەڵ ئەوانە بە شەڕبێ کە ڕوویان وەرگێڕاوە (لە ئیسلام)) کاتێك ئەو کارەم گرتە دەست و چووم بانگی کردم و فەرمووی (لەگەڵیان شەڕ مەکە تا بانگیان دەکەیت بۆ ئیسلام) منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەی سەبەو بێت چۆنە؟ دوڵە یان شاخە یان چیە؟ فەرمووی (نا، بەڵکو پیاوێك بوو لە عەرەب دە کوڕی بوو) ئینجا فەرموودەکە دێنێت. ئەم سەنەدە حەسەنە، ئەگەر چی ئەبوحەبابی کەلبی تیادایە کە قسەیان لە سەر کردووە بەڵام ئیبن جەریر لە ئەبو

---

[1] – صحيح.
[2] – له كنز العمال ج١ ص٢٦٠ دا وا هاتووه.

کورەیبەوە لە عەبقەریەوە لە ئەسباتی کوڕی نەسفەوە لە یەحیای کوڕی هانیئی موورادی لە مامیەوە یان لە باوکیەوە – ئەسبات دوو دڵە کامیانە- هێناویەتی دەڵێت: فەروەی کوڕی موسەیك هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) ئینجا دەیهێنێت[1][2].

تەبەرانی لە خالیدی کوڕی سەعیدەوە (ﷺ) هێناویەتی دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) ناردمی بۆ یەمەنو فەرمووی (گەیشتی بەهەر شوێنێکی عەرەب بانگی تیادا بسترا بەرەو ڕوویان مەبەرەوە، هەرشوێنێکیش بانگی تێدا نەبیسترا بانگیان بکە بۆ ئیسلام)[3][4].

بەیهەقی ج٩ ص١٠٧ لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە (ﷺ) دەڵێت: دیلەکانی لاتو عوززا هێنران بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (ئایا بانگتان کردوون بۆ ئیسلام؟) وتیان: نەخێر، پێی فەرمووی(ئایا بانگیان کردوون بۆ ئیسلام؟) وتیان:نەخێر فەرمووی (خلو سبیلهم حتی یبلغ مامنهم) (وازیان لێ بهێنن تا دەچنەوە شوێنی خۆیان) پاشان ئەم دوو ئایەتەی خوێندەوە (انا ارسلناك شاهدا ومبشرا ونذیرا. وداعیا الی الله باذنه و سراجا منیرا) (واوحي الي هذا القران لانذرکم به من بلغ ائنکم لتشهدون ان مع الله الها اخری) تاکۆتایی ئایەتەکە[5][6].

حارس لە ڕێگەی واقیدیەوەو لە کنز العمال ج٢ ص٢٠٧ یشدا هاتووە دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) دەستەیەکی نارد بۆ سەرلاتو عوززاو دایان بەسەر ناوچە نشینێکی عەرەبداو جەنگاوەرو ژنو منداڵیان بەدیل گرتن، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا بەبێ ئەوەی بانگمان بکەن بۆ ئیسلام دایان بەسەرماندا، پێغەمبەریش (ﷺ)

---

[1] – حسن.

[2] – لە تەفسیری (ئیبن کەسیر ج٣ ص٥٣١)یشدا واهاتووە.

[3] – ضعیف.

[4]– هەیسەمی (ج٥ ص٣٠٧) دەڵێت: یەحیای کوڕی عەبدولحەمیدی حەمانی تێدایە کە لاوازە.

[5] – ضعیف.

[6] – بەیهەقی دەڵێت: ڕوحی کوڕی موسافیر – کە لە سەنەدەکەیدایە- لاوازە

پرسیاری لە خەڵکی سریەکە کرد، ئەوانیش وتیان ڕاست دەکەن بانگمان نەکردوون بۆ ئیسلام، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (ردوهم الی مامنهم بعد ادعوهم) واتە(بیانگێڕنەوە بۆ شوێن و جێ پەنای خۆیان پاشان بانگیان بکەن بۆ ئیسلام.[1]

## (پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کەس دەنێرێت بۆ بانگەوازی ڕێی خواو پێغەمبەرەکەی)

ئەبونەعیم لە (الحلیە ج١ ص١٠٧) لە عروەی کوڕی زوبەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی کە پشتیوانان کاتێك بیستیان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چی فەرمووەو دڵنیابوون لە بانگەوازەکەی و بڕوایان هێنا، بوونە هۆکاری خێرو ماوەی ساڵی دواییان لەگەڵ دیاری کرد تا یەکتری ببیننەوە، گەڕانەوە بۆلای خەڵکی خۆیان و ناردیان بە دوای پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) وتیان لەلایەن خۆتەوە کەسێکمان بۆ بنێرە تا خەڵك بۆلای کتێبی خوا بانگ بکات، چونکە زۆرتر نزیکترە تا شوێنی بکەون، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) موسعەبی کوڕی عەمەیری (رضي الله عنه) نارد بۆلایان کە لە بەنی عەبدودار بوو، لەناو بەنی غەنەم لای ئەسعەدی کوڕی زەرارە دابەزی و دەیدواندن و قورئانی بۆ دەگێڕانەوە، موسعەب بە بەردەوام لای سەعدی کوڕی موعاز بوو بانگەوازی دەکرد و لەسەر دەستی ئەو خوای گەورە ڕێنموونی خەڵکی دەکرد تا ئەوەی کەم ماڵی پیشتیوانان هەبوو موسڵمانی تیادا نەبێت، بەڵکو پیاوماقوڵەکانیشیان موسڵمان بوون، عەمری کوڕی جەمووح موسوڵمان بوو و بتەکانی شکاند، موصعەبی کوڕی عەمەیریش بە (موقری) ناو دەبرا گەڕایەوە بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).[2]

تەبەرانی لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە (رضي الله عنه) بە دوورو درێژی هێناویەتی، باسی ئەوە دەکات کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموون بانگەواز بکەن, تیایدا هاتووە

---

[1] – ضعیف

[2] – ضعیف.

گەڕانەوە بۆلای خەڵکەکەی خۆیان و بە نهێنی بانگیان دەکردن بۆ ئیسلام و باسی پێغەمبەر (ﷺ) و ئەو پەیامەیان بۆ دەکرد کە خوا ناردبووی, تا ئەوەی کەم ماڵی پشتیوانان مابوو مەگەر ئەوەی کەسانێکی تێدا موسڵمان ببوون، پاشان ناردیان بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و وتیان لەلایەن خۆتەوە کەسێك بنێرە بۆلامان تا خەڵك بانگ بکات بۆلای قورئان، ئەویش موصعەبی کوڕی عومەیری (رضي الله عنه) لە بەنی عەبدودار بۆ ناردن، ئەویش لەناو بەنی غەنەمدا لەلای ئەسعەدی کوڕی زرارە دابەزی و خەڵکی بانگ دەکردو ئیسلام بڵاو بوویەوەو ژمارەی موسوڵمانان زیادی کرد، لەوکاتەدا بە نهێنی بانگەوازیان دەکرد.

پاشان باسی بانگەوازی موصعەب بۆ سەعدی کوڕی موعازو موسڵمان بوونی سەعدو موسڵمان بوونی بەنی عەبدولئەشەل دەکات، وەك لە باسی بانگەوازی موصعەبدا باسی دەکەین، پاشان دەڵێت: بەنی نەجار موسعەبی کوڕی عومەیریان دەرکردو فشاریان لەسەر سەعدی کوڕی زەرارە داناو موصعەبیش چوو بۆلای سەعدی کوڕی موعاز،بەردەوام خەڵکی بانگ دەکرد بۆ ئیسلام و لەسەر دەستی خەڵك موسڵمان دەبوون تا کەم ماڵی پشتیوانان مایەوە موسڵمانی تێدانەبێت، خانەدانەکانیشیان موسڵمان بوون، عەمری کوڕی جەموح موسڵمان بوو، موصعەب گەڕایەوە بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و پێی دەوترا (موقری)[1].[2]

[1] – ضعیف

[2] – هەیسەمی ج٦ ص٤٢ دەڵێت: لە سەنەدەکەیدا ئیبن لوهەیعە هەیە کە لاوازیەکی لەسەرە، بەڵام قسەو گێڕانەوەی باشە، کەسەکانی دیکەی جێ متمانەن. ئەبونەعیم لە الدلائل النبوە ص١٠٨ بە دوورو درێژی هێناویەتی، ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص١٠٧ لە زوهەیریەوە بە واتای فەرموودەکەی عروە بە کورتی هێناویەتی، لە فەرموودەکەدا ئەمەش هاتووە: ئەوان موعازی کوڕی عەفراو ڕافیعی کوڕی مالیکیان نارد بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و وتیان لەلایەن خۆتەوە کەسێکمان بۆ بنێرە تا خەڵك بانگ بکات بۆلای قورئان، چونکە زیاتر جێی ئەوەیە شوێنی

تەبەرانی لە ئەبوئومامەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) ناردمی بۆلای هۆزەکەم تا بانگیان بکەم بۆلای خوای گەورەو شەریعەتی ئیسلامیان بۆ بخەمە ڕوو، منیش چووم ئاوی وشترەکەیان دابوو و دۆشیبویان و خواردبوویانەوە، کاتێك منیان بینی وتیان مەرحەبا لە صودەی کوڕی عەجلان بیستومانە داوتە پاڵ ئەو کابرا، وتی نا، بەڵام بڕوام هێناوە بە خواو پێغەمبەرەکەی و پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) ناردوومی بۆلاتان تا ئیسلامتان بۆ بخەمە ڕوو، لەم قسانەدا بووین کە تەشتەکەیان هێناو دایان ناو لە دەوری کۆبوونەوەو چی تێدابوو خواردیان، وتیان صوعدە وەرە بخۆ، وتم: قوڕتان بەسەر من لای کەسێکەوە هاتووم کە ئەمەتان لێ بە حەرام دەزانێت تەنها ئەوەی بەپێی پەیامی خوا ماویەتی بە پاکی بیخۆن، وتیان، چی وت؟ وتم: ئەم ئایەتە دابەزی (حرمت عليكم الميتة والدم ولحم الخنزير) تا (وان تستقسموا بالازلام) منیش ئاوا بەرەو ئیسلام بانگم دەکردن و ئەوانیش ئامادە نەبوون وەری بگرن، پێم وتن: ماڵتان وێران بێت کەمێك ئاوم بۆ بێنن تینوّمە مێزەرێکیش بەسەرمەوە بوو، وتیان نا، بەڵام وازت لێ دێنین تا بە تینوویی بمریت منیش مێزەرەکەم پێچایەوەو سەرم لەسەری دانا و لە گەرمایەکی سەختدا لە (رِةمضاء) خەوتم، لە خەومدا کەسێك هات و جامێکی شووشەی پێ بوو، کە شتی لەو چاکتر نەبینرابوو، خواردنەوەیەکی تێدابوو خەڵکی شتی وایان نەدیبوو، بۆی هێنام و منیش لێم خواردەوە، کە لە خواردنەوەی بوومەوە بێداربوومەوە، سوێند بەخوا دوای ئەوە نەمزانیوە تینویەتی یانی چی.[1]

---

بکەون، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) موصعەبی کوڕی عومەیری (رضي الله عنه) بۆ ناردن، ئینجا وەك ئەوەی دی دەیهێنێت.

[1]– هەیسەمی ج٩ ص٣٨٧ دەڵێت: تیایدا بەشیری کوڕی شورەیح هەیە کە لاوازە،ئیبن عەساکیریش بە درێژی وەك ئەوە هێناویەتی، لە کنز العمال ج٧ ص٩٤ یشدا هاتووە، ئەبویەعلاش بە کورتی هێناویەتی و لە کۆتاییەوە ئەمەشی بۆ زیاد کردووە (پاشان یەکێکیان وتی: یەکێك لە دوورە ڕێی هۆزەکەتان هات بۆلاتان و ئێوەش وای پێ دەکەن؟ بۆیە شیریان بۆ هێنام، منیش وتم: پێویستم پێی نیە،

ئیبن ئەبی عاصم لە ئەحنەفی کوڕی قەیسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: من لە سەردەمی عوسماندا (رضي الله عنه) تەوافی کەعبەم دەکرد کە یەکێك لە پیاوانی بەنی لەیس دەستی گرتم و وتی: مژدەت پێ بدەم؟ وتم بەڵێ، وتی: بیرت دێت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناردمی بۆلای هۆزەکەت، منیش ئیسلامم بۆ خستنەڕووو بانگم کردن بۆ ئیسلام، تۆش وتت: بۆ چاکە بانگمان دەکەیت و بە چاکە فەرمانمان پێ دەکەیت، ئەویش پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بانگەواز بۆ خێرو چاکە دەکات؟ ئەمە گەیشتەوە بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، ئەویش فەرمووی (خوایە لە ئەحنەف خۆش ببە) ئەحنەفیش دەیوت: هیچ کارێکم هێندەی ئەوەم هیوابەخش نەبوو، -واتە نزاکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).[1]

ئەحمەدو تەبەرانیش هێناویانەو ئەمەشیان هێناوە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناردمی بۆلای هۆزەکەت لە بەنی سەعد تا بانگیان بکەم بۆ ئیسلام، تۆش وتت: سوێند بەخوا تەنها خێری وت و تەنها چاکەم لێ بیست، منیش گەڕامەوەو ئەوەم بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وت، ئەویش فەرمووی (خوایە لە ئەحنەف خۆش بە) ئەحنەف دەڵێت، هیچ شتێکم هێندەی ئەوە هیوای پێ نەدام.[2][3]

---

ئینجا سکم پێ نیشاندان، بەوە هەموویان موسڵمان بوون، بەیهەقی لە الدلائل هێناویەتی و ئەمەشی بۆ زیاد کردووە: بە کەسوکارەکەیەوە ناردی بۆلای هۆزەکەی، لە الاصابە ج٢ ص١٨٢ دا واهاتووە، تەبەرانیش بە دەقی ئەبویەعلاو جگە لەویش هێناویانە، هەیسەمی ج٩ ص٣٨٧ دەڵێت بەدووسەنەد هێناویەتی سەنەدی یەکەمیان حەسەنە، تیایدا ئەبوغالیب هەیە کەجێی متمانەیە، حاکم لە المستدرك ج٣ ص٦٤١ هێناویەتی و زەهەبی دەڵێت بە ڕاستی داناوەو ئیبن موعینیش بە لاوازی داناوە.

[1]- عەلی کوڕی زەید بە تەنها هێناویەتی، لاوازیەکی تێدایە، لە الاصابە ج١ ص١٠٠ دا هاتووە، حاکم لە المستدرك ج٣ ص٦١٤ دا بەوجۆرە هێناویەتی،

[2]- ضعیف.

[3]- هەیسەمی ج١٠ ص٢ دەڵێت: پیاوەکانی سەنەدەکەی ئەحمەد صەحیحن، جگە لەوەی عەلی کوڕی زەیدی تیایە کە فەرموودەی حەسەنە.

ئەبویەعلا لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) یەکێك لە هاوەڵانی نارد بۆلای یەکێك لە گەورەکانی سەردەمی نەزانیو بانگی کرد بۆلای خوای گەورە، ئەویش وتی: ئەو پەروەردگارەی بانگەوازی بۆ دەکەیت چۆنە؟ لە ئاسن دروست کراوە؟ یان لە مسە؟ یان لە زیوە؟ یان لە زێڕە؟ ئەویش هاتەوە بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)و پێی وت وای وتووە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) دووبارە ناردیەوەو هەمان شتی پێ وتەوە، ئەویش هاتەوەو هەواڵی پێ دایەوە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) بۆ جاری سێیەم ناردیەوەو هەمان شتی پێ وت، ئەویش هاتەوەو بۆ پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) گێڕایەوە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی خوای گەورە هەورە بروسکەیەکی بۆ ناردو سوتاندی، ئینجا ئەو ئایەتە دابەزی (ويرسل الصواعق فيصيب بها من يشاء وهم يجادلون في الله وهو شديد المحال).[1] بەڵام بەزار دەڵێت: ناردی بۆلای یەکێك لە فیرعەونەکانی عەرەب، هاوەڵەکە لە بارەیەوە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو لەوە ڕەقترو سەرکەشترە، بۆ جاری سێیەم کە گەڕایەوە بۆلای قسەکەی لێ دووبارە کردەوە،لە کاتێکدا دەیدواند خوای گەورە هەورێکی هێنایە سەر سەریو هەورە بروسکەی وەشاندو لێی داو سەری برد، تەبەرانی بەو شێوەیە لە (الاوسط) دا هێناویەتی، دەڵێت: هەورەبروسکەی کردو برقەی دا، پیاوانی سەنەدەکەی بەزار صەحیحن، جگە لە دەیلەمەی کوڕی غەزوان، هەرچەندە متمانەی پێ دەدات، لە سەنەدەکەی ئەبویەعلاو تەبەرانیدا عەلی کوڕی ئەبوشارە هەیە کە لاوازە، پێشتریش فەرموودەکەی خالیدی کوڕی سەعیدمان هێنا کە وتی: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناردمی بۆ یەمەنو فەرمووی (گەیشتیتە هەرشوێنێکی عەرەبو بیستت بانگی تیایە بەرەو ڕوویان مەبەرەوەو ئەگەریش بانگت لەلا نەبیستن بانگیان بکە بۆ ئیسلام)، دواتر باسی ئەوە دەکەین پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) عەمری کوڕی مررەی جوهەینی دەنێرێت بۆلای هۆزەکەی.

---

[1] – هەیسەمی ج٧ ص٤٢ دەڵێت: ئەبویەعلاو بەزار بەهەمان شێوە هێناویانە.

## (پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سریە دەنێرێت بۆ بانگەوازی ڕێی خودا)

دارقوتنی لە ئیبن عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) عەبدوڕەحمانی کوڕ عەوف (رضي الله عنه) بانگکردو فەرمووی (جۆت ئامادە بکە چونکە بە سریەیەکەوە دەتنێرم (تجهز فاني باعثك في سرية) ئینجا فەرموودەکە دێنێت، تیایدا هاتووە: عەبدوڕەحمان کەوتە ڕێ تا گەیشت بە هاوەڵەکانی و چوو تا گەیشتە دەومەتەلجەندەل، کاتێك چوویە ناوی بانگی کردن بۆ ئیسلام، ئەمەش سێ ڕۆژی خایاند، لە ڕۆژی سێ یەمدا ئەصبوغی کوڕی عەمری کەلبی (رضي الله عنه) کە نەسرانی و گەورەیان بوو موسوڵمان بوو، عەبدوڕەحمانیش لەگەڵ پیاوێکی جوهەینیدا کە پێ دەوترا ڕافیعی مەکیس نامەی نارد بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هەواڵی پێدا، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) نامەی بۆ نووسی کچی ئەصبەغ بە هاوسەر بگرە، ئەویش بەهاوسەری گرت، ئەم ئافرەتە ٠ تماضر) دواتر ئەبوسەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمانی بوو.[1]

ئیبن ئیسحاق لە موحەمەدی کوڕی عەبدوڕەحمانی تەمیمیەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) عەمری کوڕی عاصی (رضي الله عنه) نارد تا عەرەب بەرەو ئیسلام بانگ بکات، دایکی عاصی کوڕی وائیل لە بەنی بەلی بۆو، بۆیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناردی تا دڵیان ڕابکێشێت تا گەیشتە ئاوێك لە خاکێکی ڕووتەن کە پێی دەوترا سەلاسیل- شەڕی زاتوسەلاسیل بەم هۆیەوە ئەو ناوەی لێ نرا- کە چوویە ئەوێ ترساو ناردی بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و داوای یارمەتی لێ کرد، ئەویش ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاحی بە کۆچەرانی یەکەمەوە نارد کە ئەبوبەکرو عومەریش (رضي الله عنه)ی تیادا بوون، ئینجا فەرموودەکەی هێنا[2].[3]

---

[1] - لە الاصابە ج١ ص١٠٨ دا واهاتووە.

[2] - ضعیف

[3] - لە البدایەج٤ ص٢٧٣ دا واهاتووە.

بەیهەقی لە بەراوئەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خالیدی کوڕی وەلیدی (رضي الله عنه) نارد بۆلای خەڵکی یەمەن تا بانگیان بکات بۆ ئیسلام، بەراو وتی: من یەکێك بووم لەوانەی لەگەڵ خالید چووین، شەش مانگماینەوەو خالید بانگی دەکردن بۆ ئیسلامو ئەوانیش بە دەمیەوە نەهاتن، پاشان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) عەلی کوڕی ئەبوتالیبی (رضي الله عنه) ناردو فەرمانی پێکرد خالید بنێرێتەوە بە هاودەمەکانیەوە جگە لە کەسێك کە حەزی دەکرد لەگەڵ عەلی بمێنێتەوە، بەراو دەڵێت من یەکێك بووم لەوانەی لەگەڵ عەلی مامەوە، کاتێك لێیان نزیك بووینەوە هاتن بۆلامان، پاشان عەلی هات تا نوێژمان بۆ بکات، دوایی یەك یەك ڕیزی کردین، عەلی هەواڵی موسوڵمان بوونی ئەوانی نووسی بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کاتێك نامەکەی خوێندەوە سوجدەی برد، دواتر سەری بەرزکردەوەو فەرمووی • سەلام لە هەمەدان، سەلام لە هەمەدان)[1].[2]

ئیبن ئیسحاق دەڵێت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خالیدی کوڕی وەلید (رضي الله عنه)ی نارد بۆلای کەعب لە نەجرانو فەرمانی پێکرد تا پێش ئەوەی لەگەڵیان بەشەڕ بێت سێ جار بانگیان بکات بۆ ئیسلام، ئەگەر هاتن بە دەمیەوە باشەو لێیان قبوڵ بکە، ئەگەرنا لەگەڵیان بجەنگە، خالیدیش چوو تاگەیشتە لایان، دەستەی بە هەموو لایەکدا نارد تا بانگەواز بکەن بۆ ئیسلام و بڵێن: خەڵکینە موسڵمان بن پارێزراو دەبن، خەڵکیش موسڵمان بوونو هاتنە ناو بانگەوازەکەوە، خالیدیش خەڵکی لادانان تا ئیسلامو قورئانو سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)یان فێر بکەن، وەك چۆن پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێکردن ئەگەر موسڵمان بوونو شەڕیان نەکرد وا بکات، پاشان خالیدی کوڕی وەلید (رضي الله عنه) نامەی نووسی بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

(بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان)

---

[1] – صحيح.

[2] – بوخاری بەکورتی هێناویەتی، لە البداية و النهاية ج٥ ص١٠٥دا هاتووە.

بۆ موحەمەدی پێغەمبەری خوا لە خالیدی کوڕی وەلیدەوە سەلامت لێ بێت ئەی پێغەمبەری خوا، ڕەحمەت و بەرەکاتی خوات لێ بێت، سوپاسی ئەو خوایەت لەسەر دەکەم کە هیچ پەرستراوێکی دی نیە جگە لەو، پاشان: ئەی پێغەمبەری خوا صەلاتی خوات لێبێت، تۆ ناردمت بۆلای بەنی حارسی کوڕی کەعب و فەرمانت پێ کردم ئەگەر هاتم بۆلایان سێ ڕۆژ لە گەڵیان بە شەڕ نەیەم و بانگیان بکەم بۆ ئیسلام، ئەگەر موسوڵمان بوون لێیان قبوڵ بکەم و ڕێنماییەکانی ئیسلام و قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خوایان فێر بکەم، ئەگەر موسڵمان نەبوون لەگەڵیان بەشەڕبێم، منیش هاتم و وەك پێغەمبەری خوا فەرمانی پێ کردم سێ ڕۆژ بانگم کردن بۆ ئیسلام، کەسم بۆ ناردن تا بڵێن ئەی بەنی حارس موسڵمان بن پارێزراو دەبن، ئەوانیش موسوڵمان بوون و شەڕیان نەکرد، منیش لە نێویاندا ماومەتەوە و فەرمان و ڕێگری خوایان لەلا جێبەجێ دەکەم و مەشخەڵ و ڕێنماییەکانی ئیسلام و سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)یان فێر دەکەم تا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نامەم بۆ بنووسێت، سەلام و ڕەحمت و بەرەکاتی خوات لێ بێت ئەی پێغەمبەری خوا).

پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) بۆی نووسی:

(بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان)

لە موحەمەدی پێغەمبەری خواوە بۆ خالیدی کوڕی وەلید، سەلامت لێ بێت، من سوپاسی ئەو خوایە دەکەم کە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لەو، پاشان نامەکەت لەگەڵ نێردراوەکەتدا گەیشتە دەستم کە هەواڵی دەدا بەنی حارسی کوڕی کەعب پێش ئەوەی لەگەڵیان بەشەڕ بێیت موسڵمان بوون و هاتوون بەدەم بانگەوازەکەتەوە کە بانگت کردن بۆ ئیسلام و شایەتییان داوە هیچ خوایەك نیە جگە لە الله و موحەمەدیش بەندە و پێغەمبەریەتی، خوای گەورەش ڕێنموونی خۆی پێ بەخشیون، دەی مژدەیان پێ بدە و بیانترسێنە (بە دۆزەخ) و وەرەوە با لەگەڵ خۆێشتدا وەفدی ئەوانیش بێت، سەلام و ڕەحمەت و بەرەکاتی خوات لێ بێت).

خالیدیش بە وەفدێکی بەنی حارسی کوڕی کەعبەوە هاتەوە خزمەت پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کاتێك هاتن بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و بینینی فەرمووی (من هؤلاء القوم الذين كانهم رجال الهند؟) واتە(کامانەن ئەوانەی لە پیاوانی هیند دەچن؟) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانە بەنو حارسی کوڕی کەعبن، کاتێك هاتنە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سەلامیان لێ کردو وتیان شایەتی دەدەین تۆ پێغەمبەری خوایت و هیچ پەرستراوێکیش نیە جگە لە خوا، ئەویش فەرمووی (منیش شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواو منیش پێغەمبەری خوام) پاشان فەرمووی (انتم الذين اذا زجروا استقدموا) واتە(ئێوەن کە ئەگەر پیاتانا هەڵشاخن ئامادەیی دەردەبڕن) هەموو بێدەنگ بوون و کەسیان لەسەری نەچوو، پاشان دووبارەو سێ بارەی کردەوەو کەسیان وەڵامی نەدایەوە، پاشان بۆ جاری چوارەم وتیەوەو یەزیدی کوڕی عەبدولمدان وتی بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ئێمەین کە ئەگەر پیامان هەڵشاخن ئامادەیی دەردەبڕین چوارجار وتیەوە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی ئەگەر خالید بۆی نەنووسیمایە موسوڵمان بوون و شەڕتان نەکردووە سەرەکانتانم دەخستە ژێر پێکانتان، یەزید وتی دەی بەخوا سوپاسی تۆو خالیدیشمان نەکرد فەرمووی ئەی سوپاسی کێتان کرد وتیان سوپاسی ئەو خوایەمان کرد کە بەهۆی تۆوە ڕێنمونی کردین ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی ڕاست دەکەن پاشان فەرمووی (بم كنتم تغلبون من قاتلكم في الجاهية؟) واتە(لەکاتی نەفامیتاندا کاتێك کەسێك شەڕی لەگەڵ دەکردن چۆن سەردەکەوتن؟) وتیان ئەی پێغەمبەری خوا بەسەرکەسدا سەرنەدەکەوتین فەرمووی با بەڵکو سەردەکەوتن بەسەر ئەوەی لەگەڵتان بەشەڕ دەهات وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە وابەسەریاندا سەردەکەوتین کۆ دەبووینەوەو جیانەدەبووینەوەو بەرامبەر

بە کەس دەستمان نەدەکرد بە ستەم کردن، فەرمووی: ڕاست دەکەن، پاشان قەیسی کوڕی حوصەینی کرد بە ئەمیریان[1,2].

## ((بانگەواز بۆ فەرزەکانی ئیسلام))

بەیهەقی لە جەریری کوڕی عەبدوڵلاوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (عليه السلام) کەسێکی نارد بۆلامو فەرمووی ئەی جەریر بۆچی هاتوویت؟ وتی تا لەسەر دەستت موسڵمان بم ئەی پێغەمبەری خوا، ئەویش پەردەیەکی خستە ژێرمو دوای سەیری هاوەڵانی کردو فەرمووی (اذا اتاكم كريم قوم فاكرموه) واتە(ئەگەر بە ڕێزو گەورەی کۆمەڵێك هات بۆلاتان ڕێزی بگرن) پاشان فەرمووی (جەریر: بانگت دەکەم بۆ شایەتی دان بەوەی هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواو منیش پێغەمبەری خوامو بڕوات بە خواو ڕۆژی دوایی و خێرو شەڕی قەدەر هەبێت و نوێژە لەسەر نووسراوەکانت بکەیت و زەکاتی فەرزکراو بدەیت) منیش ئەوەم کرد,دوای ئەوە هەرکەس منی بدیبایە زەردەخەنەی بۆ نیشان دەدام، البداية والنهايه ج٥ ص٧٨، هەروەها تەبەرانی و ئەبونەعیم لە جەریرەوە بەو شێوە هێناویانە. لە كنزالعمال ج٧ ص٩٥یشدا هاتووە. بوخاری لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(عليه السلام) بە موعازی کوڕی جەبەل (رضي الله عنه)ی فەرموو- کاتێك ناردی بۆ یەمەن- (تۆ دەچیت بۆلای خەڵکێك کە ئەهلی کیتابن کە چوویت بۆلایان بانگیان بکە بۆئەوەی شایەتی بدەن هیچ پەرستراوێك نیە جگەلە خواو موحەمەدیش پێغەمبەری خوایە, ئەگەر گوێڕایەڵت بوون بلێ خوا لە هەموو شەو و ڕۆژێکدا پێنج نوێژی لەسەر فەرز کردوون, ئەگەر لەوەشدا گوێڕایەڵت بوون پێیان بلێ خوا سەدەقەیەکی

---

[1] - ضعيف.

[2] - لە البداية والنهاية ج٥ ص٩٨ دا هاتووە، واقدی لە ڕێگەی عیکرمەی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی حارسەوە هێناویەتی، لە (الاصابة ج٣ ص٦٦٠)یشدا هاتووە.

له‌سه‌ر داناون تا له ده‌وڵه‌مه‌نده‌كانتان وه‌ربگيرێت و بدرێت به هه‌ژاره‌كانتان ئه‌گه‌ر له‌وه‌شدا به گوێيان كرديت وريای ماڵ وسامانيان به خۆيشت له نزای سته‌م لێكراو بپارێزه چونكه په‌رده له نێوان ئه‌وسته‌ملێكراو و خوادا نيه.[1]

ئه‌بو نه‌عيم له حه‌وشه‌بی زی زه‌ڵيمه‌وه هێناويه‌تی ده‌ڵێت: كاتێك خوای گه‌وره موحه‌مه‌د (صلى الله عليه وسلم)ی سه‌ر خست به چل سوارچاكه‌وه له‌گه‌ڵ عه‌بدشه‌ڕدا چوومه‌وه به‌ده‌م بانگه‌وازه‌كه‌يه‌وه، ئه‌وانه به نامه‌يه‌كی منه‌وه به‌ره‌و مه‌دينه چوون عه‌بدشه‌ڕ وتی كامتان موحه‌مه‌ده؟ وتيان ئه‌وه‌يه، وتی چيت بۆ هێناوين؟ ئه‌گه‌ر ڕاست و هه‌قه شوێنت ده‌كه‌وين، فه‌رمووی نوێژ بكه‌ن و زه‌كات بده‌ن و خوێن نه‌ڕێژن و فه‌رمان له چاكه و ڕێگری له خراپه بكه‌ن، عه‌بدشه‌ڕ وتی: ئه‌مه كه باشه ده‌ستت بێنه با به‌يعه‌تت بده‌مێ، پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) فه‌رمووی (ناوت چيه؟) وتی عه‌بدشه‌ڕ فه‌رمووی (نا، به‌ڵكو عه‌بد خه‌ير) وه‌ڵامه‌كه‌شی بۆ نووسی بۆ حه‌وشه‌ب، ئه‌ويش باوه‌ڕی هێنا.[2]

بوخاری له ئيبن عه‌بباسه‌وه (رضي الله عنه) هێناويه‌تی ده‌ڵێت: وه‌فدی عه‌بدولقه‌يس هاتن بۆلای پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) ئه‌ويش فه‌رمووی (مرحبا بالقوم غير خزايا ولا ندامى) واته(مه‌رحه‌با له‌م هۆزه بێ شه‌رمه‌زاری و په‌شيمانی بن) وتيان ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا (صلى الله عليه وسلم) نێوانی ئێمه و تۆ بێباوه‌ڕانی موزه‌رن، ته‌نها له مانگی حه‌رامدا ده‌توانين بێين بۆلات، بۆيه به جوانی شتێكمان پێ بڵێ ئه‌گه‌ر بيكه‌ين پێی بچينه به‌هه‌شته‌وه و خه‌ڵكی ديكه‌شی بۆ بانگ بكه‌ين، ئه‌ويش فه‌رمووی (امركم باربع و انهاكم عن اربع: الايمان بالله شهادة الا اله الا الله وايقام الصلاة وايتاء الزكاة وصوم رمضان وان

---

[1] – ئه‌وانی ديكه‌ش هێناويانه و له البداية والنهاية ج٥ ص١٠٠يشدا هاتووه.

[2] – له كنز العمال ج٥ ص٣٢٥ دا واهاتووه، هه‌روه‌ها ئيبن مونده وئيبن عه‌ساكير هێناويانه، له كنز ج١ ص٨٤يشدا هاتووه، ئيبن سه‌كه‌نيش هێناويه‌تی، هه‌روه‌ها له الاصابه ج١ ص٣٨٢يشدا هاتووه.

**تعطو من المغانم الخمس، وانهاكم عن اربع: ما ينتبذ في الدباء و النقير والحنتم و المزفت).**[1]

**حاکم لە عەلقەمەی کوڕی حارسەوە (رضي الله عنه) دەڵێت: -حەوتەم کەسی هۆزەکەم بووم - کە چووین بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و سەلاممان لێکردو ئەویش وەڵامی داینەوە، ئێمەش دواندمان و ئەویش بە قسەکانمان سەرسام بوو و فەرمووی ئێوە کێن؟ وتم: ئێمە باوەڕدارین، فەرمووی (لكل قول حقيقته ما حقيقة ايمانك؟) واتە(هەرقسەیەك ڕاستیەکی هەیە ڕاستی باوەڕداری ئێوە چیە؟) وتمان پانزە خەسڵەتە، پێنجیان تۆ فەرمانت پێ کردوین، پێنجیان نێردراوانت فەرمانیان پێ کردوین، پێنجیشیان لەسەردەمی نەفامیدا خوومان پێوە گرتوون و تا ئێستاش لەسەریان دەچین مەگەر تۆ ڕێگریمان لێ بکەیت ئێمەیش وازیان لێ دێنین، فەرمووی: ئەو پێنجەی فەرمانم پێ کردوون کامانەن؟ وتمان: فەرمانت پێ کردین بڕوابهێنین بە خواو فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی و چاك و خراپی قەدەر، فەرمووی: ئەی ئەو پێنجەی نێردراوەکانم فەرمانیان پێ کردن چی بوون؟ وتمان: فەرمانیان پێ کردین شایەتی بدەین هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواو تاك و بێ هاوتایە تۆش بەندەو نێردراوی ئەویت، فەرزەکان بکەین و زەکاتی فەرزکراو بدەین و مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژوو بین و ئەگەر توانیمان حەج بکەین، فەرمووی: (ئەی ئەو پێنج خەسڵەتە چین کە لە نەفامیدا خووتان پێوە گرتبوو؟) وتمان: سوپاسی کاتی حەسانەوەو خۆشگوزەرانی، خۆڕاگری کاتی سەختی، ڕاستی لە کاتی پێکەیشتندا، ڕازی بوون بە قەزاو قەدەر، خۆشحاڵ نەبوون بە چەرمەسەری بەرامبەر کاتێك بەسەر دوژمندا سەردەکەوین، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (فقهاء ادباء كادوا ان يكون انبياء من خصال ما اشرفها) زەردەخەنەیەکی**

---

[1]- تەیالیسیش هەروا هێناویەتی و لە کۆتاییەوە زیادەیەکی بۆ هێناوە، ئەم ڕاسپاردانە پارێزراون و بانگەوازیشیان بۆ بکەن،لە البدایةوالنهایه ج٥ ص٤٦یشدا هاتووە.

بۆ کردین و دواتر فەرموویی (منیش وەسیەتی پێنج خەسڵەتتان بۆ دەکەم بەڵکو خوا خەسڵەتە چاکەکانتان بۆ کامڵ بکات، هەرچی نایخۆن کۆی مەکەنەوە، شتێك بنیاد مەنێن کە تیایدا دانانیشن، لەسەر ئەوەی سبەینێ لێی دەستبەردار دەبن رکەبەری مەکەن، لەو خوا بترسن کە دەگەڕێنەوە بۆلای، بەرەو ئەوە بچن کە بە هەتایی تیایدا بمێننەوە)[1].[2]

ئەبونەعیمیش لە الحلیة ج٩ ص٢٧٩ دا لە سویدی کوڕی حارسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: حەوت کەسی هۆزەکەم بووین کە چووین بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دواندمان سەرسام بوو کە ڕەنگ و بۆی بینین، وتی: (ما انتم؟) وتمان: باوەڕدارین، ئەویش بزەیەکی کردو فەرمووی (ان لکل قوم حقرقة، فما حقیقة قولکم و ایمانکم؟) سوەید وتی: ئێمەش وتمان پانزە خەسڵەتە، پێنجیان نێردراوانی تۆ فەرمانیان پێ کردین تا باوەڕمان پێیان هەبێت، پێنجیان نێردراوانت فەرمانیان پێ کردین کاریان پێ بکەین، پێنجیشیان لە سەردەمی نەفامیەوە خۆمان پێوە گرتوون و لە سەری دەڕۆین مەگەر تۆ بڵێیت و وازی لێ بێنین، ئینجا بەو واتایە هێناویەتی، بەڵام لە جیاتی خێرو شەڕی قەدەر زیندووبوونەوەی دوای مردنی هێناوە. پێشتریش فەرموودەی پیاوی بەلعدەویەمان لە باپیریەوە هێنا کە فەرموودەکەی هێناو تیایدا دەیوت: بانگەواز بۆچی دەکەیت؟ فەمووی (بەندەکانی خوا بۆلای خوا بانگ دەکەم) وتم: چی دەڵێیت؟ وتی: شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواو منیش موحەمەد پێغەمبەری خوام، باوەڕت هەبێت بەوەی بۆم دابەزیوەو بڕوات بە لات و عوززا نەمێنێت، نوێژ بکەیت و زەکات بدەیت...)

---

[1] - ضعیف.

[2] - ئەبوسەعیدی نەیسابووری لە عەلقەمەی کوڕی حارسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی، عەسکەری و رشاتی و ئیبن عەساکیر لە سوەیدی کوڕی حارسەوە (رضي الله عنه)هێناویانەو بە دوورو درێژی فەرموودەکە هاتووە، هەروەك لە الاصابە ج٢ ص٩٨ دا هاتووە،

## (پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نامە بە هاوەڵانیدا دەنێرێت بۆ پاشایانی ئاسۆکان و شوێنانی دیکەو بانگیان دەکات بۆ لای خوای گەورەو هاتنەناو ئیسلام)

تەبەرانی لە میسوەری کوڕی مەخزومەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چوو بۆلای هاوەڵانی و فەمووی (خوای گەورە منی بە ڕەحمەت ناردووە بۆ هەموو خەڵك، دەی -ڕەحمەتی خواتان لێ بێت- ئەوەم لێوە بگەیەنێن و دووبەرە مەبن وەك ئەوەی حەواریەکانی عیسا (عليه السلام) کردیان، چونکە ئەویش بانگی کردن بۆ ئەوەی من بانگتان دەکەم بۆی، هەرکەس شوێنەکەی دوور بوایە ناڕازی دەبوون عیسای کوڕی مەریەمیش لای پەروەردگاری سکاڵای ئەوەی کرد بۆ بەیانی هەرکامیان بە زمانی ئەو گەلە قسەی دەکرد کە ئاڕاستە کرابوو وبێ، عیسا پێی وتن: ئەمە کارێکە خوا بڕیاری لەسەر داوە بۆتان دەی بیکەن)

هاوەڵانی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا بۆت بەجێ دەگەیەنین، بۆ کوێ دەڵێیت بماننێرە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) عەبدوڵلای کوڕی حوزافەی (رضي الله عنه) نارد بۆ کیسرا، سولەیتی کوڕی عەمری(رضي الله عنه) نارد بۆلای هوەزەی کوڕی عەلی بەرپرسی یەمامە، عەلائی کوڕی حەزرەمی (رضي الله عنه) نارد بۆلای موزیری کوڕی ساوای بەرپرسی هەجەر، عەمری کوڕی عاصی(رضي الله عنه) نارد بۆلای جیفروعەو بادی دووکوڕانی جەلەندی کە پاشای عەمان بوو، دیعیەی کەلبیشی (رضي الله عنه) نارد بۆلای قەیسەر، شوجاعی کوڕی وەهبی ئەسەدی (رضي الله عنه)نارد بۆلای مونزیری کوڕی حارسی کوڕی ئەبو شومەری غەسانی، عەمری کوڕی ئومەیەی چومەری(رضي الله عنه)نارد بۆلای نەجاشی، هەموویان لە پێش کۆچی دوایی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) گەڕانەوە جگە لە عەلائی کوڕی حەزرەمی، چونکە ئەو لە بەحرەین بوو کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)کۆچی دوایی کرد[1].

---

[1] - ضعیف.

ئیبن حەجەر لە فەتحولباری ج٨ص٨٩ دا دەڵێت: موهاجیری کوڕی ئەبوئومەیەی کوڕی حارسی کوڕی عەبد کلال و جەریری (رضي الله عنه) نارد بۆلای زیلکیلەع، سائیبی (رضي الله عنه) نارد بۆلای مەدوسەیلەمەو حاتیبی کوڕی ئەبی بەلدەعەی (رضي الله عنه) نارد بۆلالی مقوقس.[٢]

موسلیم لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر لە پێش مردنی نامەی نووسی بۆ کیسراو قەیسەر و نەجاشی و هەر خۆسەپێنێکی لاسار، بانگی دەکردن بۆلای خوای گەورەو، ئەوە ئەو نەجاشیە نەبوو کە نوێژی لەسەر کرد.[٣]

ئەحمەد و تەبەرانی لە جابرەوە (رضي الله عنه) هاویانە دەڵێن: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێش ئەوەی کۆچی دوایی بکات نامەی نووسی بۆ کیسراو قەیسەرو هەر خۆسەپێنێك.[٤]

## (نامەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ نەجاشی پاشای حەبەشە)

بەیهەقی لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) عومەری کوڕی ئومەیەی زومەری (رضي الله عنه) نارد بۆلای نەجاشی سەبارەت بە جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب و هاوڕێکانی (رضي الله عنه) لەگەڵیدا نامەیەکی بۆ نارد و نووسی بووی: بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان لە موحەمەدی پێغەمبەری خواوە بۆ نەجاشی ئەزعەمی پاشای حەبەشە، سەلامت لێ بێت، من سوپاسی خوای مەلیکی قودوسی موئمینی موهەیمین دەکەم و شایەتی دەدەم عیسا روحی خوداو پەیامی ناردووەتە سەر مەریەمی بەتولی پاك و بێگەردی داوێن پاك و ئەویش سکی بە عیسا پڕبوو خواش

[١]- هەیسەمی دەڵێت: لە سەنەدەکەدا موحەمەدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی عەیاش هەیە کە لاوازە، لە المجمع ج٥ ص٣٠٦ دا هاتووە.

[٢]- حسن.

[٣]- لە البدایە والنهایە ج٤ ص٢٦٢دا هاتووە.

[٤]- هەیسەمی ج٥ ص٣٠٥ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا ئیبن لوهەیعە هەیەو فەرموودەی حەسەنەو کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە صەحیحن.

لە ڕوحی خۆی و فوی خۆی دروستی کرد وەك چۆن ئادەمی بە دەستو فوی خۆی دروست کرد، من بانگت دەکەم بۆلای خوای تاكو تەنهای بێ هاوتا و گوێڕایەڵ بوونی و شوێنم بکەویتو بڕوا بهێنیت بە خۆمو ئەو پەیامەی بۆم هاتووە، چونکە من پێغەمبەری خوام، جەعفەری ئامۆزامم بەدەستەیەکی موسوڵمانانەوە ناردبوو بۆلات ئەگەر هاتن بۆلات نەرم بە لەگەڵیانو واز لە خۆسەپێنی بهێنە چونکە من خۆتو سەربازانت بانگ دەکەم بۆلای خوای گەورە، وامن گەیاندمو ئامۆژگاریم کردن ئێوەیش وەریگرن، سەلام لەوەی شوێن ڕێنموونی دەکەوێت)

نەجاشی لە وەڵامدا ئەمەی بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)نووسی:

بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

(بۆ موحەمەدی پێغەمبەری خوا لە نەجاشی ئەسعەمی کوڕی ئەبجەرەوە، سەلامتان لێ بێت ئەی پێغەمبەری خوا، سەڵاتو ڕەحمەتو بەرەکەتی خواتان لێ بێت, ئەو خوایەی کە تاكو تەنهایەو ڕێنموونی کردم بۆ ئیسلام نامەکەتم پێ گەیشت ئەی پێغەمبەری خوا کە باسی عیسات کردبوو، سوێند بە پەروەردگاری ئاسمانو زەوی عیسا لەوە زیاتر نیە کە تۆ باست کرد، ئەوەی بۆت ناردین لێی تێگەیشتینو بەرامبەر ئامۆزاکەتو هاوەڵانی وابووین، شایەتی دەدەم تۆ پێغەمبەری خوایتو ڕاستگۆو بە ڕاست دانەریتٌ بەیعەتم بە خۆتو ئامۆزاکەشت داو لەسەر دەستی جەعفەری ئامۆزای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خۆمدا بە دەست پەروەردگاری جیهانەوە و موسوڵمان بووم، ئەی پێغەمبەری خوا ئەریعی کوڕی ئەسعەمی کوڕی ئەیحەرم نارد بۆلات. من تەنها دەسەڵاتم بەسەر دەرونی خۆمدا هەیە ئەگەر دەتەوێت بێم بۆلات دێم ئەی پێغەمبەری خوا، چونکە من شایەتی دەدەم ئەوەی دەیڵێیت ڕاستو حەقە)[1].[2]

---

[1] - ضعيف.

[2] - لە البدايە ج٣ ص٨٣ دا واهاتووە.

# (نامەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ قەیسەری پاشای ڕۆم)

بەزار لە دحیەی کەلبیەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) ناردمی بۆلای قەیسەرو نامەیەکیشی پێدام تابیدەمێ، منیش چووم بۆلای و نامەکەم پێدا، برازایەکی کە سورو زەردی تیابوو و قژی خاوبوو لەلای بوو، کاتێك نامەکەی خوێندەوە تیایدا هاتبوو:

(لە موحەمەدی پێغەمبەری خواوە بۆ هیرقلی بەرپرسی ڕۆم) برازاکەی مشەیەکی کردو وتی: ئەمە نابێت بخوێنرێتەوە، قەیسەر وتی بۆچی؟ وتی: ئەو سەرەتا ناوی خۆی دێنێت و دەڵێت (بەرپرسی ڕۆم) و نەینووسیوە (پاشای ڕۆم) قەیسەر وتی: بە خوا دەبێت بیخوێنیتەوە، کاتێك نامەکەی خوێندەوە و لەلای چوونە دەرەوە منی بانگ کردە ژوورەوە بۆلای خۆی و هەواڵی بۆ قەشە - بەرپرسیان- ناردو ئەوانیش هەواڵیان پێداو ئەویش هەواڵی پێدراو نامەکەی پێ خوێندەوە، قەشە پێی وت: ئەمە ئەوەیە کە چاوەڕێمان دەکردو عیسا (علیه السلام) مزگێنی پێ لەسەر دابووین، قەیسەر پێی وت: دەڵێیت چی بکەم؟ قەشە وتی: من بڕوای پێ دەکەم و شوێنی دەکەوم، قەیسەر پێی وت: ئەی من ئەگەر ئەوە بکەم دەسەڵاتم لە دەست دەچێت، پاشان لەلای چووین قەیسەر ناردی بەدوای ئەبوسوفیاندا، ئەو کات ئەبوسوفیان لەوێ بوو، پێی وت: باسی ئەو کەسەم بۆ بکە کە لە خاکی ئێوە دەرکەوتووە ئەوە کێ یە؟ وتی: گەنجێکە، وتی: ڕەچەڵەکی لەناوتاندا چۆنە؟ وتی: کەسمان ناگەینە ئاستی، وتی: ئەمە نیشانەیەکی پێغەمبەرایەتیە، ئەی ڕاستگۆیی چۆنە. وتی: هەرگیز درۆی نەکردوە، وتی: ئەمەش هێمایەکی پێغەمبەرایەتیە، وتی: هیچ کات لادەدات ئەگەر لە هاوەڵانی بکوژرێن؟ وتی: خەڵکێك لەگەڵی بەشەڕ هاتن ئەویش شکاندی و ئەوانیش ئەویان شکاندووە، ئەمە هێمایەکی پێغەمبەرایەتیە، وتی: پاشان بانگی کردم و پێی وتم: بە هاوەڵەکەت بڵێ من دەزانم ئەو پێغەمبەرە، بەڵام دەستبەرداری دەسەڵاتم نابم،

دەڵێت: قەشەکەش هەموو ڕۆژێکی یەکشەممە لە دەوری کۆدەبوونەوەو قسەی بۆ دەکردن و بیری دەهێنانەوە, کە ڕۆژی یەکشەممە دەهات نەچوو بۆلایان و دانیشێت تا یەکشەممەکەی تر، منیش دەچووم بۆلای و قسەو پرسیاری لێ دەکرد، کە ڕۆژی یەکشەممەی دواتر هات چاوەڕێیان دەکرد تا بچێت بۆلایان، ئەویش نەچوو بۆلایان و بیانووی هێنایەوە کە نەخۆشە، چەند جار ئەمەی کرد، دوایی ناردیان بە دوایداو وتیان: دەبێت بێیت بۆلامان ئەگەر نا ئێمە دێین و دەتکوژین، چونکە لەوکاتەوەی ئەو عەرەبیە هاتووە لێت بێزارین، قەشەش وتی: ئەم نامەیە ببە بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وسەلامی لێبکەو پێی بڵێ، شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواو موحەمەدیش پێغەمبەری خوایەو من باوەڕم پێی هێناوەو شوێنی کەوتووم، ئەوان ڕقیانە لەم کارەم، چیت بینیوە پێی بڵێ، دوایی چوو بۆلایان و ئەوانیش کوشتیان، ئینجا فەرموودەکە دێنێت[1].[2] عەبدان لە ئیبن ئیسحاق لە هەندێ لە زانایانەوە هێناویەتی هەرقل بە دحیەی (رضي الله عنه) وتووە: قوڕت بەسەر سوێند بەخوا دەزانم هاوەڵەکەت پێغەمبەرێکی نێردراوەو ئەو کەسەیە کە چاوەڕێی بووین و لە کتێبەکەماندا باسمان بیستووە، بەڵام ترسم لە ڕۆمە لێم هەستن، ئەگەر ئەوە نەبووایە شوێنی دەکەوتم، دەی بڕۆ بۆلای قەشەو باسی ئەوەی بۆ بکە، چونکە ئەو لەناو ڕۆمدا گەورەترو قسە ڕۆیشتوترە لە من، دحیەش چوو بۆلای و بۆی باسکرد، ئەویش پێی وت: سوێند بەخوا ئەوە پێغەمبەرێکی نێردراوەو ناوو سیفەتی

---

[1] - ضعيف .

[2] - هەیسەمی ج٨ ص٢٣٦ -٢٣٧ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا ئیبراهیمی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی یەحیا هەیە کە لاوازە.تەبەرانی فەرموودەکەی دەحیەی (رضي الله عنه) بە کورتی هێناوە، تیایدا یەحیای کوڕی عەبدولحەمیدی حەممانی هەیە کە لاوازە، هەیسەمی (ج٥ ص٣٠٦) هەمان شت دەڵێت ئەبونەعیم لە الدلائل ص١٢١ دا بە کورتی بەو واتایە هێناویەتی، هەروەها عەبدانی کوڕی محەمەدی مروزی لە عەبدڵڵای کوڕی شەدادەوە بەو جۆرە هێناویەتی،

دەزانین پاشان چوو جلەکەی فڕێداو جلێکی پیسی پۆشی و چوو بۆلای ڕۆم و شایەتی حەقی هێنا، ئەوانیش دایان بەسەریداو کوشتیان.[1]

عەبدوڵلای کوڕی ئەحمەدو ئەبویەعلا لە سەعیدی کوڕی ئەبوڕاشیدەوە هێناویانە دەڵێت: تەنوخی – نێردراوی هیرقل بۆلای پێغەمبەری خوا– م لە حیمس بینی کە دراوسێم بوو پیاوێکی پیر بوو تەواو بەتەمەندا چوو بوو، منیش وتم ئەرە باسی نامەکەی هیرقل بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و نامەکەی پێغەمبەر (ﷺ)م بۆ هیرقل بۆ دەکەیت؟ وتی بەڵێ. پێغەمبەر (ﷺ)چوو بۆ تەبووك و دەحیەی کەلبی (رضي الله عنه) نارد بۆلای هیرقل، کاتێك نامەکەی پێغەمبەر (ﷺ) گەیشت قەشەو بەتریکەکانی ڕۆمی کۆکردەوەو دەرگای لەسەر ئەوان و ئەویش داخست، وتی: وەك دەبینن ئەو پیاوە هاتووەو نامەی بۆ ناردووم و بانگم دەکات بۆ سێ شت: بانگم دەکات تا شوێن ئایینەکە بکەوم، یان لەسەر خاکمان بڕێ لە سامانی خۆمانیان پێ بدەین و خاکی خۆمان بێت یان شەڕی لەگەڵ بکەین سوێند بەخوا وەك لە کتێبەکاندا خوێندوتانەتەوە دەزانن چی لە ژێر پێمدایە دەی وەرن با شوێن ئایینەکەی بکەوین یان لە خاکی خۆمان شتێك لە سامانی خۆمانی پێ بدەین، ئەوانیش یەکدەنك مینگەیەکیان کردو وتی بانگمان دەکەیت تاواز لە مەسیحیەت بهێنین یان ببینە کۆیلەی دەشتەکیەك کە لە حیجازەوە هاتووە، کاتێك زانی ئەگەر بچنە دەرەوە بارو دەسەڵاتی دەشێوێنن، وتی: من تەنها بۆیە ئەوەم وت تا بزانم چەندە لەسەر قسەی خۆتان سوورن، پاشان عەرەبێکی تجیبی بانگ کرد کە لە مەسیحیەکانی عەرەب بوو وتی: کەسێکم بۆ بێنە قسە لەبەر بکات و زمانی عەرەبی بێت تا بینێرم بۆلای ئەو کابراو وەڵامی نامەکەی بدەمەوە ئەویش وتی: منی هێنا، هیرقل نامەیەکی لوول خواردووی پێدام و وتی ئەم نامەم ببە بۆ ئەو کابرایە، چیت لە قسەی بیست لە سێ

[1]– یەحیای کوڕی سەعیدی ئومەوی لە (المغازي) و تەبەری لە ئیبن ئیسحاقەوە هێناویانە لە الاصابە ج٢ ص٢١٦ یشدا هاتووە.

شتدا بەوردی لەبەری بکە، بزانە هیچ باسی ئەو نامە دەکات کە ناردی بۆم؟ بزانە کە نامەکەی خوێنەدەوە باسی شەو دەکات؟ بڕوانە بۆ پشتەوەی بزانە شتێکی پێیە تا بتترسێنێت؟ منیش نامەکەیم برد تا هاتمە تەبووك، دەبینم لەگەڵ هاوەڵانیدا لای ئاوەکە دانیشتوون، وتم: کامەیە بەرپرستان؟ وترا ئەوەیە ـ منیش چووم تا لەبەردەمیدا دانیشتم، نامەکەم پێدا، ئەویش خستیە چوورەکەین پاشان فەرمووی (ممن انت؟) واتە(تۆ خەڵکی کوێیت؟) وتم یەکێکم لە تەنوخ، فەرمووی (هل لك في الحنيفية ملة ابيكم ابراهيم) واتە(هیچ لەسەر ئایینی حەنیفی ئیبراهیمی باپیرتان دەزانیت؟) منیش وتم: من نێردراوی گەلێکم و لەسەر ئایینی گەلێکم کە وازی لێ ناهێنم تا دەەڕێمەوە لایان، ئەویش فەرمووی (انك لا تهدي من احببت ولكن الله يهدي من يشاء وهو اعلم بالمهتدين) ئینجا فەرمووی (تەنوخی من نامەم نووسی بۆ کیسرا، ئەویش دڕاندی خوا خۆی دەسەڵاتی لەت و پەت بکات، نامەم نووسی بۆ بەرپرسی ئێوەش ئەویش وەری گرت، بەردەوام تا لە ژیاندایە خەڵکی خێری لێ دەبینن) وتم ئەمە یەکێکە لەو سیانەی وەسیەتی بۆ کردم، ئینجا لە بەرگی شمشێرەکەم نووسیم، پاشان یەکێك کەلە چەپیەوە بوو نامەکەی وەرگرت، منیش وتم: کێ نامەکەتان بۆ دەخوێنێتەوە؟ وتیان موعاویە، لە نامەی بەرپرسەکەمدا هابتوو: (بانگی دەکردم بۆ بەهەشتێکی فراوانی وا کە پانتاییەکەی هێندەی ئاسمانەکان و زەویەو ئامادەکراوە بۆ لە خواترسان، ئەی دۆزەخ کوا؟) پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (سوبحانەڵلا ئەی ئەگەر ڕۆژهەڵات ئیتر شەو لە کوێ بێ؟) منیش نووسیم: کاتێك لە خوێندنەوەی نامەکەم بوومەوە فەرمووی(ان لك حقا وانت رسول الله، فلو وجدت عندنا جائزة جوزناك بها، انا سفر مرملون) واتە(مافی خۆتە، تۆ نێردراوی، ئەگەر خەڵاتمان لا بوایە خەڵاتم دەکردیت، بەڵام لە سەفەرداین و هیچمان پێ نەماوە)، ئینجا یەکێك هاواری لێ کرد من خەڵاتی دەکەم، توێشوەکەی کردەوەو کڵاوێکی صفوری هێناو خستیە توێشووەکەم، منیش وتم: ئەمە کێ بوو؟ وتیان عوسمان، پاشان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (من ينزل هذا الرجل؟) واتە(کێ

ئەم پیاوە دەباتە لای خۆی؟) گەنجێکی پشتیوانان وتی: من، منیش لەگەڵی هەستام و چووین، کە لە کوڕەکە چوومە دەرەوە پێغەمبەر (ﷺ) بانگی کردم و فەرمووی (یا اخاتنوخ) منیش لامکردەوە و هەر لەو کاتەشەوە لە کوڕەکەیدا لەبەردەستیدا بووم چاوەڕێ بووم پێغەمبەر (ﷺ) پشتی خۆی هەڵماڵی و فەرمووی (هاهنا امض لما امرت بە) واتە(سەیری ئێرە بکە بۆ ئەوەی فەرمانت پێ کراوە) منیش کە سەیرمکرد مۆرێکم دی، لە شوێنی کرکراگەی شانیدا بوو وەك شوێنی کەڵەشاخ گرتن وابوو[1].[2]

بوخاری لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه)هێناویەتی ئەبوسوفیان پێی وتووە هیرقل ناردوویەتی بە شوێنیدا، ئەوکات لەگەڵ دەستەیەکی قورەیشدا بوو – بازرگان بوون لە شام-- ئەمەش لەو کاتەدا بوو کە پێغەمبەر (ﷺ) چوو تا چاوەڕوانی ئەبوسوفیان و بێباوەڕانی قورەیش بکات،[3] هات و ئەوانیش لە ئیلیا و بوون، قەیسەر بانگی کردن و لە کوڕەکەیدا گەورەکانی ڕۆم لەوێ بوون، پاشان بانگی کردن و داوای وەرگێڕیشی کرد، وتی: کامتان لە ڕووی ڕەگەزەوە لەو پیاوە نزیکترە کە بانگەشەی ئەوە دەکات پێغەمبەرە؟ ئەبوسوفیان وتی: من لە هەموویان لێی نزیکترم، وتی: نزیکی بکەنەوە لێم و هاوەڵانیشی نزیك بکەنەوە و لە پشتیەوە ڕایان

---

[1] – صحیح.

[2] – هەیسەمی ج٨ ص٢٣٥-٢٣٦ دەڵێت: پیاوانی سەنەدەکەی ئەبویەعلا جێ متمانەن، پیاوانی سەنەدەکەی عەبدوڵڵای کوڕی ئەحمەدیش هەروەها. ئیمامی ئەحمەد لە البدایە والنهایە ج٥ ص١٥ دا هێناویەتی و دەڵێت: فەرموودەیەکی غەریبە و سەنەدەکەی کێشەی نیە، ئیمامی ئەحمەد بە سوفرەدی هێناویەتی، هەروەها یەعقوبی کوڕی سوفیان هێناویەتی، لە البدایة والنهایة ج٦ ص٢٧یشدا هاتووە.

[3] ئەو کاتەی کە ئەبو سوفیان لە شام بوو شەڕی بەدرو ئوحود ڕوویدابوو، پێغەمبەر (ﷺ) لە دوای شەڕی ئوحود بە ئەبو سوفیانی وت ساڵێکی تر لە بەدر بەیەك دەگەینەوە، پێغەمبەر (ﷺ) چاوەڕێیان بوو تا لەشام بگەڕێنەوە).

وەستێنن، پاشان بە وەرگێڕەکەی وت پێیان بڵێ: من پرسیاری لێ دەکەم لەسەر ئەو کەسە ئەگەر درۆی کرد بە درۆی بخەنەوە. پاشان یەکەم پرسیاری ئەوەبوو: ڕەچەڵەکی لەناوتاندا چۆنە؟ وتم: خاوەن ڕەچەڵەکە لەناوماندا، وتی: هیچ کەس لە ئێوە پێش ئەو بانگەشەی پێغەمبەرایەتی کردووە؟ وتم: نا وتی: ئەی هیچ کام لە باوباپیرانی پاشاو دەسەڵاتدار بوون؟وتم: نا، وتی:ئەی خانەدانان شوێنی کەوتوون یان هەژاران و لاوازان؟ وتم: بەڵکو هەژاران و لاوازان. وتی: زیاد دەکەن یان کەم دەکەن؟ وتم: زیاد دەکەن. وتی: ئەی هیچ کامیان دوای ئەوەی موسڵمان دەبێت بەدەست بێزاری ئاینەکەیەوە هەڵدەگەڕێتەوە؟ وتم: نا، وتی: پێش ئەوەی بانگەشەی پێغەمبەرایەتی بکات تۆمەتبارتان دەکرد بە درۆ؟ وتم: نا، وتی: ئەی ناپاکی دەنوێنێت؟ وتم: نا، ماوەیەکیشە نازانم چی دەکات و چی ناکات، وتی: هیچ شتێکی لێ نەپرسیم هیچی بۆ زیاد بکەم جگە لەو قسە، وتی: ئەی لەگەڵی بەشەڕ هاتن؟ وتم: بەڵێ، وتی: چۆن لەگەڵی بەشەڕ هاتن؟ وتم: شەڕی نێوانمان بەسەرە بوو، هەرجارەو یەکێکمان سەردەکەوت. وتی: فەرمانی چیتان پێ دەکات؟ وتم: دەڵێت: خوای تاک و تەنهاپەرستن و هاوەڵی بۆ دامەنێن، واز لە قسەی باوباپیرانتان بێنن، فەرمانمان پێ دەکات نوێژ بکەن و ڕاستگۆو پاك بین و پەیوەندی خزمایەتیمان هەبێت، بە وەرگێڕەکەی وت: پێی بڵێ: من لەسەر ڕەچەڵی پرسیارم لێ کردیت و تۆ وتت لەناوتاندا خاوەن نەسەبە، پێغەمبەرانیش وابوون، وتم کەستان پێشتر ئەمەی وتووەو وتت نا، ئەگەر کەسێك پێشتر بیوتایە دەموت ئەمە دەیەوێت پێشەنگی بە قسەکەیەوە بکات کە پێش خۆی وتراوە، پرسیارم لێ کردیت باو باپیرانی کەسیان پاشاو دەسەڵاتدار بوون وتت نا، وتم ئەگەر کەسیان پاشا بوایە دەموت ئەمە داوای دەسەڵات و کورسی پاشایەتی باوکی دەکات، وتم پێشتر بە درۆزن تۆمەتبارتان دەکرد وتت نا، بۆیە زانیم ئامادەنیە لەگەڵ خەڵك درۆنەکات کەچۆن درۆ بە دەم خواوە هەڵدەواسێت، وتم خانەدانەکان شوێنی دەکەون یان هەژاران وتت هەژاران دەی هەرئەوانەن (هەژاران) شوێنی کەوتوانی

پێغەمبەران بوون، وتم زیاد دەکەن یان کەم وتت زیاد دەکەن، دەی ئیمانیش هەروایە تا دەگاتە ئەوپەڕ، وتم کەسیان لە بێزاری ئایینەکەیدا هەڵدەگەڕێتەوە وتت: نا، دەی ئیمانیش وایە کاتێك چێژی تێکەڵ بە دڵ دەبێت، پرسیارم لێ کردیت ئایا ناپاکی دەنوێنێت، وتت نا، دەی پێغەمبەرانیش وابوون، وتم: بەچی فەرمانتان پێ دەکات، وتت دەڵێت خوا بپەرستن و هاوەڵی بۆ دامەنێن و لە پەرستشی بتەکان بە دوورتان دەخاتەوە و فەرمانتان پێ دەکات نوێژبکەن وڕاستگۆو پاك بن، ئەگەر ئەمەی دەیڵێیت ڕاست بێت ئەوا ڕۆژێك دێت شوێنی ئەم دوو جێ پێیەم دەگرێت، من وامدەزانی لە دەرەوەی ئێوەیە و نەمدەزانی لە ئێوەیە، ئەگەر دەمزانی خۆم پێ دەگەیاندو هەوڵی بینینیم دەدەا، ئەگەریش لای بومایە سوێند بە خوا قاچەکانیم دەشۆرد، پاشان داوای ئەو نامەی پێغەمبەری (عليه السلام) کرد کە بە دحیەدا (رضي الله عنه) ناردبووی بۆ گەورەی بوصری، دایە دەسی هیرقل، تیایدا هاتبوو:

بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

(لە موحەمەدی کوڕی عەبدوڵڵاو پێغەمبەری خواوە بۆ هیرقلی گەورەی ڕۆم! سەلامی خوا لەو کەسەی ڕێی ڕێنموونی دەگرێتەبەر، پاشان: من بانگت دەکەم بۆ ئیسلام، موسڵمان بە پارێزراو دەبیت و خوا دووجار پاداشتت پێ دەدات، ئەگەر نا تاوانی ئەرسیسەکانت لەسەرە، (یا اهل الکتاب تعالو الی کلمة سواء بیننا وبینکم ان لا نعبد الا الله ولا نشرك به شیئا ولا یتخذ بعضنا بعضا اربابا من دون الله فان تولو فقولوا اشهدوا بانا موسلمون).

ئەبوسوفیان دەڵێت: کاتێك ئەوەی ویستی وتی و لە خوێندنەوەی نامەکە بوویەوەو تووڕەیی و هاوارو دەنگ و گاڵە بەرزبوویەوەو کراینە دەرەوە، بە هاوەڵەکانم وت – کاتێك دەرکراین- باری ئیبن ئەبی کەبشە وای لێ هاتووە پاشای بەنی ئەسفەر لێی بترسێت، ئیدی دڵنیابوون سەردەکەوێت تا ئەوەی خوای گەورە ئیسلامی خستە دڵمەوە، ئیبن ناتوری بەرپرسی ئیلیا و هیرقلی قەشەی مەسیحیەکانی شام بوو، دەڵێت هیرقل کاتێك هات بۆ ئیلیا ئەو ڕۆژە بوو کە

کەسێکی دەروون پیس، هەندێ لە بەتریکەکان وتیان حەزمان لە چارەت نیە، ئیبن ناتوری وتی: هیرقل کەسێکی زۆر پێشبینی کەر بوو، سەیری ئەستێرەکانی دەکرد، کاتێك پرسیاریان لێ کرد پێی وتن: کاتێك سەیری ئەستێرەکانم کرد بینیم پاشای خەتەنەکراو سەرکەوت، کێ لەناو ئەو گەلانەدا خەتەنە دەکات؟ وتیان: تەنها جوولەکە، خۆ ئەوانیش لات گرنگ نین، نامە بنووسە بۆ مەدائین تا چی جوولەکەی تێدایە بیکوژن، لەم کاتەدا پیاوێك کە پاشای غەسان ناردبووی هات بۆلای و هەواڵی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) پێدا، هیرقل کاتێك داوای هەواڵی لێکرد وتی بزانن خەتەنەکراوە یان نا؟ ئەوانیش سەیریانکردو وتیان خەتەنە نەکراوە، پرسیاری لێ کرد لەسەر عەرەب وتی ئەوان خەتەنە دەکەن هیرقل وتی: ئەوە پاشاکەیە وادەرکەوت. پاشان نامەیەکی نووسی بۆ هاوەڵێکی لە ڕۆمیە- کە لە زانستدا هاو وێنەی نەبوو- هیرقل چوو بۆ حیمس و دانیشت تا نامەیەکی هاوەڵەکەی بۆ هات و هەمان ڕای لەسەر هاتنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەبوو و وتی: پێغەمبەری خوایە.

پاشان هیرقل گەورەکانی ڕۆمی لە دەسکەرەکەیدا (وەك کۆشك وایە) لە حیمس کۆکردەوەو فەرمانی کرد دەرگاکان دابخەن، پاشان هات و وتی: ئەی کۆمەڵی ڕۆم ئایا سەرکەوتن و گەورەییتان دەوێت تا دەسەڵاتتان بچەسپێت؟ دەی بکەونە شوێن ئەو پێغەمبەرە، هیرقل کە ئەمەی بینی و بێ هیوابوو لەوەی موسڵمان بن وتی: بیانگێڕنەوە بۆم، تەنها ئەمەم وت تا سووربوونتان لەسەر ئایینەکەتان تاقی بکەمەوە، وابینیم، ئەوانیش سوجدەیان بۆ بردو لێی ڕازی بوون، ئەمەش کۆتا کاری هیرقل بوو.[1]

---

[1]- بوخاری لە صەحیحەکەیدا لە چەند شوێنێکدا بە دوورو درێژی هێناویەتی، ئەوانی دیکەش جگە لە ئیبن ماجە لە ڕێگەی زوهری لە عەبدوڵڵای کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعوود لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویانە. لە البدایە والنهایە ج٤ ص٢٦٦ یشدا هاتووە. ئیبن ئیسحاقیش بە دوورو درێژی لە زوهریەوە هێناویەتی، هەروەك لە البدایە والنهایە (ج٤ ص٢٦٢) دا هاتووە.

## (نامەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ کیسرای پاشای فارس)

بوخاری لە فەرموودەی لەیس لە یونس لە زوهری لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتیبە لە ئیبن عەبباسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر(ﷺ) نامەیەکی بە کەسێکدا نارد بۆ کیسراو فەرمانی کرد بیدات بە گەورەی بەحرەین، ئەویش دای بە کیسرا، کاتێك کیسرا خوێندیەوە لەویٚ یەتی کرد، وارزانم ئیبن موسەیب وتی: پێغەمبەر (ﷺ) دوعای لیٚ کردن تا خوا لەت و پەتیان بکات، عەبدوڵڵای کوڕی وەهب لە یونس لە زوهریەوە هێناویەتی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەبدولقاری (رضي الله عنه) پێی وتم پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژێك لەسەر مینبەر هەستاو وتاری پێشکەش کردو سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کردو شایەتومانی وت و فەرمووی (پاشان، من دەمەوێت هەندێك لە ئێوە بنێرم بۆلای پاشایانی عەجەم، جا لەگەڵم ناکۆك مەبن وەك ئەوەی بەنو ئیسرائیل بەرامبەر بە عیسای کوڕی مەریەم ناکۆك بوون) کۆچەران وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە هیچ کات لە هیچ شتێکدا لێت لانادەین، دەی بمانێرە، ئەویش شوجاعی کوڕی وەهبی (رضي الله عنه) نارد بۆلای کیسرا، ئەویش فەرمانی کرد هەیوانەکەی بڕازێنێتەوە، پاشان گەورەکانی فارسی کۆکردەوە، پاشان مۆڵەتی شوجاعی کوڕی وەهبی دا تا بێت، کە هاتە ژوورەوە کیسرا فەرمانی کرد تا نامەکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)ی لێوەربگرن، ئەویش وتی: نا دەبێت خۆم بیدەمە دەست خۆت چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمانی پیٚ کردوم، کیسرا وتی: نزیك بەرەوە،ئەویش نزیك بوویەوەو نامەکەی دایە دەست، پاشان نووسەرێکی خۆی بانگ کرد کە خەڵکی حیرە بوو، نامەکەی بۆ خوێندەوە، تیایدا هاتبوو:

(لە موحەمەدی کوڕی عەبدوڵڵاو پێغەمبەری خواوە بۆ کیسرای گەورەی فارس).

---

ئەبونەعیم لە دلائل النبوه (ص١١٩) لە ڕێگەی زوهریەوە بە دوورو درێژی بەوجۆرە هێناویەتی، بەیهەقیش ج٩ ص١٧٨ بەو سەنەدە بە دوورو درێژی بەوجۆرە هێناویەتی.

کاتێك بینی پێغەمبەر (ﷺ) ناوی خۆی پێش خستووە تووڕە بوو و هاواری کردو نامەکەی دڕاند پێش ئەوەی بزانێت چی تێدایە، فەرمانیشی کرد بە شوجاع تا بچێتە دەرەوە، کاتێك ئەوەی بینی لەسەر وڵاخەکەی دانیشتو دواتر چوو، پاشان وتی: سوێند بە خوا لام گرنگ نیە بەرەو کام ڕێیان دەچم، مادەم نامەکەی پێغەمبەرم(ﷺ) گەیاند، کاتێك کیسرا تووڕەیی‌یەکەی نەما هەواڵی نارد بۆ شوجاع تا بێت بۆلای، بەڵام سەیری کرد نەماوە، ناردی بۆ حیرە کەچی فریای نەکەوت، کاتێك شوجاع هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) بۆی گێڕایەوە کیسرا چۆن نامەکەی دڕیوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (مزق کیسری ملکه) (دەسەڵاتی کیسرا لەتو پەت بێت)[1].[2]

ئەبوسەعیدی نەیسابووری لە کتێبی (شرف المصطفی) لە ڕێگەی ئیبن ئیسحاق لە زوهری لە ئەبووسەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمانەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك نامەکەی پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتە لای کیسراو خوێندیەوەو دڕاندی نامەی بۆ بازان –بەرپرسی لە یەمەن– نووسی دووکەسی بەهێز بنێرە بۆلای ئەو کەسەی لە حیجاز ئەو نامەیەی بۆ ناردووم تا بیهێنن بۆم، ئەویش قەهرەمانی خۆی –ئەبانووی بوو کە نووسەرێکی چاك بوو– بە نامەیەکی فارسەوە ناردو لەگەڵیدا یەکێك لە فارسەکانی نارد کە پێی دەوترا (جدجُمیزة) نامەیەکیشی پیایاندا نارد بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و فەرمانی پێ دەکرد تا لەگەڵێدا بچێت بۆلای کیسرا، بە قەهرەمانەی وت: سەیری ئەو کابرام بۆ بکە بزانە کێیەو بیدوێنەو هەواڵی بهێنەرەوە بۆم، ئەوانیش چوون تا گەیشتە تائیف، کۆمەڵێك بازرگانی قورەیشیان لەوێ بینین، پرسیاریان لێ کردن لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) ئەوانیش وتیان: لە یەسریبە، دڵخۆش بوون، وتیان" کیسرا بڕیاری گرتنی داوە، ئینجا ئەو دووانە

---

[1] – صحیح.

[2] – لە البدایە ج٤ ص٢٦٩ دا واهاتووە.

چوون بۆ مەدینەو ئەبانوە دواندی و وتی کیسرا نامەی نووسیوە بۆ بازان تا کەسێك بنێرێت تۆ ببات بۆلای، ئەویش منی ناردووە تا لەگەڵت بێیت، ئەویش فەرمووی بگەڕێرەوە بەیانی وەرنەوە بۆلام، بەیانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموون: خوا کیسرای کوشتووەو شیرویەی کوڕی لە شەوی ئەوەندەو لە مانگی ئەوەندەدا بەسەریاندا زاڵ کردووە، وتیان ئەرێ دەزانیت چی دەڵێیت؟ ئەمە بنووسین بۆ بازان؟ فەرمووی (بەڵێ پێشی بڵێن ئەگەر موسڵمان بێت چی ناوچەت لە ژێر دەستدایە پێت دەدەم) (نعم وقولوا لە: ان اسلمت اعطيك ما تحت يديك) پاشان ناوچەیەکی دا بە جدجمیرە کە پێشکەشی کرابوو تیایدا زێڕو زیو هەبوو، ئەوانیش چوون بۆلای بازان و هەواڵیان پێدا، ئەویش وتی سوێند بەخوا ئەمە قسەی پاشا نیەو سەیر دەکەین بزانین ئەوەی وتوویەتی چۆنە، هێندەی نەبرد نامەیەکی شیرورەی بۆ هات دەیوت: من وەك تورەیيم بۆ فارس کیسرام کوشت چونکە کوشتنی خانەدانانی فارسی ڕەوا کردبوو،دەی گوێڕایەڵی ئەوانەی لای خۆتم بۆ وەربگرەو گوێ بەکەس مەدە کە کیسرا شتێکی بۆ نووسیویت لەسەری، کاتێك خوێندیەوە وتی: ئوم کابرا (موحەمەد) پێغەمبەرێکی نێردراوە، بۆیە موسوڵمان بوو و ئەندامانی بنەماڵەی فارسیش ئەوانەی لە یەمەن لەگەڵیدا بوون هەموویان موسوڵمان بوون، ئەبونەعیمی ئەسبەهانی لە الدلائل لە ئیبن ئیسحاقەوە بەو جۆرە بەبێ سەنەد گێڕاویەتەوە، بەڵام ناوی ناوە خدخەسرەو لەسەرناوی (ئةبانوة) ی هاوڕێی هاوڕایە[1][2].

ئیبن ئەبی دونیاش لە دلائل النبوە لە ئیبن ئیسحاقەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) عەبدوڵڵای کوڕی حوزافەی (رضي الله عنه) بە نامەیەکەوە نارد بۆلای کیسراو بانگی کرد بۆ ئیسلام، کاتێك نامەکەی خوێندەوە نامەکەی دڕاند، پاشان

---

[1] – ضعيف.

[2] – لە الاصابە ج١ ص٢٥٩ دا واهاتووە.

نامەی نووسی بۆ بازانی کاربەدەستی یەمەن، وەك ئەو فەرموودەکەی هێناوە، تیایدا هاتووە: پاشان ئەو دووانە چوون بۆ مەدینەو بابەویە وتی: شاهەنشاه کیسرا نامەی بۆ بازان نووسیوەو فەرمانی پێ کردووە کەسێك بنێرێت تا تۆی بۆ ببات، ئەگەر ڕازی بین شتێکت بۆ دەنووسم کە لای ئەو بە دەردت بخوات، ئەگەر نا خۆت و هۆزەکەشت لەناو دەبات و وڵاتت وێران دەکات، ئەویش پێی فەرموو بگەڕێنەوەو بەیانی وەرنەوە، ئینجا فەرموودەکەی وەك ئەو هێناوە[1][2].

ئیبن جەریریش لە ڕێگەی ئیبن ئیسحاق لە زەیدی کوڕی ئەبوحەبیبەوە هێناویەتی دەڵێت: عەبدوڵڵای کوڕی حوزافەی (رضي الله عنه) نارد بۆلای کیسرای کوڕی هورمزی پاشای فارس و لەگەڵیدا ئەم نامەی نارد:

(بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان)

لە موحەمەدی پێغەمبەری خواوە بۆ کیسرای گەورەی فارس! سەلام لەو کەسەی ڕێی ڕێنموونی دەگرێتە بەرو بڕوا دەهێنێت بە خواو پێغەمبەرەکەی و شایەتی دەدات هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خوای تاك و بێ هاوتا و موحەمەدیش بەندەو نێردراوی ئەوە، بانگت دەکەم بۆلای خوا، چونکە من پێغەمبەری خوام بۆ هەموو خەڵك تا هەرچی زیندوو هەیە هۆشیاری بکەمەوەو قسەی حەق بەسەر بێباوەڕاندا سەرکەوێ، ئەگەر موسوڵمان بیت پارێزراویت، ئەگەر نا تاوانی موجووسیەکان لە ئەستۆتدا دەبێت).

کاتێك خوێندیەوە دڕاندی و وتی ئەمە کە بەندەو کۆیلەی منە ئاوام بۆ بنووسێت؟! پاشان کیسرا نامەی نووسی بۆ بازان - ئینجا فەرموودەکەی ئیبن ئیسحاق دێنێت- تیایدا دەڵێت: هاتنە لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و ڕیشیان تاشیبوو و

---

[1] - ضعیف.

[2] - ئیبن ئەبی دونیا لە ئەبوسەعیدی مەقبەریەوە تەواو بە کورتی هێناویەتی، هەروەها لە الاصابە ج١ ص١٦٩ یشدا هاتووە.

سمێڵیان بەردابوویەوە، پێغەمبەر (ﷺ) حەزی نەدەکرد سەیریان بکات و فەرمووی قوڕتان بەسەر ئەوە کێ فەرمانی پێ کردن وابن؟ وتیان: پەروەردگارمان فەرمانی پێ کردین – مەبەستیان کیسرا بوو– پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (بەڵام پەروەردگاری من فەرمانی پێ کردووم تا ڕیشم بەربدەمەوە و سمێڵم کورت بکەمەوە[1].[2]

تەبەرانی لە ئەبوبەکرەوە (ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) نێردراوی، کیسرا هەواڵی نارد بۆ کاربەدەستی لە یەمەن و ناوچە عەرەبیەکانی ژێر دەستی – پێی دەوترا بازان– وتی: بیستوومە پیاوێك لەلای ئێوە دەرکەوتووە و دەڵێت پێغەمبەرم، پێی بڵێت واز بێنێت ئەگەر نا کەسێکی بۆ دەنێرم تا خۆی یان هۆزەکەی بکوژێت، نێردراوی بازانیش هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و ئەوەی پێ وت، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (ئەگەر شتێك بووایە لەلایەن خۆمەوە بمکردایە وازم دەهێنا، بەڵام خوای گەورە ناردوومی) نوێنەرەکەش لەلای هەستا و پێغەمبەریش (ﷺ) پێی فەرموو (ان ربی قتل کیسری ولا کیسری بعد الیوم وقتل قیصر ولا قیصر بعد الیوم) وایە(پەروەردگارم کیسرای کوشت و لەمڕۆ بەدواوە کیسرا نیە، قەیسەریشی کوشت و لەمڕۆ بەدواوە قەیسەر نیە) ئەویش ئەو قسەی لەو کات و ڕۆژو مانگەی پێی وت نووسی، دوایی گەڕایەوە بۆلای بازان دەبینێت کیسرا مردووە و قەیسەریش کوژراوە[3].[4]

---

[1] – حسن.

[2] – لە البدایەوالنهایە ج٤ ص٢٦٩ دا واهاتووە.

[3] –صحیح.

[4] – هەیسەمی ج٨ ص٢٨٧ دەڵێت پیاوانی سەنەدەکە صەحیحن جگە لە کەسیری کوڕی زیاد هەرچەندە ئەو متمانەی پێ داوە.

بەزار لە دحیەی کەلبییەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نامەیەکی پێ ناردم بۆ قەیسەر، ئینجا فەرموودەکە دێنێت، لە کۆتاییدا دەڵێت: پاشان دحیە چوو بۆلای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کە نێردراوانی کاربەدەستانی پیاوانی کیسرا لەسەر سەنعا لەلای بوون، ئەو کاربەدەستە ناردبوونی بۆلای، کیسرا پێی وتبوو ئەو کابرام لەکۆڵ دەکەیتەوە کە لە خاکی تۆ دەرکەوتووەو بانگم دەکات بۆ ئایینەکەی یان دەڵێت دەبێت سەرانە بدەم یان دەمکوژێت یان وات پێ دەکەم، بەرپرسی سەنعاش بیست و پێنج کەسی نارد بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، دحیە سەیر دەکات لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کاتێك بەرپرسەکەیان نامەکەی خوێندەوە پانزە شەو بەجێی هێشتن، دواتر هاتنەوە لای، کە بینینی بانگی کردن و فەرمووی (بڕۆن بۆلای پەروەردگارەکەتان و پێی بڵێن: پەروەردگارم ئەمشەو پەروەردگاری ئەوی کوشتووە) ئەوانیش چوون و هەواڵیان پێدا، ئەویش وتی: ئەم شەوە بژمێرن و لە بیری مەکەن، وتی: پێم بڵێن کە بینیتان چۆن بوو؟ وتیان: هیچ پاشایەکمان نەدی لەو بەختەوەرتر بێت بەناویاندا دەهات و دەچوو لە هیچ نەدەترسا و پاسەوانی نەبوو، دەنگیان لادا بەرز دەکردەوە، دحیە دەڵێت: پاشان هەواڵ هات کە لەو شەوەدا کیسرا کوژراوە[1،2].

## (نامەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ مقوقسی پاشای ئەسکەندەریە)

بەیهەقی لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولقاریئەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) حاتەبی کوڕی ئەبی بەلعەتی (رضي الله عنه) نارد بۆلای مقوقسی بەرپرسی ئەسکەندەریە، ئەویش نامەکەی پێغەمبەری خوای (صلى الله عليه وسلم) بۆ برد، ئەویش نامەکەی ماچ کرد و

---

[1] – ضعيف.

[2] – هەیسەمی ج٥ ص٣٠٩ دەڵێت: تیایدا ئیبراهیمی کوڕی ئیسماعیل هەیە کە لە باوکیەوە هێناویەتی، هەردووکیان لاوازن

ڕێـزی حاتـەبی گـرت و لـە شـوێنی باشـدا دای نیـشاند و ناردیـەوە بـۆلای پێغەمبەر(ﷺ) بە کۆمەڵێ دیاریەوەو جل و بەرگ و وڵاخیشی بە دوو کەنیزەکەوە پێدا نارد، یەکێکیان دایکی ئیبراهیم بوو، ئەوی دیکەشیان پێغەمبەر (ﷺ) دای بە موحەمەدی کوڕی قەیسی عەرەبی (رضي الله عنه).[1]

هـەروەها بەیهـەقی (رضي الله عنه) لـە حاتـەبی کـوڕی ئـەبی بەلتەعـەوە (رضي الله عنه) هێناویـەتی دەڵێـت: پێغەمبـەر (ﷺ) نـاردمی بـۆلای مقوقـسی پاشـای ئەسـکەندەریە، منـیش نامەکەی پێغەمبـەرم (ﷺ) بۆ برد، ئەویش لە شـوێنی خۆیـدا دای نیـشاندم و لای هەستام، دوایی بەتریکەکانی کۆکردەوەو ناردی بە شوێنمداو وتی پرسیارێکت لـێ دەکەم حەز دەکەم لێم تێ بگەیت، وتم دەی بیڵێ، وتی: لە بارەی هاوەڵەکەتـەوە پـێم بڵێ مەگەر ئەو پێغەمبەر نیە؟ وتم بەڵکو پێغەمبـەری خوایە، وتـی: ئـەی بۆچـی داوا دەکات و نـزا ناکات لـەو هـۆزەی کە لەشاری خـۆی دەریـانکرد بـۆ شوێنی تـر؟ وتم: مەگەر تۆ شایەتی نادەیت عیسای کوڕی مەریـەم پێغەمبـەری خوایـە؟ وتـی: بـا، وتم ئەی بۆچی کاتێك کە هۆزەکەی بردیان تا لە خاچی بدەن نزای لـێ نـەکردن تـا خـوا لەناویان ببات لە جیاتی ئـەوەی خـوا بـەرزی بکاتـەوە بـۆ ئاسمانی دونیا؟ ئـەویش پێی وتم: تۆ دانایت و لای کەسێکی داناوە هاتوویت، ئەم دیاریانەت پێدا دەنێرم بۆ موحەمـەد و لەگەڵتـدا دەسـتەیەك دەنێـرم تـا بتگەیەننـە ئارامگـەی خـۆت، دوو کەنیزەکی بە دیاری نـارد بـۆ پێغەمبـەر (ﷺ) یـەکێکیان دایکـی ئیبراهیمـی کـوڕی پێغەمبـەر (ﷺ) بـوو. یەکێکیـشیان پێغەمبـەر (ﷺ) بەخـشی بـە حەسـانی کـوڕی سابتی ئەنساری (رضي الله عنه).[2][3]

---

[1] – ضعيف.

[2] – ضعيف.

[3] – لـە البدايـە والنهايـە ج٤ ص٢٧٢ دا واهـاتووە، هـەروەها ئـیبن شـاهینیش فەرموودەکـەی حاتەبی هێناوە، لە الاصابە ج١ ص٣٠٠ یشدا هاتووە.

# (نامەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ خەڵکی نەجران)

بەیهەقی لە یونسی کوڕی بەکیر لە سەلەمەی کوڕی عەبدیەسوع لە باوکیەوە لە باپیریەوە هێناویەتی یونس – کە مەسیحی بوو دوایی موسڵمان بوو – دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) نامەی نووسی بۆ خەڵکی نەجران پێش ئەوەی (گس)ی سولەیمان (یووەتی نەمل) دابەزێت بۆی:

(بە ناوی پەروەردگاری ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوبەوە، لە موحەمەدی پێغەمبەری خواوە بۆ ئوسقوف نەجران و خەڵکی نەجران، سەلامتان لێ بێت، من سوپاسی خوای ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب دەکەم، پاشان بانگتان دەکەم بۆ پەرستشی خوا تاواز لە پەرستشی بەندەکان بهێنن، لە ویلایەتی بەندەکانەوە بانگتان دەکەم بۆ ویلایەتی خوا، ئەگەر ڕازی نەبوون ئەوا سەرانەتان لەسەرە، ئەگەر ڕازی نەبوون ئەوا شەڕتان لە دژ ڕادەگەیەنم، والسلام).

کاتێك ئوسقوف نامەکەی پێ گەیشت و خوێندیەوە تەواو پێ ڕاچڵەکا و ناردی بەدوای کەسێکی خەڵکی نەجراندا کە پێی دەوترا شەرحەبیلی کوڕی وەداعە – خەڵکی هەمەدان بوو ئەگەر مەسەلەیەکی سەخت بهاتایەتە پێش لە پێش کەس ئەودا بانگ نەدەکرا، نە دلێرو نە گەورەو نە عاقب–[1] ئوسقوف نامەکەی دا بە شەرحەبیل و ئەویش خوێندیەوە، ئوسقوف وتی: ئەبومەریەم ڕات چۆنە؟ شەرحەبیل وتی: دەزانی خوای گەورە بەڵێنی پێغەمبەرایەتی بە ئیبراهیم و نەوەی ئیسماعیل داوە. دوور نیە ئەم پیاوە ئەو بێت، ئیتر لەسەر پێغەمبەرایەتی قسەو ڕام نیە، ئەگەر مەسەلەیەکی دونیایی بوایە ڕایەکم پێ دەوتیت، ئوسقوفیش پێی وت: پەلە مەکەو دانیشە، ئەویش بە گوێی کرد، ئوسقوف ناردی بە دوای کەسێکی خەڵکی نەجراندا کە پێی دەوترا عەبدوڵڵای کوڕی شەرحەبیل، لەناو حیمیەردا ئاماژەی پێ دەکرا، نامەکەی بۆ خوێندەوەو وتی: ڕات لەسەری چیە؟ ئەویش

---

[1] عاقیب: پلەیەکی ناو ئایینی مەسیحیەکانە.

هەمان قسەی شەرحەبیلی کرد، ئوسقوف وتی: تۆش لە شوێنیٚ دانیشە پەلە مەکە، ئەویش دانیشت، ئوسقوف ناردی بە دوای پیاوێکی خەڵکی نەجراندا کە پێی دەوترا جەباری کوڕی فەیز کە لەبەنی حارسی کوڕی کەعب بوو. یەکێك بوو لە بەنی حەماس، نامەکەی بۆ خوێندەوەو داوای بڕیار لە سەردانی لیٚ کرد، ئەویش قسەکەی شەرحەبیل و عەبدوڵڵای کرد، ئوسقوف وتی: دانیشە، ئەویش دانیشت، کاتێك هەموویان هەمان ڕایان هەبوو ئوسقوف فەرمانی کرد ناقووس لێدراو ئاگر بەرزکرایەوە کورسی پەرستگاکان هێنراو ئەمەش لە کاتی مەترسی ڕۆژدا دەکرا، ئەگەر مەترسی شەو بووایە ناقووسیان لیٚ دەداو لە پەرستگاکانەوە ئاگر بەرزدەکرایەوە، کاتێك ناقووس لێدرا خەڵك کۆبوونەوەو خەڵکی دۆڵ لەسەر خواری مسوحەوە (وەك کورسی وایە) یان بەرزکردەوە، یەك ڕۆژ ڕێبڕینی سوارچاکێك ماوەی دۆڵەکە بوو، حەفتاوسیٚ گوندی تێدابوون، سەدو بیست هەزار جەنگاوەر بوون، ئەویش نامەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)ی بۆ خوێندنەوە وتی: ڕاتان لەسەری چۆنە، هەموو لەسەر ئەوە یەکدەنگ بوون شەرحەبیلی کوڕی داعەی هەمەدانی و عەبدوڵڵای کوڕی شەرحەبیلی ئوصبوحی و جەباری کوڕی فەیزی حارسی بنێرن بۆلای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و هەواڵی ئەو بهێننەوە. ئەوانیش چوون تا گەیشتنە مەدینە جلی سەفەریان لابردو جلی جوانیان پۆشی بە ئەڵقەی زێڕەوە، پاشان چوون تا هاتنەلای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و سەلامیان لێکرد، ئەویش وەڵامی نەدانەوە، ڕۆژێکی دوورو درێژ ویستیان بیدوێنن ئەویش وەڵامی نەدانەوە چونکە بەو جل و بەرگ و ئەڵقانەوە هاتبوون، بۆیە چوون بۆلای عوسمانی کوڕی عەففان و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف (رضي الله عنه) چونکە دەیانناسین، لەناو پشتیوانان و کۆچەراندا لە کۆڕێکدا دۆزییانەوەو وتیان عوسمان، عەبدوڕەحمان پێغەمبەرەکەتان نامەیەکی بۆ نوسیوین، ئێمەیش هاتووین بە دەمیەوەو سەلاممان لێکردووە کەچی وەڵامی نەداوینەتەوە، ڕۆژێکی دوورو درێژ ویستمان بیدوێنین کە چی ئامادە نەبوو، ئێوە دەڵێن چی؟ بگەڕێینەوە؟ ئەوانیش بە عەلی کوڕی ئەبوتالیب (رضي الله عنه) ئەبولحەسەن

وت تۆ لە بارەی ئەمانەوە چی دەڵێیت؟ عەلی بە عوسمان و عەبدولڕەحمانی وت: پێم وایە جل و بەرگی ڕازاندنەوە و ئەڵقەکانیان لا ببەن و جلی سەفەریان بپۆشن و بچنەوە بۆلای، ئەوانیش وایان کرد و سەلامیان کرد، ئەویش وەڵامی دانەوە و پاشان فەرمووی (سوێند بەو کەسەی بەهەق ناردوومی جاری یەکەم هاتن بۆلام شەیتان لەگەڵیان بوو) پاشان پرسیاری لێ کردن و ئەوانیش پرسیاریان لێ کرد، لەسەر ئەوە چوون تا پێیان وت: لە بارەی عیساوە چی دەڵێیت؟ ئێمە مەسیحین و دەچینەوە لای خەڵکەکەمان- ئەگەر تۆ پێغەمبەریت- حەز دەکەین بزانین تۆ لە بارەیەوە چی دەڵێیت؟ پێغەمبەریش (عليه السلام) فەرمووی لەسەری هیچم پێ نیە، هەستن تا دوایی پێتان دەڵێم پەروەردگارم چی لەبارەی عیساوە پێ فەرموون، بۆ بەیانی خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند (ان مثل عيسى عند الله كمثل ادم) تا (الكاذبين) ئەوانیش ڕازی نەبوون بەوە وازبێنن، بۆ بەیانی پێغەمبەر (عليه السلام) پاش ئەوەی هەواڵی پێدان حەسەن و حوسەینی برد بۆ بێستانێکی خۆی و فاتیمەش لە دوایەوە دەچوو، ئەوکات چەند هاوسەرێکی هەبوو، شەرحەبیل بە دوو هاوڕێکەی وت: ئێوە دەزانن خەڵکی دۆڵ ئەگەر سەروخواریان کۆبوونەوە ئەوە تەنها یەك ڕایان هەیە، بەخوا من ئەمە بە کارێکی قورس دەزانم، سوێند بەخوا ئەگەر ئەم کابرایە نێردراوبێت یەکەمینی عەرەب دەبین کە تانەی لێ دەگرین و بەرپەرچی دەدەینەوە، دڵی ئێمە و هاوڕێکانی ئەویش هیچ ڕێ نابڕن تا دووچاری دەردەسەریمان دەکەن، ئێمە لە عەرەبەکاندا لە هەموویان لێیان نزیکترین، ئەگەر ئەم کابرا پێغەمبەرێکی نێردراوبێت و ئێمەش نەفرینی لێ بکەین لەسەر زەویدا هیچمان نامێنێ و هەموو لەناو دەچین. ئەو دوو هاوڕێکەشی وتیان: ئەی تۆ دەڵێیت چی بکەین ئەی ئەبومەریەم؟ وتی: پێم باشە بیدوێنم، چونکە وای دەبینم هەرگیز خۆبەخۆ قسەناکات، ئەوانیش وتیان دەی باشە، شەرحەبیل چوویە لای پێغەمبەر (عليه السلام) و پێی وت: من باشتر لەوەم پێ یە. فەرمووی: چۆنە؟ وتی: حوکم (لە ڕۆژەوە تاشەو و شەویش تا بەیانی) کامیان لەناوماندا دەگریتەبەر دروستە،پێغەمبەریش

(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (لعلك وراءك اخا يثرب عليك) واتە(لەوانەیە لە پشتەوە کەسێك هەبێت سەرزەنشتت بکات) ئەویش وتی دەی پرسیار لە دوو هاوڕێکەم بکە، ئەویش پرسیاری لێ کردن، ئەوانیش وتیان خەڵکی دوڵ تەنها ئەم ڕایەی شەرحەبیلیان هەیە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) گەڕایەوەو لەگەڵیان ڕێك نەکەوت تا بەیانی هات بۆلایان و ئەم نامەی بۆ نووسین:

بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

(ئەمە نامەی پێغەمبەر موحەمەد پێغەمبەری خوایە بۆ نەجران، ئەگەر دەسەڵاتی بەسەریانەوە هەیە لەهەموو بەرخەمێکدا، و لەهەموو زەردو سپی و ڕەشێکدا، لە هەموو کۆیلەیەك کە لێیان زیاد بێت، هەموو ئەمانەیان بۆ بەجێ دێڵێت بەرامبەر بە دووهەزار پۆشاك، لە هەموو ڕەجەبێکدا هەزار پۆشاك و لەهەموو صەفەرێکدا هەزار پۆشاك) هەموو مەرجەکانی باسکرد،[1] لە البداية والنهاية ج٥ ص٥٥ دوای وتنی – هەموو مەرجەکانی باسکرد– دەڵێت: تائەوەی ئەبووسوفیانی کوڕی حەرب و غەیلانی کوڕی عەمرو مالیکی کوڕی عەوف و لەبەنی نەصرو ئەقرەعی کوڕی حاسبی حەمزەڵی و موغە یرەبوون بە شاهید، ئەمەی نووسی و کە نامەکەیان وەرگرت چوونەوە بۆ نەجران، لەگەڵ ئوسقوفەکەدا برایەکی هەبوو لە دایکیەوە کە بەرەچەڵەك ئامۆزای بوو پێی دەوترا بەشیری کوڕی موعاویەو ئەبوعەلقەمە کونیەکەی بوو، وەفدەکە نامەکەی پێغەمبەریان (صلى الله عليه وسلم)دا بە ئوسقوف، کاتێك دەیخوێندەوە ئەبووعەلقەمەی لەگەڵدابوو ڕێیان دەبڕی تا ئەوەی وشترەکەی بیشر وەرچەرخا و بیشر نزای لەناوچوونی کرد، بەڵام نەیدایەوە پاڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئەوکات ئوسقوفە پێی وت: دەی سوێند بەخوا قسەت بە پێغەمبەرێکی نێردراو وت، دەی بەخوا دانابەزم تا نەچمە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئینجا ڕووی وشترەکەی بەرەو مەدینە وەرچەرخاند و ئوسقوف وشترەکەی هێنایە بەردەمی و

[1] – لە تەفسیری ئیبن کەسیر ج١ ص٣٦٩ دا هاتووە،

پێی وت: لێم تێبگە، تەنها بۆیە ئەوەم وت تا عەرەب لێم ببیستن نەوەك وابزانن مافمان بردون یان بەدەنگی ڕازی بووین ملکەچی ئەو پیاوەبووین لە کاتێکدا لە هەموویان بەعیزەتترین بیشر پێی وت: سوێند بەخوا هەرگیز ئەوە قبوڵ ناکەم کە لە سەرتەوە دەرچوو (واتە ئەوەی وا بیرت لیچ کردەوە) بۆیە دای لە وشترەکەی – کە پشتی کردبوویەوە لە ئوسقوف– ئینجا وتی:

اليك تغد وقلقا و ضهينا　　　　وعترضا في بطنها جنينها

مخالفا دين النصارى دينها

تا هاتە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)و موسوڵمان بوو و بەردەوام لەگەڵیدا بوو تا دواتر کوژرا، دەڵێت: وەفدەکە چوونە نەجران و ڕاهیب ئیبن ئەبی سومەری زوبەیدی کە لەسەرەوەی کەژاوەکەی بوو هات، پێی وت: پێغەمبەرێك لە توهامە نێردراوە– ئینجا باسی وەفدی نەجرانی کرد کە چوون بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)و ئامادەی پێشنیار وەرگرتنەکەی ئەو نەبوون و بیشری کوڕی موعاویە چووە بۆلای و موسوڵمان بوو– ڕاهیبیش وتی: دامبەزێنن ئەگەرنا خۆم دەخەمەخوارەوە، ئەوانیش دایانبەزاند، ئەویش دیاریەکی لەکەڵ خۆی بردو چوو بۆلای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەوانە ئەو کراسەی کە خەلیفەکان دەیانپۆشی، لەگەڵ کڵاو و داردەستێکدا، (ماوەیەك لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مایەوەو گوێی لە سروش دەگرت، دوایی هاتەوە ناو هۆزەکەی و قەدەری وانەبوو موسڵمان بێت، بەڵێنیدا بگەڕێتەوە، ئەوەشی بۆ نەگونجا تا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کۆچی دوایی کرد)، ئوسقوف ئەبولحارسیش هاتە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)و سەیدو عاقبی لەگەڵدا بوو لەگەڵ کەسانی دیاری هۆزەکەشدا، لەوێ لای مانەوەو گوێیان لەوەدەگرت کە خوا بۆی دادەبەزاند، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەم نامەی نووسی بۆ ئوسقوف و ئەوانی دیکەی نەجران لە دوای ئەم:

بە ناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

(لـە موحەمـەدی پێغەمبـەرەوە بـۆ ئوسـقوف ئـەبوحارس و ئوسـقوف و کـاهین و ڕووهبانـەکانی نـەجران و هـەموو ئەوانـەی لـە ژێـر دەسـتیاندان بـە زۆرو کەمـەوە، پاراستنی خواو پێغەمبەریان هەیە هیچ ئوسقوفێك و ڕاهیبێك و کاهینێك هەڵمەتیان نابرێتە سەرو هیچ مافێکیان ناخورێت و هەڵمەت نابرێتە سەر دەسەڵاتیان و ئەوەی لەسەری دەڕۆن، پاراستنی خواو پێغەمبەرەکەی بە هەمیشەیی بۆیان هەیە تا ئەو کاتەی چاك بن و ئامۆژگارییان لەسەربێت و نەکەونە ستەم و ستەمکاری)[1][2].

## (نامەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ بەکری کوڕی وائیل)

ئەحمەد لە مەرثەدی کوڕی زیبابەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە پێغەمبەری خواوە (ﷺ) نامەیەکمان بۆ هات و کەسمان دەست نەکەوت بیخوێنێتەوە تا یەکێك لە کەسانی ڕەبیعە خوێندیەوە (لە پێغەمبەری خواوە بۆ بەکری کوڕی وائیل موسڵمان بن پارێزراو دەبن)[3][4].

## (نامەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆ بەنی جوزامە)

تەبەرانی لە عومەیری کوڕی موقبیلی جوزامیەوە لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: ڕوفاعی کوڕی زەیدی جوزامی بە وەفدێك چوو بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش نامەیەکی بۆ نووسی تیایدا هاتووە:

---

[1] – ضعیف.

[2] – موغیرەی کوڕی شوعبە ئەمەی نووسی، لە البدایة والنهایة ج٥ ص٥٥ هاتووە.

[3] – ضعیف.

[4] – هەیسەمی (ج٥ ص٣٥٠) دەڵێت: کەسانی سەنەدەکەی صەحیحن، بەزارو ئەبویەعلاو تەبەرانی لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) بەو واتایە هێناویانە، هەیسەمی ج٥ ص٣٠٥ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدی دووکەسی یەکەم صەحیحن.

(لە موحەمەدی پێغەمبەری خواوە بۆ روفاعی کوڕی زەید، من ناردم بۆ هەموو هۆزەکەی و ئەوانەیان دەچنە ڕیزیانەوە تا بانگیان بکات بۆلای خواو پێغەمبەرەکەی، هەرکامیان باوەڕیان هێنا لە حیزبی خوادان، هەرکەس ڕووی وەرگێڕا دوومانگ پەنای بۆ هەیە). کاتێك چوو بۆلایان هاتن بە دەمیەوە، ئینجا فەرموودەکە دێنێت.[1]

[1]- هەیسەمی ج٥ ص٣١٠ دەڵێت تەبەرانی بەو جۆرە بە موتەسیلی (لکاوی) هێناویەتی بە مونقەتیعی (پچڕاو) لە ئیبن ئیسحاقەوە هاتووە، لە سەنەدەکەدا کۆمەڵێك هەن نایانناسم، سەنەدیشیان تا ئیبن ئیسحاق باشە، ئومەدی لە (المغازی) لە ڕێگەی ئیبن ئیسحاقەوە لە گێڕانەوەی عەمەیری کوڕی مەعبەدی کوڕی فلانی جوزامیدا لە باوکیەوە هێناویەتی، الاصابە ج٣ ص٤٤١ یشدا هاتووە.

# (بەسەرهاتەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ئاکارە بەرزەکانیدا کە بوونە هۆی ڕێنموونی کردنی خەڵك)

## ﴿موسڵمان بوونی زەیدی کوڕی سەعنەی حیبری ئیسرائیلی (رضي الله عنه)﴾

تەبەرانی لە عەبدوڵڵای کوڕی سەلامەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: خوای گەورە کاتێك ویستی زەیدی کوڕی سەعنە ڕێنموونی بکات زەعنی کوڕی سەعنە وتی: هەر دەمـدی نیـشانەیەکی پێغەمبەرایـەتی هـەبووبێت لـە ڕوخـساری موحەمـەددا (صلى الله عليه وسلم)کاتێك سەیرم دەکرد، تەنها دوو نیشانە نەبێت کە نەمدەزانین: نەرمونیانی پێش نەزانی دەکەوت، توندی نەزانی تەنها نەرموونیانی بۆ ئەو زیاد دەکرد، زەید دەڵێـت: ڕۆژێکیـان پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) لـە مـاڵ چـوویە دەرەوە - عـەلی کـوڕی ئەبوتالیبیشی (رضي الله عنه) لەگەڵدا بوو- پیاوێك بەوڵل خەکەیەوە وەك خێڵەکیەك هات بۆلای، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من لە گوندی بەنی فڵاندا کەسانێکم هەن کە موسوڵمان بوون، من پێم دەوتن ئەگەر موسڵمان بن ڕۆزی دەبارێت بەسەرتاندا، کەچـی وا وشکەساڵی و قـات و قـڕی نابـارانی ڕووی تـێ کـردووین، ئێستا ئەی پێغەمبەری خوا دەترسم بەو هۆیەوە لە ئیسلام بچنە دەرەوە وەك چۆن بەوهۆیەوە هاتنە ناو ئیسلام، ئەگەر پێت باشە شتێکیان بۆ بنێرە تا فریایان بکەوێت، سەیری پیاوێکی کرد لەلایەوە بوو وابزانم عەلی بوو، وتی ئەی پێغەمبەری خوا هیچی لێ نەماوە، منیش لێی نزیك بوومەوەو وتم: ئەی موحەمەد هێندەت هەیە لە حەوشەی بەنی فڵانداو بۆ ماوەی ئەوەندەو ئەوەندە خورمام پێ بفرۆشە، ئەویش فەرمووی (لا تسمی حائط بني فلان) منیش وتم بەڵێ، ئینجا پێی فرۆشتم، منیش کیسی پارەکەم داتەکاندو بۆ بڕێك خورما هەشتا مسقاڵی زێڕم پێدا بۆ ماوەی ئەوەندەو ئەوەندە ئەویش دای بە کابراو فەرمووی (اعدل علیهم و اغثهم) واتە(چاوپۆشیان لێ بکەو یارمەتیان بدە)، زەید دەڵێت: دوو ڕۆژ پێش کاتی خۆی (یان سێ ڕۆژ)

پێغەمبەر (علیه السلام) لەگەڵ ئەبوبەکرو عومەرو عوسماندا (رضي الله عنه) بە دەستەیەکی هاوەڵانیەوە چوو، ساتێك نوێژی لەسەر تەرمێك کردو لە دیوارەکە نزیك بوویەوە تا پاڵی پێوە بداتەوە چووم بۆلای و کراس و عەباکەیم گرت و بە ڕوویەکی تووڕەییەوە سەیرم کردوو پێم وت: موحەمەد ئەرێ مافەکەم بۆ ناگێڕیتەوە؟ بەنی عەبدولموتەلیب سوێند بەخوا هەرفێری ماوە درێژکردنەوەبوون، خەڵکیش دەزانێت تێکەڵیتان چۆنە، سەیری عومەرم کرد چاوەکانی سوور ببون و وەك گەردوون دەسووڕایەوە، پاشان چاوی لێ زیت کردمەوەو وتی: ئەی دوژمنی خوا ئاوا بە پێغەمبەری خوا دەڵێیت و وای پێ دەکەیت؟ سوێند بەخوا ئەگەر لەبەر پێغەمبەری خوا نەبوایە بە شمشێرەکەم دەمدا لە ملت، پێغەمبەریش (علیه السلام) بە نەرمی و لەسەرخۆ سەیری دەکردم و بە عومەری فەرموو: ئەی عومەر من و ئەم کابرا بارمان جیاوازە، دەبێت بە من بڵێیت ڕەفتارم لەگەڵی جوان بێت و ئەویش جوان ڕێ بگرێتەبەر، عومەر بیبەو مافەکەی خۆی بدەرەوەو لە جیاتی ئەوەی ترساندت بیست ساع خورمای زیاتری بدەرێ، عومەریش بردی و مافەکەی پێدایەوەو بیست ساعی بۆ زیاد کردم، وتم: عومەر دەمناسیت؟ وتی: نا، وتم: من زەیدی کوڕی سەعنەم، وتی: حیبر تۆیت؟ وتم: بەڵێ، وتی: ئەی بۆچی بەرامبەر بە پێغەمبەر(علیه السلام) واتکرد؟ منیش قسەی خۆمم بۆ کرد، وتم: عومەر لە هێماکانی پێغەمبەرایەتیدا هەرچی هەبوو لە هەڵسووکەوتی پێغەمبەر (علیه السلام) بینیم کاتێك سەیرم کرد، تەنها دوانیان نەبن کە لێم نەبینی، نەرمونیانی لە پێش تووڕەییەوە بێت، لە کاتی تووڕەییدا نەرمونیانی زیاد بکات، واهەردووکیانم بینین، دەی عومەر واتۆ بەشایەت دەگرم ڕازیم بەوەی خوا پەروەردگارم بێت، ئیسلام ئایینم بێت، موحەمەد پێغەمبەرم بێت، بە شایەتیشت دەگرم بەشێکی ئەو سامانە زۆرەی هەمە بیکەم بەخێر بۆ ئوممەتی موحەمەد(علیه السلام)، عومەریش وتی: بڵێ بۆ هەندێکیان چونکە ناتوانیت بیدەیت بە هەموو ئوممەت، ئەویش وتی: هەندێکیان، عومەرو زەید گەڕانەوە بۆلای پێغەمبەر (علیه السلام) و زەید وتی: شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك

نیە جگە لە خوا، موحەمەدیش بەندەو پێغەمبەری خوایە، باوەڕی پێ هێناو بەیعەتی پێداو لە چەندین کات و شەڕو حاڵدا لەگەڵیدا بوو، پاشان لە شەڕی تەبووک کۆچی دوایی کرد- ڕەحمەدی خوا لە زەید-[1].[2]

ئیبن سەعد دەڵێت: یەزید لە جەریری کوڕی حازمەوە لە کەسێکەوە لە زوهری بیستبوو دەڵێت: جوولەکەیەك وتی: لە وەسفی پێغەمبەر (ﷺ) لە تەوراتدا چی هەبوو هەموویم بینی جگە لە نەرمونیانی، ئینجا چیرۆکەکە دێنێت.[3]

## (چیرۆکی ڕێککەوتنی حودەیبیە)

بوخاری لە میسوەری مەخرەمە و مەروانەوە هێناویەتی کە دەڵێن: پێغەمبەر (ﷺ) لە کاتی حودەیبیەدا چوو تا لە نیوەی ڕێدا بوون پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ان خالد بن الوليد بالغميم في خيل لقريش طليعة فخذوا ذات اليمين) واتە(خالیدی کوڕی وەلید لە غەمیمە، بە ئەسپێکی قورەیشیەوە (کاروانێکی سوارچاکانی قورەیش) وەك پێشڕەو هاتووە، بۆیە لای ڕاست بگرنەبەر) سوێند بە خوا خالید هەستی پێ نەکردن تا هاتنە پێشەوەی سوپاکە، خالیدیش ڕایکرد تا قورەیش ئاگادار بکاتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) چوو تا گەیشتە ئەو دووڕیانەی کە لەوێ

---

[1] – حسن.

[2] – هەیسەمی ج٨ ص٢٤٠ دەڵێت: تەبەرانی گێڕاویەتەوەو کەسانی سەنەدەکەی جێ متمانەن، ئیبن ماجە بەشێکی لێ گێراوەتەوە. ئیبن حیبانیش لەگەڵ حاکم و ئەبوشەیخ لە کتێبی (اخلاق النبی ﷺ)و چەندێکی دیکەش هێناویانە، لە الاصابە ج١ ص٥٦٦ یشدا هاتووە، دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە جێ متمانەن. وەلید دەڵێت کە قسەی تێدا کردووە بۆ موحەمەدی کوڕی ئەبوسری کە لە وەلیدەوە گێڕاویەتیەوە، ئیبن موعینیش متمانەی پێ دەدات، ئەبوحاتەم لە ڕوویدا نەرمی دەگرێتەبەر، ئیبن عەدی دەڵێت: (موحەمەد) هەڵەی زۆرە، خواش باشتر دەزانێت، شاهیدێکی دیکەم لە ڕوویەکی ترەوە بۆ چیرۆکەکەی بەدی کردووە، بەڵام تیایدا ناونەهاتووە.

[3] – ئەبونەعیم لە الدلائل (ص٢٣)دا هێناویەتی.

سوارەکەی دایکوتا، خەڵکی وتیان (حل حل)[1] بەڵام هەر نەچوو، وتیان وا (قصواء) دایکوتاوەو ناڕوات، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی (ما خالت القصواء، و ما ذاك لها بخلق، ولكن حبسها حابس الفيل) واتە(نا قصواء داینەکوتاوەو ئەوە لە ئاکاری ئەو نیە، بەڵکو ئەوەی ڕێی نەدا فیلی (ئەبرەهە) بچێت ڕێ نادات ئەمیش بچێت) پاشان فەرمووی (والذي نفسي بيده لا يسالوني خطة يعظظلون فيها حرمات الله الا اعطتيهم اياها) واتە(سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە داوای هەرشتێکم لێ بکەن ئەگەر بەزاندنی سنوری خوا نەبێت ڕازی دەبم و پێیان دەبەخشم)، پاشان پیایدا هەڵشاخا و وشترەکەش چوو تا لەوپەڕی حودەیبیە لای ئاوێکی کەم دابەزی کە کەم کەم ئاوی دەدا، هێندەی نەبرد تەواویان کرد، سکاڵای تینویەتی برایە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەویش ڕمێکی دەرهێنا و فەرمانی کرد بیخەنە ناویەوە، سوێند بە خوا بەردەوام ئاو قلْپەی دەدا تا دوایی ڕمەکەیان لابرد، لەوکاتەدا ئیبن وەرقائی خوزاعی بە دەستەیەکی خوزاعیەکانەوە هات – ئەمانە جێی متمانەو ئامۆژگاری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوون لەناو خەڵکی توهامەدا– وتی: من کەعبی کوڕی لوئەی و عامری کوڕی لەئیم بینین کە لەسەر ئاوەکانی حودەیبیە بوون و تەپڵ و دەف و شمەکیان پێ بوو و هاتبوون تا لەگەڵت بەشەڕ بێن و نەهێڵن بچنە کەعبەوە، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) فەرمووی (ئێمە بۆ شەڕی کەس نەهاتوین، بەڵکو هاتووین تا عەمرە بکەین، قورەیش کە شەڕ سەری خواردوون و زیانمەندبوون، ئەگەر پێیان باشە ماوەیەکیان دەدەمێ با واز لە من و خەڵك بهێنن، ئەگەر سەرکەوتم ئەوکات ئەگەر ویستیان بابێنە ناو ئەو ئایینەی خەڵك دێتەناوی، ئەگەر نا پارێزراو دەبن با پاڵ بدەنەوە، ئەگەر بەوە ڕازی نابن دەی سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە لەسەر ئەم کارەم لەگەڵیان دەجەنگم تا دەگاتە قوڕقوڕاگەم (ئەگەر بە تەنهاش بێت) و کاری خوا جێ بەجێ دەبێت (واتە سەرخستنی ئایینەکەی خۆی)). ئیبن وەرقائی

---

[1] بۆ وشتر بەکاردێت کاتێك نەڕوات.

وتی: ئەمەی وتت دەیگەیەنمە ئەوان، چوو تا گەیشتە لای قورەیش و وتی ئێمە لای ئەو کابراوە هاتین و بیستمان شتێکی وت، دەتانەوێت پێتان بڵێین؟ گەمژەو هەرزەکارەکانیان: پێویستمان بە هیچ قسەو هەواڵێکی نیە،یەکێکیان کە قسەڕۆیشتوو بوو وتی: ئادەی بیڵێ بابزانین چیت بیستووە، وتی: بیستم ئاوای دەوت، ئیتر چی قسەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو پێی وتن، عورەوەی کوڕی مەسعود وتی: خەڵکینە، من باوك نیم؟ وتیان: با، وتی: ئێوە کوڕ نین؟ وتیان: با، وتی هیچ تۆمەتێکم دەدەنە پاڵ؟ وتیان: نەخێر، وتی: دەزانن من خەڵکی عوکاڤم بانگ کرد تا بێن بۆ یارمەتیتان کاتێك ئامادەنەبوون خۆم و منداڵ و ئەوانەی گوێڕایەڵم بوون هەموو هێنان بۆلاتان، وتیان: وایە، وتی: دەی ئەم کابرا پێشنیارێکی چاك و بەویژدانانەی کردووە، لێی قبوڵ بکەن و ڕێ بدەن بابچم بۆلای، وتیان: بڕۆ بۆلای، ئەویش چوو بۆلای، پێغەمبەری دواند، ئەویش (صلى الله عليه وسلم) هەمان قسەی پێشووی کردەوە، ئەوکات عورەوە وتی: موحەمەد پێت چۆنە بنەویتە ڕیشەی هۆزەکەت، مەگەر بیستووتە پێش تۆ کەس لە عەرەب وابکات؟ ئەگەریش شتێکی ترە ئەوا سوێند بە خوا من کەسانی دیارو تێکەڵی خەڵك نابینم تا بێن بە دەمتەوە، ئەبوبەکر (رضي الله عنه) وتی: دەمت داخە بەزری لات، ئێمە وازی لێ دێنین و لێی ڕادەکەین؟ ئەبوبەکر وتی ئەویش وتی: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر دەست لام نەبوایە (ڕێزی جاران نەبوایە) لێم قبوڵ نەدەکردیت و وەڵامم دەدایتەوە، ئینجا کەوتە دواندنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، هەرچی دەیدواند ڕیشی دەگرت، موغەیرەی کوڕی شوعبەش لە سەر سەری پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) ڕاوەستا بوو بە سووچی شمشێرەکەی دەیدا بەسەر دەستیداو پێی دەوت: دەستت لە ڕیشی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دووربخەرەوە، عورەوە سەری بەرز کردەوەو وتی: ئەمە کێیە؟ وتیان: موغەیرەی کوڕی شوعبە، وتی: ئای چ ناپاکێکە! مەگەر ئاگام لە ناپاکیت نیە؟ ئاخۆ موغیرە لە سەردەمی نەفامیدا چوو بۆلای خەڵکێك و کوشتنی و پارەو سامانی بردن، دواتر هات و موسڵمان بوو، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (اما الاسلام فاقبل و اما المال

فلست منه في شيئ) واتە(بۆ ئیسلام قبوڵمە، بەڵام بۆ پارەو سامانەکە هیچی قبوڵ ناکەم)، پاشان عوروە چاوی بڕیبووە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و چاوەکانی زیتەیان نەدەکرد، وتی: سوێند بەخوا، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەڵغەمی بکردبایە نەدەکەوتە سەر زەوی و دەکەوتە ناو دەستی یەکێکیان و دەیهێنا بەسەر دەم و چاو و پێستیدا، ئەگەر فەرمانی پێ بکردنایە ڕایان دەکرد بەدەمیەوە، کە دەست نوێژی دەگرت لەسەر ئەوەی کامیان ئاوی دەست نوێژی بدات پاڵپاڵێنیان بوو، کە قسەی دەکرد بێدەنگ دەبوون، لەتاو بە گەورە دانانیدا نەیاندەتوانی چاوی لە ڕوودا بوەستێنن، عوروە گەڕایەوە بۆلای هاوەڵانی و وتی: هۆزەکەم سوێند بەخوا چووم بۆلای پاشاکان، چووم بۆلای قەیسەرو کیسراو نەجاشی، سوێند بەخوا ئەگەر پاشایەکم دیبێت هاوەڵانی بەرزی ڕاگرن موحەمەد بووە، سوێند بەخوا بەڵغەمێکی بکردایە دەکەوتە دەست یەکێك لە هاوەڵانی نەیاندەهێشت بەڵغەمی بکەوێتە سەر زەوی و دەیانهێنا بەسەر دەم و چاو و پێستیاندا، کە فەرمانێکی پێ دەکردن بەڕاکردنەوە دەچوون بەدەمیەوە، کە دەست نوێژی دەگرت شەڕیان بوو لەسەر ئەوەی کامیان ئاوی دەست نوێژی بدەن، کە قسەی دەکرد دەنگیان نزم دەکردەوە لە خزمەتیدا، لەتاو بە گەورە دانانیدا نەیاندەتوانی جوان سەیری بکەن، بەڕاستی ئەم پیاوە پێشنیارێکی دروستی خستووەتە بەردەستتان لێی قبوڵ بکەن، یەکێك لە پیاوانی کینانە وتی: وازبێنن بامن بچم بۆلای، وتیان بڕۆ، کاتێك چوو بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانی، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی ئەوە فڵان کەسە لە هۆزێکە کە قوربانی بە گەورە ڕادەگرن، دەی کەس بنێرن بۆلای، خەڵکی چوون بەدەمیەوە و بە (لا اله الا الله) وتنەوە پێشوازییان لێ کرد، ئەویش وتی: سوبحانەڵلا، ئەمانە بە قوربانیەوە هاتوون ناکرێت ڕێیان لێ بگیرێت تا نەچنە کەعبە، ئینجا گەڕایەوە بۆلای خەڵکەکەی و پێی وتن: پێموانیە ڕێیان لێ بگیرێت، یەکێکیان کەناوی موکرزی کوڕی حەفص بوو وتی: وازبێنن با من بچم، وتیان: بڕۆ، کە چوو بەرەو لایان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (هذا مكرز وهو رجل فاجر) واتە(ئەوە موکریزە پیاوێکی

خـرای و فـاجیره) هـات و پێغەمبـەری خـوای دوانـد، لـە کـاتی قسەکردنیدا بـوو کـە سوهەیلی کوڕی عەمر هات – عومەر دەڵێت ئەیوب لە عیکرەمەوە پێی وتم: کاتێك سوهەیلی کـوڕی عـەمرهات– پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (لقد سهل لكم من امركم) واتە(کارەکـەتان ئاسـان بـووە) موعەمـەر دەڵێت: زوهـری لـە فەرموودەکـەیدا دەڵێت: سوهەیل هـات و وتـی: وەرە شتێك لـە نێـوان هەردوولامانـدا بنووسـە، پێغەمبـەریش (ﷺ) نووسـەری بـانگ کـرد و فـەرمووی (بنوسـە بـە نـاوی خـوای بەخـشندەی میهرەبـان) (اكتب بسم الله الرحمن الرحيم) سـوهەیل وتـی: بەخوا نـازانم ڕەحمـان چـیە. بنووسـە (باسمـك اللـهم) (خوایـە بـە نـاوی تـۆوە) وەك چـۆن جـاران وات دەنووسـی، موسـوڵمانان وتیـان: سـوێند بـەخوا دەبێـت (بسم الله الرحمن الرحيم) بنوسرێت، پێغەمبـەریش (ﷺ) فەرمووی بنووسە (خوایـە بـە نـاوی تـۆوە) پاشـان فـەرمووی (هـذا ماقال عليه محمد رسول الله) واتـە(ئەمـە بڕیـارو دادوەرییـە کـە کـە موحەمـەدی پێغەمبـەری خـوا لەسـەری ڕێککـەوتووە) سـوهەیل وتـی: بـەخوا ئەگـەر پێمـان وابوایـە پێغەمیـەری خوایـت ڕێمـان لـیّ نـەدەگرتیت بـۆ کەعبـە و لەگـەڵت نەدەجـەنگاین، بـەڵکو بنووسـە لـە موحەمـەدی کـوڕی عەبـدوڵڵا وە، پێغەمبـەریش (ﷺ) فەمووی (سـوێند بەخوا من پێغەمبـەری خـوام، ئەگـەریش بەڕاستم دانـانێن و بڕوام پیّ ناکەن دەی بنووسە موحەمەدی کوڕی عەبدوڵڵا) زوهری دەڵێت: لەبەرئەو فەرمایشتەی بـوو کـە دەیفـەرموو (داوای هەرچیەکم لـیّ بکـەن شـکاندنی سـنووری خـوای تێـدا نـەبێت پێیـان دەبەخـشم و ڕازیـم)، پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی (لەسـەر ئەوەی ڕێمـان بدەن بچینە کەعبـە و تـەواف بکـەین) سوهەیل وتـی: نا بـەخوا بەعـەب ناڵێیت کە فشارمان لەسەر داناوە، بابۆ ساڵی دواتر تەواف بکەن، ئەویش نووسـی، سـوهەیل وتـی: لەسـەر ئـەوەی هەرکـەس لـە ئێمـەبێت بۆلاتـان با موسـڵمانیش بێـت بیگێڕیتەوە بۆمان، موسوڵمانان وتیان: سـوبحانە ڵلا، چۆن بیگێڕینەوە بۆ بێباوەڕان لە کاتێکدا بە موسـڵمانی هاتبێـت؟ لەمـەدا بـوون کـە ئەبوجەندەلی کـوڕی سـوهەیلی عـەمر (رضي الله عنه) بـە ماندوویـەتی و وەك کـوتراو هـات، لـە خـوارووی مەککـەوە هـاتبوو تـا

هاتە لای موسڵمانان، سوهەیل وتی: موحەمەد ئەمە یەکەم شتە لەگەڵت لەسەری ڕێك دەکەوم دەبێت بیگێڕیتەوە بۆم، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (انا لم نقچی الکتاب بعد) واتە(ئێمە هێشتا نامەکەمان نەنووسیوە) ئەویش وتی: دەی سوێند بەخوا لەسەر هیچ لەگەڵت ڕێك ناکەوم، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (فاجزه لي) سوهەیل وتی نابێت فەرمووی با وابکە، وتی نایکەم، موکریز دەڵێت: دەی باشە، ئەبو جەندەل وتی: ئەی کۆمەڵی موسڵمانان بریێمەوە بۆلای بێباوەڕان لە کاتێکدا بە موسڵمانی هاتووم؟ نابینن چیم لێ کرا؟ -چونکە لەسەر ئایینی خوا زۆر سزادرابوو- عومەر (رضي الله عنه) دەڵێت: هاتم بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)و وتم: مەگەر تۆ پێغەمبەری خوا نیت؟ فەمووی: با، وتم: مەگەر ئێمە حەق و دوژمنانمان ناحەق نین؟ فەمووی: با، وتم: ئەی ئیتر بۆچی ئاوا سازش بکەین لە ئایینمان؟ فەرمووی (من پێغەمبەری خوام و لە فەرمانی خوا لانادەم و ئەو سەرخەرمە) وتم: مەگەر تۆ نەتوت دەچین بۆ کەعبەو لەوێ تەواقی دەکەین؟ فەرمووی (با، پێم وتیت، ئەی پێم وتیت ئەم ساڵ دەچین؟) عومەر دەڵێت وتم: نا، فەرمووی (دەی تۆ دەچیت بۆ کەعبەو تەواف دەکەیت) ئەوکات چووم بۆلای ئەبوبەکر (رضي الله عنه)و وتم: ئەبوبەکر مەگەر موحەمەد نێردراوی خوا نیە؟ وتی: با، وتم: مەگەر ئێمە لەسەر حەق و دوژمنانیشمان ناحەق نین؟ وتی: با، وتم: ئەی ئیتر بۆچی سازش لەسەر ئایینەکەمان بکەین؟ وتی: ئەرێ کابرا ئەوە پێغەمبەری خوایەو لە فەرمانی پەروەردگاری لانادات و خوا سەری دەخات دەی گوێڕایەڵی بەو لێی لا مەدە، چونکە سوێند بەخوا ڕاست دەکات، وتم: مەگەر ئەو نەیدەوت دێین بۆ کەعبەو تەواف دەکەین؟ ئەبوبەکر وتی: با، مەگەر پێی وتیت ئەمساڵ دەچیت؟ وتم: نا، وتی: دەی دەچیت بۆ کەعبەو تەواف دەکەیت،عومەر وتی: بۆیە زانیم ئەمە شتێکەو وایە، کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەنامە نووسینەکە بوویەوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە هاوەڵانی فەموو (قوموا فانحروا ثم احلقوا) واتە(هەستن قوربانیەکانتان سەربڕن، دوایی سەرتان بتاشن) سوێند بەخوا کەسیان نەیانکرد، سێ جار پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

وتیەوەو نەیانکرد، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) چوو بۆلای ئوم سەلەمە (رضي الله عنها)و بۆی باسکرد کە هاوەڵان چییان کردووە، ئەویش وتی ئەی پێغەمبەری خوا حەزدەکەیت ئەوە بکەین؟ بڕۆ بە هیچ کامیان مەڵێ تا خۆت قوربانیەکەت سەردەبڕیت و سەرت چاك دەکەیت، ئەمیش چوو ئەوەی کرد، قوربانیەکەی سەر بڕی و کەسێکی بانگ کرد سەری چاك کرد، کەئەمیان بینی ئەوانیش لێنەوین و قوربانیەکانیان سەربڕین و کەوتنە تاشینی سەری یەکتری خەریك بوو زیانیان بەیەك دەگەیاند، پاشان ئافرەتانێکی باوەڕدار هاتن و خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند (یا الیها الذین امنوا اذا جائکم المؤمنات مهاجرات فامتحنوهن) تا دەگاتە (بعصم الکوافر) ئەو ڕۆژە عومەر دووئافرەتی بێباوەڕی تەڵاقداو موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان یەکێکیانی هێناو صەفوانی کوڕی ئومەویش ئەوی دیکەی هێنا، پاشان پێغەمبەریش (ﷺ) گەڕایەوە بۆ مەدینەو ئەبوبەسیریش (رضي الله عنه) -یەکێك بوو لە قورەیشیەکان موسڵمان ببوو، هات بۆلای، ئەوانیش دوو کەسیان نارد بە شوێنیدا و وتیان: لەسەر بەڵێنی نێوانمان ئەبوبەسیرمان بدەرەوە دەست، ئەویش دایە دەست دووکەسەکەو بردیان تا گەیشتە زیاحولەیفەو لەوێ دابەزین تا بڕێك خورما بخۆن کە پێیان بوو، ئەبوبەسیر بە یەکێکیانی وت: سوێند بەخوا شمشێرەکەی ئەو باشترە، ئەویش ڕایکێشاو وتی: ئەرێ وەڵلا وایە، پێی ڕاهاتووم، ئەبوبەشیریش وتی ئادەی با سەیری بکەم، ئەویش دایە دەستی، ئەبوبەسیریش لێیدا تا خستی و ئەوی تریش ڕایکردو هاتەوە بۆ مەدینەو چوویە مزگەوت، پێغەمبەر (ﷺ) کە بینی فەمووی (لقد رای هذا ذعرا) واتە(بەخوا بە ترساوی دەیبینم) کاتێك هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) وتی: بەخوا هاوڕێکەمی کوشت و منیش دەکوژرام، ئەبوبەسیر هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا سوێند بەخوا زیممەی خۆتت بەجێ هێناو گێڕامتەوە بۆیان، خوای گەورەش ڕزگاری کردم لە دەستیان، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ویل امه مسعرحوب، لوکان لە احد) ئەبوبەسیر کە ئەمەی بیست زانی دەیگێڕێتەوە بۆیان، بۆیە چوو تا لە کەناراوی دەریا دابەزی،

ئەبو جەندەلی کوڕی سوهەیلی کوڕی عەمریش (رضي الله عنه) لە دەستیان ڕایکردو چوو بۆلای ئەبوبەسیر، ئیتر هەرقورەیشیەك موسوڵمان بوایە دەچوو بۆلای ئەبوبەسیر تا بوون بە کۆمەڵێك، سوێند بەخوا بیان بیستایە هەرکاروانێکی قورەیش دەچێت بۆ شام ڕێیان پێ دەگرت و دەیانکوشتن و ماڵ و سامانیان دەبردن، قورەیش ناردیان بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و سکاڵایان لاکرد لەبەر خواو خزمایەتی هەرکەس هات بۆلای پارێزراوە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) ناردی بە شوێنیاندا، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند (و هو الذي كف ايديهم عنكم و ايدكم عنهم ببطن مكة من بعد ان اطفركم عليهم) تا (الحمية حمية الجاهلية) ئەو گوڕو تینەشیان ئەوە بوو کە دانیان بەوەدا نەدەنا موحەمەد (صلى الله عليه وسلم) پێغەمبەری خوایەو بە (بسم الله الرحمن الرحيم) ڕازی نەدەبوون و نەیانهێشت بچن بۆ کەعبە.[1]

ئیبن عەساکیرو ئیبن شەیبە لە عورووەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی لەسەر دابەزینی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە حودەیبیە دەڵێت: قورەیش کە ئەوەیان بیس ترسان و پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) حەزی کرد یەکێك لە هاوەڵانی خۆی بنێرێت بۆلایان، بۆیە عومەری کوڕی خەتابی (رضي الله عنه) بانگکرد تا بینێرێت بۆلایان، ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) من لایان بێزراوم و هیچ کەس لە مەککە لە بەنی کەعب نین ئەگەر ئازاریان دام لەسەرم بێنە جواب، عوسمان بنێرە چونکە خێڵەکەی لەوێن و ئەوەی دەتەوێت دەیگەیەنێت، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) عوسمانی کوڕی عەففانی بانگکردو ناردی بۆلای قورەیش و فەرمووی پێیان بڵێ ئێمەش بۆ شەڕ نەهاتووین، بەڵکو بۆ عەمرە هاتووین، بانگیان بکە بۆ ئیسلام، فەرمانیشی پێکرد تا باوەڕدارانێکی ناو مەککە ببینێت و موژدەی فەتحیان پێ بدات و بڵێت خوای گەورە

---

[1]- ئیبن کەسیر لە البداية والنهاية ج٤ ص ١٧٧ دا دەڵێت: ئەم دەقە زیادەو سودێکی باشی هەیە کە لە گێڕانەوەی ئیبن ئیسحاق لە زوهریەوە نیە. بەیهەقی ج٩ ص ٢١٨ بە دوورو درێژی هێناویەتی.

بەم زوانە ئاینی خۆی لە مەککە سەردەخات تا ئەوەی بە ئاشکرا ئیمان تیایدا دەچەسپێت، عوسمانیش چوو تا دای بەلای قورەیشدا لە (بەلدەح)، قورەیش وتیان بۆ کوێ دەچیت؟ وتی: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناردوومی بۆ لاتان تا بانگتان بکەم بۆلای خوای گەورەو ئیسلامو پێتان بڵێم ئێمە بۆ شەڕ لەگەڵ کەسدا نەهاتووینو بۆ عەمرە هاتووین، عوسمانیش هەمان شتی جێ بەجێکرد، وتیان بیستمان چی دەڵێن، ئیستا ئیشەکەت بڵێ، ئیبانی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص لەبەری هەستاو پێشوازی لێکردو لە ئەسپەکەی خۆی دابەزیو عوسمانی سوارکردو پەنای داو بردی تا هاتە مەککە. پاشان قورەیش ئیبن وەرقای خوزاعیو برای بەنی کینانەیان نارد، پاشان عروەی کوڕی مەسعودی ثەقەفی هات[1].[2]

ئیبن سەعد لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتاب (رضي الله عنه) دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەسەر ڕێککەوتنێك لەگەڵ خەڵکی مەککە ڕێککەوتو شتێکی پێدان، ئەگەر پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەویرێکی لەسەر دابنامایەو ئەوەی بکردایە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کردی گوێڕایەڵی نەدەبووم، لە بەشێکی ڕێککەوتنەکەدا دەڵێت هەریەك لە بێباوەڕان هاتە ناو موسوڵمانان دەبێت بیگەڕێننەوە، ئەگەر لە موسڵمانان چوو بۆلای بێباوەڕان نایگێڕنەوە، لە کنزالعمال ج٥ ص٢٨٦ هاتووەو سەنەدەکەی بە صەحیح داناوە.

ئیبن عەساکیر لە واقیدیەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبوبەکری صدیق (رضي الله عنه) دەڵێت: هیچ فەتحێك لە ئیسلامدا لە فەتحی حودەیبیە گەورەتر نەبوو، بەڵام خەڵکی ئەو ڕۆژە ڕایان نەبوو لەسەر ئەوەی لە نێوان موحەمەدو نێردراوەکەیدا هەبوو،

---

[1] – ضعیف.

[2] –لە کنز العمال ج٥ ص٢٨٨ دا هاتووە، هەروەها ئیبن ئەبی شەیبە لەلایەکی ترەوە بە دوورو درێژی لە عروەوە هێناویەتی، لە کنز العمال ج٥ ص٢٩٠ یشدا هاتووە، بەیهەقی ج٩ ص٢٢١ لە موسای کوڕی عوقبەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی.

بەندەکان پەلە دەکەن‌و خواش وەك بەندەکان نیە پەلە ناکات تا بارەکە دەگاتە کاتی خۆی‌و ئەوەی خوا دەیەوێت، سەیری سوهیلی کوڕی عەمرم کرد لە حەجی ماڵئاواییدا وەستابوو خۆی لە جەستەی پێغەمبەر (عليه السلام) نزیك دەکردەوەو قوربانیەکەی دەبردە بەردەستی پێغەمبەر (عليه السلام) ئەویش بەدەستی خۆی سەری بڕی‌و سەرتاشی بانگ کردو سەری تاشی، سەیری سوهەیلم دەکرد موەکانی پێغەمبەری (عليه السلام) دەگرتەوەو دەیخستنە سەر چاوانی، ئەوکات ئەو ڕۆژەی حودەیبیەم بیرکەوتەوە کە ئامادە نەبوو بنووسرێت (بسم الله الرحمن الرحيم) و (محمد رسول الله) ئەوکات سوپاسی خوام کرد کە ڕێنموونی کرد بۆ ئیسلام[1][2].

## (چیرۆکی موسڵمان بوونی عەمری کوڕی عاص (رضي الله عنه))

ئیبن ئیسحاق لە عەمری کوڕی عاصەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك لە ڕۆژی ئەحزاب لە خەندەقەکە پاشەکشەمان کرد کۆمەڵێك لە پیاوانی قورەیشم کۆکردەوە کە هاوڕاو گوێگرم بوون پێم وتن: دەزانن سوێند بەخوا وای دەبینم موحەمەد زۆر بە خراپی سەردەکەوێت، من ڕایەکم هەیە ئێوە چی دەڵێن؟ وتیان ڕات چیە؟ وتم: بچن بۆلای نەجاشی‌و لای ئەو بین، ئەگەر موحەمەد بەسەرماندا سەرکەوت لای نەجاشی دەبین، ئەگەریش هۆزو کەسمان سەرکەوتن ئێمە دەناسن‌و تەنها چاکەمان لێ دەبینن، ئەوانیش وتیان ڕایەکی جوانە، منیش وتم دەی شتێك کۆبکەنەوە با بە دیاری بۆی ببەین، ئەوەی ئەو زۆر حەزی پێیەتی بۆی ببەین کەرەیە، ئێمەش بڕێکی زۆرمان بۆ کۆکردەوە، ئینجا چووین بۆلای، سوێند بەخوا لەلای بووین کە عەمری کوڕی ئومەیەی زومەری(رضي الله عنه) هات بۆلای، پێغەمبەر (عليه السلام) سەبارەت بە جەعفەرو هاوەڵانی ناردبووی بۆلای، چوویە ژوورەوە بۆلای‌و دوایی

---

[1] - ضعيف.

[2] - كنز العمال ج٥ ص٢٨٧.

هاتە دەرەوە، منیش بە هاوەڵەکانم وت: ئەوە عەمری کوڕی ئومەیەیە ئەگەر بچم بۆلای نەجاشیو داوای بکەم بماندات دەستو بماندات دەدەم لە ملی، ئەگەر ئەوە بکەم قورەیش وادەزانن بە کوشتنی نێردراوی موحەمەد پاداشتم داونەتەوە، بۆیە چوومە ژوورەوە بۆلایو سوجدەم بۆ برد وەك جاران، ئەویش وتی: مەرحەبا لە هاوڕێکەم، لە وڵاتی خۆتەوە هیچت بۆ هێناوم؟ وتم: بەڵێ ئەی پاشا بڕێکی زۆر کەرەمان بۆ هێناویت، پاشان بۆم بردو ئەویش پێی سەرسام بوو و حەزی پێ کرد، پاشان وتم: ئەی پاشا من کەسێکم دی لەلات چوو، ئەوە نێردراوی کەسێکی دوژمنمانە، دەی بیدە بە من تا بیکوژم چونکە زۆرێك لە پیاو ماقوڵانی ئێمەی کوشتووە، ئەویش تووڕە بوو، پاشان دەستی درێژ کردو دای لە لووتم وامزانی شکاندی، ئەگەر زەوی شەقی ببردایە لە ترسا دەچووم بەناویدا، پاشان وتی ئەی پاشا سوێند بە خوا وای دەبینم ڕقت بوو لەو داواکاریەم، ئەویش وتی: داوام لێ دەکەیت نێردراوی کەسێکت بدەمە دەست کە ناموسی گەورە (جوبریل) هاتووە بۆلای، ئەوەی کە هات بۆلای موسا، ئینجا نێردراوی ئەو پیاوەت بدەمە دەست بیکوژیت؟ منیش وتم: ئەی پاشا وای لێهات؟ وتی: قوڕت بەسەر عەمر بە گوێم بکەو شوێنی بکەوە، چونکە سوێند بەخوا لەسەر هەقەو بەسەریاندا سەردەکەوێت چۆن موسای کوڕی عیمران بەسەر فیرعەونو سەربازەکانیدا سەرکەوت، منیش وتم: لەسەر ئیسلام بەیعەتی منی بۆ وەردەگریت؟ وتی: بەڵێ، ئینجا دەستی کردەوەو منیش بەیعەتی ئیسلامم پێدا، دوایی چووم بۆلای هاوڕێکانمو لەسەر باری جاران چووم بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گەیشتم بە خالیدی کوڕی وەلید، ئەمەش کەمێك پێش فەتحی مەککە بوو، خالید لە مەککەوە هاتبوو، وتم ئەبوو سولەیمان بۆ کوێ دەچیت؟ وتی: من تێر بوومو بەسە، ئەو کابرا پێغەمبەرەو دەچم موسوڵمان بم،ئیتر تاکەی؟ منیش وتم: دەی بەخوا منیش هەر بۆ ئەوە هاتووم، ئینجا بەرەو مەدینە چووین خالیدی کوڕی وەلید پێش کەوتو بەیعەتیدا و موسڵمان بوو، منیش نزیك بوومەوەو وتم: لەسەر لێخۆشبوونی تاوانی پێشترم بەیعەتت پێ دەدەم، باسی

تاوانی دواترم نەخستە ناوی، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی ئەی عەمر (بایع فان الاسلام یجب ما کان قبله، وان الهجرة تجب ماکان قبلها) واتە(بەیعەت بدە، چونکە ئیسلام پێش خۆی دەسڕێتەوەو کۆچیش پێش خۆی دەسڕێتەوە) منیش بەیعەتم پێدا، پاشان چووم[1] [2].

بەیهەقیش لە ڕێگەی واقیدیەوە بە فراوانترو باشتر هێناویەتی، تیایدا هاتووە: پاشان چووم تا گەیشتمە (هدە) لەوێ دووکەس کەمێك پێشم کەوتبوون دەیانەویست دابەزن، یەکێکیان لە چادرێکدا بوو، ئەویش دوو وڵاخی گرتبوو، سەیرم کرد خالیدی کوڕی وەلیدە، وتم: چی دەکەیت لێرەدا؟ وتی: بۆلای موحەمەد دەچم، خەڵکی چوونەتە ناو ئیسلامو تەنها چاوچنۆکەکان ماون، سوێند بەخوا ئەگەر وابڕوات ملمان دەگرێت وەك چۆن ملی کەمتیاردەگرن، منیش وتم: دەی بەخوا منیش دەمەوێت بچم بۆلای موحەمەدو موسڵمان بم، عوسمانی کوڕی تەلحەش (رضي الله عنه) هاتە دەرەوەو بەخێرهاتنی کردمو هەموو دابەزین، دوایی ڕێککەوتین تا چووینە مەدینە، قسەی ئەو پیاوەم بیرناچێت کە لە بیری ئەبوعوتبە پێی گەیشتین هاواری دەکرد، ئەی ڕەباح ئەی ڕەباح، ئێمەش بە قسەکەی گەشاینەوەو چووین، پاشان سەیری کردین، گوێم لێ بوو دەیوت: مەککە دوای ئەم دووانە چی دەمێنێت، وام دەزانی مەبەستی منو خالیدی کوڕی وەلیدە، پاشان خێرا بەرەو مزگەوت چوو، وامدەزانی مژدە بە پێغەمبەر (ﷺ) دەدات کە هاتووین، هەروایش بوو، جلی ڕێكو پێکمان پۆشیو بانگی عەسر دراو بەرەو ڕووی چووین، ڕووخساری زیکری دەکردو موسڵمانانیش لە دەوری بوون بە موسڵمان بوونمان دڵخۆش بوون، خالیدی کوڕی وەلید پێشکەوتو بەیعەتی دا، پاشان

---

[1] - حسن.

[2] - لە البدایة والنهایة ج٤ ص١٤٢ دا واهاتووە، ئەحمەدو تەبەرانیش لە عەمرەوە بەوجۆرە بەدوورو درێژی هێناویانە، هەیسەمی ج٩ ص٣٥١ دەڵێت: کەسانی سەنەدەکەی صەحیحن،

عوسمانی کوڕی تەلحە چوو و بەیعەتی دا، پاشان منیش چووم و سوێند بەخوا هەرکە لەبەردەمیدا دانیشتم لەتاو شەرمدا نەمدەتوانی سەرم بەرزبکەمەوە، بەیعەتم پێدا لەسەر ئەوەی لە تاوانی ڕابردووم خۆش بێت و باسی داهاتووم نەکرد، ئەویش فەرمووی ئیسلام و کۆچکردن پێش خۆیان دەسڕنەوە، سوێند بەخوا لەو کاتەوەی موسوڵمان بووین پێغەمبەر (ﷺ) لە کارێکدا کە دەهاتە ڕێی من و خالیدی نەدەخستە دوای هاوەڵانی[1][2].

## (چیرۆکی موسوڵمان بوونی خالیدی کوڕی وەلید (رضي الله عنه))

واقدی لە خالیدەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێک خوای گەورە چاکەی بۆ ویستم ئیسلامی خستەدڵمەوە و تێگەیشتووی کردم، وتم: من لە هەموو ئەو شەڕانەی دژ بە موحەمەددا بەشداریم کرد، لە هەر جارێکیان کە دەمدی و دەگەڕامەوە لە دەروونمدا دەموت من دەستم داوەتە کارێکی هیچ و موحەمەدیش سەردەکەوێت، کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) چوو بۆ حودەیبیە، بە دەستەیەکی بێباوەڕانەوە چووم و لە عوسفان گەیشتم بە پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی و کەوتمە ئازاردانی و ڕێ لێ گرتنی، ئەویش لەبەردەمماندا نوێژی نیوەڕۆی بۆ هاوەڵان کرد، ئێمەش وتمان با بدەین بەسەریدا، دوایی لەو بڕیارە سارد بووینەوە- خێریشی تێدا بوو- بەوە ئەو نیازەمان نەما، پاشان بە شێوەی نوێژی ترس نوێژی عەسری بۆ هاوەڵان کرد،، ئەمە کاری تێکردین و وتم کابرا ڕێی لێ گیراوە، بۆیە کەناری گرت و لە ڕێی سوارەکانی ئێمە لایداو بەرەو ڕاست چوو، کاتێک لە حودەیبیە لەگەڵ قورەیشدا ڕێککەوتنی بەست ئیتر وتم چی ماوە؟بۆ کوێ بچم؟ بۆلای نەجاشی کەوتووەتە شوێن موحەمەدو هاوەڵانیشی لای ئەو پارێزراون، بچم بۆلای هیرقل

---

[1] - ضعيف.

[2] - له البداية والنهاية ج٤ ص٢٣٧ دا واهاتووه.

دەبێت واز لە ئایینی خۆم بێنم و ببم بە مەسیحی و جوولەکەو لەناو بێگانەشدا دابنیشم، جا بەوەوە ماوەتەوە لە ماڵی خۆمدا دابنیشم باشترە، بەو جۆرە بووم تا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە (عمر القضاء) دا هاتەوە مەککە، من لەوێ ئامادە نەبووم و هاتنە ناو مەککەیم نەبینی، وەلیدی کوڕی وەلیدی برام لەگەڵ ئەوانەدا بوو کە لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هاتنە مەککە، گەڕا بەدوامدا بەڵام نەیدۆزیمەوە، بۆیە نامەیەکی بۆ نووسیم، تیایدا هاتبوو:

به ناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

(پاشان تەواو سەرم سوڕدەمێنێت چۆن ڕات لەسەر ئیسلام نیەو عەقڵت وات پێ دەڵێت، چۆن دەبێت کەس لە ئیسلام بێئاگابێت؟ پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لەسەر تۆ پرسیاری لێ کردم و فەرمووی خالید لە کوێیە؟ منیش وتم: خوا بە موسڵمانی دەیهێنێت بۆلات، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (مثله جهل الاسلام، ولوكان جعل نكايته وجده مع المسلمين كان خيرا له ولقد مناه على غيره) واتە (کەسی وا لە ئیسلام بێئاگابووە، ئەگەر ئەو هەوڵ و کارەی بۆ ئیسلام و لەگەڵ موسوڵماناندا بەکار بهێنایە بۆی چاکتربوو و بە دڵنیاییشەوە بەسەر کەسانی دیکەدا پێشمان دەخست)، دەی براکەم تا دەرفەتی خێر ماوە فریام کەوە).

کاتێک نامەکەم بۆ هات بە پەلە بڕیاری چوونم داو زیاتر حەزی چوونە ناو ئیسلامم پەیدا کرد، زۆر دڵخۆش بووم کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پرسیاری لێکردم، لە خەومدا وام بینی لە وڵاتێکی بەرتەسک و وشک و ڕووتەندا بووم چووم بەرەو وڵاتێکی سەوزایی بەرفراوان، وتم: بە دڵنیاییەوە ئەم خەوە ڕاستە، کاتێک چووم بۆ مەدینە باسی دەکەم بۆ ئەبوبەکر (رضي الله عنه) ئەویش وتی: هاتنە ناو ئسیلام کە خوای گەورە ڕێنموونی کردیت، ئەو بەرتەسکیەش کە لەکاتی بێباوەڕیدا لەسەری بوویت وانەما.

کاتێک خۆم کۆکردەوە تا بچم بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وتم: لەگەڵ کێدا بچم بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)؟ گەیشتم بە صەفوانی کوڕی ئومەیەو پێم وت: ئەی ئەبو وەهب

چۆن سەیری باری خۆمان دەکەیت؟ وەك نیشتووی بنمان لێ هاتووەو مەحەمەدیش سەرکەوتووە بەسەر عەرەب و عەجەمدا، دێیت بچین بۆلای موحەمەدو شوێنی بکەوین چونکە گەورەیی موحەمەد بۆ ئێمەش گەورەییە، بەڵام ئەو زۆر بە توندی ناڕەزایی دەربڕی و وتی: ئەگەر تەنها خۆشم بمێنمەوە شوێنی ناکەوم، ئینجا لە یەك جیا بووینەوە، وتم: ئەم کابرا لە بەدر براکەی و باوکی کوژراون بۆیە وادەڵێت، ئینجا چووم بۆلای عەکرەمەی کوڕی ئەبوجەهل و چیم بە صەفوان وت بە ئەویشم وت، ئەویش هەمان وەڵامی صەفوانی هەبوو، منیش وتم: دەی لای کەس باسی مەکە، ئەویش وتی: باسی ناکەم.

ئینجا چوومە ماڵەوەو وتم سوارەکەم بۆ ئامادە بکەن، ئینجا کەوتمە ڕێ تا گەیشتم بە عوسمانی کوڕی تەلحەو وتم: ئەمە هاوڕێمە، بەڵکو بەمیش بڵێم، دوایی بیرم کردەوە باوك و کەسی کوژراوە، وتم پێی ناڵێم، دواتر وتم: تەنها هێندەم لەسەرە ئێستا بچم ئیتر چی دەبێت با ببێت، بۆیە هەمووم بۆ باسکردو وتم: من وەك ڕێوی ناو کون وام، ئەگەر سەتڵێ ئاوی تێبکەیت دێتەدەرەوە، چیم بەو دوانەکەی تر وت ئەویش خێرا ڕازی بوو، پێم وت: من ئەمڕۆم داناوەو دەمەوێت بچم، وا وڵاخەکەشم بۆ ئەوە ئامادە کردووە، لەسەر شوێنی (یەئجوج) وەعدمان بە یەکتردا ئەگەر ئەو پێشکەوت چاوەڕێم بکات، ئەگەریش من پێشکەوتم چاوەڕێی دەکەم.

بەرەبەیان بوو کەوتینەڕێ و خۆرهەڵنەهات تا گەیشتینە یەئجوج، چووین تا گەیشتینە (الهدە) لەوێ عەمری کوڕی عاصمان بینی، سەلامی لێ کردین و ئێمەش وەڵاممان دایەوە، وتی: بۆ کوێ دەچن؟ وتمان: ئەی تۆ بۆ کوێ دەچیت؟ وتی: ئەی ئێوە بۆ کوێ دەچن؟ وتمان: دەچین تا موسڵمان بین و بکەوینە شوێن موحەمەد (ﷺ) ئەویش وتی: دەی منیش هەربۆ ئەوە هاتووم، ئینجا پێکەوە چووین تا گەیشتینە مەدینەو لە کانەرەوە وڵاخەکانمان بەستنەوە هەواڵ گەیەنرا بە پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش پێمان دڵخۆش بوو، جلی چاکم پۆشی و دواتر چووم بەرەو لای

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، براکەمم پێگەیشت و وتی: زووکە وا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەواڵی هاتنی تۆی داوەو بە هاتنت خۆش حاڵ بووەو چاوەڕێت دەکات، ئێمەش خێرا چووین و گەیشتمە خزمەتی سەیر دەکەم زەردەخەنەم بۆ دەکات تا لە بەردەمیدا وەستام و سەلامی پێغەمبەرایەتیم لێ کردو ئەویش بە ڕوویەکی کراوەو گەشەوە وەڵامی دامەوە، وتم: شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواوو تۆش پێغەمبەری خوایت، فەرمووی وەرە، پاشان فەرمووی (الحمد الله الذي هادك، قد كنت ارى لك عقلا رجوت ان لاسلمك الا الى خير) واتە(سوپاس بۆ خوا کە ڕێنموونی کردیت، عاقڵیەکم لێ بەدی کردیت هیوام خواست تەنها بەرەوچاکەت ببات)، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا من هەمیشە دژ بە هەق لێنەویوم دەی لای خوا نزام بۆ بکە تا لێم خۆش بێت، ئەویش فەرمووی (ئیسلام پێش خۆیی دەسڕێتەوە) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا دەی نزام بۆ بکە، فەرمووی (اللهم اغفر لخاليد بن الوليد كلما اوضع فيه من صد عن سبيل الله)واتە(خوا لەهەر کارێکی خالیدی کوڕی وەلید خۆش ببە کە مایەی ڕێگرتن لە پەیامی خوا بووە).[1]

خالید دەڵێت: عوسمان و عەمریش (رضي الله عنه) هاتن و بەیعەتیان دا بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئەمم هاتنەشمان لە مانگی صەفەری ساڵی هەشتدا بوو، سوێند بەخوا دوای ئەوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێش هەموو هاوەڵانی دەخستم.[2]

---

[1] - ضعيف.

[2]- لە البدايە والنهايە ج٣ ص٢٣٨ دا واهاتوە، ئیبن عەساکیریش بەو جۆرە بە دوورو درێژی هێناویەتی، لە کنز العمال ج٧ ص٣٠ دا هاتووە.

# (چیرۆکی فەتحی مەککە خوا شەرەفمەندتری بکات)

تەبەرانی لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پاشان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چوو ئەبوروغمی کوڕی کەلسومی کوڕی حوسەین غەففاری (رضي الله عنه) لەسەر مەدینە داناو لە دەی ڕەمەزاندا کەتەوڕێ، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕۆژووی گرت و هاوەڵانیش وەك ئەویان کرد تا گەیشتینە کەدید (ئاوێکە لە نێوان عوسفان و ئومج) لەوێ ڕۆژووی شکاند و دواتر چوو تا لە (مر الظهران) بە دەهەزار موسڵمانەوە دابەزی، لەگەڵ هەزار کەسی موزەینەو سولەیمدا لەناو هەموو هۆزەکاندا چەك و پێداویستی هەبوو، هەروەها کۆچەران و پشتیوانانیش لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دا هاتن و کەسیان دوا نەکەوت کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە مر الظهراندا دابەزی قورەیش بێئاگابوون و هیچ هەواڵێکیان لەسەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ نەچوو بوو وە نەیان دەزانی چی دەکات، لەو شەوەدا ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب و حەکیمی کوڕی حیسام و ئیبن وەرقا چوونە دەرەوەو بۆ هەواڵ دەگەڕان تا بزانن هیچ دەبیستن، عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیبیش (رضي الله عنه) لە نیوەی ڕێدا گەیشت بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەبوسوفسیانی کوڕی کارشی کوڕی عەبدولموتەلیب و عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئومەیەی کوڕی موغەیرەش لە نێوان مەککەو مەدینەدا گەیشتن بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و داوایان کرد ببینن، ئوم سەلیمیش ئەوەی بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وت، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئامۆزاو پورزاو کەسەکەت هاتوون، فەرمووی (لا حاج لی بهما اما ابن عمی فهد عرضي بمكه، واما ابن عمتی و صهری فهو الذي قال لی بمكه ما قال)واتە(هیچ ئیشێکم پێیان نیە ئامۆزاکەم ئەوەبوو کە لە مەککەدا دای لە ئابڕووم، پورزاکەیشم ئەوەبوو لە مەککەدا ئەوەی پێوتم کە وتی) کاتێك ئەوەی پێوت – لەگەڵ ئەبوسوفیاندا کوڕێکی هاتبوو– وتی: سوێند بەخوا یان مۆڵەتم دەدەن یان دەستی ئەم کوڕەم دەگرم و دەچین تا لە برسیەتی و تینوویەتیدا دەمرین، کاتێك

پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەی بیست دڵی بۆیان سوتا و مۆڵەتی پێدان و هاتن و موسڵمان بوون.

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) لە مر الظهران دابەزی عەبباس وتی: قوڕ بەسەرتان قورەیش، چ بەیانیەکی ڕەش، سوێند بەخوا ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) بێتە ناو مەککە پێش ئەوەی داوای پەنای لێ بکەن ئەوا قورەیش بە هەتاهەتایی لەناو دەچێت، دەڵێت لەسەر وڵاخە سپیەکەی پێغەمبەر (ﷺ) و، لەلای چووم تا هاتمە ئەراك، بە عەلیم (رضي الله عنه) وت دەچم بۆلای دارکۆکەرەوە یان کەسێك شیری هەبێت یان پێویستیەکی هەبێت و بچێت بۆ مەککە تا پێیان بڵێم پێغەمبەر (ﷺ) لە کوێیە و پێش ئەوەی لە ناکاودا بچێتە ناوی و داوای پەنای لێبکەن، سوێند بەخوا دەمویست بچم و بۆ ئەوە بگەڕێم کە بۆی چووم تا قسەی ئەبوسوفیان و ئیبن وەرقام بیست کە دەگەڕانەوە و ئەبوسوفیان وتی ئاگرو سەربازگەی وەك ئەمڕۆم نەبینیوە، ئیبن وەرقاش وتی سوێند بەخوا ئەمە ئاگری خوزاعەیە و جەنگ دایگرتووان ئەبوسوفیان وتی: سوێند بەخوا خوزاعە لەوە کەمترە ئەمە ئاگرو سەربازگەی ئەو بێت، منیش دەنگیم ناسیەوە و وتم ئەبوحەنزەلە، ئەویش دەنگی ناسیمەوە و وتی ئەبولفەزل؟ وتم: بەڵێ، وتی چی دەڵێیت بە دایك و باوکمەوە بە قوربانت بم، وتم، قوڕت بەسەر ئەبو سوفیان وا پێغەمبەر (ﷺ) بە خەڵکێکەوە هاتووە، قوڕ بە سەر قورەیش، وتی: ئەی پلان چیە بە دایك و باوکمەوە بە قوربانت بم، وتم: ئەگەر بە سەرتدا زاڵ بێت لە ملت دەدات، دەی زوو لەگەڵمدا سواربە تا بتبەم بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و داوای پەنا بکەم بۆت، ئەویش لە پشتمەوە سوار بوو هاوڕێیەکەیشی گەڕایەوە و منیش بردم، دەماندا بە پاڵ ئاگری هەر دەستەیەکی موسڵماناندا دەیانوت ئەمە کێیە؟ کە وڵاخەکەی پێغەمبەر (ﷺ) یان دەدی دەیانوت مامی پێغەمبەری خوایە، تا دام بە پاڵ ئاگری عومەری کوڕی خەتابدا (رضي الله عنه) وتی ئەوە کێیە؟ هات بۆ لام، کاتێك ئەبو سوفیانی لە پشتەوە دی وتی ئەبو سوفیانی دوژمنی خوا کە بە بێ بەڵێن و پەیمان هێنایتیە ژێر دەستم، پاشان بە

تورەیی‌یەوە چوو بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و منیش سوار بوومەوە و پێشی کەوتم و هاتم بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و عومەریش هات و وتی: ئەی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) خوا ئەوە ئەبو سوفیانە خوا بە بێ بەڵێن و پەیمان هێناویەتە بەردەست دەی ڕێم پێبدە با بدەم لە ملی، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) من پەنام داوە، پاشان لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دانیشتم و وتم: نە بەخوا ئەم شەو جگە لە من کەس ڕزگاری ناکات، کە عومەر زۆر لەسەری چوو وتم: عومەر کەمێك لەسەر خۆبە، سوێند بە خوا ئەگەر لە بەنی عەدی کوڕی کەعب بوایە وات نەدەووت، بەڵام دەزانیت لە بەنی عەبد مەنافە بۆیە وا دەڵێیت، ئەویش وتی لەسەر خۆبە عەباس، سوێند بە خوا ئەو ڕۆژەی موسڵمان بویت هێندە پێخۆشحاڵ بووم وەك ئەوەی باوکم موسڵمان بووبێت، ئەمەش تەنها لەبەر ئەوەی دەمزانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) موسڵمان بوونی تۆی لا خۆشەویست ترە تا موسڵمان بوونی خەتتاب، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (إذهب به الى رحلك یا عباس، فاذا أصبحت فاتني به) واتە(بیبەرەوە بۆ لای خۆت، بەیانی بیهێنەرەوە بۆ لام) منیش بردم و لام مایەوە و بەیانی بردمەوە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بینی فەرمووی: (ویحك یا ابا سفیان الم یان لك ان تشهد ان لا اله الا الله)واتە(قوڕت بەسەر ئەبو سوفیان ئیتر کاتی ئەوە نەهاتووە شایەتی بدەیت هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خوا) وتی: بە دایك و باوکمەوە بەقوربانت بم چەندە نەرم و نیان و بەڕێز و خاوەن خزمایەتیت تا ئەوەی پێم وایە ئەگەر جگە لە خوا کەسی تریش(خوای تریش) هەبێت ئیشم پێی نیە، فەرمووی: (قوڕت بەسەر ئەبو سوفیان ئایا ئیتر کاتی ئەوە نەهاتووە بزانیت کە من پێغەمبەری خوام؟) وتی: بە دایك و باوکمەوە بە قوربانت بم، چەندە نەرم و نیان و بەڕێز و خاوەن خزمایەتیت، سوێند بە خوا تا ئێستا لە دەروونندا شتێکی وا هەبوو، عەبباس (رضي الله عنه) وتی: ئەبو سوفیان هاوار بۆت موسڵمان بە و شایەتی بدە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواو موحەمەدیش پێغەمبەری خوایە و پێش ئەوەی بدات لە ملی، ئەویش شایەتی حەقی هێنا و موسڵمان بوون، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا

ئەبو سوفیان حەزی بە گەورەییە دەی شتێکی بۆ بکە، ئەویش فەرمووی(بەڵێ هەرکەس بچێتە ماڵی ئەبو سوفیان پارێزراوە و هەرکەس دەرگای ماڵی دابخات پارێزراوە، هەرکەس بچێتە مزگەوت (کەعبە) پارێزراوە) کاتێك چوو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (یا عباس احبسه بالوادي عنده ختط الجبل حتی تمر به جنود الله فیراها) واتە(عەبباس لە دۆڵ لای بەرزی شاخەکەوە ڕایوەستێنە تا سەربازانی خوا بدەن بە پاڵیدا و بیان بینێت). منیش بردم و فەرمانی پێغەمبەری خوام بەجێ گەیاند، هەرکە هۆزێك بە ئاڵاکەیەوە دەیدا بە پاڵیدا دەیووت عەبباس ئەمانە کێن؟ وتم: بەنی سولەیم، وتی سەیریان بکە، پاشان هۆزێکی تر دەهات و دەیووت ئەمانە کێن؟ وتم: موزەینە، وتی: سەیریان بکە، تا ئەوەی هەموویان تێپەڕین و هەردەیووت ئەمانە کێن؟ منیش دەمووت فلانە کەس، تا ئەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە ئاڵای سەوزەوە بە پشتیوانان و کۆچەرانەوە تێپەڕبوو تەنها سەرنجدانیان لێ دەبینرا، وتی سوبحانەڵا ئەمانە کێن؟ عەباس وتی: ئەمە پێغەمبەری خوایە بە کۆچەر و پشتیوانانەوە، وتی: ئەمانە سەر و خواریان نیە و کەس دەرەقەتیان نایەت، ئەبولفەزڵ دەسەڵاتی برازاکەت زۆر گەورەیە، وتم: ئەبو سوفیان ئەوە پێغەمبەرایەتیە، وتی: ئەرێ دەی، وتم: بڕۆرەوە بۆ لای هۆزەکەت، ئەویش چوو تا بەوپەڕی دەنگیەوە هاواری دەکرد ئەی قورەیش وا موحەممەد بە سوپایەکی بێ شوومارەوە هاتن بۆتان، هەرکەس بچێنە ناو ماڵی ئەبوسوفیان پارێزراوە، هیندی کچی عوتبەش کە هاوسەری بوو سمێڵی گرت و وتی: قوڕتان بەسەر ئەم کابرا بەم قسانە لە خشتەتان نەبات، وتیان: قوڕت بەسەر ماڵی تۆ بۆچی؟ وتی: دەی هەرکەس دەرگای ماڵی خۆی دابخات پارێزراوە هەرکەسیش بچێتە مزگەوتەوە پارێزراوە، خەڵکیش چوونەوە بەرەو ماڵ و مزگەوت.[1] لە کنز العمال ج٥ ص٢٩٥

[1]- هەیسەمی ج٦ ص١٦٧ دەڵێت: تەبەرانی گێڕاویەتەوە و کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن. بەیهەقیش بە دوورو درێژی هێناویەتی، لە البدایة والنهایة ج٩ ص٢٩١ یشدا

یشدا هاتووەو هەمان شتی گێرانەوەی تەبەری هێناوە، لە دەقەکەیدا هاتوە پاشان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو (احسبه بمضيق الوادي الى خطم الجبل حتى تمر به جنود الله فيراها) عەبباس وتی: منیش وامکرد، کاتێك ئەبوسوفیانم لەوێ وەستاند، وتی: بەنی هاشم ناپاکیتان نواند، عەبباس وتی: ئەهلی پێغەمبەرایەتی ناپاکی نانوێنن، بەڵام پێشکەش بێت؟ وتی: دەی هەر ئێستا دەستی پێ بکە، وتم: ئیشێکم پێتە. بڕوام نەدەکرد وابیر بکەیتەوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هاوەڵانی ئامادەکردو سەرکردەکان بە هۆزەکانیانەوەو کەتیبەکانیش بە ئاڵاکانیانەوە چوون. یەکەم کەس کە پێش کەوت خالیدی کوڕی وەلید بوو بە بەنی سولەیمەوە کە هەزار کەس بوون بە ئاڵایەکەوە چوون کە عەباسی کوڕی مرداس هەڵی گرتبوو، ئاڵایەکی دیکەش بە دەستی خەفافی کوڕی نەدبەو ئاڵایەکیش بە حەجاجی کوڕی عەلات هەڵیگرتبوون ئەبوسوفیان وتی: ئەمانە کێن؟ عەبباس وتی: خالیدی کوڕی وەلیدە، وتی: غوڵام، وتم: بەڵێ، کاتێك خالید دای بەپاڵ عەبباسدا کە ئەبوسوفیانیشی لە پاڵدا بوو سێ جار الله اكبريان وتو دواتر چوون، پاشان بە دوایدا زوبەیری کوڕی عەوام هاتو پێنج سەد کۆچەرو خەڵکێکی دی لەگەڵدا بوو بە ئاڵایەکی ڕەشەوە هاتنو هەمان شتیان کرد، ئەبوسوفیان وتی: ئەمە کێیە؟ وتی: زوبەیری کوڕی عەوام، وتی: خوشکەزاکەت؟ وتم: بەڵێ، لە غیفاریشدا دەستەیەکی سێ سەد کەسی هاتنو ئەبوزەری غەفاری ئاڵاکەی هەڵگرتبوو، یان دەڵێن ئیمانی کوڕی ڕەحزە ئاڵاکەی هەڵگرتبوو، ئەوانیش سێ جار الله اكبريان کرد، وتی: ئەمانە کێن ئەبولفەزل؟ وتی: بەنوغەفار، وتی: بەنی غەفار بۆ؟ پاشان ئەسلەمە بە چوار سەد کەسەوە بە دوو ئاڵاوە هاتن یەکێکیان بە دەست بورەیدەی کوڕی حەصیبو ئەوی دیکەش بەدەست ناجیەی کوڕی ئەعجەمەوە بوو، ئەوانیش وایانکردوو و ئەبوسوفیان وتی: ئەبولفەزل ئەمانە کێن؟ وتم: ئەسلەم، وتی: ئەوان بۆ؟ خۆ تا ئێستا تاڵە موویەکیش

---

هاتووە، ئیبن عەساکیریش لە ڕێگەی واقیدی لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی

چیە پەیوەنییان نەبووە لەگەڵمان، عەبباس وتی: ئەوانە دەستەیەکن هاتوونەتە ناو ئیسلام پاشان بەنی کەعبی کوڕی عەمر بە پێنج سەد کەسەوە بە ئاڵایەکەوە هاتن بیشری کوڕی شەیبان هەڵی گرتبوو، وتی ئەمانە کێن؟ وتم: ئەوە کەعبی کوڕی عەمرە، وتی: بەڵێ ئەمانە هاوپەیمانی موحەمەد بوون، ئەوانیش کە هاتن سێ الله اکبریان کرد، پاشان موزەینە بە هەزار کەس و بە سێ ئاڵاوە هاتن و سەد سواریشیان هەبوون نەعمانی کوڕی موقەرین و بیلالی کوڕی حارس و عەبدوڵلای کوڕی عەمر ئاڵاکانیان هەڵگرتبوو، ئەوانیش کە هاتن سێ الله اکبریان کرد، وتی: ئەمانە کێن؟ وتم: موزەینە، وتی: خۆ دەنگیان گوێی کەڕ دەکرد، پاشان جوهەینە بە هەشت سەد کەسەوە لەگەڵ سەرکردەکەیاندا بە چوار ئاڵاوە هاتن، ئاڵایەکیان بە ئەبوزەرعە مەعبەدی کوڕی خالیدو یەکێکیان بە سوەیدی کوڕی صەخرو یەکێکیان بە ڕافعی کوڕی مەکیس و یەکێکیان بە عەبدوڵلای کوڕی بەدر بوو، ئەوانیش سێ الله اکبریان وت، پاشان کینانە و بەنولویس و زەمرەو سەعدی کوڕی وائیل بە دوو سەد کەسەوە هاتن و ئەبو واقدیدی لەیسی ئاڵاکەی هەڵگرتبوو، ئەوانیش وایان کرد، وتی ئەمانە کێن؟ وتم: بەنی بەکر، وتی: بەڵێ، سوێند بە خوا شوومن، بەهۆی ئەمانەوە موحەمەد لەگەڵمان بەشەڕ هات، سوێند بەخوا لەسەری ڕاوێژم پێ نەکراوەو نەمزانیوەو کاتێکیش بیستم حەزم نەکرد، بەڵام تازە هەڵگیرسا بوو، عەبباس وتی: خوا لە شەڕی موحەمەددا دژ بە ئێوە خێری بۆ هێنان و هەمووان هاتنە ناو ئیسلامەوە.

واقیدی دەڵێت: عەبدوڵلای کوڕی عامر لە عەمری کوڕی حەماسەوە بۆچی گێڕامەوەو وتی: بەنولەیس بە تەنها هاتن کە دوو سەدو پەنجا کەس بوون و سەعدی کوڕشی جوسامە ئاڵاکەی هەڵگرتبوو، کە تێپەڕین سێ جار الله اکبریان کرد، ئەبوسوفیان وتی: ئەمانە کێن؟عەباس وتی: بەنولەیس، پاشان ئەشجەع هاتن کە کۆتا دەستە بوون و سێ سەد کەس بوون و ئاڵایەکیان بە دەست مەعقەلی کوڕی سنان و ئاڵایەك بە دەست نەعیمی کوڕی مەسعود بوو، ئەبوسوفیان وتی: ئەمانە

لەناو عەرەبدا سەرسەخترین نەیاری موحەمەد بوون، عەبباس وتی: خوا ئیسلامی خستە ناو دڵیانەوە، ئەمەش فەزڵی خوایە، ئەویش بێدەنگ بوو پاشان وتی: ئەی موحەمەد تێنەپەڕی؟ عەبباس وتی: هێشتا نەهاتووە، ئەگەر ئەو کەتیبەیە ببینێت کە لەگەڵ موحەمەدداد ئاسن و سوارو سەرباز هێندە دەبینێت کە هیچ کەس دەرەقەتیان نایەت، بەخوا منیش وا گومان دەبەم، کێ هەیە دەرەقەتی ئەمانە بێت، کاتێك کەتیبەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەرکەوت تەپ و تۆز بە دوای ئەسپەکانەوە بەرز بوویەوە و هەمووان تێدەپەڕین، ئەویش وتی: ئەی موحەممەد بۆ نەهات؟ عەبباس وتی: جارێ تێپەڕ نەبووە تا بە حوشترەکەیەوە (القصواء) لە نێوان ئەبوبەکر و ئوسەیدی کوڕی حوچەیردا کە دەیدواندن تێپەڕ بوو، عەبباس وتی: ئەوە پێغەمبەری خوایە و بە کەتیبە سەوزەکەیەوە، کۆچەران و پشتیوانانی تێدان، ئاڵای تێدا بەرز بوونەوە و لەگەڵ هەر پاڵەوانێکی پشتیوانان‌دا ئاڵایەك بەرز کرابوویەوە، عومەری کوڕی خەتتابیش ڕێکی دەخست و بە دەنگی بەرز هاواری دەکرد، ئەبوسوفیان وتی: ئەوەی قسە دەکات کێیە؟ عەبباس وتی: عومەری کوڕی خەتتابە، وتی: کاروباری بەنی عەدی گرتەدەست بەوکەمی و زەلیلیەوە، عەبباس وتی: ئەبوسوفیان خوای گەورە هەرکەسی بوێت پلەوپایەی بەرز دەکاتەوە بەوەی خۆی دەیەوێت، عومەریش یەکێکە لەوانەی ئیسلام پلەوپایەی بەرز کردەوە، لە کەتیبەکەدا دووهەزار قەڵغان هەبوون، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئاڵاکەی دایە دەست سەعدی کوڕی عوبادە کە لەپێش سوپاکەوە بوو، کە سەعد بە ئاڵاکەی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) تێپەڕی وتی ئەبوسوفیان ئەمڕۆ ڕۆژی (ملحمة) (دەستە و یەخە بوونە)، ئەمڕۆ حەرامەکان (کوشتار) ڕەوادەبن، ئەمڕۆ خوا قورەیش زەلیل دەکات. ئینجا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هات کە دای بە پاڵ ئەبوسوفیاندا هاواری لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کردوو وتی: پێغەمبەری خوا فەرمانت کردووە هۆز و کەسی خۆت بکوژن؟ سەعد و هاودەمەکانی کە بە لاماندا تێپەڕ بوون وایان وت، فەرمووی: ئەی ئەبوسوفیان ئەمڕۆ ڕۆژی (دەستە و یەخە بوونە) ئەمڕۆ نارەواییەکان ڕەوا دەبن، ئەمڕۆ خوا

قورەیش زەلیل دەکات، بۆ خوا فریای هۆزەکەت بکەوە تۆ لە هەموان باشتر و خاوەن خزمایەتی تریت، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف و عوسمانی کوڕی عەفان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە سەعد دڵنیا بین بەرامبەر بە قورەیش؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی(یا اباسفیان الیوم یوم المرحمة، الیوم اعز الله فیه قریشا)واتە(ئەمڕۆ ڕۆژی ڕەحم و سۆزە، ئەمڕۆ خوا تیایدا قورەیش عیزەتمەند دەکات)، پێغەمبەر (ﷺ)یش ناردی بە دوای سەعد داو لایبرد و ئاڵاکەی دایەدەست قەیس، پێغەمبەر (ﷺ) ئاڵاکە لە دەست سەعد دەرناچێت کاتێك درایە دەست کوڕەکەی، سەعدیس ئامادە نەبوو ئاڵاکە بداتە دەست کەس مەگەر بە فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) نەبێت، پێغەمبەر (ﷺ)یش مێزەرەکەی بۆ نارد، سەعدیش ناسیەوە و ئەو کات ئاڵاکەی دایە دەست قەیسی کوڕی.[1]

تەبەرانی لە ئەبولمیلاوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) بووین وتی ئەبوسوفیان لە ئەراك بوو، چووین و بردمان، موسڵمانانیش بە کالانی شمشێرەکانیان بەرێیان کرد، تا هێنایان بۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەویش پێی فەرموو(ویمك یا اباسفیان قد جئتکم بالدنیا و الاخره فاسلموا تسلموا)عەبباسیش دۆست و هاوڕێی بوو، ووتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەبوسوفیان حەزی لە ناوبانگە، پێغەمبەر (ﷺ)یش کەسێکی نارد تا لە مەککەدا هاوار بکات(هەرکەس دەرگای دابخات پارێزراوە، هەرکەس چەکەکەی فڕێ بدات پارێزراوە، هەرکەس بچێتە ماڵی ئەبوسوفیانەوە پارێزراوە، پاشان عەبباسی مامی لەگەڵدا نارد تا لە دووریاندا دانیشتن، بەنوسولەویم هاتن وتی عەبباس ئەمانە کێن؟ وتی بەنوسولەیم، وتی: ئەوان بۆ؟ پاشان عەلی کوڕی ئەبو تالیب (رضي الله عنه) بە کۆچەرانەوە هات وتی عەبباس ئەمانە کێن؟ وتی: عەلی کوڕی ئەبوتالیب بە کۆچەرانەوە، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) بە پشتیوانانەوە هات، وتی عەبباس ئەمانە

---

[1] - ضعيف.

کێن؟ وتی: مەرگی سوور، ئەوە پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم) بە پشتیوانانەوە، ئەبوسوفیان وتی: دەسەڵاتی کیسرا و قەیسەرم بینیوە بەڵام وەك دەسەڵاتی برازاکەت نین، عەبباسیش وتی: ئەمە تەنها پێغەمبەرایەتیە.[1]

تەبەرانی لە عوروەوە (رضي الله عنه) بە مورسەلی هێناویەتی دەڵێت: پاشان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە دوانزە هەزار کۆچەر و پشتیوان و ئەسلەم و غیفار و جوهەینە و بەنی سولەیمەوە دەرچوو و پێشکەوتن تا لە مرالظهران دابەزین و قورەیش پێی نەزانین، حەکیمی کوڕی حیزام و ئەبوسوفیانیان نارد بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و وتیان: یان پەنامان بۆ وەربگرە لەلای یان بڕیاری شەڕ بدەن ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب و حەکیمی کوڕی حیزامیش چوون و گەیشتن بە وەرقاء و بردیان لەگەڵ خۆیان تا لە ئەراك کە دەمەو عیشا بوو چادریان دی کە هەڵدرابوون و سەربازان دایان کووتابوو، دەنگی ئەسپیان بیست، ئەمە ترساندی و وتیان: ئەمانە بەنی کەعب بۆ شەڕ هاتوون، ئیبن وەرقاء وتی: ئەوانە لە بەنی کەعبن زۆر زیاترن، بڵێیت هەوارین پەنایان هێنابێت بۆ خاکی ئێمە، بە خوا نازانین ئەمە چیە لە حەجی خەڵك دەچێت، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)یش دەستەیەکی نارد تا جاسوسەکان بگرن، خوزاعەش لەسەر ڕێ بوون و ڕێیان نەدەدا کە بچێت، کاتێك ئەبوسوفیان و هاوەڵانی چوونە ناو سەربازگەی موسڵمانان دەستەی موسڵمانان لە تاریکە شەودا گرتنیان و بە ترساندنی کوشتنەوە بردنیان عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) هەستا و بەرەو ئەبوسوفیان چوو و دای بە پشت ملیدا و ئەوانیش بە دوایدا هاتن و بردیان تا بیبەن بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئەویش ترسا بیکوژن، - عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب (رضي الله عنه) لە سەردەمی نەفامیدا دڵسۆزی بوو - بەوپەڕی دەنگیەوە هاواری لێ کردن- ناکرێت عەبباسم بۆ بانگ بکەن؟ عەبباسیش هات بۆ لای و

---

[1]- هەیسەمی ج٦ ص١٧٠ دەڵێت: تەبەرانی گێڕاویەتیەوە، لە سەنەدەکەدا حەربی کوڕی حەسەن هەیە کە لاوازە، هەندێکیش متمانەی پێ دەدەن.

پاراستی و داوای لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد بیداتە دەست ئەو و لە تاریکی شەودا سواری کرد و بردی بە سەربازگەکەدا تا هەموویان بینیان، عومەر کاتێك دای بە پشت ملی ئەبوسوفیاندا وتی: سوێند بە خوا نابێت لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نزیك ببیتەوە دەبێ بمریت، ئەویش هاواری بردە لای عەبباس و وتی وا دەکوژرێم، بەڵام عەبباس نەیهێشت لێی بدەن، کاتێك زۆری و گوێڕایەڵی خەڵکەکەی بینی وتی هەرگیز شتی وەك ئەمەی ئەمشەوم نەبینیوە، بەوە عەبباس لە دەستیان ڕزگاری کرد و وتی: ئەگەر موسڵمان نەبیت و شایەتی نەدەیت موحەمەد پێغەمبەری خوایە دەکوژرێیت، ئەویش دەیویست ئەوەی عەبباس پێی دەڵێت بیڵێت بەڵام زمانی گۆی نەدەکرد و لەگەڵ عەبباس مایەوە، حەکیمی کوڕی حیزام و ئیبن وەرقاش هاتن بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و موسڵمان بوون و پێغەمبەر (ﷺ)یش هەواڵی خەڵکی مەککەی لێ دەپرسین، کاتی نوێژی بەیانی هات و بانگ درا هەموو هاتن، ئەبوسوفیان ترسا و وتی عەبباس ئەمە چیە، دەتانەوێت چی بکەن؟ ئەویش وتی ئەمانە موسڵمانن و حەز دەکەن لە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) دابن، عەبباس ئەوی برد، کاتێك ئەبوسوفیان موسڵمانانی بینی وتی عەبباس ئەگەر فەرمانیان پێ بکات بە هەرشتێ دەیکەن؟ وتی ئەگەر بڵێت نان و ئاو مەخۆن بە گوێی دەکەن، پاشان بە ئەبوسوفیانی وت: دەی لەسەر هۆزەکەت بیاندوێنە بزانە لێیان دەبوورێت؟ دواتر ئەبوسوفیانی برد تا چوونە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)، عەبباس وتی ئەی پێغەمبەر خوا (ﷺ) ئەمە ئەبوسوفیانە، ئەبوسوفیان وتی ئەی موحەمەد هانای سەرکەوتنم بردە لای خوا خۆم و تۆش هانای سەرکەوتنت بردە لای خوای خۆت بە خوا وا دەبینم تۆ سەرکەوتیت، ئەگەر خوای من حەق بوایە و خوای تۆ حەق نەبوایە من بە سەرتدا سەردەکەوتم، ئەوکات شایەتومانی هێنا، عەبباس وتی: ئەی پێغەمبەری خوا حەز دەکەم مۆڵەتم بدەیت تا بچمە لای خەڵکی مەککە و بێداریان بکەمەوە و بانگیان بکەم بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی، ئەویش مۆڵەتی پێدام، عەبباس وتی: چۆن پێیان بڵێت ئەی پێغەمبەری خوا؟ پەنایەکم پێ بڵێ تا دڵنیایان بکەم،

پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (پێیان بڵێ هەرکەس شایەتی بدات هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خوای تاك و تەنهای بێ هاوتاو موحەمەد بەندەو نێردراوی ئەوە پارێزدراوە، هەرکەس لای کەعبە دابنیشێت و چەکەکەی دابنێت پارێزراوە، هەرکەس دەرگای ماڵی دابخات پارێزراوە) عەبباسیش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئیبن عەبباس ئامۆزامانەو حەزدەکات لەگەڵمابێتەوە، بەڵکو ڕێزێکی پێ بفەرمووی، ئەویش فەرمووی (هەرکەس بچێتە ماڵی ئەبوسوفیان پارێزراوە) ئەبوسوفیانیش داوای دەکرد پێی بگەیەنێت، چونکە ماڵی لەسەروی مەککەوە بوو، فەرمووی (هەرکەسیش بچێتە ماڵی حەکیمی کوڕی حیزام و دەست بگرێتەوە پارێزراوە) ماڵی حەکیمیش لە خوارووی مەککەوە بوو، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) عەبباسی سواری ئەو وڵاخە سپییەکرد کە دحیەی کەلبی (رضي الله عنه) پێشکەشی کردبوو، عەبباسیش چوو بۆلای ئەبوسوفیان و تێی گەیاند، کە عەبباس بە ڕێکەوت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناردی بە شوێنیداو فەرمووی: بگەن بە عەبباسداو بیگێڕنەوە بۆلام ئەوەی لێی دەترسا پێی وتن (ترسی هەبوو شتێك بە عەبباس بکەن) نێردراوەکەش خۆی گەیاندە عەبباس، عەبباسیش حەزی نەکرد بیگێڕێتەوەو وتی: پێغەمبەری خوا دەترسێت ئەبوسوفیان بە حەزی خۆی بگەڕێتەوە ناو ئەو خەڵکەو دوای موسڵمانبوونی بێباوەڕبێتەوە؟ دەی ڕایوەستێنن، ئەویش ڕایوەستاند، ئەبوسوفیان وتی: بەنی هاشم ناپاکیان نواند؟ عەبباسیش وتی: ئێمە ناپاکی نانوێنین، بەڵکو هەندێ کارم پێتە، وتی: کامە ئیش بابۆت ئەنجام بدەم؟ وتی: پێت دەڵێم کاتێك خالیدی کوڕی وەلید و زوبەیری کوڕی عەوام (رضي الله عنه) دێن بۆ لات، عەبباس لەبەرتەسکێکدا لای ئەراك وەستا و هەرکەس و دەستەیەك بەوێدا تێپەڕ دەبوون ئەبووسوفیانی تێدەگەیاندن، پاشان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەستە بە دەستە دەیناردن و دابەشی کردن بە سەر دوو بەشدا، زوبەیری بە سوپای ئەسلەم و ئیفار و قوزاعەوە نارد، ئەبوسوفیان وتی: عەبباس ئەمە پێغەمبەری خوایە؟ وتی: نا، بەڵام خالیدی کوڕی وەلید، ئینجا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سەعدی کوڕی عوبادەی بە دەستەی پشتیوانانەوە

نارد، دەیوت: ئەمڕۆ ڕۆژی تێکڕژانە، ئەمڕۆ نارەواکان ڕەوا دەبن، پاشان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە کەتیبەی ئیمانی کۆچەران و پشتیوانانەوە هات، ئەبوسوفیان کە ئەو هەمووە دەموچاوە نەناسراوەی دی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) ئەمانەت بۆ زیادبوون هێناون یان دژ بە هۆز و کەست، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (تۆ و هۆزەکەت ئەوەتان کرد، ئەمانە بە ڕاستیان دانام کاتێك ئێوە بە درۆتان زانیم، سەریان خستم کاتێك دەرتان کردم) ئەوکات لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەقرەعی کوڕی حابس و عەبباسی کوڕی میرداس و عویەینەی کوڕی حصنی کوڕی بە دری فەزاری (رضي الله عنه) هەبوون، لەگەڵ ئەو هەمووانەدا پشتیوانان و کۆچەران دەبینران، وتی: عەبباس بڕۆ هیچ کات سەرباز و سوپای وام نەدیوە، زوبەیریش بە خەڵکەکەوە چوو تا لە (حجون) وەستا، خالید چوو تا چوویە ناو خوارووی مەککە و سووکە شەڕێکی بەنی بەکر بەرەو ڕووی بوویەوە و لەگەڵیان جەنگا و خوا شکاندنی و لە (حزورە) بەشەڕ هاتن تا چوونە ماڵەکان، دەستەیەکیان لە شاخی خەندەمەوە چوونە سەرەوە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لە دواوە بوو هات و کەسێك هاواری کرد هەرکەس دەرگای ماڵی دابخات و دەستی بگرێتەوە پارێزراوە، ئەبوسوفیانیش لە مەککە هاواری کرد موسڵمان بن پارێزراو دەبن، خوای گەورە بە هۆی عەبباسەوە پاراستنی، هندی کچی عوتبە هات و ڕیشی ئەبوسوفیانی گرت و هاواری کرد ئەی (ال غالب) سەرکەتووان ئەم پیرە گەمژەیە بکوژن، ئەویش وتی: ڕیشم بەردە سوێند بە خوا ئەگەر تۆش موسڵمان نەبیت دەدرێت لە ملت، قوڕت بەسەر وا بە حەق و ڕاستی هاتووە دەی بڕۆ ژوورەوە تا پێت بڵێین- یان وتی: لە ماڵەوە دابنیشە.[1,2]

---

[1] - صحیح.

[2] - هەیسەمی ج٦ ص ١٧٣ دەڵێت: تەبەرانی بە مورسەلی گێڕاویەتیەوە و تیایدا ئبن لوهەیعە هەیە و فەرموودەکەی حەسەنە، لاوازیشی تێدایە هەروەها ئیبن عائیز لە (مغازی عروە (رضي الله عنه)) دا هێناویەتی، لە الفتح ج٨ ص٤ هێناویەتی، بوخاری بە کورتی لە عروەوە هێناویەتی.

واقدی و ئیبن عەساکیر و ئیبن سەعد لە سوهەیلی عەمرەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت:کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هاتە مەککەوەو سەرکەوت چوومەماڵەوەو دەرگام لەسەر خۆم داخست و عەبدوڵلای کوڕی سوهەیلی برامم نارد تا داوای پەنا لە موحەمەد بکەم چونکە دڵنیانەبوون لەوەی نەکوژرێم، عەبدوڵلای کوڕی سوهەیلش چوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بە هۆی منەوە پەنای دەدەیت، فەرمووی (بەڵێ، ئەو بە پەنای خوا پارێزراو و پەنادراوە با دەرکەوێت) پاشان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەوانەی دەورووبەری فەرموو (هەرکامتان گەیشت بە سوهەیل با چاوی لێ زیت نەکاتەوە، چونکە (فلعمری) واتە(سوێندە بە تەمەن) سوهەیل عەقڵو شانوشکۆی هەیەو کەسی وەك سوهەیل لە ئیسلام بێئاگا نیە) عەبدوڵلا چوو بۆ لای باوکی و پێی وت: ئەویش وتی: بەخوا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە بچوکی و گەورەیشی چاکەکاربوو، سوهەیل دەهات ودەچوو و بۆ حونەین لەگەڵ پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) هێشتا بێباوەڕبوو تا لە عرانە موسڵمان بوو، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) ئەو ڕۆژ لە دەستکەوتی حونەین سەد وشتری پێ بەخشی[1].[2]

ئیبن عەساکیر لە عومەری کوری خەتتابەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە ڕۆژی فەتحدا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە مەککە بوو ناردی بەشوێن صەفوانی کوڕی ئومەییەو ئەبوسوفیانی کوڕی حەربو حارسی کوڕی هیشامدا، عومەر وتی: منیش وتم: خوای گەورە هێنانیە بەردەستم دەزانم چییان کردووە تا ئەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (نمونەی منو ئێوە وەك ئەوەیە کە یوسف (علیه السلام) بە براکانی وت: هیچ لۆمەو سووکایەتیەکتان لەسەر نیە ئەمڕۆ خوا لێتان خۆش دەبێت، چونکە ئەو گەورەی میهرەبانە) عومەر وتی: منیش لەتاو شەرمی پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) سەرم دانەواند نەوەك هیچ بکەم لە کاتێکدا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وای پێ فەرموون.[3]

---

[1] – ضعیف

[2]– لە الکنز العمال ج٥ ص٢٩٤ دا واهاتووە، حاکمیش لە المستدرك ج٣ ص٢٨١ دا بەهەمان شێوە هێناویەتی.

[3] – لە الکنز ج٥ ص ٢٩٢ دا واهاتووە.

ئیبن زەنجەویە لە کتێبی (الاموال) لە ڕێگەی ئیبن ئەبی حوسەینەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مەککەی فەتح کردچوویە ناو کەعبە، دوایی هاتە دەرەوە و دەستی لەسەر دوو لای دەرگاکە دانا و فەرمووی چی دەڵێن؟ سوهەیل وتی: قسە و گومانی خێرمان هەیە، برایەکی بەخشندە و برازایەکی بەخشندە، دەشتوانیت هەرچی بکەیت، ئەویش فەرمووی (اقول کما قال یوسف، لا تسریب علیکم الیوم)(ئەوە دەڵێم کە یوسف وتی: ئەمڕۆ هیچتان لەسەر نیە).[1]

بەیهەقی ج٦ ص١١٨ لە ڕێگەی قاسمی سەلامی کوڕی مسکین لە باوکیەوە لە سابتی بەنانی لە عەبدوڵڵای کوڕی ڕەباح لە ئەبوهورەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی و فەرموودەکە دێنێت، تیایدا دەڵێت: پاشان هاتە کەعبە و دەستی گرت بە دوو لای دەرگاکەوە و فەرمووی (چی دەڵێن؟ و چۆن گومان دەبەن؟) وتیان: دەڵێن برازا و ئامۆزایەکی نەرم و نیان و میهرەبان بیت، سێ جار ئەمەیان وت، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (یوسف چی وت منیش وادەڵێم: بڕۆن ئەمڕۆ لۆمە و سەرکۆنەتان لەسەر نیە خوا لێتان خۆش بێت، چونکە خوا گورەترینی میهرەبانە). ئیتر وەك چۆن لە گۆڕدا دەربێن چوونە دەرەوە و هاتنە ناو ئیسلام.

بەیهەیقی دەڵێت: شافعی لە ئەبو یوسف لەو چیرۆکەوە ئەوە دێنێت کە کاتێك لە مزگەوت کۆبوونەتەوە پێی فەرموون (پێتان وایە چیتان لەگەڵ بکەم؟) وتیان چاکە، برایەکی بەخشندە و بەڕێز و برازایەکی بەڕێز و بەخشندە، فەرمووی(اذهبوا فانتم الطقاء) واتە(بڕۆن ئێوە ئازادن).[2]

---

[1] – لە الاصابە ج٢ ص٩٣دا واهاتووە.

[2] – ضعیف.

## (چیرۆکی موسڵمانبوونی عەکرەمەی کوڕی ئەبووجەهل (رضي الله عنه))

واقیدی و ئیبن عەساکیر لە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: لە ڕۆژی فەتحدا ئوم حەکیمی کچی حارسی کوڕی هیشامی ژنی عەکرەمەی کوڕی ئەبو جەهل موسڵمان بوو، پاشان ئوم حەکیم وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) عەکرەمە لە دەست تۆ ڕایکردووە بۆ یەمەن و ترساوە بیکوژیت دەی پەنای بدە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (هو امن) (پەنا دراوە) ئوم حەکیم چوو بە شوێنیدا و بەندەیەکی ڕۆمیشی لەگەڵدا بوو، لە ڕێدا بەندەکە چاوی تێبڕی تا هەڵمەتی بباتە سەر(داوێن پیسی) ئوم حەکیمیش دەمەدەمێی پێکرد تا گەیشتە قەرەباڵغیەك و هاواری بردە لایان، ئەوانیش بەستیانەوە.

ئوم حەکیم گەیشت بە عەکرەمە لە کەناراوی توهامەدا بوو، عەکرەمە دەچوویە ناو دەریا، هەر کەشتیەك دەهات پێی دەوت خۆت پزگارکە، ئەیوت چی بڵێم؟ دەیوت بڵێ لا اله الا الله، عەکرەمە وتی من لە دەست ئەوە ڕامکردووە، ئەوکات ئوم حەکیم هات و زۆر لێی پاڕایەوە و وتی ئامۆزاکەم لای کەسێکەوە هاتووم کە لە هەمووان خزم دۆست تر و چاکترە، خۆت لەناو مەبە، ئەویش وەستا تا پێی گەیشت، ئوم حەکیم وتی: من لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) داوای پەنام بۆ کردوویت، عەکرەمە وتی تۆ وات کردووە؟ وتی بەڵێ. من پێم وت و ئەویش پەنای دایت، عەکرەمەش لەگەڵیدا گەڕایەوە، ئوم حەکیم پێی وت بەندە ڕۆمیەکەی چی بەرامبەر نواند، عەکرەمەش کوشتی، ئەوکات هێشتا موسڵمان نەببوو.

کاتێك لە مەککە نزیك بوویەوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە هاوەڵانی فەرموو (عەکرەمەی کوڕی ئەبو جەهل بە باوەڕداری و کۆچکردووی دێت بۆ لاتان، وریابن قسە بە باوکی مەڵێن، چونکە قسە وتن بە مردوو ئازار بە زیندوو دەگەیەنێت و ناگات بە مردوو). عەکرەمەش داوای لە ژنەکەی دەکرد سەرجێی لەگەل بکات ئەویش ڕازی نەدەبوو و دەیوت تۆ بێباوەڕیت و منیش موسڵمانم، ئەویش دەیوت شتێکی لەوە گەورەتر ناهێڵێت سەرجێیم لەگەل بکەیت، کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) عەکرەمەی بینی

چوو بە دەمیەوە و لە تاو خۆشحاڵی بۆ عەکرەمە عەبای بەسەرشانەوە نەبوو، پاشان پێغەمبەر (ﷺ)دانیشت و لەبەردەمیدا عەکرەمە و ژنەکەشی کە پەردەی بە دەموچاویدا دابوو وەستان عەکرەمە وتی: موحەممەد ئەم ژنە پێی وتم تۆ پەنات داوم، پێغەمبەر (ﷺ) وتی (ڕاست دەکات تۆ پەنا دراویت) عەکرەمە وتی: موحەممەد بانگەواز بۆ چی دەکەیت؟ فەرمووی(بانگت دەکەم بۆ ئەوەی شایەتی بدەیت کە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خوا و من پێغەمبەری خوام، نوێژ بکەیت و زەکات بدەیت و ئەوە و ئەوە بکەیت) تا خەسڵەتەکانی ئیسلامی ژمارد، عەکرەمە وتی سوێند بە خوا تەنها بانگەواز بۆ حەق دەکەیت و قسەت جوانە، سوێند بە خوا ئەوەی بانگەواز بۆ ئەوە بکەیت لەناوماندا ڕاستگۆترین و چاکترین کەسمان بوویت، عەکرەمە شایەتومانی هێنا، پێغەمبەریش (ﷺ) بەوە دڵخۆش بوو، پاشان وتی ئەی پێغەمبەری خوا چاکترین شتێکم پێ بڵێ تا بیڵێم، فەرمووی بڵێ (اشهد ان لا الله الا الله و ان محمدا عبده و رسوله) عەکرەمە وتی: ئەی دواتر چی؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (بڵێ خوا و ئامادەبوان به شاهید دەگرم من موسڵمانی موجاهیدی کۆچکردووم)، عەکرەمەش ئەوەی وت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ئەمڕۆ داوام لێ بکەیت هەرچی ببەخشم پێت دەیبەخشم) عەکرەمەش وتی داوات لێ دەکەم لە هەموو دژایەتی یەکی جارانم بۆت لێم خۆش بیت یان یان لەهەر هەنگاونان یان ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی یان قسەیەکم لە دژت ئایا خۆت لەوێ بووبیت یان نا پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (اللهم اغفر له كل عداوة عادانيها، و كل مسيرسار فيه الى موضع يريد بذلك المسير إطفاء نورك و أغفر له مانال منى من عرض في وجهي او انا غائب عنه) عەکرەمەش وتی ئەی پێغەمبەری خوا ئێستا ڕازی بووم.

پاشان عەکرەمە وتی: سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەر (ﷺ) هەر پارەیەکم لە دژایەتی پەیامی خوادا خەرج کردبێت چەند بەرامبەری لە ڕێی خوادا دەبەخشم، هەر شەڕێکم کردبێت بۆ ڕێگری ڕێی خوا دەبێت لە ڕێی خوادا چەند بەرامبەری

بکەم، پاشان تەواو نەویە جیهاد تا شەهید بوو، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) بەوە ژنەکەی بە مارەبڕینی یەکەمی گێڕایەوە.

واقیدی لە بارەی کەسەکانیەوە دەڵێت: سوهەیلی کوڕی عەمر لە ڕۆژی حونەیندا وتی: موحەممەد و هاوەڵانی تاقیان کەنەوە، عەکرەمە پێی وت: ئەو هیچ ناڵێت هەمووشت بە دەست خوایە نەوەك موحەممەد، ئەگە ئەمڕۆ لە دژی بم سبەینێ بۆ ئەو دەبێت، سوهەیل وتی: سەردەمی دژایەتیش قسەیەکە، وتی: ئەبو یەزید سوێند بە خوا ئەوکات بێ مانا لێنەوی بووین و عەقڵمان دانابوو، بەردێکمان دەپەرست کە سود و زیانی نەبوو.[1][2]

حاکم ج٧ ص٢٤١ لە فەرموودەکەی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیردا (رضي الله عنه) هێناویەتی، بەڵام کورتی کردوەتەوە تا ئەوەی: کاتێك گەیشتە بەردەرگای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) خۆشحاڵ بوو لەتاو خۆشحاڵی بە هاتنی لە ڕوویدا هەستا، پاشان لە عوروەی کوڕی زوبەیروە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: عیکرەمەی کوڕی ئەبوجەهل وتی: کاتێك گەیشتمە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وتم: موحەمەد (ئەم ژنە دەڵێت تۆ پەنات داوم، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم). فەرمووی (انت امن) واتە(تۆ پەنا دراویت) منیش وتم: شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خوای تاکی بێهوتا و تۆ بەندەو پێغەمبەری خوایت، تۆ چاکترین و ڕاستگۆترین و بەوەفاترین کەسیت، عیکرەمە دەڵێت: ئەمەم دەوت و لەتاو شەرم لێ کردنیدا سەرم دانەواندبوو، پاشان وتم: ئەی پێغەمبەری خوا نزام بۆ بکە تا خوا لە هەر دژایەتیەکم بۆت لێم خۆش بێت یان لە هەر شتێکم خۆش بێت کە ویستبێتم هاوەڵ دانانی تێدا زاڵ و بە دیاربخەم، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (اللهم اغفر لعكرمة كل عداوة عادانيها او موكب اوضع فيه يريد ان يصد عن سبيلك) وتم: ئەی

[1] – ضعيف.

[2] – لە كنز العمال ج٧ ص٧٥دا واهاتووە.

پێغەمبەری خوا چاکترین شتم پێ بڵێ تا فێری ببم، فەرمووی (بڵێ شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواو موحەمەدیش بەندەو پێغەمبەری خوایەو لەو پێناوەشدا جیهاد بکە (لێبنەوە)). پاشان عیکرەمە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا سوێند بە خوا چەندەم لە ڕێی ڕێگری لە ئایینی خوادا بە خەرج دابێت دوو بەرامبەری لە ڕێی خوادا دەبەخشم، چەندە دژ بە پەیامی خوا جەنگابم دوو بەرامبەری ئەوە لە پێناوی خوادا دەجەنگم پاشان کەوتە جیهادەوە تا لە ڕۆژی شەڕی (ئەجنادین، لە سەردەمی ئەبوبەکردا (رضي الله عنه) شەهید بوو، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە ساڵی حەجیدا لەسەر هەوەزان دینا، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) مردو عیکرەمە ئەو ڕۆژ لە (تبالە) بوو[1][2].

## (چیرۆکی موسڵمان بوونی صەفوانی کوڕی ئومەییە(رضي الله عنه))

واقیدی و ئیبن عەساکیر لە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: لە ڕۆژی فەتحدا ژنەکەی صەفوانی کوڕی ئومەییە بە غومی کچی معدل لە کینانە موسڵمان بوو، صەفوانی کوڕی ئومەیەش ڕایکرد تا چوویە شیوێك و بە کۆیلەکەی (یەسار) – کە لەگەڵیدا نەبوو– وت قوڕت بەسەر وریابە بزانە کێ دەبینیت؟ ئەویش وتی: ئەوە عومەیری کوڕی وەهبە (رضي الله عنه)، صەفوان وتی: چی بکەم بە عومەیر، سوێند بە خوا تەنها بۆ کوشتنی من هاتووە، موحەممەد بەسەرمدا سەرکەوتووە و ئەویش پەیوەستی بووە، وتی: عومەیر هێندە بەس نیە چیت پێ کردم منت خستە سەر ئایین و کەسی خۆت، ئێستا هاتوویت دەتەوێت بمکوژیت، ئەویش وتی: ئەبو وەهب بە قوربانت بم، لەلای چاکترین و خزم دۆست ترین کەسەوە هاتووم بۆ لات،

---

[1] – صحیح.

[2]– تەبەرانی لە عیکرەمەوە(رضي الله عنه) چیرۆکی موسڵمان بوونەکەی بە کورتی هێناوە. هەروەك لە المجمع ج٦ ص ١٧٤ دا هاتووە.

عومـەیر بـە پێغەمبـەر (ﷺ) وتبـوو ئـەی پێغەمبـەری خـوا گـەورەی هۆزەکـەم ڕایکردووە تا خۆی فڕێ بداتە ناو دەریاوە و دەترسێت تۆ پەنای نەدەیت، دەی بە دایك و باوکمەوە بە قوربانت بم پەنای بدە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی وا پەنام دا (قد امنتـه) ئـەویش چـوو بـە شـوێنیدا و وتـی پێغەمبەری خـوا پـەنای دایـت، صـەفوانیش وتـی: نـا بـەخوا لەگەڵتـدا ناگەڕێمـەوە تـا نیـشانەیەکم بـۆ بهێنیـت بیناسمـەوە، پێغەمبـەریش (ﷺ) فـەرمووی (مێزەرەکـەم ببـە) عومـەیریش بـە مێزەرەکەیـەوە گەڕایـەوە بـۆ لای، عومـەیر بـۆ جـاری دووەم چـوویەوە بـۆ لای تـا بوردەکەی برد و وتـی ئەبو وەهب لای چاکترین و خزم دۆست ترین و نەرم ترین کەسەوە هاتووم بۆ لات، شکۆ و عیزەتی ئەو هی تۆشە و دەسەڵاتی ئەو بـۆ تۆشـە، کـوڕی دایـك و باوکـت، بـۆ خـاتری خـوا بێـدار بـەرەوە، ئـەویش پێـی وت: دەترسم بکـوژرێم، وتـی: بـانگی کردویـت تـا بـچیتە نـاو ئیـسلامەوە ئەگـەر حـەز دەکـەیت، ئەگـەرنا دوو مـانگی بـۆ داناویـت، ئـەو لـە هـەمووان بـە وەفـاتر و چاکترە، وا ـئـەو مێزەرەیەی خۆی بۆ ناردوویت کە هێنایە دەرەوە کاتێك هاتە ژوورەوە دەموچاوی پـێ داپۆشـیبوو، ئـەویش ناسـیەوە و وتـی بـەڵێ ووتـی بـەڵێ ئـەوە خۆیـەتی، صەفوانیش گەڕایەوە تا هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) ئەوکات پێغەمبەر (ﷺ) نوێـژی عەسری لە مزگەوتدا دەکرد، ئەوانیش وەستان، صـەفوان وتـی لـە شـەو و ڕۆژێکدا چەند نوێژ دەکەن؟ وتی پێنج نوێـژ، وتـی موحەممەد بەرنوێـژیتان بۆ دەکات؟ وتـی بـەڵێ، کاتێك سـەلامی دایـەوە صـەفوان هـاواری کـرد موحەممـەد عومـەیری کـوڕی وەهب ئەم مێزەرەیەی بۆ هێنـاوم دەڵێت تـۆ ووتوتـە بێم بـۆ لات، ئەگـەر ڕازیـم باشـە ئەگەرنا دوومانگت بۆ داناوم، فەرمووی(انـزل یـا ابوهـب) واتـە(دابـەزە ئـەبو وەهـب)، وتـی نـا بـەخوا تـا بـۆم ڕوون نەکەیتـەوە، فـەرمووی بـەڵکو چـوارمانگت بـۆ هەیـە، صـــەفوانیش دابـــەزی و پێغەمبـــەر (ﷺ) بـــەرەو لای هـــەوەزان چـــوویە دەرەوە، صەفوانیش بەبێ باوەڕی لەگەڵیدا چوو، ناردی داوای لـێ کـرد بـە کـاتی چەکەکەی بدات بەلایـەوە، ئەویش سـەد قـەڵغان و شمەکەکانیشی دا بەلایەوە، صـەفوان وتـی:

بەزۆریان یان بە ویست، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (عاریة رادّة)(بە کاتی ودەیگێڕمەوە) ئەویش دای بەلایەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمانی پێکردو ئەویش بردی بۆ حونەین و لەو شەڕەو لە ئیفیشدا بەشداربوو، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) گەڕایەوە بۆ جەعرانە، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) دەستکەوتەکانی بەڕێ دەکرد ئەو سەیری دەکرد- صەفوانی لەگەڵدا بوو- صەفوان سەیری دۆڵێکی پڕ مەڕو بەرخی دەکردو چاوی لەسەری بوو، پێغەمبەریش (ﷺ) پێی فەرموو (ئەبو وەهب ئەو دۆڵە سەرسامی کردوویت؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی (هو لك وما فيه) (چی تیایە بەخۆیەوە بۆ تۆ) ئەو کات صەفوان وتی: مەگەر تەنها دڵی پێغەمبەرێك هێندە پاك و چاك بێت، یەکسەر شایەتومانی هێناو لەوێدا موسڵمان بوو[1،2].

ئیمامی ئەحمەد ج٦ ص٤٦٥ لە ئومەیەی کوڕی صەفوانی کوڕی ئومەیە لە باوکیەوە هێناویەتی کە پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕۆژی حونەیندا هەندێ قەڵغانی لاهێنا بە کاتی، ئەویش وتی ئەی موحەمەد بە زۆرە؟ فەرمووی (بل عارية مضمونة) هەندێکی لەناو چوو، پێغەمبەریش (ﷺ) پێشنیاری بۆکرد تا قەرەبووی بۆ بکاتەوە، ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمڕۆ ئیسلامم لا گرنگترە.[3]

---

[1] - ضعيف.

[2]- لە الكنز ج٥ ص٢٩٤ دا واهاتووە، ئیبن ئیسحاق لە موحەمەدی کوڕی جەعفەری کوڕی زوبەیر لە عروەوە لە عائیشەوە(رضي الله عنها) بە کورتی هێناویەتی، لە البداية والنهاية ج٤ ص٣٠٨یشدا هاتووە.

[3] - حسن.

## (چیرۆکی موسڵمانبوونی حوەیتبی کوڕی عەبدولعوززا (رضي الله عنه))

حاکم ج٣ ص٤٩٣ لە مونزیری کوڕی جەهمیەوە هێناویەتی دەڵێت: حوەیتبی کوڕی عەبدولعوززا وتی: کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ساڵی فەتحدا هاتە مەککە من زۆر ترسامو لە ماڵی خۆم دەرچوومو خێزانم لە شوێنێکدا دانا کە تیایدا دڵنیاو پارێزراو بن، چووم بۆلای دیواری عەوفو لەوێ بووم تا ئەوەی ئەبوزەری غیفاریم بینی(رضي الله عنه) منو ئەو رێگرو جیاییەکی هەمیشەیی هەبوو، لە دەستی ڕامکرد وتی: ئـــەبوو موحەمـــــەد، منـــیش وتم: بـــەڵێ، وتـــی: ئـــەوە چیتە؟ وتم: دەترسم، وتی: ترست لەسەر نیە، پەنای خوات پێدراوە، منیش گەڕامەوە بۆ لای و سەلامم لێکرد، وتی: بڕۆرەوە بۆ ماڵەوە، وتم: هیچ ڕێگەیەك هەیە تا بچمەوە ماڵەوە؟ سوێند بە خوا بڕوا ناکەم بە زیندوویی بگەمەوە ماڵەوە دەگیرێم و دەکوژرێم یان دێنە ماڵەکەم و دەمکوژن، ماڵ و منداڵیشبەملاولاوم پەرش وبلاو بوونەتەوە ه، وتی: دەی ماڵ و منداڵت لە یەك شوێندا کۆبکەرەوە و منیش لەگەڵتا دێم تا ماڵەوە، لەگەڵم هات و هاواری دەکرد حوەیتب پارێزراوە کەس هێرشی نەباتە سەر، پاشان ئەبوزەر (رضي الله عنه) چوو بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی وت کە چی کردووە، ئەویش فەرمووی (اولیس قد امن الناس کلهم الا من امرت بقتلهم؟) منیش دڵنیا بووم و ماڵ و منداڵم گێڕانەوە بۆ ماڵەوە و ئەبوزەریش گەڕایەوە بۆ لام و وتی: ئەبوموحەممەد تا کەی؟ لە هەموو بارەکاندا پێشکەوتیت و خێرێکی زۆرت لە دەستدا، خێرێکی زۆریشی ماوە، دەی وەرە بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و موسڵمان ببە و پارێزراو دەبیت، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) چاکترین و خزم دۆست ترین و نەرم ونیانترین کەسە، گەورەیی و شکۆی ئەو بۆ تۆشە، منیش وتم: لەگەڵ تۆدا دێم و دەچم بۆ لای، لەگەڵی چووم تا هاتمە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە بەتحاء، ئەبوبەکر و عومەریش (رضي الله عنه) لەلای بوون، لەسەر سەری ڕاوەستام و پرسیارم لە ئەبوزەر کرد لە سەلام کردندا چی دەوترێت، وتی بڵێ (السلام علیك ایها النبي و رحمة الله و برکاته) منیش وتم: ئەویش فەرمووی (وعلیك السلام

حویطب) منیش شایەتومانم هێنا و ئەویش فەرمووی سوپاس بۆ ئەو خوایەی ڕێنمونی کردیت، پێغەمبەر (ﷺ) بە موسڵمان بوونم دڵخۆش بوو و داوای قەرزێکی لێکردم، منیش چل هەزار درهەمم بە قەرز پێدا و لە شەڕی حونەین و تائیفیشدا بەشداریم کرد لەگەڵیدا و لە دەستکەوتی حونەیندا سەد وشتری پێدام[1].[2]

حاکم لە ج٣ ص٤٩٢ لە ئیبراهیمی کوڕی جەعفەری کوڕی مەحموودی کوڕی موحەممەدی کوڕی سەلەمەی ئەشهەلی لە باوکیەوە هێناویەتی، ئینجا فەرموودەکە دێنێت، تیایدا دەڵێت: پاشان حوەیتب وتی: لەناو قورەیشدا هیچ کام لە گەورەکان لەسەر ئاینی هۆزەکەیان نەماوە تا مەککە فەتح کرا من پێم ناخۆش بوو بەڵام قەدەر وابوو، لە بەدردا لەگەڵ بێباوەڕاندا بەشداریم کرد و چەند پەند و ئەزموونێکم وەرگرت، فریشتەکانم بینین لە نێوان ئاسمان و زەویدا شەڕیان دەکرد و بێباوەڕیان بە دیل گرت، وتم: ئەم کابرا ڕێ لێ گیراوە، باسی ئەوەم بۆ کەس نەکرد، شکاین و گەڕاینەوە بۆ مەککە و لەوێ ماینەوە و قورەیشیەکانیش یەك لە دوای یەك موسڵمان دەبوون، کە ڕۆژی حودەیبیە هات ئامادە بووم لە ڕێککەوتنەکەدا تاکۆتایی تیایدا بوون، هەموو ئەمانە ئیسلامی زیاد دەکرد و ویستی خوا دەچوویە سەر، کە ڕێککەوتنی حودەیبیەمان نووسی من کۆتا شاهیدی بووم و وتم: قورەیش تەنها ئەوە لە موحەممەد دەبینن کە زیانی خۆیانە، من ڕازی بووم بە ڕم بەرگری لێ بکەم، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆ عەمرەی قەزا و قورەیش لە مەککە چوونە دەرەوە من یەکێك بووم لەوانەی لە مەککە مانەوە، من و سوهەیلی کوڕی عەمر تا لە کاتی تەواوبووندا پێغەمبەر (ﷺ) دەربکەین، کە سێ ڕۆژ تەواو بوو من و سوهەیل چووین و وتمان مەرجەکەت تەواو بوو دەی لە شارمان بڕۆرە دەرەوە، ئەویش

---

[1] – ضعیف.

[2] – ئیبن سەعد لە الطبقات لە ڕێگەی مونزیری کوڕی بەهم و کەسانی دیکەوە لە حوەیتیبەوە هێناویەتی لە الاصابة ج١ ص٣٦٤یشدا هاتووە.

هاواری کرد ئەی بیلال (لا تغیب الشمس و احمد بن المسلمین بمكة ممن قدم معنا) واتە(خۆرئاوا نەبێت تا هەرچی موسڵمانی ناو مەککە کە لەگەڵمان هاتوون بچنە دەرەوە).[1]

## (چیرۆکی موسڵمانبوونی حارسی کوڕی هیشام (رضي الله عنه))

حاکم ج٣ص٢٧٧ لە عەبدوڵڵای کوڕی عەکرەمەوە هێناویەتی دەڵێت: لە ڕۆژی فەتحدا حارسی کوڕی هیشام و عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ڕەبیعە چوون بۆ لای ئوم هانیئی کچی ئەبوتالیب و پەنایان بردە لای و وتیان با لە پەنای تۆدابین، ئەویش پەنای دان، عەلی کوڕی ئەبوتالیب چوو بۆ لایان و سەیری کردن و نەوی لە شمشێر بۆیان، بەڵام ئوم هانیئی باوەشی پیاکرد و وتی لەناو خەڵکدا وام پێ دەکەیت بەخوا دەبێت پێش ئەو دوانە من بکوژیت، ئەویش وتی پەنای بێباوەڕان دەدەیت؟ ئینجا چوویە دەرەوە و ئوم هانیش دەڵێت چوومە خزمەت پێغەمبەر (عليه السلام) و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا عەلی کوڕی دایکم (عەلی برام) بێزار و تووڕەی کردم من دوو خزمم پەناداون کە بێباوەڕن کەچی ئەو ویستی بیانکوژێت، پێغەمبەریش (عليه السلام) فەرمووی: (ما كان ذالك له قد اجرنا من اجرت و امنا من امنت) واتە(مافی ئەوەی نیە، تۆ پەنای کێت داوە ئێمەش پەنای دەدەین) ئوم هانیئیش گەڕایەوە بۆ لایان و پێی وتن: ئەوانیش چوونەوە بۆ ماڵی خۆیان، بە پێغەمبەر (عليه السلام) وترا حارسی کوڕی هیشام و عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ڕەبیعە لە کۆڕی خۆیاندا دانیشتون و خۆیان هەڵدەکێشن؟ فەرمووی: هیچ چارێکمان نیە وا پەنامان داون، حارس دەڵێت: شەرمم دەکرد پێغەمبەر (عليه السلام) بمبینێت و بیری بینینیم لەهەر شەڕێکدا لەگەڵ موسوڵمانانندا بێتەوە یادو دواتر بیری چاک و مهرەبانی بکەمەوە، لەناو مزگەوتدا پێی بگەم و ئەو ڕووی خۆش بێت، وەستا تا چووم بۆلای و سەلامم لێ کرد و شایەتی حەقم هێنا، ئەویش فەرمووی (الحمد الله الذي هداك، ماكان مثلك يجهل الاسلام).[2]

---

[1] - ضعیف.

[2] - ضعیف.

# (چیرۆکی موسڵمانبوونی نەزیری کوڕی حارسی عەبدەری(رضي الله عنه))

واقیدی لە ئیبراهیمی کوڕی موحەمەدی کوڕی شەرحیلی عەبدەری لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: نەزیری کوڕی حارس لە هەموان شارەزاتر بوو، دەیوت: سوپاس بۆ خوا کە بە ئیسلامەوە بە ڕێزی کردین و بە موحەمەدیش (صلى الله عليه وسلم) منەتباری کردین و لەسەر باری باو باپیرانمان نەمردین، من بە هەموو بارێکەوە لەگەڵ قورەیشدا بووم تا ساڵی فەتح، چوو بۆ حونەین و ئێمەیش لەگەڵی چووین و دەمانەویست ئەگەر هەر شکستێك تووشی موحەمەد بوو ئێمەش سەختتری بکەین لەسەری، بەڵام بۆمان نەکرا، لە جەعرانەدا بوو سوێند بەخوا هەر لەسەر ئەو باوەڕە بووم تا بینیم پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە خەندەیەکەوە پێم گەیشت و فەرمووی: نەزیر، وتم: بەڵێ، فەرمووی (ئەمە باشترە یان ئەوەی ڕۆژی حونەین دەتویست؟) منیش خێرا بەرەو ڕووی چووم، فەرمووی (ئێستا کاتی هاتووە بڕوانیت لە چ بارو حاڵێکدایت) وتم: دەبینم، فەرمووی (خوایە چەسپاوی زیاد بکەیت)سوێند بە خوا دڵم وەك بەردێکی چەسپاو لەسەر ئیسلام و سەرخستنی حەق مایەوە، پاشان هاتمەوە بۆ ماڵەوەو دەبینم یەکێك لە بەنی دیئل دەڵێت: ئەبولحارس پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سەد وشتری بۆ داناویت، شتێکی بدە بە مَن چونکە قەرزارم، منیش ویستم وەری نەگرم وتم ئەمە تەنها بۆ دڵڕاکێشانە، نامەوێت لەسەر ئیسلام بەرتیل وەرگرم، پاشان وتم: سوێند بەخوا داوام لێ نەکردووە بۆیە وەرمگرت و دەیانمبەخشی بە دیلی.[1][2]

---

[1] - ضعیف.

[2] - الاصابە ج٣ ص٥٨٨ دا هاتووە.

# (چیرۆكی موسڵمانبوونی سەقیف خەڵكی تائیف)

ئیبن ئیسحاق دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) كە سەقیفی بەجێهێشت عوروەی كوڕی مەسعود كەوتە شوێنی تا پێش ئەوەی بگاتە مەدینە پێی گەیشتو موسڵمان بوو و داوای لیّ كرد بە موسڵمان بوونەوە بگەڕێتەوە بۆناو هۆزەكەی، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (انهم قاتلوك) واتە(دەتكوژن) پێغەمبەریش (ﷺ) زانی دەمارێكی ناڕەزایی و ڕێگرییان هەیە، عوروە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من لە ناویاندا خۆشەویستمو هەشیانە گوێڕایەڵەو دێت بە دەممەوە، ئینجا چوو هۆزەكەی خۆی بەرەو ئیسلام بانگ بكات، هیوای وابوو لەبەر پلەو پایەی لە ناویاندا دژایەتی نەكەن كاتێك گەیشتە لای كە پرێك بانگی كردن بۆ ئیسلامو موسڵمان بوونی خۆی بۆ نیشان دان، ئەوانیش لە هەمووڵاوە تیربارانیان كرد تا تیرێكی بەركەوتو كوشتی، بە عوروە وترا: چی لە ئایینەكەت بەدی دەكەیت؟ وتی: ڕێزێك كە خوا لێی ناومو شەهیدییەك كە خوا نۆشی كردم كە تەنها بۆ ئەو شەهیدانە هەبوو كە پێش بەجیّ هێشتنی ئێوە شەهید بوون، دەی لای ئەواندا بە خاكم بسپێرن، ئەوانیش وایان كرد، ئەوان دەیانوت پێغەمبەر (ﷺ) لەبارەیەوە فەرموویەتی (ان مثله في قومه كمثل صاحب يس في قومه) پاشان لە دوای گەشتنی عوروە لە سەقیف چەند مانگێك مانەوەو دواتر لە نێو خۆیاندا كۆبوونەوەو زانییان توانای شەڕیان لەگەڵ عەرەبی چواردەوری خۆیاندا نەماوە و بەیعەتیان داو موسڵمان بوون، پاشان یەنگدەنگ بوون لە سەر ئەوەی كەسێك بنێرن، بۆ ئەمەش عەبدیالیلی كوڕی عەمریان لەگەڵ دوو هاوپەیمانو سیّ لە بەنی مالیكدا نارد، كە لە مەدینە نزیك بوونەوەو دابەزین گەیشتنە موغەیرەی كوڕی شوعبە لە سەرەی خۆیدا وڵاخەكەی هاوەڵانی دەلەوەڕاند، كە ئەوانی بینی بە خێرایی چوو تا موژدە بدات بە پێغەمبەر (ﷺ)، لە ڕێدا ئەبوبەكر (رضي الله عنه) پێی گەیشتو پێی وت: ئەوا سەقیف هاتوون ئەیانەوێت بەیعەت بدەنو موسڵمان بن ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) چەند مەرجێكیان پیّ

بدات و لەناو هۆزەکەیاندا نووسراوێك بنووسن، ئەبوبەکر بە موغەیرەی وت: سوێندت دەدەم بەخوا پێشم مەکەوە با من بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بڵێم، موغەیرەش ڕازی بوو، ئەبوبەکریش چوویە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و هەواڵەکەی پێ وت، پاشان موغەیرە گەڕایەوە بۆلایان و لەگەڵیان بوو و فێری کردن چۆن سەلام بکەن لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەڵام ئەوان سەلامی سەردەمی نەفامییان بەکارهێنا.

کاتێك هاتنە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) چادرێکیان لە مزگەوتدا بۆ هەڵدرا، خالیدی کوڕی سەعدی کوڕی عاص لە نێوان ئەوان و پێغەمبەردا (ﷺ) دەهات و دەچوو، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) نانی بۆ دەناردن لێیان نەدەخوارد تا خالیدی کوڕی سەعد پێش ئەوان لێی نەخوات، ئەویش نووسراوێکی بۆ نووسین، لەناو مەرجەکانیاندا لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەبوو ڕێیان بدات سێ سال بتەکەیان (الطاغية) بپەرستن بەرە بەرە ساڵ بە ساڵ کەمیان دەکردەوە تا وتیان یەك مانگ لە دوای هاتنیان تا دڵی گەمژەکانیان ڕابکێشن، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) ڕازی نەبوو بڕیاریدا ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب و موغەیرەی کوڕی شوعبە بنێرێت تا بیشکێنن، لەگەڵ ئەوەشدا داوایان کرد تا نوێژ نەکەن و بە دەستی خۆیان بتەکانیان نەشکێنن، ئەویش فەرمووی (اما كسر اصنامكم بايديكم فسنعفيكم واما الصلاة فلا خير في دين لا صلاة فيه) واتە(بۆ شکاندنی بتەکانتان بە دەستی خۆتان چاوپۆشیتان لێ دەکەین؛ بەڵام بۆ نوێژ خێر لە ئایینێکدا نیە کە نوێژی تێدا نەبێت) ئەوانیش وتیان با سوکی و ڕسوایشمان بێت ڕازین.[1]

ئەحمەد لە عوسمانی کوڕی عاصەوە هێناویەتی وەفدی سەقیف هاتنە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش لە مزگەوت دایبەزاندن تا دڵیان نەرمتر بێت، ئەوانیش مەرجیان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) دانا تا بێ جەنجاڵ و بێ دەیەك دان و بێ پارەدان بن و کەسی جگە لە خۆیان نەکرێت بە بەرپرسیان، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی

---

[1] – ضعیف.

(لكم ان لا تحشروا ولاتجبوا ولا يستعمل عليكم غيركم ولا خير في دين لاركوع فيه) عوسمانی کوڕی ئەبو عاص وتی: ئەی پێغەمبەری خوا قورئانم فێر بکەو بمکە بە پێشەوای هۆزەکەم، ئەبوداودیش هێناویەتی دەڵێت: سەبارەت بە سەقیف کە بەیعەتیان دا پرسیارم کرد لە جابر(رضي الله عنه) وتی: مەرجیان لەسەر پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام)دانا تا سەدەقەو جیهادیان لەسەر نەبێت، دەڵێت گوێی لە پێغەمبەر(عليه الصلاة والسلام) بوو کە دوای ئەوە دەیفەرموو (کە موسڵمان بوون سەدەقە دەدەن و جیهادیش دەکەن)[1][2].

ئەحمەدو ئەبوداودو ئیبن ماجە لە ئەوسی کوڕی حوزەیفەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: بە وەفدێکی سەقسفەوە چووینە خزمەت پێغەمبەر(عليه الصلاة والسلام) ئەحلاف لای موغەیرەی کوڕی شوعبە(رضي الله عنه) دابەزین پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) بەنی مالیکی لە خێوەتێکی خۆیدا دابەزاندو هەموو شەوێك دوای عیشا دەهات بۆلامان و لەسەر پێ ڕادەوەستاو دەیدواندین تا لەتاو زۆر وەستاندا پێکانی [illegible]دو دەبوون، زیاتر کە دەیدواندین لەسەر قورەیش بوو، پاشان دەیفەرموو (لا [illegible]، وکنا مستضعفين مستذلين بمكة، فلما خرجنا الى المدينة كانت سجال العرب [illegible] وبينهم ندال عليهم ويدالون علينا) واتە(گرفت نیە، ئێمە لە مەککە کەم دەسەڵات و لاوازبووین، کە چووین بۆ مەدینە نۆبەکاری جەنگ لە نێوان ئێمەو ئەواندا بوو بەسەریاندا سەردەکەوتین و بەسەرماندا سەردەکەوتن، شەوێکیان دواکەوت لە کاتی جاران وتمان ئەمشەو دواکەوتی؟ فەرمووی (إنه طرئ علي جزئي من القران فكرهت أن أجيئ حتى اتمه)(دوو بەشی قورئانم بەسەردا خوێندرا، بۆیە حەزم نەکرد بێم تا تەواوی بکەم)[3][4].

---

[1] – صحيح.

[2] – لە البداية والنهاية ج٥ ص٢٩ بە کورتی هاتووە.

[3] – ضعيف.

[4] – لە البداية والنهايە ج٥ ص٣٢ دا هاتووە، ئیبن سەعد ج٥ ص٥١٠ لە ئەسودەوە (رضي الله عنه) بە هەمان شێوە هێناویەتی.

# (بانگەوازی هاوەڵان بۆ کەس و تاکەکان)

## (بانگەوازی ئەبوبەکری صدیق(رضي الله عنه))

ئیبن ئیسحاق دەڵێت: کە ئەبوبەکر(رضي الله عنه) موسڵمان بوو و موسڵمان بوونەکەشی ئاشکرا کرد بانگەوازی کرد بۆ خوای گەورە، ئەبوبەکر لای هۆزەکەی کەسێکی نەرم و نیان و سادە و خۆشەویست بوو، لەناو قورەیشدا لە هەمووان زیاتر شارەزای رەچەڵەك و نەسەب بوو، دەیزانی چی چاك و خراپیان هەیە، پیاوێکی بازرگان و خاوەن رەوشت و چاکە بوو، کەسانی هۆزەکەی دەهاتن بۆلای و لەبەر زانست و بازرگانی و رەفتاری جوانی لە چەندین کاردا پشتیان پێ دەبەست، ئەویش متمانەی بە هەرکەس بدایە لەگەڵی دادەنیشت و بانگی دەکرد بۆ ئیسلام، لەسەر دەستی ئەم هێندەی پێم گەیشتووە زوبەیری کوڕی عەوام و عوسمانی کوڕی عەفان و تەلعەی کوڕی عەبدوڵڵاو سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و عەبدورەحمانی کوڕی عەوف(رضي الله عنه) موسڵمان بوون، ئەمانە لەگەڵ ئەبوبەکردا چوون بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئیسلامی بۆ خستنەڕوو و قورئانی بەسەردا خوێندن و حەقی ئیسلامی پێ گەیاندن و ئەوانیش باوەڕیان هێنا، ئەمانە هەشت کەسی یەکەم بوون کە موسڵمان بوون و بڕوایان هێنا بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەوەی لای خواوە هێناویەتی.[1]

## (بانگەوازی عومەری کوڕی خەتاب (رضي الله عنه))

ئیبن سەعد لە ئوستقەوە هێناویەتی دەڵێت: من بەندەی عومەری کوڕی خەتاب (رضي الله عنه)بووم و مەسیحیش بووم، پێشنیاری ئیسلامی بۆ کردم و دەیوت: ئەگەر موسڵمان بیت لەسەر سپاردەکەم پشتم پێ دەبەستیت چونکە دروست نیە لە سپاردەی موسوڵماناندا پشتت پێ ببەستم لە کاتێکدا لەسەر ئایینی ئەوان نیت،

---

[1] – لە البدایە والنهایە ج٣ ص٢٩ دا واهاتووە.

بەڵام من ڕازی نەبووم، ئەویش دەیوت: زۆر کردن لە ئیسلامدا نیە، کاتێك سەرە مەرگی هات من هەر مەسیحی بووم‌و ئەویش ئازادی کردم، وتی: بۆ کوێ دەتەوێت برۆ.[1][2]

دارقوتنی‌و ئیبن عەساکیر لە ئەسلەمەوە هێناویانە دەڵێت: لە شام بووین ئاوێکم هێنا بۆ عومەری کوڕی خەتاب(رضي الله عنه) تا دەست نوێژی پێ بگرێت، وتی: ئەم ئاوەت لە کوێ هێنا؟ ئاوی شیرین‌و ئاسمانی پاکی لەم جۆرەم نەدیوە، وتم: لە ماڵی ئەو پیرەژنە مەسیحیە هێنام، کاتێك دەست نوێژی لێگرت چوو بۆلای پیرەژنەکەو وتی: پیرەژن موسڵمان بە، خوای گەورە موحەمەدی(صلى الله عليه وسلم) بە هەق ناردووە، ئەویش موی سەری خۆی نیشاندا چۆن سپی ببوو پیرێکی بە تەمەن واخەریکە دەمرێ، عومەریش(رضي الله عنه) وتی: خوایە شاهید بە.[3]

## (بانگەوازی موصعەبی کوڕی عومەیر (رضي الله عنه))

ئیبن ئیسحاق لە عەبدوڵلای کوڕی موحەمەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزم‌و کەسانی دیکەشەوە هێناویەتی ئەسعەدی کوڕی زەرارە موصعەبی کوڕی عومەیری برد بەرەو ماڵی بەنی عەبدولئەشهەل‌و بەنی زەفەر، سەعدی کوڕی موعاز پوورزای ئەسعەدی کوڕی زەرارە بوو، بردیە حەوشەیەکی بەنی زوفەر لەسەر بیرێك کە پێی دەوترێت بیری (مرق)، لە حەوشەکەدا دانیشتن‌و پیاوانێکی هۆزی ئەسلەم لەلایان

---

[1] – ضعيف.

[2] – سەعدی کوڕی مەنسورو ئیبن ئەبی شەیبەو مونزیرو ئیبن ئەبی حاتەمیش بە کورتی هێناویانە، لە الکنز ج٥ ص٥٠ یشدا هاتووە، ئەبونەعیم لە الحلیە ج٩ ص٣٤ لە وسقی ڕوومیەوە بەهەمان شێوە هێناویەتی، بەڵام لە گێڕانەوەکەی ئەمدا دەڵێت: لەسەر سپاردەی موسڵمانان چونکە ناکرێت لەسەر سپاردەی موسڵمانان پشتت پێ ببەستم لە کاتێکدا تۆ لەسەر ئایینیان نیت.

[3] – لە الکنز العمال ج٥ ص١٤٢ دا واهاتووە.

کۆبوونـەوە، ئـەوکات سـەعدی کـوڕی موعـازو ئوسـەیدی کـوڕی حـوزەیر گـەورەی هۆزەکانیان بوون لە بەنی عەبدولئەشهەلدا، هەردووکیشیان بێباوەڕ بوون و لەسەر ئایینی هۆزەکەیان بوون، کاتێك هەواڵیان بیست، سەعد بە ئوسەیدی وت: بێ باوك بڕۆ بۆلای ئەو دوو کەسەی هاتوون بۆ ماڵمان تا لاوازەکانمان سەرگەردان نەکەن، بڕۆ سەرکۆنەیان بکەو مەهێڵە بێنەماڵمان، چونکە ئەگەر ئەسعەدی کوڕی زەرارەم نەبوایە کە دەزانێت ئەوا تۆم بەس بوو بۆ ئەوە، ئەو پورزامەو کەس لەو لەپێشتر نازانم.

ئوسـەیدی کـوڕی حـوزەیریش خەنجەرەکـەی هـەڵگرت و بـەرەو ڕوویـان چـوو، کاتێـك ئەسـعەدی کـوڕی زەرارەی بـینی بـە موصـعەبی وت: ئەمـە گـەورەی هۆزەکەیەتی و هاتووە، بە ڕاستی دابنێ، موصعەب وتی: ئەگەر دابنیشێت قسەی لەگەڵ دەکەم، ئەویش بە جنێودانەوە لەسەریان وەستا و وتی: چی وای کرد بێن تا لاوازەکانمان سەرگەردان بکەن؟ ئەگەر خۆتان پێویستیەکتان هەیە لە ئێمە کەنار بگرن، موصعەب پێی وت: دادەنیشیت تا گوێ بگریت، ئەگەر ڕازی بوویت باشە، ئەگەر نا بە دووربە لێی، ئەویش وتی بە ویژدانەوە قسەت کرد.

پاشـان خەنجەرەکـەی چـەقاند بـە زەویـدا و لایـان دانیـشت، موصـعەب لەسـەر ئیـسلام قـسەی بـۆ کـرد و قورئـانی بەسـەردا خوێنـد، سـەبارەت بـەوەی بـۆی بـاس دەکردن وتیان: سوێند بەخوا پێش ئەوەی قسە بکات لە ڕوخسار و نەرمونیانیدا ئیسلاممان ناسی، پاشان وتی: قسەکەت چەندە جوان و چاکە، ئەگەر بتانەوێت بچنە ناو ئەم ئایینە چی دەکەن؟ پێی وتن: خۆت دەشۆریت و خۆت و جل و بەرگت پـاك ڕادەگریـت، پاشـان شـایەتمانی حـەق دێنیـت، پاشـان نوێـژ دەکـەیت، ئـەویش هەستا وخۆی شت و جل و بەرگەکەی پاك ڕاگرت و شایەتی حەقی هێنا و دواتر هەسـتا و دووڕکـات نوێـژی کـردو پێـی وتـن: مـن کەسـێکی تـرم لەگەڵدایـە ئەگـەر شوێنتان بکەوێت هەموو هۆزەکەی شوێنتان دەکەون، ئێستا دەی نێرم بۆ لاتان، ئەویش سەعدی کوڕی موعازە.

پاشان خەنجەرەکەی هەڵگرت و چوو بۆ لای سەعد و هۆزەکەی کە لە کۆڕی خۆیاندا دانیشتبوون، کاتێک سەعدی کوڕی موعاز سەیری کرد وتی: بەخوا ئوسەید بەو ڕوخسارەوە نەهاتەوە کە پێی چووبوو، کاتێک هاتە لایان سەعد پێی وت: چیت کرد؟ وتی: قسەم لەگەڵ کردن سوێند بەخوا خراپەیان نابینم. ڕێگریم لێ کردن، وتیان تۆ چۆن حەزدەکەیت وا دەکەین، بیستم بەنی حارثە چوون تا سەعدی کوڕی زرارە بکوژن، چونکە زانیویانە پورزای تۆیە تا سووکایەتی پێ بکەن.

سەعدی کوڕی موعاذیش بە ترس و توورەیی‌یەوە بەرامبەر بەو هەواڵەی بەنی حارثە هەستا و خەنجەرەکەی دەستی هەڵگرت و وتی: سوێند بە خوا جۆرێک دەتبینم، پاشان چوو بۆ لایان و سەیر دەکات بێخەم دانیشتوون بە مەزانی ئوسەید ویستوویەتی قسەیان ببیستێت، لە ڕوویاندا وەستا و جنێوی پی دان ودواتر بە سەعدی کوڕی زرارەی وت: ئەی ئەبو ئوسامە سوێند بەخوا ئەگەر خزمیەتی نێوانمان نەبوایە ئەمەم لێ قبووڵ نەدەکردی، لەماڵی خۆماندا شتێك دەکەی کە ئێم پێی ڕازی نین؟ سەعدیش بە موسعەبی وت: سوێند بەخوا کەسێك هاتووە بۆ لات ئەو هۆزەی بە دوای ئەمەوەن ئەگەر شوێنت بکەوێت دوانیان نابینیت شوێنت نەکەون.

موسعەبیش پێی وت دادەنیشیت و گوێ بگریت ئەگەر پێت باش بوو وەری بگرە، ئەگەر نا چیت پێ ناخۆشە لێت بەدوور دەخەینەوە، سەعدیش وتی: قسەیەکی بە ویژدانانەیە، پاشان خەنجەرەکەی داچەقاند و دانیشت، موسعەبیش ئیسلامی بۆ خستەڕوو و قورئانی بەسەردا خوێند، موسای کوڕی عوقبە دەڵێت: سەرەتای سورەتی زوخروف بەسەردا خوێندەوە. دەڵێت پێش ئەوەی قسەبکات لە ڕوخسارو نەرمونیانیدا ئیسلامان بەدیکرد، پاشان پێی وتن: ئەگەر موسڵمان بن وبێنە ناو ئەو ئایینەوە چی دەکەن؟ وتیان: خۆت دەشۆیت و خۆت و جل و بەرگت پاك دەکەیتەوەو دواتر شایەتی هەق دێنیت و پاشان دووڕکات نوێژ دەکەیت، ئەویش هەستا و ئەوانەی کرد، پاشان خەنجەرەکەی هەڵگرت و گەڕایەوە بۆلای

هۆزەکەی کە بینیان دێت وتیان سوێند بە خوا سەعد بەو ڕوخسارەوە نەگەڕایەوە کە پێشتر پێی چوو، کاتێك هات بۆلایان وتی: ئەی بەنی عەبدولئەشهەل لەبارەی منەوە چۆن دەڕوانن؟ وتیان: گەورەو ڕادروستترینمانیت، وتی: دەی قسەی پیاو ژنتان لێم حەرام بێت تا بڕوابهێنن بە خواو پێغەمبەرکەی، سوێند بەخوا ئیتر نەهات تا هەرچی ژنو پیاوی ناوماڵانی بەنی عەبدولئەشهەل هەبوون هەموویان موسڵمان بوون.

سەعدو مەصعەب گەڕانەوە بۆ ماڵی ئەسعەدی کوڕی زەرارە و لای مانەوەو خەڵکیان بۆ ئیسلام بانگ دەکرد تا هەرچی ژنو پیاوی ناو ماڵی پشتیوانان بوون موسڵمان بوون مەگەر لە ناو بەنی ئومەییەی کوڕس یەزیدو خەتمەو وائیلو واقیفو ئەوسدا نەبێت.[1]

تەبەرانیو ئەبونەعیمیش لە دلائل النبوە لە عروەوە بە دورودرێژی هێناویەتی، باسی ئەوە دەکات پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بانگەوازی بۆ پشتیوانان خستەڕوو ئەوانیش موسڵمان بوون، وەك دواتر لە باسی سەرەتای پشتیواناندا باسی دەکەین، ئەویش موصعەبی نارد بۆلایان وەك پێشتر لە باسی ئەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کەسو تاکەکانی ناردووە بۆ بانگەواز بۆلای خواو پێغەمبەرەکەی باسی ئەومان کرد. پاشان دەڵێت: ئەسعەدی کوڕی زەرارە لەگەڵ موصعەبی کوڕی عومەیردا چوون تا هاتنە لای بیری (مرق) یان لە نزیکیەوە دانیشتنو ناردیان بە دوای دەستەیەکی خەڵکەکەداو ئەوانیش بە شارەزاییەوە هاتن، کاتێك موصعەبی کوڕی عومەیر قسەی بۆ دەکردنو قورئانی بەسەردا دەخوێندن هەواڵیان پێدرا کە سەعدی کوڕی مەعاز دێت، ئەویش بە ڕمەکەیەوە هاتو لەسەر سەریان ڕاوەستاو وتی: چۆن کەسی تاکی نامۆی تەنها دێننە ماڵمان تا لاوازەکانمان سەرگەردان بکاتو بانگیان بکات بۆلای خۆی، دوای ئەمە لەلای ئێمە نەمێنێتەوە، ئەوانیش چوونەوەو بۆ

---

[1] – لە البداية و النهايەج٣ ص١٥٢ دا واهاتووە.

جاری دووەم گەڕانەوە ئەویّ، هەواڵ درا بە سەعد بۆ جاری دووەم ئەویش جیا لە جاری یەکەم هەڕەشەی لێکردن، بەڵام کاتێك ئەسعەد نەرمیەکی لیّ بەدی کرد وتی: پورزا گوێی لێبگرە بەڵکو ئەگەر پێت باش نەبوو بە وەڵامی بەهێزتر وەڵامی بدەرەوە، ئەگەریش پێت باش بوو وەڵامی پەیامی خوا بدەرەوە، ئەویش وتی: (موحەمەد) چی دەڵێت؟ موصعەبی کوڕی عومەیریش ئەم ئایەتەی بەسەردا خوێندەوە (حم والكتاب المبين. انا جعلناه قرانا عربيا لعلكم تعقلون) سەعد وتی: شتی وام نەبیستووەو، گەڕایەوەو خوا ڕێنموونی کرد بۆ ئیسلام‌و موسڵمانبوونەکەی دەرنەخست تا گەڕایەوە، کە گەڕایەوە ناو هۆزەکەی بەنی عەبدولئەشهەلی بانگ کرد بۆ ئیسلام‌و موسڵمانبوونی خۆی ئاشکرا کرد، تیایدا وتی: هەرکەس بە گەورەو بچوك‌و ژن‌و پیاوتانەوە گومانی هەیە با لەوە چاکترمان بۆ بهێنێت تا لێی وەربگرین، سوێند بەخوا ئەمە لە ناوبردنی سەرەکان نیە، بەوە بەنوعەبدولئەشهەل بە موسڵمانبوونی سەعدو بانگەوازەکەی موسڵمان بوون مەگەر ئەوەی نەیبیستایە، بەمەش یەکەم دەستەی پشتیوانان بوون کە بەیەکجار هەموویان موسڵمان بوون، ئینجا فەرموودەکە دێنێت وەك چۆن پێشتر لە باسی ئەوەدا باسمانکردووە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تاکە کەسانی ناردووە بۆ بانگەواز بۆلای خواو پێغەمبەرەکەی، دواجار موصعەبی کوڕی عومەیر(رضي الله عنه) گەڕایەوە بۆلای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، واتە گەڕایەوە بۆ مەککە.

# (بانگەوازی تولەیبی کوڕی عومەیر)

واقیدی لە موحەمەدی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حارسی تەییمیەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك تولەیبی کوڕی عومەیر (رضي الله عنه) موسڵمان بوو چوو بۆلای ئەروای کچی عەبدولموتەلیبی دایکی پێی وت: موسڵمان بووم وکەوتوومەتە شوێن موحەمەد(رضي الله عنه) تیایدا باسی کردووەو دەڵێت: پێی وتووە: دایە چی ناهێڵێت موسڵمان بیت و شوێنی نەکەویت؟ وا حەمزەی برات(رضي الله عنه) موسڵمان بووە، ئەویش وتی: بابزانم خوشکەکانم چی دەکەن وداتر منیش یەکێك دەبم لەوان.

منش وتم: دەی لای خوا نزات بۆ دەکەم تا بێیت و سەلامی لێ بکەیت و شایەتی بدەیت هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خوا، دایکی وتی: دەی من شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك نیە جگە لەخواو موحەمەدیش پێغەمبەری خوایە، پاشان بە زمانی پاڵپشتی پێغەمبەری دەکردو کورەکەی هاندەدا لەسەر سەرخستنی و ئەنجامدانی کارەکانی،[1] حاکمیش لە المستدرك ج٣ ص٢٩٣ دا لە ڕێگەی ئیسحاقی کوڕی موحەمەدی فرەویەوە لە موسای کوڕی موحەمەدی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حارسی تەیمیەوە لە باوکیەوە لە ئەبوسەلەمەی کوڕی عوبدولڕەحمانەوە هێناویەتی دەڵێت: تولەیبی کوڕی عومەیر(رضي الله عنه) لە ماڵی ئەرقەمدا موسڵمان بوو، دواتر چوو بۆلای ئەورانی کچی عەبدولموتەلیبی دایکی و وتی: من شوێنکەوتەی موحەمەدمو خۆم داوەتە دەست پەروەردگاری جیهانیان، دایکیشی وتی: زۆر چاکت کردووە پشتی خاڵۆزاکەت گرتووە، بەخوا ئەگەر ئێمەش توانای پیاوانمان هەبووایە شوێنی دەکەوتین و بۆی دەتواینەوە، دەڵێت منیش وتم: ئەی دایە گیان ئیتر بۆچی موسڵمان نابیت؟ ئینجا ئەو باسەی پێشوو دێنێت.[2]

---

[1]- لە الاستیعاب ج٤ ص٢٢٥ دا واهاتووە، عوقەیلیش لە ڕێگەی واقیدیەوە بەهەمان شێوە هێناویەتی، هەروەك لە الاصابە ج٤ ص٢٢٧ دا هاتووە،

[2]- ئیبن سەعد لە الطبقات ج٣ ص١٢٣ دا لە موحەمەدی کوڕی ئیبراهیمی تەیمی لە باوکیەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی، حاکم ج٣ ص٢٩٣ دەڵێت: صەحیحی غەریبە لەسەر مەرجی بوخاری، بەڵام بوخاری و موسلیم نەیان هێناون ئیبن حەجەر لە الاصابە ج٢ ص٢٣٤ دا لەسەری دەچێت و

# (بانگەوازی عومەیری کوڕی وەهبی جومەحی (رضي الله عنه)و چیرۆکی موسڵمان بوونی)

ئیبن ئیسحاق لە موحەمەدی کوڕی جەعفەری کوڕی زوبەیر لە عورووەی کوڕی زوبەیرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: عومەیری کوڕی وەهبی جومەحی لەگەڵ صەفوانی کوڕی ئومەییە لە حیجر بوو، پاش ماوەیەکی کەم لای توشبوانی خەڵکی بەدر دانیشت، عومەیری کوڕی وەهب یەکێك بوو لە شەیتانەکانی قورەیش، یەکێك بوو لەوانەی ئازاری پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و هاوەڵانی دەداو ئازاری دەهێنایە ڕێی کاتێك لە مەککە بوو، وەهبی کوڕیشی لە دیلەکانی بەدر بوو صەفوان وتی: سوێند بە خوا دوای هاوەڵانی قولیب خێر نەما، عومەیریش وتی: ڕاست دەکەیت، سوێند بە خوا ئەگەر قەرزم لەسەر نەبووایە تابیدەمەوەو ژن و منالم لەسەر بوایەو بترسایەم لە دوای خۆم لەناو دەچن سواردەبووم و دەچووم بۆلای موحەمەد تا بیکوژم، چونکە کوڕەکەم لایان بەندە، سەفوانی کوڕی ئومەیەش دەرفەتەکەی قۆستەوەو وتی: من قەرزەکەت دەدەمەوە، ژن و منالیشت لەسەر من تاماوم ناهێڵم نەدارو گیرۆدەبن، عومەیریش پێی وت: دەی با ئەمە لە نێوان من و تۆدا شاراوەو پارێزراو بێت، ئەویش وتی: باشە، ئینجا شمشێرەکەی هێناو ژەهراوی کرد، پاشان چوو تا هاتە مەدینە، عومەری کوڕی خەتاب(رضي الله عنه) بە دەستەیەکی موسڵمانانەوە باسیان لە ڕۆژی بەدر دەکردو دەیانوت: خوا چ ڕێزێکی لێ گرتووین و چی نیشانی دوژمنانی دا، عومەر سەیری عومەیری کوڕی وەهبی کرد کە لە دەرگای مزگەوت بە شمشێرەکەوە وەستاوە، ئەویش وتی: ئەو سەگە دوژمنی خوا عومەیری کوڕی وەهب تەنها بە شەڕو خراپەوە هاتووە. ئەمە دەردی ڕۆژی بەدری لە ڕوودا نواندین، دوایی هاتە لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا وا دوژمنی خوا عومەیری کوڕی

---

دەڵێت: وانیە کە دەیلێت چونکە مووسا (کەسی ناو سەنەدەکە) لاوازەو گێڕانەوەکەی ئەبو سەلەمەیش لێیەوە مورسەلەو ئەوەیە دەڵێت: وتم: دایە گیان، تا کۆتایی دەیهێنێت.

وەهب بە شمشێرەکەیەوە هاتووە، ئەویش فەرمووی (فادخله علي) واتە(بیهێنەلام) عومەریش هێنای و شمشێرەکەی خستە لای ملی و لێی توند کردەوەو بەوپشتیوانانەی چواردەوری وت: بچن بۆلای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و لای دابنیشن و وریای ئەم پیسەبن چونکە متمانەی لەسەر نیە، پاشان بردی بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، کاتێك پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بینی عومەر شمشێرەکەی لای ملی داناوە فەرمووی (ارسله یا عمر، ادن یا عمیر) واتە(عومەر بینێرە، عومەیر نزیك بەرەوە) ئەویش نزیك بوویەوە، وتی: بەیانیت باش (انعم صباحا) – سەلامێکی سەردەمی نەفامی بوو- پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (قد اکرمنا الله بتحیه خیر من تحیتك یا عمیر بالسلام تحیه اهل الجنه) واتە(ئەی عومەیر خوا سەلامێکی پێ ڕەوا فەرمووین چاکترە لەوەی تۆ، سەلامی ئەهلی بەهەشتە). وتی: سوێند بەخوا ئەی موحەمەد سەردەمێکی نوێ بوویت، فەرمووی (عومەیر بۆچی هاتوویت؟ وتی: هاتووم بۆ ئەوەی ئەو دیلەی لەبەردەستاندایە لەگەڵیدا چاکبن، فەرمووی (فما بال السیف في عنقك؟) واتە(ئەی ئەو شمشێرەی ملت؟) وتی: شمشێرێکی پیسە، هیچ سوودێکی هەیە، فەرمووی (ڕاست پێم بڵێ بۆچی هاتوویت؟ وتی: تەنها بۆئەوە هاتووم. فەرمووی (بەڵکو تۆو صەفوانی کوڕی ئومەیە لە حیجر دانیشتن و باسی هاوەڵانی قەلیب لە قورەیشتان کرد، دوایی تۆو تت: ئەگەر قەرزی سەرشانم و ماڵ و منالم نەبوایە دەچووم تا موحەمەد بکوژم، صەفوانی کوڕی ئومەیەش قەرزو ئەرکی ماڵ و منالی گرتیتە ئەستۆ تا من بکوژیت بۆی، خوا ڕێی نەدا ئەوە بکەیت) عومەیر وتی: شایەتی دەدەم تۆ پێغەمبەری خوایت ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەی لەسەر هەواڵی ئاسمان و دابەزینی سروش بۆ سەرت دەتوت بە درۆمان دەزانیت، ئەم کارەش تەنها من و صەفوان ئاگاداری بووین، سوێند بەخوا دڵنیام تەنها خوا ئەم هەواڵەی پێداویت، دەی سوپاس بۆ ئەوی خوایەی ڕێنموونی کردم بۆ ئیسلام و ئەم ڕێیەی پێ گرتمەبەر، پاشان شایەتی حەقی هێنا، پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (فقهە اخاکم في دینە و علموە القران و اطلقوا اسیرە) واتە(براکەتان لە ئایینەکەی

تێبگه‌یه‌نن و قورئانی فێر بکه‌ن و دیله‌که‌شی به‌ربده‌ن) ئه‌وانیش وایانکرد، ئه‌ویش وتی: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا من بۆ کوژاندنه‌وه‌ی ڕووناکی ئاماده‌و کارابووم، ئازاری زۆری که‌سانی موسڵمانم ده‌دا، ئێستا حه‌زده‌که‌م مۆڵه‌تم بده‌یت تا بچم بۆ مه‌ککه‌و بانگیان بکه‌م بۆلای خواو پێغه‌مبه‌ره‌که‌ی و ئایینی ئیسلام، به‌ڵکو خوای گه‌وره ڕێنموونیان بکات،ئه‌گه‌ر نا چۆن هاوه‌ڵانی تۆم له‌سه‌ر ئیسلام ئازار ده‌دا ئه‌وانیش له‌سه‌ر ئایینیان ئازار ده‌ده‌م پێغه‌مبه‌ریش (صلى الله عليه وسلم) مۆڵه‌تی پێداو ئه‌ویش چوو بۆ مه‌ککه‌، کاتێ عومه‌یر له‌ مه‌ککه‌ ده‌رچوو صه‌فوان ده‌یوت موژده‌یه‌کتان له‌م چه‌ند ڕۆژه‌دا بۆ دێت که‌ جه‌نگی به‌درتان پێ له‌ بیر ده‌باته‌وه‌، صه‌فوان پرسیاری له‌ کاروانه‌کان ده‌کرد تا کاروانێك هات و وتی: عومه‌یر موسڵمان بووه‌، ئه‌ویش سوێندی خوارد هه‌رگیز نه‌یدوێنێت و سوودی پێ نه‌گه‌یه‌نێت،[1] له‌ کنز العمال ج٧ ص٨١ دا هاتووه‌و ئه‌مه‌شی بۆ زیاد ده‌کات: کاتێك عومه‌یر (رضي الله عنه) چوو بۆ مه‌ککه‌ له‌وێ بانگه‌وازی ده‌کرد بۆ ئیسلام و ئازاری توندی نه‌یارانی ئیسلامی ده‌دا، له‌سه‌ر ده‌ستی عومه‌یر خه‌ڵکێکی زۆر موسڵمان بوون،[2] له‌ عوروه‌ی کوڕی زوبه‌یریشه‌وه‌ به‌ مورسه‌لی گێڕدراوه‌ته‌وه‌ تیایدا ده‌ڵێت: کاتێك خوا ڕێنموونی کرد موسڵمانان دڵخۆش بوون و عومه‌ری کوڕی خه‌تابیش (رضي الله عنه) وتی: کاتێك هات به‌رازێك له‌و زیاتر لام خۆشه‌ویستتربوو، ئه‌مڕۆش له‌ هه‌ندێ له‌ کوڕه‌کانم زیاتر خۆشم ده‌وێت.[3]

---

[1]– له‌ البداية و النهايه‌ج٣ ص٣١٣ دا هاتووه‌ ئیبن جه‌ریر له‌ عومه‌ره‌وه‌(رضي الله عنه) به‌ دوورو درێژی هێناویه‌تی،

[2]– ته‌به‌رانی له‌ موحه‌مه‌دی کوڕی جه‌عفه‌ری کوڕی زوبه‌یره‌وه‌(رضي الله عنه) به‌و جۆره‌ هێناویه‌تی، هه‌یسه‌می ج٨ ص٢٨٦ ده‌ڵێت: سه‌نه‌ده‌که‌ی باشه‌،

[3]– سه‌نه‌ده‌که‌ی حه‌سه‌نه‌، ته‌به‌رانیش له‌ ئه‌نه‌سه‌وه‌(رضي الله عنه) به‌ مه‌وصولی هێناویه‌تی (به‌ هه‌مان واتاو به‌ کورتی)، هه‌یسه‌می ج٨ ص٢٨٧ ده‌ڵێت: که‌سه‌کانی سه‌نه‌ده‌که‌ی صه‌حیحن، ئیبن منده‌ش به‌مه‌ وصولی له‌ ئه‌نه‌سه‌وه‌ (رضي الله عنه) هێناویه‌تی و ده‌ڵێت: فه‌رمووده‌که‌ غه‌ریبه‌و ته‌نها له‌ ئه‌بوعیمرانه‌وه‌ له‌م ڕووه‌وه‌ هاتووه‌، له‌ الاصابه‌ ج٣ ص٣٦ یشدا هاتووه‌.

واقیدی لە عبدوڵڵای کوڕی ئومەییە لە باوکیەوە هێنایەتی دەڵێت: کاتێك عومەیری کوڕی وەهب (رضي الله عنه) پاش موسڵمان بوونی هاتە مەککە لای خەڵکەکەی دابەزیو نەچوو بۆلای صەفوانی کوڕی ئومەییە، موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاندو بانگەوازی بۆ کرد، صەفوان ئەمەی بیستەوەو وتی: کە هاتەوەو یەکەمجار نەهاتەلای من زانیم لایداوە، بۆیە هەرگیز نایدوێنمو سوود بە خۆیو ژنو منالی ناگەیەنم، عومەیریش لە حیجردا بوو لەسەر سەری ڕاوەستاو بانگی کرد، ئەویش دەست بەرداری بوو عومەیر پێی وت: تۆ گەورەیەکی ئێمەیت چی دەڵێیت لەسەر پەرستنی بەردو شت سەربڕین بۆی؟ ئایا ئەمە ئایینە؟ شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواو موحەمەدیش بەندەو پێغەمبەری ئەوە، صەفوانیش هیچ وەڵامێکی نەدایەوە.[1] [2]

## (بانگەوازی ئەبوهورەیرە (رضي الله عنه))

موسلیم لە ئەبوهوڕەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: من دایکم بانگ دەکرد بۆ ئیسلام چونکە بێباوەڕبوو، ڕۆژێکیان بانگم کرد بۆ ئیسلامو ئەویش بەرامبەر بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەندێ قسەی ناشیرینی پێوتم، منیش چووم بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)و چاوبەگریان گەیشتمەلایو وتم: ئەی پێغەمبەری خوا من دایکم بۆ ئیسلام بانگ دەکرد کەچی ڕازی نەبوو، ئەمڕۆ کە بانگم کرد بۆ ئیسلام بەرامبەر بە تۆ قسەی وای وت کە پێی بێتاقەت بووم، دەی لە خوا بپاڕێرەوە تا دایکی ئەبوهوڕەیرە ڕێنموونی بکات، ئەویش فەرمووی (اللهم اهدي ام ابي هريرة) واتە(خوایە دایکی ئەبوورەیرە ڕێنموونی بکە) منیش بە خۆشحاڵیەوە چوومو

---

[1] – ضعیف.

[2] – لە الاستیعاب ج٢ ص٤٨٦ دا هاتووە، پێشتر باسمانکرد کە عومەیر هەوڵیدا صەفوان بەرەو ئیسلام بهێنێت.

گەیشتمەوە بەر دەرگا دەبینم داخراوەو گوێم لە تەپەی پێی دایکم بوو کەوتی ئەبوهوڕەیرە مەیەژوورەوە، گوێم لە شڵقەی ئاوبوو، جلەکەی کردەبەری و هەنگاوەکانی خێراکردو دەرگاکەی کردەوەو وتی: ئەبوهورەیرە شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواو موحەمەدیش پێغەمبەری خوایە، منیش گەڕامەوە بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و بۆم گێڕایەوە، ئەویش سوپاسی خوای کردو قسەی خێری کرد.[1]

ئیبن سەعد ج٤ ص٣٢٨ لە ئەبوهورەیرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: سوێند بە خوا هەر موسڵمانێك ناوی منی بیستبێت خۆشی ویستووم، دەڵێت وتم: ئەمە چۆنە؟ دەڵێت وتی: من دایکم بانگ دەکرد بۆ ئیسلام، ئینجا ئەو فەرموودەی پێشوو دێنێت و لە کۆتاییەکەشیدا ئەمەش دێنێت: هاتم بە گریانی خۆشیەوە خۆم گەیاندە پێغەمبەری خوا چۆن پێشتر لە خەفەتا دەگریام، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا موژدەبێت خوا نزاکەی گیراکردیت و دایکی ئەبوهوڕەیرەی ڕێنموونی کرد بۆ ئیسلام، پاشان وتم: ئەی پێغەمبەر لە خوا بپاڕێرەوە تا من و دایکم لای باوەڕداران و هەر موسڵمانێك خۆشەویست بکات، ئەویش فەرمووی (اللهم حبب عبيديك هذا وامه الى كل مؤمن و مؤمنة) واتە(خوایە ئەم بەندەت لەگەڵ دایکیدا لای هەموو باوەڕدارێکی نێرینەو مێینە خۆشەویست بکە) ئیتر هەر موسڵمانێك ناوی منی ببیستایە خۆشی دەویستم؟

[1] –ئەحمەدیش هێناویەتی، لە الاصابة ج٤ ص٢٤١ یشدا هاتووە.

## (بانگەوازی ئوم سولەیم (رضي الله عنها))

ئەحمەد لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی ئەبوتەلحە (رضي الله عنه) چوویە داوای ئوم سولەیم(رضي الله عنها) واتە پێش موسڵمان بوونی، ئەویش وتی: ئەبوتەلحە نازانیت ئەو خوایەی دەیپەرستیت لە زەویەوە هاتووە؟ وتی: با، وتی: دەی شەرم ناکەیت دارێك دەپەرستیت؟ ئەگەر موسڵمان بوویت مارەییەکەم با بەس ئەوە بێت، ئەویش وتی: بابزانم، چوو و هاتەوەو شایەتومانی هێنا، ئەویش وتی: ئەنەس مارەم بڕە لە ئەبوتەلحە، ئەویش مارەی بڕی.[1]

## (بانگەوازی هاوەڵان لەناو هۆزەکانی عەرەبدا)

### (بانگەوازی زەمامی کوڕی سەعلەبە لەناو بەنی سەعدی کوڕی بەکردا)

ئیبن ئیسحاق لە ئیبن عەبباسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: بەنوسەعدی کوڕی بەکر زەمامی کوڕی سەعلەبەیان نارد بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەویش چوو بۆلای و وشترەکەی لەبەردەم دەرگای مزگەوتدا بەجێهێشت، دوایی بەستیەوەو چوویە مزگەوتەوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەناو هاوەڵانیدا دانیشتبوو، زەمام کەسێکی قژ درێژی خاوەن پرچ بوو کە دووپرچی هەبوو، هات تا لەبەردەم پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) لەبەردەم هاوەڵانیدا وەستاو وتی: کامتان کوڕی عەبدولموتەلیبە؟پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (انا ابن عبد المطلب) من، وتی: موحەمەد، فەرمووی بەڵێ، وتی: ئەی کوڕی عەبدولموتەلیب من لە مەسەلەیەکدا پرسیارت لێ دەکەمو لێت تووڕەم دەی وریای خۆت بە، ئەویش فەرمووی (لا اجد في نفسي فسل عما بدالك) واتە(هیچ لەخۆما شك نابەم، دەی پرسیار لەسەر ئەوەبکە کە وای دەبینیت) ئەویش وتی: بۆ خاتری خوای تۆو خوای ئەوانەی پێشووتو ئەوانەی دواتریشت ئایا خوا تۆی بە پێغەمبەری ناردووە بۆ ئێمە؟ فەرمووی (ئەرێ بەخوا) (اللهم بعم) وتی: دەی بۆ خاتری خوای خۆتو ئەوانەی پێش تۆو دوای تۆ خوا فەرمانی پێی کردوویت تا

---

[1] – ئیبن سەعدیش بەو واتایە هێناویەتی. لە الاصابة ج٤ ص٤٦١ یشدا هاتووە.

فەرمانمان پێ بکەیت بە تەنها ئەو بپەرەستین و هیچ هاوەڵێکی بۆ دانەنێین و واز لەو بتانە بهێنین کە باو باپیرانمان پەرەستویانن؟ فەرمووی: ئەرێ بەخوا، وتی: سوێندت دەدەم بە خوای خۆت و ئەوانی پێش خۆت و دوای خۆت خوا فەرمانی پێ کردوویت تا ئەو پێنج نوێژە بکەیت؟ فەرمووی: بەڵێ، پاشان فەرزەکانی ئیسلامی هێنا، فەرزی زەکات و ڕۆژو و حەج و شەریعەتەکانی ئیسلام و لە هەرکامیاندا سوێندی دەدا تا لە هەموویان بوویەوە وتی: دەی شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواو موحەمەدیش پێغەمبەری خوایەو ئەو فەرزانە بەجێ دەگەیەنم دوور دەکەومەوە لەوەی دووره پەرێزیت لێ کردوون، ئیتر زیادو کەمی تیا ناکەم، پاشان گەڕایەوە بەرەولای وشترەکەی،پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی (ان صدق ذوالعقیصتین دخل الجنة) واتە(ئەگەر خاوەن دووپرچ ڕاست بکات دەچێتە بەهەشتەوە)، ئینجا ڕەشوەی وڵاخەکەی کردەوەو گرتی و چوویەوە بۆ ناو هۆزەکەی و هەموویان لەدەوری کۆبوونەوە، یەکەم قسە کردی ئەوەبوو: ئای لە خراپی و پیسی لات و عوززا، ئەوانیش وتیان: وس بە زەمام، لە نەخۆشی پێشت بترسە کە تووشت نەبێت، بترسە لەوەی تووشی شێتی نەبیت، ئەویش وتی قوڕتان بەسەر بەخوا ئەم دووانە سوودو زیان ناگەیەنن، خوا پێغەمبەرێکی ناردووەو کتێبێکی بۆ دابەزاندووە کە لەو بارەتان ڕزگارتان دەکات، من شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواو موحەمەدیش بەندەو پێغەمبەری ئەوە، من لەلای ئەوەوە فەرمان و ڕێگریەکانم بۆ هێناون، سوێند بەخوا ئێوارە نەهات تا هەموو ژن و پیاویان موسڵمان بوون، ئیبن عەبباس(رضي الله عنه) دەڵێت: نەمان بیستووە وەفدی هیچ هۆزێك چاکتر بێت لە زەمامی کوڕی سەعلەبە، ئەحمەدیش لە ڕێگەی ئیبن ئیسحاق و ئەبوداودیش لەو ڕێگەوە هێناویەتی، واقدیش دەڵێت: ئێوارەی ئەو ڕۆژە نەهات تا هەموو ژن و پیاویان موسڵمان بوون و مزگەوتیان بنیادناو بانگیاندا[1].

---

[1] – حسن.

# (بانگەوازی عەمری کوڕی مورەی جوهەینی (رضي الله عنه) لەناو هۆزەکەیدا)

ڕەویانی و ئیبن عەساکیر لە عەمری کوڕی مورەی جوهەینیەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: لە سەردەمی نەزانیدا بە کۆمەڵێکی هۆزەکەمەوە هاتین بۆ حەج و لە خەومدا بینیم لە مەککە بووم کە ڕووناکیەکی درەوشاوە لە کەعبەوە دەرکەوت تا شاخی یەسریبی بۆ ڕۆشن کردمەوە، لە ڕووناکیەکەوە گوێم لە دەنگێک بوو دەیوت: ستەمکاران لەناو چوون و ڕووناکی دەرکەوت و کۆتای پێغەمبەران نێردرا، پاشان ڕووناکیەکی تری دایەوە و سەیری کۆشکەکانی حیرە و سپیایی مەدائینم کرد، لە ڕووناکیەکەوە گوێم لە دەنگێک بوو دەیوت: ئیسلام سەرکەوت و بتەکان شکان و پەیوەندی خزمایەتی گەیەنرا، منیش لە ترسا بێداربوومەوە و پێم وتن: سوێند بەخوا لەم شوێنەی قورەیشدا ڕووداوێك دەبیستن، وتم کە چ خەوێکم بینیوە، کە گەیشتینەوە وڵاتی خۆمان هەواڵهات کەسێك بە ناوی ئەحمەدەوە نێردراوە، منیش چووم تا گەیشتمە لای و وتم چ خەوێکم بینیوە؟ ئەویش فەرمووی (ئەی عەمری کوڕی مورە، من پێغەمبەری نێردراوم بۆ هەموو بەندەکان و بانگیان دەکەم بۆ ئیسلام). (و امرهم بحقن الدماء و صلة الارحام، وعبادة الله وحده، و رفض الاصنام، و بحج البيت، و صيام شهر رمضان – شهر من اثنى عشر شهرا– فمن اجاب فله الجنة ومن عصى فله النار، فامن يا عمرو، يؤمنك الله من هول جهنم) واته(فەرمانیان پێ دەکەم تا خوێن نەڕێژن و پەیوەندی خزمایەتی بگەیەنن و خوای تەنها بپەرستن و بەرپەرچی بتەکان بدەنەوە و حەج بکەن و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان

---

[1]- لە البداية والنهاية ج٥ ص٦٠ دا واهاتووە. حاکم لە المستدرك ج٣ ص٥٤ لە ڕێگەی ئیبن ئیسحاقەوە هێناویەتی و دواتر دەڵێت: بوخاری و موسلیم لەسەر هاتنی زەمام بۆ مەدینە و چوونی یەکدەنگن و هیچ کامیان بە دوورو درێژی فەرموودەکەیان نەهێناوە، ئەمەش صەحیحە، زەهەبیش لەسەری یەکدەنگە و دەڵێت صەحیحە.

بگرن، مانگێك لەناو دوانزە مانگدا، هەرکەس بێت بەدەم ئەمەوە بەهەشتی بۆ دەبێت، هەرکەسێکیش سەرکەش بێت دۆزەخی بۆ هەیە، ئەی عەمر دەی بڕوابهێنە خوا دەتپارێزێت لە گوڕو تینی دۆزەخ) منیش شایەتومانم هێناو وتم: باوەڕم هێنا بە هەرچی حەڵاڵو حەرامێك کە دەیڵێیت، پاشان چەند دێرشە شعرێکم لەسەر وت کاتێك بیستم هاتووە، بتێکمان هەبوو کە باوکم سادینی(خزموتکاری) بوو، منیش هەستامو شکاندم، پاشان گەیشتم بە پێغەمبەر(ﷺ)و دەموت:

شهدت بان الله حق و انني — الالهة الاحجار اول تارك

و شمرت عن ساق الازار مهاجرا — اجوب اليك الوعث بعد الدكادك

لاصبح خير الناس نفسا و والدا — رسول مليك الناس فوق الحبائك

پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (مرحبا يا عمرو) وتم: بە دایكو باوکمەوە بە قوربانت بم بمنێرە بۆلای هۆزەکەم بەڵکو خوای گەورە بەهۆی منەوە منەتباریان بکات وەك چۆن تۆ منەتبارت کردم، ئەویش ناردمی و فەرمووی (عليك بالرفق والقول السديد ولاتكن فظا ولامتكبرا ولاحسودا) واتە(نەرمونیانبەو قسەی دروست بکەو ڕەقو توندو خۆبەزلزانو حەسوود مەبە) منیش چوومەوە لای هۆزەکەمو وتم: بەنی ڕەفاعە بەڵکو ئەی کۆمەڵی جوهەینە من نێردراوی خوام بانگتان دەکەم بۆ ئیسلامو فەرمانتان پێ دەکەم تا خوێن نەڕێژنو پەیوەندی خزمایەتیتان هەبێتو خوای تاكو تەنها بپەرستنو بت نەپەرستنو حەج بکەنو ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرن کامتان ڕازی بوو بەهەشتی بۆ دەبێت، کامیشتان یاخی بوو دۆزەخ بەشیەتی، ئەی کۆمەڵی جوهەینە خوای گەورە بە چاکترینی ئەوانەی لەونو ئەوەی لای عەرەبی تر خۆشەویست بوو لە سەردەمی نەفامیتاندا لای ئێوە ناشیرینی کردووە، چونکە ئەوان دووخوشکیان پێکەوە دەهێناو لە مانگی حەرامدا شەڕیاندەکردو کەسێك لە دوای باوکی ژنەکەی باوکی دەهێنایەوە، دەی وەرن بەدەم ئەم پێغەمبەرەوە کە لە بەنی لوئەی کوڕی غالبدا نێردراوە، بەوە سەربەرزو بەڕێزی دونیاو دواڕۆژ دەبن، هەرکامیان دەهات بۆلام دەیوت: ئەی عەمری کوڕی مورە خوای گەورە ژیانی والێکردوویت، فەرمانمان پێ دەکەیت تا واز لە خواوەندەکانمان بهێنینو یەکدەنگیمان نەهێڵینو لە ئایینی باو باپیرانمان واز بهێنین بۆ ئەوەی ئەو قورەیشیەی ناو

توهامە بانگەشەی بۆدەکات؟ ئەوە هیچ خۆشەویستی و ڕێزداریکی تێدا نیە، پاشان پیسێکیان ئەم شعرەی وت:

| | |
|---|---|
| ان ابن مرة قد اتى بمقالة | ليست بمقالة من يريد صلاحا |
| اني الاحسب قوله فعاله | يوما وان طال الزمان ذباحا |
| ليسفه الاشياخ ممن قد مضى | من رام ذالك لاصاب فلاحا |

عەمریش وتی ژیانی درۆزنمان تاڵ بکات و زمانی لە گۆ بخات و سەری سپی بکات، سوێند بەخوا نەمردو کوێربوو و عەقڵی لە دەستداو نان خواردنی نەبوو، عەمری کوڕی ئەسلەمیش لەلایان چوو تا هاتنە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەویش سەلامی لێکردن و بەخێرهاتنی کردن و نامەیەکی بۆ نووسین بەم جۆرە:

(بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان)

(هذا كتاب من الله العزيز على لسان رسوله بحق صادق وكتاب ناطق مع عمرو بن مرة لجهينة بن زيد، ان لكم بطون الارض وسهولها وتلاع الاودية وظهورها على ان ترعو انياتها وتشربوا ماءها على ان تؤدوا الخمس وتصلوا الخمس وفي الغنيمة والصريمة شاتان اذا اجتمعا فان خرفتنا فشاة شاة ليس على اهل المثيرة صدقة ولا على الواردة لبقة، والله شهيد على ما بيننا ومن حضر من المسلمين)[1] (ئەمە نامەیەکی خوای بەدەسەڵاتە لەسەر زاری پێغەمبەرەکەی بە حەقێکی راست و کتێبێکی دەربڕ کە بە عەمری کوڕی موررەیە بۆ زەیدی کوڕی جوهەینە، ئاوو دەشت و دەرو دۆڵ و سەری زەویتان بۆ هەیە تا درەخت و گیای سەرپەرشتی بکەن و ئاوی بخۆنەوە بەرامبەر بەوەی پێنج یەك بدەن و پێنج نوێژەکە بکەن و لە دەستکەوتی صەریمەشدا دوو بەرخ ئەگەر کۆبوونەوە، ئەگەر جیابونەوە یەك یەك، لەسەر خەڵکی......خواش شاهیدە لەسەر ئەوەی لەنێوان ئێمەو ئامادەبوانی موسڵمانانندا هەیە).

---

[1]- قەیسی کوڕی شەمامە نووسی. لە كنز العمال ج٧ ص٦٤ دا هاتووە، هەروەها ئەبونەعیم بەدووروو درێژی هێناویەتی، لە البداية والنهاية ج٢ ص٣٥١ داهاتووەو تەبەرانی بە دووروو درێژی هێناویەتی،لە المجمع ج٨ ص٢٤٤ دا هاتووە.

## (بانگەوازی عوروەی کوڕی مەسعود (رضي الله عنه) لەناو سەقیفدا)

تەبەرانی لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی: کاتێك خەڵکی لە ساڵی نۆی کۆچیدا هاتن بۆ حەج عوروەی کوڕی مەسعود (رضي الله عنه) بە موسڵمانی هاتە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و مۆڵەتی خواست تا بچێتەوە ناو هۆزەکەی، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (دەترسم بتکوژن) فەرمووی ئەگەر بە خەوتوویی بمبینن بێدارم ناکەنەوە، پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) مۆڵەتی پێداو عوروەش بە موسڵمانی گەڕایەوە ناو هۆزەکەی و شەو گەڕایەوەو سەقیف لە دەوری کۆبوونەوە، ئەویش بانگی کردن بۆ ئیسلام، ئەوانیش تۆمەتباریان کردو قسەی ناشیرینیان پێوتو کوشتیان، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (نمونەی عوروە وەك نمونەی یاسین وایە کە هۆزەکەی خۆی بانگکرد بۆلای خواو ئەوانیش کوشتیان)[1,2].

ئیبن سەعد ج٥ ص٣٦٩ لە واقیدیەوە لە عەبدوڵلای کوڕی یەحیا لە چەند کەسێکی زاناوە هێناویەتیو بە دوورو درێژی فەرموودەکەی هێناوە، تیایدا هاتووە: شەو گەیشتەوە تائیف و چوویەوە ماڵی خۆی، سەقیفیش هاتنە لای و سەلامکردنی سەردەمی نەفامن لێکرد، ئەویش ڕێگری لیٚ کردن و وتی: سەلامی بەهەشتیەکان بڵێن (السلام) ئەوانیش ئازاریان داو لە دژی هەستان، ئەویش نەرمی نواند و ئەوانیش چوون و بیلالیان بۆ دانا، کە بەیانی هات چوویە ژوورێکیەوە و نوێژی دابەست، سەقیف لە هەموو لایەکەوە بۆی هات و کەسێك لە بەنی مالیك کە پێی دەوترا ئەوسی کوڕی عەوف تیرێکی بۆ وەشاند و دای لە چاوی، بەڵام خوێنی نەڕشت، غەیلانی کوڕی سەلەمە و کینانەی کوڕی عەبدیالیل و حەکیمی کوڕی عەمر و ناودارانی ئەحلاف هەستان و نەوینە چەك و کۆبوونەوە و وتیان یان

---

[1] - ضعیف.

[2] - هەیسەمی ج٩ ص٣٨٦ دەڵێت: تەبەرانی هێناویەتی، لە زوهریشەوە هاتووە، هەردووکیان بەمورسەلی هێناویانەو سەنەدەکەیان حەسەنە، حاکمیش ج٣ ص٦١٦ بەو واتایە هێناویەتی.

هەموومان دەکوژرێین یان لە تۆڵەیدا گەورەی بەنی مالیك دەکوژینەوە، کاتێك عروە ئەمەی بینی وتی: لەسەرمن شەڕ مەکەن لە خوێنی خۆم بوراوم تا بەوە صوڵحی نێوانتان بکەم، چونکە ئەمە ڕێزی خوایە و شەهادەتێکە کە خوا پێی بەخشیوم، شایەتی دەدەم موحەممەد پێغەمبەری خوایە و ئەو پێی فەرمووم کە ئێوە من دەکوژن، پاشان دەستەو کەسی خۆی بانگکرد و وتی ئەگەر مردم لەگەڵ ئەو شەهیدانەدا بە خاکم بسپێرن کە لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) پێش ئەوەی لێرە بچێت شەهید بوون، دواتر مرد و ئەوانیش وەسیەتەکەیان بە جێگەیاند،ئەم هەواڵە گەیشتەوە لای پێغەمبەر (ﷺ) و ئەویش ئەو فەرموودەیەی پیشووی فەرموو، پێشتر لە باسی ئاکار و بەها بەرزەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) کە بوونە هۆی ڕێنموونی خەڵك باسی موسڵمان بوونی سەقیفمان کردووە.[1]

## (بانگەوازی توفەیلی کوڕی عەمری دەوسی (رضي الله عنه) لەناو هۆزەکەیدا)

ئەبونەعیم لە الدلائل ص٧٨ لە موحەممەدی کوڕی ئیسحاقەوە هێناویەتی دەڵێت: (ﷺ) چی لە هۆزەکەی ببینیایە ئەوپەڕی ئامۆژگاری دەکردن و بانگی دەکردن تا لە دەست ئەو بارەی تیایدان ڕزگاریان بێت، کاتێك خوا قورەیشی لەو پێغەمبەرە بێبەش کرد (قورەیش نەیانتوانی ڕێی ڕاست بگرن) کەوتە بێدارکردنەوەی خەڵك لێی و هەر عەرەبێك بهاتایە بۆلایان دەیانوت وریای بە، توفەیلی کوڕی عەمری دەوسیش دەڵێت هاتووە بۆ مەککە، ئەوکات (ﷺ) لەوێ بووە، کەسانی قورەیش هاتن بۆلای، توفەیل کەسێکی پیاوماقوڵی شاعیری هەڵکەوتوو بوو، پێیانوت توفەیل تۆ هاتوویت بۆ وڵاتمان ئەم کەسەی لە نێوانماندایە دووبەرەکی خستووین و قسەکانی وەك جادوو ناکۆکی دەخەنە نێوان

[1] - ضعیف.

کوڕو باوك و براو ژن و مێردەوە، دەترسێین تۆو هۆزەکەشت دووچاری ئەم دەردەبن، بۆیە مەیدوێنەو گوێی بۆ مەگرە، سوێند بەخوا هێندەیان پێوتم تا ئەوەی وتم هیچ گوێی لێناگرم و نایدوێنم تا کاتێك چووم بۆ مزگەوت لۆکەم کردە گوێم نەوەك شتێکی لێ ببیستم کە نەمەوێت گوێی لێبگرم، چووم بۆ مزگەوت دەبینم پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەلای کەعبە نوێژ دەکات، منیش لە نزیکەوە وەستام، بەڵام خوای گەورە وای لێکردم گوێم لە هەندێ قسەی بێت، قسەیەکی جوانم بیست و لە دڵی خۆمدا وتم دایکم ڕۆڵە ڕۆم بۆ بکات من کەسێکی زمانپاراو و شاعیرم و هیچ چاك و خراپێکم لێ شاراوە نیە، دەی بۆچی گوێی لێ نەگرم؟ ئەگەر ئەوەی باشبێت لێی وەردەگرم، ئەگەرنا بەجێی دێڵم، مامەوە تا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەرەو ماڵەوە چوویەوە، کەوتمە شوێنی تا چوویە ماڵەوەو منیش چووم بۆلای و وتم: ئەی موحەمەد هۆزەکەت دەڵێن تۆ ئەمەو ئەوە دەڵێیت تائەوەی سوێند بەخوا ترساندمیان لە تۆ و گوێم پڕکرد لە لۆکە تا قسەت نەبیستم، بەڵام دواتر ویستی خوا وابوو هەندێ شت ببیستم و شتێکی جوانم بیست، دەی باسی خۆتم بۆ بخەڕوو، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) ئیسلامی بۆ خستەڕوو و قورئانی بەسەردا خوێندەوە، توفەیل وتی: سوێند بەخوا هەرگیز قسەیەکی لەوە چاکترو دروست و ڕێك و پێکترم نەبیستووە، بۆیە موسڵمان بووم و شایەتومانی حەقم هێنا و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا من لەناو هۆزەکەمدا کەسێکم گوێڕایەڵی دەکرێم، من دەگەڕێمەوە بۆ ناویان و بانگیان دەکەم بۆ ئیسلام، دەی لای خوا نزام بۆ بکە تا بەڵگەیەکم پێبدات تا ببێتە پشتیوانم لەسەریان وپاڵپشتی بانگەوازم بێت لەلایان، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (اللهم اجعل له اية) منیش چوومەوە بۆلای هۆزەکەم تا گەیشتمە دووڕیانێك خێرا ڕووناکیەك لە نێوچەوانمدا وەك چرا دەرکەوت وتم خوایە با لە دەم و چاوانمدا نەبێت چونکە دەترسم واگومان ببەن ئەمە سزایەکەو دووچاری دەم و چاوم بووە لەبەرئەوەی وازم لە ئایینی ئەوان هێناوە، خێرا گۆڕاو کەوتە سەر قامچیەکەم، ئیدی کەسی ئامادەبوو قامچیەکەی بەو ڕووناکیەوە وەك چرای هەڵواسراو دەبینی، منیش لە

دووڕیانەکەوە دابەزیم بۆلایان تاهاتمەوە ناویان، کە دابەزیم باوکم – کە پیاوێکی پیر بوو– هات بۆلام، وتم: باوکە گیان وەرە ئەمەم لێوەربگرە، نەمن بۆ تۆو نە تۆش بۆ منی، وتی: ئەی بۆچی کوڕی شیرینم؟ وتم: موسڵمان بووم و کەوتمە شوێن ئایینی موحەمەد (ﷺ)، باوکیشم وتی: ئایینی من ئایینی تۆیە، هەستاو خۆشی شۆردو جل و بەرگی پاك ڕاگرت و دواتر هات و منیش ئیسلامم بۆ خستەڕوو و ئەویش موسڵمان بوو، پاشان هاوسەرەکەم هات بۆلام و پێم وت: من و تۆ لەیەك جیاین، وتی بۆ؟ بە دایك و باوکمەوە بە قوربانتبم، وتم: ئیسلام نێوانی من و تۆی جیاکردۆتەوە، ئەویش موسڵمان بوو، دەوسم بانگ کردن بۆ ئیسلام کەچی خێرا نەهاتن بە دەممەوە، پاشان هاتنە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) لە مەککەو وتم: ئەی پێغەمبەری خوا دەوس بەسەرمدا زاڵ بوون نزایان لێ بکە، ئەویش فەرمووی (اللهم اهد دوسا، ارجع الى قومك وافق بهم) واتە(خوایە ڕێنموونی دەوس بکەیت، بگەڕێرەوە بۆلایان و لەگەڵیان نەرمبە) منیش گەڕامەوە نەکەوتمە بانگەوازیان بۆ ئیسلام تا پێغەمبەر(ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینەو بەدرو ئوحودو خەندەق ڕوویدا، پاشان لەگەڵ ئەوانەی موسڵمان ببون هاتم بۆ خەیبەر بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) تا حەفتا یان هەشتا ماڵی دەوسیم لە مەدینە دانا.[1]

ئیبن عەبدولبیر لە الاستیعاب ج٢ ص٢٣٢ ڕێگەکەی ئومەوی لە ئیبنولکەلبی لە ئەبوصالح لە ئیبن عەبباس لە توفەیلی کوڕی عەمرەوە دێنێت و چیرۆکی موسڵمان بوونی و بانگەوازی بۆ باوکی و ژنەکەی و هۆزەکەی و هاتنی بۆ مەککە بەوشێوەی

---

[1]– لە البدایە والنهایە ج٣ ص١٠٠ لە ئیبن ئیسحاقەوە بە زیادەیەکی کەمەوە هاتووە، لە الاصابة ج٢ ص٢٢٥ دا دەڵێت: ئیبن ئیسحاق لە هەموو نوسخەکاندا بەبێ سەنەد هێناویەتی، لەیەکێك لە نوسخەکانی المغازی ج٢ ص٢٢٥ دا گێڕدراوەتەوە لە ڕێگەی صاڵحی کوڕی کەیسان لە توفەیلی کوڕی عەمرەوە لە چیرۆکی موسڵمان بوونیدا بە دوورو درێژی هێناویەتی، هەروەها ئومەوی لە ئیبنولکەلبیەوە بە سەنەدێکی دیکە هێناویەتی، بەم کورتیە تەواوبوو،

پێشوو دێنێت، دواتر باس لەوە دەکات دەستەی ناردووە تا بتی (ذي الكفين) بسوتێنێت، پاشان چووە بۆ یەمامەو لە خەویدا چی بینیوەو لەوێ لە ڕۆژی یەمامە شەهید بووە، لە الاصابة دا دەڵێت: ئەبوفەرەجی ئەصفەهانی لە ڕێگەی ئیبنولکەلبیەوە هێناویەتی کە توفەیل کاتێك هات بۆ مەککە خەڵکێکی قورەیش باسی پێغەمبەریان دەکردو داوایان لێکرد لە حاڵی بپرسێتەوە، ئەویش هات‌و شیعرێکی بۆ خوێندەوە، پێغەمبەریش (عليه السلام) سورەتی الاخلاص‌و الناس‌و الفلق ی بۆ خوێندەوە، ئەویش یەکسەر موسڵمان بوو و گەڕایەوە ناو هۆزەکەی، باسی چراو ڕێنومایيەکەشی دەکات، دەڵێت: باوك‌و دایکی بانگ کرد بۆ ئیسلام و باوکی موسڵمان بوو بەڵام دایکی موسڵمان نەبوو، بانگەوازی هۆزەکەشی کرد، تەمها ئەوبهورەیرە (رضي الله عنه) چوو بەدەمیەوە، پاشان هات بۆلای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و وتی: قەڵایەکی پتەو و ڕێگرێکت هەیە واتە خاکی دەوس، کاتێك پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نزای بۆ کرد توفەیل پێی وت: حەزم بەوە نەدەکرد، ئەویش فەرمووی نمونەی وەك تۆی زۆری تیایە، جەندوبی کوڕی عەمری کوڕی حەمەمەی کوڕی عەوف دەوسی لە سەردەمی نەفامیدا دەیوت: ئەم بوونە دروستکراوێکی هەیە بەڵام نازانم کێیە، کاتێك هەواڵی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) بیست بە حەفتاو پێنج کەسی هۆزەکەیەوە هات‌و موسڵمان بوون ئەبوهورەیرە دەڵێت: جوندوب یەك یەك دەیبردنە پێشەوە پێشتریش باسمانکرد کە عەلی(رضي الله عنه) لەناو هۆزی هەمداندا بانگەوازی کرد.[1]

---

[1] - ضعيف.

# (ناردنی هاوەڵان بە تاك و كۆمەڵ بۆ بانگەواز)

بەیهەقی لە الدلائل لە ئەبو ئومامەی باهیلیەوە لە هیشامی كوڕی عاصی ئومەویەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: من و كەسێكی دیكە نێردراین بۆلای هرقلی بەرپرسی ڕۆم تا بانگی بكەین بۆ ئیسلام، ئێمەیش چووین تا هاتینە (غووتە) واتە(دیمەشق) لەلای جەبەلەی كوڕی ئەیهەمی غەسانی دابەزین و چووین بۆلای دەبینین پاڵی داوەتەوە، نێردراوێكی نارد بۆ لامان و دواندینی، ئێمەش وتمان سوێند بە خوا لەگەڵ نێردراودا قسە ناكەین، ئێمە نێردراوین بۆ لای پاشا، ئەگەر مۆڵەتمان دەدات دەیدوێنین ئەگەرنا لەگەڵ نێردراودا قسە ناكەین، نێردراوەكەش چوویەوە بۆلای و پێی وت، ئەویش مۆڵەتی داین و وتی: قسەبكەن، هیشامی كوڕی عاصیش دواندی و بانگی كرد بۆ ئیسلام، جلێكی ڕەشی لەبەربوو، هیشام پێی وت: ئەمەت بۆ چی پۆشیوە؟ وتی: پۆشیومە و سوێندم خواردووە لای نەبەم تا لە شامەوە بێم بەرەو ڕووتان، وتمان: سوێند بە خوا ئەو شوێنەشت لێ دەسێنین و پشت بەخوا دەسەڵاتی گەورەت دەبەین، پێغەمبەرەكەمان موحەمەد (صلى الله عليه وسلم) هەواڵی ئەوەی پێداوین، وتی: ئێوە لەوانە نین، ئەوانە بەڕۆژ بەڕۆژوو دەبن و بە شەویش نوێژ دەكەن، ئینجا بە دوورو درێژی فەرموودەكە دێنێت وەك لە باسی پاڵپشتە غەیبیەكاندا دەیهێنین[1][2].

ئەبونەعیم لە الدلائل (ص٩) لە موسای كوڕی عوقبەی قورەیشیەوە هێناویەتی هیشامی كوڕی عاص و نەعیمی كوڕی عەبدوڵڵا و كەسێكی دیكە كە ناوی نەهاتووە نێردراین بۆلای پاشای ڕۆم لە سەردەمی ئەبوبەكردا (رضي الله عنه) ئێمەیش چووین بۆلای جبلای كوڕی ئەبهەم كە لە غەوتە بوو، جلێكی ڕەشی لەبەربوو و هەموو شتێكی دەورووبەری ڕەش بوو، وتی: هیشام بیدوێنە، ئەویش دواندی و بانگی كرد بۆلای خوای گەورە، ئینجا بە دوورو درێژی فەرموودەكەی هێناوە.

---

[1] - ضعیف.

[2] -حاكمیش بە دوورو درێژی هێناویەتی، لە تەفسیری ئیبن كەسیر ج٢ ص٢٥١ یشدا بە هەمان شێوە هاتووە.

# (هاوەڵان نامە دەنێرن بۆ بانگەوازی ڕێی خواو هاتنە ناو ئیسلام)

## (نامەی زیادی کوڕی حارس بۆ هۆزەکەی)

بەیهەقی لە زیادی کوڕی حارسی صەدائیەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: هاتم بۆلای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و بەیعەتی موسڵمان بوونم پێداو هەواڵم بیست سوپایەکی ناردووە بۆ هۆزەکەم، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا سوپاکە بگەڕێنەرەوە موسڵمان بوون و گوێڕایەڵبوونی هۆزەکەم بۆت لەسەر من، ئەویش فەرمووی: دەی بڕۆ سوپاکە بگەڕێنەرەوە، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا وڵاخەکەم پێی نەماوە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) کەسێکی ناردو سوپاکەی گێڕایەوە صەدائی دەڵێت: نامەیەکم بۆ نووسین و وەفدێکیان بە موسڵمانبوونیانەوە هاتن، پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (یا اخا صداء انك لمطاع في قومك) واتە(تۆ لە ناو هۆزەکەتدا گوێڕایەڵ کراویت) منیش وتم بەڵکو خوای گەورە ڕێنموونی کردن بۆ ئیسلام، ئەویش فەرمووی (افلا أؤمرك عليهم؟) واتە نەتکەمە بەرپرسیان؟ وتم: با، ئەی پێغەمبەری خوا، ئەویش نامەیەکی بۆ نووسیم و کردمی بە بەرپرسیان، منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا شتێك لە سەدەقەیان بدە بە من، فەرمووی: بەڵێ، ئینجا نامەیەکی دیکەی بۆ نووسیم، صەدائی دەڵێت ئەمە لە هەندێ سەفەویدا بووە پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لە شوێنێك دابەزیوەو خەڵکی ئەوێ هاتوون بۆلای و سکاڵایان لە کاربەدەستەکەی کردووەو دەیانوت: شتێکی لێ سەندوین کە لە سەردەمی نەفامیدا لە نێوان ئەو و هۆزەکەیدا هەبووە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) پرسی ئایا شتی وای کردووە؟ وتیان: بەڵێ، ئەویش لای کردەوە بەلای هاوەڵانیداو منیش لە نێوانیاندا بووم، فەرمووی (لا خير في الامارة لرجل مؤمن) صەدائی دەڵێت قسەکەی لە دەرونمدا چەسپا و دواتر کەسێکی تر هات بۆلای، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) پێم ببەخشە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (من سال الناس عن ظهر غنى فصداع في الراس وداء

في البطن)(هەرکەس بە دەوڵەمەندی داوا لە خەڵك بکات ئەوە ژانەسەرو دەردە سکە)، داواکارەکەش وتی: لە سەدەقە شتێکم پێ ببەخشە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (ان الله یرضی في الصدقات بحکم مني ولا غیره حتی حکم هو فیها، فجزاها ثمانیة اجزاء، فان کنت من تلك الاجزاء اعطیتك) واتە(خوا لە سەدەقەکاندا بە حوکمی من و کەسی دیکەش ڕازی نیە تا خۆی حوکمی لەسەر بدات، ئینجا کردی بە هەشت بەشەوەو فەرمووی ئەگەر یەکێکیت لەوانە پێت دەبەخشم)، ئەم قسەش چوویە دەروونمەوە کە من دەوڵەمەند بوومو داوای سەدەقەشم لێکرد، ئینجا فەرموودەکە دێنێت، صەدائی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) کە نوێژی کرد چووم بۆلای و دوونامەکەم بۆ بردو وتم ئەی پێغەمبەری خوا لەم دووشتە دوورم بخەرەوە فەرمووی (ما بدا لك؟) واتە(چیت دیوە؟) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا گوێم لێبوو فەرمووت (لا خیر في الامارة مؤمن) منیش بڕوام بە خواو پێغەمبەرەکەی هەیە، گوێم لێت بوو بە داواکارەکەت فەرموو (من سال الناس عن ظهر غنی فهو صداع في الراس وداء في البطن) منیش دەوڵەمەندم کەچی داوام لێکردیت، فەرمووی (هو ذاك، فان شئت فاقبل وان شئت فدع) واتە(وایە ئەگەر دەتەوێت قبوڵی بکە، ئەگەر نا وازی لێ بهێنە) وتم: وازدێنم، پێغەمبەریش (ﷺ) پێی فەرمووم (دەی کەسێکم پێ بڵێ با بیکەم بە بەرپرستان، منیش یەکێك لە ئەندامانی ئەو وەفدەم پێ وت کە هاتبوون بۆلای، ئەویش کردی بە بەرپرسیان.[1][2]

---

[1] - ضعیف.

[2]- لە البدایة والنهایە ج٥ ص٨٣ دا واهاتووە. بەغەوی و ئیبن عەساکیریش بە دوورو درێژی هێناویانە، دەڵێت: فەرموودەکە حەسەنە، وەك لە الکنز العمال ج٧ ص٣٨ یشدا هاتووە، ئەحمەدیش بە دوورو درێژی هێناویەتی، لە الاصابە ج١ ص٥٥٧ دا هاتووە. تەبەرانی بە دوورودرێژی هێناویەتی، هەیسەمی ج٥ ص٢٠٤ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا عەبدولڕەحمانی کوڕی زیادی کوڕی ئەنعوم هەیە کە لاوازە، ئەحمەدی کوڕی صاڵحیش متمانەی پێدەداتو بەرپەرچی هەرکەس دەداتەوە قسەی لەسەر بکات، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە جێ متمانەن.

# (نامەی بوحەیری کوڕی زوهەیری کوڕی ئەبووسەلما (ﷺ) بۆ کەعبی برای)

حاکم ج٣ ص٥٧٩ لە ئیبراهیمی کوڕی مونزیری حزامی لە حەجاجی کوڕی زی روقەیبەی کوڕی عەبدورەحمانی کوڕی کەعبی کوڕی زوهەیری کوڕی ئەبوسەلمای موزەنی لە باوکیەوەو لە باپیریەوە هێناویەتی دەڵێت: کەعب و جوبەیر کە دوو کوڕی زوهەیر بوون کەوتنەڕێ تا هاتنە (ئەبرەق عەززاف) جوبەیر بە کەعبی وت: لێرەبە تا دەچمە لای ئەو پیاوە واتە پێغەمبەر(ﷺ) و گوێی لێ دەگرم، ئەویش مایەوەو جوبەیر هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەریش (ﷺ) ئیسلامی بۆ خستەڕوو و جوبەیریش موسڵمان بوو، کەعب ئەمەی بیست وتی:

| | |
|---|---|
| الا ابلغا عني بجيرا رسالة | على اي شيئ ويب غيرك دلكا |
| على خلق لم تلف اما ولا ابا | عليه ولم تدرك عليه اخا لكا |
| سقاك ابوبكر بكاس روية | و انهلك المامون منها و علكا |

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) ئەم دێڕانەی بیست خوێنی ڕەواکردو فەرمووی هەرکەس گەیشت بە کەعب با بیکوژێت، جوبەیر ئەمەی نووسی بۆ براکەی و پێی وت پێغەمبەر(ﷺ) خوێنی ڕەواکردووە، پێی دەوت: فریاکەوە با لەناو نەچیت، پاشان ئەمەی بۆ نووسی (بزانە پێغەمبەر(ﷺ) هەرکەس بێت بۆلای و شایەتی بدات هیچ پەرەستراوێك نیە جگە لە خواو موحەمەدیش پێغەمبەری خوایە لێی قبوڵ دەکات،ئەگەر ئەم نامەت گەیشتە دەست موسڵمان بەو وەرە) ئەویش موسڵمان بوو و قەسیدەیەکی وتو تیایدا وەسفی پێغەمبەر(ﷺ)ی دەکرد، پاشان هاتو لە بەردەم دەرگای مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) وڵاخەکەی بەستەوەو چوویە مزگەوت، پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ هاوەڵانیدا دانیشتبوو و هەموو لە دەوری چەند بازنەیەکیان بەستبوو، هەرجارەو لای دەکردەوە بەلای کۆمەڵێکیاندا و دەیدواندن، کەعب دەڵێت: لە بەردەرگای مزگەوتدا وڵاخەکەم بەستەوەو پێغەمبەرم (ﷺ) بە سیفاتەکانیدا ناسیەوە، چوومە پێشەوەو لەلای دانیشتمو سەلامم لێ کردو وتم: شایەتی دەدەم هیچ پەرەستراوێك نیە جگە لە خواو تۆش پێغەمبەری خوایت، پەنام بدە ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی (تۆ کێیت؟) وتم: من

کەعبی کوڕی زوهەیرم، فەرمووی (تۆ کە دەتوت) پاشان سەیری ئەبوبەکر (رضي الله عنه) کردو فەرمووی (ئەی چی دەوت؟) ئەبوبەکریش (رضي الله عنه) ئەمەی وتەوە:

سقاك ابوبكر بكاس روية — و انهلك المامور منها و علكا

وتی ئەی پێغەمبەری خوا شتی وام نەوتووە، فەرمووی ئەی چیت وتووە؟ وتی وتومە:

سقاك ابوبكر بكاس روية — و انهلك المامون منها و علكا

فەرمووی سوێند بەخوا وایە، پاشان هەموو چیرۆکەکەی پێ وت تا تەواوی کرد، قەسیدەکە دێنێت.

حاکمیش ج٣ ص٥٨٢ لە ئیبراهیمی کوڕی مونزیر لە موحەمەدی کوڕی فلیح لە مووسای کوڕی عوقبەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بە کەعبی کوڕی زوهەیری دەفەرموو (بانت سعاد) لە مزگەوتی مەدینە، کاتێك کەعب بیستی وتویەتی:

ان الرسول ليسف يستضاء به — و صارم من سيوف الله سلول

في فتية من قريش قال قائلهم — ببطن مكة لما اسلموا زولوا

پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەسەر قۆڵی ئاماژەی بە خەڵکەکەدا تا بیبیستن، جوبەیری کوڕی زوهەیر نامەی نووسیبوو بۆ کەعبی کوڕی زوهەیری کوڕی ئەبوسەلمای برای و دەیترساندو بانگی دەکرد بۆ ئیسلام، چەند دێڕێکی لەسەر وت:

من بلغ كعبا؟ فهل لك في التي — تلوم عليها باطلا؟ و هي احزم

الى الله لا العزى ولا اللات وحده — فتنجو اذا كان النجاء و تسلم

لدى يوم لاينجو و ليس بمفلت — من النار الا طاهر القلب مسلم

فدين زهير وهو لا شيئ باطل — ودين ابي سلمى علي محرم[1]

---

[1]- حاکم ج٣ ص٥٨٣ دەڵێت فەرموودەکە چەند سەنەدێکی هەیە ئیبراهیمی کوڕی مونزیری خرامی کۆی کردوونەتەوە، فەرموودەکەی موحەمەدی کوڕی فولیح لە موسای کوڕی عوقبەوەو فەرموودەکەی حەجاجی کوڕی زیروقبە صەحیحن، موحەمەدی کوڕی ئیسحاقی قورەیشی لە (المغازی) دا بە کورتی هێناویەتی و بە سەنەدەکەی دەیداتەوە لای ئیبن ئیسحاق.تەبەرانیش لە ئیبن ئیسحاقەوە هێناویەتی، هەیسەمی ج٩ ص٣٩٤ دەڵێت: کەسەکانی تائیبن ئیسحاق جێ متمانەن، ئیبن ئەبی عاصمیش لە فەرموودە (ئاحادو مەسانیەکاندا) لە یەحیای کوڕی عەمری کوڕی جورەیج لە ئیبراهیمی مونزیر لە حەجاجەوە هێناویەتی، لە الاصابة ج٣ ٢٩٥ دا هاتووە. بەیهەقیش لە ئیبن مونزیرەوە بەهەمان سەنەد هێناویەتی، لە البداية والنهاية ج٤ ص٣٧٢ یشدا هاتووە.

# (نامەی خالیدی کوڕی وەلید بۆ خەڵکی فارس)

تەبەرانی لە ئەبووائیلەوە(ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: خالیدی کوڕی وەلید (ﷺ) نامەی بۆ خەڵکی فارس نووسی و بانگی کردن بۆ ئیسلام:

(بە ناوی خوای بەخشندەو میهرەبان)

لە خالیدی کوڕی وەلیدەوە بۆ ڕەسیم (ڕۆستەم) و مەهران و فارسەکان سەلام لەو کەسەی شوێن ڕێنموونی دەکەوێت، پاشان بانگتان دەکەم بۆ ئیسلام، ئەگەرنا سەرانە بدەن و ژێردەستە دەبن، ئەگەرنا کەسانێکم لەگەڵدان حەزیان لەوەیە لە پێناو خوادا بکوژرێت وەك سەرمەستەکان، سەلامی خوا لەوەی ڕێنموونی دەگرێتەبەر).[1]

ئیبن حەجەریش ج٢ ص٥٥٣ لە موجالید لە شەعبیەوە هێناویەتی دەڵێت: بەنوبەقلیە نامەکەی خالیدی کوڕی وەلیدیان بۆ خەڵکی مەدائین پێ خوێندمەوە:

(لە خالیدی کوڕی وەلیدەوە بۆ مەرزەبانەکانی خەڵکی فارس سەلامی خوا لەوەی ڕێنموونی دەگرێتەبەر، پاشان سوپاس بۆ ئەو خوایەی خزمەتی شکاندن و موڵکی نەهێشتن و فێڵی ڕسواکردن هەرکەس نوێژمان بکات و ڕووبکاتە ڕووگەمان و سەربڕاومان بخوات و ئەو موسڵمانەیە کە ئەرك و مافی ئێمەی هەیە، پاشان ئەگەر ئەم نامەم گەیشت پێتان دوو کەسم پێ بگەیەنن و زیممەی من ببەستن، ئەگەرنا سوێند بەوکەسەی جگە لەو هیچ پەرەستراوێك نیە خەڵکێکتان بۆ دەنێرم چەندە ئێوە حەز بە ژیان دەکەن ئەوان هێندە حەز بە مەرگ دەکەن). کاتێك نامەکەیان خوێندەوە پێی سەرسام بوون، ئەمەش لە ساڵی دوانزەدا بوو.

ئیبن جەریر لە مێژووەکەیدا ج٢ ص٥٥٤ لە موجالیدەوە لە شەعبیەوە هێناویەتی دەڵێت: خالید (ﷺ) نامەی نووسی بۆ هورموز پێش ئەوەی لەگەڵ ئەزاز بەی باوکی ئەبوزبازبەکانی ناو یەمامە دەرچێت، هورموزی بەرپرسی ئەوکاتی سەرسنوور بوو،

[1]-هەیسەمی ج٥ ص٣١٠ دەڵێت: تەبەرانی گێڕاویەتەوەو سەنەدەکەی حەسەنە یان صەحیحە، حاکمیش لە المستدرك ج٣ ص٢٩٩ لە ئەبووائیلەوە هێناویەتی،

خالید نووسی (پاشان موسڵمان بە پارێزراو دەبیت یان زیممە بۆخۆت و گەلەکەت ببەستەو سەرانەبدە، ئەگەرنا سەرکۆنەی کەس مەکە، چونکە کەسانێکم بۆ هێناویت وەك حەزی ئێوە بۆ ژیان حەزیان لە مەرگە).

ئیبن جەریر (ج٤ ص٥٧١) بە سەنەدی خۆی هێناویەتی خالید کە دەستیگرت بەسەر دوولای سوادیدا کەسێکی خەڵکی حیرەی بانگ کردو نامەیەکی نارد بۆ خەڵکی فارس کە لە هەمەدان بوون و ڕاجیاوازبوون لەسەر مەرگی ئەردەشێر ببونە پاڵپشتی یەك، بەڵام بەهمەن جازەوەیهیان لە بوهیرسیر دانا وەك ئەوەی لە پێشەوە بێت، ئەم کەسە چەند نموونەیەکی لەگەڵدا بوو، دوو کەسی بە دوونامەوە بانگ کرد، یەکێکیان بۆ کەسانی تایبەت و ئەوی دیکەش بۆ خەڵکی گشتی، یەکێکیان خەڵکی حیرەو ئەوی دیکەش نەبتی بوو، خالید بە نێردراوی خەڵکی حیرەی وت: ناوت چیە؟ وتی: مورە، وتی: ئەو نامە بگرەو بیبە بۆ خەڵکی فارس بەڵکو خوای گەورە ژیانیان بەڕێ بکات یان موسڵمان ببن یان تەوبە بکەن، بە نێردراوی سەلوبای بای وت: ناوت چیە؟ وتی: هیرقیل، وتی: ئەو نامە بگرەو وتی: خوایە لەناویان ببەیت، ئیبن جەریر دەڵێت: ئەمە دوونامەکەن:

(بە ناوی خوای بەخشندەو میهرەبان)

(لە خالیدی کوڕی وەلیدەوە بۆ پاشایانی فارس، پاشان سوپاس بۆ ئەو خوایەی سیستمی هەڵوەشاندنەوەو فێڵی نەهێشت و یەکدەنگی نەهێشتن، ئەگەر ئەوەی تووش نەکردنایە خراپ دەبوو بۆتان، دەی وەرنە ڕیزمانەوە وازتان لێدەهێنین و خاکتان بۆ خۆتان و وەك خەڵکی تر ڕێتان دەدەین، ئەگەرنا کەسانێك بەسەرتاندا زاڵ دەبن کە هێندەی ئێوە حەز بە ژیان دەکەن ئەوان هێندە حەز بە مەرگ دەکەن).

(بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان)

(لە خالیدی کوڕی وەلیدەوە بۆ مەرزەبانەکانی فارس، پاشان موسڵمان بن پارێزراو دەبن، ئەگەرنا لە منەوە زیممە وەربگرن و سەرانە بدەن، ئەگەرنا کەسانێکتان بۆ دەنێرم هێندەی حەزی ئێوە بۆ ژیان حەزیان لە مەرگە). تەواو.

# (بانگەوازی هاوەڵان (رضي الله عنه) لە شەڕدا لە سەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دا)

حەسەنی کوڕی سوفیان و ئەبونەعیم لە عەبدولڕەحمانی کوڕی حەسانی کینانی یەوە هێناویانە دەڵێت: موسلیمی کوڕی حاریسی کوڕی موسلیمی تەمیمی بۆی گێڕامەوە باوکی بۆی گێڕاوەتەوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە سریەیەکەوە ناردوونی، دەڵێت: کاتێك گەیشتینە شوێنی هەڵمەت بردن غاری ئەسپەکەمم داو شوێنی هاوەڵانم کەوتم و بە دەنگ و هەراوە بەرەو ڕوویان چووین، پێم وتن: بڵێن لااله الا الله پارێزراو و براوە دەبن، ئەوانیش وتیان، هاوەڵانم هاتن و لۆمەیان کردم و وتیان لە دەستکەوت بێبەشت کردین پاش ئەوەی هاتبوویە بەردەستمان، کاتێك چووینەوە ئەمەیان گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئەویش بانگی کردم و دەستخۆشی لە کارەکەم کرد و فەرمووی (اما ان الله قد كتب لك من كل انسان منهم كذا و كذا) واتە (بزانە خوای گەورە لەسەر هەرکامیان هێندە و هێندە خێری بۆ نووسیت) عەبدولڕەحمان وتی: من هۆکاری ئەوە بووم، پاشان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (اما اني ساكتب لك كتاب واوصى بك من يكون بعدي من ائمة المسلمين) نامەکەی بۆ نوسی و مۆری کرد و پێی فەرمووم (ئەگەر نوێژی بەیانیت کرد پێش ئەوەی کەس بدوێنیت بڵێ: اللهم اجرني من النار، حەوت جار بیڵێ، چونکە ئەگەر ئەو ڕۆژە بمریت خوای گەورە بۆت دەنووسێت لە ئاگر پارێزراویت، ئەگەریش نوێژی ئێوارەت کرد پێش ئەوەی کەس بدوێنیت بڵێ: اللهم اجرني من النار (خوایە بمپارێزە لە دۆزەخ) حەوت جار بیڵێ، ئیتر ئەگەر ئەو شەوە بمریت خوای گەورە بۆت دەنووسێت لە ئاگر پارێزراویت)، کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەفاتی کرد هاتن بۆلای ئەبوبەکر (رضي الله عنه) و نامەکەم دایە دەست و کردیەوە و خوێندیەوە و بۆی نووسیم و مۆری کرد، پاشان هێنام بۆ عومەریش (رضي الله عنه) ئەویش هەروای کرد، هێنام بۆ عوسمانیش (رضي الله عنه) هەروای کرد، موسلیمی کوڕی حارس دەڵێت لە سەردەمی

خیلافەتی عوسماندا(رضي الله عنه) حارس مردو نامەکەی لای ئێمە بوو تا عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (رضي الله عنه) دەسەڵاتی وەرگرت، ئەکات نامەی بۆ کاربەدەستمان نووسی کە موسلیمی کوڕی حارسی کوڕی موسلیمی تەمیمی بەو نامەی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) کە بۆ باوکی نووسی بوو بنێرە بۆلام، منیش چووم بۆلای و خوێندیەوەو بۆی نووسیمو مۆری کرد[1][2].

واقیدی لە موحەمەدی کوڕی عەبدوڵلای زوهەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کەعبی کوڕی عومەیری غەففاری (رضي الله عنه) بە پانزە کەسەوە نارد تا گەیشتنە (ذات اصلاح) لە شام، دەبینین کە دەستەیەکی زۆر کۆبوونەتەوە، بانگیان کردن بۆ ئیسلامو ئەوانیش نەهاتن بە دەمیانەوە و تیربارانیان کردن، کاتێك هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەمەیان بینی بەسەختی لەگەڵیان بەشەڕ هاتن تا شەهیدبوون، بریندارێکیان لەناو شەهیدەکاندا مایەوە کە شەوی بەسەردا هات کەمە کەمە چوو تا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هات ویستی بنێرێت بەشوێنیاندا، ئەویش پێی گەیاند کە چوون بۆ شوێنێکی دیکە[3][4].

ئیبن سەعد لە الطبقات ج٢ ص١٢٧ دا لە واقیدیەوە لە موحەمەدی کوڕی عەبوڵلا لە زەهریەوە بەو جۆرە هێنایەتی، ئیبن ئیسحاقیش لە عەبدوڵلای کوڕی ئەبوبەکرەوە هێناویەتی کە ئەو ڕۆژە کەعبی کوڕی عومەیر کوژرا، موسای کوڕی عوقبەش لە ئیبن شەهابو ئەبولئەسوەد لە عوروەوە هێناویانە، لە الاصابة ج٣ ص٣٠١ یشدا هاتووە دەڵێت: ئیبن سەعد لە چینی سێیەمدا هێناویەتی کە ئەمە لە ربیع الاول ی ساڵی هەشتەمی کۆچیدا بووە، بەیهەقی لە ڕێگەی واقیدی لە

---

[1] – ضعیف.

[2] – لە کنز العمال ج٧ ص٢٨ دا واهاتووە لە المنتخب ج٤ ص١٦٢ یشدا واهاتووە.

[3] – ضعیف.

[4] – لە البدایە ج٤ ص٢٤١ وا هاتووە.

موحەمـەدی کـوڕی عەبـدوڵڵای موسـلیم لـە زوهریـەوە هێناویـەتی دەڵێـت: کاتێـك پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) لـە عـەمرەی قـەزا لـە زیلحەجـەی سـاڵی حەوتـدا گەڕایـەوە ئـیبن ئەبولعـەوجائی سـەلمی (رضي الله عنه) بـە پـەنجا سـوارەوە نـارد، هـەواڵگر چـوو بۆنـاو هۆزەکەی و بێداری کردنەوەو هەواڵی پێدان، ئەوانیش کۆبوونەوەو هاتن بۆ ئیبن ئەبولعوجائو لەوپەڕی ئامادەسازیدا بـوون، کاتێـك کـە هاوەڵـانی پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) ئەوانیان بینی بانگیانکردن بۆ ئیسلام، ئەوانیش گوێیـان لـێ نـەگرتن و تیربارانیـان کـردن و وتیـان: پێویـستمان بـە بانگەوازەکـەتان نیـە، ماوەیـەك تیربارانیـان کـرد و فریـاگوزاری دەهـات تـا لـە هـەموولاوە گەمارۆیان دان، شەڕێکی سەخت ڕوویدا تا هەموویان شەهید بوون و ئیبن ئەبیلعەوجائیش چەندین برینی تووش بوو، خۆی ڕاگرت تا بە هاوەڵانی هاودەمیەوە لە یەکەم ڕۆژی مانگی صەفەری ساڵی هەشتی کۆچیدا گەڕایەوە بۆ مەدینە[1].[2]

---

[1] – ضعیف.

[2]– لە البدایە والنهایە ج٤ ص٢٣٥ دا وا هاتووە. ئیبن سەعد لە الطبقات ج٢ ص١٢٣ دا بەبێ سەنەد بەوجۆرە هێناویەتی.

# (بانگەوازی هاوەڵان بۆلای خواو پێغەمبەرەکەی لە شەڕەکانی سەردەمی ئەبوبەکرداو وەسیەتی ئەبوبەکر بۆ سەرکردەکان تا بانگەواز لە شەڕدا بگرنەبەر)

بەیهەقی ج٩ ص٨٥ و ئیبن عەساکیر لە سەعیدی کوڕی موسەیبەوە هێناویانە کە ئەبوبەکر (رضي الله عنه) کاتێك سەربازی بەرەو شام نارد یەزیدی کوڕی ئەبوسوفیان و عەمری کوڕی عاص و شەرحەبیلی کوڕی حەسنەی دانا، کاتێك سوار بوون ئەبوبەکر لەگەڵ سەرکردەکانی سەربازاندا بەپێ دەڕۆیشت وماڵئاوایی لێ دەکردن تا گەیشتە دووریانی ماڵئاوایی، وتیان ئەی پێغەمبەری خوا (عليه السلام) تۆ بەپێ بڕۆیت و ئێمەش سوارین؟ وتی: من ئەم هەنگاوانە لە پێناوی خوادا دەنێم و چاوەڕێی پاداشتیان دەکەم، وەسیەتی بۆ کردن، وتی: وەسیەتتان بۆ دەکەم لە خوا بترسن، لە پێناو خوادا بجەنگن لەگەڵ هەرکەس بجەنگن بڕوای بەخوا نیە چونکە خوا خۆی ئایینەکەی سەردەخات، زیادەڕۆو ناپاك و ترسنۆك مەبن و لەسەر زەویدا خراپە مەنێنەوە، لە فەرمان لامەدەن، ئەگەر بەرەو ڕووی دوژمنی بێباوەڕ بوونەوە ئەگەر ویستی خوای لەسەر بوو ئەوا سێجار بانگیان بکەن بۆ ئیسلام، ئەگەر هاتن بەدەمتانەوە لێیان قبوڵ بکەن و وازیان لێبێنن، پاشان بانگیان بکەن تا لە وڵاتی خۆیانەوە بچنە وڵاتی کۆچەرانەوە، ئەگەر کردیان پێیان بڵێن هەمان ئەرك و ماف کۆچەرانیان هەیە، ئەگەریش هاتنە ناو ئیسلام و وڵاتی خۆیان پێ باشتر بوو پێیان بڵێن وەك موسڵمانەکانی دی (اعراب المسلمين) ئەو حوکمەی خوایان بەسەردا جێبەجێ دەکرێت کە بەسەر موسڵماناندا فەرزەو لە فەیئەو دەستکەوتدا پشکیان نیە تا ئەو کاتەی لەگەڵ موسڵماناندا جیهاد بکەن، ئەگەریش ڕازی نەبوون موسڵمان بن بانگیان بکەن بۆ سەرانە، ئەگەر کردیان باشە، ئەگەر نا پشت بەخوا ببەستن بە ویستی خوا لەگەڵیان بەشەڕ بێن، دارخورما نەبڕن و لەناومەبەن، بێهودە ئاژەڵ لەناو مەبەن، درەختی بەردار لەناو مەبەن، پەرستگاکانی جوولەکەو

مەسیحیەکان وێران مەکەن، منداڵو پیرو ژن مەکوژن، دواتر کەسانێك دەبینن لەناو پەرستگاکاندا خۆیان بەند کردووەو ماونەتەوە وازیان لێبهێنن با لە حاڵی خۆیاندا بن، کەسانێکی دیکە دەبینن لە ناوەڕاستی سەریاندا چەند هێمایەکیان بۆ شەیتان داناوە، جا ئەگەر ئەوانەتان بینی بە ویستی خوا لە ملیان بدەن.[1]

بەیهەقی ج٨ ص٢٠١ لە عورووەوە هێناویەتی کە ئەبوبەکری صدیق (رضي الله عنه) فەرمانی کردووە بە خالیدی کوڕی وەلید کاتێك ناردی بۆ لێدانی هەڵگەڕاوەکانی عەرەب تا بانگیان بکات بۆلای ئیسلامو بۆیان ڕوون بکاتەوە ئەركو مافیان چیەو سوور بێت لەسەر ڕێنموونیان. هەرکامیان ڕازی بوون ڕەشو سپیو سوور جیاوازیان نیەو لێیان وەربگرێت، تەنها لەگەڵ کەسێکدا شەڕ بکات کە بڕوای بەخوا نەبێت، ئەگەر ئەو کەسەی بانگەواز دەکرێت بەرەو ئیسلام ڕازی بوو لێ نادرێت، خواش خۆی ئاگای لێیە، هەرکەسیش نەهات بەدەم بانگەوازی ئیسلامەوەو لەسەر هەڵگەڕاندەوەکەی سوور بوو دەکوژرێت.[2]

ئیبن جەریری تەبەری ج٢ ص٥٥١ لە ئیبن حەمید لە سەلەمە لە ئیبن ئیسحاق لە صالحی کوڕی کەیسانەوە هێناویەتی کە خالید لە حیرە دابەزیو پیاوماقوڵانی ئەویٚ لەگەڵ قوبەیصەی کوڕی ئیسای کوڕی حەییەی تائیدا بەروو ڕووی چوون، قوبەیصە لەلایەن کیسراوە لە دوای نوعمانی کوڕی مونزیر دانرابوو، خالید بە قوبەیصەو هاوەڵانی وت: بانگتان دەکەم بۆلای خواو ئیسلام، ئەگەر ڕازی بوون ئەوا ئەركو ماق موسڵمانانتان هەیە، ئەگەرنا سەرانە بدەن، ئەگەر سەرانەش نادەن ئەوا کەسانێکم بۆ هێناون لە سوور بوونی ئێوە بۆ ژیان زیاتر لەسەر مەرگ سوورن،

[1]– لە الکنز العمال ج٢ ص٢٩٥ دا واهاتووە، مالیكو عەبولڕەزاقو بەیهەقیو ئیبن ئەبی شەیبەش لە یەحیای کوڕی سەعیدو بەهیەقی لە صالحی کوڕی کیسانو ئیبن زەنجەویەش لە ئیبن عومەرەوە (رضي الله عنه) بە کورتی هێناویانە، لە الکنز العمال ج٢ ص٢٩٥ یشدا هاتووە.

[2] – لە الکنز العمال ج٣ ص١٤٣ دا واهاتووە.

لەگەڵتان دەجەنگین تا خوا نێوانمان لەگەڵتان یەکلا دەکاتەوە، قوبەیصەش وتی: پێویستمان بە شەڕی ئێوە نیە، لەسەر ئایینی خۆمان دەمێنینەوەو سەرانە دەدەین، ئەویش لەسەر نەوەد هەزار درهەم لەگەڵیان ڕێککەوت.[1]

بەیهەقی ج٩ ص ١٨٧ لە ڕێگەی یونسی کوڕی بەکیر لە ئیبن ئیسحاقەوە هێناویەتی و تیایدا دەڵێت خالید وتی: بانگتان دەکەم بۆ ئیسلام و شایەتیدان لەسەر ئەوەی هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خوای تاك و تەنها و موحەممەدیش بەندەو نێردراوی خوایەو نوێژبکەن و زەکات بدەن و دان بنێن بە حوکمی موسڵماناندا، بەوە ئەرك و مافی موسڵمانانتان هەیە، هانئیش وتی: ئەی ئەگەر ئەوەم نەوێت چی دەبێت؟ وتی: ئەگەرنا سەرانە بدەن، وتی: ئەگەر ئەوەمان نەکرد؟ وتی: ئەوا کەسانێکتان بە گژدا دەدەم کە لە حەزتان بۆ ژیان زیاتر حەزیان بە مەرگە، هانئیش وتی: ئەمشەو دەرفەتمان بدە تا بیری لێ بکەینەوە، ئەویش وتی: باشە، بۆ بەیانی هانیئ وتی: لەسەر ئەوە یەکدەنگ بووین سەرانە بدەین دەی وەرە با لەگەڵت ڕێك بکەوین، ئینجا چیرۆکەکە دێنێت، لە البدایە والنهایە ج٧ ص٩ دا دەڵێت: کاتێك خەڵکی لە ڕۆژی یەرموکدا لەیەك نزیك بوونەوە ئەبوعوبەیدەو یەزیدی کوڕی ئەبوسوفیان لەگەڵ زیراری کوڕی ئەزوەرو حارسی کوڕی هیشام و ئەبوجەندەلی کوڕی سەهل پێشکەوتن و وتیان: ئیشمان بە سەرکردەکەتانە تا لەگەڵی کۆببینەوە، ڕێیان پێدراو چوونە لای تەزاریق دەبینین لە چادرێکی ئاوریشمدا دانیشتووە، هاوەڵان وتیان: بە ڕەوای نازانین بێینە ناویەوە، ئەویش وتی: دەی فەرشێکی ئاوریشمیان بۆ ڕاخەن، وتیان لەسەر ئەوەیش دانانیشین، ئەویش بە حەزو ڕازیبوونی ئەوان دانیشت و ڕێککەوتنی لەگەڵ بەستن و هاوەڵانیش پاش ئەوەی بانگیان کردن بۆلای خوای گەورە گەڕانەوە، بەڵام ئەمە نەگەیشتە کۆتا.

---

[1] - ضعیف.

له البدایه و النهایه ج٧ ص ١٢ دا له واقیدیو کەسانی دیکەشەوە هاتووە کە دەڵێن: جورجەی سەرکردەیەکی گەورەی ڕیزەکە (واته ڕۆژی یەرمووك) هاتو داوای خالیدی کوڕی وەلیدی کرد، هات بۆلای تا ملی ئەسپەکانیان دەیاندا لە یەکتر، جورجە وتی: خالید بەڕاست پێم بڵێو درۆم لەگەڵ مەکە، چونکە کەسی ئازاد درۆ ناکات فێڵم لێ مەکە چونکە کەسی بەڕێز فێڵ ناکات لە کەسێك کە خوای بە شاهید داناوە، ئایا خوا لە ئاسمانەوە شمشێری بۆ پێغەمبەرکەتان دابەزاندوەو داویەتە دەست تۆ، چونکە لە ڕووی هەرکەسدا بەرزی دەکەیتەوە دەیشکێنیتو بەسەریدا سەردەکەویت؟ وتی: نا، وتی: ئەی بۆچی پێت دەوترێت شمشێری خوا؟ وتی: خوای گەورە پێغەمبەری خۆی لەناوماندا نارد بانگی کردینو ئێمەش لێی دوورکەوتینەوەو هەموو لە دژی بووین پاشان هەندێکمان بڕوایان پێ هێناو شوێنی کەوتنو هەندێکمان بە درۆی زانیو لێی دوورکەوتنەوە، من لەوانە بووم کە بە درۆم داناو لێی دوورکەوتمەوە پاشان خوا دڵی پاك کردینەوەو ڕێنموونی کردینو بەیعەتماندا بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، ئەویش پێی فەرمووم (تۆ شمشێرێکی خوایت کە خوا دژ بە بێباوەڕان بەرزی کردووتەوە (هەڵی گرتووە)) نزای سەرکەوتنی بۆ کردم، بۆیە ئەو نازناوەم لێنرا، جا من لە هەموو موسڵمانان زیاتر توندم لەسەر بێباوەڕان.

جورجە وتی خالید بانگەواز بۆچی دەکەن؟ وتی: شایەتیدان لەسەر ئەوەی هیچ خوایەك نیە جگە لە خوا و موحەممەد بەندە و نێردراوی خوایە و داننان بەوەی لە لای خواوە هاتووە، وتی ئەی هەرکەس بەمە ڕازی نیە و نایەت بە دەمتانەوە چی؟ وتی: سەرانە دەدات و ئێمەش دەیپارێزین، وتی: ئەی ئەگەر ئەوەش نەدات؟ وتی: شەڕە یان لەگەل دەکەین، وتی: ئەی ئەگەر کەسێك ئەمڕۆ بێتە ناو ئیسلامەوە پلەوپایە و ماف چیە؟ وتی: (فەرزی خوا بەسەر گەورە و بچووك و یەکەم و کۆتامانەوە یەك شتە، جورجە وتی: ئەی هەرکەس ئەمڕۆ بێتە ناوتان هەمان پاداشت و خەزێنەی ئێوەی هەیە؟ وتی: بەڵێ، بەڵکو چاکتریش، وتی چۆن

پێشکەوتوون کە چی لەگەڵتاندا یەکسانە؟ خالید وتی: ئێمە کتوپڕ ئەمەمان قبووڵ کرد و بەیعەتمان بە پێغەمبەرمان دا، ئەوکات لە ناوماندا بوو و لە ئاسمانەوە هەواڵی بۆ دەهات و پێی دەوتین و ئایەتەکانی پێی نیشان دەداین و حەق بوو هەرکاممان کە دەمانبینی و لێمان دەبیست باوەڕی پێ بهێنین و بەیعەتی پێ بدەین، بەڵام ئێوە ئەوەتان نەبینیوە و ئەو سەرسوڕهێنەری و بەڵگانەتان نەبیستن کە ئێمە بیستمان و بینیمان، بۆیە هەرکام لە ئێوە بە ڕاستی و نیازی پاکەوە موسڵمان بێت لە ئێمە باشترە، جورجە وتی: سوێند بە خوا لەگەڵمان ڕاستت وت و فێڵت لێ نەکردووم؟ وتی: بەڵێ، سوێند بە خوا ڕاستم لەگەڵ کردویت و خوا شاهید بێ لەسەر ئەوەی پرسیارت لەسەر کرد، ئەوکات جورجە قوڵی لێهەڵکرد و بە خالیدی وت فێری ئیسلامم بکە، خالیدیش بردی بۆ چادرەکەی خۆی و بڕێك ئاوی بە سەردا کرد و دوایی دوو ڕکات نوێژی پێکرد، لەگەڵ هەڵگەڕاندنەوەی ئەو لە ڕۆم خێرا ڕۆمەکان هەڵمەتیان بردە سەر خالید چونکە پێیان وابوو ئەمە هەڵمەتە بۆ سەریان، بۆیە موسڵمانانیان لەو شوێنە دەرکرد جگە لە عەکرەمەی کوڕی ئەبووجەهل و حارسی کوڕی هیشام، خالیدیش لەگەڵ جورجە هەستا و سوار بوو و ڕۆمەکانیش لە دەوروبەری موسڵمانان بوون، خەڵکی هاواریان کرد و هەستان و ڕۆمەکانیش کشانەوە دواوە و خالید بە موسڵمانانەوە چوویە پێشەوە تا شەڕە شمشێر دەستی پێکرد، خالید و جورجەش لە بەرزایی خۆری نیوەڕۆوە تا ئاوابوونی خۆر شەڕیان کرد و موسڵمانان نوێژی نیوەڕۆ و عەسریان بە ئیما و کرد و جورجە ڕەحمەتی خوای لێبێت بریندار بوو و تەنها ئەو دوو ڕکات نوێژەی لەگەڵ خالید دا (رضي الله عنه) بۆ خوا کرد. ئیبن حەجەر لە الاصابە ج١ ص٢٦٠ دا دەڵێت: ئیبن یونسی ئەزدی لە (فتوح الشام)دا باسی کردووە، لە ڕێگەی ئەبونەعیم لە (الدلائل)یشدا هاتووە و دەڵێت جرجیر، سەیفی کوڕی عومەر لە (الفتوح)دا دەڵێت: جورجە، دەڵێت لەسەر دەستی خالید موسڵمان بوو و لە یەرمووك شەهید بوو،

ئەبوحوزەیفە ئیسحاقی کوڕی بشیر لە (الفتوح)دا چیرۆکەکەی دێنێت، بەڵام ناوی ناهێنێت.

لە البدایة و النهایە ج٦ ص٣٤٥ لە خالیدی کوڕی وەلیدەوە هێناویەتی کە لەناو خەڵکدا وتاری داوەو هانیداون بۆ وڵاتی عەجەمو وای کردووە چاویان لای وڵاتی عەرەب نەمێنێت، وتویەتی: نابینین لێرە چ بەخشینێك هەیە، سوێند بەخوا ئەگەر جیهادی ڕێی خوا و بانگەواز بۆ ئیسلام نەبوایەو تەنها ژیانو بژێوی هەبوایە ڕام وابوو لەسەر ئەم خاکە بجەنگین تا ببینە خاوەنی و لە برسێتیو کەمی بە دووربینو ئەوانەی لەسەری دەژی کەم بکەن نەوەك ئێوە.[1]

## (بانگەوازی هاوەڵان بۆ خواو پێغەمبەرەکەی لە شەڕدا لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتابدا(رضي الله عنه)و وەسیەتی عومەر بۆ سەرکردەکان تا لە شەڕدا بانگەواز بکەن)

ئەبوعوبەید لە یەزیدی کوڕی ئەبوحەبیبەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتاب (رضي الله عنه) نامەی نووسی بۆ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (رضي الله عنه) کە من نامەم بۆ نووسیویت تا بۆ ماوەی سێ ڕۆژ خەڵکی بانگ بکەیت بۆ ئیسلام، هەرکامیان لە پێش شەڕدا بە دەمتەوە هات ئەوا یەکێکە لە موسڵمانانو لە پشکی ناو ئیسلامدا وەك موسڵمانانە، هەرکامیشیان دوای شەڕ یان شکست هات بەدەمتەوە لە فەیئی موسڵماناندا پشکی نیە چونکە موسڵمانان لە پێش موسڵمان بوونی ئەودا بەدەستیان هێناوەن جا ئەمە فەرمانو نامەی منە بۆت.[2]

---

[1]- ئیبن جەریر لە مێژووەکەیدا ج٢ ص٥٥٩ لە ڕێگەی سەیف لە موحەمەدی کوڕی ئەبوعوسمانەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی.

[2] – لە الکنز العمال ج٢ ص٢٩٧ دا واهاتووە.

ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص١٨٩ لە ئەبولبوختەریەوە هێناویەتی سوپایەکی موسڵمانان کە لەلایەن سەلمانی فارسیەوە (رضي الله عنه) ڕێبەری دەکرا، گەمارۆی کۆشکێکی فارسییدا، وتیان ئەی ئەبوعەبدوڵڵا هەڵمەتیان بۆ نەبەین، وتی: ڕێم بدەم باوەك دەمبیست پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بانگەوازی دەکردن بانگیان بکەم بۆ ئیسلام، پێی وتن: من وەك ئێوە فارسێکم لە ئێوە، دەمبینن عەرەبەکان گوێڕایەڵیم دەکەن ئەگەر موسڵمان بن هەمان ماف ئێمەو هەمان ئەرکی ئێمەشتان هەیە، ئەگەر تەنها بە ئایینی خۆتان ڕازین باشە بەڵام سەرانەمان پێ بدەن و ژێردەستە دەبن بە فارسی قسەیەکی تایبەتی پێ وتن(بە جفرە دواندنی) کە ئێوە جێی سوپاس نین و ئەگەر ڕازی نەبن بە یەکسانی لە دژتان دەبین، ئەوانیش وتیان نەبڕوا دێنین و نە سەرانەش دەدەین بە دڵنیاییشەوە لەگەڵتاندا بەشەڕ دێین، وتیان: ئەی ئەبو عەبدوڵڵا هەڵمەتیان بۆ نەبەین؟ وتی: نا، سێ ڕۆژ بەوجۆرە بانگی کردن، پاشان وتی هەڵمەتیان بۆ ببەن و ئەو قەڵایان فەتح کرد، ئەحمەدیش لە موسنەدەکەیداو وەحاکم لە المستدرك وەلە نصب الرایة ج٣ ص٣٧٨ یشدا بەو واتایە هاتووەو تیایدا دەڵێت لە ڕۆژی چوارەمدا فەرمانی بە خەڵکەکە کردو هەڵمەتیان بۆ بردن و فەتحیان کرد.[1]

ئیبن جەریر ج٤ ص١٧٣ لە ئەبولبوختەریەوە هێناویەتی دەڵێت: گەورەی موسڵمانەکان سەلمانی فارسی بوو، موسڵمانان کردبوویان بە بانگخوازی خەڵکی فارس، عەتییە دەڵێت: کردیان بە بەرپرسی بانگکردنی خەڵکی بهسیر و لە ڕۆژی کۆشکی سپیشدا کردیان بە بەرپرس، ئەویش سێ ڕۆژ بانگەوازی بەرەو ئیسلامی بۆ خستنەڕوو، ئینجا فەرمودەکە لەسەر بانگەوازی سەلمانی فارسی (رضي الله عنه) بەو واتایە دێنێت.

[1] – ئیبن ئەبی شەیبەش هێناویەتی، لە الکنز العمال ج٢ ص٢٩٨یشدا هاتووە.

ئیبن کەسیر لە البدایە والنهایە ج٧ ص٣٨ دا دەڵێت: سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (رضي الله عنه) دەستەیەك لە گەورەکانی نارد، لەوانە نوعمانی کوڕی موقەرین و فوراتی کوڕی حەببان و حەنزەلەی کوڕی ڕەبیعی تەمیمی و عەتاردی کوڕی صاجب و ئەشعەسی کوڕی قەیس و موغەیرەی کوڕی شوعبە و عەمری کوڕی مەعدی یەکرب (رضي الله عنه) تا بچن ڕۆستەم بانگ بکەن بۆلای خوا، ڕۆستەم پێی وتن بۆچی هاتوون؟ وتیان: بەپێ بەڵێنی خوا بۆ ئێمە هاتووین تا وڵاتتان بگرین و ژن و منداڵتان بە کەنیزەك و کۆیلە بگرین و سامانتان ببەین و لەمەش زۆر دڵنیاین، ڕۆستەم لە خەویدا بینیبووی فریشتەیەك لە ئاسمانەوە دابەزیوە و کۆتایی بە هەموو چەکی فارس هێنابوو و دایبووی بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) دابووی بە عومەر (رضي الله عنه) سەیف لە مامۆستاکانیەوە دەیهێنێت دەڵێت کاتێك هەردوو سوپا بەروو ڕووی یەك بوونەوە ڕۆستەم ناردی بۆلای سەعد (رضي الله عنه) تا کەسێکی ژیرو زانای بۆ بنێرێت تا پرسیاری بۆ بنێرێت، ئەویش موعەیرەی کوڕی شوعبەی بۆنارد، کاتێك چوو ڕۆستەم پێی دەوت: ئێوە دراوسێی ئێمەن و ئێمەش چاکەمان بۆتان هەبوو و ئازارمان لەسەر لادەبرن، دەی بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆتان و ڕێ لە بازرگانیتان ناگرین بێتە وڵاتمان بەڵام بۆ شوێنانی تر هەقمان نیە، موغەیرە پێی وت: ئێمە بۆ ویستی دونیا نەهاتووین، بەڵکو ویست و داوامان ڕۆژی دواییە، خوا پێغەمبەرێکی بۆ ناردووین، پێی وت: من ئەم دەستە زاڵ دەکەم بەسەر ئەوەدا کە ئایینم وەرناگرێت، بەمانە تۆڵەیان لێدەستێنم و زاڵ دەبم بەسەریاندا تا ئەوەی دانی پێدا دەنێن چونکە ئایینی حەقە و تەنها زەلیلی خۆی لێ بەدوور دەگرێت و هەرکەسیش پشتی پێببەستێت عیزەتمەندە، ڕۆستەم پێی وت: ئەو ئایینە چیە؟ وتی: ئەو پایەی کە بەبێ ئەو ناکرێت شایەتیدانە بەوەی هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواو موحەمەدیش پێغەمبەری خوایە و داننان بەوەی لە خواوە هاتووە، ئەویش وتی: چەند جوانە، چیتر؟ وتی: دەرکردنی بەندەکان لە پەرستشی بەندەکانەوە بۆ پەرستشی خوا، وتی ئەمیش باشە، چیتر؟ وتی: خەڵکی هەمووی نەوەی ئادەمن،

بـران لـە دایـك و باوكـەوە، وتـیش ئـەمیش باشـە، دواتـر وتـی: ئەگـەر بێینـە نـاو ئایینتانـەوە لـە وڵاتمـان دەگەڕێنـەوە؟ وتـی: ئـەرێ بـەخوا، پاشـان مەگـەر تـەنها بـۆ بازرگانی یان ئیشێك بێینە وڵاتتان، وتی: ئەمەش باشە، كاتێك موغەیرە لەلای چوو ڕۆستەم لەگەڵ گەورەكانی گەلەكەیدا لەسەر ئیسلام قسەی كرد، بەڵام ئەوان ڕازی نەبوون بێنە ناو ئیسلام (خوا ڕسواو سەرشۆڕیان بكات، وایشی پێكردن) پاشان سەعد نێردراوێكی دیكەی ناردە لای لەسەر داوای ڕۆستەم، ئەویش ڕەبیعی كوڕی عامیر بوو، هات بۆلای و سەیردەكات بە پشتی زێڕین و ڕایەخی ئاوریشم و مرواری نیشاندان و شتی گرانبەها و ڕازاندنەوەیەكی گەورەوە شوێنەكەیان ڕازاندوەتەوە، و ڕۆستەمیش تاجەكەی خۆی لەسەرە لەگەڵ چەندین شتی دیكەی ڕازاندنەوەی گرانبەهادا، ڕۆستەم لەسەر ڕاخەرێكی زێڕین دانیشتبوون ڕەبیعی بە جلێكی سادەو شمشێرو ئەسپێكی كورتەوە چوو بۆلای، هێندە سواری ببو تا شوێن پێی چاك كوتابوویەوە، پاشان دابەزی و بەستیەوە و بەرەو پێش چوو، چەك و قەڵغان و كڵاوەكەی لەسەر سەری بوو، پێیان وت: چەكەكەت دابنێ، ئەویش وتی: من نەهاتووم بۆلاتان بەڵكو لەسەر داوای خۆتان هاتووم ئەگەر ڕێ دەدەن بەمجۆرەبم باشە ئەگەر نا دەگەڕێمەوە، ڕۆستەم وتی: ڕێی بدەن، ئەویش ڕمەكەی كردبوو بە گاڵۆك و لەسەر پشتیە دایدەنا هەموان بێزاربوون و پێیان وت: بۆچی هاتووی؟ وتی: خوای گەورە ئێمەی ناردووە تا بە ویستی خوا بەندەكان لە پەرستشی بەندەوە بەرەو پەرستشی خوا ببەین، لە تەنگەبەری دونیاوە بەرەو فراوانی دونیا ببەین، لە ستەمی ئایینەكانەوە بۆ دادوەری ئیسلام ببەین، بەم ئایینەی خۆیەوە بۆ بەدەكانی ئێمەی ناردووە تا بەندەكان بانگ بكەین بۆلای ئیسلام هەركەس بەمە ڕازی بوو قبوڵمانەو وازی لێ دێنین، هەركەسیش ڕازی نەبێت تاماوین بەشەڕدێین تا بەڵێنی خوا دێت، وتیان: بەڵێنی خوا چیە؟ وتی: بەهەشت بۆ ئەوەی لەسەر شەڕی نەیاران دەكوژرێت و سەركەوتنیش بۆ ئەوەی دەمێنێتەوە. ڕۆستەم وتی قسەكم بیستن ئێستا دەكرێت ئەمە دوابخەن تا بیری لێ بكەینەوە؟ وتی: بەڵێ، چەند ڕۆژتان پێ

خۆشە ڕۆژێك یان دووڕۆژ؟ وتی نا، بەڵكو تا ڕای خۆمان و گەورەكانی وڵاتەكەمان وەردەگرین، ئەویش وتی: سوننەتی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) ئەوە نیە لەگەڵ دوژمندا زیاتر لە سێ ڕۆژ دوابكەوین، بڕوانە ڕای خۆت و ئەوانیش، دوای ئەوماوە یەكێك لەو سیانە هەڵبژێرە، وتی: تۆ گەورەیانیت؟ وتی: نا، بەڵام موسڵمانان وەك یەك جەستەوان لە خوار تا سەرو گەورە تا بچوكیان یەكن.

ڕۆستەم لەگەڵ گەورەكانی هۆزەكەی كۆبوویەوەو وتی: هەرگیز قسەی بە عیزەتترو باشتر لە قسەی ئەم كابراتان بیستووە؟ وتیان: پەنا بە خوا ئەگەر هیچ هەواداری بیت و واز لە ئایینی خۆت بهێنیت بۆ ئەو سەگە، مەگەر سەیری جلەیەكت نەكرد؟ وتی: قوڕتان بەسەر مەڕواننە جل و بەرگ، بڕواننە قسەو ڕاو ژیان، عەرەبەكان جل و خواردنیان سادەو پشت و ناوبانگیان بەهێز دەهێڵنەوە.

پاشان لە ڕۆژی دوەمدا داوای كەسێكیان كرد، ئەویش حوزەیفەی كوڕی موحسینی بۆ ناردن و هەمان قسەكانی ڕەبیعی كرد، لە ڕۆژی سێیەمیشدا موغەیرەی كوڕی شوعبەی(رضي الله عنه) ناردوقسەیەكی چاكی دوورو درێژی كرد، تیایدا ڕۆستەم بە موغەیرەی وت: نمونەی ئێوە كە هاتوونەتە خاكمانەوە وەك ئەو مێشە وایە كە هەنگوین دەبینێت دەڵێت كێ بۆم دێنێت دوو درهەمی دەدوەمێ؟ كە بۆی هێنرا تیایدا نغرۆ دەبێت و داوای فریاكەوتن دەكات و كەس نیە ڕزگاری بكات، ئەوكات دەڵێت هەركەس ڕزگارم بكات چواردرهەمی دەدەمێ نمونەی ئێوە وەك ڕێویەكی لاواز وایە كە دەچێتە شوێنێكی پڕ مێوەترێ خاوەنەكەش كە دەبینێت لاوازە سۆزی بۆی دەجوڵێت و وازی لێ دێنێت، كە قەڵەو بوو خراپەیەكی زۆر دەنێتەوە، بۆیە بە سوپاكەیەوە دێت و كەسەكانی لە دژی هەڵدەستن، دەچێت تا دەربچێت لەبەر قەڵەویەكەی ناتوانێت، بۆیە لێی دەدات تا دەكوژێت، بەوجۆرە ئێوەش لە وتمان دەردەچن، پاشان هەڵچوو و هاواری كردو سوێندی بەخوا خوارد كە سبەینێ دەتانكوژم، موغەیرەش وتی: دەیبینێت.

پاشان ڕۆستەم بە موغەیرەی وت: وتومە جل‌و بەرگتان بۆ بێنن‌و هەزار دینار بۆ سەرکردەکەتان‌و جل‌و بەرگ‌و وڵاختان دەدەمێ تابڕۆن، موغەیرەش وتی: پاش ئەوەی دەسەڵاتمان سوك‌و عیزەتمان لاوازکردن، پاش ماوەیەك بەرەو وڵاتتان دێین‌و سەرانەتان لێوەردەگرین‌و ژێردەستە دەبن و دەبنە کۆیلەمان، کە ئەمەی وت هەڵچوو و تەواو تووڕە بوو.[1]

ئیبن جەریر لە حوسەینی کوڕی عەبدولڕەحمانەوە هێناویەتی دەڵێت ئەبولوائیل وتی: سەعد (رضي الله عنه) هات لە قادسیە بە خەڵکەکەوە دابەزی، نازانم پێدەچێت زیاتر لە حەوت هەزار یان هەشت هەزار نەبوون، بێباوەڕانیش (٣٠) (سی) هەزار بوون، لەو گێڕانەوەدا واهاتووە، لە البدایە والنهایە ج٧ ص٣٨ لە سەیف‌و کەسی دیکەشەوە هاتوەوە کە هەشتا هەزار بوون، لە گێڕانەوەیەکدا: ڕۆستەم بە سەدوبیست هەزارەوە‌و هەشتا هەزاریش بە دوایەوە هات، سی‌و سێ فیلی پێبوو، فیلێکیان سپی بوو هی شاپوور بوو کە لە هەموویان گەورەترو لە پێش هەموویانەوە بوو وەپێی ڕاهاتبوو. بەو جۆرە تەواو بوو.

وتیان دەست‌و هێزو چەکتان نیە، بۆچی هاتوون؟ بگەڕێنەوە، ئێمەش وتمان: ئێمە ناگەڕێینەوە، ئەوانیش پێمان پێدەکەنین‌و دەیانوت (دوك دوك) وەك ئاسك سەیریان دەکردین، کاتێك ڕازی نەبووین بگەڕێینەوە وتیان: کەسێکی ژیری خۆتان بنێرن بۆلامان تا ئەوەی هێناونی ڕوونی بکاتەوە بۆمان، موغەیرەی کوڕی شوعبەش (رضي الله عنه) وتی: من دەچم، چوو بۆلایان‌و لەگەڵ ڕۆستەم لەسەر نوێن دانیشت‌و ئەوانیش هەڵچوون‌و هاواریانکرد، وتی: ئەمە هیچ لە پایەی من بەرزناکاتەوە‌و لە گەورەشتان کەم ناکاتەوە، ڕۆستەم وتی: ڕاست دەکات، وتی:

---

[1]- تەبەری ج٤ ص١٠٥ لە ئیبن ڕەفیل لە باوکیەوە‌و لە ئەبوعوسمانی مەهدی و کەسی دیکەشەوە هێناویەتی، لە باسی بانگەوازەکەی زوهرە‌و موغەیرە‌و ڕەبیعی‌و حوزەیفە(رضي الله عنهم) بە دوورو درێژی بەو واتایەی پێشوو هێناویەتی.

بۆچی هاتوون؟ وتی: ئێمە گەلێك بووین لە خراپەو گومراییدا بووین، خوای گەورە پێغەمبەرێکی بۆ ناردین و بەهۆیەوە ڕێنمونی کردین و لەسەر دەستی ئەو ڕۆزی داین، لەوانە دانەوێڵەیەك کە لەم وڵاتەدا دەچێنرا، کە دەمانخواردو دەرخواردی کەس وکارمان دەدا دەیانوت خۆمان ناگرین بمانبەن بۆ ئەو ئەوخاکە تا لە دانەوێڵەبخۆین، ڕۆستەم وتی: دەی دەتانکوژین، ئەویش وتی: ئەگەر بمانکوژن دەچینە بەهەشت و ئەگەریش ئێمە ئێوە بکوژین دەچنە دۆزەخ، کەوتی دەبێت سەرانە بدەن هاواریان لێهەستا و وتیان هیچ ڕێککەوتنێك لە نێوان ئێمەو ئێوەدا نیە موغەیرە وتی یان ئێوە بپەڕنەوە بۆلامان یان ئێمە دەپەڕینەوە، ڕۆستەم وتی ئێمە دەپەڕینەوە بۆتان، موسڵمانان مانەوە تا ئەوان پەڕینەوە و هەڵمەتیان بردنە سەرو موسڵمانان ئەوانیان شکاندان،[1] حاکم ج٣ ص٤٥١ لە ڕێگەی حوصەینی کوڕی عەبدولڕەحمان لە ئەبووائیلەوە هێناویەتی دەڵێت: لە قادسیەدا بەژداریم کردو موغەیرەی کوڕی شوعبە(رضي الله عنه) چوو، ئینجا بە کورتی باسی دەکات.

حاکم ج٣ ص٤٥١ لە موعاویەی کوڕی قرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە ڕۆژی قادسیەدا موغەیرەی کوڕی شوعبە(رضي الله عنه) نێردرا بۆلای بەرپرسی فارس، وتی: دە کەسم لەگەڵدا بنێرن، ئەوانیش ناردیان، کراسەکەی پەکی کەوتبوو، پاشان بەرگێکی هەڵگرت و چوو تا هاتەلای و وتی: شتێکم بۆ ڕاخەن لەسەری دابنیشم، کەڵەگەتێکیان وتی: ئەی کۆمەڵی عەرەب دەزانم بۆچی هاتوون بۆلامان، ئێوە لە وڵاتی خۆتاندا نانتان نیە تاتێر بخۆن دەی ها چەندەتان پێویستە خواردن ببەن، چونکە ئێمە مەجوسین و حەزناکەین بتانکوژین، ئێوە خاکمان پیس دەکەن، موغەیرەش وتی: سوێند بەخوا بۆ ئەوە نەهاتووین، بەڵام ئێمە جاران گەلێك بووین بەردو بتمان دەپەرست، کە بەردێکی باشترمان دەبینی ئەویترمان فڕێدەداو ئەممان دەپەرست و پەروەردگارمان نەدەناسی تا خوا لەناو خۆماندا پێغەمبەرێکی بۆ

---

[1] – لە البداية و النهاية ج٧ ص٤٠دا واهاتووە.

ناردین و بانگی کردین بۆ ئیسلام ئێمەش شوێنی کەوتین، ئێمە بۆ خواردن نەهاتووین، بەڵکو ئەو فەرمانی پێ کردین تا لەگەڵ ئەو دوژمنانەمان بەشەڕبێین کە ئیسلام وەرناگرن، نەهاتووین بۆ خۆراك بەڵکو تا جەنگاوەرتان بکوژین و ژن و مناڵتان بگرین، باسی ئەو خۆراکەش کە دەیکەیت سوێند بەخوا هێندە نانمان نیە تێربخۆین و ئاوی زۆریشمان نیە، سوێند بەخوا وازناهێنین تا یان بۆ ئێمە دەبێت یان بۆ ئێوە، فارسەکەش بە زمانی فارسی وتی: ڕاست دەکەیت، وتی: تۆ سبەینێ چاوت لە دەست دەدەیت، سبەینێ چاوی لە دەستدا تیرێکی بەرکەوت و چاوی کوێرکرد،[1]

لە البدایة والنهایة ج٧ ص٤١ لە سەیفەوە هێناویەتی کە سەعد (رضي الله عنه) دەستەیەکی هاوەڵانی نارد بۆلای کیسرا تا بانگی بکەن بۆلای خوا لە پێش ڕوودانی شەڕدا، چوون و داوایان کرد کیسرا ببینن، ڕێیان پێدا و خەڵکی وڵات هاتنە دەرەوە تا شێوە و ڕوخسارو سەرو ملیان و قامچی دەستیان و نەعلی پێیان و ئەسپی لاوازیان و جێی کاریگەری زەوی لەسەر پێیان ببینن، لەوپەڕی سەرسوڕمانیاندا بوون چۆن کەسانی وا ژمارەی زۆری سوپای ئەوان بە ئامادەسازیەوە دەشکێنن، کاتێك چوونەلای یەزدگورد مۆڵەتی پێدان و لای خۆی داینیشاندن، - کەسێکی خۆبەزلزانی کەم ئەدەب بوو- لەسەر جل و بەرگەکانیان پرسیاری لێ دەکردن کە ناویان چیە، پاشان هەرچیەکیان پێ دەوت لەو بارەیەوە دڵخۆش دەبوو خوای گەورەش دەیدایەوە بە دەم و چاویدا، پاشان پێی وتن بۆ چی هاتوون بۆ ئەم وڵاتە؟ وادەزانن لەبەرئەوەی کە سەر قاڵین بەخۆمانەوە پێمان دەوێرن؟نوعمانی کوڕی موقەرین(رضي الله عنه) پێی وت: خوا ڕەحمی پێ کردین و

[1]- فەرموودەکە غەریبە، حاکم دەڵێت: سەنەدەکەی صەحیحە بوخاری و موسلیم نەیانهێناوە، زەهەبی دەڵێت: صەحیحە، تەبەرانی لە موعاویەوە(رضي الله عنه) بەهەمان شێوە هێناویەتی، هەیسەمی ج٦ ص٢٧٥ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن

پێغەمبەرێکی بۆ ناردین تا بەرەو چاکەمان ببات و فەرمان بە چاکەمان پێ بکات و خراپەمان پێ بناسێنێت و بە دوورمان بگرێت لێی، بەڵێنی پێداوین ئەگەر بەدەمیەوە بچین چاکەی دونیا و دواڕۆژمان دێتە ڕێ، هەر هۆزێکی بانگ بکردایە بۆ ئیسلام دەبوونە دووبەش، دەستەیەك دەیاندایە پاڵی و دەستەیەکیش دووریان لێی دەگرت، تەنها تایبەتان لەگەڵیدا دەچوونە ناو ئایینەکەیەوە، بەوجۆرە مایەوە تا ئەوەندەی خوا ویستی، پاشان فەرمانی پێ کرد تا هەڵمەت بباتە سەر عەرەبە نەیارەکانی و لەوانەوە دەست پێ بکات، ئەویش وایکرد، ئیتر هەموو عەرەب بە دووجۆر هاتنە ژێر دەسەڵاتی هەندێ بە ناحەزی کە دامرکانەوە، هەندێ بە ملکەچی و حەز کە زیادیانکرد، هەموومان نرخی ئەو ئایینە دەزانین کە بۆی هێناوین و لە دژایەتی و تەنگەبەری ڕزگاری کردین، فەرمانی پێ کردین تا گەلانی پاڵمان بانگ بکەین بۆ ئینساف، ئێمە بانگتان دەکەین بۆلای ئایینەکەمان کە ئیسلامە و هەموو چاکیەك بەچاك و هەموو خراپەیەك بە خراپ دادەنێت ئەگەر ڕازی نەبوون شتێك کە خراپەی لەو کەمترە دێت، ئەگەرنا شەڕ لە نێوانماندایە، ئەگەر هاتن بەدەم ئیسلامەوە لەناوتاندا قورئان بەجێ دەهێڵین و لەسەری دەڕۆن تا حوکمەکانی جێ بەجێ بکەن و ئێمەش بەجێتان دەهێڵین تا وڵاتتان بۆ خۆتان بێت، ئەگەر سەرانە بدەن ڕازین و دەتانپارێزین، ئەگەرنا لەگەڵتان بەشەڕ دێین.

یەزدگوردیش وتی لەسەر زەویدا گەلێکی سەرکەشتر و ژمارەکەمتر و خراپتر لە ئێوە نابینم، ئێمە گوندەکانی دەوروبەرمان دایەدەستتان تا دەستگرۆتان بین و فارس لێتان نەدات، ئێستا کە ژمارەتان زیادی کردووەیاخی مەبن لێمان، ئەگەرناچاری وای لێکردوون موچە و خۆراکتان بۆ دەبڕینەوە و ڕێزی گەورە و دیارەکانتان دەگرین و جل و بەرگتان پێدەدەین و دەسەڵاتێکی شیاو بە خۆتان پێدەدەین، هەمووان بێدەنگ بوون موغەیرەی کوڕی شزعبەش (رضي الله عنه) هەستاو وتی: ئەی پاشا ئەو گەورە و کەسە دیارانەی عەرەب خانەدانن و شەرم دەکەن، کەی بەڕێز دەتوانێت ڕێزی بەڕێز بگرێت و کەسی خانەدان دەتوانێت خانەدان بەڕێز ڕاگرێت،

هەموو ئەوەی بۆیان ناردوویت بۆیان کۆنەکردوویتەوەو هەمووی ئەوەی وتت وەڵامیان نەدایتەوە لەسەری، چاکەیان نواندووەو ئەمەش نمونەی چاکەیە، وەڵامی من بدەرەوە تا من پێت بڵێمو ئەوانیش شایەتی لەسەر بدەن، تۆ وەسفێکت کردین کە شارەزای نیت، باسی خراپی بارمانت کرد کە لە ئێمە خراپتر نەبوو و برسێتیشمان هەروا، ئێمە مێرو و مەگەزو دوپشكو مارمان دەخواردو ئەوەمان بە خۆراکمان دەزانی، خانوو وماڵیشمان هەر زەوی بووەو جلو بەرگیشمان لە موو و خوری وشترو مەڕ بووا، ئاییینمان کوشتنی یەکدی و یاخیبوون لە یەکدی بوو، هەمانبوو لە ترسی خۆراك کچەکەی خۆی زیندە بەچاڵ دەکرد، پێش ئەمڕۆ حاڵمان بەو جۆرەبوو کە بۆم باسکردیت تا خوای گەورە کەسێکی ناسراوی بۆ ناردین کە ڕەچەڵەكو ڕوخسارو لە دایکبوونو باری دەزانین، خاکی ئەو چاکترین خاكو شوێنە، ڕەچەڵەکیشی هەروا، ماڵیشی هەروا، هۆزەکەشی هەروا، خۆیشی لەو بارەماندا لە هەموومان چاکتربوو چونکە ڕاستگۆترینو نەرمونیانترینمان بوو، بانگی کردین بۆ شتێكو کەسمان نەچووین بە دەمیەوە تا ببینە جێگری دوای خۆی، ئەو وتیو ئێمە وتمان ئەو ڕاستی کردو ئێمە درۆ، ئەو زیادی کردو ئێمە کەم، هەرچی دەوت خوای گەورە بە ڕاست دانانی خۆیو شوێنکەوتوەکانی دەخستە دڵمانەوە ئیدی لە نێوان ئێمەو خوای پەروەردگاری جیهانیاندا بوو، چی پێوتین فەرمایشتی خوا بوو، چی فەرمانی پێکردین فەرمانی خوا بوو، پێی وتین: پەروەردگارتان فەرموویەتی: (من خوای تاكو تەنهای بێهاوەڵم من هەبوومو هیچ نەبوو هەموو شتێك لەناو دەچێت جگە لە خۆم، من هەموو شتم دروست کردووەو هەموو شتێك بۆلای من دەگەڕێتەوە، سۆزو ڕەحمەتم گەیشتووە پێتان، ئەم کەسەم ناردووە بۆتان تا ئەو ڕێگەتان پێ نیشانبدەم کە لە دوای مەرگ لە سزای خۆم دەتانپارێزێتو تا داوسەلامی خۆمتان (بەهەشت) بۆ ڕەوا ببینم). ئێمە شایەتی دەدەین لەلایەن حەقەوە حەقی بۆ هێناین، فەرمووی (هەرکەس لەسەر ئەمە شوێناتان کەوت ئەوا ئەركو ماف ئێوەی هەیە، هەرکەس ڕازی نەبوو سەرانەی بۆ بخەنەڕوو

پاشـان چـۆن خۆتـان دەپـارێزن ئـەویش بپـارێزن، هەرکـەس ڕازی نـەبوو لەگـەڵی بەشـەڕبێن، مـن دادوەری و یەکلاکـەرەوەی نێوانتـانم، هـەرکامتان کـوژرا دەیخەمـە بەهەشتەکەمەوە، هەرکامیشتان مایەوە سەرکەوتن بەسەر نەیاراندا دەکەمە بەشی).

جـا هەڵبـژێرە ئەگـەر دەتـەوێت سـەرانەبدەو ژێردەسـتەیت، ئەگـەرنا شمـشێر، یـان موسـڵمان ببـەو خـۆت ڕزگاربکـە، یـەزگورد وتـی: وابـەرەو ڕووم دێیـت؟ وتـی: بـەرەو ڕووی کـەس ناچـم تـا نەمدوێنێت، ئەگـەر کەسیتر بوایـە واشم نـەدەوت، وتـی: ئەگـەر لەبـەر ئـەوە نەبووایـە نێردراوان نـاکوژرێن دەمکوشـتن و هیـچتان لام نـەدەبوو، وتـی: بڕێك خـۆڵم بۆ بهێنن و بیبەن بۆ گەورەی ئەمانە، پاشان بیبەن تا لـە ماڵـەکانی مـەدائین دەچێتە دەرەوە، بگەڕێنـەوە بۆلای گەورەکـەتان و پێـی بڵـێن ڕۆسـتەمی بـۆ دەنێـرم تـا خـۆی و سـەربازەکانی لـە خەنـدەقی قادسـیەدا بـە خـاك بسـپێرێت و ئـەو و ئێـوەش لەناوببات، پاشـان بچێت بۆ وڵاتتـان و خراپتر لەو بارەتـان بەسـەر بێنێت کە لەگـەڵ سابووردا نواندتان، پاشان وتـی: گـەورەتان کامەیە؟ هـەموو بێدەنگ بـوون، عاصـمی کوڕی عەمر (رضي الله عنه) هەستا و کوا باخۆڵەکە بێنێت من گەورەیانم دەی بیدەن بە من؟ وتی وایە؟ وتیان: بەڵێ، ئەویش خستیە سەر پشتی و لە هەیوان و خانووەکە بردیە دەرەوە تـا بردیـە لای وڵاخەکـەی و لەسـەری دانـا و خێـرا چـوو تـا گەیاندیـە لای سـەعد(رضي الله عنه) عاصـم پێشیانکەوت و لـە دەرگـای قـەدیس تێپـەڕی و دایخـست، وتـی: مـژدە بـدەن بـە ئەمیرەکە سەردەکەوێت، پشت بەخوا سەرکەوتووین، پاشان چـوو تـا خۆڵەکـەی برد و گەڕایـەوە و هاتـەوە لای سـەعد(رضي الله عنه) و هـەواڵی پێدا، ئـەویش وتـی: موژدەتـان لێبێت سوێند بەخوا بەسەریاندا سەردەکەوین (خوا کلیلی دەسەڵاتی ئەوانی پێداوین) بـەوە دڵخۆش بوون و وڵاتیان گرت، تەواو.[1]

ئیبن جەریر (ج٤ ص١٨٦) لـە ڕێگـەی سـەیفەوە لـە موحەمـەد و تەلحـە و کەسـانی دیکەوە هێناویانە دەڵێن: کاتێك ڕۆم بینیان – واتە لە ڕۆژی شەڕی تکریتدا– هـەرچی

[1] – تەبەری ج٤ ص٩٤ لە شوعبەی کوڕی سەیف لە عەمری شەیبیەوە بەوجۆرە هێناویەتی.

دەردەچن شکست دێنن وازیان لەسەرکردەکانیان هێنا و کەلوپەلەکانیان خستەناو کۆشیانەوە هەواڵگرانی تغلب و ئیاد و نەمیر هاتن بۆلای عەبدوللای کوڕی موعتەسەم و هەواڵیان پێداو داوایانکرد بەرامبەر عەرەب ئاشتی بنوێنێت، پێیانوت ئەوا هاتوون بە دەمیانەوە، ئەویش هەواڵی بۆ ناردن ئەگەر ڕاست دەکەن شایەتومان بهێنن و دان بنێن بەوەی پێغەمبەری خوا لەلایەن خواوە هێناویەتی پاشان ڕای خۆتمان پێ بڵێن، ئەوانیش بەو قسەوە گەڕانەوە و بە موسڵمانبوونەوە وەڵامیان بۆ ناردنەوە، ئینجا چیرۆکەکە باس دەکات.

ئیبن جەریر ج٤ ص٢٢٧ لە ڕێگەی سەیف لە ئەبوعوسمان لە خالید و عوبادەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێن: عەمری کوڕی عاص (رضي الله عنه) پاش ئەوەی عومەر گەڕایەوە بۆ مەدینە چوو بۆ میسر تا گەیشتە (باب ئەلیەن) زوبەیریش بە دوایدا چوو بەیەکگەیشتن، لەوێ ئەبو مریەم – جاسلیقی میسر- لەگەڵ ئوسقوف بە خەڵکی لیاتەوە کە مقوقس ناردبووی تا وڵاتیان بپارێزن بەرەو ڕوویان بوویەوە، عەمر (رضي الله عنه) کە دابەزی لەگەڵی جەنگان، ئەویش هەواڵی بۆ ناردن پەلە مەکەن تا پۆزشمان بۆتان هەبێت و ئێوەش سەیری ڕای خۆتان بکەنەوە، ئەوانیش دەستیان گرتەوە، عەمر هەواڵی بۆ ناردن من دیارم دەی با ئەبومریەم و ئەبومریامیش بێن، ئەوانیش ڕازی بوون، پەنای یەکتریاندا، عەمر پێی وتن: ئێوە ڕاهیبی ئەم وڵاتەن دەی گوێ بگرن، خوای گەورە موحەمەدی (رضي الله عنه) بە هەق ناردووە و فەرمانی پێ کردووە و ئەویش فەرمانی بە ئێمە کردووە و چی فەرمانی پێکرابوو پێی گەیاندین، پاشان پێغەمبەر(عليه السلام) کۆچی دوایی کرد و لەسەر ڕێی ڕوون بەجێی هێشتین، لەوەی فەرمانی پێ کردین پۆزش خوازبین بۆ خەڵك، ئێمە بانگتان دەکەین بۆ ئیسلام، کامتان ڕازیبوو وەك ئێمە وایە، کامتان ڕازی نەبوو با سەرانە بدات و دەیپارێزین، پێمان وتراوە ئێمە وڵاتان فەتح دەکەین، وەسیەتی بۆ کردین (پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)) تا بتانپارێزین لەبەر تێکەڵی و سۆزمان لەگەڵتان، ئەگەر ئەمە بکەن زیمەتتان دەبێت، ئەوەی ئەمیرەکەمان پێی ڕاسپاردووین ئەوەیە لەگەڵ قیبتیەکاندا باشبن و باش بڵێن

چونکە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وا وەسیەتی بۆ کردووین، چونکە سۆزو نزیکی و زیممەیان بۆ هەیە، ئەوانیش وتیان نزیکایەتیەکی دوور کە تەنها پێغەمبەران پێی دەگەن، بەڕێزو ڕێکوپێکە، کچی پاشامان کە خەڵکی مەنف بوو و لەناویاندا دەسەڵاتدار بوو، خەڵکی عەین شەمس دایان بەسەریانداو کوشتیان و موڵك و وڵاتیان بردو نامۆکەوتن، بەمە کەوتە دەست ئیبراهیم (عليه السلام) سەلام لە خۆی و خێزانی، پەنامان بدە تا بگەڕێینەوە لات، عەمر وتی: کەسی وەك من فێڵتان لێناکات، بەڵام سێ ڕۆژ دەرفەتتان دەدەم تا بڕواننە ڕای خۆتان و خەڵکەکە، ئەگەر نا شەڕ دەکەین، وتیان بۆمان زیادبکە، ئەویش ڕۆژێکی بۆ زیادکردن، گەڕانەوە بۆلای مقوقس و ئەو ئامادەبوو بەڵام ئەرتبوون ڕازی نەبوو وەڵامیان بداتەوەو فەرمانی کرد هەڵمەتیان ببەنەسەر، ئەو دوانەش بە خەڵکی میسریان وت ئێمە هەوڵ دەدەین بتانپارێزین و بگەڕێینەوە بۆلایان وا چوار ڕۆژ ماوە، هیچ شتێکتان تووش نابێت چونکە داوامان کردووە پەنامان بدات، کەچی عەمرو زوبەیر دەبینن بەیات بەرەو ڕوویان هاتن و عەمریش هەروا تووشبوو، شەڕیان لەگەڵ ئەستبوون کردو شکاو دواتر سواربوونەوەو عەمرو زوبەیر (رضي الله عنه) بەرەو عەین شەمس چوون.

تەبەری ج٤ ص٢٨٨ لە ئەبوحارس و ئەبوعوسمانەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك عەمر (رضي الله عنه) لە عەین شەمس دابەزی، خەڵکی میسر بە پاشاکەیان وت: چی دەکەیت بەرامبەر کەسێك کیسراو قەیسەریان شکاندو وڵاتیان گرتن؟ بۆیە ڕێککەوتنیان لەگەڵ ببەستەو بەرەو ڕوویان مەبەرەوەو ئەوانیش بەرەو ڕوومان نابنەوە، ئەمەش لە ڕۆژی چوارەمدا بوو، بەڵام ئەو ڕازی نەبوو و هەڵمەتی بردنە سەرو شەڕیانکرد زوبەیر بەسەر شوورەکانیدا سەرکەوت، کە بەوەیان زانی دەرگایان بۆ عەمر (رضي الله عنه) کردەوەو لەگەڵی ڕێککەوتن، ئەویش ڕازی بووو زوبەیر (رضي الله عنه) خێرا لەوێ دابەزی.

تەبەری ج٥ ص٩ لە سولەیمانی کوڕی بورەیدەوە هێناویەتی ئەمیری باوەڕداران عومەری کوڕی خەتاب (رضي الله عنه) ئەگەر سوپایەکی ئەهلی باوەڕی کۆبکردایەتەوە کەسێکی زانای لەسەر دادەنا، سوپایەکی کۆکردەوەو سەلەمەی کوڕی قەیسی

ئەشجەعی (رضي الله عنه) نارد بۆلایان و وتی: بە ناوی خواوە بڕۆ و لە پێناوی خوادا لەگەڵ هەردەستەیەك بجەنگێ کە بڕوای بە خوا نیە، ئەگەر بە دوژمنی بێباوەڕتان گەیشتن بانگیان لەسەرەو لە فەیئەی موسڵماناندا پشکیان نیە، ئەگەریش لەگەڵتان هاتن ئەوا هەمان ماف و ئەرکی ئێوەیان هەیە، ئەگەر ڕازی نەبوون بانگیان بکەن بۆ خەراج، ئەگەر ڕازیبوون لەگەڵ دوژمنیان بجەنگن و وریای خەراجیان بین و لە سەروو توانای خۆیان مەدەن بەسەریاندا، ئەگەر بەوەش ڕازی نەبوون لەگەڵیان بجەنگن تا خوا سەرتان دەخات بەسەریاندا، ئەگەر لە شوێنێکدا خۆیان قایم کردبوو و داوایان لێتان کرد لەسەر حوکمی خواو پێغەمبەرەکەی لەگەڵیان بجوڵێنەوە وامەکەن چونکە ئێوە نازانن حوکمی خواو پێغەمبەرەکەی بۆیان چیە، ئەگەر داوایان لێکردن پەنای خواو پێغەمبەریان پێ بدەن پەنای خۆتانیان پێ بدەن، ئەگەر لەگەڵیان جەنگان زێدەڕۆیی و ناپاکی مەکەن و جەستە مەشێوێنن، منداڵ مەکوژن، سەلەمە دەڵێت چووین تا گەیشتین بە دوژمنی بێباوەڕو بانگمانکردن بۆ ئەوەی ئەمیری باوەڕداران فەرمانی پێکردین، کەچی موسڵمان نەبوون، بانگمانکردن بۆ سەرانە، بەوەش ڕازی نەبوون، لەگەڵیان جەنگاین و خوا بەسەریاندا سەری خستین، جەنگاوەرەکانمان کوشتن و منداڵەکانمان گرتن و سامانمان کۆکردنەوە، بە دوورو درێژی فەرموودەکە دێنێت.

ئیبن سەعد ج٤ ص١١٠ لە بەشیری کوڕی ئەبوئومەییە لە باوکیەوە هێناویەتی کە ئەشعەری لە ئەسبەهان دابەزیو پێشنیاری ئیسلامی بۆ کردن کەچی موسڵمان نەبوون، پاشان پێشنیاری سەرانەی بۆ کردن لەسەر ئەوە لەگەڵی ڕێککەوتن، بەوجۆرە لەسەر ڕێککەوتنەکەیان مانەوە تا ئەوەی ناپاکییان نواند، ئەو کات لەگەڵیاندا کەوتە شەڕەوە، هێندەی نەبرد تا خوای گەورە سەری خست بەسەریاندا.

# (چیرۆکی هاوەڵان لەو کارو ئاکارانەی بوونە هۆی ڕێنموونی خەڵك)

ئەبونەعیم لە الدلائل ج١٠٩ لە ئیبن ئیسحاقەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك پشتیوانانی مەدینە هاتن لە دوای بەیعەتدانیان بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئیسلام لە ناو مەدینەدا دەرکەوت و هەندێکیش لەسەر ئاینی بێباوەڕی خۆیان مابوونەوە، لەوانە عەمری کوڕی جەموح، موعازی کوڕی لە عەقەبەدا ئامادەبوو و بەیعەتی دابوو بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و عەمریش گەورەیەکی بەنی سەلەمەو خانەدانێکیان بوو، لە ماڵ خۆیدا لەدار بتێکی داتاشیبوو پێی دەوترا (منات) خانەدانان بتەکانیان کە بەخوا دەزانی پاك ڕایان دەگرتن، کاتێك گەنجانی بەنی سەلەمە موعازی کوڕی جەبەل و موعازی کوڕی عەمری کوڕی بە دەستەیەکی دیکەی گەنجانەوە موسڵمان بوون و لە عەقەبەدا بەشدارییانکرد، دەچوونە لای بتەکەی عەمرو دەیانبرد و فڕێیان دەدایە ناو چاڵ و چۆڵی بەنی سەلەمە کە شەخەڵی تێدابوو و شەخەڵیان بەسەردا دەکرد، عەمریش بۆ بەیانی دەیوت قوڕتان بەسەر ئەمشەو کێ وای بە خواوەندەکەمان کردووە؟ پاشان خۆی دەچوو بۆی دەگەڕا تا دەیدۆزیەوە، دەیشۆرد و پاکیدەکردەوەو بۆنی خۆشی لێدەدا، پاشان دەیوت: ئەی بەخوا ئەگەر دەمزانی کێ وای پێ کردوویت سەرشۆڕم دەکرد، بۆ شەو عەمر دەخەوت و ئەوانیش دەهاتنەوە و هەمان شتیان دەکرد، چەند جارێك دووبارەبوویەوە، جارێکیان عەمر دەریهێناو شتی و پاکی کردەوەو بۆنی لێداو دواتر شمشێرەکەی هێناو هەڵیواسی پیایداو دواتر پێی وت: سوێند بەخوا نازانم کێ وات پێدەکات، ئەگەر خێرت تیایە بەو شمشێرە بەرگری لە خۆت بکە، شەو هات و خەوت و ئەوانیش هاتن بردیان و شمشێرەکەش لە ملیدا بوو، پاشان سەگێکی تۆپیویان بە پەتێکەوە بەستەوە بەو بتەوە، پاشان فڕێیاندایە چاڵە شەخەڵێکی بەنی سەلەمەوە، عەمری کوڕی جەموح کە بەیانی هەستا نەبینی چوو گەڕابۆی تا لەپاڵ سەگێکی تۆپیودا دۆزیەوە، کە بینی

لێـی ورد بوویـەوە و هەنـدێ لەوانـەی موسـڵمان ببـون داوانـدیان موسـڵمان بـوو (ڕەحمەتی خوای لێبێت) و بەباشیش ئیسلامی وەرگرت.

منجاب لـە زیاد لـە فەرموودەکـەی ئـیبن ئیسحاقەوە ئـەوەش دێنێـت کـە دەڵێـت: ئیسحاقی کوڕی یەسار لە کەسێکی بەنی سەلەمەوە بۆی گێڕامەوە کە وتـی: کاتێك گەنجانی بەنی سەلەمە موسڵمان بوون ژنەکەی عەمری کوڕی جەموح و کوڕەکەی موسڵمان بوون، بە ژنەکەی وت: هیچ لە کەس وکارت بانگ مەکە تا بزانین ئەوانە چی دەکەن، وتـی: باشە، بەڵام ئایا دەکرێ لە کوڕەکەتەوە ئەوەی فڵان ببیستیت کە لێوەی گێڕاوەتەوە؟ وتی: لەوانەیە هەڵخەڵەتابێت، وتـی: نا بـەڵام لەگـەڵ ئەو خەڵکەدا بوو، ئەویش ناردی بە دوایداو وتی: پێم بڵێ چیت لە قسەی ئەو پیاوە بیستووە؟ ئەویش سورەتی فاتیحەی لـە سەرەتاوە تـا (الصراط المستقيم) بەسەردا خوێنـدەوە، وتـی: چەند جوان و چاکە، هەمووی وایە؟ وتـی: بابە گیـان لـەوەش باشترە، وتـی: ئـەی تـۆ بەیعەتی پێدەدەیت؟ هەموو هۆزەکەت ئەوەیان کردووە، وتی: نا تـا فـەرمان لـە مـەنات وەربگـرم بـزانم چـی دەڵێـت، ئەگـەر بیانویـستایە لەگـەڵ مـەنات قسەبکەن پیرەژنێـك دەهات لە پشتیەوە دەوەستا و وەڵامی دەدایەوە، کـە ئـەو دەهـات پیرەژنەکە نـەدەماو ئەمیش لای دەوەستاو سوپاسی دەکرد و دەیوت: ئەی مـەنات هەسـت دەکـەیت ئـەو پرسیاری لـە تـۆ کردووەو تـۆش بێئاگایـت، کەسێك هـاتووە دەڵێـت تـۆ نەپەرستین و فەرمانمان پێدەکات تا لات ببەین، منیش حەزم نەکرد بەبێ فـەرمانی تـۆ بەیعـەتی پـێ بـدەم، زۆر دوانـدی و وەڵـامی نەدایـەوە، وتــی: وابـزانم تووڕەبوویـت خـۆ هیـچم نەکردووە، بۆیە هەستا و شکاندی.[1]

ئیبراهیمـی کـوڕی سـەلەمە لـە فەرموودەکـەی ئـیبن ئیـسحاقەوە ئەمەشـی هێنـاوە عەمری کوڕی جەموح کاتێك موسڵمان بوو و خوای ناسی بیری بتەکەی دەکردەوە و سوپاسی ئەو خوایەی دەکردکە لە گومڕایی و کوێربینی ڕزگاری کرد ﷺ وتـی:

[1] - ضعيف

| | |
|---|---|
| اتوب الى الله مما مضى | و استنقذ الله من ناره |
| و اثنى عليه بنعماته | اله الحرام و استاره |
| فسبحانه عدد الخاظبين | وقطر السماء ومدراره |
| هداني وقد كنت في ظلمة | حليف مناة و احجاره |
| و انقذني بعد شيب القذال | من شين ذاك بمقداره |
| فقد كدت اهلك في طلمة | تدارك ذاك بمقداره |
| فحمدا وشكرا له ما بقيت | اله الاصنام و جباره |
| اريد بذالك اذ قلته | مجاورة الله في داره |

هەروەها كەوتە سەركۆنەو لۆمەی بتەكەی و وتی:

| | |
|---|---|
| تا الله لو كنت الها لم تكن | انت و كلب وسط بئر في قرن |
| اف لمصرعك الها مستدن | الا فتشناك عن سوء الغبن |
| هو الذي انقذني من قبل ان | اكون في ظلمة قبر مرتهن |
| الحمد الله العلى ذي المنن | الوهاب الرزاق ديان الدين |

حاكم لە المستدرك ج٣ ص٣٣٦ لە واقیدیەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبودەرداء (رضي الله عنه) دەڵێت: كۆتا شوێنی ئیسلام بوو، هێشتا پەیوەستی بتێكی خۆی هەبوو كە پەردەیەكی بەسەردا دابوو، عەبدوڵلای كوڕی ڕەواحە (رضي الله عنه) بانگی دەكرد بۆ ئیسلام كەچی ڕازی نەبوو، دەچوو بۆلای و ژنەكەشی خێرا دەچوو ئەوكات سەری دادەهێنا، وتی: ئەبودەرداء كوا؟ ژنەكەی وتی: براكەت كەمێكە چووە، ئینجا چوویە ژووری بتەكەی و چەند شخڵێكی لەگەڵدابوو، دایبەزاندو پارچە پارچەی كردو بەنهێنی ناوی هەموو شەیتانەكانی لە خۆدەگرت، دەیوت هەرچی لەگەڵ خوادا بپەرسترێت پووچەڵە، پاشان چوو و ئافرەتەكە دەنگی دەبیست كە لەو بتەی دەدا، وتی: ئیبن ڕەواحە قوڕبەسەرت كرد، چوو هیچ نەبوو تا ئەبودەرداء هات بۆ ماڵەوە سەیردەكات ژنەكەی بەدانیشتنەوە وەك سۆزداری بۆی دەگریا، وتی: چیتە؟ وتی: عەبدوڵلای كوڕی ڕەواحەی برات هات بۆلام و ئەمەی كرد كە دەیبینیت، ئەویش تەواو تووڕەبوو،

پاشان بیری کردەوە ئەگەر ئەم بتە سوودی هەبووایە بەرگری لە خۆی دەکرد، بۆیە چوو بۆلای پێغەمەر(صلى الله عليه وسلم) ئیبن ڕەواحەشی لەگەڵدا بوو، لەوێ موسڵمان بوو.[1]

ئیبن جەریری تەبەری ج٤ ص٢٢٧ لە زیادی کوڕی جوزئی زوبەیدیەوە هێناویەتی دەڵێت: لە سەردەمی خیلافەتی عومەردا (رضي الله عنه) ئەسکەندەریەمان فەتح کرد، ئینجا فەرموودەکە دێنێت، تیایدا هاتووە: پاشان لە بەاهیب وەستاین و چاوەڕێی نامەی عومەرمان دەکرد تا نامەی هات و عەمر (رضي الله عنه) بۆی خوێندینەوە:

(پاشان نامەی تۆم پێگەیشت کە باس لەوە دەکەیت بەرپرسی ئەسکەندەریە پێشنیاری بۆ کردوویت سەرانەت پێ بدات بەرامبەر بەوەی چی دیلت لە خاکیدا گرتووە بۆی بگێڕیتەوە، بەخوا سەرانەیەك کە بۆ ئێمەو موسڵمانانی دوای خۆمان بێت لام خۆشەویستترە لە فیئەیەك کە دابەش بکرێت و دواتر نەمێنێت، بۆیە پێشنیار بکە بۆ بەرپرسی ئەسکەندەریە تا سەرانەت پێبدات تا چی دیلیان هەیە سەرپشکیان بکەیت لە نێوان ئیسلام و ئاییینی خۆیاندا، هەرکامیان ئیسلامی هەڵبژارد لە موسڵمانانەو ماف و ئەکی ئەوانی هەیە، هەرکەسیش ئاییینی هۆزەکەی هەڵبژێرێت سەرانەی لەسەر دادەنرێت وەك ئەوانی دی، هەرکەس لەو دیلانە گەیەنرابێتە لای عەرەب لە مەککەو مەدینەو یەمەن ناتوانین بیگێڕینەوە، حەزناکەین لەسەر شتێك لەگەڵی ڕێکبکەوین وەفامان بۆی نەبێت).

عەمریش ناردی بۆلای بەرپرسی ئەسکەندەریە و هەواڵی نامەکەی ئەمیری بڕوادارانی پێدا، ئەویش وتی: باشە ڕازیم، ئێمەش چی دیلمان هەبوو کۆمان کردنەوەو مەسیحیەکان کۆکرانەوەو یەك یەك دەمانهێنان، دەمانوت سەرپشکیت موسڵمان دەبیت یان مەسیحی، ئەگەر ئیسلامی هەڵبژاردایە الله اکبرێکمان دەوت کە لە الله اکبرەکانی فەتحی گوندەکە بەهێزتر بوو، پاشان دەماندایە لای خۆمان، ئەگەریش مەسیحی بووایە مەسیحیەکان هاوریان دەکرد و دەیاندایە پاڵ خۆیان و

---

[1] - ضعیف

ئێمەش سەرانەمان لەسەر دادەنا و زۆر بەوە بێزار دەبووین وەك ئەوەی کەسێك لە خۆمان لامان چووبێت، ئەمە وابوو تا هەموویان تەواوبوون، یەکێك لەوانەی هێنامان ئەبومەریەم عەبدوڵڵی کوڕی عەبدولڕەحمان بوو، قاسم دەڵێت: ناسیم کە ئەو عەریفی بەنی زوبەیر بوو، وەستاندمان و پێشنیاری ئیسلام و مەسیحیەتمان خستە بەردەست، باوکی و دایکی و براکانی مەسیحی بوون، ئەویش ئیسلامی هەڵبژارد و دامانە پاڵ خۆمانن باوکی و دایکی و براکانی دایان بەسەریدا تا ئەوەی کراسەکەیان دڕاند، پاشان ئەو ئەمڕۆش وەك دەیبینیت عەریفمانە، ئینجا فەرموودەکە دێنێت.

ترمزی و حاکم لە شەعبیەوە هێناویانە دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبوتالیب (رضي الله عنه) چوو بۆ بازاڕ دەبینێت مەسیحیەك قەڵغان دەفرۆشێت، عەلی (رضي الله عنه) قەڵغانەکەی خۆی ناسیەوە و وتی: ئەوە هی منە و با دادوەری موسڵمانان نێوانمان یەکلا بکاتەوە، دادوەری موسڵمانانیش شورەیح بوو،عەلی داوای دادوەری لێ کرد، کاتێك شورەیح ئەمیری باوەڕدارانی دی لە دادوەریەکەی هەستا و عەلی لە شوێنیدا دانا، شورەیح لە خوارەوە لە پاڵ مەسیحیەکەدا دانیشت، عەلی وتی: شورەیح ئەگەر نەیارەکەم موسڵمان بووایە لەگەڵیدا دادەنیشتم، بەڵام گوێم لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بووە کە دەیفەرموو (لا تصافحوهم ولا تبدؤوهم بالسلام، ولا تعودوا مرضاهم ولا تصلوا عليهم و البحبئوهم الى مضايق الطريق، و صغرهم الله) واتە(لەگەڵیان تەوقە مەکەن و لە سەلامدا دەستپێشخەرییان بۆ مەکەن، سەردانی نەخۆشیان مەکەن و نوێژیان لەسەر مەکەن، بەرەو کەناری ڕێگەیان ببەن و وەك چۆن خوا بە بچووکی داناون بە بچوکیان دابنێن) ئەی شورەیح نێوانی من و ئەو دادوەری بکە، شورەیح وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران تۆ دەڵێیت چی؟ عەلی وتی: ئەوە قەڵغانی منە دەمێکە لام نەماوە و لێم کەوتووە، شەرەیح وتی: ئەی مەسیحی تۆ چی دەڵێیت؟ مەسیحیەکە وتی: ئەمیری باوەڕداران درۆدەکات ئەوە قەڵغانی منە، شورەیح وتی: نازانم لە دەستی دەریبکەم، هیچ ڕوونکردنەوە و بەڵگەیەکت هەیە؟ عەلی وتی: شورەیح ڕاست دەکات، مەسیحیەکە وتی: من شایەتی دەدەم ئەمە حوکمی پێغەمبەرانە و ئەمیری باوەڕداران

دێت بۆلای دادوەری و ئەویش دادگایی دەکات، ئەی ئەمیری باوەڕداران سوێند بەخوا ئەوە قەڵغانتە، شوێنت کەوتووم و لە وشترەکەت کەوتوو منیش بردم، شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواو موحەمەدیش پێغەمبەری خوایە، عەلی وتی: دەی کە موسڵمان بوویت بۆ خۆت و بردیە سەر ئەسپێك.[1]

حاکم لە شەعبیەوە هێناویەتی دەڵێت: عەلی (رضي الله عنه) لە ڕۆژی جەمەلدا قەڵغانەکەی لێکەوتوو کەسێك بردی و فرۆشتی و لای کەسێکی جوولەکە بینرایەوە، بردیە لای شورەیح و حەسەن و قەنبەری و مەولای شایەتیان دا بۆ عەلی، شورەیح وتی: شاهیدم لە جیاتی حەسەن بۆ بهێنە، ئەویش وتی: شایەتی حەسەنت ناوێت؟ وتی: با، بەڵام شایەتی کوڕ بۆ باوکی نابێت.

حاکم لە (الکنی) و ئەبونەعیم لە (الحلیە ج٤ ص١٣٩) لە ڕێگەی یبراهیمی کوڕی یەزیدی تەمیمی لە باوکیەوە بە دووورو درێژی هێناویەتی و تیایدا دەڵێت، شورەیح وتی: شایەتی مەولاکەت دروستە، بەڵام شایەتی کوڕەکەت بۆ تۆ بەڕەوای نازانین، عەلی (رضي الله عنه) وتی: دایکت ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات مەگەر گوێت لە عومەر (رضي الله عنه) نەبووە کە دەیوت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەیوت (حەسەن و حوسەین گەورەی گەنجانی بەهەشتن) پاشان بە جوولەکەکەی وت: قەڵغانەکە بگرە، جوولەکەکەش وتی: ئەمیری بڕواداران لەگەڵمدا هات بۆلای دادوەری موسڵمانان و ئەویش لە بەرژەوەندی مندا بڕیاریداو ئەویش ڕازی بوو، ڕاست دەکەیت سوێند بەخوا ئەی ئەمیری بڕواداران ئەمە قەڵغانی تۆیە لە دەستت کەوت و منیش بردم، شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواو موحەمەدیش پێغەمبەری خوایە، عەلیش دای بە خۆی، حەوت سەدیشی پێداو لەگەڵیدا بوو تا لە ڕۆژی صفین کوژرا[2].[3]

---

[1] – ضعیف.

[2] – ضعیف

[3] – لە کنز العمال ج٤ ص٦ دا وا هاتووە.

# (بەشی دووەم)

# (بەیعەتدان)

## (هاوەڵان (رضي الله عنه) چۆن و لەسەر چی بەیعەتیان دەدا بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و خەلیفەکانی دوای خۆی)

# (بەیعەتدان لەسەر ئیسلام)

تەبەرانی لە جەریرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: بەیعەتماندا بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەك بەیعەتی ئافرەتەکان هەرکاممان مردو هیچی لە ڕووی ئافرەتەکاندا نەبوو زامنی بەهەشتی بۆ هەیە، هەرکامیشیان مردو هیچی لە ڕووی ئافرەتاندا هەبوو (داوێن پیسی) حەددی ئیسلامی بەسەردا جێ بەجێ کرابێت کەفارەتی ئەو تاوانەیەتی، هەرکەس لە ڕوویاندا شتێکی کردبێت و شاردبێتیەوە لێپێچینەوەی لای خوایە[1] [2].

ئەحمەد لە عەبدوڵڵای موڕی عوسمانی کوڕی خەیسەمەوە هێناویەتی موحەمەدی کوڕی ئەسوەدی کوڕی خەلەف پێی وتووە کە ئەسوەدی باوکی (رضي الله عنه) پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) بینیوە لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا بەیعەتی لە خەڵك وەردەگرت لای شاخی (قەڕن) دانیشت و ڕوویکردبووە خەڵك و خەڵکی لەسەر ئیسلام و شایەتومان بەیعەتیان پێدا، وتم: شایەتومان چیە؟ وتی: موحەمەدی کوڕی ئەسوەدی کوڕی خەلەف پێی وتم لەسەر ئیمان بە خواو شایەتیدان لەسەر ئەوەی هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواو موحەمەدیش بەندەو نێرداراوی خوایە[3] [4].

بوخاری و موسلیم لە موجاشعی کوڕی مەسعودەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: من و براکەیشم هاتن بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، وتم: بەیعەتی هیجرەتت پێدەدەین، فەرمووی

---

[1] – ضعیف.

[2] – هەیسەمی لە مجمع الزوائد ج٦ ص٣٦ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا سەیفی کوڕی هاروون هەیە، ئەبونەعیم متمانەی پێدەدات و دەستەیەکیش بە لاوازی دادەنێن، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە صەحیحن. ئیبن جەریریش لە الكنز العمال ج١ ص٨٢ دا هێناویەتی، دواتر لە بەیعەتی ئافرەتاندا دەیهێنین.

[3] – ضعیف.

[4] – لە البدايه والنهايەج٤ ص٣١٨ دا هاتووە، ئەحمەد بەتەنها هێناویەتی، هەیسەمی ج٦ ص٣٧ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن، بەیهەقی دەڵێت: گەورە و بچوك و ژن و پیاو هاتن و لەسەر ئیسلام و شایەتومان بەیعەتیان پێدا لە البدايه و النهايه ج٤ ص٣١٨ دا هاتووە، بەم دەربڕینە تەبەرانی لە (المعجم الكبير) و (المعجم الصغير) دا هێناویەتی، لە مجمع الزوائد ج٦ ص٣٧ یشدا هاتووە، بەغەوی و ئیبن سەکەن و حاکم و ئەبونەعیمیش هێناویانە، لە الكنز العمال ج١ ص٨٢ یشدا هاتووە.

(مضت الهجرة لاهلها) وتم: ئەی لەسەر چی بەیعەتمان لێ وەردەگریت؟ فەرمووی (لەسەر ئیسلام و جیهادن لە العینی ج٧ ص١٦ دا هاتووە ئیبن ئەبی شەیبەش هێناویەتی و ئەوەی بۆ زیاد کردووە دەڵێت: گەیشتم بە براکەم و پرسیارم لێکرد، ئەویش وتی: موجاشیع ڕاست دەکات.[1]

ئەبو عوانە لە موسنەدەکەیدا ج١ ص٣٨ لە زیادی کوڕی علاقەوە هێناویەتی دەڵێت: لە جەریری کوڕی عەبدوڵڵام بیست لە کاتی مەرگی موغەیرەی کوڕی شوعبەدا (رضي الله عنه) وتاری بۆ خەڵك دەداو دەیوت: وەسیەتتان بۆ دەکەم لە خوای تاك و تەنهای بێ هاوتا بترسن و نەرم ونیان و لەسەرخۆ بن، چونکە من بەم دەستانەم بەیعەتمدا بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەسەر ئیسلام و مەرجی لەسەرم دانا تا ئامۆژگاری هەموو موسڵمانێك بکەم، دەی سوێند بەخوای کەعبە من ئامۆژگاری هەمووتان دەکەم، دواتر داوای لێخۆشبوونی کرد و دابەزی،[2] بەیهەقی وکەسانی دیکەش لە زیادی کوڕی حارسی صەدائیەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: هاتمە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و بەیعەتم پێدا لەسەر ئیسلام، ئینجا بە دوورو درێژی فەرموودەکە دێنێت وەك پێشتر لە باسی بانگەوازدا هێنامان.[3]

---

[1] – لە کنز العمال ج١ ص٨٣،٢٦ دا واهاتووە.

[2] – بوخاری بە پڕاو پڕتر هێناویەتی ج١ ص١٤،

[3] – صحیح.

# (بەیعەتدان لەسەر کارەکانی ئیسلام)

حەسەنی کوڕی سوفیانو تەبەرانی لە معجم الاوسط و ئەبونەعیمو حاکمو بەیهەقی و ئیبن عەساکیر لە بەشیری کوڕی خەصاصیەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێ: هاتمە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تا بەیعەتی پێبدەم، وتم: لەسەر چی بەیعەتم لێوەردەگریت ئەی پێغەمبەری خوا؟ پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) دەستی هێناو فەرمووی (شایەتی بدەیت هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خوای تاكو تەنهای بێهاوەڵو موحەمەد بەندەو نێردراوی خوایە پێنج نوێژەکە لە کاتی خۆیدا بکەیتو زەکاتی فەرزکراو بدەیتو ڕۆژووی ڕەمەزان بگریتو حەج بکەیتو لە پێناو خوادا جیهاد بکەیت) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا هەموویان دەتوانین جگە لە دوانیان نایانتوانین، زەکات، چونکە سوێند بەخوا دەوشتری زەودم هەیە (لە نێوان دوو بۆ نۆساڵدا) کە شیری خێزانەکەم دەدەنو ولاخی ماڵەوەن بۆ بارکردن، جیهادیش من کەسێکی ترسنۆکمو دەڵێن هەرکەس ڕوو وەرچەرخێنێت تووڕەیی خوای بەردەکەوێت، دەترسم ئەگەر شەڕ دەستی پێکرد بترسمو ڕابکەمو تووڕەیی خوام بەربکەوێت، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەستی گرتو دواتر تەکاندیو فەرمووی (ئەی بەشیر نە صەدەقەو نە جیهاد، ئەی ئیتر بەچی دەچیتە بەهەشتەوە؟) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەستت بێنە تا بەیعەتت پێبدەم، ئەویش دەستی کردەوەو بەیعەتم پێدا لەسەر هەموو ئەوانە.[1][2]

ئەحمەدیش لە جەریرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: بەیعەتم دا بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەسەر نوێژکردنو زەکات دانو ئامۆژگاری کردنی هەموو موسڵمانێك.[3]

---

[1] – ضعيف

[2] – لە كنز العمال ج٧ ص ١٢ دا هاتووە، ئەحمەدیش هێناویەتی کەسەکانی سەنەدەکەش جێی متمانەن، هەیسەمیش ج١ ص٤٢ هێناویەتی،

[3] – هەروەها ئیبن جەریر وەك ئەوە هێناویەتی لە كنز العمال ج١ ص٨٢ یشدا هاتووە، بوخاریو موسلیمو ترمزیش هێناویانە، لە الترغيب ج٣ ص٢٣٦ دا هاتووە،

ئەحمەدیش لەلایەکی دیکەوە هێناویەتی دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) مەرجێکم لەسەر دابنێ چونکە تۆ شارەزاتریت بەوە، فەرمووی (بەیعەتت لێوەردەگرم لەسەر پەرستشی خوای تاك و تەنها تا هیچ هاوەڵێکی بۆ دانەنێیت، نوێژبکەیت و زەکات بدەیت و ئامۆژگاری موسڵمانان بکەیت و لە هاوەڵدانان دوورە پەرێز بیت)[1،2] ئیبن جەریریش هێناویەتی، بەڵام ئەم دەڵێت (ئامۆژگاری موسڵمانان بکەیت و لە هاوەڵدانان جیابیتەوە)[3] تەبەرانی لە(الکنز العمال)دا هێناویەتی دەڵێت: جەریر (رضي الله عنه) هاتە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەویش فەرمووی (ئەی جەریر دەستت بێنە) ئەویش وتی: لەسەرچی فەرمووی (ان تسلم وجهك لله و النصيحة لكل مسلم) واتە(خۆت بدەیتە دەست خواو ئامۆژگاری هەموو موسڵمانێك بکەیت) مۆڵەتی پێدا – کەسێکی ژیر بوو – وتی: ئەی پێغەمبەی خوا چەندە توانیم، دوای توانا نەمان دەرفەت بەخەڵك دەدرێت[4،5].

ڕەویانی و ئیبن عەساکیر لە عەوف کوڕی مالیکی ئەشجەعیەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دا نۆ یان هەشت یان حەوت کەس بووین وتی: ئایا بەیعەت نادەن بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)؟ سێ جار وتیەوە، ئێمەیش چووینە پێشەوە و بەیعەتماندا بە پێغمبەر (صلى الله عليه وسلم)، وتمان ئەی پێغەمبەری خوا بەیعەتمان پێداویت، بەڵام لەسەر چی؟ فەرمووی (لەسەر ئەوەی خوا بپەرستن و هیچ هاوەڵی بۆ دانەنێن و پێنج نوێژەکە بکەن و وشەیەکی بە دەنگی نزم ئەوەبوو هیچ لە خەڵك داوانەکەن) هەندێ لەوانەم دەدی قامچیەکەی دەستی لێ دەکەوت بە کەسی نەدەوت بیداتەوە دەست و خۆی دادەبەزی بۆی.[6]

---

[1] – صحيح.

[2] – نەسائی گێڕاویەتیەوە، لە البداية والنهايه ج٥ ص٧٨ دا هاتووە،

[3] – لە الکنز العمال ج١ ص٨٢ دا هاتووە.

[4] – ضعيف.

[5] – لە الکنز ج١ ص٨٢ دا هاتووە.

[6] لە الکنز العمال ج١ ص٨٣ دا هاتووە، موسلیم و ترمزی و نەسائیش هێناویانە لە الترغيب ج٢ ص٩٨ یشدا هاتووە.

تەبەرانی لە (المعجم الكبير) لە ئەبوئومامەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (کێ بەیعەت دەدات؟) سەوبان (رضي الله عنه) مەولای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بەیعەتمان لێوەربگرە، فەرمووی (لەسەر ئەوەی داوای هیچ لە کەس نەکەن) سەوبان وتی ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پاداشتی چیە؟ فەرمووی (بەهەشت). سەوبانیش بەیعەتی پێدا، ئەبوئومامە دەڵێت: لە مەککە لەناو خەڵکێکی زۆردا بینیم قامچیەکەی دەستی لەسەر وڵاخەکەی لە دەست دەکەوت، جارهەبوو دەکەوتە سەر شانی کەسێك، کەسەکە هەڵی دەگرتەوە تا بیداتەوە دەستی کەچی لە دەستی وەرنەدەگرت تا خۆی دادەبەزیو هەڵی دەگرتەوە[1،2] ئەحمەدو نەسائیو کەسانی دیکەش بەکورتی لە سەوبانەوە هێناویانە، چیرۆکی قامچیەکەی ئەبوبەکریان (رضي الله عنه) هێناوە[3،4].

ئەحمەد لە ئەبوزەرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەسەر پێنج شت بەیعەتی لێوەرگرتمو متمانەی حەوت شتی پێدامو لە حەوت شت خوای لە شایەت لەسەر گرتم، لەسەر ئەوەی لەبەر خوا لە لۆمەی لۆمەکاران نەترسم، ئەبولموسەنناش دەڵێت: ئەبوزەر وتی: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بانگی کردم و فەرمووی (بەیعەتم پێ دەدەیت تا بەهەشتت بۆ بێت؟) وتم: بەڵێ، دەستم کردەوەو پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) مەرجی لەسەر دانام تا داوای هیچ لە کەس نەکەمو منیش وتم: بەڵێ، فەرمووی (تەنانەت ئەگەر قامچیەکەشت لە دەست کەوت داوانەکەیت و خۆت دابەزیتو وەریبگریتەوە) لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (ستة ايام ثم اعقل يا اباذر مايقال لك بعد) لە ڕۆژی حەوتەمدا فەرمووی (وەسیەتت بۆ

---

[1] – ضعيف.

[2] – لە الترغيب ج٢ ص١٠٠ دا وا هاتووە.

[3] – صحيح.

[4] – هەروەك لە الترغيب ج٢ ص٩٩،١٠١ يشدا هاتووە.

دەکەم لە نهێنی و ئاشکرای بارتدا لە خوا بترسەو ئەگەر خراپەت لە ڕوودا کرا چاکە بکە، داوای هیچ لە کەس مەکە ئەگەر قامچیەکەت لە دەست بکەوێت (داوا مەکە بیدەنەوە دەستت) سپاردەش مەهێڵەوە)[1].[2]

شاشی و ئیبن عەساکیر لە سەهلی کوڕی سەعدەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: من و ئەبوزەرو عوبادەی کوڕی صامت و ئەبوسەعیدی خودری و موحەمەدی کوڕی مەسلەمە(رضي الله عنه) لەگەڵ کەسی شەشەمدا بەیعەتماندا بە پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر ئەوەی لە پێناو خوادا گوێ بە لۆمەی لۆمەکاران نەدەین، شەشەمیش داوای کرد دەست لەو بڕیارە بکێشێتەوە، ئەویش ڕێی پێدا[3].[4]

موسلیمیش لە عوبادەی کوڕی صامتەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی: من یەکێك بووم لەو نەقیبانەی بەیعەتیاندا بە پێغەمبەر (ﷺ)، وتی: بەیعەتمان پێدا تا هیچ هاوەڵ بۆ خوا دانەنێین و دزی نەکەین و زینانەکەین و کەسێك نەکوژین کە خوا بە حەرامی داناوە مەگەر بەحەقی ئیسلام نەبێت، تاڵانی نەکەین و یاخی نەبین، ئەگەر ئەمە بکەین بەهەشت بەشمانە، ئەگەر لەوەدا شتێکمان پێنەکرا قەزاکەی لای خوایە.

ئیبن جەریر (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لای پێغەمبەر (ﷺ) بووین فەرمووی (بەیعەتم پێ بدەن لەسەر ئەوەی هیچ هاوەڵێك بۆ خوا دانەنێن و دزی و زینا نەکەن، هەرکامتان بردیەسەر پاداشتی لای خوایە، هەرکامتان لە شتێك لەوانە تووش بوو و خوا داپۆشی خوا خۆی دەزانێت، ویستی سزای دەدات، یان ئەگەر ویستی لێی خۆش دەبێت).[5]

---

[1] – ضعيف

[2] – لە الترغيب ج٢ ص٩٩ دا وا هاتووە.

[3] – صحيح.

[4] – لە الكنز العمال ج١ ص٨٢ دا هاتووە. تەبەرانی بەوجۆرە هێناویەتی، هەیسەمی ج٧ ص٢٦٤ دەڵێت: لە سەنەدەکەیدا عەبدولموهەیمنی کوڕی عەیاش هەیە کە لاوازە.

[5] – لە كنزالعمال ج١ ص٨٢ دا واهاتووە.

ئیبن ئیسحاق و ئیبن جەریرو ئیبن عەساکیر لە عوبادەی کوڕی صامتەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: یانزە کەس بووین لە بەیعەتی عەقەبەی یەکەمدا بەیعەتماندا بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەك بەیعەتی ئافرەتان پێش ئەوەی شەڕمان لەسەر فەرز بێت، بەیعەتمان پێدا تا هیچ هاوەڵێك بۆ خوا دانەنێین و دزیو زینا و بوختان لەبەردەستو پێماندا نەکەین و منداڵەکانمان نەکوژین و لە چاکەدا یاخی نەبین و لانەدەین، هەرکەس ئەوەی بردەسەر بەهەشتی بۆ هەیە، هەرکەس نەیبردەسەر یان خوا بە ویستی سزای دەدات یان لێی خۆش دەبێت، پاشان بۆ ساڵی دواتر لە بەیعەتەکەیان جیابوونەوە[1].[2]

## (بەیعەتدان لەسەر کۆچکردن)

بەیهەقی ج٩ ص١٦ لە یەعلای کوڕی مونیەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە دووەم ڕۆژی فەتحدا هاتمە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا بەیعەتی کۆچ لە باوکم وەربگرە، فەرمووی (بەڵکو بەیعەتی جیهادی لێوەردەگرم، لە ڕۆژی فەتحەوە کۆچ پچڕا) پێشتریش فەرموودەکەی موجاشیعمان (رضي الله عنه)هێنا کە وتی: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا لەسەر کۆچکردن بەیعەتمان لێوەربگرە، فەرمووی (مضت الهجرة الاهلها) یان فەرموودەکەی جەریر کە فەرمووی (لە هاوەڵدانان جیابیتەوەو دوورکەویتەوە) بەیهەقی ج٩ ص١٣ لە فەرموودەکەی جەریردا (رضي الله عنه) هێناویەتی: (ئامۆژگاری باوەڕدار بکەیت و لە هاوەڵدانان جیابیتەوە). ئەحکودو بوخاری لە (التاریخ)و ئیبن ئەبی خەیسەمە ئەبو عەوانەو بەغەوی و ئەبونەعیم و تەبەرانی لە حارسی کوڕی زیادی سەعیدیەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: لە ڕۆژی خەندەقدا هاتمە

---

[1] – صحيح.

[2] – لە الكنز العمال ج١ ص٨٢ دا هاتووەو بوخاریو موسلیمیش بە هەمان شێوە هێناویانە، لە البدايه والنهايه ج٣ ص١٥٠ دا هاتووە.

خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) و خەڵكی بەیعەتی كۆچیان پێدەدا، وامان دەزانی بانگەواز بۆ بەیعەت دەكەن وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر كۆچ بەیعەت لەمە وەربگرە، فەرمووی (ئەمە كێیە؟) وتم: ئەمە حەوسی كوڕی یەزید یان یەزیدی كوڕی حەوسی ئامۆزامە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (بەیعەتتان لێوەرناگرم، خەڵكی كۆچ دەكەن بۆلای ئێوە نەوەك ئێوە كۆچ بكەن بۆلایان، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە هەركەس پشتیوانانی خۆشبوێت كە دەگاتەوە بە خوا ئەوكات خوای گەورە خۆشی دەوێت، هەركەسیش ڕقی لە پشتیوانان بێت كە دەگاتەوە بەخوا ئەوكات خوای گەورە لێی توورەیە)[1][2].

ستەبەرانی لە ئەبوئوسەیدی ساعیدیەوە (رضی الله عنه) هێناویەتی خەڵكی هاتنە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) لەكاتی هەڵكەندنی خەندەقەكەداو بەیعەتی كۆچیان پێدا، كە لێبوویەوە فەرمووی (ئەی كۆمەڵی پشتیوانان لەسەر كۆچكردن بەیعەت مەدەن، بەڵكو خەڵكی كۆچ دەكەن بۆلاتان، هەركەس بگاتەوە بەخواو پشتیوانانی خۆش بوێت ئەوكات خوا خۆشی دەوێت، هەركەسیش بگاتەوە بەخواو ڕقی لە پشتیوانان بێت ئەوكات خوا لێی توورەیە)[3][4].

---

[1] – ضعیف

[2] –لە الكنز العمال ج٧ ص١٣٤ دا هاتووە. ئەبوداودیش هێناویەتی، لە الاصابە ج١ ص٢٧٩ یشدا هاتووە، هەیسەمی ج١٠ ص٣٨ دەڵێت: ئەحمەدو تەبەرانی بە چەند سەنەدێك هێناویانە، كەسەكانی هەندێكیان صەحیحن جگە لە موحەمەدی كوڕی عەمر كە فەرموودەكانی حەسەنن.

[3] – ضعیف

[4] – هەیسەمی ج١٠ص ٣٨ دەڵێت: لە سەنەدەكەدا عەبدولحەمیدی كوڕی سوهەیل هەیە كە نایناسم، كەسەكانی دیكەی سەنەدەكە جێی متمانەن.

# (بەیعەتدان لەسەر سەرخستن)

ئەحمەد لە جابرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) دە ساڵ لە مەککە مایەوەو چوو بۆلای خەڵکی لە شوێنەکانیان لە عوکاظ و مەجەننە، لە وەرزەکاندا دەیوت (من یؤوینی؟ من ینصرنی؟ حتی ابلغ رسالە ربی ولە الجنە) واتە(کێ پەنام دەدەات؟ کێ سەرمدەخات تا پەیامی پەروەردگارم بگەیەنم و بەهەشت بەشی بێت) کەس نەبوو پاڵپشت و سەرخەری بێت تا ئەوەی کەسێك لە یەمەنەوە یان لە موزەرەوە دەهات و کەس و نزیکانی دەیانوت: وریای ئەو کەسەی قورەیش بە لە خشتەت نەبات، کە بەناویاندا دەچوو بە پەنجە ئاماژەیان بۆ دەکرد تا خوای گەورە لە یەسریبەوە ئێمەی نارد بۆلای و پەیمانماندا و بڕوامان پێی هێنا، ئیدی کەسی ئێمە دەچوو بڕوای پێدەهێنا و قورئانی لا دەخوێند و دەگەڕایەوە ناو کەسوکاری و ئەوانیش لەگەڵیدا موسڵمان دەبوون تا هەرچی ماڵی پشتیوانان بوو دەستەیەکی موسڵمانانی تێدابوو کە ئیسلامیان نیشاندەدا، پاشان هەموو پلانیان دانا، وتمان تاکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە جێ بهێڵین، تەواف بکات و لە شاخەکانی مەککەدا دەربکرێت و بترسێنرێت؟ بۆیە حەفتا کەسمان چوون بۆلای لە وەرزەکەدا بەڵێنماندا لە دۆڵی عەقەبە، لەوێ یەك و دوو کۆبووینەوە تا بینیمان وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر چی بەیعەتت پێ بدەین؟ فەرمووی (بەیعەتم پێبدەن لەسەر گوێگری و گوێڕایەڵی لە چالاکی و تەمبەڵیدا، لە سەختی و خۆشیدا ببەخشن و فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە بکەن لە پێناو خوادا بڵێن و لەبەر خوا لە لۆمەی لۆمەکاران نەترسن، سەرم بخەن و بمپارێزن ئەگەر هاتم بۆلاتان وەك چۆن خۆتان و ژن و منداڵتان دەپارێزن، بەوە بەهەشتتان بۆ هەیە).

ئێمەش چوونەلای و ئەسعەدی کوڕی زەزار (رضي الله عنه) کە بچوکی هەموویان بوو دەستی خستە دەستیەوە، لە گێڕانەوەی بەیهەقیدا بچوکترینی حەفتا کەسەکە بوو جگە لە من، فەرمووی پەلە مەکەن ئەی خەڵکی یەسریب ئێمە دەزانین ئەو پێغەمبەری

خوایە، ئەمڕۆ بردنی دوژمنایەتی هەموو عەرەب و کوشتنی چاکەکانتان و شکاندنی شمشێرەکانتان، ئەگەر ئێوە لەوە بڕوانن لێی بنەوە و پاداشتتان لای خوایە، ئەگەرنا ئەگەر لە خۆتان دەترسن وازی لێ بهێنن، ئەوە ڕوون بکەنەوە چونکە ئەو لای خوا زیاتر جێی پۆزشە، وتی: ئەی سەعد لێیان دوورکەوە، سوێند بەخوا واز لەو بەیعەتە ناهێنین و هەرگیز پشتی بەرنادەین هەستاین و بەیعەتمان پێداو ئەویش مەرجی لەسەر داناین و لە بەرامبەردا بەڵێنی بەهەشتی پێداین[1][2].

ئیبن ئیسحاق لە لە کەعبی کوڕی مالیکەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کە لە دۆخی عەقەبە کۆبووینەوە چاوەڕوانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بووین و تا هات بۆ لامان و عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب (رضي الله عنه) لەگەڵیدا بوو، ئەوکات هێشتا ئەو موسڵمان نەببوو، بەڵام حەزی دەکرد لە کاروباری برازاکەیدا ئامادە بێت و لێی دڵنیا بێت. کاتێك دانیشت یەکەم کەس قسەی کرد عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب بوو وتی: ئەی کۆمەڵی خەزرەج موحەممەد لە ئێمەیە و دەزانن لە دەست هۆزمان پاراستوومانە لەسەر ئەوەی وای دەبینی لەناو هۆزەکەیدا عیزەت و پاراستنی ناو شارەکەی هەیە و بەڵام بڕیاری داوە پەیوەستی ئێوە بێت، ئەگەر وا دەبینن وەفاتان بۆ ئەوە هەیە کە بانگتان کردووە بۆی و دەیپارێزن لە نەیاری دەبێت بەرگەی ئەوە بگرن، ئەگەر دەتانەوێت بیدەن بە دەستەوە و بیشکێنن، دوای ئەوە دێت بۆ لاتان ئەوا هەر لە ئێستاوە وازی لێ بهێنن و چونکە ئێستا عیزەتمەند و پارێزراوە لە ناو هۆز و شاری

---

[1] – صحيح.

[2] – ئەحمەدو بەیهەقیش لە ڕێگەی ترەوە ئەم فەرموودەیان هێناوە، سەنەدەکەی بەپێی مەرجی موسلیم باشە، بەڵام بوخاری و موسلیمیش نەیانهێناوە، لە البداية والنهاية ج٣ ص١٥٩ دا هاتووە، ئیبن حەجەر لە فتح الباري ج٧ ص١٥٨ دا دەڵێت: سەنەدەکەی حەسەنەو حاکم بە صەحیحی داناوە و ئیبن حەببانیش هێناویەتی، هەیسەمی ج٦ ص٤٦ دەڵێت: کەسەکانی ئەحمەد کەسانی صەحیحن، بەزاریش گێڕاویەتیەوە و لە فەرموودەکەیدا دەڵێت: سوێند بەخوا واز لەو بەیعەتە ناهێنین و دەستبەرداری نابین.

خۆیدا، ئێمەش پێمان وت: بیستمان چی وت ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تۆ بفەرموو چی مەرجت هەیە بۆ خۆت و پەروەردگارت لەسەرمان داینێ، پێغەمبەریش (ﷺ) قسەی کرد و قورئانی خوێند و بانگەروازی کرد بۆ لای خوا و بەرەو ئیسلام هانیدااین، فەرمووی (بەیعەتتان لێ وەردەگرم لەسەر ئەوەی بمپارێزن لەوەی ژن و منداڵی خۆتانی لێ دەپارێزن) بەرائی کوڕی مەعرو دەستی گرت و وتی: بەڵێ، سوێند بەوەی تۆی بە حەق ناردووە چۆن خۆمان و ژن و منداڵمان دەپارێزین تۆیش دەپارێزین دەی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەیعەتمان لێ وەربگرە، سوێند بە خوا ئێمە کوڕی جەنگین و بەردەوام بە میراتمان گرتووە، ئەبولهەیسەمی کوڕی تەیهان لەسەر قەسەکە وەستاندی کاتێك بەراء لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) قسەی دەکرد، وتی ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئێمە و ئەو خەڵکە پەتێکمان لە نێواندایە دەیپچڕێنین- واتە جوولەکەکان- ئەی ئەگەر ئەوەمان کرد پاشان خوا تۆی سەرخست دەگەڕێیتەوە ناو هۆزەکەت و واز لە ئێمە دێنیت؟ پێغەمبەریش (ﷺ) زەردەخەنەیەکی کرد و دواتر فەرمووی (بل الدم الدم و الهدم الهدم انا منكم و انتم منی، احارب من حاربتم و اسالم من سالمتم) واتە(بەڵکو خوێنم خوێنتانە و گۆڕم لەوێ دەبێت، من لە ئێوەم و ئێوەش لە منن، لەگەڵ ئەوەی دەجەنگن دەجەنگم، لەگەڵ کێ ئاشتی دەکەن ئاشتی دەکەم) کەعب (ﷺ) وتی: (ﷺ) فەرمووی (احرجوا الی منكم اثنی عشر نقيبا يكونونعلی قومهم بما فيهم) ئەوانیش دوانزە کەسیان هەڵبژاردن، نۆیان لە خەزرەج و سێیان لە ئەوس بوون[1][2].

---

[1] – حسن.

[2]–لە البدايه والنهايه ج٣ ص١٦٠ دا هاتووە، ئەحمەد و تەبرانیش بە دوورودرێژی هێناویانە، لە مجمع الزوائد ج٦ص٤٢ یشدا بە دوورودرێژی هاتووە ج٦ص٤٥ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدی ئەحمەد صەحیحن جگە لە ئیبن ئیسحاق، ئیبن حەجەر ج٧ص١٥٧ دەڵێت: ئیبن ئیسحاق هێناویەتی و ئیبن حەبانیش بە دوورو درێژی لەو ڕێگەوە هێناویەتی.

تەبەرانی لە عروەوە (رضي الله عنه) بە مورسەلی هێناویەتی دەڵێت: یەکەم کەس بەیعەتی دا بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەبولهەیسەمی کوڕی تەیهان (رضي الله عنه) بوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمەو ئەو خەڵکە پەیوەندیەکمان هەیە – پەیمان و هاوپەیمانی – با بیپچڕێنین، ئایا ئەگەر ئەوەمان کرد تۆ دەگەڕێیتەوە ناو هۆزەکەت و ئێمەیش لەو بارەدەبین و لە گەڵیان لە شەڕدابین، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) بەو قسە پێکەنی و فەرمووی (بل الدم الدم الهدم الهدم) کە ئەبولهەیسەمی بەو وەڵامەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕازی بوو وتی: هۆزەکەم ئەمە پێغەمبەری خوایەو من شایەتی دەدەم ڕاستەو ئەمڕۆ لە سنورو پەنا و پاراستنی خوادایەو لەبەر دەستی هۆزو خێڵیدایە، بزانن ئەگەر دەیبەنە لای خۆتان عەرەب یەکدەستە لە دژتان دەبن، ئەگەر دەتانەوێت لە پێناو خوادا ماڵ و گیان و منداڵتان دابنێن بانگی بکەن بۆ خاکی خۆتان چونکە بەڕاستی پێغەمبەری خوایە، ئەگەریش دەترسن دەستی لێبەردەن لە ئێستاوە وازی لێبهێنن، ئەوکات وتیان: ڕازین خواو پێغەمبەرەکەی چی دەڵێن و ئێمەش ماڵ و گیانمان بەختی تۆ دەکەین ئەی پێغەمبەری خوا، ئەبولهەیسەم ڕێمان بۆ چۆڵ بکە تا بەیعەت بدەین بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئەبولهەیسەم وتی: من یەکەم کەسم بەیعەتم پێدا، پاشان هەموو ئەوانیش بەیعەتیاندا.[1]

ئیبن ئیسحاق لە عاصمی کوڕی عومەری کوڕی قەتادەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی خەڵکی کە کۆبوونەوە تا بەیعەت بدەن بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) عەبباسی کوڕی عوبادەی کوڕی نەزلە – لە بەنی سالمی کوڕی عەوف – وتی: ئەی کۆمەڵی خەزرەج دەزانن لەسەر چی بەیعەت دەدەن بەو پیاوە؟ وتیان بەڵێ: ئێوە لەسەر شەڕی سوورو ڕەشی خەڵك بەیعەتی پێدەدەن ئەگەر وا دەبینن ئەگەر ماڵ و سامان و خانەدانەکانتان بە کوشتن لەناو دەچن دەیدەن بە دەستەوە؟ ئەوا هەر لە ئێستاوە – سوێند بەخوا ئەگەر شتی

---

[1]– هەیسەمی ج٦ ص٤٧ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا ئیبن لوهەیعە هەیەو فەرموودەی حەسەنەو جۆرە لاوازیەکی تێدایە.

وابکەن- سەر شۆڕی دونیا و دواڕۆژ دەبن، ئەگەریش دەزانن دەیبەنە سەر با ماڵ و گیانیشتان دابنێن ئەوا ببیەن -سوێند بەخوا- خێری دونیاو دواڕۆژی تیایە، وتیان: ئێمە لەسەر دانی گیان و سامانمان دەیبەین، ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر ئەوەمان بردەسەر چیمان بۆ هەیە؟ فەرمووی (بەهەشت) وتیان: دەستت بێنە، ئەویش دەستی کردەوە و بەیعەتیان پێدا[1].[2]

ئیبن ئیسحاق لە مەعبەدی کوڕی کەعب لە عەبدوڵڵای برایەوە هێناویەتی، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ارفضوا الی رحالکم) واتە(بەرەو لای شمەك و ئاژەڵەکانتان بچن) عەبباسی کوڕی عوبادە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا سوێند بەو خوایەی بە حەق تۆی ناردووە ئەگەر حەز دەکەیت سبەینێ بە شمشێرەکانمانەوە دەدەین بەسەر خەڵکی مینادا، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (فەرمانی ئەوەمان پێ نەکراوە) بەڵام بگەڕێنەوە بۆلای شمەك و ئاژەڵەکانتان)[3].[4]

---

[1] - حسن.

[2] - له البدايه والنهايه ج٣ ص١٦٢ دا واهاتووه.

[3] - حسن.

[4] - له البدايه والنهايه ج٣ ص١٦٤ دا واهاتووه.

# (بەیعەتدان لەسەر جیهاد)

بوخاری ص٣٩٧ لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چوو بۆ خەندەق و سەیردەکات کۆچەران و پشتیوانان (رضي الله عنه) لە کەشێکی سارددا هەڵدەکەنن و کۆیلەیان نیە لە جیاتی ئەوان بیکەن، کە سەختی و بریسێتی لێ بەدیکردن فەرمووی:

اللهم ان العیش عیش الاخرة فاغفر للانصار والمهاجرة

ئەوانیش لە وەڵامیدا وتیان:

نحن الذین بایعوا محمدا على الجهاد ما بقینا ابدا

موسلمیش لە ترمزیش هێناویانە، لە جمع الفوائد ج٢ ص٥١ یشدا هاتووە، پێشتر فەرمووودەکەی موجاشیعمان هێنا وتی وتم: لەسەر چی بەیعەتمان لێ وەردەگریت؟ فەرمووی لەسەر ئیسلام و جیهاد، یان فەرمووودەکەی بەشیری کوڕی خەساسیە (ئەی بەشیر سەدەقە و جیهادیش نەبێ، ئەی بەچی دەچیتە بەهەشتەوە؟) وتم دەستت بێنە تا بەیعەتت پێبدەم، ئەویش دەستی هێنا و منیش بەیعەتم پێدا، یان فەرمووودەکەی ئەبویەعلا: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا بەیعەتی کۆچ لە باوکم وەربگرە، فەرمووی: بەڵکو لەسەر جیهاد بەیعەتی لێ وەردەگرم.[1]

[1] - ضعیف

## (بەیعەتدان لەسەر مەرگ)

بوخاری ص٤١٥ لە سەلەمەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: بەیعەتمدا بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پاشان چوومە ژێر سێبەری درەختەوە، کە خەڵکی کەم بوونەوە فەرمووی (ئیبنولئەکوەع بەیعەت نادەیت؟) وتم ئەی پێغەمبەری خوا بەیعەتم داوە، فەرمووی (هەمدی) منیش بۆ جاری دووەم بەیعەتم پێدا، پێی وتم: ئەی ئەبوموسلیم ئەوڕۆژ لەسەر چی بەیعەتتان پێدا؟ وتم: لەسەر مەرگ.[1]

بوخاری ص٤١٥ لە عەبدوڵڵای کوڕی زەیدەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە سەردەمی شەڕی (الحره)[2] دا کەسێك هات بۆلای و پێی وت: ئیبن حەنزەلە لە سەرەمەرگ بەیعەت وەردەگرێ، وتی: لەدوای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەسەر ئەوە بەیعەت بە کەس نادەم، موسلیم هێناویەتی.[3]

## (بەیعەتدان لەسەر گوێگری و گوێڕایەڵی)

بەیهەقی لە عەبدوڵڵای کوڕی ڕافعەوە (رضي الله عنه) هات و ڕژاندی و وتی: ئێمە بەیعەتماندا بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەسەر گوێگری و گوێڕایەڵی لە چالاکی و تەمبەڵیدا، لە سەختی و خۆشیدا ببەخشین، فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە بکەین، لە پێناو خوادا بڵێین و گوێ بە لۆمەی لۆمەکاران نەدەین و پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) سەربخەین ئەگەر هات بۆ یەسریب بۆلامان تا بیپارێزین لەوەی خۆمان و ژن و منداڵمانی لێ دا پارێزین بەهەشت دەبێتە بەشمان، ئەمە ئەو بەیعەتە بوو کە دامان بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)،

---

[1] – موسلیم و ترمزی و نەسائی هێناویاتە، لە العینی ج٧ ص١٦ و بەیهەقی ج٢ ص١٤٦ و ئیبن سەعد ج٤ ص٣٩ دا هاتووە.

[2] – الحره: ئەو شەڕەبوو لەسەردەمی یەزیدی کوڕی موعاویەدا کە تیایدا ڕەوایی لە مەدینەدا گیرایەبەرو کەوتنە تاڵان و بڕی و کوشتنی خەڵکی ناو مەدینە، ئەمەش پەڵەیەکی ڕەشی ناو مێژووی گەشی ئیسلامە.

[3] – لە العینی ج٧ ص١٥ و بەیهەقی ج٨ ص١٤٦ دا هاتووە.

سەنەدەکەی تەواو بەهێزەو بوخاری‌و موسلیم‌و ئەوانی دیکەش نەیانهێناوە، یونس لە ئیبن ئیسحاقەوە هێناویەتی دەڵێت: عوبادەی کوڕی وەلیدی کوڕی عوبادەی کوڕی صامت لە باوکیەوە لە باپیریەوە عوبارده(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: بەیعەتی جەنگمان دا بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەسەر گوێگری‌و گوێڕایەڵی لە سەختی‌و خۆشی‌و چالاکی‌و لاوازی‌و ناڕەحەتیماندا، لەگەڵ کەسی خاوەن کاریدا ڕکەبەری نەکەین‌و لە هەرکوێ بین حەق بڵێین‌و لە پێناو خوادا لە لۆمەی لۆمەکاران نەترسین.[1]

ئیبن جەریر لە جەریرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: بەیعەتم دا بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەسەر گوێگری‌و گوێڕایەڵی‌و ئامۆژگاری کردنی موسڵمانان، هەروەها لە فەرموودەکەیدا هێناویەتی دەڵێت: هاتمە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و وتم: بەیعەتت پێ دەدەم لەسەر گوێگری‌و گوێڕایەڵی لەوەیدا حەزم پێیەو حەزم پێی نیە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (ئایا ئەوە دەتوانیت یان دەرەقەتی ئەوە دێیت؟ وامەڵێ، بڵێ چەندە توانیم)منیش وتم: چەندە توانیم، ئەویش بەیعەتی لێوەرگرتم، هەروەها لەسەر ئامۆژگاری کردنی موسڵمانان[2][3]، ئەبوداود‌و نەسائی لە فەرموودەکەیدا هێناویانە دەڵێت، بەیعەتمدا بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەسەر گوێگری‌و گوێڕایەڵی‌و ئامۆژگاری هەموو موسڵمانێك بکەم، ئەگەر شتێکی بفرۆشتایە یان بیکڕیایە دەیوت: ئەوەی لێمان وەرگرتیت لەوە لامان خۆشەویستترە کە پێت دەدەین خۆت هەڵبژێرە.[4]

بوخاری لە ئیبن عومەرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئەگەر بەیعەتمان بدایە بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەسەر گوێگری‌و گوێڕایەڵی پێی دەفەرمووین (فیما استطعت) واتە(چەندە توانیم).[5]

---

[1]– لە البداية و النهاية ج٣ ص١٦٣ دا هاتووە، بوخاری موسلیمیش بەو واتایە هێناویانە، الترغیب ج٤ ص٣ دا هاتووە.

[2] – ضعیف

[3] – لە کنز العمال ج١ ص٨٢ دا واهاتووە.

[4] – الترغیب ج٣ ص٢٣٧.

[5]– نەسائی هێناویەتی، ئیبن جەریریش بەو واتایە هێناویەتی، لە الکنز ج١ ص٨٣ دا هاتووە.

بەغەوی و ئەبونەعیم و ئیبن عەساکیر لە عوتبەی کوڕی عەبدوڵڵاوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: حەوت بەیعەتم دا بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەسەر گوێڕایەڵی و دوانیان لەسەر خۆشەویستی.[1]

ئیبن جەریر لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: بەم دەستانەم بەیعەتمدا بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەسەر گوێگری و گوێڕایەڵی چەندە بتوانم.[2]

## (بەیعەتی ئافرەتان)

ئەحمەدو ئەبویەعلاو تەبەرانی –کەسەکانی سەنەدەکەی جێ متمانەن– وەك هەیسەمی ج٦ ص٣٨ دەڵێت: لە ئیبن ئوم عەتییەوە (رضي الله عنها) هێناویانە وتی: کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هاتە مەدینە ئافرەتانی پشتیوانان لەماڵێکدا کۆبوونەوە، پاشان عومەری کوڕی خەتابی (رضي الله عنه) نارد بۆلایان، ئەویش لە بەردەرگاکەدا ڕاوەستا و سەلامی لێکردن و ئەوانیش وەڵامیان دایەوە وتی: من نێردراوی پێغەمبەری خوام بۆتان، وتیان: سەلام لە نێردراوی پێغەمبەری خواو خودی پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم)، وتی: بەیعەت دەدەن لەسەر ئەوەی هیچ هاوەڵ بۆ خوا دانەنێن و دزی و زینانەکەن و منداڵەکانتان نەکوژن و لە نێوخۆتاندا بوختان نەکەن و لە چاکەو ڕاستیدا سەرکەش و یاخی نەبن، وتیان: بەڵێ، عومەریش لە دەرەوەی دەرگاکەوە دەستی برد و ئەوانیش لە ناوەوە دەستیان برد، پاشان وتی: خوایە شاهیدبە، فەرمانیشی پێکردین تا لە دووجەژندا بە حەیزو دەستگیرۆیشەوە بچین بۆ جەژن و ڕێگری لێکردین بکەوینە شوێن تەرمی مردوو لەسەر بوختان و لەسەر سەرکەش بوون لە چاکەدا پرسیارم لێکرد وتی: شین و واوەیلایەن ئەبوداود زۆر بە کورتی هێناویەتی.[3][1]

---

[1] – لە الکنز العمال ج١ ص٨٣ دا هاتووە.

[2] – لە کنز العمال ج١ ص٨٢ دا هاتووە.

[3] – صحیح.

دەڵێم: بوخاریش بە کورتی هێناویەتی، ئیبن سەعدو عەبد بن حەمید بە دوورو درێژی هێناویانە،[2]، هەیسەمی ج٦ ص٣٨ دەڵێت: لە سەلمای کچی قەیسەوە (رضي الله عنها) – پورێکی پێغەمبەر (ﷺ) بوو کە لە هەردوو قیبلەدا نوێژی لەگەڵدا کردو یەکێك بوو لە ژنانی بەنی عەددی کوڕی نەجار– وتی: هاتمە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) و لەگەڵ هەندێ لە ئافرەتانی پشتیواناندا بەیعەتم پێدا، کە مەرجی لەسەر دانایین تا هیچ هاوەڵ بۆ خوا دانەنێین و دزی و زینا نەکەین و منداڵەکانمان نەکوژین و بوختان نەکەن و لە چاکەدا سەرکەشی نەنوێنین، فەرمووی (ولا تتغششن ازواجكن) واتە(غەش لە مێردەکانتان نەکەین) ئێمەش بەیعەتمان پێدا،پاشان چووین، بە ئافرێکیانم وت: بگەڕێرەوە پرسیاربکە لە پێغەمبەر (ﷺ) بلێ: غەش کردن لە مێردەکانمان چیە؟ وتی: پرسیارم لێکرد فەرمووی (ماڵ و سامانی ببەیت و هەروا بیدەیت بە کەسی دیکە)[3][4].

تەبەرانی لە المعجم الكبير والمعجم الاوسط لە غوفەیلەی کچی عوبەیدی کوڕی حارسەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: من و قورەیری کچی حارسی عەنواریەی دایکم لەگەڵ هەندێ ئافرەتانی کۆچەردا هاتیە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) بەیعەتمان دا بە پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش بەیعەتی لێ وەرگرتین لەسەر ناوەڕۆکی ئایەتەکە، کاتێك دانمان بەوەدا ناو دەستمان برد تا بەیعەتی پێ بدەین فەرمووی ٠ من دەست نادەم لە دەستی ئافرەتان) داوای لێخۆشبوونی بۆ کردین، ئەوەش بەیعەتەکەمان بوو[5][1].

---

[1] – لە مجمع الزوائد ج٦ ص٣٨ دا هاتووە.

[2] – لە الكنز العمال ج١ ص٨١ دا هاتووە، ئەحمەدو ئەبویەعلاو تەبەرانی – کەسەکانی جێ متمانەن– هێناویانە

[3] – ضعیف

[4] – ئیمامی ئەحمەد لە عائیشەی کچی قوداماوە (رضي الله عنها) بەو واتایە لە بەیعەتدان بە پێی ئایەتەکە هێناویەتی، لە ئیبن کەسیر ج٤ ص٣٥٣ دا هاتووە.

[5] – ضعیف

مالیك هێناویەتی و ئیبن حەببانیش بە صەحیحی داناوە لە ئومەیەی کچی روقیەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ کۆمەڵێك ئافرەتدا هاتمە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تا بەیعەتی پێ بدەین، وتمان ئەی پێغەمبەری خوا بەیعەتت پێ دەدەین لەسەر ئەوەی هیچ هاوەڵ بۆ خوا دانەنێین و لە چاکەدا لێت یاخی نەبین، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (هێندەی بتوانن و دەرەقەت بێن) وتمان: خواو پێغەمبەرەکەی لە خۆمان زیاتر سۆزیان هەیە بۆمان، دەی دەستت بێنە با بەیعەتت پێبدەین ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی (من لەگەڵ ئافرەتدا تەوقە ناکەم، بەڵکو قسەم بۆ سەد ئافرەت وەك قسەم بۆ یەك ئافرەت وایە)[2][3].

تەبەرانی –کەسەکانی سەنەدەکە جێ متمانەن– لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئومەیەی کچی ڕوقیە (رضـي الله عنهـا) هاتە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تا بەیعەتی پێبدات لەسەر ئیسلام، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (ابایعك على ان لا تشركی بالله شیئا ولاتسرقی ولاتقتلی ولدك ولاتاتی ببهتان تفترینه بین یدیك و رجلیك ولاتنوحی ولاتبرجی تبرج الجاهلیه الاولی)[4][5].

ئەحمەدو بەزار – کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن– لە عائیشەوە (رضي الله عنها) هێناویانە دەڵێت: فاتیمەی کچی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە (رضي الله عنها) هات تا بەیعەت بدات بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەویش بەیعەتی لێوەرگرت لەسەر ئایەتەکە، ئەویش دەستی لەسەر دەستی دانا لەتاو شەرمدا، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) سەری سوڕما لەو کارەی، عائیشە (رضي الله عنها) وتی: دانی پێدا بنێ ئەی ئافرەت سوێند بەخوا

---

[1]– هەیسەمی ج٦ ص٣٩ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا موسای کوڕی عوبەیدە هەیە کە لاوازە.

[2] – صحیح.

[3] – ترمزی و کەسانی دیکەش بە کورتی هێناویانە، لە الاصابە ج٤ ص٢٤٠ دا هاتووە.

[4] – صحیح.

[5]– لە الجمع ج٦ ص٣٧ دا هاتووە، نەسائی و ئیبن ماجە و ئیمامی ئەحمەدیش هێناویانە، ترمزی بە صەحیحی داناوە و لە تەفسیری ئیبن کەسیر ج٤ ص٣٥٢ یشدا هاتووە.

کەس بەس لەسەر ئەمە بەیعەتمان داوە، وتی: بەڵێ، ئینجا بەیعەتی پێدا لەسەر ئایەتەکە[1].[2]

تەبەرانی لە عزەی کچی خەیلەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی هاتووەتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) و بەیعەتی پێدا لەسەر ئەوەی زینا و دزی نەکەن و بە ئاشکراو نهێنی زیندە بەچاڵ نەکەن، زیندە بەچاڵی ئاشکرا ئەوە دەیزانم، بەڵام زیندە بەچاڵی نهێنی پرسیارم نەکرد لە پێغەمبەر (ﷺ) و پێی نەوتم، لە دەروونمدا وامزانی خراپکردنی منداڵە، سوێند بەخوا هەرگیز شتی وام نەکردووە[3].[4]

حاکم ج٢ ص٤٨٦ لە فاتیمەی کچی عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی عەبدشەمسەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی ئەبوحوزەیفە (رضي الله عنه) ئەو و هیندی کچی عوتبەی هێناوەتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) تا بەیعەتی پێبدەن، دەڵێت مەرجی لەسەر دانایین، منیش پێم وت: ئامۆزا گیان هیچ لەوانە لەناو هۆزەکەتدا دەزانیت؟ ئەبوحوزەیفە دەڵێت: دەی ئادەی، ئینجا بەیعەتی پێدا چونکە بەوجۆرە بەیعەتی وەردەگرت و بەوەش مەرجی دادەنا، هیند وتی لەسەر دزی بەیعەتت پێنادەم، چونکە من لە ماڵی مێردەکەم دەدزم، پێغەمبەریش (ﷺ) دەستی گرتەوە و ئەویش دەستی گرتەوە تا ناردی بە شوێن ئەبوسوفیاندا و ئەویش ڕێی پێدا شتێك لە ماڵی ببات، ئەبوسوفیان وتی: بۆ خورمای (الرطب) باشە، بەڵام بۆ وشکەکە نا، ئافرەتەکە دەڵێت: سوێند بەخوا ڕقم لە گومەزی تۆ بووە و حەزم نەدەکرد خوا خۆی و ناوی ڕەوا بکات، سوێند بەخوا ئێستا لە هەمووی لام خۆشەویستترە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (سوێند بەخوا وایە،

---

[1] – صحیح.

[2] – لە مجمع الزوائد ج٦ ص٣٧ دا هاتووە.

[3] – ضعیف

[4] – هەیسەمی ج٦ ص٣٩ دەڵێت: تەبەرانی لە معجم الاوسط و معجم الکبیر بەوجۆرە لە عەتائی کوڕی مەسعودی کەلبیەوە لە باوکیەوە لەو ئافرەتەوە هێناویەتی و مەسعود ناناسم و کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە جێ متمانەن،

کەستان باوەڕی تەواو نیە تا لە خۆی و منداڵ و باوکی لای خۆشەویستتر نەبم) حاکم دەڵێت: ئەم فەرموودە سەنەدەکەی صەحیحە، بەڵام بوخاری و موسلیم نەیانهێناوە، زەهەبی بە صەحیحی داناوە ئەبویەعلا لە عائیشەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: هیندی کچی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە (رضي الله عنها) هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) تا بەیعەتی پێبدات، ئەویش سەیری دەستی کردو فەرمووی (بڕۆ دەستەکانت بگۆڕە) (اذهبي فيغيري يديك) منیش چووم و بە خەنە ڕەنگیانم گۆڕین، پاشان هاتەوە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) و ئەویش فەرمووی (بەیعەتت پیێ دەدەم لەسەر ئەوەی هیچ هاوەڵێك بۆ خوا دانەنێیت و دزی و زینا نەکەیت) وتی: مەگەر ئافرەتی ئازاد زینا دەکات؟ فەرمووی (منداڵەکانتان لە ترسی نەبوونیدا نەکوژن) وتی: مەگەر هیچ منداڵت بۆ بەجێهێشتووین تا بیانکوژین، بەیعەتی پێدا و دواتر بە پێغەمبەری (ﷺ) وت — دوو بازنی زێڕینی لە دەستدا بوو— چی دەڵێیت لەبارەی ئەم دوو بازنەیە؟ فەرمووی (دوو پشکۆی ناو دۆزەخن)[1][2].

لە الاصابة ج٤ ص٤٥٢ دەڵێت: چیرۆکەکەی لە کاتی بەیعەتی ئافرەتاندا هێناوە- دەفەرموێت (دزی و زینا نەکەن) وتی: مەگەر ئافرەتی ئازاد دزی دەکات؟ لە کاتی فەرمایشتی (ولايقتلن اولادهن) واتە(منداڵەکانتان مەکوژن) وتی: بە بچوکی گەورەیان بکەین و بە گەورەیی بیانکوژین، لە ڕێگەی هێنانی ئیبن سەعدەوە بە سەنەدی صەحیحی مورسەل لە شەعبیەوە و لە مەیمونی کوڕی میهرانیشەوە هاتووە، لە گێڕانەوەکەی شەعبیەوە هاتووە: زینانەکەن، هیند وتی: مەگەر ئافرەتی ئازاد زینا دەکات؟ بۆ (منداڵەکانتان مەکوژن) وتی: تۆ کوشتنت، لە گێڕانەوەیەکی هاوشێوەشیدا هاتووە، بەڵام وتی: مەگەر لە ڕۆژی بەدردا منداڵت بۆ هێشتینەوە؟ ئیبن مندە هێناویەتی: لە سەرەتاکەیەوە هاتووە: هیند وتی: دەمەوێت بەیعەت بدەم بە

---

[1] — حسن.

[2]— هەیسەمی ج٦ ص٣٧ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا کەسی وا هەیە کە نایناسم. ئیبن ئەبی حاتەم بە کورتی هێناویەتی، ئیبن کەسیر ج٤ ص٣٥٤ هێناویەتی

موحەمەد، وتی: دەمبینیت تۆ بێباوەڕ بوویت، وتی: ئەرێ بە خوا، سوێند بە خوای گەورە نەمبینیوە پێش ئەمشەو لەم مزگەوتەدا خوا بەحەق بپەرسترێت، سوێند بە خوا دەبینم بە هەستان و کڕنوش و سوجدەوە نوێژیان دەکردتۆش ئەوت کرد کە کردت، دەی لەگەڵ خۆتدا پیاوێکی هۆزەکەت ببە، ئەویش چوو بۆلای عومەر (رضي الله عنه) و لەگەڵیدا چووو بەیعەتی بۆ وەرگرتن بە دەم و چاو داپۆشراوی چوویە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و باسی بەیعەتەکە دەکات، هیند وتی: من لە ماڵ و سامانی ئەبوسوفیانم خەرج کردووە، ئەبوسوفیان وتی: چی لە ماڵ و سامانم بردووە حەڵاڵە، بە کورتی تەواو بوو، ئیبن جەریر لە فەرموودەکەی ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) بە دوورو درێژی هێناویەتی، ئیبن کەسیر لە تەفسیرەکەیدا ج٤ ص٣٥٣ دەڵێت: تیایدا هاتووە: ئەبوسوفیان وتی: لە ڕابردوودا چیت بردووە یان ئەوەش کە ماوە حەڵاڵت بێت، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) پێکەنی و ناسیەوەو بانگی کرد (ژنەکەی ئەبوسوفیان) هیند دەستی گرت و داوای لێبوردنی لێکرد، فەرمووی تۆ هیندی؟ وتی: خوا لە ڕابردووت خۆش بووە، با پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) پشتگوێی بخات، ئەویش فەرمووی (زینا نەکەن) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا مەگەر ئافرەتی ئازاد زینا دەکات؟ فەرمووی: نەبەخوا ئافرەتی ئازاد زینا ناکات، فەرمووی (منداڵەکانتان مەکوژن) هیند وتی: تۆ لە ڕۆژی بەدردا کوشتنت، تۆ و ئەوان باشتر دەبینن، فەرمووی (ولا ياتين ببهتان يفترينه بين ايديهن و ارجلهن) دەڵێت: هەروەها لە چاکەشدا یاخی نەبن، ڕێی لێ گرتن شیوەن بکەن، چونکە خەڵکی نەزانی لەکاتی شیوەندا جلەکانیان دادەدڕین و دەموچاویان دادەڕنی و قژیان دەبڕین و هاوارو شیوەنیان دەکرد، ئیبن کەسیر دەڵێت: ئەمە ئەسەرێکی غەریبە، ئیبن ئەبی حاتەم لە ئوسەیدی کوڕی ئەبوئوسەیدی بەزار لە ئافرەتێکی بەیعەتدەرەوە هێناویەتی دەڵێت: لەناو بەیعەتەکەماندا ئەبو لە چاکەدا لێی یاخی نەبین و ڕوونەماڵین و قژنەڕنین و بەرۆك دانەدڕین و شین و واوەیلا نەکەین[1].[2]

---

[1] – ضعيف

[2] – لە تەفسیری ئبن کەسیر ج٤ ص٣٥٥ دا هاتووە.

## (بەیعەتی هەرزەکاران)

تەبەرانی لە موحەمەدی کوڕی حوسەینەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەیعەتی لە حەسەن و حوسەین و عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس و عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر(رضي الله عنه) وەرگرت و هەمووشیان بچوك بوون و هێشتا ڕیشیان ڕەش نەکردبوو و باڵغ نەببون، لەناو منداڵاندا تەنها بەیعەتی لە ئێمە وەرگرت.[1]

تەبەرانی لە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرەو عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی لە تەمەنی حەوت ساڵیدا بەیعەتمان داوە بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) کە بینیونی زەردەخەنەی کردووە و دەستی بردووە و بەیعەتی لێوەرگرتوون.[2]

نەسائی لە هرماسی کوڕی زیادەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: دەستم بەرەو لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) برد و هێشتا منداڵ بووم، داوام کرد بەیعەتم لێ وەربگرێت، بەڵام بەیعەتی لێ وەرنەگرتم.[3][4]

## (بەیعەتی هاوەڵان (رضي الله عنه) لەسەر دەستی خەلیفەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم))

ئیبن شاهین لە (الاصابة) لە ئیبراهیمی کوڕی مونتەشر لە باوکیەوە لە باپیریەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك خوای گەورە ئایەتی دابەزاندە سەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) (ان

---

[1]- هەیسەمی ج٦ ص٤٠ دەڵێت: فەرموودەکە مورسەلە و کەسەکانی سەنەدەکەش صەحیحن.

[2]- هەیسەمی ج٩ ص٢٨٥ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا ئیسماعیلی کوڕی عەبباسیش هەیە کە لەسەری ڕاجیاوازن، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە کەسانی صەحیحن، ئەبونەعیمی ئیبن عەساکیریش لە عروەوە هێناویانە عەبدوڵڵای کوڕی زوەیرو عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر – لە دەربڕینێکی تردا جەعفەری کوڕی ز بەیعەتیاندا بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەروەك لە المنتخب ج٥ ص دا هاتووە.

[3] – حسن.

[4] – لە جمع الفوائد ج١ ص١٤ دا هاتووە.

الـذين يبـايعونـك انمـا يبـايعون الله) ئـەو بەيعەتـەی پێغەمبـەر (ﷺ) لـێم وەردەگـرت بەیعەتدان بوو بە خواو گوێڕایەڵی حەق، بەیعەتی ئەبوبەکریش (رضي الله عنه) لەسەر ئەوەبوو بەیعـەتم پـێ دەدەن لـەوەی گوێڕایـەڵی خـوابم، بەیعـەتی عومـەریش (رضي الله عنه) و ئـەوانی دواتریش وەك بەیعەتی پێغەمبەر (ﷺ) بوو.[1]

بەیهەقی ج٨ ص١٤٦ لە ئیبن عەفیفەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئەبوبەکرم(رضي الله عنه) دی کە لەدوای پێغەمبەر (ﷺ) بەیعەتی لە خەڵك وەردەگرت، دەستەیەك دەهاتنەلای و ئەویش دەیوت: بەیعـەتم پـێ دەدەن لەسـەر گوێگری و گوێڕایەڵی خـواو قورئانەکەی پاشان بۆ ئەمیر؟ دەیانوت: بەڵێ، ئەویش بەیعـەتی لـێ وەردەرگتن، منیش ئـەوکات تازە باڵغ ببوم ماوەیەك لای مامـەوەو مەرجەکەیم لەسـەر خـەڵك زانـی و هاتم بـۆلای و لەگـەڵی کەتمـە قسەو وتم: بەیعـەتت پـێ دەدەم لەسـەر گـوێگری و گوێڕایـەڵی خـواو قورئانەکەی، پاشان ئەمیر، ئەویش سەری چەماندەوەو سەیری کردمو دواتر خـۆی ئاسایی کردەوە، دەمبینی سەرسامم کردبوو (ڕەحمەتی خوای لێ بێت).

موسـەدد لـە ئەبوسـەفەرەوە (رضي الله عنه) هێناویـەتی دەڵێـت: ئەبوبـەکر (رضي الله عنه) کـە دەستەیەکی دەنارد بۆ شام لەسەر تانەو تاعون بەیعەتی لێ وەردەگرتن.[2]

ئیبن سەعدو ئیبن ئەی شەیبەو تەیالیسی لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: هاتمە مەدینەو ئەبوبەکر مردبوو و عومەر (رضي الله عنه) شوێنی گرتبوویەوە، بە عومەرم وت: دەستت بێنە با هـەمان بەیعـەتی هـاوەڵی پێش خۆتـت پـێ بدەم بەیعـەتی گوێگری و گوێڕایەڵی چەندە بتوانم.[3]

ئیبن سەعد لە عومەیری کوڕی عەتیەی لەیسیەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: هاتمـە لای عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) وتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران دەستت بێنـە – خـوا

[1] – لە الاصابە ج٣ ص٤٥٨ دا واهاتووە.

[2] – لە کنزالعمال ج٢ ص٣٢٣ دا واهاتووە.

[3] – لە کنز العمال ج١ ص٨١ دا واهاتووە.

دەست بەرز بکاتەوە – تا لەسەر سوننەتی خواو پێغەمبەرەکەی بەیعەتت پێ بدەم، ئەویش دەستی هێناو پێکەنی و وتی: ئەمە لەسەر ئێوەیە بۆ ئێمەو لەسەر ئێمەشە بۆ ئێوە.

عەبدوڵلای کوڕی حەکیم(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: بەم دەستانەم بەیعەتم دا بە عومەر (رضي الله عنه) لەسەر گوێگری و گوێڕایەڵی[1]

ئەحمەد لە (السنة) لە سەلیمی ئەبوعامرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی: وەفدی حەمرا هاتنەلای عوسمان (رضي الله عنه) و بەیعەتیان پێدا تا هیچ هاوەڵێك بۆ خوا دانەنێن و نوێژبکەن و زەکات بدەن و ڕۆژووی ڕەمەزان بگرن و وازبهێنن لە جەژنی مەجوس، کە وتیان بەڵێ بەیعەتی لێ وەرگرتن.[2]

بوخاری لە میسوەری کوڕی مەخرەو(رضي الله عنه) هێناویەتی ئەو دەستەی عومەر (رضي الله عنه)داینابوون کۆبوونەوەو ڕاوێژیان کرد، عەبدولڕەحمان (رضي الله عنه) پێی وتن: من لەسەر ئەم کارە ڕکەبەریتان ناکەم، بەڵام ئەگەر حەزدەکەن لەناو خۆتاندا کەسێکتان بۆ هەڵدەبژێرم، ئەوانیش دایانە دەست عەبدولڕەحمان، خەڵکی بەرەو لای چوون تا هەرکەسی بدیبایە شوێنی ئەو دەستە کەوتوون و بە شوێنیدا دێن و بەرەولای عەبدولڕەحمان دێن لەو شەوانەدا ڕاوێژیان پێ دەکرد، تا ئەو شەوەی بۆ بەیانیەکەی بەیعەتمان دا بە عوسمان (رضي الله عنه) میسوەر وتی: عەبدولڕەحمان درەنگە شەوێك هات و تەقەیدا لە دەرگا تا لەخەو هەستام، وتی: دەبینم خەوتوویت، سوێند بەخوا ئەمشەو هێندە چاوم نەداوە بەیەکدا، هەستە سەعدو زوبەیر (رضي الله عنه) بانگ بکە، منیش بانگم کردن و ئەویش ڕاوێژی پێ کردن، پاشان بانگی کردم و وتی: عەلیم (رضي الله عنه) بۆ بانگ بکە، منیش بانگم کرد، تا درەنگە شەوانێك دواندی، پاشان عەلی لەلای هەستا و چاوی لە خیلافەت بوو، عەبدولڕەحمان کەمێك لە عەلی دەترسا، پاشان پێی وتم:

---

[1] – لە الكنز العمال ج١ ص٨١ دا واهاتووە.

[2] – لە کنز العمال ج١ ص٨١ دا واهاتووە.

عوسمانم بۆ بانگ بکە، منیش بانگم کرد، ئەویشی دواند تا بانگی بەیانی، کە خەڵکی نوێژی بەیانیان کردو ئەو دەستە لە مینبەر کۆبوونەوە عەبدولڕەحمان ناردی بەدوای کۆچەران و پشتیوانانی ئامادەبوو و سەرکردە سەربازیەکاندا، ئەوان لەگەڵ عومەردا بۆ ئەو حەجە چوو بوون، کە کۆبوونەوە عەبدولڕەحمان شایەتومانی وتەوەو دواتر وتی: پاشان ئەی عەلی من سەیری باری قسەی خەڵکم کردو دیتم لەسەر عوسمان کێشەیان نیە، بۆیە ئەملاو لاو پەلە مەکەن دەستی عوسمانی گرت و وتی: لەسەر سوننەتی خواو پێغەمبەرەکەی و دووخەلیفەی دوای پێغەمبەر (ﷺ) بەیعەتت پێ دەدەم، عەبدولڕەحمان بەیعەتی پێداو کۆچەران و پشتیوانان و سەرکردە سەربازیەکان و موسڵمانانیش بەیعەتیان پێدا.[1]

[1] - بەیهەقی ج٨ ص١٤٧ بەهەمان شێوە هێناویەتی.

# (بەشی سێیەم)

# (خۆگرتن لەسەر سەختیەکان لە پێناو خوادا)

(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانی (رضي الله عنه) چۆن لەسەر سەختیو ئازارەکانو برسێتیو تینوێتی لە پێناو دەرخستنی ئایینی بەرزو پتەوداو لە پێناو خوای گەورەدا بۆ بەرز ڕاگرتنی پەیامی خوا خۆیان دەگرت)

# (بەشی سێیەم)

# (خۆگرتن لەسەر سەختیەکان لە پێناو خوادا)

## (پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی (رضي الله عنهم) چۆن لەسەر سەختیو ئازارەکانو برسێتیو تینوێتی لە پێناو دەرخستنی ئایینی بەرزو پتەوداو لە پێناو خوای گەورەدا بۆ بەرز ڕاگرتنی پەیامی خوا خۆیان دەگرت)

ئەبو نەعیم لە الحلیە ج١ ص١٧٥ لە جوبەیری کوڕی نوفەیر لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: لە پاڵ میقدادی کوڕی ئەسوەددا(رضي الله عنه) ڕۆژێکیان دانیشتبووین کەسێك دای بە پاڵیدا، وتی: سەربەرزی بۆ ئەو دووچاوە کە پێغەمبەریان (ﷺ) بینیوە، سوێند بەخوا حەزمان دەکرد ئەوەی تۆ بینیوتە ئێمەش بیبینین، منیش گوێم گرتو سەرم سووڕما دیتم تەنها خێر دەڵێت: پاشان هاتە پێشەوەو وتی: بۆچی هیوا بەشتێك دەخوازن کە خوای گەورە دووری خستوونەتەوە لێی، نازانی ئەگەر لەو سەردەمەدا بوایە چۆن دەبوو، سوێند بەخوا کەسانێك لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) هەبوون خوای گەورە بەرەو دۆزەخی ناردن نەهاتن بەدەمیەوەو بە ڕاستیان نەزانی، یان چۆن سوپاسی خوا ناکەن کە خوای گەورە هێناونی و تەنها پەروەردگارتان دەناسنو ئەوەی پێغەمبەرتان هێناویەتی دانی پێدا دەنێنو لە بەڵاو سەختیەك پارێزراون کە جگە لە ئێوە توشی بوون؟ سوێند بەخوا پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر سەختترین بارێك نێردرا کە پێغەمبەران لە ماوەیەکدا دەنێردرێن سەردەمی نەزانی بێتو چاکترین ئایین لایان بتپەرستی بوو، خوایش یەکلا کەرەوەیەکی هێناو حەقو باتڵی لەیەك جیا کردەوە، نێوانی خستە نێوان باوكو کوڕەوە، تا ئەوەی کەسێك باوکی یان کوڕی یان برای بە بێباوەڕی دەدیو خوا قوفڵی دڵی خۆی بەرەو ئیمان کردبوویەوە دەیزانی هەرکەس بچێتە ناو دۆزەخ قوڕبەسەرە چاوی ئۆقرەی نەدەگرت

کەســە نزیکەکـەی ببینێـت دەچـێتە دۆزەخـەوەو ئـەو فەرمایـشتەی پـەروەردگاری دەهاتەوە بیر (ربنا هب لنا من ازواجنا و زریاتنا قرة اعین)[1][2].

ئیبن ئیسحاق لە موحەمەدی کوڕی کەعبی قورزیەوە هێناویەتی دەڵێت: پیاوێکی خەڵکی کوفە بە حوزەیفەی کوڕی یەمانی (رضي الله عنه) وت: ئەی ئەبوعەبدوڵڵا ئێوە بینەرو هاوەڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوون، وتی: بەڵێ ئەی برازا، وتـی چیتان کرد؟ وتـی: سوێند بـەخوا زۆر تێدەکۆشـاین و مانـدوو دەبووین، وتـی: سـوێند بـە خـوا ئەگـەر ئێمـەش بمانبینیایە نەماندەهێشت بچێت بەسەر زەویداو دەمانخستە سەر شانمان، حوزەیفە وتـی: بـرازا سـوێند بـەخوا لــە خەندەقـدا لەگـەڵ پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) بـووین، ئینجـا فەرموودەکە دێنێت لەسەر خۆگرتنیان لەسەر سەختی ترس و برسێتی و سەرما.[3]

موسلیم هێناویەتی، حوزەیفە پێی وت: تۆ لەوێ بوویتایە چیت دەکرد؟ لە شـەوی ئەحزاب لە شـەوێکی ڕەشـەبای توند و سارددا لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بووین، ئینجا فەرموودەکـە دێنێـت، حـاکم و بەیهـەقی هێناویانـە حوزەیفـە دەیـوت: هیـوای ئـەوە مەخوازن، ئینجا فەرموودەکەی هێنا وەك لە باسی خۆگرتن لەسەر ترس دەیهێنین.[4]

---

[1] – صحیح.

[2] – تەبەرانی بەو واتایە بە چەند سەنەدێك هێناویـەتی، لـە سـەنەدێکیاندا یەحیای کوڕی صالح هەیـە کـە زەهـەبی متمانـەی پـێ دەدات، بـەڵام هەنـدێ قسـەی لەسـەر دەکـەن کەسـەکانی دیکـەی سەنەدەکە وەك هەیسەمی لە المجمع ج٦ ص١٧ دا دەڵێت کەسەکانی صەحیحن.

[3] – صحیح.

[4] – صحیح.

# (خۆگرتنی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر سەختی و ئازار لە پێناو بانگەوازی ڕێی خوادا)

ئەحمەد لە ئەنەسەوە (ﷺ) هێناویەتی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت (ئازارێکم چەشتووە کەس نەی چەشتووە، لەبەر خوا هێندە ترسێنراوم کەس وا نەترسێنراوە، سێ شەو و ڕۆژم بەسەردا هاتووە من و بیلال شتێکمان نەبوو کە جەرگ ئاوساوێکیش بیخوات مەگەر ئەوەی لە بن باڵی بیلالدا حەشاردەدرا)[1،2].

تەبەرانی لە معجم الاوسط و معجم الکبیر لە عەقیلی کوڕی ئەبوتالیبەوە (ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: قورەیش هاتن بۆلای ئەبوتالیب و وتیان: ئەی ئەبوتالیب براکەت دێتە کۆڕو کۆمەڵمان و هەندێ شت دەڵێت کە ئازارمان دەدات، بەڵکو ڕێی لێ بگریت، ئەویش پێی وتم ئەی عەقیل بڕۆ ئامۆزاکەتم بۆ بانگ بکە، منیش لە ماڵێکی ئەبوتالیبدا دۆزیمەوە، لەگەڵم هات و بە دوای فەیئەدا دەچوو، دەهات و دەچوو و دەستی نەکەوت تا گەیشتە لای ئەبوتالیب، ئەبوتالیب پێی وت: برازاکەم، سوێند بەخوا دەزانم تۆ گوێڕایەڵیم دەکەیت، وا هۆزەکەت هاتوون و بانگەشەی ئەوە دەکەن دەچیتە کۆڕو کۆمەڵیان و قسەیەك دەکەیت کە ئازاریان دەدات، بەڵکو وازیان لێ بهێنیت، ئەویش چاوی بەرەو ئاسمان بەرزکردەوە و وتی (سوێند بە خوا چەند یەکێك لە ئێوە دەتوانێت لەو خۆرەوە بەشە ئاگرێك بکاتەوە هێندە منیش دەتوانم وازبهێنم لەمەی پێی نێردراوم). ئەبوتالیب وتی: سوێند بەخوا برازاکەم هەرگیز درۆ ناکات، بگەڕێنەوە بەوجۆرە.[1،3]

---

[1] – صحیح.

[2] – لە البدایەوالنهایە ج٣ ص٤٧ دا واهاتووە، ترمزی و ئیبن ماجە لە صەحیحەکەیاندا هێناویانە ترمزی دەڵێت فەرموودەکە حەسەنی صەحیحە، لە الترغیب ج٥ ص١٥٩ دا هاتووە، ئیبن ماجە و ئەبونەعیمیش هێناویانە.

[3] – حسن.

بەیهەقی وا هێناویەتی ئەبوتالیب پێی وت: برازاکەم وا هۆزەکەت هاتوون بۆلام و ئەمەو ئەوە دەڵێن، دەی من و خۆیشت بهێڵەرەوە و شتێکم تووش مەکە من و تۆیش دەرەقەتی نەیەین، واز لەو قسە بێنە کە هۆزەکەت پێی بێزار دەبن، پێغەمبەریش (ﷺ) وای زانی مامی وازی لێ دێنێت و دەیدات بە دەستەوە و ناتوانێت لەگەڵیدا بڕوات بۆیە فەرمووی (مامە گیان، ئەگەر خۆر بخەنە دەستی ڕاستم و مانگ بخەنە دەستی چەپم واز لەم کارە ناهێنم تا خوا سەری دەخات یان لە پێناویدا لەناو دەچم) پاشان پێغەمبەر (ﷺ) دڵی پڕبوو و گریا و لایکردەوە تا بچێت، کاتێك بینی پێغەمبەر (ﷺ) چی بەسەر هاتووە وتی: برازاکەم، ئەویش سەیری کرد، وتی: لەسەر کاری خۆت بڕۆ و چیت پێ خۆشە بیکە، سوێند بەخوا هەرگیز دەستت لێ بەرنادەم[٢،٣].

بەیهەقی لە عەبدوڵلای کوڕی جەعفەرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك ئەبوتالیب مرد پێغەمبەر (ﷺ) بەرەوڕووی گەمژەیەکی قورەیش کەوتەوە و خۆڵی کرد بەسەر پێغەمبەردا، ئەویش گەڕایەوە بۆ ماڵەوە و یەکێك لە کچەکانی خۆڵی سەر دەموچاوی لادەبرد و دەگریا، ئەویش فەرمووی (کچی شیرینم، مەگری، چونکە خوا باوکت دەپارێزێت) لە نێوان ئەمەشدا دەیوت (قورەیش هیچیان نەکرد بێزارم بکەن تا ئەبوتالیب مرد، دواتر دەستیان پێکرد)[٤].[٥] ئەبونەعیم لە الحلیە ج٨ ص٣٠٨ دا هێناویەتی لە ئەبوهورەیرەوە (رضي الله عنه) دەڵێت: کاتێك ئەبوتالیب مرد هێرشیان بردە سەر پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش فەرمووی (مامە گیان! چەندە زوو هەستم بە لە دەستدانت کرد).

---

[١]- هەیسەمی ج٦ ص١٤ دەڵێت: تەبەرانی و ئەبویەعلا بە کورتی لە سەرەتاکەیەوە هێناویانە، کەسەکانی سەنەدەکەی ئەبو یەعلا صەحیحن، بوخاری لە (التاریخ) هێناویەتی، لە البدایە والنهایە ج٣ ص٤٢ یشدا هاتووە.

[٢]- حسن.

[٣]- لە البدایة والنهایة ج٣ ص٤٢ دا واهاتووە.

[٤]- ضعیف.

[٥]- لە البدایة والنهایةج٣ ص١٣٤ دا هاتووە،

تەبەرانی لە حارسی کوڕی حارسەوە دەڵێت بە باوکم وت: ئەو کۆمەڵە چی بوون؟ وتی: ئەوانە دژ بە هەڵخەڵەتاوێکیان کۆبووتەنەوە، دەڵێت: دابەزین دەبینین پێغەمبەر (ﷺ) خەڵك بانگ دەکات بۆ یەکتاپەرستی خوای گەورە بڕواداری و ئەوانیش بەرپەرچیان دەدایەوە و ئازاریان دەدا تا نیوەڕۆ، ئەوکات خەڵکی چوون و ژنێك هات و سەرسنگی دەرکەوتبوو و سەتڵ و پەڕۆیەکی پێبوو ئاوی پێدەدا و ئەویش ئاوی خواردەوە و دەست نوێژی گرت و دواتر سەری بەرز کردەوە و وتی (یا بنیه خمری علیك نحرك ولاتخافین علی ابیك) واتە(کچی شیرینم سەرسنگت داپۆشە و ترست لە باوکت نەبێت) وتمان ئەوە کێیە؟ وتیان زەینەبی کچیەتی (رضي الله عنها)[1].[2]

هەروەها تەبەرانی لە منبتی ئەزدیەوە هێناویەتی دەڵێت: لە سەردەمی نەفامیدا پێغەمبەرم (ﷺ)دەبینی دەیفەرموو (ئەی خەڵکینە بڵێن لا اله الا الله سەرکەوتوو و براوە دەبن) هەیانبوو تفی دەکردە نێوچەوانی، هەیانبوو خۆڵی بەسەردا دەکرد، هەیانبوو قسەی پێ دەوت تا نیوەڕۆ، ئینجا ئافرەتێك سەتڵێك ئاوی هێناو دەموچاوی و دەستەکانی شۆرد و ئەویش دەیفەرموو (یا بني لا تغشی علی ابیك غیلة ولاذلة) واتە(کچی شیرینم لەوە نەترسیت کە بڵێیت باوکم دەکوژن یان زەلیلی دەکەن). منیش وتم: ئەو ئافرەتە کێیە؟ وتیان زەینەبی کچی پێغەمبەرە (ﷺ) کچێکی جوان و ڕەنگ درەوشاوە بوو[3].[4]

بوخاری لە عوروەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پرسیارم کرد لە ئیبنولعاص (رضي الله عنه) وتم: لەسەر سەختترین کاری بێباوەڕان بەرامبەر بە پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵم پێ بدە،

---

[1] – حسن.

[2] – هەیسەمی ج٦ ص٢١ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی جێ متمانەن.

[3] – ضعیف.

[4] – هەیسەمی ج٦ ص٢١ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا منبتی کوڕی مدرك هەیە کە نایناسم، کەسەکانی دیکە جێ متمانەن.

وتی: کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) لەلای کەعبە نوێژی دەکرد عوقبەی کوڕی ئەبی موعەیت هات و کراسەکەی خستە ملی و لێی توند کردەوە، ئەبوبەکر (رضي الله عنه) چوو و شانی گرت و فڕێی دایە ئەولا و وتی (اتقتلون رجلا ان يقول ربي الله وقد جائكم بالبينت من ربكم).[1]

ئیبن ئەبی شەیبە لە عەمری کوڕی عاصەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: نەمبینی قورەیش بیانەوێت پێغەمبەر (ﷺ) بکوژن تا ئەوەی ڕۆژێك پیلانیان بۆ دانا و لە ژێر سایەی کەعبەدا دانیشتبوون و پێغەمبەریش (ﷺ) لای مەقامدا نوێژی دەکرد، عوقبەی کوڕی ئەبوموقیت هات بۆی و عەباکەی خستە ملی و ڕایکێشا تا پێکانی کەوتنە زەوی و هەموو خەڵك وایانزانی کوژراوە، ئەبوبەکریش (رضي الله عنه) هات و توند ژێربالی پێغەمبەری (ﷺ) گرت و وتی (اتقتلون رجلا ان يقول ربى الله) پاشان لای پێغەمبەر (ﷺ) چوون و پێغەمبەریش (ﷺ) هەستا نوێژی کرد، کە لە نوێژەکەی بوویەوە دای بە پاڵیاندا و ئەوانیش لە سێبەری کەعبەدا دانیشتبوون، پێی فەرموون (يا معشر قريش اما والذي نفس محمد بيده ما ارسلت اليكم الا بالذبح) واتە(ئەی کۆمەڵی قورەیش سوێند بەوکەسەی گیانی موحەمەدی بە دەستە نەنێردراوم بۆلاتان مەگەر بەسەربڕین) بەدەستی ئاماژەی بە قوڕقڕاگەی کرد، ئەبوحەهل پێی وت: تۆ بێئاگا و نەفام نەبوویت، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو تۆ لەوان بوویت.[2][3]

ئەحمەد لە عروەی کوڕی زوبەیر لە عەبدوڵای کوڕی عەمرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێم وت: کەی قورەیشت بینیوە زیاتر ئازاری پێغەمبەر (ﷺ) بدەن؟ وتی: –

---

[1] – لە البداية والنهاية ج٣ ص٤٦ دا واهاتووە.

[2] – حسن.

[3] – كنز العمال ج٢ ص٣٢٧. ئەبویەعلا و تەبەرانیش بەوجۆرە هێناویانە، هەیسەمی ج٦ ص١٦ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا موحەمەدی کوڕی عەمری کوڕی عەلقەمە هەیە کە فەرموودەی حەسەنە کەسەکانی دیکەی سەنەدی تەبەرانی صەحیحن، هەروەها ئەبونەعیم لە الدلائل ص٦٧ دا هێناویەتی.

پیاوماقوڵەکانیان لە حجردا کۆببونەوە – منیش لایان بووم، وتیان: بەرگەی بینینی ئەم کابرا ناگرین وا گەنجەکانمانی لە خشتە بردووەو قسە دەڵێت بە باو باپیرانمان و ئاییمنمان بە عەیبە دەزانێت و دووبەرەکی خستووین و قسە بە خواوەندەکانمان دەڵێت: بە ڕاستی لەسەر شتێکی گەورە بەرگەمان گرتووە، یان شتێکی لەو جۆرەیان وت، لەم بارەدابووین کە پێغەمبەر (ﷺ) دەرکەوت و چوو تا نزیك بوویەوەو تەواف کەعبەی کرد، کە دای بەپاڵیاندا و هەندێ لە قسەکانیان وتەوە، ئەوەم لە ڕوخساریدا بەدی کرد پاشان چوو، کە جاری دووەم چوو دووبارەیان کردەوەو ئەوەم لێ بەدیکردەوە، کە جاری سێیەم چوو ئەوەیان کردەوەو ئەویش فەرمووی (ئەی کۆمەڵی قورەیش دەبیستن؟ سوێند بەوکەسەی گیانی موحەمەدی بە دەستە هاتووم بۆلاتان بەسەربڕینەوە) قسەکەی خەڵکەکەی گرت تا کامەیان زۆر پرشنگی هەبوو ئەوەی قبوڵ کرد تا دایمرکێنێتەوەو بە جوانتر دەیدواند و دەیوت ئەبولقاسم وەرە بڕۆ، بڕۆ بەڕێزەوە سوێند بەخوا نەفام نیت، پێغەمبەریش (ﷺ) چوو تا بۆ بەیانی کۆبوونەوەو منیش لەگەڵیاندا بووم، بەیەکدییان دەوت: بیرتان دێت چیتان پێ هات تا ئەوەی گاڵتەی پێ کردن و ئێوەش وازتان لێ هێنا، لەم کاتەدا پێغەمبەر (ﷺ) هات و هەموو بەیەکجار دایان بەسەریداو چواردەوریان داو وتیان: تۆ بوویت ئەمەو ئەوەت دەوت؟ چونکە بە عەیبەی خواوەندو ئایینەکانیان دەزانین، دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو (بەڵێ من بووم ئەوەم وت) دەمدی هەرکامیان سوچێکی عەباکەی دەگرت، ئەبوبەکریش هەستا تا لایان ببات و دەگریا و دەیوت (اتقتلون رجلا ان يقول ربي الله) پاشان لێی دوورکەوتنەوە ئەمە سەختترین کاری قورەیش بوو بەرامبەری کە هەرگیز نەگەیشتبووە ئەو بارە[1].[2]

---

[1] – صحيح.

[2] – هەیسەمی ج٦ ص١٦ دەڵێت: ئیبن ئیسحاق بە سەماع هاتووەو کەسەکانی دیکەی سەنەدەکەی صەحیحن.

بەیهەقیش لە عورووەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: بە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصم وت: کەی زیاتر دژایەتی قورەیشت بینیوە؟ ئەویش بە دوورو درێژی بەو جۆرە هێناویەتی،[1] ئەبویەعلا لە ئەسمائی کچی ئەبوبەکرەوە (رضي الله عنها) پێیان وت: کەی بینیوتە بێباوەڕان زۆر دژایەتی پێغەمبەر (ﷺ) بکەن، وتی: بێباوەڕان لە کەعبەدا قسەیان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) و قسەی بەرامبەر خواوەندەکانیان دەکرد، لەو کاتەدا پێغەمبەر (ﷺ) هات و هەستان بۆی تا هاوار گەیشتەلای ئەبوبەکر وتیان: فریای هاوڕێکەت بکەوە، ئەویش لەلامان هەستاو دەیوت (قوڕتان بەسەر، کەسێك دەکوژن کەدەڵێت خوا پەروەردگارمەو بەڵگەی ڕوونی بۆ هێناون) ئەوانیش وازیان هێنا لە پێغەمبەر (ﷺ) و ڕوویانکردە ئەبوبەکر.[2]

ئەبویەعلا لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: جارێکیان هێندەیان دا لە پێغەمبەر (ﷺ) تا لە هۆش خۆی چوو، ئەبوبەکر (رضي الله عنه) هەستاو هاواری کرد قوڕتان بەسەر کەسێك دەکوژن کە دەڵێت پەروەردگارم خوایە، وتیان ئەوە کێیە؟ وتیان ئەبوبەکرە شێتە.[3]

بەزار لە موسنەدەکەیدا لە موحەمەدی کوڕی عقیل لە عەلیەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی کە وتاری بۆ خوێندوونەتەوەو وتوویەتی: خەڵکینە کامتان دلێرترین کەسە؟ وتیان: تۆ ئەی

---

[1] – لە البدایە والنهایە ج٣ ص٤٦ یشدا هاتووە.

[2] – هەیسەمی ج٦ ص١٧ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا تەدروسی باپیری ئەبوزوبەیر هەیە کە نایناسم، کەسەکانی دیکە جێ متمانەن، ئیبن عەبدولبیریش لە الاستیعاب ج٢ ص٢٤٧ دا لە ئیبن عویەینەوە لە وەلیدی کوڕی کەسیر لە ئیبن عەبدوس لە ئەسمائەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی و بەجۆرە دەیهێنێت، ئەبونەعیمیش لە (الحلیة ج١ ص٣١) بە کورتی بەو سەنەدە هێناویەتی، لە سەنەدەکەدا (ئیبن تەدروس لە ئەسمائەوە) هەیە.

[3] – بەزاریش هێناویەتی و دەڵێت: وازیان لەو هێناو ڕوویانکردە ئەبوبەکر، کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن، هەروەك هەیسەمی ج٦ ص١٧ دەڵێت، حاکمیش ج٣ ص٦٧ هێناویەتی و دەڵێت: فەرموودەکە بەپێی مەرجی موسلیم صەحیحەو بوخاری و موسلیم نەیانهێناوە.

*ئەمیری باوەڕداران، وتی: دەی من هەرکەس لە ڕووم دەرکەوتایە بڕیاری خۆم لەسەر دەدا* (لێی دوور دەکەوتمەوە) بەڵکو ئەوە ئەبوبەکر بوو، ئێمە کەپرێکمان کردبوو بۆ پێغەمبەر (ﷺ) وتمان: کێ لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) دا دەبێت تا هیچکام لە بێباوەڕان هەڵمەتی بۆ نەبەن؟ سوێند بەخوا کەس لێی نزیك نەبوویەوە جگە لە ئەبوبەکر (رضي الله عنه) کە شمشێرەکەی لەسەر سەری پێغەمبەر (ﷺ) دا ڕاوەستاندو هەرکەس بهاتایە بۆی هەڵمەتی بۆ دەبرد، ئەو دلێرترین کەس بوو، بینیم پێغەمبەر (ﷺ) کەوتبوویە بەرهەڵمەتی قورەیش یەکێك تووڕەو لە دژی بوو، یەکێك بوو باری دەشێواندو دەیانەت: تۆ هەموو خواوەندەکانت کردووە بەیەك، *سوێند بەخوا کەس لێی نزیك نەدەبوویەوە مەگەر ئەوەی ئەبوبەکر لێی دەداو* دەیوت قوڕتان بەسەر کەسێك دەکوژن کە دەڵێت پەروەردگارم خوایە؟ پاشان عەلی عەباکەی سەری بەرزکردەوەو گریا تا ڕیشی تەڕبوو، پاشان وتی: سوێندتان دەدەم بەخوا باوەڕداری ناو بنەماڵەی فیرعەون باشتربووە یان ئەو؟ هەموو بێدەنگ بوون، عەلی (رضي الله عنه) وتی: دەی سوێند بەخوا ساتێکی ئەبوبەکر لە هەموو دونیایەکی پڕ بەباوەڕداری ناو بنەماڵەی فرعەون باشترە، ئەو کەسە باوەڕی خۆی شاردەوەو ئەبوبەکر بەئاشکرا ئیمانی خۆی نیشاندا.[1]

بەزارو تەبەرانی لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) لە مزگەوتدا بوو و ئەبوجەهلی کوڕی هیشامو شەیبەو عوتبەی دوو کوڕی ڕەبیعەو عوقبەی کوڕی ئەبی موعیتو ئومەییەی کوڕی خەلەفو دوو کەسی دی کە حەوت کەس بوون لە حیجردا بوون و پێغەمبەریش (ﷺ) نوێژی دەکرد، کاتێك سوجدەی برد زۆر لە سوجدەدا مایەوە، ئەبوجەهل وتی: کێ دەچێت بۆلای بەنی فڵانو ناو سکی ئاژەڵەکەی بهێنێت تا بیکەین بە سەری موحەمەددا، سەرکەشترینیان عوقبەی کوڕی ئەبوموعەیت چوو و هێنایو کردی بەسەر شانی پێغەمبەردا (رضي الله عنه) لەو کاتەی لە سوجدەدا بوو، ئیبن مەسعود دەڵێت: منیش

---

[1]- پاشان بەزار وتی: تەنها لەم ڕووەوە بیستوومانە، لە البداية والنهايەج٣ ص٢٧١ واهاتووە، هەیسەمی ج٩ ص٤٧ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا کەسی واهەیە کە نایناسم.

وەستابووم و نەمدەتوانی هیچ بڵێم چونکە کەس نەبوو بمپارێزێت بۆیە چووم تا گوێم لە فاتیمەی کچی پێغەمبەر (ﷺ) بوو هات و لەسەر شانی پێغەمبەر (ﷺ) لایبرد و دواتر سەیری قورەیشی کرد و قسەی پێ وتن، ئەوانیش هیچیان نەوت، پێغەمبەریش (ﷺ) سەری بەرزکردەوە و وەك چۆن لە تەواوکردنی سوجدەدا سەربەرزدەکەیتەوە، کاتێك نوێژی تەواوکرد فەرمووی (اللهم عليك بالقريش) سێ جار وتیەوە (عليك بعتبة وابي جهل وشيبة) پاشان لە مزگەوت چوویە دەرێ و ئەبولبوختەری بینی کە قامچیەکی پێ بوو، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بینی دەبینێت رووی خۆش نیە وتی چیتە؟ ئەویش فەرمووی وازم لێ بهێنە، وتی: خوا ئەزانێت وازت لێ ناهێنم تا پێم نەڵێیت چیتە، تووشی شتێك بوویت، کە پێغەمبەر (ﷺ) زانی واز ناهێنێت پێی وت و وتی ئەبوجەهل فەرمانی کرد و پیسی و ناوسکی ئاژەڵ کرا بەسەرمدا، ئەبولبوختەری وتی وەرە بابچین بۆ مزگەوت، پێکەوە چوونە مزگەوت و ئەبولبوختەری سەیری ئەبوجەهلی کرد و وتی: ئەی ئەبولحەکەم تۆ فەرمانت کرد ئەوە بکەن؟ وتی: بەڵێ، ئەویش قامچیەکەی بەرزکردەوە و دای لەسەری، هەموو شڵەژان و ئەبوجەهل هاواری کرد ماڵوێران بن، سەیری کەن دەیەوێت موحەمەد دوژمانیەتی بخاتە نێوانمان و خۆی و هاوەڵانی دەرباز بن،[1] لە دەقی صەحیحدا هاتووە: کاتێك ئەوەیانکرد پێکەنین تا ئەوەی لەتاو زۆری پێکەنیندا بەریەك دەکەوتن، ئەحمەد هێناویەتی عەبدوڵڵا وتی: بینیم ئەوانە لە ڕۆژی بەدردا هەموویان کوژران.[2]

---

[1] – هەیسەمی ج٦ ص١٨ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا ئەجلەحی کوڕی عەبدوڵڵای کندی هەیە کەلای ئیبن موعین و کەسانی دیکەش جێ متمانەیە، بەڵام نەسائی و چەندێکی دی بەلاوازی دەزانن، ئەبونەعیمیش لە (الدلائل ص٩٠) هەمان گێڕانەوەی بەزارو تەبەرانی هێناوە، بوخاری و موسلیم و ترمزی و هی دیکەش بە کورتی چیرۆکی ئەبولبوختەریان هێناوە،

[2] – لە البداية والنهاية ج٣ ص٤٢ دا هاتووە.

بەیهەقی لە عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ڕۆژێکیان لە مزگەوتدا بووم کە ئەبوجەهل –نەفرینی خوای لێ بێت– هات وتی: سوێند بەخوا ئەگەر موحەمەد ببینم بە سوجدەشەوە بێت ئەدەم لە ملی، منیش چووم بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و پێم وت وای وتووە، ئەویش بە توورەیی هات بەرەو کەعبەو لەوێ لە دەرگاوە هاتە ژوورەوەو پاڵی بە دەرگای هەیوانەکەوە نا، وتم ئەمڕۆ شەڕدەبینم، کەوتمە شوێنی، پێغەمبەر (ﷺ) چووە ژوورەوەو ئەم ئایەتەی خوێندەوە (اقرا باسم ربك الڑی خلق....) کە گەیشتە سەرباری ئەبوجەهل (کلا ان الانسان لیطغی ان راه استغنی) یەکێك بە ئەبوجوهلی وت: ئەبولحەکەم ئەوە موحەمەدە، ئەبوجەهل وتی: نابینن چی دەبینم؟ سوێند بەخوا ئاسۆی ئاسمانم لە ڕوودا داخراوە، پێغەمبەریش (ﷺ) کە گەیشتە کۆتایی سورەتەکە سوجدەی برد[1].[2]

ئیبن سەعد لە واقیدیەوە بە سەنەدێکی خۆی کە دەیباتەوە سەر برەی کچی ئەبی تجرات هێناویەتی دەڵێت: ئەبوجەهلو دەستەیەك لەگەڵیدا بەرەو ڕووی پێغەمبەر (ﷺ) بوونەوەو ئازاریاندا، تولەیبی کوڕی چوو بۆ ئەبوجەهلو لێی داو هاواری کردو بردیان، ئەبولەهەب هەستا تا سەری بخات، ئەمە گەیشتەوە لای ئەروا، ئەویش وتی: چاکترین ڕۆژی ڕۆژی سەرخستنی خاڵۆزاکەی بوو، بە ئەبولەهەب وترا: ئەروا وای وتووە، ئەویش چوو بۆلایو سەرکۆنەی کرد، ئەرواش وتی: بڕۆ بۆ جگە لە برازاکەت چونکە ئەگەر سەربکەوێت بۆ تۆ چاکەیەو ئەگەر نا برازاکەت بە دوورو پارێزراو دەبێت، ئەبولەهەب وتی: لەناو عەرەبدا توانای تەواومان هەیە، ئەو ئایینێکی داهێنراوی هێناوە[3].[4]

---

[1] – ضعیف.

[2] – لە البدایة والنهایة ج٣ ص٤٣ دا واهاتووە، تەبەرانیش لە معجم الکبیر و معجم الاوسط دا هێناویەتی، هەیسەمی ج٨ ص٢٢٧ دا دەڵێت: ئیسحاقی کوڕی ئەبی فەروە هەیە کە مەتروکە، حاکم ج٣ ص٣٢٥ بەهەمان شێوە هێناویەتی، دەڵێت: سەنەدەکەی صەحیحە، بوخاریو موسلیم نەیانهێناوە، زەهەبی لەسەری دەچێتو دەڵێت: لە سەنەدەکەدا عەبدوڵڵای کوڕی صالح هەیە، ئیسحاقی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی فەروەش هەیە کە مەتروکە.

[3] – ضعیف.

[4] – لە الاصابة ج٤ ص٢٢٧دا واهاتووە.

تەبەرانی لە قەتادە بە مورسەلی هێناویەتی دەڵێت: ئوم کەلسومی کچی پێغەمبەر (ﷺ) هاوسەری عوتەیبەی کوڕی ئەبولەهەب بوو، ڕوقیەیش ژنی عوتبەی کوڕی ئەبولەهەبی برای بوو، بەوجۆرە بوو تا پێغەمبەر (ﷺ) نێردرا، کە ئەم ئایەتە دابەزی (تبت یدا ابي لهب) ئەبولەهەب بە دوو کوڕەکەی وت: سەرم لەسەرتان حەرام بێت ئەگەر ئەو دوو کچەی موحەمەد تەڵاق نەدەن، دایکیشیان کە کچی حەربی کوڕی ئومەییە بوو (حمالة الحطب ئەو بوو) وتی: کوڕەکانم ئەم دووانە تەڵاق بدەن، ئەوانیش تەڵاقیان دان، کاتێك عوتەیبە ئوم کەلسومی تەڵاقدا هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) و وتی: یان واز لە ئایینت دێنیت یان لە کچەکەت جیادەبمەوەو نایەیت بۆلام نایەم بۆلات، پاشان قسەی لێ هەڵگرت و تووڕەیی نواندو کراسەکەی پێغەمبەر (ﷺ)ی دڕاند، کاتێك بەرەو شام دەچوو بۆ بازرگانی، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (اما اني اسال الله ان یسلط علیك كلبه) ئەویش چوو بۆ بازرگانی قورەیش تا لە شوێنێك کە پێی دەوترێت (زەرقاء) دابەزین و شەو بوو، ئەو شەوە شێر بە دەوریاندا دەهات و دەچوو، عوتەیبە دەیوت: هاوار بۆ دایکم بەخوا ئەمە وەك موحەمەد وتی: ئەمشەو دەمخوات ئیبن ئەبی کەبشە کە لە مەککەیە و من لە شامم بکوژمە، شێرەکە لەناو هەموویاندا هەڵمەتی ئەمی داو قەپی پیاکردوو کوشتی، زوهەیری کوڕی عەلاء وتی: هیشامی کوڕ عورووە لە باوکیەوە بۆی گێڕاینەوە شێرەکە کاتێك ئەو شەوە بە دەوریاندا دەسووڕایەوە چوو، ئەوانیش خەوتن و عوتەیبەش لە نێوانیاندا بوو، گورگ هاتە نێویان تا سەری عوتەیبەی گرت و قەپی پیاککرد، عوسمانی کوڕی عەففان لە دوای ڕوقیە ئوم کەلسومی (رضي الله عنها) هێنا[1،2].

بوخاری ج١ ص٤٨٥ لە عروەوە هێناویەتی عائیشە (رضي الله عنها) ی ژنی پێغەمبەر (ﷺ) پێی وتم کە بە پێغەمبەر (ﷺ)ی وتووە هیچ ڕۆژێکت بەسەردا هاتووە

---

[1] – ضعيف.

[2] – هەیسەمی ج٦ ص١٨ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا زوهەیری کوڕی عەلاء هەیە کە لاوازە.

لە ڕۆژی ئوحود سەختتر بووبێت؟ فەرمووی (بەدەست هۆزەکەتەوە سەختی زۆرم چەشت، سەختترین شت لە ڕۆژی عەقەبەدا بوو، پێشنیارم بۆ ئیبن عەبدیالیلی کوڕی عەبدکلال کردو نەهات بەدەم خواستەکەمەوە، بە غەمباریو ڕوخساری خەفەتباریەوە چوومو چووم تا (قرن الثعالب) سەرم بەرزکردەوە، دەبینم هەورێك سێبەری بۆ کردوم، سەیرم کرد تیایدا جبریل (علیه السلام) بوو بانگی کردمو وتی: خوا قسەی هۆزەکەتی لە ڕوتدا بیست چۆن وەڵامیان دایتەوە، خوا فریشتەی شاخەکانی ناردووە بۆلات تا چیت پێ خۆشە فەرمانی پێ بکەیت پێیان بکات، فریشتەی شاخەکان بانگی کردمو سەلامی لێکردم، پاشام وتی: ئەی موحەمەد، ئەوەی وت چیت دەوێت، ئەگەر دەتەوێت با دووشاخی (ئەخشەبەین) بدەم بەسەریاندا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بەڵکو هیوام وایە خوای گەورە لە پشتو نەوەی ئەمانەوە کەسانێك بێنێت کە خوای گەورەی تاكو تەنها بپەرستن و هیچ هاوەڵێکی بۆ دانەنێن) موسلیمو نەسائیش هێناویانە.

موسای کوڕی عوقبە لە المغازی لە ئیبن شابەوە باسی دەکات کاتێك ئەبوتالیب مرد پێغەمبەر (ﷺ) چوو بۆ تائیف بەڵکو پەنای بدەن، چوو بۆلای سێ کەسی سەقیف کە گەورەیان بوون، عەبدویالیلو حەبیبو مەسعود کە کوڕانی عەمر بوون، پێشنیاری بۆ کردنو سکاڵای لاکردن کە هۆزەکەی چی پێ دەکەن، ئەوانیش زۆر بە ناشیرینی بەرپەرچیان دایەوە.[1]

ئەبونەعیم لە دلائل النبوة ص١٠٣ لە عروەی کوڕی زوبەریرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئەبوتالیب مرد و سەختی سەر پێغەمبەر (ﷺ) زیادی کرد، بۆیە چوو بۆلای سەقیف بەو هیوایەی پەنای بدەن و سەری بخەن، سێ کەسی لە گەورەکانیان بینی کە برا بوون: عەبد یالیلو خوبەیب و مەسعوودی کوڕی عەمر، پێشنیاری بۆکردن و

[1] - هەروەها ئیبن ئیسحاق بەبێ سەنەدو بە دوورو درێژی باسی کردووە هەروەها ئیبن حەجەر لە فتح الباری ج٦ ص١٩٨دا هێناویەتی.

سکاڵای خۆی لەسەر هۆزەکەی لا کردن، یەکێکیان وتی: ئەگەر خوا تۆی بە شتێك ناردبێت ئەوا بەرگی کەعبە دەدزم؟ ئەوی تریان وتی: لە دوای ئەمە دانیشتنەت هیچ کات قسەت لەگەڵ ناکەم ئەگەر تۆ بیت ئەوا تۆ لەوە گەورە تر و خاوەن حەق تریت تا من بتدوێنم، سێیەمیان وتی: خوا نەیتوانی کەسی جگە لە تۆ بنێرێت؟ ئەمەیان لەناو سەقیفدا بڵاو کردەوە و کەوتنە گاڵتە کردن بە پێغەمبەر (ﷺ) و بە دوو ڕیز لە سەرە ڕێیدا بۆی دانیشتن و بەردیان لە دەستدا بوو، هەرکە پێغەمبەر (ﷺ) پێی بەرز دەکردەوە و دایدەنا بەردبارانیان دەکرد و گاڵتەشیان پێدەکرد، کاتێك دوو ڕیزەکانی تێپەڕاند و پێکانی خوێنیان لیٚ دەچۆڕا چوو بۆ باخێکی مێو یان، هاتە ژێر سایەی مێوێك و دانیشتن و خەمبار و دڵشکاو و خوێن لە پێکانی دەچۆڕا، ئەو مێوە هی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە و شەیبەی کوڕی ڕەبیعە بوو، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) ئەوانی بینی حەزی نەکرد بچێت بۆ لایان چونکە دەیزانی دوژمنایەتی خوا و پێغەمبەر (ﷺ) و پەیامەکەی دەکەن، ئەوانیش کۆیلەی خۆیان نارد بۆ لای و بڕێك ترێیان بۆ نارد، ئەو کۆیلە مەسیحی بوو، خەڵکی نەینەوا بوو، کە ترێکەی لە بەردەستیدا دانا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (بسم الله) عداس سەرسام بوو، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: (ئەی عداس خەڵکی کوێیت؟) وتی: من خەڵکی نەینەوام، فەرمووی (لە خەڵکی شاری پیاو چاك یونسی کوڕی مەتا؟) عەداس پێی وت: تۆ چۆن ئەمە دەزانیت؟ پێغەمبەر (ﷺ)یش چی لەسەر یونس دەزانی پێی فەرموو، پێغەمبەر (ﷺ) کەسی بە کەم نەدەزانی کە پەیامی خوای پیٚ گەیشتبێت، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لەسەر یونسی کوڕی مەتا شتم پیٚ بڵیٚ، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) چی بۆ نێردرابوو لەسەر یونس بۆی وت سوجدەی برد بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و پێکانی ماچ کرد کە خوێنیان لیٚ دەچۆڕا، کاتێك عوتبە و شەیبەی برای بینیان ئەو کۆیلەیان چی کرد بێدەنگ بوون، کاتێك هاتەوە بۆ لایان وتیان بۆچی وات کرد کەچی بۆ هیچ کام لە ئێمە واناکەیت؟ وتی: ئەمە پیاو چاکێك بوو هەندیٚ شتی پیٚ وتم کە لەسەر پێغەمبەرێك زانیم خوای گەورە ناردبووی بۆمان پێی دەوترا یونسی کوڕی مەتا،

ئینجا ئەو پێو وتم ئەوە پێغەمبەری خوا بووە، ئەوانیش پێکەنین و وتیان: لە مەسیحیەتیەکەت هەڵتنەگێڕێتەوە، ئەم کابرا هەڵخەڵەێنەرە، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) گەڕایەوە بۆ مەککە، تەواو.[1]

لە البدایة و النهایة ج٣ص١٣٦دا لە موسای کوڕی عوقبەوە هاتووە کە خەڵکی تائیف بە دوو ڕیز لەسەر ڕێگەکەیدا وەستان، کاتێک تێپەڕی هەرکە پێی بەرز دەکردەوە و دایدەنا بەرد بارانیان دەکرد تا خوێنیان لێ هێنا، کە لێیان دوور کەوتەوە پێکانی خوێنیان لێ دەچۆڕا، ئیبن ئیسحاق دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) لایان هەستا و لە خێری سەقیف بێ هیوا بوو، پێی وتن: ئەگەر ئەوەتان کرد دەی باسی مەکەن، چونکە حەزی نەدەکرد ئەوە بگاتەوە دەم هۆزەکەی نەوەك زیاتر پێی بوێرن، بەڵام وایان نەکرد و گەمژە و مناڵ و کۆیلەکانیان کەوتنە قسە پێ ووتن و هاوار کردن بە سەریدا تا خەڵك لێی کۆبوونەوەو بەرەو لای باخی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە و شەیبەی کوڕی ڕەبیعەیان نارد، ئەو دوانە خۆیان لە باخەکە بوون، نەفامەکانی سەقیف کە کەوتبوونە شوێنی گەڕانەوە، ئەویش چوویە ژێر سایەی دار مێوێك و لەوێ دانیشت و دوو کوڕانی ڕەبیعەش سەیریان دەکرد کە چیان پێ کردووە، ئەو ئافرەتەی لە بەنی جومەح بوو گەیشتە پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو: سەیرکە خزمانت چیان لێ کردم؟ کە دڵنیا بوو ئەو کات فەرمووی(اللهم اني اشكو اليك ضعف قوتي و هواني على الناس يا ارحم الراحمين انت رب المستضعفين، و انت ربي الى من تكيلني الى بعيد يتهجمني او الى عدو ملكته امري، ان لم يكن بك غضب علي فلا ابالي، و لكن عافيتك اوسع لي، اعذو بنور وجهك الذى اشرقت له الظلمات، وصلح عليه امر الدنيا و الاخرة من ان ينزل به غضبك او يحل سخطك، لك العتبى حتى ترضى، لا حول و لا قوة الا بك) (پێشتر وەرمان گێڕاوە) دەڵێت: کاتێك کوڕانی ڕەبیعە بینیان هەستیان جووڵا و کۆیلەیەکی خۆیان بانگ کرد کە مەسیحی

---

[1] – ضعیف.

بوو پێی دەوترا عداس، پێیان وت برێ لەو ترێیە ببە و بیخە ئەو قاپە و بۆی ببە، پێی بڵێ لێی بخوات، عداسیش بۆی برد و خستیە بەردەستی و پێی وت بخۆ، پێغەمبەر (ﷺ) یش کە دەستی خستە ناوی فەرمووی (بسم الله) پاشان خواردی، پاشان عداس سەیری ڕووخساری کرد و وتی: بەخوا ئەم قسە هی خەڵکی ئەم شوێنە نی یە، پێغەمبەر (ﷺ)یش پێی فەرموو(تۆ خەڵکی کام وڵاتیت ئەی عداس؟ ئاینت چی یە)؟) وتی: مەسیحیم و خەڵکی نەینەوام، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی(لە گوندی پیاو چاك یونسی کوڕی مەتا؟) عەداس پێی وت: تۆ یونس چۆن دەناسیت؟ پێغەمبەر (ﷺ)یش فەرمووی (ئەو برای منە، ئەو پێغەمبەر بوو و منیش پێغەمبەرم) عداسیش خۆی دا بەسەر پێغەمبەر (ﷺ) داو سەر ودەست و پێی ماچ کرد، دەڵێت: یەکێك لە کوڕانی ڕەبیعە بەوی دیکەی دەوت: کۆیلەکەت لێ شێوا، کاتێك عداس هاتەوە پێیان وت، قوڕت بەسەر عداس بۆچی وات کرد؟ وتی: گەورەم لەسەر زەویدا لەمە باشتر نی یە، شتێکی پێ وتم تەنها پێغەمبەر دەیزانێت، وتیان: ها عداسی داماو وریابە لە ئاینەکەت هەڵتنەگێڕێتەوە ﷺ چونکە ئاینەکەی تۆ لە هی ئەو باشترە،[1] سولەیمانی تەیمی لە (السیرە) دەڵێت: بە پێغەمبەر (ﷺ) ی وت: شایەتی دەدەم تۆ بەندە و پێغەمبەری خوایت[2].[3]

ئیبن مەردەویە لە عائیشەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: ئەبوبەکر وتی: ئەگەر دەتدیم لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) چووینە ئەشکەوتەوە، پێکانی پێغەمبەر (ﷺ) خوێنیان لێ دەچۆڕا و پێکانی منیش ڕەق و تەق کەوتبوون، عائیشە (رضي الله عنها) وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەبێ خووف و نەعل ڕێی دەبڕی.[4]

---

[1] – لە البدایەو النهایە ج٣ ص١٣٥دا هاتووە.

[2] – ضعیف.

[3] – لە الاصابە ج٢ ص٤٦٦دا واهاتووە، لە ناو هاوەڵانیشدا ناوی هێناوە.

[4] – لە الکنز العمال ج٨ ص٣٢٩ دا بەوجۆرە هاتووە.

بوخاری و موسلیم و ترمزی له ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویانە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ڕۆژی ئوحوددا دانی شکا و ئازاری سەری هەبوو، خوێنی لە ڕوخساری دەسڕی و دەیفەرموو (كيف يفلح قوم شجوا نبيهم وكسروا باعيته و هو يدعوهم الى الله) ئینجا ئەم ئایەتە دابەزی (ليس لك من الامر شيئ) تەبەرانی لە المعجم الكبير لە ئەبوسەعیدەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: دەموچاوی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ڕۆژی ئوحوددا بریندار بوو، مالیکی کوڕی سنان هات بەرەو ڕووی و برینەکەی بە زمان لێسیەوە و قووتی دا، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (کێ حەزدەکات سەیری کەسێك بکات کە خوێنم تێکەڵی خوێنی بووە با سەیری مالیکی کوڕی سەنان بکات)[1].[2]

تەیالیسی لە عائیشەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: ئەبوبەکر (رضي الله عنه) کە باسی ڕۆژی ئوحودی دەکرد دەیوت: ئەو ڕۆژە هەمووی هی تەلحە بوو، پاشان دەیوت: من یەکەم کەس بووم لە ڕۆژی ئوحود گەڕامەوە کەسێکم بینی لە پێناو خوادا دەجەنگا و بینیم وتی: (حمیه) وتم: تەلحەیت کاتێك ئەوەم لە دەست چوو کە لە دەستم چوو، وتم: کەسێکە لە هۆزەکەم لام خۆشەویستترە، نێوانی من و بێباوەڕان کەسێکە نایناسم و من لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لێی نزیکتر بووم، دەمدی هەنگاوی وای دەنا من نەمدەنا، ئەویش ئەبوعوبەیدەی جەراح (رضي الله عنه) بوو، گەیشتینە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و دانی شکاو دەموچاوی بریندار بوو، دوو ئەڵقە چەقیبوونە ناو سەرگۆنای.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی بچن بەدەم هاوڕێکەتانەوە، مەبەستی تەلحە بوو، خوێنی لێ دەچوو بۆیە گوێمان بە قسەکەی نەدا، چووم تا ئەوە لە ڕوخساری لاببەم، ئەبوعوبەیدە وتی: سوێندت دەدەم وازی لێبهێنە بۆ من، منیش وازم لێ هێنا، حەزی نەدەکرد بە دەست لایببات نەوەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئازار بچەژێت، بۆیە بەدەم گرتی و

[1] – ضعيف.

[2] – له مجمع الزوائد ج٢ ص٤٧ دا واهاتووه.

یەکێك لە دوو ئەڵقەکەی دەرهێنا، لەگەڵ ئەڵقەکەدا دانێکی پێشەوەی کەوت، منیش چووم تا وابکەم، وتی: سوێندت دەدەم وازی لێ بهێنە بۆ من، هەمان شتی جاری یەکەمی کردو لەگەڵ ئەڵقەکەدا ددانێکی دیکەشی کەوت، ئەبوعوبەیدە لە هەموان چاکتر ئەوەی دەزانی، پاش چاکبوونی باری پێغەمبەر (ﷺ) چووین بۆلای تەلحە لە چاڵاییەکدا بوو، حەفتاو ئەوەندە برینی هەبوو، پەنجەشی بڕابوو، فریای ئەویش کەوتین[1][2].

# (خۆڕاگری هاوەڵان (رضي الله عنه) لەسەر سەختیو ئازارەکانی ڕێی بانگەوازی خوا)

## خۆڕاگری ئەبوبەکری صدیق (رضي الله عنه) لەسەر سەختیەکان)

زانای فەرموودەناس ئەبولحەسەنی تەرابلوسی لە عائیشەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) کۆبوونەوە – سی و هەشت پیاو بوون– ئەبوبەکر زۆر داوای لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد تا خۆیان دەربخەن، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ئەبوبەکر ئێمە کەمین) ئەبوبەکریش وازی نەهێنا تا پێغەمبەر (ﷺ) دەرکەوت و موسڵمانان بە بەشەکانی مزگەوتدا بڵاوەیان کردو هەریەکەو دایەپاڵ خێڵی خۆی، ئەبوبەکر لەناو خەڵکەکەدا هەستا و وتاری داو پێغەمبەریش (ﷺ) دانیشتبوو، بەوە یەکەم کەس بوو وتاری داو بانگەوازی بۆ خواو پێغەمبەر (ﷺ) کرد، بێباوەڕان دایان بەسەر ئەبوبەکرو موسڵماناندا و بە توندی لێیاندان، بە سەختی لە ئەبوبەکر دراو عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی فاسق لێی نزیك بوویەوەو بە دوو نەعلی

---

[1] – ضعیف.

[2] – لە البدایة والنهایة ج٤ ص٢٩ دا واهاتووە. ئیبن سەعدیش ج٣ ص٢٩٨ و ئیبن سنی و شاشی و بەزار و تەبەرانی لە المعجم الاوسط و ئیبن حەببان و دارقوتنی لە (الافراد) و ئەبونەعیم لە (المعرفة) و ئیبن عەساکیر و هەروەها لە (الکنز العمال ج٥ ص٢٧٤ دا هەموو ئەمانە هێناویانە.

دەستی لێیداو دەیدا لە ڕووخساری، چوویە سەر سکی ئەبوبەکر تا ئەوەی دەموچاوی و لووتی جیا نەدەکرایەوە.

بەنوتیم هاتن و بێباوەڕان لە ئەبوبەکر دوور کەوتنەوە، بەنوتیم ئەبوبەکریان خستەناو بەتانیەك و بردیانەوەماڵەوە گومانیان لەوە نەبوو دەمرێت، پاشان بەنوتیم گەڕانەوە و چوونە مزگەوت و وتیان: سوێند بەخوا ئەگەر ئەبوبەکر بمرێت عوتبەی کوڕی ڕەبیعە دەکوژین، گەڕانەوە بۆلای ئەبوبەکر و ئەبوقوحافەو بەنی تیم ئەبوبەکریان دەدواند تا وەڵامی دایەوە، پاشان هەستاو بە ئوم خەیری دایکیان وت: بزانە شتێکی بدەرێ بابیخوات یان ئاوبخواتەوە، کاتێك بۆی برد زۆر داوای لێکرد ئەویش دەیوت: پێغەمبەر (ﷺ) چی لێهات؟ دایکی وتی: هەواڵی هاوڕێکەتم نیە، وتی: دەی بڕۆ بۆلای ئوم جەمیلی کچی خەتتاب و پرسیاری لێ بکە لەسەر پێغەمبەر (ﷺ). ئەویش چوو بۆلای ئەم جەمیل و وتی: ئەبوبەکر لەسەر موحەمەدی کوڕی عەبدوڵلا پرسیارت لێ دەکات؟ وتی: ئەبوبەکرو موحەمەدی کوڕی عەبدوڵلاش ناناسم، بەڵام ئەگەر حەزدەکەیت لەگەڵت دێم بۆلای کوڕەکەت، وتی: بەڵێ، چوون تا هاتنەلای ئەبوبەکر بە پەککەوتەیی و نەخۆشی بینییان، ئوم جەمیل لێی نزیك بوویەوە و قیژەیەکی کرد و وتی: سوێند بەخوا (کەسانی فاس و بێباوەڕ وایان پێ کردوویت، لە خوا دەپاڕێمەوە تۆڵەت بکاتەوە لێیان، وتی: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) چی لێهات؟ وتی: ئەوە دایکتە دەیبیستێت، وتی: گرفتێك نیە، وتی: ساغ و سەلامەتەن وتی: لە کوێیە؟ وتی: لەماڵ ئیبنولئەڕقەم، وتی: دەی بەخوا نان ناخۆم و هیچ ناخۆمەوە تا نەچمەلای پێغەمبەر (ﷺ).

ئەوانیش وەستان تا کەمێك بە هۆش خۆدا هاتەوە و خەڵکی چوونەوە ماڵ، شانیان دایە ژێر باڵی تا بردیانە لا پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەریش(ﷺ) باوەشی پیاکردو ماچی کردو موسڵمانانیش وایان کرد، پێغەمبەر (ﷺ) تەواو دڵی بۆی سووتا، ئەبوبەکر وتی: بە دایك و باوکمەوە بە قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا من هیچم نیە تەنها ئەو فاسقە دای لە دەموچاوم، ئەمە دایکمە کە بۆ کوڕەکەی چاکەی

زۆرەو تۆیش پیرۆزیت، دەی نزای بۆ بکەو بانگی بکە بۆلای خوا، بەڵکو خوا بەهۆی تۆوە لە دۆزەخ ڕزگاری بکات، پێغەمبەر یش(ﷺ) نزای بۆ کردو بانگی کرد بۆ ئیسلام و ئەویش موسڵمان بوو، هەموو لە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) لەماڵەکەدا مانگێك مانەوە، ژمارەیان سی و نۆ کەس بوو.

حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب (رضي الله عنه) ئەو ڕۆژە موسڵمان بوو کە لە ئەبوبەکر درا، پێغەمبەر (ﷺ) نزای کرد تا خوا ڕێنموونی عومەری کوڕی خەتتاب یان ئەبوجەهلی کوڕی هیشام بکات، ئەوەبوو عومەر بەرنزاکە کەوت،نزاکە لە ڕۆژی چوار شەممەدا بوو عومەریش لە ڕۆژی پێنج شەممەدا موسڵمان بوو، پێغەمبەر (ﷺ) و خەڵکی ناو ماڵەکە الله اکبرێکیان کرد کە لەو پەڕی مەککەوە بیسترا، ئەبولئەرقەم – کە کوێرێکی بێباوەڕ بوو– هات و وتی: خوایە لە بەنی عەبیدولئەرقەم خۆش بە چونکە بێبباوەڕ بوون، عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا تا کەی ئێمە ئایینمان بشارینەوە لە کاتێکدا لەسەر هەقین و ئایینی ئەوان پووچەو ئاشکراو دیاربێت؟ فەرمووی (عومەر ئێمە کەمین بینیت تووشی چی بووین) عومەر وتی: سوێند بەوکەسەی تۆی بە حەق ناردووە هەر کۆڕێك هەبێت تیایدا دانیشتبم بێباوەڕ بووبن ئیمانی تێدا دەردەخەم، پاشان چوو تەواف کەعبەی کردو چوو بەلای قورەیشدا، ئەوانیش چاوەڕوانی بوون، ئەبوجەهلی کوڕی هیشام وتی: فڵان کەس دەڵێن تۆش لە خشتەبراویت؟ عومەریش لەبەرچاویدا شایەتومانی هێنا، بێباوەڕان هاتن بۆی، ئەویش دای بەسەر عوتبەداو خستی و لێیدەداو دەستی دەکر بە نێوچاوانیدا و عوتبەش هاواری دەکردو خەڵکی دوورکەوتنەوەو عومەریش هەستا و کام لێی نزیك بوونایەتەوە گەورەکەیانی دەگرت تا هەموو وازیان هێنا، دەچوویە هەموو کۆڕەکان و ئیمانی نیشاندەدا، پاشان بەو بارەوە چوو بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) وتی: بە دایك و باوکمەوە بە قوربانتبم بەخوا هیچ کۆڕێکی سەردەمی بێباوەڕیم نەما مەگەر ئەوەی بەبێ ترس و بیم ئیمانم تێدا نیشاندا، پێغەمبەر (ﷺ)چوو و عومەریش لە بەردەمیەوەو حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیبیشی لەگەڵدا بوو، چوو تا تەواف کەعبەی کردو نوێژی نیوەڕۆی بەبێ

خەمی کرد لەگەڵ عومەردا گەڕایەوە بۆماڵی ئەرقەم و دواتر عومەر بەتەنها چوو، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) چوو.[1]

صەحیحەکەی ئەوەیە: عومەر لە دوای دەرچوونی کۆچەران بۆ خاکی حەبەشە موسڵمان بوو، ئەمەش لە ساڵی شەشەمی پێغەمبەرایەتیدا بوو.[2]

بوخاری ص (٥٥٢) لە عائیشەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: هێشتا عەقڵم نەگرتبوو کە دایك و باوکم ئایینداربوون و هەموو ڕۆژێك پێغەمبەر (ﷺ) بەیانی و ئێوارە دەهات بۆلامان، کاتێك موسڵمانان توشی سەختی بوون ئەبوبەکر (ﷺ) ویستی بەرەو حەبەشە کۆچ بکات گەیشتە (برك الغماد) لەوێ (ئیبن دغنە) ی گەورەی هۆزی (القارة) ی پێگەیشت، وتی: بۆ کوێ دەچیت ئەبوبەکر؟ وتی: هۆزەکەم دەریانکردوم و دەمەوێت بەو زەویەدا بگەڕێم و پەروەردگارم بپەرستم، ئەویش وتی: کەسی وەك تۆ ئەی ئەبوبەکر نابێت دەربکرێت و نابێت بچێت، تۆ دەستگرۆی نەبوو و خاوەن پەیوەندی خزمایەتی و وریای هەتیو و میواندارو سەرخەری حەق بوویت، من تۆ دەپارێزم بگەڕێرەوە و لە وڵاتی خۆتدا پەروەردگارت بپەرستە، ئەویش لەگەڵ ئیبن دوغنەدا گەڕایەوە، لەناو پیاوماقوڵانی قورەیشدا گەڕاندی و پێی وتن: ئەبوبەکر نابێت بچێت و دەربکرێت، دەتانەوێت کەسێکی وا دەربکەن (سیفەتەکانی پێشووی وت) قورەیشیش نەیانوت وانیە و وتیان ئەبوبەکر ببە با لە ماڵی خۆیدا پەروەردگاری بپەرستێت و لەوێ نوێژبکات و چەندە حەزدەکات بخوێنێت و ئازارمان نەدات و بە ئاشکرا نەیکات، ئێمە دەترسین ژن و منداڵەکانمان لە خشتە ببات، ئیبن دوغنەش ئەوەی وت بە ئەبوبەکر ئەویش لە ماڵەوە ئەوەی دەکرد و قورئانی دەخوێند و ئافرەتان و کوڕانی بێباوەڕ دەهاتن بۆلای و پێی سەرسام دەبوون و سەیریان دەکرد،

---

[1] – ضعیف.

[2] – لە البدایة و النهایەج٣ ص٣٠ دا هاتووە، ئیبن حەجەر لە الاصابە ج٤ ص٤٤٧ لە ئیبن ئەبی عاصمەوە هێناویەتی.

ئەبوبەکر کەسێکی وابوو زۆر دەگریا، لە کاتی خوێندنی قورئاندا بەسەر چاوەکانیدا زاڵ نەدەبوو، ئەمە خانەدانانی بێباوەڕی قورەیشی ترساندو ناردیان بۆلای ئیبن دوغنەو ئەویش چوو بۆلایان، وتیان: ئێمە لە پەنای تۆدا ڕێماندا بە ئەبوبەکر تا لە ماڵی خۆیدا پەروەردگاری بپەرستێت، بەڵام ئەوە لەوە لایدا مزگەوتێکی دروست کردووەو تیایدا نوێژدەکات و قورئان دەخوێنێت، ئێمەش دەترسین ژن و منداڵمان لە خشتە بەرێت، دەی ڕێی لێ بگرن، ئەگەر حەزدەکات لە ماڵەوەی خۆی بیکات باشە، ئەگەر نا داوای لێ بکە پەناکەت پێ بداتەوە چونکە دەترسین وابکات بەڵێن بشکێنێت و ڕازی نین ئەبوبەکر بە ئاشکرا وابکات، عائیشە (رضي الله عنها) دەڵێت: ئیبن دەغنە هات بۆلای ئەبوبەکرو وتی: تۆ دەزانیت من لەسەر چی پەنام دایت، یان با بەس ئەوە بێت یان زیممەم بۆ بگێڕەوە، من حەزناکەم عەرەب وا ببیستن لە بەڵێن لامداوە، ئەبوبەکریش وتی: پەناکەت بۆ دەگێڕمەوەو بە پەنای خوای گەورە ڕازیم، ئینجا فەرموودەکە بە دوورو درێژی لەسەر کۆچ کردن دێنێت.

ئیبن ئیسحاقیش بەهەمان شێوە هێناویەتی لە دەقەکەیدا هاتووە: ئەبوبەکر چوو تا کۆچ بکات تا ئەوەی ماوەی ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ ڕێ لە مەککەوە چوو، ئیبن دەغنەی پێگەیشت کە گەورەی ئەحابیش بوو، وتی: ئەی ئەبوبەکر بۆ کوێ دەچی؟ وتی: هۆزەکەم دەریان کردم و فشاریان لەسەر دانام، وتی: بۆ چی؟ سوێند بە خوا تۆ جوانی خێڵیت، پاڵپشتی لاوازو چاکەکارو دەستگرۆی نەداریت، بگەڕێرەوە تۆ لە پەنای مندایت، ئەویش لەگەڵی گەڕایەوە چوونە مەککە، ئیبن دەغنە وتی: ئەی کۆمەڵی قورەیش من پەنای ئیبن ئەبی قوحافەم داوە کەستان لە گوڵی کەمتری پێ نەڵێن، ئەوانیش دەستیان لە ئەبوبەکر گرتەوە، لە کۆتاییەکەیدا هاتووە وتی ئەبوبەکر من پەنات نادەم بۆ ئەوەی ئازار بدەیت، ئەوان لەو شوێنەی هەتە (مزگەوتەکەی لای ماڵی) بێزارن و بەوە ئازاریان پێ دەگات، دەی بڕۆرە ماڵەوەو چیت پێخۆشە بیکە، ئەبوبەکر وتی: پێت چۆنە پەناکەت بۆ بگێڕمەوەو بە پەنای خوا ڕازیبم، ئەویش وتی: دەی پەناکەم بۆ بگێڕەرەوە، وتی: وا بۆم گێڕایتەوە، ئیبن

دەغنەش هەستاو وتی: کۆمەڵی قورەیش ئیبن ئەبی قوحافە پەناکەی بۆ گێڕامەوە ئیتر چی پێ دەکەن خۆتان دەزانن.[1][2]

ئیبن ئیسحاق لە قاسمەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبوبەکری صدیق (رضي الله عنه) کاتێک لە پەنای ئیبن دغنە دەرچوو گەمژەیەکی قورەیشی پێی گەیشت کاتێك بەرەو کەعبە دەچوو، خۆڵی کرد بەسەریدا، وەلیدی کوڕی موغەیرە – یان عاصی کوڕی وائیل- دای بەپاڵ ئەبوبەکرداو ئەبوبەکر پێی وت: نابینیت ئەو گەمژەیە چی دەکات؟ وتی: تۆ خۆت وات کرد بە خۆت، ئەویش دەیوت: ئای خوایە چەند لەسەرخۆیت، ئای خوایە چەند لەسەرخۆیت، ئای خوایە چەند لەسەرخۆیت، البداية والنهايه ج٣ ص٩٥ پێشتر لە فەرموودەکەی ئەسمائدا (رضي الله عنها) ص ٢٦٠ لای ئەبویەعلاو هی دیکەش هاتووە وتی: یەکێك هاواری کرد ئەی ئەبوبەکر فریای هاوڕێکەت کەوە لامان، ئەویش دەیوت: قوڕتان بەسەر، ئایا کەسێك دەکوژن کە دەڵێت خوا پەروەردگارمەو لەلایەن پەروەردگارتانەوە بەڵگەی ڕوونی بۆ هێناون) ئەوانیش وازیان هێنا لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و کەوتنە ئەبوبەکر.[3]

---

[1] – صحيح.

[2] – لە البدايە والنهايە ج٣ ص٩٤ دا واهاتووە.

[3] – ضعيف.

## (خۆڕاگری عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) لەسەر سەختیەکان)

ئیبن ئیسحاق لە ئیبن عومەرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك عومەر (رضي الله عنه) موسڵمان بوو وتی: ئەی قورەیش کێ زۆر قسە دەهێنێت و دەبات؟ پێیان وت: جەمیلی کوڕی موعەممەر، ئەویش چوو بۆلای، عەبدوڵلا دەڵێت: کەوتمە شوێنی تا بزانم چی دەکات – ئەوکات هەرزەکار بووم و هەرچیم دەدی عەقڵم پێی دەشکا– تا چوو بۆلای، پێی وت: جەمیل دەزانیت من موسڵمان بووم و چوومەتە سەر ئایینی موحەمەد (صلى الله عليه وسلم)؟ وتی: سوێند بەخوا هەرکەپێی وت عەباکەی هەڵگرت و عومەریش کەوتە شوێنی و منیش کەوتمە شوێنی تا لەبەر دەرگای کەعبەدا بە دەنگی بەرز هاواری کرد: ئەی کۆمەڵی قورەیش – لە کۆڕی خۆیاندا بوون لە دەوری کەعبەدا– بزانن ئیبن خەتتاب هەڵخەڵەتا، عومەریش لە پشتیەوە دەیوت: درۆدەکات، بەڵکو من موسڵمان بووم و شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خوا و موحەمەدیش پێغەمبەری خوایە، ئەوانیش هەستان بۆی و لێیاندا تا خۆر هاتە سەر سەریان (نیوەی ڕۆژ) دانیشت و ئەوانیش لەسەر سەری ڕاوەستان، ئەویش وتی: چی دەتوانن بیکەن، سوێند بەخوا ئەگەر سێ سەد کەس بووینایە یان ئێرەمان بۆ بەجێ دەهێشتن یان ئێرەتان بۆ بەجێ دەهێشتین، لەم بارەدا بووین کە پیرێکی قورەیش کڵاوێك و کراسێکی خەتخەتاوی لەبەر بوو لەلایان ڕاوەستا و وتی: چیتانە؟ وتیان عومەر هەڵخەڵەتاوە، وتی: بەسە کابرا بۆخۆی شتێکی هەڵبژاردووە و ئیتر چیتان دەوێت؟ وادەزانن بەنی عەدی بەوجۆرە ئەو کەسەی خۆیان دەدەنە دەستتان؟وازی لێ بهێنن، سوێند بە خوا وەك ئەوەی کراسێك بێت و لەسەری لابرابێت، منیش – پاش کۆچکردن بۆ مەدینە– بە باوکم وت: بابە گیان ئەوکابرا کێ بوو؟ وتی: کوڕی شیرینم ئەوە عاصی کوڕی وائیلی سەهمی بوو.[1][2]

---

[1] – صحیح.

[2] – سەنەدەکەشی تەواو بەهێزە، هەروەها لە البدایە والنهایە ج٣ ص٨٢ دا هاتووە.

بوخاری ج١ ص٥٤٥ لە ئیبن عومەرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە ماڵەوە بوو و ترسی دایگرتبوو کە عاصی کوڕی وائیلی سەهمی ئەبوعەمر بە کڵاوێك و کراسێکی ئاوریشماویەوە کە لە بەنی سەهمی هاوپەیمانانی سەردەمی نەزانیمان بوو هات: پێی وت: چیتە؟ وتی: هۆزەکەت دەڵێن: ئەگەر موسڵمان بم دەمکوژن، وتی: هیچ نیە دوای ئەم قسەت لە خۆت دڵنیابە، عاص چوویە دەرو خەڵکی بینی کە بەلێشاو کۆببونەوە وتی: چیتان دەوێت؟ وتیان: ئەوە ئیبن خەتتابە هەڵخەڵەتاوە، وتی: دەستی بۆ نەبەن، ئەوانیش کشانەوە دوا.[1]

## (خۆگری عوسمانی کوڕی عەففان (رضي الله عنه) لەسەر سەختیەکان)

ئیبن سەعد ج٣ ص٣٧ لە موحەمەدی کوڕی ئیبراهیمی تەیمیەوە هێناویەتی کاتێك عوسمانی کوڕی عەففان (رضي الله عنه) موسڵمان بوو حەکەمی کوڕی ئەبولعاصی کوڕی ئومەییە گرتی و بەستیەوە و وتی: ئەرێ واز لە ئایینی باو باپیرانت دێنێت بۆ ئایینێکی داهێنراو؟ سوێند بە خوا بەرت نادەم تا واز لەو ئایینە نەهێنیت، عوسمان وتی: سوێند بە خوا هەرگیز وازی لێناهێنم و دەستبەرداری نابم، کە حەکەم بینی سوورە لەسەر ئایینەکەی وازی لێهێنا.

## (خۆگری تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا (رضي الله عنه) لەسەر سەختیەکان)

بوخاری لە (التاریخ) لە مەسعودی کوڕی خوراشەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئێمە لە نێوان صەفاو مەروەدا تەوافمان دەکرد خەڵکێکی زۆر کەوتبوونە شوێنی گەنجێك کە دەستی لە ملیدا بوو، وتم ئەوە چیەتی؟ وتیان: ئەوە تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلایە هەڵخەڵەتاوە، ئافرەتێك لە دوایەوە بوو و لێی توورە دەبوو و قسەی پێ دەوت، وتم: ئەو ژنە کێیە؟ وتیان: صەمەی کچی حەزرەمی دایکی.[2]

---

[1] - صحیح.

[2] - لە الاصابە ج٣ ص٤١ دا واهاتووە.

حاکم لە المستدرك ج٣ ص٣٦٩ لە ئیبراهیمی کوڕی موحەمەدی کوڕی تەلحەوە هێناویەتی دەڵێت: تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا (رضي الله عنه) پێی وتم: چوومە بازاڕی بوصرا لەوێ قەشەیەك لە پەرستگاکەیدا بوو دەیوت: پرسیار لە خەڵکی ئەم کاروانە بکەن بزانن کەسی خەڵکی حەرامیان لەگەڵدایە؟ تەلحە (رضي الله عنه) دەڵێت: وتم: بەڵێ، من وتی: ئەرێ ئەحمەد دەرکەوت؟ وتم: ئەحمەد کێیە؟ وتی: کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەبدولموتەلیب لەم مانگەدا دەربکەوێت و کۆتای پێغەمبەرانیشە، لە حەرەم دەردەکەوێت و کۆچ دەکات بۆلای خورما و شوێنی بەرد و زیخ و چەو وریابە پێش بکەویت و زوو فریای کەویت، تەلحە دەڵێت: قسەکەی چوویە دڵمەوە و خێرا چوومەوە بۆ مەککە و وتم: هیچ ڕوویداوە؟ وتیان بەڵێ: موحەمەدی کوڕی عەبدوڵلای ئەمین دەڵێن بووم بە پێغەمبەر و ئیبن ئەبی قوحافەش شوێنی کەوتووە، منیش چووم بۆلای ئەبوبەکر (رضي الله عنه) وتم: ئەرێ تۆ شوێن ئەو کابرا کەوتوویت؟ وتی: بەڵێ: بڕۆ بۆلای و شوێنی بکەوە چونکە بانگەواز بۆ حەق دەکات، تەلحەش پێی وت کە ڕاهیبەکە چی وتووە ئەبوبەکریش تەلحەی برد بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و تەلحە موسڵمان بوو، تەلحە ڕووداوەی ڕاهیبەکەی بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گێڕایەوە، ئەویش دڵخۆش بوو، پاش موسڵمان بوونی ئەبوبەکر و تەلحە نەوفەلی کوڕی عەدویە گرتنی و بەیەك پەت بەستنیەوە و بەنو تیمیش بەرگرییان لێ نەکردن، نەوفەلی کوڕی خوەیلید پێی دەوترا شێری قورەیش، بۆیە ئەبوبەکر و تەلحە لە پاڵ یەکدا و بە (قرینین) ناویان دێت، ئینجا فەرموودەکە دێنێت، بەیهەقیش هێناویەتی و لە فەرمودەکەیدا هاتووە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی (اللهم اكفنا شرابن العدوية) واتە(خوایە بەدوورمان بگرە لە خراپەی ئیبن عەدویە)[1][2].

---

[1] - ضعیف.

[2] - لە البدایە والنهایە ج٣ ص٢٩ دا واهاتووە.

# (خۆگری زوبەیری کوڕی عەوام (رضي الله عنه) لەسەر سەختیەکان)

ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص٨٩ لە ئەبوئەسوەدەوە هێناویەتی دەڵێت: زوبەیری کوڕی عەوام (رضي الله عنه) لە تەمەنی هەشتساڵیدا موسڵمان بوو و لە تەمەنی هەژدەساڵیدا کۆچی کرد، مامی زوبەیر بۆ ئازاردانی زوبەیر لەسەر حەسیرێك دەیبەستەوەو بە ئاگر لە ژێرەوە دووکەڵی بۆ دەنارد و دەیوت: بگەڕێوە بۆ بێباوەڕی، زوبەیریش دەیوت هەرگیز شتی وا ناکەم.[1]

ئەبونەعیمیش لە حەفسی کوڕی خالیدەوە هێناویەتی دەڵێت: مامۆستایەك کە لە موسڵەوە هاتبوو بۆلامان بۆی گێڕامەوە وتی: هاودەمی زوبەیری کوڕی عەوام (رضي الله عنه) بووم لە چەند سەفەرێکدا، لە وشکەڵانێکدا تووشی لەشگرانی بوو وتی: داپۆشە، منیش داپۆشی، لایەکی بە ڕوودا وەرچەرخاندم و سەیرمکرد بە شمشێر بریندار بووە، وتم: سوێند بەخوا شوێنەوارێك بە جەستەتەوە دەبینم بە کەسی دیکەوە نەمبینیوە، وتی: ئەوەت بینی؟ وتم بەڵێ، وتی: سوێند بە خوا هەربرینێکی لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و لە پێناو خوادا بووە[2][3].

---

[1]- تەبەرانیش هێناویەتی و دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە جێ متمانەن، فەرموودەکەش مورسەلە، هەیسەمی لە مجموع الزوائد ج٩ ص١٥١ دا هێناویەتی، حاکم ج٣ ص٣٦٠ لە ئەبوئەسوەد لە عوروەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی.

[2]- ضعیف.

[3]- تەبەرانی هێناویەتی، حاکم لە المستدرك ج٣ ص٣٦٠ هێناویەتی، ئیبن عەساکیریش هێناویەتی، لە المنتخب ج٥ ص٧٠ یشدا هاتووە، هەیسەمی ج٩ ص١٥٠ دا دەڵێت: زانا موسڵیەکە ناناسم، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە جێ متمانەن، تەواو. ئەبونەعیمش لە عەلی کوڕی زەیدەوە دەڵێت: کەسێك کە زوبەیری بینیوە بۆی گێڕامەوە: لەسەر سنگیدا وەك چاڵ شوێنی شمشێرو تیری پێوە دیار بوو، لە الحلیە ج١ ص٩٠ دا واهاتووە.

# (خۆگری بیلالی کوڕی ڕباحی بانگدەر (رضي الله عنه) لەسەر سەختیەکان)

ئیمامی ئەحمەدو ئیبن ماجە لە مەسعودەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: یەکەم کەسانێك موسڵمانبوونی خۆیان نیشاندا حەوت کەس بوون، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەبوبەکرو عەممارو سومەییەی دایکی و سوهەیب و بیلال و مقداد (رضي الله عنه)،خوای گەورە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە هۆی مامیەوە پاراست، ئەبوبەکر خوا بەهۆی هۆزەکەیەوە پاراستی، ئەوانی دیکەش بێباوەڕان دەیانگرتن و بەرگی ئاسنیان دەکردنەبەرو دەیانخستنە بەرخۆر، هەرکامیان ئەوەی ویستی بۆیان هاتەدی (کەسێك هات بەهانایانەوە)، جگە لە بیلال کە لە پێناو خوادا خۆی گرت و ئازاری چەشت، هێنایان دایانەدەست دوو کوڕو بە دۆڵەکانی مەککەدا ڕایاندەکێشا ئەویش دەیوت ئەحەد ئەحەد[1][2].

ئەبو نەعیمیش لە الحليە ج١ ص١٤٠ لە فەرموودەکەی موجاهیدەوە هێناویەتی، لە فەرموودەکەیدا هاتوە: ئەوانی دیکەش جلی ئاسنیان دەکردنەبەرو دەیانخستنە بەرخۆرو تا ئەوەی خوا ویستی سەختی گەرمای ئاسن و خۆریان تووش بوو، بەیانیان ئەبوجەهل – نەفرینی خوای لێ بێت – بە خەنجەرێکەوە دەهات و قسەو جنێوی پێ دەوتن، ئیبن عەبدولبیر لە فەرموودەکەی موجاهیددا– لە سەر هەواڵی بیلال دەچێت و دەڵێت: پەتیان کردبووە ملی و بەناو دارو بەردی مەککەدا دەیانگێڕا، ئیبن سەعد ج٢ ص١٦٦ لە موجاهیدەوە بەوشێوەیە هێناویەتی زوبەیری کوڕی بەکار

---

[1] – حسن.

[2] – لە البداية والنهاية ج٣ ص٢٨ دا هاتووە، حاکم ج٣ ٢٨٤ دا هێناویەتی، سەنەدەکەی صەحیحەو بوخاری و موسلیم نەیانهێناوە، زەهەبی دەڵێت: صەحیحە، ئەبونەعیم لە الحلية ج١ ص١٤٩ دا هێناویەتی، ئیبن ئەبی شەیبەش هێناویەتی، لە الکنز العمالج٧ ص١٤ دا هاتووە، ئیبن عەبدولبیر لە الاستيعاب ج١ ص١٤١ دا لە فەرموودەکەی ئیبن مەسعوودەوە هێناویەتی.

لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: بیلال هی ئافرەتێکی بەنی جەمح بوو، لە ڕەمزای مەککە سزایان دەدا، پشتیان دەخستە سەر زەویەکە تا بێباوەڕ بێت، ئەویش دەیوت ئەحەد ئەحەد، لەوبارەدا وەرەقە دەیدا بەپاڵیداو دەیوت: ئەحەد ئەحەد ئەی بیلال، سوێند بەخوا ئەگەر بیکوژن ئەیکەمە سۆزو بەزەیی.[1]

ئەبونەعیم لە الحیه ج١ ص١٤٨ لە هیشامی کوڕی عورەوە لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: وەرەقەی کوڕی نەوفەل دەیدا بەپاڵ بیلالدا کە سزا دەدرا دەیوت ئەحەد ئەحەد، ئەویش دەیوت: ئەحەد ئەحەد الله ئەی بیلال گیان، پاشان سەیری ئومەییەی کوڕی خەلەفی دەکرد کەوا سزای بیلالی دەدا دەیوت: سوێند بەخوای گەورە ئەگەر بیکوژن ئەیکەمە جێی سۆزو بۆ کڕوزانەوەی، تا ئەوەی ئەبوبەکری صدیق ڕۆژێك دای بەلایدا کە سزایان دەدا، بە ئومەییەی وت: ئەریٚ لە خوا ناترسیت وابەو هەژارە دەکەیت، کۆیلەیەکم هەیە لەو ڕەشترو بەهێزترە بۆ ئایینەکەت دەتدەمیٚ لەجیاتی ئەو، وتی: قبوڵمە، ئەمە بۆ تۆ، ئەبوبەکریش کۆیلەکەی پێداو بیلالی ئازاد کرد، لە پێش کۆچکردنی لە مەککە – شەش کۆیلەی دیکەی لەسەر ئیسلام ڕزگار کرد، بیلال حەوتەمیان بوو، ئەبونەعیم الحلیة ج١ ص١٤٨ لە ئیبن ئیسحاقەوە هێناویەتی: ئومەییە لە گەرمای ڕۆژدا بیلالی دەبردو لەسەر پشت لە چەمو زیخی ناو مەککەدا ڕایدەکێشا، دواتر فەرمانی دەکرد بەردێکی گەورەیان دەخستە سەر سنگی، ئومەییە پێی دەوت: ئاوادەبیت تا دەمریت یان بەرامبەر بە موحەمەد بێباوەڕ دەبیت و لات و عوززا دەپەرستیت، ئەویش لەو سەختیەدا دەیوت ئەحەد، ئەحەد، عەمماری کوڕی یاسر باسی بیلال و هاوەڵانی و سەختی و ناڕەحەتییانی دەکرد و لەسەر ئازاد کردنی بیلال لەلایەن ئەبوبەکرەوە دەدوا کە بە ئەبوبەکر دەوترا (عتیق) دەیوت:

| | |
|---|---|
| جزى الله خيرا عن بلال و صحبه | عتيقا واخزى فاكها و ابا جهل |
| عشية هما في بلال بسوءة | ولم يحذرا ما يحذر المرء ذوالعقل |

[1] – مورسەلی جەیدە، لە الاصابه ج٣ ص٦٣٤ دا واهاتووە.

| | |
|---|---|
| بتوحيده رب الانامل وقوله | شهدت بان الله ربي على مهل |
| فان يقتلوني فلم اكن | لاشرك بالرحمن من خيفة القتل |
| فيارب ابراهيم والعبد يونس | موسى و عيسى نجني ثم لا تبل |
| لم ظل يهوى الغي من ال غالب | على غير بركة منه ولاعدل[1] |

## (خۆگری عەمماری کوڕی یاسرو خێزانیان (رضي الله عنه) لەسەر سەخیەکان)

تەبەرانی و حاکمو بەیهەقی وئیبن عەساکیر لە جابیرەوە (رضي الله عنه) هێناویانە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دای بەپاڵ عەممارو خێزانەکەیدا کە سزادەدران فەرمووی (ابشروا ال عمار وال یاسر فان موعدكم الجنة)[2][3].

حاکم لە (الكني) و ئیبن عەساکیر لە عوسمانەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: من لە بەتحاء لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەرچووم دامان بە پاڵ عەممارو دایكو باوكیدا كە لەبەر خۆردا سزادەدران تا واز لە ئیسلام بهێنن، ئەبو عەممار وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ژیان وایە (زەمانە وایە) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (صبرا یا ال یاسر اللهم اغفر لال یاسر وقد فعلت)[4][5].

---

[1] – لە الحلیة ج١ ص١٤٨ دا واهاتووە.

[2] – صحیح.

[3] – هەیسەمی ج٩ ص٢٩٣ دەڵێت: کەسەکانی تەبەرانی صەحیحن جگە لە ئیبراهیمی کوڕی عەبدولعەزیزی موقەوم کە ئەویش جێی متمانەیە.

[4] – ضعیف.

[5] – ئەحمەدو بەیهەقی و بەغەوی و عقیلی ئیبن موندەو ئەبونەعیمو کەسانی دیکەش بەو واتایە لە عوسمانەوە (رضي الله عنه) هێناویانە، هەروەها لە (الكنز العمال ج٧ ص٧٢) هاتووە، ئیبن سەعد ج٣ ص١٧٧ دا لە عوسمانەوە (رضي الله عنه) بەوشێوە هێناویەتی.

ئەبوئەحمەد حاكم لە عەبدوڵڵای كوڕی جەعفەرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) دای بەپاڵ یاسرو عەممارو دایكی عەمماردا كە لەبەر خوا سزا دەران، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموون (صبرا ال یاسر صبرا ال یاسر فان موعدكم الجنة) ئیبن كەلبی لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) بەوجۆرە هێناویەتی و عەبدوڵڵای كوڕی یاسریشی بۆ زیاد دەكات، هەروەها دەڵێت: ئەبوجەهل دای لە سومەییەو كوشتی. یاسریش بە سزا مردو عەبدوڵڵاش مردو فڕێدراو كەوتە خوار[1][2].

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص١٤٠ لە ئەبوعوبەیدەی كوڕی موحەمەدی كوڕی عەممارەوە هێناویەتی دەڵێت: بێباوەڕان عەمماریان گرت و وازیان لێنەهێنا تا قسەی وت بە پێغەمبەر (ﷺ) و بەچاكە باسی خواوەندەكانی ئەوانی كرد، كاتێك هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (چیت بووە؟) وتی: خراپەم هاتە ڕێ ئەی پێغەمبەری خوا، دواجار قسەم پێ وتیت و بە باشە باسی خواوەندەكانی ئەوانم كرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (كیف تعبد قلبك؟) واتە(ئەی دڵت چۆن بوو؟)

وتی: لە دڵمدا باوەڕ چەسپاو بوو، فەرمووی (فان عادوا فعد) واتە(ئەگەر هەمتر ناچاریان كردیتەوە وابكەرەوە)[3].

هەروەها لە موحەمەدەوە هێناویەتی: كە پێغەمبەر (ﷺ) گەیشت بە عەممار سەیر دەكات دەگریت، چاوەكانی سڕی فەرمووی (اخذك الكفار فغطوك في الماء فقلت كذا وكذا فان عادوا فقل لهم ذاك لهم).

هەروەها ج٣ ق١ ص١٧٧ لە عەمری كوڕی مەیمونەوە دەڵێت: بێباوەڕان عەمماری كوڕی یاسریان بە ئاگر سوتاند، پێغەمبەریش (ﷺ) دای بەپاڵداو دەستی دەهێنا

---

[1] - ضعیف.

[2] - لە الاصابة ج٣ ص٦٤٧ دا هاتووە. ئەحمەدیش لە موجاهیدەوە هێناویەتی دەڵێت: یەكەم شەهیدی ناو ئیسلام دایكی عەممار سومەییە بوو كە ئەبوجەهل خەنجەرێكی كرد بە سكیداو كوشتی، لە البدایة والنهایة ج٣ ص٥٩ دا هاتووە.

[3] - ئیبن سەعد ج١ ق١ ص١٧٨ لە ئەبوعوبەیدەوە بەوجۆرە هێناویەتی.

بەسەر سەریداو دەیفەرموو (یا نار کوني بردا وسلاما على عمار كما كنت على ابراهيم عليه السلام تقتلك الفئة الباغية) واتە(ئەی ئاگر سارد و سەلامەتبە لەسەر عەممار هەروەك چۆن بۆ پێغەمبەر ئیبراهیم (علیه السلام) واتکرد، ئەی عەممار دەستەیەکی سەرکەش (یاخی) دەتکوژن.[1]

## (خۆگری خەببابی کوڕی ئەرەت (رضي الله عنه) لەسەر سەختیەکان)

ئیبن سەعد ج٣ ص١١٧ لە شەعبیەوە هێناویەتی دەڵێت: خەببابی کوڕی ئەرەت (رضي الله عنه) چوو بۆلای عومەری کوڕی خەتاب (رضي الله عنه) ئەویش لە شوێنی خۆی داینیشاند، وتی: لەم دونیایەدا کەس نیە هێندەی ئەم کەسە شیاوی ئەم شوێنە بێت جگە لە یەك کەس، خەبباب پێی وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەوە کێیە؟ وتی: بیلال، خەبباب وتی: لە من شیاوتر نیە، بیلال لە نێو بێباوەڕاندا کەسێکی نارد تا بیپارێزێت: بەڵام من کەسم نەبوو بمپارێزێت، ئەگەر ئەو ڕۆژ دەتبینیم گرتمیان و ئاگرێکیان بۆ کردمەوەو پاشان خستمیانە ناویەوە پاشان یەکێکیان پێی خستە سەرسنگم و پشتم کەوتە سەر زەوی، پاشان پشتی پێ نیشاندا کە پەڵە گرتبووی (هی سووتاوی).[2]

ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص١٤٤ لە شەعبیەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەر (رضي الله عنه) پرسیاری لە بیلال کرد کە بێباوەڕان چۆن ئازاریانداوە، خەبباب وتی: ئەی پێغەمبەری خوا سەیری پشتم بکە، عومەر وتی: تا ئێستا شتی وام نەدیوە، وتی: ئاگرێکیان بۆ کردمەوە چەوری پشتم ئاگرەکەی کوژاندەوە، هەروەها ئەبونەعیم و ئیبن سەعدو ئیبن ئەبی شەیبە هێناویانە، لە کنز العمال ج١ ص٧١ لە ئەبولەیلای کەندیەوە هاتووە دەڵێت: خەببابی کوڕی ئەرەت هات بۆلای عومەر (رضي الله عنه) وتی:

---

[1] - ضعیف.

[2] - لە کنزالعمال ج٧ ص٣١ دا واهاتووە.

نزیکی بکەنەوە کەس لە تۆ شیاوتری ئەم شوێنە نیە جگە لە عەمماری کوڕی یاسر، خەببابیش شوێنەواری پشتی پێ نیشاندەدا کە چۆن بێباوەڕان سزایانداوە.

ئەحمەد لە خەببابەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: من کەسێکی ئاسنگەر بووم، قەرزێکم بەسەر عاصی کوڕی وائیلەوە بوو، چووم بۆلای تا داوای قەرزەکەم بکەم، ئەویش وتی: بە خوا ناتدەمەوە تا بەرامبەر بە موحەمەد بێباوەڕنەبیت، منیش وتم: بە خوا هەرگیز شتی وا ناکەم تا ئەوکاتەی دەمریت پاشان زیندوو دەبیتەوە، وتی: ئەگەر من بمرمو دوایی زیندوو بوومەوە دێیت بۆلامو ئەوکات ماڵو سامانو منداڵم هەیە دەتدەمەوە، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند (افرایت الذي کفر بئایاتنا وقال لاوتین مالا و ولدا) تا (و یاتینا فردا).[1]

بوخاری لە خەببابەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: چوومە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە لە پاڵ کەعبەدا پاڵی دابوویەوە، ئازاری بێباوەڕانمان زۆر پێگەیشتبوو، وتم: ئایا لە خوا ناپاڕێیتەوە؟ ئەویش دانیشت و ڕەنگی دەموچاوی سوور هەڵگەڕا و فەرمووی (ئەوانەی پێش ئێوە هەیانبوو بە مشاری ئاسنین لەت دەکرا بە گۆشت و ئێسقانیەوە کەچی وازی لە ئایینەکەی نەدەهێنا، خوای گەورە ئەم کارە تەواو دەکات و دەگەیەنێتە جێ تا ئەوەی کەسێك لە سەنعائەوە سوار دەبێت بۆ حەزرەمەوت لە خوا نەبێت لە کەس ناترسێت (گورگیش ترسی بۆ مەڕەکەی هەیە) بەڵام ئێوە پەلە دەکەن)[2]

[1]- لة البداية و النهاية ج٣ ص٥٩دا واهاتووە، هەروەها ئیبن سەعد ج٣ ص١١٦ لە خەبابەوە بەوجۆرە هێنایەتی.

[2]ئەبوداود و نەسائی هێناویانە، لە العیني ج٧ ص٥٥٨ و حاکم ج٣ ص٣٨٣ بە هەمان واتا هاتووە

# (خۆگری ئەبوزەری غەفاری (رضي الله عنه) لەسەر سەختیەکان)

بوخاری ج١ ص٥٤٤ لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێک ئەبوزەر بیستی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بووە بە پێغەمبەر بە براکەی وت: سواربە و بڕۆ بۆ ئەو دۆڵە و لەسەر ئەو کەسەی بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکات و دەڵێت لە ئاسمانەوە هەواڵی بۆ دێت زانیاریم بۆ وەربگرە و گوێ لە قسەکانی بگرە و دوایی وەرەوە بۆ لام، ئەویش چوو و تا گەیشتە لای و گوێی لێگرت، پاشان گەڕایەوە بۆلای ئەبوزەر و پێی وت: بینیم فەرمانی دەکرد بە ئاکاری چاك و قسەکانی شیعر نەبوون، ئەویش وتی: ئەوەی ویستم پێت نەگەیاندم، بۆیە خۆی کۆکردەوە و بڕێ ئاوی لەگەڵ خۆی برد تا گەیشتە مەککە، چوویە کەعبە و بە دوای پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) گەڕا و نەیدۆزییەوە و حەزیشی نەدەکرد لەسەری هەواڵ بپرسێت، ئەمە وابوو تا شەوی لێهات، ڕاکشام، عەلی (رضي الله عنه) بینی و زانی نامۆیە، کەبینی کەوتە شوێنی، هیچکام پرسیاریان لەوی تر نەکرد تا بەیانی بوویەوە، بۆ ڕۆژی دووەم چوویەوە کەعبەو دووبارە پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم) نەدی تا ئێوارە هات، گەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی، عەلیش بردیەوەو وتی: مەگەر پیاو نابێت شوێنی خۆی بزانێت، بردیەوە بۆ ماڵەوەو کەسیان پرسیاریان لەوی دیکەیان نەدەکرد، ڕۆژی سێیەمیش هەروابوو، پاشان عەلی وتی: پێم ناڵێیت بۆچی هاتوویت؟ وتی: ئەگەر بەڵێنم پێ بدەیت یارمەتیم بدەیت پێت دەڵێم، ئەویش وتی: باشە، ئەبوزەڕیش پێی وت، عەلیش وتی: بەڵێ وایە پێغەمبەری خوایە، بەیانی بکەوەرە شوێنم ئەگەر شتێکی مەترسیدارم دی هەڵدەستم وەك ئەوەی ئاو بڕژم، ئەگەریش چووم شوێنم بکەوە تا دێیتە ئەو شوێنەی من بۆی دەچم، ئەویش وای کردو شوێن پێی هەڵگرت تا گەیشتە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، لەوێ ئەبوزەڕ گوێی لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گرت و هەر لەوێدا موسڵمان بوو، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو (بگەڕێرەوە بۆلای کەسەکانت و هەواڵیان پێبدە تا فەرمانی منت پێدەگات) ئەویش وتی: سوێند بەوەی گیانم بە دەستیەتی لە نێویاندا هاواری بۆ

دەکەم، ئینجا چوو بۆ کەعبەو بە دەنگی بەرز هاواری کرد شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواو موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە، پاشان ئەوان هەستان و لێیاندا تا خستیان، عەبباس هات و خۆی دا بە سەریداو وتی: قوڕتان بەسەر مەگەر نازانن ئەمە لە غیفاریەکانەو ڕێگەی بازرگانیتان لەشام لەوێوەیە؟ بەوە ڕزگاری کرد لە دەستیان، پاشان بۆ بەیانی ئەوەی کردەوەو ئەوانیش لێیاندایەوەو عەبباسیش خۆی دا بەسەریدا.

بوخاری ج١ ص٥٠٠ لە فەرموودەکەی ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی، وتی: ئەی کۆمەڵی قورەیش من شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواو موحەممەدیش بەندەو نێردراوی ئەوە، ئەوانیش وتیان: ئادەی هەستن بۆ ئەو هەڵخەڵەتاوە، ئەوانیش هێندەیان لێدام خەریك بوو بمرم تا عەبباس فریام کەوت و خۆی دا بەسەرمداو دوایی سەیری کردن و وتی: قوڕتان بەسەر، کەسێکی غیفاریەکان دەکوژن کە بازرگانی و ڕێتان لەوێوەیە؟ ئەوانیش لێم دوور کەوتنەوە، بۆ بەیانی هەمان شتم وتەوە، ئەوانیش وایان کردەوە، عەبباسیش فریام کەوتەوەو هەمان شتی وتەوە.

موسلیم لە ڕێگەی عەبدوڵڵای کوڕی صامتەوە لە ئەبوزەڕەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی و چیرۆکی موسڵمانبوونی بە شێوەیەکی تر دەگێڕێتەوە و لە فەرموودەکەیدا هێناویەتی: براکەم چوو تا گەیشتە مەککە پاشان پێی وتم: چوومە مەککەو کەسێکم دی خەڵکی بە خراپ ناویان دەبرد زۆر لە تۆ دەچوودەڵێت: منیش چووم بۆ مەککەو کەسێکم دی قسەی پێ دەوت وتم: ئەوە لە کوێیە؟ ئەویش دەنگی بەسەرمدا بەرزکردەوەو وتی: (صابيء، صابيء) خەڵکی لێهاندام و منیش لەنێو کەعبەدا خۆم حەشارداو پانزە شەو ڕۆژ تیایدا مامەوە بەبێ نان و ئاو جگە لە ئاوی زەمزەم، دوایی گەیشتین بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەبوبەکر (رضي الله عنه) کە هاتنە کەعبەوە، سوێند بە خوا من یەکەم کەس بووم سەلامی موسڵمانانەم لێ کرد، وتم: سلامت لێبێت ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی ((عليك السلام ورحمة الله) تۆ کێیت؟) وتم: کەسێك لە بەنی غەفار،

هاوەڵەکەی وتی: ئەی پێغەمبەر (ﷺ)موڵەتم بدە تا ئەمشەو میوانی من بێت، بردمی بۆ ماڵێك لە خواری مەککەوەو بڕێك مێوژی بۆ هێنام، منیش چوومەوەو بەبراکەمم وت کە موسڵمان بووم، ئەویش وتی: منیش هاوئایینت دەبم، ئینجا چووین بۆلای دایکمان وتی: منیش دێمە سەرئایینتان، چووم بۆلای هۆزەکەم هەندێکیان شوێنم کەوتن.

تەبەرانی بەهەمان شێوە بە دوورو درێژی هێناویەتی، ئەبونەعیم لە الحلية ج١ ص١٥٨ لە ڕێگەی ئیبن عەبباسەوە (ﷺ) لە ئەبوزەرەوە (ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: لە مەککە لە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) دا بووم ئیسلامی فێر کردمو شتێکی قورئانی بۆ خوێندمەوەو وتم: ئەی پێغەمبەری خوا من دەمەوێت موسڵمانبوونی خۆم ئاشکرا بکەم، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (اني اخاف عليك ان تقتل) واتە(دەترسم بکوژرێیت) وتم: ئەگەریش بکوژرێم ئەوە دەکەم، ئەویش بێدەنگ بوو، منیش چوومو قورەیش لە کەعبەدا بازنەیان بەستبوو قسەیان دەکرد، وتم: شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواو موحەمەدیش پێغەمبەری خوایە، هەموو لێم هەستانو هێتدەیان لێدام پەکیان خستم، وایانزانی کوشتومیان، دوایی هەستامو هاتمە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)و سەیری کردم چیم لێهاتبوو فەرمووی (مەگەر نەموت وامەکە؟) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا گرێیەکی دڵم بوو و کردمەوە، ئینجا لەگەڵی مامەوەو فەرمووی (الحق بقومك فاذا بلغك ظهوري فاتني) واتە(پەیوەستی هۆزەکەت بەرەوە کە بیستت سەرکەوتووم وەرە بۆلام).

# (خۆگری سەعیدی کوڕی زەیدو فاتیمەی ژنی کە خوشکی عومەر بوو لەسەر سەختیەکان)

بوخاری ج١ ص٥٤٥ لە قەیسەوە هێناویەتی دەڵێت: لە سەعیدی کوڕی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیلم بیست (رضي الله عنه) کە لە مزگەوتی کوفەدا بوو دەیوت: سوێند بە خوا عومەر لەسەر ئیلام بەستبوومیەوە، ئینجا فەرموودەکە دێنێت، لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا لە بوخاریەوە ج١ ص٥٤٦ هێناویەتی: عومەر هێشتا موسڵمان نەببو من و خوشکەکەی لەسەر ئیسلام کۆت کردبوو.

ئیبن سەعد ج٣ ص١٩١ لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی: دەڵێت: عومەر (رضي الله عنه) شمشێرێکی بە دەستەوە بوو هات کەسێکی بەنو زوهرەی پێگەیشت وتی: بۆ کێ دەچیت ئەی عومەر؟ وتی: دەمەوێت موحەمەد بکوژم، وتی: چون پارێزراو دەبیت لە بەنی هاشم و بەنی زەهرە ئەگەر بێت و مەحەمەد بکوژیت؟ عومەر پێی وت: وابزانم تۆش هەڵخەڵەتاویت و وازت لە ئایینی خۆت هێناوە، وتی: شتێکی لەوە سەرسوڕهێنەرترت پێ بڵێم؟ وتی: چیە؟ وتی: خوشکەکەت و زاواکەت هەڵخەڵەتاون و وازیان لە ئایینەکەت هێناوە عومەریش بە هەڕەشەخوازیەوە چوو بۆلایان لەوێ یەکێك لە کۆچەران لەلایان بوو پێی دەوترا خەباب، خەباب هەستی عومەری بیست و لە ماڵەوە خۆی حەشارداو عومەریش چوویە ژوورەوەو وتی: ئەو دەنگ و زریکە چی بوو لاتان بیستم؟ ئەوکات سورەتی (طه) یان دەخوێند، ئەوانیش وتیان: تەنها لە نێوان خۆماندا قسەمان دەکرد، عومەر وتی پێدەچێت هەڵخەڵەتابن، زاواکەی پێی وت: عومەر دەڵێت چی ئەگەر حەق لە ئایینێکی جگە لە ئایینی تۆدا بێت؟ عومەر دای بە سەریداو بەتوندی لێی داو خوشکەکەشی هات تا عومەر لابیات، ئەویش بە دەست لێی داو خوێن لە دەم و چاوی هات، خوشکەکەی بەوپەڕی توورەییەوە وتی: ئەگەر حەق لە جگە لە ئایینی تۆدایە ئەوا شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواو موحەمەدیش پێغەمبەری خوایە، کە عومەر هیوای نەما و وتی: ئەو کتێبەی لاتان بوو

بمدەنیٚ تا بیخوێنمەوە، عومەر خوێندەواری هەبوو خوشکەکەی وتی: تۆ پیسیت و ئەوەش تەنها کەسانی پاك دەیگرن بە دەستەوە، هەستە خۆت بشۆ یان دەست نوێژ بگرە ئەویش هەستا و دەست نوێژی گرت پاشان سورەتی (طه) خوێندەوە تا (انني انا الله لا اله الا انا فاعبدني واقم الصلاة لذكري) عومەریش وتی: بمبەن بۆلای موحەمەد، کە خەباب ئەو قسەی بیست هاتە دەرەوە و وتی: عومەر موژدەت لێبێت، هیوام وایە تۆ بەر نزاکەی پێغەمبەر (ﷺ) بکەویت کە شەوی پێنج شەممە بۆی کردیت و فەرمووی (خوایە ئیسلام عزەتمەند بکە بە عومەری کوڕی خەتاب یابە عمری کوڕی هیشام) پێغەمبەریش (ﷺ) لەوماڵەدا بوو کە لە کەنار صەفا بوو، عومەر چوو تا گەیشتە لای ماڵەکە. حەمزەو تەلحەو هەندیٚ لە هاوەڵان لەبەر دەرگادا وەستابوون، کە حەمزە عومەری بینی هەمووان لە عومەر بە هۆش هاتنەوە حەمزە وتی: بەڵیٚ ئەوە عومەرە، ئەگەر خوا چاکەی بۆ عومەر بوێت و موسڵمان بێت و شوێن پێغەمبەر (ﷺ) بکەوێت باشە، ئەگەر نا کوشتنی لامان ئاسانە، پێغەمبەریش (ﷺ) لە ناوەوە چاوەڕێی بوو، پێغەمبەر (ﷺ) هاتە دەرەوە تا هاتە لای عومەرو کراسەکەی گرت و فەرمووی (وازناهێنیت ئەی عومەر تا خوای گەورە سەرشۆڕی و سزات بۆ دانەبەزێنێت وەك ئەوەی دایبەزاند بۆ وەلیدی کوڕی موغەیرە؟ خوایە ئەمە عومەری کوڕی خەتابە، خوا بە ئیسلام بە عومەری کوڕی خەتاب عیزەتمەند بکە) عومەریش وتی: شایەتی دەدەم تۆ پێغەمبەری خوایت، ئینجا موسڵمان بوو و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا وەرە دەرەوە (بانگەوازەکەت ئاشکرا بکە)[1]

تەبەرانی لە سەوبانەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (خوایە ئیسلام عیزەتمەند بکە بە عومەری کوڕی خەتاب) سەرەتای شەو کاتێك خوشکەکەی (اقرا باسم ربك الذي خلق) ی دەخوێند دای لە خوشکەکەی تا ئەوەی

[1]- لە العيني ج٨ ص٦٨ دا هاتووە، ئیبن ئیسحاق بەو شێوەیە بە دوورو درێژی هێناویەتی، لە البداية والنهاية ج٣ ص٨١ دا هاتووە.

وای زانی کوشتوویەتی، پاشان لە بەرەبەیاندا هەستا و بینی هەرئەوە دەخوێنێت، وتی: سوێند بە خوا ئەمە شیعرو چپەچپ نیە، چوو تا گەیشتەلای پێغەمبەر (ﷺ) سەیر دەکات بیلال (رضي الله عنه) لەبەردەرگایە، دەرگاکەی پاڵ پێوەنا، بیلال وتی: کێیە؟ وتی: عومەری کوڕی خەتاب، وتی: دەبێت لای پێغەمبەری خوا (رضي الله عنه) مۆڵەتت بۆ وەربگرم، چوو بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) عومەر لەبەردەرگایە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (ئەگەر خوا چاکەی بۆ عومەر بوێت دەیهێنێتە ناو ئیسلامەوە) بە بیلالی فەرموو (دەرگاکە بکەرەوە) پێغەمبەر (ﷺ) بن باڵەکانی گرت و تەکاندی و فەرمووی (چیت دەوێت؟ بۆچی هاتوویت؟) عومەر پێی وت: ئەوەی بانگەوازی بۆ دەکەیت بۆم بخەڕوو، فەرمووی (شایەتی بدەیت هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خوای تاك و تەنهای بێهاوتا و موحەمەدیش بەندەو پێغەمبەری خوایە) عومەر هەرلەوێدا موسڵمان بوو و وتی: دەی بە دەرکەوە[1].[2]

بەزار لە ئەسلەمی مەولای عومەرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتاب وتی: حەزدەکەن باسی سەرەتای موسڵمانبوونم بکەم بۆتان؟ وتمان: بەڵێ، وتی: من سەرسەختترین دوژمنی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بووم، لە ڕۆژێکی زۆر گەرمدا لە ڕێی مەککەدا بووم کە کەسێکی قورەیشی بینیمی و وتی: ئیبن خەتاب بۆ کوێ دەچیت؟ وتم: بۆلای ئەو کابرا دەچم، وتی: خوشکەکەت چووەتە سەر ئایینی ئەو، منیش بە توورەیی‌یەوە گەڕامەوە و چوومە بەردەرگای ماڵی خوشکەکەم، پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر کەسێکی موسڵمانبووی بدایە هیچی نیە کەس و دووکەسی دەهێنا تا شتێکی بدەنێ، بۆ مێردی خوشکەکەشم دوو هاوەڵی ناردبوو، دام لە دەرگا، پێم وترا کێیە؟ وتم: عومەری کوڕی خەتاب، ئەوکات نووسینێکیان لە بەردەستتدا بوو

---

[1] – ضعیف.

[2] – هەیسەمی ج٩ ص٦٢ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا زیدی کوڕی ڕەبیعە هەیە کە مەتروکە ئیبن عەدی دەڵێت: هیواخوازم هیچی لەسەر نەبێت، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە جێ متمانەن، تەواو.

دەیانخوێندەوە کە دەنگی منیان بیست هەستان و خۆیان لە شوێنێکدا شاردەوە و نووسینەکەیان لابرد، کە خوشکەکەم دەرگاکەی بۆ کردمەوە وتم: ئەی دوژمنی گیانت هەڵخەڵەتایت؟ وتی: شتێکم بەرزکردەوە و دام بەسەر سەریدا، ئەویش گریا و وتی: عومەری کوڕی خەتاب چیت پێ دەکرێت بیکە من موسڵمان بووم، منیش چووم و دانیشتم، دەبینم لەبەردەمیاندا پەڕاوێك هەیە، وتم: ئەمە لێرەدا چی دەکات؟ پێی وتم: کوڕی خەتاب وازمان لێ بێنە، تا خۆت نە شۆیت و پاك نەبیتەوە نابێت، چونکە تەنها کەسانی پاك دەستی لێ دەدەن، منیش زۆر پێم وت تا پێی دام، ئینجا بە دوورو درێژی باسی موسڵمانبوونی عومەر (رضي الله عنه) دەکات کە دواتر چی هاتووەتە ڕێ[1][2].

## (خۆگری عوسمانی کوڕی مەچغون (رضي الله عنه) لەسەر سەختیەکان)

ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص١٣ لە عوسمانەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك عوسمانی کوڕی عەففان (رضي الله عنه) بینی هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە چ سەختیەکدان و ئەویش لە پەنای وەلیدی کوڕی موغەیرەدا بوو وتی: سوێند بە خوا ناتوانم ببینم لە پەنای کەسێکی بێباوەڕدابم و هاوەڵانم و هاوئایینانم ئازارو سەختیەك بچەژن کە نایەتە ڕێی من، ئەمە کەم و کورتیەکی گەورەیە لە دەروونی مندا، بۆیە چوو بۆلای وەلیدی کوڕی موغەیرە و پێی وت: ئەی ئەبوعەبد شەمس زیممەی بردەسەر وا بۆم گێڕایتەوە، وتی: برازاکەم پێدەچێت یەکێك لە هۆزەکەم ئازارت بدات؟ وتی: نا من بە پەنای خوا ڕازیم و نامەوێت پەنای کەسی تر وەربگرم، وتی: دەی بڕۆ بۆ کەعبە و لەوێ بە دەنگی بەرز پەناکەم بە ئاشکرا بۆ بگێڕەوە وەك چۆن من بە ئاشکرا پەنام دایت.

---

[1] – ضعیف.

[2] – هەیسەمی ج٩ ص٦٤ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا ئوسامەی کوڕی زەیدی کوڕی ئەسلەم هەیە لاوازە. تەواو.

چووین بۆ مزگەوت و وەلید بە خەڵکەکەی وت: ئەمە عوسمانەو هاتووە پەناکەم دەگێڕێتەوە، ئەویش پێی وتن ڕاست دەکات، ئەو بە وەفا و بەخشندە بوو لە پەناکەیدا، بەڵام من حەزدەکەم تەنها پەنای خوا وەربگرم، وا پەناکەیم بۆ گێڕایەوە، پاشان عوسمان و لەبیدی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی مالیکی کوڕی قیسی لە کۆڕەکەی قورەیشدا هەستان، عوسمان لەگەڵیان دانیشتبوو، لەبید ئەم شعرەی بۆ دەوتن:

الا كل شيئ ما خلق الله باطل

عوسمان وتی: ڕاست دەکەیت، ئەویش وتی:

و كل نعيم لا محالة زائل

عوسمان وتی: درۆ دەکەیت خۆشی بەهەشتیەکان وانابێت، لەبید وتی: ئەی قورەیش سوێند بەخوا ئەم کابرا ئەزیەت دەرە تاکەی ئەمە لەناوتاندا ڕوودەدات؟ یەکێکیان هەستا و وتی: ئەوە گەمژەیەکی قورەیشەو وازی لە ئایینمان هێناوە، گوێ بە قسەی مەدە، عوسمانیش وەڵامی دایەوە تا نێوانیان تێکچوو، ئەو کەسە هەستابۆی و بۆکسێکی دا لە چاوی و مۆری کردەوە، وەلیدی کوڕی موغەیرەش ئەمەی بینی وتی: برازاکەم سوێند بەخوا بێمانا چاوت وای لێهات، خۆ تۆ لە پەنایەکی بە هێزدا بوویت، عوسمان وتی: بەڵێ سوێند بەخوا چاوەساغەکەم هەژارە چونکە بەخششەی پێنەدرا کە خوا دای بەم چاوەکەم، من لە پەنای وەدام کە لە تۆ بەعیزەت ترو بە تواناترە ئەی عەبد شەمس، ئینجا عوسمان لەسەر تووشبوونی چاوی ئەم شیعرەی وت:

فان تك عيني في رضى الرب نالها — يدا ملحد في الدين بمهتد
فقد عوض الرحمن منها ثوابه — ومن يرضيه الرحمن يا قوم يسعد
فاني وان قلتم غوى مضلل — سفيه على دين الرسول محمد
اريدبذالك الله و الحق ديننا — على رغم من بيغي علينا ويتعدى

عەلیش لەسەر چاوی عوسمانی کوڕی مەضغون وتی:

امن تذكر دهر غير مامون — اصبحت مكتئبا تبكي كمحزون

امن تذكر اقوام ذوي سفه | يغشون بالظام من يدعوا الى الدين
لا ينتهون عن الفحشاء ما سلموا | و الغدر فيهم سبيل غير مامون
لا ترون اقل الله خيرهم | انا غضبنا لعثمان بن مظعون
اذ يلطمون ولا يخشون مقتله | طعنا دراكا و ضربا غير مافون
فسوف يجزيهم ان لم يمت عجلا | كيلا بكيل جزاء غير مغبون[1].[2]

## (خۆگری موصعەبی کوڕی عومەیر لەسەر سەختیەکان)

ئیبن سەعد ج٢ ص٨٢ لە موحەمەدی عەبدەریەوە لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: موصعەبی کوڕی عومەیر گەنجێکی جوان و قژ خاوی ناو مەککە بوو، دایك و باوکی خۆشیان دەویست، دایکی دەوڵەند و بە توانا بوو، جل و بەرگی زۆر جوان و ڕازاوە بوو، لە هەمووان زیاتر بۆنی خۆشی لە خۆی دەدا، نەعلی حەززەمی دەکردە پێ، پێغەمبەر (ﷺ) باسی دەکرد و دەیفەرموو (ما رايت بمكة احسن لمة ولا ارق حلة ولا انعم من مصعب بن عمير) موصعەب بیستی پێغەمبەر (ﷺ) لە ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەرقەمدا بانگەواز دەکات بۆ ئیسلام، چوو بۆلای و موسڵمان بوو و باوەڕی هێنا و چوویە دەرەوە و لە ترسی دایکی و هۆزەکەی موسڵمانبوونی خۆی شاردەوە، بەنهێنی دەچوو بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)عوسمانی کوڕی تەلحە بینی موصعەب نوێژ دەکات، خێرا هەواڵیدا بە دایکی و هۆزەکەی بڵێ، ئەوانیش گرتیان و بەندیان کرد، بەردەوام وابوو تا لە کۆچی یەکەمدا کۆچی کرد بۆ حەبەشە، پاشان لەگەڵ موسڵماناندا گەڕایەوە، کە هاتەوە بارەکە گۆڕا بوو، دایکی وازی لە سەرکۆنەکردنی هێنابوو.[3]

---

[1] - ضعيف.

[2]- لە الحلية ج١ ص١٠٣ دا واهاتووە.لە البداية والنهاية ج٣ ص٩٣ دا چیرۆکی عوسمان لە ئیبن ئیسحاقەوە بەبێ سەنەد هاتووە، ئەوەشی بۆ زیاد دەکات: وەلید پێ وت: دەی برازاکەم بگەڕێرەوە بۆ پەنای جارانت، وتی: نا، تەبەرانی لە عروەوە بە مورسەلی هێناویەتی، هەیسەمی دەڵێت: لە سەنەدەکەدا ئیبن لهیعە هەیە (ج٦ ص٣٤).

[3] - ضعيف.

# (خۆگری عەبدوڵڵای کوڕی حوزافەی سەهمی (رضي الله عنه) لەسەر سەختیەکان)

بەیهەقی و ئیبن عەساکیر لە ئەبی ڕابعەوە هێناویانە دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) سوپایەکی نارد بۆ ڕۆم و لەناویاندا کەسێك هەبوو پێی دەوترا عەبدوڵڵای کوڕی حوزافە کە هاوەڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو ڕۆمەکان گرتیان و بردیان بۆلای پاشاکەیان، پێیان وت: ئەمە لە هاوەڵانی موحەممەدە، (طاغية) پاشای ڕۆم پێی وت: دەبیت بە مەسیحی تا لە دەسەڵات و سامانمدا بەشدارت بکەم؟ عەبدوڵڵا پێی وت: ئەگەر چیت هەیە بە هەموو موڵکی عەرەبیشەوە بمدەیتێ تا وازبهێنم لە ئایینی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) بۆ ماوەی یەك چاوتروکاندنیش بێت نایکەم، وتی: دەی دەتکوژم، وتی: دەی بمکوژە، فەرمانی پێکرا و لە خاچ درا و بەتیر هاوێژانی وت: تیر بدەن بەلای دەست و پێیدا، ئەویش وازی نەهێنا، پاشان فەرمانی کرد بیهێننەوە و دایانبەزاند پاشان داوای مەنجەڵێك ئاوی کوڵاوی کرد و دوو دیلی موسڵمانانی هێنا، فەرمانی کرد تا بیخەنە ناویەوە، خستیانە ناوی، پاشان پێشنیاری مەسیحیەتی بۆ عەبدوڵڵا دەکرد و ئەویش ئامادە نەبوو، ئینجا فەرمانی کرد ئەویش بخەنە ناویەوە، کاتێك عەبدوڵڵا برا دەستی کرد بە گریان، پێیان وادەگریت، پاشان وایزانی ترساوە، وتی: دەی بیگەڕێننەوە و پێشنیاری مەسیحیەتی بۆ بکەن، بەڵام ڕازی نەبوو، وتی: ئەی ئیتر بۆچی گریایت؟ وتی: بۆ ئەوە گریام لە دەروونی خۆمدا وتم: ئێستا فڕێ دەدرێیتە ناو ئەو مەنجەڵەو کۆتایی بە ژیانت دێت، ئارەزوومەند بووم بە هێندەی مووەکانی لەشم گیانم هەبێت تا هەموویان لە پێناو خوادا دابنێم، پاشان پێی وت: ئامادەی سەرم ماچ بکەیت تا ئازادت بکەم؟ عەبدوڵڵا وتی: هەموو دیلەکانی موسڵمانانیش ئازاد بکە باشە؟ وتی: باشە، عەبدوڵڵا دەڵێت: لە دەروونی خۆمدا وتم: سەری دوژمنێکی خوا ماچ بکەم بە هۆیەوە خۆم و هەموو دیلە موسڵمانەکان ئازاد بکەم گرفتێك نیە، لێی نزیك بوویەوە و سەری ماچ کرد و ئەویش دیلەکانی پێدا،

عەبدوڵڵاش بردنیەوە بۆلای عومەر (رضي الله عنه) و هەواڵی پێدا کە چی بووە، عومەر وتی: ئەرکی هەرموسڵمانێکە سەری عەبدوڵڵای کوڕی حوزافە ماچ بکات، منیش یەکەم کەس ئەوە دەکەم، ئەوکات هەستا و سەری ماچ کرد[1][2].

## (خۆگری گشتی هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەسەر سەختیەکان)

ئیبن ئیسحاق لە حەکیم لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: بە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسم (رضي الله عنه) وت: ئایا بێباوەڕان سزای وای هاوەڵانیان دەدا تا ناچاریان بکەن بە واز هێنان لە ئایینەکەیان؟وتی: بەڵێ، سوێند بەخوا دەیاندا لە یەکێكو برسی و تینویان دەکرد تا ئەوەی لەتاو ئازاریدا چۆکی دەداو چیان لێ داوا دەکرد دەیوت تا ئەوەی پێیان دەوت: لات و عوززا دوو خواوەندن جگە لە خوا، دەیوت بەڵێ، ئەمەش لەتاو ئەو ئازارەی توشیان دەکرد، لە البداية والنهاية ج٣ ص٥٩ دا واهاتووە.

ئیبن مونزیرو تەبەرانی و حاکمو ئیبن مەردەویەو بەیهەقی لە الدلائل و سەعیدی کوڕی مەنسور لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانی هاتن بۆ مەدینەو پشتیوانان پێشوازیان لێ کردن عەرەب بە یەکجاری لە دژیان بوون، ئیدی بە چەکەوە دەخەوتن و هەڵدەسان، دەیانوت: دەبینن ئێمە وادەژین تا بەدڵنیاییەوە بژین و تەنها لە خوا دەترسین، ئەم ئایەتە دابەزی (وعد الله الذين امنوا منكم وعملوا الصالحات ليستخلفنهم في الارض).[3]

---

[1] - ضعیف.

[2]- لە الكنز العمال ج٧ ص٦٢ دا واهاتووە، لە الاصابة ج٢ ص٢٩٧ دا دەڵێت: ئیبن عەساکیر بۆ ئەم چیرۆکە شایەتێکی لە فەرموودەکەی ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) بە مەوصولی هێناوە یەکێکیش لە فەوائیدی هیشامی کوڕی عوسماندا لە مورسەلی زوهریەوە. تەواو.

[3]-لە کنز العمال ج١ ص٢٥٩ دا واهاتووە، دەقەکەی تەبەرانی لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە دەڵێت/ کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵان هاتن بۆ مەدینە پشتیوانان پشتگیرو عەرەب نەیاریان بوون خوا

ئیبن عەساکیرو ئەبویەعلا لە ئەبوموساوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دا چووین بۆ غەزایەك، شەش کەس بووین، لە نێوانماندا وشترێك هەبوو کەوتینە شوێنی، لە چوون وەستاین منیش وەستام نینۆکەکانم کەوتن سەرقاڵ بووین بە پێکانمانەوە، بۆیە بە شەڕەکە وترا (ذات الرقاع) چونکە لەتاو چەقیندا گیرۆدەی دەست پێمان بووین،[1] ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٢٦٠ بەو جۆرە هێناویەتی ئەوەشی بۆ زیاد دەکات کە ئەبوبوردە وتی: ئەبو موسا ئەو فەرموودەی گێڕایەوە، پاشان باسی کرد ئەگەر ئەم فەرموودەم گێڕایەوە چی بکەم وەك ئەوەی حەزنەکات شتێك لە کارەکەی ئاشکرابێت، وتی: خوا پاداشتی بداتەوە.

## (خۆگری لەسەر برسێتی لە پێناو بانگەوازی ڕێی خوادا)

## (خۆگری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەسەر برسێتی)

موسلیم و ترمزی لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: مەگەر ئێوە هەر خواردن و خواردنەوەیەکتان بوێت نیتانە؟ دەی من پێغەمبەرەکەتانم بینی دەنکە خورمایەکیشی نەبوو تا سکی پێ تێر بکات، لە گێڕانەوەیەکی موسلیم لە نوعمانەوە (رضي الله عنه) دەڵێت: عومەر (رضي الله عنه) باسی سەختی ژیانی خەڵکی کردو وتی: پێغەمبەرم (صلى الله عليه وسلم) بینی ڕۆژی بە برسێتی دەبردەسەرو دەنکە خورمایەکیشی نەبوو سکی پێ تێر بکات.[2]

ئەبونەعیم لە الحلیة و خەتیب و ئیبن عەساکیرو ئیبن نەجار لە ئەبوهورەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: چوومە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە دانیشتنەوە نوێژی

ئەم ئایەتەی دابەزاند (لیستخلفنهم في الارض) هەیسەمی ج٧ ص٨٣ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە جێ متمانەن.

[1] – لە الکنز العمال ج٥ ص٣١٠ دا واهاتووە،

[2] – لە الترغیب (ج٥ ص١٥٤) دا واهاتووە، ئیمامی ئەحمەدو تەیالیسی و ئیبن سەعدو ئیبن ماجەو ئەبوعەوانەو کەسانی دیکەش هێناویانە. لە الکنز ج٤ ص٤٠ یشدا هاتووە.

دەکرد، وتم ئەی پێغەمبەری خوا دەتبینم بە دانیشتنەوە نوێژ دەکەیت چی بووە، فەرمووی (ئەبوهورەیرە برسێتیە) منیش گریام، فەرمووی (ئەبوهورەیرە مەگری، چونکە سەختی لێپێچینەوەی ڕۆژی دوایی تووشی کەسی برسێتی نابێت ئەگەر لە ژیانی دونیادا چاوەڕێی پاداشتی ڕۆژی دوایی بێت).[1]

ئەحمەد- کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن- لە عائیشەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت:ماڵی ئەبوبەکر (رضي الله عنه) پێیەکی مەڕێکی بۆ ناردین، منیش دەمگرت و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەیبڕی یان بە پێچەوانەوە، ئینجا کە ئەم فەرموودەی دەگێڕایەوە دەیوت: ئەمە بەبێ چرا، تەبەرانیش هێناویەتی و ئەوەش دێنێت وتم: ئەی دایکی بڕواداران چرای چی؟ وتی: ئەگەر جگە لە هی چرا کە ڕۆنێکمان هەبووایە دەمانخوارد[2]،[3] ئەبویەعلاش لە ئەبوهورەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ماوەیەك بەسەر ماڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دا دەچوو لە ماڵی کەسیاندا ئاگر نەدەکرایەوە و ئەگەر زەیتێکیان بەدی بکردایە بۆ چەورکردن بەکاریان دەهێنا، ئەگەریش چەوری گۆشتیان بەدەست بکەوتایە دەیانخوارد[4].[5]

ئەحمەد لە ئەبوهورەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: مانگ تێپەڕدەبوو بەسەر بنەماڵەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دا و لەماڵی هیچکامیاندا ئاگر نەدەکرایەوە نە ۆنان و نە بۆ

---

[1] - لە الكنز العمال ج٤ ص٤١ دا واهاتووە.

[2] - ضعيف.

[3]- لە الترغيب ج٥ ص١٥٥ دا هاتووە، ئیبن جەریرێش هێناویەتی، لە الكنز العمال ج٤ ص٣٨ یشدا هاتووە

[4] - صحيح.

[5]- لە الترغيب ج٥ ص١٥٤ دا واهاتووە، هەیسەمی ج١٠ ص٣٢٥ دا دەڵێت: ئەبویەعلا گێڕاویەتیەوە و لە سەنەدەکەدا عوسمانی کوڕی عەتای خوراسانی هەیە کە لاوازە، دحیم متمانەی پێ دەدات، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە صەحیحن.

چێشت، وتیان بە چی دەژیان ئەی ئەبوهورەیرە؟ وتی: بە دوو ڕەشەکە، خورما و ئاو، دراوسێیەکی پشتیوانیان هەبوو (خوا پاداشتی بداتەوە) شیری بۆ دەناردن.[1]

بوخاری و موسلیم لە عورووەوە لە عائیشەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی کە دەیوت: سوێند بە خوا خوشکەزاکەم ئێمە لە مانگی چواردەشەوەوە بۆ مانگی داهاتووتر پاشان بۆ دوای ئەویش سێ جار لە ماوەی دوومانگدا دەماینەوە و لەماڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) دا ئاگر نەدەکرایەوە، وتم: پوریْ ئەی بە چی دەژیان؟ وتی: خورما و ئاو، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) دراوسێیەکی پشتیوانانی هەبوو ئاژەڵی هەبوو بڕێك شیری دەنارد بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و ئەویش دەرخواردی دەداین.[2]

ئیبن جەریر لە عائیشەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: چل ڕۆژمان بەسەر دەبرد لە ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) دا ئاگرمان نەدەکردەوە، وتم: ئەی بە چی دەژیان؟ وتی: بە ئاو و خورما ئەگەر هەبووایە، لە الكنز العمال ج٤ ص٣٨ دا هاتووە، ترمزی لە مەسروقەوە هێناویەتی دەڵێت: چوومە خزمەت عائیشە (رضي الله عنها) بانگی خواردنی کرد بۆم، وتی: ئای تێری، ویستم بگریم گریام، وتم: بۆچی؟ وتی: بیری ئەو بارەم کەوتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) دونیای بەجێ هێشت، سوێند بەخوا تێر نان و گۆشتی نەدەخوارد لە ڕۆژێکدا دووجار،[3] ئیبن جەریر لە عائیشەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: بنەماڵەی محمد دوو ڕۆژ بەسەر یەکەوە تێریان لە گەنم نەدەخوارد تا پێغەمبەر (ﷺ) دونیای بەجێ هێشت، هەر ئیبن جەریر لە عائیشەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) گیانی سپارد و لە خورما و ئاو

---

[1] -هەیسەمی ج١٠ ص٢١٥ دەڵێت: سەنەدەکەی حەسەنە، بەزاریش بەوجۆرە هێناویەتی، تەواو.

[2] -لە الترغيب ج٥ ص١٥٥ دا واهاتووە، ئیبن جەریریش بەوجۆرە هێناویەتی، ئەحمەد بە سەنەدی حەسەن هێناویەتی، بەزار لە ئەبی هورەیرەوە (رضي الله عنه) بەو واتایە هێناویەتی، لە المجمع ج١٠ ص٣١٥ دا هاتووە.

[3] - لە الترغيب ج٥ ص١٤٨ دا هاتووە،

تێری نەخوارد، لە الكنز العمال ج٤ ص٣٨ دا واهاتووە، لە گێڕنەوەی بەیهەقیشدا دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) سێ ڕۆژ بەسەر یەکەوە تێر نەبوو، ئەگەر بمانویستایە تێردەبووین، بەڵام ئەو بەوجۆرە خۆی ڕادەهێنا[1].[2]

بوخاری لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) لە سەر سفرە نانی نەدەخواردو تەواو نانی نەدەخوارد تا کۆچی دوایی کرد، لە گێڕانەوەیەکی تردا بە چاوانی خۆی مەڕی برژاوی نەدی،[3] ترمزی – بە صەحیحی داناوە– لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) شەوانی بەسەر دەبردو خێزانەکانی برسی بوون و نانی خواردنیان نەبوو، زۆر هەیانبوایە نانی جۆ بوو، ترمزی و بوخاری لە ئەبوهورەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویانە: پێغەمبەر (ﷺ) دای بەلای کۆمەڵێکدا کە مەڕێکی برژاویان لە بەردەستدا بوو، بانگیان کرد تا بخوات، بەڵام ئامادەنەبوو بیخوات، وتی: پێغەمبەر (ﷺ) دونیای بەجێ هێشت و تێر نانی جۆی نەخوارد، لە الترغیب ج٥ ص١٤٨، ١٥١، ئەحمەد لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: فاتیمە (رضي الله عنها) پارچە نانێکی جۆی دا بە پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەریش (ﷺ) پێی فەرموو ئەمە یەکەم نانێکە لە ماوەی سێ ڕۆژدا باوکت دەیخوات، تەبەرانیش هێناویەتی و ئەمەی بۆ زیاد کردووە، فەرمووی ئەوە چیە؟ وتی: نانێکە نەمتوانی بیخۆم تا ئەمەت بۆ دانەنێم ئینجا فەرموودەکە دێنێت[4].[5]

بەیهەقی بە سەنەدی صەحیح لە ئەبوهورەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: خواردنێکی گەرم هێنرا بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لێی خوارد، کە لێ بوویەوە فەرمووی

---

[1] – ضعیف.

[2] – لە الترغیب ج٥ ص١٤٩ دا واهاتووە.

[3] – لە الترغیب ج٥ ص١٥٢ دا واهاتووە.

[4] – صحیح.

[5] –هەیسەمی ج١٠ ص٣١٢ لە پاش باسی ئەحمەدو تەبەرانیەوە دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکانیان جێ متمانەن. ئیبن ماجەش بە سەنەدی حەسەن هێناویەتی،

(سوپاس بۆ خوا كه لەماوەی ئەوەندەوە خواردنی گەرمی گەیاندە سكم)(الحمد لله ما دخل بطني طعام سخن منذ كذا و كذا)[1].[2]

بوخاری لە سەهلی كوڕی سەعدەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەو كاتەوەی خوا ناردی تا گیانی سپارد نانی گەرمو كوڕی نەخوارد، وترا: ئەی ئایا لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) بێژنگتان نەبوو؟ وتی: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەو كاتەوەی خوا ناردی تا گیانی سپارد نەیدی، وتی: ئەی چۆن بەبێ بێژنگ جۆتان دەخوارد؟ وتی: دەمانهاڕی و فومان پیا دەكردو ئەویترمان دەكرد بەنان، لە الترغيب ج٥ ص٩٥٣ دا واهاتووە، تەبەرانی بە سەنەدی حەسەن لە عائیشەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: لەسەر سفرەی پێغەرمبەردا (صلى الله عليه وسلم) كەمو زۆر نانی جۆ نەدەمایەوە، لە گێڕانەوەیەكی دیكەدا: لە بەردەم پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) سفر هەڵنەگیراوە كە خواردنی زیادەی لەسەر بووبێت[3].[4]

ترمزی لە ئەبوتەلحەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی و دەڵێت: سكاڵامان بردەلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەسەر برسێتی و كراسەكەمان بەرز كردەوە بەردمان لەسەر سكمان بەستبوو، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) كراسەكەی لاداو دوو بەردی لەسەر سكی بەستبوو.[5]

ئیبن ئەبی دونیا لە ئیبن بجیرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ڕۆژێكیان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تووشی برسێتی بوو چوو بەردێكی لەسەر سكی دانا، پاشان فەرمووی (الا رب نفس طاعمة ناعمة في الدنيا جائعة عالية يوم القيامة الا رب مكرم لنفسه وهو لها مهين، الا رب مهين لنفسه وهو لها مكرم)[6].[7]

---

[1] – صحيح.

[2] – له الترغيب ج٥ ص١٤٩ دا واهاتووه.

[3] – ضعيف.

[4] له الترغيب ج٥ ص١٥١ دا واهاتووه، هەیسەمی ج١٠ ص٣١٢ دەڵێت: بەزار هەندێكی گێڕاوەتەوە.

[5] – له الترغيب ج٥ ص١٥٦ دا وا هاتووه.

[6] – ضعيف.

[7] – له الترغيب و الترهيب ج٣ ص٤٢٢ دا هاتووه، خەتیبیش هێناویەتی، ئیبن مندەش هێناویەتی، له الاصابه ج٢ ص٤٨٦ دا هاتووه.

بوخاری لە (کتاب الضعفاء) و ئیبن ئەبی دونیا لە (کتاب الجوع) لە عائیشەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: یەکەم دەرد لە دوای پێغەمبەر (ﷺ) تووشی ئەم ئومەتە بوو تێری بوو چونکە ئومەت کە سکی تێر بوو لەشیان قەڵەو و دڵیان لاواز و ئارەزوویان هەڵدەچێت[1][2].

## (برسێتی پێغەمبەر (ﷺ) و بنەماڵەکەی و ئەبوبەکرو عومەر (رضي الله عنه))

تەبەرانی و ئیبن حەببان لە صەحیحەکەیدا لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: ئەبوبەکر (رضي الله عنه) لە گەرمادا چوو بۆ مزگەوت، عومەری کوڕی خەتاب (رضي الله عنه) بیستی وتی: ئەی ئەبوبەکر لەم کاتەدا بۆچی هاتوویتە دەرەوە؟ وتی: تەنها سەختی برسێتی وای لێ کردووم، عومەر وتی: بە خوا منیش هەر لەبەر ئەوەیە، لەم بارەدا بوون کە پێغەمبەریش (ﷺ) هات بۆلایان، فەرمووی لەم کاتەدا بۆچی هاتوونەتە دەرەوە؟ وتیان: تەنها برسێتی سکمان وای لێ کردووین، فەرمووی (سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە منیش هەروا، دەی هەستن) چوون تا گەیشتنە بەر دەرگای ئەبوئەیوبی ئەنصاری (رضي الله عنه) ئەبوو ئەییووب خواردن یان شیری دەهێنا بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، بەڵام ئەو ڕۆژە لە کاتی خۆیدا نەیهێنا و دای بە ماڵ و منالی خۆی و چوو بۆ باخەکەی خۆی تا ئیشی تیا بکات، کە هاتنە بەر درگاکە ئافرەتەکەی هاتە دەرەوە و وتی: مەرحەبا لە پێغەمبەری خوا و هاوڕێکانی، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو (ئەبوئەیوب لە کوێ یە؟ ئەویش کە لەناو دارخورماکاندا ئیشی دەکرد دەنگی بیست و خێرا هات و وتی: مەرحەبا لە پێغەمبەری خوا و هاوڕێکانی، جاران ئەم کاتە نەدەهات، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ڕاست دەکەیت، ئەبوئەیوب چوو بڕێك خورمای

---

[1] - ضعیف.
[2] - لە الترغیب ج٣ ص٤٢٠ دا وا هاتووە.

لـێ کـردەوەو هێنـای، پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی (مـا اردت الى هـذه الا جنيـت لنـا مـن تمره؟) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا حەزم کرد لەم خورمایە بخۆیت، ئەگەر نا ئاژەڵێکت بـۆ سـەردەبڕم، پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی (ئەگـەر سـەرت بـڕی شـیردەر سـەرمەبڕە) ئەویش چوو بەرخێکی هێنا و سەری بڕی بە ژنەکەی وت نانمان بۆ ئامادە بکە تۆ چاکتری لـێ دەزانـی، نـانی ئامـادەکردو هێنـایـە بـەردەم پێغەمبـەر (ﷺ) و هاوەڵـانی، پێغەمبـەر (ﷺ) هەنـدێکی لـێ جیـاکردەوەو فـەرمووی ئەبوئـەیوب ئـەوە بگەیەنـە بـە فاتمە چونکە چەند ڕۆژێکە شتی وای نەخواردووە، ئەبوئەیوبیش بردی بۆ فاتیمە، کە نانیان خواردو ئاویان خواردەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (خبز ولحم وتمر و بسر و رطـب) چـاوەکانی فرمێـسکیان ڕژانـد فـەرمووی (سـوێند بـە خـوا لەسـەر ئـەم بەخششانە لە ڕۆژی دواییدا لێپێچینەوە دەکرێن) هاوەڵانی لەسەر ئەوە الله اكبريان وت، فەرمووی (بل اذا اصبت مثل هذا فضربتم بايديكم فقولوا بسم الله، فاذا شبعتم فقولوا الحمد الله الذي اشبعنا وانعم فافضل فان هذا كفاف بهذا) کاتێك هەستا بە ئەبوئەیوبی فەرموو بەیانی وەرە بۆلامان، چونکە هەرکەسێك چاکەی لەگەڵ بکردایە حـەزی دەکـرد پاداشـتی بداتـەوە، ئەبوئـەیوب ئـەوەی نەبیـست، عومـەر پێـی وت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێکردی بەیانی بچیت بۆلای، بەیانی چوو بۆلای پێغەمبـەر (ﷺ) کەنیزەکەکەی خۆی پێداو فەرمووی (ئەبوئەیوب لەگەڵی چاکبە چونکە تا لای ئێمە بوو تەنها چاکەمان بۆ نیشان داوە) کە ئەوئەیوب لە پێغەمبـەر (ﷺ)ی وەرگت وتی: چاکترین شت بۆ بەدیهێنانی وەسیەتەکەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەیە ئازادی بکەم، بۆیە ئازادی کرد[1].[2]

بـەزارو ئەبویـەعلاو عوقـەیلی و ئـیبن مـردەو مەردەویـەو بەیهـەقی لـە الـدلائل و سەعیدی کوڕی مەنسور لە ئیبن عەبباسـەوە (رضي الله عنه) هێناویانە کە گوێی لە عومـەری

---

[1] – صحيح.

[2] – لە الترغيب ج٣ ص٤٣١ دا واهاتووە.

کوڕی خەتاب بوو (رضي الله عنه) دەیوت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نیوەڕۆیەك چوویە دەرەوەو سەیر دەکات ئەبوبەکر لە مزگەوتدایە، فەرمووی بۆچی لەم کاتەدا هاتوویتە دەرەوە؟ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەی تۆی هێناوەتەدەر بۆ منیش هۆکار هەمان شتە، عومەریش هات و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی ئەی ئیبن خەتاب تۆ چی وای لێ کردوویت بێیتە دەرەوە، وتی: هەمان هۆکاری ئێوە، ئینجا دانیشت و ڕوویکردە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و دەیدواندن، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (هل بكما قوة تنطلقان الى النخل فتصيبان طعاما و ترابا وطلا؟ قال: سيروا بنا الى منزل ابي الهيثم بن التيهان الانصاري) ئینجا بە دوورو درێژی فەرموودەکە دێنێت.[1]

تەبەرانی بە سەنەدی حەسەن لە فاتیمەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕۆژێك هات بۆلای و فەرمووی دوو کوڕەکەم – واتە حەسەن و حوسەین– لە کوێن؟ وتی: بەیانی هەستاین لە ماڵماندا هیچ نەبوو تا بیخۆین، عەلی (رضي الله عنه) وتی: دەیانبەم دەترسم بگرین بەسەرتدا و تۆش هیچت نەبێت، چوو بۆلای فڵان کەسی جوولەکە پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) چوو بۆ بەرە و ئەوێ سەیر دەکات لە حەوزێکدا یاری دەکەن و قاپێك خورمایان لەبەردەستدایە، فەرمووی (يا علي الا تقلب ابني قبل ان يشتد الحر؟) وتی: بەیانی هەستاین هیچ نەبوو لە ماڵماندا، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دانیشە، تا قاپێك خورما کۆ بکەمەوە بۆ فاتیمە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) دانیشت و دوایی چوون، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) یەکێکیانی هەڵگرت و (کوڕەکان) و ئەوی دیکەشیان بە عەلی بوو، تا بردنیانەوە.[2][3]

---

[1] – لە كنزالعمال ج٤ ص٤٠ دا هاتووە، موسلیم بە کورتی هێناویەتی، مونزیری ج٥ ص١٦٧ دەڵێت: وا دیارە ئەم چیرۆکە جارێك لەگەڵ ئەبولهەیسەم و جارێك لەگەڵ ئەبوئەیوبدا بووبێت.

[2] – ضعيف.

[3] – لە الترغيب ج٥ ص١٧١ دا واهاتووە،هەیسەمی ج١٠ ص٣١٦ دەڵێت: سەنەدەکەی حەسەنە.

هەناد لە عەتاوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: بیستم عەلی (رضي الله عنه) وتی: چەند ڕۆژێك هیچ لە ماڵی ئێمەو پێغەمبەریشدا (صلى الله عليه وسلم) نەبوو، منیش چووم دینارێك لەسەر ڕێ کەوتبوو، لەسەر خۆ هەڵمگرت و دوودڵ بووم ئایا هەڵی گرم یان نا، پاشان زۆرم لە خۆم کرد و هەڵمگرت، هاتم بۆلای کڕیاران و فرۆشتم و گەنمم پێ کڕی و هێنامەوە بۆ فاتیمە (رضي الله عنها) وتم: بیهاڕەو بیکە هەویرو بیبرژێنە، هاتم بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و پێم وت چی بووە؟ فەرمووی (بیخۆن چونکە ئەوە ڕۆزیەك بوو خوای گەورە پێی بەخشین).[1]

ئەحمەد لە موحەمەدی کوڕی کەعبی قرظیەوە هێناویەتی عەلی (رضي الله عنه) وتی: لەگەڵ پێغەمبەر دا(صلى الله عليه وسلم) بووم و لەتاو برسێتیدا بەردم بەستبوو لە سکم و ئەمڕۆ خەرجی ماڵم دەگاتە چل هەزار دینار، لە گێڕانەوەیەکی تردا خەرجی ئەمڕۆم چل خەزارە، کەسانی هەردوو گێڕانەوەکە صەحیحن جگە لە شورەیکی کوڕی عەبدوڵلای نەفەعی کە فەرموودەی حەسەنە، بەڵام لەوەی موحەمەدی کوڕی کەعب لە عەلی (رضي الله عنه) بیستبێتی گومان هەیە[2].[3]

تەبەرانی لە ئوم سەلیمەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو (خۆ ڕاگرە، سوێند بە خوا حەوت ڕۆژ لە ماڵی موحەمەددا هیچ نەبووە، ماوەی سێ ڕۆژ لە ئاگرداندا ئاگر نەکراوەتەوە بۆیان، سوێند بە خوا ئەگەر داوا لە خوا بکەم شاخی تیهامە هەمووی بکات بە زێڕ دەیکات)[4].[5]

---

[1] –عەدنی لە موحەمەدی کوڕی کەعبی قرظیەوە بە دوورو درێژی هێناویەتی، لە الكنز العمال ج٧ ص٣٢٨ دا هاتووە، ئەبوداود ج١ ص٢٤٠ لە سەهلی کوڕی سەعدەوە (رضي الله عنه) بە دوورو درێژی هێناویەتی.

[2] – ضعیف.

[3] – لە مجمع الزوائد هەیسەمی ج٩ ص١٢٣ دا واهاتووە.

[4] – ضعیف.

[5] – لە الكنز العمال ج٤ ص٤٢ داواهاتووە.

## (برسێتی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (رضي الله عنه))

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٩٣ لە سەعدەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئێمە کۆمەڵێك بووین لە مەککە لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) سەختی و ناڕەحەتی ژیانمان دەهاتە ڕێ، کاتێك سەختیمان دەهاتە ڕێ خۆمان دەگرت و لەسەری دەچووین، لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) بووم لە مەککە چوومە دەرەوە تا میز بکەم کە گوێم لە تەقەی شتێك بوو لە ژێر میزەکەدا، سەیرم کرد پارچە پێستێکی وشترە، هەڵمگرت وشۆردم و دوایی سوتاندم و خستمە نێوان دوو بەرد، پاشان بەبێ پێچانەوەی هەڵمگرت و ئاوم لەسەر خوارد و پێی ژیام.

بوخاری و موسلیم لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: من یەکەم عەرەب بووم کە لە ڕێی خوادا تیرم وەشاند،لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) غەزامان دەکرد و نان نەبوو بیخۆین جگە لە (ورق الحبلة) کە ئەویش هێندە ڕەق و وشك بوو تێکەڵ نەدەبوو.[1]

## (برسێتی مقدادی کوڕی ئەسوەد(رضي الله عنه) و دوو هاوڕێکەی (رضي الله عنهم))

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص١٧٣ لە میقدادی کوڕی ئەسوەدەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: من و دوو هاوڕێم کە لەتاو هیلاکیدا خەریکبوو چاو و گوێمان لە دەست دەدا هاتین و خۆمان دەخستە بەردەم هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەڵام کەسیان قبوڵیان نەکردین تا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بردینی بۆلای خۆی – ماڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سێ بزنیان هەبوو شیریان لێ وەردەگرتن – پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە نێوانماندا شیرەکەی دابەش دەکرد و ئێمەش بەشەکەی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) هەڵدەگرت، ئەویش دەهات و سەلامێکی دەکرد کە بێدار دەیبیست و خەوتوو پێی بێدار نەدەبوویەوە، شەیتان پێی

[1] –لە الترغیب ج٥ ص١٧٩ دا وا هاتووە، ئەبونەعیمیش لە الحلیە ج١ ص١٨ دا و ئیبن سەعدیش ج٣ ص٩٩ بەو شێوەیە هێناویانە.

وتم: با ئەوەشت بخواردایەتەوە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەچێت بۆلای پشتیوانان و ئەوان ئاگایان لێیە، هێندەی پێ وتمەوە تا خواردمەوە، هەرکە خواردمەوە پەشیمانی بۆ نیشان دام و وتی: چیت کرد؟ موحەمەد دێت و شیرەکەی نیەو نزات لێ دەکات و قوڕ دەبێت بەسەرتدا، دوو هاوڕێکەشم بەشەکەی خۆیان خواردەوەو خەوتن، بەڵام من خەوم لێ نەکەوت، بەرگێکم پێ بوو، دابووم بەسەر خۆمدا کەچی پێکانم دەرکەوتبوون، ئەگەر بمدایە بەسەر پێکانمدا سەرم دەردەکەوت، پێغەمبەر (ﷺ) هات و نوێژێکی زۆری کرد، دواتر سەیری خواردنەوەکەی کرد هیچی بۆ نەمابوو، دەستی بەرز کردەوەو وتم ئێستا نزام لێ دەکات و لەناودەچم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (اللهم اطعم من اطعمني واسق من سقاني) ئینجا چەقۆکەم هەڵگرت و بەرگەکەم برد و چووم بۆلای بزنەکەو سەیرم کرد بزانم کامیان قەڵەون تا سەری ببڕم بۆ پێغەمبەر (ﷺ) سەیر دەکەم هەموویان پڕ شیرن، قاپێکی ماڵی پێغەمبەرم (ﷺ) هەڵگرت کە تیایدا نان و شیریان دەخوارد، دۆشیم تا چەوریەکەی سەرکەوت، پاشان هاتمە لای پێغەمبەر (ﷺ) و لێی خواردەوە، پاشان دای بە منیش، منیش لێم خواردەوە، پاشان دامەوە پێی و ئەویش لێی خواردەوە، ئەویش دایەوە بە من و لێم خوادەوە، دواتر هێندە پێکەنیم تا کەوتمە سەر زەوی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (احدى سوواتك يا مقداد) منیش هەستام و پێم وت چیم کردووە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ما كانت الا رحمة من الله عز وجل لو كنت ايقظت صاحبك فاصابها منها) واتە(ئەوە ڕەحمەتی خوا بوو، بریا دوو هاوڕێکەتت بێدار دەرکردەوە تا لێی بێبەش نەبن) لە ڕێگەی میقدادیشەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك لە مەدینە دابەزین دە دە لای پێغەمبەر (ﷺ) دابەش بووین، من لەناو ئەو دەکەسەدا بووم کە پێغەمبەری(ﷺ) تێدابوو، تەنها مەڕێکمان هەبوو شیرەکەیمان دابەش دەکرد[1].[2]

---

[1] – صحيح.

[2] – لە الحلية ج١ ص١٧٤ دا هاتووە.

## (برسێتی ئەبوهورەیرە (رضي الله عنه))

ئەحمەد لە موجاهیدەوە هێناویەتی ئەبوهورەیرە (رضي الله عنه) دەیوت: سوێند بە خوا لەتاو برسێتیدا خۆم دەدا بە زەویدا، لەتاو برسێتیدا بەردم دەبەست لە سکم، ڕۆژێکیان لەسەر ڕێیدا دانیشتم و ئەبوبەکر (رضي الله عنه) دای بە پاڵمدا، پرسیارم لێکرد لەسەر ئایەتێکی قورئان، هات و پرسیارم لیَ کرد تا بڵێت وەرە لەگەڵم، کەچی نەیوت، عومەریش هات و هەروا بوو، پاشان ئەبولقاسم (رضي الله عنه) هات و زانی چی لە ڕوخسارو دەروونمدا دیارە و فەرمووی ئەبوهورەیرە، وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی (الحق) مۆڵەتم وەرگرت و مۆڵەتی پێدام، لە قاپێکدا بڕێك شیرم بەدی کرد، فەرمووی ئەم شیرەتان لە کوێ بوو؟ وتیان: فڵان کەس بۆی هێناین، فەرمووی (ئەبوهورەیرە) وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەر (ﷺ)، فەرمووی (انطلق الى اهل الصفة فادعهم لي) واتە(بڕۆ بۆلای ئەهلی صوففە و بانگیان بکە بۆم)[1] ئەهلی صوففە میوانانی ئیسلام بوون و بەرەو لای ماڵ و منداڵ نەدەچوون، کە پێغەمبەر (ﷺ) دیاریەکی بۆ بهاتایە بەشی دەدان و بەشی بۆ دەناردن، ئەگەر صەدەقەی بۆ بهاتایە هەمووی بۆ دەناردن و خۆی هیچی لیَ هەڵنەدەگرت، ئەمە منی خەفەتبار کرد و هیوام وابوو هێندە لەو شیرە بخۆمەوە بەرگەی شەو و ڕۆژێکی پیَ بگرم، وتم: من نێردراوم، ئەگەر هاتن من پێیان دەدەم و لەم شیرە هیچم بۆ نامێنیَ، ناشکرێت بە گوێی فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی نەکەم، چووم و بانگمکردن ئەوانیش هاتن و مۆڵەتیان وەرگرت پێغەمبەر (ﷺ) مۆڵەتی پێدان و دانیشتن، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ئەی ئەبوهورەیرە بیهێنە و پێیان بدە) منیش جامەکەم هێنا و شیرەکەم پیَ دەدان، هەرکامیان لێی دەخواردەوە تا ئەوەی هەموویان تەواو بوون، پاشان بردمەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، جامەکە (سەتڵەکە) ی خستە بەردەستی و کەمێکی تیا مابوو، سەری بەرزکردەوە و سەیری

---

[1]- ئەمانە کۆچەرە هەژارەکان بوون کە ماڵی نیشتەجێبوونیان نەبوو، لە کونجێکی مزگەوتدا بوون و سەرقاڵی پەرستش و وەرگرتنی قورئان و فەرموودە و هەندیَ کاری تر بوون.

کـردمو زەردەخەنەیـەکی کـردو فـەرمووی ئـەی ئـەبوهورەیرە، وتم: بـەڵێ ئـەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، فەرمووی منو تۆ ماوین، وتم: ڕاست دەفەرمویت، فەرمووی دەی دابنیشە بنۆشە، من دانیشتمو خواردمەوە، پاشان فەرمووی بنۆشە، منیش خواردمەوە، بەردەوام وای پێ دەفەرمووم تا وتم: نا بەسە سوێند بەو کەسەی بە حەق تۆی ناردووە ئیتر ناتوانم، فەرمووی (ناولني القدح) دەی بیدە بە منو منیش پێمداو خۆیشی لێی خواردەوە.[1]

ئیبن حەببان لە صەحیحەکەیدا لە ئەبوهورەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: سێ ڕۆژم بەسەردا تێپەڕی و هیچ نەبوو بخۆم، چووم بۆ لای ئەهلی صوففەو خەریکبوو دەکەوتم، منداڵان دەیانوت ئەبوهورەیرە شێت بووە، منیش بانگم دەکردنو دەموت خۆتان شێتن، تا گەیشتمە ئەوێ، دەبینم دوو قاپ تریت هێنرا بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، خەڵکی صوففەی بانگکردو لێیان خوارد، منیش دەمویست بانگم بکات، تا هەموو هەستانو تەنها کەمێك مابوویەوە، پێغەمبەر (ﷺ) کۆی کردەوەو بوو بە تیکەیەكو لەسەر پەنجەکانی هەڵیگرتو پێی فەرمووم بە ناوی خواوە بیخۆ، سوێند بەوکەسەی گیانمی بە دەستە کە خواردم تێربووم.[2][3]

بوخاریو ترمزی لە ئیبن سیرینەوە هێناویانە دەڵێت: لای ئەبوهورەیرە بووینو دوو جلی ڕەنگ خۆڵ سووری کەتانی لەبەردابوو، دەستی کرد لە کراسێکیانو وتی: بەخ بەخ ئەبوهورەیرەو کەتان، سوێند بە خوا لە نێوان مینبەری پێغەمبەر (ﷺ) و ژوورەکەی عائیشەدا (رضي الله عنها) دەکەوتمو هیلاك کەوتبووم کەسێك دەهاتو پێی دەنا بە ملمداو وای دەزانی شێت بووم تەنها برسێتیش وای لێ کردبووم.[4]

---

[1] – بوخاری هێناویەتی، ترمزی هێناویەتیو دەڵێت صەحیحە، لە البداية والنهاية ج٦ ص١٠١ هاتووە، حاکم هێناویەتیو دەڵێت: لەسەر مەرجی بوخاریو موسلیم صەحیحە.

[2] – ضعیف.

[3] – لە الترغیب ج٥ ص١٧٦ دا واهاتووە.

[4] – لە الترغیب ج٣ ص٣٩٧ دا واهاتووە.

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٢٧٨ دا و عەبدولڕەزاق بە هەمان شێوەو ئیبن سەعد ج٤ ص ق٢ ص٥٣ هێناویەتی و ئەوەشی بۆ زیاد دەکات: من بۆ خواردنی سکم پەنام بردە بەر ئیبن عەففان و کچەکەی غەزوان (بەسرە)، ڕەشوەی وڵاخەکەم بۆ دەگرتن لە کاتی سواربووندا و خزمەتم دەکردن کاتێك دادەبەزین، ڕۆژێك ئافرەتەکە پێی وتم: بەپێی پێخاوس دەیهێنیتەوەو بە وەستاوی سواری دەبیت، دواتر خواکردی بە هاوسەرم، پێم وت دەبێت وابکەیت لە گێڕانەوەکەی ئیبن سەعددا لە سەلیمی کوڕی حەببانوە دەڵێت: گوێم لە باوکم بوو دەیوت: گوێم لە ئەبوهورەیرە (رضي الله عنه) بوو دەیوت: بە هەتیوی گەورە بووم و بە هەژاری کۆچم کردو بۆ نانی سکم لە خزمەت بەسرەی کچی غەزواندا بووم، کە دادەبەزین لە خزمەتیاندا بووم، سواریش دەبوون هەروا، تا خواکردی بە هاوسەرم، سوپاس بۆ خوا کە ئایینی ڕاستاڵ و ئەبوهورەیرەی بە پێشەوا دانا.[1]

ئەحمەد – گێڕەرەوەکانی صەحیحن– لە عەبدوڵلای کوڕی شەقیقەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ ئەبوهورەیرەدا (رضي الله عنه) لە مەدینە ساڵێك مامەوە، ڕۆژێك پێی وتم: ئێمە لای ژووری عائیشەدا (رضـي الله عنـه) بووین، جلمان نەبوو، جلی کۆن و خراپ نەبێت، هەمانبوو ڕۆژی بەسەر دەبردو هێندە نانی نەبوو پێی بژێت تا ئەوەی بەردی هەڵدەگرت و دەیبەست لە سکی، پاشان جلەکەی توند دەکردەوە تا پشتی ڕاست ببێتەوە،[2] ئەحمەد هێناویەتی دەڵێت: نانمان لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) خورما و ئاو بوو، سوێند بە خوا ئەم گەنمەی ئێوەمان نەدەدی و نەماندەزانی چیە، جلمان لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) بەرگی دەشتەکیەکان بوو.[3][1]

---

[1] – ضعیف.

[2]– لە الترغیب ج٥ ص١٧٧ دا هاتووە، هەیسەمی ج١٠ ص٣٢١ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن،

[3] – صحیح.

# برسێتی ئەسمای کچی ئەبوبەکر (رضي الله عنه)

تەبەرانی لە ئەسمای کچی ئەبوبەکرەوە (رضـي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: جارێکیان لە خاکی بەنی نەزیردا لە زەویەکدا بووین کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بڕیبوویەوە بۆ ئوم سەلەمە، زوبەیر لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) چوو و دراوسێیەکی جوولەکەشمان هەبوو، مەڕێکی سەربڕی و لێینا و بۆنەکەی هات بەسەرمدا و ئەوەی هەرگیز بە خەیاڵمدا نەدەهات هات بەبیرمدا، سکم پڕبوو بە خەدیجەی کچمەوە، خۆم نەگرت و چووم بۆلای ژنە جوولەکەکە و داوای کەمێك ئاگرم لێکرد و وتم: بەڵکو کەمێك خواردنم بەش بدات ئەگینا هیچ پێویستم بە ئاگر نەبوو، کە بۆنم کرد و بینیم زیاتر حەزم چوویە سەری و جارێکی تر چوومەوە، جاری سێیەمیش چوومەوە، پاشان دانیشتم و گریام و لە خوا پاڕامەوە، مێردی ژنە جوولەکەکە هات و وتی: ئەمڕۆ کەس هاتوە بۆلاتان؟ وتی: ژنە عەرەبەکە بۆ ئاگر هات، وتی: هەرگیز لێی ناخۆم تا خواردنی بۆ نەنێریت، ئەویش جامێکی بۆ ناردم، لە دونیادا هیچ خواردنێك هێندەی ئەوە تامی نەبوو لەلام[2].[3]

---

[1]- هەیسەمی ج١ ص٣٢١ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن، بەزاریش بە کورتی گێڕاویەتیەوە. تەواو.

[2] - ضعيف.

[3]- لە الاصابة ج٤ ص٢٨٤ دا هاتووە. هەیسەمی ج٨ ص١٦٦ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا ئیبن لهیعە هەیە و فەرموودەی حەسەنە، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە صەحیحن. تەواو.

# (برسێتی گشتی هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم))

ئەبونەعیم لە ئەبوجیهادەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی کە کوڕەکەی پێی وت: بابە گیان ئێوە لەگەڵ پێغەمبەر دا(صلى الله عليه وسلم) بوون و هاودەمی بوون، سوێند بە خوا ئەگەر من دەمبینی ئەوە و ئەوەم دەکرد، باوکی پێی وت: لەخوا بترسە و ڕاست بکە، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە شەوی خەندەق لەگەڵیدا بووین و دەیفەرموو (کێ دەچێت هەواڵی ئەوانمان بۆ بێنێت لە ڕۆژی دواییدا خوا دەیکاتە هاوڕێم) کەس لە تاو برسێتی و هیلاکیدا هەڵنەسا، سێ جار هاواری کرد، ئینجا فەرمووی حوزەیفە تۆ.[1] [2]

بەزار بە سەنەدی جەید لە ئیبن مەسعودەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) برسێتی ناو ڕوخساری هاوەڵانی بینی و فەرمووی (ابشروا فانه سياتي عليكم زمان بغدي على احدكم بالقصعة من الثريد و يراح عليه بمثلها) وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە ئەمڕۆ باشترین، فەرمووی (بل انتم اليوم خير منكم يومئذ)(بەڵکو ئەمڕۆ لەو ڕۆژە باشترن)[3] [4].

ئیبن ئەبی دونیا بە سەنەدی جەید لە موحەمەدی کوڕی سیرینەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لەناو هاوەڵاندا هەبوو سێ ڕۆژ هیچی نەبوو بیخوات، دەچوو پێستی دەهێنا و دەیبرژاند و دەیخوارد، ئەگەر هیچی دەست نەکەوتایە بەردێکی دەبەست لە سکی.[5] [6]

---

[1] – ضعيف.

[2] – دولابی لەم ڕووەوە هێناویەتی، لە الاصابة ج٤ ص٣٥دا هاتووە، دواتر فەرموودەکەی حوزەیفە (رضي الله عنه) بە دوورو درێژی دێنین.

[3] – صحيح.

[4] – لە الترغيب ج٣ ص٤٢٢ دا واهاتووە.

[5] – حسن.

[6] – لە الترغيب ج٥ ص١٧٩ دا واهاتووە.

ترمزی بە صەحیحی داناوەو هێناویەتی وئیبن حەببانیش لە صەحیحەکەیدا لە فەزالەی کوڕی عوبەیدەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە نوێژی دەکرد بۆ خەڵك هەیانبوو لە برسێتیدا دەچەمیەوە، ئەوانە ئەهلی صوففە بوون تا دەشتەکیەکان دەیانوت ئەوانە شێتن، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نوێژەکەی دەکرد سەیری دەکردن و دەیفەرموو (ئەگەر بزانن لای خوا چ پاداشتێکتان بۆ هەیە حەزتان دەکرد پێویستی و سەختیتان زیاد بکات)[1][2].

تەبەرانی لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: حەوت کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) یەك خورمایان هەبوو و گەڵاکەیان دەخوارد تا لێوەکانیان وەرەمیان دەکرد[3][4].

ئیبن ماجە بە سەنەدی صەحیح لە ئەبوهورەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی حەوت کەس بوون و برسێتییان تووش بووە، وتی: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) حەوت خورمای پێدام، هەرکاممان و خورمایەکمان خوارد[5][6].

ئیبن سەعد ج٤ ص٣٢٩ لە ئەبی هورەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ڕۆژێکیان لەماڵەوە بەرەو مزگەوت دەچووم، تەنها برسێتی وای لێکردم بچم، دەستەیەکی هاوەڵانم دی وتیان: ئەبوهورەیرە لەم کاتەدا بۆچی هاتوویتەتە دەرەوە؟ وتم: برسێتی، وتیان: سوێند بەخوا ئێمەش هەروا، هەستاین و چووین بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (ماجاء بكم هذه الساعة؟) واتە(لەبەرچی لەم کاتەدا هاتوون؟) وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا برسێتی وایکردووە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) داوای بڕێك (هۆشێك)

---

[1] – صحيح.

[2] لە الترغيب ج٥ ص١٧٦ دا واهاتووە، ئەبونەعیم بە کورتی لە الحلية ج١ ص٣٣٩ دا هێناویەتی.

[3] – ضعيف.

[4] – هەیسەمی ج١٠ ص٣٢٢ دەڵێت: لە سەنەدەکەیدا خولەیدی کوڕی دەعلەج هەیە کە لاوازە.

[5] – صحيح.

[6] – الترغيب والترهيب ج١ ص١٧٨.

خورمای کردو هەریەکەمان دوو خورمای پێ داین و فەرمووی (کلوا هاتین التمرتین واشربوا علیهما من الماء فانهما ستجزیانکم یوکم هذا) واتە(ئەو دوو خورما بخۆن و ئاوی بە دوادابخۆنەوە بەشی ئەمڕۆتان دەکات، ئەبوهورەیرە دەڵێت: منیش یەکێکیانم خواردو یەکێکیانم هەڵگرت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ئەبوهورەیرە بۆ ئەو خورمایەت هەڵگرت؟) وتم: بۆ دایکم، فەرمووی (بیخۆ دوو خورماشت دەدەینێ بۆ دایکت) ئینجا دوو خورمای پێ دام بۆ دایکم.[1]

بوخاری لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) چوو بۆلای خەندەقەکەو سەیری کرد کۆچەران و پشتیوانان لە بەیانیەکی سارددا خەندەق هەڵدەکەنن و کۆیلەیان نیە ئەو کارەیان بۆ بکات، کە برسێتی و سەختی باری هاوەڵانی بینی فەرمووی:

اللهم ان العیش عیش الاخرة     فاغفر للانصار و المهاجرة

ئەوانیش وەڵامیان دایەوە:

نحن الذین بایعوا محمدا     علی الجهاد ما بقینا ابدا[2]

هەروەها بوخاری لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کۆچەرو پشتیوانان لە دەوری مەدینەدا خەندەقیان لێدەدا و لەسەر شانیان خۆڵیان دەگواستەوەو دەیانوت:

نحن الذین بایعوا محمدا     علی الاسلام ما بقینا ابدا

پێغەمبەریش (ﷺ) دەیفەرموو:

اللهم انه لا خیر الا خیر الاخرة     فبارك في الانصار والمهاجرة

دوو مشت گەنمیان دەهێناو بە ڕۆن بۆیان چەور دەکراو دەخرایە بەردەستیان، ئەوانیش برسی بوون و خواردنەکەش چاك قووت نەدەدراو بۆنێکی ناخۆشی هەبوو.[1,2]

---

[1] – ضعیف.

[2] – صحیح.

بوخاری لە جابرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە ڕۆژی خەندەقدا سەرقاڵی هەڵکەندن بووین، پارچەیەکی ڕەق هاتە ڕێمان، هاتن بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و وتیان ئەمە هاتۆتە ڕێمان، فەرمووی (من دادەبەزم) هەستاو بەردێکی لە سکی بەستبوو، سێ ڕۆژ هیچمان نەخواردبوو، ئینجا فەرموودەکە دێنێت، تەبەرانی لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)لەگەڵ هاوەڵانیدا خەندەقیان هەڵدەکەندو بەردیان بەستبوو لە سکیان لەتاو برسێتیدا، ئینجا فەرموودەکە دێنێت، ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص١٧٩ لە عەبدوڵڵای کوڕی عامری کوڕی ڕەبیعەوە لە باوکیەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەسریەیەکەوە دەیناردین و تەنها بڕێك خورمامان هەبوو، بەرپرسی سریەکەش لە نێوانماندا دابەشی دەکرد تا دەبوو بە دەنکە دەنکەی خورما، دەڵێت: وتم چەند خورما دەبوون؟ وتی: کوڕی شیرینم ئەوە مەڵێ، ئەحمەدو بەزارو تەبەرانی هێناویانە.[٣]

بەیهەقی لە جابرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناردینی و ئەبوعوبەیدەی (رضي الله عنه) کرد بە بەرپرسمان، گەیشتینە کاروانێکی قورەیش و کۆمەڵێك خورمامان لێوەرگرت، ئەبوعوبەیدە خورما خورما پێی دەداین، دەڵێت وتم: چیتان پێ دەکرد؟ وتی: دەمانکوتا و دەمانکردنە ناو ئاو و دەمانخوارد، ئینجا فەرموودەکە دێنێت،[٤] لای مالیك دەڵێت: وتم: خورمایەك چ سودێکی هەبوو؟ وتی: کاتێك نەدەما ئینجا نرخمان دەزانی.

---

[١] – ضعیف.

[٢] – لە البدایة والنهایة ج٤ ص٩٥ داواهاتووە.

[٣] – هەیسەمی ج١٠ ص٣١٩ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا مەسعودی هەیە کە شت تێکەڵ دەکات، متمانەی لەسەر بوو.

[٤] – لە البدایة والنهایة ج٤ ص٢٧٦ دا واهاتووە، مالیك و بوخاری و موسلیم و کەسانی دیکەش هێناویانە و لە گێڕانەوەکەیدا هاتووە کە سێ سەد کەس بوون، تەبەرانی هێناویەتی و تیایدا هاتووە شەش سەد کەس بوون، هەیسەمی ج١٠ ص٣٢٢ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا زەمعەی کوڕی صالح هەیە کە لاوازە،

بەزارو تەبەرانی – کەسەکانی سەنەدەکە جێ متمانەن– لە ئەبوحوبەیشی غەفاریەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی لە غەزای تیهامەدا لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو، کە گەیشتینە ناو خەیمەکان هاوەڵان هاتن بۆلای و وتیان ئەی پێغەمبەری خوا تەواو برسیمانە دەی مۆڵەتمان بدە با ئاژەڵەکانمان سەر ببڕین و بیخۆین، فەرمووی باشە، ئەم هەواڵە درا بە عومەر (رضي الله عنه) و هاتە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا چیت کردووە؟ فەرمانت کردووە خەڵك ئاژەڵەکانیان سەربڕن ئەی ئیتر سواری چی ببین؟ فەرمووی (فما تری یا ابن الخطاب؟) واتە(ئەی چارە چیە ئەی ئیبن خەتاب؟) وتی: دەڵێم زیادەی شمەکیان بێنن و لە قاپێکدا کۆی بکەیتەوە و نزای بەسەردا بخوێنیت، ئەویش وایکرد و هەموو کۆیان کردەوە و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نزای بۆ کردن و دوایی فەرمووی (ائتوا باوعیتکم) واتە(قاپ و قاچاخەکانتان بهێنن) هەرکامیان قاپەکەی پڕبوو، فەرموودەکە دێنێت.

ئەبویەعلا لە عومەری کوڕی خەتابەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) لە غەزایەکدا بووین وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا دوژمن هاتوە و تێرە و ئێمەش برسین، پشتیوانان دەڵێن دەکرێت وشترەکانمان سەربڕین و دەرخواردی خەڵکیان بدەین، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (هەرکەس خواردنێکی زیادەی لایە با بیهێنێت) هەرکەسە و بە مشت و دوو مشت و کەمترو زیاتر دەیهێنا هەموو بیست و ئەوەندە ساع بوو، لە پاڵیدا دانیشتوو نزای بەرەکەتی بەسەردا خوێند، فەرمووی (خذوا ولا تنتهبوا) واتە(لێی هەڵبگرن و تاڵانی مەکەن) هەرکەسە و بڕی خۆی دەرکە چاکی و دەچوو تا ئەوەی چاکی پڕدەکرد و هەموو تەواو بوون و خواردنەکە وەك خۆی وابوو، پاشان فەرمووی (اشهد ان لا اله الا الله واني رسول الله لا یاتي بها عبد محق الا وقاه الله حر النار)[1][2].

---

[1] – ضعیف.

[2] – هەیسەمی ج٨ ص٣٠٤ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا عاصمی کوڕی عوبەیدوڵلای عومەر هەیە کە (العجلي) متامنەی پێ دەدات، کۆمەڵێك بە لاوازی دەزانن، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە جێ متمانەن. تەواو.

بوخاری لە سەهلی کوڕی سەعدەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئافرەتێکمان لەگەڵ بوو کە لە کێڵگەکەیدا (سلق) ی دەچاند، لە ڕۆژی هەینیدا تۆوەکەی دەتەکاندو لە قاپێکدا دایدەنا، پاشان بڕێك گەنمی دەهێنا و دەیهاڕی و لەگەڵ ئەوی تردا تێکەڵی دەکرد، سەهل دەڵێت: لە دوای نوێژی هەینی دەچووین و سەلاممان لێ دەکردو ئەویش ئەو خواردنەی بۆ دەهێناین، ئێمەش لەبەر ئەو خواردنەی هیوامان بە هەینی دەخواست، لە گێڕانەوەکەیدا: چەوری و بەزی تێدا نەبوو، بە ڕۆژی هەینی دڵخۆش دەبووین.[1]

ئیبن سەعد ج٤ ص٣٦ لە ئیبن ئەبی ئەفاوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ دا حەوت غەزامان کردو تیایدا کولەکەمان دەخوارد.[2]

تەبەرانی – گێڕەرەوەکانیشی صەحیحن– لە ئەبی بەرزەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە غەزایەکماندا بووین، کەسانێکی بێباوەڕمان پێگەیشتن. لە بارگەو بنەیەکیان ڕاوەدوومان نان و چووینە سەر خواردنەکەیان و لێمان خوارد، لە سەردەمی نەفامیدا بیتبوومان هەرکەس نان بخوات قەڵەو دەبێت، کە لێمان خوارد هەرکاممان سەبری ورگی دەکرد بزانین قەڵەو بووە؟[3].[4] هەیسەمی ج١٠ ص٣٢٤ دەڵێت: لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە لە ڕۆژی خەیبەردا لەگەڵ بووین دوژمنمان بەسەر خواردنێکیان (نان) ڕاپەڕاندو دەرمانکردن،[5] ئەبونەعیمیش لە الحلية ج٦ ص٣٠٧ لە ئەبوهەرەیرە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کە خەیبەرمان فەتح کرد دامان بەپاڵ هەندێ جوولەکەدا نانیان دەکرد ڕاوەدوومان نان و نانەکەمان دابەش کرد، من پارچەیەکم بەرکەوت کە هەندێکی سووتابوو، بیستبووم هەرکەس نان بخوات قەڵو دەبێت، کە خواردم سەیری ورگم کرد بزانم قەڵەو بووم؟

---

[1] – لە الترغيب ج٥ ص١٧٣ دا واهاتووە.

[2] – ئەبونەعیم لە الحلية ج٧ ص٢٤٢ لە ئیبن ئەبی ئەوفاوە (رضي الله عنه) بەو شێوە هێناویەتی.

[3] – ضعيف.

[4] – لە الترغيب ج٥ ص١٧٧ دا واهاتووە،

[5] – تەبەرانی هێناویەتی و کەسەکانی صەحیحن، تەواو.

## (خۆگری لەسەر تینویەتی لە پێناو بانگەوازی ڕێی خوادا)

ئیبن وەهب لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی بە عومەری کوڕی خەتاب (رضي الله عنه) وترا: لەسەر ڕۆژی سەختی قسەمان بۆ بکە (ساعة العسرة) وتی: لە گەرمایەکی سەختدا چووین بۆ تەبووك و لە شوێنێك دابەزین و تەواو تینوومان بوو تا ئەوەی وامان زانی ملمان لە لەشمان جیا دەبێتەوە، هەرکاممان دەگەڕا هیچی دەست نەکەوت و وای گومان دەبرد کوێرایی دێت لە تینوویەتیدا، هەموو وشترەکەی سەردەبڕی و ئاوەکەی دەگرتەوە و دەیخواردەوە، ئەبوبەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دەزانی خوای گەورە نزات وەردەگرێت دەی نزامان بۆ بکە، فەرمووی (حەز دەکەیت؟) وتی: بەڵێ، ئەویش دەستەکانی بەرەو ئاسمان بەرزکردەوە و دەستەکانی دانەنایەوە تا نەمەی باران هات و زیادی کرد و چییان پێ بوو پڕیانکرد، پاشان چوون، دەبینین بارانەکە تەنها لەو شوێنە بووە[1][2].

ئەبونەعیم و ئیبن عەساکیر لە حەبیبی کوڕی ئەبی سابتەوە (رضي الله عنه) هێناویانە حارسی کوڕی هیشام و عکرمەی کوڕی ئەبوجەهل و عەیاشی کوڕی ئەبی ڕەبیعە (رضي الله عنه) لە ڕۆژی یەرمووك بریندار بوون تا ئەوەی نەیاندەتوانی بجوڵێن، حارس داوای ئاوی کرد، عەکرەمە سەیری کرد، وتی: بیدە بە عەکرەمە، کە عەکرەمە وەری گرت عەیاش سەیری کرد عەکرەمە وتی بیدە بە عەیاش، کە گەیاندیە لای عەیاش گیانی سپارد، کە دەگەڕایەوە بۆلای هەرکام لەوانی دی ئەوانیش گیانیان سپارد[3].

---

[1] - صحیح.

[2] - سەنەدەکەی جەیدە، ئەوانی دی نەیانهێناوە، لە البداية والنهاية ج٥ ص٩ دا هاتووە، ئیبن جەریریش لە یونسەوە لە ئیبن وەهبەوە بەو سەنەدە هێناویەتی، لە تەفسیری ئیبن کەسیر ج٢ ص٣٩٦ دا اهاتووە، بەزارو تەبەرانی (المعجم الاوسط) هێناویانە، کەسەکانی سەنەدەکەی بەزار جێ متمانەن، ئەمە قسەی هەیسەمیە ج٦ ص١٩٤.

[3] - لە کنزالعمال ج٥ ص٣١٠ دا واهاتووە، حاکم لە المستدرك ج٣ ص٢٤٢ بەو جۆرە هێناویەتی، زوبەیر لە مامیەوە لە باپیریەوە لە عەبدوڵلای کوڕی مەصعەبەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی و بەو واتایە باسی دەکات بەڵام لە

تەبەرانی لە موحەمەدی کوڕی حەنیفەوە (ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: ئەبوعەمری ئەنساریم (ﷺ) دی – لە بەدرو عەقەبەو جودوددا بەشدار بووە– بە ڕۆژوو بوو لە تاو تینویەتیدا پێچی خۆی دەداو بە غوڵامەکەی دەوت قوڕبەسەر دەی قەڵغانم بۆ ببەستە، ئەویش بۆی بەست، پاشان سوکێك تیرێکی وەشاندو گەیاندیە سێ تیر، پاشان وتی: گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو دەیفەرموو (من رمي بسهم في سبيل الله قصرا وبلغ كان له نورا يوم القيامة) واتە(هەرکەس لە پێناو خوادا تیرێك بهاوێژێت، بگات یان نەگات لە ڕۆژی دواییدا ڕووناکی بۆ هەیە) لە پێش ئاوابوونی خۆردا کوژرا[1]،[2] حاکم ج٣ ص٣٩٥ دەڵێت: لە گێڕانەویەکدا هاتووە: قوڕت بەسەر ئاوڕشێنم بکە، ئەویش ئاوڕشێنی کرد.

## (خۆگری لەسەر سەختی سەرما لە پێناو بانگەوازی ڕێی خوادا)

ئەحمەدو نەسائیو تەبەرانی لە ئەبوڕەیحانەوە (ﷺ) هێناویانە دەڵێت: لە شەڕێکدا لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) بووە، دەڵێت: شەوێکیان چووینە شوێنێكو زۆر سەرمامان بوو تا ئەوەی کەسی وا هەبوو چاڵی هەڵدەکەندو دەچوویە ناویەوەو قەڵغانەکەی دەدا بەسەر خۆیدا، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەی بینی فەرمووی (کێ ئەمشەو پاسەوانیمان دەکات تا نزایکی بۆ بکەم فەزڵەکەی پێ بگات) کەسێك لە پشتیوانان هەستا وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی تۆ کێیت؟ وتی: فڵان کەس، فەرمووی نزیك بەرەوە، نزیك بوویەوە، پێغەمبەر (ﷺ) هەندێك لە جلەکەی گرت و نزای بەسەرداخوێند، کەبیستم وتم: منیش، فەرمووی تۆ کێیت؟ وتم: ئەبوڕەیحانە، نزایەکی جیا لە نزاکەی ئەوی بۆ خوێندم، پاشان فەرمووی (ئاگر حەرامە لەسەر چاوێك کە لە پێناو خوادا پاسەوانی بکات)[3].[4]

---

جیاتی عەیاش سوهەیلی کوڕی عەمر دێنێت، ئیبن سەعد لە حەبیبەوە وەك گێڕانەوەکەی ئەبونەعیم هێناویەتی، لە الاستيعاب ج٣ ص١٥٠ دا واهاتووە.

[1] – ضعيف.

[2] – لە الترغيب ج٢ ص٤٠٤ دا واهاتووە.

[3] – صحيح.

[4] – لە الاصابة ج٢ ص٥٦ دا واهاتووە، هەیسەمی ج٥ ص٢٨٧دەڵێت: کەسەکانی سەنەدی ئەحمەد جێ متمانەن، بەیهەقی ج٩ ص١٤٩ بەوجۆرە هێناویەتی.

# (خۆگری لەسەر کەمی جلو بەرگ لە پێناو بانگەوازی ڕێی خوادا)

تەبەرانی لە خەبابی کوڕی ئەرەتەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: حەمزەم (رضي الله عنه) بینی هێندە بەرگمان پێ نەبوو کە کفنی پێ بکەین جگە لە عەبایەك، کە پێکانیمان پێدادەپۆشی سەری دەردەکەوت، کە سەریمان دادەپۆشی پێکانی دەردەکەوتن، سەریمان داپۆشی و لەسەر پێکانی (اذفر)(پووش و پەڵا)مان دادەنا[1][2].

تەبەرانی و بەیهەقی لە شیفای کچی عەبدوڵلاوە (رضي الله عنها) هێناویانە دەڵێت: چووم بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تا پرسیاری لێ بکەم، پۆزشی بۆ دەهێنامەوەو منیش سەرکۆنەم دەکرد، لە نوێژدا ئامادەبوومو چوومە دەرەوەو چووم بۆلای کچەکەم لەلای شەرحەبیلی کوڕی حەسنە بوو (رضي الله عنه)، دەبینم شەرحەبیل لەماڵدایە، وتم: کچەکەم ئامادەی نوێژبوو و تۆ لە ماڵەوە بوویت؟ کەوتمە لۆمە کردنی ئەویش وتی: پورێ گیان لۆمەم مەکە، من جلێکم هەبوو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) داوای کرد ماوەیەك لای بێت، منیش وتم بە دایك و باوکمەوە بە قوربانی بم لەو ڕۆژەوە لۆمەم دەکردو ئەوە حاڵی بوو و نەمدەزانی، شەرحەبیل وتی: تەنها ئەوەمان هەبوو[3][4].

ئەبونەعیم لە الحلیة ج٧ ص١٠٥ لە ئیبن عومەرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەبوبەکریش (رضي الله عنه) دانیشتبوون و ئەبوبەکریش عەبایەکی هەبوو

---

[1] - صحیح.

[2] - لە المنتخب ج٥ ص١٧٠ دا واهاتووە.

[3] - ضعیف.

[4] - لە الترغیب ج٣ ص٣٩٦ دا واهاتووە. ئیبن عەساکیرو لە الکنز العمال ج٤ ص٤١ یشدا و ئیبن ئەبی عسم و لە ڕێگەی خۆیەوە ئەبونەعیم و لە الاصابة ج٤ ص٣٤٢ یشدا هاتووە دەڵێت: لە سەنەدەکەیدا عەبدولوەهابی کوڕی زەحال هەیە کە قسەی لەسەرە، ئیبن مەندەش هێناویەتی، لە الاصابة ج٢ ص٢٧١ یشدا هاتووە، حاکم لە المستدرك ج٤ ص٥٨ دا هێناویەتی.

دای بەسەر سنگیدا، جبریل (علیه السلام) دابەزی بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و سەلامی خوای پێ گەیاندو فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی ئەبوبەکر وای کردووە؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ئەی جبریل لە پێش فەتحدا ماڵو سامانی خۆی بەخشی بە من) جبریل فەرمووی: دەی سەلامی خوای پێ بگەیەنەو پێی بڵێ پەروەردگارت پێت دەڵێت: تۆ لەم هەژاریەت ڕازیت یان بێزاریت؟ پێغەمبەر (ﷺ) لای کردەوە بەلای ئەبوبەکرداو فەرمووی (ئەی ئەبوبەکر جبریل سەلامی خوای بۆ هێناویت و دەفەرمویێت: ئایا تۆ لەو هەژاریەت ڕازیت یان بێزاریت) ئەبوبەکریش گریا و وتی: لە پەروەردگارم تووڕە بم، من ڕازیم لە پەروەردگارم، من ڕازیم لە پەروەردگارم.

ئەبونەعیم لە (فضائل الصحابة) لە ئەبی هورەیرەوە بەو واتایە هێناویەتی، ئیبن کەسیر دەڵێت: نامۆییەکی زۆری تێدایەو شێخی تەبەرانی عەبدولڕەحمانی کوڕی موعاویەی عەتبی و موحەمەدی کوڕی نەسری فارسی مامۆستای نایانناسم، کەسیشم نەبینیوە باسیان بکات[1][2].

هەنادی دەینەوەری لە شەعبیەوە هێناویەتی دەڵێت: عەلی (رضي الله عنه) وتی: فاتیمەی کچی پێغەمبەرم (ﷺ) بە هاوسەر گرت و کومبارێکیشم نەبوو ڕایخەم جگە لە بەرگی بەرخێك شەوانە لەسەری دەخەوتین و ڕۆژانیش بۆ لەوەڕدان لەسەری بەکارمان دەهێنا، جگە لە فاتیمەش خزمەتکوزارم نەبوو[3][4].

ئەبوداود و ترمزی بەصەحیحی و ئیبن ماجە لە بورەیدەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: باوکم پێی وتم: ئەگەر ئێمەت لەگەڵ پێغەمبەرماندا دەبینی کە ئاسمان چی بەسەرهێنابووین دەتوت بۆنی مەڕو پەز دەدەین[5][6].

---

[1]- ضعيف.

[2] - لە المنتخب كنز العمال ج٤ ص٣٥٣ دا واهاتووە.

[3] - صحيح.

[4] - لە الكنز العمال ج٧ ص١٣٣دا هاتووە.

[5] - صحيح.

[6] - لە الترغيب ج٣ ص٣٩٤ دا واهاتووە،

ئیبن سەعد ج٤ ص٨٠ لە سەعیدی کوڕی ئەبی بورەیدەوە لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: باوکم –واتە ئەبو موسا (رضي الله عنه)– پێی وتم: کوڕی شیرینم ئەگەر ئێمەت لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دا دەبینی ئاسمان چی بەسەردا هێنابووین (باران لێیدابووە) بۆ نێکت لە جلەکانمان دەبیست لە بەرئەوەی لە خوری بوون لە بۆنی مەڕو پەز دەچوو، تەبەرانی بەو جۆرە لە ئەبو موساوە هێناویەتی و ئەوەشی بۆ زیاد دەکات: جلەکانمان تەنها لە خوری و نانیشمان ئاو و خورما بوو.[1]

بوخاری لە ئەبوهورەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: حەفتا کەسی ئەهلی صوففەم بینی کەسیان عەبایان لەسەر شان نەبوو، یان بەرگێك تا خوارەوە یان بەرگێك کە لە شانیان بەستبوو، هەیانبوو یان نیوەی قاچی و هەیانبوو تا قولەپێی دەچوو، لە ترسی ئەوەی عەروەتی دەرنەکەوێت بە دەستەکانی کۆی دەکردەوە،[2] ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٣٤١ لە واسلەی کوڕی ئەسقوعەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: من لە هاوەڵانی صوففە بووم و کەسمان جلێکی تەواوی نەبوو، عارەقی پێستمان چینێك تەپوتۆزی لە خۆ گرتبوو.

بوخاری لە عائیشەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی کەسێك هات بۆلای و کەنیزەکێکی لەلابوو، زرێپۆشێکی پێنج درهەمی لەبەربوو، وتی: چاوت هەڵبڕە بۆلای کەنیزەکەکەم، سەیری کە ئامادەنیە لە ماڵدا بیکاتە بەری، منیش زرێپۆشێکم هەبوو لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) هەر ئافرەتێکی مەدینە بیویستایە خۆی برازێنێتەوە دەهات بۆ ماوەیەك لێی وەردەگرتم.[3]

---

[1] – هەیسەمی ج١٠ ص٣٢٥ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن، ئەبوداودیش بە کورتی هێناویەتی.

[2] – لە الترغیب ج٣ ص٣٩٧ دا وا هاتووە،

[3] – لە الترغیب ج٥ ص١٦٤ دا وا هاتووە.

## (خۆگری لەسەر سەختی ترس لە پێناو بانگەوازی ڕێی خوادا)

حاکم و بەیهەقی ج٩ ص١٤٨ لە عەبدولعەزیزی برازای حوزەیفەوە (رضي الله عنه) دەڵێت: حوزەیفە (رضي الله عنه) باسی دیمەنی خۆیانی لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەکرد، ئەوانەی لەگەڵی دانیشتبوون وتیان: سوێند بە خوا ئەگەر وەك ئێوە لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دا بووینایە ئەوەو ئەوەمان دەکرد، حوزەیفە وتی هیوا بەوە مەخوازن، لە شەوی ئەحزابدا بە ڕیز دانیشتبووین و ئەبوسوفیان و هاودەمەکانی لە سەرەوەو قورەیزەی جوولەکەش لە خوارمانەوە بوون و دەترساین دەست بگەیەننە لای ژن و منداڵەکانمان، هیچ شەوێك تاریکی و ڕەشەبای وای نەبوو، دەنگی ڕەشەبا وەك دەنگی هەورەگرمە بوو، هێندە تاریك بوو کەسمان پەنجەکانی خۆی نەدەبینی، دووڕووەکان مۆڵەتیان لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەردەگرت و دەیانوت ماڵمان چۆڵە و مۆڵەتمان بدە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مۆڵەتی هەموویانیدا، بەرە بەرە دەچوون ئێمەش نزیکەی سێ سەد کەس بووین، یەك یەك دەچووینە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تا سەرەی من هات و منیش تەنها شتێك هەمبوو لە دوژمن و سەرمایش بمپارێزێت جلێکی خوری ژنەکەم بوو کە لەسەر ئەژنۆم نەدەچوویە خوار، هات بۆلام و منیش لەسەر چۆك دانیشتبووم، فەرمووی (ئەمە کێیە؟) وتم: حوزەیفە، فەرمووی حوزەیفە، سەرم دانەواند و وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، بۆیە واموت نەوەك هەستم، کەچی هەستام، فەرمووی (انه كائن في القوم خبر فاتني بخبر القوم) واتە(لەناو ئەوانەدا هەواڵێك هەیە برۆ هەواڵییان بهێنە بۆم) دەڵێت: منیش لە هەموویان زیاتر دەترسام و سەرمام بوو، چووم و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (خوایە لە بەرو دواو لەڕاست و چەپ و سەرو خوارەوە بیپارێزە) سوێند بە خوا چی ترس و سەرما هەبوو لە ناخمدا نەما وەك ئەوەی نەبووبێت، کە ڕووم وەرگێڕا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (حوزەیفە لە ناو ئەواندا هیچ مەکە تادێیت

بۆلام) منیش چووم و لەسەربازگەکەیان نزیك بوومەوە و ڕووناکی ئاگرم بینی، کەسێکی کەڵەگەتم بینی، پێستی لە سەر ئاگرەکە دادەنا و دەیهێنا بەسەر دەم و لووتیدا، دەیوت: کۆچ،کۆچ، پێشتر ئەبوسوفیانم نەدەناسی، تیرێکم هێناو خستمە کەوانەکەوە تا بیوەشێنم بۆی، بیری فەرمایشتەکەی پێغەمبەرم (ﷺ) کردەوە (لەناویاندا هیچ مەکە تا دێیتەوە بۆلام) وازم هێنا و تیرەکەم هەڵگرتەوە و خۆم هاندا تا چوومە ناو سەربازگەکە، نزیکترین کەس لێم بەنوعامر بوون دەیانوت بەنوعامر کۆچ، کۆچ، شوێنی مانەوەتان نەماوە، ڕەشەبا تەنگی بە سەربازگەکان هەڵچنیبوو،سوێند بەخوا دەنگی بەردم لە شمەك و ڕاخەریاندا دەبیست کە ڕەشەبا ئەو بەردانەی بۆ دەبردن، ئینجا چوومەوە بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) لە نیوەی ڕێدا بیست سوار هاتن و دەموچاویان داپۆشیبوو، وتی: بە هاوەڵەکەت بڵێ خوا پاراستی، گەڕامەوە بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) بینیم نوێژ دەکات، سوێند بە خوا کە گەڕامەوە سەرماکەم بۆ گەڕایەوە و دەلەرزیم، پێغەمبەر (ﷺ) کە نوێژی دەکرد بە دەستی ئاماژەی بۆ کردم لێی نزیك بوومەوە، بەرگەکەی دا بەسەرمدا – پێغەمبەر (ﷺ) کە بارێکی بهاتایە ڕێ نوێژی دەکرد– هەواڵی ئەوانم پێداو وتم: کە کاتێك بەجێم هێشتن دەچوون. خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزند(يا ايها الذين امنوا اذكروا نعمة الله عليكم اذ جائتكم جنود.....) تا (وكفى الله المؤمنين القتال وكان الله قويا عزيزا)[1][2].

موسلیم لە یەزیدی تەیمیەوە هێناویەتی دەڵێت: لای حوزەیفە (رضي الله عنه) بووین کەسێك پێی وت: ئەگەر دەگەیشتمە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵیدا شەڕێکی چاکی

---

[1] – صحيح.

[2] – لە البداية والنهاية ج٤ ص١١٤ دا وا هاتووە، ئەبوداود و ئیبن عەساکیر بە دوورو درێژی بە دەقێکی تر هێناویانە، لە كنز العمال ج٥ ص٢٧٩ دا هاتووە.

مەردانەم دژ بە نەیارانی دەکرد، حوزەیفە پێی وت: وات دەکرد؟ ئەگەر شەوی ئەحزاب دەتبینین لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) لە شەوێکی ساردی ڕەشەبا سەختدا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (کێ هەواڵی ئەوانەم بۆ وەربگرێت تا لە ڕۆژی دواییدا لەگەڵمدا بێت) ئینجا بە کورتی وەك فەرموودەکەی عەبدولعەزیز دێنێت، تیایدا هاتووە، هاتمە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) و کاتێك هاتمەوە سەرمام ببو و هەواڵم دا بە پێغەمبەر (ﷺ)و ئەویش عەبایەکی سەرشانی خۆی کە نوێژی پێوە دەکرد دای بەسەر منداو تا بەیانی خەوتم، کە بەیانی هات پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی هەستە خەواڵوو (قم یا نومان).

ئیبن ئیسحاق لە موحەمەدی کوڕی کەعبی قرظیەوە (رضي الله عنه) بە مونقەتیعی[١] هێناویەتی، لە فەرموودەکەیدا هاتووە: فەرمووی: کێ هەڵدەستێت بزانێت ئەوانە چی دەکەن و دواتر بێتەوە؟ پێغەمبەر (ﷺ) مەرجی گەڕانەوەی بۆ دانا، لە خوا دەپاڕێمەوە خوا لە بەهەشتدا بیکاتە هاودەمم، لەتاو زۆری ترس و برسێتی و سەرما کەس هەڵنەسا.

---

[١] زاراوەیەکی زانستی فەرموودەیە.

# (خۆگری لەسەر نەخۆشیەکان لە پێناو بانگەوازی ڕێی خوادا)

ئیبن ئیسحاق لە ئەبی سائیبەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی کەسێکی بەنی عەبدولئەشهەل وتی: من و برایەکم لە شەڕی ئوحددا بەشداریمان کرد و بە برینداری گەڕاینەوە، کە بانگدەری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وتی: وەرن با بچین بۆ دوژمن بە براکەمم وت – یان ئەو پێی وتم– بۆچی غەزایەکمان لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) لە دەست بچێت؟ سوێند بەخوا ئاژەڵێکمان نەبوو سواری بین و برینیشمان سەخت بوو، لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چووین، برینمن لەو سوکتر بوو، کاتێك برینەکەی لێی توند دەکرد دەمگرت بە کوڵەوە تا گەیشتینە ئو شوێنەی موسڵمانان لێی وەستان.[1]

ئیبن سەعد ج٣ ص٢١ لە واقیدیەوە هێناویەتی عەبدوڵلای کوڕی سەهل و ڕافیعی کوڕی سەهلی برای (رضي الله عنه) چوون بۆ (حمراء الاسد) و بریندار بوون، یەکێکیان ئەوی تری هەڵدەگرت و وڵاخێکیشیان نەبوو تا سواری بن، ئیبن ئیسحاق لەچەند شێخێکی بەنی سەلەمەوە هێناویەتی دەڵێن: عومەری کوڕی جەموح (رضي الله عنه) کەسێکی زۆر شەل بوو، چوار کوڕی هەبوو وەك شێر وابوون و لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)دا لە شەڕەکاندا بەشدارییان دەکرد، لە ڕۆژی ئوحوددا ویستیان باوکیان نەیەت بۆ شەڕو وتیان: خوا لە تۆ بوراوە لەوەی بەشداری بکەیت، ئەویش هاتە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و وتی: کوڕەکانم دەیانەوێت لەو شەڕەدا بەشدار نەبم و لەگەڵ تۆ نەیەم، سوێند بەخوا حەزدەکەم بەم بارەمەوە بکەومە ناو بەهەشتەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (دەی تۆ خوا جیهادی لەسەر بە فەرز دانەناویت) بە کوڕەکانیشی فەرموو (ڕێی لێ مەگرن، بەڵکو خوا شەهیدی پێ ببەخشێت) باوکیان چوو و لە ڕۆژی ئوحود شەهید بوو.[2]

ئەحمەد لە ئەبی قەتادەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی ئامادەی بووە و دەڵێت: عەمری کوڕی جەموح هات بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر لە پێناو خوادا

---

[1] – لە البداية والنهاية ج٤ ص٤٩ دا واهاتووە.

[2] – لە البداية والنهاية ج٤ ص٣٧ داواهاتووە.

بجەنگم تا شەهید بم بەم قاچە ناتەواوەم دەچمە بەهەشتەوە- پێیەکی شەل بوو- پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بەڵێ، لە ڕۆژی ئوحود خۆی و برازەکەی و مەولاکەیان کوشت، پێغەمبەر (ﷺ) دای بەپاڵیداو فەرمووی (كاني انظر اليه يمشي برجله هذة صحيحة في الجنة) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد خۆی و برازاکەی و مەولاکەیان بخرێنە گۆڕەوە.[1]

بەیهەقی لە یەحیای کوڕی عەبدولحەمید لە دایە گەورەیەوە هێناویەتی دەڵێت: ڕافیعی کوڕی خودەیج (رضي الله عنه) تیرێك درا لەسەر مەمکی- عومەر (رضي الله عنه) وتی نازانم لە شەڕی ئوحود بوو یان حونەین- هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم تیرەم لێ لابە، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو (ئەی ڕافیع ئەگەر دەتەوێت تیرەکە و گۆپکەکەش هەمووی لادەبەم، ئەگەریش دەتەوێت تیرەکە لادەبەم و گۆپکەکە دەهێڵمەوە و لە ڕۆژی دواییدا شایەتیت بۆ دەدەم تۆ شەهیدیت) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا تیرەکە لابە و گۆپکەکە بهێڵەوە و لە ڕۆژی دواییدا شایەتیم بۆ بدە کە شەهیدم.

دەڵێت: ژیا تا خیلافەتی موعاویە(رضي الله عنه) برینەکەی کەوت و دوای عەسر مرد، لەو گێڕانەوەدا وا هاتووە، ڕاستتر وایە: لە دوای خیلافەتی موعاویە مرد.[2]

---

[1]- هەیسەمی ج٩ ص٣١٥ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن جگە لە یەحیای کوڕی نەسری ئەنساری خۆی متمانەی پێ دەدات، تەواو. بەیهەقیش ج٩ ص٢٤ لە ڕێگەی ئیبن ئیسحاقەوە هێناویەتی.

[2]- لە البداية والنهاية دا واهاتووە، لە الاصابة ج١ ص٤٩٦ دا دەڵێت: دەکرێت ماوەیەك هەبووبێت لە نێوان کەوتنی برینەکە و مەرگیدا. هەروەها بارودی و ئیبن مندەو تەبەرانی هێناویانە، لە الاصابة ج٤ ص٤٧٤ دا هاتووە، ئیبن شاهین هێناویەتی، لە الاصابة ج١ص٤٩٦ دا واهاتووە، دواتریش لە باسی خۆڕاگریدا فەرموودەی تر دێنین.

# (بەشی چوارەم)

# (کوچکردن)

هاوەڵان چۆن نیشتمانی ئازیزی خۆیان بەجێهێشت لەگەڵ ئەوەی بەجێهێشتنی نیشتمان لەسەر دەروون زۆر سەختە بە جۆرێک تا مردن نەگەڕانەوە بۆ نیشتمانی خۆیان؟ چۆن ئەمەیان لە دونیاو خۆشیەکانی دونیا لا خۆشەویستتر بوو؟

چۆن ئائینیان پێش دونیا خستو گوێیان نەدا بە لە دەستدانی دونیاو لایشیان بەلادا نەکردەوە؟ چۆن لە پێناو پاراستنی ئائینیان لە دەست فیتنە وڵاتەو وڵات ڕایاندەکرد وەک ئەوەی بۆ ڕۆژی دوایی دروست کرابنو نەوەی ڕۆژی دوایی بن کەچی دونیا وای لێهات وەک ئەوەی بۆ ئەوان دروست کرابێت؟

# (بەشی چوارەم)
# (کوچکردن)
# (کۆچکردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەبوبەکر)

تەبەرانی لە عورووەوە (رضي الله عنه) بە مورسەلی هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە دوای حەج ڕۆژانی دیکەی زیلحەجەو موحەرەم و صەفەر مایەوە، پاشان بێباوەڕانی قورەیش ڕێککەوتن و پیلانیان دانا کاتێك زانییان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەردەچێت، زانیان خوای گەورە لە مەدینەدا پەنا و پەناگەی بۆ داناوەو هەواڵی موسڵمانبوونی پشتیوانان و چوونی کۆچەرانیان بۆلای پشتیوانان بیستبوو، لەسەر ئەوە یەکدەنگ بوون بچن بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) یان بیکوژن یان بەدیل بیگرن – بەندی بکەن– عەمری کوڕی خالید گومانی هەبوو کامیان بوو، یان دەری بکەن یان بیبەستنەوە، خوای گەورەش پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) ئاگادار کردەوە، خوای گەورە فەرمووی (واذ یمکر بك الذین کفروا لیثبتوك او یقتلوك او یخرجوك ویمکرون ویمکر الله والله خیر الماکرین) ئەو ڕۆژەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چوو ماڵی ئەبوبەکر (رضي الله عنه) بیستبووی شەو دێن بۆی، بۆیە لەگەڵ ئەبوبەکردا (رضي الله عنه) پێشتر چووبوون بەرەو ئەشکەوتی ثەور، ئەو ئەشکەوتەی خوای گەورە لە قورئاندا باسی کردووە.

عەلی کوڕی ئەبوتالیب (رضي الله عنه) لەسەر شوێنەکەی خەوت و سەرو چاوی داپۆشی، بێباوەڕانی قورەیشیش سەرقاڵی پیلان دانان بوون ئایا بدەین بەسەر سنگی ئەم خەوتووەداو دوایی هەڵیگرین، بەمجۆرە قسەیان کرد تا بەیانی، بەیانی عەلی (رضي الله عنه) لە جێگەکەی هەستا، وتیان ئەی موحەمەد کوا، وتی: هیچ لە بارەیەوە نازانێت، ئەو کات زانییان چووە، بە هەموو لایەکدا دەگەڕان بە شوێنیدا، ناردیان بە شوێنیدا، ناردیان بۆ شوێنەکان و خەڵاتی گەورەیان بۆ دادەنان ئەگەر بیدۆزنەوە. هاتن بۆلای شاخی ثەور کە ئەشکەوتەکەی تێدا بوو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەبوبەکر (رضي الله عنه) لەوێ بوون، هاتنە سەرەوەو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەنگی بیستن، ئەبوبەکر ترسا و ترس و

خەفەت دایگرت، ئەو کات پێغەمبەر (ﷺ)پێی فەرموو (لا تحزن ان الله معنا) واتە(خەفەت مەخۆ خوامان لەگەڵە) ئینجا نزای کردو خوای گەورەیش سوکنایی خۆی دابەزاند (فانزل الله سكينته على رسوله وعلى المؤمنين وانزل جنودا لم تروها وجعل كلمة الذين كفروا السفلى و كلمة الله هي العليا والله عزيز حكيم).

ئەبوبەکر لە مەککە پشکێکی هەبوو بۆ خۆیو خەڵکەکەی، ئەبوبەکر عامری کوڕی فهیرەی مەولای جێ متمانەو متمانەداری موسڵمانبووی ئەبوبەکری ناردو کەسێکی بەنی عەبدی کوڕی عەدی بەکرێ گرت، ئەو کەسە پێی دەوترا ئیبنولئورەیقت، هاوپەیمانی قورەیش بوو لە بەنی سەهم لە بەنی عاصی کوڕی وائیلەوە، ئەو کات عەددی بێباوەڕبوو و ڕێ نیشاندەر بوو – ڕێی هاتن و چوون– ئەو شوانەو وڵاخەکانمان دەشاردەوەو عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکریش ئێواران هەواڵی ناو مەککەی بۆ دەهێنان، عامری کوڕی فهیرە شەوانە مەڕی دەهێنا بەو شوێنەداو شیری پێ دەدانو بۆیشی سەردەبڕین، پاشان بەیانی زوو دەچوو لەگەڵ شوانێکی خەڵکی تردا دەچوو و کەس پێی نەدەزانی تا دەنگ و گاڵە هێور دەبوویەوە، دەهاتەوە بۆلایانو وشترەکانیانی بۆ دەبردنەوە، دوو شەو و ڕۆژ لە ئەشکەوتەکەدا مانەوە، پاشان چوونو عامری کوڕی فهریش لەگەڵیان چوو و خزمەتی دەکردنو ئاگای لێیان بوو، ئەبوبەکر دەچوویە پێشەوەی پێغەمبەر (ﷺ) و دواتر دەهاتەوە دواوەو کەسیان لەگەڵدا نەبوو، جگە لە عامری کوڕی فهیرو کەسێکی بەنی عەدی کە ڕێی نیشان دەدان[1] [2].

ئیبن ئیسحاق لە عائیشەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: وا ڕێك نەدەکەوت پێغەمبەر (ﷺ) لە کاتی نیوەڕواندا بچێت بۆ ماڵی ئەبوبەکر (رضي الله عنه) یان بەیانی زوو یان

---

[1] – ضعیف.

[2]– هەیسەمی ج٦ ص٥١ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا ئیبن لهیعە هەیە کە قسەی لەسەرەو فەرموودەکەی حەسەنە.

ئێواران دەچوو، بەڵام ئەو ڕۆژەی مۆڵەتی کۆچکردنی پێدرا تا هۆزەکەی لە مەککە بەجێ بهێڵێت، پێغەمبەر (ﷺ) لە کاتێکی جیا لە جاران هات بۆلامان، کە ئەبوبەکر (رضي الله عنه) پێغەمبەر (ﷺ)ی بینی وتی: پێغەمبەر (ﷺ)لەم کاتەدا بۆ شتێکی گرنگ نەبێت نەهاتووە، کە پێغەمبەر (ﷺ)هاتە ژوورەوە ئەبوبەکر لەسەر جێگەکەی داینیشاند، پێغەمبەر (ﷺ) دانیشت و کەس لای نەبوو جگە لە ئەسمائی کچی ئەبوبەکری خوشکم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (اخرج عني من عندك) واتە(با تەنها بین، بیاننێرە بۆ شوێنێکی تر) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمانە کچی خۆمن و کەسی تر لێرە نیە بە دایك و باوکمەوە بە قوربانت بم، فەرمووی (خوا مۆڵەتی چوون و کۆچی پێداوم) ئەبوبەکر وتی: منیش هاودەمت دەبم ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی بەڵێ (الصحابة) هاودەمم دەبیت، دەڵێت: سوێند بە خوا پێش ئەوە نەمدیبو کەس لە خۆشیدا بگریت تا ئەوەی ئەو ڕۆژە ئەبوبەکرم دی لە خۆشیدا دەگریا، پاشان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دوو وڵاخم ئامادە کردبوون بۆ ئەمە، عەبدوڵلای کوڕی ئەرقەدی بەنی دئلی کوڕی بەکریان بە کرێ گرت – دایکی لە بەنی سەهمی کوڕی عەمر بوو و بێباوەڕیش بوو– ڕێی نیشان دەدان، دوو وڵاخەکەیان دایە لای ئەو و ئەویش لە کاتی خۆیدا بۆی دەهێنان و دەبردن، بە غەوی بە سەنەدی حەسەن لە عائیشەوە (رضي الله عنها) شتێکی لێ هێناوە، لە فەرموودەکەدا هاتووە ئەبوبەکر وتی: (الصحابة) هاوەڵ، فەرمووی (الصحابە) هاوەڵ، ئەبوبەکریش وتی: من شەش مانگە دوو وڵاخم حازر کردون و ئاڵفم داون، یەکێکیان بۆ تۆ، فەرمووی (بەڵکو دەیکڕم) وڵاخەکەی لێ کڕی و چوون و لە ئەشکەوتەکەدا بوون، ئینجا فەرموودەکە دێنێت[1].[2]

تەبەرانی لە ئەسمائی کچی ئەبوبەکر (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) لە مەککە ڕۆژانە دووجار دەهات بۆ ماڵمان، ئەو ڕۆژ نیوەڕۆ بوو هات، وتی: بابەگیان وا

---

[1] – صحیح.

[2] – لە کنز العمال ج٨ ص٣٣٤ دا واهاتووە.

پێغەمبەری خوا بە دایکم و باوکمەوە بە قوربانی بم هات، کارێکی گرنگی نەبێت لەم کاتەدا نایەت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ئایا زانیوتە خوای گەورە مۆڵەتی پێداوم تا دەربچم؟) ئەبوبەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من هاوەڵت دەبم، فەرمووی (هاوەڵم دەبیت) وتی: من دەمێکە چاوەڕێی ئەم ڕۆژە دەکەم و دوو وڵاخم بەستوونەتەوە یەکێکیان بۆ تۆ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (بثمنها یا ابابکر) واتە(بە پارەکەی دەمەوێت ئەی ئەبوبەکر) ئەویش وتی: بە دایك و باوکمەوە بە قوربانت بم مادەم واحەزدەکەیت، ئەسما دەڵێت: نانی سەفەرمان بۆ پێچانەوە و دواتر قایشەکەی پچڕاند و بەستەیەوە بەوەوە، هەردووکیان چوون و لە ئەشکەوتی شاخی ثەوردا مانەوە، کە گەیشتنە لای پێشتر ئەبوبەکر چووبوویە ناو ئەشکەوتەکە و چی کونی تێدا بوو پەنجەی کرد بەناویدا نەوەك شتێکی تێدا بێت، قورەیش کە نەیاندۆزینەوە دەرچوون و سەد وشتریان دانا بۆ ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) بدۆزێتەوە، بە شاخەکانی دەوری مەککەدا دەگەڕان تا گەیشتنە شاخی ثەور، ئەبوبەکر کەسێکی دی کە بەرەو ئەشکەوتەکە دەهات و وتی پێغەمبەر (ﷺ) دەمانبینێت، فەرمووی (نەخێر، فریشتەیەکی خوا بەباڵەکانی داماندەپۆشێت) ئەو کەسە لە بەردەم ئەشکەوتەکەدا دانیشت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ئەگەر ئێمەی بدیایە وای نەدەکرد) سێ شەو مانەوە و عامری فیهرەی مەولای ئەبوبەکر مەڕی دەبرد بۆلای ئەبوبەکر و دەمەو ئێوارە دەچوو بۆلایان و لەوێ لەگەڵ شوانەکانی دی بوو و خۆی دواخست تا تاریکی دەکرد، مەڕەکانی دەبرد بۆلای ئەوان، شوانەکانیش وایاندەزانی لەگەڵیاندایە، عەبدوڵلای کوڕی ئەبوبەکریش لەناو مەککەدا دەمایەوە و هەواڵی وەردەگرت و دواتر لە تاریکی شەودا دەهات بۆلایان و هەواڵی بۆ دەهێنان، لەوێ دەبوو دوایی دەچوویەوە و بەیانی لە مەککە دەبوو، ئەوانیش لە ئەشکەوت دەرچوون و ڕێی کەناراویان گرتەبەر، ئەبوبەکر کاتێك ترسی هەبوایە لە پێشەوە بێن بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لە پێشەوە دەچوو، ئەگەر بترسایە لە دواوە مەترسی دێت دەچوویە دواوە، بەوجۆرە دەچوو، ئەبوبەکر لەناو خەڵکدا ناسراو بوو، ئەگەر کەسێکی پێ

بگەیشتایەو بیوتایە ئەبوبەکر ئەوە کێیە لەگەڵتدا؟ دەیوت: کەسێکە ڕێم نیشان دەدات، کەسی بەرامبەر وایدەزانی ڕێی نێوان شوێنەکان دەڵێت تا گەیشتنە (قدید) کە لەسەر ڕێیان بوو کەسێك هات بۆلای بەنی مودلیج و وتی: دوو کەسم بینی بە وڵاخەوە بەرەو کەناراو دەچوون، وابزانم ئەو کەسانە بوون کە ئێوە بە دوایاندا دەگەڕێن، سوراقەی کوڕی مالیك وتی: نا ئەوانە خۆمان ناردومانن بە شوێنیاندا، دواتر کەنیزەکەکەی بانگکرد و ناردی بۆلای و فەرمانی کرد ئەسپەکەی بۆ بهێنێت، پاشان چوو بە شوێنیاندا، سوراقە دەڵێت: لێیان نزیك بوومەوە، ئینجا فەرموودەکە دێنێت، وەك دواتر دەیهێنین[1,2].

بەیهەقی لە ئیبن سیرینەوە هێناویەتی دەڵێت: کەسانێك لە سەردەمی عومەردا هەبوون وا قسەیان دەکرد فەرزڵی عومەریان دەدا بەسەر ئەبوبەکردا (ﷺ) عومەر ئەمەی بیستەوە و وتی: سوێند بە خوا یەك شەوی ئەبوبەکر لە هەموو بنەماڵەی عومەر باشترە و ڕۆژێکیش لە هەموو بنەماڵەی عومەر باشترە، ئەو شەو لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) دەرچو بۆ ئەشکەوت و دەمێك لە پێشەوە و دەمێك لە دواوە دەچوو تا ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) هەستی پێ کرد و فەرمووی (ئەی ئەبوبەکر ئەوە چیتە دەمێك لە دوامەوە و دەمێك لە پێشمەوە دەچیت؟) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بیر لەوە دەکەمەوە بێن بۆمان لە پشتتەوە دەچم، دوایی دەڵێم نا لە پێشەوە قەرەوڵیان بۆ گرتووین بۆیە لە پێشەوە دەچم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (یا ابا بکر لوکان شیئ لاحببت ان یکون بك دوني) واتە(حەزدەکەیت ئەگەر شتێکمان بێتە ڕێ تووشی تۆ بێت و من لێی بە دوور بم؟) وتی: بەڵێ سوێند بەو کەسەی تۆی بە حەق ناردووە،

---

[1] - ضعیف.

[2] - هەیسەمی ج٦ ص٥٤ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا یەعقوبی کوڕی حەمیدی کاس هەیە، ئیبن حەببان و کەسانی دیکەش متمانەی پێ دەدەن و ئەبوحاتەم و چەندێکی دی بە لاوازی دەزانن، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە صەحیحن.

کاتێك گەیشتنە ئەشکەوت ئەبوبەکر وتی: لێرە بوەستە ئەی پێغەمبەری خوا تا ئەشکەوتەکەت بۆ پاك بکەمەوە، چوو و پاکی کردەوەو هاتەوە و دوایی بیری کردەوە بەردێکی تیا مابوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ڕاوەستە تا ئەوەش پاك دەکەمەوە چوو و هاتەوە و وتی: دەی فەرموو دابەزە ئەی پێغەمبەری خوا، ئینجا دابەزین عومەر وتی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە ئەو شەوە لە هەموو بنەماڵەی عومەر باشترە.[1]

ئەبوبەکر قازی لە حەسەنی بەسریەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) و ئەبوبەکر (رضي الله عنه) چوون بۆ ئەشکەوت، قورەیش هاتن تا پێغەمبەر (ﷺ) بدۆزنەوە، کە سەیری دەرگای ئەشکەوتەکەیان کرد جاڵجاڵۆکە چنیبووی، وتیان: نەچوەتە ئێرە، لەو کاتەدا پێغەمبەر (ﷺ) بە پێوە نوێژی دەکرد، ئەبوبەکریش بە پێغەمبەری وت: وا هۆزەکەت هاتوون بۆت، سوێند بە خوا لەبەر ئاهێکی خۆیشم نیە، دەترسم شتێك بە تۆ بکەن، پێغەمبەر (ﷺ)پێی فەرموو (ئەبوبەکر مەترسە خوامان لەگەڵە).[2]

ئەحمەد لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی ئەبوبەکر (رضي الله عنه) پێی وتووە: بە پێغەمبەرم (ﷺ) وت کاتێك لە ئەشکەوتدا بووین، ئەگەر یەکێکیان سەیری پێکانی بکات لە ژێر پێکانیەوە دەمانبینێت،، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ئەی ئەبوبەکر گومانت بە دووان چیە کە سێیەمیان خوابێت؟)[3].[4]

---

[1]- لە البداية والنهاية ج٣ ص١٨٠ دا واهاتووە، حاکمیش هێناویەتی، لە منتخب كنزالعمال ج٤ ص٣٤٨ دا هاتووە، بەغەوی بە مورسەلی لە ئیبن ئەبی مولەیکەوە بەو واتایە هێناویەتی، ئیبن کەسیر دەڵێت: ئەم فەرمووده مورسەلی حەسەنە، لە كنزالعمال ج٨ ص٣٣٥ یشدا هاتووە.

[2] – ضعيف.

[3] – صحيح.

[4]– لە البداية والنهاية ج٣ ص١٨١– ١٨٢ دا هاتووە، بوخاری و موسلیمیش هێناویانە، ترمزی و ئیبن ئەبی شەیبە و چەندێکی دی هێناویانە، لە الكنز ج٤ ص٣٩٢ یشدا هاتووە.

ئەحمەد لە بەرائی کوڕی عازبەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئەبوبەکر بە سیانزە درهەم سەرجێکی(کۆپانێکی) لە عازب کڕی، پێی وت: بەراء بنێرە تا بیهێنێتەوە بۆ ماڵەکەم، وتی: نا تا پێم نەڵێیت کاتێك لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەرچوون تۆی لەگەڵدا بوویت چیت بوویت؟ ئەبوبەکر وتی: چووین و شەومان بردە سەرو شەو و ڕۆژ ماینەوە تا نیوەڕۆ هات چاوم گێڕا تابزانم سێبەرێك ببینم بچینە ئەوێ، سەیری بەردێکم کرد چوومە ژێری، سێبەرەکەی ترم دانا بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ڕاخەرێکم بۆ ڕاخست و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ڕاکشێ، ئەویش ڕاکشا، ئینجا هەستام تا بزانم کەس نایەت بە شوێنماندا، سەیری کەسێکم کرد شوان بوو مەڕی دەلەوەڕاند، وتم: تۆ هی کێیت؟ وتی: هی کەسێکی قورەیش، ناوەکەی هێناو منیش ناسیمەوە، وتم: مەڕەکانت شیریان هەیە؟ وتی: بەڵێ، وتم: شیرم پێی دەدەیت؟ وتی: بەڵێ، مەڕێکیانی گرت و گوانی لە تەپوتۆز پاك کردەوە، پاشان دەستەکانی خۆیشی لە تەپوتۆز پاك کردەوە، قاپێکم پێ بوو، بڕێك شیری کردەناو بۆم، کردمە پەرداخەوە و خوارەوەی سارد بوو، دوایی هاتم بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەبینم لەخەو هەستاوە، وتم: بنۆشە ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، ئەویش هێندەی نۆشی تا دڵم حەسایەوە، پاشان وتم: ئێستا بڕۆین؟ کەوتینە ڕێ و دوژمنیش بە دوامانـدا دەگەڕا، کەسیان نەگەیشت پێمان جگە لە سوراقەی کوڕی مالیکی کوڕی جەعسەم بە ئەسپەکەیەوە هات، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وا گەیشت پێمان، فەرمووی (خەفەت مەخۆ خوامان لەگەڵدایە) تا لێمان نزیك بوویەوە و هێندەی ڕمێك یان دووڕم یان سێ ڕم لێمان دوور بوو، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا وا گەیشت پێمان، دەستم کرد بە گریان، فەرمووی بۆچی دەگریت؟ وتم: بە خوا بۆ خۆم ناگریم بۆ تۆ دەگریم، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نزای لێ کرد و فەرمووی (اللهم اکفناه بما شئت) واتە(خوایە چۆن پێت باشترە لە دەستی بە دوورمان بگرە) پێکانی ئەسپەکەی تا لای سکی چوون بەناو زەویەکی ڕەقدا، هاواری لێ هەستا و وتی: محمد دەزانم ئەمە ئیشی تۆیە داوا لە خوا بکە لەم بارە ڕزگارم بکات، سوێند بە خوا بەڵێن بێت ئەوانەی لە دوامەوە دێن بۆت ڕێیان لێ

بشێوێنم، ئەمەش تیردانەکەم تیرێکی لێهەڵبگرەو لەو شوێنەدا دەدەیت بە پاڵ وشترو مەڕەکانمدا چەندت پێویستە لێیان ببە، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (هیچ پێویستم پێیان نیە) نزای بۆ کردو ڕزگاری بوو و گەڕایەوە بۆلای هاوەڵەکانی. پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ مندا درێژەی بە ڕێدا تا گەیشتینە مەدینەو خەڵکی پێشوازییان لێکرد، لەسەر ڕێگەو دیوارەکاندا هەستابوون و خزمەتکارو منداڵان لە سەرەڕێکاندا قەرەباڵغیان دروست کردبوو و دەیانوت: الله اکبر پێغەمبەری خوا هات، محمد هات هەمووان لەسەر ئەوە ناکۆکییان بوو لەلای کامیان دابەزێت؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ئەمشەو لای بەنی نەجاری خاڵوانی عەبدولموتەلیب دادەبەزم تا بەوە ڕێزداریان بکەم) بۆ بەیانی بەوجۆرەی ویستی هەنگاوی نا.[1]

بوخاری لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر (ﷺ) گەیشت بە زوبەیر کە کاروانێکی موسڵمانانی پێبوو لە شامەوە دەهاتنەوە (بۆ بازرگانی چووبوون) زوبەیر جلی سپی پێشکەشی پێغەمبەر (ﷺ) و ئەبوبەکر (رضي الله عنه) کرد، موسڵمانانی مەدینە بیستیان پێغەمبەر (ﷺ) لە مەککە دەرچووە، ئەوان ڕۆژانە بەیانی لە دەرەوە چاوەڕێی هاتنی پێغەمبەر (ﷺ) بوون تا گەرمای نیوەڕۆ دەیگێڕانەوە، ڕۆژێکیان پاش چاوەڕوانیەکی زۆر گەڕانەوە بۆماڵەوە، یەکێك لە جوولەکەکان لەسەر قەڵایەك وەستا و سەیری شتێکی دەکرد، کەچی پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵەکەی بە سپی ڕەنگی بینی بە چاکی دەردەکەوتن، کابرای جوولەکە خۆی نەگرت و بەوپەڕی توانایەوە هاواری کرد ئەی کۆمەڵی عەرەب ئەوە ئەو پاریتەنانە کە چاوەڕێی دەکەن موسڵمانانیش نەوینە چەك و لە دەرەوە چوون بۆ پێشوازی

---

[1] -بوخاری و موسلیم لە صەحیحەکانیاندا هێناویانە، لە البدایة والنهایة ج٣ ص١٨٧ -١٨٨ دا واهاتووە، ئیبن ئەبی شەیبە هێناویەتی، ئیبن سەعد ج٣ ص٨٠ بەوجۆرە بە زیادەیەکەوە بە دوورو درێژی هێناویەتی، ئیبن خوزەیموو کەسانی دیکەش هێناویانە، لە الکنز العمال ج٨ ص٣٣٠ یشدا هاتووە.

پێغەمبەر (ﷺ) لای ڕاستی گرتن تا لەناو بەنی عەمری کوڕی عەوف دابەزی، ئەمەش لە ڕۆژی دووی مانگی ربیع الاولدا بوو، ئەبوبەکر هەستا و پێغەمبەریش(ﷺ) بەبێ دەنگی دانیشت، هەر پشتیوانێك دەهات کە پێغەمبەری نەدیبوو سەلامی لە ئەبوبەکر دەکرد تا خۆر دای لە پێغەمبەر (ﷺ)، ئەبوبەکر بە عەباکەی سێبەری بۆ کرد، ئینجا خەڵکی ئەوکات زانیان ئەوە پێغەمبەری خوایە، پێغەمبەر (ﷺ) لەناو بەنی عەمری کوڕی عەفدا زیاتر لە سیانزە شەو مایەوەو ئەو مزگەوتەی بنیادنا کە لەسەر تەقوا بنیاد نرا و تیایدا نوێژی دەکرد، پاشان سواری وشترەکەی بوو و خەڵکیش لەگەڵیدا چوون تا لای مزگەوتی پێغەمبەر (ﷺ) لە مەدینە وشترەکەی وەستاندو دایکوتا، ئەوەیە کە ئەو ڕۆژە موسڵمانانێك نوێژیان تێدا دەکردو شوێنی دارخورمای سەهل و سوهەیل بوو کە دوو منداڵی هەتیو بوون لە ماڵی سەعدی کوڕی زارەدا (رضي الله عنه) بوون، کاتێك وشترەکەی لەوێ دایکوتا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی پشت بە خوا ئێرە دەبێت، پاشان دوو منداڵەکەی بانگکردو لە بری شتی بۆ پێشنیار کردن تا بیکات بە مزگەوت، ئەوانیش وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە خەڵاتی تۆی دەکەین بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) ڕازی نەبوو بەوە تا ئەوەی لێی کڕین و دوایی مزگەوتی بنیادنا، پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵیاندا خشتی هەڵدەگرت بۆ بنیادنانی لە کاتی خشت بردنەکەدا دەیفەرموو:

هذا العمل لاحمال خيبر　　　هذا ابر ربنا و اطهر

دەیفەرموو:

لا هم ان الاجر اجر الاخرة　　　فارصم الانصار والمهاجرة

شیعری یەکێك لە موسڵمانانی وتەوە کە ناوەکەی پێ نەوتم، ئیبن شەهاب دەڵێت: لە فەرموودەکەدا نەمان بیستوە پێغەمبەر (ﷺ) شعرێکی تەواو بڵێت جگە لەمانە ئەمە دەقی بوخاریە. موسلیم نەیهێناوە، لە چەند ڕوویەکی ترەوە چەند شاهیدێکی هەن، لە البداية والنهاية ج٣ ص١٨٦ دا واهاتووە.

ئەحمەد لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: من لەناو منداڵاندا بووم دەیانوت: محمد هات، هەردەگەڕام و هیچم نەدەبینی، پاشان وتیان محمد هات، دووبارە هەوڵم دا و هیچم نەدی، دەڵێت تا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەبوبەکری هاوڕێی (رضي الله عنه) هاتن لە کەلاوەیەکی مەدینەدا خۆمان داگرتبوو، پاشان کەسێکی خەڵکی لادێیان نارد تا پشتیوانان ئاگادار بکەنەوە، ئەوانیش نزیکەی پێنج سەد پشتیوان بوون چوون بۆ پێشوازییان و گەیشتنە لایان، پشتیوانان وتیان: بە دڵنیایی و گوێڕایەڵکراوی فەرموون، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵەکەشی لەناویاندا ڕێیان دەبڕی، خەڵکی مەدینە هاتنە دەرەوە تا ئەوەی کچۆڵە گەنج و جوانەکانیش لەسەرماڵەکان بۆی دەڕوانین و دەیانوت کامیان ئەوە؟ کامیان ئەوە؟ دیمەنی وامان نەدیبوو، ئەنەس دەڵێت: ئەو ڕۆژەی هات بۆلامان و ئەو ڕۆژەی کۆچی دوایی کرد دوو ڕۆژ بوون وێنەیانم نەدیووە[1،2].

بەیهەقی لە ئیبن عائیشەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هات بۆ مەدینە ژن و منداڵان دەیانوت:

| | |
|---|---|
| طلع البدر علينا | من ثنيات الوداع |
| وجب الشكر علينا | ما دعا لله داع[3] |

---

[1] – صحيح.

[2] – بەیهەقیش هەر بەوجۆرە هێناویەتی، لە البداية والنهاية ج٣ ص١٩٧ دا هێناویەتی.

[3] – ضعيف.

# (کۆچکردنی عومەری کوڕی خەتابو هاوەڵان (رضي الله عنهم))

ئیبن ئەبی شەیبە لە بەرائی کوڕی عازبەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: یەکەم کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هات بۆ لامان مەصعەبی کوڕی عومەیر و ئیبن ئوم مەکتووم (رضي الله عنه) بوون، قورئانیان پێ دەخوێندین، پاشان عەممار و بیلال و سەعد (رضي الله عنه) هاتن، پاشان عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) بە بیست کەسەوە هات، پاشان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هات، نەمبینیوە خەڵکی مەدینە هێندەی هاتنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە هیچ دڵخۆش بووبن، هەرکە هات ئەم ئایەتەم خوێند(سبح اسم ربك الاعلى).[1]

ئەحمەد لە فەرموودەکەی بەراء لە ئەبوبەکرەوە (رضي الله عنه) لەبارەی کۆچەوە هێناویەتی، بەراء دەڵێت: یەکەم کۆچەر کە هات بۆلامان موصعەبی کوڕی عومەیر بوو لە بەنی عەبدودار، پاشان ئیبن ئوم مەکتومی کوێر (رضي الله عنه) یەکێك لە بەنی فەهر بوو هات بۆلامان، پاشان عومەری کوڕی خەتتاب بە بیست کەسەوە هات، وتمان: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چی کرد (بۆچی نەهات؟) وتی: بە دوامەوەیە، پاشان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەبوبەکریش (رضي الله عنه) پێکەوە هاتن، بەراء دەڵێت: کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هات چەند سورەتێکم خوێندن[2][3].

ئیبن ئیسحاق لە نافع لە ئیبن عومەر لە عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك ویستم بچم بۆ مەدینە من و عەییاشی کوڕی ئەبی ڕەبیعە و هیشامی کوڕی عاش (رضي الله عنه) بەڵێنمان دا لە (تناضب) لە ئەضای بەنی غەففار لەسەر (سەرف) یەك ببینین، وتمان هەرکەس بەیانی لەوێ نەبوو با ئەو دوانەکەی تر بچن. دەڵێت: من و عەییاش گەیشتینە ئەوێ، بەڵام هیشام نەهاتوو تووش بوو، کە چووینە مەدینە بۆلای بەنی عەمری کوڕی عەوف لە قوباء، ئەبوجەهل و حارسی کوڕی هیشام هاتن بۆلای عەییاش – ئامۆزا و برای شیرییان بوو– هاتنە مەدینە و پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لە مەککە بوو، وتیان: دایکت نەزری کردووە شانە نەدات لە سەری و نەچێتە بەر سێبەر تا نەگەڕێیتەوە، ئەویش دڵی بۆی سووتا، پێم وت: سوێند بە خوا ئەمانە دەیانەوێت زیان بە ئایینەکەت بگەیەنن، وریایان بە، سوێند بە خوا ئەگەر ڕشك و ئەسپێ سەری دایکت ئازار بدەن شانە دەکات، کە گەرمای مەککەش زۆری بۆ

---

[1] – لە کنز العمال ج٨ ص٣٣١دا واهاتووە.

[2] – صحيح.

[3] – بوخاریش هێناویەتی، لە البداية والنهاية ج٨ ص١٨٨یشدا هاتووە.

هێنا دەچێتەوە بەر سێبەر، وتی: سوێندەکەی دایکم دەپارێزم و لەوێ برێك پارەم هەیە دەیهێنم، عومەر (رضي الله عنه) دەڵێت وتم: بە خوا دەزانیت من لەناو قورەیشدا لە هەمووان زیاتر پارەم هەیە دەی نیوەی پارەکەم بۆ تۆ بەڵام مەڕۆ لەگەڵیان، بەڵام ڕازی نەبوو و وتی: دەچم، کە بڕیاری دا هەر بچێت وتم: ئەگەر هەر دەڕۆیت وشترەکەی من ببە، چونکە ڕێك و پێك و لەبارە و سواری بە، ئەگەر هۆزەکەت ترسێکیان هێنایە ڕێت بەوە ڕاکە، ئەویش بردی و لەگەڵیان چوو، لە ڕێگەدا ئەبوجەهل پێی وت: برا گیان بە خوا وشترەکەم بێزاری کردوم، بۆچی ئەو وشترەت نادەیتە لای من؟ وتی باشە، ڕاوەستا تا بیگۆڕم، کە دابەزین هەڵمەتیان بۆ برد و بەستیانەوە و بردیانەوە مەککە و تووشیان کرد، عومەر (رضي الله عنه) دەڵێت: خوا تەوبە لەو کەسە وەرناگرێت کە تووش بووە ئەوانیش وایان بە خۆیان دەوت تا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هاتە مەدینە و خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند (قل یا عبادي الذین اسرفوا علی انفسهم لاتقنطوا من رحمة الله.........واتبعوا احسن ما انزل الیکم من ربکم من قبل ان یاتیکم العذاب بغتة وانتم لا تشعرون) عومەر دەڵێت: ئەو ئایەتەم نووسی و ناردم بۆلای هیشامی کوڕی عاص، هیشام دەڵێت: کە بۆم هات لە (ذي طوی) بووم دەچوومە ئەوێ و ورد دەبوومەوە و دەمخوێندەوە و لێی تێنەدەگەیشتم تا ئەوەی وتم خوایە تێم بگەیەنە لێی، خوای گەورە خستیە دڵمەوە کە ئەمە لەسەر ئێمە دابەزیوە سەبارەت بەوەی چیمان بە خۆمان دەوت و چیمان پێ دەوترا، دەڵێت: گەڕامەوە بۆ لای وشترەکەم و سواری بووم و خۆم گەیاند بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە مەدینە[1].[2]

---

[1] - صحیح.

[2] - لە البدایة والنهایە ج٣ ص١٧٢ دا واهاتووە. ئیبن سکن هێناویەتی بە سەنەدی صەحیح لە ئیبن ئیسحاقەوە بە سەنەدی خۆی بە دوورو درێژی هێناویەتی. هەروەك ئیبن حەجەر لە الاصابة ج٣ ص٦٠٤ دا و بەزاریش بە دوورو درێژی بەوشێوە ئاماژەیان پێ کردووە، هەیسەمی ج٦ ص٦١ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن، هەروەها بەیهەقی ج٩ ص١٣ و ئیبن سەعد ج٣ ص١٩٤ و ئیبن مەردەویە و بەزار لە عومەرەوە (رضي الله عنه) هێناویانە، لە کنزالعمال ج١ ص٢٦٢ یشدا هاتووە، تەبەرانیش بە مورسەلی لە عروەوە هێناویەتی و لە سەنەدەکەدا ئیبن لهیعە هەیە کە جۆرە لاوازیەکی لێ بەدیدەکرێت، هەروەها بە مورسەلی لە ئیبن شهابەوە هێناویەتی و کەسەکانی سەنەدەکەشی کەسانی صەحیحن، هەروەها لە المجمع ج٦ ص٦٢دا بەوجۆرە هاتووە.

# (کۆچکردنی عوسمانی کوڕی عەففان (رضي الله عنه))

بەیهەقی لە قەتادەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: یەکەم کەس بە ماڵ و منداڵیەوە لە پێناو خوادا کۆچی کرد عوسمانی کوڕی عەففان(رضي الله عنه) بوو، لە نەضری کوڕی ئەنەسم بیست دەیوت: گوێم لە ئەبوحەمزە – ئەنەس (رضي الله عنه)– بوو دەیوت: عوسمانی کوڕی عەففان و ڕوقیەی ژنی (رضي الله عنها) کچی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چوون بۆ خاکی حەبەشە، هەواڵیان درەنگ هاتەوە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئافرەتێکی قورەیشی هات و وتی: ئەی موحەممەد زاواکەت و ژنەکەیم بینی، فەرمووی (لە چ بارێکدا بینیت؟) وتی: بینیم ژنەکەی لەسەر ئەم گوێدرێژە هێواشانە سوارکردبوو و خۆیشی دەیبرد بە ڕێوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (خوا هاودەمیان بێت، عوسمان یەکەم کەسە لەدوای لوط (علیه السلام) بە ماڵ و منداڵیەوە کۆچ بکات)[1].[2]

ئیبنولموبارەك لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) بەو واتایە هێناویەتی، لە الاصابە ج٤ ص٣٠٥ یشدا هاتووە، تەبەرانی لە ئەنەسەوە بەو واتایە هێناویەتی، لە فەرموودەکەیدا هاتووە: هەواڵیان نەگەیشتە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەچوو و دەگەڕا تا هەواڵیان بزانێت، تا ئافرەتێك هات و هەواڵی پێدا.[3]

---

[1] – ضعیف.

[2] – لە البدایة والنهایة ج٣ ص٦٦ دا واهاتووە.

[3] – هەیسەمی ج٨ ص٨١ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا حەسەنی کوڕی زیادی بەرجەمی هەیە کە نایناسم، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە جێ متمانەن. تەواو.

## (کۆچکردنی عەلی کوڕی ئەبوتالیب (رضي الله عنه))

ئیبن سەعد لە عەلیەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە کۆچکردنیدا چوو بۆ مەدینە فەرمانی بە من کرد تا لە دوای خۆی بمێنمەوە بۆ ئەوەی سپاردەکانی خەڵك بدەمەوە کە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)بوو بۆیە پێی دەوترا ئەمین (دەستپاك) سێ ڕۆژ مامەوە، ڕۆژێك مامەوەو خۆم نەشاردەوە، دوایی کەوتمە ڕێ‌و ڕێی پێغەمبەر م(صلى الله عليه وسلم) گرتەبەر، تا هاتمەلای بەنی عەمری کوڕی عەوف‌و پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) دابەزیبوو، منیش لای کەاسومی کوڕی هیدم دابەزیم، ئەویٚ شوێنی دابەزینی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو.[١]

## (کۆچکردنی جەعفەری کوڕی ئەبووتالیب‌و هاوەڵان (رضي الله عنهم) بۆ حەبەشەو دواتریش بۆ مەدینە)

ئەحمەدو تەبەرانی –کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن– لە مەحەمەدی کوڕی حاتەبەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (اني رايت ارضا ذات نخل فاخرجوا) واتە(من خاکێکی خاوەن دارخورمام بینی دەی بڕۆن) دەڵێت: حاطەب‌و جەعفەر (رضي الله عنه) لە دەریاوە چوون، منیش لەو کەشتیەدا لە دایك بووم.[٢،٣]

تەبەرانی و بەزاریش لە عومەیری کوڕی ئیسحاقەوە هێناویانە دەڵێت: جەعفەر (رضي الله عنه) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا مۆڵەتم بدە تا بچمە خاکێك تیایدا خوا بپەرستم‌و لە کەس نەترسم، ئەویش مۆڵەتی پێدا، جەعفەر چوو بۆلای نەجاشی، فەرموودەکە بە دوورو درێژی دێنێت وەك دواتر دەیهێنین.[٤]

---

[١] – لە کنز العمال ج٨ ص٣٣٥ دا واهاتووە.

[٢] – صحيح.

[٣] – لە مجمع الزوائدی هەیسەمی ج٦ ص٢٧ دا واهاتووە.

[٤] – هەیسەمی ج٦ ص٢٩ دەڵێت: ئیبن حەببان و چەندێکی دی متمانە دەدەن بە عومەیری کوڕی ئیسحاق، سوکە قسەیەکی لەسەرە بەڵام شتێکی وانیە، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە صەصیحن. تەواو.

ئیبن ئیسحاق لە ئوم سەلەمەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: کاتێک مەککە بۆ هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سەخت بوو و ئازار دران و تووشی ئەو بەڵاو سەختیەی ڕێی ئایینیان بوون و پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) نەیتوانی ڕێ بەوشتە بگرێت، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خۆی لە پەنای هۆزەکەی و مامیدا بوو و زیان و ئازارێک کە بە هاوەڵان دەگەیشت بەم نەدەگەیشت، بۆیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموون (ان بارض الحبشة ملكا لايظلم احد عنده فالحقوا ببلاده حتى يجعل الله لكم فرجا ومخرجا مما انتم فية) واتە(لە خاکی حەبەشەدا پاشایەك هەیە لەلای ئەو کەس ستەمی لێ ناکرێت، بچن بۆ وڵاتی تا خوای گەورە دەروو و دەروازەیەکتان لێ دەکاتەوە لەو بارەی لەسەری بوون) ئێمەیش دەستە بە دەستە چووین تا لەوێ کۆبووینەوە، لە چاکترین شوێنەوە چووین بۆلای چاکترین دراوسێ و پەنادەر کە لە ئایینمان بێخەم بووین و تیایدا لە ستەم نەدەترساین، کاتێك قورەیش ئەمەیان بینی خۆیان نەگرت و ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کەسێك بنێرن بۆلای نەجاشی تا لە وڵاتیدا دەرمان بکات و بمانگێڕێتەوە بۆیان بۆیە عەمری کوڕی عاص و عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ڕەبیعەیان نارد بۆلای بە کۆمەڵێك دیاریەوە بۆ خۆی و بە نەجاش تریکەکانی، هەرکەسە و لە ئاست خۆیدا خەڵاتی ئامادە کردبوو، پێیان وتن هەر بەتریکە و خەڵاتی خۆی بدەنێ پێش ئەوەی لەسەر ئەوان قسە بکەن، پاشان دیاریەکانیش بدەن بە نەجاشی، ئەگەر توانیتان پێش ئەوەی نەجاشی بیاندوێنێت بیانگێڕنەوە بیکەن، ئەوانیش چوون و واینکرد و دواندنیان و پێیان وتن: هاتووین بۆلای پاشا سەبارەت بەم گێل و گەمژانەمان وازیان لە ئایینی هۆزەکەیان هێناوە و نەهاتوونەتە ناو ئایینی ئێوەشەوە، ئێستا هۆزەکەیان ئێمەیان ناردووە تا پاشا بیانگێڕێتەوە بۆلایان، لەمەدابووین کە ئاماژەیان پێدا تا بیکات، وتیان دەیکەین، پاشان چوون بۆلای نەجاشی و خەڵاتەکانیان پێشکەشکرد و خۆشترین دیاری مەککەش لەلای نەجاش(ادم) (پێستەی خۆشکراو) بوو، کاتێك چوون بۆلای خەڵاتەکانیان بۆ برد پێیانوت: ئەی پادشا دەستەیەکی گەمژە و نەفامەکانمان وازیان لە ئایینی هۆزی خۆیان هێناوە و نەهاتوونەتە ناو ئایینی

ئێوەش، ئاینێکی تازەیان هێناوە نایناسین، پەنایشیان هێناوە بۆ وڵاتی تۆ، خێڵەکانیان باپیرو باوکو مامو کەسیان ئێمەیان ناردووە تا ئەمانەیان بۆ بگێڕینەوە، چونکە ئەوان باشتر ئاگاداریانن، چونکە ئەمانە نەهاتوونەتە ناو ئاینی تۆوە تا بیانپارێزیت، ئەویش تووڕە بوو و دواتر وتی: سوێند بەخوا نایانگێڕمەوە بۆیان تا بانگیان نەکەمو بیاندوێنمو بزانم چی دەڵێن، ئەوانە پەنایان هێناوە بۆ وڵاتمو لەناو هەمواندا پەنای منیان هەڵبژاردووە، ئەگەر قسەکەی ئێوە وابێت دەیانگێڕمەوە، ئەگەر نا پەنایان دەدەمو وازیان لێناهێنمو ناهێڵم بەری چاویان کلی پێوەبێت، کە چوونەلای سەلامیان کردو کڕوونشیان بۆ نەبرد، وتی: ئەی کۆمەڵ پێم ناڵێن بۆچی وەك ئەوانەی هۆزەکەتان دێنەلام سوجدەم بۆ نابەن؟ پێم بڵێن ئێوە سەبارەت بە عیسا (علیه السلام) چی دەڵێن؟ ئاینتان چیە؟ ئێوە مەسیحین؟ وتیان: نا، وتی: ئەی جوولەکەن؟ وتیان: نا، وتی:ئەی لەسەر ئاینی هۆزەکەتانن؟ وتیان: نا، وتی: ئیتر ئاینتان چیە؟ وتیان: ئیسلام، وتی: ئیسلام چیە؟ وتیان: خوا دەپەرستینو هیچ هاوەڵێکی بۆ دانانێین، وتی: کێ ئەم ئاینەی بۆ هێناون؟ وتیان: کەسێك لە خۆمان کە ڕەچەڵەكو ناوبانگی دەناسین خوای گەورە وەك چۆن پێغەمبەرانی پێشتری نارد ئەمیشی نارد بۆمان، فەرمانمان پێدەکات بە چاکەو بەخشینو وەفاداریو سپاردەدانەوە، ڕێگریشمان لێدەکات لەوەی بت بپەرستینو دەڵێت خوای تاكو تەنهای بێ هاوەڵ بپەرستن، ئێمەش باوەڕمان پێکردو شارەزای فەرمایشی خوا بووینو زانیمان ئەوەی هێناویەتی لە خواوەیە، کاتێك ئەمەمان کرد هۆزەکەمان لە دژی ئێمە و پێغەمبەری ڕاستگۆ هەستانو بە درۆیانزانیو ویستیان بیکوژنن دەیانویست ئێمە بت بپەرستین، ئێمەشی ڕامانکرد بۆلای تۆ بە ئاینو خوێنمانەوە لە دەست هۆزەکەمان ڕمانکرد بۆلات، ئەویش وتی: سوێند بە خوا ئەمە لە هەمان چرادانەوە هاتووە کە فەرمانی بە مووسا کرد، جەعفەر (رضي الله عنه) وتی: ئێمەش ئەو سەلامەمان لێکردیت کە لەناو خۆماندا بە کاری دێنین، سەبارەت بە عیسای کوڕی

مەریەمیش (علیه السلام) بەندەو نێردراوی خوایەو وتەی خۆیەتی و ناردویەتی بۆ مەریەم و لە ڕۆحی خۆیەتی، کوڕی ئافرەتە داوێن پاکەکەیە.

ئەویش بڕیٚ خۆڵی هەڵگرت و وتی: سوێند بە خوا کوڕی مەریەم لە کێشی ئەمە زیاتر نەبووە، گەورەکانی حەبەشە وتیان: سوێند بە خوا ئەگەر حەبەشە بیبیستێت لاتدەبات، وتی: سوێند بە خوا هەرگیز جگە لەوە زیاتر لەسەر عیسا (علیه السلام) ناڵێم کاتێك خوا دەسەڵاتی بۆ گێڕامەوە گوێڕایەڵی خەڵکی نەکرد تا ئێستا من گوێڕایەڵی خەڵك بکەم سەبارەت بە ئاییني خوا، -پەنا بە خوا لە شتی وا-.[1,2]

ئەحمەد لە ئوم سەلەمەوە (رضي الله عنها) خێزانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە دوورو درێژی هێناویەتی، لە فەرموودەکەیدا هاتووە دەڵێت: پاشان ناردی بە شوێن هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)داو بانگی کردن، کاتێك نێردراوەکەی هات لە نێوان خۆیاندا کۆبوونەوەو وتیان: ئەگەر چووین بۆلای چی پێبڵێین؟ وتیان: سوێند بە خوا ئەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فێری کردووین و فەرمانی پێکردوین هەرئەوە دەڵێین ئیتر چی دەبێت با ببێت، کە چوون بۆلای نەجاشی قەشەکانی بانگ کرد، پەڕاوەکانیان لە دەوریدا کۆکردەوەو ئەویش پرسیاری لیٚ کردن ئەو ئایینەی پێی لە هۆزەکەتان جیابوونەتەوە چیە لە کاتێکدا نایەنە ناو ئاییني من و ئاییني هیچ گەلێکی دیکەشەوە؟ ئوم سەلەمە (رضي الله عنها) دەڵێت: جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب (رضي الله عنه) دواندی و وتی: ئەی پاشا ئێمە گەلێك بووین نەزان بووین و بتمان دەپەرست و مردارەوەبوومان دەخوارد و داوێن پیسیمان دەکرد و پەیوەندی خزمایەتیمان دەپچڕاند و دراوسێیەتیمان لە بیردەکرد و بە هێزمان هەژارمانی دەچەوساندنەوە، بەوجۆرە بووین تا خوای گەورە پێغەمبەرێکی لە خۆمان بۆ ناردین کە ڕەچەڵەك و ڕاستگۆیی و دەستپاکی و پاکداوێنی ئەومان لا ئاشکرابوو، بانگی کردین بۆلای

---

[1] – صحيح.

[2] – لە البداية والنهاية ج٣ ص٧٢ دا واهاتووە.

خوای تاك و تەنها تا بیپەرستین و واز لە پەرستشی بتەکانی خۆمان و باو باپیرانمان بێنین لە پەرستشی بەرد و بت، فەرمانی پێکردین قسەی ڕاست بکەین، سپاردە بدەینەوە، دراوسێیەتیمان باش بێت، پەیوەندی خزمایەنیمان هەبێت، واز لە حەرام و خوێنڕێژی بهێنین، ڕێگری لێدەکردین لە داوێن پیسی و شایەتی درۆ و خواردنی ماڵی هەتیو و بوختان کردن بۆ ئافرەتی پاك داوێن، فەرمانی پێکردین خوای تاك و تەنها بپەرستین و هیچ هاوەڵێکی بۆ دانەنێین، نوێژ بکەین و زەکات بدەت، ئینجا بەش و پایەکانی ئیسلامی ژمارد، ئێمەش بڕوامان پێ هێنا و شوێنی کەوتین، خوای تاك و بێهاوتامان پەرست و حەڵاڵ و حەرامامان گرتەبەر، هۆزەکەشمان هەڵمەتیان هێنایە سەرمان و سزایان داین تا واز لە ئایینمان بێنین و بتەکان لە جیاتی خوا بپەرستین و پیسیەکان بە ڕەوا بزانین، کاتێك نەیانتوانی و هەر ستەمیان لێکردین و ئازاریان داین هاتین بۆ وڵاتی تۆو لەناو هەمواندا تۆمان هەڵبژارد و پەنای تۆمان پێ باش بوو بەو هیوایەی لای تۆ ستەممان لێ نەکرێت ئەی پاشا.

نەجاشی وتی: لەوەی خوا بۆی دابەزاندووە هیچ دەزانیت بیڵێیت؟ جەعفەر (ﷺ) وتی: بەڵێ، نەجاشی پێی وت: دەی بیخوێنە، ئەویش بڕێك لە (کهیعص) ی بەسەردا خوێند، نەجاشی هێندە گریا تا ڕیشی تەڕبوو، قەشەکانیشی گریان تا پەڕاوەکانیان تەڕبوون کاتێك گوێیان لەو قورئانە بوو، پاشان نەجاشی وتی: ئەمە و ئەوەی مووسا هێنای لە یەك چرادانەوەن، بڕۆن بە خوا هەرگیزا و هەرگیز نایاندەمەوە دەستتان.

ئوم سەلەمە (رضي الله عنها) کاتێك لەلای چوون عەمری کوڕی عاص وتی: سوێند بەخوا سبەینێ دیم لەکەداریان دەکەم لەلای و ڕیشەیان دەردێنم، عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ڕەبیعە – کە لەناوماندا لە هەموومان چاکتر بوو– پێی وت: وامەکە چونکە ئەوانە ئەگەر چی پێچەوانەمانن بەڵام کەس و خزمیان هەیە، وتی: سوێند بە خوا دەڵێم ئەوان دەڵێن عیسا کوڕی مەریەمە و بەندەیە، پاشان بەیانی چوو بۆلای وتی: ئەی پاشا ئەمانە سەبارەت بە عیسا قسەیەکی سەخت دەکەن بنێرە بە شوێنیاندا و پرسیاریان لێ بکە، ئەویش ناردی بە شوێنیاندا تاپرسیاریان لێبکات، ئوم سەلەمە دەڵێت: بارێکی زۆر سەختمان تووش بوو، هەموو کۆبوونەوە و وتیان: سەبارەت بە عیسای کوڕی مەریەم چی بڵێین؟ جەعفەری کوڕی

ئەبوتالیب پێی وتن ئەوە دەڵێین کە پێغەمبەرەکەمان لە بارەیەوە وتویەتی ئەو بەندەو نێردراوی خواو ڕۆحیەتی و وتەی خۆیەتی ناردویەتی بۆ مەریەمی پاکداوێن، نەجاشی دەستی خستە سەرزەوی و بڕێ خۆڵی هەڵگرت و وتی: سوێند بە خوا عیسای کوڕی مەریەم لەوە زیاتر نیە، بەتریکەکانی هەڵچوون و ناڕازی بوون، نەجاشی وتی: بە خوا ئەگەریش هەڵبچن هەروا دەڵێم، بڕۆن ئێوە پارێزراون، هەرکەس قسەتان پێ بڵێت(ڕێتان پێ بگرێت) سزا دەدرێت، حەزناکەم شاخێك زێڕم هەبێت بەڵام کەس لە ئێوە ئازار بدەم، دیاریەکانیان بۆ بگێڕنەوە هیچ پێویستم پێیان نیە، سوێند بە خوا کاتێك خوا دەسەڵاتەکەمی بۆ گێڕامەوە بەرتیلی لێ وەرنەگرتم تا من وەری بگرم، گوێڕایەڵی خەڵکی نەکرد تا من گوێڕایەڵیان بکەم، ئەوانیش بە بێزاری و سەرشۆڕی و دیاریەکانیانەوە لەلای دەرچوون و گەڕانەوە ئێمەش لەلای بە چاکترین شێوە ماینەوە، سوێند بە خوا لەوکاتەدا کەسێك بوو بە ڕکەبەری دەسەڵاتی، بە خوا پێشتر خەفەتمان نەدەزانی، بەڵام ئەمە گەورەترین خەتەتمان بوو، نەوەك ئەو کەسە بەسەر نەجاشیدا سەرکەوێت و ئەو مافەمان نەزانێت کە نەجاشی دەیزانی، نەجاشی چوو و بانی نیل لە نێوانیاندا بوو، هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) فەموویان کێ دەچێت بۆ ئەوێ و دواتر بێتەوە لامان؟ زوبەیری کوڕی عەوام (رضي الله عنه) وتی: من، لە هەمووومان تەمەنی کەمتر بوو، ئەوانیش مەشکەیەکیان هێنا و فوویان تێکرد و بەستیان بەسەر سنگیەوە، مەلەی پێ کرد تا چوویە ئەو بەشەی نیل کە لەوێ شەڕیان دەکرد، پاشان چوو تا گەیشتە لایان، ئێمەیش دەپاڕاینەوە لە خوا تا نەجاشی بەسەر دوژمنەکەیدا سەربخات و لە وڵاتیدا دەسەڵاتی بۆ بمێنێتەوە، کاروباری حەبەشەی بۆ سەقامگیر بوو و ئێمەش لەلای بووین لە چاکترین باردا تا هاتینەوە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) کە لە مەککە بوو.[1] [2]

---

[1]- صحیح.

[2]- هەیسەمی ج٦ ص٢٧ دەڵێت: ئەحمەد گێڕاویەتیەوە و کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن جگە لە ئیسحاق، ئەبونەعیمیش لە الحلیة ج١ ص١١٥ دا لە ڕێگەی ئیبن ئیسحاقەوە بەو جۆرەو بە دوورو درێژی هێناویەتی، بەیهەقی ج٩ ص٩ ناوەڕۆکی فەرموودەکە لە ڕێگەی ئیبن ئیسحاقەوە بەو دەقە دێنێت، پاشان دەڵێت: فەرموودەکەی بە دوورو درێژی هێناوە، لە السیر ج٩ص١١٤ یشدا فەرموودەکەی هێناوە.

ئیمامی ئەحمەد لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناردینی بۆلای نەجاشی، ئێمەش نزیکی هەشتا کەس بووین لەوانە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود و عەبدوڵڵای کوڕی عەلاتەفەو عوسمانی کوڕی مەظعون و ئەبوموسا (رضي الله عنه) هاتن بۆلای نەجاشی، قورەیش عەمری کوڕی عاص و عەمماری کوڕی وەلیدیان بە خەڵاتەوە نارد، کە هاتنە لای نەجاشی سوجدەیان بۆ برد، پاشان بە ڕاست و چەپدا هاتن بە دەوریا و پاشان پێیان وت: دەستەیەك لە ئامۆزاکانمان هاتوونەتە خاکی تۆ و پشتیان هەڵکردووە لە ئێمە و خەڵکمان، وتی: ئەوانە کوان؟ وتیان: لە خاکی تۆدان بنێرە بە شوێنیاندا، ئەویش ناردی بە شوێنیاندا، جەعفەر (رضي الله عنه) وتی: ئەمڕۆ من وتەبێژتانم، ئەوانیش کەوتنە شوێنی، چوو سەلامی کرد و سوجدەی نەبرد، پێیان وت: ئەوە چیە سوجدە نابەی بۆ پاشا؟ وتی: ئێمە تەنها سوجدە بۆ خوای گەورە دەبەین، وتی: ئەمە بۆ؟ وتی: خوای گەورە پێغەمبەرێکی بۆ ناردین، فەرمانی پێکردین تا جگە لە خوا سوجدە بۆ کەس نەبەین، فەرمانی پێکردین بە نوێژ و زەکات، عەمر وتی: ئەوانە لە مەسەلەی عیسای کوڕی مەریەمدا هاوڕات نین، نەجاشی وتی: سەبارەت بە عیسای کوڕی مەریەم و دایکی چی دەڵێن؟ جەعفەر وتی: ئەوەی خوا فەرموویەتی، وتە و ڕۆحی خوایە و ناردوویەتی بۆ مەریەمی پاك داوێن کە مرۆڤ نزیکی نەکەوتووەتەوە و کوڕی لە مرۆڤ نەبووە، ئەویش مشتێکی لە خۆڵە هەڵگرت و وتی: ئەی کۆمەڵی حەبەشە و قەشە و ڕوهبانەکان سوێند بە خوا لەوەی ئێمە دەیڵێین جگە لەمە زیاتر ناڵێن، بەخێربێن بە خۆتان و ئەوەی لەلایەوە هاتوون، شایەتی دەدەم ئەو پێغەمبەری خوایە و ئەوەیە کە لە ئینجیلدا دەمانخوێندەوە، ئەو پێغەمبەرەیە کە عیسای کوڕی مەریەم موژدەی پێ داوە، لە کوێ حەز دەکەن دابەزن، سوێند بە خوا ئەگەر من پاشای ئێرە نەبوومایە دەهاتم بۆلای تا ناعلەکانی بۆ

هەڵبگرم، فەرمانی کرد بەو دووانەکە تا خەڵاتەکانیان ببەنەوەو بچنەوە، پاشان ئیبن مەسعود (رضي الله عنه) پەلەی کرد تا فریای بەدر کەوت[1][2].

تەبەرانیش لە ئەبوموساوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێکردین تا لەگەڵ جەعفەری کوڕی ئەبوتالیبدا بچین بۆ لای نەجاشی، قورەیش ئەمەی بیستەوەو عەمری کوڕی عاص و عەمماری کوڕی وەلیدیان نارد، ئینجا بەو واتایەی فەرموودەکە ئیبن مەسعود هێناویەتی، تیایدا هاتووە: نەجاشی وتی: ئەگەر من پاشای ئێرە نەبوومایە دەهاتم تا نەعلەکانی ماچ بکەم، چیتان پێ خۆشە لە خاکمدا بمێننەوە، فەرمانی پێ کردین نان و جل و بەرگیان پێ داین.[3]

ئیبن عەساکیر لە جەعفەری کوڕی ئەبوتالیبەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: قورەیشی عەمری کوڕی عاص و عەمارەی کوڕی وەلیدیان بە خەڵاتی ئەبوسوفیانەوە نارد بۆلای نەجاسی و پێیان وت – ئێمە لەلای بووین– هەندێ لە گێل و گەمژەکانمان هاتوون بۆلای تۆ، بیاندەرەوە پێمان، وتی: نا تا گوێ لە قسەیان دەگرم، ناردی بە شوێنماندا وتی: ئەمانە چی دەڵێن؟ وتمان: ئەمانە گەلێکن بت دەپەرستن، خوای گەورەیش پێغەمبەرێکی بۆ ناردووین بڕوامان پێ هێناوەو بە ڕاستی دەزانین،

---

[1] – حسن.

[2] – ئەم سەنەدە بە هێزەو دەقەکەشی حەسەنە ئیبن کەسیر لە البدایە والنهایە ج٣ ص٦٩ دا ئەمە دەڵێت، ئیبن حەجەریش لە فتح الباری ج٧ ص١٣٠ دا سەنەدەکەی بە حەسەن دادەنێت، هەیسەمی ج٦ ص٢٤ پاش هێنانی فەرموودەکە دەڵێت: تەبەرانی گێڕاویەتیەوەو لە سەنەدەکەدا خودەیجی کوڕی موعاویە هەیە کە ئەبوحاتەم متمانەی پێ دەدات، دەڵێت: لاوازی لە هەندێ فەرموودەیدا هەیە، ئیبن موعین و چەندێکی دی بە لاوازی دادەنێن، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە صەحیحن. تەواو.

[3] – هەیسەمی دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن ج٦ ص٣١، هەروەها ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص١١٤فەرموودەکەی ئەبوموسای هێناوە، بەیهەقی دەڵێت: ئەو سەنەدە صەحیحە، لە البدایة والنهایة ج٣ ص٧١ یشدا هاتووە.

نەجاشی پێ وت: ئەمانە کۆیلەی ئێوەن؟ وتیان: نا، وتی: ئەی قەرزتان هەیە بەسەریانەوە؟ ویان: نا، وتی: دەی وازیان لێ بهێنن، دەڵێت: ئێمەیش لەلای چووین، عەمری کوڕی عاص وتی: ئەمانە سەبارەت بە عیسا قسەی تۆیان نیە، وتی: ئەگەر هەمان قسەی منیان لەسەر عسیا نەبێت ناهێڵم ساتێکیش لە خاکمدابن، ناردی بە شوێنماندا، بانگکردنی دووەم لە یەکەم لامان سەختتر بوو، وتی: پێغەمبەرەکەتان سەبارەت بە عیسای کوڕی مەریەم چی دەڵێت؟ وتمان: دەڵێت: ڕۆحی خواو وتەیەتی ناردوویەتی بۆ (مەریەمی پاك داوێن)، ئەویش ناردی و وتی: فڵان قەشەو فڵان ڕاهیبم بۆ بانگ بکەن، هەندێکیان هاتن بۆلای وتی: سەبارەت بە عیسای کوڕی مەریەم چی دەڵێن؟ وتیان: تۆ لە ئێمە باشتر دەزانیت ئیتر ئێمە چی بڵێین؟ نەجاشیش مشتێك خۆڵی هەڵگرت و وتی: عسیا جگە لەوەی ئەوان دەیڵێن هیچی تر نیە، لەمە زیاتر نیە، دوایی وتی: کەس ئازارتان دەدات؟ وتمان: بەڵێ، کەسێکی بانگ کرد وتی: هەرکەس ئازاریان بدات چوار درهەم سزای بدەن، وتی: بەستانە؟ وتمان: نا، ئەویش زیادی کرد، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی کرد بۆ مەدینەو لەوێ سەکەوت پێمان وت: پێغەمبەری خوا (ﷺ) کۆچی کردووە بۆ مەدینەو ئەوانەی بۆمان باسکردیت ئەوانەی کوشتووە، دەمانەوێت بچین بۆلای، ڕێمان بدە، بارگەو بنەی بۆ پێچانەوەو دواتر وتی: بە هاوەڵەکەتان بڵێن چیم بۆ کردوون، ئەمەش هاوەڵێکی منە لەگەڵتان شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خواو ئەویش پێغەمبەری خوایە، پێی بڵێن داوای لێخۆشبوونم بۆ بکات، جەعفەر وتی: کە چووینە مەدینە پێغەمبەر (ﷺ)باوەشی پێدا کردم و دواتر فەرمووی: نازانم بە فەتحی خەیبەر دڵخۆش بم یان بە هاتنی جەعفەر؟ ئەمەش هاوکاتی فەتحی خەیبەر بوو، پاشان دانیشت و نێردراوی نەجاشی وتی: ئەمە جەعفەرەو پرسیاری لێ بکە گەورەمان چی بۆ کردووە؟ وتی: بەڵێ ئەمە و ئەوەوی بۆ کردووین و بارگەو بنەی بۆ پێچاینەوەو شایەتومانیشی هێنا و پێی وتم: پێی بڵێ داوای لێخۆشبوونم بۆ بکات، پێغەمبەر (ﷺ) هەستا و دەستنوێژی گرت، پاشان سێ جار ئەم نزایەی کرد (خوایە لە نەجاشی خۆش بیت)

موسڵمانانیش وتیان: ئامین، جەعفەر دەڵێت: بە نێردراوەیەکم وت: بڕۆ بە هاوەڵەکەت بڵێ چیت بینی لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)[1][2].

ئیبن ئیسحاق لە عەبدولعەزیزی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عامری کوڕی ڕەبیعە لە دایکیەوە (ئوم عەبدوڵڵای کچی ئەبی حەسمەوە (رضی الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: سوێند بە خوا چووین بۆ خاکی حەبەشەو عامریش چوو بوو بۆ هەندێ پێویستیمان عومەر (رضی الله عنه) هاتە ڕێم ئەوکات هێشتا بێ باوەڕبوو، وتی: پێشتر ئازارو ناڕەحەتیمان لەوەوە تووش ببوو، عومەر وتی: ئوم عەبدوڵڵا دەڕۆن؟ وتم: بەڵێ بە خوا لەخاکێکەوە دەچین بۆ خاکی خوا هێندە ئازارتان داین دەڕۆین بەڵکو خوا دەروویەکمان لێ بکاتەوە، ئەویش وتی: خوا یارو هاودەمتان بێت، جۆرە دڵسووتانێکم لابەدیکرد کە پێشتر نەمدیبوو، پاشان چوو و بینینی چوونی ئێمە دڵگرانی کرد، عامر گەڕایەوە و پێم وت: ئەبوعەبدوڵڵا ئەگەر کەمێك لەمەو پێش عومەرت دەبینی چۆن خەفەتی بۆ دەخواردین، وتی: بە تەمایت موسڵمان بێت؟ وتم: بەڵێ، وتی: تا کەرەکەی خەتتاب موسڵمان نەبێت عومەر موسڵمان نابێت، ئەمەش لەتاو ئەو توندیو ڕەقیەی عومەر بەرامبەر بە ئیسلام نواندی وتی[3][4].

---

[1] – ضعیف

[2] – ئیبن عەساکیر دەڵێت: فەرموودەکە حەسەنی غەریبە، لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ج٣ ص٧١ دا واهاتووە، تەبەرانیش لە ڕێگەی ئەسەدی عەمر لە موجالیدەوە هێناویەتی کە هەردووکیشیان لاوازن، هەیسەمی ج٦ ص٢٩ ئەمەی وتووە.

[3] – لە البدایە والنهایە ج٣ ص٧٩ دا هاتووە، ناوی دایکی عەبدوڵڵا لەیلا بوو، لە الاصابة ج٤ ص٤٠٠ دا هاتووە، تەبەرانیش هێناویەتی، حاکم لە المستدرك ج٤ ص٥٨ بە دەقێکی لە ئیبن ئیسحاق لە ڕێگەی ئەوەوە هێناویەتی، بەڵام لە سەنەدەکەدا واهاتووە لە عەبدولعەزیزی کوڕی عامری ڕەبیعە لە باوکیەوە لەدایکیەوە ئوم عەبدوڵڵا ئەم جۆرەیان دیارترە، لە کۆتاییشدا دەڵێت: لەتاو بێهیوابوونیەوە

[4] – حسن.

ئیبن مندە و ئیبن عەساکیر لە خالیدی کوڕی عاصمەوە – لە کۆچەرانی حەبەشە بوو خۆی و عومەری برایشی – هێناویەتی کاتێك چوون بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) کە لێی نزیك بوونەوە بینینی، ئەمەش ساڵێك دوای بەدر بوو، ئەوان دڵگران بوون بەوەی لە بەدردا ئامادە نەبوون، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (بۆچی خەفەت دەخۆن؟ خەڵکی یەك کۆچی بۆ هەیە و ئێوە دوو کۆچتان بۆ هەیە، کاتێك چوون بۆ حەبەشە کۆچتان کردن، دواتر لەلای بەرپرسی حەبەشەوە کۆچتان کرد و هاتن بۆلای من).[1]

بوخاری لە ئەبوموساوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئێمە لە یەمەن کە بیستمان پێغەمبەر (ﷺ) چووە، من و براکانم کە من بچووکتریان بووم یەکێکیان ئەبو بوردە و ئەوی تریشیان ئەبوو روهم بوو چووین کۆچمان کرد بۆلای، – یان وتی چەند کەسێك یان پەنجا و سێ یان پەنجا و دوو کەسی هۆزەکەم بووین چووین – سواری کەشتیەك بووین و کەشتیەکە بردینی بۆلای نەجاشی لە حەبەشە، لەوێ جەعفەری کوڕی ئەبو تالیبمان بینی، لەگەڵی ماینەوە تا هەموو پێکەوە چووین، لە فەتحی خەیبەردا گەیشتین بە پێغەمبەر (ﷺ)، هەندێ خەڵك پێیان دەوتین _ بەوانەی ناو کەشتیەکە – پێش ئێوە کۆچمان کرد، ئەسمای کچی عومەریش لەگەڵ ئێمە هاتبوو چوو بۆلای دایکی باوەڕداران ژنی پێغەمبەر (ﷺ) تا سەردانی بکات، ئەویش لەناو ئەوانەدا بوو کە کۆچیان کرد بوو بۆ حەبەشە (حەفسە ماویەتی (رضي الله عنها)) عومەر (رضي الله عنه) وتی: ئەمە حەبەشیە؟ ئەسما وتی: بەڵێ، وتی: پێش ئێوە کۆچمانکرد، ئێمە شیاوترین بە پێغەمبەر (ﷺ) لە ئێوە، ئەویش تووڕە بوو و وتی: نا سوێند بە خوا ئێوە لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ)دا بوون نانی برسی ئێوەی دەدا و نەفامتانی ئامۆژگاری دەکرد، بەڵام ئێمە لە خاکێکی دوور و ڕەقەوە لە حەبەشە بووین، تەنها لەبەر خوا و پێغەمبەرەکەی، ئەی بە خوا نان و ئاو ناخۆم تا ئەم قسەیەت نەگەیەنمە پێغەمبەر (ﷺ) و پرسیاری لێ بکەم، سوێند بەخوا درۆ و ساختەی تێدا ناکەم، کەم و زیادی ناڵێم،کە چوو بۆلای

---

[1]– لە کنز العمال ج٨ ص٣٣٢ دا واهاتووە.

پێغەمبەر (ﷺ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) عومەر (رضي الله عنه) ئەمە و ئەوەی وت، ئەویش فەرمووی ئەی تۆ چیت پێ وت؟ وتی ئەمە و ئەوەم پێ وت، فەرمووی (لە ئێوە بە من شیاوتر نیە، ئەو و هاوەڵەکانی یەك کۆچیان بۆ هەیە، بەڵام ئێوەی خەڵکی ناو کەشتیەکە دوو کۆچتان بۆ هەیە) دەڵێت: ئەبو موسا و خەڵکی ناو کەشتیەکەم بینی دەستە دەستە دەهاتن بۆ لام و لەو بارەوە پرسیاریان لێ دەکردم، لە دنیای خوادا هیچ نەبوو هێندە دڵیان خۆش بکات کە پێغەمبەر (ﷺ) وای پێ فەرموو بوون، ئەبو بوردە دەڵێت: ئەسما وتی: ئەبو موسام بینی زوو زوو ئەو فەرموودەیەی پێ دووبارە دەکردمەوە، ئەبو بوردە دەڵێت لە ئەبو موساوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (اني لاعرف اصوات رفقة الاشعريين بالقران حين يدخلون بالليل و اعرف منازلهم من اصواتهم بالقران بالليل وان كنت لم ارمنازلهمحين نزلوا بالنهار، و منهم حكيم بن حزام الى لقي العدو – او الخيل – قال لهم ان اصحابي يامرونكم ان تنظروهم)[1] ئیبن سەعد بە سەنەدی صەحیح لە شەعبیەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەسمای کچی عومەیش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا کەسانێك نازمان بەسەردا دەکەن و دەڵێن ئێمە لە کۆچەرانی یەکەم نین، فەرمووی (بەڵکو ئێوە دوو کۆچتان بۆ هەیە، کۆچ بۆ خاکی حەبەشە پاشان دواتر کۆچتان کرد).[2]

[1] – موسلیمیش وا هێناویەتی، لە البداية والنهاية ج٤ ص٢٠٥یشدا واهاتووە.

[2] – لە فتح الباری ج٧ ص٣٤١ دا بەوجۆرە هاتووە، ئیبن ئەبی شەیبەش بە دوورو درێژی هێناویەتی، لە كنز العمال ج٧ ص١٨دا هاتووە، هەروەها حەسەنی کوڕی سوفیان و ئەبو نەعیم بە کورتی فەرموودەکەی ئەبو موسایان هێناوە، لە الكنز العمال ج٨ ص٣٣٣یشدا هاتووە.

# (کۆچکردنی ئەبوسەلەمە و ئوم سەلەمە (رضي الله عنهما) بۆ مەدینە)

ئیبن ئیسحاق لە ئوم سەلەمەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك ئەبوسەلەمە بڕیاریدا بچێت بۆ مەدینە وشترەکەی هێنا بۆ منو دواتر سواری کردم و سەلەمەی کوڕی ئەبوسەلەمەی کوڕیشی خستە باوەشم، پاشان خۆی ڕەشۆی وشترەکەی گرتبوو، کاتێك پیاوانی بەنی موغیرە بینییان هەستان بۆیو وتیان: واخۆت داوەتە لاساری ئەم دوانە بۆچی، چۆن دەهێڵین بیانبەیت؟ ڕەشۆی وڵاخەکەیان لە دەست گرتو بردمیان، ئەوکات بەنوعەبدولئەسەدی یارانی ئەبوسەلەمە تووڕەبوون بە خوا ناهێڵین کوڕەکەمان لای ئەو ژنە بێت مادەم ئەم ژنەتان لەم کەسەمان سەندەوە، بەمجۆرە هێنایانو بردیان تا بەنوعەبدولئەسەد بردیانو بەنوموغیرە منیان لای خۆیان هێشتەوە و ئەبوسەلەمەی مێردیشم چوو بۆ مەدینە، بەمە منو کوڕەکەمو مێردەکەم لەیەك جیاکراینەوە، هەموو بەیانیەك دەچووم و لە دەرەوە دادەنیشتمو دەگریام تا ئێوارە، یەك ساڵ یان نزیکەی ساڵێك وابووم تا کەسێکی ئامۆزاکانم کە یەکێك بوو لە بەنی موغیرە بینی حاڵم وایە بردمیو وتی: بەنی موغیرە ئایا واز لەم ژنە هەژارە ناهێنن؟ لە مێردو کوڕەکەی جیاتان کردۆتەوە، ئەوانیش پێیان وتم دەی ئەگەر حەزدەکەیت بڕۆ بۆلای مێردەکەت، بەنوعەبدولئەسەدیش ئەو کات کوڕەکەمیان بۆ گێڕامەوە، منیش وشترەکەمم بردو کوڕەکەم نایە کۆشم، پاشان چووم بەرەو مەدینە بۆلای مێردەکەم، هیچ کەسێکم لەگەڵدا نەبوو تا گەیشتم بە عوسمانی کوڕی تەلحەی کوڕی ئەبی تەلحە لە بەنی عەبدودار، وتی: ئەی کچی ئەبی ئومەییە بۆ کوێ دەچیت؟ وتم: بۆلای مێردەکەم دەچم لە مەدینە، وتی: کەست لەگەڵدا نیە؟ وتم: بەس خواو ئەم کوڕەم، وتی: بە خوا وا بەجێت ناهێڵم، ڕەشۆی وڵاخەکەی گرتو خێرا بردمی، سوێند بە خوا هیچ کات لەگەڵ هیچ پیاوێکی عەرەبدا سەفەرم نەکرووە هێندەی ئەو بەڕێز بێت، کە دەگەیشتینە شوێنێك دایدەبەزاندمو لێم دوور دەکەوتەوە تا

دادەبەزیم وشترەکەمی دەبرد دەیبەست بە درەختێکەوە، و لە سایەیدا ڕادەکشا، کە کاتی چوون دەهات وشترەکەی دەهێنام و دەیوستاندو خۆی دوور دەکردەوەو دەیوت: سواربە، کە سوار دەبووم ڕەشوەکەی دەگرت و دەیبردم، بەوجۆرە بوو تا بردمیە مەدینە، کە سەیری گوندی بەنی عەمری کوڕی عەوف کرد لە قوبا وتی: مێردەکەت لەو گوندەیە – ئەبوسەلەمە لەوێ بوو – بە بەرەکەتی خواوە بڕۆ، خۆیشی گەڕایەوە بۆ مەککە، ئوم سەلەمە دەیوت: نابینم هیچ ماڵێك لە ئیسلامدا هێندەی دەردی ماڵی ئوم سەلەمەیان چەشتبێت و هاودەمێکم بەڕێزتر لە عوسمانی کوڕی تەلحە نەبینیوە، عوسمانی کوڕی تەلحەی کوڕی ئەبوتەلحەی عەبدەری (رضي الله عنه) لە دوای حودەیبیە موسڵمان بوو و لەگەڵ خالیدی کوڕی وەلیددا (رضي الله عنه) پێکەوە کۆچیان کرد[1].[2]

## (کۆچکردنی صوهەیبی کوڕی سنان (رضي الله عنه))

بەیهەقی لە صوهەیبەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (ارايت دار هجرتكم صبغة بين ظهراني حرتين فاما ان تكون هجر او تكون يثرب) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چوو بۆ مەدینە و ئەبو بەکریش (رضي الله عنه) لەگەڵیدا چوو منیش ویستم بچم لەگەڵیدا بەڵام گەنجانێکی قورەیش نەیانهێشت، ئەو شەوە بە پێوە بووم دانەدەنیشتم، وتیان: خوا نانی لێ حەرام کردووە، – منیش سکاڵام نەبوو – خەوتن، خێرا دەرچووم و پاش ئەوەی چووم هەندێکیان کەوتنە شوێنم تا بمگێڕنەوە، پێم وتن: ئەگەر کۆمەڵێك ئۆقیەی زێڕتان بدەمێ وازم لێ دێنن؟ ئەوانیش ڕازی بوون و چوومەوە بۆ مەککە، وتم: ژێر لا دەرگاکە هەڵکەنن لەوێدان و بچن بۆ لای فلان کەس و دوو حوللە ببەن، چووم تا گەیشتمە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە قوباء پێش ئەوەی

---

[1] – ضعيف.

[2] – لە البداية والنهاية ج٣ ص١٦٩ دا بەوجۆرە هاتووە.

لەوێ بچێت، کە منی بینی فەرمووی (ئەی ئەبو یەحیا مامەڵەیەکی بە قازانج بوو) وتم ئەی پێغەمبەری خوا کەس پێش من نەهاتووە بۆ لات و هەواڵی پێ نەداویت جگە لە جبریل (علیه السلام)[1].[2]

ئیبن سەعد ج٣ ص١٦٢ حارس و ئیبن مونزیر و ئیبن عەساکیر و ئیبن ئەبی حاتەم لە سەعیدی کوڕی موسەیبەوە (رضي الله عنه) هێناویانە صوهەیب (رضي الله عنه) چوو بەرەو لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و دەستەیەکی بێباوەڕانی قورەیش کەوتنە شوێنی، دابەزی و چی تیری پێ بوو دەری هێنا، وتی: ئەی کۆمەڵی قورەیش دەزانن لە هەمووتان تیر هاوێژ ترم، سوێند بە خوا هەرکامتان بێن تیرتان بۆ دەهاوێژم تا تیرم پێ مابێت، پاشان بە شمشێرەکەم تا بتوانم لێتان دەدەم، دوایی چی دەکەن خۆتان دەزانن، ئەگەریش حەز دەکەن پێتان دەڵێم لە مەککە سامانەکەم لە کوێیە بیبەن و وازم لێ بێنن، وتیان باشە، بەڵێنیان دا لەسەر ئەوە، صوهەیبیش پێی نیشان دان، خوای گەورەیش ئەم ئایەتەی دابەزاند (و من الناس من يشري نفسه ابتغاء مرضات الله) تا کۆتایی ئایەتەکە، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) صوهەیبی بینی فەرمووی (ئەی ئەبو یەحیا مامەڵەکەت بردەوە، ئەبو یەحیا مامەڵەکەت بردەوە، ئەبو یەحیا مامەڵەکەت بردەوە) ئینجا قورئانی بەسەردا خوێند[3].[4]

حاکم لە المستدرك ج٣ ص٣٩٨ لە ڕێگەی سولەیمانی کوڕی حەرب لە حەمادی کوڕی یەزید لە ئەیوب لە عیکرەمەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کە صوهەیب (رضي الله عنه)

---

[1] – صحيح.

[2] – لە البداية والنهاية ج٣ ص١٧٣ دا واهاتووە، تەبەرانیش بەوجۆرە هێناویەتی، هەیسەمی ج٦ ص٦٠ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا کەسانێك هەن کە نایانناسم، تەواو. هەروەها ئەبوو نەعیم لە الحليه ج١ ص١٥٢ دا هێناویەتی.

[3] – ضعيف.

[4] – لە كنز العمال ج١ ص٢٣٧ دا واهاتووە، ئیبن عەبدولبیر لە الاستيعاب ج٢ ص١٨٠ لە سەعیدەوە بەوجۆرە هێناویەتی.

چوو بەرەو مەدینە خەڵکی مەککە شوێنی کەوتن، ئەویش هەموو تیرەکانی دەرهێنا و چل تیری تێدا بوو، وتی: هەرکامتان بێت بۆم تیرێکی تێ دەگرم، پاشان شمشێرەکەم بەکاردێم، ئەوکات دەزانن کێم، لە مەککەش دوو کەنیزەکم بەجێهێشتووە بۆ ئێوە، دەڵێت: حەمادی کوڕی سەلەمە لە سابتەوە لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) بەوجۆرە بۆی گێڕاینەوە، ئەم ئایەتەش دابەزی بۆسەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) (ومن الناس من يشري نفسه ابتغاء مرضات الله) کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) صوهەیبی بینی فەرموودی (ابا يحيى ربح البيع) واتە(مامەڵەکەت بردەوە ئەبویەحیا) ئایەتەکەشی بەسەردا خوێندەوە[1,2].

ئیبن مەردەویەش لە ڕێگەی ئەبوعوسمانی نهدیەوە لە صوهەیبەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێتك ویستم لە مەککەوە کۆچ بکەم بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) قورەیش پێیان وتم: صوهەیب تۆ کە هاتیت بۆلامان هیچت نەبوو، کاتێك دەچیت ئەم هەموو پارەت هەبێت، نەبەخوا هەرگیز شتی وانابێت، منیش پێم وتن: ئەگەر پارەکەتان بدەمێ وازم لێ دێنن؟ وتیان: بەڵێ، منیش پارەکەم پێدان و وازیان لێهێنام، چووم تا گەیشتمە مەدینە، ئەمە گەیشتەوە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (ربح صهيب، ربح صهيب) (صوهەیب قازانجی کرد، صوهەیب قازانجی کرد).[3]

---

[1] – صحيح.

[2] –حاکم دەڵێت: بەپێی مەرجی موسلیم فەرموودەکە صەحیحە، بەڵام بوخاری و موسلیم نەیانهێناوە، هەروەها ئیبن سەعدیش لەلایەکی دیکەوە لە ئەبوعوسمانی نهدیەوە هێناویەتی، کەلبی لە تەفسیرەکەیدا لە ئەبوصالیح لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) گێڕاویەتیەوە ڕێگەیەکی دیکەی گێڕانەوەشی هەیە. تەواو.

[3] – لە تەفسیری ئیبن کەسیر ج١ ص٢٤٧ دا واهاتووە، ئیبن سەعد ج٣ ص١٦٢ لە ڕێگەی ئەبوعوسمانەوە بەوجۆرە هێناویەتی. تەواو.

# (كۆچکردنی عه‌بدوڵڵای کوڕی عومه‌ر (رضي الله عنه))

ئه‌بونه‌عیم له‌ الحلية ج١ ص٣٠٢ له‌ عومه‌ری کوڕی موحه‌مه‌دی کوڕی زه‌ید له‌ باوکیه‌وه‌ هێناویه‌تی ده‌ڵێت: ئیبن عومه‌ر (رضي الله عنه) ئه‌گه‌ر ده‌یدا به‌ پاڵیاندا و کۆچی کردبوو لێی چاوه‌کانی داده‌خست و سه‌یری نه‌ده‌کرد و هه‌رگیز له‌وێ دانه‌ده‌به‌زی، به‌یهه‌قی له‌ ( الزهد) دا به‌ سه‌نه‌دی صه‌حیح له‌ موحه‌مه‌دی کوڕی زه‌یدی کوڕی عه‌بدوڵڵای کوڕی عومه‌ره‌وه‌ هێناویه‌تی ده‌ڵێت: ئیبن عومه‌ر هه‌رچی باسی پێغه‌مبه‌ری (صلى الله عليه وسلم) بکردایه‌ ده‌گریا، بیدایه‌ به‌پاڵ شوێنیاندا چاوه‌کانی داده‌خست.[1]

# عه‌بدوڵڵای کوڕی جوحش (رضي الله عنه))

ته‌به‌رانی له‌ ئیبن عه‌بباسه‌وه‌ (رضي الله عنه) هێناویه‌تی ده‌ڵێت: عه‌بدوڵڵای کوڕی جه‌حش (رضي الله عنه) کۆتا که‌س بوو که‌ کۆچی کرد، چاوی داخستبوو، کاتێك بڕیاری کۆچی دا ژنه‌که‌ی که‌ کچی حه‌ربی کوڕی ئومه‌ییه‌ بوو به‌وه‌ ڕازی نه‌بوو، پێی وت با کۆچ بۆ ئه‌وێ نه‌کات، ئه‌ویش به‌ ماڵ و مناڵیه‌وه‌ به‌ شاراوه‌یی کۆچی کرد تا چوویه‌ مه‌دینه‌ بۆ لای پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم)، ئه‌بو سوفیانیش چوو ماڵه‌که‌ی له‌ مه‌ککه‌دا داگیر کرد و فرۆشتی، پاشان ئه‌بو جه‌هلی کوڕی هیشام و عوتبه‌ی کوڕی ڕه‌بیعه‌ و شه‌یبه‌ی کوڕی ڕه‌بیعه‌ و عه‌بباسی کوڕی عه‌بدولموته‌لیب وحوه‌یتبی کوڕی عه‌بدولعوززا چوونه‌ ناویه‌وه‌، له‌ناویدا پێسته‌ی گه‌نیو هه‌بوو، چاوانی عوتبه‌ فرمێسکیان ڕژاند و ئه‌م دێره‌ شیعره‌ی وت:

وكل دار و ان طالت سلامتها يوما ستدركها النكباء و العوب

ئه‌بو جه‌هل وتی: چوو بۆ لای عه‌بباس و وتی ئاواتان کرد پێمان، که‌ پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) له‌ ڕۆژی فه‌تحی مه‌ککه‌دا چوویه‌ مه‌ککه‌وه‌ ئه‌بو ئه‌حمه‌د ده‌گه‌ڕا به‌ شوێن

[1] – له‌ الاصابه ج٢ ص٣٤٩ دا واهاتووه‌.

ماڵەکەیدا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد بە عوسمانی کوڕی عەففان و ئەویش چوو بۆ لای ئەبو ئەحمەد و خۆی دا بەلایدا، ئەویش بێدەنگ بوو لە گەڕانی بە دوای ماڵەکەیدا، ئیبن عەبباس (ﷺ) وتی: ئەبو ئەحمەد کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) پاڵی دابوویەوە بە لاشانیدا لە ڕۆژی فەتحدا دەیوت:

حبذا مكة من وادی — بها امشي بلادهاي

بها يكثر عوادی — بها تركز اوتادی[1,2].

ئیبن ئیسحاق دەڵێت: یەکەم کەس لە کۆچەران دوای ئەبو سەلەمە هاتە مەدینە عامری کوڕی ڕەبیعە و عەبدوڵڵای کوڕی جەحش بوون، عەبدوڵڵا بە ماڵ و منداڵ و براکەیەوە عەبد ئەبی ئەحمەد هات، ئەبو ئەحمەد کەسێکی چاو کز بوو، بەبێ ئەوەی کەس دەستی بگرێت سەر و خواری مەککەی دەکرد، شاعیر بوو، فارعەی کچی ئەبو سوفیانی کوڕی حەربی لابوو، ئەمەیمەی کچی عەبدولموتەلیبی کوڕی هاشم دایکی بوو، لە کاتی کۆچدا ماڵی جەحش داخرا، عوتبە دای بە پاڵیدا و بەوجۆرەی پێشوو چیرۆکەکە دێنێت،[3] وادیارە باسی ئەبو ئەحمەد لە فەرموودەکەدا نەبوو، ڕاستتر ئەوەیە عەبدی کوڕی جەحش چاوکز بووە، نەوەك عەبدوڵڵای کوڕی جەحشی برای، دەڵێت: ئەبو ئەحمەدی کوڕی جەحش لە کۆچەکەیاندا بووە، وەك ئیبن کەسیر لە البداية والنهاية لە ئیبن ئیسحاقەوە ج٣ ص١٧١ دا هێناویەتی:

ولما راتني ام احمد غاديا — بذمة من اخشي بغيب و ارهب

تقول فاما كنت لابد فاعلا — فيهم بنا البدان ولننا يثرب

فقلت لها ما يثرب بمظنة — وما يشا الرحمن فالعبد يركب

الى الله وجهي و الرسول ومن يقم — الى يوما وجهه لا يغيب

---

[1] – ضعیف.

[2] – هەیسەمی ج٦ ص٦٤ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا عەبدوڵڵای کوڕی شەبیب هەیە کە لاوازە.

[3] – لە البداية والنهاية ج٣ ص١٧٠دا واهاتووە.

فكم قد تركنا من حميم مناصح ... ونا صحة تبكي بدمع و تندب

ترى ان وترا نائيا عن بلادنا ... وللحق نرى ان الرغائب نطلب

دعوت بني غنم لحقن دمائهم ... و للحق لما لاح للناس ملحب

اجابوا بحمدلله لما دعاهم ... الى الحق داع و النجاح فاوعبوا

وكنا واصحابا لنا فارقوا الهدى ... اعانوا علينا بالسلاح و اجلبوا

كفوجين اما منها فموفق ... على الحق مهدي و فوج معذب

طغوا وتمنوا كذبة و ازلهم ... عن الحق ابليس فخابوا وخيبوا

ورعنا الى قول النبي محمد ... فطاب ولاة الحق منا و طيبوا

منت بارحام اليهم قريبة ... ولا قرب بالارحام اذ لا تقرب

فاي ابن اخت بعدنا يامنكم ... واية صهر بعد صهري يرقب

ستعلم يوما اينا اذ تزايلوا ... و زيل امر الناس للحق اصوب

## (کۆچکردنی چەمرەی کوڕی ئەبولعەیص یان ئیبنولعەیص)

فەریابی لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند (لايستوي القاعدون من المؤنين غير اولي الضرر) پاشان هەندێ لە هەژارانی ناو مەککە مۆڵەتیان پێدرا تا ئەم ئایەتە دابەزی (ان الذين توفاهم الملائكة ظالمي انفسهم) وتیان ئەمە لەرزە وشەکانەوەیە، تا ئەم ئایەتە دابەزی (المستضعفين من الرجال والنساء والولدان الذين لا يستطيعون حيلة ولا يهتدون سبيلا) ضەمرەی کوڕی عەیس – لەبەنی لەیث بوو و چاوی پێکرا بوو و دەوڵەمەندیش بوو– وتی: ئەگەر چاوم هەیە ئەوا من ماڵ و کۆیلەم نییەو دەتوانم بەشداریم دەی هەڵمگرن بمبەن، بە نەخۆشی لەسەرخۆ سوار بوو و چوو، تا مەرگی هات، لە مزگەوتی تەنعیم بە خاك سپێردرا (لەوێ مرد) ئەم ئایەتە لەسەر

ئەو دابەزی (ومن يخرج من بيته مهاجرا الى الله و رسوله) ئیبن موندە دەیداتەوە پاڵ هوشەیمی کوڕی سالم، ئیبن ئەبی حاتەم لە ڕێگەی ئیسرائیل لە سالمی ئەفتەسەوە هێناویەتی دەڵێت: لە سەعیدی کوڕی جوبەیر لە ئەبی ضەمرەی کوڕی عەیصی زەرقی یەوە (رضي الله عنه)[1]، ئەبو یەعلاش لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ضەمرەی کوڕی جوندوب لە ماڵەوە بۆ کۆچ کەوتە ڕێ و بە ماڵەوەی وت: سوارم بکەن و لە خاکی بێ باوڕانەوە بمبەن بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ڕێگەدا پێش ئەوەی بگاتە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کۆچی دوایی کرد،ئەو کات ئەم ئایەتە دابەزی (ومن يخرج من بيته مهاجرا الى الله ورسوله ثم يدركه الموت) تا (وكان الله غفورا رحيما).

## (کۆچکردنی واسیلی کوڕی ئەسقەع (رضي الله عنه))

ئیبن جەریر لە خالیدی کوڕی وەلید لە ئەسقەعەوە هێناویەتی دەڵێت: لە ماڵ و منالم دەرچووم تا بەرە و ئیسلام بچم، چوومە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەبینم نوێژ دەکات، منیش لە کۆتایی ڕیزەکاندا ڕیزم بەست و نوێژەکەیانم کرد، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە نوێژەکە بوویەوە فەرمووی با ئەوەی ڕیزی کۆتایی بێت بۆلام، فەرمووی (پێویستیت چییە؟) (ئیشت چییە؟) وتم ئیسلام، فەرمووی ئەوەت بۆ باشترە، فەرمووی کۆچیش دەکەیت؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی (هجرة البادي او هجرة الباتي) وتم کامیان باشترە؟ فەرمووی (هجرة الباتي) ئەم کۆچە ئەوەیە لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) بمبینێتەوە، بەڵام کۆچی (بادي) ئەوەیە بگەڕێیتەوە بۆلای دێکەت، فەرمووی (وعليك الطاعة في عسرك ويسرك و منشطك ومكرهك واثرة عليك) وتم: بەڵێ، ئینجا دەستی هێنا و دەستم برد، کاتێك بینی هیچ بۆ خۆم ناڵێم فەرمووی ( چەندە توانیت) وتم (چەندە توانیم) دەستی خستە دەستمەوە.[2]

---

[1] – لە الاصابة ج٢ ص٢١٢ دا وا هاتووە.

[2] – لە كنز العمال ج٨ ص٣٣٣ دا واهاتووە.

## (کۆچکردنی بەنی ئەسلەم)

ئەبونەعیم لە ئیاسی کوڕی سەلەمەی کوڕی ئەکوەعەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئەسلەم تووشی ئازارێك بوون، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (یا اسلم ابدوا) واتە(ئەی ئەسلەم بچنەوە لادێ) وتیان ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) حەزناکەین بە شوێن خۆماندا بگەڕێینەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی ( انتم بادیتا ونحن حاضرتکم اذا دعوتمونا اجبناکم واذا دعوناکم اجبتمونا، انتم المهاجرون حیث کنتم) واتە(ئێوە لادێ نشینی ئێمەو ئێمەش شارنشینی ئێوەین، کەی بانگتان کردین دێین و کەی بانگمان کردن وەرن، ئێوە لە هەرکوێ بن کۆچەرن).[1]

## (کۆچکردنی جەنادەی کوڕی ئومەییە (رضي الله عنه))

ئەبونەعیم و حەسەنی کوڕی سوفیان لە جەنادەی کوڕی ئومەییەی ئەزدیەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) کۆچمان کردو ڕاجیاواز بووین لەسەر کۆچ، هەندێکمان دەیانوت: کۆچکردن تەواو بووە، هەندێکی دی دەیانوت: هێشتا ماوە، چووین بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و لەو بارەیەوە پرسیارمان لێکرد، فەرمووی (لا تنتقطع الهجرة ما قوتل الکفار)[2].[3] ئیبن مفدەش هێناویەتی، ئیبن عەساکیر لە عەبدوڵڵای کوڕی سەعدیەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: بە دەستەیەکی بەنی سەعدی کوڕی بەکرەوە چووم بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) حەوت یان هەشت کەس بووین، من لە هەموویان بچووکتر بووم، هاتن بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و کاریان بە جێگەیاند و منیان بەجێ هێشت، چووم بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و وتم ئەی پێغەمبەری خوا پێویستیەکەی من چی؟ فەرمووی پێویستیت چیە؟ وتم: هەندێ دەڵێن کۆچ

---

[1] – لە کنز العمال ج٧ ص١٤٢ دا هاتووە.

[2] – صحیح.

[3] – لە کنز العمال ج٨ ص٣٣١ دا واهاتووە،

نەماوە، فەرمووی (انت خيرهم حاجة او حاجتك خير من حاجتهم، لا تنطع الهجرة ما قوتل الكفار) واتە(تۆ لە هەموویان کارەکەت باشترە یان کارەکەی تۆ لە هی ئەوان باشترە، کۆچ ناپچڕێت تا ئەوکاتەی بێباوەڕان سەرقاڵی کوشتنن).[1]

## (ئەوەی بە صەفوانی کوڕی ئومەییە و کەسانی دی وترا لەبارەی کۆچکردنەوە)

ئیبن عەساکیر لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی بە صەفوانی کوڕی ئومەییە- کە لە سەرووی مەککەوە بوو- وترا هەرکەس کۆچ نەکات موسڵمان نیە، وتی: ناچمەوە ماڵەوە تا نەگەمە مەدینە، هاتمە مەدینە و لای عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب دابەزی و دواتر هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ئەی ئەبو وەهب بۆچی هاتویت؟) وتی دەڵێن هەرکەس کۆچ نەکات ئاینی نیە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ئەی ئەبو وەهب بگەڕێرەوە بۆ دۆڵی مەککە و لەوێ لە ماڵتاندا سوکنا بگرن کۆچ نەما، بەڵام جیهاد و نیاز پاکی ماوە، ئەگەر وترا بێن بۆ جیهاد وەرن) لە كنز العمال ج٨ ص٢٣٣دا واهاتووە، بەیهەقی بەودەقە ج٩ ص١٧ هێناویەتی، عەبدوڕەزاق لە تاوسەوە هێناویەتی دەڵێت: بە صەفوان وترا هەرکەس کۆچی نەکرد قوڕبەسەر بوو، ئەویش سوێندی خوارد سەری نەشوات تا بچێتە لای پێغەمبەر (ﷺ) سواری وڵاخەکەی بوو و چوو لە بەردەرگای مزگەوتدا گەیشت بە پێغەمبەر (ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئاوەهام پێ وتراوە، سوێندم خواردووە سەرم نەشۆم تا نەیەمە لات، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (صەفوان ئیسلامی بیست و وەك ئایین پێی ڕازی بوو، کۆچ لە دوای فەتح نەما، بەڵام جیهاد و نیازپاکی ماوە، ئەگەر بانگکران بۆ جیهاد وەرن).[2][3]

---

[1]- لە الكنز العمال ج٨ ص٣٣٣دا هاتووە، ئەبو حاتەم و ئیبن حەبان و نەسائیش هێناویانە، ئەبو زەرعە دەڵێت: فەرموودەکە صەحیحە، لە الاصابە ج٢ ص٣١٩دا هاتووە.

[2] - ضعيف.

[3] - لە الكنز العمال ج٣ ص٨٤دا واهاتووە.

بەغەوی و ئیبن موندە و ئەبو نەعیم لە صاڵحی کوڕی بەشیری کوڕی فودەیکەوە هێناویانە فودەیکی باپیری هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دەڵێن هەرکەس کۆچی نەکردبێت قوڕبەسەر و ماڵ وێرانە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ئەی فودەیك نوێژ بکە و زەکات بدە و لە خراپە بە دووربە و لەناو خاکی هۆزەکەتدابە هەرکات ویستت کۆچەریت)[1] بوخاری لە عەتای کوڕی ئەبی ڕەباحەوە هێناویەتی دەڵێت: سەردانی عایشەم (رضي الله عنها) کرد لەگەڵ عوبەیدی کوڕی عەمری لەیسیدا، پرسیارمان لێکرد سەبارەت بە کۆچ کردن، وتی: ئەمڕۆ کۆچ نیە، باوەڕداران لەبەر خوا و پێغەمبەرەکەی لە ترسی ئایینەکەیان ڕایاندەکرد، دەی ئەمڕۆ خوا ئیسلامی سەرخستووە و کەی و لە کوێ دەتەوێت پەروەردگات دەپەرستیت، بەڵام ئەمڕۆ جیهاد و نیەت پاکی هەیە.[2]

[1] – لە کنز العمال ج٨ ص٢٣١ دا واهاتووە، بەیهەقی ج٩ ص١٧ هێناویەتی،

[2] – بەیهەقی ج٩ ص١٧ هێناویەتی.

# (کۆچکردنی ژنان و منداڵان)

## (کۆچکردنی خێزانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەبوبەکر (رضي الله عنه))

ئیبن عەبدولبیر لە عائیشەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: کاتێک پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کۆچی کرد ئێمە و کچەکانی بەجێهێشت کاتێک ئەوێ سەقامگیر بوو زەیدی کوڕی حارسەی لەگەڵ ئەبوو رافیعدا (رضي الله عنه) کە مە ولای بوو ناردن و دوو وشتر و پێنج سەد درهەمی پێدان کە لە ئەبو بەکرەوە (رضي الله عنه) وەریانگرتبوو تا پێویستی ڕێیانی پێ بکڕن، ئەبوبەکر عەبدوڵلای کوڕی ئورەیقتی بە دوو وشتر یان سێ وشترەوە نارد لەگەڵیاندا و نامەی نووسی بۆ عەبدوڵلای کوڕی ئەبوبەکر کە ئوم ڕۆمانی دایکم و من و خوشکەکەم ئەسامی ژنی زوبەیر (رضي الله عنه) بێنێت بۆ مەدینە، ئەوانیش پێکەوە دەرچوون، کە گەیشتنە (قودەید) زەیدی کوڕی حارسە بەو پێنج سەد درهەمە سێ وشتری کڕی، پاشان چوونە مەککە و گەیشتن بە تەلحەی کوڕی عەبدوڵلا (رضي الله عنه) کە دەیویست کۆچ بکات، هەموو پێکەوە چوون، یەزید و ئەبو رافیع فاتیمە و ئوم کەلثوم و سەودەی کچی زەمعەیان هێنا، زەید ئوم ئەیمەن و ئوسامەی سوار کرد تا لە بەیداء وشترەکەم بۆی دەرچوو، من لەگەڵ دایکمدا لە کەژاوەیەکدا بووم، دایکم دەیوت: وەی ڕۆ بۆ کچەکەم، وای بۆ بووکەکەم، تا گەیشتە وشترەکەمان و لە سەنیەلیای شاخی هەرشی نیشتەوەو خوا پاراستی، پاشان چووینە مەدینە و لەگەڵ ماڵی ئەبوبەکردا دابەزیم و ماڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دابەزین، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مزگەوتەکەی بنیاد دەنا لەگەڵ چەند ماڵێکدا لە دەرەوەی مزگەوتەکەدا، لەوێ ماڵ و منالی دانا، چەند ڕۆژێک ماینەوە، ئینجا فەرموودەکە بە دوورو درێژی دێنێت سەبارەت بە هاوسەرگیری عائیشە[1].[2] هەیسەمی لە مجمع الزوائد ج٩ ص٢٢٧ دا هێناویەتی بەڵام باسی دەرچوونەکەی نیە، دەڵێت: لە سەنەدەکەدا موحەمەدی کوڕی حەسەنی کوڕی زبالە

---

[1] – ضعیف.

[2] – لە الاستیعاب ج٤ ص٤٥٠ دا واهاتووە،

هەیە کە لاوازە، پاشان لە عائیشەوە دێنێت دەڵێت: بەرەو مەدینە چووین بۆ کۆچکردن، ڕێی (ثنية) مان گرتەبەر، ئەو وشترەی من لەسەری بووم غارێکی خراپی دا و سوێند بە خوا هەرگیز بیرم ناچێت دایکم دەیوت: بووکەڵە گیانەکەم، سەری بۆ بەرزکردمەوە و گوێم لیّ بوو دەنگێك دەیوت: ڕەشوەکەی بگرە، منیش گرتم وەك چۆن کەسێك دەست بداتە ژێر باڵی ئەوی دی ڕێك بوویەوە.[1]

ئیبن ئیسحاق لە زەینەبی کچی پێغەمبەری خواوە هێناویەتی دەڵێت: خۆم ئامادەکرد کە هیندی کچی عوتبە پێم گەیشت وتی: ئەی کچی موحەمەد مەگەر پێم نەگەیشتووە تۆ دەتەوێت بچێت بۆلای باوکت، دەڵێت: وتم: نەمویست، وتی: ئەی ئامۆزا وامەکە، ئەگەر پێویستیەکی ڕێت هەیە بۆ کەس یان سامان تا پێی بگەیت بە باوکت من لامە، لێم زیز مەبە چونکە کێشەی پیاوان ناچێتە بازنەی ژنانەوە، وتم: بە خوا نامەوێت، وتی: دەبێت بتەوێت، دەڵێت: بەڵام لێی ترسام حەزم نەکرد ئەوەم بوێت، ئیبن ئیسحاق دەڵێت: خۆی ئامادەکرد کە لیّ بوویەوە برای مێردەکەم کینانەی کوڕی ڕەبیع وشترێکی بۆ هێنا و سواری کرد و خۆیشی تیرو کەوانەکەی هەڵگرت و بەڕۆژ بە ڕێی خست و خۆی لەگەڵیدا بوو و زەینەبیش لە کەژاوەکەدا بوو، پیاوانی قورەیش ئەمەیان بیست و چوون بە دوایدا تا لە (ذي طوى) پێی گەیشتن، بەڵام یەکەم کەس پێی گەیشت هباری کوڕی ئەسوەدی فەرهەری بوو، هبار بە ڕم دەیترساند، زەینەبیش وەك ئەوەی دەڵێن سکی پڕبوو، کەوتە خوارەوە، کینانەی برای مێردەکەی تیرەکانی دەرهێنا و وتی: سوێند بەخوا هەرکامتان نزیك بێتەوە تیرێکی تیّ دەگرم، چەند جار چوون و هاتن ئەبوسەفیان بە دەستەیەکی قورەیشەوە هات و وتی: کابرا تیرەکەت لابە تا قسەت لەگەڵ بکەین، ئەویش تیرەکەی لابرد، ئەبوسوفیان چوو لای وەستا و وتی: باشت نەکردووە بە ئاشکرا ئەم ژنەت

[1] - پاشان ج٨ ص٢٢٨ دەڵێت: تەبەرانی گێڕاویەتیەوە و سەنەدەکەی حەسەنە، تەواو. حاکمیش لە المستدرك ج٤ ص٤ بە دوورو درێژی هێناویەتی.

دەرکردووە، تۆ دەزانیت بە دەست موحەمەدەوە تووشی چی بووین، ئێستا خەڵکی وادەزانێت ئەوە لە لاوازی و ترسنۆکی ئێمەوەیە، سوێند بە خوا هیچ پێویستمان بەوە نیە، لە باوکی دووری بخەینەوە یان سامانی ببەین، بەڵام ئافرەتەکە بێنەرەوە تا بارەکە هێور دەبێتەوە و خەڵکی وابزانێت گێڕاومانەتەوە، دوایی بە نهێنی بیبە بۆلای باوکی، ئەویش وای کرد[1][2].

تەبەرانی لە عورووەی کوڕی زوبەیرەوە (ﷺ) هێناویەتی پیاوێک هات بۆلای زەینەبی کچی پێغەمبەر (ﷺ) و دوو کەس لە قورەیش پێی گەیشتن و شەڕیان لەگەڵدا کرد تا بەسەریدا سەرکەوتن و زەینەبیان بردەوە، ئەویش کەوت بەسەر بەردێکداو خوێنی لێ هات، بردیان بۆلای ئەبوسوفیان، ئافرەتانی بەنی هاشم هاتن بۆلای و ئەویش زەینەبی دانەدەست،دواتر کۆچی کرد و هەر ئەو ئازارو زامەی هەبوو تا بەو برینەوە گیانی سپارد، بۆیە پێیان وایە شەهیدە[3][4].

تەبەرانی لە المجمع الکبیر لە عائیشەی ژنی پێغەمبەرەوە (ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆ مەدینە زەینەبی کچی لە مەککە لەگەڵ کینانە یان کوڕی کینانەدا لە مەککە دەرچوون ئەوانیش چوون بە شوێنیدا، هباری کوڕی ئەسوەد پێی گەشت و بە ڕمەکەی دەیدا لە وشترەکەی تا کەوتە خوارو منداڵەکەی ناوسکی لەبار برد، بەنو هاشم و بەنوئومەییە لەسەر ئەوە بوو بە دەمەقاڵەیان، بەنو ئومەییە وتیان ئێمە شیاوترین پێی چونکە لای ئەبولعاصی ئامۆزایان بوو، هەروەها هالای هیندی کچی عوتبەی کوڕی ڕەبیعە بوو دەیوت ئەمە بە هۆی باوکتەوە بوو، پێغەمبەریش (ﷺ) بە زەیدی کوڕی حارسەی فەرموو بۆ ناچیت زەینەب بێنیت؟

---

[1] – ضعیف.

[2] – لە البدایة والنهایة ج٣ ص٣٣٠ دا واهاتووە.

[3] – ضعیف.

[4] – هەیسەمی ج٩ ص٢١٦ هێناویەتی و دەڵێت مورسەلە و کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن.

وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا فەرمووی خاتەمەکەم ببەو بیدەرە دەستی، زەید چوو لە سەر خۆبوو تا گەیشتە شوانێك وتی شوایی بۆ کێ دەکەیت؟ وتی: بۆ ئەبولعاص، وتی: ئەو مەڕانە هی کێن؟ وتی: زەینەبی کچی موحەمەد، ماوەیەك لەگەڵیدا چوو دوایی وتی: ئەگەر شتێکت بدەمە دەست دەتوانیت بیدەیتە دەست زەینەب و بە کەس نەڵێیت؟ وتی: بەڵێ، ئەویش خاتەمەکەی پێدا، زەینەبیش ناسیەوەو وتی: کێ ئەمەی بێدایت؟ وتی: پیاوێك، وتی: لە کوێ بەجێت هێشت؟ وتی: لە فڵان شوێن، ئەویش بێدەنگ بوو تا شەو چوو بۆلای، کە چوو بۆلای زەید پێی وت: سواری وشترەکەبە، وتی: نا تۆ سواربە ئینجا من، زەید سواربوو و زەینەبیش لە دوایەوە سوار بوو تا گەیشتن، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی ئەمە چاکترین کچمە کە لەسەر من تووش بوو، عەلی کوڕی حوسەین (رضي الله عنه) ئەمەی بیستەوەو چوو بۆلای عوروەو وتی: ئەم فەرموودەی لە تۆوە بیستوومە چیە لەماف فاتیمە کەم دەکاتەوە، عوروە وتی: سوێند بەخوا حەزناکەم هێندەی ماوەی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوام هەبێت بەڵام هیچ لە ماف فاتیمە کەم بکەمەوە، لە دوای ئەمەش هەرگیز ئەم فەرموودە ناگێڕمەوە.[1]

---

[1]- هەیسەمی ج٩ ص٢١٣ دەڵێت: تەبەرانی لە المجمع الکبیر المجمع الوسیط هەندێکی هێناوە، بەزاریش هێناویەتی، کەسەکانی سەنەدەکەش صەحیحن. تەواو.

## (کۆچکردنی دوڕڕەی کچی ئەبولەهەب (رضي الله عنها))

تەبەرانی لە ئیبن عومەر و ئەبو هورەیرە و عەماری کوڕی یاسرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: دوڕڕەی کچی ئەبو لەهەب کۆچی کرد و لای ڕافیعی کوڕی موعەللای زورەقی دابەزی، هەندێ ئافرەتی بەنی زورەیق کە لەلای دانیشتبوون پێیان وت: تۆ کچی ئەبو لەهەبیت کە خوا لە بارەیەوە دەیفەرموو (تبت یدا ابي لهب وتب ما اغنی عنه ماله وما کسب) بۆیە کۆچکردنەکەت دادت نادات، دوڕەش چوو بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و سکالای لەسەر ئەو قسەیان کرد پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) داینیشاند و فەرمووی (دابنیشە) پاشان نوێژی نیوەڕۆی کرد و دەمێك لەسەر مینبەر دانیشت و فەرمووی (یا ایها الناس مالي اوذي في اهلي؟ فوالله انا شفاعتي لتنال حی حا و حکم و صدا و سلهب یوم القیامه)[1].[2]

پێشتریش باسی کۆچی ئوم سەلەمە و ئەبو سەلەمەمان کرد، لەگەڵ باسی ئەسمای کچی عومەر و ئوم عەبدوڵلا لەیلای کچی ئەبی حەسمە لە کاتی کۆچی جەعفەری کوڕی ئەبی تالیب و هاوەڵاندا بۆ حەبەشە.

## (کۆچکردنی عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (رضي الله عنه) و منداڵانی دیکەش)

تەبەرانی لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە ساڵی پێنجەمی کۆچیدا هاتین بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، لەگەڵ قورەیشدا لە ساڵی ئەحزاب گەیشتین، من و فەزڵی برام و کۆیلەکەمان ئەبو ڕافیعمان لەگەڵدا بوو، گەیشتینە عەرج، لە ڕێدا کاروانێکمان بینی، لەو ڕێگەوە چووین تا لە بەنی عەمری کوڕی عەوف دەرچووین تا گەیشتینە مەدینە و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مان بینی لە خەندەقەکەیدا بوو، ئەوکات من تەمەنم هەشت ساڵ بوو، براکەم سیانزە ساڵ بوو[3].[4]

---

[1] – ضعیف.

[2] – هەیسەمی ج٩ ص٢٥٧ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا عەبدوڕەحمانی کوڕی بەشیری دیمەشقی هەیە کە ئیبن حەببان متمانەی پێ دەدات و ئەبو حاتەم بە لاوازی دەزانێت، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە صەحیحن.

[3] – ضعیف.

[4] – هەیسەمی ج٦ ص٦٤ دەڵێت: تەبەرانی لە المعجم الوسیط لە ڕێگەی عەبدوڵلای کوڕی موحەممەدی کوڕی عەممارەی ئەنساری لە سولەیمانی کوڕی داودی کوڕی حوصەینەوە هێناویەتی و هیچ کامیان نە بە متمانە و نە بە لاواز دانانێت، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە جێ متمانەن. تەواو.

# (بەشی پێنجەم)

# (سەرخستن)

چۆن هاوەڵان سەرخستنی ئایینی ڕاست و ڕێی ڕاستیان لە هەموو شتێک لا خۆشەویت تر بوو؟ چۆن شانازییان بەوە دەکرد و کەسیان شانازیی بە عیززەتی دنیاییەوە نەدەکرد؟ چۆن لەگەل ئەمەدا لەسەر خۆشییەکانی دونیا خۆڕاگر بوون؟ وەک ئەوەی هەموو ئەمە تەنها لە پێناو خوا و شوێنکەوتنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دا ئەوە بکەن.

# (بەشی پێنجەم)
# (سەرخستن)
## (سەرەتای باری پشتیوانان (رضي الله عنهم))

تەبەرانی لە المجمع الاوسط لە عائیشەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەموو ساڵێك دەچوو بۆلای هۆزە عەرەبەکان و داوای لێ دەکردن پەنای بدەن تا پەیامی خوا بگەیەنێت لە بەرامبەردا بەهەشت بەشیان دەبێت، هیچ هۆزێکی عەرەب نەهات بە دەمیەوە تا ئەوەی خوای گەورە ئایینەکەی سەربخات و پێغەمبەرەکەشی سەربخات و ئەو بەڵێنەی دابووی بیهێنێتە دی، ئەوە بوو خوای گەورە ئەمەی کردە بەشی پشتیوانان و هاتن بە دەمیەوە و خوای گەورە ماڵی کۆچی بۆ پێغەمبەرەکەی دیاری کرد[1].[2]

بەزار- بە فەرموودەی حەسەنی دەزانێت- لە عومەرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە مەککە دەرچوو بۆلای هۆز بەهۆزی عەرەب لە وەرزەکاندا، کەسیان نەبوو بێت ب ەدەمیەوە تا خوای گەورە ئەو دەستەی پشتیوانانی هێنا کاتێك بەختەوەری کردن و ڕێزی لێنان، پشتگیرو سەرخەری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوون، خوای گەورە لەسەر پێغەمبەرەکەی پاداشتی خێریان بداتەوە[3].[4] لە جمع الفوائد ج٢ ص٣٠ لە فەرموودەکەی عومەر (رضي الله عنه) ئەمەی هێناوە، سوێند بە خوا وەفامان نەبوو بۆیان لەسەر ئەوەی بەڵێنمان دابوو پێیان لەسەری ئێمە پێمان وتن: ئێمە سەرکردەو ئێو

---

[1] - ضعیف.

[2] -هەیسەمی ج٦ ص٤٢ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا عەبدوڵلای کوڕی عومەر هەیە، ئەحمەد و کۆمەڵێك متمانەی پێ دەدەن و نەسائی و کۆمەڵێکی دیکەش بە لاوازی دەزانن، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە جێ متمانەن.

[3] - صحیح.

[4] - لە کنز العمال ج٧ ص١٣٤ دا واهاتووە،

وەزیر، ئەگەر بۆ ئەمجار بمێنمەوە یەك کاربەدەستم ناهێڵمەوە مەگەر لە پشتیوانان بێت.[1]

ئیمامی ئەحمەد لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە (ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) چوو بۆلای خەڵکی و پێشنیاری سەرخستنی بۆ دەکردن و دەیفەرموو کەس هەیە لەسەر هۆزەکەم پاڵپشتم بێت چونکە ناهێڵن پەیامی پەروەردگارم بگەیەنم، کەسێك لە هەمدان هات بۆلای، فەرمووی (تۆ لە کێیت؟) وتی: لە هەمدان، فەرمووی: (لای هۆزەکەت هیچ پەناو پشتگیریەکت هەیە؟) وتی: بەڵێ، پاشان کابرا ترسا هۆزەکەی پشتگیری نەکەن، هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و وتی: دەچم بۆلایان و پێیان دەڵێم دوایی دێمەوە بۆلات، فەرمووی (باشە) کابرا چوو و لە مانگی ڕەجەبدا پشتیوانان هاتن[2]. [3] پێشتریش لەسەر بەیعەتدان لەسەر سەرخستن فەرموودەکەی جابرمان (ﷺ)لە ئیمامی ئەحمەدەوە هێنا کەوتی: پێغەمبەر (ﷺ) دەساڵ لە مەککە مایەوە و دەچوو بۆلای خەڵك لە شوێنەکانیان لە عوکاظ و میجەننە و لە وەرزەکاندا دەچوو بۆلایان و دەیفەرموو (کێ پەنام دەدات، کێ سەرم دەخات تا ئاییني پەروەردگارم بگەیەنم و بەهەشتیش بۆ ئەو بێت) کەس نەبوو بێت بە دەمیەوە تا ئەوەی کەسێك لە یەمەنەوە یان لە موزەر دەهات و هۆزەکەی و خزمانی پێیان دەوت ویاری ئەو کابرا قورەیشیە بە هەڵت نەخەڵەتێنێت، لە نێویاندا دەگەڕا و ئەوانیش بە پەنجە ئاماژەیان بۆ دەکرد تا خوای گەورە لە یەسربەوە ئێمەی نارد بۆلای و پەنامان داو بڕوامان پێ هێنا و هەرکەسمان چوو بۆلای و باوەڕی پێ دەهێنا و قورئانی

---

[1] - دەڵێت: هی بەزارە بە لاوازی، لە مجمع الزوائد دا لە بەزارەوە بە تەواوەتی بەوجۆرە هێناویەتی دەڵێت: بەزار هێناویەتی و سەنەدەکەی بە حەسەن داناوە و لە سەنەدەکەیدا ئیبن شەبیب هەیە کە لاوازە.

[2] - صحیح.

[3] هەیسەمی ج٦ ص٣٥ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی جێ متمانەن، ئیبن حەجەر لە فتح الباری ج٧ ص١٥٦ دەیداتەوە پاڵ زانایانی سونەن و ئیمامی ئەحمەد دەڵێت: حاکم بە صەحیحی زانیوە،

دەخوێندو دەگەڕایەوە بۆ لای ماڵو منداڵی و ئەوانیش موسڵمان دەبوون تا هیچ ماڵێکی پشتیوانان نەما دەستەیەکی موسڵمانانی تێدا نەبێت، پاشان هەموو ڕاوێژیان کردو وتیان تاکەی وازبێنین پێغەمبەر (ﷺ) بە شاخ و داخی مەککەدا ڕابکات و بێت و بچێت و بترسێت؟ بۆیە حەفتا کەسمان لە وەرزی حەجدا چوون بۆلای و لە دۆڵی عەقەبە کاتی دیدار دانراو یەك کەس و دووکەس چووین بۆلای تا هەموو کۆبووینەوە و وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا لەسەر چی بەیعەتت پێ بدەین؟ ئینجا فەرموودەکە دێنێت[1] [2].

تەبەرانی لە عوروەوە (رضي الله عنه) بە مورسەلی هێناویەتی دەڵێت: لە کاتی وەرزی حەجدا دەستەیەك لە پشتیوانانی بەنی مازنی کوڕی نەجار هاتن بۆ حەج، لەوانە: موعازی کوڕی عەغرا، ئەسعەدی کوڕی زورارە، لە بەنی زورەیق: ڕافعی کوڕی مالیك و زەکورانی کوڕی عەبدولقەیس، لە بەنی عەبدولئەشهەل ئەبولهەیسەمی کوڕی تەیهان، لە بەنی عەمری کوڕی عەوف: عوەیمی کوڕی ساعدە (رضي الله عنه) پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆلایان و هەواڵی پێغەمبەرایەتی و ڕێزێکی پێ دان کە خوا پێی بەخشیوە، قورئانی بەسەردا خوێندنەوە، کاتێك گوێیان لێگرت بێدەنگ بوون و دەروونیان بۆ بانگەوازەکەی ئارامی گرت و لەوەی لە ئەهلی کیتانیان بیستبوو سیفەتەکانیان زانی و بڕوایان پێ هێنا و بوونە هۆی خێر، پاشان پێیان وت: تۆ دەزانیت لە نێوان ئەوس و خەزرەجدا خوێن ڕژان هەیە و ئێمەش حەزدەکەین بزانین خوا فەرمانی چی پێ کردویت و ئێمەیش ئامادەین قسەی پەروەردگارو تۆ وەربگرین، جا لەمەدا پرس بە تۆ دەکەین، بەناوی خواوە خۆ بگرە تا بگەڕێینەوە لای هۆزەکەمان و سەبارەت بە تۆ هەواڵیان پێ بدەین و بانگیان بکەین بۆلای خواو پێغەمبەرەکەی، بەڵکو خوای گەورە نێوانمان چاك بکات و یەکدەنگمان بکات، چونکە ئەمڕۆ دژبەیەك و دوژمنی

---

[1] - صحيح.

[2] - حاكم ج٢ ص٦٢٥ هێناویەتی و دەڵێت سەنەدەکەی صەحیحە.

یەکترین، ئەگەر ئەمڕۆ بێت و ئێمە ڕێکنەکەوتبین بۆت یەکدەنگ نابین، بەڵێنی دیدارمان وەرزی حەجی داهاتووە، پێغەمبەریش (ﷺ) بە قسەکەیان ڕازی بوو، گەڕانەوە بۆلای هۆزەکەیان و بە نهێنی بانگیان کردن بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و پەیامی خواو قورئان تا ئەوەی کەم ماڵی پشتیوانان مابوو کەسانێك تێیدا موسڵمان نەبووبن، ئینجا فەرموودەکە دێنێت، وەك لە باسی بانگەوازی موصعەبی کوڕی عومەیردا (رضي الله عنه) هاتووە.[1]

حاکم ج٢ ص٦٢٦ لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە هێناویەتی دەڵێت: گوێم لە پیرێکی پشتیوانان بوو دەیوت: ئیبن عەبباس (رضي الله عنه) دی دەچوو بۆلای صرمەی کوڕی قەیس و ئەم دێڕانەی لێوە فێردەبوو:

ثوى في قريش بضع عشرة حجة — يذكر لو الفي صديقا مواتيا
و يعرض في اهل المواسم نفسه — فلم ير من يؤوي ولم ير داعيا
فلما اتانا واستقرت به النوى — و اصبح مسرورا بطيبة راضيا
و اصبح ما يخشى ظلامة ظالم — بعيد وما يخشى من الناس باغيا
بذلنا له الاموال من جل مالنا — و انفسنا عند الوغى والتاسيا
نعادى الذي عادى من الناس كلهم — بحق و ان كان الحبيب المواتيا
و نعلم ان الله لاشيئ غيره — و ان كتاب الله اصبح هادي

[1] - هەیسەمی ج٦ ص٤٢ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا ئیبن لهیعە هەیە کە جۆرە لاوازیەکی تێدایە، فەرموودەی حەسەنە، کەسەکانی دیکەی جێی متمانەن، تەواو.

## (برایەتی نێوان کۆچەران و پشتیوانان (رضي الله عنهم))

ئیمامی ئەحمەد لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف (رضي الله عنه) چوو بۆ مەدینەو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) برایەتی خستە نێوان ئەو و سەعدی کوڕی ڕەبیعی ئەنسیاریەوە، سەعد پێی وت: ئەی برا گیان من لە هەموو خەڵکی مەدینە پارەم زیاترە، سەیرکە نیوەی پارەکەم ببە بۆ خۆت و دوو ژنیشم هەیە کامیان جێی حەزی تۆیە بیڵێ با تەڵاقی بدەم بۆت، عەبدوڕەحمان وتی خوا بەرەکەت بخاتە ماڵ سامانتەوە، بازاڕم پێ نیشان بدە، بازاڕیان پی نیشان دا لەوێ کەوتە کڕین و فرۆش و قازانجی کرد و هەندێ پەنیر و ڕۆنی کڕی و پاشان هێندەی نەبرد هات و بۆنی زەعفەرانی پێوە بوو، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (مهیم؟) واتە(چۆن وا؟) وتی ئەی پێغەمبەری خوا ژنێکم بە هاوسەر گرتووە، فەرمووی (مارەییکەی چەندت بۆ کرد؟) وتی: هێندەی دەنکێك زێڕم بۆ کرد، فەرمووی (چێشتی وەلیمە بکە با بە مەڕێکیش بێت)، عەبدوڕەحمان دەڵێت: ئەگەر بەردێکم بەرز بکردایەتەوە وام دەبینی زێڕ و زیوم دەست کەوێ.[1]

بوخاری لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کۆچەران کە هاتن بۆ مەدینە کەسی کۆچەر بە پێی ئەو برایەتیەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە نێوانیاندا داینابوو وەك نزیکەکانی کەسی پشتیوان میراتی وەردەگرت، کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی (ولكل جعلنا موالي) سڕایەوە، لەو گێڕانەوەدا واهاتووە سڕەرەوەی میراتی حەلیف ئەو ئایەتەیە، لەوەی دواتر دا سڕەرەوە ئەم ئایەتەیە (و اولو الارحام بعضهم اولى ببعض) ئیبن حەجەر دەڵێت: ئەمەیان جێی پشت پێ بەستنەو دەکرێت دووجار سڕابێتەوە، یەکەمیان ئەوەیە کەسی عەقدبەستوو بەجیا لە دەستە میرات وەردەگرێت، ئەم ئایەتە

---

[1]– لە البداية والنهاية ج٣ ص ٢٢٨دا واهاتووە، بوخاری و موسلیمیش لە ئەنەسەوە هێناویانە، بوخاری لە فەرموودەکەی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفیشەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی، الاصابة ج٢ ص٢٦یشدا هاتووە، هەروەها ئیبن سعد ج٣ ص٨٩ لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی.

دابەزی (ولكل جعلنا) بەمە هەموویان میراتیان وەردەگرت، لەسەر ئەمە فەرموودەکەی ئیبن عەبباس (رضي الله عنه) دێنێت، پاشان ئایەتی ئەحزاب ئەمەی سڕیەوەو میراتی بە دەستەی دیاری کردو کەسی عەقدبەستوو سەرخستو ئەو جۆرانەی بۆ مایەوە، لەسەر ئەمە بەرە بەرە لەسەری دەهات، ئەحمەد لە فەرموودەکەی عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکیەوە لە باپیریەوە (رضي الله عنه) بەوجۆرە هێناویەتی، هەروەها لە فتح الباری ج٧ ص١٩١ هاتووە.

ئیبن سەعد بە چەند سەنەدێکی واقیدی لە کۆمەڵێکی تابعینەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چوو بۆ مەدینە برایەتی خستە نێوان کۆچەران بەجیا و کۆچەران و پشتیوانان لەسەر بەدەمەوە بوون و میراتیشیان بە دەرکەوت، ئەوانە نەوەد کەس بوون، هەندێکیان کۆچەرو هەندێکیان لە پشتیوانان بوون، یان دەڵێن: سەد کەس بوون، کاتێك ئایەتی (والوا الارحام) دابەزی میراتی نێوانیان بەو برایەتیە پووچەڵ بوویەوەو لەکار خرا، لە فتح الباری ج٧ ص١٩١ دا واهاتووە.

## (پشتیوانان بە ماڵو سامانیان دڵی کۆچەران دەدەنەوە)

بوخاری ج١ ص٣١٢ لە ئەبوهورەیرەوە (رضي الله عنه) هێناوەتی دەڵێت: پشتیوانان بە پێغەمبەریان (صلى الله عليه وسلم) وت: دارخورماکانمان لە نێوان ئێمەو براکانماندا دابەش بکە، فەرمووی نا، وتیان: دەی یارمەتیمان بدەن تا لە بەرهەمدا بەشدارتان بکەین؟ وتیان بەڵێ باشە، عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەسلەم دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە پشتیوانانی فەرموو (براکانتان پارەو سامان و منداڵیان بەجێ هێشتووەو هاتوون بۆلای ئێوە) وتیان دەی پارەو سامانمان لە نێوانماندا دابەش بکە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی ئەی جگە لەوە؟ وتیان چی بکەین ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی (ئەوانە کۆمەڵێکن کار نازانن هاوکاریان بن و بەرهەمیان لەگەڵدا دابەش بکەن) وتیان بەڵێ.[1]

---

[1] – لە البداية والنهاية ج٣ ص٢٢٨ دا واهاتووە.

ئیمامی ئەحمەد لە یەزید لە حەمید لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کۆچەران وتیان ئەی پێغەمبەری خوا کەسی وامان وەك ئەمانە نەدیوە کە هاتووین بۆلایان وا دڵنەواییمان دەکەن و زۆرمان پیٚ دەبەخشن، هێندە بەسە یارمەتیمان بدەن و لە بەرهەمدا بەشداریان کردووین تا ئەوەی دەترساین هەموو پاداشتەکە ببەن فەرمووی (لا ما اثنیتم علیهم و دعوتم الله لهم) واتە(نا مادام سوپاسیان دەکەن و لای خوا نزایان بۆ دەکەن)[1][2].

بەزار لە جابرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی ئەگەر پشتیوانان درەختەکانیان (دارخورماکان) دەبڕی خورمایەکیان دابەش دەکرد بۆ دووبەش، یەکێکیان لەوی دی کەمتر بوو، پاشان گەڵاکەیان لەگەڵ کەمەکەیاندا دادەنا، پاشان بە کۆچەرانیان دەوت: بە دڵی خۆتان یەکێك لەو دووانە هەڵبژێرن، ئەوانیش زۆرەکەیان هەڵدەگرت و پشتیوانانیش لە پێناو گەڵاکەیدا کەمەکەیان هەڵدەگرت، ئەمە تا فەتحی خەیبەر وابوو، ئینجا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (قد وفیتم لنا بالذي کان علیکم، فان شئتم ان تطیب انفسکم بنصیبکم من خیبر و یطیب ثمارکم فعلتم) وتیان: ئێمە چەند مەرجێکمان لەسەر شان بوو، ئێمەش مەرجێکمان لەسەر تۆ هەبوو ئەویش بەهەشت بوو، ئەوەی پێت وتین کردمان بەرامبەر مەرجەکەت، فەرمووی (فذاکم لکم) واتە(مەرجەکەتان بۆ هەیە)[3][4].

بوخاری لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پشتیوانانی بانگ کرد تا بەحرەنیان پیٚ بدات، وتیان مەگەر هێندەش بڕیتەوە بۆ برا کۆچەرەکانمان، فەرمووی (اما لا فاصبروا حتی تلقوني فانه سیصیبکم اثرە).

---

[1] – صحیح.

[2] –ئەم فەرموودە لەسەر مەرجی بوخاری و موسلیم سەنەدی سیایە، هیچکام لە شەش کتێبی فەرموودە لەم ڕووەوە نەیانهێناوە لە البدایة والنهایة ج٣ ص٢٢٨ دا واهاتووە، ئیبن جەریریش لەگەڵ حاکم و بەیهەقیدا هێناویانە، لە کنز العمال ج٧ ص١٣٦ دا واهاتووە.

[3] – ضعیف.

[4] – هەیسەمی ج١٠ ص٤٠ دەڵێت: بەزار لە دوو ڕێگەوە هێناویەتی، لە هەردوو ڕێگەکەوە موجالیدی تێدایە کە ڕای جیاوازی لەسەرە، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە صەحیحن.

# (پشتیوانان (خوایان لیٚ ڕازی بیٚت) چۆن بۆ بە هیٚزکردنی پەتی ئیسلام پەتی نەفامییان پچڕاند)

بوخاری لە جابری کوڕی عەبدوڵڵاوە (رضي الله عنه) هیٚناویەتی دەڵیٚت: پیٚغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (کیٚ دەچیٚت بۆ کەعبی کوڕی ئەشرەف چونکە خواو پیٚغەمبەرەکەی ئازار دەدات؟) موحەمەدی کوڕی مەسلەمە (رضي الله عنه) هەستاو وتی: ئەی پیٚغەمبەری خوا حەزدەکەیت بیکوژن؟ فەرمووی بەڵیٚ، وتی: دەی مۆڵەتم بدە تا هەندیٚ شت بڵیٚم، فەرمووی بیڵیٚ، موحەمەدی کوڕی مەسلەمە چوو بۆلای و وتی: ئەم کابرا داوای بەخشینمان لیٚ دەکات و بیٚزاری کردوین و منیش هاتووم داوای قەرزت لیٚ بکەم، وتی: بە خوا دووبارە بیٚزاری دەبیت، وتی: ئیٚمە ماندوومان کردووە و نامانەویٚت وازی لیٚ بهیٚنین تا بزانین چی لیٚ دیٚت، هاتووین تا بڕیٚك قەرزمان بدەیتیٚ، عەمر چەند جاریٚك بۆی گیٚڕاوینەتەوە و بڕەکەی نەهیٚناوە، منیش پیٚم وت: بڕەکەی یەك یان دوو کۆڵ، وتی: بەدیدەکەم، وتی: بەڵیٚ دەی ڕەهن بدەنە لام، وتیان چیت دەویٚت؟ وتی: ئافرەتەکانتان بە ڕەهن بدەنە لام، وتیان چۆن ئافرەتەکانمان دەدەینەلات و تۆ جوانترینی عەرەبی؟ وتی: دەی منداڵەکانتان، وتیان: چۆن دەبیٚت ئەو کات قسەیان پیٚ بڵیٚیت، وتی: دەی یەك یان دوو کۆڵ و بار، وتیان: ئەوە عەیبەیە بۆمان بەڵام (الامە) چەکت دەدەینە لا، ئینجا بەڵیٚنی پیٚدا بۆی بهیٚنیٚت، شەو هات بۆلای و ئەبونائیلەشی لەگەڵدا بوو، برای شیری کەعب بوو، ئەویش بانگی کردن بۆ قەڵاکە و چوون بۆلایان، ژنەکەی پیٚی وت: بەم درەنگە بۆ کویٚ دەچیت؟ ئەوە موحەمەدی کوڕی مەسلەمەو ئەبونائیلی برای من، جگە لە عەمر وایان هیٚناوە، ژنەکەی وتی: دەنگیٚك دەبیستم چۆڕەی خویٚنی لیٚ دیٚت، وتی: کورە ئەوە موحەمەدی کوڕی مەسلەمە دوو کەسی لەگەڵدابوو، بە ئەبوسوفیان وترا عەمر ناوی هیٚنان؟ وتی: یەکیٚکیانی هیٚنا، عەمر دەڵیٚت: دوو کەسی لەگەڵدابوو، کەسانی دی دەڵیٚن ئەبوعەبسی کوڕی جەبرو حارسی کوڕی ئەوس و عەبادی کوڕی بیشر بوون،عەمر

دەڵێت: دوو کەسی لەگەڵدا بوو، وتی: ئەگەر هات من دەست بۆ قژی دەبەم و بۆنی دەکەم، کە بینیتان سەریم گرت لێی دەن، ئەویش بەجلی (وشخ) پێستەییەوە هات بۆلایان و بۆنی خۆشیان لێ دەهات، وتی: بۆنی لەوە خۆشترم نەبیستووە، لەلای جگە لە عەمر هاتووە دەڵێت: بۆنخۆشترین ئافرەتی عەرەب و کامڵترینی عەرەبم لایە، عەمر دەڵێت: وتی: مۆڵەتم دەدەیت بۆنی سەرت بکەم؟ وتی: بەڵێ، پاشان بۆنی کرد، ئینجا هاوەڵانیشی بانگکرد تا بۆنی بکەن، پاشان وتی: مۆڵەتم دەدەیتەوە؟ وتی: بەڵێ، کە سەری گرت وتی ئادەی، ئەوانیش کوشتیان و هاتنەوەی لای پێغەمبەر (ﷺ) پێیان وت، لە گێڕانەوەیەکی عەمردا (رضي الله عنه) هەواڵیان دایەوە بە پێغەمبەر (ﷺ) و ئەویش سوپاسی خوای کرد، لە گێڕانەوەی ئیبن سەعددا کە گەیشتنە بەقیعی غەرقەد الله اکبریان وت، پێغەمبەر (ﷺ) ئەو شەوە شەونوێژی دەکرد، کە الله اکبری ئەوانی بیست الله اکبری کرد و زانی کوشتوویانە، پاشان گەیشتنەوە لای، ئەویش فەرمووی (افعلت الوحدة) واتە(ئەم دەم و چاوانە سەرکەوتن) وتیان ڕووخساری تۆش ئەی پێغەمبەری خوا، ئینجا سەری کەعبیان خستە بەردەستی، ئەویش سوپاسی خوای کرد لەسەر کوشتنی، لە فەرموودەی مورسەلی عیکرەمەدا (رضي الله عنه) جوولەکە ترسان و هاتن بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و وتیان گەورەکەمان بە پیلان کوژراوە، پێغەمبەریش (ﷺ) پێی فەرموون کە چی کردووە و خەڵکی لە دژی پێغەمبەر (ﷺ) هانداوە و ئازاری موسڵمانانی داوە، ئیبن سەعد ئەوەشی بۆ زیاد دەکات: ترسان و هیچیان نەوت،[1] ئیبن ئیسحاقیش هێناویەتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (کێ دەچێت بۆ ئیبن ئەشرەف؟) موحەمەدی کوڕی مەسلەمە وتی: من دەچم بۆی ئەی پێغەمبەری خوا، من دەیکوژم، فەرمووی (دەی ئەگەر دەتوانیت بیکوژە) موحەمەدی کوڕی مەسلەمەش هاتەوە و سێ شەو و ڕۆژ نان و ئاوی نەخوارد مەگەر تەنها بەشی مان و ژیانی، ئەمەی باسکرد بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش پێی فەرموو (بۆچی وازت لە نان و ئاو هێنا؟)

---

[1] - لە فتح الباری ج٧ ص٢٣٩ دا بەوجۆرە هاتووە.

وتی: ئەی پێغەمبەری خوا قسەیەکم پێ وتیت نازانم چاری قسەکەم دەکەم یان نا، فەرمووی (لك الحيعد) هەر ئیبن ئیسحاق لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵیان تا بەقیعولغەرقەد چوو دوایی ناردنی و فەرمووی (بەناوی خواوە بڕۆن، خوایە یارمەتییان بدەیت)[1][2].

## (کوشتنی ئەبوڕافیع سەلامی کوڕی ئەبولحوقەیق)

ئیبن ئیسحاق لە عەبدوڵڵای کوڕی کەعبی مالیکەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: یەکێك لەو شتانەی خوای گەورە بەخشی بە پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەبوو ئەو دووبەشەی پشتیوانان ئەوس و خەزرەج لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) کێ بڕکێیان بوو، ئەوس هەرچی بکردایە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) خەزرەج دەیوت سوێند بەخوا نابێت لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) فەزڵیان لە ئێمە زیاتر بکات بۆیە وازیان نەدەهێنا تا ئەوانیش وەك ئەوان بکەن، بۆ خەزرەجیش هەروابوو، کاتێك ئەوس کەعبی کوڕی ئەشرەفیان لە دوژمنایەتی پێغەمبەر (ﷺ) دوور خستەوە خەزرەج وتیان سوێند بەخوا نابێت هەرگیز فەزڵیان لە ئێمە زیاتر بێت، بۆیە لای پێغەمبەر (ﷺ) کەوتنە باسی دوژمنایەتی کەسێك کەوەك ئیبن ئەشرەف وابوو، باسی ئیبن ئەبی حوقەیقیان کرد کە لە خەیبەر بوو، مۆڵەتیان لە پێغەمبەر (ﷺ) وەرگرت تا بیکوژن، ئەویش مۆڵەتی دان، بۆیە لەناو خەزرەجدا لە بەنی سەلەمە پێنج کەس چوون: عەبدوڵڵای کوڕی عوتەیك و مەسعودی کوڕی سنان و عەبدوڵڵای کوڕی سنان و ئونەیس و ئەبوقەتادە حارسی کوڕی ڕبیع و خوزاعی کوڕی ئەسوەد، چوون و پێغەمبەر (ﷺ) عەبدوڵڵای کوڕی عوتەیکی کرد بە ئەمیریان، ڕێگری لێ کردن لەوەی منداڵ یان ئافرەت بکوژن،

---

[1] - ضعيف.

[2] -لە بداية والنهاية ج٤ ص٧ دا واهاتووە، ئیبن حەجەر سەنەدی فەرموودەکەی ئیبن عەبباس بە حەسەن دادەنێت، ئەمە لە فتح الباري ج٧ ص٢٣٧ دا.

ئەوانیش چوون بۆ خەیبەرو چوون بۆ ماڵی ئیبن ئەبی حوقەیق، ئەمەش لە شەودا، هەرکەسی ناو ماڵیان بانگ دەکرد دەرگاکەیان لەسەر ماڵەوەی دادەخست، لە ژوورێکی (لەسەر زەوی بەرز بوویێتەوە، پایەو تایەی لە ژێردابێت) دار خورمایەك هەبوو، پیایدا هەڵزنین تا چوونە سەر دەرگاکەی و مۆڵەتیان وەرگرت، ژنەکەی هاتە دەرەوە بۆلایان و وتی: ئێوە کێن؟ وتی: خەڵکێکی عەرەبین هاتووین بۆ نان، وتی: ئەوە کابرایە بچن بۆلای، کە چوونە ژوورەوە دەرگاکەیان داخست نەوەك کەسێك بکەوێتە نێوان ئێمەو ئەوەوە، ژنەکەی هاواری کردو دەنگی بەسەردا بەرزکردینەوە، ئەویش لەسەر جێگەکەی بوو بە شمشێر دامان بەسەریداو سوێند بەخوا لەو تاریکی شەوەدا سپیی ڕەنگیەکەی وایکرد بیبینین، هەرلە جلی قیبتی دەچوو، کاتێك ژنەکەی قیژەی بەسەردا کردین یەکێکمان شمشێری لە ڕوودا بەرزکردەوە بەڵام فەرموودەکەی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) بیرکەوتەوە کە ڕێگری کرد لە کوشتنی ژن بۆیە دەستی گرتەوە، ئەگەر نا ئەو شەوە دەمانکوشت، کە بە شمشێر دامان لە کابرا عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیس شمشێرەکەی کرد بەسکیداو ئەویش دەیوت: بەسمە بەسمە، ئێمەیش چووینە دەرەوە، عەبدوڵڵای کوڕی عوتەیك شەو کوێر بوو، ئەوانیش ئاگریان دەکردەوەو لە هەموو لایەکەوە بە دواماندا دەگەڕان تا بێهیوابوونو گەڕانەوە بۆلای و چواردەوریانداو ئەویش باسی دەکرد، وتمان چووزانین ئەو دوژمنەی خوا مردووە؟ یەکێکمان وتی: من دەچمو سەیر دەکەم، چوو تا گەیشتە ناو خەڵکەکە، دەڵێت ژنەکەیم دی لەگەڵ کەسانی جوولەکەدا لە دەوری بوونو چرایەك لە دەوری ژنەکەیدا سەیری ناوچاوی مێردەکەی دەکردو قسەی بۆ خەڵکەکە دەکرد، سوێند بەخوا گوێم لە دەنگی ئیبن عوتەیك بوو، دوایی وتم وانیە ئیبن عوتەیك لێرەدا چی دەکات؟ پاشان ژنەکەی سەیری نێوچەوانی پیاوەکەی دەکردو وتی سوێند بەخوا جوولەکە مرد، هیچ قسەیەکم نەبیستووە هێندە دڵخۆشم بکات، دەڵێت پاشان هاتەوە بۆلامانو پێی وتین، ئێمەش هاوڕێکەمان هەڵگرتو چووین بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و پێمان وت ئەو دوژمنی خوامان کوشت و هەرکام ناکۆکیمان بوو کە کێ

کوشتوویەتی، ئەویش فەرمووی (شمشێرەکانتان بێنن) ئێمەش شمشێرەکانمان پێدا، سەیری کردو بە شمشێرەکەی عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیسی فەرمووی (هذا قتله اری فیه اثر الطعام)[1،2].

بوخاری لە بەرائەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەندێ لە پشتیوانانی نارد بۆلای ئەبوڕافعی جوولەکە، عەبدوڵڵای کوڕی عوتەیکی (رضي الله عنه) کرد بە ئەمیریان، ئەبوڕافیع ئازاری پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) داو خەڵکی هاندەدا لە دژی ، لە قەڵایەکی خاکی حیجازدا بوو، کەلێی نزیك بوونەوە خۆر ئاوابوو و خەڵکی ئاژەڵ و شتی خۆیان بردبوویەوە، پاشان بە جلەکەی خۆی داپۆشی وەك ئەوەی پێویستی خۆی بەجێ بگەیەنێت، خەڵکی چوونە ژوورەوە، دەرگاوان هاواری لێکرد ئەی عەبدوڵڵا ئەگەر دەتەوێت بێیتە ژوورەوە وەرە دەمەوێت دەرگاکە دابخەم، منیش چوومە ژوورەوەو خۆم حەشاردا، کە خەڵکی چوونە ژوورەوە دەرگاکەی داخست، پاشان کلیلەکانی بەستەوە بە پەتێکەوە، منیش هەستام و کلیلەکانم بردو دەرگاکەم کردەوە، ئەبو ڕافعیش لە خانوویەکدا بوو و خەڵکی لای کۆدەبوونەوە، کاتێك خەڵکی چوونەوە سەرکەوتم بۆلای و هەرکە دەرگایەکم دەکردەوە لە ناوەوە لەسەر خۆم دادەخست وتم خەڵکەکە وازم لێناهێنن با وابکەم تا بیکوژم، کە گەیشتمەلای لە ماڵێکی تاریکدا بوو، نازانم لە کوێی ماڵەکەوە بوو، وتم: ئەبوڕافیع، وتی: ئەوە کێیە؟ منیش چووم بەرەو لای دەنگەکەو بە شمشێر لێمداو تەواو شڵەژابووم و هیچم پێ نەدەکرا، ئەویش هاوری کردو منیش لە ماڵەکە ڕامکردو زۆر نەمامەوە، دوایی چوومەوە بۆلای و وتم: ئەبوڕافیع ئەو دەنگە چیە. وتی: دایکت ڕۆڵەڕۆت بۆ بکات لەم ماڵەدا بە شمشێر کوژرام، منیش شمشێرێکی توندم لێداو هێشتا نەمکوشتبوو، پاشان لای شمشێرەکەم کرد بە سکیدا تا لە پشتیەوە دەرکەوت ئینجا زانیم

---

[1] - صحيح.

[2] - له البداية والنهاية ج٤ ص١٣٧ دا واهاتووه، له سيره ابن هشام ج٢ ص١٩٠ دا هاتووه.

کوشتوومە یەك یەك دەرگاکانم کردەوە تا گەیشتمە لای پەیژەکە، پێم خستە سەرو وام زانی تەواوە، کەچی لەوشەوەدا مانگ ڕووناکی خۆی دەدا کەوتمو پێم شکا، بە مێزەرێك پێم بەستەوەو کەوتمە ڕێ تا لەسەر دەرگاکە دانیشتم، وتم: ئەمشەو ناچم تا نەزانم کوژراوە، کە کەڵەشێر خوێندی هەواڵدەری مەرگ لەسەر شوورەکان هەستاو وتی: ئەبوڕافیعی سەرخەری خەڵکی حیجاز مرد، منیش چوومەوە بۆلای هاوڕێکانمو وتم: موژدە خوا ئەبوڕافیعی کوشت، ئینجا چوومەوە بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و پێم وت، ئەویش فەرمووی (ابسط رجلك) واتە(پێت ڕاکێشە)، پێم ڕاکشاندو ئەویش دەستی بەسەردا هێنا وەك ئەوە وابوو هیچ کات تووشی هیچ نەبووبێت بوخاریش بە دەقێکی تر هێناویەتی، بوخاری بەو دەقانە لە نێوان شەش فەرموودەناسدا بە تەنها هێناویەتی، پاشان دەڵێت: زوهری دەڵێت: ئوبەی کوڕی کەعب وتی: چوون بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) کە لەسەر مینبەر فەرمووی (افلحت الوحدة) ئەویش وتی: ڕوخساری تۆش ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی (ئایا کوشتتان؟) وتیان: بەڵێ، فەرمووی (شمشێرەکەم بدەرێ) ئەویش شمشێرەکەی پێدا، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (اجل هذا طعامه في رباب السيف)[1]

[1] – لە البداية والنهاية ج٤ ص١٣٧ دا واهاتووە.

# (کوشتنی ئیبن شەیبەی جوولەکە)

ئەبونەعیم لە کچی موحەیصە لە باوکیەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (من ظفرتم بە من رجال یهود فاقتلوه) موحەیصەش دای بەسەر ئیبن شەیبەدا – بازرگانێکی جوولەکە بوو کە جلی بۆ دەهێنان و شتی پێ دەفرۆشتن– کابرای جوولەکەی کوشت، موحەیصە ئەو کات هێشتا موسڵمان نەببوو، لە حوەیصە بە تەمەنتر بوو، کە کوشتی حوەیصە لێیداو وتی: ئەی دوژمنی خوا کوشتنت سوێند بەخوا چەوری ورگت لە نانی ئەوەوە بوو، وتی: سوێند بەخوا ئەگەر بڵێت تۆش بکوژم دەدەم لە ملی تۆش، وتی: سوێند بەخوا ئەگەر ئەمە سەرەتای موسڵمانبوونی حوەیصە بێت، سوێند بەخوا ئەگەر موحەمەد بڵێت بمکوژێت بێیت بمکوژیت؟ موحەیصە وتی: ئەرێ سوێند بەخوا، حوەیصە وتی: بەخوا ئایینی وات پێگەیشتبێت جێی سەرسوڕمانە، لە کنز العمال ج٧ ص٩٠ دا واهاتووە، ئیبن ئیسحاقیش بەوجۆرە هێناویەتی، لە فەرموودەکەیدا هاتووە: موحەیصە وتی: وت: سوێند بەخوا ئەوەی فەرمانی پێدام بیکوژم بۆ تۆش بڵێت دەدەم لە ملت، لەکۆتاییشدا ئەمە دێنێت: حوەیصە موسڵمان بوو، ئەبوداودیش لەو ڕێگەیەوە هێناویەتی، بەڵام لەو قسەیدا کۆتایی پێ دێنێت (ئەوەی لە سکتدایە لە پارەی ئەوە) ئیتر دواتری ناهێنێت.[1]

---

[1] – صحیح.

# (شەڕەکانی بەنی قەینووقاع و بەنی نەزیرو بەنی قورەیزەو لەو بوارەدا پشکی پشتیوانان چی بوو)

ئیبن ئیسحاق بە سەنەدی حەسەن لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ڕۆژی بەدردا وای بە قورەیش کرد جوولەکەکان لە بازاڕی بەنی قەینوقاعدا کۆبوونەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (ئەی جوولەکە، موسڵمان بن پێش ئەوەی تووشی ئەوەبن کە لە ڕۆژی بەدردا قورەیش تووشی بوو) وتیان ئەوان شەڕیان نەدەزانی، ئەگەر لەگەڵ ئێمەدا شەڕت بکردایە ئەوکات دەتزانی مەرد کامەیە، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند (قا للذين كفروا ستغلبون...... لاولي الابصار) لە فتح الباري ج٧ ص٣٣٤ دا بەوجۆرە هاتووە، ئەبوداودیش ج٤ ص١٤١ لە ڕێگەی ئیبن ئیسحاقەوە بەو واتایە هێناویەتی و لە فەرموودەکەشیدا ئەمەش هاتووە: وتیان: ئەی موحەمەد لە خۆت بایی نەبیت بەوەی دەستەیەکی بێ ئەزموونی نەشارەزای قورەیشت کوشتووە، ئەگەر لەگەڵ ئێمە شەڕ بکەیت دەزانیت ئێمە کێین و کەسی وەك ئێمەت بەدی نەدەکرد.[1]

ئیبن جەریریش هەروەك لە تەفسیری ئیبن کەسیر ج٢ ص٦٩ یشدا هاتووە لە زوهریەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك قورەیش لە بەدر شکان موسڵمانان بە جوولەکەکانیان وت: موسڵمان بن پێش ئەوەی دەردی قورەیشی ڕۆژی بەدرتان تووش بێت، مالیکی کوڕی صەیفیش وتی: بەوەی دەستەیەکی نەشارەزای شەڕی قورەیشتان شکاندووە لە خۆتان بایی بوون، ئەگەر بڕیاری ئەوە دەدەین بدەین بەسەرتاندا دەستی ئەوەتان نەدەبوو دەستمان لێ بکەنەوە، عوبادەی کوڕی صامتیش (رضي الله عنه) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا جوولەکەکان بە هێزن، چەکیان زۆرە، شانشکۆیان بەهێزە، من خۆم بە دوور دەگرم لە دۆستایەتی جوولەکەو دەدەمەوە

[1] - ضعيف.

پاڵ خواو پێغەمبەرکەی و ئەوانم بەسە، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی وتی: بەڵام من نکوڵی ناکەم لە دۆستایی جوولەکە، من کەسێکم هەردەبێت لەگەڵیان هەبم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (یا ابا الحباب ارایت الذي نفست به من ولایة یهود علی عبادة بن الصامت فهولك دونه) واتە(ئەی ئەبولحەباب ئەگەر وادەزانیت بە دۆستایەتی جوولەکە شتێکت لە عوبادەی کوڕی صامت بردۆتەوە ئەوە هەر بۆتۆ) ئەویش وتی: باشە قبوڵە، ئەوکات خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند (یا ایها الذین امنوا لاتتخذوا الیهود والنصاری اولیاء) تا (والله یعصمك من الناس).[1]

ئیبن ئیسحاق لە عوبادەی کوڕی صامتەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی، لە البدایة والنهایة ج٤ ص٤ یشدا هاتووە کە عوبادە دەڵێت: کاتێك بەنوقەینوقاع لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) شەڕیان کرد عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی دایە پاڵیان، عوبادەی کوڕی صامت (رضي الله عنه) کە لەبەنی عەوف ئەو هاوپەیمانیەی کە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی لەگەڵیان هەیبوو چوو بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و نکوڵی لێ کردن و دایە پاڵ پێغەمبەر (ﷺ)و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا خواو پێغەمبەرەکەی و باوەڕداران هەڵدەبژێرمو نکوڵی دەکەم لە هاوپەیمانی و دۆستایەتی ئەو بێباوەڕانە، هەروەها دەڵێت لەسەر ئەو و عەبدوڵڵا ئەم ئایەتانەی سورەتی (المائدة) دابەزین (یا ایها الذین امنوا لاتتخذوا الیهود والنصاری اولیاء..... ومن یتولی الله و رسوله والذین امنوا فان حزب الله هم المفلحون).[2]

---

[1] - ضعیف.

[2] - ضعیف.

# (فەرموودە سەبارەت بە بەنو نە ضیر)

ئیبن مەردەویە بە سەنەدی صەحیح لە موعەممەر لە زوهریەوە هێناویەتی کە عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی کەعبی کوڕی مالیك لە یەكێك لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: بێباوەڕانی قورەیش نامەیان نووسی بۆ عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی و هەندێکی دی لەوانەی بت پەرست بوون، ئەمە لە پێش بەدردا، هەڕەشەیان لێ دەکردن بۆچی پەنای پێغەمبەرو هاوەڵانیان داوەو و هەڕەشەیان لێ دەکردن بە هەموو عەرەبەوە بێن بۆیان، بەمە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی و هاودەمەکانی ویستیان لەگەڵ موسڵمانانندا بجەنگن، پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆلایان و فەرمووی (ماکادکم احد بمثل ماکادتکم قریش یریدون ان تلقوا بالسنتکم بینکم) واتە(کەس وەك قورەیش فێڵی لێ نەکردوون، دەیانەوێت شەڕەکە بخەنە نێوان خۆتانەوە) کە ئەمەیان بیست حەقیان بۆ ڕوون بوویەوەو بڵاوەیان لێ کرد، لە شەڕی بەدردا کە ئەوە ڕوویدا دواتر بێباوەڕانی قورەیش نامەیان نووسی بۆ جوولەکە (ئێوە خاوەنی بازنەو قەڵاو پەنان، بەنونەضیریش یەکدەنگ بوون لەسەر ناپاکی و ناردیان بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و وتیان لەگەڵ سێ هاوەڵی خۆتدا وەرە بۆلامان تا سێ لە زاناکانمان بتبینن، ئەگەر باوەڕیان پێ هێنایت شوێنت دەکەوین، ئەویش چوو، سێ جوولەکە خەنجەریان لەگەڵ خۆیان هەڵگرت، ئافرەتێکی بەنی نەضیر هەواڵی نارد بۆ برایەکی لە پشتیوانان کە موسڵمان ببوو هەواڵی پێدا کە بەنونەضیر دەیانەوێت چی بکەن، ئەویش هەواڵەکەی گەیاندە پێغەمبەر (ﷺ) پێش ئەوەی بگاتە لایان، بۆیە گەڕایەوەو بەسوپاوە گەڕایەوە بۆ لایان و گەمارۆی دان، پاشان بۆ بەیانی گەمارۆی بەنی قورەیضەی داو ئەوان لەگەڵی ڕێککەوتن، ئەوکات وازی لەوان هێناو گەڕایەوە بۆ بەنی نەضیرو لەگەڵیان بەشەڕهات تا بڕیاریاندا شاربەجێ بهێڵن و ئەوەی وشتر پێی دەکرێت ببەن جگە لە چەك، ئەوانیش تەنانەت دەرگایماڵەکانیشیان لەگەڵ خۆیاندا بردو ماڵەکانی خۆیان بە دەستی خۆیان وێران دەکردو چی دارو پەردووی

بوو لەگەڵ خۆیان برد، ئەوە یەکەم چوونیان بۆ شام بوو[1]. [2] هەروەها بەیهەقی لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گەماڕۆی دان تا حاڵیان گەیشتە ئەوەی تووشیان بوو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چی لێ داواکرد ئەوان پێی ڕازی بوون، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵیان ڕێککەوت تا واز لە خوێنیان بهێنێت و لە خاك و نیشتمان و ماڵی خۆیان دەریان بکات و بیان نێرێت بۆ (اذرعات) لە شام، بۆ هەرسێ کەسیان وشترێك یان وڵاخێك، هەروەها موحەممەدی کوڕی مەسلەمە (رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناردی بۆلای بەنونەضیرو فەرمانی پێکرد ماوەی سێ ڕۆژ دەرچوونەکەیان بۆ درێژ بکاتەوە، لە تەفسیری ئیبن کەسیر ج٤ ص٣٣٣ دا واهاتووە، ئیبن سەعد هێناویەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی (رضي الله عنه) نارد بۆلایان تا پێیان بڵێت (ان اخرجوا من بلدي فلا نساكنوني بعد ان هممتم بما هممتم به من الغدر وقد اجلتكم عشرا) واتە(لە خاك و شارم بچنە دەرەوە پاش ئەوەی ئەو نیازی ناپاکیەتان هەبوو ئیتر لەلام دامەنیشن و ماوەی دە ڕۆژم بۆ داناون تا بچن).[3]

---

[1] – صحيح.

[2] –عەبدوڵلای کوڕی حەمید لە تەفسیرەکەیدا لە عەبدولڕەزاقەوە هێناویەتی، لەمەدا وەڵامدانەوەیەك هەیە بۆ ئیبن تین کە دەڵێن لەو چیرۆك و باسەوە فەرموودەیەکی بە سەنەد نییە، لە فتح الباری ج٧ ص٢٣٢ یشدا هاتووە، ئەبوداود لە ڕێگەی عەبدولڕەزاق لە موعەمەرەوە بە دوورو درێژی هێناویەتی لەگەڵ زیادەکەیدا، عەبدولڕەزاق و ئیبن مونزیرو بەیهەقی لە الدلائل دا هێناویانە، لە بذل المجهود ج٤ ص١٤٢ لە الدر المنثوریشەوە هاتووە،

[3] – لە فتح الباری ج٧ ص٢٣٣ بەو جۆرە هاتووە.

# (فەرموودەکەی بەنی قورەیظە)

ئیمامی ئەحمەد لە عائیشەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: لە ڕۆژی خەندەقدا بەدوای خەڵکەوە بووم کە گوێم لە گرمەو دەنگی دواوە بوو، سەیردەکەم سەعدی کوڕی کوعازو حارسی کوڕی ئەوسی برازای (رضي الله عنه) بوون کە (مجنە) یەکی پێ بوو، منیش لەسەر زەوی دانیشتمو سەعد چوو و قەڵغانێکی ئاسنی پۆشیبوو کە چواردەورەکەی دەرچوو بوو، منیش دەترسام بەرم بکەوێت چونکە سەعد لە هەموویان کەڵەگەت ترو درێژتر بوو، تێپەڕیو دەیوت:

لبث قليلا يدرك الهيجا جمل ما احسن الموت اذ حان الاجل

عائیشە (رضي الله عنها) دەڵێت هەستامو چوومە باخێکەوەو دەبینم دەستەیەکی موسڵمانان لەوانە عومەری کوڕی خەتتابی تێدابوو لەگەڵ کەسێکدا کە شتێکی لەسەر بوو (مغفر) دەچوو، عومەر وتی: بۆچی هاتوویت؟ بەخوا تۆ نەترسیت چوزانیت تووشی شتێك نابیت، بەردەوام سەرکۆنەی کرد تا ئەوەی هیوام دەخواست زەوی بکرێتەوەو بچم بەناخیدا، کابرا بەرگەکەی بەسەر دەمو چاوی لابردو دەبینم تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵڵایە (رضي الله عنه) وتی: عومەر هاوار بۆ تۆ ئەمڕۆ زۆر دەچیت، جگە بۆلای خوا ڕاکردن بۆ کوێ هەیە؟ عائیشە دەڵێت: کەسێك لە قورەیش شمشێرێکی دا لە سەعدو وتی: بیگرە من ئیبنولعرقەم، دای لە ژێر چاویو بڕی، سەعدیش وتی: خوایە نەمکوژی تا چاوم بە نەمانی بەنی قورەیظە سوکنایی بگرێت، بەنوقورەیظە دۆستو هاوپەیمانی سەردەمی نەفامی سەعد بوون، برینەکەی برینپێچ کردو خوا ڕەشەبای نارد بۆ بێباوەڕان و باوەڕدارانی لە شەڕ پاراست، خوای گەورەش بە هێزو سەرکەوتووە، ئەبوسوفیان و هاودەمەکانی گەیشتنە تیهامە، عویەینەی کوڕی بەدرو هاودەمەکانیشی گەیشتنە نەجد، بەنوقورەیظەش گەڕانەوە لە قەڵاو پەناکانی خۆیاندا سەنگەریان گرت، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گەڕایەوە بۆ مەدینەو داوای چادرێکی پێستەیی کردو لە مزگەوتدا هەڵدرا بۆ سەعد، جبریل (علیه السلام) تەپوتۆزی شەڕی

لەسەر مابوو وتی: ئەرێ دەڵێت چەکت دانا؟ نە سوێند بەخوا فریشتەکان هێشتا چەکیان دانەناوە، بڕۆ بۆ بەنی قورەیظە و لەگەڵیان بجەنگە، پێغەمبەریش (ﷺ) بەرگی شەڕی پۆشی و بە خەڵکی وت: بەڕێ کەون، بەنی غەنەم کە دراوسێی مزگەوت بوون کەوتنەڕێ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (من مر بکم؟) (کێ دای بە لاتاندا) وتیان: دوحیەی کەلبی (رضي الله عنه)، دوحیەی کەلبی ریش و تەمەن و ڕوخساری لە جبریل (علیه السلام) دەچوو، پێغەمبەر (ﷺ) چوو بۆ بەنی قورەیظە و بیست و پێنج شەو گەمارۆی دان، کاتێك باریان سەخت بوو پێیان وترا بێنە ژێرباری فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەوانیش ڕاوێژیان کرد بە ئەبولوبابەی کوڕی عەبدولمونزیر، ئەویش پێی وتن سەربڕین دێتە ڕێتان، ئەوانیش وتیان دەی حوکم و بڕیاری سەعدی کوڕی موعازمان دەوێت، پێغەمبەر (ﷺ) ڕازی بوو و فەرمووی (انزلوا علی حکم سعد بن معاذ) گوێدرێژێك هێنرا و سەعدی پێ هێنرا، هۆزەکەشی لە چواردەوریدا بوون، وتیان: ئەی ئەبوعەمر هاوپەیمان و دۆستی جارانت، خۆیشت دەزانیت، ئەویش نەوەڵامی دانەوە و نەلای بەلادا دەکردنەوە، تا لێیان نزیك بوویەوە سەیری هۆزەکەی کرد و وتی: ئێستا کاتی هاتووە تا لە پێناو خوادا گوێ بە لۆمەی لۆمەکاران نەدەم، ئەبوسەعیدیش دەڵێت: کەهات پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (قوموا الی سیدکم فانزلوه) واتە(بچن گەورەکەتان دابەزێنن) عومەر وتی: خوا گەورەمانە، فەرمووی (انزلوه) (دایبەزێنن) ئەوانیش دایانبەزاند پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (احکم فیهم) واتە(حوکمیان لەسەر بدە) سەعد وتی: من حوکمیان لەسەر دەدەم جەنگاوەرەکانیان بکوژێن و ژن و منداڵیشیان ببرێن و ماڵ و سامانیشیان دابەش بکرێت، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (بەڕاستی حوکمی خواو پێغەمبەرەکەیت بەسەریاندا دا) پاشان سەعد پاڕایەوە لە خواو وتی: خوایە ئەگەر شەڕی قورەیشت بۆ پێغەمبەرەکەت هێشتۆتەوە بمهێڵەرەوە، ئەگەر نا بمبەرەوە بۆلای خۆت، ئەم قسەی کرد و پێی نەما و گەڕایەوە بۆ ناو ئەو چادرەی پێغەمبەر (ﷺ) بۆی دادابوون پێغەمبەر (ﷺ) و ئەبەبەکرو عومەر (رضي الله عنهما) چوون بۆلای، عائیشە (رضي الله عنها) دەڵێت: سوێند بەو

کەسەی گیانی موحەمەدی بەدەستە لە ژوورەکەی خومدابووم کە دەنگی گریانی عومەرو ئەبوبەکرم لە یەکدی جیا دەکردەوە، وەك چۆن خوا دەفەرمویت (رحماء بینهم) ئاوابوون، عەلقەمە (رضي الله عنه) دەڵێت: وتم: دایەگیان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چی دەکرد؟ وتی: چاوەکانی فرمێسکیان بۆکەس نەدەڕشت، بەڵام ئەگەر باری وا هەبوایە دەستی دەگرت بە ڕیشیەوە، ئەم فەرموودە سەنەدەکەی جەیدەو لە چەندین لاوە شاهیدی هەن[1][2].

هەروەها ئەبونەعیم بە دوورو درێژی هێناویەتی، لە کنزالعمال ج٧ ص٤٢ لە عائیشەوە (رضي الله عنها) هاتووە، پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی بە مەرگی سەعدی کوڕی مەعاز گریان، عائیشە (رضي الله عنها) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) ئەگەر حاڵی زۆر سەخت بوایە دەستی دەگرت بە ڕیشیەوە، منیش گریانی باوکم و عومەرم دەناسیەوە، تەبەرانی لە عائیشەوە هێناویەتی کە پێغەمبەر (ﷺ)لەسەر قەبرانی سەعدی کوڕی مەعاز گەڕایەوەو فرمێسکەکانی بەسەر ڕیشیەوە دیاربوون.[3]

---

[1] – حسن.

[2] – لە البدایة والنهایة ج٤ ص ١٢٣ دا واهاتووە. ئیبن سەعد ج٣ ص٣ لە عائیشەوە (رضي الله عنها) بەهەمان شێوە هێناویەتی ، هەیسەمیش ج٦ ص١٣٨ دەڵێت: ئەحمەد گێڕاویەتیەوەو لە سەنەدەکەیدا موحەمەدی کوڕی عەمری کوڕی عەلقەمە هەیە کە فەرموودەی حەسەنە، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە جێ متمانەن. تەواو. ئیبن حەجەریش لە الاصابةج١ ص٢٧٤ دا دەڵێت: فەرموودەکە صەحیحە، ئیبن حیببان بە صەحیحی داناوە، تەواو.

[3] – هەیسەمی ج٩ ص٣٠٩ دەڵێت: سەهل ئەبوحورەیز لاوازە.

## (شانازی پشتیوانان بە عیزەت و شکۆی ئایینەوە)

ئەبویەعلاو بەزارو تەبەرانی – کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن- هێناویانە، هەروەك هەیسەمی ج ١٠ ص٤١ دەڵێت: لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: ئەوس و خەزرەج شانازییان دەکرد، ئەوس دەیوت: ئێمە حەنزەلەی کوڕی راهیبمان هەیە کە فریشتە شۆردوویەتی، کەسێکمان هەیە کە عەرشی خوا بۆی لەریەوە کە سەعدی کوڕی مەعازە، کەسێکمان هەیە کە زەردەواڵەو سورپیاز پاراستیان کە عاصی کوڕی پانیتی ئەبی ئەلقلەحە، کەسێکمان هەیە شایەتی خۆی تەنیا بە دووشایەتی قبوڵ کرا کە خوزەیمەی کوڕی پابتە، خەزرەجیەکانیش دەیانوت: ئێمە چوارکەسمان هەیە کە لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) تەنها ئەوان قورئانیان کۆدەکردەوە، زەیدی کوڕی ثابت و ئوبەی کوڕی کەعب و موعازی کوڕی جەبەل و ئەبوزەید[1].[2]

## (خۆڕاگری پشتیوانان لەسەر خۆشی و شادیە کاتیەکانی دونیاو ڕازیبوون بە خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم))

ئیمامی ئەحمەد لە عەبدوڵڵای کوڕی ڕەباحەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: هەندێ وەفد چووین بۆلای موعاویەو من و ئەبوهورەیرەش لەگەڵیان بووین، ئەمەش لە مانگی ڕەمەزاندا بوو، هەندێکیان نانیان بۆ ئەوانی تر ئامادە دەکرد، ئەبوهورەیرە زۆرجار بانگی دەکردین، هاشم دەڵێت: زۆرجار بانگی دەکردین بۆلای خۆی، دەڵێت: وتم: ئەرێ بۆ خواردنێك حازرنەکەم و بانگیان بکەم بۆلای خۆم؟ وتم: خواردنێك چاك بکەین، عیشا گەیشتم بە ئەبوهورەیرەو وتم: ئەی ئەبوهورەیرە ئەمشەو لای من میوانی، وتی: پێشم کەوتیت، هاشم وتی: وتم بەڵێ، بانگم کردن و لای من بوون،

---

[1] – صحیح.

[2] – ئەبوعەوانەش هێناویەتی، ئیبن عەساکریش هێناویەتی و دەڵێت: ئەم فەرموودە حەسەنی صەحیحە، هەروەك لە المنتخب ج٥ ص١٣٩ یشدا هاتووە.

ئەبوهورەیرە وتی: ئەی کۆمەڵی پشتیوانان با فەرموودەیەکتان بۆ بگێڕمەوە لەسەر ئەوە، ئینجا باسی فەتحی مەککەی کرد و وتی: پێغەمبەر (ﷺ) هاتە مەککەو زوبەیری کوڕی عەوامی لەسەر بەشێکی سوپاکەو خالیدیشی (رضي الله عنه) لەسەر بەشەکەی تر دانا و ئەبوعوبەیدەیش (رضي الله عنه) لەسەر پێ قەڵغانەکان دانا، چوونە ناو دۆڵەکەو پێغەمبەریش (ﷺ) لە کەتیبەکەی خۆیدا بوو، قورەیش خۆی کۆکردبوویەوە، دەیانوت پێش ئەوان دەکەوین، ئەگەر شتێکیان بۆ بوو لەگەڵیان دەبین، ئەگەریش بەرکەوتن ئەوەی داوای لێکردوین دەیدەینێ، پێغەمبەریش (ﷺ) سەیری منی کردو فەرمووی (ئەی ئەبوهورەیرە) وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی (اهتف لي بالانصار ولا یاتيني الا انصاري) واتە(پشتیوانەکانم بۆ بانگ بکەو جگە لە پشتیوانەکانم کەسێکی تر نەیەت بۆلام) منیش بانگم کردن و ئەوانیش هاتن و لە چواردەوری پێغەمبەردا (ﷺ) کۆبوونەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (کوڕو کۆمەڵ و شوێنکەوتوانی قورەیش دەبینن؟) پاشان دەستێکی دەدا بەسەر ئەو دەستەکەی تریداو دەیفەرموو (احصدوهم حصدا حتى توافوني بالصفا) ئەبوهوریرە دەڵێت: ئینجا چووین و هەرکاممان دەمانویست بە دڵی خۆی لە قورەیش بکوژێت، کەس لەوانیش بەرەوڕوومان نەدەبوویەوە، ئەبوسوفیان وتی: ئەی پێغەمبەری خوا زۆرینەی قورەیش خوێنی ڕەواکرا، لەمڕۆ بەدواوە قورەیش بوونی نابێت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (هەرکەس دەرگاکەی دابخات پارێزراوە، هەرکەس بچێتە ماڵ ئەبوسوفیان پارێزراوە) خەڵکیش دەرگاکانیان داخست، پێغەمبەر (ﷺ) چوو بەرەو حیجرو گرتیە دەست و دواتر تەواف کەعبەی کرد، لە دەستیدا گەوانێك هەبوو لایەکی کەوانەکەی گرتبوو و لە تەوافەکەیدا دەیدا لەو بتانەی کە لە پاڵ کەعبەدا دەپەرستران و دەیدا لە چاوی بتەکەو دەیفەرموو (جاء الحق و زهق الباطل ان الباطل كان زهوقا) پاشان چوویە سەر سەفا و سەیری کەعبەی کردو دەستەکانی بەرزکردەوەو تێر یادو سوپاسی خوای کردو لێی پاڕایەو، پشتیوانانیش لە خوارەوە بەیەدکییان دەوت دەڵێیت حەزی گوندەکەی و سۆزی بۆ خێڵەکەی بزواوە،

ئەوکات سروش دابەزی کاتێك ئەوەمان لەبەرچاو بوو کەس سەری لە ڕوویدا بەرز نەدەکردەوە، پاشان فەرمووی (ئەی کۆمەڵی پشتیوانان ئایا وتتان ئەم کابرا هاتە ئێرە حەزی گوندەکەی و سۆزی بۆ خێڵەکەی بزوا؟) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا وامان وت، فەرمووی (فما اسمي اذا؟ كلا اني عبدالله ورسوله، هاجرت الى الله واليكم فالمحيا محياكم و الممات مماتكم)( دەی ئیدی ناوم چ بێ؟ نا من بەندەو نێردراوی خوام و کۆچم کردووە بۆ خوا و بۆ لای ئێوە، زیندوو زیندووتانە و مردوو مردووتانە) ئەوانیش بەرە و ڕووی چوون و گریان و وتیان: سوێند بەخوا تەنها لە گومان بردن بە خوا و پێغەمبەرەکەیەوە ئەمەمان وت، ئەویش فەرمووی (خوا و پێغەمبەرەکەی بڕواتان پێ دەکەن و پۆزشتان لێ وەردەگرن).[1]

بوخاری لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە ڕۆژی حونەیندا هەوەزان و غەتفان و چەندێکی دی بەژن و مناڵ و ئاژەڵیانەوە هاتن، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) دە هەزار کەس و ئازادکراوانی ڕۆژی مەککەی لەگەڵدا بوو، چواردەوریان چۆڵ کردن تا بە تەنها مایەوە، ئەو ڕۆژ دوو هاواری کرد کە هەرگیز تێکەس نابن، لای کرد بەلای ڕاستیدا و فەرمووی (ئەی کۆمەڵی پشتیوانان) وتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا لەگەڵتداین، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لەسەر وڵاخێکی سپی بوو، دابەزی و فەرمووی (من بەندەو نێردراوی خوام) بێباوەڕان شکان و ئەو ڕۆژە دەستکەوتێکی زۆری دەستکەوت، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دابەشی کرد بەسەر کۆچەران و ئازادکراوانی مەککەدا و هیچی نەدا بە پشتیوانان، پشتیوانان وتیان: ئەگەر سەختی بێت ئێمە بانگ دەکات و لە کاتی دەستکەوتدا بە کەسی تری دەدات، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەمەی بیستەوە و کۆی کردنەوە و چوویە سەر بەرزاییەك و فەرمووی (ئەی کۆمەڵی پشتیوانان چیە قسەی

---

[1]-موسلیم و نەسائیش لە فەرموودەکەی ئەبوهورەیرەوە بەهەمان شێوە هێناویانە، لە البداية والنهاية ج٤ ص٣٠٧ دا هاتووە، ئیبن ئەبی شەیبە بەکورتی هێناویەتی، لە کنزالعمال ج٧ ص١٣٥ دا هاتووە.

وام بیستووە؟) هەموو بێدەنگ بوون پاشان فەرمووی (ئەی کۆمەڵی پشتیوانان ئایا ڕازین خەڵکی بە دونیاوە بچنەوەو ئێوەش بە پێغەمبەری خواوە بچنەوەماڵەکانتان؟) وتیان بەڵێ، فەرمووی (ئەگەر خەڵکی شیوێك بگرنەبەرو پشتیوانانیش شیوێك بگرنەبەر، من شیوی پشتیوانان دەگرمەبەر) هیشام دەڵێت: وتم ئەبوحەمزە تۆ لەوێ بوویت؟ وتی: ئەی لە کوێ بم.[1]

ئیبن ئیسحاق لە فەرموودەکەی ئەبوسەعیدی خودریەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ڕۆژی حونەیندا دەستکەوتەکانی دابەشکرد بەسەر تازەموسڵمانبوانی قورەیش و هەموو عەرەبداو بەشی پشتیوانانی نەدا، پشتیوانان شتێك لە دەرونیاندا دروست بوو و وتیان: سوێند بە خوا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) داویەتیەوە پاڵ هۆزەکەی، سەعدی کوڕی عوبادە(رضي الله عنه) چوو بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم پشتیوانانە شتێك لە دەرونیاندا لە ڕوتدا دروستبووە، فەرمووی لەسەر چی؟ وتی: سەبارەت بە دابەشکردنی دەستکەوتەکان بەسەر هۆزەکەت و هەموو عەرەبدا کەچی ئەوان بەشیان نەبوو، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (ئەی تۆ لەوبارەیەوە چی دەڵێیت سەعد؟) وتی: منیش یەکێکم لە هۆزەکەم، فەرمووی (لەو شوێنەدا هۆزەکەتم بۆ کۆبکەرەوە، ئەگەر کۆبوونەوە پێم بڵێ)، سەعدیش چوو بانگی کردن و لەوێ کۆی کردنەوە، یەکێك لە کۆچەران هات و مۆڵەتی پێدا، هەندێکی تری کۆچەران هاتن بەڵام ڕێی پێ نەدان، هەموو پشتیوانەکان کۆ بوونەوە، ئینجا هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا وەك چۆن فەرمانت پێ کردم لەوێ کۆمکردنەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هات و هەستا و وتاری خوێندەوەو سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کرد، پاشان فەرمووی (ئەی کۆمەڵی پشتیوانان کاتێك هاتم بۆلاتان گومڕانەبوون خوا ڕێنموونی کردن؟ هەژارنەبوون خوا دەوڵەمەندی کردن؟ دوژمن نەبوون خوا دڵی

---

[1]- لە البداية والنهاية ج٤ ص٣٥٧ دا بەو جۆرە هاتووە.ئیبن ئەبی شەیبەو ئیبن عەساکیر بەوجۆرە هێناویانە، لە الكنز العمال ج٥ ص٣٠٧ یشدا هاتووە.

یەکخستن؟) وتیان بەڵێ، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ئەی کۆمەڵی ئەنسار وەڵام نادەنەوە؟) وتیان: چی بڵێین ئەی پێغەمبەری خوا، وەڵامی چیت بدەینەوە؟ منەت بۆ خواو پێغەمبەرەکەیەتی، فەرمووی (سوێند بەخوا ئەگەر بتانەوێت دەتوانن بڵێن و ڕاستیش بڵێن و بڕواشتان پێ بکرێت، بڵێن بە دەرنراوی هاتیت بۆلامان و پەنامان دایت، هەژاربوویت دڵنەواییمان کردیت، ترست لەسەر بوو دڵنیامان کردیت، دەست لێ بەردراوبوویت سەرمان خستیت) وتیان: منەت بۆ خواو پێغەمبەرەکەیەتی، فەرمووی (ئەی کۆمەڵی پشتیوانان لەسەر بەرێکی کاتی دونیایی کە دڵی کەسانێکم پێ ڕاگرت کە موسڵمان بوون دڵتان شتێکی کردو ئێوە دەکەمە وەکیل لەوەی خوا لە ئیسلامدا دەیبڕێتەوە بۆتان؟ ئەی کۆمەڵی پشتیوانان ئایا ڕازین خەڵکی بە مەڕو وشترەوە بەرەو ماڵیان بچنەوەو ئێوەش بە پێغەمبەری خواوە بچنەوە ماڵەکانتان؟ سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر خەڵك شیوێك بگرنەبەرو پشتیوانانیش شیوێك بگرنەبەر من شیوی پشتیوانان دەگرمەبەر، ئەگەر کۆچکردن نەبوایە یەکێك دەبووم لە پشتیوانان، خوایە ڕەحم بکە بە پشتیوانان و کوڕانی پشتیوانان و کوڕوزاکانی پشتیوانان) ئەوانیش هێندە گریان تا ڕیشیان تەڕبوو، وتیان: ڕازین بە بەشی خواو پێغەمبەرەکەی، پاشان چوون و بڵاوەیان لێ کرد[1][2].

---

[1] – صحيح.

[2] – ئیمامی ئەحمەد لە فەرموودەکەی ئیبن ئیسحاقدا بەوجۆرە هێناویەتی و لەو ڕووەوە زانایانی تر نەیانهێناوە، فەرموودەکەش صەحیحە، لە البدایە والنهایە ج٤ ص٣٥٨ یشدا واهاتووە، هەیسەمی ج١٠ ص٣٠ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی ئەحمەد صەحیحن جگە لە موحەمەدی کوڕی ئیسحاق. تەواو. هەروەها ئیبن ئەبی شەیبە لە فەرموودەکەی ئەبوسەعیدەوە (رضي الله عنه) بە دوورو درێژی بەو واتایە هێناویەتی، لە کنزالعمال ج٧ ص١٣٥ یشدا هاتووە، بوخاریش هەندێکی لە فەرموودەکەی عەبدوڵڵای کوڕی زەیدی کوڕی عاصمەوە (رضي الله عنه) هێناوە، لە البدایة والنهایة ج٤ ص٣٥٨یشدا هاتووە، ئیبن ئەبی شەیبەش هێناویەتی، لە کنز العمال ج٧ ص١٣٦ یشدا هاتووە.

تەبەرانی لە فەرموودەکەی سائیبی کوڕی یەزیدەوە (ﷺ) هێناویەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئەو فەیئەی دابەشکرد کە لە حونەیندا لە دەستکەوتی هەوەزان دەستکەوت، بەخشیەوە، لەناو خەڵکێکی قورەیش و خەڵکی تردا دابەشیکرد، پشتیوانان توورەبوون، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەی بیست چووبۆلایان، پاشان فەرمووی (هەرکەس لە پشتیوانان لێرەیە بابچێت بۆ شوێنەکەی و دواتر پێغەمبەر (ﷺ) ببینێت) سوپاسی خوای کردو پاشان فەرمووی (ئەی کۆمەڵی پشتیوانان لەسەر ئەو دەستکەوتەی خەڵکانێکم دیاری کردن پێیان بدەم تا لەسەر ئسیلام دڵیان ڕابکێشم قسەی ئێوەم بیست بەڵکو لەمەودوا شایەتی بدەن (شەیەتومانی حەق) خوای گەورە ئیسلامی خستەدڵیانەوە، پاشان فەرمووی ئەی کۆمەڵی پشتیوانان مەگەر خوای گەورە بە ئیمان منەتبارو بەڕێز جیای نەکردنەوەو جوانترینی ناوەکانی لیٚ نان پشتیوانانی خواو پشتیوانانی پێغەمبەرەکەی؟ ئەگەر کۆچکردن نەبوایە من یەکێك دەبووم لە پشتیوانان، ئەگەر خەڵك دۆڵێك بگرنەبەرو ئێوەش دۆڵێك بگرنەبەر من دۆڵەکەی ئێوە دەگرمەبەر، ئایا ڕازی دەبن خەڵکی بە مەڕو وڵاخ و وشترەوە بچنەوە ئێوەش بە پێغەمبەری خواوە؟)

کە پشتیوانان ئەم قسەیان بیست وتیان: ڕازین، فەرمووی (اجیبوني فما قلت) پشتیوانان وتیان ئەی پێغەمبەری خوا لە گومڕاییدابووین خوا بە هۆی تۆوە بەرەو ڕووناکی بردین، لە کەناری دۆزەخدابووین خوا بەهۆی تۆوە ڕزگاری کردین، گومڕابووین خوا بەهۆی تۆوە ڕێنمونی کردین، ڕازین خوا پەروەردگارمان و ئیسلام ئایینمان و موحەمەد(ﷺ) پێغەمبەرمان بێت، ئەی پێغەمبەری خوا چیت پیٚ باشە وابکە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (سوێند بەخوا ئەگەر وەڵامی دیکەشتان بدایەمەوە هەردەموت ڕاست دەکەن، ئەگەر بتانوتایە: مەگەر بە وەدەرنراوی نەهاتیت بۆلامان ئێمەش پەنامان دایت، بەدرۆ نەخرایتەوە بە ڕاستمان زانیت، پشتت بەرنەدرا ئێمە سەرمان خستیت و ڕازی نەبووین بە وەڵامدانەوەی خەڵکی لە دژت؟ ئەگەر ئەوەشتان بوتایە ڕاستتان دەوت، پشتیوانانیش وتیان: بەڵکو منەت بۆ خواو

پێغەمبەرەکەیەتی و پێغەمبەری خوا فەزڵ و منەتی بەسەر ئێمەو جگە لە ئێمەشدا هەیە، ئەوکات تێر گریان و پێغەمبەریش (ﷺ) لەگەڵیان گریا[1].[2]

بوخاریش لە فەرموودەکەی ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك خوای گەورە ئەو سامانەی هەوەزانی خستە بەردەستی پێغەمبەرەکەی و ئەویش بە خەڵکی دەبەخشی، هەبوو سەد وشتری بەردەکەوت، هەندێ لە پشتیوانان وتیان خوا لە پێغەمبەر (ﷺ) خۆش بێت بە قورەیش دەبەخشێت و ئێمە لە بیر دەکات کەچی هێشتا شمشێرەکانمان خوێنی ئەوانیان لێ دەچۆڕێت؟ ئەمە گەشتەوە بەرگوێی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەویش ناردی بە شوێن پشتیواناندا و لە بەرزاییەکدا کۆی کردنەوە و جگە لەوان کەسی تری بانگ نەکرد، کە کۆبوونەوە پێغەمبەر (ﷺ) هەستا و فەرمووی (چیە ئەو قسەتان لەبارەوە دەبیستم؟) زاناکانی ئەنسار وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا گەورەکانمان شتی وایان نەوتووە، هەندێ هەرزە و تازە پێگەیشتوو وتیان خوا لە پێغەمبەر (ﷺ) خۆش بێت بە قورەیش دەخشێت و ئێمە لە بیر دەکات لەکاتێکدا هێشتا شمشێرەکانمان خوێنی ئەوانیان لێ دەچۆڕێت، پێغەمبەر (ﷺ)یش فەرمووی (من بە کەسانێکم بەخشیوە کە تازە لە کوفر وازیان هێناوە تا دڵیان ڕابگرم، ئایا ڕازی دەبن خەڵکی بە سامانەوە بچنەوە و ئێوەش لەگەڵ پێغەمبەردا بچنەوە بۆماڵەکانتان؟ سوێند بەخوا ئەوەی ئێوە دەیبەنەوە زۆر باشترە لەوەی ئەوان دەیبەنەوە) وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ڕازین، پێی فەرموون (لەمەودوا سەختیەکی زۆر دەبینن، دەی خۆڕاگرن تا دەگەنەوە بە خوا و پێغەمبەرەکەی، چونکە من لەسەر حەوزم (چاوەڕێتانم) ئەنەس دەڵێت بەڵام خۆیان ڕانەگرت.

---

[1] – ضعیف.

[2] –هەیسەمی ج١٠ ص٣١ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا رشدینی کوڕی سەعد هەیە، کەسەکانی دیکە جێ متمانەن، تەواو.

ئەحمەدیش لە فەرموودەکەی ئەنەسەوە هێناویەتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ئێوە بەرگی بەر و سەرن ڕازی دەبن خەڵکی بە مەڕ و وشترەوە بچنەوە ئێوەش بە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بچنەوە بۆ ماڵەکانتان؟) وتیان بەڵێ، فەرمووی (الانصار کرشي و عیبتي) پاشان فەرمووی (ئەگەر خەڵکی دۆڵێك بگرنەبەر و پشتیوانان دۆڵێك بگرنەبەر من دۆڵەکەی ئەوان دەگرمەبەر، ئەگەریش کۆچ نەبوایە یەکێك دەبووم لە پشتیوانان).[1]

## (سیفەتی پشتیوانان (ڕەزای خوایان لێ بێت))

عەسکەری لە (الامثال) لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە بەحرەینەوە پارە و سامانێك هێنرا بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) کۆچەران وپشتیوانان ئەمەیان بیست و چوون بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)، ئینجا فەرموودەیەکی دوور و درێژ دێنێت، تیایدا هاتووە، پێغەمبەر (ﷺ) بە پشتیوانانی فەرمووی (هێندەی من دەتانناسم ئێوە لە کاتی ترس و سەختیدا زیاد دەکەن و لە کاتی خۆشی و بەخشیندا کەم دەکەن).[2][3]

بەزار لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر (ﷺ) بە ئەبو تەلحەی (رضي الله عنه) فەرموو (سەلام بکە لە هۆز و قەومەکەت و پێیان بڵێ هێندەی من لەسەریان بزانم زۆر دەست لە خۆشی دەگرنەوە و زۆر خۆڕاگرن).[4][5] لە کنز العمال ج٧ ص١٣٦ یشدا هاتوە،

---

[1] – لە البداية والنهاية ج٤ ص٣٥٦ دا واهاتووە.

[2] – ضعیف.

[3] – لە کنز العمال ج٧ ص١٣٦ دا واهاتووە.

[4] – صحیح.

[5] –هەیسەمی ج١٠ ص٤١ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا موحەممەدی کوڕی سابتی بەنانی هەیە کە لاوازە، دواتر لە ڕوویەکی ترەوە، دەڵێت: لە ئەنەسەوە دێنین، هەروەها ئەبو نەعیم لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی،

دەڵێت: ئەبوتەلحە (رضي الله عنه) چوو بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ ئەو سکاڵایەی هەیبوو، ئەویش پێی فەرموو (سەلام لە هۆز و قەومەکەت بکە، چونکە زۆر دەست لە خۆشی دەگرنەوە.[1]

ئیبن سەعد ج٣ ص٩ لە عەبدوڵڵای کوڕی شیدارەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چوو بۆلای سەعدی کوڕی موعاز (رضي الله عنه) و پێی فەرموو (جزاك الله خيرا من سيد قوم، فقد انجزت الله ما وعدته و لينجزن الله ما وعدك) واتە(خوا پاداشتی خێرت بداتەوە لەسەر گەورەیی هۆزو قەومەکەت، ئەوەی بەڵێنت دابوو بە خوا بەجێت گەیاند، خواش ئەو بەڵێنەی پێی داویت بەجێی دەگەیەنێت). ئیمامی ئەحمەدو بەزاریش لە عائیشەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (ما يضر امراة نزلت بين بيتين من الانصار او نزلت بين ابويها)(ئافرەتێك زیانی چی پێدەگات کە لە نێوان دوو ماڵی پشتیوانان یان لەلای دایكو باوکی دابەزێت)[2][3].

## ((ڕێزگرتن و خزمەتەکانی پشتیوانان (ڕەزای خوایان لێ بێت))

ئیبن عەدی بەیهەقی و ئیبن عەساکیر لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: ئوسەیدی کوڕی حوضەیر (رضي الله عنه) هات بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و خۆراکی دابەشکرد، باسی ماڵێکی پشتیوانانی بۆ کرا لەبەنی ظوفەر کە پێویستییان زۆرەو نەدارن و زۆربەشیان ئافرەتن، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (تركتنا يا اسيد حتى ذهب ما في ايدينا، فاذا سمعت بشيء قد جاءنا فاذكر لي اهل ذلك البيت)(ئەی ئوسەید قسەت نەکرد تا هیچمان بەدەستەوە نەما، ئەگەر بیستت شتێکمان بۆ هات ئەو ماڵەم

[1] – زەهەبیش لەسەری کۆکە و دەڵێت صەحیحە.

[2] – صحيح.

[3] – هەیسەمی ج١٠ ص٤٠ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکانی هەردووکیان کەسانی صەحیحن.

بیربخەرەوە) دوای ئەوە لە خەیبەرەوە خواردنی گەنم و خورمای بۆهات، پێغەمبەر (ﷺ) بەناو خەڵکەکەدا بەخشیەوە و لەناو پشتیوانانیدا زیاتری بەخشیەوە و ئەو ماڵەش زیاتر، ئوسەیدی کوڕی حوضەیر وەك دەست خۆشی وتی ئەی پێغەمبەری خوا خوای گەورە پاکترین و چاکترین پاداشتت بداتەوە، ئەویش فەرمووی (وانتم يا معشر الانصار فجزاكم الله اطيب الجزاء فانكم ما علمت اعفة صبر وسترون بعدي اثره في الامر والقسم فاصبروا حتى تلقوني على الحوض)(ئێوە ئەی کۆمەڵی پشتیوانان خوا باشترین پاداشتتان بداتەوە هێندەی لێتان بزانم ئێوە جوان خۆراگرن دوای منیش شوێنەواری دەبینن، دەی خۆرابگرن تا لەسەر حەوز پێمدەگەن).[1]

ئیمامی ئەحمەد لە ئوسەیدی کوڕی حوضەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: دوومالٚ لە هۆزەکەم لە ظوفەرو بەنی موعاویە هاتن و وتیان: لای پێغەمبەر (ﷺ) قسەمان بۆ بکە شتێکمان بۆ ببڕێتەوە یان شتێکمان پێ ببەخشێت یان شتێکی لەو جۆرە، منیش دواندم، فەرمووی بەڵێ بۆ هەرکامیان بەشێك ببڕەوە، ئەگەر خوا هەمتری بۆ ناردین بۆیان دەنێرین، وتم: خوا پاداشتی خێرت بداتەوە ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی (وانتم فجزاكم الله خيرا، فانكم ما علمتكم اعفة صبر انكم ستلقون اثره بعدي) کاتێك عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) لەناو خەڵکدا شتی دابەشکرد کڵاوێکی بۆ ناردم، منیش بە کەمم زانی، نوێژم دەکرد کە گەنجێکی قورەیش دای بە پاڵمداو ئەو کڵاوەی لەسەر بوو ڕایدەکێشا، ئەوکات فەرموودەکەی پێغەمبەرم بیر کەوتەوە (انكم ستلقون اثره بعدي)(ئێوە دوای من شوێنەواری دەگرنەبەر) وتم: خواو پێغەمبەرەکەی ڕاستیان کرد، ئینجا یەکێك چوو بۆلای عومەرو پێی وت، ئەویش هات و من نوێژم دەکرد، وتی: ئەبوئوسەید نوێژەکەت بکە، لێبوومەوە وتی چیت وت؟

---

[1] - لە كنز العمال ج٧ ص١٣٥ دا وا هاتووە، حاکمیش لە المستدرك ج٤ ص٧٩ دا هێناویەتی و دەڵێت: فەرموودەکە سەنەدی صەحیحە، بوخاری و موسلیمیش نەیانهێناوە، زەهەبی دەڵێت: صەحیحە.

منیش بۆم گێڕایەوە، ئەویش وتی: ئەوە کڵاوێکە ناردم بۆ فڵان کەس کە لە بەدرو ئوحودو عەقەبەدا بەشداری کردووە، ئەو گەنجەش چووەو لێ کڕیوەو کردویەتیە سەری، وام زانی ئەوە لە سەردەمی مندا بێت، دەڵێت: وتم: سوێند بە خوا ئەی ئەمیری باوەڕداران وام زانی لە سەردەمی تۆدا نەبێت.[1]

ئیبن عەساکیر لە موحەمەدی کوڕی مەسلەمەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: چووم بۆ مزگەوت و سەیر دەکەم کابرایەکی قورەیشی کڵاوێکی لەسەرە، وتم: کێ ئەمەی پێ داویت؟ وتی: ئەمیری باوەڕداران، کەمێك چووم و کەسێکی دیکەم لە قورەیش دی کڵاوێکی لەسەر بوو وتم: کێ پێی دایت؟ وتی: ئەمیری باوەڕداران، دەڵێت: چوویە مزگەوتەوەو دەنگی بەرزکردەوەو وتی: الله اكبر خواو پێغەمبەرەکەی ڕاست دەکەن، دووبارە ئەوەی وتەوە، عومەریش (رضي الله عنه)دەنگی بیست و ناردی بە شوێنیدا، ئەویش وتی: با دووڕکات وێژبکەم، ئەویش کە هاتەوە سوربوونی لەسەر ڕاگەیاند، موحەمەدی کوڕی مەسلەمەش وتی: منیش سووربووم لەسەر ئەوەی تا دووڕکات نوێژنەکەم ناچم بۆلای، ئینجا نوێژی کردو عومەر (رضي الله عنه) هات و لەلای دانیشت، کە لە نوێژەکەی بوویەوە وتی: پێم بڵێ بۆ چی لەجێ نوێژی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) ئەوەت وت؟ وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران بۆ مزگەوت دەهاتم فڵانی کوڕی فڵانی قورەیشیم بینی کڵاوێکی لەسەر بوو، هەمتر هاتم و فڵانی کوڕی فڵانی قورەیشیم بینی کڵاوێکی لەسەر بوو وتم کێ پێی دایت؟ وتی: ئەمیری باوەڕداران، چووم و گەیشتمەلای فڵانی کوڕی فڵانی ئەنساری و کڵاوێکی جیا لەو دووکڵاوەی تری هەبوو وتم: کێ پێی دایت؟ وتی: ئەمیری باوەڕداران، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەمووی (انكم سترون بعدي اثره) منیش حەزم نەکرد ئەمە لەسەر دەستی تۆبێت ئەی ئەمیری باوەڕداران، عومەریش (رضي الله عنه)

---

[1]- لە کنزالعمال ج٢ ص٣٢٩ دا واهاتووە. هەیسەمی ج١٠ ص٣٣ دەڵێت: ئیمامی ئەحمەد گێڕاویەتیەوەو کەسەکانی سەنەدەکەی جێ متمانەن، بەڵام ئیبن ئیسحاق قسەی لەسەرە.

گریا و دواتر وتی: داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەم و شتی وا دووبارەناکەمەوە، ئیتر دوای ئەوە نەبینرا هیچ کەسێکی قورەیش فەزڵی پێش پشتیوانان بخرێت،

ئیبن عەساکیر لە زەیدی کوڕی سابتەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: سەعدی کوڕی عوبادە (رضي الله عنه) چوو بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و کوڕەکەشی لەگەڵدابوو سەلامی لێکرد، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (هاهنا وهاهنا)( ئائێرەو ئائەوێ) ئینجا لەلای ڕاستیەوە داینیشاندو فەرمووی ( مەرحەبا لە پشتیوانان، مەرحەبا لە پشتیوانان) کوڕەکەی لە بەردەم پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) ڕاوەستا، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (من لە پشتیوانان و کوڕی پشتیوانانم) سەعد (رضي الله عنه)وتی چۆن ڕێزدارت کردین خوا ڕێزدارت بکات، فەرمووی (خوا لە پێش ڕێزی مندا ڕێزی لێ گرتن، لە دوای من سەختیتان دێتەڕێ، خۆتان ڕابگرن تا لەسەر حەوز پێم دەگەن)[1] بەغەوی و بەیهەقی و ئیبن عەساکیر لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: جەریر لە سەفەرێکدا لەگەڵمدابوو و خزمەتی دەکردم، وتی: من پشتیوانانم بینی لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) شتێکیان دەکرد، منیش هەرکامیانم ببینیبێت خزمەتم کردوون.[2]

ڕەویانی و ئیبن عەساکیر لە حەبیبی کوڕی ئەبی سابتەوە هێناویانە ئەبوئەیوب هات بۆلای موعاویە (رضي الله عنه) و سکاڵای لاکرد قەرزێکی لەسەرە، ئەویش شتێکی وای لێ نەدی کە دڵخۆشی بکات و بێزاریشی کرد، وتی: گوێم لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو دەیفەرموو (انكم سترون بعدي اثره) وتی ئەی چی پێ وتن؟ فەرمووی (خۆڕاگرن) وتی: دەی خۆڕاگرن، وتی: سوێند بە خوا تاماوم داوای هیچت لێ ناکەم، چوو بۆ

---

[1] – لە سەنەدەکەدا عاصمی کوڕی عەبدولعەزیزی ئەشجەعی هەیە، خەتیب دەڵێت: بەهێز نیە، لە کنز العمال ج٧ ص١٣٤ دا واهاتووە، نەسائی و دارقوتنیش وادەڵێن، بوخاریش دەڵێت: قسەو ڕوانینێکی لەسەرە، منیش دەڵێم: عەلی کوڕی مودینی فەرموودەی لێ گێڕاوەتەوەو معنی قەزاز متمانەی پێ داوە، لە المیزان ج٢ ص٣دا وا هاتووە،

[2] – لە کنزالعمال ج٧ ص١٣٦ دا واهاتووە.

بەسرەو لای ئیبن عەبباس (رضي الله عنه) دابەزیو ئەویش ماڵەکەی بۆ چۆڵ کردو وتی چیم کرد بۆ پێغەمبەری خوا بۆ تۆش وا دەکەم، فەرمانی کرد بە ماڵو منداڵەکەیو چوونە دەرەوەو وتی: چی لەم ماڵەدایە هەمووی بۆ تۆ، چل هەزاریشی پێدا، لەگەڵ بیست مەملوکدا.[1]

تەبەرانیش هێناویەتیو لە المجمع ج٩ ص٣٢٣ یشدا هاتووەو لە فەرموودەکەیدا هاتووە: هات بۆلای عەبدوڵلای کوڕی عەبباس لە بەسرە کە عەلی (رضي الله عنه) کردبووی بە والی ئەویٚ، وتی: ئەی ئەبوئەیوب دەمەوێت وەك چۆن ماڵەکەم چۆڵکرد بۆ پێغەمبەری خوا بۆ تۆیش وابکەم، فەرمانی کرد بە ماڵو منالی بچنە دەرەوەو چی لە ماڵەکەیدا هەبوو پێی دا. کاتێك چوو وتی: ئەی پێویستی خۆت؟ وتی: موچەکەمەو هەشت کۆیلەشم هەن لە زەویەکەمدا ئیش دەکەن، مووچەشی چوار هەزار بوو، پێنج بەرامبەری کردو کردی بە بیست هەزارو چل کۆیلە.[2]

حاکم ج٣ ص٥٤٤ لە عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبی زناد لە باوکیو لە عەبدوڵلای کوڕی فەزڵی کوڕی عەبباسی کوڕی ئەبی ڕەبیعی کوڕی حارسەوە هێناویەتی حەسانی کوڕی سابت (رضي الله عنه) وتی: ئێمەی کۆمەڵی پشتیوانان داوامان لە عومەر یان عوسمان کرد (ئیبن ئەبی زناد گومانی هەبوو ئایا عومەر بوو یان عوسمان) عەبدوڵلای کوڕی عەبباس و دەستەیەکی هاوەڵانی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) برد، ئیبن عەبباسو هاوەڵان قسەیان کردو باسی فەزڵو پلەو پایەی پشتیوانانیان کرد، والیش ئامادەیی دەرنەبڕی، حەسان دەڵێت:

---

[1]– لە كنز العمال ج٧ ص٩٥ دا واهاتووە، حاکمیش هێناویەتی، حاکم دەڵێت: ئەم فەرموودە سەنەدەکەی صەحیحەو بوخاریو موسلیم نەیانهێناوە، زەهەبی دەڵێت صەحیحە.

[2]– هەیسەمی دەڵێت: تەبەرانی بە دوو سەنەد فەرموودەکەی هێناوە کەسەکانی سەنەدی یەکێکیان صەحیحن جگە لەوەی حەبیبی کوڕی ئەبی سابت لە ئەبوئەیوبی (رضي الله عنه) نەبیستووە، منیش دەڵێم: حاکم لە المستدرك ج٣ ص٤٦١ لە ڕێگەی حەبیبی کوڕی ئەبی سابتەوە هێناویەتی و لە دواوە ئەوەی بۆ زیاد دەکات: لە موحەمەدی کوڕی عەلی کوڕی عەبدوڵلای عەبباس لە باوکیەوە لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتیو بە دەقەکەی تەبەرانی بە دوورو درێژی فەرموودەکە دێنێت، پاشان دەڵێت: بە سەنەدێکی صەحیحی موتەصیل ئەم فەرموودە هاتووەو لەبەر چەند زیادەیەکی بەم سەنەدە هێناویەتی. تەواو.

شتێکی گەورەمان لێ داواکرد، بەردەوام دەیبینینەوە تا هەستان و پۆزشیان بۆ هێنایەوە، بەڵام عەبدوڵای کوڕی عەبباس وتی: نەبەخوا پشتیوانان هیچیان نیە، ئەوان پەنا و سەرخەر بوون، کەوتە باسی فەزڵیان و وتی: ئەمە شاعیرو بەرگریکاری پێغەمبەری خوایە، عەبدوڵڵا بەردەوام قسەیەکی پڕاوپڕی پێ دەتەوە کە هەموو شتەکانی دەگرتەوە، ئەویش ناچاربوو پێویستیەکەی بەدیهێنایین، دەڵێت: هاتینە دەرەوەو خوای گەورە بە قسەکەی ئەو پێویستیەی بەجێ گەیاندین، من دەستی عەبدوڵڵام گرتبوو و سوپاسم دەکرد و نزام بۆ دەکرد، لە مزگەوتدا دام بەپاڵ ئەوانەدا کە لەگەڵیدابوون و نەگەیشتە ئاستەکەی ئەو، کاتێك ئەوان دەنگیان دەبیستم وتم: ئەو لە ئێوە بۆ ئێمە لە پێشترە، وتیان: وایە، منیش بە عەبدوڵڵام وت: ئەمە دواماوەیەکی پێغەمبەرایەتی و میراتێکی ئەحمەدە (صلى الله عليه وسلم) لە هەمووتان زیاتر شیاوە پێی، حەسان دەڵێت: ئاماژەم دەکرد بە عەبدوڵڵا و دەموت:

اذ قال لم يترك مقالا لقائل — بملتفظات لايرى بينها فصلا

كفى وشفى ما في الصدور فلم يدع — لذي اربة في القول جدا ولا هزلا

سموت الى العليا بغير مشقة — فنات ذراها لا دنيا ولا علا[1]

لە مجمع الزوائد ج٩ ص٢٨٤ دا بەوجۆرە هاتووە، لە فەرموودەکەیدا هاتووە سوێند بەخوا لە هەمووتان لە پێشترە پێی، سوێند بە خوا ئەمە ماوەو میراتی پێغەمبەرایەتی ئەحمەدە (صلى الله عليه وسلم) ڕەچەڵەکی و داماڵینی شێوە مۆرکی ڕێنموونی دەکات، ئەوانیش وتیان جوانە ئەی حەسان، ئیبن عەبباسیش وتی ڕاست دەڵێن، ئەویش بەم جۆرە مەدحی ئیبن عەبباسی کرد:

اذا ما ابن عباس بدلك وجهه — رايت له في كل مجمعه فضلا

پاشان سێ دێڕەکەی پێشتر دێنێت و دواتر ئەمەشی بۆ زیاد دەکات:

خلقت حليفا للمروءة والندى — بليغا ولم تخلق كهاما ولاحلا

والی وتی: سوێند بەخوا مەبەستی بە تەمبەڵ و تەوەز تەنها منە خوا لە نێوان من و ئەودا بێت.

[1] – تەبەرانیش لە حەسانی کوڕی سابتەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی.

# (نزاو پاڕانەوە بۆ پشتیوانان (رضي الله عنهم))

ئیمامی ئەحمەد لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پشتیوانان ئاوڕشێنیان لەسەر سەخت بوو، چوونە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و داوایان لێ کرد ڕووبارێکی (جۆگەیەکی) بە خوڕیان بۆ لێبدات، ئەویش پێی فەرموون (مەرحەبا لە پشتیوانان، مەرحەبا لە پشتیوانان، مەرحەبا لە پشتیوانان، ئەمڕۆ داوای هەرچیم لێ بکەن پێتان دەبەخشم، منیش لای خوا داوای هەرچیتان بۆ بکەم خوا پێم دەبەخشێت) هەندێکیان بە هەندێکی دیکەیان دەوت: دەرفەت بقۆزنەوەو داوای لێخۆشبوونی لابکەن، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا نزای لێخۆشبوونمان بۆ بکە ئەویش فەرمووی (خوایە لە پشتیوانان و کوڕانی پشتیوانان و کوڕانی کوڕانی (کوڕەزاکانی) پشتیوانان خۆش بە) لە گێڕانەوەیەکی تردا (لە هاوسەرانی پشتیوانان)ە[1][2].

بەزارو تەبەرانی لە ڕەفاعەی کوڕی رافعەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (خوایە لە پشتیوانان و نەوەی پشتیوانان و نەوەی نەوەکان و دراوسێکانیشیان خۆش بە)[3][4].

بەزار لە عوسمانەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە پێغەمبەرم (صلى الله عليه وسلم) بیست دەیفەرموو (الایمان یمان، الایمان في قحطان، القسوة في ولد عدنان، حمیر راس العرب ونابها و مذحج هامتها و عحمتها و الازدکاهلها و جمجمتها، وهمدان غاربها و ذروتها،

---

[1] – صحیح.

[2] – هەیسەمی ج١ ص٤٠ دەڵێت: ئیمامی ئەحمەد گێڕاویەتیەوەو بەزاریش بەوجۆرە هێناویەتی دەڵێت (مەرحەبا لە پشتیوانان) – سێ جار– تەبەرانیش لەهەر سێ موعجەمەکەیدا هێناویەتی، دەڵێت (وللکنائن) یەکێك لەسەنەدەکانی ئەحمەد کەسەکانی صەحیحن، تەواو

[3] – ضعیف.

[4] – هەیسەمی ج١٠ ص٤٠ دەڵێت: لە سەنەدەکەیدا کەسی واهەن نایانناسم، تەواو.

اللهم اعز الانصار الذين اقام الله الدين بهم، الذين اووني ونصروني و حموني وهم اصحابي في الدنيا وشيعتي في الاخرة واول من يدخل الجنة من امتي)[1]، لە کنزالعمال ج٧ ص١٣٤ لە عوسمانی کوڕی موحەمەدی کوڕی زوبەیرەوە هاتووە دەڵێت: ئەبوبەکری صدیق (رضي الله عنه) لە هەندێ وتاریدا دەیفەرموو: سوێند بە خوا ئێمە لای پشتیوانان وەك ئەوە واین کە دەڵێت:

| | |
|---|---|
| جزى الله عنا جعفراحين اشرقت | بنا نعلنا للوائين فزلت |
| ابوا ان يملونا ولو ان امنا | تلاقى الرى يلقون منا لمت |

# (پشتیوانان (خوایان لێ ڕازی بێت) لە مەسەلەی خیلافەتدا خۆ دووردەگرن)

ئیمامی ئەحمەدو ئیبن جەریر بە سەنەدی حەسەن لە حەمیدی کوڕی عەبدولڕەحمانی حومەیریەوە هێناویانە دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کۆچی دوایی کرد ئەبوبەکر (رضي الله عنه) لەناو دەستەیەکی خەڵکی مەدینەدا بوو، هات و پەردەی سەردەم و چاوی (پێغەمبەر)ی لابردو وتی: دایك و باوکم بە قوربانت بن، بە زیندوویی و مردوویش چەندە بۆنت چۆشە، سوێند بە پەروەردگاری کەعبە موحەمەد مرد، ئەبوبەکرو عومەر (رضي الله عنه) خێرا چوون بۆلایان، ئەبوبەکر قسەی کردو چی لەسەر پشتیوانان دابەزی بوو هەمووی وت، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چی لە بارەیانەوە فەرموو بوو باسی کرد، وتی: دەزانم پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی (ئەگەر خەڵکی دۆڵێك بگرنە بەرو پشتیوانانیش دۆڵێك بگرنەبەر من دۆڵی پشتیوانان دەگرمەبەر) ئەی سەعد دەزانم تۆ دانیشتبووی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (قریش ولاة هذا الامر،

---

[1]– هەیسەمی ج١٠ ص٤١ دەڵێت: سەنەدەکەی حەسەنە، تەواو. ئیبن ئەبی دونیا لە (الاشراف) هێناویەتی

فبر الناس تبع لبرهم وفاجرهم تبع لفاجرهم) سەعد (ﭬ) پێی وت: ڕاست دەکەیت، ئێمە وەزیرو ئێوەش ئەمیر.[1]

تەیالیسی و ئیبن سەعد ج٣ ص٦٥١ و ئیبن ئەبی شەیبەو بەیهەقی ج٨ ص١٤٣و کەسانی دیکەش لە ئەبوسەعدی خودریەوە (ﭬ) هێناویانە دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوایی کرد وتاربێژانی پشتیوانان هەستان و یەکێکیان وتی: ئەی کۆمەڵی پشتیوانان ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) کەسێکی لە ئێوە دابنایە لە پاڵیدا یەکێك لە ئێمەشی دادەنا، بۆیە پێمانباشە دووکەس ئەم کارە (خیلافەت) وەربگرن، یەکێکیان لە ئێوەو ئەوی تریش لە ئێمە، بەردەوام ئەمەیان دەوت، زەیدی کوڕی سابت (ﭬ) هەستا و وتی: پێغەمبەر (ﷺ) لە کۆچەران بوو و دەبێت پێشەوایش لە کۆچەران بێت، ئێمەش پشتیوانی ئەوین وەك چۆن پشتیوانی پێغەمبەر (ﷺ) بووین، ئەبوبەکر (ﭬ) هەستا و وتی: ئەی کۆمەڵی پشتیوانان خوای گەورە پاداشتی خێرتان بداتەوەو قسەی بێژەرتان بچەسپێنێت پاشان وتی: سوێند بە خوا ئەگەر ئەوە نەکەن، چۆن لەگەڵتان بگونجێین، پاشان زەیدی کوڕی سابت دەستی ئەبوبەکری گرت و وتی: ئەمە بەرپرستانەو دەی بەیعەتی پێ بدەن، ئینجا فەرموودەکە دێنێت.[2]

ئیبن سەعد و ئیبن جەریر لە قاسمی کوڕی موحەمەدەوە هێناویانە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك کۆچی دوایی کرد پشتیوانان لای سەعدی کوڕی عوبادە (ﭬ) کۆبوونەوە، ئەبوبەکرو عومەرو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحیش هاتن بۆلایان، حەبابی کوڕی موندیر

---

[1] - لە کنز العمال ج٣ ص١٣٧ دا واهاتووە، هەیسەمی ج٥ ص١٩١ دەڵێت: ئیمامی ئەحمەد گێڕاویەتیەوە، لە صەحیحیشدا بەشێکی سەرەتاکەی هاتووە، کەسەکانی سەنەدەکە جێ متمانەن، بەڵام حەمیدی کوڕی عەبدولڕەحمان ئەبوبەکری نەبینیوە، تەواو.

[2] - هەروەها لە کنزالعمال ج٣ ص١٢١ دا هاتووە، هەیسەمی ج٥ ص١٨٣ دەڵێت: تەبەرانی گێڕاویەتیەوە، ئەحمەدیش هێناویەتی و کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن تەبەرانی لە ئەبوتەلحەوە (ﭬ) هێناویەتی، لە کنزالعمال ج٣ ص١٤٠ دا هاتووە.

(رضي الله عنه)كە لە بەدردا بەشداری کردبوو وتی: ئەمیرێك لە ئێمەو ئەمیرێك لە ئێوە، چونكە سوێند بە خوا ئێمە بۆ ئەم کارە بەخیلیمان بە ئێوە نیە بەڵام دەترسێین دواتر کەسانێك بێن کە باوك و براکانیانمان کوشتوون، عومەر (رضي الله عنه) پێی وت ئەگەر وایە دەی ئەگەر دەتوانیت بمرە، ئەبوبەکریش (رضي الله عنه) قسەی کردو وتی: ئێمە ئەمیرو ئێوە وەزیر، ئەمە لە نێوانماندا نیوە بە نیوەیە، یەکەم کەس بەشیری کوڕی ئوسەیدی کوڕی نوعمان (رضي الله عنه) بەیعەتی دا، کە خەڵکی لەسەر ئەبوبەکر یەکدەنگ بوون شتی لەناو خەڵکدا دابەش کرد، بۆ پیرێکی بەنی عەدی کوڕی نەجا زەیدی کوڕی سابتی نارد، وتی: ئەمە چیە؟ وتی: ئەبوبەکر بۆ ئافرەتانی بڕیوەتەوە، وتی: لەسەر ئایینەکەم بەرتیلم پێ دەدەن؟ وتیان:نا، وتی: دەترسن واز لەوە بێنم کە لەسەریمی (ئیسلام) ؟ وتیان: نا، وتی: نا سوێند بە خوا هەرگیز هیچی لێ وەرناگرم، زەیدیش گەڕایەوە بۆلای ئەبوبەکرو پێی وت: ئەو پیرەژنە چی وتووە؟ ئەویش وتی: لەوەی پێمان داوە هیچ کات هیچی وەرناگرینەوە[1].[2]

---

[1] – صحیح.

[2] – لە کنز العمال ج٣ ص١٣٠ دا واهاتووە.

# (بەشی شەشەم)

# (جیهادکردن)

پێغەمبەر (ﷺ)و هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێ بێت) چۆن لە پێناو خوادا جیهادیان دەکردو لە پێناو بانگەوازی ڕێی خواو پێغەمبەرەکەیدا گەورەو بچوكو لاوازو چالاکیان دەچوون بۆ جیهاد؟چۆن لە کاتی سەختیو خۆشیو زستانو هاویندا خۆیان بۆ ئەوە ئامادە دەکرد؟

# (بەشی شەشەم)

# (جیهادکردن)

## (هاندان و گەرم و گوڕی پێدانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەسەر جیهادو پارەو سامان بەخشین)

ئیبن ئەبی حاتەم و ئیبن مەردەویە – ئەم دەقەش هی ئەوە – لە ئەبی عیمرانەوە هێناویانە کە گوێی لە ئەبوئەیوبی ئەنساری (رضي الله عنه) بوو دەیوت ئێمە لە مەدینە بووین و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی (بیستوومە کاروانی ئەبوسوفیان وادێتەوە، ئەرێ دێن بچین بەرەولای ئەو کاروانە بەڵکو خوای گەورە بە غنیمەت و دەستکەوت پێمان ببەخشێت؟) وتمان: بەڵێ، چووین، ڕۆژێکیان دوو ڕۆژ ڕێمان بڕی فەرمووی (ما ترون في القوم فانهم قد اخبروا بمخرجكم) واتە(چۆنیان دەبینن بیستوویانە ئێوە دەرچوون) وتمان نەبەخوا توانای شەڕی ئەوانمان نیە ئێمە بۆ ئەو کاروانە هاتووین، پاشان فەرمووی (چی دەڵێن بۆ شەڕی ئەوانە؟) ئێمەش هەمان شتمان وتەوە، مقدادی کوڕی عەمر (رضي الله عنه) هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە وەك ئەوانەت پێناڵێین کە بە موسا (علیه السلام) یان وت (اذهب انت وبك فقاتلا انا هاهنا قاعدون) هەرکام لە کۆمەڵی قورەیش ئاواتەخواز بووین ئێمە ئەو قسەی مقدادمان بکردایە ئەوەمان لە سامانێکی زۆر لاخۆشەویستتر بوو، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند (كما اخرجك ربك من بيتك بالحق وان فريقا من المؤمنين لكارهون) ئینجا هەموو فەرموودەکە دێنێت.[1]

---

[1] – لە البداية والنهاية ج٣ ص٢٦٣ دا هاتووە. لە مجمع الزوائد ج٦ ص٧٣ دا بە تەواوەتی هەمووی هاتووە، پاشان ج٦ ص٧٤ دەڵێت: بەزار هەمووی هێناوە و تەبەرانیش هەندێکی هێناوەو لە سەنەدەکەیدا عەبدولعەزیزی کوڕی عیمران هەیە کە مەترووکە. تەواو.

ئیمامی ئەحمەد هێناویەتی و لە البدایة والنهایة ج٣ ص٢٦٣ یشدا لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەسەر چوونی بۆ بەدر ڕاوێژی کرد، ئەبوبەکر (رضي الله عنه) ئاماژەی بە چوون کرد، پاشان ڕاوێژی پێ کردنەوە، عومەریش هەروا، پاشان ڕاوێژی پێ کردنەوە هەندێ لە پشتیوانان وتیان: ئەی پشتیوانان وریابن پێغەمبەری خوا مەبەستی ئێوەیە، ئەوکات هەندێ لە پشتیوانان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە وەك قسەکەی بە نوئیسرائیل بەرامبەر بە موسا (علیه السلام) ناڵێین (اذهب انت وبك فقاتلا انا هاهنا قاعدون) بەڵکو سوێند بەوەی تۆی بە حەق ناردووە ئەگەر بدەیت بەناو (برك الغماد) یشدا شوێنت دەکەوین،[1]

هەروەها ئیمامی ئەحمەد لە فەرموودەکەی ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کاتێك بیستی ئەبو سوفیان دێت ڕاوێژی کرد، ئەبو بەکر و عومەر قسەی خۆیان کرد و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چاوەڕێی قسەی ئەوانی دیکەشی دەکرد و سەعدی کوڕی عوبادە (رضي الله عنه) وتی: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) قسەی ئێمەی دەوێت، سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە ئەگەر فەرمانمان پێ بکەیت بدەین بە ناو دەریاکاندا دەچین، ئەگەر بڵێیت بدەین بەناو (برك الغماد) دا دەیکەین.[2]

ئیبن مەردەویە لە ئەلقەمەی کوڕی وقاصی لەیسیەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چوو بۆ بەدر تا لە ڕەوحا و، وەستا و وتاری بۆ خەڵکەکە خوێندەوە و فەرمووی (کیف ترون؟) ئەبووبەکر (رضي الله عنه) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بیستوومانە لەوێ و ئەوێدا، پاشان بە خەڵکەکەی فەرموو (کیف ترون؟) عومەر (رضي الله عنه) هەمان قسەکەی ئەبوبەکری وتەوە، پاشان بە خەڵکەکەی فەرموو (کیف ترون؟) سەعدی

---

[1]—ئیبن کەسیر دەڵێت: ئەمە سەنەدێکی دروستی سیانیە لەسەر مەرجی صەحیحی دروست و صەحیحە

[2]—لە البدایة والنهایة ج٣ ص٢٦٣ دا واهاتووە، ئیبن عەساکیریش لە ئەنەسەوە بەوجۆرە هێناویەتی، لە کنزالعمال ج٥ ص٢٧٣یشدا هاتووە.

کوڕی موعاز وتی: (رضي الله عنه) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مەبەستت ئێمەیە دەی سوێند بەوەی ڕێزداری کردیت و قورئانی دابەزاندە سەرت هیچ کات نەمگرتوونەتە بەر و شارەزاییم لە سەری نییە، ئەگەر بچیت بۆ (برك الغماد) لە (ذي يمن) لەگەڵت دێین، ئێمە وەك ئەوانە نین کە بە موسا (عليه السلام) یان وت (اذهب انت و ربك فقاتلا انا هاهنا قاعيدون) بەڵکو دەڵێین تۆ و پەروەردگارت بڕۆن و بجەنگن ئێمەش شوێنتان دەکەوین و لەگەڵتانین، پێدەچێت بۆ شتێك هاتبیت و خوای گەورە شتێکی تری هێنابێتە ڕێت چی دەکەیت بیکە، لە ماڵ و سامانمان هەڵیگرە، ئەوکات لەسەر قسەکەی سەعد (رضي الله عنه) ئەم ئایەتە دابەزی (كما اخرجك ربك من بيتك بالحق...) ئومەویش لە المغازی دا هێناویەتی، ئەمەشی بۆ زیاد دەکات: چیت لە ماڵ و سامانمانت دەوێت بیبە و ئەوەی لێمان دەبەیت لامان خۆشترە لەوەی نایبەیت، چی فەرمان دەکەیت بیڵێ ئێمە گوێڕایەڵی فەرمانی تۆین، سوێند بەخوا ئەگەر بمانبەیت تا (برك) لە (غمدان) لەگەڵت دێین[1].[2] ئیبن ئیسحاقیش هێناویەتی و لە دەقەکەیدا هاتووە: سەعدی کوڕی موعاز (رضي الله عنه)وتی سوێند بە خوا وادەبینم ئەی پێغەمبەری خوا مەبەستت ئێمەیە، فەرمووی بەڵێ، وتی: ئێمە بڕوامان پێ هێنایت و بە ڕاستمان زانیت، شایەتیمان دا ئەوەی هێناوتە حەقە، لەسەر ئەوەش بەڵێنی خۆمان پێ دایت، بەڵێنمان دا لەسەرگوێگری و گوێڕایەڵی، دەی ئەی پێغەمبەری خوا چۆنت پێ خۆشە هەنگاو بنێ و ئێمەش لەگەڵتداین، سوێند بەوەی بە حەق تۆی ناردووە ئەگەر بڵێت تاوبدەینە دەریا لەگەڵت دێین و کەسمان دواناکەوین، ناترسین سبەینێ بگەین بە دوژمن، ئێمە لە شەڕدا زۆر خۆڕاگرین، لە کاتی پێکگەیشتندا ڕاستگۆین، بەڵکو خوای گەورە شتێکت پێ نیشان بدات کە دڵتی پێ شاد بکات، دەی بە بەرەکەتی خواوە بەڕێکەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)یش بەو قسە و چالاکییەی سەعد دڵخۆش بوو و

---

[1] – صحيح.

[2] – لە البداية والنهاية ج٣ ص٢٦٤دا واهاتووە

فەرمووی (سيروا و ابشروا قال الله قد وعد ادى الطائفتين و الله لكاني الان انظر الى مصارع القوم) واتە(بڕۆن و موژدەتان لێ بێت، چونکە خوا بەڵێنی سەرکەوتن یان شەهیدی پێ داوم، سوێند بە خوا وەك ئەوەی لەناوچوونی ئەوان (قورەیش) ببینم)[1][2].

ئیمامی ئەحمەد لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوسوبسی وەك هەواڵگر نارد تا بزانێت کاروانەکەی ئەبوسوفیان چی دەکات، ئەویش هات و تەنها من و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەماڵ بووین، نازانم ئایا هندێ لە ژنەکانی لەوێ بوون یان نا، ئینجا قسەکەی بۆ گێڕایەوە و وتی: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چوویە دەرەوە و قسەی کرد و فەرمووی (ان لنا طلبة فمن كان ظهره حاظرا فليركب معنا) کەسانێك لە سەرووی مەدینەوە بوون مۆڵەتیان لێ وەرگرت تا بچن بارگەو بنەیان بێنن، ئەویش فەرمووی: نا تەنها ئەوەی بارگەو بنەی ئامادەیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و هاوەڵانی چوون تا پێش بێباوەڕان گەیشتنە بەدر، بێباوەڕان هاتن پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (لا يتقدمن احد منكم الى شيئ حتى اكون انا دونه) واتە(کەستان بەبێ من لە خۆیەوە هیچ نەکات) بێباوەڕان نزیك بوونەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (قوموا الى جنة عرضها السماوات والارض) دەڵێت: عومەیری کوڕی حەمامی ئەنساری دەیوت: ئەی پێغەمبەری خوا بەهەشتێك کە پانتاییەکەی هێندەی ئاسمان و زەویە؟ فەرمووی: بەڵێ، وتی: بەخ بەخ، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (چی وایکرد بیڵێیت بەخ بەخ؟) وتی: نەبەخوا ئەی پێغەمبەری خوا تەنها بەو هیوایەوە وتم یەکێك بم لە کەسانی ناو بەهەشت، ئەویش فەرمووی (فانك من اهلها) واتە(دەی تۆ یەکێکیت لە کەسانی ناو بەهەشت) ئەویش

---

[1] - صحيح.

[2] - لە البداية والنهاية ج٣ ص ٢٦٢.داو هاتووە

چەند خورمایەکی لە گیرفانی دەرهێنابوو دەیخواردن دوایی وتی: ئەگەر زیندووبم تا ئەم خورمایانە بخۆم ژیانێکی دوورو درێژ دەکات، چی خورمای پێ بوو فرێی داو لەگەڵیان جەنگا تا شەهید بوو. ڕەحمەتی خوای لێ بێت، موسلیمیش هێناویەتی.[1]

ئیبن ئیسحاق هێناویەتی: پاشان پێغەمبەر (ﷺ) چوو بۆلای خەڵکەکەو هانیدان و فەرمووی (سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بەدەستە ئەمڕۆ هەرکەس لەگەڵیان بجەنگێت و بە خۆڕاگری و چاوەڕێی پاداشتەوە بەبێ ڕاکردن بجەنگێت و بکوژرێت خوا دەیخاتە بەهەشتەوە) عومەیری کوڕی حەمام (رضي الله عنه) لە بەنی سەلەمە بوو چەند خورمایەکی بەدەستەوە بوو دەیخواردن وتی: بەخ بەخ نێوانی من و بەهەشت تەنها ئەوەبێت ئەوانە بمکوژن؟ خورماکانی دەستی فڕێ داو شمشێرەکەی هەڵگرت و لەگەڵیان جەنگا تا شەهید بوو، ئیبن جەریر دەڵێت: عومەیر جەنگاو دەیوت:

| | |
|---|---|
| ركضا الى الله بغير زاد | الا التقى وعمل المعاد |
| و الصبر في الله على الجهاد | و كل زاد عرضة النفاد |

غير التقى والبر والرشاد[2]

ئیبن عەساکیر ج١ ص١٠٥ لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی دەڵێت: شەش مانگ دوای دەرچوونی پێغەمبەر (ﷺ) لە تائیف هاتم بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)، پاشان خوا فەرمانی پێکرد بە شەڕی تەبوك، ئەمە ئەو کاتە بوو کە خوا لە قورئاندا بە (ساعة العسرة) ناوی هێنا، ئەم شەڕە لە گەرمایەکی سەختدا بوو، دووڕووەکان زیادیان کردبوو، هاوەڵانی صوففە زیادیان کردبوو، صوففە بۆ نەداران بوو کە تیایدا کۆ دەبوونەوە و بەخششی پێغەمبەر (ﷺ) و موسڵمانانیان بۆ دەچوو، لەکاتی شەڕدا موسڵمانان دەچوون بۆلایان و هەریەکە و کەسێکیان لەوان دەبرد و چەك و تفاقیان بۆ

---

[1]—لە البداية والنهاية ج٣ ص٢٧٧ دا هاتووە بەیهەقی ج٩ ص٩٩ بە دوورو درێژی هێناویەتی، حاکم ج٣ ص٤٢٦ بە کورتی هێناویەتی.

[2] — لە البداية والنهاية ج٣ ص٢٧٧ دا واهاتووە.

ئامادە دەکرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد تا لە پێناو خواداو بۆ چاوەڕوانی پاداشت ببەخشن، ئەوانیش بخشییان بۆ چاوەڕوانی پاداشت، بەڵام هەندێك وا نەیانبەخشی، کەسانێکی هەژاری موسڵمانان ئامادەکران و هەندێکیش مانەوە چاکترین بەخششی ئەو ڕۆژ هی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف (رضي الله عنه) بووکە دووسەد ئوقیەی بەخشی، عومەری کوڕی خەتتاب سەد ئوقیەی بەخشی، عامری ئەنساری نەوەد کۆڵ خورمای بەخشی، عومەری کوڕی خەتتاب وتی: ئەی پێغەمبەری خوا دەبینم عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف هیچی بۆ ژن و منداڵەکەی بەجێنەهێشتووە، پێغەمبەریش (ﷺ) پرسیاری لێ کرد ئایا بۆ ژن و منداڵت هیچت بەجێهێشتووە؟ وتی: بەڵێ زیاترو چاکترو لەوەی کە بەخشیومە، فەرمووی چەندە؟ وتی: هێندەی خواو پێغەمبەرەکەی بەڵێنی ڕۆزیو خێریان داوە، یەکێك لە پشتیوانان هات کە پێی دەوترا عوقەیل هات و مشتێ خورمای هێناو بەخشی، دووڕووەکان کاتێك ئەو بەخشینەیان دی چاوەچاوێیان بوو، کەسێك کە زۆری دەبەخشی دەیانوت: سەیری ناکەیت؟ کەسێکیش کەمە خورمایەکی دەهێنا دەیانوت شتەکەی بێ نرخە، کاتێك عوقەیل ئەو برە خورمای هێنا وتی: شەو مامەوەو بەردەوام ئاوم هەڵدەگۆزی، سوێند بەخوا بەس ئەوەم هەبوو، شەرمی دەکرد، یەکێك لەو دوومشتەم هێناو ئەویشم بۆ ماڵەوە بەجێهێشت، بێباوەڕان وتیان: ئەوە زۆر هەژارترە لەو، لەمەشدا چاوەڕێ بوون دەوڵەمەندو هەژاریان لەو سەدەقە شتێکی بەرکەوێت، کاتێك دەرچوونی پێغەمبەر (ﷺ) نزیك بوویەوە هاتن و داوای مۆڵەتیان کرد و سکاڵای گەرمایان بوو و دەترسان و دەیانوت: دەترسین ئەگەر شەڕبکەن تووشی فیتنە دەبن، سوێندی درۆیان بەدەم خواوە دەخوارد، پێغەمبەریش (ﷺ) مۆڵەتی دەدان و نەیدەزانی چی لە دڵیاندایە، دەستەیەکیان مزگەوتی دووڕوویان دامەزراند و ئەبوعامری فاسقیان بە قەرەوڵ گرتبوو بۆی، ئەو لای هیرقل بوو، هاتە ئەوێ و کینانەی کوڕی عەبدیالیل و عەلقەمەی کوڕی علاسەی عامریش هاتن سورەتی (براءة) لەسەر ئەوە دابەزی و ئایەتێکی تێدا دابەزی کە مۆڵەتی بە دانیشتوو نەدەدا.

کاتێك خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند (انفروا خفافا وثقالا) کەسی لاواز لە ئامۆژگاری ڕێی خواو پێغەمبەرداو کەسی نەخۆش و هەژار لای پێغەمبەر (ﷺ) سکاڵایان دەکرد و وتیان ئەمە هیچ ڕێدانێکی تێدانیە، لەناو دووڕواندا تاوانی نادیار هەبوو کە هێشتا دەرنەکەوتبوو، کەسانێکی نادڵنیا و باوەڕبەرز دواکەوتن، ئەم سورەتە بە ڕوونکردەوە و وردەکاریەوە سەبارەت بە پێغەمبەر (ﷺ) دەرکەوتن و هەواڵیان دەدا بە هەواڵ و باسی ئەوەی شوێنی کەوتووە تا گەیشتە تەبووك، لەوێ عەلقەمەی کوڕی موجەززەزی مودلیجی (رضي الله عنه) نارد بۆ فەلەستین، خالیدی کوڕی وەلیدی (رضي الله عنه) نارد بۆ دەومەتولجەندەل، فەرمووی خێرابکە بەڵکو لەدەرەوە بیبینیت قەرەوڵی گرتبێ و بیگریت، ئەویش وایکرد.

دووڕووەکانی مەدینە بەهەر هەواڵێکی خراپ دەشڵەژان، کاتێك دەبانبیست موسڵمانان تووشی سەختی و نارەحەتی بوون پێی دڵخۆش بوون و دەیانوت: ئێمە ئەوەمان دەزانی و هۆشیاریمان لەسەر دەدا، ئەگەر سەلامەتی و چاکەی موسڵمانانیان ببیستایە دەڵتەنگ دەبوون و هەموو کەس ئەمەی لێ بەدیدەکردن، هیچ دووڕوویەکی ئەعرابی و ئەوانی دیکەش نەبوو مەگەر کارێکی خراپ و ڕەوشتێکی خراپی دەشاردەوە و بە ئاشکرا دەیکرد، هەرچی خاوەن بیانووش بوو چاوەڕێی دەکرد دەروویەك لەوەی خوای گەورە لە قورئاندا دایبەزاندووە بەدی بکات.[1]

بەیهەقی لە ڕێگەی ئیبن ئیسحاق لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکری کوڕی حەزمەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) بۆ هەر غەزایەك بچوایە وای نیشاندەدا بۆ شوێنی دی دەڕوات، بەڵام لە شەڕی تەبووکدا فەرمووی (خەڵکینە، دەمەوێت بچم بۆ ڕۆم) پێی وتن دەچێت، ئەمەش لە بارێکی تەواو سەخت و گرانی گەرما و وشکەساڵی وڵاتدا، کاتێك بەرهەم کاتی بوو و خەڵکی چاویان لەوە بوو لەلای بەرهەمەکەیان بمێننەوە و حەزیان نەدەکرد دەستی لێ بەردەن، پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژێك لەو بارەدا بە

[1] – ضعیف.

جەددی کوڕی قەیسی فەرموو (یا جد هل لك في جلاد بني الاصفر؟) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا مۆڵەتم بدەو تاقیم مەکەرەوە، هۆزەکەم دەزانن کەسیان هێندەی من سەرسام نیە بە ئافرەت، دەترسم ئەگەر ئافرەتی بەنی ئەسفەرم دی تووش ببم، دەی ئەی پێغەمبەری خوا مۆڵەتم بدە، پێغەمبەریش (ﷺ) وازی لێ هێناو فەرمووی (قد اذنت لك) خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند (ومنهم من يقول ائذن لي ولا تفتني الا في الفتنة سقطوا) دەڵێت ئەو فیتنەی تێی کەوت بە دواکەوتنی لە پێغەمبەر (ﷺ) و حەزی خۆی بەوەی ترسی لە فیتنەی ئافرەتانی بەنی ئەسفەر هەبوو، ( وان جهنم لميحگه بالكافرين) دەڵێت بۆ ئەوانەی دواتری، یەکێك لە دووڕووەکان وتی: بەم گەرمایە مەڕۆن، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند (قل نار جهنم اشد حرا لو كانوا يفقهون) دەڵێت: پاشان پێغەمبەر (ﷺ) کۆڵی سەفەری کردە شان و فەرمانی جیهادی بە خەڵك کردو دەوڵەمەندی هاندا تا ببەخشن و خەڵك بۆ جیهاد ئامادە بکەن، ئەوانیش وایان کردو عوسمان (رضي الله عنه) لەو بوارەدا بەخششێکی بەخشی کە هیچ کەس لەو زیاتری نەبەخشی، ئەویش باری دووسەد وشتر بوو[1][2].

تەبەرانی لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) ویستی بچێت بۆ غەزای تەبوك بە جەددی کوڕی قەیسی فەرموو (ما تقول في مجاهدة بني الاصفر؟) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من کەسێکی ژن خۆشەویستم و ئافرەتی بەنی ئەسفەر ببینم لە خشتە دەبرێم، مۆڵەتم دەدەیت دابنیشم و تووش نەبم؟ خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند (ومنهم من يقول ائذن لي ولاتفتني الا في الفتنة سقطوا)[3][4].

---

[1] – ضعيف.

[2] –لە التاريخی ئیبن عساكير ج١ ص١٠٨ دا واهاتووە، بەیهەقیش لە السير ج٩ ص٣٣ لە عروەوە (رضي الله عنه) بە کورتی هێناویەتی، لە البداية والنهاية ج٥ ص٣ لە ئیبن ئیسحاق لە زوهری و یەزیدی کوڕی ڕۆمان و عەبدوڵلای کوڕی ئەبوبەکرو عاصمی کوڕی عومەرەوە بەو جۆرە هێناویەتی.

[3] – ضعيف.

[4] – هەیسەمی ج٧ ص٣٠ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا یەحیای حەمانی هەیە کە لاوازە.

ئیبن عەساکیر ج١ ص١١٠ هێناویەتی پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵی نارد بۆ هۆزەکان و بۆ مەککەش تابێن بۆ شەڕی دژی دوژمنیان، بورەیدەی کوڕی خەصیبی (رضي الله عنه) نارد بۆلای ئەسلەم تا ئاگاداریان بکاتەوە، ئەبوڕوهمی (رضي الله عنه) نارد بۆلای هۆزەکەی و فەرمانی پێکرد داوایان لێ بکات لەوێ بێن، ئەبوواقیدی لەیسی (رضي الله عنه) بە هۆزەکەیەوە دەرچوو، ئەبوجەعدی ضومەری (رضي الله عنه) بە هۆزەکەیەوە بە کەناراودا کەوتەڕێ، ڕافیعی کوڕی مکیث و جوندی کوڕی مکیث (رضي الله عنه) نارد بۆلای جوهەینە، نەعیمی کوڕی مەسعودی (رضي الله عنه) نارد بۆلای ئەشجەع، لە بەنی کەعبی کوڕی عەمردا چەندێکی نارد، ئەوانیش بدیلی کوڕی وەرقا و عەمری کوڕی سالم و بشیری کوڕی سوفیان (رضي الله عنه) لە سەلیمیشدا چەندێکی نارد، لەوانە عەبباسی کوڕی مرداس (رضي الله عنه).

پێغەمبەر (ﷺ) موسڵمانانی هاندا بۆ جیهاد و گەرمی دەکردن لەسەری و فەرمانی سەدەقەی پێ دەکردن، ئەوانیش سەدەقەیەکی زۆریان بەخشی، یەکەمیان ئەبوبەکری صدیق بوو کە هەموو سامانی خۆی چوار هەزار درهەم بوو هێنای، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (هیچت هێشتووەتەوە بۆ ماڵ و مناڵەکەت؟) وتی: خوا و پێغەمبەرەکەی چاکتر دەزانن، پاشان عومەر (رضي الله عنه) نیوەی سامانی خۆی هێنا، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو (هیچت هێشتووەتەوە بۆ ماڵ و مناڵەکەت؟) وتی: نیوەی ئەوەی هێناومە.

عومەر بیستی ئەبوبەکر چەندەی هێناوە وتی: هەرکات خێرێکمان کردبێت پشتم کەوتویت، عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب و تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا (رضي الله عنه) بڕێك سامانیان هێنا بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف (رضي الله عنه) دوو سەد ئۆقیەی بۆ هێنا، سەعدی کوڕی عوبادە (رضي الله عنه) سامانێکی بۆ هێنا، موحەمەدی کوڕی مەسلەمەش (رضي الله عنه) هەروا، عاصمی کوڕی عەددی (رضي الله عنه) نەوەد کوڵ خورمای هێنا، عوسمانی کوڕی عەفان (رضي الله عنه) سێ یەکی ئەو سوپایەی پرچەك و تفاق کرد، لە هەموویان بەخششی زیاتر بوو تا ئەوەی بەشی سێ یەکی ئەو سوپایەی کرد تا ئەوەی دەوترێت تێر بەشی پێویشستی کردن، دەڵێن ئەو ڕۆژە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (مایضر عثمان ما فعل بعد هذا) واتە(دوای ئەمە هیچ زیان بە عوسمان ناگات) دەوڵەمەندان کەوتنە خێرخوازی و چاوەڕێی پاداشت بوون، هەشبوو لەوان لاوازتربوو کەس هەبوو وشترێکی دەهێنا بۆیەك یان دووکەس و

دەیوت ئەم وشترە بۆ ئەم دوانەتان بەسەرە سواری بن، هەبوو خەرجی و بەخششێکی دەهێنا، تەنانەت ئافرەتان چییان هەبوو دەیانهێنا، ئوم سنانی ئەسلەمی (رضي الله عنه) دەڵێت: کراسێکی کراوەم دی لەبەردەستی پێغەمبەر (ﷺ) لە ماڵ عائیشەدا (رضي الله عنها) عاج و پاوانەو خەڵخاڵ و ئەنگوستیلەی لەسەر بوو، پڕببو لەو شتانە کە ئافرەتانی موسڵمان بۆ جیهاد ناردبوونیان، خەڵکی لە سەختیەکی زۆردا بوون، کاتی بەرهەم بوو، خەڵکی حەزیان دەکردو ڕقیان لەوە بوو واز لەو بارەیان بهێنن، پێغەمبەر (ﷺ) پەلەو توندو تۆڵی گرتەبەرو لە (ثنیة الوداع) سەربازەکانی کۆکردەوەو خەڵکیش زۆر بوون و کەس هەبوو بیەوێت ئامادەنەبێت وای دەزانی ئەگەر خوا ئایەتی لەسەر دانەبەزێنێت کەس پێی نازانێت.

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) بڕیاری کەوتنەڕێ دا لەسەر مەدینە سباعی کوڕی عورتەفەی غیفاری دانا یان دەڵێن موحەمەدی کوڕی مەسلەمەی (رضي الله عنه) داناوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (استكثروا من النعال فان الرجل لايزال راكبا مادام منتعلا) کاتێك کەوتنەڕێ ئیبن ئوبەی لەگەڵ دووڕووەکاندا نەچوو و دەیوت: موحەمەد بەو بارو گەرما لەو وڵاتە دوورەدا شەڕ لەگەڵ بەنی ئەسفەردا دەکات، موحەمەد وادەزانێت شەڕی ئەوانە گاڵتەو گەپە، دووڕوە هاودەمەکانیشی هەمان ڕایان هەبوو، پاشان ئیبن ئوبەی وتی: سوێند بەخوا دەبینم سبەینێ هاوەڵەکانی ملیان بە پەتداکراوەو هەواڵ خراپی لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی دەوت.

کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) لە (ثنیة الوداع) چوو بۆ تەبووك و ئاڵاکانی بەرز کردەوە، ئاڵا گەورەکەی دایە دەست ئەبوبەکرو زوبەیریش ئاڵاگەورەکەی لە دەست بوو، ئاڵای ئەوس لە دەست ئوسەیدی کوڕی حوضەیرو ئاڵای خەزرەج لە دەستی ئەبودوجانە یان دەڵێن حەبابی کوڕی مونزیردا (رضي الله عنه) بوو، سی هەزار کەس لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) بوون، دەهەزار سوار، هەربەشێکی پشتیوانان فەرمانی وەرگرت ئاڵای خۆی هەڵبگرێت و هۆزەکانی عەرەبیش هەروا، بە لێبڕینێکی کەمەوە. تەواو.[1]

---

[1] - ضعیف.

# (گرنگیدانی پێغەمبەر (ﷺ) بە ناردنی ئوسامە (رضي الله عنه) لە کاتی نەخۆشی سەرەمەرگیدا، زۆر گرنگیدانی ئەبوبەکری صدیقیش (رضي الله عنه) بەوە لە سەرەتای خیلافەتەکەیەوە)

ئیبن عەساکیر ج١ ص١٢٠ لە ڕێگەی زوهریەوە لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێکردووە تا لەبەری بەیاندا بدات بەسەر (ئوبنا) داو بیسووتێنێ، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) بە ئوسامەی فەرموو (امش علی اسم الله) واتە(بە ناوی خواوە بڕۆن) ئەویش ئاڵاکەی هەڵگرت و چوو دایە دەست بورەیدەی کوڕی خەصیبی ئەسلەمی، بردی بۆ ماڵی ئوسامەو پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد بە ئوسامەو لە (جورف) سەنگەری گرت و لە شوێنی ئاودانی سولەیمانی ئەمڕۆ سەنگەری گرت، خەڵکی دەردەچوون و هەرکەس پێویستیەکەی دابین دەکرد و دەچوو بۆ سەربازگەکەی، ئەگەر نا بە دەست بە تاڵی دەمایەوە، هیچکام لە کۆچەرانی یەکەم نەمانەوە مەگەر ئەوەی چوونە ئەو شەڕەوە: عومەری کوڕی خەتتاب، ئەبوعوبەیدە، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص، ئەبولئەعوەر سەعیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل، لەگەڵ دەستەیەکی کۆچەراندا، پشتیوانانیش چەندێك بوون: قەتادەی کوڕی نوعمان و سەلەمەی کوڕی ئەسلەمی کوڕی حەریش (رضي الله عنه) هەندێ لە کۆچەران کە عەیاشی کوڕی ئەبی ڕەبیعە (رضي الله عنه) لە هەموویان قسەتوندتر بوو وتی: ئەم هەرزەکارە لەسەروو ئەم کۆچەرەیانەوە دابنرێت؟ لەو بارەوە قسەو بڵێ بڵێی زۆر هەبوو، عومەری کوڕی خەتتابیش هەندێ لەو قسانەی بیستەوەو هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و بۆی گێڕایەوە دوای ئەو خۆی بەرپەرچی ئەو خەڵکەی دەدایەوە، پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەمەی بیست تەواو تووڕە بوو و چوویە سەر مینبەرو سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کردو دواتر فەرمووی (پاشان ئەی خەڵکینە ئەو قسەی هەندێکتان چیە بیستوومە لەسەر دانانی ئوسامە کە بە ئەمیرم داناوە؟ سوێند بەخوا ئەگەر لەسەر دانانی ئوسامە تانەو تەشەر بدەن لەسەر دانانی پێشتری باوکیشی تانەو

تەشەر دەدەن، ئەی هاوار (لەو خوامە) کە بە ڕاستی بۆ ئیمارەت زۆر لەبار بوو، لە دوای خۆیشی کوڕەکەی بۆ ئیمارەت زۆر لەبارە، ئەگەر خۆشەویستترین کەس لام هەبوو ئەوا ئەم لەوانەیە لە هەموان لام خۆشەویستترە، ئەم دووانە کان و کانزای هەموو چاکەیەکن، دەی لەگەڵی چاك بن چونکە لە چاکترینی ئێوەیە) پاشان پێغەمبەر (ﷺ) دابەزی و چوویە ماڵەوە، ئەمەش لە ڕۆژی شەممە دەی ڕەبیعولئەوەلدا بوو، ئەو موسڵمانانەش کە بڕیار بوو لەگەڵ ئوسامە (رضي الله عنه) بچن ماڵئاواییان دەکرد لە پێغەمبەر (ﷺ) عومەری کوڕی خەتتابیشیان لەناودا بوو، پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو (انفذوا بعث اسامة) ئوم ئەیمەن (رضي الله عنها) چوویە ژوورەوەو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر ئوسامەت لەسەربازگەکەیدا بهێشتایەتەوە تا ڕابێت، چونکە بەم بارەیەوە ئەگەر بچێت سوودی بۆ خۆیشی نابێت، ئەویش فەرمووی (انفذوا بعث اسامة) خەڵکی چوون بۆ سەربازگەکەو شەوی شەممە مانەوە، ئوسامە لە ڕۆژی یەکشەممە دابەزی، پێغەمبەر (ﷺ) هیلاك و ناساغ بوو، ئەو ڕۆژدەرمان و چارەسەریان پێدەدا، ئوسامە بەچاو بە گریانەوە چوو بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)، عەبباسی لەلابوو و ژنەکانیشی لە دەوری بوون، ئوسامە لێی نزیك بوویەوەو ماچی کرد، پێغەمبەریش (ﷺ) هیچی نەدەوت، دەستەکانی بەرز دەکردەوە بۆ ئاسمان و دواتر دەستی دەهێنا بەسەر ئوسامەدا، منیش گەڕامەوە بۆ سەربازگەکەم، بۆ ڕۆژی دووشەممە لە سەربازگەکەیدا بوو، پێغەمبەر (ﷺ) هۆشێکی بەبەردا هاتەوەو ئوسامەش هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (اغد على بركة الله) واتە(بە بەرەکەتی خواوە بەڕێ کەوە) ئوسامەش بەو بارەوە ماڵئاوایی لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد و خێزانەکانی پێغەمبەریش (ﷺ) لەتاو لەش ساغی پێغەمبەردا (ﷺ) شانەیان دەکرد، ئەبەبەکر (رضي الله عنه) چوو بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا سوپاس بۆ خوا حاڵت باش دیارە، مۆڵەتی لێوەرگرت و چوو بۆ (سنخ)، ئوسامەش بەرەو سەربازگەکەی چوو و هاواری کرد تا هەموو بێنە ناو سەربازگەکە، گەیشتە سەربازگەکەی و دابەزی و بە خەڵکەکەی وت: بە ڕێکەون خۆریش هەڵهاتبوو، ئوسامە ویستی لە

(جرف) بڕوات کە نێردراوی ئوم ئەیمەن (ﷺ) هات بۆلای و هەواڵی پێدا پێغەمبەر (ﷺ) لە سەرەمەرگدایە ئوسامە لەگەڵ عومەرو ئەبوعوبەیدەدا هاتەوە مەدینەو گەیشتنەلای پێغەمبەر (ﷺ) لە کاتی سەرەمەرگیدا، لەگەڵ لاربوونەوەی خۆری ڕۆژی دوو شەممە دوانزەی ڕەبیعلئەوەلدا پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوایی کرد، موسڵمانانی ناو سەربازگەی جەرف هاتنەوە مەدینە، بورەیدەی کوڕی حەصیب (ﷺ) بە ئاڵاکەی ئوسامەوە هاتە بەر دەرگای پێغەمبەر (ﷺ) و لەوێ چەقاندی بە زەویدا. کاتێک بەیعەت درا بە ئەبوبەکر بورەیدەی نارد تا ئاڵاکە ببات بۆ ماڵی ئوسامەو داینەنێت تا ئوسامە شەڕەکە دەکات، بورەیدە دەڵێت: ئاڵاکەم برد بۆ ماڵی ئوسامەو دواتر لەگەڵ ئوسامەدا بردم بۆشامو دواتر گێڕامەوە بۆ ماڵی ئوسامە، بەردەوام لە ماڵیدا بوو تا کۆچی دوایی کرد، کاتێک عەرەب هەواڵی کۆچی دوایی پێغەمبەریان (ﷺ) بیستو هەندێکیان لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە، ئەبوبەکر بە ئوسامەی وت: فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) بەجێبگەیەنە، خەڵکی بردو لە شوێنی یەکەمیاندا سەنگەریان گرت، بورەیدە ئاڵاکەی بردو گەیشتە سەربازگەی یەکەمیان، ئەمە لەسەر گەورە کۆچەرانی یەکەم سەخت بوو، عومەرو عوسمانو ئەبوعوبەیدەو سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصو سەعیدی کوڕی زەید(ﷺ) چوون بۆلای ئەبوبەکرو وتیان ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا عەرەب لە هەموو لایەکەوە داویانە بەسەرتدا، تۆیش ئەم سوپایە بڵاوە پێ مەکە، با بۆ لێدانی هەڵگەڕاوەکان لات بنو بیدە بەگژیاندا، هەروەها متمانەی ئەوە نیە هەڵمەت نەبرێتە سەر مەدینە کە ژنو منداڵی تێدایە، بەڵکو غەزای ڕۆم دوابخەیت تا ئیسلام جێی خۆی دەچەسپێنێو هەڵگەڕاوەکان دەگەڕێنەوە سەر باری جارانیان یان لەناو دەبرێن، ئینجا ئوسامە بنێرە، ئێمە لەوە دڵنیاین ڕۆم نایەت بۆمان، ئەبوبەکر کە گوێی لێگرتن وتی: کەستان ماوە شتێکی مابێت بیڵێت؟ وتیان: نا، گوێت لێ گرتین، وتی: دەی سوێند بەو کەسەی کە گیانمی بە دەستە ئەگەر بزانم لە مەدینە گورگ دەمخوات ئەم دەستەیە دەنێرم، هەردەبێت بچێت، چۆن ئەو پێغەمبەرەی کە لە ئاسمانەوە سروشی بۆ دادەبەزی بفەرموێت (سوپاکەی ئوسامە بنێرنو بەڕێی بخەن)

ئێستا نەینێرم، بەڵام شتێك هەیە لەسەر ئوسامە دەیڵێم، دەڵێم با عومەرمان لا بمێنێتەوە، چونکە پێویستمانە پێی، بە خوا نازانم ئوسامە دەیکات یان نا، سوێند بە خوا زۆریشی لێ ناکەم ئەوانیش زانییان ئەبوبەکر سوورە لەسەر ئەوەی ئوسامە بنێرێت، ئەبوبەکر چوو بۆماڵی ئوسامەو داوای لێکرد تا عومەر لای بەجێ بهێڵێت، ئەویش ڕازی بوو.

ئەبوبەکریش وتی: بە ڕەزامەندیەوە دەڵێیت باشە؟ وتی: بەڵێ، ئینجا چوو، بە بانگکەرەکەی وت بانگ بکات هەرکەس لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) لەگەڵ ئوسامەدا نێردراوە بە سووربوونی من لەسەر ئەوە با لە ئوسامە دوانەکەوێت چونکە هەرکەس لە چوون لەگەڵیدا دوابکەوێت خۆم بەپێی خۆم دەچم بەشوێنیدا، ناردی بە شوێن ئەو کۆچەرانەدا کە لەسەر ئیمارەتی ئوسامە قسەیان هەبوو، لێیان تووڕە بوو و وتی: بچن، کەس دوانەکەوت، ئەبوبەکریش ئوسامەو موسڵمانانی بەڕێ کرد کاتێك لە جورف لەگەڵ سێ هەزار هاوەڵەکەیدا ئوسامە بە ڕێکەوت (کە هەزاریان خاوەن سوار بوون) ئەبوبەکر لەگەڵ ئوسامەدا دەمێك چوو و دوایی وتی: ئایین و سپاردەو سەرەنجامی کارەکەت دەدەمە دەست خوا، پێغەمبەر (ﷺ) وەسیەتی بۆ کردویت، بە فەرمانی خوا بەجێی بگەیەنە، ئیتر من هیچ فەرمان و ڕێگریەکم بۆت نیە، من تەنها ئەوە بەجێ دەگەیەنم کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێ کردووە، ئەویش خێرا چوو و چوویە چەند وڵاتێکی هێور کە وازیان لە ئیسلام نەهێنابوو وەك جوهەینەو ئەوانی دی لە قوضاعە، کە لە (وادي القرى) دابەزی هەواڵگرێکی بەنی عوزرە کە پێی دەوترا (حريث) هات و لە پێشیەوە چوو و کارەکەی بە جێگەیاند تا گەیشتە (ئوبنا) سەیری ئەوێی کرد و گەڕایەوەو گەیشتەوە بە ئوسامە، لە دووری دوو ڕۆژ ڕێ لە ئوبنا، هەواڵی پیدا کە خەڵکی بێئاگان و خۆیان کۆنەکردۆتەوە، فەرمانی پێکرد تا پێش ئەوەی خۆیان کۆ بکەنەوە بچێت بۆیان و هەڵمەتی بباتە سەریان[1][2].

---

[1] – ضعيف.

[2] – لە مختصر ئیبن عەساکیردا واهاتووە، لە كنز العمال ج٢ ص٣١٢ لە ئیبن عەساکیر لە ڕێگەی واقیدی لە ئوسامەوە هێناویەتی، ئیبن حەجەریش لە فتح الباري ج٨ ص١٠٧ دا ئاماژەی پێکردووە.

هەروەها ئیبن عەساکیر لە حەسەنی کوڕی ئەبولحەسەنەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) لە پێش مردنیدا دەستەیەکی خەڵکی مەدینەو چواردەوری کۆکردەوە بۆ ناردن، لەوانە عومەری کوڕی خەتتابی (رضي الله عنه) تێدا بوون ئوسامە کوڕی زەیدی کرد بە ئەمیریان، کۆتا کەسیان لە خەندەقەکە تێپەڕی نەکرد تا پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوایی کرد، ئوسامە خەڵکەکەی وەستاندودواتر بە عومەری وت: بگەڕێرەوە بۆلای خەلیفەی پێغەمبەری خواو مۆڵەتی لیٚ وەربگرە تا مۆڵەتم بدات خەڵکەکە بگێڕمەوە چونکە کەسانی دیارو زۆرینە لەگەڵمدان و ترسم هەیە خەلیفە شتێکی لیٚ بکریٚو بێباوەڕان بکوتنە سەر ئەو، پشتیوانان وتیان ئەگەر وتی هەردەبێت بچن قسەی ئێمەی پیٚ بگەیەنەو داوای لێبکە با کەسێکی بە تەمەنتر لە ئوسامە بکاتە ئەمیرمان، عومەریش بە فەرمانی ئوسامە چوو و هاتەلای ئەبوبەکر و قسەی ئوسامەی پیٚ گەیاند، ئەبوبەکریش وتی: ئەگەر سەگ و گورگ بمڕفێنن فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) ناگێڕمەوە، وتی: دەی پشتیوانان پێیان وتم تا پێت بڵێم ئەوان داوات لیٚ دەکەن کەسێکی بەتەمەنتر لە ئوسامە بکەیتە ئەمیریان، ئەبوبەکر هەستایە سەر پیٚو ڕیشی عومەری گرت و وتی: دایکت ڕۆڵە ڕۆت بۆ بکات ئیبن خەتتاب پێغەمبەر (ﷺ) ئەوی داناوەو تۆش دەڵێیت لایبەم؟ عومەریش چوو بۆناو خەڵکەکە، وتیان: چیت کرد؟ وتی: دایکتان ڕۆڵەڕۆتان بۆ بکات لەبەر ئێوە خەلیفەی پێغەمبەر (ﷺ) زۆری پیٚ کردم، پاشان ئەبوبەکر هات و هانیدان و بەڕێی کردن، خۆی بە پیادە دەچوو و ئوسامەش لەسەر ئەسپ بوو، عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف وڵاخەکەی ئەبوبەکری (رضي الله عنه) پیٚ بوو، ئوسامە پێی وت: ئەی خەلیفەی پێغەمبەر یان سواردەبیت یان دادەبەزم، وتی: بە خوا دانابەزیت و منیش سوارنابم، چی دەبێت با منیش کەمێك لەپێناو خوادا پێکانم تۆز بیانگرێت، چونکە جەنگاوەر هەر هەنگاوێك دەینێت حەوت سەد چاکەی بۆ دەنووسرێت و حەو سەد پلە بەرزدەبێتەوە و حەوت سەد

تاوانیشی دەسڕێنەوە، تا گەیشتە کۆتا پێی وت: ئەگەر پێت باشە عومەری کوڕی خەتتابم بۆ بەجێ بهێڵە، وتی: باشەو مۆڵەتی دا[1 2].

ئیبن عەساکیر لە عروەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك لە بەیعەتدان بووینەوەو خەڵکی دامرکانەوە ئەبوبەکر بە ئوسامەی (رضي الله عنه) وت: بڕۆ بۆ ئەو کارەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناردیتی، کەسانێکی کۆچەرو پشتیوانان دواندیان و وتیان ئوسامەو سوپاکەی بهێڵەرەوە چونکە دەترسین عەرەب بە هەواڵی مردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بدەن بەسەرماندا، ئەبوبەکر وتی: من سوپایەك ڕاوەستێنم کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناردوویەتی؟! بەڕاستی لەسەر کارێکی گەورە بوێری دەنوێنم، دەی سوێند بەو کەسەی گیانمی بە دەستە ئەگەر عەرەب بدەن بەسەرمدا لام خۆشترە لەوەی سوپایەك ڕاگرم کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناردوویەتی، ئوسامە بە سوپاکەوە بڕۆ بۆ ئەو ئاڕاستەی فەرمانت پێ کراوەو بە پێی فەرمانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەلای فەلەستینەوە بجەنگەو لەگەڵ خەڵکی موئتە بجەنگە، خوا زامنی ئەوی ترە، بەڵام ئەگەر دەکرێت عومەری کوڕی خەتتابم بۆ بەجێ بهێڵە تا ڕاوێژی پێ بکەم چونکە خاوەن ڕایە، و بۆ ئیسلام ئامۆژگاری دەگرێتەبەر، ئەویش ڕازیبوو، بە گشتی عەرەب و خەڵکی ڕۆژهەڵات و غەتفان و بەنوئەسەدو زۆرینەی ئەشجەع وازیان لە ئیسلام هێنا و تەیئیش لەسەر ئیسلام مانەوە، هاوەڵان وتیان: ئوسامەو سوپاکەی ڕاگرەو دژ بە هەڵگەڕاوەکانی غەتفان و عەرەب بەکاریان بهێنە، ئەبوبەکریش ڕازی نەبوو و وتی: ئێوە دەزانن لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) ڕاوێژ لەوەدابوو کە سوننەتی پێغەمبەرەکەتانی لەسەر نەبێت و لە قورئاندا هیچی لەسەر نەهاتبێت، ئێوە قسەی خۆتان کرد و منیش ڕاوێژی خۆمتان پێ دەڵێم، چاکترین هەڵبژێرن بەجێی بگەیەنن، چونکە لەسەر گومڕایی

---

[1] - ضعیف.

[2] -لە مختصر ئیبن عەساکیر ج١ ص١١٧ دا واهاتووە،لە کنز العمال ج٥ ص٣١٤ دا هاتووە، لە البدایة والنهایة ج٦ ص٣٠٥ یش بە کورتی لە سەیف لە حەسەنەوە هێناویەتی.

كۆتان ناكاتەوە، سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە كارێك لەو جیهادە چاكتر نابینم كە پەتێ بگرینەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) بە دەستی خۆی داویەتیە دەست (تا بچێت بۆ جیهاد) ئەوانیش ملكەچی ڕاكەی ئەبوبەكر بوون و زانییان لە ڕاكەی ئەوان چاكترە، ئەو كات ئەبوبەكر ئوسامەی كوڕی زەیدی نارد، لەو غەزایەدا كارێكی گەورەی ئەنجامداو خوای گەورە خۆی و سوپاكەی بە سەلامەتی و دەستكەوتەوە گەڕاندەوە، ئەبوبەكر (رضي الله عنه) بە كۆچەرو موسڵمانەكانەوە چوو كاتێك ئوسامە چوو، عەرەبەكان بە ژن و منداڵیانەوە ڕایانكرد. كە موسڵمانان ئەمەیان بیست وتیان بە ئەبوبەكر بگەڕێرەوە بۆ مەدینەو بۆلای ژن و منداڵەكان و كەسێك لە هاوەڵانت لەسەر سوپا دابنێ و كاری خۆتی پێ بسپێرە، موسڵمانان زۆریان لێ كرد تا گەڕایەوە، ئەویش خالیدی كوڕی وەلیدی (رضي الله عنه) لەسەر سوپاكە داناو پێی وت: ئەگەر موسڵمان بوون و سەدەقەیان دا كامیان ویستی با بگەڕێنەوە، ئەبوبەكر بەوە گەڕایەوە بۆ مەدینە[1].[2]

لە البداية والنهاية ج٦ ص٣٠٤ لە سەیفی كوڕی عومەر لە هیشامی كوڕی عوروە لە باوكیەوە (رضي الله عنه)هێناویەتی دەڵێت: كاتێك بەیعەت درا بە ئەبوبەكرو پشتیوانان لەسەر ئەو بارەی ڕاجیاواز بوون یەكدەنگ بوون ئەبوبەكر وتی: با سوپاكەی ئوسامە بچێت، عەرەبیش كەمو زۆر لە هەموو هۆزێك وازیان لە ئیسلام هێنابوو، دووڕوویی زاڵببوو و مەسیحیەت و جوولەكە پەلیان هاویشتبوو و موسڵمانانیش وەك مەڕی ناو تاریكی وابوون لەبەر لە دەستدانی پێغەمبەرەكەیان و شەڕو زۆری دوژمنان، خەڵكی بە ئەبوبەكریان دەوت: ئەوانە زۆرینەی موسڵمانانن و عەرەبیش دەبینیت هات بۆت، چاك نیە ئەو كۆمەڵە موسڵمانە لە خۆت دووربخەیتەوە، ئەویش وتی: سوێند بەوەی گیانی ئەبوبەكری بەدەستە ئەگەر بزانم گورگ دەمرفێنێ ئەو سوپای ئوسامە دەنێرم وەك چۆن پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێ كرد، ئەگەر لەم شارەشدا جگە لە خۆم كەس نەمێنێت هەر جێبەجێی دەكەم.[3]

---

[1] - ضعيف.

[2] - لە مختصر ئیبن عەساكیر ج١ ص١١٨ دا واهاتووە، لە كنز العمال ج٥ ص٣١٤ یشدا هاتووە.

[3] - ئیبن كەسیر دەڵێت: ئەمە لە هیشامی كوڕی عوروە لە باوكیەوە لە عائیشەوە ( رضي الله عنها ) گێڕدراوەتەوە.

لە فەرموودەکەی قاسم و عەمرە لە عائیشەوە هاتووە دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوایی کرد عەرەب یەك پارچە هەڵگەڕانەوە و دووڕوویی زاڵبوو، سوێند بە خوا بارێك تووشی باوکم بوو ئەگەر تووشی شاخەکان بوایە تێکدەشکان، هاوەڵانی موحەمەد (علیه السلام) وەك مەڕی وێڵی ناو خاکی گورکانیان لێهات، سوێند بە خوا لە هەر شتێکدا ناکۆك بوونایە باوکم گەنی و لاری و ناکۆکیەکەی نەدەهێشت، تەواو[1][2].

ئەبو هورەیرە دەڵێت: سوێند بەوخوایەی هیچ پەرستراوێك نیە جگە لەو ئەگەر ئەبوبەکر نەکرایە بە خەلیفە خوا نەدەپەرسترا، سێ جار وتیەوە، پێی وترا، بۆ وادەڵێیت ئەی ئەبوهورەیرە؟ وتی: پێغەمبەر (ﷺ) ئوسامەی کوڕی زەیدی (رضي الله عنه) بە حەوت سەد کەسەوە نارد بۆشام، کاتێك لە (ذی خشب) دابەزی پێغەمبەر (ﷺ) گیانی سپارد و عەرەبی دەوری مەدینە هەڵگەڕانەوە، هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) کۆبوونەوە و وتیان: ئەبوبەکر ئەوانە بگێڕەوە کە نێردراون بۆ ڕۆم وا عەرەبی دەوری مەدینە هەڵگەڕاونەتەوە، وتی: سوێند بەو خوایەی جگە لەو هیچ پەرستراوێکی تر نیە ئەگەر سەگ قاچەکانی ژنەکانی پێغەمبەر (ﷺ) ڕابکێشن ئەو سوپایە ناگێڕمەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) ناردوویەتی و ئاڵایەك کە پێغەمبەر (ﷺ) دایناوە لاینابەم، ئوسامەی نارد و ئەویش دەیدا بە پاڵ هەر هۆزێکدا کە نیازی هەڵگەڕانەوەیان هەبوو دەیانوت ئەگەر ئەوانە هێزێکی زۆریان نەبێت ئەم هەمووە نانێرن، بەڵام وازیان لێ دێنین تا بگەن بە ڕۆم، گەیشتن بە ڕۆم و ڕۆمیان شکاند و بە سەلامەتی گەڕانەوە و ئەوانیش لەسەر ئیسلام مانەوە[3].

---

[1] – ضعیف.

[2] – تەبەرانیش لە عائیشەوە (رضي الله عنها) بە هەمان شێوە هێناویەتی، هەیسەمی ج٩ ص٥٠ دەڵێت: تەبەرانی لە چەند ڕێگەیەکەوە هێناویەتی و کەسەکانی سەنەدێکیان جێ متمانەن.

[3] – ضعیف.

تەبەری ج٤ ص٤٣ لە ڕێگەی سەیفەوە هێناویەتی: ئەبوبەکر دوای چوونی خالید (رضي الله عنه) بۆ شام تووشی ئەو نەخۆشیە بوو کە دوای چەند مانگێك بە هۆیەوە مرد، موسەننا (رضي الله عنه) هات و ئەبوبەکریش چاك ببویەوە، عومەری ڕاسپارد ئەویش هەواڵی پێدا، ئەویش وتی: دەبێت عومەر ببینم، عومەر هات، ئەویش پێی وت: گوێ بگرە عومەر بزانە چیت پێ دەڵێم بیکە، هیوام وایە ئەمڕۆ بمرم، ئەو ڕۆژیش ڕۆژی دوو شەممە بوو، ئەگەر مردم نەگاتە ئێوارە تا خەڵك لەگەڵ موسەننا دەنێریت، ئەگەر کەوتمە شەو بەیانی نەکەیتەوە تا کەس لەگەڵ موسەننا بنێریت، موسیبەت و سەختی سەرقاڵتان نەکات تا لەسەر مەسەلەی ئایین و وەسیەتی پەروەردگارتان لاتان سەختتر بێ، بینیت کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مرد من چیم کرد، کەسیش وەك ئەو نیە، سوێند بە خوا ئەگەر لە فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی لامبدایە خوا سەرشۆڕی دەکردین. تەواو.

[1]- لە البدایة والنهایة ج٦ ص٣٠٥ دا واهاتووە. صابونی و هەروەها لە کنز العمال ج٣ ص١٢٩ و ئیبن عەساکیر لە مختصر ج١ ص١٢٤ لە ئەبوهورەیرەوە بە هەمان شێوە هێناویانە، ئیبن کەسیر دەڵێت: لە سەنەدەکەدا عبادی کوڕی کەسیر هەیە کە وادەزانم بەرمەکیە، چونکە فریابی فەرموودەی لێوەگێڕاوەتەوە، بەڵام بۆ بەصری سەقەی فەرموودەی مەترۆکە، تەواو. لە کنز العمال دا دەڵێت: سەنەدی فەرموودەکەی ئەبوهورەیرە حەسەنە، تەواو.

# (گرنگیدانی ئەبوبەکری صدیق (رضي الله عنه) بە جەنگی هەڵگەڕاوەکان و ئەوانەی زەکاتیان نەدەدا)

خەتیب لە گێڕانەوەی مالیك لە ئیبن عومەرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کۆچی دوایی کرد دووڕوویی ناو مەدینەی گرتەوەو عەرەب و عەرەجەم هەڵگەڕانەوە و هەڕەشەی نەهانەندیان دەکرد و دەیانوت: ئەو پیاوەی عەرەب خۆی پێ سەردەخست مرد، ئەبوبەکریش (رضي الله عنه) کۆچەرو پشتیوانانی کۆکردەوەو وتی: عەرەب ئامادە نین مەڕو وشتری زەکاتیان بدەن و وازیان لە ئایینیان هێناوەو عەجەمیش لە نەهاوەند کۆدەبنەوە بۆ شەڕی ئێوەو دەڵێن ئەو کەسەی پێی سەرکەوتن مرد، دەی بڵێن چی بکەم منیش یەکێکم لە ئێوەو بۆ ئەم بنیادەش ئەرکی قورسترم لەسەر شانە، زۆریان پێ چوو تا عومەر (رضي الله عنه) قسەی کرد و وتی: بەخوا ئەی خەلیفەی پێغەمبەر پێم باشە نوێژی عەرەب قبوڵ بکەیت و واز لە زەکاتیان بهێنیت، چونکە تازە موسڵمان بوون و ئیسلامیان لا نەچەسپاوە، یان خوا دەیانگێڕێتەوە بۆ خێر یان خوا ئیسلام بەهێز دەکات و توانای شەڕیانی دەبێت، چونکە کۆچەران و پشتیوانان ناتوانن بەیەکجار لە ڕووی عەرەب و عەجەمیشدا بوەستن، سەیری عوسمانی کرد و عوسمانیش (رضي الله عنه) هەمان شتی وت، عەلیش (رضي الله عنه) هەمان شتی وت، کۆچەرانیش هەروایان وت، پاشان سەیری پشتیوانانی کرد و ئەوانیش هەروایان وت، کە ئەمەی بینی چوویە سەر مینبەرو سوپاس و ستایشی خوای کرد و دواتر وتی: پاشان خوای گەورە موحەمەدی (صلى الله عليه وسلم) نارد و حەقیش کەم و وەدەرنراو بوو، ئیسلامیش نامۆ و ڕاوەدوونراو بوو، پەتی تەنك و خەڵکی کەم بوون، خوا بە هۆی موحەمەدەوە کۆی کردنەوە و کردنی بە ئوممەتی میانڕەوی ماوەو لەناونەچوو، سوێند بە خوا لە فەرمانی خوا چاکترم لانیەو لە پێناو خوادا جیهادی خۆم دەکەم تا خوا بەڵێنی خۆیمان بۆ بێنێتەدی، هەرکاممان کوژرا شەهیدی ناو بەهەشت و هەرکاممان مایەوە خەلیفەی خوا بێت لە سەر زەویداو میراتی پەرستشی حەقی

هەبێت، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت (وعد الله الذين امنوا منكم و عملوا الصالحات ليستخلفنهم في الارض كما استخلف الذين من قبلهم)[1] سوێند بە خوا ئەکەر بەرخێك نەدەن بە من کە پێشتر دەیاندا بە پێغەمبەر (ﷺ) پاشان دارو درەختو مرۆڤو جنۆکەشیان لەگەڵدا بێت لەسەر ئەوە لەگەڵیان دەجەنگم تا گیانم دەگاتەوە لای خوا، خوای گەروە جیاوازی نێوان نوێژو زەکاتی نەکردووە و کۆیشی کردوونەتەوە پێکەوە، عومەریش (رضي الله عنه) الله اکبری کردو وتی: سوێند بە خوا کاتێك خوا ئەبوبەکری لەسەری ئەوان سوورکرد زانیم ئەبوبەکر حەقە.[2]

ئیبن عەساکیر لە صاڵحی کوڕی کیسانەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك خەڵکەکە گەڕانەوە ئەبوبەکر (رضي الله عنه) هەستاو سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کرد، پاشان وتی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی ڕێنموونی کردین و پێویستی پێ نەبوو، بەخشی و لەو دەوڵەمەندتر بوو، خوا موحەمەدی بە دەرکراوی نارد و ئیسلامیش نامۆ بوو، پەتی تەنك و خەڵکی لێی بێئاگابوون، خوا تووڕەیی نواند بۆ ئەهلی کیتاب و خێری پێ نەبەخشین و خراپەشی لەسەر لانەبردن، ئەوان کتێبەکەی خۆیان گۆڕی و هەندێ شتیان بۆ هێنا کە تیایدا نەبوو، عەرەبە نەخوێندەوارەکان خوایان نەدەپەرستی و لێی نەدەپاڕانەوە، کامیان ژیانی جیاترو ئایینی گومڕاتر بوو دەستەیەکی هاوەڵانی لەگەڵدا بوو، خوای گەورە بە موحەمەد(ﷺ) کۆی کردنەوە و سەری خستن تا خوای گەورە پێغەمبەرەکەی بردەوە ئەوکات شەیتان پڕیە پشتی کۆڵیان و دەستی گرتن بەرەو نابوودی بردن (وما محمد الا رسول قد خلت من قبله الرسل افان مات او قتل انقلبتم على اعقابكم ومن ينقلب على عقبيه فلن يضر الله شيئا وسيجزي الله الشاكرين) ئەو عەرەبەی لە دەورتان ئامادەنین مەڕو وشتری زەکاتیان و لەسەر ئایینیان نەماونەتەوە، ئەگەر بگەڕێنەوە چاوپۆشی لە مڕۆیان دەکرێت، لە ئایینیشدا

---

[1] – ضعیف.

[2] – لە کنز العمال ج٣ ص١٤٢ دا واهاتووە.

ئەمڕۆ لەو کاتەی ئێوە بەهێزترنین کە بەرەکەتی پێغەمبەر (ﷺ) تان لە دەستدا، ئەویش ئێوەی دایە دەست ئەو کەسەی کە لە گومڕاییەوە ڕێنموونی کردو لە هەژاریەوە دەوڵەمەندی کرد، ئێوە لە کەنار دۆزەخدابوون کە لە دۆزەخ ڕزگاری کردن، سوێند بە خوا بەردەوام لەسەر فەرمانی خوا دەجەنگم تا خوا بەڵێنی خۆیمان بۆ بێنێتەدی و ئەوەمان کوژرا شەهیدی ناو بەهەشتو ئەوەی مایەوە خەلیفەی میراتگری سەرزەوی بێت، خوا حەقی گەیاندووەو قسەشی لادانی تیانیە (وعد الله الذين امنوا منكم و عملوا الصالحات ليستخلفنهم في لارض) پاشان لە مینبەرەکەدا دابەزی.[1]

عەدەنی لە عومەرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێک کۆچەران یەکڕابوونو منیشیان لەناودابووم، - ئەوکات عەرەب هەڵگەڕابوونەوە- وتمان ئەی خەلیفەی پێغەمبەر ڕێ بە خەڵکی بدە نوێژەکەیان بکەنو زەکات نەدەن، چونکە ئەگەر ئیمان چوویە دڵیان زەکاتەکەش دەدەن، ئەبوبەکر (رضي الله عنه) وتی: سوێند بەو کەسەی گیانمی بەدەستە ئەگەر لە ئاسمانەوە بکەومە خوارەوە لام خۆشەویستترە لەوەی شتێك واز لێ بهێنم کە پێغەمبەر (ﷺ) لەسەری جەنگاوە دەبێت منیش لەسەری بجەنگم، لەگەڵ عەرەب جەنگا تا هاتنەوە سەر ئیسلام، عومەر (رضي الله عنه)وتی سوێند بەو کەسەی گیانمی بەدەستە ئەو ڕۆژە لە هەموو بنەماڵەی عومەر باشتر بوو.[2]

دەینەوەری لە المجالسەو ئەبولحەسەنی کوڕی بشران لە (الفوائد) یدا بەیهەقی لە (الدلائل) و لالەکانی لە (السنة) لە ضبەی کوڕی موحصینی غەنەویەوە هێناویانە دەڵێت: بە عومەری کوڕی خەتتابم (رضي الله عنه) وت تۆ لە ئەبوبەکر باشتری، ئەویش گریا و وتی: سوێند

---

[1]- ئیبن کەسیر دەڵێت: لەنێوان صاڵحی کوڕی کسانو ئەبوبەکردا پچڕانێك هەیە، بەڵام هەرخۆی شایەتی ڕاستیو دروستی بۆ دەدات لەبەر ڕاستی دەقەکەیو زۆری شایەت لەسەری، لە کنز العمال ج٣ ص١٤٢ دا واهاتووە، لە البداية والنهاية ج٦ ص٣١٠ لە ئیبن عەساکیرەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی.

[2] – لە کنز العمال ج٣ ص١٧١ دا واهاتووە.

بەخوا شەو و ڕۆژێکی ئەبوبەکر لە عومەرو خێزانەکەی باشترە، باسی شەو و ڕۆژی ئەبوبەکرت بۆ بکەم؟ وتم: بەڵێ ئەی ئەمیری باوەڕداران، وتی: شەوەکەی ئەوکات بوو کە پێغەمبەر (ﷺ) مەککەی بەجێ هێشت، شەو دەچوو و ئەبوبەکریش شوێنی کەوت، ئینجا فەرموودەکە لەسەر کۆچکردن دێنێت، بۆ ڕۆژەکەیشی کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوایی کردو عەرەب هەڵگەڕانەوە، هەندێك دەیانوت: نوێژ دەکەین و زەکات نادەین، هەندێکیش دەیانوت: نوێژیش ناکەین و زەکاتیش نادەین، منیش چووم بۆلای و وتم: ئەی خەلیفەی پێغەمبەر (ﷺ) دڵی خەڵك ڕابگرەو لەگەڵیان نەرم بە چونکە ئەمڕۆ لەباری دڕندەیی دان، وتی: سەرخستنی دواخستووەو زەبوونی دێنێت لە نەفامیدا توندو ڕق و لە ئیسلامدا لاواز؟ لەچی دەترسیت بە قسەی برق و باق و جادوو دڵیان ڕاگرم، ئەی هاوار ئەی پێغەمبەر (ﷺ) چوو و سروش نەما، سوێند بەخوا دەترسم شمشێر بگرێت لەسەر نەدانی بەرخێکیش بێت لەگەڵیان دەجەنگم.[1]

ئیمامی ئەحمەدو بوخاری و موسلیم لە ئەبوهورەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویانە کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوایی کردو ئەبوبەکر هات و عەرەب بێباوەڕبوونەوە، عومەر (رضي الله عنه) وتی: ئەی ئەبوبەکر چۆن خەڵکی دەکوژیت (شەڕیان لەگەڵ دەکەیت) لە کاتێکدا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت (فەرمانم پێکرا تا لەگەڵ خەڵك بجەنگم تا دەڵێن هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خوا، هەرکەس وتی (لا الە الاالله) ماڵ و سامان و گیانی لێم حەرامە مەگەر بە حەقی ئیسلام لەسەری، حساب و لێپێچینەوەشی لای خوایە) ئەبوبەکر (رضي الله عنه) وتی: سوێند بەخوا لەگەڵ هەرکەس دەجەنگم کە جیاوازی بکات لە نێوان نوێژو زەکاتدا، چونکە زەکات مافی بیت و المالە، سوێند بە خوا ئەگەر بەرخێکیان دابێت بە پێغەمبەر (ﷺ) و نەیدەن بە من لەسەری لەگەڵیان دەجەنگم، عومەر وتی: سوێند بە خوا زانیم خوا سنگی ئەبوبەکری بۆ ئەو شەڕە کردۆتەوەو حەقە.[2]

---

[1] – لە منتخب کنز العمال ج٤ ص٣٤٨ دا هاتووە.

[2] – ئەو چوارەکەی تریش هێناویانە جگە لە ئیبن ماجە، ئیبن حەببانیش و بەیهەقیش هێناویانە، لە کنز العمال ج٣ ص٣٠١ یشدا هاتووە.

# (گرنگیدانی ئەبوبەکر(رضي الله عنه) بە ناردنی سوپا لە پێناو خوادا گوڕو تین پێدان لە پێناو جیهادو ڕاوێژکردنی بە هاوەڵان لەسەر جیهادی ڕۆم)

ئیبن عەساکیر ج١ ص١٣٣ لە قاسمی کوڕی موحەممەدەوە هێناویەتی و فەرموودەکە دێنێت، تیایدا هاتووە، ئەبوبەکر (رضي الله عنه) هەستا و لەناو خەڵکەکەدا وتاری دا، سوپاسی خوای کردو سەڵاواتی دا لەسەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و وتی: هەرکارێك کۆدەنگیەکی هەیە هەرکەس پێی گەیشت بەسیەتی، هەرکەسی کار بۆ خوا بکات خوای بەسە، وردو بەنیاز بن، چونکە نیاز لە پێشترە، هەرکەس ئیمانی نەبێت ئایینی نیە، هەرکەس چاوەڕێی پاداشت نەبێت پاداشتی بۆ نیە، هەرکەس نیەتی نەبێت هیچ کارێکی بۆ نیە، لە کتێبی خوادا پاداشتی جیهادی ڕێی خوا باسکراوە، دەبێت موسڵمان تایبەتمەندی هەبێت بۆی و لێی نەوێت، ئەمە ئەو ڕزگاری و (بازرگانیەیە) کە خوای گەورە ڕێنموونی لەسەر داوەو لە سەر شۆڕی ڕزگاری کردن و ڕێزی دونیا و دواڕۆژی پێ پەیوەست کردووە.[1]

بەیهەقیش لە سونەنەکەیدا ج٩ ص١٧٩ لە ئیبن ئیسحاقەوە لە چیرۆکی خالیدی کوڕی وەلیدەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی کاتێك لە یەمامە بوویەوە دەڵێت: ئەبوبەکر (رضي الله عنه) نامەی نووسی بۆ خالیدی کوڕی وەلید (رضي الله عنه) کە هێشتا لە یەمامە بوو، (لە بەندەی خوا ئەبوبەکری خەلیفەی پێغەمبەری خواوە بۆ خالیدی کوڕی وەلید وئەو کۆچەرو پشتیوان و شوێنکەوتووە چاکانەی لەگەڵیدان، سەلامتان لێ بێت، من سوپاسی ئەو خوایەتان لەسەر دەکەم کە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لەو، پاشان سوپاس بۆ ئەو خوایەی بەڵێنی خۆی بەدی هێناوەو بەندەی خۆی سەرخستووەو وەلی خۆی

[1]- لە المختصردا وا هاتووە، لە کنز العمال ج٨ ص٢٠٧ یشدا واهاتووە.تەبەری ج٤ ص٣٠ لە قاسمی کوڕی موحەممەدەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی،

سەربڵند کردو دوژمنی خۆی ڕیسواکردو بە تەنها بەسەر هەمواندا سەرکەوت، ئەو خوایەی هیچ پەرستراوێك نیە جگە لەو دەفەرمویێت(وعد الله الذين امنوا منكم و عملوا الصالحات ليستخلفنهم في الارض كما استخلف الذين من قبلهم و ليمكنن لهم دينهم الذي ارتضى لهم) هەموو ئایەتەکەی نووسی و خوێندیەوە – بەڵێنی خوایەو لادانی نیەو وتەیەکی بێگومانە، جیهادی لە سەر باوەڕداران فەرز کردوەو دەفەرمویێت (كتب عليكم القتال وهو كره لكم) – تا هەموو ئایەتەکانی خوێندەوە – دەی چاوەڕێی بەڵێنی خوا بن بۆتان و لەوەی لە سەرتان فەرزی کردووە گوێڕایەڵی بن ئەگەر چی سەختی و هەوڵی زۆری بوێت و ناڕەحەتی هەبێت و ماڵ و سامان و گیانی خۆتانی بوێت، چونکە ئەمە لە چاو گەورەیی پاداشتی خوادا سادەیە، دەی – ڕەحمەتی خواتان لێ بێت – غەزای ڕێی خوا بکەن (خفافا و ثقافا و جاهدوا باموالكم وانفسكم)– ئایەتەکەی نووسی– بزانن وا خالیدی کوڕی وەلیدم ڕاسپارد تا بچێت بۆ عێراق، نەوەستێت تا فەرمانی منی پێ دەگات، لەگەڵی بڕۆن و تەمبەڵی لەڕوودا مەنوێنن، چونکە ڕێگەیەکە خوا پاداشتی گەورەی لەسەر داناوە بۆ ئەوەی نیەتی خێری بۆی هەیەو حەزی بۆی خێری زۆرە، ئەگەر چوونە عێراق لەوێ بن تا فەرمانی منتان بۆ دێت، خوامان بەسە، وریای کارە گرنگەکانی دونیا و دواڕۆژ بن، والسلام عليكم و رحمة الله وبركاته)، تەواو.

ئیبن عەساکیر ج١ ص١٢٦ لە زوهریەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ئەوفای خوزاعیەوە (ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك کە ئەبوبەکر (ﷺ) ویستی هەڵمەت بباتە سەر ڕۆم عەلی و عومەرو عوسمان و عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و سەعیدی کوڕی زەید و ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەراح و ناودارانی کۆچەران و پشتیوانانی خەڵکی بەدرو هاوەڵانی دیکەی بانگکردو چوون بۆلای، عەبدوڵڵا دەڵێت: منیش لە ناویاندابووم، ئەبوبەکر وتی: بەخششەکانی خوا نەژمێردرێن و کاروکرداریش ناگەنە پاداشتی، سوپاس بۆ خوا، خوای گەورە یەکدەنگی کردن و نێوانی باش کردن و بەرەو ئیسلام ڕێنموونی کردن و شەیتانی لێ

دوور خستنەوە، خوا تەماعی لەوە نیە هاوەڵی بۆ دابنێین و جگە لەو کەسی تر بپەرستن، ئەمڕۆ عەرەب نەوەی یەك دایك و باوکن، پێم باشە موسڵمانان بۆ جیهادی ڕۆم لە شام بنێرم تا خوا پاڵپشتی موسڵمانان بکات و ئەو پەیامەی خۆی باڵا بکات، لەگەڵ ئەوەی موسڵمانان لەوەدا پشکی لەباریان هەیە، چونکە هەرکەسیان لەناوبچێت شەهیدە و بۆ چاکەکاران لای خوا چاکە و پاداشت هەیە، هەرکەسیش بژی لە بەرگریکردن لە ئیسلام و چوون بە دەم خواوە و پاداشتی موجاهیداندا دەژی، ئەمە ڕای منە و با ئێوەش ڕای خۆتانم پێ بڵێن. عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) هەستا و وتی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی هەر بەندەیەکی خۆی بوێت خێری پێ تایبەت دەکات، سوێند بە خوا چووبین بۆ هەر خێرێك تۆ پێشمان دەکەوتیت، ئەمەش فەزڵی خوایە و بەکێی بوێت دەیبەخشێت، خواش خاوەن فەزڵی گەورەیە، سوێند بە خوا ویستم ئەو ڕایەت بڵێم بەڵام ئەوەبوو تۆ باست کرد، - خوا ڕێی ڕاست و دروست بکاتە بەشت- ڕاستت پێکا، سوپا لە دوای سوپا بۆیان بنێرە و سەرباز لە دوای سەربازیان بۆ بنێرە، چونکە خوا سەرخەری ئایینەکەی و عیزەتبەخشی ئیسلام و موسڵمانانە، عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفیش (رضي الله عنه) هەستا و وتی: ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا ئەوانە ڕۆم و بەنوئەسفەری پۆڵایین و پایەچەسپاون، من وانابینم بدەین بەسەریاندا، بەڵام سوپا بنێرە تا هەڵمەت ببەنە سەر ناوچەکناری و دوورەکانیان پاشان بگەڕێتەوە بۆلات، ئەگەر چەند جارێك ئەوە بکەین زیانیان پێ دەگەیەنین، لە کارو دووریەکانی خاکیاندا دەستکەوت بە دەست دێنن، بەوە لە دوژمنیان پارێزراو دەبن، پاشان بنێرە بۆ خاکی یەمەن و دوورایییەکانی ڕەبیعە و موزەر، پاشان هەموویان لای خۆت کۆدەکەیتەوە، پاشان دواتر ئەگەر ویستت هەڵمەتیان ببەرە سەر یان هەڵمەتیان بۆ بنێرە، پاشان بێدەنگ بوو و خەڵکەکەش بێدەنگ بوون، پاشان ئەبوبەکر پێی وتن: چی دەڵێن؟ عوسمانی کوڕی عەففان (رضي الله عنه) وتی: من وادەتبینم ئامۆژگاری کەری ئەم ئایینەیت، نەرمیت بەرامبەریان و سۆزت بۆیان هەیە، ئەگەر ڕایەکت بۆ هەموان هەیە بڕیاری بەجێ گەیاندنی بدە چونکە تۆ

جێ گومان و تۆمەتبار نیت، تەلحەو زوبەیرو ئەبوعوبەیدەو سەعیدی کوڕی زەیدو کۆچەران و پشتیوانانی ئامادەبوو وتیان عوسمان ڕاست دەکات، چ ڕایەکت هەیە بیگرەبەر ئێمە لێت لانادەین و تۆمەتبارت ناکەین، قسەی لەو جۆرەیان کرد، عەلیش (ﷺ) لەناویاندا بوو هیچی نەدەوت، ئەبوبەکر وتی: ئەبولحەسەن تۆ چی دەڵێیت؟ وتی: پێم وایە ئەگەر خۆت بچیت یان کەسێك بنێریت بۆیان پشت بە خوا بەسەریاندا سەردەکەوین، ئەویش وتی: خوا موژدەی خێرت پێبدات چۆن ئەمە دەزانیت؟ وتی: گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو دەفەرموو (لا یزال هذا الدین ظاهرا علی کل من ناواة حتی یقوم الدین واهله ظاهرون) وتی: سوبحانەڵلاّ چ فەرموودەیەکی جوانە بەڕاستی دڵخۆشت کردم پێی خوا دڵخۆشت بکات، پاشان ئەبوبەکر (ﷺ) لەناو خەڵکەکەدا هەستاو یادی خوای کردو سەلاواتی لەسەر پێغەمبەر (ﷺ)داو وتی: خەڵکینە خوا بەخششی ئیسلامی بەسەردا ڕژاندن بە جیهاد ڕێزداری کردن، بەم ئایینە فەرزڵی دان بەسەر هەموو ئایینێکدا، دەی بەندەکانی خوا خۆتان ئامادەبکەن بۆ غەزای ڕۆم لە شام، من چەند سەرکردەیەکم بۆ داناون و ئاڵام بۆ داناون، گوێڕایەڵی پەروەردگارتان بن و لە سەرکردەکانتان لامەدەن تا نیازو خۆراك و خواردنەوەتان باش بێت، چونکە خوای گەورە لەگەڵ لە خواترسان و چاکەکاراندایە، خەڵکەکەش بێدەنگ بوون و کەسیان هیچیان نەوت، عومەر (ﷺ) وتی: ئەی کۆمەڵی موسڵمانان بۆچی وەڵامی خەلیفەی موسڵمانان نادەنەوە لە کاتێکدا بانگتان دەکات بۆ شتێك کە دەتان بوژێنێتەوە؟ ئەگەر خستنەڕوویەکی نزیك یان سەفەرێکی بەنیاز بوایە دەست پێشخەریتان بۆ دەکرد، عەمری کوڕی سەعد(ﷺ) هەستاو وتی: ئیبن خەتتاب بزانە نموونەی دووڕووانمان بۆ ناهێنیتەوە؟ بۆچی دەست پێناکەیت بەوە عەیبدارمان بکەیت؟ عومەر (ﷺ) وتی: ئەو دەزانێت ئەگەر بانگم بکات وەڵامی دەدەمەوەو دەچم بۆ غەزا، عەمری کوڕی سەعد (ﷺ) وتی: بەڵام ئێمە ئەگەر غەزامان کرد بۆ ئێوە نایکەین بۆ خوا دەکەین، عومەر وتی: دەی خوا سەرکەوتووت بکات زۆر باشە، ئەبوبەکر بە عەمری وت: ڕەحمەتی خوات لێ بێت دانیشە، چونکە مەبەستی بەو قسە

ئازاردانی موسڵمانان نەبوو، بەڵكو ویستی هانی ئەوانە بدات كە لە جیهاد كەمتەرخەمن و تەمبەڵن، خالیدی كوڕی سەعید(رضي الله عنه) هەستاو وتی: خەلیفەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕاست دەكات براگیان دانیشە، ئەویش دانیشت و خالید وتی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی كە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لەوەی موحەمەدی بە ڕێنموونی و ئایینی حەق نارد تا بەسەر هەموو ئایینەكاندا سەری بخات ئەگەر چی بێباوەڕان حەزناكەن، سوپاس بۆ خوا بەڵێنەكەی بەدی دێنێت و ئایینەكەی سەردەخات و دوژمنی دەشكێنێت و ئێمەش لانادەین و تۆش كە والی ئامۆژگاریكەری بە سۆزیت لادان لە ئارادا نیە ئەگەر بڵێیت بچن دەچین و ئەگەر فەرمانمان پێ بكەیت گوێڕایەڵت دەبین، ئەبوبەكر (رضي الله عنه) بە قسەكەی دڵخۆش بوو و پێی وت: خوا پاداشتت بداتەوە ئەی براو دۆستم، تۆ لە باری ترسدا موسڵمان بوویت و بە چاوەڕێی پاداشتەوە كۆچت كرد، لە دەست بێباوەڕان لە پێناو ئایینتدا ڕاتكرد تا خواو پێغەمبەرەكەی ڕازی بكەیت و پەیامی خوا سەرخەیت، تۆ ئەمیری خەڵكیت، ڕەحمەتی خوات لێ بێت بڕۆ، پاشان دابەزی، خالیدی كوڕی سەعید (رضي الله عنه) گەڕایەوەو خۆی ئامادە كرد، ئەبوبەكر بیلالی ڕاسپارد هاواری لەناو خەڵكدا كرد تا بچن بۆ جیهادی ڕۆم لە شام، خەڵكی وایان دەبینی خالیدی كوڕی سەعید ئەمیریان بێت، گومانیان لەوە نەبوو، پێش هەموان سەنگەری گرت، پاشان خەڵكی دەدەو بیست بیست و سی سی و جل جل و پەنجا پەنجا و سەد سەد چوون بۆ سەربازگەكانیان تا خەڵكێكی زۆر كۆبوونەوە، ئەبوبەكر (رضي الله عنه) لەگەڵ هەندێ لە هاوەڵاندا چوو تا گەیشتە سەربازگەكەیان، ئامادەسازییەكی باشی دی كە پێشتر بۆ دژ بە ڕۆم پێی ڕازی نەبوو، بە هاوەڵانی وت: دەڵێن چی ئەگەر بو جۆرە بیاننێرم بۆ شام؟ عومەر (رضي الله عنه) وتی: من بەمە ڕازی نیم دژ بە بەنی ئەسفەر بەكاربێن، بە هاوەڵانی وت: ئەی ئێوە چی دەڵێن؟ وتیان: ئێمەش هەمان ڕای عومەرمان هەیە، ئەویش وتی: ئەی چی دەڵێن نامە بنێرم بۆ خەڵكی یەمەن بانگیان بكەین بۆ جیهادو لەسەر

پاداشتەکەی هانیان بدەین؟ هەموو هاوەڵان پێیان باش بوو و وتیان: بەڵێ چۆنت پێ باشە وابکە، ئەم نامەی نووسی:

(بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان)

(لە خەلیفەی پێغەمبەری خواوە بۆ ئەو موسڵمان و باوەڕدارانەی خەڵکی یەمەن کە ئەم نامەم دەخوێننەوە، سەلامتان لێ بێت، من سوپاسی ئەو خوایەتان لەسەر دەکەم کە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لەو، پاشان خوای گەورە جیهادی لەسەر موسڵمانان نووسیوەو فەرمانی پێ کردوون هەموو بچن و بە ماڵ و گیانیان لە پێناو خوادا بجەنگن، جیهاد فەرزەو پاداشتیش لای خوای گەورە زۆرە، ئێمە موسڵمانانمان بانگ کردوون بۆ جیهادی ڕۆم لە شام، خێرا هاتون بە دەمیەوە، بەمە نیازیان باشەو چاوەڕێی پاداشتن، دەی ئێوەش بەندەکانی خوا خێرا وەرن بۆ ئەوەی کە ئەوان بۆی هاتن، با نیازتان بۆی چاك بێت، چونکە یەکێك لە دوو چاکەکەتان دێتە ڕێ، یان شەهیدی یان فەتح و دەستکەوت، خوای گەورە قسەی بێ کرداری لە بەندەکانی ناوێت، جیهادیش دژ بە دوژمنەکانی خوایە تا ئایینی حەق وەربگرن و ملکەچی فەرمانی قورئان بن، خوا ئایینتان بپارێزێت و ڕێنموونی دڵەکانتان بکات و کردارتان ڕاکرێت و پاداشتی موجاهیدانی خۆڕاگرتان پێبدات) ئەو نامەی لەگەڵ ئەنەسدا (رضي الله عنه) نارد.[1]

ئیبن عەساکیر لە عەبدولڕەحمانی کوڕی جوبەیرەوە هێناویەتی ئەبوبەکر (رضي الله عنه) کاتێك عەبدولڕەحمانی نارد بۆ حەبەشە لەناویاندا هەستا و سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کرد و دواتر فەرمانی پێ کردن تا بچن بۆ شام و موژدەی فەتحی خوای پێ دان تا تیایدا مزگەوت بنیاد بنێن، وا نازانن ئێوە بە گاڵتەو گەپەوە بچن بۆ ئەوێ، شام تێرو پڕەو خواردنی زۆری تیایە بۆتان، دەی وریای خۆشگوزەرانی بن، سوێند بە پەروەردگاری کەعبە خۆشی خۆشگوزرانیتان دەبێت، جا ئامۆژگاریتان دەکەم وریایان بن پیرو پەککەوتە مەکوژن.[2]

---

[1] – لە المختصر ج٢ ص١٢٦ و کنز العمال ج٣ ص١٤٣ دا واهاتووە.

[2] – ئینجا فەرموودەکە دێنێت، کنز العمال ج٣ ص١٤٣ دا وا هاتووە.

# (عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) موسڵمانان لەسەر جیهادی ڕێی خوا هاندەدات و لەوەی دەهاتە ڕێی ڕاوێژی بە هاوەڵان دەکرد)

تەبەری ج٤ ص٦١ لە قاسمی کوڕی موحەمەدەوە هێناویەتی دەڵێت: موسەننای کوڕی حارسە قسەی کرد و وتی: خەڵکینە ئەمەتان لەسەر سەخت نەبێت، ئێمە خاکی بە پیتی فارسمان گرت و بە سەرکەشانی سوادا سەرکەوتین و بەسەریاندا زاڵ بووین و ئەوانی پێشمان پێیان وێران و پشت بە خوا دواتریش وادەبێت، عومەر (رضي الله عنه) لەناو خەڵکەکەدا هەستا و وتی: حیجاز شوێنی لەوەڕ نیە بۆتان و خەڵکەکەشی بەوە بەسەریدا زاڵن، کوان ئەو کۆچەرە کت وپڕانەی بۆ بەڵێنی خوا دەچوون؟ بچن بۆ ئەو خاکەی خوا لە قورئاندا بەڵێنی پیّ داون بۆ ئێوەی بهێڵێتەوە چونکە دەفەرموێت (ليظهره على الدين كله) خوای گەورە ئایینەکەی سەردەخات، سەرخەری سەربەرز دەکات و میراتی گەلانی بۆ دەهێڵێتەوە، کوان بەندە چاکەکارەکانی خوا؟ یەکەم کەس کە ڕێی ئەوەی گرتەبەر ئەبوعوبەیدەی کوڕی مەسعود بوو، پاشان سەعیدی کوڕی عوبەید یان سولەیتی کوڕی قەیس (رضي الله عنه) کاتێك کۆبوونەوە بە عومەر وترا: یەکێك لە کۆچەران و پشتیوانانی سەرەتایان لەسەر بکە بە ئەمیر، وتی: نە بەخوا بەڕاستی خوای گەورە بە پێشکەوتن و خێراییان بەرەو ڕووی دوژمن بەرز ڕایگرتوون ئەگەر بترسن و ڕقتان لە ڕووبەڕووبوونەوە بێت ئەوەیتان خێراتر بەرەو بانگەوازەکە چوو ئەوە شیاوتری سەرکردایەتیتانە، سوێند بە خوا یەکەمیان کیّ بوو پێشڕەیی کرد ئەوە دەکەم بە ئەمیریان، پاشان ئەبوعوبەید و سولەیت و سەعدی بانگ کرد و وتی: ئەو دوانەتان ئەگەر پێشی بکەوتنایە ئێوەم دەکرد بە ئەمیر و دەگەیشتن بە پایەکەی ئەو، بۆیە ئەبوعوبەیدی کرد بە ئەمیری سوپاکە و بە ئەبوعوبەیدی وت: گویّ لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بگرە و لە بارەکەشدا بەشدارییان پیّ بکە و خێرا خۆت بڕیار مەدە تا ڕوون دەبێتەوە شەڕە، شەڕیش کەسی نەرم و لەسەرخۆی دەوێت کە دەبێت دەرفەت و کات بزانێت، تەبەریش (ج٤ ص٦١) لە ڕێگەی شەعبیەوە هێناویەتی و لە

فەرموودەکەیدا هاتووە: بە عومەر(رضي الله عنه) وترا: کەسێکیان بکە بە ئەمیر کە هاوەڵ بێت، عومەر (رضي الله عنه) وتی: فەرزڵی هاوەڵان بە پێشڕەوی ڕوو بە دوژمن و توانایە، ئەگەر هەرکەس ئەوەی کردو کامیش کەمتەرخەم بوون لە چووندا ئەوا خێراکەیان لە پێشترە، سوێند بە خوا یەکەم پێشڕەویان دەکەم بە ئەمیریان، بۆیە ئەبوعوبەیدی کرد بە ئەمیرو ئامۆژگاری بۆکرد لەسەر سەربازەکانی، تەواو.

تەبەری ج٤ ص٨٣ لە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك عومەر بیستی ئەبوعوبەیدی کوڕی مەسعود کوژراوە فارس لەسەر کەسێکی بنەماڵەی کیسرا کۆبووەتەوە کۆچەران و پشتیوانانی بانگ کردو چوو تا گەیشتە بیری (صرار) تەلحەی کوڕی عەبەیدوڵڵا پێش کەوت تا بگاتە (ئەعوەص) بۆلای ڕاست عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف و لای چەپ زوبەیری کوڕی عەواف و عەلیشی (رضي الله عنه) لەسەر مەدینە دانا و ڕاوێژی بە خەڵك کردو هەموو وتیان بچێت بۆ فارس، لەوەی بوو ڕاوێژی نەکرد تا لە صرار دابەزی، تەلحە گەڕایەوەو ڕاوێژی بە خاوەن ڕاکان کرد، تەلحە لەوانە بوو کە لەگەڵ خەڵك بوو، عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف ئەو ڕۆژ ڕێگری لێ کرد، عەبدولڕەحمان وتی: لە دوای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تا ئێستا و بۆ داهاتووش بە دایك و باوکمەوە بە قوربانی کەس نابم و نابم، وتم: بە دایك و باوکمەوە بەقوربانی تۆبم و لە منی بگرەو هەستەو سەرباز بنێرە، دەبینم قەزای خوا بۆ تۆ پێشترو دواتریش لە سەربازەکانتدایە، چونکە ئەگەر سوپاکەت بشکێت وك شکستی خۆت نیە، ئەگەر بکوژرێت یان لەو نێوەندەدا بشکێیت دەترسم موسڵمانان الله اکبر نەکەن و هەرگیز شایەتی نەدەن کە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خوا، ئەو کات بە دوای کەسێکدا دەگەڕا، نامەکەی سەعدی لەو نێوەندی ڕاوێژدا هێنا و لەسەر بەخششی نەجد لە قسەدا بوون، عومەر وتی: دەی کەسێکم پێ بڵێن، عەبدولڕەحان وتی: دۆزیمەوە، وتی: کێ؟ وتی: سەعدی کوڕی مالیك شێری مەیدان، خاوەن ڕاکانیش هاوڕای بوون. تەواو.

## (هاندانی عوسمانی کوڕی عەففان (رضي الله عنه) بۆ جیهادی ڕێی خوا)

ئیمامی ئەحمەد ج١ ص٦٥ لە ئەبوصاڵحی مەولای عوسمانی کوڕی عەففانەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: گوێم لە عوسمان بوو لەسەر مینبەر دەیوت: خەڵکینە من فەرموودەیەکم لێ شاردنەوە کە لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) م بیستبوو ئەویش لە ترسی ئەوەی لەسەر کونە جیابوونەوە و دواتر وتم دەبێت بۆتان بگێڕمەوە تا هەرکەسە و خۆی باری خۆی هەڵبژێرێت، گوێم لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو دەیفەرموو (رباط يوم في سبيل الله تعالى خير من الف يوم في ما سواه من المنازل)[1]

ئیمامی ئەحمەد ج١ ص٦١ لە موصعەبی کوڕی سابتیشەوە هێناویەتی دەڵێت: عوسمانی کوڕی عەففان (رضي الله عنه) لەسەر مینبەرەکەی وتاری دەداو وتی: فەرموودەیەکتان بۆدەگێڕمەوە کە لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)م بیستووە تەنها لەبەر ئەوە پێشتر پێم نەوتن لەبەر ئەوە گومانم لەسەرتان هەبوو، من گوێم لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو دەیفەرموو (حرس ليلة في سبيل الله تعالى افضل من الف ليلة يقام ليلها ويقام نهارها) واتە(پاسەوانی شەوێك لە ڕێ خوادا باشترە لە هەزار شەو کە شەوەکەی هەستێت و ڕۆژەکەی بە ڕۆژووبێت).[2]

---

[1] – صحيح.

[2] – ضعيف.

# (عەلی کوڕی ئەبوتالیب (خوا ڕوخساری ڕێزدار بکات و لێی ڕازی بێت) لەسەر جیهاد موسڵمانان هاندەدات)

تەبەری ج٤ ص٩ لە زەیدی کوڕی وەهبەوە هێناویەتی عەلی (رضي الله عنه) لەناو خەڵکەکەدا وتاری دەدا، وتی: ئەوەی هەڵی دەوەشێنێتەوە کۆنابێتەوەو ئەوەی کۆی دەکاتەوە کەس هەڵی ناوەشێنێتەوە، ئەگەر بیەوێت دوو لە دروستکراوەکانی ناکۆك نابن و هەمووان لە هیچ فەرمانێکیدا دووبەرەك نابن، کەسی جێ فەزڵ نکۆڵی لە فەزڵی خاوەن فەزڵ ناکات، قەدەر ئێمەو ئەوانی بەڕێ کردووەو والێرداین، ئەگەر گوێگری بەردەم پەروەردگارمانین، ئەگەر خوا بیەوێت چەرمەسەری پێش دەخات و دەیگۆڕێ تا خوا ستەمکار بەردۆبخاتەوە و بە حەق بڵێ ڕێڕەوی لە کوێوەیە، بەڵام دونیای کردە شوێنی کردارو دواڕۆژ شوێنی بڕیاری کۆتایی (ليجزي الذين اساؤوا بما عملوا ويجزي الذين احسنوا بالحسنى) وریابن سبەینێ دەگەن بەو گەلە، دەی شەو زۆر بێداربن و قورئانی زۆر بخوێنن و داوای سەرکەوتن و خۆڕاگری لە خوا بکەن و بە ورەو هەوڵ و توندیەوە بەرەو ڕوویان بنەوەو ڕاستگۆبن، پاشان چوو، تەواو.

دووبارە ج٤ ص(١١) لە ئەبی عەمری ئەنسارییەوە هێناویەتی دەڵێت: عەلی (رضي الله عنه) لە ڕۆژی صفین دا خەڵکی هاندەداو دەیوت: خوای گەورە بازرگانیەکی پێ نیشان داون لە سزای سەخت ڕزگارتان دەکات، بەرەو خێرتان دەبات، بڕوابوون بەخواو پێغەمبەرەکەی و جیهادی ڕێی خوا، پاداشتیشی لێخۆشبوون لە تاوانەکان و شوێنی باشی ناو بەهەشتی نەبڕاوەیە، پاشان هەواڵی پێدان ئەوانەی خۆش دەوێت کە یەکریز لە پێناویدا دەجەنگن وەك خشتی ریز بەستوو (دیواری ڕێك) وان، دەی ریزەکانتان وا ڕێکبکەن و قەڵغانیەکانتان پێشکەون و بێ قەڵغانەکانتان بچنەدواوە، ئینجا بە دوورو درێژی فەرموودەکە دێنێت.

هەروەها لە ج٤ ص٥٧ لە ئەبولوەداکی هەمەدانیەوە هێناویەتی کاتێك عەلی (رضي الله عنه) لە نوخەیلە دابەزی و لە خەواریجەکان بێهیوا بوو، هەستا و سوپاس و ستایشی

پەروەردگاری کردو دواتر وتی. پاشان هەرکەس واز لە جیهادی ڕێی خوا بهێنێت و کەمتەرخەمی بنوێنێت لە کەناری لەناوچووندایە مەگەر خوا فریای کەوێت، دەی لە خوا بترسن و لە پێناو خوادا بجەنگن و دژ بەوەی سنوری خوا دەشکێنێ و دەیەوێ ڕووناکی بکوژێنێتەوە ئەوانە هەڵەکارو گومڕاو ستەمکارو تاوانبارن و قورئان ناخوێنن و شارەزای دین و زانای لێکدانەوە نین و پێشینەیان لەسەر ئیسلام نیە، سوێند بەخوا ئەگەر دەسەڵاتتان بگرنە دەست (مەبەست خەواریجەکانە) وەك کیسراو هیرقل دەکەن، خۆتان ئامادە بکەن بۆ چوون بۆ دوژمنانتان لە ڕۆژئاواوە، وا ناردوومانە بۆلای براکانتان لە بەسرە تا بێن بۆلاتان، ئەگەر هاتن کۆببنەوە پشت بە خوا سەردەکەوین و هێزو تواناش بەس لای خوایە، تەواو.[1]

ئیبن عەبدولبر لە الاستيعاب ج١ ص٣١٥ لە عەبدولواحیدی دیمەشقیەوە هێاویەتی دەڵێت: حەوشەبی حمیری لە ڕۆژی صفیندا عەلی (رضي الله عنه) ی بانگکرد، وتی: ئەی ئەبوتالیب بکشێرەوە دواوەو وازمان لێ بێنە سوێندت دەدەین بەخوا با خوێنی ئێمەو تۆش نەڕژێت، با وازبێنین عێراق بۆ تۆ و شام بۆ ئێمە تا خوێنی موسڵمانان نەڕژێت، عەلی (رضي الله عنه) وتی: ئەی هاوار کوڕی ئوم قولەیم سوێند بەخوا ئەگەر بمزانیبا ئاگربەست بۆ ئایینی خوا باشە دەمکرد، ئەمەم بۆ ئاسانتر بوو، بەڵام خوا لە قورئاندا بەبێدەنگی و وازهێنان ڕازی نابێت، ئەگەر لەخوالا یاخی بوون و موسڵمانانیش توانای بەرگری و جیهادیان هەبوو دەبێت بجەنگن تا فەمانی خوا سەرکەوێت. تەواو.[2]

---

[1] نووسەر لێەدا گێڕانەوەیەکی ئەبی موخنەف هێناوە کە بەهیچ جۆرێك فەرموودەی وەرناگیرێت و کەسێکی هەواداری توندی شیعەیەو ساختەکاری تۆماری مێژووی زۆرە بۆیە نەمانهێناوە.

[2] – ئەبونەعیمیش لە الحلية ج١ ص٨٥ بەوجۆرە هێنایەتی.

# (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (رضي الله عنه) موسڵمانان لەسەر جیهاد هاندەدات)

تەبەری ج٣ ص٤٤ لە ڕێگەی سەیف لە موحەمەدو تەلحەو زیادەوە (رضي الله عنه) بە سەنەدەکەیانەوە هێناویەتی دەڵێت: سەعد لە ڕۆژی قادسیەدا وتاری داو سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کردو وتی: خوا حەق و بێ هاوتایەو قسەی بەرپەرچ نادرێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت (ولقد كتبنا في الزبور من بعد الذكر ان الارض يرثها عبادي الصالحون) ئەمە میراتی ئێوەو بەڵێنی پەروەردگارتانەو ماوەی سێ حەجە بە ڕەوای داناوە بۆتان، لێ بخۆن و خەڵکەکەی بکوژن و پارەیان لێ کۆبکەنەوەو بیانگرن بەوەی ڕۆژانی جاران هاوەڵانتان لێیان بەدەست خستن، ئەوا ئەو کۆمەڵەی ئەوانتان بۆ هاتون و ئێوەش کەسە دیارو هەڵکەوتووەکانی عەرەب و هەر هۆزێکن، ئەگەر دونیا وەلا بنێن و چاوببڕنە ڕۆژی دوایی خوا دونیا و دواڕۆژتان بۆ کۆدەکاتەوە، تاکاتی خۆی کەس لەوە نزیك نابێتەوە، ئەگەر شکست بێنن و بترسن و لاوازبن سامتان نامێنێت و دواڕۆژ لە دەست دەدەن، عاصی کوڕی عەمر (رضي الله عنه) هەستا و وتی: خوا ئەم وڵاتەی بۆ ڕەواکردوون لە خەڵکەکەی، سێ ساڵە ئەوەی کە لە ئێوە دەستان ناکەوێت ئێوە لە وان بە دەستی دەخەن، ئێوە بەرزترن و خواتان لەگەڵە ئەگەر خۆڕاگر بن و بەڕاستی لێیان بدەن ماڵ و سامان و ژن و منداڵ و وڵاتیان بۆ ئێوە دەبێت، ئەگەریش بترسن و لاواز بن خوا لەوەدا لەگەڵتانەو پارێزەرە، بەخوا کەستان نامێنێتەوە لە ترسی ئەوەی بەرەو هیلاکی بڕۆن، الله الله بیری ڕۆژان بکەنەوە خوا چی پێ بەخشین، نابینن زەوی لە پێشتانەوە وشك و بێ ئاو و ڕووتەن و بێ درەخت و بێ پەنایە، جێی پەنا نیە؟ دەی ڕۆژی دوایی بکەن بە نیازو مەبەستتان. تەواو.

# (حەزو گوڕوتینی هاوەڵان (رضي الله عنهم) بۆ جیهادی ڕێی خوا)

ئەبونەعیم لە الحلیة ج٩ ص٣٧ لە ئەبی ئومامەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بڕیاریدا بچێت بۆ بەدر، کە خۆی کۆکردەوە تا لەگەڵی بچێ ئەبوبەردەی کوڕی دینار پێی وت: لای دایکت بمێنەرەوە، وتی: نا تۆلای خوشککەت بە، ئەوەی بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) باسکرد، ئەویش فەرمانی کرد تا ئەبو ئومامە بمێنێتەوەو ئەبو بوردە چوو، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گەڕایەوەو ژنەکەی مردبوو و نوێژی لەسەر کرد. ئیمامی ئەحمەد لە (الزهد) و سەعیدی کوڕی مەنسورو ئیبن ئەبی شەیبەو چەندێکی دی لە عومەرەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: ئەگەر سێ شت نەبوونایە حەزم دەکرد بگەمەوە بەخوا، ئەگەر لە پێناو خوادا ڕێم نەبڕیایە، یان تەوێڵێك نەمخستایەتە ناو خۆڵ و سوجدەم بۆ خوا نەبردایە، یان لەناو خەڵکیدا دانەنیشتمایە کە قسەی پاك و چاك بکەن وەك خورمای پاك وەرگرتن.[1]

ئیبن ئەبی شەیبەش لە عومەرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: حەج بکەن چونکە کارێکی چاکەو خوا فەرمانی پێکردووە، بەڵام جیهاد لەو باشترە.[2]

ئیبن عەساکیر لە ئیبن عومەرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: برام بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ڕۆژی بەدردا تا بەشداری بکەم، بەڵام ئەو بە بچوکی دانام و ڕازی نەبوو، هیچ شەوێکم نەبوو هێندەی ئەو شەوە خەفەتبارو چاو بە فرمێسك بم لەسەر ئەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەیهێشت بچم بۆ غەزاکە، بۆ ساڵی دواتر چووم و ڕازیبوو، منیش سوپاسی خوام لەسەر کرد، کەسێك وتی: ئەی ئەبوعەبدولڕەحمان لە ڕۆژی پێکەیشتندا لەوێ بوون ڕاتان کرد، وتی: بەڵێ، بەڵام خوا لە هەموومان خۆش بوو، سوپاس بۆ خوای گەورە.[3]

---

[1] – لە کنزالعمال دا وا هاتووە.

[2] – لە کنز العمال ج٢ ص٢٨٨ دا واهاتووە.

[3] – لە منتخب کنز العمال ج٥ ص٢٣١ دا واهاتووە

هەنناد لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کەسێك هات بۆلای عومەر (رضي الله عنه) و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران توێشووم بەرێ دەمەوێت بچم بۆ جیهاد، عومەریش (رضي الله عنه) بە کەسێکی وت: دەستی بگرەو بیبە بۆ بەیتولمال تا چی دەوێت هەڵیگرێت، کە چوویە ژوورەوە سپی و زەردی دەبینی، وتی: ئەمە چیە من ئەمانەم ناوێت، من بارو بنەو وڵاخم دەوێت، ئەوانیش بردیان بۆلای عومەرو وتیان: وای وتووە عومەریش وتی: دەی بیدەنێ، عومەر بە دەستیماڵئاوایی لێ دەکرد، کە سواربوو دەستی بەرز کردەوەو سوپاسی خوای کرد کەوای بۆ کردووە، عومەریش لە دوایەوە دەچوو و هیواخواز بوو نزای خێری بۆ بکات، کە لێبوویەوە وتی: خوایە پاداشتی خێری عومەر بدەرەوە.[1]

ئیبن عەساکیر لە ئەرتەئەی کوڕی مونزیرەوە هێناویەتی عومەر (رضي الله عنه) بەوانەی لای دانیشتبوون وتی: کێ پاداشتی گەورەترە؟ ئەوانیش دەیانوت: کەسی نوێژکەرو کەسی ڕۆژووگر، یان فڵان کەس و فڵان کەس دوای ئەمیری باوەڕداران، ئەویش وتی: پێتان بڵێم کێ لەوانە پاداشتی زیاترە کە ئێوە ناوتان هێنان، بەڵکو لە ئەمیری باوەڕدارانیش پاداشتی زیاترە؟ وتیان: بەڵێ، وتی: پیاوێکە (پیاوێکی سادە) لە شام ڕەشوەی وڵاخەکەی گرتبێت و لە پشتەڕێی موسڵمانان‌دا بیلەوەڕێنێت و نەزانێت ئایا گورگ پەلاماری دەدات یان مارو دووپشك دەیگەزێت یان دوژمن دێتە بۆی؟ ئەمە پاداشتی لەوانە زیاترەو لە ئەمیری باوەڕدارانیش پاداشتی زیاترە.[2]

ئیبن سەعد لە ڕێگەی واقیدی لە کەعبی کوڕی مالیکەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب دەیوت: موعاز چوو بۆ شام و چوونی زیان بوو بۆ مەدینە لە بواری فیقهداو فەتوادانی بۆیان، من بە ئەبوبەکرم (رضي الله عنه) وت: با نەهێڵت بچێت چونکە خەڵکی پێویستیان پێیەتی، بەڵام ئەو ڕازی نەبوو و وتی: کەسێك دەیەوێت بەرەو

---

[1] – لە کنز العمال ج٢ ص٢٨٨.دا هاتووە

[2] – لە کنز العمال ج٢ ص٢٨٩ دا واهاتووە.>

شەهیدی بچێت من ڕێی لێ ناگرم، منیش وتم: سوێند بە خوا کەس لەسەر جێگەکەو لە ماڵەکەیدا دەوڵەمەندو بێباك لە وڵاتی هەرشەهیدی پێ دەبەخشرێت، کەعبی کوڕی مالیك دەڵێت: موعازی کوڕی جەبەل لە سەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەبوبەکردا لە مەدینە فەتوای بۆ خەڵك دەدا[1][2].

ئیبن عەساکیر لە نەوفەلی کوڕی عەممارەوە هێناویەتی و دەڵێت: حارسی کوڕی هیشام و سوهەیلی کوڕی عەمر هاتن بۆلای عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) و لەلای دانیشتن و ئەویش لە نێوانیاندا بوو، کۆچەرانی سەرەتا دەهاتن بۆلای عومەر و ئەویش دەیوت ئالێرەوە ئەی سوهەیل، ئالێرەوە ئەی حارس، لە جێگەکەیان لایدەدان بۆ خەڵکەکە، پشتیوانانیش هاتن و هەر وایکرد تا کەوتنە کۆتایی خەڵکەکەوە، کاتێك لای عومەر چوون حارسی کوڕی هیشام بە سوهەیلی کوڕی عەمری وت: بینیت چی لەگەڵ کردین؟ سوهەیل پێی وت: کابرا سەرکۆنەی ئەو مەکە، دەبێت سەرکۆنەی خۆمان بکەین، خەڵکەکە بانگکرا و خێرا هاتن، ئێمە بانگکراین و خاو و خلیچکیمان نواند، کاتێك ئەوانەی لای عومەر چوون ئەم لاوانە چوون بۆلای و وتیان ئەی ئەمیری بڕواداران بینیمان ئەمڕۆ چیت کرد و زانیمان لە خۆمانەوە بوو، ئەی هیچ هەیە ئێمەش خۆمانی پێ فریا بخەین؟ ئەویش پێی وتن: تەنها لەم ڕووەوە شك دەبەم، ئاماژەی بەسەر سنووری ڕۆم کرد، ئەوانیش چوون بۆ شام و لەوێ مردن.[3]

حاکم ج٣ ص٢٨٢ لە ڕێگەی ئیبنولموبارەك لە جەریری حازم لە حەسەنەوە هێناویەتی دەڵێت: هەندێ خەڵك هاتنە بەردەرگای عومەر و سوهەیلی کوڕی عەمر و ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب و گەورە گەلێکی ناوقورەیش لەناویاندا بوون، مۆڵەت

---

[1] – ضعیف.

[2] – لە کنز العمال ج٧ ص٨٧ دا واهاتووە.

[3] –لە کنز العمال ج٧ ص١٣٦دا واهاتووە، زوبەیریش لە موصعەبی مامیەوە لە نەوفەلی کوڕی عەممارەوە بەوجۆرە هێناویەتی، ئیبن عەبدولبیریش لە الاستیعاب ج١ ص١١١دا هێناویەتی.

دەرەکەی هات و مۆڵەتی بە خەڵکی بەدر دا وەك صوهەیب و بیلال و عەممار (رضي الله عنه) وتی: بە خوا ئەمانە لە بەدردا بەشدار بوون و خەلیفە خۆشی دەوێن و وەسیەتی چاکەی بۆ ئەوان کردووە، ئەبو سوفیان وتی: هیچکات وەك ئەو ڕۆژەم نەبینیوە مۆڵەت بەو کۆیلانە درا و ئێمەش دانیشتبووین و لامان بەلادا نەدەکرایەوە، سوهەیلی کوڕی عەمر وتی: سەیری ئەم کابرا ناکەیت! خەڵکینە من کە هیچ ناڵێم ئەوەی لە ڕوخسارتاندا هەیە دەیبینم، ئەگەر تووڕەن لە خۆتان تووڕە بن، ئەوانە بانگ کراون و ئێوەش بانگکران، ئەوان چوون بە دەمیانەوەو ئێوەش تەمبەڵیتان نواند، ئەوانە پێشتان کەوتوونو هیچ چارەیەکتان نیە لەوەیدا ئەوان پێشتان کەوتوون، دەی بڕواننە ئەو جیهادەو بڕۆن بەشداری بن بەڵکو خوای گەورە جیهادو شەهیدیتان پێ ببەخشێت، پاشان جلەکەی کۆکردەوەو هەستا و چوو بۆ شام، حەسەن دەڵێت: سوێند بە خوا ڕاست دەکات، خوای گەورە حسابی بەندەیەك کە خێرا بەرەو ڕووی دەچێت لەگەڵ بەندەیەکدا کە کەمتەرخەمی دەنوێنێت وەك یەك دانانێت[1].[2]

ئیبن سەعد ج٥ ص٣٢٥ لە ئەبی سەعدی کوڕی فوزالەوە هێناویەتی – هاوەڵێتی هەبووە– دەڵێت: منو سوهەیلی کوڕی عەمر چووین بۆ شام گوێم لێ بوو دەیوت: گوێم لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو دەیفەرموو (مقام احدكم في سبيل الله ساعة من عمره خير من عمل عمره في اهله)(ساتێ کاری یەکێکتان لە ڕێی خوادا باشترە لە ئیشی تەمەنی لەناو ماڵو منداڵیدا) سوهەیل وتی: بۆیە تامردن سەنگەر دەگرمو ناگەڕێمەوە بۆ مەککە، ئەبی سەعد دەڵێت: لە شام مایەوە تا بە نەخۆشی تاعون لە (عەمواس) مرد.[3]

---

[1] – ضعیف.

[2] – لە الاستیعاب ج٢ ص١١٠ دا واهاتووە تەبەرانیش بە دوورو درێژی بەو واتایە لە حەسەنەوە هێناویەتی، هەیسەمی ج٨ ص٤٦ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن، بەڵام حەسەن ئەوەی لە عومەر نەبیستووە. تەواو. بوخاریش لە (التاریخ) داو بارووردی لە ڕێگەی حەمید لە حەسەنەوە بە کورتی بەو واتایە هێناویەتی، لە الاصابة ج٢ ص٩٤ یشدا هاتووە.

[3] –لە الاصابة ج٢ ص٩٤ دا هاتووە، حاکم ج٣ ص٢٨٢ لە ئەبی سەعیدەوە (رضي الله عنه) بەو جۆرە هێناویەتی.

ئیبنولموبارەك لە ئەسوەدی كوڕی شەیبان لە ئەبی نەوفەلی كوڕی ئەبی عەقرەبەوە هێناویەتی دەڵێت: حارسی كوڕی هیشام (رضي الله عنه) لە مەككە دەرچوو، خەڵكی مەككە زۆر بێتاقەت بوون و هەموو چوون بۆ بەڕێكردنی، تا گەیشتە بەتحا یان شوێنێك لەو دەورەوە وەستاو خەڵكیش لە دەوری وەستان و دەگریان، كاتێك ئەوەی بینی وتی: خەڵكینە- سوێند بە خوا من بە حەزی خۆم لای ئێوە ناچم و حەزم لە شارێكی تر نیە جگە لە شاری ئێوە بەڵام ئەمە ناچارییە، كەسانێكی قورەیش لێرە چوون كە دیارو بەرچاو نەبوون، دواتر سوێند بە خوا هێندەی شاخەكانی مەككە زێڕمان لە ڕێگەی خوادا ببەخشیایە نەدەگەیشتینەوە بە ڕۆژێكی ئەواندا، ئەگەر ئەمەمان لە دەست دا دەی بەڵكو لە دواڕۆژدا بەشداریان بین، چوو بۆ شام و سەختیەكەی ماندووی كرد و شەهید بوو، ڕەحمەتی خوای لێ بێت.[1]

ئیبن سەعد لە زیادی مەولای ماڵی خالیدەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: خالید لە سەرەمەرگیدا وتی: لە دونیادا هیچ شەوێك نیە لام خۆشەویستتر بێت هێندەی شەوێكی بەستەڵەكی سارد لەناو سریەیەكی كۆچەراندا تا بەیانی بەرامبەر بە دوژمن لەگەڵیاندا بووم، دەی بڕۆن بۆ جیهاد.[2] ئەبویەعلاش لە قەیسی كوڕی ئەبوحازمەوە هێناویەتی دەڵێت: خالیدی كوڕی وەلید (رضي الله عنه) وتی: شەوێكی بوكێنی ناو ماڵم كە مزگێنی منداڵ بوونم پێ دەدرێت هێندەی شەوێكی سارد و بەستەڵەكی ناو سریەی كۆچەران نیە كە تابەیانی دژ بە دوژمن لەگەڵیان بووم.[3]

ئەبویەعلا لە قەیسی كوڕی ئەبی حازمەوە هێناویەتی دەڵێت: خالیدی كوڕی وەلید (رضي الله عنه) وتی: جیهادی ڕێی خوا نەیهێشت زۆر قورئان بخوێنم، هەیسەمی ج٩

---

[1]- لە الاستیعاب ج١ ص٣١٠ دا هاتووە، حاكم ج٣ ص٢٧٨ لە ڕێی ئیبن موبارەكەوە بەو جۆرە هێناویەتی.

[2] - لە الاصابة ج١ ص٤١٤ دا وا هاتووە.

[3] - المجمع ج٩ ص٣٥٠ دا واهاتووە و دەڵێت: كەسەكانی سەنەدەكەی صەحیحن.

ص٣٥٠ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن لە الاصابة ج١ ص٤١٤ لە ئەبی یەعلا لە خالیدەوە (رضي الله عنه) هاتووە کە دەڵێت: جیهاد ڕێی نەدام زۆر لە قورئان فێربم.

ئیبنولموبارەك لە (کتاب الجهاد) لە عاصمی کوڕی بەهد لە ئەبی وائیلەوە هێناویەتی دەڵێت: خالید لە سەرەمەرگیدا وتی: تەواو بە دوای کوژراندا گەڕام کەچی قەدەرم وابوو لەسەر جێگەکەم بمرم لە دوای وتنی (لا اله الا الله) هیچ شتێك هێندەی ئەوە لام خۆشتر نەبووە شەوێك سەنگەر بگرمو تا بەیانی ئاسمان بارانم بەسەردا ببارێنێ تا بدەین بەسەر دوژمناندا، دواتر وتی: ئەگەر مردم سەیری چەكو ئەسپەکەم بکەنو لە پێناو جیهادی ڕێی خوادا بەکاری بهێنن کە مرد عومەر (رضي الله عنه) چوو بۆلای تەرمەکەیو وتی: هیچ لە ژنانی وەلید با لەسەر خالید فرمێسك نەڕێژێت مادەم تینوو نەبوو و زمانی (لە تینوویەتیدا) دەرنەهێنا، لە الاصابةدا وا هاتووەو لە ج١ ص١٤٥ دا دەڵێت: ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لە مەدینە مردووە، ڕای زیاتر لەسەر ئەوەیە لە حمص مردووە، تەواو.[1]

تەبەرانی لە عەبدوڵلای کوڕی موحەمەدو عومەرو عەمماری دوو کوڕی حەفص لە باوکیانەوە لە باپیریانەوە هێناویەتی دەڵێن: بیلال هات بۆلای ئەبوبەکرو وتی: ئەی خەلیفەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، من گوێم لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو دەیفەرموو (ان افضل عمل المؤمنین جهاد في سبیل الله) واتە(چاکترین کاری باوەڕداران جیهادی ڕێی خوایە) منیش دەمەوێت تا مردن لە پێناو خوادا سەنگەر بگرم، ئەبوبەکر (رضي الله عنه) وتی: بۆ خاتری خوا ئەی بیلال لەبەر مافو حورمەتی منیش بێت کە تەمەنم زۆربووەو هێزم نەماوەو سەرەمەرگم ماوە لەگەڵم بە، بیلالیش لەگەڵی مایەوە، کە ئەبوبەکر مرد هات بۆلای عومەرو هەمان شتی پێ وتەوە، عومەریش وای وتو بیلالیش ڕازی نەبوو، عومەر وتی: ئەی کێ بانگ بدات بیلال؟ وتی: سەعد، چونکە لە مزگەوتی (قباء) دا لە

---

[1]- تەبەرانیش لە ئەبی وائیلەوە بەوجۆرە بەرکورتی هێناویەتی، هەیسەمی ج٩ ص٣٥٠ دەڵێت: سەنەدەکەی حەسەنە، تەواو.

سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) دا بانگی داوە، بەوە عومەر بانگی دایە دەست عوقبەو سەعد[1][2]. موسای کوڕی موحەمەدی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی تەیمی لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوایی کرد بیلال (رضي الله عنه) بانگی داو هێشتا پێغەمبەر (ﷺ) نەخرابوویە ناو گۆڕەوە، کە گەیشتە (اشهد ان محمد رسول الله) خەڵکی ناو مزگەوت دەگریان، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) خرایە ناو گۆڕەوە ئەبوبەکر (رضي الله عنه) پێی وت: بانگ بدە، وتی: ئەگەر لەبەر ئەوە ئازادت کردم کە لەگەڵت بم ئەوە باشە، ئەگەریش لەبەر خوا ئازادت کردووم وازم لێ بێنە با لەگەڵ خوای خۆمدا بم، وتی: تەنها لەبەر خوا ئازادم کردوویت، بیلال وتی: دەی لە دوای پێغەمبەر (ﷺ) بانگ بۆ کەس نادەم، وتی: دەی باشە، دەڵێت: مایەوە تا دەستەی سوپا بۆ شام چوو، لەگەڵیان چوو بۆ شام بۆ ئەوێ، لە سەعیدی کوڕی موسەییبیشەوە هاتووە کە ئەبوبەکر کاتێك ڕۆژی هەینی لەسەر مینبەر دانیشت بیلال (رضي الله عنه) پێی وت: ئەی ئەبوبەکر، وتی: بەڵێ، وتی: لەبەر خوا ئازادت کردووم یان لەبەر خۆت؟ وتی: لەبەر خوا، وتی: دەی مۆڵەتم بدە تا بچم لە پێناو خوادا غەزا بکەم، ئەویش مۆڵەتی دا، بیلالیش چوو بۆ شام و لەوێ مرد.[3]

ئەبونەعیم لە الحلیة ج٩ ص٤٧ لە ئەبی یەزیدی مەکیەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبوئەیوب و میقداد (رضي الله عنه) دەیانوت: فەرمانمان پێکراوە لە هەموو بارێکدا بچین بۆ جیهاد، ئەم ئایەتەیان دەخوێندەوە (انفروا خفافا وثقالا).

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص١٧٦ لە ئەبوڕاشیدی حیبرانیەوە هێناویەتی دەڵێت: گەیشتمە خزکەت میقدادی کوڕی ئەسوەدی سوارچاکی پێغەمبەر (ﷺ) لەلای

---

[1] – ضعیف.

[2] – هەیسەمی ج٥ ص٢٧٤ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا عەبدولڕەحمانی کوڕی سەهلی کوڕی عەممار هەیە کە لاوازە، تەواو. ئیبن سەعدیش ج٣ ص١٦٨ بەو سەنەدەو بەو جۆرە هێناویەتی،

[3] – ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص١٥٠ لە سەعیدەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی.

تابوتی کەسێکی پارە گۆڕەوەی ناو حیمص دانیشتبوو، لەو زیاتری مەبەست بوو دەیویست بچێت بۆ غەزا، پێم وت: خوای لەسەر تۆی نەنووسیوە وتی: ئەم سورەتەمان بۆ دابەزی (انفروا خفافا وثقالا) تەبەرانی لە ئەبی ڕاشیدەوە بەو جۆرە هێناویەتی، هەیسەمی ج٧ ص٣٠ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا بەقیەی کوڕی وەلید هەیە کە لاوازیەکی لێ بەدی دەکرێت، کەسەکانی دیکەش جێ متمانەن، تەواو.[1]

بەیهەقی ج٩ ص٢١ لە جوبەیری کوڕی نوفەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: لە دیمەشق لای میقدادی کوڕی ئەسوەد لەسەر تابوتی کەسێکی خاوەن فەزڵ دانیشتین، کەسێك پێی وت: بەڵکو ئەمساڵ نەچیت بۆ غەزا، وتی: سورەتی تەوبەمان لەسەر دابەزیوە، خوا دەفەرموێت (الزخروا خفافا وثقالا) دەی من خۆم بە (خفیف)[2] دەزانم.

ئیبن عەبدولبیر لە الاستیعاب ج١ ص٥٥٠ لە حەمادی کوڕی سەلەمە لە سابتی بەنانی و عەلی کوڕی زەید و لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی ئەبوتەلحە (رضي الله عنه) سورەتی (براءة) ی خوێندەوە و گەیشتە (انفروا خفافا وثقالا) وتی: خوای پەروەردگارمان فەرمانمان پێ دەکات بە گەنج و پیرەوە بچین بۆ جیهاد، کوڕە شیرینەکانم دەی ئامادەم بکەن، ئامدەم بکەن، ئەوانیش پێیان وت: ڕەحمەتی خوات لێ بێت تۆ لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دا بەشداری غەزا بوویت تا کۆچی دوایی کرد، لەگەڵ ئەبوبەکرو عومەریشدا هەروات کرد، دەی وازبێنە ئێمە لە جیاتی تۆ دەچین بۆ غەزا، وتی: نا ئامادەم بکەن بۆ غەزا، چوو بۆ غەزای دەریا تا لە دەریادا مرد، هیچ دوورگەیەکیان بەدی نەکرد تا بە خاکی بسپێرن تا ئەوەی حەوت ڕۆژی پێ چوو ئینجا لە دوورگەیەکدا بە خاکیان سپاردو تەرمەکەشی هیچ گۆڕانی بەسەردا نەهاتبوو.[3]

---

[1] – حاکم هێناویەتی، ئیبن سەعد ج٣ ص١١٥ لە ئەبی ڕاشیدەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی، حاکم ج٣ ص٣٤٩ دەڵێت: سەنەدەکەی صەحیحە و بوخاری و موسلیم نەیانهێناوە، تەواو.

[2] چەند لێکدانەوەیەك بۆ واتای خفاف یان خفیف کراوە وەك: پیری، لاوازی، بچوکی...هتد.

[3] – ئیبن سەعد ج٣ ص٦٦ لە ڕێگەی سابت و عەلی لە ئەنەسەوە بە دوورو درێژی بە هەمان شێوە هێناویەتی، بەیهەقی ج٩ ص٢١ و حاکم ج٣ ص٣٥٣ لە ڕێگەی حەماد لە سابت و عەلی لە ئەنەسەوە بەو واتایە بە کورتی هێناویانە، حاکم دەڵێت: فەرموودەکە لەسەر مەرجی موسلیم صەحیحە و بوخاری و

حاکم ج٣ ص٤٥٨ لە موحەمەدی کوڕی سیرینەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبوئەیوب (رضي الله عنه) لەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دا بەشداری بەدری کرد، دواتریش لە هەموو غزاکانی موسڵمانانندا ئامادەبوو جگە لە یەك ساڵ نەبێت کە ئەو ساڵە کەسێکی گەنج سەرکردەی سوپاکە بوو ئەو ساڵ ئەبوئەیوب بەشداری نەکرد، دواتر خەفەتی دەخواردو دەیوت: گرنگ نیە کێ سەرکردەیە، نەخۆش کەوت و یەزیدی کوڕی موعاویە سەرکردەی سوپا بوو هات بۆ سەردانی، وتی: پێویستیت چیە؟ وتی: ئەگەر مردم سوارم بکەو بمبە بۆ خاکی دوژمن و لە کوێدا کرا لەوێ دامنێ، ئەگەرنا بە خاکم بسپێرە، پاشان بگەڕێرەوە، دەڵێت: ئەبوئەیوب (رضي الله عنه) دەیوت: خوا فەرموویەتی (انفروا خفافا وثقالا) ئەی ئیدی من هەریەکێك لەو دوانە.[1]

ئیبن عەبدولبر لە الایتیعاب ج١ ص٤٤ لە ئەبی ظبیان لە ماموستاکانیەوە لە ئەبوئەیوبەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی کە لە سەردەمی موعاویەدا (رضي الله عنه) چوو بۆ غەزا، کاتێك توانای نەما بە هاوەڵەکانی وت: ئەگەر مردم بمبەن کە گەیشتنە لای دوژمن لە ژێر پێی خۆتاندا بە خاکم بسپێرن، ئەوانیش وایان کرد، ئینجا هەموو فەرموودەکە دێنێت، تەواو.

ئیمامی ئەحمەد هێناویەتی و لە البدایة والنهایة ج٣ ص٥٩ یشدا لە ئەبو ڤبیانەوە هێناویانە دەڵێت: ئەبوئەیوب (رضي الله عنه) لەگەڵ یەزیدی کوڕی موعاویەدا چوو بۆ غەزاو وتی: ئەگەر مردم بمبەنە خاکی دوژمن و لە کوێ گەیشتن بە دوژمن لە ژێر پێی خۆتاندا بە خاکم بسپێرن، پاشان وتی: گوێم لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوو دەیفەرموو (هەرکەس بمرێت و هیچ هاوەڵ بۆ خوا دانەنێت دەچێتە بەهەشتەوە).[2]

---

موسلیم نەیانهێناوە، ئەبویەعلاش هێناویەتی، لە المجمع ج٩ ص٣١٢ دا بە کورتی هاتووەو دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن.

[1] – ئیبن سەعدیش ج٣ ص٤٩ لە موحەمەدەوە بەو جۆرە هێناویەتی، لە الاصابة ج١ ص٤٠٥ یشدا هاتووەو دەڵێت: ئەبوئیسحاقی فەزاری لە موحەمەدەوە هێناویەتی و ناوی گەنجەکەشی هێناوە کە عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان بووە، تەواو.

[2] – ئیبن سەعد ج٣ ص٤٩ بەو جۆرەی دەقی ئیبن عەبدولبر هێناویەتی.

ئیبن ئیسحاق باس لەوە دەکات ئەبوخوزەیمە – پاش چوونی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە چەند ڕۆژێك – لە ڕۆژێکی گەرمدا گەڕایەوە بۆ ماڵەوەو سەیر دەکات دوو ئافرەت لە حەوشەکەیدا لەژێر کەپردان، هەرکامیان ئاوپرژێنی دەکات و تێیدا ئاوفێنك دەکاتەوەو خواردنی تێدا بۆ ئامادە دەکات، کە چوویەوە ژوورەوە سەیری هەردوو ژنەکەی کرد چی بۆ دەکەن وتی: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە گەرما و بەرخۆرو ڕەشەبادا بێت و ئەبوخوزەیمەش لای ئاوی سارد و سێبەرو خواردن و ژنی جوان لە ماڵەوە دانیشتبێت؟ بە خوا ئەمە ویژدان نیە، سوێند بە خوا ناچمە ناو هیچ کام لەو دووکەپرە تا ئەگەم بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خۆی ئامادەکرد و چوو بۆلای وشترەکەی و ئامادەی کرد و چوو بە دوای پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) و لە تەبووك گەیشتە خزمەتی، عومەیری کوڕی وەهبی جومەحی لە ڕێگەدا گەیشت بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئەویش دەیویست بچێت بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و پێکەوە چوون تا لە تەبووك نزیك بوونەوە، ئەبوخەیسەمە بە عومەری کوڕی وەهبی وت: من تاوانێکم هەیە ئیتر پێویست ناکات تۆ بە دوامەوە بیت تا دەچمەلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەویش وتی: باشە، چوو تا لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نزیك بوویەوە و خەڵکی وتیان وا لە ڕێوە سوارێك دێت، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (دەی ئەبوخەیسەمەبێت) وتیان: سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا خۆیەتی، کاتێك گەیشت چوو و سەلامی کرد لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (اولى لك يا ابا خيشمة) پاشان ئەویش هەواڵەکەی بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) باسکرد و ئەویش فەرمووی خێر دەبێت نزای خێریشی بۆ کرد.

عوروەی کوڕی زوبەیرو موسای کوڕی عوقبە چیرۆکی ئەبوخەیسەمە دێنن بە شێوەی دەقەکەی ئیبن ئیسحاق و بە فراوانتر دەیهێنن، دەڵێن: لە دەمەو پاییزدا چوو بۆ تەبووك، لە البدايه والنهايه ج٥ ص٧ دا واهاتووە، تەبەرانی هێناویەتی و لە المجمع ج٦ ص١٩٢ یشدا هاتووە لە سەعدی کوڕی خەیسەمەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دواکەوتم و چوومەوە حەوشەی ماڵ و دەبینم کەپر ئاو پرژێن کراوەو ژنەکەم لەوێیە، وتم: ئەمە ویژدان نیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەناو گەرما و من

لە سێبەرو خۆشیدابم، هەستام و سواری وشترەکەم بووم خورمام بردو ژنەکەم وتی: بۆ کوێ ئەبوخەیسەمە؟ منیش چووم بەرەو لای پێغەمبەر (ﷺ) تا لە نیوەی ڕێدا عومەیری کوڕی وەهبم پێ گەیشت، وتم: تۆ کەسیکی نەترس و دلێری من دەزانم کە دەچمە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) بە تاوانباری دەچمە خزمەتی، دەی تۆ دوابکەوە تا من بە تەنها بچمە خزمەتی، عومەیر دوام کەوت و کەمنیش نزیکی سەربازگەکە بوومەوە خەڵکی بینیمیان، پێغەمبەر (ﷺ) فەمووی (دەی ئەبوخەیسەمە بێت) چووم وتم: ئەی پێغەمبەری خوا خەریك بوو ماڵ وێران بم، ڕووداوەکەم بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) قسەو نزای خێریشی بۆ کردم[1][2].

## (خەم و پەژارەی هاوەڵان (رضي الله عنهم) لەسەر نەتوانین بۆ چوون بۆ غەزاو بەخششی ڕێی خوا)

ئیبن ئیسحاق دەڵێت: بیستم ئیبن یامینی نەزری گەیشت بە ئەبولەیلاو عەبدوڵلای مغفل(رضي الله عنه) دەگریان وتی: بۆچی دەگرین؟ وتیان: چووین بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) تا چەکمان پێ بدات کەچی پێی نەبوو، ئێمەیش نەمانتوانی لەگەڵی بچین، ئەویش وشترێکی دا بە هەردووکیان و بڕێك خورمای پێدان ئەوانیش لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) دا چوون.

یونس لە ئیبن ئیسحاقەوە ئەوەش زیاد دەکات: عەلبەی کوڕی زەید (رضي الله عنه) شەو چوو تێر نوێژی کردو گریا، وتی: خوا تۆ فەرمانت بە جهاد کردووەو هانت داوین بۆی، دەی من هیچم نیە تا پێی بچم، پێغەمبەرەکەیشت لە دەستیدا نیە تا پێم بدات، من گەردنی هەرموسڵمانێك ئازاد دەکەم لەسەر ماڵ یان جەستە یان ئابڕوم، پاشان

---

[1] – ضعیف.

[2] – هەیسەمی ج٦ ص١٩٣ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا یەعقوبی کوڕی موحەمەدی زوهری هەیە کە لاوازە. تەواو.

بەیانی لەگەڵ خەڵکەکە چوو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (این المتصدق هذة اللیلة؟) کەس هەڵنەسا، پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی کێیە با هەستێت، ئەویش چوو بۆلای و پێی وت: پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (ابشر فوالذي نفسي بیده لقد کتبت في الزکاة المتقبلة) واتە(مۆژدەت لێ بێت سوێند بەوەی گیانمی بە دەستە لە زەکاتی قبوڵکراوادا نووسرا).[1]

ئیبن مند لە ئەبی عەبسی کوڕی حبرەوە هێناویەتی دەڵێت: عەلبەی کوڕی زەیدی کوڕی حارسەوە (رضي الله عنه) یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) بوو، کاتێك هانی صەدەقەی دا کەسێکیان چی لابوو هێنای، عەلبەی کوڕی زەید وتی: خوایە من هیچم نیە بیبەخشم، خوایە وا ئابڕووم بەرامبەر هەموو دروستکراوەکانت دەبەخشم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد یەکێك هاواری کرد (این المتصدق بعرضه البارحة؟) عەلبە هەستا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (سەدەقەکەت قبوڵ کرا).

بەزار لە عەلیەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) هانی بەخششی دا، ئینجا فەرموودەکە دێنێت.[2]

---

[1]– لە البدایه والنهایه ج٥ ص٥ دا واهاتووە. لە الاصابة ج٢ ص٥٠٠ دا دەڵێت: ئیبن ئیسحاق بەبێ سەنەد فەرموودەکەی هێناوە، لە فەرموودەکەی مەجمەعی کوڕی حارسەو فەرمودەکەی عەمری کوڕی عەوف و ئەبی عەبسی کوڕی حبرو فەرموودەکەی عەلبی کوڕی زەیدو قوتەیبەوە موسنەدی مەوصول هاتووە، ئیبن مردەویە لە مەجمەعی کوڕی حارسەوە هێناویەتی.

[2]– بەزار دەڵێت ئەم عەلبەیە لەناو پشتیواناندا کەسێکی ناسراوەو جگە لەم فەرموودەی فەرموودەی تریمان نەبیستووە، ئیبن ئەبی دونیا و ئیبن شاهین لە ڕێگەی کەسیری عەبدوڵلای کوڕی عەمری عەوف لە باوکیەوە لە باپیریەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی، بە کورتی تەواو بوو، ئیبن نەجاشی بە کورتی لە عەلبەی کوڕی زەیدەوە هێناویەتی، لە کنز العمال ج٧ ص٨٠ یشدا هاتووە.

# (نکوڵی لەسەر ئەوەی دەرچوونی لە پێناو خوادا درەنگ خستبێت)

ئیمامی ئەحمەد لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر (ﷺ) دەستەیەکی نارد بۆ مۆتەو زەیدی کرد بە ئەمیریان، ئەگەر زەید کوژرا جەعفەر، ئەگەر ئەویش کوژرا ئیبن ڕەواحە، ئیبن ڕەواحە دواکەوت، لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) مایەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (بۆ چی دواکەوتویت؟) وتی: لەگەڵ تۆ دەبم، فرمووی (لغدوة او روحة في سبيل الله خير من الدنيا وما فيها)[1,2].

ئیمامی ئەحمەد لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەی بە سریەیەکەوە نارد، ئەو ڕۆژە ڕۆژی هەینی بوو، هاوەڵانی پێشخستو وتی: من لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی هەینی دەکەم پاشان دەگەمەوە پێیان، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی کرد بینی و فەرمووی (بۆ چی لەگەڵ هاوەڵەکانتدا نەچویت؟) وتی: ویستم لەگەڵتدا نوێژی هەینی بکەم ئینجا بگەمەوە پێیان، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەگەر چی لەسەر زەویدا هەیە هەمووی ببەخشیت ناگەیتەوە بەو چوونەیاندا[3,4].

هەروەها ئیمامی ئەحمەد لە موعازی کوڕی ئەنەسەوە(رضي الله عنه) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) هێناویەتی کە فەرمانی غەزای بە هاوەڵانی کردووە، یەکێکیان وتویەتی: من دەمێنمەوە تا

---

[1] – صحيح.

[2] – لە البداية والنهاية ج٤ ص٢٤٢ دا واهاتووە، ئیبن ئەبی شەیبەش لە ئیبن عەبباسەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی، هەروەك لە كنز العمال ج٥ ص٣٠٩ دا هاتووە.

[3] – ضعيف.

[4] – ترمزی هێناویەتی و دواتر لەسەر ئەوەی لە شوعبەوە هێناویەتی قسەدەکات و دەڵێت: حەکەم لە موقەسەم تەنها پێنج فەرموودەکەی بیستووە، ئەمەش لەوانەیە، لە البداية والنهاية ج٤ ص٢٤٢ دا واهاتووە.

لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) نوێژ دەکەمو سەلامی لێدەکەمو ماڵئاوایی لیٚ دەکەم تا نزایەکم بۆ بکاتو ببێت بە پشتێنەم بۆ ڕۆژی دوایی، کە پێغەمبەر (ﷺ) نوێژی کرد کابرا چوو و سەلامی لێکرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرموودەی (دەزانیت هاوەڵانت چەندە پێشت کەوتوون؟) وتی: ئەمڕۆ بە چوونیان پێشم کەوتوون، فەرمووی (والذي نفسي نفسي بيده لقد سبقوك بابعد مابين المشرقين والمغربين في الفضيلة) (سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە لە فەزڵدا زیاتر لە دووری نێوان ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا پێشت کەوتوون)[1].[2]

بەیهەقی ج٩ ص١٥٨ لە ئەبی هورەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی بە سریەیەك کرد تا دەربچن، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمشەو بچین یان بمێنینەوە تا ڕۆژ دەبێتەوە؟ فەرمووی (اولا تحبون ان تبيتوا في خريف من خرائف الجنة؟) واتە(ئایا حەزناکەن لە باخچەیەك لە باخچەکانی بەهەشتدا بمێننەوە؟)[3].[4]

ئیبن راهەویەو بەیهەقی لە ئەبی زەرعەی کوڕی عومەری کوڕی جەریرەوە هێناویانە دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) سوپایەکی نارد کە تیایدا موعازی کوڕی جەبەل(رضي الله عنه) هەبوو، کە چوونو موعازی بینی، وتی: نەچوویت؟ وتی: ویستم نوێژی هەینی بکەم ئینجا بچم، عومەر وتی: مەگەر گوێت لە پێغەمبەر (ﷺ) نەبووە کە دەفەرموێت (العدوة والروحة في سبيل الله خير من الدنيا وما فيها)(هاتنو چوون لە پێناو خوادا چاکترە لە دنیا و ئەوەی تیایدایە)[5].[6]

---

[1] – ضعيف.

[2] –هەیسەمی ج٥ ص٢٨٤ دەڵێت: لە سەنەدەکەیدا زبانی کوڕی فائیدە هەیە کە ئەبوحاتەم متمانەی پیٚ دەداتو هەندیٚ بە لاوازی دەزانن، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە جیٚ متمانەن، تەواو.

[3] – ضعيف

[4] –تەبەرانیش هەروا هێناویەتی، هەیسەمی ج٥ ص٢٧٦ دەڵێت: بەکری کوڕی سەهلی دمیاتی ماموٚستایەتی، زەهەبی دەڵێت: فەرموودەی موقاریبە، نەسائیش دەڵێت: لاوازە، لە سەنەدەکەدا ئیبن لهیعەش هەیە، تەواو.

[5] – صحيح .

[6] – لە کنز العمال ج٢ ص٢٨٩ دا واهاتووە.

# (سەرکۆنەی ئەو کەسەی لە ڕێی خوا دوادەکەوێت‌و کەمتەرخەمی تێدا دەنوێنێت)

بوخاری لە کەعبی کوڕی مالیکەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە هیچ غەزایەکی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) دوانەکەوتم جگە لە غەزای تەبووك، بەڵام لە غەزای بەدر دواکەوتووم‌و کەسیش لەسەر ئەوە سەرکۆنە نەکرا، بەڵکو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ کاروانێکی قورەیش چوو تا بەبێ کات‌و بەڵێن خوا گەیاندنی بەیەك، لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) لە عەقەبەدا بەشداربووم کە بەڵێنی ئیسلاممان دا، حەزناکەم لە جیاتی ئەوە لە بەدردا بەشداربوومایە هەرچەندە بەدر لەناو خەڵکدا زیاتر لە عەقەبە باس دەکرێت، لەسەر باس و خواسی من ئەوە هەیە هیچ کات هێندە بە هێزو سادە نەبووم کاتێك لەو غەزایەدا دواکەوتم، سوێند بە خوا هیچ کات پێش ئەوە دوو وڵاخم نەبوون بەڵام لەو غەزایەدا دوانم کۆکردنەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەرغەزایەکی ویستبێت وای نیشانداوە بۆ شوێنێکی تر دەچێت تا ئەو غەزایەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە لە گەرمایەکی سەختدا کردی، بەرەو سەفەرێکی دوور چوو و ژمارەو ئامادەسازیەکی زۆری هەبوو، بە ئاشکرا بە موسڵمانانی ڕاگەیاند تا ئامادەسازی خۆیان بۆ جەنگەکە بکەن، بۆیە پێی فەرموون کە دەیەوێت بۆ کوێ بچێت، موسڵمانانیش لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) زۆر بوون‌و لە ژمارەی نووسین نەدەهاتن (نەدەکرا ناونووسین بکرێن) هەرکەس بیویستایە ئامادە نەبێت وای دەزانی ئەگەر سروشی خوای لەسەر دانەبەزێت کەس پێی نازانێت.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە کاتی بەرهەم گەیشتندا ئەو غەزایەی کردو خۆی بۆ ئامادەکردو موسڵمانانیش لەگەڵیدا خۆیان ئامادەکرد، منیش دەچووم تا خۆم لەگەڵیدا ئامادە بکەم، دوایی دەگەڕامەوەو هیچم نەدەکرد، لە دەروونی خۆمدا دەموت من دەتوانم بچم، بەردەوام وابووم تا خەڵکی مەسەلەکەیان تەواو توندکردەوە و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و موسڵمانان ئامادە بوون‌و منیش هیچ خۆم ئامادە نەکردبوو، وتم: دوای ڕۆژێك یان

دوو ڕۆژ خۆم ئامادە دەكەم، دواتر خۆم دەگەیەنم پێیان، پاش ئەوەی چوون كەوتمە خۆئامادەكردن، گەڕامەوەو هیچم نەكرد، پاشان چووم و گەڕامەوەو دووبارە هیچم نەكرد، هەروا بووم تا ئەوەی چوون و كات لە دەست چوو، ویستم بڕۆم و خۆم بگەیەنمە لایان، -خۆزگەش بچومایە- بەڵام نەچووم، دوای چوونی پێغەمبەر (ﷺ) دەچوومە ناو خەڵك ئەوە خەفەتباری دەكردم هیچ پیاوێكم نەدەبینی مەگەر ئەوەی تۆمەتبار بە دووڕوویی بێت یان پەككەوتەیەك كە خوا جیهادی لەسەر نەنووسیبوو، پێغەمبەر (ﷺ) منی بیرنەكەوتەوە تا گەیشتە تەبووك، لەناو خەڵكەكەدا لە تەبووك لەناو خەڵكەكەدا دانیشتبوو فەرمووی (ما فعل كعب؟) واتە(كەعب چی كرد؟) یەكێك لە بەنی سەلەمە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، دووكراسەكەی و ئەملاوئەولاكەی نەیانهێشت بێت، موعازی كوڕی جەبەلیش وتی: خراپت وت سوێند بە خوا تەنها خێرمان لێ بینیوە، پێغەمبەر (ﷺ) بێدەنگ بوو، كەعبی كوڕی مالیك دەڵێت: كاتێك بەرەو ڕێ كەوتووە، گیرم خوارد و بیرم كردەوە درۆبكەم یان نا، دەموت: سبەینێ چۆن لە توورەیی پێغەمبەر (ﷺ) خۆم دەربازبكەم؟ بۆ ئەمە ڕای هەموو خاوەن ڕاكانی ماڵ و منداڵم وەرگرت، كاتێك وترا: پێغەمبەر (ﷺ) وا بەڕێوەیە ئەوەم لەسەردا نەما و زانیم هەرگیز بە درۆ ڕزگارم نابێت، بۆیە بڕیارمدا ڕاستیەكەی پێ بڵێم، پێغەمبەر (ﷺ) دەهاتەوە، كاتێك لە سەفەرێك دەهاتەوە دەچوویە مزگەوت و دووڕكات نوێژی تێیدا دەكرد و دواتر لای خەڵكەكە دانیشت، ئەوانەی دواكەوتبوون دەچوونە لای و پۆزشیان دەهێنایەوەو سوێندیان بۆ دەخوارد، ئەوانەش هەشتا و ئەوەندە كەس بوون، پێغەمبەر (ﷺ) بە ڕووكەش وازی لێ هێنان و بەیعەتی لێ وەرگرتن و لێیان خۆشبوو و ناخ و نهێنیەكەشیانی دایەدەست خوای گەورە، منیش چووم بۆلای، كە سەلامم لێ كرد زەردەخەنەیەكی توورە ئامێزی كرد و دواتر فەرمووی (وەرە) منیش چووم تا لەبەردەمیدا دانیشتم، پێی فەرمووم (ما خلفك؟ الم تكن قد ابتغي ظهرك؟) وتم: با، سوێند بە خوا ئەگەر لەلای كەسێكی تری جگە لە تۆ بوومایە بە پۆزش و بیانوویەك خۆم لە توورەیی و ڕەقی دەرباز دەكرد من فێری مشتومڕم، بەڵام سوێند

به خوا زانیم ئەگەر درۆیەکت بۆ بکەم ڕازیت دەکەم بەڵام لەوانەیە خوا تووڕەیی تۆ بەسەرمدا داباریێنێ، ئەگەریش ڕاستییەکەت پێ بڵێم لێم تووڕە دەبیت، هیوام وایە بەو هۆیەوە خوا لێم خۆش بێت، بە خوا من هیچ بیانوویەکم نەبوو، بە خوا هیچ کات هێندە بوێرو نەترس نەبووم تا لە تۆ دوابکەوم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ئەمە ڕاستی وت، دەی هەستە تا خوا حوکمی خۆی لەسەرت دەدات) منیش هەستام و هەندێ لە کەسانی بەنی سەلەمە کەوتنە شوێنم و وتیان: بە خوا نەمانبینیوە پێش ئەمەش درۆت کردبێت؟ تۆ نەتتوانی وەك ئەوانی تر کە دواکەوتن بیانوو بهێنیتەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، هێندەت بەسە پێغەمبەر (ﷺ) داوای لێخۆشبوونت بۆ بکات، سوێند بە خوا بەردەوام سەرکۆنەیان دەکردم تا ئەوەی خەریکبوو بگەڕێمەوەو خۆم بەدرۆبخەمەوە، پاشان پێم وتن: کەسی تر ئەمڕۆ وایکردووە؟ وتیان: بەڵێ دووکەس وەك تۆیان وت و هەمان شت کە بەتۆ وترا بەوانیش وترا، وتم: ئەو دوانە کێ بوون؟ وتیان: مرارەی کوڕی ڕەبیعی عومەری و هیلالی کوڕی ئومەییەی واقفی، دووکەسی پیاوچاکیان پێ وتم کە لە بەدردا بەشداربوون و پێشەنگ بوون، پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگری لە موسڵمانان کرد کە ئەم سیانەمان بدوێنن، خەڵك لێمان دوور دەکەوتنەوە و بەرامبەرمان گۆڕان تا ئەوەی خۆمم بێزرا، ماوەی پەنجا شەو لەوبارەدا بووین، دوو هاوڕێکەی ترم سەریان دانەواندو لەماڵەوە دادەنیشتن و دەگریان، بەڵام من وەك ئەوان نەبووم لەگەڵ موسڵماناندا بەشداری نوێژم دەکرد و دەچوومە بازاڕو کەس نەیدەدواندم، دەچووم بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) لە دوای ئەوەی لە دوای نوێژ دادەنیشت سەلامم لێ دەکرد و لە دەروونی خۆمدا دەموت ئەرێ بۆ وەڵامدانەوەی سەلامەکەم لێوەکانی جوڵاند یان نا؟ دواتر لە نزیکەوە نوێژم دەکرد و لە ژێرچاوەوە سەیرم دەکرد، کاتێك لە نوێژ دەبوومەوە سەیری دەکردم، کاتێك لام دەکردەوە بەلایدا چاوی لێ لادەبردم، تا ئەوەی دوورەپەرێزی خەڵك زۆر بێزاری کردم و چوومە سەر دیواری حەوشەی ئەبوقەتادە – ئامۆزام بوو و لە هەمووکەس لام خۆشەویستتر بوو– سەلامم لێ کرد، سوێند بە خوا وەڵامی سەلامەکەی نەدامەوە، وتم: ئەی ئەبوقەتادە بۆ

خاتری خوا تۆ دەزانیت من خواو پێغەمبەری خوام خۆش دەوێت؟ بێدەنگ بوو، دووبارە پێم وتەوە بۆ خاتری خوا، ئەویش بێدەنگ بوو، بۆ جاری سێیەمیش وتمەوە بۆ خاتری خوا، وتی: خواو پێغەمبەرەکەی دەزانم، منیش پڕ فرمێسك بوون و چووم تا لە دیوارەکە دابەزیم، بەرەو بازاڕی مەدینە دەچووم تا هەندێ لە خەڵکی شام کە دەهاتن لە مەدینە خۆراکیان دەفرۆشت هاتن یەکێکیان وتی: کێ کەعبی کوڕی مالیکم پێ نیشان دەدات؟ هەموو خەڵك ئاماژەیان بۆ دەکرد کە بەرەو ڕووی من بێت، ئەویش نامەیەکی پاشای غەسانی پێدام، نامەکە لە پارچەیەکی ئاوریشمدا بوو، تیایدا هاتبوو:

(بیستوومە هاوەڵەکەت دوورەپەرێزی لێ کردوویت، خواش تۆی ڕیسواو زەبوون نەکردووە، وەرە بۆلای ئێمە دالدەو دڵنەواکەرت بین)

کاتێك خوێندمەوە وتم: ئەمەش بەڵایەکی ترە، بردمو خستمە ناو تەنوورەکەوە، بەوبارەوە ماوەی چل شەوماینەوە، پێغەمبەر (ﷺ) کەسی نارد بۆلام و وتی: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێ کردویت لە ژنەکەت دوورکەویتەوە، وتم: تەڵاقی بدەم یان چی بکەم؟ وتی: نا لێی نزیك مەبەرەوە و کەناری لێ بگرن، بۆ هاوەڵەکانیشم هەروای فەرموو بوو، منیش بە ژنەکەم وت: بڕۆرەوە بۆ ماڵی باوکت و لەوێ بە تا خوا بڕیاری سەر ئەم مەسەلە دەدات، ژنەکەی هیلالی کوڕی ئومەییە هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا هیلالی کوڕی ئومەییە پیرێکی پەککەوتەیە، خزمەتکاری نیە، دەکرێت خزمەتی بکەم؟ فەرمووی ئاساییە بەڵام لێی نزیك نەبیتەوە، ئەو ژنە دەڵێت: سوێند بە خوا جووڵەی نەکرد، بەس دەگریا، کەعب دەڵێت: هەندێ لە کەسوکارم پێیان وتم: بۆچی وەك هیلالی کوڕی ئومەییە مۆڵەت لە پێغەمبەر (ﷺ) وەرناگریت بۆ ژنەکەت، وتم: نەبەخوا ئەوە ناکەم، چوزانم ئەگەر ئەو داوای لێ بکەم پێغەمبەر (ﷺ) چی دەڵێت لە کاتێکدا من کەسێکی گەنجم؟ دەشەو دوای ئەوە بەو بارەوە مامەوەو پەنجا شەومان تەواوکرد بەو بارەوە،کاتێك نوێژی بەیانیم کرد لە بەیانی شەوی پەنجاهەمدا لەلای ماڵی خۆمان بووم بەوبارەوە

دانیشتبووم که دونیام لیٚ هاتبووه‌یه‌ك – گویٚم له هاواری یه‌کیٚك بوو له‌سه‌ر شاخ به ده‌نگی به‌رز هاواری ده‌کرد ئه‌ی که‌عب موژده‌ت لیٚ بیٚت، منیش سوجده‌م بردو زانیم ده‌رووی خیٚر کراوه‌ته‌وه، پیٚغه‌مبه‌ر (ﷺ) به‌لیٚخۆشبوونی خوا بۆمان مۆڵه‌تی به خه‌ڵك دا تا بماندویٚنن، ئه‌مه‌ش له کاتی نویٚژی به‌یانیدا بوو، خه‌ڵکی هاتن و موژده‌یان پیٚ داین، هه‌ندیٚ موژده‌ده‌ر به‌ره‌ولای دوو هاوڕیٚکه‌م چوون، یه‌کیٚکیش به ئه‌سپه‌وه هات به‌ره‌و لام و یه‌کیٚکیش له به‌رزایی شاخه‌وه هاواری ده‌کرد (له به‌نی ئه‌سله‌م بوو) ده‌نگه‌که له ئه‌سپییه‌که خیٚراتر بوو، کاتیٚك ئه‌و ده‌نگه‌م بیست و ئه‌وکه‌سه‌ش هات، کراسه‌که‌مم لابرد بۆی و هه‌ردووکیم پیٚدا، سویٚند به خوا ئه‌و ڕۆژ ته‌نها ئه‌و دوو جله‌م هه‌بوو، دوایی دووکراسم به‌ماوه وه‌رگرت و چووم بۆلای پیٚغه‌مبه‌ر (ﷺ)، خه‌ڵکی ده‌سته ده‌سته ده‌هاتن پیرۆزباییان لیٚ ده‌کردم و ده‌یانوت: ته‌وبه‌ی خوات لیٚ پیرۆزبیٚت، منیش چوومه مزگه‌وت و پیٚغه‌مبه‌ر (ﷺ) له‌ویٚ دانیشتبوو و خه‌ڵکی له ده‌وری بوون، ته‌لحه‌ی کوڕی عوبه‌یدوڵلا به‌په‌له هات به‌ره‌و لام و ته‌وقه‌و پیرۆزبایی له‌گه‌ڵ کردم، سویٚند به‌خوا له‌ناو کۆچه‌راندا به‌س ئه‌و هات بۆلام، ئه‌وه‌ش له‌بیرناکه‌م، کاتیٚك سه‌لامم کرد له پیٚغه‌مبه‌ر (ﷺ)، پیٚغه‌مبه‌ر (ﷺ) له‌تاو خۆشیدا ده‌موچاوی پرشنگی ده‌دا فه‌رمووی (ابشر بخير يوم مر عليك منذ ولدتك امك) واته (موژده‌ت لیٚ بیٚت به ڕۆژیٚك له‌و کاته‌وه‌ی له‌دایك بوویت تا ئه‌مڕۆ پاکترین ڕۆژته) منیش وتم: ئه‌ی پیٚغه‌مبه‌ری خوا له تۆوه‌وه یان له خواوه؟ فه‌رمووی (نا، به‌ڵکو له خواوه‌یه) پیٚغه‌مبه‌ر (ﷺ) ئه‌گه‌ر به‌شتیٚك دڵخۆش بوایه ڕوخساری واپرشنگی ده‌دایه‌وه ده‌توت پارچه‌یه‌کی مانگه، ئیٚمه‌ش ئه‌وه‌مان ده‌زانی، کاتیٚك له خزمه‌تیدا دانیشتم وتم: ئه‌ی پیٚغه‌مبه‌ری خوا ته‌وبه‌که‌م له‌سه‌ر ئه‌وه‌یه ماڵ و سامانم به سه‌ده‌قه له پیٚناو خواد و پیٚغه‌مبه‌ره‌که‌یدا ببه‌خشم، پیٚغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رمووی (هه‌ندیٚك له ماڵ و سامانت بۆ خۆت بهیٚڵه‌ره‌وه ئه‌وه بۆت باشتره) منیش وتم: پشکه‌که‌ی خه‌یبه‌رم ده‌هیٚڵمه‌وه، وتم: ئه‌ی پیٚغه‌مبه‌ر (ﷺ) خوای گه‌وره به ڕاستگۆیی ڕزگاری کردم و به‌ڵیٚن بیٚ تاماوم له‌گه‌ڵ که‌س درۆنه‌که‌م و ته‌نها ڕاست بڵیٚم، سویٚند به خوا له‌وکاته‌وه هیچ که‌س له

موسڵمانانم نەدەدی خوا لە ڕاستگۆیدا پشکداری بکات وەك من، لەوکاتەوە تا ئەمڕۆ یەك درۆم نەکردووەو هیوام وایە خوا لەمەودواش بمپارێزێت، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی بۆ پێغەمبەرەکەی دابەزاند (لقد تاب الله على النبي والمهاجرين والانصار) تا (وكونوا مع الصادقين) سوێند بە خوا داوای بەخششی ئیسلام گەورەترین شت لام ڕاستگۆییم لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) بوو بەوەی درۆم لەگەڵ نەکردووە وەك ئەوانەی درۆیان کرد قوڕبەسەر نەبووم، چونکە خوا لەبارەی ئەوانەوە ئەم ئایەتەی دابەزاند (سيحلفون بالله لكم اذا انقلبتم اليهم لتعرضوا عنهم) تا (فان الله لاترضى عن القوم الفسقين) کەعب دەڵێت: ئەی سێ کەسەکە ئێمە وانە دواکەوتین کە لای پێغەمبەر (ﷺ) سوێندیان خواردو بەیعەتو داوای لێخۆشبوونی پێغەمبەریان دەستکەوت، پێغەمبەر (ﷺ) کارەکەی ئێمەی دواخست تا خوای گەورە بڕیاری لەسەردا، ئەوە بوو فەرمووی (وعلى الثلاثة الذين خلفوا) ئەو دواکەوتنە مەبەستی لە دواکەوتنی غەزامان نەبوو، بەڵکو دواخستنی بارمان بوو لەوانەی سوێندو پۆزشیان لای پێغەمبەر (ﷺ) نیشانداو ئەویش لێی وەرگرتن، موسلیم بەو جۆرە هێناویەتی، ئیبن ئیسحاقیش هەروا. ئیمامی ئەحمەد بە زیادەیەکی کەمەوە هێناویەتی، لە البداية والنهاية ج٥ ص٢٣ دا هاتووە، ئەبوداودو نەسائیش بەکورتیو بەجیا بەوجۆرە هێناویانە، ترمزی بەشێکی سەرەتای هێناوە دوایی دەڵێت: فەرموودەکەی هێناوە،.[1]

[1] – لە الترغيب ج٤ ص٣٦٦ یشدا هاتووە. بەیهەقیش ج٩ ص٣٣ بە دوورو درێژی هێناویەتی.

# (هەڕەشە لەو کەسەی لەناو ژن و ماڵیدا دەمێنێتەوەو واز لە جیهاد دێنێت)

بەیهەقی ج٩ ص٤٥ لە ئەبی عمرانەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە قوستەنتینە بوون و عوقبەی کوڕی عامر بەرپرسی خەڵکی میسرو کەسێکیش – فوضالەی کوڕی عوبەید– بەرپرسی خەڵکی شام بوو، لە شارەکەوە ڕیزێکی گەورەی ڕۆمەکان هاتن، ئێمەش ڕیزمان بۆ بەستن، یەکێك لە موسڵمانان دای بەسەر ڕۆمەکاندا تا چوویە ناویان و دوایی هاتەوە بۆلامان، خەڵکی هاواریان بەرەو ڕووکردو وتیان (سبحان الله) خۆی تووشی ناڕەحەتی و ماڵوێرانی کرد، ئەبوئەیوبی ئەنساری (رضي الله عنه) هاوەڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەستاو وتی: خەڵکینە ئێوە بەو جۆرە تەئویلی ئەو ئایەتە دەکەن، ئەم ئایەتە لەناو ئێمەی کۆمەڵی پشتیواناندا دابەزی، کاتێك خوا ئایینی خۆی سەربڵند کردو سەرخەرانی زۆرکرد – لەنێوان خۆماندا لە دوور چاوی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم)– وتمان وا پارەو سامانمان فەوتا بریا بمانهێشتایەتەوە، خوای گەورەش بەرمبەر بەو نیارەمان وەڵامی داینەوەو فەرمووی (وانفقوا في سبيل الله ولا تلقوا بايديكم الى التهلكة) بۆیە ئەو ماڵوێرانی و خۆ بە هێلاك بردنە لەسەر ئەوە بوو، فەرمانی غەزای پێ کردین، ئەبوئەیوب تا مردنی سەرقاڵی غەزای ڕێی خوا بوو.

بەیهەقی ج٩ ص٩٩ لە لایەکی دیکەوە لە ئەبی عیمرانەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: هەڵمەتمان بردە سەر شاری قوستەنتینیەو عەبدولڕەحمانی کوڕی خالیدی کوڕی وەلید بەرپرسمان بوو و ڕۆمیش پێشیان دابوو بە دیواری شارەکەوە، یەکێك لە موسڵمانەکان هەڵی کوتایە سەر دوژمن، خەڵکی وتیان: سەیرکە، لا اله الا الله چۆن خۆی تووشی سەختی و هیلاکی کرد، ئەبوئەیوب (رضي الله عنه) وتی: ئەم ئایەتە لەناو ئێمەی کۆمەڵی پشتیواناندا دابەزی کاتێك خوا پێغەمبەری خۆی سەرخست و ئیسلامی زاڵکرد، وتمان: باشتر وایە لەناو ماڵ و سامانی خۆماندا بین و بەوە سەرقاڵ بین، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند (و انفقوا في سبيل الله ولا تلقوا بايديكم الى

التهلكة) بۆیە دەستدانە دونیاو سامانو وازهێنان لە جیهادمان بە هیلاکیدا چوونە، ئەبوعیمران وتی: ئەبوئەیوب بەردەوام لە ڕێی خوادا جیهادی دەکرد تا لە قوستەنتینە بە خاك سپێردرا.[1]

ئەبوداودو ترمزیو نەسائی لە ئەبی عیمرانەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: یەکێك لە کۆچەران لە قوستەنتینیە بوو، هەندێ خەڵك وتیان بە دەستی خۆی واخۆی بە هیلاکدا برد، ئەبوئەیوبی ئەنساریشمان لەگەڵدا بوو، هەندێ خەڵك وتیان: بە دەستی خۆی وا خۆی بەهیلاکدا برد، ئەبوئەیوب وتی: ئێمە چاکتر شارەزای ئەو ئایەتەینو لەناو ئێمەدا دابەزی، هاودەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بووینو لە شەڕەکاندا لەگەڵیدا بووینو سەرمان دەخست، کاتێك ئیسلام بڵاو بوویەوە و سەرکەوت، ئێمە کۆمەڵی پشتیوانان کۆبووینەوە و وتمان خوا ڕێزداری کردین بە هاودەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و سەرخستنی تا ئیسلام بڵاوبوویەوەو موسڵمانان زۆر بوون، ئێمە ئیسلاممان پێش ژنو منداڵو سامانمان خست، وا شەڕ کۆتایی پێ هات، دەی بابگەڕێینەوە ناو ژنو منداڵمانو لای ئەوان دانیشتین، ئو کات ئەو ئایەتەمان لەسەر دابەزی (و انفقوا في سبيل الله ولا تلقوا بايديكم الى التهلكة) بۆیە دانیشتن لەناو ژنو منداڵو وازهێنان لە جیهادماڵوێرانیە[2].[3]

---

[1] – صحيح.

[2] – صحيح.

[3] – عەبدی کوڕی حەمیدیش لە تەفسیرەکەیداو ئیبن ئەبی حاتەمو ئیبن جەریرو ئیبن مەردەویەو ئەبویەعلا لە موسنەدەکەیداو ئیبن حەببان لە صەحیحەکەیداو حاکم لە المستدرك دا هێناویانە، ترمزی دەڵێت: فەرموودەکە حەسەنی صەحیحی غەریبە، حاکم دەڵێت: لەسەر مەرجی بوخاریو موسلیم صەحیحەو بوخاریو موسلیم نەیانهێناوە، لە تەفسیری ئیبن کەسیر ج١ ص٢٢٨ یشدا وا هاتووە.

## (هەڕەشەو ترساندن بۆ ئەو کەسەی سەرقاڵی کشتوکاڵەو واز لە جیهاد دێنێت)

ئیبن عائیذ لە المعاز لە یەزیدی کوڕی ئەبی حەبیبەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب بیستی عەبدوڵلای کوڕی حوری عەنەسی لە شام زەویەکی چاندووە، ئەویش دای بەسەر کشتوکاڵەکەیداو وتی: لە سەر گەردنی گەورەکان چوویت بۆ هەندێ زەلیلو بچوکێ و خستوەتە گەردنی خۆت، لە الاصابة ج٣ ص٨٨ دا واهاتووە.

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٣٤٢ لە یەحیای کوڕی ئەبی عەمری شەیبانیەوە هێناویەتی دەڵێت: هەندێ لە خەڵکی یەمەن دایان بەلای عەبدوڵلای کوڕی عاصداو پێیان وت: چی دەڵێیت سەبارەت بە کەسێك بە چاکی موسڵمان بێتو بە چاکی کۆچ بکاتو بە چاکی جیهاد بکاتو دواتر بگەڕێتەوە بۆلای دایكو باوکی لە یەمەنو چاکەو سۆزیان بۆ بنوێنێ؟ وتیان: دەڵێن بە شوێن پێی خۆیدا گەڕاوەتەوە، وتی: بەڵکو لە بەهەشتدایەو پێتان دەڵێم کێ بە شوێن پێی خۆیدا گەڕاوەتەوە، کەسێك بە چاکی موسڵمان بێتو کۆچو جیهاد بکات، پاشان بچێت بۆ زەوی جوتیارێكو بە سەرانەو ڕۆزی بیباتو بکەوێتە چاندنیو واز لە جیهاد بهێنیت، ئەوە بە شوێن پێی خۆیدا گەڕاوەتەوە.

## (خێراچوون بۆ جیهادی ڕێی خواو ڕیشەکێشکردنی فیتنەو خراپە)

بوخاری لە جابری کوڕی عەبدوڵلاوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە شەڕێکدا بووین، سوفیان دەڵێت: جارێکیان لەناو سوپایەکدا بووین، یەکێك لە کۆچەران دای لە یەکێك لە پشتیوانان، پشتیوانیەکەیە وتی: ئای بۆ پشتیوانان، کۆچەریەکەش وتی: ئای بۆ کۆچەران، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەمەی بیستەوەو فەرمووی (ما بال دعوی جاهلیة؟)

وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا یەکێك لە کۆچەران بە دەستی داویەتی لە یەکێك لە پشتیوانان، فەرمووی (دعوها فانها منتنة) واتە(وازی لێ بێنن ئەو دیدە بۆگەنە).

عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی ئەمەی بیستەوەو وتی: ئەوەیان کرد، دەی بە خوا ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ مەدینە دەبێت سەربڵند سەرشۆڕ دەربکات لە مەدینە، پێغەمبەر (ﷺ) ئەمەی بیستەوە، عومەر هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ڕێمبدە با بدەم لە ملی ئەو دووڕووە، فەرمووی (دعه لا یتحدث الناس ان محمدا یقتل اصحابه) واتە(وازی لێ بێنە با خەڵك نەڵێن موحەمەد هاوەڵەکانی خۆی دەکوژێت) کاتێك چوونەوە مەدینە پشتیوانان لە کۆچەران زیاتر بوون، دواتر کۆچەران زیادیان کرد، موسلیم و ئیمامی ئەحمەدیش هێناویەتی، بەیهەقیش لە جابرەوە (رضي الله عنه) بە هەمان شێوە هێناویەتی، لە تەفسیری ئیبن کەسیر ج٤ ص٣٧٠ یشدا وا هاتووە.

ئیبن ئەبی حاتەم لە عورروەی کوڕی زوبەیرو عەمری کوڕی سابتی ئەنساریەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی: پێغەمبەر (ﷺ)غەزای مورەیسیعی ئەنجامدا و تیایدا پێغەمبەر (ﷺ) مەناتی شکاند پێغەمبەر (ﷺ) خالیدی کوڕی وەلیدی نارد و مەناتی شکاند، لەو شەڕەدا دووکەس بە شەڕهاتن، یەکێکیان لە کۆچەران و ئەوی دیکەش لە (بهز)ی هاوپەیمانانی پشتیوانان بوو، ئەوەی لە کۆچەران بوو خۆی هەڵنا بەسەر ئەوی تردا، ئەویش وتی: ئەی کۆمەڵی پشتیوانان، بۆ یە یەکێك لە پشتیوانەکان چوو بە دەمیەوە، کۆچەریەکەش وتی: ئەی کۆمەڵی کۆچەران، یەکێك لە کۆچەران چوو بە دەمیەوە، خەریك بوو لە نێوانیاندا جۆرە شەڕێك ڕوویدەدا، پاشان لە یەکدی جیاکرانەوە، هەر دووڕوویەك یان کەسێك نەخۆشی لە دڵیەوە هەبوو دەگەڕایەوە بۆلای عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول، ئەویش وتی: تۆ هیوا خوازو پێدەربوویت، ئێستا نە زیان و نە سودت نیە، تۆ دژ بە ئێمە پاڵپشتی تازە کۆچکردوویەك بوویت، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی دوژمنی خوا وتی: سوێند بە خوا ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ مەدینە سەربڵند دەبێت سەرشۆڕی تێدا دەربکات، مالیکی کوڕی دخشن کە لە دووڕووەکان بوو وتی پێم نەوتن یارمەتی هاوەڵانی پێغەمبەر مەدەن تا وایان کرد؟!

عومەری کوڕی خەتتاب ئەمەی بیستەوەو چوو بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا مۆڵەتم بدە با بدەم لە ملی ئەو کابرای کە خەڵکی لە خشتەبردووە

(عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (اوقاتله انت ان امرتك بقتله؟) واته(ئەگەر بڵێم بیکوژە دەیکوژیت؟) وتی: سوێند بە خوا ئەگەر فەرمانم پێ بکەیت دەدەم لە ملی، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (دانیشه) ئوسەیدی کوڕی حوضەیر (رضي الله عنه) کە یەکێك بوو لە پشتیوانان و لە بەنی عەبدولئەشئەل بوو هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا مۆڵەتم بدە با بدەم لە ملی ئەو کابرای کە خەڵکی لە خشتە بردووە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (او قاتلته انت ان امرتك بقتله؟) وتی: بەڵێ بە خوا ئەگەر فەرمانم پێ بکەیت بە شمشێر لە بناگوێیەوە ملی دەبڕم پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (دانیشه) پاشان فەرمووی (مۆڵەتی چوون بە خەڵکەکە بدەن) خەڵکەکە چوون، شەو و ڕۆژێك و بەیانیەکەشی تا نیوەڕۆ چوون، پاشان خەڵکی دابەزین، پاشان هەمتر چوون تا لە بەرەبەیانی ڕۆژی سێیەمدا لە (قفا المشلل) ەوە چوون، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتە مەدینە عومەری بانگ کرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (عومەر ئەگەر فەرمانم پێبکردیتایە بیکوژە دەتکوشت؟) عومەر وتی: بەڵێ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (و الله لو قتلته يومئذ لارغمت انوف رجال، لو امرتهم اليوم بقتله لقتلوه فيحدث الناس اني قد وقعت على اصحابي فاقتلهم صبرا) ئینجا خواي طةورة ئةم ئايةتةي دابةزاند (هم الذين يقولون لا تنفقوا مع عند رسول الله حتى ينفضوا) تا (يقولون لئن رجعنا الى المدينة.....).[1]

ئبن ئیسحاقیش بەو دوورو درێژی هێناویەتی، لە البداية والنهاية ج٤ ص١٥٧ یشدا هاتووە و لە دەقەکەیدا هاتووە: پاشان پێغەمبەر (ﷺ) ئەو ڕۆژە خەڵکەکەی بەڕێکرد تا ئێوارە هات، ئەویش تا بەیانی، تا نیوەڕۆ پاشان خەڵکەکەی دابەزاند، هەرکە دابەزین یەکسەر خەوتن، ئەمەی بۆیە کرد تا بیریان لای ئەو مەسەلەی دوێنێی عەبدوڵڵای کوبەی نەمێنێت کەچی وت.

---

[1]–ئبن کەسیر لە تەفسیرەکەیدا ج٤ ص٣٧٢: دەڵێت دەقێکی غەریبە و هەندێ شتی گرانبەهای تێدایە کە تەنها لێرەدا هەن، تەواو.ئبن حەجەر لە فتح الباری ج٨ ص٤٨٥ دا دەڵێت: فەرموودەکە جەیدی مورسەلە، تەواو.

## (نکووڵی لەسەر ئەوەی لە پێناو خوادا چل شەو سەنگەرگیری تەواو نەکات)

عەبدولڕەزاق لە زوبەیری کوڕی ئەبی حەبیبەوە هێناویەتی دەڵێت: کەسێك هات بۆلای عومەری کوڕی خەتتاب و ئەویش وتی: لە کوێ بوویت؟ وتی: لە سەنگەر بووم، وتی: چەندە لەوێ بوویت؟ وتی: (٣٠) ڕۆژ، وتی: دەبوو چل ڕۆژەکە تەواو بکەیت[1،2].

## (دەرچوون بۆ سێ چل ڕۆژی لە پێناو خوای گەورەدا)

عەبدولڕەزاق لە ئیبن جورەیجەوە هێناویەتی دەڵێت: کەسێك کە جێی متمانەمە پێی وتم عومەر (رضي الله عنه) بە شەقامەکاندا دەگەڕا کە گوێی لە دەنگی ئافرەتێك بوو دەیوت:

| | |
|---|---|
| تطاول هذا الليل و اسود جانبه | و ارقني ان لا حبيب الاعبه |
| فلولا حذار الله لا شيئ مثله | لزعزع من هذا السر جوانبه |

عومەریش (رضي الله عنه) وتی: چیتە؟ وتی: چەند مانگێکە پیاوەکەمت لێ دوورخستوومەتەوە و منیش تامەزرۆیم، وتی: خراپەت دەوێت؟ وتی: پەنا بە خوا، وتی: دەی خۆت ڕاگرە، وا دەنێرم بە شوێنیدا. ناردی بە شوێنیدا، دوایی چوو بۆلای حەفصە (رضي الله عنها) وتی: پرسیارێکت لێ دەکەم وەڵامی ڕاستم بدەرەوە، ئافرەت بە ماوەی چەند شەو شەیدای پیاوەکەی دەبێت و بیری دەکات؟ ئەویش سەری دانەواند و شەرم دایگرت، عومەر وتی: خوا شەرم لە حەق ناکات، ئەویش بە دەستی ئاماژەی بۆ سێ مانگ کرد، ئەگەر نا چوار مانگ، عومەریش (رضي الله عنه) نووسی نابێت لە سەروو چوار مانگ زیاتر سوپا بمێنێتەوە[1،3].

---

[1] - ضعیف.

[2] - لە کنز العمال ج٢ ص ٢٨٨ دا وا هاتووە.

[3] - صحیح.

بەیهەقی ج٩ ص٢٩ لە ڕێگەی مالیك لە عەبدوڵلای کوڕی دینار لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب شەو دەگەڕا گوێی لە ئافرەتێك بوو دەیوت:

تطاول هذا الليل و اسود جانبه و ارقني ان لا حبيب الاعبه

عومەر بە حەفصەی کچی وت: ئافرەت تا چەند خۆی لە دووری مێردی دەگرێت؟ وتی: شەش یان چوار مانگ، عومەر وتی: نابێت زیاتر لەوە سوپا بهێڵمەوە.

## (حەزی هاوەڵان لە تاودانە تەپوتۆز لە پێناو خوای گەورەدا)

تەبەرانی لە ڕەبیعی کوڕی زەیدەوە هێناویەتی دەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر خۆ دەچوو کە گەنجێکی قورەیشی دی لە دوورەوە (کەناری گرتبوو) دەڕۆیشت، فەرمووی (مەگەر ئەوە فڵانەکەس نیە؟) وتیان: با، فەرمووی (دەی بانگی بکەن) هات، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو (ما لك اعتزلت عن الطريق) واتە( بۆ چی وا دەچوویت بە ڕێدا؟) وتی: ڕقم لە تەپوتۆزە، فەرمووی (فلا اعتزل عنه فوالذي نفسي بيده لذريرة الجنة) واتە(دەی خۆتی لێ دوور مەگرە سوێند بەو کەسەی گیانمی بە دەستە ئەوە بۆنی بەهەشتە)[2][3].

ئیبن حببان لە صەحیحەکەیدا لە ئەبی موصبەحی مقرائیەوە هێناویەتی دەڵێت: لە خاکی ڕۆمدا دەستەیەك بووین دەچووین کە ئەمیرەکەی مالیکی کوڕی عەبدوڵلای خەسعەمی بوو، مالیك دای بە پاڵ جابری کوڕی عەبدوڵڵادا کە وڵاخێکی پێبوو بەپێ دەچوو، مالیك پێی وت: ئەبوعەبدوڵڵا سواربە خوا ئەوەی پێ داویت، جابر وتی:

---

[1] – لە کنز العمال ج٨ ص٣٠٨ دا واهاتووە.

[2] – ضعيف.

[3] –هەیسەمی ج٥ ص٢٨٧ دەڵێت: تەبەرانی گێڕاویەتیەوەو کەسەکانی سەنەدەکەشی جێ متمانەن، تەواو.

وریای وڵاخەکەمو بێباکم لە هۆزەکەم، گوێم لە بوو کە دەیفەرموو (هەرکەس لە پێناو خوادا قاچەکانی تۆز بیانگرێت خوا لە دۆزەخی حەرام دەکات) چوو تا ئەو شوێنەی دەنگی دەبیست بەو پەڕی دەنگیەوە هەمان شتی بە جابر دەوت، جابریش زانی و هەمان شتی وتەوە، خەڵکی لەسەر وڵاخەکانیان دابەزین، هیچ کات هێندەی ئەو ڕۆژە پیادەم نەدیبوو.

ئەبویەعلا بە سەنەدی جەید هێناویەتی دەڵێت: لە سولەیمانی کوڕی موساوە دەڵێت: ئێمە دەچووین ئینجا هەمان شت دێنێت، تیایدا دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو دەیفەرموو (قاچەکانی هیچ بەندەیەك لە پێناو خوادا تۆزناگرن مەگەر ئەوەی خوا دۆزەخیان لێ حەرام دەکات) مالیكو خەڵکەکەش دابەزین بەپێ دەچوون، ڕۆژی وا نەبینرابوو بەپێ بچن.[1]

لە الاصابة ج٣ ص١٢٦ دا دەڵێت: ئەم فەرموودە ئەبوداودی تەیالیسی لە موسنەدەکەیدا بە سەنەدی خۆی هێناویەتی واتە لە ئەبی مەصبەحەوە، تیایدا دەڵێت: عامری کوڕی عەبدوڵلا تێپەڕی[2].[3]

---

[1]- لە الترغیب ج٢ ص٣٩٦ یشدا وا هاتووە، هەیسەمی ج٥ ص٢٨٦ دەڵێت: ئەبویەعلا هێناویەتی و کەسەکانی سەنەدەکەی جێ متمانەن، تەواو.

[2]- صحیح.

[3]- ئیبن موبارەکیش لە کتاب الجهاددا هێناویەتی، لە موسنەدی ئیمام ئەحمەددا هاتووە، لە صەحیحی ئیبن حەببان لە ڕێگەی ئیبنولموبارەکەوە هاتووە، تەواو. بەیهەقی ج٩ ص٢٦٢ لە ڕێگەی ئەبی لموصبەحەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی.

# (خزمەت لە جیهادی ڕێی خوادا)

موسلیم ج١ ص٣٥٦ لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە سەفەردا لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دا بووین، هەمانبوو بە ڕۆژوو بوو، هەمانبوو ڕۆژووی نەگرتبوو، لە شوێنێك لە ڕۆژێکی گەرمدا دابەزین و زۆربەمان جلەکەی دەکرد بە سێبەر بۆ خۆی، هەمانبوو بە دەستی سێبەری دەکرد، ڕۆژوو گرەکان کەوتن و ڕۆژوو نەگرتوەکانیش هەستان و چادریان لێداو ئاوی وڵاخەکانیان دا، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (ذهب المفترون اليوم بالاجر) واتە(ئەمڕۆ ڕۆژوو نەگرتووەکان پاداشتیان بردەوە).

بوخاری لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دا بووین زۆبەمان بە جلەکەمان سێبەرمان بۆ خۆمان کردبوو، ئەوانەی بە ڕۆژوو بوون هیچیان نەکرد، ئەوانەی بە ڕۆژوو نەبوون سوارەکانیان بردن و کەوتنە خزمەتکردن، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (ذهب المفترون اليوم بالاجر).

ئەبونەعیم لە الحلية ج١ ص٣٦٩ لە سەعیدی کوڕی جورمانەوە هێناویەتی دەڵێت: پرسیارم لە سەفینە کرد چون ناوی ئەوەیە، وتی: با پێت بڵێم چون، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناوی واهێنام، وتم: بۆچی ئەو ناوەی لێنای؟ وتی: لەگەڵ هاوەڵانیدا چوو، بارو کەلوپەلیان لەسەر سەخت بوو، فەرمووی (ابسط كسائك) منیش کردمەوە، ئەویش کەلوپەلەکەی ئەوانی خستەناویەوە دوایی دای بە سەرمداو فەرمووی (احمل ما انت الا سفينة) دەڵێت: ئەگەر ئەو ڕۆژە باری وشترێك یان دوو یان پێنج یان شەش حوشترم هەڵبگرتایە لەسەرم سەخت نەدەبوو.[1]

حەسەن لە سوفیان و ئیبن موندەو ئەبونەعیم لە ئەحمەدی مەولای ئوم سەلەمەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: لە غەزایەکدا لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دا بووین، دامان بەناو دۆڵێکداو منیش خەڵکم دەپەڕاندەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرمووم (ما كنت في هذا اليوم الا سفينة)(لەو ڕۆژەدا کەشتی بوویت).[2]

---

[1] – حسن.

[2] – لە المنتخب ج٥ ص١٩٤ دا واهاتووە.

ئەبونەعیم لە الحیلة ج٣ ص٢٨٥ لە موجاهیدەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ ئیبن عومەردا (ﷺ) لە سەفەرێکدا پێکەوە بووین، کە دەمویست سواربم دەهات و سوارەکەی دەگرتم، کەسواریش دەبووم کراسەکەی دەگرتم، موجاهید دەڵێت: جارێك هات و منیش بەوە بێزاربووم، وتی: موجاهید تۆ دەروون بەرتەسکی.

ئەبوداود لە ئەبی قلابەوە (ﷺ) هێناویەتی هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) سوپاسی کەسێکیان دەکرد کە چاکەی بۆیان هەبوو، وتیان کەسی وەك فلانمان هەرگیز نەدیوە، لە ڕۆیشتندا قورئان خوێن بوو، لە هەر شوێنێکیشدا دادەبەزی نوێژی دەکرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (فمن كان يكفيه في عتو) کێ کاروباری بۆ ڕادەپەڕاند تا فەرمووی (ومن كان يعلف جمله او دابته؟) واتە(کێ ئاڵفی دەدا بە وشترەکەی یان وڵاخەکەی؟) وتمان: ئێمە، فەرمووی (فكلكم خير منه) واتە(دەی هەمووتان لەو باشترن).[1]

## (ڕۆژوو لە پێناو خوادا)

موسلیم ج١ ص٣٥٧ لە ئوم دەردائەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبودەرداء (ﷺ) وتی:لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ)دا لە چەند سەفەرێکدا لە ڕۆژی زۆر گەرمدا بووین تا هەبوو لەتاو گەرمادا دەستی دەخستە سەرسەری، تەنها پێغەمبەر (ﷺ) و عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە لەناوماندا بە ڕۆژوو بوون.

لە گێڕانەوەیەکی تری موسلیم لە ئوم دەرداء لە ئەبودەردائەوە دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) لە مانگی ڕەمەزان لە گەرمایەکی سەختدا چووین، ئینجا فەرموودەکە دێنێت، هەروەها موسلیم ج١ ص٣٥٦ لە ئەبی سەعیدی خودریەوە (ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ)دا لە ڕەمەزاندا غەزامان دەکرد، هەبوو بە ڕۆژوو بوو، هەبوو ڕۆژووی شکاندبوو، هیچ کام بەرامبەر ئەوی دی هیچیان نەبوو، وایان دەبینی هەرکەس توانای هەبێت و ڕۆژوو بگرێت باشە، ئەوەش لاوازبێت و ڕۆژوو نەگرێت ئەویش باشە.

[1] – لە الترغیب ج٤ ص١٧٢ دا واهاتووە.

ئیبن عەبدولبر لە الاستیعاب ج٢ ص٣١٦ لە ئیبن عومەرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: هاتم بۆلای عەبدوڵڵای کوڕی مەخرەمە (رضي الله عنه) لە ڕۆژی یەمامەدا کەوتبوو، چوومە سەری و وتی: ئەی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ڕۆژوەوان ڕۆژووی شکاندووە؟ وتم: بەڵێ، وتی: دەی کەمێك ئاوم بدەرێ با ڕۆژووی پێ بشکێنم، منیش چووم بۆلای حەوزەکەو پڕبوو لە ئاو، جامێکم پێ بوو کردم بە ناویداو ئاوم بۆ هێنا کەچی دەبینم مردووە.[1]

ئیبن ئەبی شەیبە لە (مصنف)ەکەیدا بە سەنەدی صەحیح لە قەیسی کوڕی ئەبی قاسم لە مودریکی کوڕی عەوفی ئەحمەسیەوە هێناویەتی دەڵێت: من لای عومەر (رضي الله عنه) بووم کە نوێنەری نوعمانی کوڕی موقرین هات بۆلای، عومەر لەسەر خەڵکەکە پرسیاری لێکرد، ئەویش باسی باری خەڵکی بۆکرد و وتی فلان و فلان کوژراون و ئەوانی دیکەش نایانناسم، عومەر وتی: بەڵام خوا دەیانناسێت، وتیان: یەکێکیش خۆی فرۆشتووە، مەبەستیان عەوفی کوڕی ئەبی حەییەی ئەحمەدی ئەبوشبیل بوو، مودریکی کوڕی عەوف وتی: ئەی ئەمیری بڕواداران سوێند بە خوا خەڵکی دەیانوت خاڵۆم خۆی بووەتە هۆی بە هیلاك بردنی خۆی، عومەر (رضي الله عنه) وتی: سوێند بە خوا ئەوانە درۆ دەکەن، خاڵۆت دواڕۆژی بە دنیا کڕی، کاتێك کوژرا بە ڕۆژوو بوو، بریندار بوو ئامادە نەبوو ئاو بخواتەوە تا مرد،[2]

پێشتریش فەرموودەکەی موحەممەدی کوڕی حەنەفیمان لەسەر (خۆگری لەسەر تینوێتی) هێنا کە وتی: ئەبو عەمری ئەنساریم دی- لە بەدر و عەقەبە و ئوحوددا بەشداربووە- بە ڕۆژوو بوو لە تاو تینوێتیدا پێچی بە خۆی دەدا و بە کۆیلەکەی دەوت: ماڵ وێران، تیرم بدەرێ، ئەویش تیرێکی پێدا و ئەویش بە لاوازیەك وەشاندنی، ئینجا فەرموودەکە دێنێت، تێیدا هاتووە: پێش ئاوابوونی خۆر کوژرا.[3]

---

[1] -ئیبن ئەبلی شەیبەو بوخاری لە التاریخ هێناویانە، لە الاصابة ج٢ ص٣٦٦ دا هاتووەو دەڵێت: ئیبنولموبارەك لە (الجهاد) لە لایەکی دیکەوە لە ئیبن عومەرەوە بە وردەکاری زیاترەوە هێناویەتی.

[2] - لە الاصابة ج٣ ص١٢٢دا واهاتووە.

[3] - تەبەرانی و حاکم هێناویانە.

# (نوێژ لە پێناو خوادا)

ئیبن خوزەیمە لە عەلیەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لەڕۆژی بەدردا تەنها میقداد سواری پێ بوو، تەنها پێغەمبەری خوایش (صلى الله عليه وسلم) لە ژێر درەختێکدا نوێژی دەکرد و دەگریا تا بەیانی بوویەوە.[1]

ئیمامی ئەحمەد لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە عوسمان لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)دا بوو، بەرامبەر بە بێباوەڕان بووینەوە کە خالیدی کوڕی وەلیدیان تێدا بوو، بێباوەڕان کەوتبوونە نێوان ئێمە و قیبلەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردین، ئەوانیش وتیان لە بارێکدان بەڵکو لە کتوپڕێکدا بدەین بە سەریاندا، پاشان وتیان: ئێستا نوێژێك دەکەن کە لە خۆیان و مناڵیان لایان خۆشەویستترە، جبریل (علیه السلام) ئەم ئایەتانەی لە نێوان نیوەڕۆ و عەسردا دابەزاند (واذا کنت فیهم فاقمت لهم الصلاة) باسی نوێژی ترس دەکات، موسلیمیش لە جابرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی بێباوەڕەکان وتیان: نوێژێك دەکەن کە لە مناڵەکانیان لەلایان خۆشەویستترە.[2][3]

ئیبن ئیسحاق لە جابرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە شەڕی ( ذات الرقاع) چووین، یەکێك لە موسڵمانەکان چوویە لای ژنێکی بێباوەڕەکان، کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گەڕایەوە مێردی ژنەکە هاتەوە، کاتێك هەواڵەکەی بیست سوێندی خوارد دانەنیشێت تا خوێنی هاوەڵانی موحەممەد بڕێژێت، کەوتە شوێن پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لە شوێنێك دابەزی و فەرمووی (ئەمشەو کێ پاسەوانیمان دەکات؟) یەکێك لە کۆچەران و یەکێك لە پشتیوانان وتیان: ئێمە ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی (فکونا بفم الشعب من

---

[1] – لە الترغیب ج١ ص٣١٦دا واهاتووە.

[2] – صحیح.

[3] – لە البدایة والنهایة ج٤ ص٨١دا واهاتووە.

الوادي) ئەودوانەش عەماری کوڕی یاسر و عەبادی کوڕی بیشر بوون، کاتێك چوون بۆ دەروازەی دۆڵەکە پشتیوانەکە بە کۆچەرەکەی وت: حەز دەکەیت کەی پاسەوانیەکەت بکەیت سەرەتای شەو یان کۆتاییەکەی؟ وتی: سەرەتاکەی، کۆچەرەکە ڕاکشا و پشتیوانەکە نەخەوت و نوێژی دەکرد، کابراش هات، کاتێك هاوەڵەکەی بینی زانی چاودێری موسڵمانەکانە، بۆیە تیرێکی وەشاند و لێی دا، ئەویش تیرەکەی لابرد و لەسەر پێ وەستا، پاشان تیرێکی تری لێدا، ئەویش تیرەکەی لابرد و لەسەر پێ وەستا، جاری سێیەم ئەوەی کردەوە، ئەویش تیرەکەی لابرد و دواتر کڕنوش و سوجدەی برد، پاشان هاوەڵەکەی بێدار کردەوە، هاوەڵەکەی وتی: دانیشە پێکراویت، کابراش هەستا و هات، کە زانی دوو هاوەڵەکە بەویان زانیوە ڕایکرد.[1]

کاتێك کۆچەرەکە خوێنی پشتیوانەکەی بینی وتی: سوبحانەڵلا بۆ چی لە سەرەتاوە بێدارت نەکردمەوە وتی: لە سورەتێکدا بووم دەمخوێند حەزم نەکرد بیبڕم تا تەواوی بکەم، کاتێك تیرەکانی تری لێ دام کڕنووشم برد و تۆم هەستاند، ئەی بەخوا ئەگەر لەبەر لەدەستدانی سەنگەری پاسەوانی نەبێت کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێکردم بیپارێزم پێش ئەوەی نوێژەکە گیانم دەردەچوو (واتە تامردن نوێژەکەم نەدەبڕی)[2].[3] بەیهەقیش لە دلائل النبوە دا هێناویەتی و دەڵێت: عوممار کوڕی یاسر خەوت و عەبادەی کوڕی بشیر نوێژی دەکرد، سورەتی(الکهف)م لە نوێژەکەدا دەخوێند حەزم نەکرد بیبڕم.

---

[1] – حسن

[2] – حسن.

[3] – ئەبوداود ج١ ص٢٩ لەو ڕێگەوە هێناویەتی، لە البدایة والنهایة ج٤ ص٨٥ دا واهاتووە، ئیبن حیببانیش لە صەحیحەکەیدا و حاکم لە المستدرك بە صەحیحی زانیوە و دارقوتنی و بەیهەقی لە سونەنەکەیاندا هێناویانە، بوخاریش لە صەحیحەکەیدا لەسەری هێناوەو لە نصب الرایة ج١ ص٤٣ یشدا هاتووە،

ئیمامی ئەحمەد لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بانگی کردمو فەرمووی (بیستوومە خالیدی کوڕی سوفیانی کوڕی نوبەیعی هوزەلی خەڵکم بۆ کۆدەکاتەوە تا شەڕم لەگەڵ بکات، ئێستا لە (عورنە)یە، بڕۆ بیکوژە) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا وەسفی بکە بۆم تا بیناسمەوە، فەرمووی (ئەگەر بینیت قەشعمرێکی لێ بەدی دەکەیت) منیش شمشێرەکەم گرتە دەستمو چووم لە عورنە بینیم هەندێ ئافرەتی پێ بوو دەیبردنە شوێنێك تا دیارنەبێت، کاتی عەسر بوو، کاتێك بینیم وەسفەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)م لێ بەدی کرد، چووم بەرەو ڕووی، ترسام هەوڵو هیلاکیەك بکەوێتە نێوان منو ئەوەوە کە نوێژەکەم پێ لە دەست بدات، بۆیە کاتێك بەرەو ڕووی دەچووم نوێژم دەکردو بە ئاماژەی سەرکڕنووشو سوجدەم دەبرد، کە گەیشتمەلای وتی: تۆ کێیت؟ وتم: کابرایەکی عەرەب هەواڵی تۆو دەوروبەرەکەتی بیستووە کە دەتەوێت هەڵمەت ببەیتە سەر ئەو کابرا هاتووم تا یارمەتیت بدەم، وتی: بەڵێ وایە، منیش هەندێ لەگەڵی چووم تا دەرفەتم بۆ گونجا بە شمشێرەکەم لێمدا تا کوشتم، دوایی چوومو ئافرەتەکانیم بەجێ هێشت بەسەریدا کەوتبوون، کاتێك چوومەوە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە دوورەوە بینیمیو فەرموویی (افلح الوجه) واتە(ئەو ڕوخسارە سەرکەوت) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا کوشتم، فەرمووی (ڕاست دەکەیت) پاشان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵم هەستاو چوویەماڵی خۆیو داردەستێکی پێدامو فەرمووی (با ئەمەت لابمێنێتەوە ئەی عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیس) منیش بە داردەستەکەوە چوومە ناو خەڵکەکەوە، وتیان: ئەو داردەستە چیە؟ وتم: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی دامو فەرمانی پێ کردم تا لام بمێنێتەوە، وتیان بۆ چی ناچیتەوە خزمەتیو لەو بارەوە پرسیاری لێ بکەیت؟ منیش چووم وتم: ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی ئەم داردەستەت پێ دام؟ وتی (هێمایەکی نێوان منو تۆ بێت لە ڕۆژی دواییدا ئەو ڕۆژ کەمترین کەسەکان گۆچان

بەدەستەکانن) عەبدوڵڵاش داردەستەکەی بە دەستەوە بە شمشێرەکەیەوە بەردەوام پێی بوو تا مرد، کە مرد خرایە ناو کفنەکەیەوە دوایی خرایە ژێر گڵ[1، 2].

تەبەری ج٢ ص٦١ لە عروەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە ڕۆژی یەرمووکدا کە دوو سەربازگەکە لە یەك نزیك بوونەوە قەبەقلار کابرایەکی عەرەبی نارد، ئینجا فەرموودەکە دێنێت، تیایدا هاتوە: پێی وت کێت لەگەڵدایە؟ وتی: ئەوانەی کەنارگیرو پەرستشکاری شەو و سوارچاکی ڕۆژن.

ئەحمەدی کوڕی مەڕوانی مالیك لە ئیبن ئیسحاقەوە فەرموودەیەك دێنێت و تیایدا دەڵێت: هیرقل وتی: بۆچی دەشکێن؟ یەکێك لە گەورەکانیان وتی: چونکە ئەوان شەو شەونوێژو ڕۆژیان بە ڕۆژووگرتنە.[3]

دواتریش لە باسی (هۆکارەکانی پاڵپشتیە خوداییەکاندا) ئەو فەرموودانە دێنین، پێشتریش فەرموودەکەی هیندی کچی عوتبەمان لە ئیبن موندەوە لە بەیعەتی ئافرەتاندا هێنا کە هیند وتی: دەتەوێت بەیعەت بدەم بە موحەمەد، ئەبوسوفیان وتی: وادیارە بێباوەڕ دەبیت، وتی: ئەرێ بەخوا! سوێند بە خوا نەمبینیوە خوای گەورە لەم مزگەوتەدا پێش ئەمشەو بە هەق بپەرسترێت، سوێند بە خوا بەردەوام نوێژیان دەکرد و کڕنووش و سوجدەیان دەبرد.

---

[1] - صحیح.

[2] - لە البدایة والنهایة ج٤ ص١٤ دا واهاتووە.

[3] - ئیبن عەساکیریش ج١ ص١٤٣ لە ئیبن ئیسحاقەوە هێناویەتی.

# (یادو زیکر لە پێناو خوای گەورەدا)

بەیهەقی لە سەعیدی کوڕی موسەیبەوە هێناویەتی دەڵێت: شەو خەڵك چوونە ناو مەککە (شەوی فەتح) بەردەوام الله اکبرو لا الە الا الله یان دەوت و تەواف کەعبەیان دەکرد تا بەیانی، ئەبوسوفیان بە هیندی وت: پێت وایە ئەمە لە خواوەیە؟ وتی: بەڵێ، پاشان بۆ بەیانی ئەبوسوفیان چوو بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو (قلت لهند اترین هذا من الله؟ قالت نعم هذا من الله) ئەبوسوفیان وتی: شایەتی دەدەم تۆ بەندەو پێغەمبەری خوایت، سوێند بەوەی ئەبوسوفیان سوێندی پێ دەخوارد جگە لە هیند کەس ئەم قسەی منی نەبیستبوو.[1]

بوخاری لە ئەبوموسای ئەشعەریەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی و دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) غەزای خەیبەری کرد، یان دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) بەرەو خەیبەر چوو، خەڵی ڕوانییان بەسەر دۆڵێکداو بە دەنگی بەرز وتیان: الله اکبر لا الە الا الله، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (لەسەر خۆ، ئێوە داوا لە کەڕو ئامادەنەبوو ناکەن، ئێوە داوا لە بیسەری نزیك دەکەن کە لەگەڵتاندایە) منیش لە پشت وڵاخەکەی پێغەمبەرەوە (ﷺ) بووم گوێی لە دەنگم بوو دەموت(لا حول ولا قوة الا بالله) فەرمووی (ئەی عەبدوڵڵای کوڕی قەیس، وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی (الا ادلك علی کلمة من کنز الجنة) واتە(وشەیەکت پێ بڵێم لە کانی بەهەشتەوە؟) وتم: بەڵێ بە دایك و باوکمەوە بە قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی (لا حول ولاقوة الا بالله). ئەوانی دیکەش ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە، ڕاستتریش ئەوەیە لە کاتی گەڕانەوەیان لە خەیبەر بووە، چونکە ئەبوموسا لە دوای فەتحی خەیبەر گەیشتە جێ.[2]

---

[1] – لە البدایة والنهایة ج٤ ص٣٠٤ دا واهاتووە، ئیبن عەساکیر لە سەعیدەوە وەك ئەوە هێناویەتی، لە کنز العمال ج٥ ص٢٩٧یشدا هاتووە دەڵێت: سەنەدەکەی صەحیحە.

[2] – لە البدایة والنهایة ج٤ ص٢١٣دا واهاتووە.

بوخاری لە جابرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێک سەردەکەوت الله کبرمان دەوت، کاتێك دادەبەزین سبحان الله مان دەوت، لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا دەڵێت: کە سەردەکەوتین الله اکبرمان دەوت: کە بەرەو خواردەبووینەوە سبحان الله مان دەوت.[1]

ئیبن عەساکیر لە ئیبن عومەرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: خەڵکی لە غەزادا دووبەش بوون، بەشێك زۆر یادی خوایان دەکرد و لە ڕۆیشتنیشدا خۆیان لە خراپە دوور دەگرت و دڵنەواو یاریدەی هاوەڵیان بوون و چاکترینی سامانی خۆیان دەبەخشی، لە مەیدانی شەڕدا شەرمیان لە خوا دەکرد لەوەی ئاگادار بە دوودڵی ناو دەرونیان یان شکستی موسڵمانان بێت، کە پیسی و پەڵە لە دڵیاندا بوایە ئەو پەڵەیان لە دڵ و دەرون وکرداریاندا لادەبرد، شەیتان نەیدەتوانی لە خشتەیان ببات و دڵیان بدوێنێت، ئایینی خوا بەوە سەربەرزو دوژمنانی خوا بەوە زەلیل و شکستخواردوو دەبوون، بەشی دووەم دەچوون و زۆر یادی خوایان نەدەکرد و لە خراپە خۆیان بەدوور نەدەگرت و بە ناحەزی نەبێت سامانی خۆیان نەدەبەخشی، ئەوەش دەیانبەخشی شەیتان دەستی تێوەردەدا، لە مەیدانی شەڕدا لەگەڵ کۆتای کۆتاکان و شکستخواردواندا بوون، پەنایان دەبردەبەر لوتکەی شاخەکان و سەیریان دەکرد بزانن خەڵك چی دەکات، کە خوا فەتحی دەنارد تاویان دەدایە درۆ، ئەگەر توانای ناپاکیان هەبوایە لە خوا نەدەترسان و دەیانکرد و شەیتان پێی دەوتن ئەوە دەستکەوتە، ئەگەریش لە خۆشیدابوونانە پاڵیان لێ دەدایەوە، لە پاداشتی موسڵماناندا هیچ پاداشتێکیان نەبوو، بەڵام جەستەو ڕێکردنیان لەگەڵ جەستەو ڕێکردنی موسڵماناندا بوو، بەڵام نیازو کاریان جیاوازبوو تا خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا کۆیان دەکاتەوە و لە یەکیان جیادەکاتەوە.[2]

---

[1] – نەسائیش لە (الیوم واللیلة) لە جابرەوە بەو شێوەیە هێناویەتی، لە العینی ج٦ ص٣٦ یشدا هاتووە.

[2] – لە کنز العمال ج٢ ص٢٩٠دا واهاتووە.

# (گرنگيدان بە نزاكان لە كاتى جيهادى ڕێى خوادا)

## (نزاى كاتى دەرچوون لە گوندو شوێنى خۆت)

ئەبونەعيم لە ڕێگەى ئيبراهيمى كوڕى موحەمەدى كوڕى ئيسحاقەوە هێناويەتى دەڵێت: بيستوومە پێغەمبەر (ﷺ) كە لە مەككەوە لە پێناو خوادا بەرەو مەدينە دەرچوو فەرمووى (الحمد الله الذي خلقني ولم اك شيئا، اللهم اعني على هول الدنيا و بوائق الدهر، و مصائب الليالي و الايام، اللهم اصحبني في سفري، و اخلفني في اهلي، و بارك لي فيما رزقتني، ولك فذللني، وعلى صالح خلقي فضومني، واليك رب فحببني، والى الناس فلا تكلني، رب المستضعفين وانت ربي، اعوذ بوجهك الكريم الذي اشرقت له السماوات والارض، وكشفت به الظلمات، وصلح عليه امر الاولين ان تحل على غضبك، وتنزل بي سخطك، اعوذ بك من زوال نعمتك وفجاءة نقمتك، وتحول عافيتك، وجميع سخطك، لك العقبي عندي خير ما استطعت لاحول ولاقوة الا بك)[1].[2]

## (نزاى كاتى چوونە لاى گوندو شوێنێك)

بەيهەقى لە ئەبى مەروانى ئەسلەمى لە باوكيەوە لە باپيريەوە هێناويەتى دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) چوون بۆ خەيبەر تا لێى نزيك بووينەوەو دەمانڕوانى بەسەريدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووى (ڕاوەستن) ئێمەش ڕاوەستاين، فەرمووى (اللهم رب السماوات السبع وما اظللن، ورب الارضين السبع وما اقللن، ورب الشياطين وما اظلللن،، فانا نسالك خير هذه القرية وخير اهلها وخير مافيها، ونعوذبك من شر هذه القرية وشر اهلها وشر مافيها) پاشان فەرمووى بە (بسم الله الرحمن الرحيم)ەوە پێشكەون[3].[1]

---

[1] – ضعيف.

[2] – لە البداية والنهاية ج٣ ص١٧٨ دا واهاتووە.

[3] – حسن.

# (نزای کاتی دەستپێکردنی جیهاد)

ئیمامی ئەحمەد لە عومەرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە ڕۆژی بەدردا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سەیری هاوەڵانی کرد کە ژمارەیان سێ سەدو ئەوەندە کەس بوو، سەیری بێباوەڕانیشی کرد کە ژمارەیان لەسەرو هەزار کەسەوە بوو، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕوویکردە قیبلەو عەباکەی بەسەرشانیەوە بوو، پاشان فەرمووی (اللهم اجزلي ما وعدتني، اللهم ان تهلك هذه العصابة من اهل الاسلام فلا تعبد في الارض ابدا) واتە(خوایە ئەوەی بەڵێنت پێ داوم بیهێنەرە دی، خوایە ئەگەر ئەم دەستەی ئیسلام لەناو بچن لەمەودا هەرگیز لەسەر زەویدا ناپەرسترێیت) بەردەوام لە پەروەردگاری دەپاڕایەوە تا عەباکەی کەوتە خوارو ئەبوبەکر (رضي الله عنه) هاتو عەباکەی داوە بەسەرشانیداو دواتر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بەسە خوای گەورە بەڵێنەکەی بۆت دێنێتەدی، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند، (اذ تستغيثون ربكم فاستجاب لكم اني ممدكم بالف من الملائكة مردفين) ئینجا هەموو فەرموودەکە دێنێت[٢] [٣].

ئەبوداود لە عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ڕۆژی بەدردا سێ سەدو پانزەکەسەوە دەرچوو، کە گەیشتە بەدر فەرمووی (اللهم انهم حفاة فاحملهم اللهم انهم عراة فاكسهم، اللهم انهم جياع فاشبعهم)

---

[١] – ئیبن ئیسحاق لە ڕێگەی ئەبی مەڕوان لە ئەبی موعتبەوە هێناویەتی، لە البداية والنهاية ج٤ ص١٨٣ دا واهاتووە، تەبەرانی لە ئەبی موعتبی کوڕی عەمرەوە هێناویەتی، لە کۆتاییەکەشیدا ئەمە زیاد دەکات بچوایە بۆ هەر شوێنێك ئەوەی دەفەرموو پێش چوونە ناوی، هەیسەمی ج١٠ ص١٣٥ دەڵێت: لە سەنەدەکەیدا ناوی یەکێکیان نەهاتووە، کەسەکانی دیکەشی جێ متمانەن.

[٢] – حسن.

[٣] موسلیمیش هێناویەتی، هەروەها ئەبوداودو ترمزیو ئیبن جەریرو کەسانی دیکەش هێناویانە، عەلی کوڕی مدینیو ترمزی بە صەحیحی هێناویانە، لە البداية والنهاية ج٣ ص٢٧٥ دا واهاتووە، ئیبن ئەبی شەیبەو ئیبن عەوانەو ئیبن حیببانو ئەبونەعیمو ئیبنولمونزیرو ئیبن ئەبی حاتەمو ئەبوشەیخو ئیبن مەردەویەو بەیهەقی هێناویانە، لە كنز العمال ج٥ ص٢٦٦ یشدا هاتووە.

واتە(خوایە ئەمانە پێ پەتین وا مەیانهێڵەوە، خوایە ئەمانە بێ جلن پۆشتەیان بکە، خوایە ئەمانە برسین تێریان بکە) خوای گەورەش فەتحی بەدری پێ بەخشین و هەرکامیان بەیەك یان دوو وشترو جل و بەرگ و تێریەوە دەگەڕانەوە[1،2].

نەسائی لە ئیبن مەسعودەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: هیچ پڕانەوەیەکم وەك پاڕانەوەی موحەمەد (رضي الله عنه) لە ڕۆژی بەدردا نەدیوە کە دەیفەرموو (اللهم اني انشدك عهدك ووعدك، اللهم ان تهلك هذه العصابة لاتعبد) پاشان لایکردەوەو دەموچاوی دەتوت مانگە فەرمووی (كاني انظر الى مصارع القوم عشية)(وادەروانم ئێوارە ئەو خەڵکە(بێباوەڕان) دەشکێن)[3].

ئیمامی ئەحمەد لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕۆژی ئوحوددا، دەیفەرموو (اللهم ان تشا لا تعبد في الارض)[4،5].

ئیمامی ئەحمەد لە ئەبی سەعیدی خودریەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە ڕۆژی خەندەقدا وتمان ئەی پێغەمبەری خوا هیچ هەیە بیڵێین وا دڵەکان پێیان نەما؟ فەرمووی (اللهم استر عوراتنا وامن روعاتنا) خوای گەروەش دای بە ڕووی دوژمنانیدا، ئیبن ئەبی حاتەم هێناویەتی.

ئیمامی ئەحمەد لە جابرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر (ﷺ) دەچوویە مزگەوتی (الاحزاب)و عەباکەی داناو دەستەکانی بەرزکردەوە بۆ نزاو نوێژی نەدەکرد، پاشان

---

[1] – حسن.

[2] –لە جمع الفوائد ج٢ ص٣٨ دا واهاتووە، بەیهەقی ج٩ ص٥٧ بەو جۆرە هێناویەتی، ئیبن سەعد ج٢ ص١٣ بە هەمان شێوە هێناویەتی.

[3] –لە البداية والنهاية ج٣ ص٢٧٦ دا بەو جۆرە هاتووە، تەبەرانیش هەروا هێناویەتی، هەیسەمی ج٦ ص٨٢ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە جێ متمانەن بەڵام ئەبوعوبەیدوڵلا لە باوکیەوە نەیبیستووە.

[4] – صحيح.

[5] – موسلیم هێناویەتی، لە البداية والنهاية ج٤ ص٢٨ یشدا واهاتووە.

هات و نزای لێ کردن و نوێژی کرد، له صهحیحی بوخاری و موسلمیشدا له عهبدوڵڵای کوڕی ئهبی ئهوفا (رضي الله عنه) هاتووه دهڵێت: پێغهمبهر (ﷺ) نزای له ئهحزاب کرد و فهرمووی (اللهم منزل الكتاب سريع الحساب اهزم الاحزاب اللهم هزمهم و زلزلهم) له گێڕانهوهیهکی تردا (للهم اهزمهم وانصرهم وانصرنا عليهم) بوخاریش له ئهبی هورهیرهوه (رضي الله عنه) هێناویهتی پێغهمبهر (ﷺ) دهیفهرموو (لا اله الا الله وحده، اعز جنده، ونصر عبده، وغلب الاحزاب وحده، فلا شئ بعده).[1]

## (نزای کاتی جیهاد)

بهیههقی له عهلیهوه (رضي الله عنه) هێناویهتی دهڵێت: له ڕۆژی بهدردا جۆره شهڕێکم کرد خێراهاتن تا بزانم پێغهمبهر (ﷺ) چی دهکات، هاتم سهیر دهکهم سوجدهی بردووه و دهفهرموێت (يا حي يا قيوم يا حي يا قيوم) لهوه زیاتر هیچی نهدهوت، گهڕامهوه بۆ شهڕهکه و دواتر هاتمهوه دهبینم ههروا لهو بارهدایه، چوومهوه بۆ شهڕهکه و دووباره هاتمهوه ههمان شتی دهوتهوه تا خوای گهوره له سهردهستی ئهو فهتحی پێ بهخشین.[2]

## (نزای کاتی شهو)

ئیبن مهردهویه و سهعیدی کوڕی مهنسور له عهلیهوه (رضي الله عنه) هێناویانه دهڵێت: پێغهمبهر (ﷺ) شهوی بهدر نوێژی دهکرد و دهیفهرموو (اللهم ان تهلك هذه العصابة لا تعبد) ئهو شهوه باران باری، ئهبویهعلا و ئیبن حیببان واهێناویانه، دهڵێت: بهیانی پێغهمبهر (ﷺ) له بهدر ڕۆژی کردهوه ئهو شهوه ههمووی بێداربوو، له کاتێکدا له سهفهردا بوو.[3]

---

[1] – له البداية والنهاية ج٤ ص١١١ دا واهاتووه.

[2] – نهسائیش هێناویهتی، له البداية والنهاية ج١ ص٢٧٥ یشدا واهاتووه.

[3] – له كنز العمال ج٥ ص٢٦٧ دا واهاتووه.

# (نزاى دواى ليبوونه‌وه)

ئيمامى ئه‌حمه‌د له رفاعه‌ى زورقيه‌وه (رضي الله عنه) هێناويه‌تى ده‌ڵێت: له ڕۆژى ئوحوددا كه بێباوه‌ڕان گه‌ڕانه‌وه پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) فه‌رمووى (ڕيزبن و ڕێك بوه‌ستن تا ستايشى په‌روه‌ردگارم بكه‌م) ئه‌وانيش له پشتيه‌وه چه‌ند ريزێك وه‌ستان، پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) فه‌رمووى (اللهم لك الحمد كله، اللهم لاقابض لما بسطت، ولاباسط لما قبضت، ولاهادي لمن اضللت، ولامضل لمن هديت، ولامعطي لما منعت، ولامانع لما اعطيت، ولا مقرب لما باعدت، ولا مبعد لما قربت، اللهم ابسط علينا من بركاتك ورحمتك وفضلك ورزقك، اللهم اني اسالك النعيم المقيم الذي لايحول ولايزول، اللهم اني اسالك النعيم يوم العلية والامن يوم الخوف، اللهم اني عائذ بك من شر ما اعطيتنا وشر ما منعتنا، اللهم حبب الينا الايمان وزينه في قلوبنا، وكره الينا الكفر والفسوق والعصيان وجعلنا من الراشدين، اللهم توفنا مسلمين و احين مسلمين و الحقنا بالصالحين غير خزايا ولا مفتونين، اللهم قاتل الكفرة الذين يكذبون رسالتك، ويصدون عن سبيلك، واجعل عليهم رجزك وعذابك، اللهم قاتل الكفرة الذين اوتوا الكتاب اله الحق)[1] ، پێشتريش نزاى پێغه‌مبه‌رمان (صلى الله عليه وسلم) له دواى لێبوونه‌وه له خستنه‌ڕووى بانگه‌واز بۆ خه‌ڵكى هێنا.

---

[1] -نه‌سائى هێناويه‌تى، له البداية والنهاية ج٤ ص٣٨ يشدا هاتووه، بوخاريش له (الادب) دا و ته‌به‌رانى و به‌غه‌وى و بارودى و ئه‌بونه‌عيم له الحليه و حاكم و به‌يهه‌قى هێناويانه، زه‌هه‌بى ده‌ڵێت: فه‌رمووده‌كه له‌گه‌ڵ پاكى سه‌نه‌ده‌كه‌يدا مونكه‌ره، ده‌ترسم هه‌ڵبه‌ستراوبێت، له كنز العمال ج٥ ص٢٧٦ دا واهاتووه، هه‌يسه‌مى ج٦ ص١٢٢ پاش هێنانى فه‌رمووده‌كه ده‌ڵێت: ئيمامى ئه‌حمه‌د و به‌زار هێناويانه و كه‌سه‌كانى سه‌نه‌ده‌كه‌ى ئه‌حمه‌د كه‌سانى صه‌حيحن، ته‌واو

# (گرنگیدان بە فێرکاری لە کاتی جیهادی ڕێی خوادا)

بەیهەقی ج٩ ص٤٧ لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی دەڵێت: خوای گەورە دەفەرموێت (خذوا حذركم فانفروا ثبات او انفروا جميعا) هەروەها دەفەرموێت (انفروا خفافا وثقالا) هەروەها دەفەرموێت (الا تنفروا يعذبكم عذابا) دواتر ئەم ئایەتانە نەسخ بوونەوە بەم ئایەتە (وكان المؤنين لينفروا كافة) دەڵێت: دەستەیەك لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) غەزابکەن و دەستەیەکیش بمێننەوە، ئەوانەی لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) ئەوانەن شارەزای ئایینن، ئەوان کەس و هۆزی خۆیان لە کاتی غەزادا بێدار دەکردەوە بەڵکو ئاگاداری فەرزو سنوورو حەددەکانی ناو قورئان بن.[1]

ئادەمی کوڕی ئەبی ئیاس لە ئەحوەصی کوڕی حەکیمی کوڕی عومەیری عەبەسیەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) نامەی نووسی بۆ سەرکردە سەربازیەکان: شارەزای ئایین بن و خەڵك فێرکەن، چونکە هەرکەس حەقی ناسی و کەوتە شوێنی ناحەق یان زانی شتێك ناحەقە و وازی لەحەق هێنا پۆزش و بیانووی بۆ نیە.[2]

عەبدولڕەزاق لە خەتتانی کوڕی عەبدوڵلای قاشیەوە هێناویەتی دەڵێت: لە سوپایەکی سەر کەناراوی دیجلەدا لەگەڵ ئەبوموسای ئەشعەریدا (رضي الله عنه) کە کاتی نوێژ هات و بانگی نیوەڕۆ دراو خەڵك دەست نوێژیان گرت و ئەبوموسا نوێژی بۆ کردن و دوایی بازنەیان بەست، لە کاتی نوێژی عەسردا خەڵکەکە هەستان بۆ دەست نوێژ ئەویش بە بانگ بێژەکەی وت: بڵێ تەنها ئەوەی دەست نوێژی شکاوە دەست نوێژگرتنەوەی لەسەرە، وتی: خەریکە زانست دەڕوات و نەفامی و نەزانی دێت تا ئەوەی کەس هەیە بە نەزانی بە شمشێر دەدات لە دایکی خۆی.[3]

---

[1] – ضعيف.

[2] – لە كنز العمال ج٥ ص٢٢٨ دا واهاتووە.

[3] –لە كنز العمال ج٥ ص١١٤ دا واهاتووە، تەحاوی لە شرح المعاني الاثار ج١ ص٢٧ دا بە کورتی هێناویەتی.

# (بەخشین لە پێناو جیهادی ڕێی خوادا)

موسلیم ج٢ ص٣٧ لە ئەبومەسعودی ئەنساریەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کابرایەك وشترێکی هەوسارکراوی هێناو وتی: ئەمە لە پێناو خوادا، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (لك بها يوم القيامة سبعمائة ناقة كلها مخطومة) ( بەرامبەر بەوە لە ڕۆژی دواییدا حەوت سەد وشترت دەبێت کە هەموویان مەختوومەن).[1]

ئیمامی ئەحمەد – کەسەکانی سەنەدەکەشی صەحیحن– لە عەبدوڵڵای کوڕی صامتەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ ئەبوزەردا(رضي الله عنه) بووم بەخششەکەی دەرکردو کەنیزەکێکی خۆیشی لەگەڵدابوو، ئەو کەنیزەکە ئیشەکانی ئەوی ڕاپەڕاند، وتم: ئەو کەنیزەکە بهێڵەرەوە تا پارمەتیت بدات یان میوانداریت بۆ بکات، وتی: خۆشەویستم ڕایسپاردم هەرچی زێڕ یان زیو هەیە و کۆکراوەتەوە دەبێتە پشکۆ بۆ خاوەنەکەی تا لە پێناو خوادا بیبەخشێت، ئەحمەدو تەبەرانیش – دەقەکەش هی ئەمە– هێناویانە (من اوكى على ذهب او فضة ولم ينفقه في سبيل الله كان جمرا يوم القيامة يكوى به)[2].[3]

تەبەرانی لە معجم الوسيط لە قەیسی کوڕی سلعی ئەنساریەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی براکانی سکاڵایان بردە لای پێغەمبەر (ﷺ) لەسەری و وتیان ئەو پارەکەی بەخەرج دەدات و دەستی زۆر کراوەیە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا من بەشە خورمای خۆم هەڵدەگرم و ئەوی تری دەبەخشم لە ڕێی خوادا، پێغەمبەر (ﷺ) دای بەسەر سنگیداو فەرمووی (ببەخشە خوا پێت دەبەخشێت) سێ جار ئەمەی فەرموو، دوای ئەوە لە پێناو خوادا دەرچووم و وڵاخێکم پێبوو من ئەو ڕۆژ لە کەس و کارم ل هەموویان زیاترم هەبوو و بارم باشتربوو[4].[5]

---

[1] – نەسائی هێناویەتی، لە جمع الفوائد ج٢ ص٣ ی). شدا هاتووە.

[2] – صحیح.

[3] – لە الترغیب ج٢ ص١٧٨ دا واهاتووە.

[4] – ضعیف.

[5] – لە الترغیب ج٢ ص١٧٣ دا واهاتووەو ئیبن مندەش هێناویەتی، لە بوخاریشەوە لەو ڕووەوە بە کورتی هاتووە، لە الاصابة ج٣ ص٢٥٠ یشدا هاتووە.

تەبەرانی لە موعازی کوڕی جەبەلەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (طوبى لمن اكثر في الجهاد في سبيل الله من ذكر الله تعالى، فان له بكل كلمة سبيعين الف حسنة، كل حستة منها عشرة اضعاف مع الذي له عند الله من المزيد) واتە(سەربەرزی بۆ کەسێك لە جیهادی ڕێی خوادا زۆر زیکری خوا دەکات، هەر وشەیەکی حەفتا هەزار خێری بۆ دەنووسرێت، هەر چاکەیەکی دە بەرامبەرە سەرەڕای ئەو زیادەی لەلای پەروەردگاری بۆی هەیە) وترا ئەی پێغەمبەری خوا ئەی ببەخشین؟ فەرمووی (النفقة على قدر ذالك) واتە(بەخشینیش هەروا) عەبدولڕەحمان دەڵێت: بە موعازم وت: بەخشینیش حەوت سەد بەرامبەرە، موعاز وتی: چاك تێمەگەیشتوویت، ئەمە کاتێك کە لە ماڵەوە بەبێ جیهاد دانیشتبن و ئەوە ببەخشن، ئەگەر لە غەزادا بیبەخشن خوای گەورە لە خەزێنەی ڕەحمەتیدا هێندەی بەسەردا دادەڕێژێت کە لە زانست و سیفەتی بەندەکاندا جێی نابێتەوە، ئەوانە حیزبی خوان، حیزبی خواش سەردەکەوێت[1][2].

لە جمع الفوائد ج٢ص٣ لە حەسەنی کوڕی عەلی و ئەبوو دەرداو ئەبوو هورەیرەو ئەبوو ئوسامەو ئیبن عەمری کوڕی عاص و جابرو عمرانی کوڕی حوصەینەوە هاتووە(من أرسل بنفقة في سبيل الله و اقام في بيته فله بكل درهم سبعمائة درهم، ومن غزا بنفسه في سبيل الله و أنفق في وجهه ذلك فله بكل درهم سبعمائة ألف درهم) پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە(والله يضاعف لمن يشاء).

پێشتر باسی بەخشینی ئەبووبەکرو عومەرو عوسمان و تەلحەو عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف و عەبباس و سەعدی کوڕی عوبادەو موحەممەدی کوڕی مەسلەمەو عاصمی کوڕی عەددیمان کرد لە کاتی هاندانی پێغەمبەر لە سەر جیهادو بەخشینی سامان.

---

[1] – ضعیف.

[2] – هەیسەمی ج٥ ص٢٨٢ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا کەسێك هەیە کە ناوی نەهاتووە، تەواو.

# نیازپاکی لە جیهادی ڕێی خوای گەورەدا

ئەبوو داوودو ئیبن جببان لە صەحیحەکەیداو حاکم بە کورتی و بە صەحیحی لە ئەبوو هورەیرەوە هێناویانە کابرایەك وتی ئەی پێغەمبەری خوا کەسێك دەیەوێت بچێت بۆ جیهادو شتێکی دنیایی مەبەستە، پێغەمبەر فەرمووی( لا اجر لە) (هیچ پاداشتێکی بۆ نیە)، ئەمە لای خەڵك سەخت بوو، وتیان بڕۆرەوە بۆ لای پێغەمبەر بەڵکو تێتبگەیەنێت، کابرا وتی ئەی پێغەمبەری خوا کەسێك دەچێت بۆ جیهادی ڕێی خواو هیوای وایە شتێکی دنیایی دەست بکەوێت، فەرمووی( لا اجر لە) ئەمە لای خەڵك سەخت بووو وتیان بڕۆرەوە بۆ لای، جاری سێیەمیش هەر وابوو، لە الترغیب و الترهیب ج٢ص٤١٩داواهاتووە.

ئەبوو داوودو نەسائی لە ئەبوو مووساوە هێناویانە دەڵێت: کەسێك هات بۆ لای پێغەمبەر وتی: ئەریٚ چی دەفەرموویت سەبارەت بە کەسێك کە چاوەڕێی پاداشتو ناوبانگیش بێت؟ فەرمووی(لا شيء لە) (هیچی بۆ نیە) سیٚ جار هەمان پرسیارو هەمان وەڵام هەبوو، پاشان فەرمووی( إن الله لا يقبل من العمل إلا ما كان خالصاً و ابتغي به وجهه)(خوا هیچ کارێکی ناوێت مەگەر تەنها لەپێناو خۆیدا نیازپاکانە بکرێت) لە الترغیب و الترهیب ج٢ص٤٢١دا واهاتووە.

ئیبن ئیسحاق لە عاصمی کوڕی عومەری کوڕی قەتادەوە هێناویەتی کابرایەکمان لەناودا بوو پێی دەوترا قەزمان، پێغەمبەر کە ناوی دەبیست دەیفەرموو( إنه لمن أهل النار) ( ئەو دۆزەخیە)، لە ڕۆژی ئوحوددا شەڕێکی سەختی کردو خۆی بە تەنها هەشت یان حەوت بێباوەڕی کوشت، ئینجا بریندار بوو،برا بۆ ماڵی بەنی زوفەر، هەندیٚ لە موسڵمانان پێیان دەوت: سوێند بەخوا ئەی قەزمان ئەمڕۆ چاکت نواند موژدەت لێبێت، ئەویش وتی: موژدەی چی، بەخوا بەس لەبەر هۆزەکەم ئەمەم کرد، ئەگەر ئەوە نەبوایە شەڕم نەدەکرد، کاتێك ئازارەکەی زیادی کرد تیرێکی دەرهێناو خۆی پیٚ کوشتەوە، لە البدایە والنهایە ج٤ص٣٦دا واهاتووە.

ئیبن یسحاق لە ئەبی هورەیرەوە هێناویەتی دەیوت: باسی کەسێکم بۆ بکەن هەرگیز نوێژی نەکردبێت چووبێتە بەهەشتەوە، ئەگەر خەڵکی نەیانزانییایە دەیانوت کێیە؟ دەیوت: ئوصەیرم بوو لە بەنی ئەشهەل عەمری کوڕی سابتی کوڕی وەقش، حوصەین دەڵێت: بە موحەمەدی کوڕی ئەسەدم وت: باری ئوصەیر چۆن بوو؟ وتی: ڕێی ئیسلامی لە هۆزەکەی دەگرت، بەڵام لە ئوحوددا موسڵمان بوو و شمشێرەکەی هەڵگرت و چوویە ناو خەڵکەکەو شەڕی کرد تا بریندار بوو، هەندێ لە بەنی ئەشهەل لە شەڕەکەدا بۆ کوژراوەکانیان دەگەڕان تا ئوصەیریان بینی، وتیان: بۆ چی هاتووە؟ خۆ ئێمە بەجێمان هێشتبوو و ئەویش ڕقی لەم پەیامە بوو، وتیان: ئەی عەمر بۆچی هاتیت؟ لەبەر هۆزەکەت یان لەبەر ئیسلام؟ وتی: بەڵکو لەبەر ئیسلام، باوەڕم بە پەروردگارو پێغەمبەرەکەی هێنا و شمشێرەکەم هەڵگرت و هاتم تا بریندار بووم، لە بەردەستیاندا گیانی سپارد، ئەوانیش ئەوەیان باسکرد بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەویش فەرمووی (انه من اهل الجنة) واتە(بەهەشتیە)[1,2].

ئەبوداود و حاکم لەلایەکی ترەوە لە ئەبوهورەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویانە کە عەکرەمەی کوڕی ئوقەیش لەناو نەفامیدا سوویەکی هەبوو، حەزی دەکرد موسڵمان نەبێت تا وەریبگرێتەوە، لە ڕۆژی ئوحوددا وتی: کوان ئامۆزاکانم؟ وتیان لە ئوحودن، وتی: لە ئوحود! یەکسەر جلوبەرگی شەڕی پۆشی و سواری ئەسپەکەی بوو و چوو بەرەو ئەوێ، کە موسڵمانان بینییان وتیان عەمر هاتیت (بەخێر بێیت) وتی: باوەڕم هێنا، شەڕی کرد تا بریندار بوو، بە برینداری برایەوە بۆماڵەوە، موعاز (رضي الله عنه) هات بۆلای و

---

[1] – ضعیف.

[2] –لە البدایة والنهایة ج٤ ص٣٧ دا واهاتووە، لە الاصابة ج٢ ص٢٦ دا دەڵێت: سەنەدەکەی حەسەنە، کۆمەڵێك لە ڕێگەی ئیبن ئیسحاقەوە هێناویانە، تەواو. ئەبونەعیمیش لە (المعرفة) دا بەو جۆرە هێناویەتی، لە کنز العمال ج٧ ص٨ دا هاتووەو ئیمامی ئەحمەدیش هەروا هێناویەتی، لە المجمع ج٩ ص٣٦٢ یشدا هاتووەو دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی جێ متمانەن.

بە براکەی وت: پرسیاری لیٚ بکە لەبەر هۆزەکەی یان لە پیٚناو خواو پیٚغەمبەرەکەیدا هاتووە؟، وتی: لە پیٚناو خواو پیٚغەمبەرەکەیدا هاتم، مردو چوویە بەهەشتو یەك ڕکات نویٚژیشی نەکردبوو،[1] بەیهەقی لە شدادی کوڕی هادەوە هیٚناویەتی کابرایەکی دەشتەکی هات بۆلای پیٚغەمبەر (ﷺ) و موسڵمان بوو و وتی: لەگەڵت کۆچ دەکەم، هەندیٚ لە هاوەڵەکانی خۆی ڕاسپارد تا لەگەڵی بن، لە غەزای خەیبەردا پیٚغەمبەر (ﷺ) دەستکەوتەکانی دابەش کردو بەشی ئەویشی دا، پیٚغەمبەر (ﷺ) بەشەکەی دا بەهاوەڵەکانی، ئەو وڵاخەکانی ئەوانی دەلەوەڕاند، کە هات هاوەڵەکان بەشەکەیان پیٚدا، وتی: ئەمە چیە؟ وتیان: بەشیٚکە پیٚغەمبەر (ﷺ) بۆی بڕیویتەوە، وتی: من لەسەر ئەمە شویٚنت نەکەوتووم، بەڵکو بۆیە شویٚنت کەوتم تا تیریٚك بەر ئیٚرەم بکەویٚت، ئامارەی بە قورگی کرد تا تیریٚك لیٚی بداتو بمرمو بچمە بەهەشت، پیٚغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ان تصدق الله يصدقك) واتە(ئەگەر لەگەڵ خوا ڕاست بکەیت خوا بۆت دیٚنیٚتەدی) پاشان چوو بۆ شەڕی دوژمن، هیٚنرا بۆلای پیٚغەمبەر (ﷺ) و تیریٚك درابوو لەو شویٚنەی کە خۆی وتی، پیٚغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (هو هو؟) واتە(ئەمە خۆیەتی، ئەمە خۆیەتی؟) وتیان: بەڵیٚ، فەرمووی (صدق الله فاصدقه) ئینجا لە جبەکەی پیٚغەمبەردا (ﷺ) کفنی کردو دواتر نویٚژی لەسەر کرد، لە نویٚژەکەیدا ئەمەی دەفەرموو (اللهم هذا عبدك خرج مهاجرا في سبيلك، قتل شهيدا وانا عليه شهيد) (خوایە ئەمە بەندەکەتە لەپیٚناو تۆدا کۆچی کردو بە شەهیدی کوژراو منیش شایەتم لەسەری)[2].[3]

---

[1]- لە الاصابة ج٢ ص٥٢٦ دا دەڵیٚت: سەنەدەکەی حەسەنە، بەیهەقی ج٩ ص١٦٧ بەو دەقە هیٚناویەتی

[2]- صحيح.

[3]- نەسائیش بە هەمان شیٚوە هیٚناویەتی، هەروەها لە البدايە والنهايە ج٤ ص١٩١ دا هاتووە، حاکم ج٣ ص٥٩٥ بە هەمان شیٚوە هیٚناویەتی.

بەیهەقی لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پیاوێك هات بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من کەسێکی ڕەش پێستی دەموچاو ناشیرین و بێزراوم، هیچ پارەو سامانم نیە، ئەگەر لەگەڵ ئەمانە بجەنگم تا دەکوژرێم دەچمە بەهەشتەوە؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەویش چوو جەنگا تا کوژرا، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هاتە سەر تەرمەکەی و فەرمووی (لقد حسن الله وجهك وطيب ريحك وكثر مالك) واتە(خوا ڕوخساری جوان و بۆنی خۆش و پارەی زۆر کردیت) فەرمووی (لقد رايت زوجتيه من الحور العين يتنازعان جبته عليه يدخلان فيما بين بلده وجبته) لە البداية والنهاية ج٤ ص١٩١ دا واهاتووە، حاکم بەو جۆرە هێناویەتی و دەڵێت لەسەر مەرجی موسلیم صەحیحە، لە الترغيب ج٢ ص٤٤٧ دا هاتووە.

ئیمامی ئەحمەد بە سەنەدی حەسەن لە عەمری کوڕی عاصەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناردی بە شوێنمداو فەرمووی جل و بەرگ و چەکەکەت هەڵبگرە و دواتر وەرە بۆلام، منیش چووم بۆلای، فەرمووی (اني اريد ان ابعثكعلى جيش فيسلمك الله ويغنمك، وارغب لك من المال رغبته صالحة) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا من لە پێناو پارەو ساماندا موسڵمان نەبووم، بەڵکو حەزی ئیسلامم هەبوو، فەرمووی (ئەی عەمر پارەی چاك و پاك باشە)[1][2].

تەبەرانی لە معجم الوسيط ومعجم الكبيردا هێناویەتی و تیایدا دەڵێت: من بە حەزم بۆ ئیسلام موسڵمان بووم تا لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)بم، فەرمووی (نعم، نعما المال الصالح للمرء الصالح).[3]

حارث لەئەبولبوختەری تائیەوە هێناویەتی دەڵێت: خەڵکانێکی ناو کوفە لەگەڵ ئەبولموختار واتە باوکی موختاری کوڕی ئەبوعوبەیدا بوون، هەموو کوژران جگە لە

---

[1] - حسن.

[2] - لە الاصابة ج٣ ص٣ دا واهاتووە.

[3] - لە المجمع ج٩ ص٣٥٣ دا هێناویەتی و دەڵێت: کەسەکانی سەنەدی ئەحمەد و ئەبویەعلا صەحیحن.

دوانیان کە بە شمشێر هەڵیانکوتایە سەر دوژمن و ڕزگارشیان بوو، پاشان سێ کەس بوون، هاتن بۆ مەدینە، عومەر (رضي الله عنه) چوویە دەرێ و ئەوانیش دانیشتبوون و باسیان دەکرد، عومەر وتی: چۆن باستان کردن، وتیان: داوای لێخۆشبوون و نزامان بۆ کردن، وتی: بە خوا دەبێت بڵێن چیتان لەبارەوە وتون یان توندیم لێ بەدی دەکەن، وتیان: پێمان وتن ئەوانە شەهیدن، وتی: سوێند بەوەی هیچ پەرستراوێك نیە جگە لەو و موحەممەدی بە حەق ناردووە ڕۆژی دوایی بە مۆڵەتی ئەو نەبێت نایەت، هیچ زیندوویەك نازانێت خوا چی بۆ کەسی مردوو داناوە جگە لە پێغەمبەری خوا، چونکە خوا لە ڕابردوو و داهاتووی خۆش بووە، هەمان سوێندی خواردەوەو وتی: هەیە لەبەر ڕووپامایی شەڕدەکات، هەیە لەبەر گوڕو تینی هۆزایەتی و نەتەوەیی، هەیە لەبەر دونیا، هەیە لەبەر سامان، ئەوانەی لەبەرخوا دەجەنگن تەنها خۆیان دەزانن[1،2].

تەمامی کوڕی مالیکی موئەوسی حەدسان(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە نێوان خۆماندا باسی سریەیەکمان دەکرد لە پێناو خوادا لە سەردەمی عومەردا (رضي الله عنه)بەرکەوتبوون، یەکێکمان وتی: ئیشکەرانی خوا لە پێناو خوادا، پاداشتیان لای خوایە، یەکێکیان دەیوت: خوا لەسەر باری مردنیان زیندوویان دەکاتەوە، عومەر وتی: بەڵێ سوێند بەو کەسەی گیانمی بەدەستە خوا لەسەر باری مردنیان زیندویان دەکاتەوە، هەیە لەبەر ڕووپامایی و ناوبانگ دەکوژرێت، هەیە لەبەر نیازی دونیا، هەیە چارەیەکی دی بەدی ناکات، هەیە خۆگرانە چاوەڕێی پاداشتی خوایە، ئەم جۆرەیان شەهیدن، لەگەڵ ئەوەی نازانم چی بە من و ئێوەش دەکرێت، بەڵام دەزانم خاوەنی ئەو گۆڕە (پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)) خوای گەورە لە تاوانی ڕابردووی خۆش بووە.

ئیبن ئەبی شەیبە لە موسروقەوە هێناویەتی دەڵێت: باسی شەهیدان لای عومەری کوڕی خەتتاب کرا، عومەر وتی: چوزانن شەهیدن؟ وتیان: ئەی ئەمیری باوەڕداران

---

[1] – ضعیف.

[2] – لە کنز العمال ج٢ ص٢٩٢ دا واهاتووە، ئیبن حەجەر دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی جێ متمانەن، بەڵام سەنەدەکە مونقەتیعە، تەواو.

لەو غەزایانەدا کوژران، ئەوکات وتی: دەی وابیٚ شەهیدەکانتان زۆرن، من باسی ئەوەتان بۆ دەکەم دلێری و ترس سروشتی ناو خەڵکەو خوا لە کوێدا بیەوێت دایاندەنیشێنێت، دلێر شەڕدەکات و گوێی لیٚ نیە نەچێتەوەلای کەسوکاری، ترسنۆکیش لە ژنەکەشی ڕادەکات (لە هەموو کەس دەترسێت و بەس ماڵ و منالی خۆی دەوێت) بەڵام شەهید کەسێکە چاوەڕێی پاداشت بێت، کۆچەر کەسێکە واز لەوەبێنێت کە خوا دوورەپەرێزی لیٚ کردووە، موسڵمان کەسێکە لە دەمودەستی پارێزراوبن.[1]

نەعیمی کوڕی حەماد لە ضمامەوە هێناویەتی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر هەواڵی بۆ دایکی نارد کە خەڵکی وازیان لیٚ هێناوم و ئەو دوژمنانەشم بانگم دەکەن تا پەنام بدەن، دایکی وتی: ئەگەر لە پێناو زیندووکردنەوەی قورئان و سوننەتی پێغەمبەردا هەستاویت لەسەر حەق بمرە، ئەگەریش بۆ دونیاخوازی واتکردووە مان و نەمانت خێری تێدانیە.[2]

[1] - لە کنز العمال ج٢ ص٢٩٢ دا واهاتووە.

[2] - لە کنزالعمال ج٧ ص٥٧ دا واهاتووە.

## (گوێڕایەڵی فەرمانی ئەمیر لە جیهادی ڕێی خوادا)

ئیبن عەساکیر لە ئەبی مالیکی ئەشعەریەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە سریەیەکدا ناردینی و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (رضي الله عنه)ی کرد بە ئەمیرمان، چووین تا لە شوێنێك دابەزین، یەکێك هەستا و وڵاخەکەی هەستاندەوە، وتم: بۆ کوێ دەچیت؟ وتی: بۆ ئالف، وتم: پرسیار لە ئەمیرمان بکە ئینجا، چووین بۆلای ئەبو موسای ئەشعەری و بۆمان باسکرد چی بووە، وتی: پێ دەچێت بتەوێت بگەڕێیتەوە ناو ژن و منداڵت، وتی: نا، وتی: دەی بابیری لێ بکەمەوە، وتی: نا، وتی: دەی بە وریاییەوە بڕۆ، چوو و دەمێکی پێ چوو و دواتر هاتەوە، ئەبوموسا وتی: پێدەچێت بۆلای ژن و منداڵت چووبیت؟ وتی: نا، وتی: دەی بابیری لێ بکەمەوە، وتی: باش، ئەبوموسا وتی: تۆ بەناو ئاگردا چوویت بۆلای کەس و کارت و لەناو ئاگردا دانیشتیت و لە ئاگریشەوە هاتیتەوە، ئینجا لایکردەوە.[1]

## (دانەپاڵ یەکدی لە کاتی جیهادی ڕێی خوادا)

ئەبوداود و نەسائی لە ئەبی ئەعلەبەی خەشەنیەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: خەڵکەکە دادەبەزین بەناو دەشت و دۆڵەکاندا بڵاوەیان دەکرد، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (ان تفرقكم في الشعاب والاودية انما ذلكم من الشطان) (ئەو بڵاوە لێ کردنەتان بە دۆڵ و دەشتا لە شەیتانەوەیە) دوای ئەوە لە هەر شوێنێك دادەبەزین دەیدایە پاڵ یەکدی)[2]،[3] بەیهەقیش ج٩ ص١٥٢ لە سەهلی کوڕی مەعازی جوهەنی لە

---

[1] – لە کنز العمال ج٣ ص١٦٩ دا واهاتووە.

[2] – صحیح.

[3] – لە الترغیب ج٥ ص٤٠ دا واهاتووە، بەیهەقی ج٩ ص١٥٢ بەو جۆرە هێناویەتی، ئەوەشی بۆ زیاد دەکات تا دەوترا ئەگەر شتێکت فڕێ بدایە بەسەریاندا هەموویانی کۆدەکردەوە، ئیبن عەساکیریش واهێناویەتی، لە کنز العمال ج٣ ص٣٤١ یشدا واهاتووە،

باوكیەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ)دا لە غەزای فلان و فلاندا بەشدار بووم، خەڵكی باریان سەخت كرد و ڕێگەكەیان بڕی، هاواركەرێكی پێغەمبەر (ﷺ) هاواری كرد (ان من ضیق منزلا او قطع طریقا فلا جهاد لە)(هەركەس شوێنێ بەرتەنگ بكات یان ڕێیەك ببڕێت هیچ جیهادی بۆ نیە)[1][2].

## (پاسەوانی لە پێناو خوای گەورەدا)

ئەبوداود لە سەهلی كوڕی حەنظەلیەوە (ﷺ) هێناویەتی لە ڕۆژی حونەیندا لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ)دا چووین و زۆر چووین تا دەمەو ئێوارە، كاتی نوێژ هات، سوارێك هات و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) من لەگەڵتان هاتم تا چوومە شاخی ئەویٚ و ئەویٚ، هەوەزانم بینی ورد و بچوكیان بە ژن و ئافرەت و ئاژەڵ و مەڕ و بەرخیانەوە كۆبوونەتەوە بۆ حونەین، پێغەمبەر (ﷺ) پێكەنی و فەرمووی (تلك غنیمة المسلمین غدا ان شء الله) واتە(پشت بەخوا ئەوە سبەینێ دەبێتە دەستكەوتی موسڵمانان)، فەرمووی (ئەمشەو كێ پاسەوانیمان دەكات؟) ئەنەسی كوڕی مەرسەدی غەنەوی وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی دەی سواربە، ئەویش سواری ئەسپەكەی بوو و هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو (استقبل هذا الشعب حتی تكون فی اعلاه ولا نغرز من قبلك اللیلة) بۆ بەیانی پێغەمبەر (ﷺ) چوو بۆ شوێنی نوێژەكەی و دووڕكات نوێژی كرد و دواتر فەرمووی (هل احستم فارسلكم؟) وتیان: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) هیچ هەستمان پێ نەكرد، ئینجا نوێژی كرد، پێغەمبەر (ﷺ) هەركە نوێژی تەواو دەكرد و سەلامی دەدایەوە سەیری دۆڵەكەی دەكرد و دەیفەرموو (ابشروا فقد جاءكم فارسكم) ئێمەش سەیری ژێر درەختێكمان دەكرد لە دۆڵەكەدا سەیرمان كرد سوارەكە هات و لە بەردەم پێغەمبەر (ﷺ)دا ڕاوەستا و

---

[1] – صحیح.

[2] – ئەبوداودیش بەو جۆرە هێناویەتی، لە المشكاة ٣٣٢ یشدا هاتووە.

سەلامی کرد و وتی: من چووم بەناو دۆڵەکەدا تا چوومە سەری سەر، لەوێ دوو دۆڵم بینی و لە هیچ کامیاندا کەسم نەدی، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو (هل نزلت الليلة ؟) واتە(شەو دابەزیت؟) وتی: نا مەگەر بۆ نوێژ یان دەستی پێویستی، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (فقد اوجبت فلا عليك ان لا تعمل بعدها)( بەجێتگەیاند دوای ئەمە هیچت پێویست نیە بیکەیت)[1].[2]

تەبەرانی لە ئیبن عەتیەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر (ﷺ) دانیشت و باسکرا کەسێك مردووە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (هل راه احد منكم على عمل من اعمال الخير؟) کەستان چاکتان لێ بینیوە؟ کەسێك وتی: بەڵێ من شەوێك لەگەڵیدا لەپێناو خوادا پاسەوانیم کردووە، پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ هاوەڵەکانیدا هەستا و نوێژی لەسەر کرد، کاتێك خرایە ناو گۆڕەکە پێغەمبەر (ﷺ) بە دەستەکانی خۆی خۆڵی کرد بە سەریدا و دواتر فەرمووی (ان اصحابك يظنون انك من اهل النار و انا اشهد انك من اهل الجنة) واتە(هاوەڵانت وادەزانن تۆ دۆزەخیت، منیش شایەتی دەدەم تۆ بەهەشتیت) پاشان پێغەمبەر (ﷺ) بە عومەری کوڕی خەتتابی (رضي الله عنه) فەرموو: (لا تسال عن اعمال ولكن عن الفطرة)(پرسیار لەسەر کردار مەکە بەڵکو لەسەر فیترەت)[3].[4]

ئیبن عەساکیر لە ئەبی عەتیەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی لە سەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) کەسێك مرد، هەندێ لە موسڵمانان وتیان ئەی پێغەمبەری خوا نوێژی لەسەر مەکە، فەرمووی (هل راه؟) ئینجا فەرموودەکە دێنێت،[5]

---

[1] – صحيح.

[2] – بەیهەقیش بەوجۆرە ج٩ ص١٤٩ هێناویەتی و ئەبو نەعیمیش لە سەهلی کوڕی حەنزەلیەوە بەوجۆرە هێناویەتی، هەروەك لە المنتخب ج٥ ص١٤٣یشدا هاتووە.

[3] – ضعيف.

[4] – هەیسەمی ج٥ ص٢٨٨ دەڵێت: ئیبراهیمی کوڕی موحەممەدی کوڕی عرقی حمصی مامۆستای تەبەرانی زەهەبی بە لاوازی دادەنێت.

[5] – لە كنز العمال ج٢ ص٢٩١ یشدا هاتووە،

بەیهەقی لە (شعب الایمان) لە ئەبی عززەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) لەکەڵ تەرمی کەسێکدا چوو، کاتێك دانرا عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا نوێژی لەسەر مەکە چونکە کەسێکی خراپ بوو، پێغەمبەر (ﷺ) سەیری خەڵکەکەی کردو فەرمووی (هل راه؟) (ئایا بینی؟)ئینجا فەرموودەکە دێنێت،[1] پێشتریش فەرموودەکەی ئەبورەیحانە (رضي الله عنه) هاتووە، تیایدا دەڵێت: (من یحرسنا اللیلة فادعو له بدعاء یصیب فضله؟) (کێ ئەمشەو پاسەوانیمان دەکات تا نزایەکی بۆ بکەم کە خێرەکەی ببینێت؟)یەکێك لە پشتیوانان هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من، فەرمووی: تۆ کێیت؟ وتی: فڵان کەس، فەرمووی (نزیك بەرەوە) نزیك بوویەوە، ئەویش هەندێ لە جلەکەی گرت و نزای بەسەردا خوێند، کاتێك بیستم وتم: منیش، فەرمووی: تۆ کێیت؟ وتم: ئەبوئەبورەیحانە، نزایەکی جیاشی بۆ من کردو فەرمووی (حرمت النار علی عینین حرست في سبیل الله) واتە(ئاگری دۆزەخ لەوچاوە حەرامە کە لە پێناو خوادا پاسەوانی دەگرێت) ئیمامی ئەحمەد و نەسائی و تەبەرانی و بەیهەقی هێناویانە، فەرموودەکەی جابر (رضي الله عنه) لەسەر نوێژی پێناو خوامان هێنا تیایدا هاتووە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (من یکلؤنا لیلنا) واتە(کێ ئەمشەو پاسەوانیمان دەکات)، یەکێك لە کۆچەران و یەکێك لە پشتیوانان هەستان، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (فکونا بفم الشعب من الوادي)(لە دەمی دۆڵەکەوە بن)، ئەو دوو کەسەش عەمماری کوڕی یاسر و عبادی کوڕی بەشیر بوون، ئینجا بە دووررو درێژی فەرموودەکە دێنێت.[2]

---

[1] – لە المشکاة ص٣٢٨ دا هاتووە.

[2] – ئیبن ئیسحاق و کەسانی دیکەش ئەم فەرموودەیەیان هێناوە.

# (خۆگری لەسەر نەخۆشی لە جیهادی ڕێی خوادا)

ئیبن عەساکیر لە ئەبی سەعیدەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (مامن شيئ يصيب المؤمن في جسده الا كفر الله عنه به من الذنوب) واتە(هەرچیەك تووشی جەستەی باوەڕدار دەبێت خوای گەورە بەوهۆیەوە لە تاوانی دەسڕێتەوە) ئوبەی کوڕی کەعب وتی: خوایە داوات لێ دەکەم تای سەر جەستەی ئوبەی کوڕی کەعب لانەبەیت تا دەگاتەوە پێت بەڵام ڕێی لێ نەگرێت لە نوێژو ڕۆژوو و حەج و عەمرە و جیهادی ڕێی تۆ، تاکەی لەگەڵدا بوو، تا مردن لێی جیا نەبوویەوە، لە کاتی تاکەیدا ئامادەی نوێژ و ڕۆژوو و حەج و عەمرە و غەزا دەبوو.[1]

هەروەها ئیبن عەساکیر و ئیمامی ئەحمەد و ئەبو یەعلا لە فەرموودەکەی ئەبو سەعیدەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: کەسێك وتی ئەی پێغەمبەری خوا چی دەڵێیت سەبارەت بەو نەخۆشییانەی تووشمان دەبن، پاداشتیان چی یە؟ فەرمووی (كفارات) واتە(سڕانەوەی تاوان) ئوبەی پێی وت: ئەگەر کەم بێت، فەرمووی (وان شوكة فما فوقها) واتە(ئەگەر دڕکێکیش بێت تا زیاتر) ئوبەی نزای لە خۆی کرد تای لێ نەبێتەوە تا مردن بەمەرجێك ڕێگری حەج و عەمرە و جیهادی ڕێی خوا و نوێژی جەماعەتی نەبێت، هەرکەس دەستی لێ دەدا هەستی بە تاکەی دەکرد تا ئەوکاتەی مرد[2] [3].

---

[1] – صحيح.

[2] – حسن.

[3] – لە كنز العمال ج٢ ص١٥٣دا واهاتووە، لە الاصابة ج١ ص٢٠دا هاتووە، ئیمامی ئەحمەد و ئەبو یەعلا و ئیبن ئەبو دنیا هێناویانە، ئیبن حیببان بە صەحیحی داناوە، تەبەرانی لە فەرموودەکەی ئوبەی کوڕی کەعبەوە بەو واتایە هێناویەتی، سەنەدەکەی حەسەنە، تەواو. ئیبن عەساکیریش هێناویەتی، لە كنز العمال ج٧ ص٢یشدا هاتووە، ئەبو نەعیم لە الحلية ج١ ص٢٢٥ لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە بەو واتایە هێناویەتی.

# (پێکران و برینداری لە جیهادی ڕێی خوادا)

بوخاری ص٩٨ لە جوندوبی کوڕی سوفیانەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەچوو بەڕێدا کە بەردێکی بەرکەوت و خوێن لە پەنجەی پێی هات، فەرمووی:

هل انت الا اصبع دميت و في سبيل الله ما لقيت

پێشتریش لە باسی خۆگری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەسەر سەختیەکان فەرموودەکەی ئەنەسمان (رضي الله عنه) هێنا کە لە ڕۆژی ئوحوددا دانی پێشەوەی شکا و سەری ئازاری بەرکەوت، فەرموودەکە دێنێت.[1]

پێشتر لە فەرموودەکەی عائیشەوە (رضي الله عنها) لە تەیالیسیەوە هێنامان عائیشە (رضي الله عنها) وتی: ئەبوبەکر (رضي الله عنه) کاتێك باسی ئوحودی دەبیست دەیوت: ئەو ڕۆژە ڕۆژی تەلحە بوو، پاشان باسی دەکرد، فەرموودەکە دێنێت، تیایدا هاتووە، گەیشتینە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و دانی شکا و ڕوخساری بریندار بوو، دوو ئەڵقە چووبوون بە کولمیدا، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (عليكما صاحبكما) واتە(فریای هاوڕێکەتان بکەون)، مەبەستی تەلحەبوو (رضي الله عنه) کە خوێنی لێ دەچوو، ئینجا فەرموودەکە دێنێت، تیایدا هاتووە، پاشان چووین بۆلای تەلحە کە لە چاڵاییەکیدا بوو حەفتا و ئەوەندە پێکران و جێ تیرو شمشێری پێوەبوو، پەنجەشی بڕابوو، ئێمەش کەوتینە تیمارکردنی.

ئەبونەعیم لە ئیبراهیمی کوڕی سەعدەوە هێناویەتی دەڵێت: بیستم عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف (رضي الله عنه) لە ڕۆژی ئوحوددا بیست و یەك برینی بەرکەوتبوو، پێیشی بریندار بوو.[2]

بوخاری و موسلیم و نەسائی – دەقەکە هی بوخاریە– لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: ئەنەسی کوڕی نەضری مامم لە شەڕی بەدر ئامادە نەبوو، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە یەکەم شەڕی دژ بە بێباوەڕاندا کە ئەنجامتدا بەشدارنەبووم، ئەگەر خوا بەشداریم پێ بکات لە شەڕی بێباوەڕاندا خوا دەبینێت

[1] – بوخاری و موسلیم و جگە لەوانیش فەرموودەکەیان هێناوە.

[2] – لە المنتخب ج٥ ص٧٧ دا هاتووە.

چی دەکەم، لە شەڕی ئوحوددا موسڵمانان ڕایانکرد وتی: خوایە من پۆزش دێنمەوە بۆت لەوەی ئەوانە کردیان، واتە هاوەڵەکانی، خوایە بە دوورم لەوەی ئەوانە کردیان، واتە بێباوەڕان، پاشان پێشکەوت و سەعدی کوڕی موعاز بەرەو ڕووی هات، وتی: ئەی سەعدی کوڕی موعاز سوێند بە پەروەردگاری نەضر بەدەر لە ئوحود بۆنی بەهەشت بەدی دەکەم، سەعد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من نەمتوانی وەك ئەو بکەم، ئەنەس دەڵێت شوێنی شمشێر یان تیر و ڕممان لە هەشتا و ئەوەندە شوێنی لەشیدا بەدیکرد، بینیمان کوژرابوو و بێباوەڕانیش جەستەکەیان شێواندبوو، کەس نەیناسیەوە تەنها خوشکەکەی نەبێت کە سەرپەنجەکەی ناسیەوە، ئەنەس دەڵێت: وامان دەبینی یان واگومانمان دەبرد ئەم ئایەتە لەسەر ئەو و هاوێنەکانی دابەزی (من المؤمنين رجال صدقوا ما عاهدوا الله عليه فمنهم من قضى نحبه ومنهم من ينتظر وما بدلوا تبديلا).[1]

بوخاری لە ئیبن عومەرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) لە شەڕی موئتەدا زەیدی کوڕی حارسەی کرد بە ئەمیر، فەرمووی (ئەگەر زەید کوژرا جەعفەر، ئەگەر جەعفەر کوژرا عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە) عەبدوڵڵا دەڵێت: من لەو شەڕدابووم، گەڕاین بە دوای جەعفەری کوڕی ئەبوتالیبدا و لەناو کوژراوەکاندا بەدیمان کرد، نزیکەی نەوەد و ئەوەندە پێکران بە جەستەیەوە بوو.[2]

---

[1]– لە الترغيب ج٢ ص٤٣٦ دا واهاتووە، ئیمامی ئەحمەد و ترمزیش لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) بەو شێوەیە هێناویانە، ترمزی و نەسائیش فەرموودەیەکی هاوواتای ئەمەیان لە ئەنەسەوە هێناوە ترمزی دەڵێت فەرموودەکە حەسەنی صەحیحە، ئەحمەدیش هێناویەتی، لە البداية والنهاية ج٤ ص٣٢ یشدا هاتووە، تەیالیسی و ئیبن سەعد و ئیبن ئەبی شەیبە و حارس و ئیبن جەریر و ئیبنولمونزیر و ئیبن ئەبی حاتەم و ئیبن مەردەویەش هێناویانە، لە کنز العمال ج٧ ص١٥ یشدا هاتووە، ئەبونەعیمیش لە الحليە ج١٠ ص١٢١ و بەیهەقی ج٩ ص٤٤ یش هێناویانە.

[2]– لە البداية والنهاية ج٤ ص٢٤٥ دا واهاتووە، تەبەرانی لە ئیبن عومەرەوە بەو جۆرە هێناویەتی، لە الاصابە ج١ ص٢٣٨ دا واهاتووە، ئەبونەعیم لە الحلية ج١ ص١١٧ و ئیبن سەعد ج٤ ص٢٦ هێناویانە.

چی دەکەم، لە شەڕی ئوحوددا موسڵمانان ڕایانکرد وتی: خوایە من پۆزش دێنمەوە بۆت لەوەی ئەوانە کردیان، واتە هاوەڵەکانی، خوایە بە دوورم لەوەی ئەوانە کردیان، واتە بێباوەڕان، پاشان پێشکەوت و سەعدی کوڕی موعاز بەرەو ڕووی هات، وتی: ئەی سەعدی کوڕی موعاز سوێند بە پەروەردگاری نەضر بەدەر لە ئوحود بۆنی بەهەشت بەدی دەکەم، سەعد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من نەمتوانی وەك ئەو بکەم، ئەنەس دەڵێت شوێنی شمشێر یان تیرو ڕممان لە هەشتا و ئەوەندە شوێنی لەشیدا بەدیکرد، بینیمان کوژرابوو و بێباوەڕانیش جەستەکەیان شێواندبوو، کەس نەیناسیەوە تەنها خوشکەکەی نەبێت کە سەرپەنجەکەی ناسیەوە، ئەنەس دەڵێت: وامان دەبینی یان واگومانمان دەبرد ئەم ئایەتە لەسەر ئەو و هاوێنەکانی دابەزی (من المؤمنين رجال صدقوا ما عاهدوا الله عليه فمنهم من قضى نحبه ومنهم من ينتظر وما بدلوا تبديلا).[1]

بوخاری لە ئیبن عومەرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە شەڕی موئتەدا زەیدی کوڕی حارسەی کرد بە ئەمیر، فەرمووی (ئەگەر زەید کوژرا جەعفەر، ئەگەر جەعفەر کوژرا عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە) عەبدوڵڵا دەڵێت: من لەو شەڕدابووم، گەڕاین بە دوای جەعفەری کوڕی ئەبوتالیبدا و لەناو کوژراوەکاندا بەدیمان کرد، نزیکەی نەوەد و ئەوەندە پێکران بە جەستەیەوە بوو.[2]

---

[1]– لە الترغيب ج٢ ص٤٣٦ دا واهاتووە، ئیمامی ئەحمەدو ترمزیش لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) بەو شێوەیە هێناویانە، ترمزی و نەسائیش فەرموودەیەکی هاوواتای ئەمەیان لە ئەنەسەوە هێناوە ترمزی دەڵێت فەرموودەکە حەسەنی صەحیحە، ئەحمەدیش هێناویەتی، لە البداية والنهاية ج٤ ص٣٢ یشدا هاتووە، تەیالیسی و ئیبن سەعدو ئیبن ئەبی شەیبەو حارس و ئیبن جەریرو ئیبنولمونزیرو ئیبن ئەبی حاتەم و ئیبن مەردەویەش هێناویانە، لە کنز العمال ج٧ ص١٥ یشدا هاتووە، ئەبونەعیمیش لە الحليه ج١٠ ص١٢١ و بەیهەقی ج٩ ص٤٤ یش هێناویانە.

[2]– لە البداية والنهاية ج٤ ص٢٤٥ دا واهاتووە، تەبەرانی لە ئیبن عومەرەوە بەو جۆرە هێناویەتی، لە الاصابه ج١ ص٢٣٨ دا واهاتووە، ئەبونەعیم لە الحلية ج١ ص١١٧ و ئیبن سەعد ج٤ ص٢٦ هێناویانە.

ئیبن ئەبی شەیبە لە عەمری کوڕی شەرحەبیلەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك سەعدی کوڕی موعاز (رضي الله عنه) لە ڕۆژی خەندەقدا بریندا بوو و خوێنی لێ دەڕۆیشت، ئەبوبەکر هات و دەیووت: وای پشتی شکاوم، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (مە ابابکر)(بوەستە ئەبووبەکر) عومەر هات و وتی: انا لله وانا الیه راجعون.[1]

ئیبن عەساکیر لە سەعیدی کوڕی عوبەیدی سەقەفیەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە ڕۆژی تائیفدا ئەبوسوفیانی کوڕی حەربم(رضي الله عنه) بینی لەسەر دیواری ئەبی یەعلا دانیشتبوو شتی دەخوارد، منیش تیرێکم بۆ وەشاندو چاوی پێکرا، هات بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وا چاوم لەپێناو خوادا لەدەستدا، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (ئەگەر دەتەوێت لە خوا دەپاڕێمەوە چاوت بۆ دەگێڕێتەوە، ئەگەریش دەتەوێت بەهەشتە، وتی: دەی بەهەشتەکەم دەوێت.[2]

بەغەوی و ئەبویەعلا لە عاصمی کوڕی عومەری مو قەتادەی کوڕی نوعمانەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی لە ڕۆژی بەدردا چاوی پێکرا، ناوچاوانی هان بەسەر کوڵمیدا، ویستیان بیبڕن، ئینجا فەرموودەکە دێنێت.

بەزارو تەبەرانی لە روفاعەی کوڕی رافعەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە ڕۆژی بەدردا خەڵکی کۆبوونەوە لەسەر ئومەییەی کوڕی خەلەف، ئێمەش چووین بۆ ئەوێ، سەیری پارچەیەکی نێو قەڵغانەکەیم کرد کە لە ژێر بنباڵیەوە بڕان دیاربوو، بە شمشێرێك لێمداو لە ڕۆژی بەدردا تیرێکم بەرکەوت و چاوم لە دەستدا، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تفی لێداو نزای بەسەردا خوێند و هیچ ئازاری نەما.[3]

---

[1] – لە کنز العمال ج٨ ص٢٢ دا واهاتووە.

[2]– لە کنز العمال ج٥ ص٣٠٧ دا هاتووە، زوبەیری کوڕی بەکاریش وا هێناویەتی، لە کنز العمال ج٢ ص١٧٨ یشدا هاتووە.

[3]– هەیسەمی ج٦ ص٨٢ دەڵێت: لە سەنەدەکەیدا عەبدولعەزیزی کوڕی عیمران هەیە کە لاوازە.

پێشتر فەرموودەکەی یەحیای کوڕی عەبدولحەمیدمان لە باپیریەوە هێنا کە ڕافیعی کوڕی خودەیج (رضي الله عنه) تیرێك بەسەر مەمکی کەوت، فەرموودەکەی ئەبوسائیبیش لەسەر خۆگری برین و نەخۆشی کە کەسێك لە بەنی عەبدولئەشهەل وتی: لە ئوحوددا من و باوکم بەشداربووین و هەردووکمان بە برینداری گەڕاینەوە، تیایدا هاتووە: سوێند بە خوا وڵاخێك نەبوو سواری بین، برینەکەشمان سەخت بوو، لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) چووین و برینەکەی من سوکتربوو، ئەگەر ئازارم زۆربوایە من سواردەبووم و عوقبە بەپێ دەچوو تا گەیشتینە ئەو شوێنەی کە موسڵمانان تیایدا وەستان.

خەلیفە ئیبن خەیات لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: بەراء لە ڕۆژی موسەیلەمەدا خۆی دا بەسەر خەڵکی ناو باخەکەدا و لەگەڵیان جەنگا تا دەرگاکەی کردەوە و هەشتا و ئەوەندە برینی تیرو شمشێری پێوە دیاربوو، برا بۆ شوێنەکەی تا برینپێچ بکرێت، خالید (رضي الله عنه) مانگێك لای مایەوە.[1]

تەبەرانی لە ئیسحاقی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی تەلحەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئەنەسی کوڕی مالیك و براکەی (رضي الله عنه) لە قەڵایەکی دوژمندابوون – لە حەرق لە عێراق– ئەوانە ئاسنێکی سەرچەماوەی لە زنجیر ئاڵاویان دەبەست بە مرۆڤەوە و بەرزیان دەکردەوە، ئەوەیان بە ئەنەس کرد، بەراء چوو تا لە دیوارەکەوە سەیری دەکرد، پاشان دەستی گەیاندە زنجیرەکە و هەوڵیدا تا ئەوەی پەتەکەی پچڕاند، پاشان سەیری دەستی کرد دەبینێت گۆشتی دەستی نەماوە و ئێسقانەکانی دەرکەوتوون، بەوە خوای گەورە ئەنەسی کوڕی مالیکی ڕزگار کرد.[2]

---

[1] – بەقی کوڕی موخەلەدیش لە موسنەدەکەیدا لە خەلیفەی ئیبن خەیاتەوە بە سەنەدەکەی بەو جۆرە هێناویەتی، لە الاصابة ج١ ص١٤٣ یشدا هاتووە.

[2] – لە الاصابة ج١ ص١٤٣ دا واهاتووە.

لە المجمع لە تەبەرانیەوە هاتووە، تیایدا دەڵێت، ئەنەسی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) بەسترایەوە بە هەندێ لەو سەرەئاسنانەوە و لە زەوی بەرزیان کردەوە، بەرائی برای هات و، وتیان: فریای براکەت کەوە، ئەویش لەگەڵ خەڵکەکە دەجەنگا، چوو تا سەر دیوار کەوت و دەستی گرت بە پەتەکەوە و ڕایدەکێشا و دەستەکانی هاواریان بوو تا پەتەکە پچڕا و دواتر سەیری دەستیکرد گۆشتی پێوە نەماوە، ئینجا فەرموودەکە دێنێت.[1]

## (هیواو نزای شەهیدبوون)

بوخاری لە ئەبی هورەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)بوو دەیفەرموو (والذي نفسي بيده لو لا ان رجالا من المؤمنين لا تطيب انفسهم ان يتخلفوا عني ولا اجدما احملهم عليه ما تخلفت عن سرية تغزو في سبيل الله والذي نفسي بيده لوددت اني اقتل في سبيل الله ثم احي ثم اقتل ثم احي ثم اقتل ثم احي ثم اقتل) واتە(سوێند بەو کەسەی گیانمی بەدەستە ئەگەر لەبەرئەوە نەبێت باوەڕدارانێك بە دواکەوتنیان لەمن دڵیان ئارام نەگرێت و نەتوانم پێویستی هاتنیان دابین بکەم لە یەك سریەی غەزای ڕێی خوا دوانەدەوتم، سوێند بەوکەسەی گیانمی بەدەستە حەزدەکەم لە پێناو خوادا بکوژرێم دوایی زیندووبکرێمەوە، ئینجا بکوژرێم ئینجا زیندووبکرێمەوە، ئینجا بکوژرێم، دووبارە بکوژرێم).

موسلیم ج٢ ص١٣٣ لە ئەبی هورەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (خوای گەورە زامنی هەرکەسی کردووە کە لە پێناو خوادا دەربچێت بۆ جیهادی ڕێی من و بڕوابوون پێم و داننان بە پێغەمبەرانمدا ئەوا زامنی دەکەم کە بیخەمە بەهەشتەوە یان بیگێڕمەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێی چووە بۆ بەدەستهێنانی پاداشت یان دەستکەوتێك، سوێند بەو کەسەی گیانی موحەمەدی بەدەستە هەر

[1] – هەیسەمی ج٩ ص٣٢٥ دەڵێت: سەنەدەکەی حەسەنە.

دڵۆپێك لە پێناو خوادا بڕژێت لە ڕۆژی داوییدا وەك کاتی ڕژانەکە دێت، ڕەنگی ڕەنگی خوێن و بۆنی بۆنی میسکە، سوێند بەو کەسەی گیانی موحەمەدی بەدەستە ئەگەر لەسەر موسڵمانان سەخت نەبوایە دانەدەنیشتم و هەرگیز لەیەك سریەی غەزای ڕێی خوادا دوانەدەوتم، بەڵام شتێك شك نابەم بۆ جەنگ ئامادەیان بکەم و خۆیشیان شك نابەن لەسەریشیان سەختە لەگەڵم نەیەن و دوابکەون، سوێند بەو کەسەی گیانی موحەمەدی بەدەستە حەزدەکەم لە پێناو خوادا بجەنگم و بکوژرێم، دواتر بجەنگم و بکوژرێم و دواتر بجەنگم و بکوژرێم).[1]

بوخاری لە ئەسلەمەی کوڕی عومەرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی: خوایە شەهیدی ڕێی خۆتم پێ ببەخشە و مەرگم با لە شاری پێغەمبەرەکەتدا بێت، ئیسماعیلی لە حەفسەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: لە عومەرم (رضي الله عنه) بیست دەیوت: خوایە کوژرانی ڕێی تۆو مەرگی ناو شاری پێغەمبەرەکەت بکە بە بەشم، منیش وتم: دەی ئەوە چۆن دەبێت؟ وتی: ئەگەر خوا بیەوێت دەبێت.[2]

تەبەرانی لە سەعیدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە هێناویەتی عەبدوڵڵای کوڕی جەحش (رضي الله عنه) لە ڕۆژی ئوحوددا پێی وت: بۆ لە خوا ناپاڕێیتەوە؟ لە شوێنێك کەناریان گرت، سەعد نزای کردو وتی: پەروەردگار ئەگەر گەیشتم بە دوژمن گەیشتنێکی مەردانەی دلێرانەم پێ ببەخشە تا لەگەڵی بجەنگم دوایی سەرکەوتنم پێ ببەخشە تا دەیکوژم، عەبدوڵڵای کوڕی جەحش ئامینی کردو دوایی وتی: خوایە کەسێکی سەخت و ئازا بێنەڕێم لەپێناو تۆدا لەگەڵی بجەنگم دواتر لووت و گوێم ببڕێت تا ئەگەر بەیانی گەیشتمەوە خزمەتت بڵێیت کێ وای لێ کردوویت؟ منیش بڵێم لە پێناو تۆو پێغەمبەرەکەتدا، تۆیش بفەرمویت ڕاست دەکەیت، سەعد وتی:

---

[1] – ئیمامی ئەحمەدو نەسائیش هێناویانە، لە کنز العمال ج۲ ص۲۵۵ یشدا هاتووە.

[2] – لە فتح الباری ج٤ ص۷۱دا واهاتووە.

کوڕی شیرینم نزاکەی عەبدوڵڵای کوڕی جەحش لە نزاکەی من باشتربوو، لە دەمەو ئێوارەدا بینیم لووت و گوێی بە پەتێکەوە هەڵواسرابوون.[1]

حاکم ج۳ ص۲۰۰ لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە هێناویەتی دەڵێت: عەبدوڵڵای کوڕی جەحش (رضي الله عنه) وتی: خوایە سوێندت دەدەم سبەینێ بگەم بە دوژمن و بمکوژن و دواتر سکم هەڵدڕن و لووت و گوێم ببڕن و تۆیش پرسیارم لێ بکەیت بۆ وایان لێ کردیت؟ منیش بڵێم لەبەر تۆ، سەعیدی کوڕی موسەییب وتی: لە خوا دەپاڕێمەوە وەك چۆن یەکەم سوێندی بەدیهێنا کۆتا سوێندیشی بەدیبهێنێت.[2]

ئەبونەعیم لە ئەنەسەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (ربّ ذي طمرين لا يؤبه له، لو اقسم على الله لابره، منهم البراء بن مالك)( لەوانەیە کەسێکی خاوەن دوو جلەشڕە لای ئێوە هیچ نەبێت بەڵام ئەگەر سوێندی خودا بدات خوا سوێندەکەی نەشکێنێ، لەوانەش بەرائی کوڕی مالیك) لە ڕۆژی توستەردا خەڵکی پەکیان کەوت، وتیان: ئەی بەراء سوێندی پەروەردگارت بدە، وتی: سوێندی پەروەردگارم دەدەم ئەی پەروەردگارم کە ملی ئەوانت دایە دەستمان بمگەیەنەوە بە پێغەمبەرەکەت، لەو شەڕەدا شەهید بوو.[3]

---

[1]– هەیسەمی ج۹ ص۳۰۲ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی کەسانی صەحیحن. بەغەویش هێناویەتی، لە الاصابة ج۲ ص۲۸۷ یشدا لە هاتووە، ئیبن وەهب هێناویەتی، لە الاستيعاب ج۲ ص۲۷٤دا هاتووە، بەیهەقی ج٦ ص۲۰۷ بە هەمان شێوە هێناویەتی، ئەبونەعیمیش لە الحلية ج۱ ص۲۷٤ دا هێناویەتی، بەڵام نزاکەی سەعدی نەهێناوە و تەنها نزاکەی عەبدوڵڵای کوڕی جەحشی هێناوە.

[2]– حاکم دەڵێت: ئەم فەرموودە لەسەر مەرجی بوخاری و موسلیم صەحیحە ئەگەر ئیرسالی تێدا نەبێت، زەهەبی دەڵێت: مورسەلی صەحیحە ئیبن شاهین و ئیبنولموبارەکیش هێناویانە، لە الاصابة ج۲ ص۲۸۷ دا هاتووە، ئەبونەعیم لە الحلية ج۱ ص۱۹۰ و ئیبن سەعد ج۳ ص٦۳ هێناویانە.

[3]– لە كنز العمال ج۷ ص۱۱ دا واهاتووە، ترمزیش هەروا هێناویەتی، لە الاصابة ج۱ ص۱٤٤ دا واهاتووە.

حـاكم ج٣ ص٢٩١ لـە ئەنەسـەوە (رضي الله عنه) هێناویـەتی دەڵێـت: پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (كم من ضعيف متضعف ذي طمرين، لو اقسم على الله لابرقسمة! منهم البراء بن مالك) ( چەند لاوازی بە لاواز دانراوی جلەشڕە هەن ئەگەر سوێندی خوا بدەن خوا سوێندەكەیان نەشكێنیّ، لەوانەش بەرائی كوڕی مالیك) بەراء بەرەو ڕووی بێباوەڕان بوویەوەو بێباوەڕان زیانیان بە موسڵمانان گەیاند، موسڵمانان وتیان ئەی بەراء پێغەمبەری خوا فەرموویەتی ئەگەر سوێندی خوا بدەیت بۆت دێنێتەدی، دەی سوێندی پەروەردگارت بدە، وتـی: پەروەردگار سوێندت دەدەم كە مل و گەردنی ئەوانت خستە دەستمان، ئینجا لەسەر پردی سوس پێكگەیشتن و ئازاری موسڵمانانیان دا، وتیان بەراء سوێندی پەروەردگارت بدە، ئەویش وتی: خوایە سوێندت دەدەم گەردنیان بدە دەستمان و بمگەیەنەوە بە پێغەمبەرەكەت (صلى الله عليه وسلم)، كە سەركەوتن بەراء شەهید بوو.[1][2]

ئەبوداودو موسودەدو حارس و ئیبن ئەبی شەیبەو ئیبنولموبارەك لە ڕێگەی حەمیدی كوڕی عەبدولڕەحمانی حومەیریـەوە هێناویـەتی كەسێك لـە هاوەڵـانی پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) پێـی دەوتـرا (حممـە) لـە سـەردەمی عومـەری كـوڕی خەتتابدا (رضي الله عنه) غەزای ئەسبەهانی كرد، وتی: خوایە حممە دەڵێت حەزی لێیە بگاتەوە بەتۆ، خوایە ئەگەر ڕاست دەكات بۆ بەدی بێنە، ئەگەریش درۆدەكات باحەزیش نەكات تووشی كە، فەرموودەكە دێنێت، تیایدا هاتووە: شەهید بوو و ئەبوموسا وتی: شەهیدە.[3]

ئیمامی ئەحمەدیش هێناویەتی و ئەوەی بۆ زیاد دەكات: ئەگەریش حەزناكات باحەزیش نەكات تووشی كە، خوایە حممە لەم سەفەرەی نەگەڕێتەوە تا مەرگ بیبات

---

[1] – صحيح.

[2] – حاكم ج٣ ص٢٩٢ دەڵێت: ئەم فەرموودە سەنەدی صەحیحە، بوخاری و موسلیم نەیانهێناوە، زەهەبی دەڵێت: صەحیحە، ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٧ بەو جۆرە هێناویەتی.

[3] – لە الاصابة ج١ ص٣٥٥دا واهاتووە.

لەگەڵ خۆیدا عەففان دەڵێت: لە ئەسبەهان مرد، ئەبوموسا هەستا و وتی: خەڵکینە ئەوەی لە پێغەمبەرتان بیستوومانە هێندە بزانن ممە شەهیدە.[1]

تەبەری ج٤ ص٢٤٩ لە مەعقەلی کوڕی یەسارەوە هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) ڕاوێژی بە هورمزان کرد و وتی: چی دەڵێیت لە فارسەوە دەست پێ بکەم یان لە ئازەربایجانەوە یان لە ئەسبەهانەوە؟ وتی: فارس و ئازەربایجان دوو باڵەکەن و ئەسبەهان سەرەکەیە ئەگەر دووباڵەکە یەکێکیان بڕا باڵەکەی تری دەمێنێت، بەڵام ئەگەر سەرەکە بڕا دوو باڵەکەش دەکەون، بۆیە لەسەرەکەوە دەست پێ بکە، عومەر(رضي الله عنه) چوو بۆ مزگەوت و نوعمانی کوڕی موقرین نوێژی دەکرد لەلای دانیشت، کە نوێژەکەی تەواو بوو وتی: دەمەوێت کارێکت پێ بسپێرم، وتی: کۆکردنەوەی خەراج بێت نایکەم، بەڵام غەزابێت باشە، وتی: دەی غەزایە، ناردی بۆ ئەسبەهان، ئینجا فەرموودەکە دێنێت، تیایدا هاتووە: موغیرە بە نوعمانی وت:ڕەحەتی خوات لێ بێت وا خەڵکەکەی ئامادەکردووە دەی لێنەوە، وتی: بە خوا تۆ پایەت بەرزە و لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەشداری شەڕی بوویت، ئەگەر بەری بەیان شەڕی نەکردایە دوای دەخست بۆ ئاوابوونی شەو و ڕەشەبا هەڵی دەکرد و سەرکەوتن دادەبەزی، پاشان وتی: من لیواکەم دەشەکێنمەوە – سێ جار– جاری یەکەم کەسێك دەستی بەئاو گەیاند و دەستنوێژی گرت، دووەم کابرایەك سەیری چەکەکەی خۆی و نەعلەکانی کرد و ئامادەی کردن، سێیەمیش لێنەون و کەستان لانەکاتەوە، ئەگەر نوعمانیش کوژرا کەس لای بەلادانەکاتەوە، چونکە من نزایەك دەکەم، دەمەوێت هەرکامتان ئامینی بۆ بکەن، خوایە ئەمڕۆ بە سەرکەوتنی موسڵمانانەوە شەهیدی ببەخشە بە نوعمان، جاری یەکەم ئاڵاکەی شەکاندەوە،

---

[1]– هەیسەمی ج٩ ص٤٠٠ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن جگە لە داودی کوڕی عەبدوڵڵای ئودی کە ئەو متمانەی پێ دەدات و ناکۆکیشی لەسەرە، تەواو. ئەبونەعیم هێناویەتی، لە المنتخب ج٥ ص١٧٠ دا هاتووە.

جـاری دووەمـیش شـکاندیەوە، پاشـان جـاری سـێیەم شـکاندیەوەو قەڵغانەکـەی پۆشی و شەڕی کرد و یەکەم پێکراو بوو مەعقەل دەڵێت: چوومەسەری و بیری بڕیارو نزاکەیم کردەوەو نیشانەیەکم لەسەر دانا و دواتر چووم، کاتێك یەکێکمان دەکوژرا هاوەڵانی دیکە لێی بێئاگادەبوون، (زولحاجیبەین) لەسەر وڵاخەکەی کەوت و سکی هەڵدڕاو خوا شکاندی، دوایی بە قاپێك ئاوەوە هاتمەوە بۆلای نوعمان و دەموچاویم شۆرد، وتی: تۆ کێیت؟ وتم: مەعقەلی کوڕی یەسار، وتی: خەڵکی چی کرد؟ وتم: خوا فەتحی بەخشی، وتی: سوپاس بۆ خوا، هەواڵی ئەوە بنوسن بۆ عومەر، ئینجا گیانی سپارد، تەبەری ج٤ ص٢٣٥ لە زیادی کوڕی جوبەیر لە باوکیەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی و فەرموودەکە لەسەر شەڕی نەهاوەند دێنێت تیایدا هاتووە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە شەڕی دەکرد لە سەرەتای ڕۆژەوە نەیدەکرد و تاکاتی نوێژو هەڵکردنی با پەلەی نەدەکرد، خۆی بۆ شەڕ ئامادە دەکرد، تەنها ئەم ڕێگەم بوو، خوایە من داوات لێ دەکەم ئەمڕۆ بە فەتحێك چاوم بکەیتەوە کە سەرکەوتنی ئیسلامی تێدابێت و زەلیلی کوفری تێدابێت، خوایە دوای ئەوە بە شەهیدی بمبەرەوە بۆلای خۆت، ئامین بکەن ڕەحمەتی خواتان لێ بێت، ئێمەش ئامینمان کرد و گریاین.[1]

---

[1]- تەبەرانی بە دوورو درێژی وەك تەبەری فەرموودەکەی مەعقەلی کوڕی یەساری هێناوە، هەیسەمی ج٦ ص٢١٧ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن جگە لە عەلقەمەی کوڕی عەبدوڵڵای موزەنی کە متمانەی پێ دەدات، تەواو. حاکمیش لە مەعقەلەوە بە دوورو درێژی ج٣ ص٢٩٣ دا هێناویەتی.

# (حەزی هاوەڵان (رضي الله عنهم) بۆ مەرگ و کوژرانی ڕێی خوا)

حاکم ج٣ ص١٨٩ لە سولەیمانی کوڕی بیلالەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە چوو بۆ بەدر سەعدی کوڕی خەیسەمەو باوکی ویستیان لەگەڵی بچن، ئەمە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) باسکرا، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی یەکێکتان بێت، قورعەیان کردو خەیسەمەی کوڕی حارس بە سەعدی کوڕی وت: هەردەبێت یەکێکمان بمێنێتەوە، دەی تۆ لەگەڵ ژنەکانتدا بمێنەرەوە، سەعد وتی: ئەگەر بەهەشت نەبوایە ڕازی دەبووم، بەڵام ئەمە شەهیدیەو هیوا دەخوازم بۆ خۆم بێت، قورعەیان کردو سەعد دەرچوو و لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چوو بۆ بەدرو عەمری کوڕی عەبدود کوشتی[1][2].

ئیبن عەساکیر لە موحەمەدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەینەوە هێناویەتی دەڵێت: لە ڕۆژی بەدردا (عوقبە نزای بۆ بەزارکرد) عەلی کوڕی ئەبوتالیب (رضي الله عنه) چوو بەرەولای وەلیدی کوڕی عوقبە، لەیەك دەچوون و کەنج بوون، خستیە سەر زەوی و کوشتی، پاشان شەیبەی کوڕی ڕەبیعە هەستا و حەمزە چوو بۆی و وەك یەك بوون، ئەویش شەیبەی کوشت، پاشان عوتبەی کوڕی ڕەبیعە هات و عوبەیدەی کوڕی حارس هەستا بۆی و هەریەکەو دایان لەوی تر، عوبەیدە دای لە شانی چەپی و عوتبەش لە قاچی عوبەیدە نزیك بوویەوە بە شمشێر لێیداو قاچی بڕی، حەمزەو عەلی گەڕانەوە بۆ عوتبەو کوشتیان و عوبەیدەیان بردە کەپرەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕایکشاندو پێی خۆی بۆ کرد بە پشتی و تەپوتۆزی سەر دەموچاوی دەسڕی، عوبەیدە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا سوێند بەخوا ئەگەر ئەبوتالیب تۆی ببینیایە دەیزانی من لەو شیاوترم بەو قسەی کە دەیوت:

نسلمه حتى نصرع حوله و نذهل عن ابنائنا والحلائل

---

[1] – ضعیف.

[2] – ئیبنولموبارەك لە سولەیمان و موسای کوڕی عوقبە لە زوهریەوە هێناویەتی، لە الاصابة ج٢ ص٢٥ یشدا هاتووە.

مەگەر من شەهید نیم؟ فەرمووی (با، منیش شایەتیت بۆ دەدەم) پاشان مرد، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە حەفراء بە خاکی سپاردو خۆی دابەزیە ناو گۆڕەکەی ئەو دابەزیبوو[1].[2]

حاکمیش ج٣ ص١٨٨ لە زوبەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: عوتبەو عوبەیدە هەرکامیان دایان لەوی تریان، حەمزەو عەلی دایان لە عوتبەو کوشتیان و عوبەیدەیان هەڵگرت و هێنایانە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و پێی بڕابوو و مۆخی لێ دەچوو، کە هێنایان عوبەیدە وتی: مەگەر من شەهید نیم ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی (با)، عوبەیدە وتی: ئەگەر ئەبوتالیب زیندووبووایە دەیزانی من لەو شیاوترم بەو قسەی کە دەیوت:

و نسلمه حتى نصرع حوله　　　و نذهل عن ابنائنا و الحلائل[3]

## (شەڕی ئوحود)

تەبەرانی لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی عومەر (رضي الله عنه) لە ڕۆژی ئوحوددا بە براکەی وت: براگیان قەڵغانەکەم بگرە، براکەی وتی: منیش وەك تۆ شەهیدیم دەوێت، ئیتر هیچکام قەڵغانەکەیان نەبرد.[4]

ئەبویەعلاو ئیبن ئەبی عاصم و بورەقی و سەعیدی کوڕی مەنسوور لە عەلیەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: کاتێك لە ڕۆژی ئوحوددا خەڵکی لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دوور کەوتنەوەو چواردەوریان چۆڵ کرد سەیری کوژراوەکانم کرد، پێغەمبەرم (صلى الله عليه وسلم)

---

[1] – ضعیف.

[2] – لە کنز العمال ج٥ ص٢٧٢ دا واهاتووە.

[3] – ضعیف.

[4] – هەیسەمی ج٥ ص٢٩٨ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە کەسانی صەحیحن، تەواو، ئیبن سەعد ج٣ ص٢٧٥ و ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص٣٦٧ دا بە هەمان شێوە هێناویانە.

نەدی، وتم: سوێند بە خوا ڕاینەکردووە، لە کوژراوەکانیشدا نیە، بەڵام لەسەر ئەمەی کردمان خوا لێمان تووڕە دەبێت، پێغەمبەرەکەی دەباتەوە لای خۆی، دەی ئیتر خێرم تیانیە ئەگەر نەجەنگم تا بکوژرێم، هەڵمکوتایە سەر دوژمن و چوومە ناویانەوە، پێغەمبەر (ﷺ) لە نێوانیاندا بوو و منیش لەوێ بووم.[1]

ئیبن ئیسحاق لە قاسمی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی ڕافیعی بەنی عەدی کوڕی نەجارەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەنەسی کوڕی نەضری کوڕی مالیك گەیشت بە عومەری کوڕی خەتتاب و تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا لەگەڵ دەستەیەکی کۆچەران و پشتیواناندا کە دەستیان لە شەڕ بەردابوو، وتی: بۆچی دانیشتوون؟ وتیان: پێغەمبەر (ﷺ) کوژرا، وتی: ئەی چی دەکەن بە تەمان دوای ئەو بژین؟ هەستن و پێغەمبەرەکەتان لەسەر چی مرد ئێوەش لەسەری بمرن، چوو بەرەو دوژمن و جەنگا تا کوژرا.[2]

واقیدی لە عەبدوڵلای کوڕی عەمماری خەتیمەوە هێناویەتی دەڵێت: سابتی کوڕی دحدحاحە لە ڕۆژی ئوحوددا هات و موسڵمانانیش بڵاوەیان لێکردبوو و شمشێریان دانابوو، ئەویش هاواری دەکرد ئەی کۆمەڵی پشتیوانان، سەیرم کەن، سەیرم کەن، من سابتی کوڕی دحدحاحەم ئەگەر موحەمەد کوژرا ئەوا خوا زیندووە و نامرێت، دەی لە پێناو ئایینەکەتاندا بجەنگن خوا سەرتان دەخات، دەستەیەك لە پشتیوانان لەگەڵی چوون و ئەویش لەگەڵ موسڵماناندا هەڵمەتی برد و بەرەو ڕووی کەتیبەیەکی سەخت بوویەوە کە سەرکردەکانی تێدابوون خالیدی کوڕی وەلید و عەمری کوڕی

[1] – لە کنز العمال ج٥ ص٢٧٤ دا واهاتووە، هەیسەمی ج٦ ص١١٢ دەڵێت: ئەبویەعلا گێڕاویەتیەوە و لە سەنەدەکەدا موحەمەدی کوڕی مەڕوانی عقیلی هەیە کە ئەبوداود و ئیبن حیببان بە جێ متمانە و ئەبوزەرعە و چەندێکی دی بە لاوازی دەزانن، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکەش صەحیحن، تەواو.

[2] – لە البداية والنهاية ج٤ ص٣٤ دا بەو جۆرە هاتووە.

عاص و عيكرەمەی كوڕی ئەبوجەهل و ضيراری كوڕی خەتتاب، تێكچڕان و خاليد بە ڕمێك لێيداو لە پشتيەوە دەرچوو و خستی و پشتيوانەكانيش لەگەڵيدابوون كوژران، دەڵێن ئەوانە كۆتا كوژراوەكانی موسڵمانان بوون[1] .[2]

بەيهەقی لە دلائل النبوة لە ڕێگەی ئەبی نجيح و لە باوكيەوە (رضي الله عنه) هێناويەتی دەڵێت: يەكێك لە كۆچەران لە شەڕی ئوحوددا دای بە پاڵ كابرايەكی پشتيوانانداكە خەڵتانی خوێن ببو، پێی وت: فڵان كەس دەزانيت موحەمەد كوژرا؟ پشتيوانەكە وتی: ئەگەر موحەمەد كوژرا گرنگ ئەوەيە پەيامەكەی گەياند، لەسەر ئايينەكتان بجەنگن، ئەوكات ئەو ئايەتە دابەزی (وما محمد الا رسول).[3]

حاكم ج٣ ص٢٠١ لە زەيدی كوڕی سابتەوە (رضي الله عنه) هێناويەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ڕۆژی ئوحوددا ناردمی بە شوێن سەعدی كوڕی ڕەبيعەدا (رضي الله عنه) پێی فەرمووم (ئەگەر بينيت سەلامی منی لێ بكەو پێی بڵێ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێت دەڵێت حاڵت چۆنە؟) منيش بەناو كوژراوەكاندا گەڕام دەبينم لە كۆتاييدايەو حەفتا پێكرانی ڕم و شمشێرو تيری پێوەبوو، پێم وت: ئەی سەعد پێغەمبەری خوا سەلامی لێ كرديت و دەڵێت حاڵی چۆنە؟ وتی: سەلام لە پێغەمبەری خواو تۆيش، پێی بڵێ ئەی پێغەمبەری خوا بۆنی بەهەشت دەكەم، بە پشتيوانانيش بڵێ ئەگەر موويەك لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) كەم بێتەوە و ئێوەش كەستان مابێت لای خوا هيچ بيانوويەكتان نيە، ئينجا گيانی سپارد[4] .[5]

---

[1] - ضعيف.

[2] - لە الاستيعاب ج١ ص١٩٥ دا واهاتووە.

[3] - لە البداية والنهاية ج٤ ص٣١ دا واهاتووە.

[4] - صحيح.

[5] - حاكم دەڵێت: ئەم فەرموودە سەنەدەكەی صەحيحەو بوخاری و موسليم نەيانهێناوەو زەهەبيش دەڵێت: صەحيحە.

حاکم لە ڕێگەی ئیبن ئیسحاقەوە هێناویەتی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەبی صەعصەعە لە باوکیەوە هێناویەتی کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: کێ دەڕوانێت بزانێت سەعدی کوڕی ڕەبیع چی دەکات؟ ئینجا فەرموودەکە دێنێت. دەڵێت: سەعد وتی: بە پێغەمبەر (ﷺ) بڵێ من لەناو مردووەکاندام و سەلامیشی لێبکەو پێی بڵێ سەعد دەڵێت: خوا پاداشتت بداتەوە بەرامبەر چاکەت لەگەڵ ئێمەو هەموو ئوممەتدا[1][2].

ئیمامی ئەحمەد لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی بێباوەڕان کاتێك لە ڕۆژی ئوحوددا پێغەمبەریان (ﷺ) لەگەڵ حەوت کۆچەرو قورەیشیەکدا گەمارۆدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (من يردهم عنا وهو رفيقي في الجنة؟) کێ ئەمانەمان لێ دووردەخاتەوە لە بەهەشتدا هاوڕێم بێت؟ یەکێك لە پشتیوانان هەستا و جەنگا تا کوژرا، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) هەمان شتی فەرموو، بەو جۆرە هەر حەوت پشتیوانەکە کوژران، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ما انصفنا اصحابنا)(بەرامبەر هاوەڵانمان ئینصافمان بەکارنەهێنا)[3].

بەیهەقی لە جابرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە ڕۆژی ئوحوددا خەڵك دەوری پێغەمبەریان (ﷺ) چۆڵکردو تەنها یانزە پشتیوان و تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا لەگەڵی مانەوەو پێغەمبەر (ﷺ) سەرشاخەکە دەکەوت، بێباوەڕان کوتنە شوێنیان، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (الا احد لهؤلاء؟) واتە(ئەرێ کەس نیە لە ڕوویاندا

---

[1] – ضعیف.

[2] –زەهەبی دەڵێت: فەرموودەکە مورسەلە، لە البداية والنهاية ج٤ ص٣٩ یشدا گێڕانەوەکەی ئیبن ئیسحاق هاتووە، مالیك لە الموطا ص١٧٥ لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە بەو واتایە بە کورتی هێناویەتی، ئیبن سەعد ج٣ ص٧٨٧ لە معن لە مالیك لە یەحیاوە بە کورتی هێناویەتی.

[3] – موسلیمیش گێڕاویەتیەوە.

بوەستێت) تەلحە وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی (كما يا طلحة) ئینجا یەكێك لە پشتیوانان وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا، دەجەنگا و پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ ئەوانی دیكەدا سەردەكەوت، پاشان پشتیوانەكە كوژراو بێباوەڕان چوون بە دوای پێغەمبەردا (ﷺ) فەرمووی (الا رجل لهؤلاء؟) تەلحە وتی: من، پێغەمبەر (ﷺ) هەمان شتی پێ فەرموو، یەكێك لە پشتیوانان وتی: من، بە هەمان شێوە ئەوان سەركەوتن و ئەمیش كوژراو بێباوەڕان دەچوون بە شوێنیدا، ئەمە بەردەوام دەبوویەوە تا هیچ كام نەمان جگە لە تەلحە، بێباوەڕان دەورەیان دان، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (من لهؤلاء؟) تەلحە وتی: من، وەك ئەوانی پێشووی جەنگا و بریندار دەبوو و دەیوت ئاخ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ئەگەر بتوتایە بسم الله فریشتەكان بەرزیان دەكردیتەوەو خەڵكی سەیریان دەكردیت تا دەیانبردیتەوە بەرزایی ئاسمان) پاشان سەركەوت بۆلای هاوەڵانی كە كۆببوونەوە[1] [2].

حاكم ج٣ ص٢٠٢ لە موحەمەدی كوڕی لەبیدەوە هێناویەتی دەڵێت: كاتێك پێغەمبەر (ﷺ) چوو بۆ ئوحود یەمانی كوڕی جابرو ئەبوحوزەیفەو سابتی كوڕی دەقشی كوڕی زەعورا و ژن و منداڵەكانی بردە قەڵاوەو یەكێكیان بەوی تری وت – هەردووكیان دووپیری بە تەمەن بوون– قوڕ بەسەر چاوەڕێی چی دەكەین؟ سوێند بە خوا هیچ كاممان هێندەی تینوێتی كەرێك بە تەمەنمانەوە نەماوە، ئەمڕۆ و سبەینێ مان ماوە، بۆچی شمشێرهەڵنەگرین و بچین بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)؟ چوونە ناو موسڵمانان و موسڵمانانیش پێیان نەدەزانین، سابتی كوڕی دەقش بەدەست بێباوەڕان كوژراو ئەبوحوزەیفەش شمشێری موسڵمانانی بەركەوت و نەیانناسیەوەو كوژرا، حوزەیفە وتی باوكم باوكم، وتیان بەخوا نەمانبینیوە، ڕاستیان دەوت، حوزەیفە وتی: خوا لێتان خۆش بێت ئەوە میهرەبانترینە، پێغەمبەر (ﷺ) ویستی

---

[1] – حسن.

[2] – له البداية والنهاية ج٤ ص٢٦ دا واهاتووه.

خوێنباییەکەی بدات، بەڵام حوزەیفە کردیە بەخششی موسڵمانان، بەمە زیاتر لای پێغەمبەر (ﷺ) خۆشەویست بوو[1].[2] لە المنتخب ج٥ ص١٦٧ یشدا هاتووەو ئەمەشی بۆ زیاد کردووە وتیان خۆمان بگەیەنینە پێغەمبەر (ﷺ) بەڵکو خوا لای پێغەمبەر (ﷺ)شەهیدیمان پێ ببەخشێت، شمشێریان هەڵگرت و چوونە ناو خەڵك و کەس پێی نەزانین، لە کۆتاییەکەشیدا ئەمەی هێناوە، لای پێغەمبەر (ﷺ) خێرو چاکەیان زیاتری کرد.

## (شەڕی (الرجيع))

بوخاری لە ئەبوهورەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) سریەیەکی نارد بۆ هەواڵگری عاصمی کوڕی سابتی (رضي الله عنه) کرد بە ئەمیریان، عاصم باپیری عاصی کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب بوو، چوون تا گەیشتنە نێوان عوسفان و مەککەو هەواڵی ناوچەیەکی هوزەیلیمان بیست کە پێیان دەوترا بەنولحیان لە نزیکی سەد رامەوە شوێنیان کەوتن و شوێن پێیان هەڵگرتن تا چوونە شوێنێك و دابەزین و تیایدا ناوکە خورمای مەدینەیان بینی وتیان ئەمە خورمای یەسریبە، شوێنیان کەوتن تا گەیشتنەوە پێیان، کاتێك گەیشتن عاصم وهاوەڵەکانی پەنایان بردە بەر بەرزاییەك، ئەوانیش گەمارۆیان دان و پێیان وتن ئەگەر دابەزن بەڵێنتان پێ دەدەین کەستان نەکوژرێن، عاصم وتی: من ناچمە ژێر باری زیممەی کوفرەوە، خوایە هەواڵی ئێمە بگەیەنە پێغەمبەرەکەت، شەڕیان لەگەڵ کردن تا بە حەوت تیر عاصمیان کوشت، خوبەیب و زەید و کەسێکی دیکە مانەوە، پەنایان پێ دان، ئەوانیش دابەزین، هەر کە دابەزین یەکسەر بەستنیانەوە، ئەو کەسی سێیەمەی لەگەڵیان بوو وتی: ئەمە یەکەم ناپاکی یە بۆیە ئامادەنەبوو لەگەڵیان بچێت، ئەوانیش زۆریان لێکرد تا لەگەڵیان

[1] - صحيح.

[2] - حاکم دەڵێت: ئەم فەرموودە لەسەر مەرجی موسلیم صەحیحەو بوخاری و موسلیم هێناویانە، ئەبونەعیمیش لە موحمودەوە هێناویەتی،

بچێت بەڵام لەگەڵیان نەچوو، بۆیە کوشتیان و خوبەیب و زەیدیشیان بردن و فرۆشتنیان بە (بێباوەڕانی) مەککە. بەنوحارسی کوڕی عامری کوڕی نەوفەل خوبەیبیان کڕی – خوبەیب لە شەڕی بەدردا حارسی کوڕی عامری کوشتبوو – بە دیلی لەلایان مایەوە تا هەموویان بڕیاریاندا بیکوژن، داوای موسێکی لە یەکێك لە کچانی حارس کردتا تەراشی پێ بکات، ئەویش پێیدا، ئەم ژنە دەڵێت: بیرم چوو کە منالْم لەلای بوو چوو بۆلای ئەویش لەسەر ڕانی خۆی داینا، کە بینیم یەکسەر ترسام، ئەویش زانی من ترسام و موسەکەشی لە دەستدابوو، وتی: دەترسیت بیکوژم؟ من پشت بە خوا شتی وا ناکەم، ئەو ژنە دەڵێت: هیچ کات دیلی باشتر لە خوبەیبم نەدیوە، دەمبینی لە هێشووە ترێیەکی دەخوارد و لە مەککەیشدا شتی وا هەرنەبوو لە کاتێکدا بە ئاسن کۆت و بریندار بوو، ئەوەش ڕۆزی خوابوو بۆی، بردیانە دەرەوە تا بیکوژن، وتی: ڕێم بدەن تا دوورکات نوێژبکەم، پاشان لای کرد بەلایاندا و وتی: ئەگەر لە بەر ئەوە نەبوایە بڵێن لە مەرگ دەترسێت زیاتر نوێژم دەکرد، بەمە ئەو یەکەم کەس بوو دوورکات نوێژی پێش کوژرانی کرد، پاشان وتی: خوایە هەموویان ڕامالە و یەك دەستە بیانکوژە، پاشان وتی:

ما ان ابالي حين اقتل مسلما — على اي شق كان مصرعي

و ذالك في ذات الاله و ان يشا — يبارك على اوصال شلو ممزق

پاشان عوقبەی کوڕی حارس هەستاو کوشتی، قورەیش ناردیان بۆلای عاصم تا بەشێك لە لەشی بنێرێت تا بیناسنەوە – عاصم لە ڕۆژی بەدردا یەکێك لە گەورەکانی ئەوانی کوشتبوو – خوای گەورە سایە و سێبەرێکی (زەردەواڵەی) بۆ ناردو نەیانتوانی وابکەن.[1]

---

[1]– بەیهەقی ج٩ ص١٤٥ لە ئەبی هورەیرەوە (رضي الله عنه) بەو جۆرە هێناویەتی، عەبدولڕەزاقیش لە ئەبی هورەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی، لە الاصابە ج٢ ص١٣٢ دا هاتووە و ئەبونەعیمیش لە الحلیة ج١ ص١١٢ دا بە هەمان شێوە هێناویەتی.

ئیبن ئیسحاق لە عاصمی کوڕی عومەری کوڕی قەتادەوە هێناویەتی دەڵێت: دوای ئوحود دەستەیەکی هۆزی (عەضەل و قارە) هاتن بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و وتیان ئێمە هەندێ موسڵمانمان تێدایە، دەی دەستەیەکی هاوەڵانمان لەگەڵ بنێرە تا فێری ئیسلاممان بکەن و قورئانمان پێ بڵێن و فێری شەریعەتی ئیسلاممان بکەن، پێغەمبەریش (ﷺ) شەش هاوەڵی لەگەڵیاندا نارد، ناوەکانی هێناوە، لەگەڵیان چوون تا گەیشتنە بیری ڕەجیع – بیرێکی هوزەیلە لە حیجاز– لەوێ ناپاکیان لە ڕوودا نواندن، هوزەیل نەوینە شمشێرەکانیان و هاواریان کرد بەسەریاندا ئەوانیش سەیر دەکەن گەمارۆ دراون، شمشێرەکانیان هەڵگرت تا بجەنگن، ئەوانیش پێیان وتن: بە خوا نامانەوێت بتانکوژین، تەنها ویستمان بە بیانووی ئێوەوە شتێك لە خەڵکی مەککە وەربگرین، بەڵێنی خواتان پێ دەدەین نەتانکوژین، مەرسەدو خالیدی کوڕی بەکیرو عاصمی کوڕی سابت (رضي الله عنه) وتیان نەبەخوا هیچ کات بەڵێن و پەنای بێباوەڕان وەرناگرین، عاصمی کوڕی سابت وتی:

ما علي وانا جلد نابل        والقوس فيها وترعنابل

تزل عن صفحتها المعابل        الموت حق والحياة باطل

وكل ماحم الاله نازل        بالمرء والمرء اليه ايل

ان لم اقاتلكم فامي هابل

هەروەها وتی:

ابو سليمان وريش المقعد        و ضالة مثل الجحيم الموقد

اذا النواحي افترشت لم ارعد        ومجنا من جلد ثور اجود

ومؤمن بما عيى محمد

هەروەها وتی:

ابوسليمان ومثلي راما        وكان قومي معشرا كراما

پاشان شەڕی کرد تا لەگەڵ دوو هاوەڵەکەی تریدا کوژرا، کە عاصم کوژرا زوهەیل ویستیان سەری ببەن تا بیفرۆشن بە سولافەی کچی سەعدی سوهەیل کە ل کاتی

کوڕانی کوڕەکەی لە ڕۆژی ئوحوددا نەزری کردبوو ئەگەر سەری عاصمم دەست بکەوێت لە کەللە سەریدا مەی بخۆمەوە، بەڵام زەردەواڵە نەیانهێشت، کاتێك ئەوەیان بینی وتیان: وازی لێ بێنن تا شەو دێت زەردەواڵەکان دەچن و دێین دەیبەین، خوای گەورەش گەردەلوولێکی نارد و عاصمی برد، عاصم بەڵێنی بە خوا دابوو هیچ کات نە دەست لە بێباوەڕ بدات و نە بێباوەڕ دەستی لێ بدات چونکە بە پیسی دەزانین، عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) کە ئەمەی بیست وتی: زەردەواڵە پاراستی خوای گەورە بەندەی باوەڕدار دەپارێزێت، عاصم نەزری کردبوو لە هەموو ژیانیدا دەستی بەر بێباوەڕ نەکەوێت و بێباوەڕیش دەستی بەر ئەو نەکەوێت، لە دوای مردنیشی خوای گەورە بۆی بەدیهێنا وەك چۆن لە کاتی ژیانیدا بۆی بەدیهێنا.

خوبەیب و زەیدی کوڕی دسنە و عەبدوڵڵای کوڕی تاریقیش (رضي الله عنه) دڵیان ناسك بوویەوە و هیوای ژیانیان پەیدا کردەوە و خۆیان دابە دەستەوە و ئەوانیش بەدیلیان گرتن و بردنیان بۆ مەککە تا پێیان بفرۆشن، کە گەیشتنە زەهران عەبدوڵڵای کوڕی تاریق دەستی لە پەتەکە دەرهێناو شمشێرەکەی برد، ئەوانیش دوای کەوتن و بەردبارانیان کرد تا کوشتیان و لە زەهران بە خاك سپێردرا.

خوبەیبی کوڕی عەدی و زەیدی کوڕی دسنەش بران بۆ مەککە و بەرامبەر بە دوو دیلی هوزەهەیل کە مەککە دیل بوون پێیان فرۆشتن، حەجیری کوڕی ئەبی تەمیمی خوبەیبی کڕی، زەیدی کوڕی دسنەش صەفوانی کوڕی ئومەییە کڕی تا لە جیانی باوکی بیکوژێتەوە، لەگەڵ مەولایەکیدا کە ناوی نسطاس بوو ناردی بۆ تەنعیم و لە حەرەم بردیە دەرەوە تا بیکوژێت، دەستەیەکی قورەیش کۆبوونەوە کە ئەبوسوفیانی کوڕی حەربیش لەناویاندابوو، ئەبوسوفیان کاتێك زەیدی دی برا تا بکوژرێت بە زەیدی وت: سوێندت دەدەم ئەی زەید حەزدەکەیت ئێستا لەم شوێنەدا موحەممەد لە شوێنی تۆ بێت و بدەین لە ملی و تۆ لەنا و ژن و منالی خۆتدابیت؟ وتی: بەخوا حەزناکەم ئێستا موحەممەد لە شوێنی خۆیدا دڕکێك ئازاری بدات و من لەناو ژن و

منداڵمدابم، ئەبوسوفیان وتی: کەسم نەدیوە وەك هاوەڵانی موحەمەد خۆشەویستییان بۆ موحەمەد هەبێت، دەڵێت دواتر نسطاس کوشتی.

بۆ خوبەیبی کوڕی عەدیش ئەوا عبدوڵلای کوڕی ئەبی نەجیح پێی وتم: ماویەی مەولای حەجیری کوڕی ئەبی ئیهاب – موسڵمان ببوو– وتی: خوبەیب لە ماڵی مندا بەندکرابوو، ڕۆژێك چووم بۆلای و هێشوویەك ترێی پێ بوو وەك سەری کەسێك وابوو (هێندە زۆرو گەورەبوو) لێی دەخوارد، لەسەر زەویدا ترێی وام نەدیبوو بخورێت.

ئیبن ئیسحاق دەڵێت: عاصمی کوڕی عومەری قەتادەو عەبدوڵلای کوڕی ئەبی نەجیح بۆیان گێڕامەوە کە ئەو ژنە (ماویە) وتی: لە کاتی کوژرانیدا خوبەیب پێی وتم: شتێکم (پارچە موسێك) بۆ بنێرە تا خۆمی پێ پاك ڕاگرم (تەراش بکەم) پێش ئەوەی بمکوژن، منیش بە منداڵێکدا موسێکم بۆ ناردو وتم: بیبە بۆ ئەو پیاوە لەو ماڵەدا، سوێند بە خوا هەر منداڵەکە چوو بۆلای وتم چیم کرد؟ بە خوا تۆڵە دەکاتەو ئەو منداڵە دەکوژێت، ئەوکات سەربەسەر دەکات، کاتێك موسەکەی پێدا وەری گرت و پێی وت: توخوا کاتێك دایکت ئەوەی بۆ ناردم ب ەتۆدا لەوە نەترسا ناپاکی بنوێنم؟! پاشان چوو، ئیبن هیشام دەڵێت: دەوترێت مناڵەکە کوڕی ئەو ئافرەتە بووە.

ئیبن ئیسحاق دەڵێت: پاشان خوبەیبیان بردو گەیاندیانە تەنعیم تا لە خاچی بدەن، خوبەیب پێی وتن: ئەگەر دەکرێت با دووڕکات نوێژ بکەم، وتیان دەی باشە، دوو ڕکات نوێژی ڕێکوپێکی کرد، پاشان سەیری خەڵکەکەی کردو وتی: سوێند بە خوا لەبەر ئەوە نەبێت بڵێن لەترسی مەرگدا نوێژ درێژ دەکاتەوە نوێژەکەم نەدەبڕی،بەوە خوبەیب یەکەم موسڵمان بوو ئەو دوو ڕکاتەی پێش کوژرانی ئەنجامدا، پاشان بە دارێکەوە هەڵیانواسی، کاتێك بەستیانەوە وتی: خوایە ئێمە پەیامی پێغەمبەرەکەتمان گەیاند، دەی تۆش هەواڵی پێ بگەیەنە چییان پێکردین، پاشان ئەم نزایەی لێ کردن (اللهم احصهم عددا واقتلهم بددا ولاتغادر منهم احدا) پاشان کوشتیان، موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان دەیوت: ئەو ڕۆژ لەگەڵ ئەبوسوفیان

لەوێ بووم، دەمبینی زەوی لەتاو نزاکەی خوبەیبدا ڕایدەکێشام، ئەوان دەیانوت: ئەگەر ئەم کابرا وازی لێ بهێنرێت تا بەلایدا ڕاکشێت لەبەرچاوت نامێنێت.

لە (المغازی) موسای کوڕی عوقبەدا هاتووە: خوبەیب و زەیدی کوڕی دسنە لە یەك ڕۆژدا کوژران، پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕۆژی کوژرانیاندا هەواڵی بیستن و فەرمووی (علیك السلام) قورەیش خوبەیبیان کوشت، دەڵێت کاتێك زەیدی کوڕی دسنەیان لە خاچدا تیربارانیان کرد تا واز لە ئایینەکەی بیهێنێت کەچی ئیمانی زیادی کرد.

عروەو موسای کوڕی عوقبە دەڵێن: کاتێك خوبەیبیان هەڵواسی دەیانوت توخوا حەزدەکەیت موحەمەد لە شوێنی تۆدابێت؟ ئەویش وتی: نەبەخوای گەورە حەزناکەم لە جیاتی من دڕکێکیش بچێت بە پێیدا، ئەوانیش پێی پێکەنین،[1] هەروەها تەبەرانی فەرموودەکەی عروەی کوڕی زوبەیری بە دوورو درێژی هێناوە تیایدا هاتووە: ئەو کەسانەی لە شەڕی بەدردا باوکیان کوژرابوو خوبەیبیان کوشت، کاتێك چەکیان لە ڕوودا هەڵگرت و ئەویش لە خاچ درابوو سوێندیان دەدا حەزدەکەیت موحەمەد لە شوێنتدابێت؟ وتی: نەبەخوای گەورە حەزناکەم لە بری من دڕکێکیش بچێت بەپێیدا، ئەوانیش پێی پێکەنین، خوبەیب کاتێك بەرزکرایەوە بۆ سەردارەکە دەیوت:

لقد جمع الاحزاب حولي و البوا قبائلهم واستجمعوا كل مجمع
وقد جمعوا ابنائهم ونسائهم وقربت من جذع طويل ممنع
الى الله اشكو غربتي ثم كربتي وما اصدر الاحزاب لي عند مصرعي
فذالعرش صبرني على مايرادبي فقد بضعوا الحمى وقد بان مطمعي
لعمري ما احفل اذا مت مسلما على اي حال كان الله مضجعي[2]

---

[1]- ئیبن ئیسحاق لە چیرۆکی زەیدی کوڕی دسنەوە بەو جۆرە هێناویەتی، لە البداية والنهاية ج٤ ص٦٣ یشدا هاتووە،

[2]- هەیسەمی ج٦ ص٢٠٠ دەڵێت: تەبەرانی گێڕاویەتیەوەو لە سەنەدەکەشدا ئیبن لهیعە هەیەو فەرموودەی حەسەنەو لاوازیەکی تێدایە، تەواو. ئیبن ئیسحاقیش دێڕەکانی هێناوە،

هەروەك لە البداية والنهاية ج٤ ص٦٧دا هاتووەو دوای دێڕی یەكەم ئەمەی بۆ زیاد كردووە:

وكلهم مبدي العداوة جاهد ... علي لاني في وثاقي بمضيع

دوای دێڕی پێنجەمیش ئەمەی هێناوە:

وقد خيروني الكفر والموت دونه ... وقد هملت عيناي من غير مجزع
ومابي حذار الموت اني لميت ... ولكن حذاري حجم نار مافع
فوالله ما ارجوا اذا مت مسلما ... عيى اي جنب كان في الله مضجعي
فلست بمبد للعدو تخشعا ... ولا جزعا اني الى الله مرجعي

## (شەڕی بیئر مەعوونە)

ئیبن ئیسحاق لە موغیرەی كوڕی عەبدولڕەحمان و عەبدولڕەحمانی كوڕی ئەبوبەكری كوڕی موحەمەدی كوڕی عەمری كوڕی حەزم و زانایانێكی دیكەشەوە هێناویەتی دەڵێن: ئەبوبەراء عامری كوڕی مالیكی كوڕی جەعفەر هات بۆ مەدینە بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و پێغەمبەریش بانگی كرد بۆ ئیسلام كەچی موسڵمان نەبوو و دوورەپەرێزیشی نیشان نەداو وتی: ئەی موحەمەد بەڵكو هەندێ لە هاوەڵانت بنێریت بۆ نەجد و بانگیان بكەن بۆ پەیامەكەت هیوام وایە بێن بە دەمتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (اني اخشى عليهم اهل نجد) واتە(دەترسم خەڵكی نەجد زیانیان پێ بگەیەنن) ئەبوبەراء وتی: من پەنایان دەدەم، پێغەمبەریش (ﷺ) مونزیری كوڕی عەرمی بەنی ساعیدەی لەگەڵ چل لە چاكترین هاوەڵانیدا نارد، لەوانە حارسی كوڕی صممەو حەرامی كوڕی مەلحان لە بەنی عەددی كوڕی نەجارو عوروەی كوڕی ئەسمای كوڕی صەلتی سولمی و نافیعی كوڕی بدیلی كوڕی وەقاری خوزاعی و عامری كوڕی فوهەیرەی مەولای ئەبوبەكر لەگەڵ هەندێ لە چاكترین موسڵماناندا، چوون تا لەبیئرمەعوونە – لە نێوان خاكی بەنی عامرو بەنی سەلیمدا– دابەزین،

حەرامی کوڕی مەلحانیان بە نامەیەکی پێغەمبەرەوە (ﷺ) نارد بۆلای عامری کوڕی توفەیل، ئەویش بەبێ سەیرکردنی نامەکە هەڵمەتی بۆ حەرام برد و کوشتی و بەنی عامری لە دژیان هاندا، ئەوانیش وتیان: ئامادەنین پەنای ئەبوبەراء بشکێنین، ئینجا هۆزەکەی بەنی سەلیمی لە دژیان هاندا (عوصەییەو ریعل و زەکوران و قارە) ئەوانیش چوون بە دەمیەوەو گەمارۆیان دان، ئەوانیش شمشێریان هەڵگرت، جەنگان و هەموویان کوژران جگە لە کەعبی کوڕی زەیدی ئەنساری لە بەنی دیناری کوڕی نەجار بەجێیان هێشت و سوکەگیانێکی بەبەرەوە مابوو و لە نێو کوژراوەکاندا خۆی رادەکێشا و چوو، ژیا تا لە رۆژی خەندەقدا کوژرا.

عەمری کوڕی ئومەییەی ضەمری و یەکێك لە پشتیوانان لە بەنی عەمری کوڕی عەوف بەوەیان نەزانی تا ئەوەی باڵندە بەسەر سەربازگەکەدا دەسوڕانەوە، ئەوانیش وتیان ئەمە شتێکە، چوون سەیریان کرد بینییان لەناو خوێندا گەوزاون و بارەکەیان بینی پشتیوانەکە بە عەمری وت: دەڵێت چی؟ وتی: پێم باشە بچین و هەواڵ بدەین بە پێغەمبەر (ﷺ)، پشتیوانیەکە وتی بەڵام حەزناکەم لە شوێنێك مونزیری کوڕی عەمر کوژراوە دەربچم و هەواڵی ئەمانە بگەیەنم، لەگەڵیان جەنگا هەتا کوژرا، عەمریش بەدیل گیرا، کاتێك پێی وتن لە موزەرە عامری کوڕی توفەیل بەریداو لەبەر نەزری بەردانی کۆیلەیەك کە بە بانگەشەی خۆی دەیوت لەسەردایکیەتی ئازادی کرد.[1]

بوخاری لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر (ﷺ) حەرامی بە حەفتا سوارەوە نارد، سەرکردەی بێباوەڕەکان عامری کوڕی توفەیل بوو پێغەمبەری (ﷺ) لەبەردەم سێ پێشنیاردا سەرپشك کرد، وتی: با خەڵکی دەشت بۆ تۆو خەڵکی لادێ بۆ من، یان جێگرت بم، یان بە دووهەزار کەسی غەتفانەوە لەگەڵت دەجەنگم، عامر لە ماڵی ئوم فڵان پێکرا، وتی: دەردی وشترو مەرگی ناوماڵی ئافرەتی بنەماڵەی فڵان، دەی ئەسپەکەم بۆ بێنن، نەفرینی خوای لەسەر بێ لەسەر ئەسپەکەی مرد.

---

[1]- لە البداية والنهاية ج٤ ص٧٣ دا واهاتووە، تەبەرانیش لە رێگەی ئیبن ئیسحاقەوە هێناویەتی، هەیسەمی ج٦ ص١٢٩ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی ئیبن ئیسحاق جێ متمانەن.

حەرام – پیاوێکی شەل بوو– لەگەڵ کەسێکی بەنی قلاندا چوو و وتی: لەم نزیکە بن تا دەچم بۆلایان ئەگەر پەنای منیاندا ئێوەش نزیك بن، ئەگەریش منیان کوشت دەچنەوە بۆلای هاوەڵەکانتان، وتی: پەنام دەدەن تا پەیامی پێغەمبەری خوا بگەیەنم؟ قسەی لەگەڵ دەکردن، ئەوانیش ئاماژەیان دا بە کەسێك و لە پێشیەوە هات و لێیدا، هەمام وتی: وابزانم وتی: تا ڕمێکی کرد بە پشتیدا، وتی: الله اکبر سوێند بە پەروەردگاری کەعبە بردمەوە، هەموویان کوشتن جگە لە شەلەکە کە لەسەر بەرزی شاخێك بوو، خوای گەورە ئەمەی دابەزاندە سەرمان و دواتر مەنسوخ بوو (ان قد لقينا ربنا فرضي عنا وارضانا) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سی بەیانی نزای دژ بە ریعل و زەکوان و بەنب لعیان و بەنی عوصوییە کرد کە لە خوا و پێغەمبەرەکەی یاخی ببوون.

بوخاری لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك حەرامی کوڕی مەلعان کە خاڵۆی بوو لە ڕۆژی بیئرمەعونەدا لێی درا ، خوێنەکەی دا بەدەموچاو و سەریدا و وتی: سوێند بە پەروەردگاری کەعبە سەرکەوتم، واقیدی هێناویەتی دەڵێت: ئەوەی کوشتی جەبباری کوڕی سەلمای کیلابی بوو کاتێك ڕمێکی لێدا وتی: سوێند بە پەروەردگاری کەعبە سەرکەوتم، جەببار پرسیاری کرد بۆچی وای وت؟ وتیان: واتە بەهەشتی دەستکەوت، وتی: بەخوا ڕاست دەکات، دواتر لەبەرئەوە جەببار موسڵمان بوو[1].[2]

## (شەڕی موئتە)

ئیبن ئیسحاق لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەجەمادی یەکەمی ساڵی هەشتی کۆچیدا دەستەیەکی نارد بۆ موئتە و و زەیدی کوڕی حارسەی کرد بە ئەمیریان و فەرمووی (ان اصيب زيد فجعفر بن ابي طالب على الناس، فان اصيب جعفر فعبد الله بن رواحة على الناس) خەڵکی خۆیان

---

[1] – ضعيف.

[2] – لە البداية والنهاية ج٤ ص٧١دا واهاتووە.

ئامادەکرد بۆ چوون و ژمارەشیان سێ هەزار کەس بوو، کە ئامادەی چوون بوون خەڵکی ماڵئاواییان کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) و سەلامیان لێ کرد، کاتێك عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە ماڵئاوایی کرد گریا، وتیان: بۆچی گریایت ئەی ئیبن رەواحە؟ وتی: بە خوا هیچ حەزم لە دونیا و مانەوەی لای ئێوە نیە، بەڵام گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو ئایەتێکی قورئانی دەخوێند کە تیایدا باسی ئاگری دەکرد (وان منکم الا واردها کان علی ربك حتما مقضیا) نازانم دوای ئەوە چیم بەسەردێت، موسڵمانان وتیان: خوا هاودەمتان بێت و بتانپارێزێت و بە سەلامەتی بتانگێڕێتەوە بۆلامان، عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە (رضي الله عنه) وتی:

ولكنني اسال الرحمن مغفرة　　وضربة ذات فرع فقذف الزبدا

وطعمة بيدي حران مجهزة　　بحربة تنفذ الاشحاء والكبد

حق يقل اذا مروا على جدثي　　ارشده الله من غاز وقد رشدا

پاشان کە ئامادەبوون، عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و ماڵئاوایی لێکرد و دواتر وتی:

فثبت الله ماتاك من حسن　　تثبيت موسا ونصرا كالذي نصروا

اني تفرست فيك الخير نافلة　　الله يعلم اني ثابت لبصر

انت الرسول فمن يحرم نوافله　　والوجه منه فقد ازري به القدر

پاشان چوون و پێغەمبەریش (ﷺ) بەڕێی کردن و ماڵئاوایی لێکردن، عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە (رضي الله عنه) وتی:

خلف السلام امدي ء ودعته　　في النخل خير مشيع وخليل

پاشان چوون تا لە (معانا) لە خاکی شام دابەزی، خەڵکی بیستیان هیرەقل لە (مەئاب) لە خاکی بەلقا بە سەد هەزار ڕۆمیەوە دابەزیوە و سەد هەزار کەسیش بە ڕێبەری کەسێکی بەللی و دواتریش یەکێکی ڕاشە کە پێی دەوترا مالیکی کوڕی رافعە لە هۆزەکانی لەخم و جوزام و قەین و بەهرا و بەللی پەیوەستی بوون، کاتێك موسڵمانان ئەمەیان بیست لە (معان) دوو شەو مانەوە تا بزانن چی دەکەن و وتیان:

نامە دەنووسین بۆ پێغەمبەر (ﷺ) و پێی دەڵێین ژمارەی دوژمنیان چەندە یان فەرمانمان پێ دەکات و بە شوێن فەرمانیدا دەچین، عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە خەڵکەکەی هانداو وتی: خەڵکینە سوێند بە خوا ئەوەی ڕقتانە لێی جیایە لەوەی بۆی هاتوون شەهیدی، ئێمە بە ژمارەو هێزی زۆر لەگەڵ خەڵك ناجەنگن، بەو ئایینە لەگەڵیان دەجەنگن کە خوا ڕێزداری کردوین پێی، دەی بڕۆن یان سەرکەوتنە یان شەهیدی، خەڵکی وتیان: بە خوا ئیبن ڕەواحە ڕاست دەکات.

خەڵکی چوون تا گەیشتنە دەوری بەلقاو سوپای هیرەقلیان لەگەڵ عەرەبدا لە گوندێکی بەلقائدا پێ گەیشت کە پێی دەوترا (مشارف) پاشان دوژمن نزیك بوویەوەو موسڵمانان بەرەو گوندێك چوون کە پێی دەوترا (موئتة) لەوێ پێکگەیشتن، موسڵمانان خۆیان بۆ ئامادەکردن، لەلای ڕاستیەوە کەسێکیان لە بەنی عوزەر دانا کە پێی دەوترا قوتەیبەی کوڕی قەتادە، لەلای چەپەوە کەسێك لە پشتیوانان کە پێی دەوترا عوبادەی کوڕی مالیك، دوایی شەڕ دەستی پێکردو زەیدی کوڕی حارسە بە ئاڵاکەی پێغەمبەرەوە (ﷺ) چوویە ناو دوژمن تا کەوتەبەر ڕمی دوژمن، دواتر جەعفەر ئاڵاکەی هەڵگرت و جەنگا تا کوژرا، جەعفەر لەناو موسڵماناندا یەکەم بریندار بوو کە لەسەر ئیسلام بریندار بوو.[1]

تەبەرانی لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە (رضي الله عنه) بە هەمان شێوە هێناویەتی، تیایدا هاتووە دواتر جەعفەر (رضي الله عنه) ئاڵاکەی هەڵگرت و شەڕی کرد تا زۆر چوویە ناو شەڕەوە لە ئەسپەکەی کەوتە خوارەوە، لەگەڵ هۆزەکەدا جەنگا تا کوژرا، جەعفەر یەکەم کەس موسڵمان بوو کە لە ئیسلامدا ئەسپەکەی بریندار کرا.[2][3]

---

[1] – لە البداية والنهاية ج٤ ص٢٤١دا واهاتووە.

[2] – ضعيف.

[3] – هەیسەمی ج٦ ص١٥٧ دەڵێت: تەبەرانی گێڕاویەتیەوە و کەسەکانی سەنەدەکەی عوروە جێ متمانەن، ئەبونەعیم لە الحلية ج١ ص١١٨ لە عوروە بە کورتی هێناویەتی،

ئیبن ئیسحاق لە زەیدی کوڕی ئەرقەمەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: من هەتیو بووم لە ماڵی عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەدا، لەو سەفەرەیدا بردمی لەگەڵ خۆیدا لە دواوە کۆڵێکم هەڵگرتبوو، سوێند بە خوا گوێم لێی بوو ئەم دێرە شیعرانەی دەوت:

| | |
|---|---|
| اذا ادنيتني وحملت رحلتي | مسيرة اربع بعد الحساء |
| فشانك انعم وخلاك ذم | ولا ارجع الى اهلي ورائي |
| وجاء المسلمون وغادروني | بارض الشام مستنهى الثواء |
| وردك كل ذي نسب قريب | الى الرحمن منقطع الاخاء |
| هنالك لاابالي طلع بعل | ولانخل اسافلها رواء |

کاتێك ئەوانەم بیست گریام و ئەویش دەستی هێنا بەسەرمداو وتی: چی دەبێت خوا شەهیدیم پێببەخشێت و تۆش لە نێوان دووبەشی ئەم سەفەرەدا بگەڕێیتەوە؟[1].[2]

ئیبن ئیسحاق لە عەبادی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەو باوکوم کە لە شیریەوە گەورەی کردم و لە بەنی عەمری کوڕی عەوف بوو پێی وتم کە کاتێك جەعفەر (رضي الله عنه) کوژرا عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە (رضي الله عنه) ئاڵاکەی هەڵگرت و لەسەر ئەسپەکەی بوو خێرا چوو و دەیویست دابەزێت و دەهات و دەچوو و دەیوت:

| | |
|---|---|
| اقسمت يا نفس لتنزلنه | لتنزلن او لتكرهنه |
| ان اجلب الناس وشد والرنة | مالي اراك تكرهين الجنة |
| قد طال ما قدكنت مطمئنة | هل انت الانطفة في شنة؟ |

هەروەها دەیوت:

| | |
|---|---|
| يا نفس لاتقتلي تموتي | هذا حمام الموت قد صليت |
| وما تمنيت فقد اعطيت | ان تفعلي فعلهما هديت |

[1] – حسن.

[2] – لە البداية والنهاية ج٤ ص٢٤٣ دا واهاتووە، ئەبونەعیم لە الحلية ج١ ص١١٩و تەبەرانی لە ڕێگەی ئیبن ئیسحاق لە زەیدەوە هێناویانە، لە المجمع ج٦ ص١٥٨ یشدا واهاتووە.

مەبەستی زەیدو جەعفەر بوو، پاشان دابەزیو ئامۆزایەکی هات بۆلایو ئێسقانێکی نیمچە کراوەی پیٚ داو قەپێکی لیٚ گرت، دوایی گوێی لە هاوارو گاڵەی خەڵك بوو، وتی هێشتا تۆ لە دونیادایت، ئێسقانەکەی فڕێداو شمشێرەکەی هەڵگرتو چوو و جەنگا تا کوژرا.[1]

ئیبن ئیسحاق لە عەبادی کوڕی عەبدوڵای کوڕی زوبەیرەوە هێناویەتی دەڵێت ئەو باوکەم کە لە شیرەخۆریەوە گەورەی کردم- لە بەنی عەمری کوڕی عەوف- لە غەزای موئتەدا بەشدار بوو پێی وتم سوێند بە خوا جەعفەرم بینی کاتێك لە ئەسپەکەی دابەزی و دواتر برینـدار بوو پاشان شەڕی کرد تا کوژرا. جەعفەر دەیوت:

یا حبذا الجنة و اقترابها طيبة وبارد شرابها

والروم روم قد دنا عذابها كافرة بعيدة أنسابها

عليّ إن لاقيتها ضرابها[2]

## شەڕی یەمامە

حاکم ج٣ ص٢٢٧ لە عومەری کوڕی عەبدوڕڕەحمان لە ئیبن زەیدی کوڕی خەتتاب لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: زەیدی کوڕی خەتتاب لە ڕۆژی یەمامەدا ئاڵای موسڵمانانی هەڵگرتبوو موسڵمانان ڕایان کرد و حەنیفیەکان سەرکەوتن و زەیدیش هاواری دەکرد چوون بۆ چوون پیاو بۆ پیاوپاشان هاواری دەکرد خوایە

[1]- لە البداية والنهاية ج٤ ص٢٤٥ دا واهاتووە، ئەبونەعیمیش لە الحلیە ج١ ص١٢٠ دا هێناویەتی، تەبەرانیش هێناویەتی و وەك هەیسەمی ج٦ ص١٦٠ دەڵێت کەسەکانی سەنەدەکەی جیٚ متمانەن.

[2]- لە البدايه و النهايه ج٤ ص٢٤٤ دا وا هاتووە، ئەبو داوود لەم ڕووەوە هێناویەتی، لە الاصابه ج١ص٢٣٨دا هاتووە ئەبو نەعیم لە الحليه ج١ص١١٨ دا هێناویەتی.

من لەبەردەمتدا پۆزش دێنمەوە کە هاوەڵانم وا ڕادەکەن و تەبەڕا دەکەم لەوەی موسەیلەمە و مەحکەمی کوڕی توفەیل دەیڵێن ئاڵاکەی توند گرت و بەرەو ناو دوژمن چوو و جەنگا تا کوژرا تا ئاڵاکە کەوت سالمی مەولای ئەبو حوزەیفە ئاڵاکەی هەڵگرت موسڵمانان وتیان سالم دەترسین لەلای تۆوە بێن بۆمان سالم وتی ئەگەر لای منەوە بێن بۆتان هەڵگرێکی خراپی قورئانیم زەیدی کوڕی خەتتاب لە ساڵی ١٢ کۆچیدا کوژرا ئیبن سەعد ج٣ ص٢٧٤ لە عەبدوڕەحمانەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی.

تەبەرانی لە کچی سابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەماسەوە فەرموودەیەکی هێناوەو تیایدا هاتووە: کاتێک ئەبووبەکر موسڵمانانی بانگکرد بۆ شەڕی هەڵگەڕاوەکان (یەمامەو موسەیلەمەی درۆزن) سابتی کوڕی قەیس لەگەڵ کۆمەڵێکدا چوو، کە گەیشتن بە موسەیلەمەو بەنی حەنیفە سێ جار موسڵمانان شکان، سابت و سالمی مەولای حوزەیفە وتیان ئێمە لەگەڵ پێغەمبەردا وا شەڕمان نەدەکرد، چاڵێکیان بۆ خۆیان هەڵکەندو چوونە ناویەوەو جەنگان تا کوژران، هەیسەمی ج٩ص٣٢٢ دەڵێت: کچی سابتی کوڕی قەیس ناناسم، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە صەحیحن، وادیارە کچی سابتی کوڕی قەیس هاوەڵ بێت، چونکە وتی لە باوکمم بیست، تەواو. ئیبن عەبدولبر لە الإستیعاب ج١ص١٩٤ بەو جۆرە هێناویەتی، بەغەویش بەو سەنەدە هێناویەتی، لە الإصابە ج١ص١٩٦یشدا هاتووە، عیکرمەی کوڕی ئەبوو جەهل لە ڕۆژی فلاندا دابەزی، خالیدی کوڕی وەلید پێی وت وامەکە کوژرانت بۆ موسڵمانان سەختە، وتی خالید وازم لێبێنە تۆ خۆت لەگەڵ پێغەمبەردا پێشینەیەکت هەیەو من و باوکیشم سەرسەختترین نەیاری پێغەمبەر بووین، عیکرمە چوو تا کوژرا، لە کنز العمال ج٧ص٧٥دا واهاتووە، بەیهەقیج٩ص٤٤ لە سابتەوە هێناویەتی.

سەیفی کوڕی عومەر لە ئەبی عوسمانی غەسانییەوە لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: عیکرمەی کوڕی ئەبوجەهل لە ڕۆژی یەرموکدا وتی: دژ بە پێغەمبەر (ﷺ) لە

چەند شەڕێکدا بووم، ئەمڕۆ لەدەست ئێوە ڕابکەم (ئەی دوژمنانی ئیسلام)! پاشان هاواری کرد کێ بەیعەتی مەرگ دەدات؟ حارسی کوڕی هیشامی مامی و زراری کوڕی ئەزوەر بە چوارسەد کەسی دیارو سوارچاکی موسڵمانانەوە بەیعەتیان پێدا، لە پێش چادرەکەی خالیدەوە شەڕیان کرد تا هەموو بریندار بوون و ژمارەیەکیان کوژران، لەوانە زرار کوژرا.[1]

## (چیرۆکی هاوەڵان (رضي الله عنهم) لەسەر حەزی کوژرانی ڕێی خوا)

تەبەرانی و ئەبویەعلا لە ئەبولبوختەری و مەیسەرە هێناویانە عەمماری کوڕی یاسر(رضي الله عنه) لە ڕۆژی صفیندا دەجەنگا و نەدەکوژرا، دەهات بۆلای عەلی (رضي الله عنه) دەیوت: ئەی ئەمیری باوەڕداران ڕۆژی فڵان و فڵان، ئەویش دەیوت: بەدوور بوویت (لە کوژران) سێ جار وتی: پاشان شیرێك هێنراو خواردیەوە و دواتر وتی: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی ئەمە کۆتا خواردنەوەیە لە دونیادا نۆشی دەکەم، پاشان هەستا و جەنگا تا کوژرا.[2]

تەبەرانی لە ئەبی سەنانی دوئلیەوە (رضي الله عنه) کە هاوەڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو هێناویەتی دەڵێت: عەمماری کوڕی یاسرم بینی داوای بڕێك خواردنەوەی لە غولامێکی کرد، ئەویش قاپێ شیری بۆ هێناو نۆشی کرد، پاشان وتی: خواو پێغەمبەرەکەی ڕاستیان فەرموو، ئەمڕۆ دەگەمەوە بە ئازیزانم موحەمەدو هاودەمانی ئینجا فەرموودەکە دێنێت.[3]

---

[1] – لە البداية والنهاية ج٧ ص١١ دا واهاتووە.

[2] – هەیسەمی ج٩ ص٢٩٧ دەڵێت: تەبەرانی و ئەویەعلا بە چەند سەنەدێك هێناویانە لە هەندێ سەنەدیدا عەتای کوڕی سائیب هەیە، کەسەکانی دیکە جێ متمانەن، سەنەدەکانی دیکە لاوازن، تەواو.

[3] – هەیسەمی ج٩ ص٢٩٨ دەڵێت سەنەدەکەی حەسەنە.

تەبەرانی لە ئیبراهیمی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: گوێم لە عەمماری کوڕی یاسر بوو لە صفین لەو ڕۆژەی تیایدا مرد هاواری دەکرد: من گەیشتم بە خواو لەگەڵ حۆریەکاندا هاوسەرگیریم کردو ئەمڕۆ دەگەینەوە بە ئازیزان موحەمەدو هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرمووم: کۆتا پشکی دونیات بڕێك شیر بێت.[1]

بەغەوی بە سەنەدی صەحیح لە ئەنەسەوە هێناویەتی دەڵێت: چووم بۆ لای بەرائی کوڕی مالیك گۆرانی دەوت، وتم: خوا ئەوەی بۆ گۆڕیویت بە چاکتر، وتی: دەترسیت لەسەر جێگەکەم بمرم؟ نەبەخوا شتی وام تووش ناکات، بە تەنها سەد شەڕم کردووە جگە لەوەی لای ئێوەش بەشداربووم.[2]

ئیبن سەعد ج٣ ص٨٨ لە موحەمەدی کوڕی سابتی کوڕی قەیسی کوڕی شەماسەوە هێناویەتی دەڵێت: لە ڕۆژی یەمامەدا کە موسڵمانان شکان سالمی مەولای ئەبی حوزەیفە وتی: لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) وا شەڕمان نەدەکرد، چاڵێکی هەڵکەندو چوویە ناویەوەو ئاڵاکەی کۆچەرانیشی پێ بوو جەنگا کرد تا کوژرا، لە ساڵی دوانزەی کۆچی لە شەڕی یەمامە لە سەردەمی خیلافەتی ئەبوبەکردا شەهیدبوو.

هەروەها ئیبن سەعد ج٣ ص٤٣١ لە ئەبی سەعیدی خودریەوە هێناویەتی دەڵێت: گوێم لە عەبادی کوڕی بشیر(رضي الله عنه) بوو دەیوت: ئەی ئەبوسەعید ئەمشەو وام دەبینی

---

[1]- هەیسەمی ج٩ ص٢٩٦ دەڵێت: تەبەرانی لە المعجم الوسیط و ئەحمەد بە کورتی هێناویانە و کەسەکانی سەنەدەکانیان صەحیحن، بەزاریش بەسەنەدی لاواز هێناویەتی، لە گێڕانەوەیەکی ئیمامی ئەحمەددا هاتووە: کاتێك شیری بۆ هێنرا پێکەنی.

[2]- لە الاصابة ج١ ص١٤٣دا واهاتووە، تەبەرانی بەو واتایە هێناویەتی، هەیسەمی ج٩ ص٣٢٤ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن حاکم المستدرك ج٣ ص٢٩١ بەو واتایە هێناویەتی دەڵێت: لەسەر مەرجی بوخاری و موسلیم صەحیحە بەڵام بوخاری و موسلیم نەیانهێناوە، ئەبونەعیمیش لە الحلیة ج١ ص٣٥٠دا بەو جۆرە هێناویەتی.

ئاسمانم لێ کرایەوەو دوایی خۆی دا بەسەرمدا، پشت بەخوا ئەوە شەهیدیە، منیش وتم: خێر دەبێت، دەڵێت: لە ڕۆژی یەمامەدا سەیرم دەکرد هاواری پشتیوانانی دەکرد کالانی شمشێرەکانیان بشکێنن و لە خەڵکەکە جیابن، دەیوت (اخلصونا، اخلصونا) بەوە چوارسەد کەسی پشتیوانان کە کەس تێکەڵیان نەبوو بە ڕێبەری عوبادەی کوڕی بەشیرو ئەبودوجانەو بەرائی کوڕی مالیك جیابوونەوەو چوونە بەردرگای باخچەکەو شەڕێکی سەختیان کردو عبادی کوڕی بشیر کوژرا، هێندەی لێدرابوو دەموچاوی شێوابوو و تەنها بە هێمایەکی لەشیدا ناسیمەوە.

هەروەها ج٣ ص٤٧٤ لە جەعفەری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەسلەمی هەمەدانیەوە هێناویەتی دەڵێت: لە ڕۆژی یەمامەدا یەکەم کەس برینداربوو ئەبوعقیلی ئەنیفی بوو کە تیرێك بەر نێوان دووشان و سەرسنگی کەوت خێرا تیرەکەی دەرهێنا و لای چەپی بە ئازار بوو، ئەمە لە سەرەتای ڕۆژەوە، کاتێك شەڕەکە گەرم بوو و موسڵمانان شکان و گەڕانەوە ئەبوعقیل بە دەست برینەکەیەوە دەیناڵاند، گوێی لە میعنەی کوڕی عەددی بوو کە هاواری پشتیوانانی دەکرد الله الله بدەنەوە بەسەر دوژمندا، میعەن بەرەو ڕووی دوژمن دەچوو و هاواری پشتیوانانی دەکرد (اخلصونا، اخلصونا) ئەوانیش یەك یەك دەچوون، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەڵێت: ئەبوعقیل هەستا تا بەرەو ئەوێ بچێت وتم: ئەبوعقیل چی دەکەیت تۆ کە شەڕت لەسەر نیە؟ وتی: هاوارکەرەکە ناوی منیشی هێنا، ئیبن عومەر وتی: ئەو دەڵێت پشتیوانان مەبەستی بریندارەکان نیە، ئەبوعقیل وتی: منیش یەکێکم لە پشتیوانان و ئەگەر لەسەر ئەژنۆش بێت دەچم بەدەمیەوە، حیزامی بەست و شمشێری بە دەستی ڕاستی گرت و هاواری دەکرد: پشتیوانان وەك لە ڕۆژی حونەین پێشکەوتن، ئەوانیش هەموو پێشکەوتن و موسڵمانانیان بەسەر دوژمندا بردن و شوێنەکەیان وێران کرد بەسەر دوژمندا، شمشێرەکانیان تێکەڵ بەیەك بوون، سەیری ئیبن عقیلم کرد دەستە بریندارەکەی برابوو، کەوتە سەر زەوی و چواردە برینی پێوەبوو و کوشتی موسەیلەمەی دوژمنی خوای لێکەوتەوە، ئیبن عقیل کەوتە سەر زەوی و منیش بانگم

کردو ئەویش بە ناڕەحەتیەکەوە وتی: گەیشتە چی؟ وتم: مژدە بێت، بە دەنگی بەرز هاوارم دەکرد دوژمنی خوا کوژرا، ئەویش پەنجەی بەرەو ئاسمان بەرزکردەوەو سوپاسی خوای کردو مرد، دوای ئەوە هەواڵم دا بە عومەر، ئەویش وتی: ڕەحمەتی خوای لێ بێت، بەردەوام داوای شەهیدی دەکرد.

تەبەرانی لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك خەڵکی لە یەمامە شکان بە سابتی کوڕی قەیسم وت: نابینی مامەگیان؟ ئەویش هەناسەی هەڵدەکێشاو وتی: لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) وا شەڕمان نەدەکرد، بە ڕاستی باش داوتانەتە دواوە، خوایە من دووره پەرێزی دەگرم لەوەی ئەمانە هێناویانەو دەیکەن، پاشان جەنگا تا کوژرا.[1] لە فتح الباري ج٦ ص٤٠٥ دا هاتووە: لە ڕۆژی یەمامەدا موسڵمانان شکان، سابت وتی: ئوف بۆ ئەمانەو پەرستنەکەشیان، ئوف بۆ ئەمانەو هەوڵیان، کابرایەکیش لەسەر پەیژەیەك بوو، کوشتی و خۆیشی کوژرا.[2]

## (شەڕی یەرمووك)

یەعقوبی کوڕی ئەبی سوفیان و ئیبن عەساکیر لە سابتی بەنانیەوە هێناویانە بە هاوەڵەکانی وت: بە ڕاستی خراپ داوتانەتە دواوە، هەڵیکوتایە سەر دوژمن و خوای گەورە فەتحی بە موسڵمانان بەخشی، لەو ڕۆژەدابوو بەراء شەهید بوو.

ئیبن سەعد و ئەبوعوبەیدە لە عەبدوڵڵای کوڕی عوتبەوە هێناویانە بیستوویەتی کە عومەری کوڕی خەتتاب وتی: کاتێك عوسمانی کوڕی مەظعون بەبێ کوژران مرد ئازارێکی زۆر کەوتە دەروونمەوە، وتم: سەیری ئەو کابرا بکەن کە لە هەمووان زیاتر

---

[1] – لە الاصابە ج١ ص١٩٥ دا هاتووە، دەڵێت: بە کورتی لای بوخاری هەیە، هەیسەمی ج٩ ص٣٢٣ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن، حاکم ج٣ ص٢٣٥ هێناویەتی و لەسەر مەرجی موسلیم بە صەحیحی داناوە،

[2] – بەیهەقی ج٩ ص٤٤ لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) بەو واتایە هێناویەتی.

دەستی لە دونیا بەردابوو مردو نەکوژرا، عوسمان بەردەوام لە دەروونمدا ئەو پلەیەی هەبوو تا پێغەمبەر (ﷺ) مرد وتم: ئەی ڕۆحەکانمان دەمرن، دواتر ئەبوبەکر مرد وتم: ئەی ڕۆحەچاکەکانمان هەر دەمرن [illegible] پلەیەی جارانی گەڕایەوە ناو دەروونم.[1]

## دلێری هاوەڵان (رضي الله عنهم)

## دلێریی ئەبوبەکر (رضي الله عنه)

بەزار لە عەلیەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی وتی: خەڵکینە پێم بڵێن دلێرترین کەس کێ یە؟ وتیان: تۆ ئەی ئەمیری باوەڕداران، وتی: من بەرامبەر هەرکەس بوومەتەوە ماف تەواوی خۆمم لێ وەرگرتووە، بەڵام پێم بڵێن دلێرترین کەس کێیە؟ وتیان نازانین کێیە؟ وتی: ئەبوبەکر بوو، لە ڕۆژی بەدردا کەپرێکمان بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دروست کرد، وتمان کێ لای پێغەمبەر (ﷺ) دەبێت هەتا هیچ کام لە بێباوەڕان نزیکی نەکەونەوە؟ سوێند بەخوا کەس نەچوو جگە لە ئەبوبەکر کە شمشێرەکەی لەسەری پێغەمبەرەوە (ﷺ) بوو هەرکەس نزیکی بکەوتایەتەوە دەچوو بۆی، ئەو دلێرترین کەس بوو، فەرموودەکە دێنێت.

## دلێری عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه)

ئیبن عەساکیر لە عەلی کوڕی ئەبوتالیبەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی وتی: هەمووان بەشاراوەیی کۆچیان کرد جگە لە عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) کاتێك ویستی کۆچ بکات شمشێرەکەی هەڵگرت و دای بەسەر شانیداو چەند تیرێکیشی لە دەستدابوو، هاتە کەعبەو خانەدانەکانی قورەیشیش لەوێ بوون، حەوت جار تەوافی کەعبەی کرد، دوایی دوورکات نوێژی لە مەقامی ئیبراهیمدا کرد، پاشان یەك یەك دەچوویە ناو کۆڕەکانیان، وتی: هەموو سەیرکەن کێ دەیەوێت دایکی ڕۆڵەڕۆی بۆ بکات و

---

[1] – لە المنتخب ج٥ ص٢٤٠ دا واهاتووە.

کوڕی هەتیو و ژنی بێوەژن بکەوێت با لەگەڵم بێتە پشت ئەو دۆڵە، کەسیان نەکەوتنە شوێنی.[1]

## (دلێری عەلی کوڕی ئەبی تالیب (رضي الله عنه))

تەبەرانی لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبی تالیب (رضي الله عنه) چوو بۆلای فاتیمە لە ڕۆژی شەڕی ئوحوددا و وتی: (بەبێ زەحمەت ئەو شمشێرەم بدەرێ) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (لئن كنت احسنت القتال لقد احسنه سهل بن حنيف و ابو دجانة سماك بن خرشة).[2,3]

ئیبن جەریر لە ڕێگەی ئیبن ئیسحاق لە یەزیدی کوڕی ڕۆمان لە عروەو عەبدوڵڵا لە کەعبی کوڕی مالیکی ئەنساریەوە هێناویەتی دەڵێن: لە ڕۆژی خەندەقدا عەمری کوڕی عەبدود بە فێرکاریەوە چوو تا ڕۆڵی خۆی بینی، کاتێک بە ئەسپەکەیەوە وەستا عەلی پێی وت: ئەی عەمر تۆ بەڵێنی خوات بە قورەیش دابوو هەرکەس بانگت بکات بۆ دووشت یەکێکیان هەڵبژێریت، وتی: دەی بانگت دەکەم بۆلای خواو پێغەمبەرەکەی‌و ئیسلام، وتی: هیچ پێویستیەکم پێی نیە، وتی: دەی بانگت دەکەم بۆ بەرەنگاربوونەوە، وتی: بۆچی برازاکەم؟ بەخوا حەزناکەم بتکوژم، عەلی وتی: بەڵام من حەزدەکەم تۆ بکوژم، ئەو کات عەمر هەڵچوو و بەرەو عەلی چوو، دابەزین‌و جەنگان‌و عەلی (رضي الله عنه) کوشتی.[4]

لە البداية والنهاية ج٤ ص١٠٦ لە ڕێگەی بەیهەقی لە ئیبن ئیسحاقەوە هاتووە دەڵێت: عەمری کوڕی عەبدود کە خۆی بە ئاسن داپۆشیبوو چوویە دەرێ‌و هاواری

---

[1] – لە منتخب كنز العمال ج٤ ص٣٨٧ دا واهاتووە.

[2] – ضعيف.

[3] – هەیسەمی ج٦ ص١٢٣ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن.

[4] – لە كنز العمال ج٥ ص٢٨١ دا واهاتووە.

کرد کێ شەڕم لەگەڵ دەکات، عەلی کوڕی ئەبوتالیب(رضي الله عنه) هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من دەچم بۆی ، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (ئەوە عەمرە دانیشە) پاشان عەمر هاواری کرد کەس نەبوو لەگەڵم بجەنگیٚ؟ سەرکۆنەی دەکردن و دەیوت ئەو بەهەشتەی دەتانوت هەرکامتان بکوژرێت دەچنە ناوی لە کوێیە؟ کەستان نیە بەرەو ڕووم بجەنگیٚ؟ عەلی هەستاو وتی: ئەی پێغمبەری خوا با من لەگەڵی بجەنگم، فەرمووی (دانیشە) عەمر بۆ جاری سێیەم وتیەوەو شعرەکەی تری وت، عەلیش هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من، فەرمووی (ئاخۆ ئەوە عەمرە) وتی: باعەمریش بێت، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) مۆڵەتی پێدا، عەلی چوو بۆلای تاهات و دەیوت:

لا تعجلن فقد اتاك — مجيب صوتك غير عاجز

في نية و بصيرة — والصديق منجى كل فائز

اني لارجو ان اقيم عليك — نائحة الجنائز

من ضربة نجلاء — يبقى ذكرها عند الهزاهز

عەمر پێی وت تۆ کێیت؟ وتی: من عەلیم، وتی: نەوەی عەبد مەناف؟ وتی: من عەلی کوڕی ئەبوتالیبم، وتی: برازاکەم لە مامەکانتا لە تۆ بەتەمەنتر هەیە من حەزناکەم خوێنی تۆ بڕێژم، عەلی (رضي الله عنه) پێی وت: بەڵام بەخوا من ڕقم لەوەنیە خوێنت بڕێژم، ئەویش تووڕەبوو و دابەزی و وەك گڕی ئاگر هەڵگیرساو بەرەو ڕووی عەلی چوو، عەلیش بە قەڵغانەکەیەوە چوو، عەمر دای لە قەڵغانەکەی و لەتی کرد و شمشێرەکەی تێدا مایەوەو سەری ئازاری بەرکەوت و عەلیش دای لە ڕەگی پشت ملی و خستی، تەپوتۆز کەوتەوەو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەنگی الله اکبری بیست، ئەو کات زانیمان عەلی (رضي الله عنه) ئەوی کوشتووە، پاشان عەلی دەیوت:

اعلي تقتحم الفوارس هكذا — عني و عنهم اخروا اصحابي

اليوم يمنعني الفرار حفيظتي — ومصمم في الراس ليس بناني

یا ئەوەی وتی:

عبد الحجارة من سفاهة راية و عبدت رب محمد بصواب

فصدرت حين تركتة متجد لا كالجذع بين دكاك و روابي

و عففت عن اثوابه ولو انني كنت المقطر بزني اثوابي

لا تحسبن الله خاذل دينه و نبيه يا معشر الاحزاب

پاشان عەلی بەرەو ڕووی پێغەمبەر (ﷺ) هاتو ڕوخساری وەك مانگ وابوو، عومەری کوڕ خەتتاب (رضي الله عنه) پێی وت: با قەڵغانەکەیت ببردایە چونکە لەناو عەرەبدا قەڵغانی باشی وانەبوو، وتی: لێمداو عەیبی بەوە داپۆشرابوو، بۆیە شەرمم لە ئامۆزاکەم کرد تا بیبەم، موسلیمو بەیهقی لە سەلەمەی کوڕی ئەکوعەوە فەرموودەیەکی دوورودرێژیان هێناوەو تیایدا باسی گەڕانەوە لە شەڕی بەنی فزازەیان دەکات، وتی: سێ ڕۆژماینەوەو دواتر چووین بۆ خەیبەر، عامر هاتو دەیوت:

والله لولا انت ما اهتدينا ولا تصدقنا ولاصلينا

و نحن من فضلك ما استغينا فانزلن يكينة علينا

و ثبت الاقدام ان لاقينا

پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (کێ یە ئەوە دەڵێت؟) وتیان: عامر، فەرمووی (پەروەردگارت لێت خۆش بێت) دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) تایبەتمەندی بەهەرکەس بدایە شەهید دەبوو، عومەر – لەسەر وشترێك بوو دەیوت خۆزگە وەك عامرمان بۆ بوایە، وتی: چووین بۆ خەیبەرو مەرحەب هاتو شمشێرەکەی دەتەکاندو دەیوت:

قد علمت خيبر اني مرحب شاكي السلاح بطل مجرب

اذا الحروب اقبلت تلهب

عامریش لە ڕووی هەستاو دەیوت:

قد لمت خيبر اني عامر شاكي السلاح بطل مغامر

هەریەکەو شمشێرەکەی بۆ ئەوی تر وەشاند، شمشێرەکەی مەرحەب چەقیەناو قەڵغانەکەی عامر، ویستی بەرەو ڕووی مەرحەبی ببات کە بە ڕووی خۆیدا

گەڕایەوەو ژێر چاوی بڕیو خوی پێکا، سەلەمە(رضي الله عنه) دەیوت: منیش چووم دەبینم دەستەیەکی هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەیانوت کارەکەی عامر پووچ بوویەوە چونکە خۆی کوشتەوە، منیش چووم بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)و دەگریام، فەرمووی (چیتە؟) وتم: وتیان عامر کارەکەی پووچ بوەتەوە، فەرمووی (کێ ئەوەی وت؟) وتم: هەندێ لە هاوەڵانت، فەرمووی (ئەوانە درۆیان وت بەڵکو دووجار پاداشتی بۆ هەیە)ئینجا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناردی بە شوێن عەلیدا، چاوی عەلیش ئازاری هەبوو، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (ئەمڕۆ ئاڵاکە دەدەمە دەست کەسێك کە خواو پێغەمبەری خوای خۆش دەوێت) منیش چووم عەلیم هێنا، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تفی دا لە چاوی و چاوی چاك بوویەوە، ئینجا ئاڵاکەی پێدا، مەرحەب هات و خۆی نواندو شعرەکەی پێشووی وتەوە: عەلیش (رضي الله عنه) خۆی بۆ نواندو وتی:

انا الذي سمتني امي حيدره　　　　كليث غابات كرية المناظرة
او فيهم بالصاع كيل السندرة

دای لە مەرحەب و سەری برد بە ئاسماندا و کوشتی و فەتح ڕوویدا، بەو جۆرە لە دەقەکەدا هاتووە کە عەلی (رضي الله عنه) مەرحەبی جوولەکەی (نەفرینی خوای لێ بێت) کوشت، ئیمامی ئەحمەد لە عەلیەوە (رضي الله عنه) وا هێناویەتی دەڵێت: کاتێك مەرحەبم کوشت سەرەکەیم هێنا بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) موسای کوڕی عوقبەش لە زوهریەوە هێناویەتی ئەوەی مەرحەبی کوشت موحەمەدی کوڕی مەسلەمە (رضي الله عنه) بوو، موحەمەدی کوڕی ئیسحاقیش لەگەڵ واقیدی لە جابرەوە (رضي الله عنه) و پێشینەی دیکەشەوە وایان هێناوە[1].[2]

ئیبن ئیسحاق لە هەندێ لە کەسانیەوە لە ئەبی ڕافیعەوە (رضي الله عنه) کە مەولای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ عەلی (رضي الله عنه) چووین بۆ خەیبەر،

---

[1] – ضعيف.

[2] – له البداية والنهاية ج٤ ص١٨٧ دا واهاتووه.

پێغەمبەر (ﷺ) بە ئاڵایەکەوە ناردی، کە لە قەڵاکە نزیک بوویەوە خەڵکی قەڵاکە هاتنە دەرەوە بۆی، ئەویش لەگەڵیان جەنگا، یەکێك لە جوولەکەکان شمشێرێکی بۆ وەشاندو قەڵغانەکەی لە دەستی خستە خوارەوە، عەلی (ﷺ) لە جیاتی ئەوە دەرگای قەڵاکەی هەڵگرت و کردی بە قەڵغان بۆ خۆی، بەردەوام لە دەستیدا بوو و دەجەنگا تا خوای گەورە فەتحی بۆ بەدی هێنا، ئینجا فڕێیدا، ئاگام لێبوو حەوت کەسی ترم لەگەڵدابوو دەمانویست ئەو دەرگا سەراوژووربکەینەوە نەماندەتوانی، بەڵام پچڕانێکی دیار لەم گێڕانەوەدا هەیە، بەڵام بەیهەقی و حاکم لە ڕێگەی ئەبوجەعفەری باقر لە جابرەوە هێناویانە کە عەلی (ﷺ) لە ڕۆژی فەتحی خەیبەردا دەرگای قەڵاکەی هەڵگرت تا موسڵمانان پێی سەرکەوتن و قەڵاکەیان بڕی، پاشان چل کەس پێیان هەڵنەدەگیرا، لاوازیەك لەمیشدا هەیە، لە گێڕانەوەیەکی لاوازیشدا هاتبووە: جابر دەڵێت: پاشان حەفتا کەس کۆبوونەوە تا دەرگاکە بگێڕنەوە.[1]

ئیبن ئەبی شەیبە لە جابری کوڕی سەمرەوە هێناویانە کە عەلی (ﷺ)لە ڕۆژی خەیبەر دەرگای قەلاکەی هەڵگرت تا موسڵمانان سەرکەوتن، دوایی فڕێیداو چل کەس ئینجا پێیان هەڵگیرا.[2]

## (دلێری تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا (ﷺ))

ئیبن عەساکیر لە تەلحەوە (ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: لە شەڕی ئوحوددا ئەم شیعرەم دەوت:

نحن حماة غالب والك                نذب عن رسولنا المبارك

نضرب عنه القوم في المعارك          ضرب صفاح الكوم في المبارك

---

[1] – لە البداية والنهاية ج٤ ص١٨٩ دا هاتووە.

[2] – منتخب كنز العمال ج٥ ص٤٤ هێناویەتی و دەڵێت حەسەنە.

هەر كە پێغەمبەر (ﷺ) لە شەڕی ئوحود گەڕایەوە بە حەسانی فەرموو (قل فی طلحة) واتە(لەبارەی تەلحەوە شیعر بڵێ) ئەویش وتی:

و طلحة يوم الشعب اسى محمدا — على ساعة ضاقت عليه و شقت

يقيه بكفيه الرماح واسلمت — اشجاعه تحق اليوف فشلت

و كان امام الناس الا محمدا — اقام رحى الاسلام حتى استقلت

ئەبوبەكری صدیقیش (رضي الله عنه) وتی:

حمى نبي الهدى والخيل تتبعه — حتى اذا مالقوا حامى عن الدين

صبرا على الطعن اذ ولت حماتهم — والناس من بين مهدي و مفتون

يا طلحة بن عبيدالله قد وجبت — لك الجنان وزوجت المها العين

عومەریش (رضي الله عنه) دەیوت:

حمى نبي الهدى باليسف منصلتا — لما تولى جميع الناس وانكشفوا

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ڕاستت وت ئەی عومەر.[1 2]

## (دلێری زوبەیری کوڕی عەوام (رضي الله عنه))

ئیبن عەساکیر لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە هێناویەتی دەڵێت: یەکەم کەس لە پێناوخوادا شمشێری هەڵکرد زوبەیری کوڕی عەوام بوو، ڕۆژێك بوو کە گوێ لە دەنگێك گیرا وتی: پێغەمبەری خوا کوژرا، ئەویش شمشێرەکەی هەڵکێشاو چوو، پێغەمبەر (ﷺ) هێواش هێواش پێی گەیشت، فەرمووی چیتە ئەی زوبەیر؟ وتی:

---

[1] – ضعیف.

[2] – لە منتخب كنز العمال ج٥ ص٦٨ دا دەڵێت: لە سەنەدەکەدا سولەیمانی کوڕی ئەییوبی طاسی هەیە، ئیبن عەددی دەڵێت: بە گشتی فەرموودەکانی جێی بە دواداچوون نین، ئیبن حەببان لەناو جێ متمانەکاندا باسی دەکات، لە اللسان ج٣ ص٧٧ یشدا هاتووە، پێشتریش باسی شەڕو هەوڵی تەلحەمان لە شەڕی ئوحوددا کرد.

بیستم تۆ کوژراویت، فەرمووی ئەی ویستت چی بکەیت؟ وتی: سوێند بەخوا ویستم بچم بەرەو ڕووی خەڵکی مەککە ببمەوە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) نزای خێری بۆ کرد، لەم بارەیەوە ئەسەدی دەڵێت:

| | |
|---|---|
| هذاك اول سيف سل في غضب | لله، سيف الزبير المرتضى انفا |
| حمية سبقت من فضل نجدته | قد يحسبن النجدات المحبس الارفا |

ئیبن عەساکیرو ئەبونەعیم ج١ ص٨٩ لە عروەوە هێناویانە زوبەیری کوڕی عەوام (رضي الله عنه) دەنگێکی شەیتانی بیست (پاش ئەوەی موسڵمان بوو) کە موحەمەد برا، ئەو کات زوبەیر تەمەنی دوانزە ساڵ بوو، شمشێرەکەی هەڵکێشا و بە کوچەو کۆڵانەکاندا دەچوو تا گەیشتە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە سەرووی مەککەوە، هێشتا شمشێرەکەی لە دەستدابوو، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو ئەوە چیتە؟ وتی: بیستوومە تۆیان بردووە، فەرمووی ئەی چیت دەکرد (ئەگەر وابوایە)؟ وتی: بەم شمشێرەم دەمدا لەو کەسەی وایکردبوو، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) نزای بۆ خۆی و شمشێرەکەی کردو فەرمووی بڕۆ، یەکەم شمشێری هەڵکێشراو لە پێناوی خوا ئەوە بوو[1][2].

یونس لە ئیبن ئیسحاقەوە هێناویەتی تەلحەی کوڕی ئەبی تەلحەی عەبدەری هەڵگری ئاڵای بێباوەڕان لە ڕۆژی ئوحوددا داوای زۆرانبازی کرد، کەس نەچوویە پێشەوە، زوبەیری کوڕی عەوام چوویە پێشەوە بۆی و چوویە سەر وشترەکەی ئەو و خستیەخوارەوەو بە شمشێرەکەی سەری بڕی، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ستایشی کردو وتی: هەر پێغەمبەرێك چەند حەواریەکی هەبوون، حەواری منیش زوبەیرە، وتی:

---

[1] - صحيح.

[2] - لە منتخب كنزالعمال ج٥ ص٦٩ دا واهاتووە، زوبەیری کوڕی بەکار هێناویەتی، لە الاصابة ج١ ص٥٤٥ دا واهاتووە، ئەبونەعیم لە الدلائل ص٢٢٦ لە سەعیدی کوڕی موسەیبەوە بەو واتایە هێناویەتی.

ئەگەر ئەو نەچوایە بۆی خۆم دەچووم بۆی کاتێك بینیم خەڵکی خۆیان بەدووردەگرن لێی.[1]

یونس لە ئیبن ئیسحاقەوە هێناویەتی دەڵێت: نەوفەلی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی موغەیرەی مەخزومی لە ڕۆژی خەندەقدا داوای زۆرانبازی کرد (شەڕی ڕووبەڕوو) زوبەیری کوڕی عەوام چوو بۆیو بە شمشێر لێیدا تا کردی بە دوو لەتەوەو کەلێك کەوتە شمشێرەکەی، ئینجا گەڕایەوە و دەیوت:

انى امرؤ احمى واحتمى عن النبي المصطفى الامي[2]

ئیبن جەریر لە ئەسمائی کچی ئەبوبەکرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: یەکێك لە بێباوەڕان بە چەکەوە هات تا چوویە بەرزاییەك و وتی: کێ شەڕی دوو کەسیم لەگەڵدا دەکات، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە یەکێك لە موسڵمانانی فەرموو (اتقوم اليه؟) واتە(هەڵدەستیت بچیت بۆی؟) وتی: ئەگەر دەتەوێت ئەی پێغەمبەری خوا دەچم! زوبەیر زوو زوو خۆی دەهێنایە بەرچاوی. تا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سەیری کردو فەرمووی (ئیبن صەفیە هەستە) ئەویش چوو و بەرامبەری وەستاو کەوتنە یەكو درێژەی کێشا، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (ايهما وقع الحضيض اول فهو المقتول) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و موسڵمانان نزایان کردو بێباوەڕەکە کەوتو زوبەیریش کەوت بەسەر سنگیداو کوشتی.[3]

بوخاری لە عوروەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی کە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ڕۆژی یەرمووکدا بە زوبەیریان وت: بۆچی لێنانەویت تا ئێمەش لەگەڵت لێنەوین؟ وتی:

---

[1] – لە البداية والنهاية ج٤ ص١٢٠ دا واهاتووە.

[2] – لە البداية والنهاية ج٤ ص١٠٧ دا واهاتووە.

[3] – لە منتخب كنز العمال ج٥ ص٦٩ دا واهاتووە.

ئەگەر وابکەم ئێوە ڕاست ناکەن، وتیان وانیە، ئەویش هەڵمەتی برد تا چوویە ناو دوژمن و ریزەکانی بڕین و کەسی لەگەڵدا نەبوو،پاشان دووبارە گەڕایەوە، ڕەشوەکەیان گرت و لە دوو شوێنەوە سەرشانیان پێکا، لە نێوان دوو پێکرانەکەدا پێکرانێکی ڕۆژی بەدریش هەبوو، عروەی کوڕی زوبەیر دەڵێت: من بچوك بووم و لە یاریکردن پەنجەم دەکرد بە شوێنە پێکرانەکاندا، عروە دەڵێت: عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیریش (ﷺ) ئەو کات تەمەنی دەساڵان بوو و لەگەڵیدا بوو، خستیە سەر ئەسپێك و دایە دەست کەسێك، لە البداية والنهاية ج٧ ص١١ دا بەو واتایە هاتووە و ئەمەشی بۆ زیاد کردووە: جاری دووەمیش هاتنەوە بۆلای و وەك جاری یەکەم ڕوویدایەوە.

## (دلێری سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (ﷺ))

ئیبن عەساکیر لە زوهریەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) سریەیەکی نارد کە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصی تێدابوو، چوون بۆ لایەکی حیجاز کە پێی دەوترا (رابغ)، بێباوەڕان دایان بەسەر موسڵماناندا، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصیش بە تیرەکانیەوە تێیان کەوت، ئەو یەکەم کەس بوو لەپێناو خوادا تیری وەشاند،**** ئەوەش یەکەم شەڕی ناو ئیسلام بوو، سەعد (ﷺ) وتی:

| | |
|---|---|
| الا هل اتى رسول الله اني | حميت صحابتي بصدور نبلي |
| اذود بها اوائلهم ذيادا | بكل حزونة وبكل سهل |
| فلا يعتد رام في عدو | يسهم يا رسول الله قبلي[1] |

ئیبن عەساکیر لە ئیبن شیهابەوە هێناویەتی دەڵێت: سەعد (ﷺ) لە ڕۆژی ئوحوددا بە یەك تیر سێ بێباوەڕی کوشت، تیرێکی وەشاند و ئەوانیش بۆیان وەشاندەوە، سەعد هەڵیگرتەوە و شاندیەوە و کەسێکی تری کوشت، ئەوانیش

[1] – لە المنتخب ج٥ ص٧٢ لە ئیبن عەساکیرەوە هاتووە.

وەشاندیانەوە، ئەویش هەڵیگرتەوە و وەشاندی و کەسی سێیەمیشی کوشت، خەڵکی لەو کارەی سەعد سەریان سوڕما، وتی: پێغەمبەر (ﷺ) ئەو تیرەی پێدام، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو دایك و باوكم بە قوربانت بن، لە منتخب كنز العمال ج٥ ص٧٢دا هاتووە.

بەزار لە ئیبن مەسعوودەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: سەعد (رضي الله عنه) لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕۆژی بەدردا شەڕی سوار و پیادەشی دەکرد.[1]

## (دلێری حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب (رضي الله عنه))

تەبەرانی لە حارسی کوڕی تەیمیەوە هێناویەتی دەڵێت: حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب (رضي الله عنه) لە ڕۆژی بەدردا پەڕپەڕووی نەعامە بەسەر سنگیەوە بوو، یەکێك لە بێباوەڕان وتی: ئەوە کێیە؟ وترا: حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب، وتی: ئەوەی ئاواو ئاوای پێ کردین.[2,3]

بەزار لە عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئومەییەی کوڕی خەلەف پێی وتم: ئەی عەبدولئیلاه ئەو کابرا کێیە کە بە پەڕی نەعامە لەسەر سنگی لە ڕۆژی بەدردا خۆی دیاری کردبوو؟ وتم: ئەوە مامی پێغەمبەری خوا حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب بوو، وتی: ئەوەی ئاواو ئاوای پێ کردین.[4] حاكم المستدرك ج٣ ص١٩٩

---

[1] – هەیسەمی ج٦ ص٨٢ دەڵێت: بەزار بە دوو سەنەد هێناویەتی، یەکێکیان موتەسیل و سەنەدەکەی تریش مورسەلە و کەسەکانی هەردوو سەنەدەکەش جێ متمانەن.

[2] – ضعيف.

[3] – هەیسەمی ج٦ ص٨١ دەڵێت: سەنەدەکەی پچڕانی تێدایە.

[4] – هەیسەمی ج٦ ص٨١ دەڵێت: بەزار لە دوو ڕێگەوە هێناویەتی، یەکێکیان عەلی کوڕی فەزلی کەرابیسی مامۆستایەتی کە نایناسم، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە صەحیحن، بەڵام ڕێگەکەی تری لاوازە،

له جابری کوڕی عەبدوڵلاوه (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ڕۆژی ئوحوددا پاش تەواو بوونی شەڕ بۆ حەمزە دەگەڕا، یەکێك وتی: من لای ئەو درەختە بینیم کە دەیوت: من شێری خواو پێغەمبەری خوام، خوایە من دوورگیری دەکەم لەمەی ئەبوسوفیان و هاوەڵانی پێی هاتوون، من پۆزش دێنمەوە کە ئەوانە وادەکەن، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) چوو بەرەو ئەویٚ، کاتیٚ بینی گریا، کاتێك سەیری کرد تەرمەکەی شێوێنراوە هیلاکی و باری نائاسایی پێغەمبەری خوای داگرت، پاشان فەرمووی (الا کفنا؟) واتە(ئەرە کفنی نیە؟) یەکێك لە پشتیوانان هەستاو جلێکی هێنا، جابر دەڵێت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (سید الشهداء عند الله تعالى یوم القیامة حمزة) واتە(گەورەی شەهیدان لای خوا لە ڕۆژی دواییدا حەمزەیە).[1]

ئیبن ئیسحاق (لە البداية والنهاية ج٤ ص١٨ دا هاتووە) لە جەعفەری کوڕی عەمری کوڕی ئومەییەی زمریەوە هێناویەتی دەڵێت: من و عەبدوڵلای کوڕی عەددی کوڕی خیار لە سەردەمی موعاویەدا (رضي الله عنه) دەرچووین، ئینجا فەرموودەکە دێنێت و دەڵێت: تا چووینە لای وەحشی دانیشتین، وتمان هاتووین تا باسی ئەوەمان بۆ بکەیت چون حەمزەت کوشت؟ وتی: چۆن پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پرسیاری لیٚ کردم و منیش وەڵامم دایەوە بەو جۆرە وەڵامی ئێوەش دەدەمەوە، من کۆیلەی جوبەیری کوڕی موتعە بووم، توعەیمەی کوڕی عەددی مامی لە بەدردا کوژرابوو، کاتێك قورەیش چوون بۆ ئوحود جوبەیر پێی وتم: ئەگەر حەمزەی مامی موحەمەد لە جیاتی مامم بکوژیتەوە ئازادت دەکەم، منیش لەگەڵ خەڵکەکەدا چووم، من کەسێکی حەبەشی بووم و وەك ئەوان تیرو خەنجەرم فڕیٚ دەداو مەگەر چی ئەگەر نا هەڵەم نەدەکرد، کاتێك شەڕەکە ڕوویدا چووم تا حەمزە ببینم، لەناو هەندیٚ خەڵکدا بینیم وەك وشتری بارشێواو بە شمشێرەکەی کەوتبووە ئەو خەڵکەو ڕێی لێنەدەگیرا منیش خۆم بۆ ئامادەکرد تا لێی بدەم و لە ژێر درەختێك یان لای

[1] - حاکم دەڵێت: سەنەدەکەی صەحیحەو بوخاری و موسلیم نەیانهێناوە، زەهەبیش دەڵێت صەحیحە.

بەردێکدا خۆم حەشاردابوو تا لێم نزیك بێتەوە، لەو کاتەدا سباعی کوڕی عەبدولعوززا پێشی خستم بۆلای، کاتێك ئەوی بینی وتی: ئادەی (ابن مقطعة البظور)، شمشێرێکی لێداو وابزانم سەری پەڕاند، منیش حەربەکەم هێناو برد تاڕێك قەرەوڵم لێ گرتو دام لەسەر سنگی، تا ئەوەی لە نێوان پێکانیەوە دەرچوو ویستی بەرەو ڕووم بێت کەچی کەوت، منیش بەجێم هێشت تا مرد، دوایی هاتمەوە و حەربەکەم هەڵگرتو گەڕامەوە بۆ سەربازگەکەو لەوێ دانیشتمو ئیشم بە کەسی تر نەبوو، ئەویشم لەبەر ئازادبوونی خۆم کوشت، کە چوومەوە مەککە ئازاد بووم، دوایی مامەوە تا پێغەمبەر (ﷺ) مەککەی فەتح کرد ڕام کرد بۆ تائیف و لەوێ مامەوە، کاتێك وەفدی تائیف چوون بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) تا موسڵمان بن دونیام لێ بوو بە کونە دەرزیەك، وتم دەچم بۆ شام یان یەمەن یان شوێنێکی دی، سوێند بەخوا ئەو نیازەم هەبوو تا کەسێك پێی وتم: قوڕبەسەر پێغەمبەر (ﷺ) کەس ناکوژێت کە بچێتە ناو ئایینەکەیو شایەتی حەق بێنێت، کاتێك ئەوەی وت چوومە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) لە مەدینە، کە سەیری کردم لەسەر سەری ڕاوەستابوومو شایەتومانم هێنا، کەمنی بینی فەرمووی (تۆ وەحشیت؟) وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی (دانیشە بۆم باس بکە چۆن حەمزەت کوشت؟) منیش چۆن بۆ ئێوەم گێڕایەوە بۆ ئەویشم گێڕایەوە، کە لە قسەکەم بوومەوە فەرمووی(قوڕت بەسەر) ڕووت لەبەر چاوم لابە، با نەتبینم) منیش پێغەمبەرم (ﷺ) لە هەر کوێ ببینیایە کەنارو دواوەم دەگرت تا نەمبینێت تا خوای گەورە بردیەوە بۆلای خۆی، کە موسڵمانان چوون بۆ شەڕی موسەیلەمەی درۆزن لە یەمامە منیش لەگەڵیان چوومو ئەو حەربەی بۆ کوشتنی حەمزە بەکارم هێنابوو بردم، کە شەڕ ڕوویدا موسەیلەمەم بینی وەستابوو و شمشێری بەدەست بوو - نەمدەناسی- خۆم بۆ ئامادەکرد، یەکێك لە پشتیوانانیش لە لایەکی ترەوە خۆی بۆ ئامادەکرد، من حەربەکەم بۆ ڕێککردو بۆم وەشاندو پشتیوانیەکەش بە شمشێر تێی کەوت، پەروەردگار چاکتر دەزانێت کاممان کوشتمان، ئەگەر من کوشتبێتم ئەوا چاکترین

کەسم دوای پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ خراپترین کەسی سەر زەویدا کوشتووە، بوخاریش لە جەعفەری کوڕی عەمرەوە بەوجۆرە هێناویەتی، تیایدا هاتووە: کە خەڵکی ڕیزیان بەست بۆ شەڕ سوباع هات و وتی: کێ هەیە بەرەو ڕووم بێتەوە؟ حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیب هات و پێی وت: ئەی سوباع ئەی کوڕی ئوم ئەنماری (مقطعة البظورة).

## (دلێری عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب (رضي الله عنه))

ئیبن عەساکیر لە جابرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕۆژی تائیفدا حەنزەلەی کوڕی ڕەبیعی نارد بۆلای خەڵکی تائیف و دواندنی و ئەوانیش بە زۆر بەرەو قەڵاکەیان برد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (کێ دەچێت بۆ ئەوانە تاوەك ئەم جەنگاوەرانەمان پاداشتی هەبێت؟) کەس هەڵنەسا جگە لە عەبباسی کوڕی عەبدولمەتەلیب تا لەناو دەستیاندا دەری کرد و باوەشی پیاکرد و ڕفاندی، ئەوانیش لە قەڵاکەوە عەباسیان بەردباران کرد، پێغەمبەریش (ﷺ) نزای بۆ دەکرد تا هێنایەوە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ).[1]

## ( دلێری موعازی کوڕی عەمری کوڕی جەموح و موعازی کوڕی عەفرا (ڕەزای خوایان لێ بێت))

بوخاری و موسلیم لە عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفەوە هێناویانە دەڵێت: من لە ڕۆژی بەدردا لە ڕیزدا وەستابووم، سەیری ڕاست و چەپی خۆمم دەکرد دوو هەرزەکاری پشتیوانانم بینی، ترسام ژێر پێ بکەون، یەکێکیان باوەشی پیاکردم و وتی: مامە گیان ئەبوجەهل دەناسیت؟ وتم: بەڵێ ئیشت پێی چیە؟ وتی: بیستوومە

[1] – لە کنز العمال ج٥ ص٣٠٧ دا واهاتووە.

قسەی بە پێغەمبەر (ﷺ) وتووە سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە ئەگەر بیبینم وازی لێ ناهێنم تا یەکێکمان ئەوی تر نەکوژێت، منیش سەرم سوڕما، ئەوی تریش باوەشی پیاکردمو هەمان شتی وت: منیش سەیری ئەبوجەهلم کرد کە لەناو خەڵکەکەدا دەگەڕا، وتم: ئەوەی دەتانەوێت ئەوەیە، ئەوانیش چوون بە شمشێرەکانیان لێیانداو کوشتیان، دوایی هاتنەوە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵیان پێدا، ئەویش فەرمووی (کامتان کوشتی؟) هەرکامیان دەیوت من کوشتم، فەرمووی (شمشێرەکانتان سڕین؟) وتیان: نا، پێغەمبەر (ﷺ) سەیری هەردوو شمشێرەکەی کردن و فەرمووی (هەردووکتان پێکەوە کوشتووتانە).[1]

بوخاری هێناویەتی کە عەبدولڕەحمان وتی: لە ڕۆژی بەدردا لە ڕیزدابووم سەیری ڕاست و چەپی خۆم کرد دوو هەرزەکارم بینی، ترسام ژێرپێ کەون، یەکێکیان چپاندی بەگوێما (تا هاوڕێکەی نەیبستێت) وتی مامە گیان ئەبوجەهلم پێ نیشان بدە، منیش وتم: برازاگیان بۆ چیتە؟ وتی: بەڵێنم بەخوا داوە ئەگەر بینیم یان بیکوژم یان بکوژرێم، ئەوی ترش چپاندی بەگوێما و هەمان شتی پێ وتم، منیش دڵخۆش بووم لە نێوان دووپیاوی وادام، ئەبوجەهلم پێ نیشان دان، ئەوانیش وەك دووهەڵۆ هەڵیان کوتایە سەری و لێیان دا، هەردووکیان کوڕانی عەفرابوون.

ئیبن ئیسحاق لە ئیبن عەبباس و عەبدوڵلای کوڕی ئەبوبەکرەوە هێناویەتی کە دەڵێن: موعازی کوڕی عەمری کوڕی جەموح لە بەنی سەلەمە وتی: ئەبوجەهل دوورە دەست بوو و پێی نەدەگەیشتن، گوێم لە خەڵکەکە بوو دەیانوت کەس ناگاتە ئەبولحەکەم، منیش کە بیستم خۆم بۆ حازرکرد و بەرە و ڕووی چووم کە گەیشتمە ئەوێ هەڵمکوتایە سەری و شمشێرێکم لێدا وابزانم دای لە نیوەی ڕانی، سوێند بەخوا تا توانیم تێی کەوتم و لێمدا، عەکرەمەی کوڕی دای لە سەرشانم و دەستی

[1] حاکم المستدرکج٣ ص٤٢٥ و بەیهەقی ج٦ ص٣٠٥ لە عەبدولڕەحمانەوە بەو جۆرە هێناویانە.

فڕێ دام، منیش خۆم گەیاندە خزمێکم کە لەلام بوو تا لە دەستی قوتاری کردم، هەموو ئەو ڕۆژە شەرم دەکردو بە دوای خۆمدا ڕامدەکێشا، کە بێزاری کردم خستمە ژێر پێمو چاك تێی کەوتم تا تێرم خواردو فڕێمدا[1].[2]

## (دلێریی ئەبودوجانە سەماکی کوڕی خەرشەی ئەنساری(رضي الله عنه))

ئیمامی ئەحمەد لە ئەنەسەوە هێناویەتی کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە ڕۆژی ئوحودا شمشێرێکی هەڵگرت و فەرمووی (کێ ئەم شمشێرە هەڵدەگرێت) هەندێ هەڵیانگرت و سەیریان کرد,پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)فەرمووی(من يأخذة بحقة) واتە(کێ هەڵی دەگرێت و مافی دەدات) هەموو گەڕانەوە دوا,ئەبو دوجانە وتی من،پێی کەوتە گیانی بێباوەڕان،موسلیم هێناویەتی لە (البداية والنهاية ج ١٥دا هاتووە، ئیبن سەعد ج٣ص١٠١لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) )بەهەمان واتا هێناویەتی.

بەزار لە زوبێری کوڕی عەوامەوە(رضي الله عنه) )هێناویەتی دەڵێت لە ڕۆژی ئوحدا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)شمشێرێکی خستە ڕوو بۆ هاوەڵان و فەرمووی(من يأخذ هذاالسيف بعقة؟) ئەبو دوجانە سەماکی کوڕی خەرشە وتی من ئەی پێغەمبەری خوا، ئەویش پێی دا، ئەبو دوجانە نەچوو منیش کەوتم، دەیدا بەلای هەرکەسدا(لە بێباوەڕان) لێی دەداو پەکی دەخست،تاهاتە لای ئافرەتانێك لەلا پاڵی شاخەکەدا کە هیندیان لەگەڵدا بوو دەیووت:

| | |
|---|---|
| نحن بنات طارق | نمشی علی النمارق |
| والمسك فی المفارق | ان تقبلوانعنق |
| أوتبدبروا نفارق | فراق غير وامق |

---

[1] – صحیح.

[2] – لە البداية والنهاية ج٣ ص٢٨٧دا واهاتووە.

منیش بۆی چوم ، لەو دەشتەدا هاواری کردو کەس نەهات بە دەمیەوە، منیش وازم لێ هێنا،بە ئەبو دوجانەم وت:بە هەموو کارەکانت سەرسام بووم جگە لەوەی ئەو ژنەت نەکوشت، ئەبو دوجانە وتی چونکە هاواری کرد و کەس نەهات بە دەمیەوە،حەزم نەکرد بە شمشێری پێغەمبەر ﷺ ئافرەتێکی بێ پشت و پەنا بکوژم.[1]

حاکم المستدرك ج٣ ص٢٣٠ لە زوبەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ لە شەڕی ئوحود شمشێرێکی هێناو فەرمووی (من یاخذ هذا السیف بحقه؟) منیش هەستام و وتم من، (بەڵام پێی نەدام، پاشان ئەوەی فەرموویەوە، ئەبودوجانە وتی من ئەی پێغەمبەری خوا بەس حەقەکەی چیە؟ فەرمووی (موسڵمانی پێ نەکوژیت و پێی لە دەست بێباوەڕ ڕانەکەیت) ئینجا پێی دا، ئەو ڕۆژ سەیرم دەکرد بزانم چۆن شەڕ دەکات؟ بچوایە بۆ هەرکەس لە دەستی دەرباز نەدەبوو، ئینجا بەو واتایەی پێشوو دەیهێنێت.[2]

ئیبن هیشام هێناویەتی دەڵێت لە چەند زانایەکم بیستووە کە زوبەیری کوڕی عەوام (رضي الله عنه) وتی: کاتێك داوای شمشێرەکەم لە پێغەمبەر ﷺ کردو پێی نەدامو دای بە ئەبودوجانە لە دەروونی خۆمدا وتم من کوڕی صەفیەی پووری و قورەیشی بوومو داوام لێکرد کەچی دای بە ئەبودوجانە، سوێند بەخوا دەبێت بزانم چی دەکات؟ کەوتمە شوێنی دەستە سرێکی سووری دەرهێناو بەستی بەسەریەوەو پشتیوانان وتیان ئەبودوجانە پەڕۆی مەرگی دەرهێنا، لەوکاتەدا دەرچوو و دەیوت:

انا الذي عاهدني خليلي    و نحن بالسفح لدى النخيل

---

[1] – هەیسەمی ج٦ ص١٠٩ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی جێ متمانەن، تەواو.

[2]– حاکم دەڵێت سەنەدەکەی صەحیحەو بوخاریو موسلیم نەیهێناوە، زەهەبی دەڵێت: صەحیحە.

ان لا اقوم الدهر في الكيول اضرب بسيف الله والرسول

بە هەر بێباوەڕێك دەگەیشت دەیکوشت، لەناو بێباوەڕاندا یەکێك هەبوو هەر برینداریکی بدیبا دەیکوشت، هەرکام لەوی تر نزیك بوویەوە، من لە خوا دەپاڕامەوە بەرەوڕووی یەك بنەوە، بەرەوڕووی یەك بوونەوەو کەوتنە لێدانی یەکدی، بێباوەڕەکە دای لە ئەبودوجانە، بەڵام بە زرێیەك ڕێی بە شمشێرەکەی گرت، ئینجا ئەبودوجانە لێیداو کوشتی، دواتر سەیرم کرد شمشێرەکەی لەسەر سەری هیندی کچی عوتبە وەستاندو دواتر گێڕایەوە، منیش وتم: خواو پێغەمبەرەکەی چاکتر دەزانن.[1]

## (دلێریی قەتادەی کوڕی نوعمان (رضي الله عنه))

تەبەرانی لە قەتادەی کوڕی نوعمانەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کەوانێك پێشکەش بە پێغەمبەر ﷺ کرا پێغەمبەریش ﷺ لە ڕۆژی ئوحوددا دای بە من، منیش لەبەردەم پێغەمبەردا ﷺ تیرم پیٚ نەما، بەردەوام لەبەرچاوی پێغەمبەردا ﷺ خۆم دەدایە بەر ڕوخساری تا ئەگەر تیرێك هات بەرمن کەوێت و پێغەمبەر ﷺ بپارێزم، تیرێکیان دای لەناوچاوم و ناوچاوم کەوت، منیش خستمە ناو دەستم و بردم بۆلای پێغەمبەر ﷺ ئەویش کە بینی چاوەکانی فرمێسکیان ڕشت و فەرمووی (اللهم ان قتادة قد اوجه بوجهه فاجعلها احسن عينيه و احدهما نظرا)(خوایە قەتادە رووی خۆی بەخشی دەی ئەو چاوەی بکە بە بیناترین چاوی) بەوە ئەو چاوەی لەوی تریان باشتربوو و زیاتر دەیبینی.[2][3]

[1] – ضعيف.

[2] – ضعيف.

[3] – هەیسەمی ج٦ ص١٤٣ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا کەسیٚ هەیە کە نایناسم.

هەر ئەو هێناویەتی دەڵێت: من لە بەردەم پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی ئوحود دەم وچاوی پێغەمبەری خوام دەپاراست ئەبودوجانەش بە پشتی خۆی پشتی پێغەمبەری ﷺ دەپاراست تا ئەوەی پشتی پڕ بوو لە تیر، ئەمەش لە ڕۆژی ئوحوددا بوو، هەیسەمی دەڵێت: لە سەنەدەکەدا کەسی وا هەیە کە نایناسم.

## (دلێریی ئەبی حەدرەد)

ئیبن ئیسحاق لە ئەبی حەدرەدەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: من ئافرەتێکی هۆزەکەی خۆمم هێنا و مارەییەکەی دووسەد درهەم بوو، هاتم بۆلای پێغەمبەر ﷺ تا یارمەتیم بدات، فەرمووی (چەندە مارەییت داناوە؟) وتم: دووسەد درهەم، فەرمووی (سبحان الله والله لو كنتم تاخذونها من واد ما زدتم، والله ما عندي ما اعينك به) چەند ڕۆژێك مامەوە، پاشان یەکێك لە جوشەمی کوڕی موعاویە کە پێی دەوترا ڕەفاعەی کوڕی قەیس – یان قەیسی کوڕی ڕِفاعە– کە لە خێڵێکی گەورەی جوشەمەوە هاتبوو بە هۆزەکەیەوە هات و لە باخدا دابەزی و دەیوست قەیس دژ بە پێغەمبەر ﷺ کۆبکاتەوە، لەناو جوشەمەدا ناوبانگ و باسی هەبوو، پێغەمبەر ﷺ من و دوو موسڵمانی تری بانگ کرد و فەرمووی (اخرجوا الى هذا الرجل تاتوا منه نجبر و علم) وشترێکی پێ داین و یەکێکمان سواربوو بە چەك و تیر و شمشێرەوە چووین تا لەگەڵ ئاوابوونی خۆردا گەیشتینە نزیکی ئەو شوێنە، من لەلایەکەوە خۆم حەشاردا، فەرمانم بە هاوەڵەکەم کرد و لە لایەکی ترەوە ئەوانیش سەنگەریان گرت، پێم وتن: ئەگەر بیستتان الله اکبرم وت و دام بەسەر سەربازگەکەیاندا ئێوەش الله اکبر بکەن و لەگەڵم بدەن بەسەریاندا، سوێند بەخوا چاوەڕوان بووین شتێك ببینین، شەو داهات تا کاتی عیشا بوو، یەکێك لە شوانەکانیان لێیان دواکەوت و ئەوانیش ترسان شتێکی لێ بێت، ڕەفاعەی کوڕی قەیس هەستا و شمشێرەکەی هەڵگرت و خستیەلای ملی و وتی: سوێند بە خوا لە باری ئەو شەوانەمان دەترسم

خراپەیەکی بێتەڕێ، هەندێ لەوانەی لەگەڵی بوون وتیان سوێند بە خوا ناچێت، ئێمە لە جیاتی تۆ دەچین، وتی: نا هەر خۆم دەچم، وتیان دەی ئێمەش لەگەڵت دێین، وتی بە خوا کەستان دوام ناکەوێت، دەرچوو تا دای بە پاڵمدا، کاتێك بۆم گونجا تیرێکم وەشاندو دام لەسەر سنگی، سوێند بەخوا نوزەی نەهات و کەوت، چووم و ملم پەڕاندو دوایی بەرەو سەربازگەکە چووم و الله اکبرم کردو دوو هاورێکەشم وایانکرد، سوێند بەخوا هیچیان پێ نەکرا جگە لەوەی بە ژن و منداڵەکانیان و سووکە شتێکی سامانیانەوە ڕایانکرد، ئێمەش وشترو مەڕێکی زۆرمان گرت و هێنامان بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، من سەری کابرام هێنا بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئەویش سیانزە وشتری پێدام بۆ مارەییەکە[1] .[2]

## (دلێری خالیدی کوڕی وەلید (رضي الله عنه))

بوخاری لە خالیدی کوڕی وەلیدەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە ڕۆژی موئتەدا نۆ شمشێر بە دەستمەوە شکان تەنها یەکێکی یەمانی لە دەستمدا مایەوە.[3]

حاکم لە المستدرك ج٣ ص٢٩٩ لە ئەوسی کوڕی حارسەی کوڕی لامەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کەس هێندەی هورمز دژی عەرەب نەبوو، کە لە شەڕی موسەیلەمەو یارانی بووینەوە بەرەو بەسرە چووین و لە کاظمة بە سوپایەکی زۆرەوە بەرەو ڕووی هورمز بووینەوە، خالید خۆی بۆ نواندو وای لە هورمز کرد بەرەو ڕووی بێتەوە، ئەویش ڕازیبوو، جەنگان و خالید کوشتی و هەواڵەکەشی نووسی و ناردی بۆ ئەبوبەکر، بەوە ڕێی بە تاڵانکردنی شمەکی هورمزدا. کڵاوەکەی

---

[1] – ضعیف.

[2] – لە البداية والنهاية ج٤ ص٢٢٣ دا واهاتووە، ئیمامی ئەحمەدو جگە لەویش هێناویانە، بەڵام لای ئەو ناوی عەبدوڵلای کوڕی ئەبی حەدرەدە، هەروەك لە الاصابة ج٢ ص٢٩٥ یشدا هاتووە.

[3] – (ئیبن ئەبی شەیبە هێناویەتی، لە الاستيعاب ج١ ص٤٠٨ دا واهاتووە، حاکم لە المستدرك ج٣ ص٤٢و ئیبن سەعد ج٤ ص٢ هێناویەتی).

سەد هەزار درهەم بوو، ئەوەش نەریتی فارس بوو کڵاوی کەسی پلەبەرزیان ئەوەندەبوو.

واقیدی لە ئەبی زەنادەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك خالید سەرە مەرگی هات گریا، دواتر وتی: لە ئەوەندە شەڕدا بەشداربووم و لەشم بستێکی بێ برینی شمشێرو ڕمی پێوەنەما، کەچی لێرەدا لەسەر جێگەکەم وەك مەرگی وشتر دەمرم، چاوی ترسنۆکان بێ خەوبێت[1].[2]

## (دلێریی بەرائی کوڕی مالیك (رضي الله عنه))

سراج لە مێژووەکەیدا لە ئەنەسەوە هێناویەتی کە خالیدی کوڕی وەلید لە ڕۆژی یەمامەدا بە بەرائی وت: هەستە ئەویش سواری ئەسپەکەی بوو و سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کرد، پاشان وتی: ئەی خەڵکی مەدینە، ئەمڕۆ مەدینە بۆ ئێوە نیە، تەنها خوایەو بەهەشت، پاشان کەوتە ڕێ و خەڵکیش وایانکردو خەڵکی یەمامە شکان و بەرائیش گەیشت بە فەرمانڕەوای یەمامەو لێیداو کوشتی و شمشێرەکەی بردو شەڕی پێکرد تا شکا.

بەغەوی لە بەرائەوە هێناویەتی دەڵێت: لە ڕۆژی شەڕی موسەیلەمە گەیشتم بە پیاوێك پێی دەوترا (کەری یەمامە) گەورەو کەڵەکەت و سپی بوو شمشێرێکی بە دەست بوو، دام لە هەردوو قاچی و لەسەر پێ کەوت، شمشێرەکەیم هەڵگرت و لێمداو لەت و پەت بوو.[3]

ئیبن عەبدولبیر لە الاستیجاب ج١ ص١٣٨ لە ئیبن ئیسحاقەوە هێناویەتی دەڵێت: موسڵمانان کشان بۆ سەر بێباوەڕان تا تاریان نان بۆ باخێك کە موسەیلەمەی دوژمنی خوای تێدابوو، وتی ئەی کۆمەڵی باوەڕداران فڕێم بدەنە ئەودیو، چوو تا هەڵزنیە سەر دیوارەکەو شەڕی لەگەڵ کردن تا دەرگاکەی کردەوە بۆ موسڵمانان و موسڵمانانیش چوون بۆیان و خوا موسەیلەمەی کوشت.

---

[1] – ضعیف.

[2] – (لە البدایة والنهایة ج٧ ص١١٤ دا وا هاتووە).

[3] – (لە الاصابە ج١ ص١٤٣ دا واهاتووە).

بەیهەقی ج٩ ص٤٤ لە موحەمەدی کوڕی سیرینەوە هێناویەتی موسڵمانان گەیشتنەلای دیوارێك كە دەرگاكە داخرابوو و لە ژوورەوە هەندێ لە بێباوەڕان هەبوون، بەرائی کوڕی مالیك (رضي الله عنه) لەسەر قەڵغانیك دانیشتو وتی: بە ڕمەكانتان بەرزم بكەنەوەو فڕێم بدەنە ئەودیو، ئەوانیش وایان كرد، كاتێك گەیشتنە لای بەراء دەبینین دە كەسی لێ كوشتبون.

ئیبن سەعد لە ئیبن سیرینەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری كوڕی خەتتاب نامەی نووسی: ئایا بەرائی كوڕی مالیك ناكەن بە بەرپرس، ئەو دەستەیەكی نالەباری لەناوبرد، ئەوی پێش خست.

## دلێری ئەبی میحجەنی سەقەفی (رضي الله عنه)

عەبدولڕەزاق لە ئیبن سیرینەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبومیحجەنی سەقەفی (رضي الله عنه) بەردەوام لەسەر مەی خواردنەوە جەڵدی لێدەدرا، كاتێك زۆر لەسەر ئەوە چوون بەندیان كردو بەستیانەوە، لە ڕۆژی قادسیەدا سەیری موسڵمانانی كرد شەڕ دەكەن، ئەویش بینی بێباوەڕان گورزیان لە موسڵمانان وەشاند، بۆیە ناردی بەشوێن ژنەكەی سەعدداو پێی وت: ئەبومیحجەن پێت دەڵێت ئەگەر بەری بدەیتو ئەو ئەسپەی لەگەڵ چەكێكدا بدەیتە دەست یەكەم كەس دەبێت بگەڕێتەوە بۆلات مەگەر ئەوی بكوژرێت، ئینجا ئەم شیعرەی وت:

كفى حزنا ان تلتقي الخيل بالقنا  و اترك مشدودا علي وثاقيا

اذا قمت عناني الحديد و غلقت  مصاريع دوني قد تصم المناديا

ژنەكە چوو و ئەوەی بە ژنەكەی سەعد وت: ئەویش دەستی كردەوەو ئەسپێكی پێداو چەكیشی دایەدەست، دوایی بە ڕاكردنەوە چوو تا گەیشتە شەڕەكەو كەوتە كوشتاری بێباوەڕان، سەعد سەیری كرد پێی سەرسام بوو و وتی: ئەو سواریە كێیە؟ هێندەی نەبرد تا خوا بێباوەڕانی شكاندو ئەبومیحجەن گەڕایەوەو چەكەكەی دایەوە دەستیانو دەستو پێی بەندكرایەوە، سەعد هاتو ژنەكەی پێی وت: شەڕەكەتان چۆن بوو؟ ئەویش بۆی باس كردو وتی وامان

بەسەرهات تا خوای گەورە کەسێکی بەسواری ئەسپێك نارد ئەگەر ئەبومیحجەنم بە دەست و پێی بەستراوی بەجێ نەهێشتبایە دەموت ئەمە ئەبومیحجەنە، ئەویش وتی: دەی بەخوا ئەوە ئەبومیحجەن بوو، باس و مەسەلەکەی بۆ گێڕایەوە، ئەویش بانگی کردو کۆت و بەندەکەی لابردو وتی سوێند بەخوا لەمەودوا هەرگیز لەسەر مەی خواردنەوە جەڵدت لێ نادرێت، ئەبومیحجەنیش وتی: دەی بەخوا منیش تا ماوم مەی ناخۆمەوە خەریکبوو لەپێناو جەڵدو لێدانی ئێوەدا دەستبەرداری بم، دوای ئەوە مەی نەخواردەوە.[1]

ئەبوئەحمەدو حاکمیش لە موحەمەدی کوڕی سەعدەوە بە دوورو درێژی هێناویەتی و لە فەرموودەکەیاندا هاتووە: چوو تا گەیشتەلای خەڵکەکەو لە هەرلایەکەوە هەڵمەتی ببردایە خوا بێباوەڕانی دەشکاند، خەڵکی دەیانوت ئەمە فریشتەیە، سەعدیش سەیری دەکردو دەیوت خۆکۆکردنەوەی بەلقاو خۆهەڵدانی ئەبومیحجەنە کەچی ئەبومیحجەنیش بەندکراوە، کاتێك دوژمن شکا ئەبومیحجەن گەڕایەوەو خۆی بەستەوە، کچی حەفسە بە سەعدی وت چی بووە؟ ئەویش وتی نا ئەمڕۆ کەسێکم نەدی وەك ئەو بدات لە دوژمن دەی بەریدەن، ئەبومیحجەنیش وتی: من جاران کە مەیم دەخواردەوە بە لێدانەکە پاك دەبوومەوە، مادەم وای لێهات سوێند بەخوا ئیتر نایخۆمەوە.(ئیبن ئەبی شەیبەش بەو سەنەدە هێناویەتی و تیایدا هاتووە: وایانزانی فریشتەیە.[2] سەیفیش لە (الفتوح) دا بە دوو و درێژی چیرۆکەکەی هێناوەو چەند دێڕێکی زیاتری شیعرەکەی هێناوە، لە چیرۆکەکەداشدا هاتووە: شەڕێکی چاکی کردو الله اکبری دەکردو هەڵمەتی دەبرد، ئیتر کەس لەبەردەمیا خۆی پێ نەدەگیرا، زۆر بە سەختی کەوتبووە گیانی دوژمنان، خەڵکی پێی سەرسام بوون و نەشیاندەناسیەوە، (لە الاصابە دا واهاتووە).

---

[1] – (لە الاستیعاب ج٤ ص١٨٤ دا واهاتووەو سەنەدەکەی صەحیحە، لە الاصابە ج٤ ص١٧٤ یشدا هاتووە).

[2] – ئیبن عەبدولبیریش لە الاستیعاب ج٤ ص١٨٧ دا هێناویەتی.

# دلێری عەمماری کوڕی یاسر (رضي الله عنه)

حاکم لە المستدرك ج٣ ص٣٨٥ و ئیبن سەعد ج٣ ص١٨١لە ئیبن عومەرەوە هێناویانە دەڵێت: لە شەڕی یەمامەدا عەمماری کوڕی یاسرم لەسەر بەردێك بینی کە هاواری دەکرد ئەی کۆمەڵی موسڵمانان ئەوە لە بەهەشت ڕادەکەن؟ من عەمماری کوڕی یاسرم، ئایا لە بەهەشت ڕادەکەن؟ من عەمماری کوڕی یاسرم وەرن بەرەو ڕووم، منیش سەیرم دەکرد گوێی بڕابوو و دەشەکایەوە کەچی هەر شەڕی دەکرد. هەروەها لە ج٣ ص٣٩٤ لە ئەبی عەبدولڕەحمانی سولەیمەوە هێناویەتی دەڵێت: لە صفیندا لەگەڵ عەلی (رضي الله عنه) بەشداربووین و دووکەسمان ڕاسپاردبوون، کە ئەوان بێئاگادەبوون هەڵمەتی دەبردەسەریان و کە دەگەڕایەوە شمشێرەکەی ڕەنگی خوێنی گرتبوو، وتی: بمبوورن بەخوا لەبەر ئەوە گەڕامەوە ئیتر شمشێرەکەم نەیدەبڕی دەڵێت: عەممارو هاشمی کوڕی عوتبەم بینی، هاشم لە نێوان دووریزدا دەچوو، عەممار وتی: هاشم سوێند بەخوا ئەوە لادانی بارو فەرمانی و شکاندنی سەربازیەتی، پاشان ئەی هاشم ئەمڕۆ دەگەمەوە بە ئازیزان موحەمەدو یارانی، هاشمیش ئاڵاکەی شەکاندەوەو وتی:

اعور يبغي اهله محلا قد عالج الحياة حتى ملا

لابو ان يفعل او يفلا

پاشان بەرەو دۆڵێکی صفین چوو، ئەبوعەبدولڕەحمان وتی: هاوەڵانی پێغەمبەرم (صلى الله عليه وسلم) دی کەوتبوونە شوێن عەمماری وەك ئەوەی ئاڵایەکیان هەبێت.

ئیبن جەریریش هێناویەتی و لە البداية والنهاية ج٧ ص٢٦٩ یشدا هاتووەو لە فەرموودەکەیدا هاتووە: عەممارم بینی دەچوو بە هەر دۆڵێکی صفین دا هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەوێ بوون دەکەوتنە شوێنی، بینیم هات بۆلای هاشمی کوڕی عوتبەی هەڵگری ئاڵای عەلی و وتی: ئەی هاشم پێشکەوە، بەهەشت لە ژێر سێبەری شمشێردایەو دەرگاکانی بەهەشتیش کراونەتەوەو حۆریەکان ڕازێنراونەتەوە، ئەمڕۆ دەگەمەوە بە ئازیزان موحەمەدو یارانی، پاشان لەگەڵ هاشم هەڵمەتیان بردو عەلی و هاوەڵانیش یەکدەستە هەڵمەتیان بردە سەر خەڵکی شام، عەممارو هاشم وەك ئاڵاو پێشڕەوی ئەوانیان لێ هاتبوو.[1]

---

[1]- (تەبەرانیش هێناویەتی، ئەبویەعلاش بە دوورو درێژی هێناویەتی،ئیمامی ئەحمەد بە کورتی هێناویەتی، هەیسەمی ج٧ ص٢٤١ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدی ئەحمەد و ئەبویەعلا جێ متمانەن).

## (دلێریی عەمری کوڕی مەعدیەکریبی زوبەیدی (رضي الله عنه))

ئیبن عائیز لە (المغازی) لە مالیکی کوڕی عوبەیدوڵلای خەسعەمیەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کەسی چاکترم لە کەسێك نەدیوە کە لە یەرموکدا چوو بۆ شەڕو کەڵەگەتێکیش چوو بۆی‌و ئەویش کوشتی، یەکێکی تر چوو و ئەویشی کوشت، دوایی شکان، ئینجا گەڕایەوەو دابەزی‌و نزای کردو ئەوانەی دەورووبەریشی نزایان کرد، وتم ئەوە کێیە؟ وتی: عەمری کوڕی مەعدیەکریب.

ئیبن ئەبی شەیبەو ئیبن عائیزو ئیبن سکن‌و سەیفی کوڕی عەمرو تەبەرانی‌و جگە لەوانیش بە سەنەدی صەحیح لە قەیسی کوڕی ئەبی حازمەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە قادسیەدا بەشداربووم‌و سەعدیش بەرپرسی خەڵکەکەبوو، عەمری کوڕی مەعدیەکیب بە ڕیزەکاندا تێدەپەڕی و دەیوت: ئەی کۆمەڵی کۆچەران شێری نەبەردین، چونکە سوار ئەگەر ڕمەکەی فڕێ دا بێهیوادەبێت، ئینجا یەکێك تیرێکی بۆ وەشاندو دای لە لای کەوانی، عەمریش هەڵیکوتایە سەری‌و لێیداو خستی‌و دابەزی بۆی، (ئیبن عەساکیریش بە دوورو درێژتر لەلایەکی دیکەوە هێناویەتی، تیایدا هاتووە کە کابرا تیرەکەی وەشاند هەڵیکوتایە سەری‌و چۆن کەنیزەك دەگرن گرتی‌و هێنایە ناو ڕیزەکانەوەو سەری لێکردەوەو وتی ئاوابکەن).

واقیدی لە ڕێگەی عیسای خەیاتەوە هێناویەتی دەڵێت: عەمری کوڕی مەعدیەکیب لە ڕۆژی قادسیەدا بە تەنها هەڵمەتی برد، لێیدان‌و دواتر موسڵمانان پەیوەستی بوون، بێباوەڕان ڕژان بەسەریداو ئەویش بە شمشێرەکەی تێیان کەوتبوو تا موسڵمانان دووریان خستنەوە لێی.

تەبەرانی لە موحەمەدی کوڕی سەلامی جومەحیەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەر نووسی بۆ سەعد: من دووهەزار کەسم بۆ ناردویت عەمری کوڕی مەعدیەکریب‌و تولەیحەی کوڕی خوەیلید (رضي الله عنه).

دۆلابی لە ئەبی صاڵحی کوڕی وەجیهەوە هێناویەتی دەڵێت: لە ساڵی بیست و یەکدا شەڕی نەهاوند ڕوویداو نوعمانی کوڕی موقرین کوژراو موسڵمانان شکان، عەمری کوڕی مەعدیەکیب ئەو ڕۆژ شەڕی کرد تا فەتح هاتەدی ئەوکات برین زۆری بۆ هێنا و لە گوندی (روزه) مرد.[1]

## (دلێریی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر (رضي الله عنه))

تەبەرانی لە عورووەی کوڕی زوبەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك موعاویە (رضي الله عنه) مرد موعاویە ئامادەنەبوو گوێڕایەڵی یەزیدی کوڕی موعاویە بێت و بە ئاشکرا قسەی پێ دەوت، یەزیدیش ئەمەی بیستەوە و سوێندی خوارد دەبێت بە دەست بەستراوی بیهێنن ئەگەرنا سوپای بۆ دەنێرێت وترا بە ئیبن زوبەیر دەڵێیت چی کۆتی زیوت بۆ دروست بکەین و جلی بەسەردا بکەیت لەبەر ئەوەی سوێندەکەی ببەیتەسەر چونکە ڕێککەوتن بۆ تۆ جوانترە، ئەویش وتی خوا سوێندی بخات، ئینجا وتی:

ولا الين لغير الحق اساله        حتى يلين لضرس الماضغ الحجر

پاشان وتی: سوێند بەخوا لێدانی شمشێر بە عیزەتەوە لە لێدانی قامچیەکی زەلیلی لام خۆشەویستترە. پاشان نزای بۆ خۆی کرد و دژایەتی یەزیدی کوڕی موعاویەی نواند، یەزیدی کوڕی موعاویەش موسلیمی کوڕی عوقبەی موری بە سوپایەکی خەڵکی شامەوە نارد بۆی و فەرمانی پێکرد تا لەگەڵ خەڵکی مەدینە بجەنگێت، کە لەوە بێتەوە بچێت بۆ مەککە، موسلیم چوویە مەدینە و ئەو ڕۆژ ئەو هاوەڵانەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەوێ مابوونەوە لەوێ ڕایانکرد و ئەویش کەوتە وێرانی و کوشتار، ئینجا لەوێ دەرچوو، لە نێوەی ڕێدا مرد و حوصەینی کوڕی نمیرەی کندی هاتە شوێنی و وتی (یا ابن برذعة الحمار) لە فێڵی قورەیش بترسی و تەنها بە

---

[1] – (لە الاصابە ج٣ ص١٨ دا واهاتووە).

متمانەپێ دان و دواتر ڕنینەوەیان هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکە، حوصەینیش چوو تا گەیشتە مەککە، لەگەڵ ئیبن زوبەیر چەند ڕۆژێك شەڕی کرد، ئینجا فەرموودەکە دێنێت، تیایدا هاتووە، حوصەینی کوڕی نومەیر مەرگی یەزیدی کوڕی موعاویەی بیست بۆیە ڕایکرد، کە یەزید مرد مەڕوان بانگەوازی دەسەڵاتی بۆ خۆی کرد، ئینجا فەرموودەکە دێنێت، تیایدا هاتووە: پاشان مەڕوان مردو عەبدولمەلیك بانگەوازی دەسەڵاتی بۆ خۆی کرد، خەڵکی شامیش چوون بەدەمیەوە، ئەویش لەسەر مینبەر وتاری داو وتی: کێ لە ئێوە دەچێت بۆ ئیبن زوبەیر؟ حەجاج وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران من، ئەویش بێدەنگی کرد، دووبارەی کردەوەو هەر ئەوبوو و بێدەنگی کردەوە، پاشان سێ بارەی کردەوەو ئەو وتی: من ئەی ئەمیری باوەڕداران چونکە لە خەومدا بینیم عەباکەی سەرشانیم لێ سەندو خۆم پۆشیم، ئەویش سوپایەکی بۆ ڕێکخست تا چوو بۆلای ئیبن زوبەیرو شەڕیانکرد، ئیبن زوبەیر بە خەڵکی مەککەی وت: ئەو دوو شاخە بپارێزن، چونکە تا ئەو دوانەتان بە دەستەوەبن لەوپەڕی شکۆداریدان، هێندەی نەبرد حەجاج و هاوەڵانی لە مزگەوت دەرکەوتن، بۆ بەیانی کە تیایدا ئیبن زوبەیر کوژرا ئیبن زوبەیر چوو بۆلای ئەسمای کچی ئەبوبەکری دایکی کە ئەو ڕۆژ تەمەنی سەد ساڵ بوو، هێشتا دانی مابوو و چاوی لە دەست نەدابوو، بە کوڕەکەی وت:عەبدوڵلا لە شەڕەکەتدا چیت کرد؟ وتی: گەیشتوونەتە ئەوێ و ئەوێ، ئینجا پێکەنی و وتی: مەرگ حەسانەوەیە، دایکی وتی: کوڕم هیوای مەرگ بۆ من بخوازیت حەزناکەم بمرم تا بتبینم یان سەردەکەویت و بەوە سوکناییم بۆ دێنێت، یان بکوژرێیت و چاوەڕێی پاداشتی شەهیدیت بم، پاشان عەبدوڵلا ماڵئاوایی لە دایکی کرد، دایکی پێی وت: کوڕی شیرینم، وریابە لە ترسی کوژران ئایینت زیانمەند نەکەیت، عەبدوڵلا چوو بۆ مزگەوت و سەری بەردە ڕەشەکە گرت نەوەك مەنجەنیق لێی بدات، یەکێك هات بۆلای ئیبن زوبەیرو ئەویش لای بەردەڕەشەکە دانیشتبوو، وتی: ئەرێ دەرگای کەعبەت بۆ نەکەینەوە تا بچیتە ناوی؟ ئەویش سەیری کردو پاشان پێی وت:

براکەت لە هەموو شتێك دەپارێزێت جگە لە گیانی واتە لە مەرگی، مەگەر کەعبە ڕێزێکی هەیە کە ئەم شوێنەش نەیبێت؟ سوێند بە خوا ئەگەر بە دارو دیواری کەعبەوە بتانبینن هەردەتانکوژن، پێی وترا ئەی بۆچی لەسەر ڕێککەوتن نایاندوێنیت؟ وتی مەگەر ئێستا کاتی ڕێککوتنە؟ سوێند بەخوا ئەگەر لەوێش بتانبینن هەمووتان سەردەبڕن، ئینجا وتی:

و لست بمبتاع الحياة بسبة و لا مرتفق من خشية الموت سلما

انافس سمها انه عنبر بارع ملاقی المنايا اي حرف تيمما

پاشان چوو بۆلای خێزانی زوبەیرو ئامۆژگاری کردن و وتی: با هەرکامتان شمشێرەکەی وەك ڕوخساری نەشکێ، وەك ئافرەت خۆی بپارێزێت و وریای خۆی بێت، سوێند بەخوا تەنها لە دەستەی یەکەمدا هەڵمەت و کشانم گرتوەتەبەر، هەرکاتێکیش دەردی برینێکم بووبێت دەردی دەرمان بووە، لەم قسەدابوون کە لە دەرگای بەنی جومەحەوە هەندێ هاتن بۆیان و ئەسوەدیان تێدابوو، وتی: ئەمانە کێن؟ وتیان: خەڵکی حیمس، لەگەڵ سوفیاندا هەڵمەتی بۆ بردن، یەکەم کەس بەرەنگاری بوویەوە ئەسوەد بوو، بە شمشێر دای لە پێی، ئەسوەد پێی وت:برای کوڕی ژنە زیناکەرەکە؟ زوبەیر پێی وت: دەمت داخە (یا ابن حام) ئەسما زیناکەر بێت، پاشان لە مزگەوت دەری کردن و چوو، سەیری کرد لە دەرگای بەنی سەهمەوە خەڵکێکی ترهاتن وتی: ئەمانە کێن؟ وترا خڵکێکی ئوردون، ئەویش هەڵی کوتایەسەریان و وتی:

لا عهد لي بغارة مثل السيل لا ينجلي غبارها حتى الليل

لە مزگەوت دەریکردن، سەیری کرد لە دەرگای بەنی مەخزومەوە هەندێکی دی هاتن، هەڵیکوتایە سەر ئەوانیش و وتی:

لكان قرني واحدا كفيته

یارانی لەسەر مزگەوتەکەوە هەیانبوو بەبەردو شتی تر دەیاندا لە دوژمن، ئیبن زوبەیر هەڵیکوتایە سەر دوژمن و بەردێك کەوت بەسەریدا، ئەویش وەستا و وتی:

و لسنا على الاعقاب تدمى كلومنا          ولكن على اقدامن نقطر الدما

پاشان کەوتو دوو مەولای خۆیان دابەسەریداو دەیانوت:

العبد يحمي ربه ويحتمي

پاشان چوون بۆیو سەریان لێ کردەوە، (هەیسەمی ج۷ ص۲۵۵ دەڵێت: تەبەرانی گێڕاویەتەوەو لە سەنەدەکەیدا عەبدولمەلیکی کوڕی عەبدولڕەحمانی زماری هەیە کە ئیبن حیببان بە جێ متمانەو ئەبوزەرعەو هی تریش بە لاوازی دەزانن، تەواو، ئیبن عەبدولبیریش لە الاستيعاب ج۲ ص۲۰۳ دا بە دوورو درێژی هێناویەتی، ئەبونەعیم لە الحلية ج۱ ص۲۳۱ بە کورتیو حاکم لە المستدرك ج۳ ص۵۵۰ بەشێکی سەرەتاکەی هێناوە).

ئەبونەعیمو تەبەرانیش لە ئیبن ئیسحاقەوە هێناویەتی دەڵێت: من ئامادەی کوشتنی ئیبن زوبەیر بووم ئەو ڕۆژەی لە مەسجیدولحەرام کوژرا، سوپاکان لە دەرگایەکی مزکەوتەوە دەچوونە ژوورەوەو ئەویش بە تەنها هەڵیدەکوتایە سەریانو دەری دەکردن، لەم بارەدا بوو کە لەسەر مزگەوتەوە شتێك کەوت بەسەریدا و خستی، ئەو کات ئەم دێڕە شیعرانەی دەوت:

اسماء ان قتلت لا تبكيني          لم يبق الا حسبي وديني

و صارم لانت به يميني[1]

---

[1]– (هەیسەمی ج۷ ص۲۵٦ دەڵێت: تەبەرانی گێڕاویەتیەوەو لە سەنەدەکەیدا کەسانێك هەن کە نایانناسم).

## (نکووڵی لەوەی لە ڕێی خوا ڕابکات)

حاکم لە المستدرك ج٣ ص٤٢ لە ئوم سەلەمەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی کە بەژنی سەلەمەی کوڕی هیشامی کوڕی موغیرەی وت: بۆ چی سەلەم نابینم لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ)و موسڵماناندا ئامادەی نوێژ بێت؟ وتی: بە خوا ناتوانێت دەربچێت، هەر کە دەربچێت خەڵکی هاواری لێدەکەن ئەی ڕاکردوان لە ڕێی خوا ڕاتان کرد؟ تا ئەوەی لەماڵەوە دانیشتووەو نایەتە دەرەوە، لە شەڕی موئتەدا لەگەڵ خالیدی کوڕی وەلیددا بوو.[1]

حاکم لە المستدرك ج٣ ص٤٢ لە ڕێگەی واقیدی کوڕی ئەبی هورەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: جۆرە قسەیەك لە نێوان منو ئامۆزاکەم دا هەبوو، وتی مەگەر لە ڕۆژی موئتەدا ڕات نەکرد، منیش نەمتوانی بەرامبەری هیچ بڵێم.[2]

## (پەشیمانیو خەفەتباری بەدەست ڕاکردنەوە)

ئیمامی ئەحمەد لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: من لە سریەیەکدا لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ)بووم، خەڵکی کەوتنە داوێكو هاواریان کرد چی بکەین؟ منیش لە ناویاندابووم، ئێمە ڕامانکرد، دوایی وتمان ئەگەر بچینەوە مەدینە دەکوژرێین، دوایی بچینە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)ئەگەر تەوبەمان بۆ بوو باشە ئەگەرنا دەچین، پێش نوێژی بەیانی چووین بۆلای‌و ئەویش فەرمووی (کێن؟)

---

[1] – (حاکم دەڵێت فەرموودەکە لەسەر مەرجی موسلیم صەحیحەو بوخاری و موسلیم نەیانهێناوە، زەهەبیش کۆکە لەسەری، ئیبن ئیسحاقیش هێناویەتی، لە البدایة والنهایة ج٤ ص٢٤٩ یشدا هاتووە).

[2] – ضعیف.

وتمان ئێمە ڕاکردوانین، فەرمووی (بل انتم الماكرون، انا فئتكم وانا فئة المسلمين) ئێمەش چووین و دەستمان ماچکرد.[1]

هەر لەوەوە هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) لە سریەیەکدا ناردینی، کە گەیشتین بە دوژمن یەکسەر شکاین، هاتینەوە مەدینە شەو بوو خۆمان شاردەوە، دوایی وتمان با بچین بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و پۆزشی لا بهێنینەوە، چووین تا پێی گەیشتین، وتمان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئێمە ڕاکردووین، فەرمووی (بل انتم العاكرون وانا فئتكم)(بەڵکو ئێوە دەربازبوون و منیش لە دەستەی ئێوەم) ئەسوەد دەڵێت فەرمووی (وانا فئة كل مسلم)(من دەستەی هەموو موسڵمانێکم)[2][3].

بەیهەقی ج٩ ص٧٧ لە ئیبن عومەرەوە (رضي الله عنه) بەو واتایە هێناویەتی و تیایدا هاتووە وتمان ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە ڕاکردوانین، فەرمووی (بل انتم العاكرون) وتمان ئەی پێغەمبەری خوا ویستمان نەیەینەوە ناو مەدینەو تاوبدەینە ناو دەریا، فەرمووی (لا تفعلوا فاني فئة كل مسلم)( وامەکەن چونکە من دەستەی هەموو موسڵمانێکم).[4]

ئیبن جەریر ج٤ ص٧٠ لە عائیشەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: گوێم لە عومەری کوڕی خەتتاب بوو کاتێك عەبدوڵلای کوڕی زەید (رضي الله عنه) هات هاواری کرد هەواڵ چیە ئەی عەبدوڵلای کوڕی زەید؟ ئەو کات لە مزگەوتدا بوو و دای بە پاڵ دەرگای ژوورەکەی مندا، وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران هەواڵم بۆ هێناویت، کە گەیشتە لای هەواڵی خەڵکی پێدا، کەسم نەدیوە ئامادەی شتێك بووبێت و هێندەی ئیبن زەید وەك خۆی باسی کردبێت، کاتێك خەڵکەکە هاتنەوەو عومەر ناڕەحەتی

---

[1] – صحيح.

[2] – صحيح.

[3] – (لە البداية والنهاية ج٤ ص٢٤٨ دا واهاتووە.

[4] – (ئەبوداودو ترمزیش هێناویانەو ترمزی بە حەسەنی داناوە، ئیبن ماجەش وەك گێڕانەوەکەی ئیمامی ئەحمەد هێناویەتی، لە تەفسیری ئیبن کەسیر ج٢ ص٢٩٤ دا هاتووەو ئیبن سەعدیش ج٤ ص١٠٧بە هەمان شێوە هێناویەتی).

موسڵمانانی کۆچەرو پشتیوانانی بە دەست ڕاکردنەوە بینی وتی: ئەی کۆمەڵی موسڵمانان خەفەت مەخۆن من هاودەمتانم ئێوە داوتانەتە پاڵ من.[1]

ئیبن جەریر ج٤ ص٧٠ لە موحەمەدی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی حوصەینەوەو هی تریشەوە هێناویەتی موعازی قاری (قورئان خوێن) لە بەنی نەجار لەوانەبوو لەو شەڕەدا بوونو ئەو ڕۆژ ڕایانکرد – واتە ڕۆژی شەڕی جسری ئەبی عوبەید– کە ئەم ئایەتەی خوێندەوە (و من یولهم یومئذ دبره الا متحرفا لقتال او متحیزا الی فئة فقد باءبغضب من الله و ماواه جهنم وبئس المصیر) دەگریا، عومەر پێی دەوت: مەگەر موعاز، من هاودەمتم، تۆ داوتەتە پاڵ من.[2]

ئیبن سەعد ج٣ ص٣٠٠ لە عەبدولڕەحمانی کوڕی لەیلاوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: عومەر کوڕی خەتتاب بە سەعدی کوڕی عوبەیدی هاوەڵی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم)وت – لە شەڕی ئەبوعوبەیددا شکان، پێی دەوترا قاری لە ناو هاوەڵاندا تەنها بەو دەوترا قاری (قوررئان خوێن) – عومەر پێی وت: دەچیت بۆ شام؟ چونکە لەوێ موسڵمانان گیریان خواردووەو دوژمنیش پێیان دەوێرن، بەڵکو ئەو ئازارەشت بسڕیتەوە، وتی: نا تەنها بۆ ئەو خاکە دەچم کە لێی ڕامکردووەو ئەو دوژمنانەی وایان پێکردم، چوو بۆ قادسیەو تیایدا کوژرا.

[1] – ضعیف.
[2] – ضعیف.

# (ئاماده‌سازی و یارمه‌تی كه‌سێك كه‌ ده‌چێت بۆ جیهادی ڕێی خوا)

ئیمامی ئه‌حمه‌دو ته‌به‌رانی له‌ جیبلله‌وه‌ واته‌ كوڕی حارسه‌ (ﷺ) هێناویانه‌ كه‌ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ئه‌گه‌ر خۆی غه‌زای نه‌كردایه‌ چه‌كه‌كه‌ی خۆی ده‌دایه‌ ده‌ست عه‌لی یان ئوسامه‌.[1]

ئه‌بوداود له‌ ئه‌نه‌سی كوڕی مالیكه‌وه‌ (ﷺ) هێناویه‌تی گه‌نجێك له‌ به‌نی ئه‌سله‌م وتی: پێغه‌مبه‌ری خوا ده‌مه‌وێت بچم بۆ جیهادو هیچم نیه‌ تا خۆمی پێ ئاماده‌ بكه‌م، فه‌رمووی (بڕۆ بۆلای فڵان ئه‌نساری، ئه‌و خۆی ئاماده‌كردو نه‌خۆشكه‌وت، بڵێ پێغه‌مبه‌ری خوا سه‌لامت لێ ده‌كات‌و پێی بڵێ ئه‌وه‌ی خۆتت پێ ئاماده‌كردووه‌ بیده‌ به‌ من) ئه‌ویش چوو و پێی وت، ئه‌ویش به‌ ژنه‌كه‌ی وت ئه‌وه‌ی خۆمم پێ ئاماده‌كردبوو بیده‌رێ‌و هیچی لێ مه‌هێڵه‌ره‌وه‌، سوێند به‌ خوا هیچی لێ هه‌ڵنه‌گریت به‌ره‌كه‌تداره‌ نه‌وه‌ك شتێ هه‌ڵگریت به‌ره‌كه‌تی نه‌بێت.[2]

موسلیم ج٢ ص١٣٧ له‌ ئه‌بی مه‌سعودی ئه‌نساریه‌وه‌ هێناویه‌تی ده‌ڵێت: كه‌سێك هات بۆلای پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) و وتی: من هیچم پێ نه‌ماوه‌ ده‌ی شتێكم بده‌رێ، فه‌رمووی (لام نیه‌) كه‌سێك وتی ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا من كه‌سێكی پێ ده‌ڵێم ئه‌وه‌ی بۆ بكات، پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رمووی (من دل على خير فله مثل اجر فاعله)(هه‌ركه‌س كه‌سێك بۆ چاكه‌یه‌ك ڕێنموونی بكات وه‌ك چاداشتی ئه‌نجامده‌ره‌كه‌ی بۆ هه‌یه‌).[3]

به‌یهه‌قی ج٩ ص١٧٢و حاكم له‌ المستدرك ج٢ ص٩٠ به‌ صه‌حیحی داناوه‌ له‌ جابری كوڕی عه‌بدوڵلاوه‌ (ﷺ) له‌ پێغه‌مبه‌ره‌وه‌ (ﷺ) هێناویانه‌ كه‌ ویستی غه‌زا بكات، فه‌رمووی (يا معشر المهاجرين والانصار ان من اخوتكم قوما ليس لهم مال ولا عشيرة فليضم احدكم اليه الرجلين او الثلاثة فما الاحدنا من ظهر جمل الا عقبة

---

[1] – (هه‌یسه‌می ج٥ ص٢٨٣ ده‌ڵێت كه‌سه‌كانی سه‌نه‌ده‌كه‌ی ئه‌حمه‌د جێ متمانه‌ن).

[2] – (موسلیم ج٢ ص١٣٧و به‌یهه‌قی ج٩ ٢٨ له‌ ئه‌نه‌سه‌وه‌ به‌ هه‌مان شێوه‌ هێناویانه‌).

[3] – (به‌یهه‌قیش ج٩ ص٢٨ له‌ ئه‌بی مه‌سعوده‌وه‌ به‌و جۆره‌ هێناویه‌تی).

كعقبة احدهم) واتە (ئەی كۆمەڵی كۆچەران و پشتیوانان لەناو براكانتاندا هەندێ هەن پارەو هۆزیان نیە، دەی هەركامتان دوو یان سێ كەسیان بگرێتەخۆی و با هەركاممان وەك یەكێك لەوان كوڵ و بارمان هەبێت) منیش دوو یان سێ كەسم دایە پاڵ خۆم و بارەكەم وەك هەركام لەوان بوو.

بەیهەقی ج٩ ص٢٨ لە واسلەی كوڕی ئەسقەفەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) لە شەڕی تەبوكدا هاواری كردو منیش چووم بۆلای هۆزەكەم و هاتمەوە، یەكەم هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) دەرچوو، منیش بەشاردا هاوارم دەكرد ئەرێ كەس چەكم دەداتێ و لە جیاتیدا پشكم ببات؟ پیرێكی پشتیوانان وتی: ئێمە پشكی دەبەین تا بارەكەی هەڵبگرین و خواردنی لەگەڵماندابێت، وتم: بەڵێ، وتی: دەی بە بەرەكەتی خواوە بكەوەرە ڕێ، منیش لەگەڵ چاكترین هاودەمدا چووم تا خوای گەورە سەری خستین و چەند وشترێكی كرد بە بەشم، بردنم بۆلای ئەو هاوەڵەم، ئەویش دەرچوو لەسەر كوڵێكی وشترەكەی دانیشت و وتی: بیانبەرەوە بەرەوداوە، دوایی وتی بەرەوپێشەوە، وتی: ئەمانە لە ڕێزەوە دەبینم، وتم: ئەمە ئەو دەستكەوتەی تۆیە كە مەرجمان كرد، وتی: وشترەكانت ببە برازاگیان، ئێمە ئەم پشكەی تۆمان نیازنەبوو. بەیهەقی دەڵێت: پێدەچێت مەبەستی ئەوە بووبێت بڵێ ئێمە مەبەستمان كرێ نەبوو، بەڵكو هاوبەشی پاداشت بوو.

تەبەرانی لە عەبدوڵڵاوە هێناویەتی ئەگەر قامچیەك لە ڕێی خوادا بخەمە گەڕ لام خۆشەویستترە لەوەی حەج لە دوای حەج بكەم.[1]

---

[1]– (هەیسەمی ج٥ ص٢٨٤ دەڵێت: تەبەرانی گێڕاویەتەوەو دەڵێت: كەسەكانی سەنەدەكەی جێ متمانەن).

# (جیهاد بە پاداشت)

تەبەرانی لە عەوف کوڕی مالیکەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) لە سریەیەکدا ناردمی و یەکێك وتی: کەسێك لەگەڵ تۆدا دەنێرم بەرامبەر بەوەی لە دەستکەوتدا پشکم هەبێت، پاشان وتی: سوێند بەخوا نازانم دەستکەوت دەگرن یان نا؟ بەڵام پشکێکی دیارم بۆ دابنێ، منیش سێ دینارم بۆ دانا، غەزامان کردو دەستکەوتمان دەستکەوت، پرسیارم کرد لە پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش پێی فەرموو (ما اجد له في الدنيا والاخرة الا دنانيره هذه الثلاثة التي اخذها) واتە (لە دونیاو دواڕۆژدا تەنها ئەو سێ دینارەی بۆ شك دەبەم کە وەریگرتووە).[1]

بەیهەقی ج٦ ص٣٣١ لە عەبدوڵڵای کوڕی دەیلەمیەوە هێناویەتی: یەعلای کوڕی منیە وتی: پێغەمبەر (ﷺ) مۆڵەتی غەزای داو منیش پیرێکی بێ خزمەتگوزار بووم، کەسێکم بە کرێ گرت تا پشکی هەبێت، کاتێك خەریك بوو بچن هات بۆلام و وتی: من نازانم پشکەکان چەندن؟ بەشی من چەندە؟ دەی شتێکم بۆ دیاری بکە هەر ئەوەبێت، منیش سێ دینارم بۆ دانا، کاتێك دەستکەوت هاتەوە ویستم بەشی بۆ ببڕمەوە، بیری دینارەکانم کەوتەوەو هاتمە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)و بۆم باسکرد، ئەویش فەرمووی (ما اجد له في غزوته هذه في الدنيا – وابزانم فەرموویشی والاخرة– الا دنانيره التي سمى).[2]

---

[1] – (هەیسەمی ج٥ ص٣٢٣ دەڵێت بەقیە لە سەنەدەکەیدا هەیە).

[2] – ضعيف.

## (ئەوەی بە سامانی کەسی تر غەزا دەکات)

تەبەرانی لە مەیمونەوە هێناویەتی وتی: ئەی پێغەمبەری خوا پێمان بڵێ ئەو کەسەی غەزا نەکات و ماڵی بە کەسی تر ببەخشێت بۆ غەزا ئایا پاداشتی هەیە یان پاداشت بۆ کەسی ڕۆیشتووە؟ فەرمووی (له اجر ماله و للمطلق اجر ما احتسب من ذالك) واتە (بۆ ئەو پاداشتی پارەکەی و بۆ ڕۆیشتوویش ئەوەی نیازو جێ چاوەڕوانی ئەو کارەیەتی)[1][2].

## (لە بری خۆ ناردن)

بەیهەقی و جگە لەویش لە عەلی کوڕی ئەبی ڕەبیعەی ئەسەدیەوە هێناویانە دەڵێت: کەسێك هات بۆلای عەلی کوڕی ئەبوتالیب (رضي الله عنه) و کوڕێکی خۆی لە جیاتی خۆی هێنابوو بۆ ناردن، عەلیش (رضي الله عنه) وتی: ڕای پیرێك لام خۆشەویستترە لە هەوڵ و جەنگی گەنجێك.[3]

## (نکووڵی لەسەر ئەوەی بۆ دەرچوون لە پێناو خوادا داوا لە خەڵك بکات)

بەیهەقی لە نافعەوە هێناویەتی دەڵێت: گەنجێکی بەهێز هات بۆ مزگەوت و لە دەستیدا............ هەبوو، دەیوت: کێ لە پێناو خوادا یارمەتیم دەدات؟ عومەر بانگی مردو بردیان بۆلای، وتی: کێ ئەم کابرام بۆ دەخاتە ئیش تا لە زەویدا بە کرێ کار بکات؟ یەکێك لە پشتیوانان وتی: من ئەی ئەمیری باوەڕداران. عومەر ووتی مانگی بە چەند؟ وتی: بە ئەوندە، وتی: بیگرەو ببیە، چەند مانگێك لە زەوی کابرا ئیشی کردو دواتر عومەر بە کابرای وت کابرای کرێکارمان چی کرد؟ وتی:

---

[1] – ضعیف.

[2] – (هەیسەمی ج٥ ص٣٢٣ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا کەسی وا هەن نایاننناسم).

[3] – (له الکنز ج٣ ص١٦٤ دا واهاتووە).

باشە ئەی ئەمیری باوەڕداران، وتی: دەی بە خۆی و حەقی کرێکەیەوە بیهێنە بۆلام، ئەویش بە بڕێ درهەمەوە هێنای، عومەر وتی: ئەمە بگرەو ئەگەر حەزدەکەیت ئێستا بڕۆ غەزا بکە یان حەزدەکەیت دابنیشە.[1]

## (قەرز بۆ جیهاد)

ئەبویەعلا لە عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە هێناویەتی دەڵێت: کابرایەك هات و وتی: گوێت لە پێغەمبەر (ﷺ) بووە لەسەر ئەسپ هیچ بڵێت؟ وتی: بەڵێ گوێم لێبوو پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو (الخيل معقود في نواصيها الخير الى يوم القيامة، اشتروا على الله واستقرضوا على الله) وترا ئەی پێغەمبەری خوا چۆن لە ڕێی خوادا بفرۆشین و قەرزبکەین؟ فەرمووی بڵێن (اقرضنا الى مقاسمنا، و بعنا الى ان يفتح الله لاتوالون بخير مادام جهادكم خضرا، وسيكون في اخرة الزمان قوم يشكون في الجهاد فجاهدوا في زمانهم، ثم اغزوا فان الغزو يومئذ خضر)[2].[3]

## (بەڕێکردن وماڵئاوایی لە موجاهیدی ڕێ خوا)

حاکم لە المستدرك ج٢ ص٩٨ لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك ناردنی بۆ غەزا تا (بقيع الغرقد) بە ڕێی کردن پاشان فەرمووی (بە ناوی خواوە بەڕێکەون، خوایە پشت و پەنایان بە)[4].[5]

---

[1] – (لە كنز العمال ج٢ ص٢١٧ دا واهاتووە).

[2] – ضعیف.

[3] – (هەیسەمی ج٥ ص٢٨٠ دەڵێت: لە سەنەدەکەیدا بەقیە هەیەو کەسەکانی دیکەی جێ متمانەن.

[4] – صحیح.

[5] – (حاکم دەڵێت لەسەر مەرجی موسلیم صەحیحە).

هەروەها حاکم لە المستدرك ج٢ ص٩٧ لە موحەمەدی کوڕی کەعبی قورەزیەوە هێناویەتی دەڵێت: عەبدوڵلای کوڕی یەزید بانگکرا بۆ خواردنێك، کە هات وتی: پێغەمبەر (ﷺ) کە ماڵئاوایی لە سوپایەك دەکرد دیفەرموو (استودع الله دینكم وامانتكم و خواتیم اعمالكم) واتە (ئایین و سپاردەو کۆتایی کارەکانتان دەدەمە دەست خوا).[١]

ئیبن عەساکیر لە ڕێگەی سەیف لە حەسەنەوە هێناویەتی و باسی ناردنی سوپای ئوسامە دەکات و دواتر دەڵێت: پاشان ئەبوبەرکر چوو تا گەیشتەلایان بە پیادە دەچوو و بەڕێی دەکردن و ئوسامەش لەسەر ئەسپ بوو، عەبدولرەحمانی کوڕی عەوفیش وڵاخەکەی ئەبوبەکری پێبوو، ئوسامە پێی وت: ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا سوێند بە خوا یان سوار دەبیت یان منیش دادەبەزم، وتی: بە خوا دانابەزیت و منیش سوارنابم، چی دەبێ منیش کەمێك لە ڕێ خوادا پێکانم تۆزاوی بن، چونکە غەزاکار هەر هەنگاوێك دەنێت حەوت سەد چاکەی بۆ دەنووسرێ و حەوت سەد پلە بەرز دەبێتەوەو حەوت سەد تاوانی دەسڕێتەوە کە گەیشتنە شوێنی ماڵئاوایی پێی وت دەکرێت عومەری کوڕی خەتتابم بۆ بەجێ بهێڵی؟ ئەویش مۆڵەتی دا.[٢]

مالیك لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە هێناویەتی ئەبوبەکری صدیق چەند سوپایەکی نارد بۆ شام، لەگەڵ یەزیدی کوڕی ئەبوسوفیاندا (رضي الله عنه) دەچوو کە ئەمیری یەکێك لەو سوپایانە بوو، دەڵێن یەزید بە ئەبوبەکری وت: یان سوار دەبیت یان منیش دادەبەزم، ئەبوبەکر (رضي الله عنه) وتی: نە تۆ دادەبەزیت و نە منیش سواردەبم، دەمەوێت پاداشتی ئەم هەنگاوانەم لەڕێی خوادا وەربگرم، ئینجا فەرموودەکە دێنێت.[٣]

---

[١] – صحیح.

[٢] – (ج٥ ص٣١٤ دا واهاتووە).

[٣] – (بەیهەقیش لە صاڵحی کوڕی کیسانەوە بەو جۆرە هێناویەتی، لە کنزالعمال ج٢ ص٢٩٥ دا هاتووە).

بەیهەقی ج٩ ص١٣٧ لە جابری بەرعینییەوە هێناویەتی ئەبوبەکری صدیق سوپایەکی بەرێکردو بەپێ لەگەڵیاندا چوو، وتی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی پێکانمان لە پێناودا خوادا تۆزاوی بوون، پێی وترا خۆ ئێمە بەرێمانکردوون و بەس؟ وتی: ئێمە ئامادەمان کردن و بەرێمانکردن و نزامان بۆ کردوون، (ئیبن ئەبی شەیبەش بەو جۆرە هێناویەتی.[1]

بەیهەقی ج٩ ص١٧٣ لە موجاهیدەوە هێناویەتی دەڵێت: چووم بۆ غەزاو عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضي الله عنه) بەڕێی کردین، کاتێك ویستی بەجێمان بهێڵێ وتی: هیچم نیە تا بتاندەمێ، بەڵام گوێم لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو دەیفەرموو (ان الله اذا استودع شيئا حفظه) من ئایین و سپاردەو کۆتایی کارەکانتان دەدەمە دەست خوا.[2]

# (پێشوازی جەنگاوەران)

ئەبوداود لە سابیئی کوڕی یەزیدەوە هێناویەتی دەڵێت: کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە غەزای تەبووکەوە هاتەوە مەدینە خەڵکی چوونە پێشوازی، منیش لەگەڵ منداڵەکاندا چووم بۆ (ثنية الوداع) بۆ پێشوازیکردنی.[3]

بەیهەقی ج٩ ص١٧٥ لە سائیبیەوە هێناویەتی دەڵێت: کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە تەبووك هاتەوە خەڵکی چوون بۆ (ثنية الوداع) بۆ پێشوازی لێکردنی، منیش هێشتا منداڵ بووم لەگەڵ خەڵکەکە چووم بۆ پێشوازی لێکردنی.

---

[1] – لە کنز العمال ج٢ ص٢٨٨ دا هاتووە، ئیبن ئەبی شەیبە لە قەیسەوە وەك فەرموودەکەی مالیك بە کورتی هێناویەتی).

[2] – صحيح.

[3] – صحيح.

# (دەرچوون لە ڕێی خوادا لە مانگی ڕەمەزاندا)

ترمزی لە عومەرەوە (ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) لە ڕەمەزان لە شەڕی بەدرداو لە فەتحی مەککەشدا غەزامان کرد، ئینجا فەرموودەکە دێنێت، (لە فتح الباری ج٤ ص١٣١ دا واهاتووە).[١]

ئیبن سەعدو ئیمامی ئەحمەد لە عومەرەوە (ﷺ) هێناویانە دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) لە ڕەمەزاندا دوو غەزامان کرد، بەدرو فەتحی مەککە، لە هەردووکیاندا ڕۆژوومان شکاند[٢].[٣]

ئیمامی ئەحمەد لە ئیبن عەبباسەوە (ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: خەڵکی بەدر سێ سەدو سیانزە کەس بوون، کۆچەرانی شەڕی بەدر حەفتاو شەش کەس بوون، شکستی خەڵکی بەدر لە حەڤدەی ڕەمەزان لە ڕۆژی هەینیدا بوو.[٤]

بەزاریش هێناویەتی، بەڵام ئەو دەڵێت: سێ سەدو سیانزە کەس زیاتر بوون، دەڵێت پشتیوانان دوو سەدو شەش کەس بوون، ئاڵای کۆچەران بە دەست عەلی کوڕی ئەبوتالیبەوە (ﷺ) بوو.[٥]

ئیبن ئیسحاق لە ئیبن عەبباسەوە (ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: پاشان پێغەمبەر (ﷺ) چوو بۆ سەفەرەکەی و ئەبوروهەم کلسومی کوڕی حوصەینی کوڕی عوتبەی کوڕی خەلەفی غیفاری لەسەر مەدینە دانا، لە دەی مانگی ڕەمەزاندا چوو و ڕۆژووی گرت و موسڵمانانیش هەروا تا گەیشتنە کەدید لە نێوان عوسفان و (ئەمج) لە وێ ڕۆژووی شکاندا، پاشان چوو تا لە (مر الظهرین) بە دەهەزار موسڵمانەوە دابەزی.[٦]

---

[١] – ضعیف.

[٢] – ضعیف.

[٣] – (فەرموودەکە حەسەنەو لە کنز العمال ج٤ ص٣٢٩ یشدا واهاتووە).

[٤] – (لە البدایة والنهایة ج٣ ص٢٦٩ دا واهاتووە).

[٥] – (هەیسەمی ج٦ ص ٩٣ دەڵێت: تەبەرانیش گێراویەتیەوەو لە سەنەدەکەیدا حەجاجی کوڕی ئەرتە هەیە کە مودەللەسە).

[٦] – (بوخاریش هێناویەتی، لە البدایة والنهایة ج٤ ص٢٨٨ یشدا هاتووە، تەبەرانیش لە فەرموودەیەکی دوورو درێژدا هەروا هێناویەتی، هەیسەمی ج٦ ص١٦٧ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن).

عەبدولڕەزاق و ئیبن شەیبی لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ساڵی فەتحدا لە مانگی ڕەمەزاندا دەرچوو بە ڕۆژوو بوو تا گەیشتە کەدید.

هەروەها عەبدولڕەزاق لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه)هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە ساڵی فەتحدا لە مانگی ڕەمەزاندا چوو تا دای بەلای ئاوێکدا لە ڕێدا، ئەویش لە گەرمای نیوەڕۆدا، خەڵکی تینووبوون و زۆریان بۆ هاتبوو و تەواو تینووی ئاوەکە بوون، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) داوای جامێ ئاوی کرد و گرتی بە دەستیەوە تا خەڵکی بینییان پاشان ئاوی خواردەوە و خەڵکەکەش ئاویان خواردەوە.[1]

## (نووسینی ناوی ئەوەی بۆ جیهادی ڕێی خوا دەچێت)

بوخاری لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی لە پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) بیست فەرمووی (هیچ پیاوێك لەگەڵ ئافرەتێکدا چۆڵەوانی نەبەستێت، هیچ ئافرەتێکیش سەفەر نەکات مەگەر مەحرەمێکی لەگەڵدا بێت) یەکێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من لە غەزای فڵاندا ناوم نووسی و ئافرەتەکەشم نیازی حەجی هەبوو، فەرمووی (دەی بڕۆ و لەگەڵ ژنەکەتدا حەج بکە).

## (نوێژو خواردن لە کاتی هاتنەوەدا)

بوخاری لە کەعبەوە هێناویەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەهاتەوە – لە چێشتەنگاڵدا– دەچوویە مزگەوت و پێش ئەوەی دابنیشێت دوورکات نوێژی دەکرد، لە جابری کوڕی عەبدوڵلایشەوە هێناویەتی کە دەڵێت: لە سەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) بووم، کە چووینە مەدینە پێی فەرمووم (بڕۆ ناو مزگەوت و دوورکات نوێژبکە).

---

[1]– (لە کنز العمال ج٤ ص٠ ٣٣٠ داهاتووە، موسلیمیش لەگەڵ ترمزی و نەسائی و مالیکیش لە ڕێی ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی، هەروەك لە جمع الفوائد ج١ ص١٥٩ دا هاتووە).

هـەروەها جـابرەوە هێناویـەتی دەڵێـت: پێغەمبـەر (ﷺ) کـە گەڕایـەوە مەدینـە مانگایـەکی سـەربڕی، موعـاز لـە شـوعبە لـە موحاریبـەوە ئـەوەی هێنـاوە لـە جـابری کـوڕی عەبـدوڵڵای بیـست کـە وتـی: پێغەمبـەر (ﷺ) وشـترێکی بـە دوو ئۆقیـەو درهـەمێك یـان دوو درهـەم لـە من کڕی، کـە هاتـە صرار فـەرمانی کرد مانگایـەکیان سـەربڕی‌و لێیـان خـوارد، کـە گەڕایـەوە مەدینـە فـەرمانی پێکـردم بـچمە مزگـەوت‌و دووڕکات نوێژ بکەم، ئینجا نرخی وشترەکەی بۆ پێوام.

## (دەرچوونی ئافرەتان لە جیهادی ڕێی خوادا)

## (ڕووداوی ئیفك)

ئیبن ئیسحاق لە عائیشەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) ئەگـەر نیـازی چـوونێکی هەبوایـە لـە نێـوان ژنەکانیـدا قورعـەی دەکـرد، کامیـان دەرچووایە لەگـەڵ خۆی دەیـبرد، لە غـەزای بەنی موستەلیقدا لـە نێوان ژنەکانیـدا قورعەی کرد وەك جاران من تیایدا دەرچووم‌و پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ خۆی بردمی، ئافرەتان ئەو کات شتی کەمیان دەخوارد نەدەکەوتنە گۆشت تا قورس بن، من کە سواری وشترەکەم دەبووم لە کەژاوەکەمدا دادەنیشتم، دواتر ئەوانەی وشترەکەیان دەبردم دەهـاتن‌و خـواری کەژاوەکـەیان دەگرت‌و بەرزیان دەکردەوەو لەسـەر پشتی وشترەکە دایاندەناو بەپـەت دەیانبەستەوە، پاشان سـەری (ڕەشـۆی) وشترەکەیان دەگرت‌و دەیانخستەڕێ.

کاتێك پێغەمبـەر (ﷺ) لـە سـەفەرەکەی بوویـەوە کەوتـەڕێ تـا نزیکـی مەدینـە بوویەوەو لە شوێنێ دابەزی و هەندێ شەوی لەوێ بەسەر برد، پاشان بانگەوازی بەڕێکەوتن کرا خەڵکی کەوتنەڕێ، منیش بۆ پێویستی خۆم دەرچووم، لە ملیشمدا ملوانکەیـەك هـەبوو کـە سلیمانی زەفاری تێدابوو، کە لێبوومـەوە لـە ملم کـەوت‌و نـەمزانی، کـە گەڕامـەوە کەوتمـەڕێ‌و سـەیرم کرد لـە ملمـدا نـەماوە، خەڵکەکـەش

کەوتبوونەڕێ، منیش گەڕامەوە بۆ ئەو شوێنەی بۆی چووبووم و دۆزیمەوە، ئەوانەی کە وشترەکەیان دەبردم بە ڕێدا کەژاوەکەیان هەڵگرت و وایانزانی من تیایدام وەك جاری جاران، هەڵیانگرت و خستیانە سەر وشترەکە و گومانیان لەوە نەبوو کە من تیایدام، پاشان کەوتنەڕێ، منیش گەڕامەوە بۆ سەربازگەکە و کەسی تێدا نەبوو و هەموو چووبوون، منیش بە جلەکەم خۆم پێچایەوە و دواتر لە شوێنی خۆمدا ڕاکشام و زانیم ئەگەر ون بم دەگەڕێنەوە بە شوێنمدا، سوێند بەخوا ڕاکشابووم کە صەفوانی کوڕی موعەتتەلی سولەمی دای بەلامدا، ئەویش لەبەر هەندێ پێویستی خۆی لە سەربازگەکە دواکەوتبوو، کە منی بینی هات و لام وەستا، پێش ئەوەی پەردە لەسەرمان واجب بێت ئەو منی دیبوو (پێش ئایەتی من وراو الحجاب لە سورەتی حوجورات) کە منی بینی وتی: انا لله وانا الیه راجعون خێزانی پێغەمبەری خوا؟ منیش بە جلەکانم خۆم داپۆشیبوو، وتی: بۆچی دواکەوتوویت ڕەحمەتی خوات لێ بێت؟ منیش پێم نەوت، پاشان وشترەکەی بۆ نزیك کردمەوە و وتی: سواربە، خۆیشی دوورکەوتەوە، منیش سواربووم، ئەویش ڕەشوەی وڵاخەکەی گرت و خێرا بەرەو لای خەڵکەکە چوو، سوێند بەخوا تا بەیانی ئینجا گەیشتینە لای خەڵکەکە کاتێك دابەزیبوون، کاتێك دڵنیابوون کابرا بە وشترەکەوە هێنامی، ئەوەبوو ئەهلی ئیفك ئەوەیان وت کە وتیان، سەربازگەکە شێوا، سوێند بە خوا ئاگام لە هیچ نەبوو.

پاشان چووینە مەدینە و هێندەی نەبرد سکاڵایەکی زۆرم لەسەر بوو و منیش ئەوەم نەدەکەوتە بەرگوێ، تا قسەکە گەیشتە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و باوك و دایکم، هەرچی لەو بارەوە بیانوتایە پێم کەم بێت یان زۆر هەندێ سۆزی پێغەمبەری خوام بۆ خۆم پێ ڕەوانەبوو، جاران ئەگەر سکاڵایەکم بوایە سۆز و میهری بۆ دەنواندم، بەڵام ئەوجار ئەوەی نەکرد، ئەوەش منی بێزار کرد، کاتێك دەهات بۆلام و دایکم

لەلام بوو و دەیدواندم دەیفەرموو (کیف تیکم؟) واتە (حاڵی چۆنە؟)[1] لەوە زیاتر هیچی نەدەوت، کاتێك ئەو وشکی و ڕەقیەی پێغەمبەرم (ﷺ) لە ڕوومدا بەدیکرد باری دەروونم باش نەبوو و وتم ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر مۆڵەتم دەدەیت با بچمەوە لای دایکم، فەرمووی پێویست ناکات، منیش ڕوومکردە لای دایکمەوەو هیچ ئاگام لە بارەکە نەبوو چی بووەو دەبێ تا ئەوەی بیست و ئەوەندە شەوی بەسەردا چوو هێشتا لە باری سەختیم دەربازم نەبوو، ئێمە لە ماڵی عەرەبدا وەك عەجەمەکان نەبووین لە ماڵدا بەڵکو دەچووینە بیابانی مەدینە، ئافرەتانیش بۆ پێویستییان شەوانە دەردەچوون، منیش شەو چووم بۆ پێویستی خۆم و ئوم میستەحی کچی ئەبی روهمی کوڕی لیبم لەگەڵدابوو، سوێندا بە خوا لەگەڵم دەچوو کە (عپرت عیی مرگها٩، وتی میستەح قوڕبپێوێ، وتم سوێند بە خوا بەرامبەر کەسێکی کۆچەران کە بەدری بینیوە خراپت وت، وتی: کچی ئەبوبەکر ئەرێ هەواڵەکەت نەبیستووە؟ وتم کام هەواڵ؟ ئەویش بۆی گێڕامەوە چی وتراوە، وتم شتی وا هەیە؟ وتی بەڵێ سوێند بە خوا هەیە، سوێند بە خوا نەمتوانی پێویستیەکەم بەجێبگەیەنم و گەڕامەوە، سوێند بەخوا هێندە گریام تا وامدەزانی جەرگم دەبڕی، بە دایکم وت، خوا لێت خۆش بێت خەڵکی ئەوە دەڵێن تۆیش هیچم پێ ناڵێیت؟ وتی: کچی شیرینم لەسەر خۆتی قورس مەکە، سوێند بە خوا کەم بووە ژنێکی باش لای پیاوێك بێت و پیاوەکەی خۆشی بوێت و ژنەکەش هەوێی هەبن هەموان لێی کۆدەبنەوە.

پێغەمبەر (ﷺ) هەستاو - من ئاگام لێ نەبوو- وتاری بۆ خەڵك خوێندەوەو سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کردو دواتر فەرمووی (ئەی خەڵکینە ئەوە چیە هەندێ کەس لەسەر کەس و خێزانم ئازارم دەدەن و شتێکیان لە دژ ئەڵێن کە حەق

[1] - لەگەڵ ئەوەی پرسیار کردنەکە جۆرێکی وشکی و ڕەقی دەگەیەنێت، بەڵام بەڵگەی سۆزو هەواڵ پرسینیشە.

نیە، سوێند بە خوا تەنها خێرم لێ بیستوون، بەرامبەر پیاوێك ئەوەش دەڵێن کە سوێند بەخوا تەنها خێرم لێ بینیووەو چووبێتە هەر ماڵێکەوە لەگەڵ خۆم بووە).

ئەمە لای عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول بە دەستەیەکی خەزرەجیەکان، لەگەڵ ئەوەی میستە و حەمنەی کوڕی جەحش هاو واتا بوون گەورە بوو، چونکە خوشکی حەمنە زەینەبی کچی جەحش (رضي الله عنها) لای پێغەمبەر (ﷺ) بوو و یەکێك لە ژنەکانی بوو، لەسەر پلە و پایە لای پێغەمبەر (ﷺ) ڕکەبەری لەگەڵ دەکردم، زەینەب (رضي الله عنها) خوای گەورە بە ئاییینەکەی پاراستی و تەنها چاکەی وت، بەڵام حەمنە کەوتە پڕوپاگەندە کردن تا لە پێناو خوشکەکەیدا ئازار و زیان بە من بگەیەنێت، بەمە سەرکەش بوو، کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) ئەو قسەی فەرموو ئوسەیلی کوڕی حوزەیر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر لە ئەوس بن خۆمان دەرەقەتیان دێین، ئەگەریش لە برا خەزرەجییەکانمان بن فەرمانی خۆتمان پێ بفەرموو، دەی سوێند بە خوا ئەوانە هی ئەوەن لە ملیان بدرێت، سەعدی کوڕی عوبادە کە پێشتریش بە کەسێکی صالح ناسرابوو وتی: سوێند بە خوا درۆت کرد لە ملیان نادرێت. سوێند بە خوا بۆیە ئەو قسەت کرد تەنها لەبەر ئەوەی زانیت لە خەزرەجییەکانن ئەگەر لە هۆزەکەی خۆت بوونایە وات نەدەووت، ئوسەید وتی: بە خوا درۆت کرد، تۆ دووڕوویت و بۆ دووڕووەکان مشتومڕ دەکەیت، خەڵکی کەوتنە یەك و خەریك بوو لە نێوان ئەوس و خەرزرەجدا شەڕێك ڕووبدات، پێغەمبەر (ﷺ) دابەزی و علی (رضي الله عنه) هات، پێغەمبەر (ﷺ) عەلی کوڕی ئەبوتالیب و ئوسامەی کوڕی زەیدی بانگ کردن و ڕاوێژی پێ کردن، ئوسامە کەوتە خێر وتن و قسەی خۆی کرد، عەلیش (رضي الله عنه) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئافرەتان زۆرن و تۆ دەتوانیت کەس ڕاسپێریت، پرسیار لە کەنیزەکەکە بکە ئەو ڕاست وەڵامت دەداتەوە، پێغەمبەر (ﷺ) بەریرەی بانگکرد و پرسیاری لێکرد، عەلی (رضي الله عنه) هەستا و زللەیەکی توندی لێدا و وتی: لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) ڕاست بڵێ، ئەویش دەیوت: سوێند بە خوا تەنها خێرم لێ بینیوە، هیچ عەیبێکم لە

عائیشه نه‌بینیوه جگه له‌وه‌ی هه‌ویرم ده‌شێلا ده‌موت لای دانیشایت که‌چی خه‌وی پیاده‌که‌وت، ئه‌و کات مه‌ڕ ده‌هات‌و ده‌یخوارد، عائیشه (رضي الله عنها) ده‌ڵێت پاشان پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) هاته ژووره‌وه بۆلام‌و دایك‌و باوكم‌و ئافره‌تێكی ئه‌نساریشم لابوو، منیش ده‌گریام‌و ئافره‌ته‌كه‌ش ده‌گریا، پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) دانیشت‌و سوپاس‌و ستایشی په‌روه‌ردگاری كرد‌و پاشان فه‌رمووی (عائیشه وا قسه‌ی ئه‌و خه‌ڵكه‌ت بیستووه‌ته‌وه، ده‌ی له خوا بترسه، ئه‌گه‌ر نزیكی خراپه‌یه‌ك كه‌وتوویته‌وه له‌وه‌ی خه‌ڵك ده‌یڵێت ئه‌وا بگه‌ڕێره‌وه بۆلای خوا چونكه خوا ته‌وبه له به‌نده‌كانی قبوڵ ده‌كات) سوێند به خوا كه ئه‌مه‌ی فه‌رموو فرمێسكم نه‌ما و هیچ هه‌ستم پێ نه‌ده‌كرد، چاوه‌ڕێم كرد دایك‌و باوكم له جیاتی من وه‌ڵامی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) بده‌نه‌وه، به‌ڵام هیچیان نه‌وت، هاوارم بۆلای ئه‌و خوایه من خۆم زۆر له‌وه به بچوكتر داده‌نا خوای گه‌وره ئه‌و قسه‌ی خه‌ڵكه به‌رامبه‌رم به درۆبخاته‌وه تا پاكی من بزانێت، به‌ڵام بۆ دابه‌زینی قورئان له‌سه‌رم سوێند به‌خوا خۆم زۆر به‌كه‌متر له‌وه ده‌زانی، كه‌بینیم باوك‌و دایكم هیچیان نه‌وت پێم وتی: ئایا وه‌ڵامی پێغه‌مبه‌ری خوا ناده‌نه‌وه؟ وتیان سوێند به خوا نازانین تا وه‌ڵامی بده‌ینه‌وه، سوێند به خوا هیچ ماڵێكم نه‌دیبوو وه‌ك ئه‌و ڕۆژه‌ی ماڵی ئه‌بوبه‌كر باریان سه‌خت بێت، كاتێك دایك‌وباوكم هیچیان له‌سه‌ر نه‌وت گریام‌و وتم: سوێند به خوا له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی باست كرد هیچ كات ته‌وبه ناكه‌م، سوێند به خوا ده‌زانم ئه‌گه‌ر دان به‌و قسه‌ی خه‌ڵكدا بنێم كه خواش ده‌زانێت من لێی به دوورم ئه‌وا شتێك ده‌ڵێم كه وانیه، ئه‌گه‌ریش بڵێم شتی وا نه‌بووه بڕوام پێ ناكه‌ن، دوایی ویستم ناوی یه‌عقوب بێنم بیرم نه‌ده‌هاته‌وه، بۆیه وتم: به‌ڵام وه‌ك قسه‌ی باوكی یوسف ده‌ڵێم (فصبر جمیل والله المستعان علی ما تصفون) سوێند به خوا پێغه‌مبه‌ر خوا له‌و دانیشتنه‌ی هه‌ڵنه‌سا تا پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) سروشی بۆ دابه‌زی، كراسه‌كه‌ی درا به‌سه‌ریداو پشتیه‌كی پێسته خرایه ژێر سه‌ری، كاتێك ئه‌وه‌م بینی نه‌ترسام‌و گوێم لێ نه‌بوو و زانیم من لێی به دوورم‌و خواش سته‌مم لێ ناكات، به‌ڵام دایك‌و باوكم ده‌ترسان، سوێند به‌و كه‌سه‌ی گیانی عائیشه‌ی به‌ده‌سته،

پێغەمبەر (ﷺ) لێ نەببوویەوە تا ئەوەی وامزانی دایك و باوكم لە ترسی ئەوەی خوای گەورە بە ڕاست دانانی قسەکەی خەڵك دابەزێنێت گیانیان دەربچێت. پاشان پێغەمبەر (ﷺ) ئەو بارەی نەما و دانیشت و ڕوخساری گەوهەری لێ دەڕژا، عارەقی نێوچاوانی دەسڕی و فەرمووی (ابشري يا عائيشة قد انزل الله عز وجل براءتك) واتە (موژدەت لێ بێت عائیشە خوا لەسەر پاکی تۆ سروشی بۆ دابەزاندم) منیش وتم سوپاس بۆ خوا، پاشان پێغەمبەر (ﷺ) چوو بۆناو خەڵکەکەو وتاری بۆ خوێندنەوەو ئەو ئایەتەی خوای بەسەردا خوێندنەوە کە لەوبارەوە دایبەزاند، پاشان فەرمانی کرد بە لێدانی (جەلد) لە میستەحی کوڕی ئەساسەو حەسانی کوڕی سابت و حەمنەی کچی جەحش (ڕەزای خوا لە هەر سێکیان) چونکە لە هەموان زیاتر پڕوپاگەندەیان دەکرد، حەددەکەیان لێدرا.[1]

ئیمامی ئەحمەدیش بە دوورو درێژی هێناویەتی و لە دەقەکەیدا هاتووە: عائیشە (رضي الله عنها) وتی: دایکم پێی وتم: هەستە بچۆ بۆلای، وتم بە خوا هەڵناسم ناچم بۆلای و تەنها سوپاسی ئەو خوایە دەکەم کە لەسەر پاکی من سروشی دابەزاند، خوای گەورە ئەم دە ئایەتەی دابەزاند (ان الذين جاؤوا بالافك عصبة منكم) کاتێك خوای گەورە ئەمەی لەسەر دابەزاندم ئەبوبەکر لەبەر خزمایەتی لەگەڵ میستەح و هەژاریی میستەح دەستگیرۆیی دەکرد وتی: بەخوا دوای ئەوەی بەرامبەر عائیشە وای وت هەرگیز دەستگیرۆیی ناکەم، ئینجا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند(ولا ياتل اولو الفضل منكم والسعة ان يؤتوا اولي القربى) تا (الا تحبون ان يغفرالله لكم والله غفور رحيم) ئەبوبەکر وتی با بە خوا حەزدەکەم خوا لێم خۆش بێت، بۆیە دوبارە دەستگیرۆیی میستەحی دەکردو وتی سوێند بە خوا هەرگیز لێی ناخۆم.[2]

---

[1]- (ئەم فەرموودە لە صەحیحی بوخاری و موسلیم لە زوهریەوە هێنراوەو ئەم دەقەش کۆمەڵێك سوودو پەندی زۆری تێدایە، لە البداية والنهاية ج٤ ص١٦٠ دا واهاتووە).

[2]- (لە تەفسیری ئیبن کەسیر ج٣ ص٢٧٠ دا واهاتووەو تەبەرانیش بە دوورو درێژی هێناویەتی، لە المجمع ج٩ ص٢٣٢ دا هاتووە).

ئیبن ئیسحاق لە ژنێکی بەنی غیفارەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ هەندێ ئافرەتی بەنی غیفاردا چووم بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و وتم ئەی پێغەمبەری خوا ویستمان لەگەڵت بێین، کاتێك دەیویست بەرەو خەیبەر بچێت، وتمان دێین تا بریندارەکان برینپێچ بکەین و یارمەتی موسڵمانان بدەین چەندە بتوانین، فەرمووی (لەسەر بەرەکەتی خوا) ئێمەش لەگەڵی چووین، من ئافرەتێکی پێگەیشتوو بووم، پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر کۆڵەکەی خۆم دایناام، سوێند بە خوا پێغەمبەر (ﷺ) تا بەیانی دانەبەزی و منیش لەسەر کۆڵەکەی دابەزیم، هەندێ خوێنی منی کەوتەسەر، ئەوەش یەکەمجاری حەیزم بوو، منیش شەرم دایگرتم و خۆم گرت بە وشترەکەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) بینی حاڵم چۆنە و خوێنی بینی فەرمووی (لعلك نفست) وتم: بەڵێ، فەرمووی (فاصلحي من نفسك، ثم خذي اناء من ماء فاطرحي فيه ماحا اغسلي ماصاب الحقيبة من الدم ثم عودي لمركبك) کاتێك خوا خەیبەری فەتح کرد لە دەستکەوتدا بەشی داین، ئەو ملوانکەش دەیبینن پێغەمبەر (ﷺ) کردیە ملم، پێیدام و بەدەستەکانی خۆی کردیە ملم، سوێند بە خوا هەرگیز لێم جیانابێتەوە، تا مرد هەر لە ملیدا بوو، پاشان وەسیەتی کرد لەگەڵیدا بیخەنە ناو کفنەکەی، نیوەی لە حەیز پاك نەدەبوویەوە مەگەر ئەوەی خوێی بەکاردەهێنا و وەسیەتیشی کرد لە شۆردنی مردنیشدا وابکەن[1].[2]

ئیمامی ئەحمەد لە حەمیدی کوڕی هیلالەوە هێناویەتی دەڵێت: کابرایەك ڕێی بەلای ئێمەدا بوو دەهات و خەڵکەکەی دەدواند، وتی: بە کاروانێکەوە هاتین بۆ مەدینە و شتەکانمان فرۆشت، دوایی وتم: ئەبێ بچم بۆلای ئەو کابرا و هەواڵی بێنم

[1] – ضعیف.

[2] – (ئیمامی ئەحمەد بەوجۆرە گێڕاویەتیەوە، ئەبوداودیش لە فەرموودەکەی ئیبن ئیسحاقەوە و واقدیش بە سەنەدی خۆی لە ئومەییەی کچی ئەبی صەلتەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی، البداية والنهاية ج٤ ص٢٠٤ دا واهاتووە).

بۆ ئەوانی دی، چوومە لای پێغەمبەر (ﷺ)و ئەویش ماڵێکی پێ نیشان دامو فەرمووی ئافرەتێکی تێدا بوو، لەگەڵ سریەیەکی موسڵماناندا چوو و دوانزە بزنەمێی لەگەڵ ئامێری چنینەکەی بەجێهێشت، دوایی بزنەمێکەی لەگەڵ ئامێرەکەیدا لە دەستدا، وتی: پەروەردگار تۆ زامنی هەرکەست کردووە لەپێناو تۆدا دەربچێت بیپارێزیت، وامن ئەمانەم لە دەستداوە دەی سوێندت دەدەم بۆم بگێڕەوە، پێغەمبەر (ﷺ) باسی گەروم و گوڕی پاڕانەوەی ئافرەتەکەی دەکرد، فەرمووی (فاصبحت عنزها ومثلها وصيصتها و مثلها، وهاتك فاتها فاسالها ان شئت) وتم: بڕوات پێ دەکەم[1][2].

بوخاری لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) چوو بۆلای کچی میلحانو لەلای پاڵی دایەوەو دواتر پێکەنی، ئەویش وتی بۆچی پێدەکەنی ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی (ناس من امتي يركبون البحر الاخضر في سبيل الله، مثلهم مثل الملوك على الاسرة) ئەویش وتی دەی پێغەمبەری خوا نزام بۆ بکە یەکێك لەوانە بم، فەرمووی (خوا با ئەم ئافرەتە یەکێك بێت لەوانە) پاشان گەڕایەوە پێکەنی، وتی ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی پێدەکەنی؟ هەمان شتی پێ فەرموو، وتی دەی نزام بۆ بکە لەوانە بم، فەرمووی (تۆ لە یەکەمینەکانی نەوەك لە دواییینەکان) ئەنەس وتی: شووی کرد بە عوبادەی کوڕی صامتو لەگەڵ کچی قورزەدا چوویە ناو دەریاکە کە کەوتنەڕێ سواری وشترەکەی بوو بەڵام لەسەری کەوتە خوارەوەو گیانی سپارد.

---

[1] – صحيح.

[2] – (هەیسەمی ج٥ ص٢٧٧ دەڵێت ئیمامی ئەحمەد بەسەنەدی صەحیح گێڕاویەتیەوە).

# (خزمەتی ئافرەتان لە جیهادی ڕێی خوادا)

تەبەرانی لە ئوم سولەیمەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) هەندێ ئافرەتی پشتیوانانی لەگەڵدابوو، ئەوانە ئاوی نەخۆشەکان و برینپێچی بریندارەکانیان دەکرد، (هەیسەمی ج٥ ص٣٢٤ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن. موسلیم و ترمزی بە صەحیحی لە ئەنەسەوە هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) ئوم سولەیم و هەندێ ئافرەتی پشتیوانانی دەبرد بۆ غەزاو لەوێ سەرقاڵ ئاودان و برینپێچی بریندارەکان بوون).

بوخاری لە ڕوبەیعی کچی میعوەزەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) بووین ئاومان پێدەدان و خزمەتمان دەکردن و بریندارو کوژراوەکانمان دەگێڕانەوە بۆ مەدینە، (هەروەها ئیمامی ئەحمەدیش لە ئەلمونتەقی هێناویەتی)، موسلیم و ئیبن ماجەش لە ئوم عەتیەی ئەنساریەوە هێناویانە دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) دا حەوت غەزام کردو لەلای شتەکانیان دەمامەوەو خواردنم بۆ ئامادە دەکردن و برینپێچی بریندارەکانم دەکردو لای تووشبوانی (زمانە) دەمامەوە.[1]

تەبەرانی لە لەیلای غیفاریەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) دا دەردەچووم و بریندارەکانم برینپێچ دەکردن.[2][3]

بوخاری لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لە ڕۆژی ئوحوددا خەڵکی شکان و لە پێغەمبەر (ﷺ) دوورکەوتنەوە، من عائیشەی کچی ئەبوبەکرو ئوم سولەیمم بینی کە فرکان فرکانیان بوو، قۆڵیان هەڵکردبوو و دەچوون و کونەیان لە

---

[1] – (لە المنتقى وا هاتووە).

[2] – ضعیف.

[3] – (هەیسەمی ج٥ ص٣٢٤ دەڵێت: لە سەنەدەکەیدا قاسمی کوڕی موحەمەدی کوڕی ئەبی شەیبە هەیە کە لاوازە).

پشت نابوو، کەسانی دیکەش هێناویانە کە کونەی ئاویان لەسەر پشت دەبردو دەیانکرد بە دەم خەڵکەوەو دەگەڕانەوەو پڕیان دەکردەوەو دووبارە دەهاتنەوەو بەوجۆرە.[1]

بوخاری لە شەعلەبەی کوڕی ئەبی مالیکەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) هەندێ خوری لە نێو ئافرەتانی مەدینەدا دابەش کرد، یەکێکی باشیان مایەوە، هەندێ لەوانەی لەلای بوون وتیان ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەوەیان بدە بە کچی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە لە لاتە، مەبەستیان ئوم کەلسومی کچی عەلی(رضي الله عنه) بوو، عومەریش (رضي الله عنه) وتی: ئوم سولەیت شیاوترە، لەو پشتیوانانە بوو کە بەیعەتیاندا بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، عومەر دەیوت: چونکە لە ڕۆژی ئوحوددا کونەی ئاوی بۆ دەهێناین.[2]

ئەبوداود لە ڕێگەی حەشرەجی کوڕی زیاد لە دایەگەورەیەوە هێناویەتی کە لە شەڕی حونەین لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)دا دەرچووین و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پرسیاری لێ کردین لەوبارەوە، ئەوانیش وتیان: هاتووین قژەکانمان دەکەینە پرچ و لەپێناو خوادا یارمەتی بدەین و بریندارا برینپێچ بکەین و تیر بدەینە دەست و ئاو بگێڕین. عەبدولڕەزاق لە زوهریەوە هێناویەتی: ئافرەتان لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)دا دەچوون بۆ شەڕو ئاوی جەنگاوەرانیان دەداو بریندارانیان برینپێچ دەکردن.[3][4]

---

[1] – (موسلیمیش هێناویەتی، بەیهەقی ج٩ ص٣٠ لە ئەنەسەوە بەوجۆرە هێناویەتی).

[2] – (ئەبونەعیم وئەبوعوبەیدیش هێناویانە، لە الکنز ج٧ ص٩٧ یشدا هاتووە).

[3] – ضعیف.

[4] – (لە فتح الباری ج٦ ص٥١ دا واهاتووە).

# (شەڕی ئافرەتان لە جیهادی ڕێی خوادا)

ئیبن هیشام لە سەعیدی کوڕی ئەبی زەیدی ئەنسارییەوە هێناویەتی ئوم سەعدی کچی سەعدی کوڕی ڕەبیع دەیوت: چووم بۆلای ئوم عەممارەو پێم وت: پوریێ باسی خۆتم بۆ بکە، وتی: لەبەری بەیانەوە چووم تا بزانم خەڵکی چی دەکەن، قاپێکیشم پێ بوو ئاوی تێدابوو، چوومە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) کە لەناو هاوەڵانیدابوو و زاڵبوون و بار بۆ موسڵمانان بوو، کە موسڵمانان شکان چووم بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)و شەڕم دەکردو بە شمشێر دەمپاراست و تیرم دەوەشاند تا بریندار بووم، ببرینێکی چاڵی لەسەر شانم بینی کە چاڵ ببوو، وتی: کێ وای پێ کردیت؟ وتم: ئیبن قەمیە (اقماه الهه) کاتێك خەڵکی لە پێغەمبەر (ﷺ) دوور کەوتنەوە هات و وتی: موحەممەدم پێ نیشان بدەن، ئەگەر بهێڵن دەرچێت مەرگم بۆ باشە، من و موصعەبی کوڕی عومەیر و هەندێکی دی لەگەل پێغەمبەر (ﷺ)ماینەوە بەرەو ڕووی بووینەوە، ئەو برینەی تووش کردم، منیش بەرامبەر بەوە چەند شمشێرێکم لێدا، بەڵام دوژمنی خوا دوو قەڵغانی پۆشیبوو.[1]

واقیدی بە سەنەدێکی تر لە عەممارەی کوڕی عەربەوە هێناویەتی کە ئەو ژنە ئەو ڕۆژ سوارێکی بێباوەڕانی کوشت، لەلایەکی دیکەوە لە عومەرەوە هێناویەتی وتی: گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو دەیفەرموو (لە ڕۆژی ئوحوددا کە سەیری ڕاست و چەپم دەکرد دەمبینی شەڕی دەکرد)[2].[3]

ئیبن سەعد لە ڕێگەی واقیدی لە زمرەی کوڕی سەعیدەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب (رضی الله عنه) هەندێ جلی خوری بۆ هێنرا، یەکێك زۆر چاك و

---

[1] – لە البدایة والنهایة ج٤ ص٣٤ دا هاتووە، واقیدی لە ڕێگەی ئیبن ئەبی صەعصەوە لە ئوم سەعیدی کچی سەعدی کوڕی ڕەبیعەوە هێناویەتی، لە الاصابة ج٤ ص٤٧٩یشدا هاتووە.

[2] – ضعیف.

[3] – لە الاصابة ج٤ ص٤٧٩دا واهاتووە.

گەورە بوو، هەندێکیان وتیان: ئەمە نرخەکەی ئەوەندەیە، بۆچی نایدێریت بۆ ژنی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر صەفیەی کچی عوبەید، وتی: دەینێرم بۆ کەسێك کە لەو شیاوترە ئوم عەممارە موسەیبەی کچی کەعب (رضي الله عنها) گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو دەیفەرموو (کە سەیری ڕاست و چەپم دەکرد دەمبینی شەڕی دەکرد).[1]

ئیبن سەعد لە هیشام لە باوکیەوە هێناویەتی صەفیە لە ڕۆژی ئوحود هات و خەڵکی شکابوون، ئەویش تیرێکی بە دەستەوە بوو دەیدا بە ڕووی دوژمناندا، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ئەی زوبەیر ژنەکە).[2]

ئیبن ئیسحاق لە عوبادەوە هێناویەتی دەڵێت: صەفیەی کچی عەبدولموتەلیب لە قەڵاکەی حەسسانی کوڕی سابتدا بوو، حەسسان لەگەل ئێمەدا بوو لەگەل ژن و منداڵەکاندا، جوولەکەیەك دای بە پاڵماندا و بە دەوری قەڵاکەدا دەهات و دەچوو، بەنو نەزیر کەوتوبوونە شەڕ و پەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) دا پچڕا ندبوو، لە نێوان ئێمە و ئەوانیشدا کەسێك نەبوو بەرگریمان لێ بکات، پێغەمبەر (ﷺ)یش لەگەڵ موسڵماناندا لەناویاندا بوون و نەیاندەتوانی وازیان لێ بێنن و بگەڕێنەوە بۆ لامان، یەکێك هات بۆ لامان، وتم: حەسسان ئەو جوولەکەیە دەبینیت دێت و دەچێت بە چواردەوری قەڵاکەدا، بە خوا من لێی دڵنیا نیم دەترسم جوولەکە لە پشتەوە لێمان بدەن، پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانیش سەرقاڵی جەنگن، دابەزە بۆی و بیکوژە، وتی: خوا لێت خۆش بێت کچی عەبدولموتەلیب بە خوا خۆت دەزانیت من هی ئەو کارە نیم، کە ئەمەی پێ وتم و هیچم لا بەدی نەکرد تا بیبەم و بچم بۆ جوولەکەکە، دواتر تێلایەکم هەڵگرت و لە قەڵاکەوە دابەزیم بۆی و لێمدا تا کوشتم، کە لێبوومەوە گەڕامەوە بۆ قەڵاکە و وتم: حەسسان بڕۆ بیهێنە پیاو بوو بۆیە من نەمهێنا، وتی: کچی عەبدولموتەلیب چ پێویستییەکم بەوە هەیە.[3]

---

[1] – لە کنز العمال ج٧ ص٩٨دا واهاتووە.

[2] – لە الاصابە ج٤ ص٤٣٩ دا واهاتووە.

[3] – لە البدایة والنهایة ج٤ ص١٠٨دا هاتووە.

بەیهەقی ج٦ ص٣٠٨ لە ڕێگەی ئیبن ئیسحاق لە یەحیای کوڕی عوبادی لی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر لە باوکیەوە (رضي الله عنه) بە هەمان شێوە هێناویەتی، دواتر لە ڕێگەی هیشامی کوڕی عروە لە باوکیەوە لە صەفیەوە بەوجۆرە هێناویەتی و ئەوەشی بۆ زیاد دەکات وتی: ئەوە یەکەم ئافرەت بوو لە بێباوەڕان بکوژێت.[1]

ئیبن ئەبی شەیبە لە ئەنەسەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبوتەلحە لە ڕۆژی حونەین هات بۆلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و پێدەکەنی، وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەریٚ سەیری ئوم سولەیم ناکەیت خەنجەرێکی گرتووە بەدەستیەوە؟ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە ئوم سولەیمی فەرموو (یا ام سلیم ما اردت الیه؟) واتە(ئوم سولەیم ئەو خەنجەرەت بۆ چیە؟) وتی: تا ئەگەر یەکێکیان لێم نزیك بوویەوە لێی بدەم.[2]

موسلیم لە ئەنەسەوە هێناویەتی ئوم سولەیم لە ڕۆژی حونەیندا خەنجەرێکی بە دەستەوە بوو وتی بۆ ئەوەی ئەگەر هەر بێباوەڕێك لێم نزیك بوویەوە بەمە سکی هەڵدڕم.

تەبەرانی لە موهاجیدەوە هێناویەتی ئەسمای کچی یەزیدی کوڕی سەکەن ئامۆزای موعازی کوڕی جەبەل لە ڕۆژی یەرمووك بە عەموودێکی چادر نۆ ڕۆمی کوشت[3].[4]

---

[1]– ئیبن ئەبی خەیسەمەش هێناویەتی، ئیبن مندە لە گێڕانەوەی ئوم عروەی کچی جەعفەری کوڕی زوبەیر لە باوکیەوە هێناویەتی، لە الاصابە ج٤ ص٣٤٩ دا هاتووە، ئیبن عەساکیر لە فەرموودەکەی صەفیەو زوبەیرەوە بەو واتایە هێناویەتی. لە کنز العمال ج٧ ص٩٩ دا هاتووە، تەبەرانی و ئەبویەعلاش هێناویانە، بەزار لە زوبەیرەوە هێناویەتی، لە مجمع الزوائد ج٦ ص١٣٣ دا هاتووە.

[2]– لە کنز العمال ج٥ ص٣٠٧ دا هاتووە، ئیبن سەعدیش بە سەنەدی صەحیح هێناویەتی، لە الاصابة ج٤ ص٤٦١ یشدا هاتووە.

[3]– حسن.

[4]– هەیسەمی ج٩ ص٢٦٠ دەڵێت کەسەکانی جیٚ متمانەن.

# (نکووڵی لەسەر چوونی ئافرەتان بۆ جیهاد)

تەبەرانی لە ئوم کەبشەی ژنێکی بەنی عزرەوە هێناویەتی دەڵێت: وتی ئەی پێغەمبەری خوا مۆڵەتم دەدەیت لەگەڵ ئەو سوپایە بچم بۆ جیهاد، فەرمووی (نا) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا مەبەستم شەڕکردن نیە، بەڵکو تا برینپێچی و ئاودانی نەخۆشەکان ئەنجام بدەم، فەرمووی (لولا ان تکون سنة ویقال فلانة خرجت لاذنت لك ولكن اجلسي) واتە(ئەگەر نەبوایە بە باو و بوترێت فڵانە ئافرەت چوو بۆ جیهاد مۆڵەتم پێ دەدایت، بەڵام دانیشە)[1,2].

بەزار لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی دەڵێت: ئافرەتێك هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من نوێنەری ئافرەتانم بۆلات لەسەر ئەو جیهادەی خوا بۆ پیاوانی نووسیوە کە ئەگەر بچن پاداشت وەردەگرن و ئەگەریش بکوژرێن لای پەروەردگاریان زیندوودەبن و ڕۆزی دەدرێن، ئەی ئافرەتان چی بکەن؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ابلغي من لقيت من النساء ان اطاعة الزوج واعترافا يعدل ذالك، وقيل منكن من يفعله) واتە(بەهەر ئافرەتێك گەیشتیت بڵێ گوێڕایەڵی پیاو و داننان بەمافیدا هاوتای ئەوەیە، کەمیش لە ئێوەی ئافرەتان ئەوە دەکەن) بەزار بە کورتی بەوجۆرە هێناویەتی، تەبەرانی لە فەرموودەیەکدا هێناویەتی لە کۆتاییەکەیەوە دەڵێت: پاشان ئافرەتێك هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من نێردراوی ئافرەتانم بۆلای تۆو چی ئافرەتان زانیبێتیان یان نا هەمان هیوای هاتنی منیان بۆلای تۆ هەیە،خوا پەروەردگاری پیاوان و ژنانیشە، تۆیش پێغەمبەری پیاوان و ئافرەتانیشی، خوا جیهادی لەسەر پیاوان نووسیوە، ئەگەر بیکەن پاداشت وەردەگرن، ئەگەریش شەهیدبن لای پەروەردگاریان ڕۆزی دەدرێن، ئەی ئێمە چ گوێڕایەڵی و تاعەتێك بگرینەبەر تا هاوتای ئەوانەبین؟ فەرمووی ( طاعة ازواجهن والمعفرفة بحقوقهم، وقليل منكن من يفعله) واتە(گوێڕایەڵی مێردەکانیان و زانین و بەجێگەیاندنی مافیان، کەمی ئێوەش هەن ئەوە بکەن)[3,4].

---

[1] – صحیح.

[2] – هەیسەمی ج٥ ص٣٢٣ دەڵێت تەبەرانی بە سەنەدی صەحصح هێناویەتی.

[3] – ضعیف

[4] – لە الترغیب ج٣ ص٣٣٦ دا واهاتووە.

# (دەرچوونو شەڕی هەرزەکاران لە جیهادی ڕێی خوادا)

ئیبن ئەبی شەعبیە هێناویەتی ئافرەتێك لە ڕۆژی ئوحود شمشێرێکی دایە دەست کوڕەکەی کە نەیدەتوانی هەڵیبگرێت، ئەویش بە ستیەوە بەدەستیەوە، پاشان هێنایە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم کوڕەم لەگەڵت دێت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (اي ابني احمل هاهنا، اي ابني حمل هاهنا) تووشی برینێك بوو و لە هۆش چوو، هێنرا بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)و ئەویش فەرمووی (اي ابني لعلك جزعت) وتی: نا ئەی پێغەمبەری خوا، کنز العمال ج٥ ص٢٧٧ دا هاتووە.

ئیبن عەساکیر لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر (ﷺ) نەیهێشت عومەیری کوڕی ئەبی وەقاص بچێت بۆ بەدرو بە بچوکی زانی، عومەیریش گریا و پێغەمبەریش مۆڵەتی دا، سەعد دەڵێت: منیش شمشێرەکەیم بۆ ئامادەکردو لە بەدردا بەشداربووو لە ڕوومدا هیچ نەبوو جگە لە موویەك کە بەدەستم دەمسڕی[1].[2]

ئیبن سەعد لە سەعدەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەیری کوڕی ئەبی وەقاصی برامم بینی پێش ئەوەی لە بەدردا پێغەمبەر (ﷺ) بمانبینێت خۆی دەگۆڕی و ڕەنگی گەورەی بە خۆی دەدا، وتم براگیان بۆ وادەکەیت؟ وتی: دەترسم پێغەمبەر (ﷺ) بمبینێتو بە بچوکم بزانێ و بمگێڕێتەوە، من حەزدەکەم بچم بەڵکو خوای گەورە شەهیدیم پێ ببەخشێت، چوویە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) گێڕایەوە، ئەویش گریا و پێغەمبەریش (ﷺ) مۆڵەتی پێدا، سەعد دەیوت: لەتاو بچوکیدا من کۆڵ و باری شمشێرەکەیم بۆ دەبەست، تەمەنی شانزە ساڵ بوو کە کوژرا.[3]

---

[1] - ضعیف.

[2] - لە کنز العمال ج٥ ص٢٧٠دا هاتووە، حاکم المستدرك ج٣ ص٨٨ دا هاتووە.

[3] - لە الاصابة ج٣ ص١٣٥ دا واهاتووە. بەزار هێناویەتی و کەسەکانی جێ متمانەن، لە المجمع ج٦ ص٦٨ یشدا هاتووە.

# بەشی حەوتەم

## گرنگیدانی هاوەڵان (رضي الله عنهم) بە یەکدەنگیو یەك بڕیاریو دوورکەوتنەوە لە ناکۆکیو دووبەرەکی نێوانیان لە بانگەوازی ڕێی خواو پێغەمبەرەکەیو جیهادی ڕێی خوادا

# (بەشی حەوتەم)

# (گرنگیدانی هاوەڵان (رضي الله عنهم) بە یەکدەنگیو یەك بڕیاریو دوورکەوتنەوە لە ناکۆکیو دووبەرەکی نێوانیان لە بانگەوازی ڕێی خواو پێغەمبەرەکەیو جیهادی ڕێی خوادا)

بەیهەقی ج٨ ص٤٥ لە ئیبن ئیسحاقەوە لە وتارەکەی ئەبوبەکری صدیق (رضي الله عنه) لە ڕۆژی کەپری بەنی ساعیدەدا هێناویەتی دەڵێت: دروست نیە موسڵمانان دووئەمیریان هەبێت چونکە تا ئەوە هەبێت کاروبارو دەسەڵاتو حوکمیان جیاواز دەبێتو یەکدەنگییان نامێنیٚو لە نێوان خۆیاندا ناکۆك دەبن، ئەوکات سوننەت پشتگوێ دەخریٚو بیدعە دەردەکەویٚو ئاشوب زاڵ دەبیٚو کەسیش چاری ناکاتو پێی چاك ناکریٚ.

هەروەها لە ج٨ ص١٤٥ دا لە سالمی کوڕی عوبەیدەوە هێناویەتیو فەرموودەکەی بەیعەتدان بە ئەبوبەکر (رضي الله عنه) دێنێتو تیایدا هاتووە: یەکێك لە پشتیوانان وتی: یەکێك لە ئێمەو یەکێك لە ئێوە، عومەر وتی: دوو شمشێر لەیەك کالانەدا نایانکرێت، تەبەرانیش لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئەی خەڵکینە گوێڕایەڵو یەکدەنگ بن، چونکە ئەوە ئەو بەتەی خوایە کە پێش ئەوەی هەرچی دروست کردبێت فەرمانی پیٚ کردووە، ئەوەی لە نێو یەکدەنگیدا پێتان ناخۆشە باشترە لەوەی لە دووبەرەکیدا پێتان خۆشە، چونکە خوای گەورە هەرچیەکی دروستکردووە کۆتاییەکیشی بۆ داناوە، ئیسلامیش هاتو چەسپاو خەریکە بە کۆتاییەکەی بگاتو دواتر زیادوکەم بکات تا ڕۆژی دوایی.[1] نیشانەی ئەوەش هەژاریو دەست داخستنە،بارەکە هێندە خراپ دەبێت کە هەژار کەس ناناسیٚ تا پەنای بۆ بەرێت،دەوڵەمەند پێی وایە ئەوەی هەیەتی بەشی

[1] - ضعيف.

ناكات تا ئەوەی كەس دەبێت داوا لە براو ئامۆزاكەی دەكات كەچی هیچی پێ نادرێ،سواڵكەریش دەدات بە نێو دوو كۆمەڵدا كەچی بە دەستی بەتاڵ بەجێیان دەهێڵێت، كە ئەمە روویدا دەنگێ زەوی دەنگێ دەردەبڕێ كە خەڵكی هەر ناوچەیەك وادەزانن دەنگەكە هی زەویەكەی ئەوانە،دواتر چەندە خوا بیەوێت هێور دەبێتەوە،دواتر زەوی خۆ تێكدەدا بە جۆرێك چەرگو هەناوی دێنێتەوە، وترا ئەی عەبدورەحمان جەرگو هەناوی زەوی چییە؟ وتی: ستوونە زێڕو زیوەكان،لەو ڕۆژەوە تا ڕۆژی دوایی زێڕو زیو بێسوود دەبن[1][2].

ئەبونەعیمیش لە حلیە ج٩ ص٢٤٩ لە ڕێگەی جگە لە موجاهیدەوە هێناویەتی و تیایدا هاتووە خزمایەتی دەپچڕێت و شۆز نامێنی تا ئەوەی دەوڵەمەند تەنها لە هەژاری دەترسێت، هەژاری كەسێك بەدی ناكات سۆزی بۆ بنوێنێ، كەس سكاڵای پێویستیەتی ئامۆزاكەشی دەوڵەمەندە، كەچی كەس نیە یارمەتی بدات. ئەوەی دواتری نەهێناوە. ئەحمەد لە كەسێكەوە هێناویەتی دەڵێت: شتێكمان بۆ ئەبوزەر هەڵگرت و ویستمان بیدەینێ، چووینە ڕەبزەو پرسیارمان كرد و نەماندۆزیەوە، وترا: مۆڵەتی حەجی وەرگرتووەو مۆڵەتی پێ دراوە، ئێمەش چووین بۆ (مینا) لەلای بووین كە پێی وترا: عوسمان (رضي الله عنه) چوار ڕكات نوێژی كرد، ئەویش ئەوەی لەسەر سەخت بوو و قسەیەكی ڕەقی وت و وتی: من لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نوێژم كردووە دووڕكاتی كردووە، لەگەڵ ئەبوبەكرو عومەریش هەروا، پاشان ئەبوزەر هەستا و چوار ڕكاتی كرد، دوایی پێی وترا: تۆ ڕەخنەت لە ئەمیری باوەڕداران دەگرت لەسەر ئەوە كەچی خۆت دەیكەیت؟وتی: دووبەرەكی خراپترە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وتاری بۆ

---

[1] - ضعیف.

[2]- هەیسەمی ج٧ص٣٢٨ دەڵێت:تەبەرانی بە چەند سەنەدێ هێناویەتی و موجالید لە سەنەدەكەدایە كە جێ متمانەو جێ قسەی جیاجیایشە،كەسەكانی دیكەی یەكێك لە سەنەدەكان جێمتمانەن.

خوێندینەوەو دەیفەرموو (انه كائن بعدي سلطان فلا تذلوه، فمن اراد ان يذله فقد خلع ربقة الاسلام من عنقه وليس بمقبول منه توبة حتى يسد ثلمته وليس بفاعل ثم يعود فيكون فيمن يعزوه)( دوای من دەسەڵات دەبێت دەی پشتی مەشکێنن، هەرکەس وابکات ئەوا ئیسلامی لە گەردنی داکەندووەو تەوبەی لێ قبووڵ ناکرێ تا چی کردووە چاکی نەکاتەوە ئەوەش ناکات، ئینجا بگەڕێتەوەو لەوانە بێت کە پاڵپشتی دەکەن)( پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێ کردین لە سێ شتدا نەوەستین، فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپەو خەڵکی فێری سوننەتەکان بکەین[1] [2].

عەبدولڕەزاق لە قەتادەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر (ﷺ)و ئەبوبەکرو عومەرو عوسماننیش تا بەشێکی خیلافەتەکەی لە مەککەو مینا دووڕکات نوێژیان دەکرد، دوایی عوسمان کردی بە چوار ڕکات، ئیبن مەسعود ئەمەی بیستو ویستی بگەڕێتەوە، دواتر هەستا و چوار ڕکاتی کرد، پێیان وت تۆ ناڕازی بوویت کەچی چوار ڕکاتەکە دەکەیت؟ وتی: ناکۆکی خراپترە.[3]

بوخاریو ئەبوو عوبەیدو ئەسبەهانی لە عەلیەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: چۆن کەنارتان دەنواند کەنار بگرن، چونکە من ناکۆکی بە خراپ دەزانم بۆ ئەوەی خەڵکی یەکدەنگ بن،یان منیش وەك یارانم بمرم،ئیبن سیرین بڕوای وایە کە ئەوەی دەڵێت هەموان ئەوە لە عەلیەوە دێنن درۆیە.[4]

عەسکەری لە سەلیمی کوڕی قەیسی عامریەوە هێناویەتی دەڵێت: (ابن الكواء) پرسیاری لە عەلی کرد لەسەر سوننەتو بیدعەو کۆمەڵو دووبەرەکی، ئەویش وتی:

---

[1] – ضعيف.

[2] – هەیسەمی ج٥ ص٢١٦ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا گێڕەرەوەیەك هەیە کە ناوی نەهاتووە، کەسەکانی سەنەدەکە جێ متمانەن، تەواو.

[3] – لە كنز العمال ج٤ ص٢٤٢ دا هاتووە.

[4] – لە المنتخب ج٥ص٥٠دا واهاتووە.

ئەی ئیبنولکواء پرسیارەکەت کرد دەی لە وەڵامەکەش تێ بگە، سوننەت هی موحەمەدە (ﷺ)، بیدعە ئەوەیە بەجیا لە سوننەت بێت، کۆمەڵ کۆبوونەوەی ئەهلی ڕاستیە با کەمیش بن، دووبەرەکی کۆبوونەوەیی پووچخوازانە (اهل الباطل) با زۆریش بن.[1]

## (یەکدەنگی هاوەڵان (رضي الله عنه) لەسەر ئەبوبەکری صدیق (رضي الله عنه))

بەیهەقی لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئەبوبەکر بە سەر وڵاخەکەیەوە لە (سونخ)ەوە هات تا لە بە ردەرگای مزگەوت دابەزی، بە دڵتەنگی و غەمباری هاتو مۆڵەتی وەرگرت تا بچێتەماڵی عائیشەی کچی، ئەویش مۆڵەتی پێدا، ئەبوبەکر چوویە ژوورەوەو پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوایی کردبوو و لەسەر جێگابوو و ئافرەتەکانیش لە دەوری بوون، ئەبوبەکر لەسەر ئەژنۆ کەوت و ماچی دەکردو دەگریاو دەیوت سوێند بەو کەسەی گیانمی بەدەستە ئەوەی ئیبن خەتتاب دەیڵێت وانیە پێغەمبەر (ﷺ) مردووە ، ئەی پێغەمبەری خوا ڕەحمەتی خوات لێ بێت، بە زیندوویی و مردوییش چەند بۆنت خۆشە، پاشان سەری داپۆشی و خێرا چوو بۆ مزگەوت و خەڵکی تێدەپەڕاند تا چوویە مینبەرەکەو عومەریش کە ئەبوبەکری بینی دێت دانیشت. ئەبوبەکر لە پاڵ مینبەرەکەدا هەستا و خەڵکی بانگ کردو دانیشتن و بێدەنگ بوون، ئەبوبەکر شایەتومانی وتەوەو وتی: خوای گەورە هەواڵی مەرگی پێغەمبەرەکەی دا کە خۆی لە ناوتاندا زیندبوو، هەواڵی مەرگی ئێوەشی داوە، ئەوە مەرگەو کەستان نامێنێتەوە جگە لە خوای گەورە، خوای گەورە دەفەرموێت (وما محمد الا رسول قد خلت من قبله الرسل) عومەر وتی: ئەم ئایەتە لە قورئاندایە، سوێند بە خوا پێش ئەمڕۆ نەمزانیوە ئەم ئایەتە دابەزیبێت، خوای گەورە بە موحەمەدی(ﷺ) فەرموو (انك میت و انهم میتون) هەروەها دەفەرموێت (كل شيئ هالك الا وجهه له الحكم واليه ترجعون)

---

[1] – لە کنز العمال ج١ ص٦٩ دا وا هاتووە.

هـەروەها دەفـەرموێت (كـل مـن عليهـا فـان ويبقـى وجـه ربـك ذو الجـلال والاكـرام) هەروەها (كل نفس ذائقة الموت وانما توفون اجوركم يوم القيامة) وتی: خوای گەورە تەمەنی دا بە موحەمەد(ﷺ)و هێشتیەوە تا ئایینی خوای گەیاندو چەسپاندیو سەری خستو لەپێناو خوادا جیهادی کرد، پاشان لەسەر ئەوە مراندیو ئێوەی لەسەر ڕێگەکە هێشتەوە، هیچ کەس لەناوناچێت مەگەر لە دوای ڕوونیو شیفا، هەرکەس خوا پەروەردگاریەتی ئەوا خوا زیندووەو نامرێت، هەرکەسیش موحەمەدی دەپەرستو بە خوای دادەنا، ئەوا موحەمەد مرد، دەی خەڵکینە لە خوابترسن، دەستبگرن بە ئایینتانەوەو پشت ببەستن بە پەروەردگارتان، چونکە ئایینی خوا زاڵەو پەیامی خوا تەواوەو خواش سەرخەری خۆیو ئایینەکەی سەردەخات، کتێبی خوا لەناوتاندایەو ڕووناکیو شیفایەو خوای گەورە بەو قورئانە ڕێنموونی موحەمەدی(ﷺ) کرد، تیایدا حەڵاڵو حەرامی خوا دیارە، سوێند بە خوا گوێمان لێ نیە چ دروستکراوێکی خوا لێمان کۆببنەوە، شمشێرەکانی خوا هەڵکێشراونو دامانەناون، هەرکەس پێچەوانەمان بێت جیهادی لە دژ دەکەین وەك چون لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) وا بووین دەی هەرکامتان با وریای خۆی بێت، پاشان کۆچەران لەگەڵی چوون بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)[1][2].

بوخاری لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی گوێم لە کۆتایی وتاری عومەر بوو کاتێك لە ڕۆژی مەرگی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر مینبەر دانیشتبوو و ئەبوبەکریش بێدەنگ بوو و قسەی نەدەکرد وتی: من هیوام وابوو پێغەمبەر (ﷺ)بژیت تا کۆتا کەسمان بێت، ئەگەر موحەمەد مرد ئەوا خوای گەورە لە نێوانتاندا ڕوناکیەکی داناوە کە ڕێنمونی پێ وەرگرن، خوا ڕێنموونی موحەمەدی کردو ئەبوبەکریش هاوەڵی ناو ئەشکەوتی پێغەمبەرە، لەناو موسڵماناندا بۆ کاروبارتان لە هەموان لە

---

[1] – صحيح.

[2] – له البداية والنهاية ج٥ ص٢٤٣ دا واهاتووه.

پێشترە، دەی بڕۆن و بەیعەتی پێ بدەن، دەستەیەك پێشتر لە کەپری بەنی سەعیدە بەیعەتیان پێدابوو، ئەوەش بەیعەتی گشتی سەر مینبەر بوو، زوهری لە ئەنەسەوە دەڵێت: گوێم لە عومەر بوو ئەو ڕۆژ بە ئەبوبەکری دەوت بڕۆرە سەر مینبەر، ئەویش چوویە سەر مینبەرو خەڵکی بەیعەتیان پێدا.

ئیبن ئیسحاق لە زوهری لە ئەنەسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك لە کەپری بەنی ساعیدە بەیعەت درا بە ئەبوبەکر بەیانیەکەی ئەبوبەکر لەسەر مینبەر دانیشتبوو و عومەر هەستا و پێش ئەبوبەکر قسەی کردو سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کردو دواتر وتی: خەڵکینە من دوێنێ قسەیەکم بۆ کردن کە لە قورئان و بەڵێنی پێغەمبەرەوە نەبوو، بەڵکو من وام دەبینی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کۆتا کەسمان بێت، خوای گەورە ئەو کتێبەی خۆی لەناوتاندا هێشتۆتەوە کە ڕێنموونی پێغەمبەرەکەی پێکرد، ئەگەر دەستی پێوەبگرن خوا ڕێنمونیتان دەکات بۆ ئەوەی کە پێغەمبەرەکەی بۆ ڕێنموونی کرد، خوا لەسەر چاکترینتان یەکدەنگی کردوون ئەویش هاوەڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و کەسی دووەمی ناو ئەشکەوتە (ئەشکەوتی سەور) دەی هەستن بەیعەتی پێ بدەن خەڵکیش بەیعەتی گشتییان دا بە ئەبوبەکر لە دوای بەیعەتی کەپرەکە، پاشان ئەبوبەکر قسەی کردو سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کرد دواتر وتی: ئەی خەڵکینە من لەسەر ئێوە دانراوم و چاکترینی ئێوە نیم، ئەگەر چاکەم کرد یارمەتیم بدەن، ئەگەریش خراپەم کرد ڕاستم بکەنەوە، ڕاستگۆیی سپاردەیەو درۆ ناپاکیە، لاوازتان لای من بەهێزە تا ماف دەگێڕمەوە، بەهێزتان لای من لاوازە تا بە ویستی خوا ماف لێ دەسەنمەوە، هەرگەلێك واز لە جیهادی ڕێی خوا بهێنێ خوا سەرشۆڕیان دەکات، لەناو هەرکەلێکیشدا داوێن پیسی بڵاوبێتەوە خوای گەورە بەڵا دەدات بەسەر هەمووان‌دا، تا کاتێك گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بم گوێڕایەڵم بن، ئەگەر لە خواو پێغەمبەرەکەی یاخی بووم هیچ

گوێڕایەڵیەکتان لەسەر نیە بۆ من، هەستن بۆ نوێژەکەتان ڕەحمەتی خواتان لێ بێت[1].[2]

ئەحمەد لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف (رضي الله عنه) گەڕایەوە، ئیبن عەبباس دەڵێت: من چاوەڕێی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف بووم و ئەویش منی دیتەوە، ئەمەش لە کۆتا حەجی عومەری کوڕی خەتتاب و لە مینادا بوو، عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف وتی: کەسێك هات بۆلای عومەری کوڕی خەتتاب و وتی: فڵان کەس دەڵێت ئەگەر عومەر بمرێت بەیعەت دەدەم بە فڵان کەس، عومەریش وتی: پشت بەخوا ئەمشەو لەناو خەڵکدا قسەدەکەم و هۆشیارییان پێ دەدەم لەو دەستەی دەیانەوێت کاروباریان زەوت بکەن، عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف وتی: منیش وتم ئەی ئەمیری باوەڕداران وامەکە، وەرزی حەج گەورە و بچوکی خەڵك کۆدەکاتەوە و ئەوانە بەسەر کۆڕتدا زاڵن ئەگەر لەناو خەڵکدا هەستیت دەترسم قسەیەك بکەیت ئەوانە جۆرێ وەری بگرن و لێی نەگەن و لە شوێنی خۆیدا داینەنێن، بەڵام بابچیتەوە مەدینە، چونکە پێگەی کۆچ و سوننەتی پێغەمبەرە، زانا و خانەدانانی خەڵك بدوێنە و چیت دەوێ بیلێ ئەوان قسەکەت تێدەگەن و لە شوێنی خۆیدا دایدەنێن، عومەر (رضي الله عنه) وتی: ئەگەر بە ساغی بگەڕێمەوە مەدینە لە یەکەم شوێندا بگەمەوە ئەوێ ئەو خەڵکە تێدەگەیەنم، لە دوای زیاحەجە لە ڕۆژی هەینی گەیشتمە مەدینە کوێرانە پێش کەوتم، وتم بە مالیك، کوێرانە چیە؟ وتی: گوێی لێ نیە کەی دەردەچێت، سەرما و گەرما و شتی وا لێکناداتەوە، سەعیدی کوڕی زەیدم لە پاڵ پایەی ڕاستی مینبەرەکەدا بینی کە پێشم کەوتبوو، دانیشتم و ئەژنۆمان بەریەك کەوتبوو، هێندەی نەبرد عومەر دەرکەوت، کە بینیم وتم: ئەمشەو لەسەر ئەم مینبرە قسەیەك دەکات کە کەس پێش

---

[1] - صحیح.

[2] - لە البدایة والنهایة ج٥ ص٢٤٨ دا واهاتووە و دەڵێت سەنەدەکەی صەحیحە.

ئەو نەیوتووە، سەعدیش ئەوەی پێ خۆش نەبوو و وتی: چون شتێ دەڵێ کە کەس پێشتر نەیوتبێ، عومەر لەسەر مینبەرەکە دانیشت، کە بانگ بێژ بێدەنگ بوو هەستا و سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کرد و دواتر وتی: ئەی خەڵکینە، من قسەیەك دەکەم، قەدەرم وا نووسراوە بیڵێم، نازانم پێدەچێت پێش سەرەمەرگم بێت، هەرکەس لێی تێگەیشت با گەیشتە هەرکوێ بیگەیەنێ، هەرکەسیش تێنەگەیشت ڕازیم نیە دۆرم بەدەمەوە بکات، خوای گەورە موحەممەدی بە هەق نارد و قورئانیشی دابەزاندە سەری، لەوانە ئایەتی ڕەجمی دابەزاند، لێی تێگەیشتین و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕەجمی کرد و ئێمەش دوای ئەو کردوومانە، دەترسم ڕۆژێك بێتەبەری خەڵك کەسێك بڵێت: لە کتێبی خوادا ئایەتی ڕەجم (بەردباران کردن) بەدی ناکەین، بەمە بەوەلانانی فەرزێك کە خوای گەورە دایناوە گومڕابن، بۆیە ڕەجم لە کتێبی خوادا لەسەر هەر ژن و مێردێکی زیناکەرە ئەگەر بەڵگەیان لەسەر چەسپا، یان سك پڕی هەبوو، یان کوفری بە دواوە دێت، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی زێدەڕۆیم لە ڕوودا مەکەن وەك ئەوەی بە عیسای کوڕی مەریەم کرا، من بەندەیەکی خوام، دەی بڵێن موحەممەدی بەندە و پێغەمبەری خوا، بیستوومە هەتانە دەڵێت: ئەگەر عومەر مرد بەیعەت دەدەم بە فڵان کەس، دەی کەس ئەو ناڕاستیە نەکات بڵێت بەیعەتی ئەبوبەکر (رضي الله عنه) بە کوتوپڕی تەواو بوو، ئەوە وابوو بەڵام خوای گەورە لە خراپەی پاراستینی، کەس لە ئێوە وەك ئەبوبەکر نیە هەموان گەردنی بۆ کەچ بکەن. کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کۆچی دوایی کرد هەواڵمان پێ درا کە عەلی و زوبەیر لەگەڵ هاودەمەکانیان لە ماڵی فاتیمەی کچی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دواکەوتبوون و پشتیوانانیش بەیەکدەنگی لە کەپری بەنی ساعیدە لێی دواکەوتوون و کۆچەرانیش لەلای ئەبوبەکر کۆبوونەتەوە منیش پێم وت: ئەی ئەبوبەکر با بچین بۆلای برا پشتیوانەکانمان، چووین تا گەیشتینەلای دوو پیاوچاك، بارەکەیان بۆ باس کردین و وتیان ئەی کۆمەڵی کۆچەران چیتان دەوێت؟ وتم: دەچین بۆلای برا پشتیوانەکانمان، وتیان: پێویست ناکات نزیکیان بکەونەوە کاری خۆتان ڕاپەڕێنن ئەی کۆچەران، وتم سوێند بەخوا دەچین بۆلایان،

چووین بۆلایان لە کەپری بەنی ساعیدە لەوێ کۆببوونەوەو کەسێکی داپۆشراو لە نێوانیاندا بوو، وتم: ئەوە کێیە؟ وتیان: سەعدی کوڕی عوبادە، وتم: چیەتی؟ وتیان: نەخۆشە، کە دانیشتین وتاربێژەکەیان هەستاو سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کردو وتی: پاشان ئێمە پشتیوانانی خواو کەتیبەی ئیسلامین و ئەی کۆمەڵی کۆچەران ئێوە داروودەستەی پێغەمبەرەکەمانن، یەکێك لە ئێوە چوو (ئێوە پێشکەوتن) دەتانەوێت لە ڕیشەمان بپچڕن و کارەکەمان لەدەست ببەن. کە بێدەنگ بوو ویستم قسەبکەم، قسەیەکم پێ بوو پێی سەرسامبووم و حەزم دەکرد لەبەردەم ئەبوبەکردا بیڵێم، من هەندێ سنووریم لەبەرچاو دەگرت و ئەو لە من داناترو لەسەر خۆتر بوو سوێند بەخوا دەمویست چی بڵێم هەمووی بە جوان بێژی خۆی وت بەچاکتریش کە من بێدەنگ بووم، وتی: پاشان ئێوە چاکەتان وت و ئێوە وان و عەرەبیش ئەم بارەیان بۆ ئەم دەستەی قورەیش ناسیوە کە نیوەندی عەرەبن لە ڕووی شوێن و ڕەچەڵەکەوە من بەیەکێك لەو دووکەسە ڕازیم بۆتان کامیان هەڵدەبژێرن، دەستی من و ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاحی گرت، سوێند بەخوا حەزم دەکرد بچم و بدات لە ملم بەڵام ئەوە لە تاوان نزیکم نەکاتەوە ئەوەم پێ خۆشتربوو لەوەی ببمە ئەمیری کۆمەڵێك کە ئەبوبەکریان لەنێودایە، بەڵام لەسەرەمەرگدا دەروونم بگۆڕێت، یەکێك لە کۆچەران وتی: من کۆڵەکەو ڕاستکەرەوەی ڕاکەی ئەوم، ئەی کۆمەڵی قورەیش ئەمیرێك لە ئێوەو یەکێك لە ئێوە! منیش بە مالیکم وت (انا جذیلها المحكك) یانی چی؟ وتی: وەك ئەوەی بڵێ من لێزانی ئەوم (بۆی ڕاست دەکەمەوە) ئینجا گاڵتەو ورتە زیادی کرد تا ترسی ناکۆکیمان لێ نیشت، وتم: ئەی ئەبوبەکر دەستت بێنە با بەیعەتت پێ بدەم، ئەویش دەستی هێناو بەیعەتم پێداو کۆچەرانیش بەیعەتیان پێدا، ئینجا پشتیوانان بەیعەتیان پێدا، پاشان دابەزین بۆلای سەعدی کوڕی عوبادە (وەك دابارین بەسەریدا) یەکێکیان وتی: سەعدتان کوشت، وتم: (قتل الله سعدا)(خوا سەعد بکوژێت) عومەر وتی: سوێند بە خوا خوا لەو بارانەی ئامادەی بووین هیچی وەك ئەوەی بەیعەتی ئەبوبەکر نەبوو دەترساین

ئەگەر ئەو خەڵکە بەجێمان بهێڵن و بەیعەتێك نەبێت دوای ئێمە بەیعەتێك بدەن، یان بەیعەتی بێ ڕەزامەندییان پێ بدەین یان لێیان جیابینەوە بەوە خراپەیەك بکەوێتەوە، جا هەرکەس بەبێ ڕاوێژی موسڵمانان بەیعەت بە ئەمیرێك بدات بەیعەت بۆ خۆی و بەیعەت پێدەرەکەی نیە لە ترسی ئەوەی شەڕنەکەن، زوهری لە عورووەوە هێناویەتی ئەو دوو کەسەی پێیان گەیشتن عوەیمی کوڕی ساعیدەو میعەنی کوڕی عەددی بوون، لە سەعیدی کوڕی موسەییبیشەوە کە ئەو کەسەی وتی: من کۆڵەکەدەرو ڕاستکەرەوەیم حەبابی کوڕی مونزیر بوو.[1]

ئیبن ئەبی شەیبەلە فەرموودەکەی ئیبن عەبباسەوە (ﷺ) هێناویەتی کە پێغەمبەر (ﷺ) کۆچی دوایی کرد هەندێ هاتن بۆ لامان و پێمان وترا پشتیوانان لە کەپری بەنی ساعیدە لەگەڵ سەعدی کوڕی عوبادە کۆبوونەتەوەو بەیعەت دەدەن، من و ئەبوبەکرو ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەراحیش چووین بۆلایان نەوەك گۆڕان لە ئیسلامدا بکەن، گەیشتین بە دوو کەسی ڕاستگۆی پشتیوانان – عومەیری کوڕی ساعیدەو میعەنی کوڕی عەددی – وتیان بۆ کوێ دەچن؟ وتمان: بۆلای ئێوە بیستوومانە وادەکەن. وتیان: بگەڕێنەوە چونکە شتێك نایەتە ڕێتان کە پێی ناڕازی بن، ئێمەش وتمان هەردەبێت بچین، من قسەم ئامادە دەکرد تا بیکەم، کە گەیشتینەلایان لەوێ لای سەعدی کوڕی عوبادە کۆببوونەوەو سەعد نەخۆش بوو و لەسەر جێگەکەی بوو، کە چووینە ئەوێ قسەیان کردو وتیان: ئەی کۆمەڵی قورەیش ئەمیرێك لە ئێمەو ئەمیرێك لە ئێوە، حەبابی کوڕی مونزیر وتی: من کۆڵەکەدەرو ڕاستکەرەوەیم ئەگەر بتانەوێت بەش بەشی دەکەین، ئەبوبەکر وتی:

---

[1]- مالیك هێناویەتی و لە ڕێگەی ئەوەوە ئەوانی دی ئەم فەرموودەیان هێناوە، لە البدایة والنهایة ج٥ ص٢٤٥ دا هاتووە، بوخاریش هێناویەتی، ئەبوعوبەید لە الغرائب و بەیهەقی و ئیبن ئەبی شەیبەش بە هەمان شێوە بە دوورو درێژی هێناویانە، لە کنز العمال ج٣ ص١٣٩ یشدا هاتووە.

لەسەر خۆبن، منیش چووم تا قسەبکەم، ئەبوبەکر وتی: عومەر بێدەنگ بە، سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کردو دواتر وتی: ئەی کۆمەڵی پشتیوانان سوێند بە خوا نکوولی گەورەیی و پایەتان لە ئیسلام و مافتان لەسەرمان نیە، بەڵام ئێوە دەزانن ئەم دەستەی ناو قورەیش لە نێوەندی عەرەبدان، کەس لە عەرەب بە کەس ڕازی نابن مەگەر لە یەکێك لەمانە، دەی ئێمە ئەمیرو ئێوە وەزیر، دەی لە خوا بترسن و ئیسلام پەل پەل مەکەن و مەبنە یەکەم گۆڕەرانی ئیسلام، من ڕازیم بۆتان بە یەکێك لەم دوانە عومەرو ئەبوعوبەیدەی کوڕی جوراح، کامتان پێ باشە بەیعەتی پێ بدەن جێ متمانەتانە، عومەر وتی: سوێند بەخوا ئەو ڕۆژە حەزم دەکرد چی بڵێم ئەبوبەکر هەمووی وت. سوێند بە خوا ئەگەر بەبێ تاوان بکوژرامایەو دوایی زیندووبکرامایەتەوەو دواتر بکوژرامایەوەو هەمیدی زیندووبکرامایەتەوە پێم خۆشتربوو لەوەی ئەمیری کۆمەڵێك بم کە ئەبوبەکریان تێدابێت، پاشان وتم: ئەی کۆمەڵی پشتیوانان، ئەی کۆمەڵی موسڵمانان یەکەم کەسی شیاو بە کاروباری پێغەمبەر (ﷺ) دوای خۆی هاودەمی ناو ئەشکەوتیەتی، ئەبوبەکری پێشڕەوی ڕوونسان، پاشان دەستیم گرت و یەکێکیش لە پشتیوانان پێشم کەوت و پێش ئەوەی بەیعەتی پێ بدەم ئەو بەیعەتی پێدا، خەڵکی یەك یەك هاتن و سەعدی کوڕی عوبادەیان لە بیرکرد.[1]

ئیبن ئەبی شەیبەش لە ئیبن سیرینەوە هێناویەتی یەکێك لە (زریق) وتی: لەو ڕۆژەدا ئەبوبەکرو عومەر هاتن بۆلای پشتیوانان، ئەبوبەکر وتی: ئەی کۆمەڵی پشتیوانان ئێمە نکوولی مافتان ناکەین و کەسی باوەڕداریش نکوولی مافتان ناکات، سوێند بەخوا هەرچاکەیەکمان بووبێت ئێوە تیایدا بەشدارمان بوون، بەڵام

[1] – لە کنز العمال ج٣ ص١٣٩ دا هاتووە.

عەرەب تەنها بە کەسێکی قورەیشی ڕازیو چەسپاو دەبن، چونکە ئەوان لە هەموان زمان پاراوترو دیارترو نێوەندە ماڵی عەرەبنو لەناو عەرەبدا دیارترن (قەڵەوترن) دەی بەیعەت بە عومەر بدەن، وتیان: نا، عومەر وتی: بۆچی؟ وتیان: لە ئاکامەکەی دەترسین، عومەر وتی: دەی من نەمویست دەی بەیعەن بدەن بە ئەبوبەکر، ئەبوبەکر بە عومەری وت: تۆ لە من بەهێزتری، عومەر وتی: تۆ لە من چاکتری، دووجار وتیەوە، لە سێیەم جاردا عومەر پێی وت: بە هێزی من لەگەڵ گەورەیی خۆتدا بۆ تۆ، دەی بەیعەت بدەن بە ئەبوبەکر، لە بەیعەتی ئەبوبەکردا خەڵکی هاتن بۆلای ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەراح، ئەویش وتی: دێن بۆلای من لە کاتێکدا هاوەڵی ناو ئەوشکەوتی پێغەمبەر (ﷺ) لەناوتاندایە؟[1].[2]



[1] – ضعيف.

[2] – له كنز العمال ج٣ ص١٤٠ دا واهاتووه.

# (هاوەڵان (رضي الله عنهم) ئەبوبەکریان (رضي الله عنه) لە خیلافەتدا پێشخستو بە خیلافەتی ڕازی بوونو بەرپەرچی هەرکەسیان دەدایەوە کە بیویستایە لێیان جیابێتەوە)

ئیبن عەساکیر لە موسلیمەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبوبەکر کەسێکی نارد بۆلای ئەبوعوبەیدە (رضي الله عنه) وتی: ئامادەی با بتکەمە خەلیفە چونکە من گوێم لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو دەیفەرموو (ان لکل امة امینا وانت امین هذه الامة)( تۆ سپاردەکاری ئەم ئوممەتەیت) ئەبوعوبەیدە وتی: من پێش کەسێك ناکەوم کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێکرد پێشنوێژیمان بۆ بکات[1،2].

ئەحمەد لە ئەبولبوختەریەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەر بە ئەبوعوبەیدەی وت: دەستت بێنە با بەیعەتت پێ بدەم، چونکە من گوێم لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو دەیفەرموو (انت امین هذه الامة) ئەبوعوبەیدە وتی: من پێش کەسێك ناکەوم کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێکرد پێشنوێژیمان بۆ بکات، تا مەرگی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێشنوێژی بۆ دەکردین[3،4]. هەروەك لە کنز العمال ج٣ ص١٤٠ دا هاتووە، لە فەرموودەکەدا هاتووە: ئەبوعوبەیدە وتی: لەو کاتەوەی موسڵمان بوویت شتی وام

---

[1] – صحيح.

[2] – لە کنز العمال ج٣ ص١٣٦ دا واهاتووە، حاکم ج٣ ص٢٦٧ لە موسلیمی بەتین لە ئەبولبوختەریەوە بە هەمان شێوە هێناویەتیو دەڵێت: سەنەدەکەی صەحیحەو بوخاریو موسلیم نەیانهێناوە، زەهەبی دەڵێت ئەم فەرموودە مونقەتیعە، ئیبن عەساکیرو ئیبن شاهینو هی دیکەش لە عەلی کوڕی کەسیرەوە بە هەمان شێوە هێناویانە، لە کنز العمال ج٣ ص١٢٦ دا هاتووە.

[3] – ضعيف.

[4] – هەیسەمی ج٥ ص١٨٣ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن بەڵام ئەبولبوختەری لە عومەری نەبیستبوو. ئیبن عەساکیریش بە هەمان شێوە هێناویەتی، لە کنز العمال ج٣ ص١٤٠ یشدا هاتووە، ئیبن سەعدو ئیبن جەریر لە ئیبراهیمی تەیمیەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی،

لە تۆ نەبینیوە بەیعەت بە من دەدەیت؟ لە کاتێکدا ئەبوبەکری صدیق و کەسی دووەمی ناو ئەشکەوتتان لەناودایە، خوسەیمەی تەرابلوسی لە حەمرانەوە هێناویەتی دەڵێت: عوسمانی کوڕی عەففان وتی: ئەبوبەکری صدیق شیاوترین کەسە بە خیلافەت، ئەو ڕاستگۆو کەسی دووەمی هاوەڵی پێغەمبەرە (ﷺ).[1]

حاکم لە المستدرك ج٣ ص٦٦ و بەیهەقی ج٨ ص١٥٢ لە سەعدی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفەوە هێناویانە کە عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف لەگەڵ عومەری کوڕی خەتتابدا بوو و موحەمەدی کوڕی مەسلەمەش شمشێرەکەی زوبەیری شکاند، پاشان ئەبوبەکر هەستا و وتاری بۆ خەڵك خوێندەوەو پۆزشی بۆ هێنانەوەو وتی: سوێند بە خوا هەرگیز هیچ شەو و ڕۆژێك شەیداو تامەزرۆی دەسەڵات نەبووم و بە ئاشکراو نهێنیش داوام لە خوا نەکردووە دەسەڵاتم بداتە دەست، بەڵام من لە ئاشوب ترسام، لە دەسەڵاتداریشدا کە حەسانەوەم بۆ نیە، بەڵم کارێکی گەورەم گرتووەتە دەست کە توانا و دەستی ئەوەم نیە مەگەر بە پاڵپشتی خوای گەورە، حەزم دەکرد بەهێزترین کەس بۆ ئەم کارە لە شوێنی مندا بوایە، کۆچەران قسەو پۆزشەکەیان وەرگرت، عەلی و زوبەیریش وتیان تەنها لەبەر ئەوە تووڕەبووین کە لە ڕاوێژ دواخراوین، ئەگەرنا ئێمە ئەبوبەکر لە دوای پێغەمبەر (ﷺ) بە شیاوترین کەس دەزانین بۆ ئەم کارە، ئەو هاوەڵی ناو ئەشکەوتی پێغەمبەر (ﷺ) بوو، ئێمە پلەوپایەو گەورەیی ئەو دەزانین و پێغەمبەریش (ﷺ) کاتێك زیندوو بوو فەرمانی بەوکرد تا بەرنوێژی بکات.

ئیبن عەساکیر لە سوەیدەی کوڕی غەفلەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئەبوسوفیان چوو بۆلای عەلی و عەبباس و وتی: ئەی عەلی تۆش ئەی عەبباس ئەوە چیە ئەو کارە لە دەست بچوکترین و کەمترین خێڵی ناو قورەیشدایە، سوێند بە خوا ئەگەر بتەوێت پڕی دەکەم لە ئەسپ و سەرباز، عەلی پێی وت: نەبەخوا نامەوێت

[1] – لە کنز العمال ج٣ ص١٤٠ داهاتووە.

وابکەیت، ئەگەر بمانزانیبا ئەبوبەکر شیاوی نیە وا بە ئاسانی وازمان نەدەهێنا ئەی ئەبوسوفیان، باوەڕداران کۆمەڵێکی ئامۆژکاری یەکترن‌و سۆز لە نێوانیاندایە ئەگەر ماڵ‌و جەستەیان لەیەك دووربێت، دووڕووەکانیش کۆمەڵێکی ناپاك بەیەکن،[1] هەروەها ئەبوئەحمەدی دهقان بەو واتایە هێناویەتی‌و سەبارەت بە دووڕووەکان ئەمەشی زیادکردووە: ئەگەرچی جەستەو ماڵیان لەیەك نزیك بێت کۆمەڵێکی ناپاك بەیەکنن ئێمە بەیعەتمان داوە بە ئەبوبەکرو ئەویش شیاوە بەو شوێنەیە.[2]

عەبدولڕەزاق لە ئیبنولجەبرەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك بەیعەت درا بە ئەبوبەکری صدیق ئەبوسوفیان هات بۆلای عەلی‌و وتی: کەمترین ماڵی ناو قورەیش دەستیانگرت بەسەر ئەو کارەدا لە جیاتی ئێوە؟ سوێند بەخوا پڕی دەکەم لە سوارو سەرباز، عەلی وتی: هێشتا دوژمنی ئیسلام‌و موسڵمانانیت، ئەوە زیانی بۆ ئیسلام‌و موسڵمانان نیە، ئێمە ئەبوبەکرمان بە شیاو زانی بۆ ئەوکارە،[3] حاکم لە المستدرك ج٣ ص٧٨ لە مورەی تەیبیەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبوسوفیانی کوڕی حەرب هات بۆلای عەلی کوڕی ئەبوتالیب‌و وتی: ئەوە چیە کەمینەی قورەیش ئەو کارەیان گرتوەتە دەست، لە هەمووان کەم دەسەڵاتتر واتە ئەبوبەکر، سوێند بە خوا ئەگەر بتەوێت بە سوارو سەرباز دایدەگرم، عەلی وتی: ئەی ئەبوسوفیان دەمێکە دژایەتی ئیسلام‌و موسڵمانانت کردووە، ئەوە هیچ زیانی نیە، ئێمە ئەبوبەکرمان بە شیاوی ئەو کارە زانیوە. تەبەری ج٤ ص٢٨ لە صەخری پاسەوانی پێغەمبەرەوە (ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص لە سەردمی پێغەمبەر (ﷺ)و لە کاتی مەرگی پێغەمبەریشدا (ﷺ) هەر لە یەمەن بوو، لە دوای مردنی پێغەمبەر (ﷺ) بە مانگێك بە جبەیەکی دیباجەوە هاتەوەو گەیشت بە عومەری کوڕی خەتتاب‌و عەلی

---

[1] – لە کنز العمال ج٣ ص١٤١ دا واهاتووە.

[2] – لە کنز العمال ج٣ ص١٤٠ دا واهاتووە.

[3] – لە الاستیعاب ج٤ ص٨٧ دا واهاتووە.

کوڕی ئەبوتالیب، عومەری هاواری کرد بۆ ئەوانەی دوورووبەری: ئەو جبەی پارچەپارچە بکەن ئاوریشم دەپۆشێت؟ لە کاتی ئاشتیا لە ناوماندا کۆچ کراو بوو، ئەوانیش جبەکەیان دڕاند، خالید وتی: ئەی ئەبوحەسەن ئەی بەنی عەبدمەناف ئەو پایەتان لە دەستدا؟ عەلی وتی: شکان دەڵێیت یان خیلافەت؟ وتی: لە ئێوە باشتر نەبوو بۆ ئەو پایە ئەی بەنی عەبدولمەناف، عومەر بە خالیدی وت: خوا زمانت ببەستێ سوێند بەخوا بەردەوام درۆزنی لەناو قسەکەتدا دێت و دەچێ و زیانیشی تەنها بۆ خۆیەتی.[1]

ئیبن سەعد ج٤ ص٩٧ لە ئوم خالیدی کچی خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاصەوە هێناویەتی دەڵێت: باوکم لە دوای بەیعەتدان بە ئەبوبەکر لە یەمەنەوە هاتەوە بۆ مەدینە، بە عەلی و عوسمانی وت: ڕازی بوون بەنی عەبدمەناف ئەو کارە لە جیاتی ئێوە بگرنەدەست؟ عومەر گواستیەوە بۆلای ئەبوبەکرو ئەبوبەکریش داوای بەیعەتی لێنەکردو عومەر وەڵامی دایەوەو خالید سێ مانگ بەبێ بەیعەتدان مایەوە، دواتر ئەبوبەکر دای بەلایدا لە کاتێکدا لە ماڵەوەیدابوو، سەلامی لێ کرد، خالید پێی وت: حەزدەکەیت بەیعەتت پێ بدەم؟ وتی: حەزدەکەم بێیتەناو صوڵح و ڕێککەوتنێکەوە کە موسڵمانان چوونەتە ناوی، وتی: شەو بەیعەتت پێ دەدەم، ئەبوبەکر هات و لەسەر مینبەربوو خالید بەیعەتی پێدا، ئەبوبەکر ڕای باشی بەرامبەری هەبوو و ڕێزی دەگرت، کە ئەبوبەکر سەربازی نارد بۆ شام ئاڵای موسڵمانانی دایە دەست ئەو و ئاڵاکەی بۆ هێنایە ماڵەوە، عومەر بە ئەبوبەکری وت: خالید دەکەیتە گەورەیان لە کاتێکدا ئاوای دەوت؟ بەردەوام پێی دەوت تا ئەبوبەکر ئەروای دەوسی ناردو پێی وت: خەلیفەی پێغەمبەر (ﷺ) پێت دەڵێت: ئاڵاکەمان بۆ بگێڕەوە، ئەویش دایە دەستی و پێ وت: سوێند بە خوا ویلایەت و

---

[1] - سەیف و ئیبن عەساکیر بە کورتی لە صەخرەوە هێناویانە، لە کنز العمال ج٨ ص٥٩ یشدا هاتووە.

دەسـەڵاتدانتان بـە ئێمـە دڵخۆشـی نـەکردین و لابردنیـشمان بێـزاری نـەکردین، سـەرکۆنەکراو تـۆ نیـت، هێنـدەم بـینی ئەبوبـەکر هـات بـۆلای بـاوکم و پۆزشـی بـۆ دەهێنایەوە و سووربوو لەسەر ئەوەی ناوی عومەر نەهێنێت، سوێند بە خوا باوکم تـا مـردن سـۆزی بـۆ عومـەر هـەبوو. سـاجی لـە عائیـشەوە (رضـي الله عنهـا) بـاوکم شمشێری هەڵگرتبوو و بە سواری وڵاخەکەی بەرەو (ذي القصة) چوو، عەلی کوڕی ئەبوتالیب هات و جڵەوی وڵاخەکەی گرت و وتی: بۆ کوێ ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا؟ ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) لە ڕۆژی ئوحـودا پێـی وتیـت هـەمان شـتت پـێ دەڵێم (شـم سـيفك ولا تفجعنـا بنفسك، فـوالله لـئن اصـبنا بـك لا يكـون للاسلام بعدك نظـام ابدا)(شمشێرەکەت بخەرەوە ناو کەلان و بە خۆت دڵگرانمان مەکە چونکە بەخوا ئەگەر تۆ لەدەست بدەین هەرگیز دوای تۆ ئیسلام نیزامی نابێ)ئەویش گەڕایەوە و سوپاکەی بەڕێکرد.[1]



[1]- لـە کنـز العمـال ج٣ ص١٤٣ دا هـاتووە، دارقوتنیش بـە هـەمان شێوە هێناویـەتی، لـە البدایـة والنهایة ج٦ ص٣١٥ یشدا هاتووە.

## (گێڕانەوەی خیلافەت بۆ خەڵك)

ئەبونەعیم لە (فضائل الصحابة) لە ئەبوبەکرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئەی خەڵکینە ئەگەر واگومان دەبەن من حەز یان ویستی خیلافەتم لە ئێوەو موسڵمانان بردووە، نا سوێند بەخوا بەوجۆرە نیە، یەك شەو یان ڕۆژ نەبووە سووربم لەسەر خیلافەت و بە ئاشکراو نهێنیش داوام لە خوا نەکردووە تا خیلافەتم پێ ببەخشێ، کارێکی گەورەم گرتوەتە ئەستۆ کە توانایم نیە مەگەر بە پشتبەستن بەخوا، حەزم دەکرد بۆ هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بێت تا بکرایەو وازم بهێنایەو بیگێڕمەوە بۆتان و بەیعەتی ئێوەم لانەبێت، دەی کێتان پێ باشە بیدەنە دەست ئەو، چونکە منیش تەنها کەسێکم لەئێوە.[1]

تەبەرانی لە عیسای کوڕی عەتیەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبوبەکر (رضي الله عنه) کە بەیعەتی پێدرا بەیانی هەستا و وتاری بۆ خەڵك خوێندەوەو وتی: ئەی خەڵکینە من ڕای ئێوەم دەوێ بتاندەمەوە، من چاکترینی ئێوە نیم، دەی بەیعەت بدەن بە چاکترینتان، ئەوانیش هەستان بۆلای و وتیان ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا سوێند بە خوا تۆ چاکترینمانیت، وتی: ئەی خەڵکینە خەڵکی بە حەزو ناچاریش هاتنە ناو ئیسلام ئەوانە جێ پەنای خوان، ئەگەر دەتانەوێت خوای گەورە هیچی بە زیمەی خۆی لێتان نەوێت دەی بیکەن، من شەیتانێکم هەیە لام ئامادەیە، ئەگەر بینیتان تووڕەبووم لێم دووربکەونەوە تا بەرامبەرتان هەڵە نەبم، ئەی خەڵکینە دەستکەوتەکانی غوڵامەکانتان لەبەرچاو بگرن، چونکە گۆشتێ بە حەرام پەیدا بوو بێت بەهەشت نایگرێتەخۆ،دەی وریا بن و چاوتان لەسەرم بێت، ئەگەر ڕاست بووم یارمەتیم بدەن، ئەگەریش لامدا

[1] - لە کنز العمال ج٣ ص١٣١ دا هاتووە.

ڕاستم بکەنەوە، ئەگەر گوێڕایەڵی خوا بووم گوێڕایەڵم بن، ئەگەریش لامدا بە گوێم مەکەن.[1]

عشاریش لە ئەبی جوحافەوە هێناویەتی دەڵێت: کە بەیعەت درا بە ئەبوبەکر سێ ڕۆژ دەرگای داخستو هەر ڕۆژێك دەهات بۆلای خەڵكو دەیوت: ئەی خەڵكینە من بەیعەتی ئێوە دەگێڕمەوە بۆتان، دەی کێتان پێ باشە بەیعەتی پێ بدەن، لە هەموو ئەوانەدا عەلی کوڕی ئەبوتالیب هەڵدەساو دەیوت: بەیعەتت لێ ناسێنینەوەو ناشمانەوێت، پێغەمبەر (ﷺ) تۆی پێشخست ئیتر کێ دوات دەخات؟ لە کنز العمال ج٣ ص١٤١ دا هاتووە، ئیبن نەجار لە زەیدی کوڕی عەلی لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبوبەکر لەسەر مینبەرەکەی پێغەمبەر (ﷺ) بوو وتی: کێ هەیە پێی ناخۆشە باوازبێنم بۆی؟ سێ جار ئەوەی وت: لەوکاتەدا عەلی کوڕی ئەبوتالیب هەستاو وتی: نەبەخوا لات نابەینو ئەوەشمان ناوێت، کێ دەتوانێت دوات بخات لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا پێشی خستی؟![2]



[1]- لە کنز العمال ج٣ ص١٣٥ دا واهاتووە، هەیسەمی ج٥ ص١٨٤ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا عیسای کوڕی سولەیمان هەیە کە لاوازە، عیسای کوڕی عەتیەش هەیە کە نایناسم، تەواو.

[2] - لە کنز العمال ج٣ ص١٤٠ دا هاتووە.

## (قبوڵکردنی خیلافەت بۆ بەرژەوەندیەکی ئایینی)

ئیبن ڕاهەویەو عەدەنی و بەغەوی و ئیبن خوزەیمە لە ڕافیعی کوڕی ئەبی ڕافیعەوە هێناویانە دەڵێت: کاتێك خەڵکی ئەبوبەکریان کرد بە خەلیفە وتم: هاوڕێکەم کە فەرمانی پێکردم تا نەبمە بەرپرسی دووکەس، منیش وتم ئەبوبەکر هیچت بیردێت کە چیت پێ وتم؟ نەبمە بەرپرسی دووکەس کەچی خۆت بوویتە بەرپرسی ئوممەت. ئەبوبەکر وتی: پێغەمبەر (ﷺ)کۆچی دوایی کردو خەڵکی تازە موسڵمان ببوون، ترسام هەڵگەڕێنەوەو ناکۆکی ڕووبدات، بۆیە بە ناحەزی وەرمگرت، بەردەوام پۆزشی دەهێنایەوە تا قبوڵم کرد.[1]



## (خەفەتخواردن بە قبوڵکردنی خیلافەت)

ئیبن ڕاهەویەو خەیسەمە لە (فضائل الصحابة)و جگە لەویش لە کەسێکی بنەماڵەی ڕەبیعەوە هێناویەتی کە دەڵێت: بیستی ئەبوبەرکر کاتێك بوو بە خەلیفە لەماڵەوە بە خەفەتباری دانیشتو عومەر چوو بۆلای ئەویش سەرکۆنەی دەکردو وتی: تۆ ئەم کارەت تووش کردم، سکاڵای بردەلای تا دادوەری نێو خەڵك بکات، عومەر پێی وت: مەگەر نازانیت پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ان الوالي اذا اجتهد فاصاب الحق فله اجران وان اجتهد فاخطا الحق فله اجر واحد)(بەرپرس ئەگەر ئیجتیهادی کردو هەڵەی کرد ئەوا پاداشتێکی بۆ هەیە، ئەگەریش ئیجتیهادی کردو پێکای ئەوا دوو پاداشتی بۆ هەیە) وەك ئەوەی باری سەرشانی ئەبوبەکر سووك بکات.[2]

---

[1] – لە کنز العمال ج٣ ص١٢٥ دا واهاتووە.

[2] – لە کنز العمال ج٣ ص١٣٥ دا واهاتووە.

ئەبوعوبەیدەو عوقەیلی و تەبەرانی و ئیبن عەساکیرو سەعیدی کوڕی مەنسورو جگە لەویش لە عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفەوە هێناویانە ئەبوبەکری صدیق (رضي الله عنه) لەك اتی نەخۆشی سەرەمەرگیدا پێی وت: تەنها خەفەت بۆ سێ شت دەخۆم کە کردومن بریا نەمدەکردن، سێ شتیش کە نەمکردن خۆزگە دەمکردن. سێ شتیش خۆزگە پرسیارم دەکرد لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە بارەیانەوە. ئینجا فەرموودەکە دێنێت و تیایدا هاتووە: خۆزگە لە ڕۆژی کەپری بەنی سەعیدە بارەکەم دەخستە سەرشانی ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاح یان عومەر. تا ئەو یەکەم ئەمیرو منیش وەزیر بوومایەوە،خۆزگە کاتێك خالیدم نارد بۆ شام عومەرم بۆ عێراق بناردایە، تا بەڕاست و چەپدا لە ڕێی خوادا دەستم بکردایەتەوە، ئەو سیانەی حەزم دەکرد لە پێغەمبەریان بپرسم، حەزم دەکرد لە سەر ئەم کارە (خیلافەت) پرسیاری لێبکەم لە چیدابێت تا ناکۆکی لەسەر نەبێ، هەروەها لێی بپرسم ئایا پشتیوانان هیچ لەمەیان بۆ هەیە؟[1]

* * * * * * * * *

[1]- لە کنز العمال ج٣ ص١٣٥ دا هاتووە، هەیسەمی ج٥ ص٢٠٣ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا عەلوانی کوڕی داودی بەجەلی هەیە کە لاوازە، ئەم ئەسەرە لەوانەیە ناڕەزایی لە ڕوودا هەیە.

# (لە بری خۆدانان)

ئیبن سەعد ج٣ ص١٩٩ لە ئەبی سەلەمەی کوڕی عەبدولڕەحمان و جگە لەوەوە هێناویەتی ئەبوبەکری صدیق کاتێك بەرەو کۆتایی ژیان دەچوو عەبدولڕەحمانی کوڕی بانگکردو وتی: لە بارەی عومەری کوڕی خەتتابەوە قسەم بۆ بکە، وتی: هەرپرسیارێکم لێبکەیت خۆت شارەزاییت لە من لەسەری زیاترە، ئەبوبەکر وتی: ئەگەریش! وتی: سوێند بەخوا ئەو لە ڕای تۆ لەسەری باشترە، پاشان عوسمانی کوڕی عەففانی بانگکردو وتی: لە بارەی عومەرەوە قسەم بۆ بکە، وتی: تۆ لە ئێمە باشتری دەناسی، وتی: دەی لەسەر ئەوەی ئەبوعوبەیدوڵلاّ (باسی بکە بۆم) عوسمانی کوڕی عەففان وتی: بە خوا من وادەیناسم پەنا و نادیاری لە ئاشکرا و دیاری باشترە، لەناو ئێمەدا نمونەی وەك ئەو نیە، ئەبوبەکر وتی: ڕەحمەتی خوات لێ بێت سوێند بە خوا ئەگەر دەستم لەو بەردایە تۆم دەگرت، لەگەڵ ئەوانەشدا ڕاوێژی کرد بە سەعیدی کوڕی ئەعوەرو ئوسەیدی کوڕی حوچەیرو کۆچەران و پشتیوانانی دیکە ئەوە، ئوسەید وتی: بە خوا وای دەناسم دوای تۆ چاکترینە، بۆ ڕەزامەندی ڕازی و بۆ تووڕەیی تووڕەیە، ئەوەی نهێنی زیاترە باشترە لەوەی ئاشکرای زیاترە، کەس لەو بەهێزتر نیە تا بتوانێ ئەو کارە بگرێتە ئەستۆ.

هەندێ لە هاوەڵان بیستیان عەبدولڕەحمان و عوسمان چوون بۆلای ئەبوبەکرو بە تەنیا دواندوویانە، ئەوانیش چوون بۆلای ئەبوبەکرو یەکێکیان وتی: تۆ چی بە پەروەردگارت دەڵێیت ئەگەر پرسیاری لێکردیت لەسەر دانانی عومەر وەك بەرپرسمان لە کاتێکدا دەزانیت عومەر توند و تووڕەیە؟ ئەبوبەکر وتی: دامنیشێنن ئەرێ بە خوا دەمترسێنن، ئەوەی ستەماتن لە ڕوو بەکاربێنێ قوڕبەسەرە، دەڵێم خوایە چاکترین کەسم لەسەریان دانا، ئەوەی پێم وتیت بیگەیەنە بەوانی دیکەش، پاشان ڕاکشا و عوسمانی کوڕی عەففانی بانگکردو وتی: بنووسە:

(بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان)

ئەمە بەڵێنی ئەبوبەکری کوڕی ئەبوقوحافەیە لە کۆتای ژیانی دونیاو لە کاتی لێدەرچوونی و لە سەرەتای ڕۆژی دوایی و چوونەناویدا کاتێ بێباوەڕ باوەڕدێنێ و دەرچوو دەگەڕێتەوەو درۆزان باوەڕدەکات من لە دوای خۆم عومەری کوڕی خەتتاب دادەنێم لەسەرتان، دەی گوێی لێ بگرن و گوێڕایەڵبن، من خێرم بۆ خواو پێغەمبەرەکەی و ئایینەکەی و خۆم و ئێوەش دەوێ، ئەگەر دادپەروەر بوو ئەوا گومانم پێی وایەو وای دەناسم، ئەگەریش وانەبوو هەرکەسەو بەپێی دەستکەوتی دەبێت، چاکەم ویستووەو غەیب نازانم (وسيعلم الذين الظلموا اي منقلب ينقلبون) سەلام و ڕەحمەتی خواتان لێ بێت.

پاشان فەرمانی کرد مۆری نامەکەی کردو دواتر هەندێکیان وتیان: کاتێك ئەبوبەکر بە هۆش چوو ئەونامە دەرچوو و ناوی عومەری تێدا نەهاتبوو، پێش ئەوەی ناوی کەس ببات برا، عوسمان نووسی من عومەری کوڕی خەتتابم لەسەردانان، پاشان ئەبوبەکر بە هۆش هاتەوەو وتی: ئەوەی نووسیوتە بۆم بخوێنەرەوە، کەناوی عومەری بۆ خوێندەوە ئەبوبەکر الله اکبری کردو وتی: وا دەبینم ترسایت ئەگەر بە هۆش نەیەمەوە، بۆیە ئەوەت نووسی، دەی خوا لەسەر ئیسلام و موسڵمانان پاداشتی خێرت بداتەوە، سوێند بەخوا تۆ شیاوی بوویت، پاشان فەرمانی پێکردو نامەکەی بە مۆرکراوی بردو عومەری کوڕی خەتتاب و ئوسەیدی کوڕی سەعیدی قرزی لەگەڵیدا بوون، عوسمان بە خەڵکەکەی وت: ئایا بەیعەت دەدەن بەوەی لەم نامەدا هەیە؟ وتیان: بەڵێ، هەندێ وتیان: پێمان بلێ چیە، ئیبن سەعد دەڵێت: بێژەرەکە وتی عومەرە، هەموو بەوە ڕازی بوون و بەیعەتیان دا، پاشان ئەبوبەکر عومەری بە تەنها بانگکردو وەسیەتی بۆکرد، پاشان لەلای چوو، ئەبوبەکر دەستەکانی بەرزکردەوەو وتی: پەروەردگار من بەم کارەم چاکەی موسڵمانانم ویست و لە ئاشووبی دژ بە موسڵمانان ترسام، بۆیە ئەو کەسەم لەسەردانان کە تۆ چاکتر دەیناسی و ڕای خۆم بۆ خستەکارو چاکترینیانم کرد بە

بەرپرسیان، ئەوەی لە هەموویان بەهێزترەو سوورترە لەسەر ڕێنموونی و چاکەیان، واسەرە مەرگیشسم کە فەرمانی تۆیە هاتووە، دەی لەناویان بەجێم بێڵە ئەوانە بەندەی تۆن و گەردنیان بەدەستتە، باریان چاك بکەو بۆیان چاك بکە، بیکە بە یەکێك لە خەلیفە ڕاشیدینەکانت کە ڕێنموونی ڕەحمەت و پیاوچاکان لە دوای ئەو بگرێتەبەرو خەڵکەکەشی بۆ چاك بکە.[1]

ئیبن عەساکیرو سەیف لە حەسەنەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: کاتێك باری ئەبوبەکر (رضي الله عنه) قورس بوو وای بەباش زانی خەڵکی بۆ کۆبکەنەوە، پێی وتن: دەبینن تووشی چی بووم و وادەزانم مەرگم هاتووە، خوای گەورە سوێندی بەیعەتی منی لەسەرنە هێشتوون و بارەکەی گێڕاوەتەوە بۆ خۆتان، دەی کێتان پێ باشە بیکەن بە ئەمیری خۆتان ئەگەر لە ژیانمدا کەستان دانا باشترە تا ئەوەی لە دوای خۆم ناکۆك و دووبەرەك نەبن، ئەوانیش هەستان و بەجێیان هێشت تا ئەوەی لەسەر کەسێك ڕێك نەبوون و گەڕانەوە بۆلای و وتیان: کەسێکمان پێ بڵێ ئەی خەلیفەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، وتی: ئاخۆ پێدەچێت ناکۆك بن، وتیان: نا، وتی: دەی بەڵێنی خواتان لەسەربێت لەسەر ڕەزامەندی؟ وتیان: بەڵێ، وتی: دەی مۆڵەتم بدەن تا بڕوانمە ئەم بەرپرسیارێتیەی لای خواو ئایینەکەی و بەندەکانی، ئەبوبەکر ناردی بە شوێن عوسمانی کوڕی عەففانداو وتی: کەسێکم پێ بڵێ چونکە سوێند بە خوا تۆلای من شیاوی جێ کەسێتی ئەوەی، ئەبوبەکر وتی بنووسە، ئەویش نووسی تا گەیشتەلای ناوەکە ئەبوبەکر لە هۆش چوو، کە بە هۆش هاتەوە وتی: بنووسە عومەر.

لالەکائی لە عوسمانی کوڕی عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك ئەبوبەکر سەرەمەرگی هات عوسمانی کوڕی عەففانی (رضي الله عنه) بانگکردو بەڵێنەکی لانووسی، دوایی ئەبوبەکر پێش ئەوەی ناوی کەس بڵێ

[1] – لە کنز العمال ج٣ ص١٤٥ دا واهاتووە.

بوورایەوە، عوسمانیش نووسی عومەری کوڕی خەتتاب، ئەبوبەکر بە هۆش هاتەوە و بە عوسمانی وت: ناوی کێت نووسی؟ وتی: کە باری تۆم بینی ترسام بەجێمان بهێڵیت بۆیە نووسیم عومەری کوڕی خەتتاب، ئەویش وتی: ڕەحمەتی خوات لێ بێت، ئەگەر خۆشت بنووسیایە شیاوی بوویت، ئینجا تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا هات بۆلای و وتی: من نێردراوی کۆمەڵێکم بۆلات دەڵێن تۆ تووڕەیی عومەر لە ژیانتدا دەزانیت، ئینجا چۆن دوای مردنت کاروباری ئێمەی دەدەیتە دەست؟ خوا پرسیارت لێ دەکات لەوبارەوە، بزانە تۆ چی دەڵێیت، ئەویش وتی: دامنیشێنن، ئایا بە خوا دەمترسێنی؟ هەرکەس باری ئێوە بە خەون بزانێ قوڕبەسەرە، ئەگەر خوا پرسیاری لێ کردم دەڵێم: لەسەر بەندەکانت چاکترینیان بۆ خۆیانم داناوە، بەوانی دیکەش ئەمە بڵێ.

ئیبن سەعد ج۳ ص۱۹٦ لە عائیشەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی دەڵێت: کە ئەبوبەکر سەرەمەرگی هات عومەری لە جێی خۆی دانا، عەلی و تەلحە (رضي الله عنه) چوون بۆلای و وتیان: کێت داناوە؟ وتی: عومەر، وتیان: ئەی چی بە پەروەردگارت دەڵێیت؟ وتی: دەمخەنە بەردەم خوا؟ من چاکتر لە ئێوە زانیاریم بە خوا و عومەریش هەیە، دەڵێم چاکترین بەندەی خۆتم لەسەریان داناوە.[1]

ئیبن ئەبی شەیبە لە زەیدی کوڕی حارسەوە هێناویەتی ئەبوبەکر کە سەرەمەرگی هات ناردی بە شوێن عومەردا تا لە جیاتی خۆی دایبنێ، خەڵکی وتیان: عومەری توندو تورەمان لەسەر دادەنێیت، دەی بەڵکو کە بوو بەوالیمان توندترو تووڕەتربێت ئەوکات کە گەیشتیتەوە بە پەروەردگارت چی دەڵێیت؟ ئەبوبەکر وتی: ئەرێ بە پەروەردگارم دەمترسێنن؟ دەڵێم خوایە چاکترین بەندەی خۆتم لەسەریان داناوە.[2]

---

[1] – لە کنز العمال ج۳ ص۱٤٦ دا واهاتووە، بەیهەقی ج۸ ص۱٤۹ دا بە هەمان شێوە لە عائیشەوە هێناویەتی، ئیبن جەریر ج٤ ص٥٤ بەو واتایە لە ئەسمای کچی عومەیسەوە (رضي الله عنها) هێناویەتی.

[2] – لە کنز العمال ج۳ ص۱٤٦ دا واهاتووە.

## (ڕاوێژکاری بۆ کاروبار لە نێوان چاکخوازانی ئەو کارەدا)

تەبەرانی لە عومەرەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك ئەبولوئلوئە دای لە عومەر دوو خەنجەری لێدا، عومەر وای زانی لەناو خەڵکدا تاوانێکی هەیەو نایزانێت، بۆیە ئیبن عەبباسی بانگکرد، عومەر زۆر ئیبن عەبباسی خۆشدەویست و لە خۆی نزیك دەکردەوەو گوێی لێدەگرت، وتی: حەزدەکەم بچیت لەسەر ئەم بارەم گوێ لە قسەی خەڵك بگریت بزانیت چۆنە، ئیبن عەبباسیش چوو و بیدایە بە پاڵ هەردەستەیەکی خەڵکدا دەیبینی دەگریان، گەڕایەوە بۆلای عومەرو وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران دەمدا بەلای هەر دەستەیەکدا دەمبینین دەگریان وەك ئەوەی ئەمڕۆ کوڕە هەرزەکارەکانیان لە دەستبدەن، عومەر (رضي الله عنه) وتی: کێ کوشتمی؟ وتی: ئەبولوئلوئەی مەجووسی کۆیلەی موغەیرەی کوڕی شوعبە، ئیبن عەبباس وتی: بزەوخەندەی سەر ڕوخساریم لێ بەدیکردو وتی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کەسێك نەبوو بڵێت لا اله الا الله، من دوورەپەرێزیم لێدەکردن هیچ بێباوەڕێکی عەجەم بهێنن کەچی ئێوە بە گوێتان نەکردم، پاشان وتی: براکانم بۆ بانگ بکەن، وتیان: کامانە؟ وتی: عوسمان و تەلحەو زوبەیرو عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص (رضي الله عنهم)، ناردی بە شوێنیانداو دواتر سەری لەسەر ڕانم دانا، کە هاتن وتم: واهاتن، وتی: بەڵێ ڕوانیمە کاروباری موسڵمانان یەکێك لەم شەشەتان کە گەورەو سەری خەڵکن، دەبێت یەکێك لە ئێوە کاروبارەکە بگرنەدەست تا ئێوە ڕاستبن خەڵکیش ڕاست دەبن، ئەگەریش ناکۆکیەك هەبێت لە نێو ئێوەدا دەبێت،کە بیستم باسی ناکۆکی و دووبەرەکی کرد هەرچەندە وامدەزانی ڕوودەدات چونکە هەرچی دەوت دەمبینی دەهاتەدی، پاشان خوێنێکی زۆری لێچوو، چپەچپ کەوتە نێوانیانەوە تا ئەوەی وامزانی بەیعەت بە یەکێك لەخۆیان بدەن، وتم ئەمیری باوەڕداران زیندووە هێشتا نەمردووە، ئیتر چۆن دەکرێت دوو خەلیفە هەبن و یەکدی ببینن، عومەر وتی: هەڵمگرن و ئێمەش وامانکرد، وتی: ڕاوێژ بەسی کەس بکەن و

باصوهەیبیش نوێژ بۆ خەڵك بكات، وتیان ئەی ئەمیری باوەڕداران ڕاوێژ بەكێ بكەین؟ وتی: ڕاوێژ بە كۆچەران و پشتیوانان و یەكێ لەوانەی سەربازانی ئێرە، پاشان داوای بڕێك شیری كرد و خواردیەوە، سپیایی شیرەكە لە شوێن برینەكانیەوە دەرهات، ئەوكات زانی مەرگە، وتی: ئێستا ئەگەر هەموو دونیا هی من بێت دەیدەم بە سەختی ئەمە و سوپاس بۆ خوا لەمەدا تەنها خێر بەدیدەكەم، ئیبن عەبباس وتی: ئەگەر بتوتایە (خوا پاداشتت بداتەوە) مەگەر پێغەمبەر (ﷺ) نزای نەكرد خوای گەورە ئیسلام و موسڵمانان شكۆداربكات كاتێك موسڵمانان لە مەككە دەترسان، كاتێك موسڵمان بوویت عیزەت و شكۆهەبوو و بە تۆ ئیسلام و پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی سەركەوتن، كۆچت كرد بۆ مەدینە و كۆچەكەت فەتحێك بوو، پاشان لە هەموو مەیدانێكی جەنگی بێباوەڕاندا لەو ڕۆژە و ئەو ڕۆژەدا بەشداربوویت، پێغەمبەر (ﷺ) دونیای بەجێهێشت و لێت ڕازیبوو، دواتر لەسەر بەرنامەی پێغەمبەر (ﷺ) وەزیری خەلیفەی دواتری پێغەمبەر (ﷺ) بوویت، بە موسڵمانەكان كەوتیتە لێدانی هەڵگەڕاوەكان تا خەڵكی بە حەزو ناحەزیش بێت هاتنەوە ناو ئیسلام، خەلیفە مرد و لێت ڕازی بوو، پاشان بە چاكترین شێوە كاروباری خەڵكت گرتەوە دەست، خوا شوێنیانی پێ ئاوەدان كردیت و سامانی پێ كۆكردیتەوە و دوژمنی پێ دوورخستیتەوە، بەهۆی تۆوە خوای گەورە بۆ هەر ماڵێك فراوانی ئایین و ڕۆزی بەخشی، پاشان دواجار شەهیدی كردە بەشت دەی پیرۆزت بێت، عومەر وتی: بە خوا لەخۆبایی ئەوەیە ئێوە لە خۆبایی بكەن، پاشان وتی: ئەی ئەبوعەبدوڵڵا لای خوا لە ڕۆژی دواییدا شایەتیم بۆ دەدەیت؟ وتی: بەڵێ، وتی: خوایە دەی سوپاس بۆ تۆ، ئەی عەبدوڵڵای كوڕی عومەر كوڵمم بخەرە سەرزەوی. منیش لەسەر ڕانم خستمە سەر قاچم، وتی: بیخەرە سەر زەوی، تا ئەوەی ڕیش و كوڵمی كەوتنە سەر زەوی، وتی: هاوار بۆ خۆت و دایكت ئەی عومەر! ئەگەر خوا لێت خۆش نەبێت ئەی عومەر! پاشان گیانی سپارد ڕەحمەتی خوای لێ بێت، كە گیانی سپارد ناردیان بە شوێن عەبدوڵڵای كوڕی عومەردا، ئەویش وتی: نایەم

بۆلاتان ئەگەر ئەوەی فەرمانی پێکرد لە ڕاوێژکردنەکەی کۆچەران و پشتیوانان و سەربازاندا نەیکەن، حەسەن وتی: باسی کاری سەرەمەرگی عومەرو ترسی لە پەروەردگاری بۆ کردو وتی: بەوجۆرە باوەڕداردەبێت چاکەو ترس کۆبکاتەوە. بەڵام دووڕوو خراپەو سەرکەشی کۆدەکاتەوە، سوێند بەخوا لەوبەندانەی چوون و ئەوانەش ماون کەسم نەدی چاکەی زیاد بکات مەگەر ئەوەی ترس و بیمی زیادی دەکرد، هەرچیەکیش لەوانەی بینیومن کە چوون یان ماون هەربەندەیەك خراپەی زیاد بکات سەرکەشی و لەخۆباییبوون زیاد دەکات.[١]

ئیبن سەعد ج٣ ص٣٤٤ و ئەبوعوبەیدەو ئیبن ئەبی شەیب و بوخاری و نەسائی و جگە لەوانەش لە عەمری کوڕی مەیمونەوە هێناویانە – فەرمووی چیرۆکی شەهیدبوونی عومەر (رضي الله عنه) دێنێت تیایدا هاتووە: بە عەبدوڵلای کوڕی عومەری وت: بزانە چەند قەرزم لەسەرە حسابی بکە، ئەویش وتی: هەشتا و شەش هەزار، وتی: ئەگەر سامانی عومەر بەشیکرد ئەوا ماڵ و سامانەکەیان بدەرەو، ئەگەر بەشی نەکرد داوا بکە لە بەنی عەدی کوڕی کەعب ئەگەر بەشی کرد باشە ئەگەر نا داوا لە قورەیش بکە، لەوە زیاتر داوا لەکەس مەکەو قەرزەکەم بدەرەوە، بڕۆ بۆلای عائیشەی دایکی باوەڕداران و سەلامی لێ بکەو بڵێ عومەری کوڕی خەتتاب داوای مۆڵەتت لێ دەکات نەڵێیت ئەمیری باوەڕداران. چونکە من ئەمڕۆ ئەمیری باوەڕداران نیم – تا لە پاڵ هاوەڵەکەیدا بە خاك بسپێردرێت، دایکمان وتی: بە خوا من بۆ خۆمم دانابوو و ئەمڕۆ دان بە ویستی خۆمدا دەنێم بۆ ئەو، کە هاتەوە وتی: چی بوو؟ وتی: مۆڵەتی پێدایت، عومەر وتی: هیچ لەوە لام گرنگترنیە، پاشان وتی: ئەگەر مردم لەسەر جێگەکەم بمبەن و دواتر داوای مۆڵەت بکەو بڵێ عومەری کوڕی خەتتاب داوای مۆڵەت دەکات، ئەگەر مۆڵەتی دا بمبە ئەگەرنا بمگێڕنەوە بۆ گۆڕستانی موسڵمانان، کە بردیان خەڵکی ئەو ڕۆژ وابوون کە چەرمەسەری وایان بە خۆیانەوە نەدیبێت،

[١] – هەیسەمی ج٩ ص٧٦ دەڵێت: سەنەدەکەی حەسەنە.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر سەلامی کردو وتی: عومەر وتی: عومەری کوڕی خەتتاب داوای مۆڵەتت لێ دەکات، ئەویش مۆڵەتی پێداو لەگەڵ پێغەمبەرەکەی و ئەبوبەکردا ڕێزداری ڕاگرت، لەسەرەمەرگدا بە عومەریان وت: کەس لە دوای خۆت دانانێیت؟ وتی: کەس لەو کەسانە بۆ ئەو پۆستە بە شیاوتر نازانم کە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك مرد لێیان ڕازی بوو، کامیان دابنێن ئەوە خەلیفەی دوای منە، ئینجا ناوی ئەمانەی هێنا، عەلی و عوسمان و تەلحەو زوبەیر عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف و سەعد (رضي الله عنهم) ئەگەر سەعد بوو باشە، ئەگەرنا هەرکامیان بوون بە خەلیفە با پشت ببەستن بە سەعد، چونکە پێم وانیە بە دوور بمێنێتەوە لە بێتوانایی و ناپاکی لە ڕوونواندن، عەبدوڵڵای دانا تا ڕاوێژی هەبێ لەگەڵیان بەڵام مافی بوون بە خەلیفەی نەبێ، کە کۆبوونەوە عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف وتی: کارەکەتان بدەنە دەست سێ کەس، زوبەیر دایە دەست عەلی، تەلحە دایە دەست عوسمان، سەعد دایە دەست عەبدولڕەحمان، ئەو سیانە کۆبوونەوەو کارەکە بۆ ئەوان بوو، عەبدولڕەحمان وتی: کامتان خۆی لەم کارە بە دوور دەگرێ و دەیدات بەمن؟ تا بەڵێنی خواتان پێ بدەم دەست بەرداری گەورەیی و چاکترینیان بۆ موسڵمانان نەبم، وتیان باش، عەلی بردە کەنارو پێی وت: تۆ لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) نزیکترو لە پێشتری، بەڵێنی خوات لەسەردادەنێم ئەگەر تۆم کرد بە خەلیفە دادپەروەردەبیت، ئەگەر عوسمان بوو گوێڕایەڵی و گوێگری بکەیت، وتی: بەڵێ، عوسمانیشی بردە ئەولاو هەمان شتی پێ وت، عوسمانیش وتی: بەڵێ، پاشان بە عوسمانی وت: دەی عوسمان دەستت بێنە، ئەویش دەستی کردەوەو عەبدولڕەحمان و عەلیش لەگەڵ خەڵکەکەش بەیعەتیان پێدا.

ئیبن ئەبی شەیبەو ئیبن سەعد لە عەمرەوە هێناویانە عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) کە سەرەمەرگی هات وتی: عەلی و تەلحەو زوبەیرو عوسمان و عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف و سەعدم بۆ بانگ بکەن، کەسیانی نەدواند جگە لە عەلی و عوسمان، بە عەلی وت: ئەی عەلی ئەو دەستە نزیکی تۆ لە پێغەمبەر (ﷺ)و

بەخششی خوایی زانستو شارەزاییت دەناسن، دەی ئەگەر تۆ بوویتە خەلیفە لەخوا بترسە، بەنی فڵان لەسەر گەردنی خەڵك ڕامەگرە، بە عوسمانیشی وت: ئەی عوسمان ئەوانە زاوایی تۆ دەزانن کە زاوای پێغەمبەر (ﷺ) یتو تەمەنو پلەوپایەو ڕێزت هەیە، ئەگەر تۆ بوویتە خەلیفە لە خوا بترسەو بەنی فڵان لەسەر گەردنی خەڵك ڕامەگرە، ئینجا وتی: صوهەیبم بۆ بانگ بکەن، سێ ڕۆژ نوێژ بۆ خەڵك بکە، با ئەمانەش لەماڵێکدا کۆببنەوە، ئەگەر لەسەر کەسێك یەکدەنگ بوون ئەوکات بدەن لە ملی هەرکامیان کە ناکۆكو دووبەرەکە.

ئیبن سەعد لە ئەبی جەعفەرەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب بە هاوەڵانی ڕاوێژی وت: لەم کارەتاندا ڕاوێژبکەن، ئەگەر دوو دوو بوون دووبارە ڕاوێژبکەنەوە، ئەگەر چوارو دوو بوون ئەوا زۆرینەکە وەربگرن، ئەسلەمیش لە عومەرەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەگەر ڕاتان سێ سێ بوو بکەونە سەر دەستەکەی عەبدولڕەحمانو گوێگرو گوێڕایەڵ بن.

ئەنەس (رضي الله عنه) دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب کەمێك پێش مردنی ناردی بە شوێن ئەبوتەلحەداو پێی وت: ئەی ئەبوتەلحە لەگەڵ پەنجا کەسی پشتیوانان‌دا لەگەڵ ئەو دەستەی ڕاوێژەدابە، چونکە وابزانم لەیەك ماڵدا کۆدەبنەوە، لەسەر دەرگاکە بوەستن، نەهێڵیت کەس بچێتە ژوورەوە بۆلایان، نەهێڵیت ڕۆژی سێیەم تێپەڕبێت تا یەکێکیان ببن بە خەلیفە، خوایە دوای مەرگی من تۆ لەناویاندایت.[1]



[1] - لە کنز العمال ج٣ ص١٥٦-١٥٧ دا واهاتووە.

# (کێ خیلافەت لە ئەستۆ دەگرێت)

ئیبن عەساکیر لە عاصمەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبوبەکر (رضي الله عنه) نەخۆش بوو کە خەڵکی کۆکردەوەو داوای کرد بیبەنە مینبەرەکە، کۆتا وتاری ئەوە بوو، سوپاس‌و ستایشی پەروەردگاری کردو دواتر پشت وتی: ئەی خەڵکینە وریای دونیابن‌و هەڵنەخەڵەتێن متمانەی پێ بکەن، دواڕۆژ پێش دونیا بخەن‌و ڕۆژی دواییتان خۆش بوێت، هەرکامتان خۆش بوێت ئەویتر ڕقاوی دەبێت، ئەم کارەی کە لە دەستماندایە کۆتاییەکەی چاك نابێت مەگەر سەرەتاکەی پێ چاك بێت، بۆیە با بە تواناترینتان لە ئەستۆی بگرێت، کامتان زیاتر بەسەرخۆیدا زاڵبوو، لە کاتی سەختیدا بەهێزتربوو، لە کاتی نەرمیدا نەرمترین بێت، ڕای خاوەن ڕاکانتان پێ دەڵێم سەرقاڵ نەبێت بەوەی پەیوەندی پێوەنیە، خەفەت نەخوات بەوەی دادەبەزێتە سەری، شەرم نەکات لە فێربوون، لەکاتی کتوپڕیدا سەرسام نەمێنێ، بەسەر ماڵ‌و سامانیدا بەهێزبێت‌و بە دژایەتی هیچ ناپاکیەکی تێدا نەکات، کەمکاری نەکات‌و قەرەوڵ بگرێتەوە بۆ ئەوەی دێت، چەکی با وریایی و بێداری‌و گوێڕایەڵی بێت. (ئەوەش عومەری کوڕی خەتتابە). پاشان دابەزی.[1]

ئیبن سەعد لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: خزمەتێکی عومەرم کرد کە هیچ کەس لە خزم‌و کەسانی خۆی خزمەتی وایان نەکردبوو، سۆزێکم بۆ نواند کە هیچ کەس لە کەسانی خۆی سوزی وایان بۆ نەنواندبوو، ڕۆژێك چووم بۆ ماڵەوە بۆلای تەنهابوو و ئەویش دواینیشاندم‌و ڕێزی گرتم‌و کلپەیەك دایگرت وامزانی گیانی دەرچوو، وتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئایا لە ترس‌و ئازارەوەیە؟ وتی: لە ترس‌و ئازارەوەیە، وتم: بۆ چی؟ وتی: نزیك بەرەوە، نزیك بوومەوە، وتی: کەس بۆ ئەم کارە بەدی ناکەم، منیش وتم: ئەی چی دەڵێیت سەبارەت بە فڵان‌و فڵان‌و فڵان‌و فڵان، ناوی شەش کەسی ئەهلی شورام هێنا ئەویش بۆ هەموویان

[1] – کنز العمال ج٣ ص١٤٧ دا وا هاتووە.

بەڵێی کرد، پاشان وتی: ئەم کارە تەنها کەسێکی بەهێزی ناتوندوتیژی دەوێ نەرم بێ و لاوازنەبێ، بەخشندەو نازیادەڕەو و دەستگرەوە بێت و پیسکە نەبێت.

ئەبی عوبەید لە الغریب و خەتیب لە گێڕەرەوەیەکی مالیکەوە هێناویانە دەڵێت: من لەگەڵ عومەری کوڕی خەتتابدا ڕۆژێك لەلای دانیشتبووم هەناسەیەکی هەڵکێشا وامزانی ئێسکەکانی تیکشکان، وتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەمە تەنها ناخۆشیە وات لێدەکات، وتی: وا من نازانم دوای خۆم ئەم کارە بدەمە دەست کێ، پاشان لایکردەوە بەلامداو وتی: بەڵکو هاوڕێکەت بەوکارە شیاوبزانی، وتم: ئەو کەسە لە فەزڵ و پێشینەی موسڵمانبوونیدا شیاوی ئەوەیە، وتی: دەی ئەوە بۆ ئەو دووانەتانە بەڵام تۆ کەسێکی جۆرە گاڵتە بازیەکت تێدایە، تا ئەوەی وتی: ئەم کارە کەسێکی بەهێزی ناتوندوتیژ و نەرمی نالاواز و بەخشندەی نازیادەڕەو و دەستگرەوەی ناپیسکەی دەوێت، ئیبن عەبباس (رضي الله عنه) دەیوت: ئەم خەسڵەتانە تەنها لە عومەردا (رضي الله عنه) کۆ دەبوونەوە.

ئیبن عەساکیر هێناویەتی دەڵێت: من خزمەتی عومەری کوڕی خەتتابم دەکردو بەرزو گەورە ڕامدەگرت، ڕۆژێك چووم بۆماڵەوە بۆلای و بە تەنها لای دانیشتم، هەناسەیەکی هەڵکێشا وامزانی گیانی دەرچوو، پاشان سەری بۆ ئاسمان بەرزکردەوەو هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، وتی: منیش لام سەخت بوو و وتم بە خوا پرسیاری لێدەکەم، وتم: سوێند بە خوا ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەم هەناسەت لە خەفەت و پەژارەوەیە، وتی: سوێند بە خوا لە خەم و پەژارەوەیە، بەڵام چ غەم و پەژارەیەك، کەسێك بەدی ناکەم بۆ ئەم شوێنە (خیلافەت)، پاشان وتی: بەڵکو بڵێیت هاوڕێکەت شیاوی ئەو پایە بێت (واتە عەلی (رضي الله عنه)) دەڵێت: وتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران مەگەر ئەو لە کۆچی و لە کاتی هاوەڵایەتی و لە نزیکایەتیدا هاودەمی نەبوو؟ وتی: وایە، بەڵام کەسێکە جۆرە سەرەڕۆییەکی تێدایە، تا ئەوەی وتی: کەسێکی نەرمی نالاوازو بەهێزی ناتوندوتیژو بەخشندەی نازیادەڕەو و دەستگرەوەی ناپیسکە ئەم کارەی پێ دەکرێت، دەڵێت عومەر (رضي الله عنه) وتی: تەنها

# (نەرمونیانیو توندوتۆڵی خەلیفە)

حاکمو لالەکائیو جگە لەوانەش لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە هێناویانە دەڵێت: کە عومەری کوڕی خەتتاب بوو بە خەلیفە لەسەر مینبەرەکەی پێغەمبەر (ﷺ) وتاری بۆ خەڵك خوێندەوەو سوپاسو ستایشی خوای گەورەی کردو پاشان وتی:

ئەی خەڵکینە من دەزانم ئێوە توندیو تیژییەکم لێ بەدیدەکەن، من لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) بوومو خزمەتکاری بووم، خوای گەورەش لە بارەی پێغەمبەرەوە دەفەرموێت (بالمؤنين رؤوف رحيم) منیش لەبەردەستیدا وەك شمشێری هەڵکێشراو بووم تا لە کارێکدا تاوی دەدام یان ڕێگری لێدەکردم منیش دەستم دەگرتەوە، ئەگەرنا پێش خەڵك دەکەوتمو لەبەرپایەی نەرمیەکەی، بەردەوام لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) دا بووم تا خوای گەورە پێغەمبەری مراندو ئەویش لێم ڕازی بوو، سوپاسی زۆری خواش دەکەم لەسەر ئەوەو پێی دڵخۆشم، پاشان لەگەڵ ئەبوبەکریشدا (ﷺ) کە خەلیفەی دوای پێغەمبەر (ﷺ) بوو وا بووم، ئێوەش دەتانناسی بە ڕێزو نەرمونیان بوو، منیش وەك شمشێری بەردەستیو توندی خۆمم تێکەڵ بە نەرمی ئەو کردبوو ئەگەر پێشم بکەوتایە لە بڕیارێکدا تا دەست بگرمەوە ئەگەرنا دەستپێشخەریم دەکرد، بەردەوام لەسەر ئەوەبووم تا خوای گەورە مراندیو ئەویش لێم ڕازی بوو، سوپاسی زۆری خوا دەکەم لەسەریو پێی دڵخۆشم، پاشان ئەمڕۆ کارتان کەوتۆتە دەست منو من دەزانم کەس دەبێت دەڵێت: عومەر لەسەرمان توندبوو، لە کاتێکدا خۆی خەلیفە نەبوو، ئێستا بووە بە خەلیفە چی؟ بزانن ئێوە سەبارەت بە کەسێك پرسیار لە من ناکەن مەگەر ئەوەی خۆتان چاکتر دەمناسنو ئەزمونتان لەگەڵم هەیەو ئەوەی من دەیزانم سەبارەت بە سوونەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئێوەش دەیزانن، پەشیمان نیم لە شتێك کە حەزم کردبێت لەسەر شتێك پرسیار لە پێغەمبەر (ﷺ) بکەم پرسیارم لێکردووە، دەی بزانم ئەو توورەییەی ئێوە دەتانبینی ئەمڕۆ زیاتری کردووە بەوەی بەرامبەر ستەمکارو دەست درێژ زیادم کردووە، بۆ وەرگرتنەوەی مافی موسڵمانی لاواز لە بەهێزیان، من پاش ئەو توورەییەم کوڵمم دەخەمە سەر زەوی بۆ خەڵکی پاكو دەستتان لێ دەگرمەوە، ئەگەر لەگەڵ یەکێکتان شتێکم بوو

لام ئاساییەو بێباکم لەوەی لەگەڵی بچم بۆلای هەر کەسێك کە ئێوە پێتان خۆش بوو، تا بزانێت نێوانمان چۆنە، دەی بەندەکانی خوا لە خوابترسن بەرامبەر بە خۆتان یارمەتیم بدەن، بەرامبەر بە فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپەو ئامۆژگاری کردنم لەسەر ئەو کارەی ئێوە کە خوا داویەتیە دەستم یارمەتیم بدەن. پاشان دابەزی.[1]

ئیبن سەعد ج٣ ص٢٠٦و ئیبن عەساکیر لە موحەمەدی کوڕی زەیدەوە (رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: عەلی و عوسمان و زوبەیرو تەلحەو عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف و سەعد (رضي الله عنهم) کۆبوونەوە، ئەوەیان بەرامبەر عومەر دلێرتر بوو عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف بوو، وتیان ئەی عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف بەڵکو ئەمیری باوەڕدارانت بدواندایە بۆ ئەو خەڵکە، چونکە کەسێك کە پێویستیەکی هەیە دەچێ بۆلای کەچی شان و شکۆی ناهێڵێت لەبارەی پێویستیەکەیەوە بیدوێنی تا دەگەڕێتەوەو پێویستیەکەی بەجێ ناگەیەنێت، ئەویش چوویە ژوورەوە بۆلای و دواندی و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران لەگەڵ خەڵك نەرم بە، چونکە کەسی وا هەیە دێت بۆلات، کەچی شان و شکۆی ناهێڵێ پێویستیەکەت پێ بڵێ و هەروا دەگەڕێتەوە، ئەویش وتی: ئەی عەبدولڕەحمان بۆ خوا سوێندت دەدەم ئایا عەلی و عوسمان و تەلحەو زوبەیرو سەعد وتیان ئەمە بڵێیت؟ وتی: ئەرێ بەخوا، وتی: ئەی عەبدولڕەحمان سوێند بەخوا هێندە نەرمیم بۆ خەڵك نواندووە تا ترسام خوای گەورە لەسەر ئەو نەرمیە لێپێچینەوەم بکات، بۆیە توندیم نواندو لەو بوارەشەوە هەمان ترسم لادروست بوو، دەی چارچیە؟ ڕووبکەمە کوێ؟ عەبدولڕەحمانیش هەستا و عەباکەی بە دەستی ڕادەکێشا و دەگریا و دەیوت (بە ئاماژەی دەستیشی) دوای تۆ هاوار بۆیان.

ئەبونەعیم لە الحلية لە شەعبیەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەر (رضي الله عنه) وتی: سوێند بە خوا دڵم لەبەرخوا هێندە نەرم بوو تا ئەوەی لە کەرە نەرمتربوو، لەبەر خواش هێندە دڵم ڕەق بوو تا لەبەرد ڕەقتربوو.

ئیبن عەساکیر لە ئیبن عەبباسەوە (رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: کاتێك عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) بوو بە خەلیفە یەکێك پێ وت: هەندێ لەو خەڵکە خەریکە ئەم مەسەلە لە

---

[1] - لە كنز العمال ج٣ ص١٤٧ دا واهاتووە.

تۆ بەدوور بگرن (خیلافەت) عومەر وتی بۆ چی؟ وتی: دەڵێن تۆ توورەی‌ت، عومەر وتی: سوپاس بۆ خوا دڵم پڕە لە ڕەحمەت بۆیان و دڵی ئەوانیش پڕە لە ترس بۆم.[1]

سەیف و ئیبن عەساکیر لە شەعبیەوە هێناویانە کە دەڵێت: عومەر نەمردبوو کە قوڕەیش نارەحەتیان کردبوو لەسەر ئەوەی کە ئەوانی لە مەدینە هێشتوەتەوە و هەموو شتی بە ڕێژەیەکی زۆر خستوەتە بەردەستیان، وتی: شتێ کە من زۆر بە مەترسی دەزانم بۆ ئوممەت بڵاوەکردنتانە لە شارەکاندا، ئەگەر کەسێ بۆ چوون بۆ جیهاد مۆڵەتی لا بخواستایە و لەو کۆچەرانە بوایە کە لە مەدینە هێڵرابوونەوە پێی دەوت لە جەنگەکانت لەگەڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) هێندەت بۆ بووە کە بەشت بکات، ئەمڕۆ ئەوەت بۆ باشترە نە تۆ دنیا ببینی و نە دنیا تۆ ببینێکاتێ عوسمان هەڵبژێردرا بڵاوەیان کرد بە شارەکانداو خەڵکی لە دەوریان کۆبوونەوە، موحەممەد و تەلحە دەڵێن ئەوە یەکەم لاوازی بوو کە ڕوویکردە هەموان.[2]

حاکم ج٣ص١٢٠ لە قەیسی کوڕی ئەبوو حازمەوە هێناویەتی کە دەڵێت: زوبەیر هات بۆ لای عومەر و داوای مۆڵەتی لێکرد بۆ جیهاد، عومەر وتی لە ماڵی خۆتدا دابنیشە چونکە لەگەڵ پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) جیهادت کردووە، ئەوەشی بۆ زیاد دەکات دووبارەی کردەوە لە عومەر و ئەویش هەمان شتی وت، بۆ جاری سێیەم وتی لە ماڵت دابنیشە چونکە سوێند بەخوا بڕوام وایە ئەگەر تۆو هاوەڵانت بچن بۆ دەرەوە ببنە هۆی خراپە بۆ هاوەڵانی موحەممەد.[3]



[1] – لە منتخب کنز العمال ج٤ ص٣٨٢ دا واهاتووە.

[2] – لە کنزالعمال ج٧ص١٣٩دا واهاتووە.تەبەریش ج٥ص١٢٤ لە ڕێگەی سەیفەوە وا هێناویەتی.

[3] – زەهەبی دەڵێت صەحیحە.

# (ڕاوێژکردن بە خاوەن ڕاکان)

## (ڕاوێژی پێغەمبەر (ﷺ))

ئەحمەد لە ئەنەسەوە هێناویەتی پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك هەواڵی ئەبوسوفیانی بیست ڕاوێژی کردو ئەبوبەکری دواند ئەویش خۆی لێ لادا، پاشان عومەری دواندو بە هەمان شێوەبوو، ئینجا فەرموودەکە دێنێت وەك لە باسی (الجهاد) دا هێنامان.

ئەحمەدو موسلیم لە فەرموودەکەی عومەرەوە سەبارەت بە چیرۆکی بەدر هێناویانە کە تیایدا هاتووە: پێغەمبەر (ﷺ) ڕاوێژی کرد بە ئەبوبەکرو عەلی و عومەر، ئەبوبەکر وتی ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانە ئامۆزاو خێڵو برانو من پێم باشە سەرانەیان لێ بسێنین، ئەوەی لێیان وەردەگرین بەهێزیمان دەبێ دژ بە بێباوەڕان، بەڵکو خوای گەورە ڕێنموونییان بکاتو ببنە پاڵپشتو یاریدەدەرمان، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی(ماترى يا ابن الخطاب؟) واتە(تۆ چی دەڵێیت ئەی ئیبن خەتتاب؟) وتی: دەڵێم: سوێند بەخوا ڕاکەی ئەبوبەکرم نیەو پێم باشە ڕێم بدەیت فلان کەسی خزمی نزیکی عومەر بگرمو بدەم لە ملیو عەلیش بدات لە ملی عقیلی زیکیو حەمزەش بدات لە ملی فلانی برای تا خوای گەورە بزانێت هیچ هەواداری و باکێکمان بۆ بێباوەڕان لە دڵدانیە، ئەوانە گەورەو سەرکردەکانی بێباوەڕانن، پێغەمبەر (ﷺ) قسەکەی ئەبوبەکری پێ باش بوو و ئەوەی منی وەرنەگرتو سەرانەی لێ وەرگرتن، بۆ بەیانی عومەر دەڵێت: چووم بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و ئەبوبەکرو هەردووکیان دەگریان، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا پێم بڵێ بۆ چی دەگریت؟ ئەگەر شتێکە با منیش بگریم، ئەگەرنا با بگریم بۆ ئەو گریانەی ئێوە، فەرمووی (للذي علي اصحابك من اخذهم الفداء قد عرض علي عذابكم ادنى من هذه الشجرة) واتە(بۆ ئەو پێشنیارەی سەرانە لێوەرگرتن کە هاوەڵەکانت پێیان وتم

سزای ئێوەم بۆ خرایە ڕوو کەمێك لە خوارووی ئەو درەختە) لەو نزیکەدا درەختێك هەبوو، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند (ماکان لنبي ان یکون له اسری).[1]

ئەحمەد لە ئەنەسەوە خە پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر دیلەکانی بەدر ڕاوێژی بە خەڵك کردو فەرمووی خوای گەورە دەستی ئێوەی بەسەریاندا زاڵکردووە، عومەری کوڕی خەتتاب وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بدە لە ملیان. پێغەمبەر (ﷺ) خۆی لێ لادا، پاشان دووبارە فەرمووی ئەی خەڵکینە خوای گەورە ئێوەی بەسەر ئەواندا زاڵکردووەو ئەوانە دوێنێ براتان بوون، عومەر هەمان شتی وتەوەو پێغەمبەر (ﷺ) خۆی لێ لادایەوە، بۆ جاری سێیەم ئەوەی فەرموو ئەبوبەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا پێمان باشە لێیان خۆش بیتو سەرانەیان بەرامبەر وەربگریت، پێغەمبەر (ﷺ) پەژارەی سەر ڕوخساری نەماو دواتر وایکرد، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند (ولولا کتاب من الله لمسکم فیمااخذتم).[2]

ئەحمەد لە ئیبن مەسعوودەوە هێناویەتی دەڵێت: لە ڕۆژی بەدردا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (سەبارەت بەو دیلانە چی دەڵێن؟) ئەبوبەکر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا کەسو هۆزی خۆتن، بیانهێڵەرەوە و مۆڵەتیان بدە بەڵکو خوای گەورە لێیان خۆش بێت، عومەریش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوان دەریانکردتو بە درۆیان زانیت، بیانهێنەو بدە لە ملیان، عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحەش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بزانە چ دۆڵێك دارو چیلکەی زۆرە بیانبەرە ئەویۆ ئاگریان تێبەردە، پێغەمبەر (ﷺ) چوویە ژوورەوەو وەڵامی هیچ کامیانی نەدایەوە، هەندێ دەیانوت قسەکەی ئەبوبەکر وەردەگرێ، هەندێکی تر دەیانوت قسەکەی عومەر وەردەگرێت، هەندێ دەیانوت قسەکەی عەبدوڵلای کوڕی

---

[1]– ئەبوداودو ترمزیو ئیبن ئەبی شەیبەو ئەبوعوانەو ئیبن جەریرو ئیبن مونزیرو ئیبن ئەبی حاتەمو ئیبن حیبانو ئەبوشەیخو ئیبن مەردەویەو ئەبونەعیمو بەیهەقی هێناویانە، هەروەك لە کنز العمال ج٥ ص٢٦٥ یشدا هاتووە.

[2]– لە نصب الرایة ج٣ ص٤٠٣ دا واهاتووە، هەیسەمی ج٦ ص٨٧ دەڵێت: ئەحمەد لە عەلی کوڕی عاصمی کوڕی صوهەیبی مامۆستایەوە هێناویەتی کە هەڵەی زۆرە، ئەگەر ڕاستو دروستی بوترایە نەدەگەڕایەوە، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە صەحیحن. تەواو.

ڕەواحە وەردەگرێت، پێغەمبەر (ﷺ) هاتە دەرەوە بۆلایان و فەرمووی (ان الله ليلين قلوب رجال فيه حتى تكون الين من اللين، وان الله ليشد قلوب رجال فيه حتى تكون اشد من الحجارة، وان مثلك يا ابابكر كمثل ابراهيم قال (فمن تبعني فانه مني ومن عصاني فانك غفور رحيم) وان مثلك يا ابابكر كمثل عيسى قال) (ان تعذبهم فانهم عبادك وان تغفر لهم فانك انت العزيز الحكيم) وان مثلك يا عمر كمثل نوح قال (لا تذر على الارض من الكافرين ديارا) وان مثلك يا عمر كمثل موسى قال (ربنا اطمس على اموالهم واشدد على قلوبهم فلا يؤمنوا حتى يروا العذاب الاليم) انتم فلايبقين احد الا بفداء او ضربة عنق)(خوا دڵی کەسانێك نەرم دەکات تا لە نەرمی نەرمتر دەبن، دڵی کەسانێکیش ڕەق و توند دەکات تا لە بەرد توندو ڕەقتر دەبن، نموونەی تۆ ئەی ئەبووبەکر وەك ئیبراهیم وایە کە دەیوت(هەرکەس شوێنم بکەوێت لە منە، هەر کەسیش لێم یاخی بوو ئەوا ئەی خوایە تۆ بەخشەری میهرەبانی)وە نموونەت ئەی ئەبووبەکر وەك عیسا وایە کە وتی(ئەگەر سزایان بدەیت بەندەی خۆتن، ئەگەریش لێیان خۆش بیت ئەوا تۆ بە توانی دانایت)ئەی عومەر نموونەی تۆیش وەك نووح وایە کە وتی(لەسەر زەویدا شوێنەواری بێباوەران مەهێڵە)وە ئەی عومەر نموونەت وەك مووسایە کە دەوت(خوایە دەستمان زاڵ بکە بەسەر ماڵیاندا توندی بکە بە بەشی دڵیان(توندییان بۆ بنوێنە)تا باوەڕ نەهێنن تا سزای پڕ ئازار ببینن) عەبدوڵلا دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا جگە لە سوهەیلی کوڕی بەیزا کە گوێم لێ بوو باسی ئیسلامی دەکرد، ئەویش بێدەنگ بوو، هیچ کات هێندە نەترسام دەموت لە ئاسمانەوە بەردێ دەکەوێت بەسەرمدا، تا ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (جگە لە سوهەیلی کوڕی بەیزا) خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند (ما كان لنبي ان يكون له اسرى) تا کۆتایی ئایەتەکە[١][٢].

---

[١] – ضعيف.

[٢] – ترمزی و حاکم بە هەمان شێوە هێناویانە، حاکم دەڵێت سەنەدی صەحیحەو بوخاری و موسلیم نەیانهێناوە، ئیبن مەردەویە لە ڕێگەی عەبدوڵلای کوڕی عومەرو ئەبی هورەیرەوە بە هەمان شێوە هێناویانە، لە ئەبوئەیوبی ئەنساریەوە بە هەمان شێوە گێڕدراوەتەوە، لە البداية والنهاية ج٣ ص٢٩٧ یشدا هاتووە.

ئیبن ئیسحاق لە زوهریەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك خەڵکی باریان سەخت بوو پێغەمبەر (ﷺ) ناردی بۆلای عوبەینەی کوڕی حوصەین و حارسی کوڕی عەوف موری کە دوو سەرکردەی غەتفان بوون، سێ یەکی بەرهەمی مەدینەی پێدان بەرامبەر بەوەی بە خۆیان و هاوەڵانیانەوە پاشەکشە بکەن، لەگەڵیاندا ڕێککەوتنی بەست و نووسییان، بەڵام شایەتیان نەگرت و بڕیاری یەکلاییان نەدا کە پێغەمبەر (ﷺ) ویستی ئەوە بکات ناردی بە شوێن هەردوو سەعداو بۆی باسکردن و ڕاوێژی پێ کردن لەو بارەوە، ئەوانیش وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا حەزی خۆتە یان فەرمانی خوایە و هەردەبێت کاری پێ بکەین یان لەبەر ئێمە دەیکەیت؟ فەرمووی (بل شيئ اصنعه لكم والله ما اصنع ذالك الا لاني رايت العرب زمتكم عن قوس واحدة وكالبوكم من كل جانب فاردت ان اكسر عنكم من شوكتهم الى امر ما) واتە(بەڵکو شتێکە لەبەر ئێوە دەیکەم، سوێند بەخوا ئەمە تەنها لەبەر ئەوە دەکەم چونکە وای دەبینم عەرەب بە یەکپارچە هاتوون بۆتان و لە هەموولایەکەوە زۆریان بۆ هێناون، بۆیە ویستم تا ئاستێ لەشان و شکۆیان بشکێنم بۆتان) سەعدی کوڕی موعاز پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە و ئەوانیش بێباوەڕبووین و بتمان دەپەرست و خوامان نەدەپەرست و نەدەناسی و ئەوانەیش چاویان لەوەنەبوو هیچ بخۆن مەگەر بە کڕین یان بەخشین، ئێستا کە خوا ڕێزداری کردین بە ئیسلام و ڕێنموونی کردین و بە تۆش سەربەرزی کردین ئێستا سامانی خۆمانیان پێ بدەین؟ هیچ پێویستمان نیە، سوێند بەخوا تەنها شمشێرکانمان لێ دەبینین تا خوای گەورە نێوانمان دەکات، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی (انت و ذاك) واتە(دەی باوابێ) سەعدی کوڕی موعازیش پەڕەکەی وەرگرت و چی نووسینی تێدابوو سڕیەوە و وتی: دەی چیتان پێ دەکرێت لە ڕوومدا با بیکەین[1].[2]

بەزار لە ئەبی هورەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: حارس هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) و وتی: خورمای مەدینەمان لەگەڵ بکە بە نیو بە نیو ئەگەرنا سەربازو سوارت بەسەردا دەبارێنم، ئەویش فەرمووی (حتى استامر السعود سعد بن عبادة و سعد بن

[1] – ضعیف.

[2] – لە البداية والنهاية ج٤ ص١٠٤ دا واهاتووە.

معاذ) واتە(تا ڕاوێژ بە سەعدەکان بکەم سەعدی کوڕی عوبادەو سەعدی کوڕی موعاز) ئەو دوانەش وتیان نەبەخوا ئێمە لە کاتی نەفامیدا ئەوەمان نەکردووە، ئێستا کە خوا ئیسلامی پێ بەخشیوین چۆن ئەوە دەکەین، پێغەمبەریش (ﷺ) گەڕایەوە بۆلای حارس و هەواڵی پێدا، ئەویش وتی: ئەی موحەمەد ناپاکیت نواند، تەبەرانی لە ئەبوهورەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: حارسی غەتفانی هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)و وتی: ئەی موحەمەد خورمای مەدینەمان لەگەڵ وا بکە نیو بە نیو، فەرمووی (حتى استامر السعود) ناردی بە شوێن سەعدی کوڕی موعازو سەعدی کوڕی عوبادەو سەعدی ڕەبیع و سەعدی کوڕی خەیسەمەو سەعدی کوڕی مەسعودداو فەرمووی (اني قد علمت ان العرب قدرمتكم عن قوس واحدة وان الحارس سالكم تشاطروه تمر المدينة، فان اردتم ان يدفعوه عامكم هذا في امركم بعد) واتە(من دەزانم عەرەب یەکدەستە هاتوون بۆتان و حارسیش داوای نیوەی خورمای مەدینەی لێ کردوون، ئەگەر دەتانەوێ ئەمساڵ ئەوەی بدەنێ ئەوە کاری خۆتانە) وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا سروشی ئاسمانە تا خۆمان بدەینە دەست فەرمانی خوا یان ڕاو و ویستی خۆتە تا بەجێی بگەیەنین، ئەگەر دەتەوێت بمێنینەوە سوێند بەخوا یەکسانین لەگەڵیان. یەك خورمایان لێنەبردووین بە کڕین نەبێت پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (هو ذا، تسمعون ما يقولون) واتە( ئەوەیە دەبیستن چی دەڵێن)، وتیان موحەمەد ناپاکیت نواند.[1]

---

[1]- هەیسەمی ج٦ ص١٣٢ دەڵێت کەسەکانی سەنەدەکە بەزارو تەبەرانی موحەمەدی کوڕی عەمریان تێدایە کە فەرمووی حەسەنە، کەسەکانی دیکەی جێ متمانەن موسەددەدیش لە عومەرەوە بە صەحیحی هێناویەتی پێغەمبەر (ﷺ) لای ئەبوبەکر شەو لە کاروباری موسڵمانان قسەی دەکردو منیش لەگەڵی بووم، كنز العمال ج٤ ص٤٥ دا وا هاتووە.

## (ڕاوێژی ئەبوبەکر (رضي الله عنه) بە خاوەن ڕاکان)

ئیبن سەعد لە قاسمەوە هێناویەتی ئەبوبەکری صدیق ئەگەر کارێکی هەبوایە و بیویستایە ڕاوێژ بە خاوەن ڕاو شارەزاکان بکات هەندێ لە کۆچەران و پشتیوانانی بانگدەکرد، عومەرو عەلی و عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف و موعازی کوڕی جەبەل و ئوبەی کوڕی کەعب و زەیدی کوڕی سابتی بانگ دەکرد، هەموو ئەوانە لە خیلافەتی ئەودا فەتوایان هەبوو، بەڵکو فەتوای خەڵك لەوانە دەدرا، ئەبوبەکر لەسەر ئەوە چوو، دواتر عومەر هات و ئەوانەی بانگ دەکردو فەتوای ماوەی خیلافەت لای عوسمان ئوبەی و زەید بوو.[1]

ئیبن ئەبی شەیبەو بوخاری لە مێژووەکەیداو ئیبن عەساکیرو بەیهەقی و یەعقوبی کوڕی سوفیان لە عوبەیدەوە هێناویانە دەڵێت: عویەینەی کوڕی حوصەین و ئەقرەعی کوڕی حابس هاتن بۆلای ئەبوبەکر، وتیان: ئەی خەلیفەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئێمە زەویەکی شۆرەکاتمان هەیەو ئاڵفی تێدانیەو سوودی نیە، پێت چۆنە بیدەیتە ئێمە تا بیکێڵین و بیچێنین، ئەویش پێ دان و نامەیەکی بۆ نووسین و عومەری لەسەر بە شایەت گرت لەکاتی خۆیدا لەوێ نەبوو، ئەوانیش چوون تا شایەتیەکەی عومەر وەربگرن، کە عومەر بە نامەکەی زانی لە دەستی سەندن و تفی لێداو سڕیەوەو ئەوانیش تووڕەبوون و وتیان کارێکی خراپت کرد، عەمەر وتی: پێغەمبەری خوا ئەو کات دڵی ڕادەگرتن، ئەوکات ئیسلام لاوازبوو، خوای گەورەش ئیسلامی بەهێزکرد، دەی بڕۆن ئیتر خۆتان هەوڵبدەن و ئەگەر خۆتان کارنەکەن خوا ئاگای لێتان نەبێت، ئەوانیش چوون بۆلای ئەبوبەکرو تووڕەیی دایگرتبوون، وتیان: سوێند بەخوا نازانین تۆ خەلیفەیت یان عومەر؟ وتی: ئەو ئەگەریش بیویستایە وادەبوو، عومەریش بە تووڕەیی هات و لەبەردەم ئەبوبەکردا وەستتاو وتی: سەبارەت بەو پارچە زەویەی بۆت بڕیونەتەوە پێم بڵێ،

---

[1] – لە کنز العمال ج٣ ص١٣٤ دا وا هاتووە.

ئەمە زەوی خۆتە یان هی هەموو موسڵمانانە؟ وتی: هی هەموو موسڵمانانە، وتی: ئەی بۆچی بەجیا لە موسڵمانان دات بەم دوانە؟ وتی: ڕاوێژم کرد بەوانەی دەورم‌و ئەوانیش وایان وت، وتی: دەی مەگەر ڕاوێژی ئەوانەی دەورت زیاترە یان ڕاوێژو ڕەزامەندی هەموو موسڵمانان؟ ئەبوبەکر وتی: من پێم وتی تۆ بۆ ئەم کارە لە من بەهێزتری بەڵام هەر ڕازی نەبوویت.[1]

سەیف‌و ئیبن عەساکیر لە صەعبی کوڕی عەتیەی کوڕی بیلال لە باوکیەوە‌و لە سەهمی کوڕی منجاب هێناویانە دەڵێت: ئەقرەع‌و زەبرقان چوون بۆلای ئەبوبەکرو پێیان وت: خەراجی بەحرەینمان پێ بدە تا ئێمە زامنت بۆ بکەین کەس لە هۆزەکەمان هەڵنەگەڕێنەوە، ئەویش ڕازیبوو و نامەی بۆ نووسین، ئەوەی لە نێوانیاندا بوو تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا بوو، چەند کەسێکیان بە شایەت نووسی، لەوانە عومەر، کاتێك نامەکە هێنرا بۆ عومەرو سەیری کرد شایەتی نەداو دواتر وتی: بێ ڕێزیە، نامەکەی دڕاند‌و سڕیەوە تەلحە تووڕە بوو و هات بۆلای ئەبوبەکرو وتی: ئەرێ تۆ ئەمیری یان عومەر؟ وتی: عومەر بەڵام گوێڕایەڵی بۆ منە، ئەویش بێدەنگ بوو.[2]

تەبەرانی لە عەبدوڵلای کوڕی عەمرەوە هێناویەتی ئەبوبەکر نامەی بۆ عەمری کوڕی عاص نووسی پێغەمبەر (ﷺ) لە شەڕدا ڕاوێژی دەکرد دەی تۆش وابکە.[3]

---

[1]- لە کنز العمال ج٢ ص١٨٩ دا هاتووە‌و لە الاصابە ج٣ ص٥٥‌و ج١ ص٥٩ دەیداتەوە پاڵ بوخاری لە (التاریخ الصغیر) یدا یەعقوبی کوڕی سوفیانیش بە سەنەدی صەحیح هێناویەتی، لە عەلی کوڕی مدینیشەوە هێناویەتی کە فەرموودەکە مونقەتیعە، چونکە عوبەیدە چیرۆکەکەی نەبینیوە‌و لە عومەریشەوە نەیگێڕاوەتەوە کە لەوی بیستبێت، دەڵێت: لە عومەرەوە بە سەنەدی باشتر لەوە هاتووە، عەبدولڕەزاقیش لە تاوسەوە بە کورتی هێناویەوتی، لە کنز العمال ج١ ص٨٠ یشدا هاتووە.

[2] – لە منتخب کنز العمال ج٤ ص٣٩٠ دا واهاتووە.

[3]- هەیسەمی ج٥ ص٣١٩ دەڵێت: تەبەرانی گێڕاویەتیەوە‌و کەسەکانی جێ متمانەن، تەواو، بەزاریش هێناویەتی، عقیلیش بە سەنەدی حەسەن، لە کنز العمال ج٢ ص١٦٣ یشدا هاتووە، پێشتریش باسمانکرد کە ئەبوبەکر لە شەڕی ڕۆمدا ڕاوێژی بە خاوەن ڕاکان دەکرد.

# (ڕاوێژی عومەری کوڕی خەتتاب بە خاوەن ڕاکان)

ئیبن سەعدو سەعیدی کوڕی مەنسوور لە ئەبی جەعفەرەوە هێناویانە عومەری کوڕی خەتتاب داوای ئوم کەلسومی کچی عەلی کرد، عەلی وتی: من کچەکانم داوە بە کوڕانی جەعفەر، عومەر وتی: عەلی ئەو کچەم لێ مارەبکە بەخوا لەسەر زەویدا کەس نیە وەك من نیازی چاکی بەرامبەری هەبێ؟ عەلی وتی: باشە، عومەر هاتە کۆڕی کۆچەران لە نێوان گۆڕو مینبەردا بوون لەگەڵ عەلی و عوسمان و زوبەیرو تەلحەو عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف دادەنیشتن، کە عومەر لە ئاسۆوە هات لەو بارەدا ڕاوێژی پێ کردن، عومەر وتی: ئاهەنگم بۆ بکەن، (پیرۆزبایی هاوسەرگیری) ئەوانیش وایان کردو وتیان: لەکێ ئەی ئەمیری باوەڕداران؟ وتی: کچەکەی عەلی کوڕی ئەبوتالیب، پاشان هەواڵی پێدان و وتی: پێغەمبەر (ﷺ) دەیفەرموو (کل سبب و نسب منقطع یوم القیامة الا سببي ونسبي)(هەموو ڕەچەڵەك و پشتێ لە ڕۆژی دواییدا دوابڕاوە جگە لە ڕەچەڵەك و پشتی من) منیش هاودەمی بووم حەزم دەکرد ئەمەش ببێت[1] [2].

ئیبن سەعد لە عەتائی کوڕی یەسارەوە هێناویەتی عومەرو عوسمان (رضي الله عنهما) ئیبن عەبباسیان (رضي الله عنه) بانگ دەکردو لەگەڵ بەشداربوانی بەدردا ڕاوێژیان پێدەکردو لە سەردەمی عومەرو عوسماندا فەتوای دەدا تا ئەو ڕۆژەی مرد، لە یەعقوبی کوڕی یەزیدیشەوە دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب لە کارێکدا کەلای گرنگ بوایە ڕاوێژی دەکرد بە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس و دەیوت: ژێر ئاوی

---

[1] - ضعيف.

[2] - ئیبن ڕاهەویە بە کورتی هێناویەتی، لە کنز العمال ج٧ ص٩٧ داو حاکم ج٣ ص١٤٢ بە کورتی هێناویەتی و دەڵێت: سەنەدی صەحیحەو بوخاری و موسلیم نەیانهێناوە، زەهەبی دەڵێت: ئەم فەرموودە (سەنەدەکەی) مونقەتیعە.

(غواص)[1] ئادەی لێنەوە، لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصیشەوە دەڵێت: کەسم نەدیوە هێندە تێگەیشتبێ خێراو بیرتیژو زاناو لەسەرخۆ و نەرمونیانی هێندەی ئیبن عەبباس زۆر بێت، عومەری کوڕی خەتتابم دەدی بۆ کێشەو باسوخواسەکان بانگی دەکردو دواتر دەیوت کێشەیەکت بۆ هاتووە، پاشان قسەکەی تێنەدەپەڕاند چونکە ئەو کەسە کۆچەریو پشتیوانانەی بەشداری بەدربوون لە دەوری بوون. بەیهەقیو ئیبن سەمعانی لە ئیبن شهابەوە هێناویانە دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب ئەگەر کێشەیەکی بهاتایەتە بەردەم گەنجانی بانگدەکردو ڕاوێژی پێ دەکردنو ئاستی عەقڵو هۆشیانی دەگرتەبەر، بەیهەقی لە ئیبن سیرینەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب ڕاوێژی بە خەڵك دەکرد،- تەنانەت ڕاوێژی بە ئافرەتان دەکرد، ئەگەر قسەیەکی باشی لێ ببیستایە وەریدەگرت.[2]

ئیبن جەریر ج٤ ص٨٣ لە ڕێگەی سەیف لە موحەمەدو تەلحەو زیادەوە بە سەنەدی ئەوان هێناویەتی دەڵێن: عومەر چوو تا لەسەر ئاوێك دابەزی کە پێی دەوترا (صرار) لەوێ سەنگەری گرت، خەڵکی نەیاندەزانی ئایا دەچێت یان دەمێنێتەوە؟ ئەگەر بیانویستایە پرسیاری لێبکەن عوسمان یان عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوفیان دەنارد بۆلای، عوسمان لە کاتی خیلافەتی عومەر داپێی دەوترا (ردیف) لە زمانی عەرەبیدا واتای کەسی دوای کەسێك دێت، واتە کەسی دووەم، عەرەب بۆ کەسی دوای سەرکردەیان ئەو نازناوە بەکاردێنن، ئەگەر ئەو دوانە هیچیان پێ نەکرایە عەبباسیان دەنارد، عوسمان (ﷺ) بە عومەری وت: چیت پێ گەیشتووە چیت دەوێت؟ ئەویش هاواری کرد کۆببنەوە بۆ نوێژ، خەڵکی کۆبوونەوەو ئەویش هەواڵی پێدان، پاشان گوێی گرت بزانێ خەڵکەکە چی دەڵێن، هەموان وتیان: بە ڕێکەوەو ئێمەش لەگەڵ خۆت ببە، ئەویش ڕاکەی ئەوانی

---

[1] ئەو کەسەی دەچێتە ژێر دەریا تا بۆ گەوهەرو مرواری بگەڕێت.

[2] – لە کنز العمال ج٢ ص١٦٣ دا واهاتووە.

وەرگرت و حەزی نەکرد وازیان لیٚ بێنێت تا بە نەرمی لەویٚ دەریان بکات، وتی: خۆتان ئامادە بکەن من دەکەومەڕیٚ مەگەر ئەوەی ڕایەکی باشتر لەوەی هەبێت، پاشان ناردی بە شوێن خاوەن ڕاکانداو دیارەکانی هاوەڵان و گەورەکانی عەرەب کۆبوونەوە عومەر وتی: ڕای خۆتانم پیٚ بڵێن چونکە من بەڕیٚ دەکەوم. ئەوانیش هەموو کۆبوونەوەو یەکدەنگ بوون لەسەر ئەوەی یەکێك لە هاوەڵان بنێرن و ئەو بمێنێتەوەو سەربازی لەگەڵ بنێرێت، بەوە دوژمن هیلاك و موسڵمانان پارێزراو و سەرکەوتنی خوا بە بەدیهاتنی بەڵێنی خوا دێت، عومەر خەڵکەکەی کۆکردەوەو ناردی بە شوێن عەلیداو لەسەر مەدینە داینا، ئەویش هات، ناردیشی بە شوێن تەلحەدا کە لە پێشەوەی سوپاوە ناردبووی، ئەویش گەڕایەوە بۆلای و لەڕاست و چەپی سوپاکەدا زوبەیرو عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف هەبوون، عومەر هەستاو ئەمەی بە خەڵکەکە وت: خوای گەورە خەڵکی لەسەر ئیسلام کۆکردەوەو دڵی یەك خستوون و برایەتی خستوەتە نێوانتانەوە، موسڵمانان لە نێوخۆیاندا وەك جەستەیەك وان و هەمووی پێکەوە ئازاری دەبێت، بۆ موسڵمانانیش وایەو دەبێت وابن و کاروباریشیان بە ڕاوێژی نێوان خاوەن ڕاکانیان بێت چونکە خەڵکی شوێنکەوتەی ئەم خاوەن کارەن تا کاتیٚ لەسەری یەکدەنگ بن و پێی ڕازی بن خەڵکی پەیوەست دەبن و شوێنکەوتەی ئەو خاوەن ڕایانەن، ئەوەش ئەم کارەی بە دەستە شوێنکەوتەی خاوەن ڕاکانیانە چی دەڵێن و چی پیلان و نەخشەی جەنگیان پێیەو ئەوانەش شوێنکەوتەی ئەو خاوەن ڕایانەن، ئەی خەڵکینە من کەسێکم وەك هەرکام لە ئێوە تا ئەوەی خاوەن ڕاکانتان وایانکرد نەچمە دەریٚ پێم باش بوو خۆم بمێنمەوەو یەکیٚ بنێرم، بۆ ئەم کارەش کەسانی پێش و پاشم هێناون).

عەلی(رضي الله عنه) جێگیری بوو لەسەر مەدینەو تەلحەش لە پێشەوە، ئیبن جەریریش لە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك کوژرانی ئەبوعوبەیدی کوڕی مەسعود گەیشتەوە لای عومەر (رضي الله عنه) و کۆبوونەوەی خەڵکی فارسی بە سەرکردایەتی یەکیٚ لە کەسەکانی بنەماڵەی کیسرا بیست، لەناو کۆچەران و

پـشتیواناندا بانگـەوازی کـردو چـوو تـا گەیـشتە (صـرار) ئینجـا بـە کـورتی فەرمووده‌کەی پێشوو دێنێت.

تەبـەرانی موحەمـەدی کـوڕی سـەلامی بیکەندیـەوە دەیهێنێـت: عـەمری کـوڕی مەعـدی یـەکریب لـەکاتی نەفامیـدا چـەند شـەڕو ڕوداوێکـی هـەبوون، ئیـسلامی وەرگـرت و هاتـە خزمـەت پێغەمبەر (ﷺ)، دواتـر عومـەری کـوڕی خـەتتاب ناردی بۆلای سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص بۆ قادسیەو لەوێ تواناییەکی جوانی نواند، عومـەر نووسـی بـۆ سـەعد: وا دوو هـەزار کەسـم لەگـەڵ عـەمری کـوڕی مەعـدی یەکریب و تولەیحەی کوڕی خوەیلیددا نارد بۆ یارمەتیت، ئەوەش تولەیحەی کوڕی خوەیلیدی ئەسـەدیە، دەی لـە شـەڕدا ڕاوێـژیان پـێ بکـەو بێ ئەوان هیچ هـەنگاوێ مەنێ.[1]



## (دانانی ئەمیرەکان)

ئەحمەد لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصەوە هێناویەتی دەڵێت: کە پێغەمبەر(ﷺ) هاتە مەدینە جوهەینە هاتن بۆ لای و وتیان: تۆ لـە نێوانـدا دابەزیویت دەی ڕێبدەو بمێنـەوە تـا خۆمـان و هۆزمـان بێین بـۆ لات، ئەویش وایکـردو ئەوانیش موسـڵمان بوون، پێغەمبەر(ﷺ) لە مانگی ڕەجەبدا ناردینی – سـەد کـەس نـەبووین– فـەرمانی پێکـردین تـا هەڵمـەت ببەینـە سـەر ناوچـەیەکی بـەنی کینانـە لـەپاڵ جوهەینـەدا، ئێمەیش هەڵمەتمان بردنەسەر و ئەوان زۆربوون، بۆیـە پـەنامان بردەبـەر جوهەینـەو ئەوانیش پاش ڕێ لێ گرتنمان وتیان بۆچی لە مانگی حەرامدا شەڕدەکەن؟ ئێمـەش

[1] – هەیسەمی ج٥ ص٣١٩ دەڵێت: تەبەرانیش بەوجۆرە هێناویەتی و سەنەدەکەی مونقەتیعە.

لەناو خۆماندا وتمان چی بڵێین؟ هەندێکمان وتیان: دەچین بۆ لای پێغەمبەری خواو پێی دەڵێین، هەندێکی دیکە وتیان: نا بەڵکو لێرە دەمێنینەوە، منیش لەگەڵ هەندێکی تردا وتم: نا دەچین بۆ لای کاروانی قورەیش و دەیبڕین، ئەوکات(فەیئ) وا بوو هەرکەس شتێکی بگرتایە بۆ خۆی بوو، چووین بۆ لای کاروانەکەو هاوەڵەکانیشمان چوون بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش بە تووڕەیی و دەموچاو سووربوونەوە فەرمووی(اذهبتم من عندي جميعا و رجعتم متفرين! انما اهلك من كان قبلكم الفرقة لابعثن عليكم رجلا ليس بخيركم اصبركم على الجوع والعطش) واتە(لەلای من کۆدەنگ چوون و بە بەشبەشەکی گەڕانەوە! ئەوانی پێش ئێوە دووبەرەکی لەناوی بردن، کەسێکتان لەسەر دادەنێم لە هەمووتان باشترنیەو لە هەمووتان زیاتر لەسەر برسێتی و تینوێتی خۆی دەگرێت) عەبدوڵڵای کوڕی جەحشی ئەسەدی نارده سەرمان، یەکەم ئەمیری ئیسلام ئەو بوو[1][2].



[1] – ضعیف.

[2] – ئیبن ئەبی شەیبەش هێناویەتی، لە كنز العمال ج٧ ص٦٠دا هاتووە، بەغەویش هێناویەتی، لە الاصابة ج٢ ص٢٨٧ دا هاتووە، بەیهەقی لە الدلائل دا هێناویەتی، لە البداية والنهاية ج٦ ص٢٤٨دا هاتووە، هەیسەمی ج٦ ص٦٦ دەڵێت: لە سەنەدەکەیدا موجالیدی کوڕی سەعید هەیە لەلای زۆرینە لاوازەو نەسائی لە گێڕانەوەیەکدا متمانەی پێ داوەو کەسەکانی دیکەی سەنەدەکەی ئەحمەد کەسانی صەحیحن، تەواو.

## (ئەمیرایەتی لەسەر دە کەس)

ئیبن ئەبی شەیبە بە سەنەدی صەحیح لە شەهابی عەنبەری باوکی حەبیبەوە هێناویەتی دەڵێت: من یەکەم کەس بووم کە ئاگرم نایە دەرگای توستەر، ئەشعەری خۆی فڕێداو کەوت و لە هۆش چوو، کە فەتحیان کرد لەسەر دە کەس لە هۆزەکەم کردمی بە ئەمیر.[1]

## (ئەمیرایەتی لە سەفەردا)

بەزارو ئیبن خوزەیمەو دارقوتنی و حاکم لە عومەرەوە هێناویانە دەڵێت: ئەگەر لە سەفەرێکدا سیان بوون با یەکێکیان بکەن بە ئەمیر، ئەمە پێغەمبەر(ﷺ) داینا.[2]

## (کێ ئەمیرایەتی لە ئەستۆ دەگرێت)

ترمزی بە فەرموودەی حەسەن و ئیبن حیببان هێناویانە(دەقەکەش هی ترمزیە) لە ئەبی هورەیرەوە(رضي الله عنه) دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) دەستەیەکی ژمارە بەرچاوی نارد و داوای لێکردن چی قورئانیان لەبەرە بۆی بخوێنن، هەرکامیان چی لەبەربوو بۆی خوێند، یەکێکیان کە تەمەنی لە هەموویان کەمتربوو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(یا فلان؟) واتە(فڵان کەس تۆ چەندت لەبەرە؟) وتی: ئەوەو سورەتی(البقرة)م لەبەرە، فەرمووی(امعك سورة البقرة؟) واتە(سورەتی بەقەرەت لەگەڵدایە(لەبەرە)؟) وتی: بەڵێ، فەرمووی(اذهب فانت امیرهم) واتە(دەی بڕۆ تۆ ئەمیریانیت) یەکێك لە خانەدانەکان وتی: سوێند بەخوا تەنها لە ترسی ئەوە سورەتی بەقەرەم لەبەرنەکرد دەترسام نەتوانم بەجێی بگەیەنم و کاری پێ بکەم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(تعلموا

---

[1] – لە الاصابة ج٢ ص١٥٩ دا واهاتووە.

[2] – لە کنز العمال ج٣ ص٣٤٤ دا واهاتووە.

القرءان واقرؤوه فان مثل القران لمن تعلمه فقرا، كثل جراب محشو مسكا يفوح ريحه في كل مكان، ومن تعلمه فيرقد و هو في جوفه فمثله كمثل جراب اوكى على مسك)(فێری قورئان بن‌و بیخوێنن چونکە نموونەی ئەوەی قورئان فێر دەبێت‌و دەیخوێنێت وەك قاچاخێکی(کونەو گۆزە)پڕکراو لە میسك وایە).[1]

تەبەرانی لە عوسمانەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وەفیدێکی نارد بۆ یەمەن‌و یەکێکیانی کرد بە ئەمیریان کە لە هەموویان بچوکتر بوو، چەند ڕۆژێك مایەوە، یەکێك لەوانە گەیشتەوە بە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)و پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(یا فلان مالك اما انطلقت؟) واتە(فڵان کەس ئەوە چیە مەگەر تۆ نەکەوتیتە ڕێ؟) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمیرەکەمان سکاڵای دەست پێیەتی، پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) چوو بۆ لای‌و فووی بەسەردا کردو فەرمووی(بسم الله و بالله اعوذ وقدرته من ما فيها)(بەناوی خواو پەنا دەگرم بە خواو توانای خوا لەوەی کە تیایدایە) حەوت جار وتیەوە، پیاوەکە چاك بوویەوە، پیرێك پێی وت: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە لە هەمووومان بچوکترەو ئەو دەکەیتە ئەمیرمان؟ پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) باسی ئەوەی کرد کە ئەو قورئانی لەبەرە، پیاوە پیرەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر لە ترسی پاڵدانەوەو کارپێ نەکردنی نەبوایە فێری دەبووم‌و لەبەرم دەکرد، پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(فانما مثل القران كجراب ملاته مسكا موضوعا كذالك مثل القران اذا قراته وكان في صدرك).[2](نموونەی قورئان کاتێ بیخوێنی‌و لە سسنگتدا بێت وەك کیسەیەك وایە کە پڕکرابێت لە میسك‌و بۆنی بڵاوبێت)

---

[1] – لە الترغيب و الترهيب ج٣ ص١٢ دا واهاتووە.

[2] – هەیسەمی ج٧ ص١٦١ دەڵێت: لە سەنەدەکەیدا یەحیای کوڕی کوهەیل هەیە کە زۆرێك بە لاوازی دەزانن‌و ئیبن حیببان متمانەی پێدەدات‌و دەڵێت: لە فەرموودەکانی کوڕەکەی لە باوکیەوە چەند ناباشی‌و مونکەرێك هەن، منیش دەڵێم: ئەم گێڕانەوە لە ڕێی کوڕەکەیەوە نیەوە، تەواو.

ئەبونەعیم لە الحلیةو ئیبن عەساکیر لە ئەبی بەکری کوڕی موحەمەدی ئەنساریەوە هێناویانە کە ئەبوبەکر(رضي الله عنه) پێی وترا: ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا ئایا بەشداربوانی بەدر ناکەیتە بەرپرس؟ وتی: من پلەو پایەی ئەوانم لەبەرچاوە بەڵام حەزناکەم بە دونیا پیس و تێکەڵیان بکەم.[1]

ئیبن سەعد ج٣ ص٦٠ لە عمرانی کوڕی عەبدوڵڵاوە هێناویەتی دەڵێت: ئوبەی کوڕی کەعب بە عومەری کوڕی خەتتابی وت: لەسەر کارو ئەرکێ دامنانێیت؟ وتی: حەزناکەم ئایینەکەت پیس بکات، ئیبن سەعدو حاکم و سەعیدی کوڕی مەنصور لە حارسی کوڕی موزریبەوە هێناویانە دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) بۆی نووسین:

(پاشان: من عەمماری کوڕی یاسرم وەك ئەمیرو عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودم وەك مامۆستاو وەزیر نارد بۆ لاتان، ئەمانە لە خانەدانانی هاوەڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و بەشداربوانی بەدرن، دەی لێیانەوە فێربن و بیانکەنە پێشەنگ، من عەبدوڵڵام بۆ ئێوە پێش خۆم خستووە، عوسمانی کوڕی حونەیفم ناردووە بۆ خاکی(سواد) ڕۆژی ڕۆژانەیان بەرخێکە دەی بەشێکی ناوسکی بدە بە عەمماری کوڕی یاسرو بەشی دووەمیشی لە نێوان ئەو سیانە دا دابەشکەن.[2]

حاکم لە(الكني) لە شەعبیەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) وتی: کەسێکم پێ بڵێن تا لەسەر کارێکی موسڵمانان کە لام گرنگە دایبنێم وتیان: عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف، وتی: لاوازە، وتیان: فڵان کەس، وتی: پێویستم پێی

[1] – لە کنز العمال ج١ ص١٤٦ دا واهاتووە.

[2] – لە کنز العمال ج٢ ص٣٢٤ دا واهاتووە، تەبەرانیش هەروا هێناویەتی، بەڵام ئەمەی باس نەکردووە: عوسمانی نارد..... تا کۆتایی، هەیسەمی ج٩ ص٢٩١ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی صەحیحن جگە لە حارس، بەیهەقی ج٩ ص١٣٦ بە دەقێکی دیکە بە دوورو درێژی هێناویەتی.

نیە، وتیان: ئەی کێت دەوێت؟ وتی: کەسێك ئەگەر ئەمیریان بوو وەك یەكێك بێت لەوان و ئەگەریش ئەمیریان نەبێت وەك ئەوە وابێت ئەمیریان بێت، وتیان: دەی تەنها ڕەبیعی کوڕی زیادی حارسی شك دەبەین وابێت، وتی: ڕاست دەکەن.[1]

## (کێ لە ئەمیرایەتی دا ڕزگاری دەبێت)

تەبەرانی لە ئەبو وائیلەوە هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب بیشری کوڕی عاصمی لەسەر صەدەقەی(هەوەزان) دانا، بیشر دواکەوت و عومەر پێی گەیشت، وتی: بۆچی دواکەوتوویت، مەگەر ئێمە گوێگری و گوێڕایەڵیمان بۆ نیە؟ وتی: با بەڵام گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو(من ولي شيئا من امر المسلمين اتي به يوم القيامة حتى يوقف على جسر جهنم فان كان محسنا نجا و ان كان مسيئا انخرق به الجسر فهوى فيه سبعين خريفا) واتە(هەرکەس کارێکی موسڵمانان بگرێتە دەست لە ڕۆژی دواییدا دەهێنرێت تا لەسەر پردێکی دۆزەخ دەوەستێنرێت، ئەگەر چاکەکاربووبێت ڕزگاری دەبێت، ئەگەر خراپەکار بووبێت پردەکە دەیخاتە خوارێ تا ئەوەی حەفتا پاییز بە ناخی دۆزەخدا ڕۆدەچێت) عومەر بە دڵگرانی و خەفەتباری چوویە دەرێ و ئەبوزەر پێی گەیشت و پێی وت: ئەوە چیە وا دڵگران و خەفەتبار دەتبینم؟ وتی: چۆن وانەبم کە بشیری کوڕی عاصم فەرموودەیەکی ئاوای پێغەمبەری(ﷺ) بۆ گێڕامەوە، ئینجا فەرموودەکەی وت، ئەبوزەر وتی: مەگەر ئەوەت لە پێغەمبەر(ﷺ) نەبیست؟ وتی: نەبەخوا، وتی: دەی من شایەتی دەدەم لە پێغەمبەرم(ﷺ) بیست فەرمووی(من ولي احدا من المسلمين اتي به يوم القامة حتى يوقف على جسر جهنم، فان كان محسنا نجان وان كان مسيئا انحرق به الجسر فهوى فيه سبعين خريفا و هي سوداء مظلمة)واتە(هەرکەس بەرپرسی کاری یەکێك لە موسڵمانان بێت ڕۆژی دوایی دەهێنرێت تا لەسەر

[1] – لە کنز العمال ج٣ ص١٦٤ دا واهاتووە.

پردێکی دۆزەخ دەوەستێنرێت.....دۆزەخیش ڕەش و تاریکە) دەی کام لەو دوو فەرمووده ئازای بۆ دڵت زیاترە؟ وتی: هەردووکیان بەس کێ لەوە ڕزگاری دەبێ؟ ئەوبوزەر وتی: هەرکەس لووتی داخاتەخوارو کوڵمی تێکەڵاوی زەوی و خۆڵ بکات(واتە سوجدەی زۆر بێت)ئێمە تەنها خێر دەزانین و کێ دەڵێت ئەگەر کەسێکی نادادپەروەری لەسەر دابنێیت تۆش لە دەست تاوانی ڕزگارت دەبێ[1][2].

## (نکوڵی لەسەر قبوڵکردنی ئەمیرایەتی)

بەزار لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) میقدادی کوڕی ئەسوەدی(رضي الله عنه) لەسەر(حورەید)(شاخ) دانا، کە هاتەوە فەرمووی چۆن بوو؟ وتی: بینیم بەرزدەبوونەوەو دادەهاتنەوە خواری تا ئەوەی وامدەزانی من ئەوە نیم پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(هو ذاك)(ئەوە وایە(ئەوەیە)) میقداد وتی: دەی سوێند بەوەی تۆی بەحەق ناردووە هەرگیز لەمەودوا هیچ کارێك ناگرمە ئەستۆ، دوایی پێیان دەوت: پێشکەوە نوێژمان بۆ بکە، کەچی ئەو ئامادەنەبوو بچێت[3][4].

ئەبونەعیمیش لە الحلية ج١ ص١٧٤ لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) بەهەمان شێوە هێناویەتی،

---

[1] - ضعيف.

[2]- لە لە الترغيب والترهيب ج٣ ص٤٤١ دا واهاتووە، هەیسەمی ج٥ ص٢٠٥ دەڵێت: تەبەرانی گێڕاویەتیەوەو لە سەنەدەکەیدا سوەیدی کوڕی عەبدولعەزیز هەیە کە مەتروکە، تەواو، عەبدولڕەزاق و ئەبونەعیم و ئەبوسەعیدی نەقاش و بەغەوی و دارقوتنیش لە(المنفق) لە ڕێگەی سوەیدەوە هێناویانە، هەروەك لە الاصابە ج١ ص١٥٢ دا هاتووە.

[3] - ضعيف.

[4]- هەیسەمی ج٥ ص٢٠١ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا سواری کوڕی داود ئەبوحەمزە هەیە کە ئەحمەد متمانەی پێ دەدات، ئیبن موعینیش جۆرە لاوازیەکی تێدایە، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە صەحیحن،

لە گێڕانەوەیەکدا دەڵێت: کە بەرزدەکرامەوەو دادەنرام وامدەزانی فەزڵم هەیە بەرامبەریان، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی(هو ذاك فخذ اودع) واتە(وایە دەی یان وەری بگرە یان وازبێنە) وتی: سوێند بەو کەسەی بە حەق تۆی ناردووە هەتاماوم نابم بە ئەمیری دووکەسیش، لە میقدادیشەوە بە کورتی هێناویەتی. تەبەرانی لە میقدادی کوڕی ئەسوەدەوە(ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) ناردمی کە گەڕامەوە پێی فەرمووم چۆن خۆتت دەبینیەوە؟ وتم: هێندە جۆرێ بووم وامدەزانی توانایەکم هەیە ئەی بەخوا تاماوم نابمە ئەمیری دووکەسیش[1][2].

تەبەرانی لە کەسێکەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) کەسێکی کرد بە بەرپرسی سریەیەك، کە چووو گەڕایەوە پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو(کیف وجدت الامارة؟) واتە(ئەمیرایەتیت چۆن دەبینی؟) وتی: وەك زۆری خەڵکەکە وابووم، کە دەکەوتمەڕێ ئەوانیش وایان دەکرد، کە دادەبەزیم ئەوانیش دادەبەزین، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(ان السلطان علی باب عتب الا من عصم الله عزوجل)( سوڵتانو دەسەڵات لەبەر دەرگای گرفتو نارەحەتیدایە مەگەر ئەوەی خوا دەربازی بکات)پیاوەکەش وتی: دەی سوێند بەخوا لەمەودوا بۆ تۆو کەسی تریش ئەمیرایەتی وەرناگرم، پێغەمبەریش(ﷺ) پێکەنی تا ئەوەی دانەکانی پێشەوەی دەرکەوتن[3][4].

---

[1] – ضعیف.

[2] – هەیسەمی ج٥ ص٢٠١ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن جگە لە عومەیری کوڕی ئیسحاق کە ئیبن حەببانو جگە لەویش متمانەی پێ دەدەنو ئیبن موعینو جگە لەویش بە لاوازی دەزانن.

[3] – ضعیف.

[4] – هەیسەمی ج٥ ص٢٠١ دەڵێت: لە سەنەدەکەیدا عەتائی کوڕی سائیب هەیە کە شت تێکەڵ دەکات، کەسەکانی سەنەدەکە جێ متمانەن، تەواو.

ئیبن موبارەك لە ڕافیعی تائیەوە هێناویەتی دەڵێت: لە غەزایەکدا هاودەمی ئەبوبەکر بووم وتم: ئەی ئەبوبەکر وەسیەتم بۆ بکە(ئامۆژگاریم بکە) وتی: لە کاتی خۆیدا نوێژە فەرزەکان بکەو زەکاتی ماڵت بدە تا دەرونت پاك بکەیتەوە، ڕۆژووی ڕەمەزان بگرەو حەجی ماڵی خوا بکە، بزانە کۆچ لە ئیسلامدا باشە، جیهادیش لەناو کۆچدا باشە، مەشبە بە ئەمیر، پاشان وتی: ئەو ئەمیرایەتیەی ئەمڕۆ دەیبینیت ساردە خەریکە بڵاوبێتەوەو زۆر بێت تا ئەوەی نەشیاو وەری دەگرێت، هەرکەس ببێت بە ئەمیر لە هەمووان زیاتر لێپێچینەوەکەی دەخانەیەنێت و سزای توندترە، هەرکەسیش ستەم بکات لە باوەڕداران ئەوا بەڵێنی خوای شکاندووە، چونکە باوڕداران جێ پەناوبەندەی خوان، سوێند بەخوا کەستان دەست بداتە بەرخ یان وشترێکی دراوسێکەی تا ئێسك و لەشی دەئاوسێ دەڵێت: بەرخ یان وشتری دراوسێکەم، ئەوا خوای گەورە لە پێشترە تا بۆ دراوسێکەی تووڕەبێت[1][2].

تەبەرانی لە ڕافیعەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) عەمری کوڕی عاصی بە سوپای زاتوسەلاسیلەوە ناردو لەگەڵیدا لەگەڵ ئەو سوپایەدا ئەبوبەکرو عومەرو دیارانی هاوەڵانی ناردو چوون تا لە هەردوو شاخی(طيء) دابەزین، عومەر(رضي الله عنه) وتی: بزانن کەس هەیە ڕێگەکە بزانێت، وتیان مەگەر تەنها ڕافیعی کوڕی عەمر، چونکە ئەو(ربيل) بووە، منیش پرسیارم لە طارق کرد ربیل چیە؟ وتی: ئەو دزەی بە تەنها هەڵمەت دەباتە سەر کۆمەڵێك و دزی دەکات، ڕافیع وتی: غەزاکەمان بەجێگەیاندو گەیشتمە ئەو شوێنەی پێشتر لێی دەرچووبووین، ئەبوبەکر تێی ڕوانیم و چووم بۆ لای و وتم: ئەی حەڵاڵ خۆر من لە نێو هاوەڵانتدا بۆ تۆ ڕوانیم، دەی شتێکم پێ بڵێ ئەگەر بیپارێزم وەك ئێوەو لە ئێوەبم، وتی: پێنج پەنجەکانت دەپارێزیت؟ وتی: بەڵێ، وتی: شایەتومان بێنەو پێنج نوێژبکەو زەکات بدە ئەگەر

---

[1] – ضعيف.

[2] – كنز العمال ج٣ ص١٦٢.

ماڵ‌وسامانت هەبوو و حەج بکەو ڕۆژووی ڕەمەزان بگرە، دەتوانیت؟ وتم: بەڵێ، دەڵێت ئەمەشی وت: نەبیتە ئەمیری دووکەس وتم مەگەر ئەمیرایەتی بۆ جگە لە ئێوەی بەشداربوانی بەدر هەیە؟ وتی: خەریکە هێندە بڵاوبێتەوە تا بگاتەلای تۆو جگە لە تۆیش، خوای گەورە کە پێغەمبەر(ﷺ) نارد خەڵکی چوونە ناو ئیسلام، هەیانبوو تاهە، ناو و خوا ڕێنمونی کرد، هەبوو لە ترسی شمشێر، ئەوانە لە پەنای خوادان، هەرکەس ئەمیر بوو و ستەمی لەنێو خەڵکدا کردو زیادەی هەندێکیانی بۆ نەداریان وەرنەگرت خوا تۆڵەی لێدەکاتەوە، لە ئێوە دەبێت مەڕێکی دراوسێکەی دەبات‌و لەتاو تووڕەیی دراوسێکەیدا ئێسك‌و لەشی دەئاوسێ، خوا لە پشت دراوسێکەیەوەیەتی، ڕافیع وتی: ساڵێك مامەوە، دواتر ئەبوبەکر بوو بە خەلیفە، چووم بۆ لای‌و وتم: من ڕافیعم کە لە فڵان شوێن لەگەڵت بووم، وتی: دەزانم، وتم: تۆ بە منت دەوت ئەمیرایەتی وەرنەگرم کە چی لەناو ئوممەتی موحەمەدا گەورەترینی ئەوەت گرتە ئەستۆ، وتی: بەڵێ هەرکەس بە قورئان لەگەڵیان نەجووڵێتەوە نەفرینی خوای لێ بێت.[1]

حاکم‌و ئەبونەعیم‌و ئیبن عەساکیر لە سەعیدی کوڕی عومەری کوڕی سەعیدی کوڕی عاصەوە هێناویانە کە مامەکانی(خالیدو ئیبان‌و عومەری کوڕی سەعدی کوڕی عاص) کاتێك هەواڵی مەرگی پێغەمبەریان(ﷺ) بیست لە کارەکانیان گەڕانەوە، ئەبوبەکر وتی: کەس لە کاربەدەستانی پێغەمبەر(ﷺ) شیاوتر نیە بەو کارانە، ئەوانیش وتیان کاربەدەستی بۆ کەس ناکەین، چوون بۆ شام‌و هەموویان کوژران.[2]

ئیبن سەعد لە عەبدولڕەحمانی کوڕی سەعیدی کوڕی یەربووعەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب بە ئیبانی کوڕی سەعیدی وت(کاتێك هات بۆ

[1] – هەیسەمی ج٥ ص٢٠٢ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی جێ متمانەن.

[2] – کنز العمال ج٣ ص١٢٦.

مەدینە): مافت نیە بێیت و بەبێ مۆڵەتی پێشەواکەت کارەکەت بەجێ بهێڵیت، پاشان بەم باروحاڵەوە؟ بەڵام تۆ دڵنیات کردووە، ئیبان وتی: دەی بەخوا من لە دوای پێغەمبەر(ﷺ) کاربەدەستیم بۆ کەس نەکردووە، ئەگەریش بمکردایە بۆ ئەبوبەکرم(رضي الله عنه) دەکرد لەبەر فەزڵ و گەورەیی و پێشینە و دێرینەی موسڵمانبوونی، بەڵام لە دوای پێغەمبەر(ﷺ) کاربەدەستی بۆ کەس ناکەم، ئەبوبەکر(رضي الله عنه) ڕاوێژی بە هاوەڵانی کرد کێ بنێرێت بۆ بەحرەین، عوسمانی کوڕی عەففان(رضي الله عنه) پێی وت: کەسێك بنێرە بۆ ئەوێ کە پێغەمبەر(ﷺ) ناردی، ئەوان دەناسیێ و ئەوانیش دەیناسن، وڵاتیان دەزانێ واتە عەلائی حەزرەمی(رضي الله عنه)، بەڵام عومەر پێی باش نەبوو و وتی: زۆر بکە لە ئیبانی کوڕی سەعدی کوڕی عاص چونکە کەسێك بوو پێچەوانەیان بووە، ئەبوبەکر ئامادەنەبوو زۆری لێ بکات و وتی: واناکەم، زۆرناکەم لە کەسێك کە دەڵێت دوای پێغەمبەر(ﷺ) کاربەدەستی بۆ کەس ناکەم، ئەبوبەکر بڕیاریدا عەلائی کوڕی حەزرەمی بنێرێت بۆ بەحرەین.[1]

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٣٨٠ لە ئەبوهورەیرەوە هێناویەتی کە عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) بانگی کرد تا کاری پێ بسپێرێت، بەڵام ئەو ئامادەنەبوو، عومەر وتی: ڕقتە لە کارێك کە کەسی لەتۆ باشتر داوای کردووە؟ وتی: کێ؟ وتی: یوسفی کوڕی یەعقوب(علیه السلام) ئەبوهورەیرە وتی: یوسف پێغەمبەری خوا بووە کوڕی پێغەمبەری خوا بووە، بەڵام من ئەبوهورەیرەم و کوڕی ئومەیەم و لە سێ و دوو دەترسم، عومەر وتی: دەی با هیچ نەبوایە بتوتایە پێنج؟ وتی: دەترسم بەبێ زانست بڵێم و بەبێ حوکم بڕیاربدەم و پشتم بشکێ و سامانم بڕواو قسە بە پشت وشەرەفم بوترێ.[2]

---

[1] - لە کنز العمال ج٣ ص١٣٣ دا واهاتووە.

[2] - ئەبوموساش لە(الذیل) هێناویەتی، لە الاصابة ج٤ ص٢٤١ دا هاتووە: سەنەدەکەی تەواو لاوازە. بەڵام عەبدولڕەزاق لە عومەر لە ئەیوبەوە هێناویەتی بە بەهێزی، تەواو، ئیبن سەعد ج٤ ص٥٩ لە ئیبن سیرین لە ئەبی هورەیرەوە بەو واتایە لەگەڵ زیادەیەك لە سەرەتاکەیەوە هێناویەتی.

تەبەرانی لە هەردوو موعجەمەکەیدا(الوسیط والکبیر) لە عەبدوڵڵای کوڕی موهبەوە هێناویەتی عوسمان بە ئیبن عومەری وت: بڕۆ لە نێو خەڵکدا دادوەری بکە، وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ڕیم بدەیت نایکەم؟ وتی: نا بڕیارم لەسەر تۆ داوە، ئەگەر نا خۆم دەچم و دادوەریت پێ دەکەم، وتی: پەلە مەکە گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو(من عاذ بالله فقد عاذ بمعاذ) واتە(هەرکەس پەنابەرێتەبەر خوا ئەوا پەنای بردوەتەبەر پەنادەرێك) وتی: بەڵێن وتی: دەی من پەنادەگرم بەخوا لەوەی دادوەربم، وتی: بۆچی وایت لەکاتێکدا باوکت دادوەری دەکرد؟ وتی: من گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو(من کان قاضیا فقضی بجهل کان من اهل النار، ومن کان قاضیا عالما فقضی بحق – او بعدل– سال التقلب کفافا) (هەرکەس دادوەر بێت و بە نەزانی دادوەری بکات لە دۆزەخیانە، هەرکەسیش دادوەر بێت و بە حەق یان دادپەروەری دادوەری بکات ئەوا بەشێوەی کیفاف داوای گەڕانەوە بۆ لای خوا دەکات) دەی نامەوێت دوای ئەوە هیچم بۆ بێت[1].[2] ئەحمەد ئەمەشی بۆ هێناوە: ڕێی پێدا نەیکات و وتی: کەس ناچار ناکەم، تەبەرانی لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی عوسمان ویستی دادوەری بکات بەڵام ئەو ئامادەنەبوو و وتی: گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو(القضاء ثلاثة: واحد ناجح و اثنان في النار، من قضی بالجور او بالهوی هلك، ومن قضی بالحق نجا) واتە(دادوەران سێ جۆرن، یەکێکیان ڕزگاری دەبێ و دوانیان لە دۆزەخدان، هەرکەس بەستەم یان بە ئارەزوو حوکم بدات قوڕبەسەر دەبێن هەرکەسیش بە حەق حوکم بدات ڕزگاری دەبێ).[3]

---

[1] – ضعیف.

[2] – هەیسەمی ج٤ ص١٩٣ دەڵێت: تەبەرانی و بەزارو ئەحمەدیش وەك بەزار بە کورتی هێناویانەو کەسەکانی ئەحمەد جێ متمانەن،

[3] – هەیسەمی ج٤ ص١٩٣ دەڵێت: تەبەرانی لە هەردوو موعجەمەکەیدا(الوسیط والکبیر) هێناویەتی و کەسەکانی سەنەدەکەی معجم الکبیر جێ متمانەن، ئەبویەعلاش بەوشێوەیە

تەبەرانی لە المعجم الكبير لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی کە لە ڕۆژی کۆبوونەوەی عەلی و موعاویە لە دەومەتولجەندەل دایکی باوەڕداران(حەفسە) پێی وتم(بە ئیبن عومەر): جوان نیە لە ڕێککەوتنێك دوابکەویت کە خوا ئاشتی نێوان ئوممەتی پێغەمبەری(ﷺ) پێ دەکات، تۆ خزمی پێغەمبەر(ﷺ) و کوڕی عومەری کوڕی خەتتابیت، ئەو ڕۆژ موعاویە وشترێکی گەورەی هێنابوو، وتی: کێ حەزی بەوکارەیەو ئاواتەخوازیەتی یان ملی بۆ درێژ دەکات؟ ئیبن عومەر وتی: پێش ئەو ڕۆژ هیچکات دڵم بۆ دونیا لێی نەدەدا بڕیارمدا بچم و بڵێم: کەسێك کە دای لە تۆو باوکیشت لەسەر ئیسلام تا ئێوەی هێنایە ناو ئیسلام چاوی لێیە، دوایی بیرم کردەوە لە بەهەشت و خۆشیەکانی، بۆیە وازم لێ هێنا و نەچووم، هەیسەمی ج٤ ص٢٠٨ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە جێ متمانەن، وادیارە مەبەستی ڕێککەوتنی حەسەنی کوڕی عەلی(ﷺ) بێت و گێڕەرەوە لێی تێکچووبێت، تەواو.[1] هەروەها لە ئەبی حوصەینەوە هێناویەتی موعاویە وتی: کێ لە ئێمە شیاوترە بەم کارە؟ عەبدوڵڵای کوڕی عومەر وتی: ویستم بڵێم: لە تۆ شیاوتر ئەوەیە لەسەر ئیسلام دای لەتۆو باوکت، پاشان بیری خۆشیەکانی بەهەشتم کردەوەو ترسام ئەوە خراپەی لێبکەوێتەوە، زوهریە دەڵێت: کە لەسەر موعاویە یەکدەنگ بوون هەستا و وتی: کێ لە من شیاوترە بەم کارە؟ ئیبن عومەر وتی: خۆم ئامادەکرد تا هەستم و بڵێ: ئەو کەسەی لەسەر ئیسلام دای لە تۆو باوکت شیاوترە بەوە، بەڵام ترسام گومانی ترم پێ ببات.

ئەحمەد لە عەبدوڵڵای کوڕی صامتەوە(ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: زیاد ویستی عیمرانی کوڕی حوصەین بنێرێت بۆ خوراسان، بەڵام ئەو ئامادە نەبوو، هاوەڵانی

---

هێناویەتی، تەواو. سەعدیش ج٤ ص١٠٨ لە عەبدوڵڵای کوڕی مەوهەبەوە بەو واتایەو بە دوورو درێژی هێناویەتی.

[1] – ئیبن سەعد ج٤ ص١٣٤ لە ئیبن عومەرەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی،

پێیان وت خوراسانت بەجێهێشت کە لەسەری بێت؟ وتی: بەخوا من حەزناکەم گەرمای بۆ من‌و سەرماکەی بۆ ئەوان بێت، دەترسم کەچوومەناو دوژمنەوە نامەی زیادم بۆ بێت، ئەگەر بچم قوڕبەسەربم، ئەگەریش بگەڕێمەوە بدرێت لە ملم، دەڵێت: حەکەمی کوڕی عەمری غیفاری ویستی بچێتە سەر خوراسان‌و ملکەچی فەرمانی بوو، عیمران وتی: کەس نیە حەکەمم بۆ بانگ بکات؟ یەکێك چوو و حەکەم هات بۆ لای، عیمران پێی وت: ئایا گوێت لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو(لا طاعة لاحد في معصية الله تبارك وتعالى؟) واتە(لە گوێڕایەڵی کردنی خوادا گوێڕایەڵی بۆ کەس نیە)[1] وتی: بەڵێ، عیمران وتی: سوپاس بۆ خوا، یان وتی(الله اكبر) لە گێڕانەوەیەکیش لە حەسەنەوە کە زیاد حەکەمی غیفاری لەسەر سوپایەك دانا، عیمرانی کوڕی حوصەین هات بۆ لای‌و لەناو خەڵکدا پێی گەیشت‌و پێی وت: دەزانیت بۆ چی هاتووم بۆ لات؟ وتی: بۆچی؟ وتی: بیری فەرمایشتی پێغەمبەرم(ﷺ) کەوتەوە کە بەو پیاوەی وت کە ئەمیرەکەی پێی وت: خۆت بخەرە ناو ئاگر ئەویش وایکرد بەڵام نەیهێشت، ئەم هەواڵە وترا بە پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش فەرمووی(لو وقع فيها ادخلا النار جميعا لا طاعة في معصية الله تبارك وتعالى)واتە(ئەگەر بکەوتایەتە ناوی هەردووکیان دەچوونە دۆزەخ،لەسەرکەشی خوادا هیچ گوێڕایەڵیەك نیە). وتی: بەڵێ، وتی: تەنها ویستم ئەو فەرموودەت بیربخەمەوە.[2]



[1] - صحيح.

[2]- هەیسەمی ج٥ ص٢٦٦ دەڵێت: ئەحمەد بە چەند دەقێك هێناویەتی تەبەرانی بە کورتی هێناویەتی، کەسەکانی سەنەدەکەی ئەحمەد صەحیحن. تەواو.

## (ڕێزگرتنی خەلیفەو ئەمیرەکان و گوێڕایەڵی فەرمانەکانیان)

ئیبن جەریرو ئیبن عەساکیر لە ئیبن عەبباسەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) خالیدی کوڕی وەلیدی کوڕی موغەیرەی مەخزومی بە سریەیەکەوە نارد و لەگەڵیدا لەناو سریەکەدا عەمماری کوڕی یاسر هەبوو، چوون تا نزیکی ئەو خەڵکە بوونەوە ئەوەی دەیانویست بگەنە لایان، لە درەنگێکی شەودا دابەزین، بێدارکەرەوە هاتەلای خەڵکەکەو بێداری کردنەوەو ئەوانیش ڕایانکرد تا توانییان چوون و یەکێکیان کە خۆی و ژن و منداڵی موسڵمان ببوون مایەوەو بە ماڵەوەی وت خۆت کۆبکەرەوەو وتی: بوەستن تا دێمەوەلاتان. پاشان هات بۆ لای عەمماری کوڕی یاسرو تی: ئەی ئەبولیەقزان من بە ژن و منداڵم موسڵمان بووین، ئەوە سوودم پێ دەگەیەنێ ئەگەر لەناو هۆزەکەمدا بمێنمەوە کە ڕایانکردووە بۆ ئەو شوێنەی ئێوە بیستووتانە؟ عەممار پێی وت: دەی لەوێ بە تۆ پارێزراویت، کابراش لەگەڵ ژن و منداڵیدا گەڕایەوە، بۆ بەیانی خالید سەیری کرد هەموو چوون، ئەو کابراو ژن و منداڵەکەی گرت، عەممار پێی وت نابێ دەست لەو کەسە بدەیت ئەو موسڵمان بووە؟ وتی: تۆ هەقت چیە بەسەریەوە؟ من ئەمیرم و کەچی تۆ پەنای دەدەیت لە ڕوومدا؟ وتی: بەڵێ وایە، کابرا بڕوای هێناوە، ئەگەربیویستایە وەك هاوڕێکانی دەچوو، بەڵام من وتم لەبەر موسڵمانبوونەکەی بمێنێتەوە، خالیدو عەممار کەوتنە دەمەقاڵێ و گەیشتنە قسەوتن بەیەك، کە هاتنە مەدینە هاتنە خزمەت پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، عەممار باسی باری کابرای بۆ کرد، پێغەمبەریش(صلى الله عليه وسلم) مۆڵەتەکەی بەڕەوازانی و ئەوڕۆژ دوورەپەرێزی کرد کەس بەرامبەر ئەمیر پەنای کەس بدات، لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کەوتنە دەمەقاڵێ، خالید وتی: ئەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەم کابرا لەبەردەم تۆدا قسەم پێ دەڵێت؟ سوێند بەخوا ئەگەر تۆ نەبوویتایە قسەی پێ نەدەوتم، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(کف یا خالد عن عمار فانه من یبغض عمارا یبغضه الله عزوجل، ومن یلعن عمارا یلعنه الله عزوجل) واتە(خالید دەست هەڵگرە

لە عەممار، چونکە هەرکەس عەممار بتۆرێنێ خوا دەیتۆرێنێ، هەرکەس نەفرین بکات لە عەممار خوا نەفرینی لێ دەکات) پاشان عەممار هەستاو چوو و خالیدی کوڕی وەلیدیش کەوتە شوێنی تا کراسەکە گرتو بەردەوام هەوڵی دەدا ڕازی بکات تا ئەوەی خوا لێی ڕازی بوو، لە گێڕانەوەیەکی تردا تا لێی ڕازی بوو و ئەم ئایەتە دابەزی(و اطیعوا الله واطیعوا الرسول واولي الامر منکم) سەرکردەکانی سریەکان(فان تنازعتم في شيئ فردوه الى الله والرسول) تا خوای گەورەو پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) حوکمی تێدا بدەن(ذالك خير واحسن تاويلا) واتە چاکترین سەرەنجامی دەبێت[1].[2]

ئەحمەد لە عەوف کوڕی مالیکی ئەشجەعیەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ ئەوانەی لەگەڵ زەیدی کوڕی حارسە لە شەڕی موئتە چوون منیش چووم، یەکێکی یەمەنی لەگەڵم بوو کە تەنها شمشێرەکەی پێ بوو یەکێك لە موسڵمانان ئاژەڵی سەربڕی، کابرای یەمەنی داوای پارچەیەکی پێستەکەی لێکرد، ئەویش پێیداو ئەویش وەك قەڵغان بەکاری هێنا، چووینو گەیشتین بە سوپای ڕۆمو تیایدا پیاوێك لەسەر ئەسپ بوو پڕ زکاڵو زیرینێکی زێڕو چەکێکی زێڕینی پێبوو، ڕۆمیەکە موسڵمانانی ڕاوەدوودەنا، کابرای یەمەنی لە پشت بەردێکەوە قەرەوڵی بۆ گرتو ڕۆمیەکە دای بە پاڵیداو ئەویش پێی ئەسپەکەی بڕی و ڕۆمیەکەش کەوتە خوارەوەو موسڵمانەکە چوویە سەریو کوشتیو ئەسپو چەکەکەی برد، کە خوا

---

[1] - صحیح.

[2]- لە کنز العمال ج١ ص٢٤٢ دا هاتووە، ئەبویەعلاو ئیبن عەساکیرو نەسائیو تەبەرانیو حاکم لە فەرموودەکەی خالیدەوە بەو واتایە بە دوورو درێژیو ئیبن شەیبەو ئەحمەدو نەسائی بە کورتی هێناویانە، لە کنز العمال ج٧ ص٧٣ دا هاتووە، حاکم المستدرك ج٣ ص٣٩٠ دەڵێت: سەنەدەکەی صەحیحەو بوخاریو موسلیم نەیانهێناوە، زەهەبی دەڵێت صەحیحە، هەیسەمی ج٩ ص٢٩٤ دەڵێت: تەبەرانی بە دوورو درێژی هێناویەتی، کورتەیەکیشی هێناوە کە لەگەڵ ئەوەی ئەحمەد یەکە، کەسەکانی سەنەدەکەی جێ متمانەن.

فەتحی دا بە موسڵمانان خالیدی کوڕی وەلید کەسێکی نارد تا دەستکەوتەکان کۆ بکەنەوە. چووم بۆ لای و وتم: ئەی خالید دەزانیت پێغەمبەر(ﷺ) دەستکەوتی بۆ جەنگاوەر داناوە؟ وتی: بەڵێ بەڵام من بە زۆری دەزانم، منیش پێم وت بەخوا یان بۆی دەگێڕمەوە یان لای پێغەمبەر(ﷺ) باسی دەکەم، ئەویش ئامادەنەبوو بۆی بگێڕێتەوە، عەوف دەڵێت: چووینە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)و باسەکەم بۆ گێڕایەوە کە کابرای یەمەنی چۆن بووەو خالید چی کردووە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(یا خالد ما حملك علی ما صنعت؟) واتە(خالید چی وای لێکردیت وابکەیت؟) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا بە زۆرم زانی بۆی، فەرمووی(خالید چیت لێ سەندووە بۆی بگێڕەوە) عەوف وتی: خالید ڕاوەستە نەموت ئۆف بۆ تۆ؟ پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی(ئەوە چیە؟) منیش بۆم باسکرد. پێغەمبەریش(ﷺ) تووڕەبوو و فەرمووی(یا خالد لا ترد علیه هل انتم تارکو امرائي؟ لکم صفوة امرهم وعلیهم کدره).[1] ( ئەی خالید بۆی مەگێڕەوە، ئایا ئێوە واز لە ئەمیرەکانم دێنن؟ چاکەی کاریان بۆ ئێوەو خراپەکەشی بۆ خۆیان).

ئیبن سەعد ج٣ ص٢٠٦ لە ڕاشدی کوڕی سەعدەوە هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) پارەو سامانێکی بۆ هێنراو ئەویش لە نێو خەڵکەکەدا دابەشی دەکرد، ئەوانیش قەرەباڵغییان لە دەوور کرد، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص هاتو خەڵکەکەی لادەدا تا گەیشتەلای و عومەر بەرزی ڕاگرتو وتی: تۆ هاتیتو لە سوڵتانی خوا لەسەر زەویدا نەترسایت، حەزم کرد پێت بڵێم سوڵتانی خوا هەرگیز ناترسێت.

بەیهەقی ج٩ ص٤١ لە عەبدوڵڵای کوڕی یەزیدەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) عەمری کوڕی عاصی لە سریەیەکدا نارد کە ئەبوبەکرو عومەری تێدابوو، کە گەیشتنە

---

[1]- موسلیم گێڕاویەتیەوەو ئەبوداودیش هەروا، لە البدایة والنهایة ج٤ ص٢٤٩ یشدا هاتووەو بەیهەقیش ج٦ ص٣١٠ بەهەمان شێوە هێناویەتی.

شـوێنی شـەڕەکە عـەمر فـەرمانی پێکـردن ئـاگر نەکەنـەوە، عومـەر تووڕەبـوو و ویـستی وابکات، بەڵام ئەبوبەکر ڕێی لێگرت و پێی وت کە پێغەمبەر(ﷺ) زانیویەتی شارەزای شەڕە بۆیە بە بەرپرسی تۆ داینـاوە، عومەریش هێوربوویـەوە.[1] حاکم ج٣ ص٢٩٠ لە جوبەریری کوڕی تفیلەوە هێناویەتی کە عیاضی کوڕی غەنەمی ئەشعەری هاوەڵی دارای گرت و کاتێك ئەویْ فـەتح کرا، هیشامی کوڕی حەکیم هات بۆ لای و لێی تووڕەبوو و هیشام چەند شەوێك مایەوە، ئینجا هیشام هات بۆ پۆزش هێنانەوە،بە عیاضی وت: مەگەر نازانیت پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێت(ان اشد الناس عذابا یوم القیامة اشد الناس عذابا للناس في الدنیا) واتە(زیاترین و توندترین سزای ڕۆژی دوایی بۆ ئەاونەیە کە لە دونیادا زیاتر خەڵکیان سزاداوە). عیاض پێی وت: ئەی هیشام ئێمە ئەوەمان بیستووە و بینیوە کە تۆ بیستووتە و بینیوتە، هاودەمی ئەوە بوون کە تۆ هاودەمی بوویت، ئەی هیشام مەگەر تۆ گوێت لێنەبوو پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو(من كانت عنده نصیحة لذي سلطان فلا یكلمه بها علانیة، ولیاخذ بیده و لیخیل به فان قبلها قبلها ولا كان قد ادی الذي علیه والذي له) واتە(هەرکەس ئامۆژگاریەکی بۆ خاوەن دەسەڵاتیْ هەیە با بە ئاشکرا پێی نەڵێت و دەستی بگریْ و بیباتە کەنارو چۆڵەوانیەك و پێی بڵیْ، ئەگەر قبووڵی کرد و وەریگرت باشە، ئەگەرنا ئەوەی لەسەریەتی و ئەوەی بۆیەتی بەجێی گەیاندووە) هیشام تۆ دلێری و نەترسی کەوا دەکەیت، بریا دەترسایت سوڵتانی خوا بتکوژێت بەوە دەبیتە کوژراوی دسەڵاتی خوا چ دەبیْ؟[2].[3]

---

[1] – حاکم المستدرك ج٣ ص٤٢ لە عەبدوڵڵای کوڕی بورەیدە لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) عەمری کوڕی عاصی لە شەڕی زاتولسەلاسیلدا نارد، ئینجا بە هەمان شێوە دەیهێنێت و دەڵێت: ئەم فەرموودە سەنەدەکەی صەحیحە و بوخاری و موسلیم نەیانهێناوە و رەهەبیش دەڵێت صەحیحە.

[2] – صحیح.

[3] – حاکم دەڵیْ: ئەم فەرموودە سەنەدەکەی صەحیحە و بوخاری و موسلیم نەیانهێناوە و زەهەبیش دەڵێت: لە سەنەدەکەیدا ئیبن زورەیق هەیە، بەیهەقی ج٨ ص١٦٤ بەو سەندە وەك ئەو هێناویەتی، لە مجمع الزوائد ج٥ ص٢٢٩ بەبیْ باسی دەرچوونکەی هێناویەتی و دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی جیْ متمانەن و سەنەدەکەی موتەسیلە ئەحمەد لە شورەیحی کوڕی

بەزار لە زەیدی کوڕی وەهبەوە هێناویەتی دەڵێت: لە سەردەمی حوزەیفەدا خەڵکی لە شتێکی ئەمرێك بێزاربوون، یەکێك لە مزگەوتەوە هات، مزگەوتی گەورە کە خەڵکی تێدابوو، تا گەیشتەلای حوزەیفە کە لەناو کۆڕێکدا دانیشتبوو، لەسەر سەری ڕاوەستاو وتی: ئەی هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) ئایا فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە ناکەیت؟ حوزەیفەش سەری بەرزکردەوەو زانی چی دەوێت و حوزەیفە پێی وت: فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە چاکەو سوونەت نیە چەك لە ڕووی ئەمیرتدا هەڵبکێشیت.[1]

بەیهەقی ج٨ ص١٦٣ لە زیادی کوڕی کسیبی عەدویەوە هێناویەتی دەڵێت: عەبدوڵڵای کوڕی عامر وتاری بۆ خەڵك دەداو جلێکی جوانی لەبەربوو و قژی شانەکردبوو، ڕۆژێکیان نوێژی کرد بۆ خەڵك و دواتر چوویە ژوور، ئەبوبەکر لە پاڵ مینبەرەکەدا دانیشتبوو، میرداس ئەو بیلال وتی: سەیری گەورەو ئەمیر ناکەن جلی جوان دەپۆشێ و خۆی دەچوێنێ بە فاسقان؟ ئەبوبەکر بیستی و بە ئوصەیلعی کوڕی وت ئەبوبیلالم بۆ بانگ بگە، ئەویش بانگی کرد، ئەبوبەکر وتی: بیستم وات وت بە ئەمیر، من گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو(من اكرم السلطان الله اكرمه الله، ومن اهان سلطان الله اهان الله) واتە(هەرکەس ڕێزی سوڵتانی خوا بگرێ خوا ڕێزی لێ دەگرێت، هەرکەسیش سووکایەتی بە سوڵتانی خوا بکات خوا سووکایەتی پێدەکات).[2]

---

عوبەیدەوەو جگە لەویشەوە هێناویەتی و دەڵێت: عیاض کە فەتحی ئەوێ کرا جەڵدی دا لە هاوەڵی دارا، هیشامیش لێی تووڕەبوو، فەرموودەکە دێنێت، هەیسەمی ج٥ ص٢٢٩ دەڵێت: کەسەکانی جێ متمانەن بەڵام من بیستم بۆ سورەیح لە عیاض و هیشامەوە نەیبیستووە هەرچەندە تابعی بووە.

[1]- هەیسەمی ج٥ ص٢٢٤ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا حەبیبی کوڕی خالید هەیە کە ئیبن جیببان متمانەی پێدەدات و ئەبوحاتەم دەڵێت: بەهێز نیە، تەواو.

[2] – ضعیف.

بوخاری و موسلیم لە عەلی کوڕی ئەبوتالیبەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) یەکێك لە پشتیوانانی لەسەر سریەیەك دانا و ناردنی و فەرمانی پێکردن گوێگرو گوێڕایەڵی ئەو ئەمیرەیان بن، ئەوانیش لەسەر شتێك تووڕەیان کردو ئەویش وتی دارو چیلکەم بۆ کۆبکەنەوە، کۆیانکردەوە، وتی: ئاگرم بۆ بکەنەوە، کردیانەوە، وتی: مەگەر پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێنەکردن گوێگرو گوێڕایەڵم بن؟ وتیان: با وتی: دەی بچنە ناوی، ئەوانیش سەیری یەکتریان کردو وتیان: ئێمە لە دەست ئاگر ڕامانکردووە بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) کە تووڕەییەکەی نەما و ئاگرەکە کوژایەوە دوایی هاتنەوەلای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) باسی ئەوەیان بۆ کرد، ئەویش فەرمووی(لو دخلوها ما خرجوا منها، انما الطاعة في المعروف)(ئەگەر بچوونایەتە ناوی نەدەهاتنە دەرێ، گوێڕایەڵی تەنها لە چاکەو دروستیدایە).[1]

ئەبویەعلاو ئیبن عەساکیر – کەسەکانی سەنەدەکەی جێ متمانەن– لە ئیبن عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویانە کە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ دەستەیەکی هاوەڵانیدا بوو، ڕووی تێکردن و فەرمووی(الستم تلعمون انی رسول الله اليكم) واتە(مەگەر ئێوە نازانن من پێغەمبەرو نێردراوی خوام بۆ لای ئێوە؟) وتیان بەڵێ شایەتی دەدەین تۆ پێغەمبەری خوایت، فەرمووی(مەگەر نازانن هەرکەس گوێڕایەڵی من بێت ئەوا گوێڕایەڵی خوایە، لە گوێڕایەڵی خواش ئەوەیە گوێڕایەڵی من بن؟) وتیان بەڵێ شایەتی دەدەین هەرکەس گوێڕایەڵت بێت گوێڕایەڵی خوایە، لە گوێڕایەڵی خوای گەورەش ئەوەیە گوێڕایەڵی تۆ بین، فەرمووی(فان من طاعة الله ان تطيعوني ومن طاعتي ان تطيعوا امرائكم، وان صلوا قعودا فصلوا قعودا) واتە(دەی لە گوێڕایەڵی

[1] – ئەم چیرۆکە لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا لە ئیبن عەبباسەوە(رضي الله عنه) هاتووەو چەسپاوە، لە البداية والنهاية ج٤ ص٢٢٦ دا واهاتووەو ئیبن جەریریش لە ئیبن عەبباس و ئیبن ئەبی شەیبە لە ئەبی سەعیدەوە بەو واتایە هێناویانە ئەبو سەعید ناوی پیاوە ئەنساریەکە دێنێت کە عەبدوڵڵای کوڕی حوزافەی سەهمی بووە، لە كنز العمال ج٣ ص١٧٠ یشدا واهاتووە، بوخاریش لە ئیبن عەبباسەوە هەمان ناوی هێناوە، لە الاصابه ج٢ ص٢٩٦ یشدا واهاتووە.

خـوا ئەوەیـە گوێڕایـەڵی مـن بـن، لـە گوێڕایـەڵی منـیش ئەوەیـە گوێڕایـەڵی سـەرکردەکانتان بن ئەگـەریش بە دانیشتنەوە نوێـژیان کـرد ئێـوەش بەدانیشتنەوە نوێژبکەن)[1][2].

ئیبن جەریر لە ئەسمائی کچی یەزیدەوە هێناویەتی ئەبوزەڕی غەفاری(رضي الله عنه) خزمەتی پێغەمبەری دەکرد، کە لە خزمەتی ئەو دەبوویەوە دەچوو بۆ مزگـەوت، ئـەوێ مـاڵی بـوو و لـەوێ ڕادەکشا، شـەوێك پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) چـوو بـۆ مزگـەوت و ئەبوزەری بینی لـە مزگـەوت خـەوتووە، پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) بـە قاچـی لێیـدا تـا لەسـەرپێ هەسـتا، پێغەمبـەر(صلى الله عليه وسلم) پێـی فەرموو(ئەوە چیە دەتبینم لێرە خەوتوویت؟) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لـە کـوێ بخـەوم؟ جگە لێرە هیچ ماڵو حاڵێکم نیە، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لای دانیشتو فـەرمووی(فكيـف انـت اذا اخرجـوك منـه؟) واتـە(ئەی چـی دەکـەیت ئەگـەر لێـرە دەریانکردیـت؟) وتـی: دەی ئـەوکات دەچم بۆ شام، چونکە شام خاکی کۆچو حەشـرو پێغەمبەرانەو دەبمـە یەکێك لـە خـەڵکی ئەوێ، فەرمووی(ئەی چی دەکەیت ئەگەر لەوێیش دەریانکردیت؟) وتی: دەی دەگەڕێمەوە بۆ مزگەوتو ئێرە دەبێتەوە بە شوێنم، فەرمووی(ئەگەر دووبارە لێرە دەریانکردیتەوە چی دەکەیت؟) وتی: شمشێرەکەم هەڵدەگرمو شەڕدەکەم تا دەکوژرێم، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دانی لێ جیڕکردەوەو دەستی لەسەر دانا و فـەرمووی(ادلك علـى مـا هـو خير من ذالك؟) واتـە(لـەوە باشترت پێ بڵێم؟) وتـی: بـەڵێ بە دایكو باوکمـەوە بـە قوربانـت بم ئـەی پێغەمبـەری خـوا، پێغەمبەری خوایش(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(تنقاد لهم حيث قادوك وتنساق لهم حيث ساقوك حتى تلقاني وانت على ذالك) واتە(ملکەچیان بیت بەرەو چییان بردیتو بەرەو کوێـت دەبـەن شوێنیان کەویت تا دەگەیتەوە بەمن لەو بارەدابیت)[3][4].

---

[1] – حسن.

[2] – لە كنز العمال ج٣ ص١٦٨ دا واهاتووە.

[3] – ضعیف.

[4] – لـە كنـز العمـال ج٣ ص١٦٨ دا واهـاتووە، ئەحمـەدیش لـە ئەسمائـەوە بـەوجۆرە هێناویـەتی، هەیـسەمی ج٥ ص٢٢٣ دەڵێـت: لـە سـەنەدەکەیدا شـەهری کـوڕی حەوشـەب هەیـە کـە لاوازە متمانەی پێ دراوە، تەواو.

هەروەها ئیبن جەریری تەبەری لە ئەبوزەرەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی و لە فەرموودەکەیدا هاتووە:(فكيف تصنع اذا اخرجت منها؟) واتە(چی دەکەیت ئەگەر لێی دەرکرایت؟) وتم: شمشێرەکەم هەڵدەگرم و دەکەومە لێدانی ئەوەی دەرمدەکات، پێغەمبەر(ﷺ) بە دەستی دای بەسەر شانمداو فەرمووی(غفرا يا اباذر تنقاد معهم حيث قادوك و تنساق معهم حيث ساقوك ولو لعبد اسود) کاتێك لە ڕەبزە دابەزیم نوێژکراو پیاوێکی ڕەش پێشکەوت، کە منی بینی گەڕایەوە تا من پێش بخات، وتم: پێشکەوە بەڵو ملکەچی فەرمانی پێغەمبەری خوام.

عەبدولڕەزاقیش لە تاوسەوە هێناویەتی و لە فەرموودەکەیدا هاتووە کە ئەبوزەر چوو بۆ ڕەبزە لەوێ غوڵامێکی عوسمانی بینی کە ڕەش بوو، بانگدراو نوێژکرا، وتی: ئەبوزەر پێشکەوە، وتی: نا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکردووم تا گوێگرو گوێڕایەڵ بم تەنانەت ئەگەر بۆ بەندەیەکی ڕەش بێت، ئەویش پێشکەوت و ئەبوزەریش لە دوایەوە نوێژی کرد،[1] ئیبن ئەبی شەیبە و ئیبن جەریرو بەیهەقی و نەعیمی کوڕی حمادو جگە لەویش لە عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویانە کە دەڵێت: گوێگرو گوێڕایەڵ بە ئەگەر سەرکردەکەشت کۆیلەیەکی ڕووتەڵی حەبەشی بوو، ئەگەر زیانی پێ گەیاندیت خۆڕاگربە ئەگەریش فەرمانێکی پێ کردیت بەجێی بگەیەنە، ئەگەر لێی گرتیتەوە خۆڕاگربە، ئەگەریش ستەمی لێکردیت خۆڕاگربە، ئەگەر ویستی لە ئایینت کەمبکاتەوە بڵێ خوێنم لە بری ئایینم و لە کۆمەڵی موسڵمانان جیامەبەرەوە، لە كنز العمال ج٣ ص١٦٧ دا واهاتووە.

یەعقوبی کوڕی سوفیان بە سەنەدی صەحیح لە حەسەنەوە هێناویەتی عومەر(رضي الله عنه) لە تاریکی شەودا گەیشت بە عەلقەمەی کوڕی عولاسە، عومەر لە خالیدی کوڕی وەلید دەچوو، عەلقەمە پێ وت: ئەی خالید ئەو کابرا لایبردیت تەنها ڕژدی وایکرد، من و ئامۆزایەکم هاتووین بۆ لای داوای شتێکی لێبکەین، ئەگەر بۆی کردم هەرگیز داوای

[1] – لە كنز العمال ج٣ ص١٦٨ دا واهاتووە،

هیچی لێ ناکەم، عومەر پێی وت دەی بیڵێ چیت لایە؟ وتی: ئەوانە خەڵکانێکن مافیان لەسەرمانەو دەبێ مافیان بدەینەوەو پاداشتمان لای خوایە، کە بەیانی بوویەوە عومەر بە خالیدی وت: ئەمشەر عەلقەمە چی پێ وتیت؟ وتی: بەخوا هیچی پێ نەوتم، دەڵێت ئەویش سوێندی خوارد. لە ڕێگەی ئەبی نەزرەشەوە بە هەمان شێوە هاتووەو ئەوەشی بۆ زیاد دەکات: عەلقەمە بە خالیدی دەوت بەسە خالید، سەیف لە عەمرەوە لە لایەکی دیکەوە لە حەسەنەوە هێناویەتی و ئەوەشی لە کۆتاییەوە بۆ زیاد دەکات: عومەر وتی: هەردووکیان ڕاستیان وت، ئیبن عائیزیش هەروا هێناویەتی و ئەوەی بۆ زیاد کردووە، مۆڵەتی عەلقەمەی داو پێویستیەکەی بەجێگەیاند، زوبەیری کوڕی بەکار لە موحەمەدی کوڕی سەلەمە لە مالیکەوە بە هەمان شێوە زۆر بە کورتی هێناویەتی و دەڵێت: لە فەرموودەکەدا هاتووە وتی: چیت لایە؟ وتی: تەنها گوێگری و گوێڕایەڵی ئەوەش زیاد دەکات عومەر(ﷺ) وتی: ئەگەر لە پشتمەوە هاوشێوەی ڕای تۆی بێت ئەوەم پێ خۆشترە لەوەو ئەوە،[1]

مالیك لە ئیبن ئەبی مولەیکەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب(ﷺ) دای بە پاڵ ئافرەتێکی تووشبووی گولیدا کە تەواف کەعبەی دەکرد بە ئافرەتەکەی وت: ئەی بەندەی خوا ئازاری خەڵك مەدە چاکتر وایە لەماڵەوە بوویتایە ئەویش دانیشت، دوای ئەوە کەسێك دای بە پاڵیداو وتی: ئەو کەسەی ڕێی لێدەگرتیت مرد دەی بڕۆ، ئافرەتەکەش وتی: ناکرێ کە زیندووبوو گوێڕایەڵی بموو کە مرد لێی یاخی بم، لە کنز العمال ج٥ ص١٩٢ دا واهاتووە، ئیبن ئەبی شەیبە لە شمر لە پیاوێکەوە هێناویەتی دەڵێت: من لە سەردەمی عەلیدا(ﷺ)(عەریف بووم)،[2] فەرمانێکی پێ کردین و وتی: ئەوەی پێم وتن کردتان؟ وتمان: نا، وتی: سوێند بەخوا یان دەیکەن یان جوولەکەو مەسیحی سوار پشتەملتان دەبن.[3]

---

[1] – لە الاصابة ج٢ ص٥٠٤ دا واهاتووە.

[2] عەریف ئەو کەسەیە کاروباری هۆز یان کۆمەڵێکی خەڵك ڕادەپەڕێنێ و ئەمیر لەوەوە کاروبارو حاڵی ئەوانە دەزانێت.

[3] – لە کنز العمال ج٣ ص١٦٧ دا واهاتووە.

# (گونجانی سەرکردەکان)

بەیهەقی لە عروەی کوڕی زوبەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) عەمری کوڕی عاصی نارد بۆ زاتولسەلاسیل لە دەوروبەرەکانی شام لە بللی و عەبدوڵڵاو هاودەمانیان لە قوضاعەوە، بەنوبللی خاڵوانی عاصی کوڕی وائیل بوون، کە گەیشتە ئەویٚ لە زۆری دوژمنی ترساو هەواڵی نارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ)و داوای ناردنی یارمەتی لێکرد، پێغەمبەریش(ﷺ) کۆچەرانی یەکەمی ڕاسپارد، ئەبوبەکرو عومەری لەگەڵ دیارانی کۆچەراندا ناردو ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەراحی کردە سەرکردەیان، کە گەیشتنە لای عەمر وتی: من ئەمیری ئێوەمو من هەواڵم نارد بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و داوای یارمەتیم لێکرد، کۆچەران وتیان بەڵکو تۆ ئەمیری هاوەڵانی خۆت و ئەبوعوبەیدە ئەمیری کۆچەرانە، عەمر وتی: ئێوە بۆ یارمەتی من نێردراون، کە ئەبوعوبەیدە ئەوەی بینی - کەسێکی ئاکار جوان و نەرمونیان بوو- وتی: عەمر تۆ دەزانیت کۆتاشت کە پێغەمبەر(ﷺ) پێی ڕاسپاردم ئەوەبوو فەرمووی ئەگەر گەیشتیتە لای هاوەڵەکەت پێکەوە بگونجێن، ئەگەر تۆ لە من یاخی بیت بەدڵنیاییەوە من ملکەچی تۆ دەبم، ئەبوعوبەیدە ئەمیرایەتی دایە دەست عەمری کوڕی عاص[1][2].

هەروەها زوهریەوە هێناویەتی کە پێغەمبەر(ﷺ) دوو دەستەی نارد بۆ هۆزەکانی کەلب و غەسان و ئەو بێباوەڕانەی عەرەب کە لە ڕۆژهەڵاتی شام بوون و لەسەر یەك لە دەستەکان ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەراح و لەسەرئەوی دیکەش عەمری کوڕی عاصی دانا، لە دەستەی ئەبوعوبەیدەدا عومەرو ئەبوبەکری تێدابوو، کە ویستیان دەربچن پێغەمبەر(ﷺ) ئەبوعوبەیدەو عەمری بانگکردو فەرمووی(لا

---

[1] - ضعیف.

[2] - لە البداية والنهاية ج٥ ص٣٦٠ دا واهاتووەو تیایدا لە جیاتی ناوچەو دەوروبەر ڕۆژهەڵاتی شام هاتووە.

تعصيا) واتە(سەرکەش و یاخی مەبن) کە لە مەدینە دەرچوون ئەبوعوبەیدە بە تەنیا عەمری دواندو پێ وت: پێغەمبەر(ﷺ) من و تۆی ڕاسپارد تا یاخی نەبین، یان تۆ ملکەچم بە یان من، وتی: نا تۆ ملکەچ و گوێڕایەڵم بە، ئەبوعوبەیدە ڕازی بوو، عەمر ئەمیری هەردوو دەستەکە بوو، عومەر(رضي الله عنه) ئەمەی بینی وتی: تۆ گوێڕایەڵی(ابن النابغة) دەبیت و دەیکەیت بە ئەمیری خۆت و ئەبوبەکرو ئێمەش؟ ئەمە کە ڕاو بڕیارە، ئەبوعوبەیدە بە عومەری وت: کوڕی دایکم پێغەمبەر(ﷺ) من و ئەوی ڕاسپارد تا یاخی نەبین، ترسام ئەگەر من گوێڕایەڵی نەبم لە فەرمانی پێغەمبەر(ﷺ) لابدەم و خەڵکی بکەونە نێوان من و عەمرەوە، سوێند بەخوا تا دەگەڕێمەوە گوێڕایەڵی دەبم، کە گەڕانەوە عومەری کوڕی خەتتاب چوو بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ) و سکاڵای ئەوەی لاکرد، پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: لەمەوبەدوا تەنها لە ئێوە — واتە کۆچەران— ئەمیر دادەنێم[1][2].

---

[1] – ضعيف.

[2] – لە كنز العمال ج٥ ص ٣١٩ دا واهاتووە.

## (مافی ئەمیر لەسەر هاوڵاتیو ژێردەستان)

هناد لە سەلەمەی کوڕی شەهابی عەبدیەوە هێناویەتی کە عومەری کوڕی خەتتاب وتی: ئەی خەڵکینە ئێمە مافێکمان لەسەرتان هەیە کە نابێ بەئاشکرا ئامۆژگاری و دڵسۆزیمان بۆ بخەنەڕوو و لەسەر چاکە یارمەتیمان بدەن، هیچ شت لای خوا خۆشەویستترو سودبەخش ترنیە لە نەرمونیانی پێشەوا،هیچیش لای خوا ناخۆشتر نیە لە نەزانی و تووڕەیی(ئاگرتێبەربوونی) پێشەوا.[1]

دووبارە هەناد لە عەبدوڵڵای کوڕی عەکیمەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) وتی: هیچ نەرمونیانیەك لای خوا هێندەی نەرمونیانی پێشەوا خۆشەویست نیە، هیچ نەزانیەکیش لای خوا لە نەزانی و ئاگرتێبەربوونی(تووڕەیی زۆر) پێشەوا ناخۆش و ناشیرین نیە، هەرکەس کاربکات بە لێبوردن لە بەرامبەریدا سەلامەتی و چاکەی دێتەڕێ، هەرکەس لە دەروونیدا بەرامبەر بە خەڵك بەویژدان بێت لە کاریدا سەرکەوتنی بۆ دەبێت و زەلیلی بۆ گوێڕایەڵی زۆر نزیکترە لە چاکەو چاکەکاری لەچا و عیزەتخوازی لە سەرکەشیدا.[2]

[1] – لە کنز العمال ج٣ ص١٦٥ دا واهاتووە تەبەری ج٥ ص٣٢ لە سەلەمەی کوڕی کوهەیلەوە بەو واتایە هێناویەتی.

[2] – لە کنز العمال ج٣ ص١٦٥ دا واهاتووە.

## (دوورەپەرێزی لە قسەوتن بە سەرکردەکان)

ئیبن جەریر لە ئەنەسەوە هێناویەتی دەڵێت: گەورە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) دوورەپەرێزییان لێدەکردین و دەیانوت: قسە بە ئەمیرەکانتان مەڵێن و لەگەڵیان ناپاك مەبن و لێیان یاخی مەبن و لە خوابترسن و خۆڕاگربن، چونکە بارەکە(ڕزگاری) نزیکە.[1]

## (زمانپارێزی لای ئەمیر)

بەیهەقی ج٨ ص١٦٥ لە عروەوە هێناویەتی دەڵێت: هاتم بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب و پێم وت: ئەی ئەبوعەبدولڕەحمان ئێمە لای ئەم پێشەوایانەمان دادەنیشین و ئەوان قسەدەکەن و ئێمەش دەزانین حەق ئەوە نیە بەڵام بەڵێیان بۆ دەکەین، ئەوان ستەم دەکەن و ئێمەش پشتگیریان دەبین و بە چاکیان دادەنێین، ئەمە چۆنە؟ وتی: برازاگیان ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) بووین ئەوەمان بە دووڕوویی دادەنا، ئیتر نازانم لای ئێوە چۆنە؟

هەروەها بەیهەقی ج٨ ص١٦٤ لە عاصی کوڕی موحەمەد لەباوکیەوە هێناویەتی کە کەسێك بە ئیبن عومەری(رضي الله عنه) وت: ئێمە ئەوەمان بە دووڕوویی دادەنا بوخاری لە موحەمەدی کوڕی زەیدەوە بە هەمان شێوە هێناویەتی و ئەمەشی بۆ زیاد دەکات: لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) ئەوەمان بە دووڕوویی دادەنا[2][3].

ئیبن عەساکیر لە موجاهیدەوە هێناویەتی کەسێك هات بۆ لای ئیبن عومەر و وتی: ئێوە و ئەبو ئونەیس چۆنن؟ وتی: ئەگەر پێی دەگەیشتن ئەوەی دەیویست

---

[1] – لە کنز العمال ج٣ ص١٦٨ دا واهاتووە.

[2] – صحيح.

[3] – لە الترغيب والترهيب ج٤ ص٣٨٢ دا واهاتووە.

وامان دەوت، کە لە لای دەچووین شتی ترمان دەوت، ئیبن عومەر وتی دەی ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) دا ئەوەمان بە دووڕوویی دەزانی.[1]

ئەبونەعیم لە الحلیة ج٤ ص٣٣٢ لە شەعبیەوە هێناویەتی دەڵێت: بە ئیبن عومەرمان وت: کە دەچینەلای ئەوانە بە دڵی ئەوان دەڵێین، کەچی شتی پێچەوانەی ئەوە دەڵێین، وتی: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) ئەوەمان بە دووڕوویی دادەنا.

بەیهەقی ج٨ ص١٦٥ لە عەلقەمەی کوڕی قاصمەوە هێناویەتی دەڵێت: کەسێك دەچوو بۆ لای سەرکردەکان و دەیخستنە پێکەنین، باپیرم پێی وت: قوڕت بەسەر فلان کەس بۆچی دەچیت بۆ لای ئەوانەو دەیانخەیتە پێکەنین؟ من لە بیلالی کوڕی حارسی موزەنی هاوەڵی پێغەمبەری خوام بیستووە کە دەیوت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(ان العبد لیتكم بالكلمة من رضوان الله ما یظن ان تبلغ ما بلغت فیرضی الله بها عنه الی یوم یلقاه، و ان العبد لیتكلم بالكلمة من سخط الله ما یظن ان تبلغ فیسخط الله بها الی یوم یلقاه) واتە(بەندە هەیە قسەیەك لە ڕەزامەندی خوادا دەکات و حسابی بۆ ناکات کەچی تا ئەو ڕۆژەی دەگاتەوە بە خوای گەورە ڕازی دەبێت لێی بەهۆیەوە، بەندەش هەیە قسەیەك لە تووڕەکردنی خوادا دەکات و گوێی پێ نادات کەچی تا ڕۆژێك دەگاتەوە بەخوا خوای گەورە لێی تووڕەیە بەهۆیەوە) هەروەها بەیهەقی ج٨ ص١٦٥ لە عەلقەمەوە هێناویەتی بیلالی کوڕی حارسی موزەنی(ﷺ) پێی وت: من دەبینم دەچیت بۆ لای ئەو سەرکردانەو دەیاندوێنی، دەی بزانە لایان چی دەکەیت، من گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو(ان الرجل.......) فەرموودەکە بەوجۆرە دێنێت.

ئەبونەعیم لە الحلیة ج٨ ص١٦٧ لە شەعبیەوە هێناویەتی عەبباس بە عەبدوڵڵای کوڕی وت: من دەبینم ئەو کابرا واتە عومەری کوڕی خەتتاب – ڕێزت دەگرێت و نزیکی کۆڕت دەبێتەوە و دەتباتە کۆڕی وا کە تۆ وەك ئەوان نیت، دەی سێ شتم لێ وەربگرەو وریایان بە، فێرە درۆ نەبیت، نهێنی لە ڕوودا بەدیارنەخەیت، لەلای ئەو غەیبەتی کەس نەکەیت.

[1] – لە کنزالعمال ج١ص٩٣دا واهاتووە.

# (قسەی حەق لای سەرکردەو بەرپەرچدانەوەی فەرمانی ئەگەر پێچەوانەی فەرمانی خوابوو)

ئیبن ڕاهەویە لە حەسەنەوە هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب خوێندنی ئایەتێکی لەلایەن ئوبەی کوڕی کەعبەوە بەرپەرچ دایەوە،ئوبەی وتی من لە پێغەمبەرم(ص) بیستوە ئەی عومەر تۆش لە بەقیع سەرقاڵی چەپڵە لێدان بوویت، عەمەریش وتی:ڕاست دەکەیت،تەنها ویستم تاقیتان بکەمەوە تا بزانم کەستان هەیە ڕاست بڵێت؟هیچ خێرێك لە سەرکردەیەکدا نیە کە کەسی حەق بێژی لا نەبێت.لە کنز العمال ج٧ص٢ دا واهاتووە.

عەبدی کوڕی حەمیدو ئیبن جەریرو ئیبن عەددی لە ئەبی میجلەزەوە هێناویانە ئوبەی کوڕی کەعب ئەم ئایەتەی خوێندەوە(من الذین استعق علیهم الاولیان) عومەر(□)وتی:درۆت کرد،وتی تۆ درۆ دەکەیت،یەکێك وتی:بە ئەمیری باوەڕداران دەڵێیت درۆزن؟ وتی:من لە تۆ زیاتر مافی ئەمیری باوەڕدارانم لەبەر چاوە،بەڵام بەرامبەر بە ڕاستدانی قورئان و کتێبی خوا بە درۆزن ناوم برد،بۆ بە درۆخستنەوەی کتێبی خوا پاڵپشتی و بە ڕاستدانانی ئەمیری باوەڕداران ناگرمەبەر، عومەر وتی ڕاست دەکات.[1]

ئیبن عەساکیر و ئەبو زەری هروەی لە(الجامع) لە نەعمانی کوڕی بەشیرەوە هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب لە کۆڕێکدا کە کۆچەران و پشتیوانانی لە دەوردا بوو وتی:ئەگەر لە هەندێ کاردا دەست بکێشمەوە ئایا ئێوە چی دەکەن؟بێدەنگ بوون،دوو یان سێ جار ئەوەی وت،بەشیری کوڕی سەعد وتی: ئەگەر ئەوە بکەیت وەك کاری بەردە ئەستێ ڕێکت دەکەینەوە،عومەر وتی:ئێوەوان ئێوەوان.[2]

[1] – لە کنز العمال ج١ص٢٨٥ دا واهاتووە.

[2] – لە کنز العمال ج٣ص١٤٨دا واهاتووە.

ئیبن موبارەك لە موسای کوڕی ئەبی عیساوە هێناویەتی دەڵێت:عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) هاتە لای بەنی حارسە،موحەمەدی کوڕی مەسلەمەی دی،عومەر وتی:موحەممەد چۆنم دەبینیت؟ وتی:سوێند بەخوا وەك ئەوەت دەبینم کە حەز دەکەم و ئەوەی حەز دەکات چاکەی تۆ ببینێت،بەهێزت دەبینم بۆکۆکردنەوەی سامان کەچی دەستت تێی ناپوات و بە دادپەروەری دابەشی دەکەیت، ئەگەریش لابدەیت ڕاستت دەکەینەوە وەك چۆن تیر لە ئاگردا ڕێك دەکرێتەوە،عومەر وتی ها، ئەویش دوبارەی کردەوە، عومەر وتی:سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە لەناو کۆمەڵێکدا داینـاوم ئەگـەر لابـدەم ڕاسـتم دەکەنەوە،لـە منتخـب کنـز العمـال ج٤ص٣٨١ دا واهاتووە.

تەبەرانی و ئەبویەعلا لە ئەبی فونەیل(١) لە موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانەوەهێناویەتی لە ڕۆژی(القمامه) چوویە سەر مینبەرو لە وتارەکەیدا وتی: سامان سامانی ئێمەو فەیئیش هی ئێمەیە، کێمان پێ باش بێت پێی دەدەین‌و کێشمان پێ باش نەبێت نایدەینێ، کەس وەڵامی نەدایەوە، لە هەینی دووەمدا ئەوەی وتەوەو کەس وەڵامی نەدایەوە، لە هەینی سێیەمدا ئەوەی وتەوەو یەکێك لە ئامادەبوانی مزگەوت وتی نەخێر سامان هی ئێمەو فەیئیش هی ئێمەیە، کێ بیەوێت بە دووری بگرێت لێمان بە شمشێرەکانمان دەیخەینە بەر حوکمی خوا،موعاویە دابەزی‌و ناردیان بە شوێن کابراداو هێنایان بۆ لای، خەڵکەکە وتیان: خۆی ماڵوێران کرد، پاشان خەڵکی چوون‌و سەیریانکرد کابرا لەسەر فەرشێك لەگەڵی دانیشتووەو موعاویەش بە خەڵکەکەی وت: ئەمە خوا بە زیندووی ڕاگرێت بووژاندمیەوە، گوێم لە پێغەمبەر() بوو دەیفەرموو:(سیکون بعدی امراو یقولون ولا یردّ علیهم یتقاحمون فی النار کما تتقاحم القرده) واتە: دوای من دواتر هەندێ سەرکردە دێن قسە دەکەن‌و وەڵام نادرێنەوە، مەیموون ئاسا کوێرانە خۆیان دەخەنە ناو ئاگرەوە.من یەکەم هەینی ئەوەم وت‌و کەس وەڵامی نەدامەوە، ترسام یەکێك بم لەوانەی فەرموودەکە باسی دەکات، لە هەینی دووەمدا هەروابوو، لە

هەینی سێیەمدا کە وتم ئەم کابرا هەستاو وەڵامی دامەوە خوا زیندووی ڕاگرێت بووژاندمیەوە[1][2].

ئیبن ئەبی عاصمو بەغەوی لە خالیدی کوڕی حەکیمی کوڕی حیزامەوە هێناویانە دەڵێت: ئەبو عوبەیدە() لە شام ئەمیر بوو، هەندێ لە خەڵکەکەی هێناو شتێکی لێسەندن، خالیدیش هەستا بۆ لایو دواندی، خەڵکەکە وتیان لە ئەمیر تووڕە بوویت؟ وتی: من نەمویست لێی تووڕە بم، بەڵام گوێم لێبوو پێغەمبەر() دەیفەرموو:(إنّ اشدّ الناس عذاباً يوم القيامه اشدهم عذاباً للناس في الدنيا) واتە:(ئەو کەسانەی لە ڕۆژی دواییدا سزایان زیاترینە ئەوانەن کە لە دنیادا زیاترین سزای خەڵك دەدەن) ئەحمەدو بوخاری لە مێژووەکەیداو تەبەرانیو باوردیش هێناویانە، باوردی ئەمەشی بۆ زیاد کردووە: ئەو لەسەر سەرانە خەڵکی سزادەدات[3][4] تەبەرانی دەڵێت: پێی وترا لە ئەمیر تووڕە بوویت؟ ئەوەشی بۆ زیاد دەکات: بڕۆوازیان لێبهێنە. کەسەکانی سەنەدەکە صەحیحن جگە لە خالیدی کوڕی حەکیم.

حاکم ج٣ص٤٤٢ هێناویەتی دەڵێت: زیاد حەکەمی کوڕی عەمری غیفاری نارد بۆ سەر خوراسانو لەوێ دەستکەوتێکی زۆریان بەدەستهێنا، زیاد بۆی نووسی:پاشان ئەمیری باوەڕداران نووسیویەتی تا سپیو زەرد جیابکرێتەوەو زێڕو زیو لەنێو موسڵماناندا دابەش نەکرێت، حەکەمیش بۆی نووسی: پاشان تۆ ئەوەت نووسیوە باسی نامەی ئەمیری باوەڕداران دەکەیت، من نووسینو کتێبی

---

[1] - صحيح.

[2] - هەیسەمی ج٥ص٢٣٦ دەڵێت: تەبەرانی لە المعجم الكبير و المعجم الوسيط و ئەبو یەعلاش هێناویانەو کەسەکانی سەنەدەکەی ئەبو یەعلا جێمتمانەن،تەواو.

[3] - صحيح.

[4] - لە الإصابه ج١ص٤٠٣دا واهاتووە، هەیسەمی ج٥ص٢٣٤ دەڵێت ئەحمەدو تەبەرانی هێناویانەو

خوام لە پێش نامەی ئەمیری باوەڕداران دیوەو سوێند بە خوا دەخۆم ئەگەر زەوی و ئاسمانەکان بەسەر کەسێکدا دابارن بەڵام ئەو کەسە لە خوا بترسێ ئەوا خوا لە نێویاندا دەربازی دەکات، والسلام. حەکەم فەرمانی کرد بە هاوارکەرێك و ئەویش هاواری کردبچن بۆ بەشەکەتان و ئێوەش لەنێویاندا دابەشی بکەن،موعاویەش دوای ئەوە ناردی بۆ گرتنی و بەندکردنی، ئەو کات لە کۆتەکەیدا مردو واش خرایە ژێرخاك، پێی وت من سکاڵاو شکاتم دەبێ.

ئیبن عەبدولبیر لە الاستیعاب ج١ ص٣١٦ دا هێناویەتی و واباسی کردووە، بەڵام لە فەرمودەکەیدا دەڵێت: لە نێوانیاندا دابەشی کردو حەکەم وتی: خوایە ئەگەر لای تۆ خێرم بۆ هەیە بمبەرەوە بۆ لای خۆت، ئەوەبووو لە خوراسان لە مەرۆ مرد لە الاستیعاب ج١ ص٣٤٧ دا دەڵێت: دروست ئەوەیە کە کاتێك نامەکەی زیادی بۆ هات کە سەرکۆنەی دەکرد نزای لە خۆی کردو مرد، تەواو.

حاکم ج٣ ص٤٧١ لە ئیبراهیمی کوڕی عەتا لە باوکیەوە هێناویەتی کە زیاد یان ئیبن زیاد عیمرانی کوڕی حوصەینی بۆ کۆکردنەوە نارد، ئەویش هات و هیچ درهەمی نەهێناوە، ئەویش پێی وت: ئەی سامانەکە کوا؟ وتی: تۆ بۆ پارەت ناردم؟ لە سەردەمی پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) چۆن وەرماندەگرت بەوجۆرە وەرماندەگرت و لەو سەردەمەدا چۆن سەرفمان دەکرد ئێستاش وادەکەین.[1]

[1] – حاکم دەڵێت: سەنەدەکەی صەحیحەو زەهەبیش دەڵێت: صەحیحە.

# (مافی خەڵك بەسەر ئەمیرەوە)

بەیهەقی لە ئەسوەدەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەر(رضي الله عنه) کە وەفدێك دەهات بۆ لای لە بارەی ئەمیرەکەیانەوە پرسیاری لێدەکردن ئایا سەردانی نەخۆش دەکات؟ ئایا وەڵامی کۆیلە دەداتەوە؟ لەگەڵ ئەوانەی دێنە بەردەرگای چی دەکات؟ ئەگەر سیفەتی باشیان بوتایە دەیهیشتەوە ئەگەرنا لایدەبرد.[1] هەناد لە ئیبراهیمەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەر(رضي الله عنه) کە کاربەدەستییێکی دادەناو وەفد دەهات بۆ لای – لەو وڵاتەوە– دەیوت: ئەمیرتان چۆنە؟ سەردانی کۆیلە دەکات؟ دەچێت بە دوای تەرمدا؟ بەردەرگای چۆنە؟ ئایا نەرمونیانە؟ ئەگەر بیل نوتایە بەردەرگای نەرمو سەردانی مەملوکی هەیە باشە، ئەگەرنا هەواڵی لابردنی بۆ دەنارد.[2]

بەیهەقی لە عاصی کوڕی ئەبی نجود لە عومەری کوڕی خەتتابەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی: کاتێك کاربەدەستی خۆی دەنارد مەرجی لەسەریان دادەنا تا سواری ئەسپی(بیرزەون) نەبن‌و نانی(نەقی) نەخۆن‌و جلی زۆر جوان نەپۆشن‌و دەرگاکانیان لە ڕووی پێویستی خەڵکی دا دانەخەن، ئەگەر ئەوانە بکەن ئەوا سزا دەدرێن، ئینجا بەڕێی دەکردن، ئەگەر بیویستایە بگەڕێتەوە دەیوت: من لەسەر خوێنی موسڵمانان‌و سەرو شەرەف‌و ئابڕو و سامانیان ئێوەم داناوە، ئێوەیان بۆ دەنێرم تا بەرنوێژییان بۆ بکەن‌و لەناویاندا(فەیئ) دابەش بکەن‌و بە دادپەروەری لەنێوانیان حوکم بکەن، ئەگەر کێشەیەکتان لا سەخت بوو بەرزی بکەنەوە بۆ لام، وریابن، نەدەن لە عەرەب‌و زەبوونی بکەن‌و کۆی نەکەنەوەو تێبکەون، پشتگوێی نەخەن‌و بێبەشی بکەن، لەگەڵ قورئان بن.[3]

---

[1] – لە کنز العمال ج٣ ص١٦٦ دا واهاتووەو تەبەری ج٥ ص٢٣ بەو واتایە لە ئەسوەدەوە هێناویەتی.

[2] – لە کنز العمال ج٣ ص١٦٦ دا واهاتووە.

[3] – لە کنز العمال ج٣ ص١٤٨ دا واهاتووە.

تەبەرانی ج٥ ص١٩ لە ئەبی حوصەینەوە بە کورتی بەو واتایە هێناویەتی، ئەوەش زیاد دەکات: تاوبدەنە قورئان و گێڕانەوە لە موحەمەدەوە(ﷺ) بەرز ڕاگرن و منیش هاوبەش و هاوڕاتانم، گوێی لە هەواڵی کاربەدەستانی دەگرت و ئەگەر سکاڵایەك بکرایە لە کاربەدەستێکی سکاڵاکارو کاربەدەستەکەی کۆدەکردەوە، ئەگەر وابوایە کە دەبوو تۆڵەی لێوەربگرێتەوە دەیکرد.

ئیبن ئەبی شەیبەو ئیبن عەساکیر لە ئەبی خوزەیمەی کوڕی سابتەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەر(رضي الله عنه) کە کەسێکی دەکرد بە بەرپرس دەستەیەکی پشتیوانان و جگە لەوانیشی دەکرد بە شاهید لەسەری و دەیوت: من لەسەر خوێنی موسڵمانان تۆم داناوە، بەو واتایە دەیهێنێت.[1]

ئیبن سەعدو ئیبن عەساکیر لە عەبدولڕەحمانی کوڕی سابتەوە هێناویانە دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) ناردی بۆ لای سەعیدی کوڕی عامری جومەحی و وتی: ئێمە تۆمان لەسەر ئەوانە داناوە تا بەرەو خاکی دوژمنیان ببەیت و جیهادیان پێ بکەیت، وتی: ئەی عومەر تووشم مەکە، عومەر وتی: بەخوا وازتان لێ ناهێنم، خستتانە سەر گەردنم ئێستا دەستم لێ بەردەدەن، من دەتنێرم لەگەڵ کۆمەڵێکدا کە تۆ چاکترینیان نیت، ناتنێرم تا تێیان بکەویت و ئابڕوویان بشکێنی، بەڵکو تا بەرامبەر بە دوژمنیان جیهادیان پێ بکەیت و سامان و دەستکەوتیان لە نێوانیاندا دابەش بکەیت.[2]

ئیبن عەساکیرو ئەبونەعیم لە الحلیە لە ئەبوموساوە(رضي الله عنه) هێناویانە ئەمیری باوەڕداران عومەری کوڕی خەتتاب ناردمی تا قورئان و سوونەتی پێغەمبەرەکەتان فێربکەم و ڕێگەتان پاك ڕاگرم.[3]

---

[1] – لە کنز العمال ج٣ ص١٤٨ دا واهاتووە.

[2] – کنز العمال ج٣ ص١٤٩.

[3] – لە کنز العمال ج٣ ص١٤٩ دا واهاتووە، تەبەرانیش هەروا هێناویەتی، هەیسەمی ج٥ ص٢١٣ دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکەی کەسانی صەحیحن، تەواو.

# (نکووڵی لەسەر بەرز ڕاگری ئەمیرو گوێ دانی بەوانەی پێویستیو کاریان پێی هەیە)

ئیبن عەبدولحەکیم لە ئەبی صاڵحی غیفاریەوە هێناویەتی دەڵێت: عەمری کوڕی عاص نامەی نووسی بۆ عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) ئێمە لە مزگەوتی نوێژی هەینیشدا نەخشەی ماڵێکمان بۆ داناویت، عومەر بۆ نووسی: چۆن دەکرێت کەسێك لە حیجاز بێتو لە میسر ماڵی هەبێت؟ فەمانی پێکرد بیکات بە بازاڕێك بۆ موسڵمانان.[1]

ئیبن عەبدولحەکیم لە ئەبی تەمیمی جەیشانیەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب نامەی نووسی بۆ عەمری کوڕی عاص:

(پاشان! پێم گەیشتووە تۆ مینبەرێکت داناوە کە لە گەردنی خەڵکەکە بەرزترە، یان بە حسابی خۆت هەستیتە سەرپێو موسڵمانان لە خوارتەوە بن، جا بڕیارم داوە تا بیشکێنیت). کنز العمال ج٣ ص١٦٦.

موسلیم لە ئەبی عوسمانەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: عومەر(رضي الله عنه) ئەمەی بۆ نووسین کاتێك لە ئازەربایجان بووین:

ئەی عوتبەی کوڕی فەرقەد! ئەوە لە ڕەنجی شانی خۆتو باوکتو دایکت نیە، دەی توێشوەکەی خۆت بەچی پڕە بۆ موسڵمانانیش وابکە وریابن نەکەونە ڕابواردنو پۆشینی بەرگی هاوەڵدانەرانو بەرگو پۆشاکی ئاوریشم)[2]

ئیبن عەساکیر لە عروەی کوڕی ڕوەیمەوە هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) تەوقەی لەگەڵ خەڵك دەکرد، خەڵکی حیمص دای بەلایدا، پێی وتن: ئەمیرەکەتان چۆنە؟ وتیان چاکترین ئەمیرە بەڵام بەرزە ماڵێکی دروست کردووەو لەوێ دەژی، ئەویش نامەیەکی بۆ نووسیو پۆستەچی ناردو فەرمانی پێکرد تا

---

[1] – کنز العمال ج٣ ص١٤٨.

[2] – لە الترغیب ج٣ ص٤٥٨ دا واهاتووە.

بیسوتێنێت، کە نامەکەی بۆ هات دارو چیلکەی کۆکردەوەو دەرگاکەی سوتاندو هەواڵی ئەوە گەیشتەوەو ئەویش وتی: وازی لێ بێنن ئەوە نێردراوە، پاشان نامەکەی دایەدەست، لە دەستی داینەنا تا سوار بوو تا بچێت بۆ لای عومەر(رضي الله عنه)، کە عومەر(رضي الله عنه) بینی وتی: بمگەیەنە بە(الحرة) کە تیایدا وشتری بەخشین هەبوو، وتی: جلەکەت لابە، بەرگێکی لە تووکی وشتر بۆ فڕێ دا، پاشان وتی: کۆڵی ئەو وشترە بکەرەوە بەوجۆرە دادەبەزی تائەوەی بێزاربوو، پاشان وتی: لە کەیەوە ئەمە وایە؟ وتی: کەمێکە ئەی ئەمیری باوەڕداران، وتی: دەی بۆیە بەرزە خانووت کۆکردۆتەوەو بەسەر هەژارن و بێوەژن و هەتیواندا سەرکەوتوویت. بگەڕێرەوە سەر کارەکەت و دووبارەی نەکەیتەوە.[1]

ئیبن موبارەك و ڕاهەویەو موسەددەد لە عیتابی کوڕی ڕەفاعەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) پێی گەیشت سەعد کۆشکێکی دروست کردووەو دەرگایەکی لە ڕوو دانـاوەو وتوویەتی: نـاوزڕان نـەما، عومەریش موحەمەدی کوڕی مەسلەمەی نارد، عومەر ئەگەر حەزی بکردایە کارێك بەپێی ویستەکەی بێت دەینارد بە شوێن کارەکەدا، وتی: بچۆ بۆ لای سەعدو دەرگاکەی لەسەر بسوتێنە، ئەویش چوو بۆ کوفە، کە هاتە لای دەرگاکەی بەردە ئاگرەکەی دەرهێنا و ئاگری کردەوەو سووتاندی، هەواڵ درا بە سەعدو وەسفی ئەوکەسەی بۆ کرا، ئەویش ناسیەوەو چوو بۆ لای، موحەمەد وتی: سەعد ئەمیری باوەڕدارن بیستوویەتی وتووتە: ناوزڕاندن نەما، سەعد سوێندی خوارد وای نەوتووە، موحەمەد وتی: ئەوەی ڕاسپێردرابووین بیکەین دەیکەین و قسەی تۆش دەگەیەنین، بەردەوام داوای لێدەکرد شتێکی زیادەی پێ بدات، بەڵام ئەو ئامادەنەبوو، پاشان سواری وڵاخەکەی بوو تا هاتەوە مەدینە کە عومەر(رضي الله عنه) بینی وتی: ئەگەر گومانی

[1] – لە کنز العمال ج٣ ص١٦٦ دا واهاتووە.

چاکمان پێت نەبوایە وامان نەدەزانی ڕاسپاردەکەت گەیاندبێت، باسی ئەوەی کرد کە خێرا چووە، وەیش وتی: بەڵێ وایە، پۆزشی دەهێنایەوەو سوێندی بەخوا خوارد کە چی وتووە، عومەر وتی: فەرمانی هیچی بۆ کردیت؟ وتی: حەزم نەکرد چونکە خاکی عێراق خاکێکی بە پیتەو خەڵکی مەدینەش لە برسێتیدا خەریکە دەمرن، ترسام داوای هیچت بۆ بکەم سارد بۆ تۆو گەرمیەکە بۆ من بێت، مەگەر گوێت نەبوو لە پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو(لا يشبع المؤمن دون جاره) واتە(باوەڕدار بەبێ دراوسێکەی تێرنابێت)[1].[2]

تەبەرانی لە ئەبی بەکرو ئەبوهورەیرەوە(رضي الله عنه) بە کورتی هێناویەتی، بەڵام لە فەرموودەکەیدا هاتووە: عومەر(رضي الله عنه) بیستی ڕێیان نادات ببیننو دەرگایان لەسەردادەخات، ئەویش عەمماری کوڕی یاسری ناردو فەرمانی پێکرد ئەگەر چوو و دەرگاکە داخرابوو ئاگری تێبەردات.[3]



[1] – ضعیف.

[2] – لە کنز العمال ج٣ ص١٦٥ دا واهاتووەو لە الاصابە ج٣ ص٣٨٤ دا هەمووی هێناوە، تەنها ئەوەیە دەڵێت: لە عوبادەی کوڕی ڕەفاعەوە، هەروەها هەیسەمی ج٨ ص١٦٧ لە عوبابەوە بە دوورو درێژی دەیهێنێتو دواتر دەڵێت: ئەحمەدو ئەبویەعلا هەندێکی هێناوە، کەسەکانی سەنەدەکەش صەحیحن، بەڵام ئەوە هەیە عوبابەی کوڕی رغاعە لە عومەری نەبیستووە، تەواو.

[3] – هەیسەمی ج٨ ص١٦٨ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا عەتائی کوڕی سائیب هەیە کە شت تێکەڵ دەکات.

## (بەدواداچوونی بارودۆخەکان)

خەتیب لە ئەبی صاڵحی غیفاریەوە هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) بڕیاری دا شەوانە بچێ بۆ لای پیرەژنێکی کوێر لە کەناری مەدینە تا ئاوی پێ بداو کاروئیشی بۆ بکات، کە دەهات تا بۆی بکات دەبینێت کەسێك پێشی کەوتووەو کارەکەی کردووە، چەند جارێك هاتو فریای نەکەوت، جارێکیان عومەر قەرەوڵی گرتو سەیری کرد ئەبوبەکری صدیقی خەلیفەیە دێت، عومەر وتی: بەخوا هەرتۆیت.[1]

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٤٨ لە ئەوزاعیەوە هێناویەتی عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) لە تاریکی شەودا دەچوو، تەلحە بینی، عومەر چوو بۆ ماڵێكو دواتر چوویە ماڵێکی تر، کە بەیانی بوویەوە تەلحە چوو بۆ لای ئەو ماڵە، سەیری کرد پیرەژنێکی کوێرو پەککەوتەی ناوجێی تێدایە، وتی: ئەو کابرا بۆچی دێت بۆ لاتان؟ وتی: ئەو دەمێکە(لەوکاتەوە) بەڵێنی داوە پێمو دێت بۆ لامو کارەکانم بۆ دەکاتو سەختیم لەسەر ناهێڵێ، تەلحە وتی: دایکت ڕۆڵەڕۆت بۆ بکات تەلحە! دەتەوێت بە دوای لادانو هەڵخلیسکانی عومەردا بگەڕێیت؟!!

---

[1] – لە منتخب کنز العمال ج٤ ص٣٤٧ دا واهاتووە.

# (وەرگرتنی ڕوخساری کارەکان)

عەبدولڕەزاق لە عەبدوڵڵای کوڕی عوتبەی کوڕی مەسعودەوە هێناویەتی دەڵێت: گوێم لە عومەری کوڕی خەتتاب بوو دەیوت: هەندێ خەڵك لە سەردەمی پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) سروشیان وەردەگرت، سروش پچڕاو ئێستا ئێمە ڕوخساری کارتان وەردەگرین، کامتان چاکەمان بۆ نیشان بدات بڕوای پێ دەکەین و نزیکی دەکەینەوە، بۆ نهێنیەکەی هەقمان پێوە نیە(هیچمان لە دەست نایەت) خوا لەسەر نهێنیەکەی لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکات، هەرکەسیش خراپەمان بۆ نیشان بدات لێی دڵنیانین و بڕوای پێ ناکەین با ناخ و نادیاریشی باش بێت.[1]

ئیبن سەعد ج٣ ص١٩٦و بەیهەقی لە حەسەنەوە هێناویەتی کە یەکەم وتاری عومەر(رضي الله عنه) ئەوە بوو سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کرد و دواتر وتی:

(پاشان! من کەوتمە بەر تاقیکردنەوەی ئێوەو ئێوەش کەوتنەبەر تاقیکردنەوەی من، دوای هاوەڵەکەم بووم بە خەلیفەتان، هەرکەس لەلامان بوو بەشدارو تێکەڵی دەبین، کەی لێمان دوور بوو کەسی خاوەن هێزو سپاردە کاری لەسەر دادەنێین، هەرکەس چاکە بکات چاکەی زیاتری لەگەڵ دەکەین، هەرکەس خراپە بکات سزای دەدەین، خوا لە ئێمەو ئێوەش خۆش بێت.[2]



[1]- لە کنز العمال ج٣ ص١٤٧ دا واهاتووە، بەیهەقی ج٨ ص٢٠١ لە عەبدوڵڵاوە بەوجۆرە هێناویەتی و دەڵێت بوخاری لە صەحیحەکەیدا هێناویەتی.

[2] – لە کنز العمال ج٣ ص١٤٧ دا واهاتووە.

## (ڕوانینە کار)

بەیهەقی و ئیبن عەساکیر لە تاوسەوە هێناویانە عومەر(رضي الله عنه) وتی: ئەڵێن چی ئەگەر چاکترین کەستان بۆ دابنێم کە دەیناسم، پاشان فەرمانی پێ بکەم بە دادپەروەری ، ئایا ئەرکی خۆمم بەجێگەیاندووە؟ وتیان: بەڵێ، وتی: نا تائەوەی سەیری کاری بکەم بزانم بە فەرمانەکەم دەکات یان نا؟[1]

## (بەدواداچوونی سوپاکان)

ئەبوداودو بەیهەقی لە عەبدوڵڵای کوڕی کەعبی کوڕی مالیکی ئەنسارییەوە هێناویانە کە سوپایەکی پشتیوانان لە خاکی فارس لەگەڵ ئەمیرەکەیاندا بوون و عومەریش(رضي الله عنه) هەموو ساڵێك بەدواداچوونی بۆ سوپاکان هەبوو، عومەر ئاگای لەوان نەما، کاتێك ماوەکە تێپەڕبوو خەڵکی ئەو سەرسنوورە کەوتنەڕێ و باریان سەرخست بوو، ئەوانە هاوەڵی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوون و وتیان عومەر تۆ بێئاگابوویت لە ئێمەو ئەوەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێکرد تا بەدواداچوونی سوپاو غەزاکانت هەبێ بەرامبەر بە ئێمە نەتکردو دەستت لێ بەردا[2].[3]

## (موسڵمانان تووشی چی بن ئەمیر چاودێرییان بکات)

ئیبن عەساکیر لە تاریقی کوڕی شەهاب لە ئەبی موساوە هێناویەتی ئەمیری باوەڕداران نامەی نووسی بۆ ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەراح کاتێ هەواڵی ئەو نەخۆشی(طاعون)ەی بیست کە تووشی خەڵکی شام ببوو، نووسی(من پێویستیم بە تۆ دەرکەوت بۆیە هیچ پێویستیەکم بە تۆ نیە لەوێن ئەگەر ئەم نامەم شەو گەیشتە

---

[1] – لە کنز العمال ج٣ ص١٦٥ دا واهاتووە.

[2] – لە کنز العمال ج٣ ص١٤٨ دا واهاتووە.

[3] – صحیح.

دەستت جەخخ لێ دەکەمەوە بەیانیت کردەوە بەردەوام بێیت، ئەگەر ڕۆژ گەیشتە دەستت شەو نەکەیتەوە تا بەرەولام بێیت، ئەبوعوبەیدە(ﷺ) وتی: من گرنگیەکەی ئەمیری باوەڕداران دەزانم کە خستتەڕوو دەزانم دەیەوێت هەوڵ بدات ئەوەی ماوەو بەرەونەمان دەچێت بیهێڵێتەوە، بۆیە بۆی نووسی من لەناو سەربازانی موسڵماناندام و ناتوانم خۆم لەوان جیابکەمەوە، من ئەو پێویستیەی تۆ دەزانم و نیازت دەزانم، ئەگەر ئەم نامەی منت پێ گەیشت بمبوورە لەو نیازوبڕیارەت، مۆڵەتم پێ بدە تا بمێنمەوە، کە عومەر نامەکەی خوێندەوە چاوەکانی فرمێسکیان ڕشت و گریا، ئەوانەی لەلای بوون وتیان: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەبوعوبەیدە مرد؟ وتی: نا بەڵام وەك ئەوە وایە مردبێت. عومەر نامەی بۆ نووسی کە ئەو زەویە زەویەکی دەرداویە ئەو باسی نەخۆشیەکەی بۆ نووسیبوو و جابیەکەش زەویەکی دوورە دەرد بوو بۆیە کۆچەرانی بەرەو ئەوێ ئاڕاستە کرد، ئەبوعوبەیدە کە نامەکەی خوێندەوە وتی: ئەمەیان فەرمانی ئەمیری باوەڕدارانی تێدایە و گوێگری دەبین، بۆیە فەرمانی پێکردم تا سواربم و خەڵکەکە بگەیەنمە شوێنی خۆیان، ئەویش بەرکەوت و مرد و دەردەکە نەما، ئەبولمەوجە دەڵێت: دەیانوت ئەبوعوبەیدە سی وشەش هەزار سەربازی هەبوو هەموو مردن و جگە لە شەش هەزار کەس.[1]

حاکم ج٣ ص٢٦٣ لە ڕێگەی سوفیانەوە هێناویەتی و لە دەقەکەیدا هاتووە: ئەبوعوبەیدە وتی: ڕەحمەتی خوا لە ئەمیری باوەڕداران دەیەوێت کەسانێك بهێڵێتەوە کە هی مانەوەنین، پاشان ئەبوعوبەیدە بۆی نووسی: من لە سوپایەکی باوەڕداراناندام و نامەوێت خۆم لەوان جیابکەمەوە،[2] لە البداية والنهاية ج٧ ص٧٨

---

[1] – سوفیانی کوڕی عویەینە بە کورتتر هێناویەتی، لە کنز العمال ج٢ ص٣٢٤ دا واهاتووە.

[2]– حاکم دەڵێت: گێڕەوەکانی فەرموودەکە هەموویان جێ متمانەن، زەهەبی دەڵێت: لەسەر مەرجی بۆخاری و موسلیم صەحیحە، ئیبن ئیسحاق لە ڕێگەی تاریقەوە بە دوورو درێژی هێناویەتی،

یـشدا هـاتووەو لـە دەقەکەیـدا هـاتووە: ئـەی ئـەمیری بـاوەڕداران مـن دەزانم تـۆ پێویـستیت بـە منـە، بـەڵام مـن لەگـەڵ سـەربازانێکی موسـڵماناندامو نـاتوانم لێیـان جیابمەوە تا خوای گەورە قەزای خۆی لەسـەرمن و ئـەوان دەدات، بۆیـە ئـەی ئـەمیری باوەڕداران دەست لەمن هەڵبگرەو لەناو سەربازانمدا بەجێم بهێڵە.[1]

## (سۆزو میهری ئەمیر)

ئیبن ئـەبی شـەیبە لـە ئـەبی جەعفـەرەوە هێناویـەتی ئەبوئوسـەید هـات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)و دیلی بەحرەینی هێنابوو، پێغەمبـەر(ﷺ) سـەیری ئافرەتێکی کـرد لەناویانـدا دەگریـا، فـەرمووی(مـا شـانك؟) واتـە(چـیتە؟) وتـی: کوڕەکـەمی فرۆشـت، پێغەمبـەر(ﷺ) بە ئەبوئوسـەیدی فەرموو(کوڕەکەی ئـەم ئافرەتـەت فرۆشـت؟) وتـی: بەڵێ، فەرمووی(فیمن؟)(بە کێ؟) وتی: بە بەنی عەبەس، فەرمووی(ارکب انت بنفسك فائت بە)(خۆت سواربە بڕۆ بیهێنەرەوە).[2]

ئیبن مـونزیرو حـاکمو بەیهـەقی لـە بورەیـدەوە هێناویـەتی دەڵێـت: لای عومـەر دانیشتبووم کە قیژەیەکی بیست، وتی: ئەی یەرفەء بزانە ئەو دەنگە چیە؟ ئەویش سـەیری کـردو هاتـەوەو وتـی: کـەنیزەکێکی قوڕەیـشە دایکـی دەفرۆشـێت. عومـەر وتی: کۆچەران و پشتیوانانم بۆ کۆبکەرەوە، هێنـدەی نـەبرد ئـەویٚ پڕبوو لـە خـەڵك، سـوپاس و ستایـشی پـەروەردگاری کـردو دواتـر وتـی:(پاشـان: دەیـزانن؟ یـەکێ لەوشتانەی پێغەمبەر(ﷺ) پێی هات پچڕاندن بوو، وتیان: نا وانیە، وتـی: دەی خـۆ لەناوتاندا بڵاوە، پاشان ئەم ئایەتـەی خوێنـدەوە(فهل عسیتم ان تولیتم ان تفسدوا في الارض و تقطعوا ارحاکم) پاشان وتی: پچڕان لەوە زیاتر چیە کە دایکی کەسێك

---

[1] – تەبەری ج٤ ص٢٠١ بە دوورو درێژی لە تاریقەوە هێناویەتی.

[2] – لە كنز العمال ج٢ ص٢٢٩ دا واهاتووە.

لەناوتاندا بفرۆشرێت و خواش ماڵ و سامانی بە ئێوە بەخشیبێت؟ وتیان دەی چیت پێ باشە بیکە، ئەویش نووسی دایکی ئازاد نەفرۆشێت، چونکە پچڕاندنی خزمایەتی و سۆزە و دروست نیە.[1]

بەیهەقی ج٩ ص٤١ و هیناد لە ئەبی عوسمانی هیندیەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب یەکێك لە بەنی ئەسەدی لەسەر کارێك دانا، ئەویش هات بەڵێنەکەی وەرگرێت، عومەر کوڕێکی ماچی کرد، ئەسەدیەکە وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەوە ماچی دەکەیت؟! سوێند بەخوا هەرگیز کوڕم ماچ نەکردووە، عومەر(رضي الله عنه) وتی: سوێند بەخوا لەگەڵ خەڵك سۆزت کەمترە، ئەو بەڵێنەمان بدەرەوە و هەرگیز کارم بۆ مەکە، ئەویش بەڵێنەکەی گەڕاندەوە.[2]

دەینەوەری لە موحەمەدی کوڕی سەلامەوە هێناویەتی و لە فەرمووەدەکەیدا هاتووە: عومەر وتی: ئەگەر سۆز لە دڵت نەما تاوانم چیە، خوا لەناو بەندەکانیدا تەنها سۆزی بۆ سۆزدارەکان هەیە، بۆیە لەسەر کارەکەی لایبرد و وتی: تۆ سۆزت بۆ کوڕی خۆت نیە ئێستا چۆن سۆزت بۆ خەڵك هەیە؟[3]



[1] – لە كنز العمال ج٢ ص٢٢٦ دا واهاتووە.
[2] – لە كنز العمال ج٣ ص١٦٥ دا واهاتووە.
[3] – لە كنز العمال ج٣ ص٣١٠ دا واهاتووە.

# (دادپەروەری پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵەکانی)

## (دادپەروەری پێغەمبەر(ﷺ))

بوخاری لە عروەوە هێناویەتی ئافرەتێك لە سەردەمی پێغەمبەر(ﷺ) و لە غەزای فەتحدا دزی کرد، هۆزەکەی ترسان و چوونە لای ئوسامەی کوڕی زەید تا لای پێغەمبەر(ﷺ) سکاڵایان بۆ بکات، عروە دەڵێت: کاتێك ئوسامە سەبارەت بەو ئافرەتە پێغەمبەر(ﷺ) دواند، پێغەمبەر(ﷺ) ڕەنگی ڕوخساری گۆڕشا و فەرمووی:(اتكلمني في حدّ من حدود الله تعالى؟) واتە(ئایا لە سنورێك لە سنوورەکانی خودا دەمدوێنی؟) ئوسامە وتی ئەی پێغەمبەری خودا(ﷺ) داوای لێخۆشبونم بۆ بکە، بۆ شەو پێغەمبەر(ﷺ) وتاری خوێندەوە بۆ خەڵکەکە و پاش سوپاس و ستایشی جوانی پەروەردگار فەرمووی(اما بعد! فانما هلك الناس و انهم کانوا اذا سرق فيهم الشريف ترکوه واذا سرق فيهم الضعيف اقاموا عليه الحد، والذي نفس محمد بيده لو أن فاطمة بنت محمد سرقت لقطعت يدها) واتە(پاشان! خەڵکان بەوە لە ناو چوون ئەگەر یەکێکیان خانەدان بوایە و دزی بکردایە وازیان لێ دەهێنا و ئەگەریش لاواز و هەژارێکیان دزی بکردایە حەد و سنوریان لەسەر جێ بەجێ دەکرد، سوێند بەوەی گیانی موحەممەدی بە دەستە ئەگەر فاتمەی کچی محمد دەستی دەبڕم)، پاشان فەرمانی کرد و دەستی ژنەکەیان بڕی و ژنەکە دوای ئەوە تەوبەی کرد و شووی کرد، عائیشە(رضي الله عنها) دەڵێت: دوای ئەوە هات و منیش کار و خواستەکەیم دەگەیاند بە پێغەمبەر(ﷺ).[1]

---

[1]- بوخاری لە شوێنێکی تر و موسلیم لە فەرموودەکەی عائیشەوە هێناویەتی، لە البدايه و النهايه ج٤ ص٣١٨ دا هاتووە و چوار فەرموودە ناسەکەش لە عائیشەوە هێناویانە و لە الغريب و الترهيب ج٤ ص٢٦ یشدا هاتووە.

بوخاری لە ئەبی قەتادەوە(ﷺ) هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) لە ساڵی شەڕی حونەین دەرچووین کە گەشتین بە دوژمن موسڵمانان سورێك چوون، یەکێك لە بێباوەڕانم دی دای بەسەر موسڵمانێکدا، منیش لە پشتەوە دام لە ڕەگی ملی و قەڵغانەکەم بڕی و ئەویش لایکرد بە لامدا و باوەشی پیاکردم و بۆنی مەرگم لێ بەدی کرد، پاشان مرد، چووم و گەشیتمە عومەر(ﷺ) وتم باری خەڵکی چۆنە؟ وتی: فەرمانی خودا، گەڕانەوە و پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبوو فەرمووی(من قتل قتیلا له علیه بینه فله سلبه) واتە(هەرکەس دوژمنێکی کوشتبێ و بەڵگەی لەسەری هەبێ ئەوا شمەکەکەی بۆ ئەوە) منیش هەستام و وتم کێ شایەتیم بۆ دەدات؟ دوایی دانیشتم و پێغەمبەر(ﷺ) هەمان شتی فەرموو، منیش وتم: کێ شایەتیم بۆ دەدات؟ پاشان دانیشتم و پێغەمبەر(ﷺ) هەمان شتی فەرموو: وتم کێ شایەتیم بۆ دەدات، پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی فەرموویەوە. منیش وتم کێ شایەتی بۆ دەدات، ئینجا دانیشتم، پێغەمبەر(ﷺ) هەمان شتی فەرموو، منیش هەستام، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(ما لك یا أباقتادە) واتە(چیتە ئەبو قەتادە؟) منیش پێم وت چی بووە، یەکێك وتی ڕاست دەکات، شمەکەکەی لای منە بیبەوە لێم، ئەبو بەکر وتی: نە بەخودا ناکرێ شێرێك لە شێرەکانی خوا و پێغەمبەر(ﷺ) شتەکەی بدات بە تۆ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(صدق فأعطه) واتە(ڕاست دەکات دە بیدەرێ) ئەویش دای پێم و منیش لەناوبەنی سەلەمدا دوشە خورمایەکم پێ کڕی و ئەوە یەکەم سەرمایەی ناو ئیسلامم بوو.[1][2]

ئیبن عەساکیر لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی حەدرەدی ئەسلەمیەوە(ﷺ) هێناویەتی کە جوولەکەیەك چوار درهەمی لای بوو، هەڵمەتی بردە سەری و داوای درهەمەکانی

[1] - ضعيف.

[2] - موسلیم ج٢ ص٨٦ و ئەبو داود ج٢ ص١٦ و ترمزی ج١ ص٢٠٢ و ئیبن ماجە ص٢٠٩ و بەیهەقی ج٩ ص٥٠ هێناویانە.

کردەوە، وتی ئەی موحەممەد من چوار درهەمم لای ئەمەیە ونامداتەوە، ئەویش فەرمووی(أعطه حقه) واتە(مافەمەی بدەوە) وتی: سوێند بەوەی تۆی بە حەق ناردووە ناتوانم بی دەمەوە، فەرمووی(مافەکەی بدەرەوە) منیش هەمان واتام وتەوە، پێم وتوە تۆ دەماننێریت بۆ خەیبەر هیوام وایە دەستکەوێکمان دەست بکەوێت ئەوکات دەگەڕێمەوە و دەیدەمەوە، فەرمووی(مافەکەی بدەرەوە) پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەگەر سێ جار شتێکی بوایە دەستبەرداری نەدەبوو، ئیبن ئەبی حەدرەد چوو بۆ بازاڕ و لەسەر سەری کلاوێك بوو و بە قوماشێك دایپۆشیبوو، مێزەکەی سەری لا برد و ئەوی دانا و قوماشەکەی دا ماڵی و وتی: ئەمەم لێ بکڕە، ئەویش بە چوار درهەم کڕی، ئافرەتێکی پیر بەوێدا تێپەڕی و وتی: چیتە ئەی هاوەڵی پێغەمبەر؟ ئەویش پێی وت چی بووە، ئافرەتەکەش وتی ها ئەوە بۆ تۆ، ئەوی لەسەری بوو(قوماش) فڕێی دا بۆی.[1]

ئیبن ئەبی شەیبە و ئەبو سەعیدی نەقاش لە ئوم سەلەمەوە(رضي الله عنها) هێناویانە دەڵێت: دوو لە پشتیوانان ناکۆکیان هەبوو هاتنە خزمەت پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەسەر کێشەی میرات و بەڵگەیان لەسەری نەبوو، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(إنکم تختصمن الي وانما أقضي برأيي فيما لم ينزل علي فيه، فمن قضيت له فيه بعجة يقتطع بها شيأً من حقا أخيه فلا يأخذه فانما اقطع له قطعة من النار يأتي يوم القيامة انتظاماً في عنقنه) واتە(ئێوە کێشەتان هێناوەتە لای من و منیش ڕای خۆم دەڵێم و لەسەری سروشم بۆ دانەبەزیوە، هەر کامتان بە پێی بەڵگەکەی شتێکم بۆ ببڕنەوە و لە مافی براکەی تیابوو با نەیبات بۆ خۆی چونکە ئەوە بەشە ئاگرێکە بۆی دەبڕمەوە و لە ڕۆژی دواییدا کە دێت وەك بازنەی دەوری گەردنی لە ملی ئاڵێنراوە). هەردوو کابرا گریان و هەرکامیان دەیوت: ئەی پێغەمبەری خوا مافەکەی من بۆ ئەوە

[1]- لە کنز العمال ج٣ ص١٨١ دا وا هاتووە و ئەحمەدیش هێناویەتی و لە الاصابە ج٢ ص٢٩٥ یشدا هاتووە.

**پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(اما اڎا فعلتما ما فعلتما فاڎهبا و توخّیا الحق واستهما و لیعلل کل واحد منکما صاحبه) واته(دەی ئەگەر واتان کرد بڕۆن و بە دووی حەقدا بگەڕێن و هەریەکەو پشکێك ببەن و هەرکامتان گەردنی ئەوی ترتان ئازاد بکەن)[1,2].**

**ئیبن ماجە لە ئەبی سەعیدەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: دەشتەکیەك هاتە خزمەت پێغەمبەر(ﷺ) و داوای دانەوەی عەرزێکی دەکرد لەسەری بوو، زۆری بۆ هێنا تا ئەوەی وتی: وازت لێ ناهێنم تا نەمدەیتەوە، هاوەڵانی لێی هەستان و وتیان قوڕت بەسەر دەزانیت لەگەڵ کێ قسە دەکەیت؟ وتی من داوای مافی خۆم دەکەم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(هلا مع صاحب الحق کنتم؟) واته(کامتان دەچن لەگەڵ ئەم خاوەن مافەدا؟) پاشان ناردی بۆ لای خەولەی کچی قەیس و پێی فەرموو:(ئەگەر خورمات لایە بە قەرز بمان دەرێ تا خورمامان بۆ دێت و قەرزەکەت دەدەینەوە) وتی: بەڵێ بە دایك و باوکمەوە بە قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خودا. بە قەرز پێی دا و قەرزەکەی بردەوە. ئەویش وتی خوا وەفادارت بکات وەفات هەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی(أولئك خیار الناس انه لا قدست أمة لا یأخذ الضعیف فیها حقه غیر متعتع) واته(ئەوانە چاکترینی خەڵکن، پیرۆزی نی یە لە ئومەتێکدا کە تیایدا لاواز مافی خۆی وەرنەگرێتەوە تا ماندوو نەکرێت)[3,4].**

**تەبەرانیش لە خەولەی کچی قەیسی ژنی حەمزەی کوڕی عەبدولمەتەلیبەوە هێناویەتی دەڵێت: پێغەمبەر(ﷺ) بارێ خورمای کەسێکی بەنی ساعیدە قەرزار**

---

[1] - صحیح.

[2] - لە کنز العمال ج٣ ص١٨٢دا هاتووە.

[3] - صحیح.

[4] - بەزار لە فەرموودەکەی عائیشەوە(رضي الله عنها) بە کورتی هێناویەتی و تەبەرانیش لە فەرموودەکەی ئیبن مەسعوودەوە بە سەنەدی جەیید هێناویەیتی لە الترغیب و الترهیب ج٣ ص٢٧٤١ یشدا هاتووە.

بوو، کابرا هات بۆ داوای قەرزەکەی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی بە یەکێ لە پشتیوانان کرد، ئەویش خورمایەکی تری پێدا کابراش قەبووڵی نەکرد، هاوەڵەکە وتی ئەوە بەرامبەر بە پێغەمبەر(ﷺ) دەگێڕێتەوە؟ ئەویش وتی بەڵێ ئیتر لە پێغەمبەری خودا کێ شیاوترە بە دادپەروەری. چاوەکانی پێغەمبەر(ﷺ) فرمێسکاوی بوون و فەرمووی(صدق ومن أحق بالعدل مني! لاقدّس الله امه لا يأخذ چعيفها حقه من شديدها و لا يتعتعه) واتە(ڕاست دەکات کێ لە من شیاوترە بە دادپەروەری، خوا پیرۆزی نەهێڵێ لە ئومەتێکدا کە لاواز یان بەبێ ماندوو کردن نەتوانێ مافی لە بەهێزیان وەربگرێتەوە) پاشان فەرمووی(يا خولة عديه واقضيه فأنه ليس من غريم يخرج من عند غريمه راضياً الا صلّت عليه دواب الارض و نون البعار، وليس من عبد يلوى غريمه و هو يجد الا كتب الله عليه في كل يوم و ليلة اثما) واتە(خەولە بڕۆ بۆی بژمێرە و بیدەرەوە،چونکە هەرکەس خاوەن قەرزەکەی بە ڕەزامەندی لای بچێت ئەوا ئاژەڵی سەرزەوی و گیانداری ناو دەریا سەڵەواتی لەسەر دەدەن، هەر بەندەیەکیش توانای هەبێ و لانەکاتەوە بە لای خاوەن قەرزەکەیدا خوای گەورە هەموو شەو و ڕۆژێك تاوانی لەسەر دەنووسێت[1].[2]

---

[1] – ضعيف.

[2] – ئەحمەد بە هەمان شێوە لە عائیشەوە(رضي الله عنها) بە سەنەدی بەهێز هێناویەتی. لە الترغب و الترهيب ج٣ ص٢٧٠ یشدا هاتووە.

## (دادپەروەری ئەبو بەکر(رضي الله عنه))

بەیهەقی لە عەبدوڵڵای کوڕی عاصمەوە هێناویەتی ئەبو بەکر(رضي الله عنه) ڕۆژێکی هەینی هەستا و وتی: بۆ بەیانی سەدەقەی وشتر بێنن تا دابەش بکرێت و کەس بە بێ مۆڵەت نەیەت بۆ لامان، ئافرەتێك بە پیاوەکەی وت: ئەم هەوسارە بگرە بەڵکو خودای گەورە وشترێکمان پێ ببەخشێ، کابرا هات و سەیری کرد ئەبو بەکر و عومەر(رضي الله عنه) چوونەتە ناو وشترەکانەوە، ئەویش لەگەڵیان چوو، ئەبو بەکر لایکردەوە و وتی: بۆچی هاتیت؟ هەوسارەکەی لێسەند و لێیدا. کە ئەبو بەکر لە دابەشکردنی وشترەکان بوویەوە کابرای بانگ کرد و هەوسارەکەی پێدا و وتی: ئادەی تۆڵە بکەرەوە، عومەر وتی: نە بەخودا ئەمە ناکەیت بە سوننەت لێت ناداتەوە، ئەبو بەکر وتی: ئەی لە ڕۆژی دوایی لەبەردەم خوادا کێ فریام دەکەوێت؟ عومەر وتی: ڕازی بکە، ئەبوبەکر بە غولامەکەی وت وڵاخێك وشمەکی وڵاخەکەو کۆپانەکەشی بۆ بهێنێ لەگەڵ پێنج دیناردا بەوە ڕازی کرد.[1]

## (دادپەروەری عومەری فاروق(رضي الله عنه))

ئیبن عەساکیر و سەعیدی کوڕی مەنسوور و بەیهەقی لە شەعبیەوە هێناویانە دەڵێت: کێشەیەك لە نێوان عومەرو ئوبەی کوڕی کەعبدا هەبوو، عومەر وتی: با کەسێك ببێتە دادوەری نێوانمان، زەیدی کوڕی سابتمان دانا، هاتن بۆ لای، عومەر وتی: هاتووی تا دادوەری نێوانمان بکەیت و لەماڵەوەیدا حکمەوە بدرێت، کە چوونە ژوورەوە بۆ لای زەید بەڕەکەی ژێری فراوان کرد و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران لێرەدا دانیشە، عومەر پێی وت: ئەوە یەکەم ستەمە کە لە حوکمدانەکەتدا کردت. بەڵکو لای بەرامبەرەکەم دادەنیشم، هەردووکیان لەبەردەستیدا دانیشتن. ئوبەی سکاڵای کرد و بێزاری خۆی دەربڕی، زەید وتی:

---

[1] – لە کنزالعمال ج٣ ص١٢٧ دا وا هاتووە.

ڕێبدە با سوێندی ئەمیری باوەڕداران نەدەم و بۆ جگە لە کەسی تریش داوام نەکردووە، عومەر سوێندی خوارد، پاشان سوێندی خوارد زەید لە دادوەری نازانێت تا ئەوەی عومەر و تاکێك لە موسوڵمانان لای یەکسان نەبن، ئیبن عەساکیر لە شەعبییەوە هێناویەتی دەڵێت: لەسەر بەشەدار خورمایەکی ئوبەی کوڕی کەعب و عومەری کوڕی خەتتاب ناکۆکیەك ڕووی دا، ئوبەی گریا و دواتر وتی: بە دەستەڵاتەوە دەنازیت ئەی عومەر؟ عومەر وتی: دەی یەکێك لە موسوڵمانان بکەرە دادوەری نێوان من و تۆ، ئوبەی وتی زەید، چوون بۆ لای – ئینجا فەرمووده‌کە دێنێت.[1]

عەبدوڕەزاق لە زەیدی کوڕی ئەسلەمەوە هێناویەتی دەڵێت: عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب لە پاڵ مزگەوتی مەدینەدا ماڵێکی هەبوو پێی وت: پێم بفرۆشە، عومەر ویستی بیخاتە سەر مزگەوتەکە، بەڵام عەبباس ئامادە نەبوو پێی بفرۆشێت، عومەر وتی دەی خەڵاتی بکە پێم، هەر ئامادە نەبوو، عومەر وتی: دەی خۆت بیخەرە سەر مزگەوت، هەر ئامادە نەبوو، عومەر وتی: هەردەبێت یەکێکیان بکەیت، ئەویش ئامادە نەبوو، عومەر وتی دەی کەسێك بکە بە دادوەری نێوانمان، ئەویش ئوبەی کوڕی کەعبی(رضي الله عنه) دانا، چوون بۆ لای ئوبەی بە عومەری وت: پێم وانییە بکرێ دەری بکەیت تا ڕازی نەکەیت. عومەر وتی: ئەم بڕیارەت لە قورئان یان سوننەتی پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) بەدی کردووە؟ وتی: بەڵکو لە سووننەتی پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم)، عومەر وتی: من گوێم لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوو دەیفەرموو(ان سليمان بن داود – عليهما السلام – لما بنى بيت المقدس جعل كلما بنى حائطا اصبح منهدما، فأوحى الله اليه ان تبن فى حق رجل حتى ترضيه) واتە(سولەیمانی کوڕی داود – سەلامی خوایان لێبێ – کاتێك بەیتولمەقدیسی بنیاد نا هەرکات دیوارێکی بنیاد دەنا دەڕووخا خوای گەورە سروشی بۆ نارد کە تاکەسێك ڕازی

---

[1] – لە کنزالعمال ج۳ ص١٧٤ و ج۳ ١٨١ یشدا هاتووە.

نەکـەیت لەسـەر مـاف و حـاڵ و مـاڵی بنیـاد مـەنێ). عومـەریش وازی لێهێنـا و عەبباسیش دواتر فراوانی کرد بۆ سەر مزگەوتەکە.

عەبدوڕەزاقیش لە سەعیدی کوڕی موسەیبەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەر(رضي الله عنه) ویـستی مـاڵی عەبباسـی کـوڕی عەبدولموتـەلیب(رضي الله عنه) وەربگـرێ و بیداتـە پـاڵ مزگەوت، عەبباس ڕازی نەبوو، عومەر وتی هەر دەبێ وەریگرم، وتی با دادوەرێك لە نێوانماندا هەبێ ئوبەی کوڕی کەعب، وتی باشە، چوون بۆ لای ئوبەی و باس و حاڵیان بۆ گێڕایەوە، ئوبەی وتی: خوا سروشی دابەزاند بۆ سولەیمانی کوڕی داود – علیهما السلام – کـە بەیتولمەقـدیس بنیـاد بنـێ، ئـەوێ زەوی کابرایـەك بـوو، سولەیمان لێی کڕی، کە پارەکەی پێدا وتی ئەوەی پێت دام باشتر بوو لەوەی لێت بردم؟ وتی: ئەی ئەوەی لە منت وەرگرت؟ وتی: بەڵێ ئەوەی لە تۆم وەرگرت، وتـی: دەی من نایدەم، دواتر سولەیمان بە پارەیەکی زیاتر لەوە لێی کڕی، کابرا دوو یان سێ جار ئەو شتەی دووبارە کردەوە، سولەیمان – علیه السلام – مەرجی لەسەر دانا بەو جۆرەی تۆ دەتەوێت نایکڕم، ئیتر لێم نەپرسی کامیان باشترە، ئینجا بە حوکمی خۆی لێی کڕی و ئەویش دوانزە هەزار قینتاری زێڕی دانا، سولەیمان ئەوەی لەسەر زۆر بوو تا پێی بدات، خوای گەورە سروشی بۆ دابەزاند ئەگەر لە هی خـۆت چـی پـێ دەبەخـشی ئـەوە خـۆت باشـتر دەزانیـت، ئەگـەر لـە ڕۆزی ئێمـەوە دەیبەخشیت هێندەی بدەرێ تا ڕازی دەبێت، ئەویش وای کرد، ئوبەی وتـی: من وای دەبینم عەبباس شیاوترە بە ماڵەکەی تا ئەوەی ڕازی بکەیت، عەبباس وتی دەی مادەم لە بەرژەوەندی من بڕیارت دا ئەوا کردم بە خێر بۆ موسڵمانان.[1]

---

[1]- لە کنزالعمال ج٤ ص٢٦٠ دا هاتووە، ئیبن سعد ج٤ ص١٣ و ئیبن عەساکیر لە سالم ئەبی نەزرەوە بە دوورو درێژی هێناویەتی و سەنەدەکەی صەحیحە، بەڵام سالم عومەری نەبینیوە، بەیهەقی و یەعقوبی کوڕی سوفیانیش لە ئیبن عەبباسەوە بە کورتی و بە سەنەدی حەسەن هێناویانە. لە کنزالعمال ج٧ ص٦٦ دا هاتووە، حاکم و ئیبن عەساکیر لە ڕێگەی ئەسلەمە لە

عەبدورِەزاق و بەیهەقی لە ئیبن عومەرەوە هێناویانە دەڵێت: عەبدورِەحمانی برام لەگەڵ ئەبو سروعە عوتبەی کوڕی حارسدا – لە میسر – لە سەردەمی عومەردا(رضي الله عنه) مەییان خواردەوە و سەرخۆش بوون، بۆ بەیانی چوون بۆ لای عەمری کوڕی عاصی ئەمیری مسیر و وتیان پاکمان بکەرەوە – چونکە سەرخۆش بووین – عەبدوڵلا دەڵێت: براکەم بۆی گێرامەوە ئەو سەرخۆش بوو، وتم: بچۆرە ژوورەوە پاکت دەکەمەوە، نەمزانی ئەوان هاتوون بۆ لای عومەر، براکەم پێی وتم ئەمیر ئەوەی گەیاندووە بە عومەر، وتم ئەمڕۆ لەگەڵ سەری خەڵکدا سەرت دەتاشم. ئەوکات لەگەڵ لێدانی حەددا سەریان دەتاشی، هەردووکیان چوونە ماڵ، عەبدوڵلا دەڵێت بە دەستەکانی خۆم سەریم تاشی، پاشان عەمر جەڵدی لێدان، عومەر ئەوەی بیست و نامەی نووسی بۆ عەمر عەبدوراحمانم لەسەر پشتی ولاخێ بۆ بنێرە، ئەویش وایکرد. کە هات بۆ لای عومەر جەلدی لێدا و سەرکۆنەی کرد لەبەر پلە و پایەی ئەو. پاشان ناردیەوە و مانگێکی تەواو مایەوە و دوای ئەوە تووشی دەرد بوو و مرد، خەڵکی هەموو وتیان بە هۆی جەلدەکانی عومەرەوە مردووە و لەبەر جەڵدەکانی عەمر نەمردووە.[1]

عەبدورِەزاق و بەیهەقی لە حەسەنەوە هێناویانە دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) ناردی بە شوێن ئافرەتێکدا کە مێردەکەی نەمابوو و خەڵکی دەچوون بۆ لای ئەویش ئەوەی پێ خۆش نەبوو، ناردی بە شوێنیدا و پێی وترا: وەڵامی عومەر بدەرەوە، ئەویش وتی ئەی هاوار، من و عومەر، لە ڕێگەدا ترسا و هۆش

---

لایەکی ترەوە بە دوورو درێژی هێناویانە، لە کنزالعمال ج٧ ص٦٥ دا هاتووە و لە فەرموودەکەدا لە جیاتی ئوبەی کوڕی کەعب(رضي الله عنه) حوزەیفە(رضي الله عنه) هاتووە.

[1] – لە المنتخب کنز العمال ج٤ ص٤٢٢دا هاتووە: سەنەدەکەی صەحیحە، ئیبن سەعد لە ئەسلەم لە عەمری کوڕی عاصمەوە بە دوور و درێژی هێناویەتی، لە المنتخب کنز العمال ج٤ ص٤٢٠ دا هاتووە.

بردیەوە(ئازاری منداڵ بووە) بردیانە ماڵ و لەوێ مناڵەکەی بوو. منداڵەکە دوو قیژەی کرد و دواتر مرد، عومەر ڕاویژی کرد بە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) هەندێکیان وتیان هیچت لەسەر نی یە تۆ بۆ ڕێنموونی و تەمێکردن وات کردووە، عەلی(رضي الله عنه) بێدەنگ بوو، عومەر ڕوویکردە عەلی و وتی تۆ چی دەڵێیت؟ وتی ئەگەر ئەوان وا دەڵێن ئەوا ڕاکەیان دروست نی یە، ئەگەریش لەبەر ئارەزووی تۆ دەیڵێن ئەوا ئامۆژگاری کەرت نین، من پێم وایە دەبێت لە بریەکەی(دیە) بدەیت، چونکە تۆ ترساندووتە و ئەویش لە ترسی تۆ منداڵەکەی لەبار بردووە. ئەویش فەرمانی بە عەلی کرد تا لە بریەکەی دابەش بکات بەسەر قورەیشدا، واتە لە بریەکەی لە هەموو قورەیش بسەنێ، چونکە ئەو هەڵەی کردووە.[1]

ئیبن سەعد ج٣ ص٢١١ لە عەتائەوە عێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب فەرمانی بە کاربەدەستەکانی دەکرد تا لە کاتی حەجدا بێن بۆ لای کە کۆبوونەوە وتی:

(خەڵکینە! من کاربەدەستانم نەناردووە بۆتان تا لێتان بسێنن و ماڵ و سامانتان ببەن، بەڵکو ناردوومن تا نێوانتان ڕێك بخەن و لە نێوانتاندا دەستکەوتەکان دابەش بکەن، هەرکەس جگە لەوەی لەگەڵدا کراوە با هەستێتە سەرپێ) کەس هەڵنەسا جگە لە یەك کەس کە وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران فلان کاربەدەستت سەد قامچی لێدام، وتی لەبەرچی؟ هەستە تۆڵەی خۆتی لێ بکەرەوە، عەمری کوڕی عاص هەستاو وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەگەر ئەوە بکەیت بارت سەخت دەبێ و دەبێتە باوو سوونەت و لە دوای خۆیشت پەیڕەو دەکرێ، وتی: من گوێم لێ نی یە گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو خۆی وای دەگرتەبەر، وتی: دەی ڕێمان بدە تا ڕازی بکەین، وتی باشە ڕازی بکەن، ئەویش دووسەد دیناری پێدا، بۆ هەر قامچ یەك دوو دینار.[2]

---

[1] – لە کنز العمال ج٧ ص٣٠٠ دا وا هاتووە.

[2] – ئیبن ڕاهەویەش هێناویەتی. لە منتخب کنز العمال ج٤ ص٤١٩ یشدا هاتووە.

ئیبن ئەبولحەکەم لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی کەسێکی خەڵکی میسر هات بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ستەمم لێکراوە و پەنام هێناوەتە لات، وتی دەی بێخەمبە پەناکەت دروستە، وتی: لەگەڵ کوڕەکەی عەمری کوڕی عاصدا پێشبڕکێم کرد و بردمەوە، ئەویش بە قامچی لێی دام و دەیوت من کوڕی دوو ڕێزدارەکەم، عومەریش نامەی بۆ عەمر نووسی و فەرمانی پێکرد بە خۆی و کوڕەکەیەوە بێت، ئەویش هات، عومەر وتی: کوا میسریەکە؟ قامچی یەکە بگرە و لێی دە، ئەویش لێیدەدا و عومەریش دەیوت بدە لە ٠ابن الاکرمین)، ئەنەس دەڵێت سوێند بەخوا کە لێی دەدا ئێمە حەزمان لە لێدانی دەکرد، کە لێبووەوە حەزمان دەکرد وازی لێ بهێنێ/ پاشان بە میسری یەکەی وت: بکەوەرە عەمریش، وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران تەنها کوڕەکەی لێیدام و منیش تۆڵەی خۆمم لێکردەوە، عومەر بە عەمری وت: بێدەنگ، چون خەڵکیتان کردووە بە کۆیلە لە کاتێکدا بە ئازادی لە دایك بوون؟ وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران نەمزانیوە و ئەمەش نەهاتووە بۆ لام.[1]

ئیبن جەریر لە زەیدی کوڕی ئەبی مەنسوورەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) بیستی ئیبن جارود یان ئیبن ئەبی لجارودی کاربەدەستی لە بەحرەین کەسێکی بۆ هێنراوە بە ناوی ئەدریاس بەڵگەی لەسەر بووە بەوەی پەیوەندی هەبووە لەگەڵ دوژمنی موسڵماناندا و ویستوویەتی پەیوەستیان بێت، بۆیە دای لە ملی و ئەویش دەیوت: هاوار بۆ عومەر گیان! هاوار بۆ عومەر گیان! عومەریش نووسی بۆ کاربەدەستی ئەویّ کە بێت بۆ لای، ئەویش هات و عومەر خەنجەرێکی لە دەستدا بوو دانیشت، هاتە لای عومەر و عومەر بە خەندەرەکەی دەستی ڕەیشی بەرز دەکردەوە و دەیوت: بەڵێ: ئەدریاس/ بەڵێ ئەدریاس، جاروود دەیوت: ئەی ئەمیر باوەڕداران ئەو نهێنی موسڵمانانی نووسیبوو بۆ دوژمن و

[1] – لە منتخب کنز العمال ج٤ ص٤٢٠ دا وا هاتووە.

دەیویست بکات پێیان، عومەر وتی لەسەر ویستەکەی کوشتت؟ کامەمان وستی بۆ نییە، ئەگەر سوننەت نەیوایە بەمە دەمکوشتیت.[1]

بەیهەقی لە زەیدی کوڕی وەهبەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەر هاتە دەرێ و قەنجەکانی لە گوێدا وون و دەیوت: بەڵێ! بەڵێ! خەڵکی وتیان ئەوە چییەتی؟ وتی: نامەی هەندێ سەرکردەی بۆ هاتووە کە ڕووبارێك ناهێڵێت بپەڕنەوە و کەشتیشیان نی یە، ئەمیرەکەیان وتی: بگەڕێن بزانن کەس هەیە شارەزای قوڵایی ڕووبارەکە بێت؟ پیرێك هێنرا. وتی: من لەسەرما دەترسم، چونکە کاتی سەرما بوو، ئەویش زۆری لێ کرد و بە زۆر ناردی یە ناوی، بەرگەی سەرمای نەگرت و هاواری دەکرد: وەی بۆ عومەر گیان تا ئەوەی خنکا، عومەر(رضي الله عنه) نامەی بۆ ئەمیرەکە نووسی و هێندەی نەبرد تا هات، چەند ڕۆژێك گوێی پێنەدا و چوو بە دەمیەوە، ئەگەر بەرامبەر بە کەسێکیان توندی هەبوایە وای دەکرد، پاشان وتی ئەو کابرات کە کوشت چی کردبوو؟ وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران نیازم کوشتنی نەبوو، هیچ چارێکمان نەبوو بۆ پەڕینەوە، ویستمان قووڵایی ئاوەکە بزانین و ئەو شوێنە و ئەو شوێنەمان فەتح کرد، عومەر وتی: یەك کەسی موسڵمان لام زۆر خۆشەویست ترە لە هەموو ئەوەی فەتحت کردووە، ئەگەر لەبەر بوون بە سوننەت نەبوایە دەمدا لە ملت، دەی بڕۆ خوێن بابیەکەی بدە بە کەس و کارەکەی، بڕۆ نەتبینم.[2]

بەیهەقی لە جەریرەوە هێناویەتی کابرایەك لەگەڵ ئەبوو مووسا بوو دەستکەوتێکیان بەدەست هێنا، ئەبو موسا پشکەکەی پێدا و هەمووی پێ نەدا، کابراش وتی دەبێت هەمووم بدەیتێ، ئەبو مووسا بیست قامچی لێدا و سەری تاشی، ئەویش قژەکانی خۆی کۆ کردەوە و چوو بۆ لای عومەر(رضي الله عنه) لە گیرفانیدا

---

[1] – لە کنزالعما ج ٧ ص٢٩٨ دا وا هاتووە.

[2] – لە کنزالعمال ج٧ ص٢٩٩ دا وا هاتووە.

بڕێ لە قڕەکەی دەهێناو دای لەسەر سنگی عومەر، عومەر وتی: چیتە؟ ئەویش باسەکەی بۆ گێڕایەوە، عومەریش نامەی نووسی بۆ ئەبو مووسا(رضي الله عنه):

(سەلامت لێ بێت! پاشان! فلانی کوڕی فلان هەواڵی وای پێداوم، سوێندت دەدەم ئەگەر لەناو خەڵکدا وات کردووە لەناو خەڵکدا دادەنیشیت و تۆڵەت لێبکاتەوە، ئەگەریش ئەوەت لە چۆڵەوانیدا کردووە ئەوا لە چۆڵەوانیدا دابنیشە تا تۆڵەت لێبکاتەوە).

کە نامەکەی پێدا دانیشت بۆ تۆڵە سەندنەوە، کابرا وتی: لەبەر خوا لێی خۆش بووم.[1]

ئیبن عەساکیر لە حەزماویەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) نامەی نووسی بۆ فەیروزی دەیلەمی(رضي الله عنه):

(پاشان! پێم گەیشتووە سەرقاڵبوویت بە خواردنی هەنگوینی پوختەوە، ئەم نامەم گەیشتە دەستت پشت بە خوا هەستە سەرپێ و لە پێناو خودا بکەوەرە غەزاکردن).

فەیروزیش هات و داوای مۆڵەتی لە عومەر کرد(رضي الله عنه)، ئەویش مۆڵەتی دا، گەنجێکی قورەیش هاتە ڕێی، فەیروز دەستی بەرز کردەوە و دای لە لووتی قورەیشی یەکە، قورەیشی یەکە بە خوێنی لووتیەوە هات بۆ لای عومەر(رضي الله عنه) پێی وت کێ وای لێ کردیت؟ وتی: فەیروز، وا لەبەر دەرگایشە، مۆڵەتی دە تا فەیروز بێتە ژوورەوە، ئەویش هاتە ژوورەوە، وتی فەیروز ئەمە چی یە؟ وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئێمە تازە دەستەڵاتمان وەرگرتووە تۆ نامەت بۆ من نووسی نەوەك بۆ ئەو، مۆڵەتی منت دا بێمە ژوورەوە نەوەك ئەو، ئەویش ویستی پێش من بێتە ژوورەوە، منیش وام لێکرد، عومەر وتی: تۆڵە بکەرەوە، فەیروز وتی چاری تر نی یە؟ وتی نا چاری تر نی یە؟ فەیروز لەسەر ئەژنۆ کەوت و گەنجەکە هەستا تا تۆڵەی خۆی بکاتەوە، عومەر پێی وت: گەنجەکە پەلە مەکە، تا فەرموودەیەکی پێغەمبەرت(صلى الله عليه وسلم) بۆ بگێڕمەوە، جارێکیان گوێم لە

[1] - لە کنز العمال ج٧ ص٢٩٩ دا وا هاتووە.

پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو:(قتل الليلە الاسود العنسی الکڑاب! قتله العبد الصالح فیروز الدیلمی) واتە(ئەم شەو ئەسوەدی عەنەسی درۆزن کوژرا! بەندەی پیاو چاك فەیروزی دەیلەمی کوشتی) ئێستا دوای فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) هەر تۆڵەی لێ دەسێنیتەوە؟ گەنجەکە وتی: پاش بیستنی ئەوە لێی خۆش بووم، فەیروز بە عومەری وت: پێت وایە دەرباز کردنی من لەو کارەم و لێخۆش بوونی ئەو لە من بە ناحەزی نەبوبێت؟ وتی: بەڵێ، فەیروز وتی: دەی تۆ بە شایەت دەگرم شمشێرەکەم و ئەسپەکەم و سی هەزار لە ماڵەکەم خەڵاتی ئەو بێت، ئەویش وتی: ئەی قورەیشی بە چاوەڕوانی پاداشتی دواڕۆژ لێی خۆش بوویت و سامانیشت وەرگرت.[1]

تەبەرانی لە المعجم الاوسط و ئیبن کەسیر و بەیهەقی لە ئیبن عەبباسەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: کەنیزەکێك هات بۆ لای عومەر و وتی: گەورەکەم تۆمەتباری کردووم و لەسەر ئاگر دایناوم تا شەرمگەم سووتا، عومەر پێی وت: ئەوەی لا بەدیکردیت(بینی)؟ وتی: نا، وتی: ئایا تۆ هیچت پێ وت، وتی: نا، عومەر وتی: دەی خۆم چاری دەکەم، کاتێك عومەر پیاوەکەی بینی وتی: سزای خوا دەگیریتە بەر؟ وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران لە دەروونی خۆمدا بە تاوانبارم زانی، عومەر وتی دەی وابوو؟ وتی: نا، عومەر وتی: خۆی دانی بە هیچدا نا، وتی: دەی سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە ئەگەر گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) نەبوایە کە دەیفەرموو(لایقادمملوك من مالكه و لا ولد من والده) بە دڵنیاییەوە ئەو کەنیزەکەم نەدەدایەوە، پاشان سەد قامچی لێدا، بە کەنیزکەکەشی وت بڕۆ تۆ ئازادی و دۆستی خوا و پێغەمبەرەکەیتی، شایەتی دەدەم کە پێغەمبەر(ﷺ) م بیست دەیفەرموو(من حرّق بالنار او مثل به فهو حرّ و هو مولى الله ورسوله)[2,3].

بەیهەقی لە مەکعوولەوە هێناویەتی عوبادەی کوڕی صامت(رضي الله عنه) کەسێکی نەبتی بانگ کرد تا لەلای بەیتولمەقدیس وڵاخەکەی بۆ ڕابگرێت، بەڵام ئەو ئامادە

[1] – لە کنزالعمال ج٧ ص٨٣ دا وا هاتووە.

[2] – ضعیف.

[3] – لە کنزالعمال ج٧ ص٢٩٩ دا وا هاتووە.

نەبوو، ئەویش لێیدا پیایا هەڵشاخی، ئەویش لە دژی سکاڵای بردە لای عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه)، عومەر پێی وت بۆچی وات کرد؟ وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران فەرمانم پێ کرد وڵاخەکەم ڕابگرێت کەچی نەیکرد، منیش کەسێکم ئەوەم پێ قبوڵ ناکرێ بۆیە لێمدا، وتی: دانیشە بۆ تۆڵە سەندنەوە، زەید وتی تۆڵەی کۆیلەیەکەت لە براکەت دەکەیتەوە؟ عومەر(رضي الله عنه) دەستبەردار بوو و لە بری قەرەبوو و پارەی دانا.[1]

ئەبوعوبەیدە و بەیهەقی و ئیبن عەساکیر لە سوەیدی کوڕی غەفلەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت: کە عومەر(رضي الله عنه) هاتە شام کەسێك لە ئەهلی کیتاب هات بۆ لای و وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران یەکێك لە باوەڕداران ئاوای پێ کردووم کە دەیبینیت، دەڵێت: کوترا بوو و لێی درابوو، عومەر(رضي الله عنه) زۆر تووڕە بوو، پاشان بە صوهەیبی وت بڕۆ بزانە کێ وای لێ کردووە بیهێنە بۆ لام، صوهەیبیش چوو سەیر دەکات عەوفی کوڕی مالیکی ئەشعەریەوە(رضي الله عنه) وتی: ئەمیری باوەڕداران زۆر لە دەستت تووڕەیە، بۆیە موعازی کوڕی جەبەل(رضي الله عنه) بهێنە تا بیدوێنێت چونکە دەترسم خێرا تێت بکەوێت، کە عومەر لە نوێژ بوویەوە وتی: صوهەیب کوا؟ کابرات هێنا؟ وتی بەڵێ، عەوفیش چوویە لای موعاز و پێی وت چی بووە و موعازی هێنا، موعازیش وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەوە عەوفی کوڕی مالیکە گوێی لێبگرە و پەلە بڕیاری لەسەر مەدە، عومەر پێی وت: لەگەڵ ئەم کابرا چیت بووە؟ وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەم کابرام بینی ئافرەتێکی موسڵمانی لەسەر گوێدرێژێك بەڕێدەکرد، نەقیزەی گوێدرێژەکەی دا تا ئافرەتەکە بکەوێت، ئافرەتەکە نەکەوت، کەچی ئەم پاڵی پێوە نا و خستی، ئافرەتەکە بوورایەوە، ئەویش وتی ئافرەتەکەم بۆ بهێنن تا بزانم وایە کە تۆ دەیڵێیت؟ عومەر چوو بۆ لای ئافرەتەکە، باوك و مێردی ئافرەتەکە وتیان بەوە ئابڕومان دەبەیت، ئافرەتەکە وتی بە خوا لەگەڵیدا

[1] – لە کنزالعمال ج٧ ص٣٠٣ دا وا هاتووە.

دەچم، باوك و مێردی ژنەكە وتیان لە جیاتی تۆ ئێمە دەچین و قسەت دەگەیەنین، چوونە لای عومەر و هەمان شتیان وت كە عەوف وتی: عومەر فەرمانی كرد جوولەكەكە لە خاچ درا، وتی: لەسەر ئەمە لەگەڵتان رێكنەكەوتین، پاشان وتی: خەڵكینە زیممەو پەنای موحەممەد بپارێزن و وریای بن، هەركام لە ناموسڵمانانیش ئەمەیان كرد(لادان) هیچ پەنایەكی بۆ نی یە، سوەید دەڵێت: هێندەی من دیبێتم ئەو جولەكەیە یەكەم لە خاچ دراوی ناو ئیسلامە.[1]

ئیبن مندە و ئەبو نەعیم لە عەبدولمەلیكی كوڕی یەعلای لەیئیەوە هێناویانە بەكری كوڕی شەداخی لەیسی(رضي الله عنه) لە خزمەتكارانی هەرزەكاری پێغەمبەر(ﷺ) بوو، كە گەیشتە تەمەنی باڵغی هات بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)وتی ئەی پێغەمبەری خودا من جاران دەهاتم بۆ ناو ماڵی تۆ و ژنەكانت،بەلام ئێستا باڵغ بووم، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی:(اللهم صدّق قوله و لقّه النظر) جا لە سەردەمی عومەردا(رضي الله عنه) جولەكەیەك بە كوژراوی بینرا. عومەر ئەمەی لەسەر سەخت بوو و چوویە سەر مینبەر و وتی: ئایا لەو كارەی خوا پێی سپاردووم كەسان زەفەریان پێ ببرێت، خواتان لێ بەشایەت دەگرم شتیی لەسەر دەزانن پێم بڵێن، بەكری كوڕی شەداخ هەستا و وتی: من، وتی: الله اكبر خوێنی دۆزرایەوە، دەی بیڵێ، وتی بەڵێ، فلان كەس چوو بۆ غەزا و منی سپارد بۆ ئاگا بوون لە ماڵ و منداڵی/ منیش چووم و ئەم جوولەكەم لە ماڵەكەیدا بینی كە دەیوت:

| | |
|---|---|
| واشعث غره الاسلام منی | خولت بعرسه لیل التمام |
| أبیت علی ترا ئبها و یمسی | علی جرد الاحقه الحزام |
| كأن مجامع الزبلات منها | فئام ینهچون الی فئام |

[1]- لە كنز العمال ج٢ ص٢٩٩ دا وا هاتووە، تەبەرانی لە عەوفی كوڕی مالیكەوە بە كورتی هێناویەتی، هەیسەمی ج٦ ص١٣ دەڵێت: كەسەكانی سەنەدەكەی صەحیحن، تەواو.

عومـــەر(رضي الله عنه) بـــڕوای بـــە قـــسەکەی کـــرد و خـــوێن بابیەکـــەی بـــە نزاکـــەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەکار خست.[1]

عەبـدوڕەزاق و بەیهـەقی لـە قـاسمی کـوڕی ئـەبی بـەززەوە هێناویانـە کەسـێکی موسڵمان یەکێك لە ئەهلی زممەی لە شام کوشت، شتەکە بەرز کرایەوە بۆ لای ئەبو عوبەیـدەی کـوڕی جـەڕاح(رضي الله عنه)، ئـەویش لـەو بارەیـەوە نامـەی نووسـی بۆ عومـەری کـوڕی خـەتتاب(رضي الله عنه)، عومـەر نووسـی ئەگـەر هـەروا بـووە بیهێنـە و بـدە لـە ملـی، ئەگـەریش هەڵـچوون و نـاڕەزایی بـوو بێـت چـوار هـەزاری خوێنبـایی بێـت، لـە کنزالعمال ج٧ ص٢٩٨ دا وا هاتووە.

مالیك لە کەسێکی خەڵکی کەنار بووی، وتی بیستوومە کەسانێکتان خوازیاری العلج تـا ئـەوەی کـە سـەختی شـاخ هـات و ڕیْ گـر بـوو کـابرا دەڵێـت: مترس دەڵێت: مەترسە، کە پێی دەگات دەیکوژێت، سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ببیـستم هەرکـەس وا دەکـات دەدەم لـە ملـی، ئـیبن صـاعد و لالـەکائی لـە ئـەبی سەلەمەوە(رضي الله عنه) هێناویانە عومەر(رضي الله عنه) وتی: سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە ئەگەر هەرکامتان بە پەنجە ئاماژە بەوە و ئاسمان بکات بۆ بێباوەڕێك و دواتر لەسەر ئەوە بەسەریدا داباڕێت و دواتر بیکوژێت دەیکوژم.[2]

بەیهـەقی ج٩ ص٩٦ لـە ئەنەسـی کـوڕی مالیکـەوە هێناویـەتی دەڵێـت: لـە سـەردەمی عومـەردا گـەمارۆی توسـتورمان دا، هـورمزان هاتەبـەردەم بڕیـاری عومەر(رضي الله عنه) ئەم شتە خراپەیە بەردەم عومەر و هورمزان چوو بۆ لای، کە گەیشتنە لای عومەر پێی وت قسەبکە، وتی: قسەی کەسی زینوویان مردوو؟ وتی: گرفت نی یـە قـسەبکە، وتـی: ئێمـە و ئێـوەی کۆمـەڵی عـەرەب خـا نێـوانی خستبووین، ئێمـە

---

[1]- لـە کنـز العمـال ج٧ ص١٣ دا وا هـاتووە و ئـیبن ئـەی شـەیبە لـە شـەیبەوە بـە هـەمان واتـا هێناویەتی، لە الاصابە ج١ ص٥٢ یشدا وا هاتووە.

[2] – لە کنزالعمال ج٢ ص٢٩٨ دا وا هاتووە.

ئێوەمان کردبوو بە کۆیلە و دەمانکوشتن و دەستمان بەسەردا دەگرتن، کاتێ خوا لەگەڵ ئێوە بوو ئیدی ئێمە هیچمان نەما، عومەر وتی: دەڵێیت چی؟ وتم ئەی ئەمیر باوەڕداران من دوژمنێکی زۆر و بەربەستێکی سەختم بە جێ هێشتووە، ئەگەر ئەمە بکوژیت خەڵکەکەی هیوای ژیانیان نامێنێ و زیاتر گوڕ و تین پەیدا دەکەن، عومەر وتی: شەرم دەکەم لە بکوژی بەرائی کوڕی مالیك و میجزەئەی کوڕی ئەور، کە ترسام بیکوژێت وتم: هیچ ڕێیەکی کوژرانی نی یە، تۆ پێت وت: گرفت نیە قسە بکە، عومەر وتی: وا بەرتیلت لێ وەرگرتووە؟ وتی: نەبەخوا شتی وا نییە، وتی: دەی یان شایەتم بۆ دێنیت یان سەرەتا تۆ ڕسوا دەدەم، دەڵێت: چوومە دەرەوە و بە زوبەیری کوڕی عەوام گەیشتم شایەتی دا. عومەر وازی هێنا و هورمزانیش موسڵمان بوو و ئەویش شتێکی بۆ بڕییەوە.[1]

ئیبن عەساکیر و واقیدی لە عەبدوڵلای کوڕی حەدرەدی ئەسلەمیەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ عومەری کوڕی خەتتاب چووین بۆ پارە کۆکردنەوە پیرێکی ئەهلی زیممەمان دی کە داوای شانی دەکرد، ئەویش پرسیاری لێکرد وتی ئەمە کابرایەکی ئەهلی زیممەیە پیر و لاوازبووە، عومەر(رضي الله عنه) سەرانەی سەرشانی لابرد و وتی سەرانەتان لەسەرداناوە و کە پیر بووە وازتان لێهێناوە تا ئەوەی داوای پاروە نانێك بکات؟ بۆیە لە بەیتولمال دە درهەمی بۆ بڕیەوە، ئەو ژن و منالیشی هەبوو، ئەبی عوبەید و ئیبن زەنجەویە و عقیلی لە عومەرەوە هێناویانە کە داویەتی بەلای پیرێکی ئەهلی زیممەدا کە لە بەر دەرگای مزگەوتەکاندا سواڵی کردووە، وتی: ویژدانمان لەگەڵ بەکارهێنایت، تا گەنج بوویت سەرانەمان لێسەندیت، دواتر کە پیر بوویت پشتمان بەردایت، پاشان لە بەیتولمال هێندەی بۆ بڕیەوە کە بەشی بکات.[2]

---

[1]- شافیعیش بەو واتایە و بە کورتی هێناویەتی، لە کنز العمال ج٢ ص٢٩٨دا وا هاتووە، بەیهەقی ج٩ ص٩٦ هێناویەتی لە ڕێگەی جوبەیری کوڕی حەییەوە کە بە دەقێکی درێژتر هاتووە، بەیهەقی ج٧ ص٨٧ یشدا بە دوورو درێژی هاتووە.

[2] – لە کنز العمال ج٢ ص٣٠١-٣٠٢ دا وا هاتووە.

ئەبو عوبەیدە لە زەیدی کوڕی ئەبی مالیکەوە هێناویەتی دەڵێت: موسڵمانان سەرقاڵی کۆکردنەوە بوون و عومەری کوڕی خەتتابیش لە ناویاندا بوو، کابرایەکی ئەهلی زیممە هات و وتی خەڵکی لە ترێکەیدایە لەیان کردوون، عومەر چوو تا گەیشت بە یەکێ لە هاوەڵانی کە کۆڵێ ترێی هەڵگرتبوو، وتی تۆیش؟ وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران تووشی برسێتی بووین، عومەر وازی لێهێنا و گەڕایەوە بۆ لای خاوەن ترێکە و فەرمانی کرد هێندەی تر پارەی بدەنێ.[1]

مالیك لە سەعیدی کوڕی موسەییەوە هێناویەتی موسڵمان و جوولەکەیەك هاتنە لای عومەر و عومەر حەقەکەی بۆ جوولەکەکە بینی و بڕیاری بۆ دا، ئەویش وتی بە خوا بڕیاری ڕاستت دا، عومەریش بە گۆژانەکە لێیدا و وتی: چووزانیت؟ جوولەکەکە وتی: ئێمە لە تەوراتدا بیستوومانە هەر دادوەرێك بە حەق دادوەری بکات لە ڕاست و چەپیەوە فریشتە هەن و ڕێنموونی دەکەن تا کاتێك لەگەڵ حەق بێت، کە لە حەق لایدا بەجێی دێڵن و دەچن.[2]

تەبەری ج٥ ص٣٢ لە ئیاسی کوڕی سەلەمە لە باوکیەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) چوو بە بازاڕدا و گاڵۆکێکی پێبوو، پاڵێکی پێوە نام و پێوەی و دای لە کراسەکەم، لەسەر ڕێ لادە، بۆ ساڵی دواتر گەیشتەوە پێم وتی سەلەمە حەجت دەوێ؟ وتم بەڵێ، دەستی گرتم و بردمی بۆ ماڵی خۆی و شەش سەد درهەمی پێدام وتی بۆ حەجەکەت بەکاری بێنە و بزانە ئەوە هی ئەو لێدانەی پاربوو، وتم ئەی ئەمیری باوەڕداران من بیرم نەمابوو، ئەویش وتی: منیش بیرم نەچوو بوو.

[1] – لە کنز العمال ج٢ ص٢٩٠ دا وا هاتووە.

[2] – لە الترغیب والترهیب ج٣ ص٤٥٥ دا هاتووە.

## (دادپەروەری عوسمانی خاوەن دوو ڕووناکی(رضي الله عنه))

سمـان لـە(الموافقـە) لـە ئەبولفوراتـەوە هێناویـەتی دەڵێـت: عوسمـان(رضي الله عنه) کۆیلەیەکی، پێی وت: من گوێم کێشایت دەی تۆڵەی خۆت بکەرەوە، ئەویش گوێی گرت، پاشان عوسمان وتی دەی ڕایکێشە بەڵکو تۆڵەکە لە دنیادا بێت نەوەك لە دواڕۆژدا بێت.[1]

ئیمامی شافیعی لە موسنەدەکەیدا(ص٤٧) لە نافعی کوڕی عەبدولحارثەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) هاتە مەککە و لە ڕۆژی هەینی هاتە دارونەدوە و ویستی باڵندەکانی ئەوێ لەگەڵ مزگەوت لێکیان نزیك بکاتەوە، عەباکەی هەڵدا بە سەر کەسێکی وەستاوی ناو کەعبەدا، کۆترێك کەوتە سەر سەری و ئەویش فڕاندی و مارێك هەڵمەتی بۆ برد و کوشتی. کە نوێژی هەینی کرد لەگەڵ من و عوسمانی کوڕی عەففان چووین بۆ لای و وتی: لەسەر ئەو کارەی ئەمڕۆم حوکمم لەسەر بدەن، ئەمڕۆ ئەوەم کرد(گێرایەوە) بۆیە پێموایە لە شوێنێکی جێ پەناوە فڕاندم بۆ شوێنێ لەناو چوونی، منیش بە عوسمانی کوڕی عەففانم وت: پێت چۆنە بزنێکی دوانەی عفراو بکەین بە حوکمی سەرشانی ئەمیری باوەڕداران؟ وتی: پێم باشە، بۆیە فەرمانی ئەوەی پێکرد(عومەر(رضي الله عنه)).



[1] – لە الریاض النضرة في مناقب العشرةی محب الطبری ج٢ ص١١١ دا وا هاتووە.

# دادپەروەری عەلی مورتەزا(رضي الله عنه))

بەیهەقی ج٦ ص٣٤٨ و ئیبن عەساکیر لە کولەییەوە هێناویانە دەڵێت: لە ئەسبەهانەوە پارەیەك هێنرا بۆ عەلی(رضي الله عنه) ئەویش کردی بە حەوت بەشەوە، تیایدا پارچە نانێکی بەدیکرد، کردی بە حەوت بەشەوە و بۆ هەربەشێکی ئەوانە بەشێکی دانا، پاشان حەوت ئەمیرەکەی بانگکرد و قورعەی کرد لە نێوانیاندا تا بزانێت یەکەم جار بە کامیان بدات.[1]

بەیهەقی ج٦ ص٣٤٩ لە عیسای کوڕی عەبدوڵڵای هاشمی لە باوکی یەوە لە باپیریەوە هێناویەتی دەڵێت: دوو ئافرەت هاتن بۆ لای عەلی(رضي الله عنه) یەکێکیان عەرەب و ئەوی تریشیان مەولای بوو، عەلیش فەرمانی بڕێ خواردن و چل درهەمی بۆ هەرکامیان کرد، ئەو مەولای کە لەگەڵی بوو شتەکەی هەڵگرتوو چوو، بەڵام عەرەبی یەکە وتی ئەی ئەمیری باوەڕداران من عەرەبم و ئەو مەولا کەچی وەك یەکمان پێ دەدەیت؟ عەلی(رضي الله عنه) پێی وت: من سەیری کتێبی خوام کردووە و نەمبینیوە فەزڵی کوڕی ئیسماعیل بدات بەسەر کوڕی ئیسحاقدا.

ئیبن عەساکیر لە عەلی کوڕی ڕەبیعەوە هێناویەتی دەڵێت: جەعدەی کوڕی هوبەیرە هات بۆ لای عەلی(رضي الله عنه) و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران دوو کەس دێن بۆ لای تۆ، تۆ لای یەکێکیان لە خۆی خۆشەویستتریت، یان لە کەس و کارو ماڵ و سامانی لای خۆشەویستتریت، ئەوی دیکەش ئەگەر پێی بکرێت سەرت دەبڕێت، کەچی تۆ دژ بەم بڕیار بۆ ئەو دەدەیت؟ ئەویش بە لەپی دەستی دای بەسەر سنگیدا و وتی: ئەم شتە ئەگەر بۆ خۆم بوایە دەم کرد،بەڵام ئەمە هی خوایە.[2]

---

[1]– لە کنز العمال ج٣ ص١٦٦ دا وا هاتووە و ئیبن عەبدوالبر لە الاستعاب ج٣ ص٤٩ دا هێناویەتی.

[2] – لە کنز العمال ج٣ ص١٦٦ دا وا هاتووە.

ئەبوعوبەیدە لە(الاموال) لە ئوصبەغی کوڕی نوباتەوە هێناویەتی دەڵێت: لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبو تالیب(رضي الله عنه) چووم بۆ بازاڕ، سەیری کرد خەڵکی بازاڕ لە سنووری شوێنی خۆیان لایان داوە، وتی: ئەمە چی یە؟ وتیان خەڵکی بازاڕ لە سنووریان لایان داوە، وتی: مەگەر ئەوە بۆ ئەوان نیە؟ بازاڕی موسڵمانان وەك شوێنی نوێژکەران وایە، هەرکەس پێشتر چوویە پێش بۆ ئەوەتا بەجێی دێڵێ.[1]

## (دادپەروەری عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە(رضي الله عنه))

بەیهەقی لە ئیبن عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی و فەرموودەکەی بە دوورو درێژی لە باسی شەڕی خەیبەردا هێناوە و تیایدا هاتووە: عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە هەموو ساڵێك دەهات بۆ لایان، توندوتۆڵی و وردەکاریی لەگەڵیاندا بەکار دەهێنا. ئەوانیش سکالایان بردە لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەسەر زۆر سوور بوونی دەیانوسیت بەرتیل بدەنە عەبدوڵلا، وتی ئەی دوژمنانی خوا! حەرامم دەرخوارد دەدەن؟ سوێند بەخوا لەلایەن خوشەویترین کەسەوە هاتووم بۆ لاتان و بەم بارەتانەوە لە مەیموون و بەراز لام بێ ڕقترن، ڕقم بۆ ئێوە و خۆشەویستیم بۆ ئەو وام لێناکات لەگەڵتان دادپەروەر نەبم، وتیان: دەی بەو دادپەروەریە ئاسمانەکان و زەوی ڕێك وەستاون.[2]

* * * * * * * * *

---

[1] – لە کنز العمال ج٣ ص١٧٦دا وا هاتووە، پێشتریش چیرۆکی عەلیمان(رضي الله عنه) لەگەڵ کابرای جوولەکەدا هێنا لە باسی ئاکاری جوانی هاوەڵان لە ڕێنمونی خەڵك دا.

[2] – لە البدایە والنهایە ج٤ ص١٩٩ دا وا هاتووە.

## (دادپەروەری میقدادی کوڕی ئەسوەد (رضي الله عنه))

ئەبو نەعیم لە الحلیە ج١ ص١٧٦ لە حارپی کوڕی سوەیدەوە هێناویەتی دەڵێت: میقدادی کوڕی ئەسوەد (رضي الله عنه) نەیبیستووە ولاخەکەی برد بۆ لەوەڕ، ئەویش لێیدا، کابرا گەڕایەوە و دەیوت: هەرگیز وەك ئەمڕۆم نەهاتوەتە ڕێ، میقداد تێپەڕ بوو وتی: چیتە؟ ئەویش بۆی گێڕایەوە، ئەویش شمشێری هەڵکێشا و لەگەڵی چوو تا گەیشتە لای ئەمیر و وتی: ئادەی با تۆڵەی خۆی بکاتەوە لێت، ئەویش خۆی ئامادە کرد و کابراش لێی خۆش بوو، میقدادیش گەڕایەوە و دەیوت: دەبێت بمرم و ئیسلام شکۆداربێت.

## (ترسی خەلیفەکان)

ئیبن ئەبی شەیبەو هنادو بەیهەقی لە زوحاکەوە هێناویانە دەڵێت: ئەبوبەکری صدیق (رضي الله عنه) باڵندەیەکی لەسەر درەختێك بینی، وتی: خۆزگە ئەی باڵندە! سوێند بەخوا حەزم دەکرد منیش وەك تۆ لەسەر درەخت بوومایەو لە بەرهەمم بخواردایە، دوایی دەفڕیت و لێپێچینەوەو سزات لەسەر نیە! سوێند بەخوا حەزمدەکرد درەختێکی کەنار ڕێگەیەك بوومایەو وشترێك بیدایە بە پاڵمداو بیگرتمایەو بیخواردمایەو چاك بیجویمایەو دواتر خێرا قووتی بدامایەو دواتر بیهێنامایەتەوە بەڵام مرۆڤ نەبومایە!

ئیبن فەتحەویە لە کەسێکەوە لە زوحاکی کوڕی موزاحیمەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبوبەکر سەیری چۆلەکەیەکی کرد و وتی: خۆزگەم پێت ئەی چۆلەکە! لە بەرهەم دەخۆیت و دەفڕیتەسەر درەختان و هیچ سزاو لێپێچینەوەیەکت نیە، سوێند بەخوا حەزمدەکرد بەرانێك بومایەو کەسوکارم قەڵەویان بکردمایە، کە گەورەبوو سەریان بڕیمایەو هەندێکی گۆشتەکەمیان ببرژاندایەو هەندێکی بە کوڵان، دواتر

بیانخواردمایەو دواتر فڕێیان بدامایەتە زبڵدانەوە، بەڵام بە مرۆڤی دروست نەکرامایە.[1]

هەنادو ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص٥٢و بەیهەقی لە زوحاکەوە هێناویانە دەڵێت: عومەر(رضي الله عنه) وتی: خۆزگە بەرانی کەس و کارم بوومایە، چەند حەزیان بکردایە قەڵەویان بکردمایە، دوایی سەریان بڕیمایەو هەندێکیمیان ببرژاندایەو هەندێکی بەلێنان، پاشان بیانخواردمایەو بە پیسی فڕێیان بدامایە، بەڵام مرۆڤ نەبوومایە!.

ئیبن موبارەك و ئیبن سەعدو ئیبە ئەبی شەیبەو موسەددەو ئیبن عەساكیر لە عامری كوڕی ڕەبیعەوە هێناویانە دەڵێت: عومەری كوڕی خەتتابم بینی بەردێكی زەوی هەڵگرت و وتی: خۆزگە ئەو دەنكە بەردە بوومایە! خۆزگە دروست نەكرامایە! خۆزگە هیچ نەبوومایە، خۆزگە لە دایك نەبوومایە، خۆزگە ناوم نەبووایەو لە بیر بكرامایە.

ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص٥٣ لە عومەرەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەگەر هاواركەرێك لە ئاسمانەوە هاوار بكات ئەی خەڵكینە: ئێوە هەمووتان دەچنە بەهەشت جگە لە یەك كەس دەترسم ئەو كەسە من بم، ئەگەریش هاوار بكات: ئەی خەڵكینە ئێوە هەمووتان دەچنە دۆزەخەوە جگە لەیەك كەس هیوام وایە ئەوە من بم.

ئیبن عەساكیر لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی كە عومەر گەیشت بە ئەبوموسای ئەشعەری و پێی وت: ئەی ئەبوموسا پێت خۆشە ئەو كارەت لەگەڵ پێغەمبەردا(عليه السلام) بوویت بۆی دانایت و تۆش بە تەواوی لە كارەكەت دەربچیت خێری بە خراپەی و خراپەی بەخێری بگۆڕێتەوە؟ چاك و خراپی هیچت بۆ

---

[1] – ئەحمەد لە الزهد لە ئەبوبەكرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: حەزم دەكرد تاڵەموویەكی بەندەیەكی باوەڕداربوومایە. لە منتخب كنز العمال ج٤ ص٣٦١ دا واهاتووە.

نەمێنێ؟ ئەی ئەمیری باوەڕداران، سوێند بەخوا چووم بۆ بەسرەو خەڵکی ئەوێ شکیان لێ بەدی کرا، فێری قورئان و سوننەتم کردن و لە ڕێی خوادا غەزام پێ کردن، هیوای پاداشت و فەزڵیم هەیە، عومەر وتی: بەڵام من حەزدەکەم خێرو شەڕو خراپی کارەکەم هەمووی نەمێنێ، نەپاداشت و نەسزای، تەنها کارم لەگەڵ پێغەمبەر دا(صلى الله عليه وسلم) بۆ بمێنێتەوە![1]

ئەبونەعیم لە الحلیه ج١ ص٥٢ لە ئیبن عەبباسەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك عومەر(رضي الله عنه) پێکرا چووم بۆ لای و پێم وت: موژدەت لێ بێت ئەی ئەمیری باوەڕداران خوای گەورە شوێنانی پێ ڕێککردیت و دووڕوویی بە تۆ نەهێشت و بە هۆی تۆوە ڕۆزی بڵاوکردەوە، وتی: ئیبن عەبباس دەست خۆشی لەسەر ئیمارەتم دەکەیت؟ وتم: ئەی لە چی؟ وتی: سوێند بەوەی گیانمی بەدەستە حەزم دەکرد چۆن چوومەناوی بەو جۆرە لێی دەرچم، نە پاداشت و نە سزا.[2] هەروەها لە ئیبن سەعد ج٣ ص٢٥٦ لە ڕێگەیەکی ترەوە فەرموودەکە دێنێت و تیایدا هاتووە: وتم: موژدەی بەهەشتت لێ بێت هاودەمی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوویت و ئەوەش زۆری خایاندو بوویتە ئەمیری باوەڕدارانیش بەهێزبوویت و سپاردەو ئەرکت بەجێگەیاند، وتی: سەبارەت بە موژدەدانت بۆ بەهەشتم سوێند بە خوای بێ هاوتا ئەگەر هەموو موڵکی دونیام هەبوایە دەمبەخشی بەرامبەر سەختی بەر ڕێم پێش ئەوەی هەواڵ بزانم، بۆ ئەمیرایەتی موسڵمانانیش سوێند بەخوا حەزدەکەم بە چاك و خراپییەوە بۆم نەمێنێ، بۆ باسی هاودەمی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئەمەیان بڵێی ئەرێ.

هەروەها ئیبن سەعد ج٣ ص٢٥٧ لە فەرموودەکەی عەبدوڵڵای کوڕی عوبەیدی کوڕی عومەیرەوە بە دوورو درێژی هێناویەتی و ئەوەشی بۆ زیادکردووە:

---

[1] – لە منتخب کنز العمال ج٤ ص٤٠١ دا واهاتووە.

[2] – تەبەرانی لە فەرموودەکەی ئیبن عومەرەوە بە فەرموودەیەکی دوورو درێژ هێناویەتی، ئەبویەعلاش لە ئەبی رافیعەوە هێناویەتی، لە المجمع ج٩ ص٧٦ دا هاتووە، ئیبن سەعد ج٣ ص٢٥٤ لە ئیبن عەبباسەوە(رضي الله عنه) بە هەمان شێوە هێناویەتی.

عومـەر(رضي الله عنه) وتـی: دامنیـشێنن، کـە دانیـشت بـە ئـیبن عەبباسـی وت: قـسەکەتم بـۆ دووبارەبکەرەوە، کـە دووبـارەی کـردەوە وتـی: کـە گەیـشتیەوە بـە خـوای گـەورە لای خوا ئەو شایەتیەم بۆ دەدەیت؟ ئیبن عـەبباس وتـی: بـەڵێ، عومـەر بـەوە دڵخۆش و سەرسام بوو.

ئەبی نەعیم لە الحلیە ج١ ص٥٢ لە ئیبن عومەرەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەر کە لـە نەخۆشـی سـەرەمەرگیدا بـوو سـەری لەسـەر ڕانیم بـوو، پێـی وتم: سـەرم لەسـەر زەوی دابـنێ، وتم: بۆچـی لەسـەر زەوی بێـت یـان لەسـەر ڕانم؟ وتـی: لەسـەر زەوی، منیش دامنا لەسە زەوی، وتـی: هـاوار بـۆ خـۆمو دایکـم ئەگـەر پـەروەردگارم ڕەحـم پـێ نەکات. میسوەر هێناویەتی دەڵێت: کە عومەر پێکرا وتـی: سـوێند بـەخوا ئەگـەر پڕی هەموو دونیا زێڕم هەبێت دەیبەخشم لە جیاتی ڕزگاربوون لە سزای خوا پێش ئەوەی سزای پەروەردگار ببینم.

## (ئایا ئەمیر لە سەرکۆنەی سەرکۆنەکاران دەترسێت)

بەیهەقی لە سلئیبی کوڕی یەزیدەوە هێناویەتی دەڵێت: کەسێك بـە عومـەری کـوڕی خـەتتابی وت: ئەگـەر لـە ڕێـی خـوادا لـە لۆمـەی لۆمـەکاران بترسـم یـان ڕوو لـە خـۆم وەربگێڕم؟ وتـی: هەر کـەس هـەر کـارێکی موسـڵمانان بگرێتە دەسـت لـە ڕێـی خـوادا هیچ لە لۆمەی لۆمەکاران ناترسێت، هەرکەسیش تەنهایە با ڕوو لە خۆی وەرگێڕێو ئامۆژگاری کاربەدەستەکەی بکات.[1]



[1] – لە کنز العمال ج٣ ص١٦٤ دا واهاتووە.

# (وەسیەتی خەلیفەکان بۆ خەلیفەو ئەمیرەکان)

## (وەسیەتی ئەبوبەکر (رضي الله عنه) بۆ عومەر (رضي الله عنه))

تەبەرانی لە ئەغەری کوڕی مالیکەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێک ئەبوبەکر ویستی لە دوای خۆی عومەر دابنێ ناردی بە شوێنیداو ئەویش هات، ئەبوبەکر پێی وت:

من بانگت دەکەم بۆ کارێك کە هەرکەس لە ئەستۆی بگرێت لەسەری سەختە، دەی عومەر لە خوابترسە! گوێڕایەڵی بەو لێی بترسە، چونکە لە خواترسی کارێکی پارێزگاریە، پاشان کارەکە خراوەتەڕوو کەس نایەت بەدەمیەوە مەگەر ئەوەی کاری پێ بکات، هەرکەس فەرمان بە چاکە بکات و خراپەبکات فەرمان بە چاکە بکاتو خراپە بنوێنێ هێندە نابا کە هیوای بپچڕێو کارەکەی پێی پووچەڵ بێتەوە ئەگەر تۆ بوویتە بەرپرسیان ئەگەر توانیت دەستت لە خوێنیان بگرەوەو سکت خاڵی بکە لە ماڵو سامانیانو زمانت لە ئابڕوویان بپارێزە، هێزیش تەنها بۆ خوایە)[1].[2]

ئیبن عەساکیر لە سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە هێناویەتی دەڵێت: کە ئەبوبەکر سەرەمەرگی هات وەسیەتی کرد:

(بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان)

ئەمە بەڵێنی ئەبوبەکری صدیقە لە کۆتا ساڵی ژیانیدا کە دونیا بەجێ دێڵێو سەرەتای سەردەمی ڕۆژی دواییەتی وە دەچێتە ناویەوە ئەو کاتەی بێباوەڕ باوەڕدێنێو دەرچوو و خاراپەکار دەترسێو بە درۆزان دەکەوێتە بەڕاست دانان، من لە دوای خۆم عومەری کوڕی خەتتاب بە خەلیفە دادەنێم، ئەگەر دادپەروەربوو

---

[1] – ضعیف.

[2] – هەیسەمی ج٥ ص١٩٨ دەڵێت: ئەغەر ئەبوبەکری (رضي الله عنه) نەبینیوە، کەسەکانی دیکەی سەنەدەکە جێ متمانەن، تەواو. مونزیری لە الترغیب ج٤ ص١٥ دەڵێت: گێڕەرەوەکانی جێ متمانەن بەڵام جۆرە پچڕانێکی تێدایە، تەواو.

ئەوا من وا گومانی پیێ دەبەم، ئەگەریش گۆڕاو خراپ بوو من خێرم ویستووەو غەیب و نادیار نازانم(وسيعلم الذين ظلموا اي منقلب ينقلبون).

پاشان ناردی بە شوێن عومەردا(رضي الله عنه) و بانگی کردو وتی: ئەی عومەر کەسی جێ ڕق ڕقی لێتەو کەسی جێ خۆشەویست خۆشی دەوێت، هەیە ڕقی لە خێرەو حەزی لە خراپەیە، وتی: هیچ پێویستیم پێی نیە، وتی: بەڵام ئەو پێویستی بە تۆیە، من پێغەمبەرم(صلى الله عليه وسلم) بینیوە و هاودەمی بووم، دەمبینی ئێمەی پێش خۆی دەخست تائەوەی ئێمە زیادەی ئەوەی لێمان وەردەگرت دەماندایەوە بە کەس وماڵی، تۆش منت بینیوەو هاودەمم بوویت و بینیت چۆن شوێن پێی پێش خۆمم گرتەبەر،بەخوا نەخەوتوم تا خەوم دیبێت و دیمەنێکم نەدیوە تا خەیاڵ هەڵیگرتبم، لەسەر ڕێیەکە کە لێی لامنەداوە، ئەی عومەر بزانە خوا لە شەودا مافێکی هەیە بە ڕۆژ قبوڵی ناکات، لە ڕۆژیشدا مافێکی هەیە بەشەو قبوڵی ناکات، تای تەرازووی کەسێ قورسە کە تای تەرازووی لە ڕۆژی دواییدا قورس بێت بە شوێنکەوتنی حەق، پێویستە تەرازوویەك قورس بێت تەنها حەقی تێدابێت، تای تەرازووی کەسێ سووکە کە بە شوێنکەوتنی پووچەڵی و هەڵە تای تەرازووی لە ڕۆژی دواییدا سووک بێت، دەبێت ئەوەی تای تەرازووەکەی سووك بێت تەنها پووچەڵی و هەڵەی تێدابێت، یەکەم شت کە بێداریت پێ دەدەم لەسەری خۆتی، هۆشیاربەو ئاگات لە خەڵك بێت، چونکە چاویان زیتەو ویستیان فڕکانیەتی، ئەگەر کەمی و لاوازییان هەبێت باخێریان بێتەڕێ، وریابە تۆ وانەبیت چونکە ئەوان بەردەوام بۆت دەترسن و تاکاتێك لە خوا بترسیت و لەگەڵ خوا بیت ئەوانیش بۆ تۆ وان، ئەمە وەسیەتی منەو منیش سەلامت لێ دەکەم).[1]

ئیبن موبارەك و ئیبن ئەبی شەیبەو هەناد و ئیبن جەریرو ئەبونەعیم لە الحليه لە عەبدولڕەحمانی کوڕی سابت و زەیدی کوڕی زەیدی کوڕی حارس و موجاهیدەوە هێناویەتی دەڵێن: کە ئەبوبەکر سەرەمەرگی هات عومەری بانگکرد و پێی وت:

[1] – كنز العمال ج٣ ص١٤٦.

(عومەر لە خوابترسە و بزانە خوای گەورە بەڕۆژ کارێکی دەوێت کە بەشەو قبوڵی ناکات، کارێکی شەوی دەوێ بەڕۆژ قبوڵی ناکات، تا فەرزەکان بەجێ نەگەیەنیت سوننەت قبوڵ ناکات، تای تەرازووی کەسێك قورسە کە بە شوێنکەوتنی حەق لە دونیادا و قورسی چاکەیان لە ڕۆژی دواییدا تای تەرازوویان قورس بێت، دەبێت تای تەرازوویەك کە سبەینێ قورسی تێدایە قورس بێت، تای تەرازووی کەسێك سووکە کە بە گرتنەبەری خراپە لە دونیا و سووکی تەرازوویان لە ڕۆژی دواییدا تای تەرازوویان سووکە، دەبێت تەرازوویەك کە سبەینێ پووچەڵەو خراپەی تێدایە سووك بێت، خوای گەورە باسی خەڵکی بەهەشت دەکات و بە چاکترینی کاریان باسیان دەکات و خراپەکانیان پەردەپۆش دەکات، کە بیرم دەکردنەوە دەمووت دەترسم پێیان نەگەم و پەیوەستیان نەبم، کە باسی خەڵکی دۆزەخیش دەکات بە خراپترینی کاریان باسیان دەکات و چاکەکانیان دەداتەوە بە ڕوویاندا، کە بیرم دەکردنەوە دەموت: دەترسم لەگەڵ ئەوانەبم، ئایەتی ڕەحمەت و سۆزو ئایەتی سزای هێناوە، بەوە بەندە هەم دەترسێت و هەم هیوای دەبێ، هیوای حەق زیاتر هیچ لە خوا چاوەڕوان ناکرێت و لە سۆزی بێهیوابوون نیەو بە دەستەکانی خۆی کەس بەرەو هیلاکی نابات. ئەگەر وەسیەتەکەم وەربگریت هیچ شتێکی نائامادەنیە هێندەی مەرگ لات خۆشەویست بێت لە کاتێکدا مەرگ بەرەو ڕووت دێت. ئەگەریش وەسیەتەکەم پشتگوێ بخەیت هیچ شتێکی نائامادەنیە هێندەی مەرگ ڕقت لێ بێت کەچی دەرەقەتیشی نایەیت و لە دەستی دەربازنابیت.



## (وەسیەتی ئەبوبەکر بۆ عەمری کوڕی عاص و کەسانی دیکەش)

ئیبن سەعد لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوبەکری کوڕی موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی حەزمەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبوبەکر بڕیاریدا سوپاکان کۆبکاتەوە بۆ شام، یەکەم کاربەدەستی کە چوو عەمری کوڕی عاص بوو، ئەبوبەکر فەرمانی پێکرد تا ڕێی(ئوبوللە) بگرێتەبەرو بەرەو فەلەستین بچێ، ئەو سەربازانەی عەمر کە لە مەدینە دەرچوون سێ هەزار کەس بوون، خەڵکێکی زۆری کۆچەران و پشتیوانانیان تێدابوو، ئەبوبەکری صدیق بە پیادە دەچوو لە پاڵ وڵاخەکەی عەمری کوڕی عاصەوە دەچوو و وەسیەتی بۆ دەکردو دەیوت:

ئەی عەمر لە نهێنی و ئاشکرای بارتدا لە خوابترسەو شەرمی لێ بکە، چونکە خوا خۆت و کارت دەبینێت، دەزانێت تۆم پێش خستووە بەسەر کەسانێکدا کە لە تۆ پێشینەترن و زۆر لە تۆ لە ئیسلامدا گەورەو دەوڵەمەندترن(چاویان لە بەرژەوەندی دونیا نیە)دەی لەوانەبە کە ئیش بۆ ڕۆژی دوایی دەکەن و ئەوەی دەیکەیت لە پێناو خوادا بیکەو باوك بە بۆ ئەوەی لەگەڵتدایەو نهێنی خەڵك ئاشکرا مەکەو تەنها چاوت لە ڕووی دیاریان بێت، لەکارتدا گورج و گۆڵ بەو وریابە و کە بەرەنگاری دوژمن بوویتەوە ڕاستگۆیانە لێبنەوەو مەترسەو بەرەو ڕووی ڕێچکەشکێنیان بەرەوەو سزایان بدە، ئەگەر ئامۆژگاری هاوەڵانت کرد بە پوختی بیڵێ و خۆت چاك بکە ژێردەستەکانت بۆت چاك دەبن).[1]

ئیبن جەریری تەبەری ج٤ ص٢٩ لە قاسمی کوڕی موحەممەدەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبوبەکر نامەی نووسی بۆ عومەرو وەلیدی کوڕی عوقبە کە لەسەر نیوەی صەدەقەی قوزاعە بوو، ئەبوبەکر کە دەیناردن بۆ صەدەقە کە بەڕێی دەکردن وەسیەتێکی بۆ هەرکامیان دەکرد و دەیوت:

---

[1] - لە کنز العمال ج٣ ص١٣٣ دا واهاتووە، ئیبن عەساکیریش ج١ ص١٢٩ بە هەمان شێوە هێناویەتی.

لە نهێنی و ئاشکرادا لە خوابترسە، چونکە هەرکەس لە خوابترسێت خوا دەرووی لێ دەکاتەوەو لەلایەکەوە کە حسابی بۆ ناکات ڕۆزی دەدات، هەرکەس لە خوابترسێت تاوانەکانی دەسڕێتەوە، وە پاداشتی گەورەی دەبێ چونکە لە خواترسان باشترین وەسیەتی خوایە بۆ بەندەکانی، تۆ لەسەر ڕێیەکی ناو ڕێیەکانی خوادایت، نابێت تیایدا زیادەڕەو و کەمڕەو بیت و بێئاگانەبیت لەوەی سەرکەوتنی ئایینەکەت و گرنگی کارتانی تێدایە، دەی لاوازو لادەر مەبە). ئیبن سەعد لە موتەلیبی کوڕی سائیبی کوڕی ئەبی وەداعەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: ئەبوبەکری صدیق نامەی نووسی بۆ عەمری کوڕی عاص:

من نامەم نووسی بۆ خالیدی کوڕی وەلید تا بۆ یارمەتی تۆ بێت لات، ئەگەر هات بۆ لات بە جوانی لەگەڵی هاودەم بەو ساتەساتەی پێ مەکەو لەبەرئەوەی تۆم پێش ئەو و کەسانی دیکەش خستووە بەبێ ئەو مەنەوەرە کارەکان و ڕاوێژیان پێ بکەو پێچەوانەیان مەکە).[1]

ئیبن سەعد لە عەبدولحەمیدی کوڕی جەعفەر لە باوکیەوە هێناویەتی ئەبوبەکر بە عەمری کوڕی عاصی وت:

(من تۆم کردە کاربەدەستی ئەو شوێنانەی پێیدا تێپەڕدەبی لە بلی و عوزەرو هەموو قوزاعەو ئەو عەرەبانەی لەوێ کەوتون، دەی بەرەو جیهادی ڕێی خوایان ببەو هانیان بدە بۆی، هەرکەسیان شوێنت کەوت شمەك و شتی بدەرێ و لە نێوانیاندا بگونجێنی و هەر هۆزێك لە شوێن و لە ڕێزی خۆیدا دابنێ)(بەپێی ئاستیان لەگەڵیان بجوڵێرەوە).[2]



[1] – لە کنز العمال ج۳ ص۱۳۳ دا واهاتووە.

[2] – لە کنز العمال ج۳ ص۱۳۳ دا واهاتووە. ئیبن عەساکیریش لە ج۱ ص۱۲۹ دا هێناویەتی.

# (وەسیەتی ئەبوبەکری صدیق(رضي الله عنه) بۆ شەرحەبیلی کوڕی حەسنە(رضي الله عنه))

ئیبن سەعد ج٤ ص٧٠ لە موحەممەدی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حارسی تەیمیەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك ئەبوبەکر خالیدی کوڕی وەلیدی لابرد وەسیەتی بۆ شەرحەبیلی کوڕی حەسنە کرد بۆ خالید، شەرحەبیل یەکێ بوو لە سەرکردەکان، ئەبوبەکر وتی:

(چاوت لە خالیدی کوڕی وەلید بێ و ماف لە سەرتە بزانە وەك چۆن تۆ حەزت دەکرد ئەگەر ئەو لە جێت بوایە ئەو مافی تۆی لەبەرچاو بوایە، تۆ پلەو پایەی لە ئیسلامدا دەزانیت و پێغەمبەریش(عليه الصلاة والسلام) کە کۆچی دوایی کرد ئەو والی بوو بۆی، منیش بە والیەتی هێشتمەوە، پاشان بە باشم زانی لاییبەم، پێدەچێت ئەوەش بۆ ئایینی باشتربێت، بێرەیی بە ئیمارەتی کەس نابەم، من لەناو سەرکردەکانی سەربازاندا هەڵمبژاردووەو ئەویش تۆی هەڵبژارد لە جیاتی تۆ و ئامۆزاکەی، ئەگەر کارێکت هاتەڕێو پێویستیت بە ڕای لە خواترسی ئامۆژگاریکەر بوو با یەکەم کەس کە دەچێتەلای ئەبوعوبەیدەی جەراحو دووەمیان موعازی کوڕی جەبەلو سێیەمیشیان خالیدی کوڕی وەلید بێت، چونکە ئامۆژگاریو خێریان لا بەدی دەکەیت، وریابە ڕاسەپێنی نەکەیت یان هەندێ هەواڵیان لێ نەشاریەوە).[1]

        

[1] - لە کنز العمال ج٣ ص١٣٤ دا هاتووە

# (وەسیەتی ئەبوبەکری صدیق(رضي الله عنه) بۆ یەزیدی کوڕی ئەبوسوفیان)

ئیبن سەعد لە حارسی کوڕی فوزەیلەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك ئەبوبەکر(رضي الله عنه) ئاڵای دایە دەست یەزیدی کوڕی ئەبوسوفیان پێی وت:

(ئەی یەزید تۆ گەنجیت، باسی چاکەیەك دەکرێت کە لە تۆدا بینراوە، ئەوەش لەبەرئەوەی لە دەروننتدا هەیە، ویستم تاقیت بکەمەوەو لە کەسوکارت دەرت بێنم، دەی بزانە تۆ چۆنیت؟ ویلایەتت چۆنە؟ تاقیت دەکەمەوە ئەگەر چاکەت کرد بۆت زیاد دەکەم، ئەگەر خراپت کرد لات دەبەم، من کارەکەی خالیدی کوڕی سەعیدت پێ دەسپێرم)، پاشان وەسیەتی بۆ کرد تا ئەو کارانە لەپێناو خوادا بکات، پاشان وتی(وەسیەتی چاکەکاری بەرامبەر ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەراحت بۆ دەکەم، تۆ پلەو پایەی ئەو لە ئیسلامدا دەزانیتو بیستووتە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت(لكل امة امين وامين هذه الامة ابوعبيدة بن الجراح)(هەر ئوممەتێ سپاردەکارێکی هەیە، سپاردەکاری ئەم ئوممەتەش ئەبووعوبەیدەی کوڕی جەراحە). دەی پلەو پایەو پێشینەی بزانە، سەیری موعازی کوڕی جەبەل بکە، ئامادەییەکانی ئەو لەگەڵ پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم) دەزانیت، پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(هێندەی تیرەوشاندنێ لە پێش زانایانە)دەی بەبێ ئەو دوانە هیچ مەکەو ئەو دوانە هەمیشە بەرەو چاکەت دەبەن).

یەزید وتی: ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا چۆن وەسیەتت بۆ ئەو دوانە کرد بۆ منیش وەسیەت بکە لای ئەو دوانە، ئەبوبەکر وتی: بێخەمبە وەسیەتت بۆ دەکەم لایان، یەزید وتی: ڕەحمەتی خوات لێ بێتو خوا لەسەر ئیسلام پاداشتت بداتەوە.[1]

[1] – لە كنز العمال ج٣ ص١٣٢ دا واهاتووە.

ئەحمەدو حاکم و مەنسوری کوڕی شوعبەی بەغدادی لە(الاربعین) دا هێناویانەو دەڵێت: دەقەکەی حەسەن‌و سەنەدەکەی لە یەزیدی کوڕی ئەبوسوفیانەوە غەریبەو ئەو دەڵێت: ئەبوبەکر کە ناردمی بۆ شام وتی: ئەی یەزید تۆ خزمایەتیەکت هەیەو بەڵکو خزمان پێش نەخەیت بۆ دەسەڵات، ئەمە گەورەترین شتێکە کە دەترسم تووشی بیت، چونکە پێغەمبەر(عليه السلام) فەرموویەتی(من ولي من امور المسلين شيئا فأمر عليهم احدا محاباة له بغير حق فعليه لعنة الله لايقبل الله منه صرفا ولا عدلا حتى يدخله جهنم، و من اعطى احدا من مال اخيه محاباة له فعليه لعنة الله – او قال – برئت من ذمة الله، ان الله دعا الناس الى ان يؤمنوا بالله فيكونوا حمى الله، فمن انتهاك في حمى الله شيئا بغير حق فعليه لعنة الله – او قال- برئت منه ذمة الله عز وجل) واتە(هەرکەس لە کاروباری موسڵمانان شتێك بگرێتە دەست و لەبەر خۆشەویستی بۆی بە ناحەق کەسێك بکاتە ئەمیری خەڵك نەفرینی خوای لەسەرەو خوا گۆڕان‌و لادانی لیّ وەرناگریّ تا دەیخاتە دۆزەخ، هەرکەس لە ماڵی براکەی ببەخشیّ وەك خۆشەویستی بۆی نەفرینی خوای لەسەرە – یان وتی – پەنای خوای بۆ نیە، خوا خەڵکی بانگ کردووە بۆ ئەوەی بڕوا بهێنن بەخواو جیّ گوڕوتینی ڕێی خوابن، هەرکەس گوڕوتینی ڕێی خوا بەبیّ حەق ببڕیّ نەفرینی خوای لەسەرە – یان وتی – پەنای خوای گەورەی بۆ نیە) ئیبن کەسیر دەڵێت: ئەم فەرموودە لە هیچکام لە شەش کتێبی فەرموودەدا نیە، لەوانەیە لەبەر نەزانی مامۆستایەکی کە پێی گەیشتووە وازیان لیّ هێنابێت، وتی: ئەوەی دڵ دەیڵیّ ئەوەیە ئەم فەرموودە ڕاست بێت، چونکە صدیق وایکردووە، دواى ئەو چاکترینی موسڵمانانی دانا.[1][2]

---

[1] – ضعیف.

[2] – لە کنز العمال ج٣ ص١٤٣ دا واهاتووەو هەیسەمی ج٥ ص٢٣٢ دەڵێت: ئەحمەد هێناویەتی‌و تیایدا کەسێك هاتووە کە ناوی نەهاتووە.

# (وەسیەتی عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) بۆ هاوەڵانی دوای خۆی)

ئیبن بەبی شەیبەو ئەبوعوبەیدە لە(الاموال)و ئەبویەعلاو نەسائی و ئیبن حیببان و بەیهەقی لە عومەرەوە(رضي الله عنه) هێناویانە دەڵێت:(وەسیەتی بۆ دەکەم لەگەڵ ئەو پشتیوانانە چاك بێت کە پێش ئەوان ئیمانیان هەڵبژاردو با چاکەکاریان قبوڵ بکات و لە خراپەکاریان ببوورێت، وەسیەتی بۆ دەکەم بۆ خەڵکی ناوچەکان تا چاك بێت چونکە ئەوانە پەنا و سەرخەری ئیسلام و پێدەرو کۆکەرەوەی سامانن و جێ تووڕەیی دوژمنن، با تەنها لە زیادەی خۆیان بە ڕەزامەندی خۆیان وەربگیرێت، وەسەیەتی بۆ دەکەم بۆ عەرەبەکان تا چاك بێ لەگەڵیان چونکە ئەوانە بنەڕەتی عەرەب و کەرەستەی خاوی ئیسلامن تا لە وردە ئاژەڵی سامانیان وەربگیرێت و بدرێتەوە بە هەژارانیان، وەسیەتی بۆ دەکەم سەبارەت بە پەانی خواو پێغەمبەرەکەی تا وەفای بۆ ئەوانە هەبێت و لە پێشیانەوە بجەنگێ و تەنها بەپێی توانایان ئەرکیان بخاتە سەرشان)[1].[2]

ئیبن سەعد ج٤ ص١٩٧ و ئیبن عەساکیر لە قاسمی کوڕی موحەممەدەوە هێناویانە دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب وتی:

بائەوەی دوای من کاروبار دەگرێتە دەست بزانێت دوور و نزیك دواتر لێیان دەوێت کە من بەدەر لە خۆم شەڕی خەڵکم دەکرد، ئەگەر بزانم یەکێك لە خەڵك لە من لێی بەهێزترە پێشدەکەوتم تا بدریێ لە ملم، ئەوە لام خۆشەویستتربوو زیاتر لەوەی ئەو کارە بگرمەدەست.[3]

---

[1] – صحيح.

[2] – لە منتخب كنز العمال ج٤ ص٣٩ دا واهاتووە.

[3] – لە كنز العمال ج٣ ص١٤٧ دا واهاتووە.

# (وەسیەتی عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) بۆ ئەبوعوبەیدەوی کوڕی جەراح(رضي الله عنه))

ئیبن جەریر ج٤ ص٥٤ لە صالحی کوڕی کیسانەوە هێناویەتی دەڵێت: یەکەم نامەی عومەر کە نووسی بۆ ئەبوعوبەیدە کاتێك دایان ئەوە بوو نووسی تا لەسەر سەربازانی خالید بیکات بە بەرپرس ئەمە بوو:

(وەسیەتت بۆ دەکەم لەو خوا بترسە کە دەمێنیٚ‌و جگە لەو لەناو دەچێت، ئەو خوایەی لە گومڕاییەوە ڕێنموونی کردین‌و لە تاریکیەوە بەرەو ڕووناکی بردین، من تۆم کردووە بە بەرپرسی سەربازانی خالیدی کوڕی وەلید، دەی ئەو کارەی ئەرکی سەرشانتە بۆیان ڕاپەڕێنە، لەپێناو دەستکەوتدا موسڵمانان بەرەو لەناوچوون مەبەو پێش ئەوەی ویستت بۆیان نەبیٚ مەیانبەرە شوێنیٚ، بزانە چوونت بۆی چۆنە، سریەیەك مەنێرە مەگەر بە خەڵکێکی زۆرەوە، وریابە موسڵمانان بەرەو هیلاکی نەبەیت، خوای گەورە تۆی بە من‌و منی بەتۆ تاقی کردووەتەوە، دەی چاوت لە دونیا دابخەو دڵت لێی هەڵکەنە، وریابە وەك ئەوانی پێش تۆ بە هیلاکا نەچیت تۆ لەناوچوونی ئەوانت بینی).

# (وەسیەتی عومەری کوڕی خەتتاب بۆ سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص(رضي الله عنه))

ئیبن جەریر ج٤ ص٨٤ لە ڕێگەی سەیف لە موحەممەدەوەو تەلحەش بە سەنەدی هەردووکیان هێناویەتی کە عومەر هەواڵی نارد بۆ سەعدو ئەویش هات بۆ لای،عومەریش فەرمانی پێکرد تا شەڕی عێراق بکات و وەسیەتی بۆ کرد و وتی:

(ئەی سەعدی کوڕی سەعدی بەنی وەهب بەوە هەڵنەخەڵەتێیت بوترێت خاڵۆی پێغەمبەری خواو هاوەڵی پێغەمبەرە، چونکە خوای گەورە خراپە بە خراپە ناسڕێتەوە بەڵکو خراپە بە چاکە دەسڕێتەوە، خوای گەورە لەگەڵ کەسدا نێوانی

ڕەچەڵەکی نیە بەڵکو تەنها گوێڕایەڵی خوا هەیە، خەڵکی گەورەو بچووکیان لەبەردەم خوادا یەکسانن، خوا پەروەردگاریانە و ئەوانیش بەندەی خوان، بەپێی بەخشین فەزڵیان بەسەر یەکدا هەیەو بەپێی گوێڕایەڵی دەگەن بەوەی لەلای خوایە، دەی بڕوانە بۆ ئەو بارەی کە پێغەمبەر(ﷺ) لەسەری بینی ئەو کاتەی نێردرا تا ئەو کاتەی بەجێی هێشتین، پەیوەستی بە چونکە ئەوە فەرمانە، ئەمە وەسیەتمە بۆت، ئەگەر وەلات نا و پشتگوێت خست کارت پووچەڵ دەبێتەوەو لە قوڕبەسەران و خەسارۆمەندان دەبیت) کاتێك ویستی بینێرێ بانگی کردو وتی:

(من شەڕی عێراقم پێ سپاردوویت دەی وەسیەتم بپارێزە، تۆ هەنگاو بۆ کارێکی سەخت دەنێیت کەسی بە حەق لێی دەربازدەبێت، دەی خۆت و هاودەمانت بە خێر ڕابێنەو بەوە دەست پێ بکە، بزانە هەرنەریت و کارێك شمەکی دەوێت، شمەکی چاکەش خۆڕاگریە، دەی خۆڕاگربە لەسەر ئەوەی توشت دەبێت یان دێتەڕێت، با لە خواترسانت لا کۆبێتەوە، بزانە ترسی خوا لە دوو شتدایە: لە گوێڕایەڵی پەروەردگارو دوورکەوتنەوە لەلادان لە فەرمانی، ئەوەی گوێڕایەڵیەتی بە ڕقی دونیاو خۆشەویستی ڕۆژی دوایی گوێڕایەڵەتی، ئەوەی سەرکەش و یاخیە لێی بە خۆشەوستی دونیاو ڕقی ڕۆژی دواییە، دڵەکان چەند ڕاستیەکیان هەن کە خوای گەورە دایاندەنێ هەیانە نهێنی و هەیانە ئاشکرا، بۆ ئاشکراکە جێ سوپاس و جێ سەرکۆنەیە لە سەر حەق بەیەکسانی، بۆ نهێنیەکەش بە ڕووخساری دانایی دڵی لەسەر زمانیەو بە خۆشەویستی خەڵك دەبێت، دەی لە تێکەڵی و چوونەناو خەڵك خۆ مەگرەوە چونکە پێغەمبەران داوای خۆشەویستیان کردوون، خوای گەورە ئەگەر بەندەیەکی خۆش بوێت خۆشەویستی دەکات، ئەگەریش بەندەیەکی خۆش نەوێت بوغرای دەکات، دەی پلەو پایەت لای خوا بە پلەو پایەت لای خەڵك بە پەند وەربگرە لەوەی لەو کارەتدا لەگەڵت دەبێ و بڕیارت لەگەڵ دەدات).

# (وەسیەتی عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) بۆ عوتبەی کوڕی غەزوان(رضي الله عنه))

ئیبن جەریر ج٤ ص١٥٠ لە عەبدولمەلیکی کوڕی عومەیرەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەر کە عوتبەی کوڕی غەزوانی دەنارد بۆ بەسرە پێی وت:

(ئەی عوتبە! من تۆم کردووە بە کاربەدەستی خاکی هیند کە خانەو مەیدانی دوژمنە، هیوام وایە خوای گەورە بۆ چواردەوری یارمەتیدەرو دەستگرۆت بێت، نامەم نووسی بۆ عەلائی کوڕی حەزرەمی تا عورجوفەی کوڕی هەرئەمەت بۆ بنێرێت بۆ یارمەتیت، ئەو کەسێکە لە جیهادی دوژمن و فێڵی دژی دوژمندا زۆر بەهێزە، ئەگەر هات بۆ لات ڕاوێژی پێ بکەو نزیکی ببەرەوەو بانگی بکە بۆ لای خوا، هەرکەس هات بەدەمتەوە لێی قبووڵ بکە، هەرکەس ڕازی نەبوو سەرانەی بچوکی و زەبوونی لێ بسێنە، ئەگەرنا بەبێ دوودڵی شمشێر بخەرەکار، لەو کارەی گرتووەتە دەست لە خوابترسە، وریابە دەروونت بەرەو خۆبەزلزانیەکت نەبات کە ڕۆژی دواییت لە دەست بسێنێ، تۆ هاودەمی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بوویت و پاش زەلیلی بەو هۆیەوە عیزەتمەند بوویت، پاش لاوازی پێی بەهێز بوویت تا ئەوەی بووی بە ئەمیرێکی بە دەسەڵات و پاشایەکی گوێڕایەڵکراو، دەڵێیت و گوێت لێدەگیرێت و فەرمان دەکەیت و فەرمانت جێ بەجێ دەکرێت، دەی بە ڕاستی بەخششێکە کە بەسەر ڕێزو پلەتدا بەرزت دەکاتەوەو بەسەر کەسانی تردا پێشت دەخات، ئەو بەخششە بپارێزە چۆن خۆت لە تاوان دەپارێزیت، ئەمەیان(پاراستنی بەخشش) لای من بۆت گرنگترە وریابە هەڵت نەخەڵەتێنێت و دوابکەویت کە بەرەو دۆزەخت ببات، پەنات دەدەمە بەرخوا لەو کەوتنە، خەڵکی کاتێك دونیایان بۆ بەرزبوویەوە خێرا بەرەولای خواچوون، دوایی دونیایان ویست، دەی تۆ خوات بوێت دونیات نەوێت، لە سەرەنجام و لەناوچوونی ستەمکاران بترسێ)[1].

---

[1] – عەلی کوڕی موحەممەدی مەدائینیش بە هەمان شێوە هێناویەتی، لە البدایە والنهایە ج٧ ص٤٨ یشدا واهاتووە.

## (وەسیەتی عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) بۆ عەلائی کوڕی حەزرەمی)

ئیبن سەعد ج٤ ص٧٨ لە شەعبیەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب نامەی نووسی بۆ عەلائی کوڕی حەزرەمی کە لە بەحرەین بوو، لە نامەکەدا نووسی: بڕۆ بۆ لای عوتبەی کوڕی غەزوان و من کاری ئەوم پێ سپاردویت، بزانە بۆ لای یەکێك لەو کۆچەرە یەکەمانە دەچیت کە چاکەیان لای خوا لە پێشە لەبەر ئەوە لام نەبردووە کە پاك نەبێت و توندو بە توانا نەبێت، من پێم وابووە تۆ لەم ڕوانگەوە لەو زیاتر بۆ موسڵمانان باشتریت، دەی مافی لەبەرچاو بگرە، من پێش تۆ کەسێکم دانا بەڵام پێش گەیشتنی مرد، ئەگەر خوای گەورە بیەوێت دوای ئەو تۆ دێیت، یان بیەوێت عوتبە دێت، دروستکراوەکان کاریان بەدەست پەروەردگارە، بزانە کاری خوا بەو جۆرەی ناردوویەتی پارێزراوە، دەی بزانە بۆچی دروست کراویت و لێی بنەوەو واز لە جگە لەو بهێنە، چونکە دونیا کاتی و دواڕۆژ هەمیشەییە، دەی خراپەی ڕۆیشتوویەك لە چاکەی ماوە سەرقاڵت نەکات، لە دەست تووڕەیی خوا ڕابکە بۆ لای خوا چونکە خوا کێی بوێت دەسەڵات و زانستی پێ دەدات، داوای یارمەتی لە خوا دەکەین بۆ خۆمان و تۆیش لەسەر گوێڕایەڵی خۆی و ڕزگاربوون لە دەست سزای خوا.

## (وەسیەتی عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) بۆ ئەبوموسای ئەشعەری(رضي الله عنه))

دەینەوەری لە زوبەیری کوڕی موحصینەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب نامەی نووسی بۆ ئەبوموسای ئەشعەری:

(پاشان! خەڵکی بێزارییەکیان هەیە لە سوڵتانیان، دەی پەنا ئەگرم بە خوا فریام کەوەو وریابە سنورەکان بەجێ بگەیەنە با یەك ساتیش بێت. ئەگەر دوو

شتت هاتنەڕێ: یەکەمیان بۆ خواو دووەمیان بۆ دونیا، ئەوا تۆ پشکی خۆتت لەوەی خوادا وەربگرە، چونکە دونیا لەناودەچێ و ڕۆژی دوایی دەمێنێتەوە، دەرچوان سووك بکەو دەستە دەستە و تاك تاکیان بکە، سەردانی نەخۆشی موسڵمانان بکەو بڕۆرە بۆنەی بە خاك سپاردنیان، دەرگات بکەرەوەو خۆت لە کاروبارياندا بەشداربە، چونکە تۆش کەسێکیت لەوان، تەنها ئەوەیە خوای گەورە باری سەرشانی تۆی قورس کردووە، بیستوومە بەرگی خۆت و خێزانت و جل و بەرگ و سوارت لە هی موسڵمانان ناچێت، دەی ئەی بەندەی خوا وریابە وەك ئەو ئاژەڵە نەبیت کە بە شیوێکی پڕ فەڕو پیتدا بڕوات و تاکە هەواڵ و زانیاری خۆ قەڵەوکردن بێت، بەڵکو لەناوچوونی لە قەڵەوبوونیدایە، بزانە ئەگەر کاربەدەست فەوتا هاوڵاتیەکانیشی دەفەوتێن، سەرکەشترین نەگبەت ترین کەسیش ئەوەیە هاوڵاتییەکانی بە هۆیەوە یاخی و سەرکەش بن).[1]

ئیبن ئەبی شەیبە لە زوحاکەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب نامەی نووسی بۆ ئەبوموسای ئەشعەری(رضي الله عنه):

(پاشان! هێز لە کاردا ئەوەیە کاری ئەمڕۆ نەخەنە بەیانی، چونکە ئەگەر وابکەن کارەکان کەڵەکە دەبن بەسەرتانداو نازانن کامیان بکەن، بەوە گیرۆدە دەبن، ئەگەر دوو ئیشتان هاتەڕێ یەکێکیان بۆ دونیا و ئەوی تریش بۆ ڕۆژی دوایی ئێوە ئەوەی دووەم پێش بخەن، چونکە دونیا دەفەوتێ و ڕۆژی دوایی دەمێنێتەوە، هەمیشە ئاگاتان لە چاودێری خوا بێت و هۆشار بن و سەرقاڵی فێربوونی قورئان بن چونکە قورئان سەرچاوەی زانستەکان و بەهاری دڵانە).[2]

---

[1]- لە کنز العمال ج٣ ص١٤٩ دا واهاتووە، ئیبن ئەبی شەیبەو ئەبونەعیم لە الحلیة لە سەعیدی کوڕی ئەبی بوردەوە بە کورتی هێناویەتی، لە کنز العمال ج٨ ص٢٠٩ یشدا هاتووە.

[2] – لە کنز العمال ج٨ ص٢٠٨ دا واهاتووە.

# (وەسیەتی عوسمانی کوڕی عەففان(رضي الله عنه))

فەزائیلی رازی لە عەلائی کوڕی فەزڵ لە دایکیەوە هێناویەتی دەڵێت: کاتێك عوسمان(رضي الله عنه) کوژرا گەڕان بەنێو خەزێنەکەیداو تیایدا بوخچەیەکی قوفڵ کراویان دۆزیەوە، کردیانەوەو تیایدا پەڕەیەکیان دۆزیەوە کە تیایدا نووسرابوو: ئەمە وەسیەتی عوسمانە:

بە ناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

عوسمانی کوڕی عەففان شایەتی دەدات هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خوای تەنهای بێ هاوەڵو موحەمەدیش بەندەو نێردراوی خوایەو بەهەشت حەقەو دۆزەخ حەقەو خوای گەورە لە ڕۆژی بێ گوماندا ئەوانەی ناوگۆڕ زیندوودەکاتەوەو بەڵێنی خوا لادانی نی یە، لەسەری دەژینو لەسەری دەمرینو لەسەری زیندوو دەبینەوە ئەگەر خوا بیەوێت!).

نیزامولمولکیش هێناویەتیو ئەوەشی هێناوە: لە پشتیەوە ئەم نووسراوەیان بینی:

غنى النفس حتى يجلها    و ان غضها حتى يضر بها الفقر
وما عسرة فاصبرها وان لقيتها    بكائنة الا سيتبعها يسر
ومن لم يقاس الدهر لم يعرف الاسى    وفي غير الايام ما وعد الدهر[1]

ئەبوئەحمەد لە شدادی کوڕی ئەوسەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی: کە گەمارۆی سەر عوسمان لە(یوم الدار) دا توندی کرد، سەیری خەڵکی کردو وتی: ئەی بەندەکانی خوا! دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبوتالیبم بینی مێزەرەکەی پێغەمبەری(صلى الله عليه وسلم) لەسەرنابوو لە ماڵەکەی هاتەدەرێو شمشێرەکەی هەڵکێشابوو و حەسەنو عەبدوڵڵای کوڕی عومەر بە دەستەیەکی کۆچەرانو پشتیوانانەوە لە پشتیەوە بوون کەوتنە خەڵكو بڵاوەیان پێ کردن، پاشان چوون بۆ لای عوسمان، عەلی پێی وت: سەلامەت لێ بێت

---

[1] – لە الرياض النضرة ی موحیبی تەبەریدا ج٢ ص١٣٣ هاتووە.

ئەی ئەمیری باوەڕداران پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نەگەیشت بەم کارە تا دای لە هاتوو و پشت تێکردوو سوێند بەخوا من ئەمانە وا دەبینم هەر دەتکوژن، دەی ڕێ بدە با بجەنگین، عوسمان وتی:(سوێندی هەرکامتان دەدەم کە مافێکی خوای بینیبێت و دان بەوەدا بنێت مافێکم لەسەریەتی با لە پێناومدا پڕی پیاڵەیەك خوێن نەڕێژێت یان لە پێناو مندا خوێنی نەڕێژرێت). عەلی(رضي الله عنه) لێی دووبارە کردەوەو ئەویش هەمان وەڵامی دایەوە، وتی: عەلیم بینی لە دەرگاوە دەچوویە دەرەوەو دەیوت: خوایە تۆ دەزانیت ئێمە هەوڵی خۆمان دا. پاشان چوویە مزگەوت و ئامادەی نوێژ بوو، پێیان وت: ئەی ئەبولحەسەن بڕۆ بەرنوێژی بۆ ئەو خەڵکە بکە، وتی: من بەرنوێژیتان بۆ ناکەم لە کاتێکدا پێشەوا گەمارۆدراوە، بەڵکو بە تەنها نوێژەکەم دەکەم، بە تەنها نوێژەکەی کرد و گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، کوڕەکەی پێی گەیشت و وتی: بابە گیان سوێند بە خوا ماڵەکەیان بەسەردا ڕووخاند، وتی: انا لله وانا اليه راجعون سوێند بە خوا ئەوانە دەیکوژن، وتیان: ئەی ئەبولحەسەن ئەو لە کوێیە؟ وتی: سوێند بە خوا لە بەهەشتی بەریندایە، وتیان: ئەی ئەوان لە کوێن ئەی ئەبولحەسەن؟ وتی: سوێند بە خوا لە دۆزەخدان، سێ جار ئەمەی وت.[1]

ئەبوئەحمەد لە ئەبی سەلەمەی کوڕی عەبدولڕەحمانەوە هێناویەتی دەڵێت: ئەبوقەتادەو کابرایەکی تر چوون بۆ لای عوسمان(رضي الله عنه) ئەو کاتەی گەمارۆدرابوو، داوای مۆڵەتی حەجیان کرد، ئەویش مۆڵەتی پێدان، پێیان وت: ئەگەر ئەوانە سەرکەوتن ئێمە لەگەڵ کێ بین؟ وتی: لەگەڵ کۆمەڵ و یەکدانگیدا بن، وتیان: ئەگەر یەکدەنگی لەوانەدابوو کە سەردەکەون بەسەرتدا لەگەڵ کێدا بین؟ وتی: لەگەڵ کۆدەنگیدا بن لەهەرکوێ بێت، ئێمەیش چووین و حەسەنی کوڕی عەلیمان(رضي الله عنه) لەبەردەرگادا دی کە دەچوو بۆ لای عوسمان(رضي الله عنه) لەگەڵی گەڕاینەوە تا قسەی ببیستین، حەسەن سەلامی کرد لە عوسمان و پاشان وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران

[1] – لە الرياض النضرة ج٢ ص١٢٨ دا واهاتووە.

پێم بڵێ چیت دەوێت با بۆت بکەم؟ عوسمان وتی: برازا گیان بگەڕێرەوەو دابنیشە تا فەرمان و ویستی خوا دێت، حەسەن لەگەڵ ئێمە هاتەدەرو ئیبن عومەرمان دی کە هاتەژوورەوە بۆ لای عوسمان، لەگەڵ ئەویش گەڕاینەوە تا قسەی ببیستین، سەلامی کرد لە عوسمان و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، هاودەمی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بووم و گوێم گرت و گوێڕایەڵ بووم پاشان بۆ ئەبوبەکریش هاودەم بووم و گوێم گرت و گوێڕایەڵی بووم، بۆ عومەری کوڕی خەتتابیش هاوەڵی بووم و گوێم لێگرت و گوێڕایەڵی بووم و ماف باوکایەتی و خیلافەتیشم پێدا، وا ئێستا من لەبەردەستتدام ئەی ئەمیری باوەڕداران چی دەڵێی با بیکەم؟ عوسمان پێی وت:خوا پاداشتتان بداتەوە ئەی بنەماڵەی عومەر دووجار! پێویستیم بە خوێن ڕشتن نیە.[1]

ئەبوعومەر لە ئەبی هورەیرەوە(رضي الله عنه) هێناویەتی دەڵێت: من لەگەڵ عوسمان(رضي الله عنه) لەماڵەوە گەمارۆدرابووم، درا لە یەکێك لە ئێمە، وتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئێستا کاتی لێدانە وا یەکێك لە ئێمەیان کوشت، ئەویش وتی: ئەی ئەبوهورەیرە بڕیارم داوە دەبێت ئەو شمشێرەت فڕێ بدەیت، چونکە ئەوان منیان دەوێت، منیش بە خۆم باوەڕداران دەپارێزم، ئەبو هورەیرە دەڵێت: شمشێرەکەم فڕێداو تا ئێستاش نازانم لە کوێیە؟[2]

---

[1] – لە الرياض النضرة ج٢ ص٢٦٩ دا واهاتووە.

[2] – لە الرياض النضرة ج٢ ص١٢٩ دا واهاتووە.

## (وەسیەتەکانی عەلی کوڕی ئەبوتالیب(رضي الله عنه) بۆ سەرکردەکانی)

دەینەوەری و ئیبن عەساکیر لە موعاجیری عامیریەوە هێناویانە دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبوتالیب(رضي الله عنه) بەڵێنێکی بۆ هەندێ لە هاوەڵانی بەرپرسی شوێنی نووسی و تیایدا هاتبوو:

(پاشان! وەستانی بەردەرگات لەسەر هاوڵاتیانت درێژمەکەرەوە، چونکە ئەو کارە بەشێکە لە بەرتەسکی و بەوە گەورە لایان بچووك و بچووك لایان گەورە و جوان لایان ناشیرین و ناشیرین لایان جوان دەکات و حەق دەکات بە پووچەڵی و ناهەقی، والی کەسێکە و نازانێت خەڵکی چی لێ دەشارنەوە، قسەکردن هێمای لەسەر نیە تا ڕاست و درۆ لەیەك جیابکەیتەوە، بەو پێیە لە هاتنەژوورەوەدا بە نەرمی پەردەداری بەردەرگا مافەکان بپارێزی، چونکە تۆ یەکێکیت لەم دوو جۆرە کەسە: یان کەسێك بە زیادەڕەوی ماف خۆتت لە بیر کردووە و پەردەدارەکەت ڕێك ڕادەگریت بەو مافەی دەیدەیتێ یان بەو ئاکارە جوانەی دەینوێنی، یان تووشی ڕێگرتن بوویت لەخێر خەڵکی دەست دەگرێتەوە لە خۆت و داوالێکردن ئەگەر بێهیوابوون، لەگەڵ ئەوەی زۆربەی پێویستی خەڵك لەلات هیچ ئەرکی سەرشانی تێدانی یە، سکاڵای ستەمێکە یان داوای بە گەڕخستنی ویژدانە، دەی ئەمەی وەسفم کرد پێی سوودمەندبە و پشت بە خوا هەوڵبدە چاوت لە بەخت و ژیری و هۆشیاریت بێت).[1]

دەینەوەری و ئیبن عەساکیر لە مەدائینەوە هێناویانە دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبوتالیب(رضي الله عنه) نووسی بۆ هەندێ لە کاربەدەستەکانی:

(لەسەرخۆ وریابە! وەك ئەوەی گەیشتبیتەجێ و کارەکانت خرابنە بەرچاوت لەو شوێنەی کەسی هەڵخەڵەتاو و بەخۆداناز هاواری پەشیمانی و کەسی دەرفەت نەماو و فەوتێنەر هاواری تەوبە و ستەمکار هاواری گەڕانەوە و پەشیمانی دەکات). عەلی کوڕی ئەبوتالیب(رضي الله عنه) کردمی بە بەرپرسی(عەکبەرا) و بە من و خەڵکی ئەوێی ژێردەستمی وت:

---

[1] - لە منتخب کنز العمال ج٥ ص٥٨ دا واهاتووە.

(خەڵکی وڵاتی سواد خەڵکێکی فێڵبازن وریابە هەڵت نەخەڵەتێنن، وەفات هەبێت بۆ ئەوەی لەسەریانەو بەجێی بگەیەنە) پاشان وتی: بڕۆ، منیش کە چوومەوە بۆ لای پێی وتم:(ئەوەم پێوتیت تا پێیان بڵێمو گوێگربن، لە پێناو درهەمێکدا قامچیەك لە یەك کەسیان نەدەیتو ڕاینەگریت، مەڕو گایان لێ وەرمەگرە، ئێمە فەرمانمان پێکراوە لێبوردنیان لێ وەربگرین، دەزانیت لێبوردن چییە؟ توانا). لە کنز العمال ج٣ ص١٦٦ دا واهاتووە.بەیهەقی ج٩ ص٢٠٥ هێناویەتی، لە فەرموودەکەیدا هاتووە: ڕۆزی و بەرگو پۆشاکی زستانو هاوینو وڵاخی کاریان مەفرۆشەو کەسێك لە پێناو درهەمێکدا لەسەرپێ مەوەستێنە، وتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران دەی یانی چۆن لەلات چووم وا بگەڕێمەوە بۆ لات؟ وتی: ئەگەریش چۆن چوویتو وا بگەڕێیتەوە، ئێمە فەرمانمان پێکراوە لێبوراویان لێ وەربگرین واتە زیادەی خۆیان.

## (ئامۆژگاری تاكو هاووڵاتی بۆ پێشەواکەی)

ئیبن سەعدو ئیبن عەساکیر لە مەکحوولەوە هێناویانە سەعیدی کوڕی حوزەیمی جومەحیەوە لە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) هێناویەتی بە عومەری کوڕی خەتتابی وت: ئەی عومەر دەمەوێت وەسیەتت بۆ بکەم، وتی: بەڵێ دەی وەسیەتم بۆ بکە، وتی:

(وەسیەتت بۆ دەکەم بەرامبەر بە خەڵك لە خوابترسیتو بەرامبەر بە خوا لە خەڵك نەترسیتو قسەو کردارت پێچەوانە نەبن، چونکە ڕاستترین قسەت ئەوەیە کە کردارت بە ڕاستی دادەنێت، لە یەك مەسەلەدا دوو بڕیاری جیا مەدە ئەگەرنا باروکارت تێکدەچێتو حەقت لەلانامێنێ، کاری پێویست بە بەڵگە بگرەبەر خوا یارمەتیت دەداتو هاوڵاتیانی بەردەستت چاك دەکات، ڕوو و دادوەریت لەو کارەی خوای گەورە داویەتیە دەستت بۆ دوورو نزیکی موسڵمانان ڕێك بێت، ئەوەی بۆ

خۆت و ژن و منداڵت حەزت پێیە بۆ خەڵکیش حەزی پێ بکە، ئەوەی بۆ خۆت و ماڵ و منداڵت پێت ناخۆشە بۆ ئەوانیش پێت ناخۆش بێت، هەنگاو بەرەو حەق بنێ و لە پێناو خوادا لە لۆمەی لۆمەکاران مەترسێ).

عومەر وتی: کێ ئەوەی پێ دەکرێت؟ سەعید وتی: کەسی وەك تۆ، هەرکەس خوای گەورە کاروباری ئوممەتی مەحەممەدی دایە دەست، پاشان کەس لە نێوان ئەو خوادا نەما.[1]

ئیبن راهەویەو حارس و موسەددەو ئەبویەعلا – بە صەحیحی – لە عەبدوڵای کوڕی بورەیدەوە هێناویانە عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) خەڵکی بۆ هاتنی وەفد کۆکردەوە، بە ئەزنەی کوڕی ئەرقەمی وت: بزانە هاوەڵانی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) کوان مۆڵەتیان پێبدە پێش هەموان بێن، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان، ئەوانیش چوون و لەبەردەمیدا ڕیزیان بەست، سەیری کرد پیاوێکی کەڵەگەت لەتە کڵاوێکی لەسەربوو، عومەر ئاماژەی نزیکبوونەوەی بۆ کرد، ئەویش هات بۆ لای، عومەر وتی: ئێ ێ ێ، پیاوەکەش سێ جار وتی: ئێ ێ ێ عومەر وتی: ئۆف! هەستە ئەویش هەستا، عومەر سەیریکرد کابرایەکی ئەشعەری سپی لەش لاوازە، کورت و قورس و هێواشە، ئاماژەی نزیکبوونەوەی بۆ کرد، چوو بۆ لای، عومەر وتی: ئێ ێ ێ، ئەشعەریەکە وتی: ئێ ێ ێ، عومەر وتی: تێ ێ ێ، کابرا وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران قسەیەك بکەرەوە با لەسەری بتدوێنین(شتێ بڵێ با ئێمە قسەبکەین) عومەر وتی: ئۆف، هەستە، ڕای گومان هەرگیز سوودت پێ ناگەیەنێت، سەیری کرد کابرایەکی سپی لەش لاوازە، ئاماژەی کردو لێی نزیك بوویەوە، عومەر وتی: ئێ ێێ، ئەویش لێنەوی و سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کردو لەبەرخوا کەوتە ئامۆژگاری، دوایی وتی:(تۆ کاروباری ئەم ئوممەتەت گرتووەتە دەست دەی لەو کارەی ئوممەت و هاوڵاتیانی ژێردەستت بە تایبەت لە خوابترسە، چونکە تۆ

---

[1] – لە منتخب کنز العمالج٤ ص٣٠٩ دا واهاتووە.

لێپێچینەوەت لەگەڵ دەکرێت و لێپرسراویت، تۆ جێ سپاردەیت، دەبێت سپاردەی سەرشانت بدەیتەوە، ئەو کات بەپێی کردارت پاداشت دەدرێیتەوە). وتی: لەو کاتەوەی بووم بە خەلیفە جگە لە تۆ کەس بە ڕاست نەیدواندووم، تۆ کێیت؟ وتی: من ڕەبیعی کوڕی زیادم، وتی: برای موهاجیری کوڕی زیاد؟ وتی: بەڵێ، عومەر سوپایەکی ئامادەکردوو ئەشعەریەکەی لەسەردانا، پاشان وتی: بزانە ڕەبیعی کوڕی زیاد ئەگەر لە قسەیەکدا ڕاست بکات ئەوا لەسەر ئەو کارە یارمەتی دەبێت، بۆیە بەکاری بهێنە، پاشان دە کەس لە ئێوە نەیەت مەگەر ئەوەی کارەکەی لەسەر دەنووسی و لەسەر ژیانی کارەکەیدا دەنوسیت بۆم، تا ئەوەی وابزانیت منم خستوومەتەکار، پاشان عومەر وتی: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ڕایسپاردین و فەرمووی(ان اخوف ما اخشى عليكم بعدي منافق عليم اللسان)[1].[2]( ترسناکترین شتێ بۆ دوای خۆم ترسم هەیە تووشتان بێت دووڕوویەکی زمانزانە).

ئەبونەعیم لە الحلية ج١ ص٢٣٨ لە موحەممەدی کوڕی سوقەوە هێناویەتی دەڵێت: چووم بۆ لای نەعیمی کوڕی هیند، ئەویش پەڕەیەکی دەرهێنا بۆم، تیایدا نووسرابوو:

(لە ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەراح و موعازی کوڕی جەبەلەوە بۆ عومەری کوڕی خەتتاب، سەلامت لێ بێت، پاشان! ئێمە ڕامان سپاردیت و باری خۆت بەرامبەریان بۆ خۆتە، وا هەموو کاروبارێکی(سوور و ڕەش) ئەم ئوممەتەت گرتووەتە دەست، لەبەردەستتدا گەورەو بچووك بەرزو ڕیسوا دۆست و دوژمن دادەنیشن، هەرکامیان پشکی دادپەروەری خۆی هەیە. ئەی عومەر بزانە لەو بارەدا چۆنیت! چونکە ئێمە هۆشیاریت پێ دەدەین لەسەر ڕۆژێك کە ڕوخسارەکان تیایدا دەناڵێنن و دڵەکان تیایدا وشك دەبنەوەو بەڵگەکان دەپێچرێن و بۆ بەڵگەی(پادشایەك) دەستەلاتدارێك

---

[1] - ضعيف.

[2] - لە كنز العمال ج٧ ص٣٦ دا واهاتووە.

کە بە توانای خۆی دەستەوسانی خستوون، دروستکراوان هەموو بەرەو ڕووی ئەو(خوای گەورە) ملکەچن و هیوایان بە ڕەحمەتی ئەوەو لە سزای ئەو دەترسن، ئێمە وامان دەوت کاروباری ئەم ئوممەتە لە کۆتا سەردەمیدا دەگەڕێتەوە تا ئەوەی دەبنە برای بەرچاو و دوژمنی نهێنی. پەنادەگرین بە خوا ئەم نووسینەمان لای تۆ بەدەر لە نیازی دڵمان دابەزێت، ئێمە تەنها وەك ئامۆژگاری بۆمان نووسیویت، والسلام عليك).

## عومەری کوڕی خەتتابیش(رضي الله عنه) بۆی نووسین:

لە عومەری کوڕی خەتتابەوە بۆ ئەبوعوبەیدەو موعاز، سەلامتان لێ بێت، پاشان نامەکەتان گەیشتە دەستم، بیرتان دێت ئێوە ڕاتان سپاردم و کاروباری من بۆیان، وا هەموو کاروباری ئوممەتم گرتەدەست، گەورەو بچووك خانەدان و ڕسوا، دۆست و دوژمن لەبەردەستمدان و هەرکامیان پشکی خۆی هەیە، نووسیتان ئەو کات ئەی عومەر بزانە چی دەکەیت؟ لێرەدا عومەر هیچی پێ ناکرێت بە یارمەتی خوا نەبێت، نووسیتان هۆشیاری لەسەر گەلانی پێشوومان وەرگم، دەمێکە جیاوازی شەو و ڕۆژ بە داهاتنی خەڵکی هەموو دوورێك نزیك دەکەنەوە و هەموو نوێیەك تووش دەکەن. بە بەڵێنێك دێن تا خەڵکی دەچنە بەهەشت یان دۆزەخ، نوسیتان و هۆشیاریتان پێ دام:(ئەم ئوممەتە لە کۆتا زەمانـدا دەگەڕێتەوە تا ئەوەی دەبنە برای بەرچاو و دوژمنی پەنهان، ئێوە ئەوانە نین و ئەم سەردەمەش ئەو سەردەمە نیە، ئەوە سەردەمی دەرکەوتنی ترس و مژدەیە، حەزی خەڵکی بۆ یەکتر بۆ دونیایانە، نووسیتان پەنام دەدەنەبەر خوا لەوەی نامەکەتان بەدوور لە نیازی دڵتان بگرم و بە ئامۆژگاری بۆ متان نووسیوە، ڕاست دەکەن، دەی لەمەودوا نامەم لێ مەبڕن چونکە پێویستیم پێتانە، والسلام عليكم).[1]

---

[1] - ئیبن ئەبی شەیبەو هینادیش بە هەمان شێوە هێناویانە، لە كنز العمال ج٨ ص٢٠٩ هاتووە. تەبەرانیش هێناویەتی، لە المجمع(ج٥ ص٢١٤) دا هاتووەو دەڵێت: کەسەکانی سەنەدەکە تا ئەو لاپەڕەیە جێ متمانەن.

## (وەسیەتی ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەراح(رضي الله عنه))

لە سەعیدی کوڕی موسەییبەوە دەڵێت: کاتێك ئەبوعوبەیدە(رضي الله عنه) لە ئوردون پێکرا موسڵمانانی ئەوێی بانگکردو وتی:(من وەسیەتێکتان بۆ ئەکەم ئەگەر قبوڵی بکەن بەردەوام لە خێرو چاکەدا دەبن، نوێژ بکەن و ڕۆژووی ڕەمەزان بگرن و سەدەقە بدەن و حەج و عەمرە بکەن و پەیوەست بن و ئامۆژگاری سەرکردەکانتان بکەن و لەگەڵیان ناپاك نەبن، دونیا قوڕبەسەرتان نەکات، چونکە کەسێك ئەگەر هەزار جار بژی هەر دەبێت بەرەو ئەم مەرگەی من بێت کە دەیبینن، خوای گەورە مەرگی لەسەر نەوەی ئادەم نووسیوەو ئەوانە دەمرن، ژیرترینتان ئەوەیە زیاتر گوێڕایەڵی پەروەردگاریەتی و زیاتر کاردەکات بۆ ڕۆژی دوایی، والسلام علیکم ورحمە الله وبرکاتە، موعازی کوڕی جەبەل بەرنوێژی بکە بۆ خەڵکەکە). ئینجا مرد، ڕەحمەتی خوای لێ بێت، موعاز(رضي الله عنه) لەناو خەڵکەکەدا هەستاو وتی:(خەڵکینە لە دەست تاوانەکانتان لای خوا تەوبە بکەن، هەر بەندەیەك بە داوای تەوبە لە گوناهەکانی بگەڕێتەوە بۆ لای خوا ئەو خوا مافی لەسەرە کە لێی خۆش بێت، هەرکەس قەرزێکی لەسەرە با بیداتەوە، چونکە بەندە بە قەرزەکەی گیرۆدەو ڕاوەستێنراوە، هەرکامتان براکەی تۆراندووە با بڕوات بۆ لایو ئاشتی لەگەڵ بکات، نابێت موسڵمان زیاتر لە سێ ڕۆژ براکەی بتۆرێنێت. موسڵمانان: کەسێکتان لە دەستدا بانگەشە نیە ئەگەر بڵێم چاکترین دڵ و دوورترین تەڵەکەو زیاتر خۆشەویستی بۆ هەموان و ئامۆژگاریکەرترین بوو، دەی ڕەحمەتی بۆ بنێرن و ئامادەی نوێژ بن لەسەری).[1]

[1] – لە الریاض النضرة في المناقب العشرة ج٢ ص٣١٧ دا واهاتووە.

# (ژياننامەی خەليفەو ئەميرەكان)

# (ژيانی ئەبوبەكری صديق(ڕەزای خوای لێ بێت))

ئيبن سەعد ج٣ ص١٣١ لە ئيبن عومەرو عائيشەو موسەيب و جگە لەوانيشەوە(ڕەزای خوای لێ بێت) هێناويەتی دەڵێت: لە نێو خۆياندا قسەيان كردو وتيان: ئەبوبەكری صديق لە ڕۆژی مەرگی پێغەمبەردا(ﷺ) لە ڕۆژی دوو شەممە دوانزەی ڕەبيعولئەوەلی ساڵی يانزەی كۆچيدا بەيعەتی پێدرا، ماڵی لەلای حەبيبەی كچی جاريجەی كوڕی زەيدی كوڕی ئەبی زوهەير لە بەنی حارسی كوڕی خەزرەج لە(سونج) بوو، لە خوریو موو هۆدەيەكی دروست كردبوو، تا ئەوەی هاتە ماڵی مەدينە هەر وابو، لەوێ پاش شەش مانگی بەيعەت هەر بەپێ بە مەدينەدا هاتووچۆی دەكرد، كە سواری وڵاخێكی دەبوو و بەرگێكی پۆشيبوو عەبايەكی ڕەنگ سوورو خۆڵ تێكەڵاوی لەسەربوو، دەچوويە مەدينەو نوێژی بۆ خەڵك دەكرد، كە نوێژی عيشای دەكرد دەگەڕايەوە بۆ لای ماڵو منداڵی لە سونج، كە ئامادە دەبوو نوێژی بۆ خەڵك دەكرد، ئەگەر ئامادەنەبوايە عومەری كوڕی خەتتاب بەرنوێژييەكەی دەكرد، لە ڕۆژی هەينی لە نيوەی ڕۆژدا لە سونج بوو، سەروڕيشی ڕەنگ دەكردو دواتر دەچوو بەرەو نوێژی هەينی كۆی دەكردنەوە، ئەو كەسێكی بازرگان بوو، ڕۆژانە دەچوو بۆ بازاڕو كڕينو فرۆشتنی دەكرد، ڕانەمەڕێكی هەبوو خۆی دەيهێنانو دەيبردن، يان دواتر لەبری خۆی بۆی دەلەوەڕێنرا، مەڕەكانيان شيری ناوچەكەيان دەدا، كە بەيعەتی خيلافەتی پێدرا كەنيزەكێكی ناوچەكە وتی: ئێستا پشكی ماڵمان نادەی پێمان، ئەبوبەكر بيستی و وتی: بەڵێ بە خوا پێتان دەدەمو(شيرەكە) هيوام وايە ئەم كارەم هيچ ئاكاری جارانم بگۆڕێتو پێ لە دەستبدات. شيری پێدان، يان وا دەڵێت بە كەنيزەكەكەی وت: ئەی كەنيزەك حەزدەكەيت شيری كەرەدارو بێ كەرەشت بدەمێ؟ وابزانم وتی: بەڵێ بيكەن(هەردووكيان هاتوون) هەركاميانی وت كردی، بەو جۆرە شەش مانگ لە

سونج مایەوە، دواتر دابەزی بۆ مەدینەو لەوێ مایەوەو سەرقاڵی کاروباری بوو، وتی: ئەبەخوا بازرگانی بۆ چاککردنی باری خەڵك ناشێتو تەنها یەکلاکردنەوە بۆ کاریان دادیان دەدات تا لە کاروباریان بڕوانین، دەبێت شتێکی شیاو بۆ کەسو ماڵم هەبێ، وازی لە بازرگانی هێناو لە بەیتولمالی موسڵمانان بەشی بژێوی ڕۆژ دوای ڕۆژی خۆی و کەسو ماڵی بڕیەوە، بەشی ئەوەی حەجو عەمرەی بکات بۆ هەر ساڵێك شەش هەزار درهەمیان بۆ بڕیبوویەوە، لە سەرەمەرگیدا وتی: چی لە بەتولمان لایە بۆمان بگێڕنەوە چونکە من هیچ لەو ماڵە نابەم، بەو بەشەی موسڵمانان ڕازیم کە لە فلانو فلان شوێن لێم وەرگرتوون، ئەوەی لەگەڵ وشترێکی پڕشیرو کۆیلەیەکی صەیقەلو هۆشەیەکی دا بە عومەر کە نزیکەی پێنج درهەمە، عومەر(رضي الله عنه) وتی: ئەوەی دوای ئەم دێت پەککەوتە دەبێت(گیر دەخوات) وتیان: ئەبوبەکر لە ساڵی یانزەدا عومەری کوڕی خەتتابی لەسەر حەج دانا، پاشان ئەبوبەکر لە ڕجەبی ساڵی دوانزەدا عەمرەی کردو لە چێشتەنگایەکدا چوویە مەککەو چوو بۆ ماڵەوەو ئەبوقوحافە لەبەردەرگادا وەستابوون چەند گەنجێکی لەگەڵدابوو کە دەیدواندن تا ئەوەی پێی وترا: ئەوە کوڕەکەتە، ئەویش ڕاپەڕیو ڕایکردو ئەبوبەکر ویستی خێرا ولاخەکەی بوەستێنێو لەسەری دابەزیو دەیوت: بابەگیان هەڵمەسە، پاشان پێی گەیشتو نێوان چاوانی ئەبوقوحافەی ماچکردو پیرەپیاویش لەتاو خۆشی هاتنیدا دەگریا، عیتابی کوڕی ئوسەیدو سوهەیلی کوڕی عیکرمەی کوڕی ئەبوجەهلو حارسی کوڕی هیشام(رضي الله عنه) هاتنە مەککەو سەلامیان لێکردو وتیان سەلامت لێ بێت ئەی پێغەمبەر، هەموویان تەوقەیان لەگەڵ کرد، ئەبوبەکر هەر کە باسی پێغەمبەری لێ دەبیستن دەگریا، پاشان سەلامیان کرد لە ئەبوقوحافە، ئەبوقوحافە وتی: ئەی ئازادکراو لەگەڵی ئەمانە چاك بە، ئەبوبەکر وتی: بابەگیان هێزو توانا بەس بۆ خوایە، کارێکی قورس لەسەرشانمدا نراوە کە دەرەقەتی نایەم بە یارمەتی خوا نەبێت، پاشان خەڵکی دەچوون بەرەوڕووی و هاوەڵانی کەوتنە شوێنی و ئەویش ڕووی تێکردنو وتی: لەسەرخۆ بچن، خەڵکی لە

سەرمەرگی پێغەمبەر(ﷺ) سەرەخۆشییان لێ دەکردو ئەویش دەگریا تا بەوحاڵەوە گەیشتەوە ماڵ، عەباکەیپۆشی(لە شێوەی کاتی تەوافدا) پاشان چوو و حەوت جار تەواف کردو دوو ڕکات نوێژی کرد، پاشان گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، کە نیوەڕۆ هات دەرچوو و دووبارە تەوافی کەعبەی کرد، پاشان لە نزیك دارونەدوە دانیشت و وتی: کەس هەیە سکاڵای هیچ ستەمێکی هەبێت یان داوای مافێك بکات؟ کەس نەهات و هیچی نەبوو، خەڵکی لەسەر والیەکەیان سوپاسی خوایان کرد، پاشان نوێژی عەسری کردو دانیشت و خەڵکی ماڵئاواییان لێکرد، پاشان بەرەو مەدینە گەڕایەوە، لە کاتی حەجدا لە ساڵی دوانزە ئەبوبەکر حەجی بۆ خەڵك کردو بە تەنها حەجی کردو لەسەر مەدینە عوسمانی کوڕی عەففانی دانا، ئیبن کەسیر دەڵێت: دەقەکەی حەسەنەو لە چەند لایەکی دیکەوە چەند شاهیدێکی هەن، دەروونیش شتی وا قبووڵ دەکات و جێی ڕەزامەندیە.

## (چیرۆکی عومەیری کوڕی سەعدی ئەنساری(رضي الله عنه))

ئەبونەعیم لە الحلیە ج١ ص٢٤٧ لە عەبدولمەلیکی کوڕی هارونی کوڕی عەنتەرە لە باوکیەوە لە باپیریەوە لە عومەیری کوڕی سەعدی ئەنساریەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب وەك کاربەدەستی حیمص ناردی، ئەویش ماوەیەك مایەوەو هەواڵی بۆ نەدەهات، عومەر بە نووسەرەکەی وت: نامە بنووسە بۆ عومەیر، سوێند بەخوا وادەبینم ناپاکی لە ڕوودا نواندبێن، نامەی نووسی (ئەگەر ئەم نامەم گەیشتە دەستت یەکسەر بە خۆت و ئەو سامانەی لە دەستکەوتی موسڵمانان کۆتکردوەتەوە وەرە کاتێك سەیری ئەم نامەم دەکەیت).

عومەیر توێشووەکەی هەڵگرت و شمەکی خۆی تێدا دانا و قاپەکەی هەڵگرت و خەنجەرەکەی هەڵگرت و لە حیمصەوە چوو تا چوویە مەدینە.

کە گەیشت ڕەنگی تێکچووبوو و دەموچاوی تۆزاوی ببوو و قژی درێژببوو، چووبۆ لای عومەرو وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، سەلام و ڕەحمەتو بەرەکەتی خوات لێ بێت، عومەر وتی: چیتە؟ وتی: تۆ چی لەبارەمەوە دەبینیت؟ مەگەر تۆ منت بە لەش دروستو خوێن پاك نەدەزانی، مەگەر دونیام پێیە تا ڕایکێشم؟ وتی: چیت پێیە؟ عومەر وایزانی پارەی هێناوە، وتی: توێشووەکەمە کە شمشێرەکەمی تێدایە لەگەڵ تەشتەکەم کە تیایدا جلو سەرم دەشۆم، قاپەکەم کە تیایدا دەسنوێژدەگرمو ئاوی پێ دەخۆمەوە، خەنجەرەکەشم کە دەکەوم بەسەریداو ئەگەر دوژمنم هاتەڕێ جیهادی پێ دەکەم، سوێند بەخوا دونیا تەنها سەختیە بۆ خۆشیەکانم! عومەر وتی: کە هاتیت بەڕێدا دەچوویت؟ وتی: بەڵێ، وتی: کەس نەبوو وڵاخێکت پێ بدات تا سواری بیت؟ وتی: نەیانکردو منیش وام نەکرد، عومەر وتی: بە ڕاستی لای موسڵمانانێکی خراپەوە هاتوویت، عومەیر پێی وت، عومەر لە خوا بترسە، خوا ڕێ پێ نەداویت غەیبەت بکەیت، دەیانبینم نوێژی بەیانی دەکەن، عومەر وتی: دەی بۆ کوێم ناردوویت؟ لە گێڕانەوەی تەبەرانیدا دەڵێت: دەی ئەوەی ناردومیت پێی لە کوێیە؟ چیت کردووە؟ وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران پرسیارت چیتە؟ عومەر وتی: سبحان الله، عومەیر وتی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە لە ڕووتدا ڕاست نەبم پێم نەدەوتیت، ناردمت تا چوومە ئەوێ، خەڵکە چاکەکەیم کۆکردەوەو کۆکردنەوەی بەرهەمی زەوییانم دایە دەستیان تا کۆیان کردەوە، ئەو کات لە شوێنی خۆمدا دامنا، ئەگەر تۆ هیچ پشکێکت لێی هەبووایە بۆم دەهێنایت، وتی: ئەی هیچت بۆ نەهێناوم؟ وتی: نا، وتی: دەی بەڵێنەکە نوێ بکەنەوە بۆ عومەیر، وتی: ئەمە شتێکە بۆ تۆو کەسی دوای تۆیش نایکەم، سوێند بەخوا وەرمنەگرتووە هیچکات، بە مەسیحیەکم وت ئەی خوا زەبوونت بکات، ئەمە ئەوەیە پێشنیاری کردم بۆی ئەی عومەر، خراپترین ڕۆژم ئەو ڕۆژەیە لەگەڵ تۆ دروست کرام ئەی عومەر، بۆیە داوای مۆڵەتی لێکرد، ئەویش مۆڵەتی داو عومەیریش گەڕایەوە بۆماڵەوە. دەڵێت: چەند میلێك لە نێوان ئەوێو مەدینەدا ڕێ

بوو، عومەر لە كاتی چوونی عومەیردا وتی: وا دەبینم ناپاكی لەڕوودا نواندین، بۆیە كەسێكی بەناوی حارسی ناردو سەد دیناری پێدا، پێی وت: بڕۆ بۆ لای عومەیر تا لای دادەبەزیت وانیشان بدە تۆ میوانیت، ئەگەر كاریگەری شتێكت دی وەرە، ئەگەر بارێكی سەختت دی ئەم سەد دینارەی پێ بدە. حارس چوو سەیری كرد عومەیر دانیشتووەو لە پاڵ حەوشەكەدا كەراسەكەی پاك دەكردەوە، كابرا سەلامی لێكرد، عومەیر پێی وت: دانیشە ڕەحمەتی خوات لێ بێت، ئەویش دابەزی‌و دواتر پرسیاری لێكرد، وتی: لە كوێوە هاتوویت؟ وتی: لە مەدینەوە، وتی: ئەی ئەمیری باوەڕدارانت چۆن بینی؟ وتی: باشە، وتی: ئەی موسڵمانان؟ وتی: باش‌و پیاوچاكن. وتی: ئایا سنوورەكان بەجێ ناگەیەنیت؟ وتی: بەڵێ، دای لە كوڕێكی خۆی كە خراپەیەكی كردبوو لەتاو ئەوەدا دواتر كوڕەكەی مرد، عومەیر وتی: خوایە یارمەتی عومەیر بدە چونكە وایدەبینم زۆر تۆی خۆش دەوێت، سێ ڕۆژ لای مایەوەو تەنها كولێرەیەكی گەنمی هەبوو ماڵەوەیان دایاندەنا بۆ ئەو و خۆیان پێچدەدا تا ماندووبوون، عومەیر پێی وت: تۆ برسیت كردووین، ئەگەر دەتوانیت لەلامان بچیت باشە، ئەویش دینارەكانی دەرهێنا و پێی داو وتی: ئەمیری باوەڕداران ئەمەی بۆ ناردیت وەریگرە، ئەویش هاواری كردو وتی: هیچ پێویستیم پێی نیە، ژنەكەی پێی وت: دەی ئەگەر پێویستیت پێیەتی باشە ئەگەر نا لە شوێنی خۆیدا بیبەخشە. عەمەیر وتی: سوێند بەخوا هیچم ناوێت، ژنەكەی خوارووی چۆكەكەی دڕی‌و ئەویش پارەكەی كردەناوی، ئافرەتەكە چوو لە نێو كوڕانی شەهیدان‌و هەژاراندا دابەشی كرد، نێردراوەكە وای زانی شتێكی لەوە پێ بدات، عومەیر پێی وت: سەلامم بگەیەنە بە ئەمیری باوەڕداران. حارس گەڕایەوە بۆ لای عومەرو وتی: چۆنت بینی؟ وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران لە بارێكی سەختدا بینیم، وتی: ئەی چی كرد بە دینارەكان؟ وتی: نازانم. عومەر بۆی نووسی ئەم نامەم گەیشت پێت دایمەنێ تا بێیت بۆ لام، ئەویش هات، عومەر پێی وت: چیت كرد بە دینارەكان؟ وتی هەرچیم پێكرد پێمكرد تۆ بۆچی پرسیاری لەبارەوە

دەکەیت؟ وتی: سوێندت دەدەم لەبەر خوا پێم بڵێ چیت پێ کرد؟ وتی: پێشم خستن بۆ خۆم(بەخشیم) وتی: ڕەحمەتی خوات لێ بێت، فەرمانی کرد تا کۆشێ خواردن و دووکراسی بدەنێ، ئەویش وتی: بۆ خواردنەکە پێویستیم پێی نیە چونکە لە ماڵەوە دوومشت گەنمم بەکارهێناوە تا ئەوە دەخۆم خوا ڕۆزی دەنێرێت، بۆیە خواردنەکەی وەرنەگرت، بۆیە دووکراسەکەش دایکی فلان کەس بێ بەرگە، هەردووکیانی بردوو گەڕایەوە بۆ ماڵەوە و هێندەی نەبرد مرد(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) عومەری ئەمەی بیست، دڵی سووتا و گریانی بۆی هات و لەگەڵ خەڵکیدا چوو بۆ گۆڕستانی(بقیع الغرقد)[1] بە هاوەڵەکانی وت: هەمووتان ئاواتی خۆتان بڵێن، یەکێکیان وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران حەزمدەکرد پارەم هەبوایە و لەپێناو خوادا ئەوە و ئەوە ئازاد بکەم، یەکێکی تر وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران حەزمدەکرد پارەم هەبوایە لە پێناوخوادا بیبەخشم، یەکێکی تر وتی: ئەگەر توانام هەبوایە لە زەمزەم ئاو هەڵگۆزم بۆ حاجیانی ماڵی خوا، عومەر وتی: حەزدەکەم کەسێکی وەك عومەیری کوڕی سەعدم هەبێت تا لە کاروباری موسڵماناندا پشتی پێ ببەستم[2,3].

---

[1] گۆڕستانێکە بۆ خەڵکی مەدینە چونکە درەختی غەرقەدی تێدایە.

[2] - ضعیف.

[3]- تەبەرانیش بەو جۆرە لە عومەیری کوڕی سەعدەوە هێناویەتی، هەیسەمی ج٩ ص٣٨٤ دەڵێت: لە سەنەدەکەدا عەبدولمەلیکی کوڕی ئیراهیمی کوڕی عەنتەرە هەیە کە مەترووکە، هەیسەمی هەروا هێناویەتی، وا دیارە ڕاستتر ئەوەیە عەبدولمەلیکی کوڕی هارونی عەنتەرە لە کتێبەکانی ناوی کەسانی فەرموودەدا هاتووە، ئیبن عەساکیریش لە ڕێگەی موحەممەدی کوڕی موزاحیمەوە بە دوورو درێژی بەو واتایە هێناویەتی، کنز العمال ج٧ ص٧٩ هێناویەتی.

# (چیرۆکی سەعیدی کوڕی عامری کوڕی حوزەیمی جومەحی(رضي الله عنه))

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٢٤٥ لە خالیدی کوڕی مەعدانەوە هێناویەتی دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب سەعیدی کوڕی عامری جومەحی کردە بەرپرسمان لە حیمص، کە عومەر هات بۆ حیمص، وتی: ئەی خەڵکی حیمص بەپرسەکەتان چۆن دەبینن؟ ئەوانیش سکالایان لاکرد - بە خەڵکی حیمص دەوترا کوەیفەی بچووک لەبەر سکالایان لە سەر کاربەدەستان - وتیان چوار سکالامان لەسەری هەیە: خۆر هەڵدێت ئینجا دێت بۆ لامان، وتی: پێی گەورە دەبی، وتی: چیتر؟ وتیان: شەو وەڵامی کەس ناداتەوە، وتی: گەورەییە، وتی: چیتر؟ وتیان: لە مانگەکەدا ڕۆژێك هەیە نایەت بۆ لامان، وتی: گەورەییە، وتی: چیتر؟ وتیان: هەندێ ڕۆژ سەرەمەرگ دەیگرێت، وتی: عومەر ئەوی لەگەڵ خەڵکەکەدا کۆکردەوەو وتی: خوایە ئەمڕۆ ڕام لەسەری ڕاست بێت، سکالاتان لەسەری چییە؟ وتیان: تاخۆر هەڵنەیەت نایەت بۆ لامان، وتی: حەزناکەم باسی بکەم، لە ماڵدا خزمەتکارم نیە، بۆیە هەویرەکەم دەشێلم، دواتر دەوەستم تا دەترشێت، پاشان دەیبرژێنم و دواتر نوێژدەکەم و دێم بۆ لایان. وتی: سکالای ترتان چییە؟ وتیان: شەو وەڵامی کەس ناداتەوە،عومەر وتی: چی دەڵێیت: سەعید وتی: حەزناکەم باسی بکەم، ڕۆژم بۆ ئەوان داناوەو شەوم بۆ خوای گەورە داناوە. وتی: سکالای ترتان چیە؟ وتیان: لە مانگێکدا ڕۆژێك هەیە نایەت بۆ لامان. عومەر وتی: چی دەڵێیت؟ وتی: خزمەتکارێکم نیە تا جلەکانم بۆ بشوات و جلی دیکەشم نیە بیگۆڕم. وتی: سکالای ترتان چییە؟ وتیان: هەندێ جار دەگاتە سەرەمەرگ. وتی: چی دەڵێیت؟ وتی: سەرەمەرگی حەبیبی ئەنسارم لە مەککە بینی کە قوڕەیش گۆشتەکەیان پارچە پاچە کردو لەسەر پەلی خورمایەك دایاننا، وتیان حەزدەکەیت موحەمەد لە شوێنتدا بێت؟ وتی: سوێند بەخوا حەزناکەم لەناو کەس و کارمدا بم و موحەممەد دڕکێك

بچێت بە پێیدا. پاشان هاواری کرد ئەی موحەممەد، کە بیری ئەو ڕۆژە دەکەمەوە بۆچی لەو بارەدا سەرم نەخستو بڕوام بە خوای گەورە نەبوو وادەزانم خوای گەورە هەرگیز لەو تاوانەم خۆش نابێت، بۆیە تووشی ئەوبارە دەبم،عومەر وتی: سوپاس بۆ خوا کە بێهیوای نەکردم، هەزار دیناری بۆ ناردو وتی: بۆ خۆت بەکاری بهێنە، ژنەکەی وتی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی لە خزمەتی تۆ دەوڵەمەندی کردین، پێی وت: هیچ خێرێك لەوەدا دەبینیت؟ دەیدەین بە کەسێك کە لە ئێمە زیاتر پێویستی پێیەتی، وتی: بەڵێ، بۆیە یەکێك لە کەسانی خۆی بانگکرد کە جێی متمانەی بوو، بەش بەشی کردو دواتر وتی: ئەمە ببە بۆ فلان بێوەژنو ئەمە بۆ فلان هەتیو و ئەوە بۆ فلان هەژارو ئەمە بۆ فلان نەخۆش. زێڕێکی لێمایەوە، وتی: ئەمەش ببەخشە، پاشان گەڕایەوە سەر کارەکەی، ژنەکە وتی: ئەی خزمەتکارێکمان بۆ ناکڕیت؟ ئەم پارە سوودی نیە بۆمان، وتی: کەس دێت بۆ لات کە لە تۆ پێویستی زیاتری هەیە.

## (چیرۆکی ئەبوهورەیرە(رضي الله عنه))

ئەبونەعیم لە الحلیة ج١ ص٣٨٥ لە سەعلەبەی کوڕی ئەبومالیکی قورەزیەوە هێناویەتی ئەبوهورەیرە دەچوو بۆ بازاڕو بەرچینەخورمای هەڵدەگرت، وتی: ڕێ بکەرەوە بۆ ئەمیری کوڕی ئەبی مالیك، منیش پێم وت: هێندە بەسە، وتی: ڕێ بۆ ئەمیر بکەرەوەو دەرفەتی بدە.

**پشت بە خوا بەرگی یەکەم تەواو بوو و بە دوایدا بەرگی دووەم دێت.**

